# تيسير الكريم الرحمن

## في تفسير كلام المنان

به كوردى

نووسينى: العلامة عبد الرحمن بن ناصر السعدي رحمه الله

وه‌رگێڕانی: عباس محمد امين

به‌رگی چواره‌م

سووره‌تی (الشعراء) تا سووره‌تی (الشورى)

# تَيْسِيرُ الكَرِيْمُ الرَّحْمَن فِي تَفْسِيرِ كَلاَمِ المَنَّانِ

## به كوردى

**بەرگی چوارەم**

**سوورەتی (الشعراء) تا سوورەتی (الشوری)**

# تَيْسِيرُ الكَرِيْمُ الرَّحْمَن فِي تَفْسِيرِ كَلاَمِ المَنَّانِ
# به كوردى

نووسينى

العلامة عبدالرحمن بن ناصر السعدي رحمه الله

ناوی کتێب: تَيْسِيرُ الكَرِيْمُ الرَّحْمَن فِي تَفْسِيرِ كَلاَمِ المَنَّانِ بە کوردی (بەرگی چوارەم)
بابەت: تەفسیری قورئانی پیرۆز
ناوی نووسەر: العلامة عبدالرحمن بن ناصر السعدي (رحمه الله)
وەرگێڕانی: عباس محمد امین
دیزاینی بەرگ: ناوەندی ڕێنوێن
دیزاینی تێکست: دانا حەسەن
نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠١٩
چاپ: ناوەندی ڕێنوێن
تیراژ: (١٠٠٠) دانە
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (٤٩)ـی ساڵی (٢٠١٩)ـی پێ دراوە.



ناوەندی ڕێنوێن
07701932749 - 07501269689
hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com
سلێمانی - بازاڕی ئاوباریک - نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)


بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
طسٓمٓ ۝١ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ۝٢ لَعَلَّكَ بَٰخِعٌ نَّفْسَكَ أَلَّا
يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ ۝٣ إِن نَّشَأْ نُنَزِّلْ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ءَايَةً فَظَلَّتْ
أَعْنَٰقُهُمْ لَهَا خَٰضِعِينَ ۝٤ وَمَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّنَ ٱلرَّحْمَٰنِ مُحْدَثٍ
إِلَّا كَانُوا۟ عَنْهُ مُعْرِضِينَ ۝٥ فَقَدْ كَذَّبُوا۟ فَسَيَأْتِيهِمْ أَنۢبَٰٓؤُا۟ مَا كَانُوا۟
بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ۝٦ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ إِلَى ٱلْأَرْضِ كَمْ أَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ
كَرِيمٍ ۝٧ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ۝٨ وَإِنَّ
رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ۝٩ وَإِذْ نَادَىٰ رَبُّكَ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱئْتِ ٱلْقَوْمَ
ٱلظَّٰلِمِينَ ۝١٠ قَوْمَ فِرْعَوْنَ ۚ أَلَا يَتَّقُونَ ۝١١ قَالَ رَبِّ إِنِّىٓ أَخَافُ
أَن يُكَذِّبُونِ ۝١٢ وَيَضِيقُ صَدْرِى وَلَا يَنطَلِقُ لِسَانِى فَأَرْسِلْ
إِلَىٰ هَٰرُونَ ۝١٣ وَلَهُمْ عَلَىَّ ذَنۢبٌ فَأَخَافُ أَن يَقْتُلُونِ ۝١٤ قَالَ
كَلَّا ۖ فَٱذْهَبَا بِـَٔايَٰتِنَآ ۖ إِنَّا مَعَكُم مُّسْتَمِعُونَ ۝١٥ فَأْتِيَا فِرْعَوْنَ
فَقُولَآ إِنَّا رَسُولُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝١٦ أَنْ أَرْسِلْ مَعَنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ
۝١٧ قَالَ أَلَمْ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيدًا وَلَبِثْتَ فِينَا مِنْ عُمُرِكَ سِنِينَ
۝١٨ وَفَعَلْتَ فَعْلَتَكَ ٱلَّتِى فَعَلْتَ وَأَنتَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ۝١٩

# تەفسیری سووڕەتی (الشعراء)

## مەككیە (٢٢٧) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٩): ﴿ طسٓمٓ ﴿١﴾ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ
ٱلْمُبِينِ ﴿٢﴾ لَعَلَّكَ بَٰخِعٌ نَّفْسَكَ أَلَّا يَكُونُوا۟
مُؤْمِنِينَ ﴿٣﴾ إِن نَّشَأْ نُنَزِّلْ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ءَايَةً
فَظَلَّتْ أَعْنَٰقُهُمْ لَهَا خَٰضِعِينَ ﴿٤﴾ وَمَا يَأْتِيهِم
مِّن ذِكْرٍ مِّنَ ٱلرَّحْمَٰنِ مُحْدَثٍ إِلَّا كَانُوا۟ عَنْهُ مُعْرِضِينَ
﴿٥﴾ فَقَدْ كَذَّبُوا۟ فَسَيَأْتِيهِمْ أَنۢبَٰٓؤُا۟ مَا كَانُوا۟ بِهِۦ
يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٦﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ إِلَى ٱلْأَرْضِ كَمْ أَنۢبَتْنَا
فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ ﴿٧﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً ۖ وَمَا
كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٨﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ
ٱلرَّحِيمُ ﴿٩﴾ ﴾

﴿ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴾ خـوا ﷻ ئامـاژە دەكات ئاماژەكردنێـك بەڵگەیە لەسـەر بە مـەزن دانانـی ئایـەتو دەقەكانی، هەمـوو داواكاری پەرسـتراوێتیو مەبەسـتە شـەرعیەكان دەگرێتـەوە، بەجـۆرێ كەمترین گومـانو دوو دڵی نامێنـی لای بینەر لـەوەی هەواڵی پێداوە یـان بڕیـاری لەسـەر داوە، لەبـەر ڕوونـیو بەڵگە بوونـی لەسـەر پیرۆزترینـی ماناكانی، وە گرێدانـی بڕیـارەكان بـە حوكمەكانـیو لەیەكدانەوەیـان بە پێـی گونجاویـان، پێغەمبەر ﷺ خەڵكـی پـێ ئاگـادار دەكـردەوەو ڕێنمایـی دەكردن بـۆ ڕێگای ڕاسـت، ئـەو بەندانەی لە خـوا دەترسـان هیدایەتیـان پێوەردە گـرت، وە ئـەوەی بەدبەختی لەسـەر نووسـراوە پشـتی تێدە كـرد، پێغەمبـەر ﷺ بێتاقـەتو خەمبار دەبوو لەسـەر بـڕوا نەهێنانیان، چونكە سـوور بوو لەسـەر خێرو چاكـەو ئامۆژگاریكردنیان.

جا لەبـەر ئەمە خوا ﷻ دەربـارەی پێغەمبەرەكەی فەرموویەتـی: ﴿ لَعَلَّكَ بَٰخِعٌ نَّفْسَكَ ﴾ واتە: (خەریكـە) خـۆت لەناو دەبەیـت ﴿ أَلَّا يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴾ واتـە: وا مەكەو بەهـۆی ئەوانەوە ئاخـو حەسـرەت هەڵمەكێشـە، بێگومـان هیدایـەتو ڕێنمایـی بەدەسـتی خوایە، ئـەوەی لە

ئەستۆی تۆدا لە گەیاندن درێغیت نەکردو گەیاندت، لەسەرووی ئەم قورئانەوە شتێکی دیکە نیە تا دایبەزێنین بۆ ئەوەی ئەوان بڕوا بهێنن، ئەو قورئانە بەسە بۆ کەسێ بیەوێت هیدایەت وەربگرێت، لەبەر ئەمە فەرموویەتی:

﴿ إِن نَّشَأْ نُنَزِّلْ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ءَايَةً ﴾ واتە: (ئەگەر بمانەوێ لە ئایەتو نیشانەیان لە ئاسمانەوە بۆ دادەبەزێنین) لە ئایەتەکانی پێشنیار کردن ﴿ فَظَلَّتْ أَعْنَٰقُهُمْ ﴾ واتە: بەدرۆدانەران گەردنیانی ﴿ لَهَا خَٰضِعِينَ ﴾ واتە: (بۆ دابنوێنن)، بەڵام هیچ پێویست بەوە ناکاو ئەوە هیچ بەرژەوەندیەکی تێدانیە، بێگومان ئەوکاتە ئیمان هێنان هیچ سوودو بایەخێکی نابێ، بەڵکو ئیمانی بەسوود بریتیە لە ئیمان بوون بە غەیبو پەنهان، هەر وەکو خوا فەرموویەتی: ﴿ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَوْ يَأْتِىَ رَبُّكَ أَوْ يَأْتِىَ بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ ۗ يَوْمَ يَأْتِى بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَٰنُهَا ﴿١٥٨﴾ ﴾الأنعام، (واتە: ئاخۆ ئەوان چاوەڕوانی چ شتێک دەکەن بێجگە لەوەی فریشتەی گیان کێشانیان بۆ بێت، یان پەروەردگارت بێت، یان هەندێ موعجیزەو نیشانە ئاشکراکانی پەروەردگارت بەدیبێت ئەو ڕۆژەی هەندێ لە نیشانەو بەڵگە ڕوونەکانی پەروەردگارت بەدیبێت بڕواهێنان سوود ناگەیەنێ بە هیچ شێوەیەک).

﴿ وَمَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّنَ ٱلرَّحْمَٰنِ مُحْدَثٍ ﴾ واتە: (ئەوانە هەر بەشێکی نوێو تازەی قورئانیان لەلایەن خوای بەخشندەوە بۆ بێت) فەرمانیان پێ بکاو قەدەغەیان لێبکا، وە یادیان بخاتەوە ئەوەی سوودی هەیە بۆیانو زیانیان لێدەدات ﴿ إِلَّا كَانُوا۟ عَنْهُ مُعْرِضِينَ ﴾ (ئەوان بەردەوام پشتێکەرو ڕوو وەرگێڕن لێی) بە دڵو جەستەکانیان، ئەمە پشتێکردنیانە لە یادی هەر شتێکی تازەی قورئان، نەریتی ئەوان بەو جۆرە بووە بەدرۆخستنەوەی ئایەتە تازەکان بەلای ئەوانەوە زۆر لە پێشتر بووە، چونکە ئەوان هیچ خێرێکیان تێدانیە، ئامۆژگاریش سوودیان پێناگەیەنێ، لەبەرئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ فَقَدْ كَذَّبُوا۟ ﴾ واتە: ئەوانە حەقیان بەدرۆ زانی، درۆ کردن بووە پیشەیان، هەرگیز گۆڕانکاری بەسەردا نایەت ﴿ فَسَيَأْتِيهِمْ أَنۢبَٰٓؤُا۟ مَا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴾ واتە: بە زوویی سزایان لەسەر پێویست دەبێ، لەسەر ئەو بەدرۆدانانو گاڵتە پێکردنانەیان، بەڕاستی ئەوانە وشەی سزایان لەسەر پێویست بووە، خوا ﷻ هانی بیرکردنەوەیەک دەدا سوودی بۆ خاوەنەکەی هەبێ، فەرموویەتی:

﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ إِلَى ٱلْأَرْضِ كَمْ أَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ ﴾ (واتە: ئایا سەیری زەوی ناکەن چەندمان ڕواندووە تیایدا) لە هەموو جۆرێکی چاکی بە کەڵک لە ڕووەکەکانو

بەدیمەنێکــی جــوانو بەخشــندەیە لــە ســوود وەرگرتنیــدا.

﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً ﴾ (بــە ڕاســتی ئا لــەوەدا بەڵگەو نیشــانە هەیە لەســەر زیندووکردنەوەی مــردوو دوای مردنیــان، هەروەکــو چــۆن زەویمــان زیندووکردنــەوە دوای ئــەوەی مردبوو ﴿ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴾ (واتــە: کەچــی زۆربەیــان بــڕوادار نەبوون) هــەروەک خوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ وَمَآ أَكْثَرُ ٱلنَّاسِ وَلَوْ حَرَصْتَ بِمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٣﴾ ﴾یوسف، (واتــە: وە زۆربــەی خەڵکــی هەرچەند تۆ ســووربیت (لەســەر بڕواهێنانیان) نابنــە ئیماندار). ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ﴾ ئــەو زاتــەی کــە زاڵە بەســەر هەمــوو بەدیهێنراوەکانــدا، وە جیهانی ســەرەوەو خــوارەوە ملکەچــی ئــەون، ﴿ ٱلرَّحِيمُ ﴾ ئــەو زاتەیــە ڕەحمــەتو بەزەیــی دەوری هەمــوو شــتێکی داوەو گەیشــتوە بە هەموو زینــدەوەرێ، (العزیز) کە هەموو گومڕاو سەرلێشــێواوانی بــە جۆرەها ســزا لەنــاو بــردووە، بەبەزەییــە بەرانبەر خۆشــبەختەکان، لــە کاتێکــدا ڕزگاری کــردوون لە هەمــوو شــەڕو خراپەیەک.

(١٠-٢٠): ﴿ وَإِذْ نَادَىٰ رَبُّكَ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱئْتِ ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠﴾ قَوْمَ فِرْعَوْنَ أَلَا يَتَّقُونَ ﴿١١﴾ قَالَ
رَبِّ إِنِّىٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ﴿١٢﴾ وَيَضِيقُ صَدْرِى وَلَا يَنطَلِقُ لِسَانِى فَأَرْسِلْ إِلَىٰ هَٰرُونَ ﴿١٣﴾ وَلَهُمْ
عَلَىَّ ذَنۢبٌ فَأَخَافُ أَن يَقْتُلُونِ ﴿١٤﴾ قَالَ كَلَّا ۖ فَٱذْهَبَا بِـَٔايَٰتِنَآ ۖ إِنَّا مَعَكُم مُّسْتَمِعُونَ ﴿١٥﴾ فَأْتِيَا
فِرْعَوْنَ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ أَنْ أَرْسِلْ مَعَنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٧﴾ قَالَ أَلَمْ نُرَبِّكَ فِينَا
وَلِيدًا وَلَبِثْتَ فِينَا مِنْ عُمُرِكَ سِنِينَ ﴿١٨﴾ وَفَعَلْتَ فَعْلَتَكَ ٱلَّتِى فَعَلْتَ وَأَنتَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ
﴿١٩﴾ قَالَ فَعَلْتُهَآ إِذًا وَأَنَا۠ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٢٠﴾ ﴾

﴿ وَإِذْ نَادَىٰ رَبُّكَ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱئْتِ ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ تــا کۆتایــی ئــەو ئایەتــەی کــە خــوا ﷻ دەفەرمــوێ: ﴿ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧٤﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٧٥﴾ ﴾ الشــعراء، (واتــە: بە ڕاســتی لەمەدا (باســکرا) پەندێکی گــەورە هەیە بەڵام زۆربەیــان بڕوادار نەبــوون * بێگومــان پەروەردگــارت زاڵو میهرەبانــە) خــوا ﷻ چیرۆکــی مووســا ﵇ی دووبــارە کردۆتــەوەو لە قورئاندا کــە وەک ئەو هیچ چیرۆکێکی دیکــەی دووبارە نەکردوە، لەبــەر ئــەوەی حیکمــەتو پەنــدو ئامۆژگاریەکــی مــەزن لەخۆدەگــرێ، لــەو چیرۆکــەدا هەواڵــی ســتەمکارانو بڕوادارانــی تێدایــە، مووســا ﵇ خاوەن ئــەو شــەریعەتە گەورەیەیە، وە خــاوەن تەوراتــە، کــە باشــترین کتێبە لــە دوای قورئــان، جــا فەرموویەتی: یــادی حاڵی مووســا بکــەرەوە کاتــێ پەروەردگــاری لە پاڵی کێــوی توردا بانگــی کردوو هەواڵــی پێداو کــردی بــە پێغەمبــەر ﷺ جــا پێــی فەرمــوو: ﴿ أَنِ ٱئْتِ ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ (واتە: بچــۆ بۆ لای

گەلـی سـتەمکار) ئەوانـەی لـووت بەرزیان کرد لەسـەر زەویـدا، وە خۆیان بە گـەورە زانی بەسـەر خەڵکەکەیدا، گـەورەو پێشـەواکەیان بانگـەوازی پەروەردگاریّتی دەکـرد بۆ خۆی. ﴿ قَوۡمَ فِرۡعَوۡنَۚ أَلَا يَتَّقُونَ ﴾ واتـە: پێیـان بڵـێ: بـە نـەرمو نیانـیو لەسـەرخۆییەوە ﴿ أَلَا يَتَّقُونَ ﴾ (واتـە: ئایـا لـە خوا ﷻ ناترسـن) ئەو زاتـەی دروسـتی کـردوونو ڕزقو ڕۆزی پێـداون، واز لـەو بیّبڕواییـە بێنـن کە لەسـەری دەڕۆن.

مووسـا ﷺ بیانووی بـۆ پەروەردگاری هێنایەوەو بیانووەکەیشـی ڕوون کـردەوە، وە داوای پشـتیوانی لێکرد لەسـەر ئەم ئەرکە قـورسو گرانە، فەرمـووی: ﴿ رَبِّ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ١٢ وَيَضِيقُ صَدۡرِي وَلَا يَنطَلِقُ لِسَانِي ﴾ (واتـە: وتـی پەروەردگـارا بێگومان من دەترسـم بـروام پێنەکـەن * تەنگە نەفەسو سـینە تەنگیـش ببمو زمانم پـاراو نەبێت) جـا فەرمووی: ﴿ قَالَ رَبِّ ٱشۡرَحۡ لِي صَدۡرِي ٢٥ وَيَسِّرۡ لِيٓ أَمۡرِي ٢٦ وَٱحۡلُلۡ عُقۡدَةٗ مِّن لِّسَانِي ٢٧ يَفۡقَهُواْ قَوۡلِي ٢٨ وَٱجۡعَل لِّي وَزِيرٗا مِّنۡ أَهۡلِي ٢٩ هَٰرُونَ أَخِي ٣٠ ﴾طه، (واتـە: (مووسـا) وتی پەروەردگارم سـنگم (دڵو دەروونـم) فـراوان بکـە * وە ئیـشو کارم بۆ ئاسـان بکـە * گرێی زمانیشـم بەرەڵا بکـە * بـۆ ئـەوەی لـە قسـەکانم تێبگـەن * وە لـە خـزمو کەسـی خـۆم کەسـێک بکەرە پشـتیوانم * کـە هاڕوونی برامـە) ﴿ فَأَرۡسِلۡ إِلَىٰ هَٰرُونَ ﴾ (واتـە: بەڵکو پەیام بـۆ هاڕوونی براشـم بنێری).

خـوا ﷻ وەڵامـی داواکـەی دایـەوەو هاڕوونـی بـرای کـرد بـە پێغەمبـەر، هەروەکو چۆن هەواڵـی پێـدا ﴿ فَأَرۡسِلۡهُ مَعِيَ رِدۡءٗا ٣٤ ﴾القصص، (واتـە: جـا ئـەوم لەگەڵـدا بنێـرە) پشـتیوانو یاریـدەدەرم بـێ لـە کاروبارەکانـم بـۆ ئـەوەی بە ڕاسـتم بزانـن، ﴿ وَلَهُمۡ عَلَيَّ ذَنۢبٞ ﴾ واتـە: لـە کوشـتنی ئـەو پیـاوە قیبتیـەدا (بۆیـە دەترسـم بمکـوژن).

﴿ قَالَ كَلَّاۖ ﴾ واتـە: ناتوانـن بتکـوژن، ئێمە پشـتیوانیتان لێدەکەیـنو چاودێریتـان دەکەین ﴿ قَالَ فَلَا يَصِلُونَ إِلَيۡكُمَا بِـَٔايَٰتِنَآۚ أَنتُمَا وَمَنِ ٱتَّبَعَكُمَا ٱلۡغَٰلِبُونَ ٣٥ ﴾القصص، (واتە: ئەوسـا بـە هـۆی ئایەتەکانی ئێمەوە دەسـتیان بە ئێـوە ناگات تەنها ئێوە مووسـاو هـاڕوونو ئەوەی شـوێنتان دەکـەوێ سـەردەکەون)، ئا لەبەرئەمـە نەیتوانی مووسـا بکوژێ، لەگـەڵ ئەوپەڕی دژایەتـی کـردن لەگەڵیداو بە گێـل دانانی بۆچوونەکانـیو گومراکردنی خـۆیو گەلەکەی ﴿ فَٱذۡهَبَا بِـَٔايَٰتِنَآۖ ﴾ (هەردووکتـان هـاوڕێ لەگـەڵ موعجیزەکانماندا) کە بەڵگەن لەسـەر ڕاسـتگۆیی ئێـوەو ئـەو پەیامـەی هێناوتانـە ﴿ إِنَّا مَعَكُم مُّسۡتَمِعُونَ ﴾ واتـە: دەتانپارێزینو چاودێریتـان دەکەین.

﴿ فَأۡتِيَا فِرۡعَوۡنَ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولُ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ واتــە: خــوا ﷻ ئێمــەی نــاردووە بۆ لای تۆ بــۆ ئــەوەی بڕوای پــێ بهێنیو بــڕوا بــە ئێمە بکــەی، وە ملکەچــی بەندایەتــی کردنی بیی‌و یەکتاپەرســتی ئەنجام بدەی.

﴿ أَنۡ أَرۡسِلۡ مَعَنَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ﴾ واتــە: (داوات لێدەکەیــن ئــەی فیرعــەون) دەســتبەرداری ســزادانیان بیــت، وە وازیــان لێبهێنیت تــا بەندایەتــی پەروەردگاریــان بکــەنو فەرمانەکانی بە جێبهێنن .

کاتــێ هاتــن بۆ لای فیرعــەون، وە ئەوەی خــوا ﷻ پێی ڕاگەیاندبوون پێیــان ووت، فیرعەون نــە بــڕوای هێنــاو نە دڵــی نەرم بــوو، بەڵکــو بەرپەرچی مووســای دایــەوەو ﴿ قَالَ أَلَمۡ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيدٗا ﴾ واتــە: ئایــا ئێمــە بــە منداڵــی پەروەردەمــان نەکــردووی، نازونیعمەتــی خۆمان پێنەدایــت، کاتــێ منــداڵ بــووی لــە لانکــدا، وە بــە بەردەوامی تــا ئێســتا ﴿ وَلَبِثۡتَ فِينَا مِنۡ عُمُرِكَ سِنِينَ ١٨ وَفَعَلۡتَ فَعۡلَتَكَ ٱلَّتِي فَعَلۡتَ ﴾ (واتــە: چەندەها ســاڵی تەمەنت لــە ناوماندا بەســەر نەبــرد * ئەوەشــت کــرد کــە کــردت) ئەویــش کوشــتنی پیاوێکــی قیبتی بــوو لە لایــەن مووســاوە ؑ، کاتێ کەســێ لــە کۆمەڵەکەی مووســا ؑ پەنای بۆ برد، مووســاش هاتــە دەمیــەوە ﴿ فَوَكَزَهُۥ مُوسَىٰ فَقَضَىٰ ١٥ ﴾ القصــص، (واتە: ئنجا مووســا زلەیەکــی لێدا ئەو قیبتیــەی کوشــت)، ﴿ وَأَنتَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾ واتــە: تــۆ ڕێگایەکت گرتۆتــە بەر جگە لــە ڕێگــای ئێمــە، ئەو کاتــە ڕێگای تــۆو ڕێگای ئێمــە یەک ڕێگا بــوو، دانی نــا بە کوفرو بێبڕواییــدا بــە جۆرێ نەیشــی دەزانێ.

قَالَ فَعَلْتُهَآ إِذًا وَأَنَا۠ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٢٠﴾ فَفَرَرْتُ مِنكُمْ لَمَّا خِفْتُكُمْ
فَوَهَبَ لِى رَبِّى حُكْمًا وَجَعَلَنِى مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٢١﴾ وَتِلْكَ نِعْمَةٌ
تَمُنُّهَا عَلَىَّ أَنْ عَبَّدتَّ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٢٢﴾ قَالَ فِرْعَوْنُ وَمَا رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ
﴿٢٣﴾ قَالَ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ
﴿٢٤﴾ قَالَ لِمَنْ حَوْلَهُۥٓ أَلَا تَسْتَمِعُونَ ﴿٢٥﴾ قَالَ رَبُّكُمْ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ
ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٦﴾ قَالَ إِنَّ رَسُولَكُمُ ٱلَّذِىٓ أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ لَمَجْنُونٌ
﴿٢٧﴾ قَالَ رَبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ
﴿٢٨﴾ قَالَ لَئِنِ ٱتَّخَذْتَ إِلَٰهًا غَيْرِى لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ ٱلْمَسْجُونِينَ
﴿٢٩﴾ قَالَ أَوَلَوْ جِئْتُكَ بِشَىْءٍ مُّبِينٍ ﴿٣٠﴾ قَالَ فَأْتِ بِهِۦٓ إِن كُنتَ
مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٣١﴾ فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ ﴿٣٢﴾
وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِىَ بَيْضَآءُ لِلنَّٰظِرِينَ ﴿٣٣﴾ قَالَ لِلْمَلَإِ حَوْلَهُۥٓ
إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ عَلِيمٌ ﴿٣٤﴾ يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُم
بِسِحْرِهِۦ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ ﴿٣٥﴾ قَالُوٓا۟ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ وَٱبْعَثْ فِى ٱلْمَدَآئِنِ
حَٰشِرِينَ ﴿٣٦﴾ يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَحَّارٍ عَلِيمٍ ﴿٣٧﴾ فَجُمِعَ ٱلسَّحَرَةُ
لِمِيقَٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿٣٨﴾ وَقِيلَ لِلنَّاسِ هَلْ أَنتُم مُّجْتَمِعُونَ ﴿٣٩﴾

﴿ فَعَلْتُهَآ إِذًا وَأَنَا۠ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴾ واتــە: (ئــەو کاتــە ئــەوەم کــرد) بەبــێ کوفــر، بەڵکــو بەهــۆی نەزانینمەوە بوو، داوای لێخۆشـبوونم کــرد لــە خــوا، خــواش لێـم خــۆش بــوو (پاشــان دەفەرمــوێ:)

(٢١-٤١): ﴿ فَفَرَرْتُ مِنكُمْ لَمَّا خِفْتُكُمْ فَوَهَبَ لِى رَبِّى حُكْمًا وَجَعَلَنِى مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٢١﴾ وَتِلْكَ نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا عَلَىَّ أَنْ عَبَّدتَّ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٢٢﴾ قَالَ فِرْعَوْنُ وَمَا رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٣﴾ قَالَ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ ﴿٢٤﴾ قَالَ لِمَنْ حَوْلَهُۥٓ أَلَا تَسْتَمِعُونَ ﴿٢٥﴾ قَالَ رَبُّكُمْ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٦﴾ قَالَ إِنَّ رَسُولَكُمُ ٱلَّذِىٓ أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ لَمَجْنُونٌ ﴿٢٧﴾ قَالَ رَبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢٨﴾ قَالَ لَئِنِ ٱتَّخَذْتَ إِلَٰهًا غَيْرِى لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ ٱلْمَسْجُونِينَ ﴿٢٩﴾ قَالَ أَوَلَوْ جِئْتُكَ بِشَىْءٍ مُّبِينٍ ﴿٣٠﴾ قَالَ فَأْتِ بِهِۦٓ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٣١﴾ فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ ﴿٣٢﴾ وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِىَ بَيْضَآءُ لِلنَّٰظِرِينَ ﴿٣٣﴾ قَالَ لِلْمَلَإِ حَوْلَهُۥٓ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ عَلِيمٌ ﴿٣٤﴾ يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِۦ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ ﴿٣٥﴾ قَالُوٓا۟ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ وَٱبْعَثْ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿٣٦﴾ يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَحَّارٍ عَلِيمٍ ﴿٣٧﴾ فَجُمِعَ ٱلسَّحَرَةُ لِمِيقَٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿٣٨﴾ وَقِيلَ لِلنَّاسِ هَلْ أَنتُم مُّجْتَمِعُونَ ﴿٣٩﴾ لَعَلَّنَا نَتَّبِعُ ٱلسَّحَرَةَ إِن كَانُوا۟ هُمُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿٤٠﴾ فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ قَالُوا۟ لِفِرْعَوْنَ أَئِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿٤١﴾ ﴾

﴿ فَفَرَرْتُ مِنكُمْ لَمَّا خِفْتُكُمْ ﴾ واتــە: هەتــا هەوڵتانــدا بمکــوژن، هەڵهاتم بۆ مەدیــەن، لەوێ چەندین ســاڵ مامەوە، پاشــان هاتم بــۆ ناوتــان ﴿ فَوَهَبَ لِى رَبِّى حُكْمًا وَجَعَلَنِى مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾ (واتــە: ئیتــر پەروەردگــارم دانایی پــێ بەخشــیووم‌و کردوومی بــە یەکێک لــە پێغەمبەران. بــە پوختــی: بەرپەرچدانــەوەی فیرعــەون بەرپەرچدانەوەیەکــی نەفامانــە بوو، یــان خۆ گێل کــردن بــوو، فیرعــەون ئــەوەی کــردە بەربەســت بــۆ پێغەمبەرایەتیەکەی مووســا ﷺ کە گوایــە ئــەو کەســێکی بەناهــەق کوشــتووە، مووســا ﷺ بــۆی ڕوون کردوە کوشــتنی ئەو

کەســە بە هــۆی گومڕایی‌و نەفامیــەوە بوو، مەبەســتی ئەوە نەبــوو بیکوژێــت، بێگومان هیچ کــەس لــە فــەزڵو چاکەی خــوا بەربەســت نەکــراوە، ئەی بۆچــی ئێــوە دەتانــەوێ ڕێگری بکــەن لــەوەی خــوا پێی بەخشــیوم لــە حوکمو پەیــام؟ ئــەی فیرعــەون تەنها ئــەوەت ماوە بیانــوو بێنیتــەوەو بڵێــی: ﴿أَلَمۡ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيدٗا ١٨﴾(واتــە: ئایــا بە منداڵی لــە لای خۆمان پەروەردمــان نەکــردی) لە کاتــی لێکۆڵینــەوەدا دەردەکــەوێ هیــچ منەتێکی تــۆی تێدانیە، بۆیــە فەرموویەتی:

﴿وَتِلۡكَ نِعۡمَةٞ تَمُنُّهَا عَلَيَّ أَنۡ عَبَّدتَّ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾(واتــە: جا ئەو نازو نیعمەتەی) منەتم بەســەردا دەکەیــت، کــە تــۆ نەوەکانــی ئیســرائیلت زەلیــل کردبــوو، وەکو بەنــدەو کۆیلــە مامەڵەت لەگەڵــدا دەکــردن، خــوا ﷻ منــی ڕزگــار کــرد لــەوەی بمکــەی بە کۆیلــەو ژێردەســتەی خــۆت، نــازو نیعمەتــی خــۆی بەســەرمدا داباران، کەســێ ســەرنج بدا بــۆی دەردەکــەوێ لە حەقیقەتــدا تۆ ســتەمت لەم گەلــە بەرێزە کردوەو ســزات داونو کردوونت بــە خزمەتکاری خــۆت، بــەڵام خــوا ﷻ منــی ڕزگار کــردوە لــە ئــازاری تــۆ، لەگــەڵ بــەردەوام بوونت لە ســزادانی گەلەکــەم، ئــەم منــەتو فــەزڵو چاکەیە چیــە دەیکەی بەســەر مندا؟!!

﴿قَالَ فِرۡعَوۡنُ وَمَا رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾(فیرعــەون وتــی باشــە پەروەردگــاری جیهانیــان کێیــە؟) ئەمــەش ئینــکاری کــردن بــوو بەرانبــەر پەروەردگــاری، بــە هــۆی ســتەمو خۆبەزلزانیەوە، لەگــەڵ ئــەوەدا دڵنیابــوو لــە ڕاســتی ئەو بانگەشــەی کــە مووســا ؈ دەیکــرد، فەرمووی:

﴿رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَآ﴾ واتــە: ئــەو زاتــە بەدیهێنــەری جیهانــی ســەرەوەو خوارەوەیــە، وە بەڕێوەی بردووە بــە چاکترین بەڕێوەبردن، پــەروەردەی کردوە بە چاکترین پــەروەردە، لــە کــۆی ئەوانــە ئێــوە ئــەی ئەوانــەی دوێنراون چــۆن نکوڵــی لــە بەدیهێنەری دروســتکراوەکانو هەمــوو زەوی‌و ئاســمانەکان دەکــەن ﴿إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ﴾(واتــە: ئەگەر ئێــوە بــڕوا دەکــەنو دڵنیا دەبن) فیرعــەون بە لووت بەرزی‌و سەرســامبوون بــە گەلەکەیەوە وتــی: ﴿أَلَا تَسۡتَمِعُونَ﴾واتــە: ئــەوە گــوێ ناگــرن لــەو پیــاوە چــی دەڵێت؟! مووســا ؈ ڕووی کــردە خەڵکەکــەو وتــی: ﴿رَبُّكُمۡ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلۡأَوَّلِينَ﴾(واتــە: پەروەردگاری من پەروەردگــاری ئێــوەش‌و بــاوکو باپیرانیشــتانە) بەلاتانەوە ســەیر بێ یان نا، لــە خۆبایی بن یــان گوێڕایەڵــی بکــەن، فیرعەون بە عینــادی کردنەوە بەرانبــەر حــەقو لەکەدارکردنی ئەو کەســەی هێناویەتی وتی:

﴿إِنَّ رَسُولَكُمُ ٱلَّذِيٓ أُرۡسِلَ إِلَيۡكُمۡ لَمَجۡنُونٞ﴾ (واتــە: بەڕاســتی ئــەو پێغەمبــەرەی بــۆ ئێــوە

ڕەوانەکـراوە شـێتە) چونکـە شـتێک دەڵـێ پێچەوانـەی ئەوەیـە ئێمـە لەسـەری دەڕۆیـن، عەقـڵو ژیـری لای فیرعـەونو دارو دەسـتەکەی، پێیـان وابوو ئـەوان دروسـت نەکراون، یـان ئاسـمانەکانو زەوی بـە بـەردەوام بوونیـان هەبـووە بـێ ئـەوەی کەسـێ بیانهێنێتـە بـوون، ئـەوان خۆیـان لـە خۆیانـەوە دروسـتکراون بەبـێ دروسـتکەر، عەقـڵو ژیری لای فیرعـەون ئەوەبـوو بەدیهێنراوێکـی ناتـەواو لە هەمـوو ڕووەکانەوە بپەرسـترێ، شـێتێش لە لای ئـەو چەسـپاندنی پەروەردگارێـک بـوو بـۆ جیهانەکانـی سـەرو خـوارەوە، وە پێدەری نـازو نیعمەتـە ئاشـکراو نهێنیەکان، وە بانگەشـەی بەندایەتیشـی بـۆ بکات، ئـەم وتەی لای خەڵکەکـەی جـوان کـردوو ڕازاندیـەوە، ئەوانـەی عەقڵ سـووکو هەرزەو گەمـژەو گێل بـوون ﴿ فَٱسْتَخَفَّ قَوْمَهُۥ فَأَطَاعُوهُ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَـٰسِقِينَ ﴿٥٤﴾ ﴾الزخـرف، (واتـە: جا بـەم قسـانە گەلەکـەی هەڵخەڵەتاندو ئەوانیـش گوێڕایەڵیـان کرد)، مووسـا ﷺ لە وەڵامی ئینـکاری کردنـی فیرعـەون لـە کارخسـتنی پەروەردگـاری جیهانیـان فەرمووی:

﴿ رَبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَمَا بَيْنَهُمَآ ﴾ (واتـە: پەروەردگـاری خۆرهـەڵاتو خۆرئـاواو هەمـوو ئەو شتانەشـە کـەوا لەناویاندایە) لە سـەرجەم دروسـتکراوەکان ﴿ إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ ﴾ (ئەگـەر عەقـڵو بیـرو هۆشـتان بخەنـە کار)، بێگومـان ڕوونکردەوەی تـەواوم بـە ئێوەدا، هـەر کەسـێک خاوەنـی کەمتریـن عەقـڵ بـێ لێـی تێدەگا، ئـەی بۆچـی ئێوە خۆتـان درۆ دەکـەن لـەوەی کـە دەتاندوێنـم پێی؟ ئەم شـتە ئامـاژەو ئاگادارکردنـەوەی تێدایـە لەوەی کـە مووسـاتان پێـی تۆمەتبار کرد شـێتیە، ئەوە نەخۆشـیە بۆتـان، چاکتریـنو تەواوترینو عاقڵترینـی بەدیهێنراوەکانتـان بـە شـێت لـە قەڵەمدا، لـە کاتێکـدا خۆتان شـێتو گەوجن، کاتـێ عەقڵەکانتـان لە دەسـتدا بە هـۆی ئینـکاری کردنتان لـە دیارترینی بەدیهێنـراوەکان، بەدیهێنـەری ئاسـمانەکانو زەویو ئـەوەی لەنێویاندایە، جـا ئەگەر ئێوە نکووڵـی لەمە بکەن چـی شـتێک دەچەسـپێنن؟ وە ئەگـەر خۆتـان لـەوە بگەوجێنـن ئەوە چـی شـتێ دەزانن؟ ئەگـەر ئێـوە بـڕوا بـە خـواو ئایـەتو نیشـانەکانی نەکـەن، بـە چ شـتێک لـە دوای خواو ئایەتەکانـی بڕوادەهێنـن؟ سـوێند بـە خوا ئـەو شـێتانەی وەک ئـاژەڵ وانو هیـچ تێناگەن عاقڵتـرن لـە ئێـوە، وە بە ڕاسـتی ئاژەڵـی مـاڵات بەڕێزترە لـە ئێوە.

کاتـێ کـە فیرعـەون بەڵگـەی بـە دەسـتەوە نەماو بـێ توانـا بـوو لـە ڕووبـەڕوو بوونەوە ﴿ قَالَ ﴾هەڕەشـەی لـە مووسـا ﷺ کـرد بـە دەسـەڵاتەکەیو وتـی: ﴿ لَئِنِ ٱتَّخَذْتَ إِلَـٰهًا غَيْرِى لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ ٱلْمَسْجُونِينَ ﴾ پێـی وابـوو- خـوا ڕوو ڕەشـی بـکات-، ئـەو دەتوانـێ

مووسـا ﷺ گومـڕا بـکات، وە مووسـا ﷺ مافـی ئـەوەی نیـە جگە لـەو کەسـێکی دیکە بپەرسـتێ، ئەگەرنـا فیرعـەون یـەکلا بووەتـەوە، کە فیرعـەونو ئـەوەی لەگەڵیدایە لەسـەر بەرچـاو ڕوونیـن لـە کاروبارەکانیاندا؟

مووسـا ﷺ پێی وت: ﴿ أَوَلَوْ جِئْتُكَ بِشَيْءٍ مُّبِينٍ ﴾ واتە: نیشـانەیەکی ئاشـکراو ڕوونت بۆ بهێنمـەوە لەسـەر ڕاسـتی پەیامەکەم، کە لـە دەرەوەی عـادەتو دابو نەریتـدا بێ، ﴿ قَالَ فَأْتِ بِهِۦٓ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٣١﴾ فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِيَ ثُعْبَانٌ ﴾ واتـە: (فیرعـەون وتی: ئـادەی بزانـم چیت پێدەکـرێ ئەنجامی بـدە ئەگەر ڕاسـت دەکەی * ئەویـش گۆچانەکەی فڕێـدا) دەسـت بەجـێ بووبـە مـار ﴿ مُّبِينٌ ﴾ ئاشـکرا بـۆ هەموو کەسـێ نـە خەیاڵـەو نە لێکچواندن.

﴿ وَنَزَعَ يَدَهُۥ ﴾ (دەسـتی دەرهێنـا) لـە گیرفانـی ﴿ فَإِذَا هِيَ بَيْضَآءُ لِلنَّٰظِرِينَ ﴾ واتـە: بـوو بـە ڕووناکیەکـی مـەزن، هیـچ ناتەواویەکـی تێـدا نەبـوو بـۆ کەسـێ تەماشـای بکردایـە، ﴿ قَالَ ﴾ فیرعـەون وتـی: ﴿ لِلْمَلَإِ حَوْلَهُۥٓ ﴾ (واتە: بـە دەسـەڵاتدارانی دەوروبەری خۆی) بـە بەرهەڵسـتی کردنـی حـەقو ئەوەیشـی هێناویەتـی: ﴿ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ عَلِيمٌ ﴿٣٤﴾ يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُم ﴾ (واتـە: ئـا ئەمـە جادووگەرێکـی زانـاو شـارەزایە * دەیەوێ لەسـەر زەوی خۆتـان دەرتان بکات) سـاختەی لێکردن چونکە دەیزانـی ئەوانەی دەوروبەری خەڵکێکـی کـەم عەقـڵو گوێڕایەڵـن، وتـی: ئەمـە هـەروەک ئەوەیـە کـە سـاحیرەکان دەیکـەن, چونکـە لای ئـەوان چەسـپاوەو جادووگـەرەکان شـتی سەرسـووڕهێنەر دەکـەن کـە لـە توانـای خەڵکیـدا نیە، وە ترسـاندنی کە مەبەسـتی مووسـا ﷺ لـەم جادووکردنەیدا هەوڵـدانو کۆشـش کردنە بـۆ دژایەتی کردنـی ئـەوانو دەربەدەرکردنی مـاڵو منداڵیان لە شـارەکەیان ﴿ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ ﴾ (فەرمانتـان چیـە) چـی پـێ بکەین؟

﴿ قَالُوٓا۟ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ ﴾ واتـە: (وتیـان: مۆڵەتێـک بـدە بـە مووسـاو براکەی) بـۆ کاتێکی دیکـە ﴿ وَٱبْعَثْ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴾ (فەرمانیـش بنێرە بۆ کاربەدەسـتانی هەموو شـارەکان) خەڵکـی کۆبکەنەوە، ﴿ يَأْتُوكَ ﴾ (بۆت بهێنن) ئەوانـەی بڵاوت کردوونەتەوە ﴿ بِكُلِّ سَحَّارٍ عَلِيمٍ ﴾ واتـە: فەرمانبـەر بنێـرە بۆ هەموو شـارو شـارۆچکەکانت کە سـەرچاوەی زانسـتو کانـزای جادوون، هەمـوو جادووگەرێکی زیـرەکو بە توانا کۆبکەنـەوە، چونکە جادووگـەر دەتوانـێ وەڵامی جادووگـەر بداتەوە.

ئەمـە لـە سـۆزو بەزەیی خوایـە بەرانبەر بـە بەندەکانـی کە نیشـانیان بدات بەتاڵـیو پووچی

ساخته‌كردنی فیرعه‌ونـی نه‌فامـی گومـڕای گومڕاكـه‌ر، كه‌ پێـی وایه‌ ئه‌وه‌ی مووسـا عليه السلام هێناویه‌تـی جادووه‌، چاره‌نووسـیان وابـوو، كه‌ هه‌مـوو جادووگه‌ره‌ به‌ توانـاكان كۆبكه‌نه‌وه‌ بـۆ ئـه‌وه‌ی كۆڕێـك ئاماده‌ بكـه‌ن له‌ پێـش چاوی هه‌مـوو خه‌ڵكی، تـا هه‌ق له‌ پـووچ جیا ببێتـه‌وه‌و ده‌ربكـه‌وێ، وه‌ بـۆ ئـه‌وه‌ی خاوه‌ن زانسـتو خاوه‌ن پیشـه‌كان دان بنێن به‌ڕاسـتی په‌یامه‌كـه‌ی مووسـادا عليه السلام، بـه‌وه‌ی كه‌ ئه‌وه‌ جـادوو نیه‌، فیرعـه‌ون بۆچوونه‌كه‌یانی په‌سـند كـردو خه‌ڵكـی نارد بـۆ شـارو شـارۆچكه‌كان، هه‌مـوو جادووگـه‌ره‌كان كۆبكه‌نـه‌وه‌، وه‌ هـه‌وڵو كۆششـێكی زۆریـدا بـۆ ئـه‌و مه‌به‌سـته‌. ﴿ فَجُمِعَ ٱلسَّحَرَةُ لِمِيقَـٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴾ (واتـه‌: سـه‌ره‌نجام جادووگـه‌ران له‌ ڕۆژێكـی دیاریكـراو كاتێكی دیاریكـراو كۆكرانه‌وه‌)، مووسـا عليه السلام لـه‌و ڕۆژه‌دا په‌یمانـی پێیان دابـوو، ئه‌ویـش ڕۆژی جه‌ژن بوو كـه‌ خه‌ڵكی له‌و ڕۆژه‌دا خۆیـان ده‌رازانـده‌وه‌و ده‌سـتیان له‌ ئیـشو كاره‌كانیـان هه‌ڵده‌گرت.

﴿ وَقِيلَ لِلنَّاسِ هَلْ أَنتُم مُّجْتَمِعُونَ ﴾ واتـه‌: هه‌مـوو خه‌ڵكه‌كـه‌ بانـگ كران بـۆ كۆبوونه‌وه‌ له‌ ڕۆژی دیاریكراودا

﴿ لَعَلَّنَا نَتَّبِعُ ٱلسَّحَرَةَ إِن كَانُوا۟ هُمُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴾ واتــە: بــە خەڵکەکەیــان گــوت: کۆببنــەوە بــۆ ئــەوەی ســەرکەوتنی جادووگــەرەکان ببینن بەســەر مووســا ﷺ، بێگومــان ئەوان شــارەزان لــە پیشــەکانیاندا، بــۆ ئــەوەی شــوێنیان بکەویــن‌و بــە مەزنیــان بزانیــن، وە گەورەیــی‌و فەزڵــی زانســتی جــادوو بۆ دەربکــەوێ، ئەگــەر ئەوانــە ســەرکەوتوو بکرانایــە بــۆ حــەقو ڕاســتی دەیانــوت: بــۆ ئــەوەی شــوێنی ئەوەیــان بکەویــن کە حــەقو ڕاستیان پێیــە، ئــا لەبەر ئەمــە هیچ ســوودی پێنەگەیانــدن تەنهــا پێویســت بوونــی بەڵگــەو حوجە نەبــێ ﴿ فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ ﴾ (کاتــێ) جادووگەران گەیشــتنە لای فیرعــەون، پێیــان گــوت: ﴿ أَئِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴾ (واتــە: ئایا پاداشــتمان دەبێــت ئەگــەر ئێمــە ســەرکەوتین) بەســەر مووســا؟ (ئنجــا وەڵامــی دانــەوە وتــی:)

لَعَلَّنَا نَتَّبِعُ ٱلسَّحَرَةَ إِن كَانُوا۟ هُمُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿٤٠﴾ فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ
قَالُوا۟ لِفِرْعَوْنَ أَئِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿٤١﴾ قَالَ نَعَمْ
وَإِنَّكُمْ إِذًا لَّمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٤٢﴾ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلْقُوا۟ مَآ أَنتُم مُّلْقُونَ
﴿٤٣﴾ فَأَلْقَوْا۟ حِبَالَهُمْ وَعِصِيَّهُمْ وَقَالُوا۟ بِعِزَّةِ فِرْعَوْنَ إِنَّا لَنَحْنُ
ٱلْغَٰلِبُونَ ﴿٤٤﴾ فَأَلْقَىٰ مُوسَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ
﴿٤٥﴾ فَأُلْقِىَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ﴿٤٦﴾ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٧﴾
رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿٤٨﴾ قَالَ ءَامَنتُمْ لَهُۥ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ إِنَّهُۥ
لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِى عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحْرَ فَلَسَوْفَ تَعْلَمُونَ لَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ
وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَٰفٍ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٤٩﴾ قَالُوا۟ لَا ضَيْرَ إِنَّآ
إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ ﴿٥٠﴾ إِنَّا نَطْمَعُ أَن يَغْفِرَ لَنَا رَبُّنَا خَطَٰيَٰنَآ أَن كُنَّآ
أَوَّلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٥١﴾ ۞ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِىٓ إِنَّكُم
مُّتَّبَعُونَ ﴿٥٢﴾ فَأَرْسَلَ فِرْعَوْنُ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿٥٣﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ
لَشِرْذِمَةٌ قَلِيلُونَ ﴿٥٤﴾ وَإِنَّهُمْ لَنَا لَغَآئِظُونَ ﴿٥٥﴾ وَإِنَّا لَجَمِيعٌ حَٰذِرُونَ
﴿٥٦﴾ فَأَخْرَجْنَٰهُم مِّن جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٥٧﴾ وَكُنُوزٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٥٨﴾
كَذَٰلِكَ وَأَوْرَثْنَٰهَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٥٩﴾ فَأَتْبَعُوهُم مُّشْرِقِينَ ﴿٦٠﴾

(٤٢-٦٨): ﴿ قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ إِذًا لَّمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٤٢﴾ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلْقُوا۟ مَآ أَنتُم مُّلْقُونَ ﴿٤٣﴾
فَأَلْقَوْا۟ حِبَالَهُمْ وَعِصِيَّهُمْ وَقَالُوا۟ بِعِزَّةِ فِرْعَوْنَ إِنَّا لَنَحْنُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴿٤٤﴾ فَأَلْقَىٰ مُوسَىٰ عَصَاهُ
فَإِذَا هِىَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ ﴿٤٥﴾ فَأُلْقِىَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ﴿٤٦﴾ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٧﴾ رَبِّ
مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿٤٨﴾ قَالَ ءَامَنتُمْ لَهُۥ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِى عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحْرَ فَلَسَوْفَ
تَعْلَمُونَ لَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَٰفٍ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٤٩﴾ قَالُوا۟ لَا ضَيْرَ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا
مُنقَلِبُونَ ﴿٥٠﴾ إِنَّا نَطْمَعُ أَن يَغْفِرَ لَنَا رَبُّنَا خَطَٰيَٰنَآ أَن كُنَّآ أَوَّلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٥١﴾ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ
أَسْرِ بِعِبَادِىٓ إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ ﴿٥٢﴾ فَأَرْسَلَ فِرْعَوْنُ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿٥٣﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَشِرْذِمَةٌ قَلِيلُونَ
﴿٥٤﴾ وَإِنَّهُمْ لَنَا لَغَآئِظُونَ ﴿٥٥﴾ وَإِنَّا لَجَمِيعٌ حَٰذِرُونَ ﴿٥٦﴾ فَأَخْرَجْنَٰهُم مِّن جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٥٧﴾ وَكُنُوزٍ
وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٥٨﴾ كَذَٰلِكَ وَأَوْرَثْنَٰهَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٥٩﴾ فَأَتْبَعُوهُم مُّشْرِقِينَ ﴿٦٠﴾ فَلَمَّا تَرَٰٓءَا ٱلْجَمْعَانِ
قَالَ أَصْحَٰبُ مُوسَىٰٓ إِنَّا لَمُدْرَكُونَ ﴿٦١﴾ قَالَ كَلَّآ إِنَّ مَعِىَ رَبِّى سَيَهْدِينِ ﴿٦٢﴾ فَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ
أَنِ ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْبَحْرَ فَٱنفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرْقٍ كَٱلطَّوْدِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٦٣﴾ وَأَزْلَفْنَا ثَمَّ ٱلْءَاخَرِينَ ﴿٦٤﴾

﴿وَأَنجَيْنَا مُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ أَجْمَعِينَ ﴿٦٥﴾ ثُمَّ أَغْرَقْنَا ٱلْـَٔاخَرِينَ ﴿٦٦﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٦٧﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٦٨﴾﴾.

﴿قَالَ نَعَمْ﴾ (واتە: گوتی بەڵێ) کرێو پاداشتان دەدەمەوە، ﴿وَإِنَّكُمْ إِذًا لَّمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ﴾ (واتە: بێگومان ئێوە سەرەڕای ئەوە دەبنە کەسانێکی نزیکی من)، پەیمانی پێدان بە پاداشتو نزیک کردنەوەیان لێی، بۆ ئەوەی چالاکیان زیاتر بێتو هەرچی لە توانایاندا هەیە بەکاری بهێنن بۆ دژایەتی مووسا.

کاتێ کۆبوونەوە لە کاتی دیاریکراودا، ئەوانو مووساو خەڵکی میسر، مووسا ﷺ ئامۆژگاری کردنو یادی خستنەوە، وە وتی: ﴿وَيْلَكُمْ لَا تَفْتَرُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا فَيُسْحِتَكُم بِعَذَابٍ ۖ وَقَدْ خَابَ مَنِ ٱفْتَرَىٰ ﴿٦١﴾﴾طه، (واتە: هاوار بۆ ئێوە درۆ بە دەم خواوە نەکەن ئەگینا بە سزایەک لە ناوتان دەبات بە ڕاستی هەرکەسێ درۆ هەڵبەستێ بە دەم خواوە ڕەنجەڕۆ دەبێ) کەوتنە مشتومڕو دەمەدەمێ لە ناو یەکتردا، پاشان فیرعەون هانی دانو غیرەتی داوە بەریان، وە هەندێکیان هانی هەندێکی دیکەیاندا.

﴿قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلْقُوا۟ مَآ أَنتُم مُّلْقُونَ﴾ واتە: چیتان هەیە فڕێی بدەن، شتێکی نەبەستەوە بە شتێکی دیکە، چونکە سوور بوو لەسەر بەتاڵی ئەوەی ئەوان هێناویانە لە ڕووبەڕوو بوونەوەی حەق ﴿فَأَلْقَوْا۟ حِبَالَهُمْ وَعِصِيَّهُمْ﴾ (واتە: ئەوانیش هەرچی پەتو گوریسو فڕێیاندا) لە ناکاو بوون بە کۆمەڵە مارێک ڕێیان دەکرد، بەو شێوەیە جادوویان لە چاوی خەڵکەکە کرد ﴿وَقَالُوا۟ بِعِزَّةِ فِرْعَوْنَ إِنَّا لَنَحْنُ ٱلْغَٰلِبُونَ﴾ (واتە: وە وتیان بە یارمەتیو دەسەڵاتی فیرعەون ئێمە سەردەکەوین)، پشتیان بەست بە عیزەتو دەسەڵاتی بەندەیەکی لاوازی بێتوانا لە هەموو ڕوویەکەوە، تەنها ئەوە نەبێ ئەو ستەمکارو سەرکەش بوو، وە سەربازوو خەڵکێکی زۆری لە دەوروبەر بوو، ئەو دەسەڵاتو سەرکەشیەی فیرعەون خەڵەتاندنیو خەڵەفاندنی، عەقڵو هۆشیان نەدەکرایەوە بۆ حەقیقەتی کارەکە، یان ئەمە سوێندێک بوو لە لایەن ئەوانە بە عیزەتی فیرعەون، کە بێگومان هەر سەرکەوتوو دەبن.

﴿فَأَلْقَىٰ مُوسَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ تَلْقَفُ﴾ (واتە: ئنجا مووسا ﷺ گۆچانەکەی فڕێدا) جا کتو پڕ خواردیو قووتیدا، ﴿مَا يَأْفِكُونَ﴾ هەرچی گوریسو داریان بوو هەڵیلوشی، چونکە درۆو هەڵبەستراو بوو، ئەوانە هەموو بەتاڵو پووچن، ڕووبەڕووی هەق نابنەوەو بەرگری ناکەن.

کاتێ جادووگەرەکان ئەو نیشانە مەزنەیان لە مووسا بینی دڵنیا بوون -چونکە زانیان- ئەمە جادوو نیە، بەڵکو ئایەتو نیشانەیەکە لە ئایەتەکانی خوا، وە موعجیزەیەکە ڕاستی مووساو ڕاستی ئەو پەیامەی هێناویەتی دەردەخات.
﴿ فَأُلْقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ﴾ (واتە: ئەوسا هەموو جادووگەران کەوتن بە ڕووداو سوژدەیان برد) بۆ پەروەردگاریان ﴿ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٤٧ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴾ (واتە: وتیان بڕوامان هێنا بە پەروەردگاری جیهانیان * پەروەردگاری مووساو هاروون)، لەو شوێنەدا بەتاڵو پووچ لەناو چوو، گەورەکانیان دانیانا بە پووچیدا، حەقو ڕاستی دەرکەوتو ئاشکرا بوو، تەنانەت خەڵکی بە چاوی خۆیان بینیان، بەڵام فیرعەون نەیویست تەنها یاخی بوونو گومڕاییو ڕۆچوون لە عینادیدا نەبێ، جا فیرعەون گوتی: ﴿ ءَامَنتُمۡ لَهُۥ قَبۡلَ أَنۡ ءَاذَنَ لَكُمۡ ﴾ (واتە: ئایا بڕواتان پێی هێنا پێش ئەوەی مۆڵەت لە من وەربگرن)؟! سەری سوڕما، وە سەری سوڕما لە گەلەکەی چۆن بەبێ مۆڵەتی ئەو بڕوا دەهێنن، وتی: ﴿ إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِي عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحۡرَ ﴾ (واتە: بە ڕاستی ئەو مووسا جادووگەرە گەورەکەتانە کە فێری جادووی کردوون).
فیرعەون خۆی جادووگەرەکانو دەسەڵاتدارەکانی کۆکردەوە، ئەوانەی ئاماژەیان بۆی کرد هەموو جادووگەرەکان لە شارو شارۆچکەکان کۆبکاتەوە، باش دەیانزانی جادوو گەرەکان مووسایان نەدەناسیو پێشتر لەگەڵیدا کۆنەبوونەتەوە، وە نەیانیش بینیوە، جادووگەرەکان جادوویەکیان هێنا بینەری سەرسام دەکردو تووشی شۆکی دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا، دانیان نا بە شکستو پووچی ئەو چاوبەستەی کردیان لە خەڵکی، بە لای کەسی ژیرو عاقڵەوە جێگای سەرسوڕمان نیە، کە بڕوانەهێنن بەو ئایەتە ڕونو ئاشکرایانە، چونکە ئەگەر فیرعەون هەر شتێکی پێیان بوتایە کە پێچەوانەی حەقو ڕاستی بووایە ئەوان بڕوایان پێدەکرد.
ئنجا هەڕەشەی لە جادووگەرەکان کرد ﴿ لَأُقَطِّعَنَّ أَيۡدِيَكُمۡ وَأَرۡجُلَكُم مِّنۡ خِلَٰفٖ ﴾ واتە: دەستی ڕاستو قاچی چەپ، وەک چۆن کەسێک فەسادی لەسەر زەویدا بکات پێی دەکرێ ﴿ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴾ (بێگومان هەمووتان هەڵدەواسم) بۆ ئەوەی ڕیسواو سووکو زەلیل بن.
جادووگەرەکانیش گوتیان دوای ئەوەی چێژی ئیمانیان وەرگرت، (وتیان:) ﴿ لَا ضَيۡرَ ﴾ واتە: گوێی پێنادەین هەر هەڕەشەیەکمان لێبکەی، ﴿ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ ٥٠

﴿ إِنَّا نَطۡمَعُ أَن يَغۡفِرَ لَنَا رَبُّنَا خَطَٰيَٰنَآ ﴾ (واتە: چونکە بە ڕاستی ئێمە گەڕانەوەمان بۆ لای پەروەردگارمانە * بەڕاستی ئێمە بە تەمایین‌و ئومێدی دەکەین کە پەروەردگارمان لە گوناهەکانمان ببوورێ) لە کوفرو جادوو کردن‌و جگە لەوانەش ﴿ أَن كُنَّآ أَوَّلَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾ (واتە: چونکە ئێمە یەکەمی بڕواداران بووین)، بە مووسا ﷺ لەو سەربازانە، خوا ﷻ جێگیرو خۆڕاگری کردن.

دەگونجێ فیرعەون ئەو هەڕەشەیەی بەسەریاندا جێبەجێ کردبێ، بە هۆی ئەوەی ئەو کاتە خاوەن دەسەڵات‌و هێزو توانا بوو، وە دەگونجێ خوا ﷻ ڕێگری لێکردبێ.

پاشان فیرعەون‌و گەلەکەی هەر بەردەوام بوون لەسەر کوفرو سەرکێشی، مووسا ﷺ نیشانەو بەڵگەیەکی ڕوونی بۆ دەهێنان، هەرکاتێ نیشانەیەکیان بۆ بهاتایە، وە بگەشتنایەتە نارەحەتی پەیمانیان دەدا بە مووسا ﷺ ئەگەر خوا ﷻ لەسەریان لای ببا بڕوای پێدەهێنن‌و نەوەکانی ئیسرائیلیشی لەگەڵدا دەنێرن، خوا ﷻ لەسەری هەڵدەگرتن، پاشان پەیمانەکەیان دەشکاند، کاتێ مووسا ﷺ بێئومێد بوو لە بڕواهێنانیان، و سزای خوایان لەسەر پێویست بوو، کاتی ئەوە هات نەوەکانی ئیسرائیل خوا ﷻ لە دیلی ئازادیان بکات‌و دەسەڵاتیان پێ بدا لەسەر زەویدا، خوا ﷻ وەحی‌و نیگای کرد بۆ مووسا ﷺ: ﴿ أَنۡ أَسۡرِ بِعِبَادِيٓ ﴾ واتە: شەوڕۆیی بە نەوەکانی ئیسرائیل بکە، با بە پەنهان خۆیان دەربکەن ﴿ إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ ﴾ واتە: فیرعەون‌و سەربازەکانی بەم نزیکانە شوێنتان دەکەون، هەروەک چۆن خوا ﷻ هەواڵی پێدان بەو شێوەیە ڕوویدا، ئەوان کاتێ بەیانیان کردەوە تەماشایان کرد نەوەکانی ئیسرائیل لەگەڵ مووسادا ﷺ شەوڕۆییان کردوە.

﴿ فَأَرۡسَلَ فِرۡعَوۡنُ فِي ٱلۡمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴾ واتە: (ئەوسا فیرعەون) پیاوانی کۆکردەوە، بۆ ئەوەی بەنی ئیسرائیل بگرێ، هانی گەلەکەی دەداو دەیوت: ﴿ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ ﴾ واتە: نەوەکانی ئیسرائیل ﴿ لَشِرۡذِمَةٞ قَلِيلُونَ ٥٤ وَإِنَّهُمۡ لَنَا لَغَآئِظُونَ ﴾ (واتە: کۆمەڵێکی کەمی بێنرخن * وە بە ڕاستی ئەوانە ڕقی ئێمە هەڵدەسێنن) ئێمەش دەمانەوێ توورەیی خۆمان بەتاڵ بکەینەوە لەو کۆیلانەی لامان ماوەتەوە.

﴿ وَإِنَّا لَجَمِيعٌ حَٰذِرُونَ ﴾ واتە: ئاگادارین لە هەموو پیلانەکانیان، ئەوان دوژمنی هەموومانن، وە بەرژەوەندیەکانمان یەکە، جا فیرعەون‌و سەربازەکانی دەرچوون بەهێزێکی مەزن‌و جاڕدانێکی گشتی، هیچ کەسیان لێ بەجێنەما، مەگەر کەسێ نەبێ عوزرو بیانووی بێتوانایی هەبێ.

خـوای بەرز فەرموویەتـی: ﴿ فَأَخْرَجْنَٰهُم مِّن جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴾ واتە: (فیرعـەونو تاقمەکەیمان دەرکـرد) لە بـاخو کانیاوو کشـتووکاڵو زەویو زارەکانیـان، ﴿ وَكُنُوزٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴾ واتە: وە دەرمانکـردن لـەو هەمـوو گەنجینـەو کۆشـکە زۆر جـوانو چاکانـە، کـە هـەر کـەس تەماشـای بکردایە سـەری سـووڕدەماو بیری لێدەکردەوە، سـاڵانێکی زۆر لەززەتو خۆشیان لـە کوفـرو عینادیو لـووت بەرزی بینـی بەسـەر بەندەکاندا.

﴿ كَذَٰلِكَ وَأَوْرَثْنَٰهَا ﴾ واتـە: (ئـا بـەو جـۆرە لـە ناومان بـردن) ئـەو هەموو بـاخو باخاتو کشـتووکاڵو شـوێنە خـۆشو سەرنجراکێشـانە ﴿ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴾ واتـە: (بەخشـیمان بـە نەوەکانـی ئیسـرائیل) ئەوانـەی کرابوونـە خزمەتکارو کاری گـرانو قورسـیان پێدەکردن، پاکـی بـۆ ئـەو خوایـەی موڵکو دەسـەڵاتی دەبەخشـێ بە هەر کەسـێک خۆی بیـەوێ، وە لێیشـی وەردەگرێتـەوە بـە ویسـتی خـۆی، عیزەتی پێدەدا بە ویسـتی خـۆی بـە گوێڕایەڵی کردنـی، وە زەلیلـی دەکا بە ویسـتی خـۆی ئەو کەسـەی سـەرپێچی دەکات.

﴿ فَأَتْبَعُوهُم مُّشْرِقِينَ ﴾ واتـە: گەلەکەی فیرعەون شـوێنی گەلەکەی مووسـا ﷺ کەوتن کاتـی خۆرهەڵاتـن، کەوتبوونە شـوێنیان زۆر بە تووڕەییو خەشـمو قینەوە،

فَلَمَّا تَرَٰٓءَا ٱلۡجَمۡعَانِ قَالَ أَصۡحَٰبُ مُوسَىٰٓ إِنَّا لَمُدۡرَكُونَ ٦١
قَالَ كَلَّآۖ إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهۡدِينِ ٦٢ فَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنِ
ٱضۡرِب بِّعَصَاكَ ٱلۡبَحۡرَۖ فَٱنفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرۡقٖ كَٱلطَّوۡدِ ٱلۡعَظِيمِ
٦٣ وَأَزۡلَفۡنَا ثَمَّ ٱلۡأٓخَرِينَ ٦٤ وَأَنجَيۡنَا مُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ أَجۡمَعِينَ
٦٥ ثُمَّ أَغۡرَقۡنَا ٱلۡأٓخَرِينَ ٦٦ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗۖ وَمَا كَانَ
أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ ٦٧ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ٦٨
وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ إِبۡرَٰهِيمَ ٦٩ إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوۡمِهِۦ مَا تَعۡبُدُونَ
٧٠ قَالُواْ نَعۡبُدُ أَصۡنَامٗا فَنَظَلُّ لَهَا عَٰكِفِينَ ٧١ قَالَ هَلۡ
يَسۡمَعُونَكُمۡ إِذۡ تَدۡعُونَ ٧٢ أَوۡ يَنفَعُونَكُمۡ أَوۡ يَضُرُّونَ ٧٣ قَالُواْ
بَلۡ وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا كَذَٰلِكَ يَفۡعَلُونَ ٧٤ قَالَ أَفَرَءَيۡتُم مَّا كُنتُمۡ
تَعۡبُدُونَ ٧٥ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُمُ ٱلۡأَقۡدَمُونَ ٧٦ فَإِنَّهُمۡ عَدُوّٞ لِّيٓ
إِلَّا رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٧٧ ٱلَّذِي خَلَقَنِي فَهُوَ يَهۡدِينِ ٧٨ وَٱلَّذِي هُوَ
يُطۡعِمُنِي وَيَسۡقِينِ ٧٩ وَإِذَا مَرِضۡتُ فَهُوَ يَشۡفِينِ ٨٠ وَٱلَّذِي
يُمِيتُنِي ثُمَّ يُحۡيِينِ ٨١ وَٱلَّذِيٓ أَطۡمَعُ أَن يَغۡفِرَ لِي خَطِيٓـَٔتِي
يَوۡمَ ٱلدِّينِ ٨٢ رَبِّ هَبۡ لِي حُكۡمٗا وَأَلۡحِقۡنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ ٨٣

﴿ فَلَمَّا تَرَٰٓءَا ٱلۡجَمۡعَانِ ﴾ واته: دوو كۆمه‌ڵه‌كه چاویان به یه‌كتری كه‌وت ﴿ قَالَ أَصۡحَٰبُ مُوسَىٰٓ ﴾ گومانیان به موسا ﷺ هه‌بوو زۆر خه‌مبارو دڵته‌نگ بوون، وتیان: ﴿ إِنَّا لَمُدۡرَكُونَ ﴾ (واته: بێگومان ئێمه ده‌سبه‌سه‌ر كراوین) جا ﴿ قَالَ ﴾ مووسا ﷺ به دڵنیاییه‌وه هه‌واڵی پێدان به په‌یمانی راسته‌قینه‌ی په‌روه‌ردگاری‌و وتی: ﴿ كَلَّآۖ ﴾ واته: نه‌خێر، كاره‌كه به‌و شێوه‌یه نیه كه پێتان وایه ده‌ستبه‌سه‌ر كراون ﴿ إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهۡدِينِ ﴾ (واته: بێگومان من په‌روه‌ردگارم له‌گه‌ڵه دڵنیابن ڕێنمایم ده‌كات) بۆ ئه‌وه‌ی من‌و ئێوه‌ش رزگارمان بێ.

﴿ فَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱضۡرِب بِّعَصَاكَ ٱلۡبَحۡرَ ﴾ مووسا ﷺ دای له ده‌ریاكه ﴿ فَٱنفَلَقَ ﴾ ده‌ریاكه له‌ت بوو، به دوازده ڕێگا ﴿ فَكَانَ كُلُّ فِرۡقٖ كَٱلطَّوۡدِ ﴾ (واته: هه‌ر له‌تێكی) وه‌ك شاخێكی ﴿ ٱلۡعَظِيمِ ﴾ (گه‌وره وابوو) مووساو گه‌له‌كه‌ی چوونه نێویه‌وه.

﴿ وَأَزۡلَفۡنَا ثَمَّ ﴾ (واته: ئه‌وانی ترمان نزیك كرده‌وه) له‌و شوێنه ﴿ ٱلۡأٓخَرِينَ ﴾ واته: فیرعه‌ون‌و گه‌له‌كه‌ی نزیكمان كردنه‌وه، وه خستمانه نێو ئه‌و ڕێگایه‌ی كه مووساو گه‌له‌كه‌ی پێیدا تێپه‌ر ده‌بوون.

﴿ وَأَنجَيۡنَا مُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ أَجۡمَعِينَ ﴾ (واته: جا مووساو هه‌موو ئه‌وانه‌ی له‌گه‌ڵی بوون رزگارمان كردن)و به ته‌واوه‌تی له ده‌ریاكه ده‌رچوون، هیچ كه‌سێكیان لێ به‌جێ نه‌ما.

﴿ ثُمَّ أَغۡرَقۡنَا ٱلۡأٓخَرِينَ ﴾ (واته: ئه‌وانی ترمان نووقم كرد) هیچ كه‌سێكیان له خنكان رزگاری نه‌بوو، ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗۖ ﴾ به‌ڵگه‌یه‌كی مه‌زن له‌سه‌ر راستی ئه‌و په‌یامه‌ی مووسا ﷺ هێناویه‌تی، وه به‌تاڵی‌و پووچی ئه‌وه‌ی فیرعه‌ون‌و گه‌له‌كه‌ی له‌سه‌ری بوون ﴿ وَمَا كَانَ أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ ﴾ (واته: به‌ڵام زۆربه‌یان بروایان نه‌هێنا) له‌گه‌ڵ بوونی ئه‌م هه‌موو به‌ڵگه‌و نیشانانه‌دا كه بڕواهێنان ده‌خوازێ، ئه‌ویش به‌هۆی فه‌سادی‌و پیس‌و

چەپەڵـی دڵەكانیانــەوە ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴾ بــە عیــزەتو دەســەڵاتی كافرو بە درۆدانەرانــی لــە ناوبــرد، وە بــە ڕەحمەتو بەزەیــی خۆی مووســاو شــوێنكەوتووانی ڕزگار كرد.

(٦٩-١٠٤): ﴿ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ إِبۡرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾ إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوۡمِهِۦ مَا تَعۡبُدُونَ ﴿٧٠﴾ قَالُواْ نَعۡبُدُ
أَصۡنَامًا فَنَظَلُّ لَهَا عَٰكِفِينَ ﴿٧١﴾ قَالَ هَلۡ يَسۡمَعُونَكُمۡ إِذۡ تَدۡعُونَ ﴿٧٢﴾ أَوۡ يَنفَعُونَكُمۡ أَوۡ يَضُرُّونَ ﴿٧٣﴾
قَالُواْ بَلۡ وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا كَذَٰلِكَ يَفۡعَلُونَ ﴿٧٤﴾ قَالَ أَفَرَءَيۡتُم مَّا كُنتُمۡ تَعۡبُدُونَ ﴿٧٥﴾ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُمُ
ٱلۡأَقۡدَمُونَ ﴿٧٦﴾ فَإِنَّهُمۡ عَدُوٌّ لِّيٓ إِلَّا رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٧٧﴾ ٱلَّذِي خَلَقَنِي فَهُوَ يَهۡدِينِ ﴿٧٨﴾ وَٱلَّذِي هُوَ
يُطۡعِمُنِي وَيَسۡقِينِ ﴿٧٩﴾ وَإِذَا مَرِضۡتُ فَهُوَ يَشۡفِينِ ﴿٨٠﴾ وَٱلَّذِي يُمِيتُنِي ثُمَّ يُحۡيِينِ ﴿٨١﴾ وَٱلَّذِيٓ
أَطۡمَعُ أَن يَغۡفِرَ لِي خَطِيٓـَٔتِي يَوۡمَ ٱلدِّينِ ﴿٨٢﴾ رَبِّ هَبۡ لِي حُكۡمًا وَأَلۡحِقۡنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ
﴿٨٣﴾ وَٱجۡعَل لِّي لِسَانَ صِدۡقٖ فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ﴿٨٤﴾ وَٱجۡعَلۡنِي مِن وَرَثَةِ جَنَّةِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٨٥﴾ وَٱغۡفِرۡ لِأَبِيٓ إِنَّهُۥ كَانَ
مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٨٦﴾ وَلَا تُخۡزِنِي يَوۡمَ يُبۡعَثُونَ ﴿٨٧﴾ يَوۡمَ لَا يَنفَعُ مَالٞ وَلَا بَنُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا مَنۡ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلۡبٖ سَلِيمٖ
﴿٨٩﴾ وَأُزۡلِفَتِ ٱلۡجَنَّةُ لِلۡمُتَّقِينَ ﴿٩٠﴾ وَبُرِّزَتِ ٱلۡجَحِيمُ لِلۡغَاوِينَ ﴿٩١﴾ وَقِيلَ لَهُمۡ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡ تَعۡبُدُونَ ﴿٩٢﴾ مِن
دُونِ ٱللَّهِ هَلۡ يَنصُرُونَكُمۡ أَوۡ يَنتَصِرُونَ ﴿٩٣﴾ فَكُبۡكِبُواْ فِيهَا هُمۡ وَٱلۡغَاوُۥنَ ﴿٩٤﴾ وَجُنُودُ إِبۡلِيسَ أَجۡمَعُونَ ﴿٩٥﴾
قَالُواْ وَهُمۡ فِيهَا يَخۡتَصِمُونَ ﴿٩٦﴾ تَٱللَّهِ إِن كُنَّا لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ﴿٩٧﴾ إِذۡ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٩٨﴾
وَمَآ أَضَلَّنَآ إِلَّا ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴿٩٩﴾ فَمَا لَنَا مِن شَٰفِعِينَ ﴿١٠٠﴾ وَلَا صَدِيقٍ حَمِيمٖ ﴿١٠١﴾ فَلَوۡ أَنَّ لَنَا كَرَّةٗ فَنَكُونَ مِنَ
ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٠٢﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗۖ وَمَا كَانَ أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿١٠٣﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٤﴾ ﴾:

﴿ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ إِبۡرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾ إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوۡمِهِۦ مَا تَعۡبُدُونَ ﴾ تــا كۆتایــی ئــەم چیرۆكــە كــە دەفەرمــوێ: ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴾ واتــە: ئــەی موحەممــەد ﷺ بخوێنــەرەوە بەســەر خەڵكیــدا هەواڵــی ئیبراهیمــی خەلیل، كــە هەواڵێكی مــەزنو گەورەیە، بــە تایبــەت لــەم حاڵەتــەدا، ئەگەرنــا هەواڵــی دیكــەی زۆری هەیە، بــەڵام لــە گرنگترینو سەرســووڕهێنەرترینو چاكتریــن هەواڵەكانی، ئــەم هەواڵەیە كــە پێغەمبەرایەتیو بانگەوازی گەلەكــەیو مشــتومڕ لەگەڵیانــداو بەتاڵ بوونەوەو پووچــی ئەوەی ئەوان لەســەری دەڕۆن لە خۆدەگــرێ، ئــا لەبەرئەمەیــە بەســتوویەتیەوە بــە (الظرف) فەرموویەتی:

(٧٠): ﴿ إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوۡمِهِۦ مَا تَعۡبُدُونَ ﴾؟ (واتــە: كاتــێ بــە باوكــیو گەلەكــەی گوت: چی دەپەرســتن) بە شــانازی كــردن بــە بەندایەتــی كردنیانەوە:

(٧١): ﴿ قَالُواْ نَعۡبُدُ أَصۡنَامٗا ﴾ (وتیان:) بتانێک دەپەرســتینو بەدەســتی خۆمان دەیانتاشــینو دروســتیان دەكەیــن، ﴿ فَنَظَلُّ لَهَا عَٰكِفِينَ ﴾ واتــە: بەردەوامین لەســەر بەندایەتــی كردنیان

لـە زۆربـەی کاتەکانمانـدا، ئیبراهیـم ؈ بۆ ئەوەی ڕوونـی بکاتەوە کە ئەو بتانە شایسـتەی پەرسـتن نین پێـی وتن:
(٧٢): ﴿ هَلْ يَسْمَعُونَكُمْ إِذْ تَدْعُونَ ﴾ واتـە: (ئایـا گوێیـان لێتانـە) تـا داواو نزاکانتـان لـێ وەربگـرن‌و ناخۆشـیەکانتان لەسـەر لاببـەن؟
(٧٣): ﴿ أَوْ يَنفَعُونَكُمْ أَوْ يَضُرُّونَ ﴾ (واتـە: یـان ئایـا ئەوان سـوودو زیانتـان پێدەگەیەنن؟) دانیـان بەوەدانـا هەمـوو ئەوانـە لـەو پەرسـتراوانەدا نیـن، نەدەبیسـتن، نەسـوود دەگەیەنن، نـە زیـان لادەبـەن، وە لەبەرئەمـە کاتـێ شـکاندنی گوتـی: ﴿ بَلْ فَعَلَهُ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا فَاسْأَلُوهُمْ إِن كَانُوا يَنطِقُونَ ﴿٦٣﴾ ﴾الأنبیاء، (واتـە: (ئیبراهیـم) وتی: نەخێـر بەڵکو ئەم بتـە گەورەیـان ئەمەی کـردوە دە پرسـیار لەوانە (بتە شـکاوەکان) بکەن ئەگەر ئەوانە قسـە دەکـەن)، بە ئیبراهیمیـان وت: ﴿ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا هَٰؤُلَاءِ يَنطِقُونَ ﴿٦٥﴾ ﴾الأنبیاء، (واتە: بـە ڕاسـتی تـۆ دەتزانی ئـەو بتانـە قسـە ناکـەن) واتـە: ئەمـە شـتێکی یەکلاکەرەوەیە کە ئـەوان ناتوانن قسـە بکـەن، قبووڵی گومـان‌و ئاڵـۆزی ناکات).
(٧٤): ئەوسـا گەڕانـەوە بـۆ پەیڕەوکردنـی بـاو و باپیرانیـان، جـا وتیـان: ﴿ بَلْ وَجَدْنَا آبَاءَنَا كَذَٰلِكَ يَفْعَلُونَ ﴾ واتـە: (بەڵکـو ئێمـە بـاوو باپیرانمان دیوە ئا بەو شـێوەیان کـردوە) ئێمەش شـوێنیان کەوتویـن‌و ڕێگای ئەوانمـان گرتۆتە بەر، بۆیـە داب‌و نەریتی خۆمان پاراسـتووە، ئیبراهیـم پێـی وتـن: ئێـوەو بـاو و باپیرانتـان بـە تایبـەت لـەم کارەدا قسـە کـردن لەگەڵ هەمووانـدا یەکە.
(٧٥-٧٨): ﴿ أَفَرَأَيْتُم مَّا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ ﴿٧٥﴾ أَنتُمْ وَآبَاؤُكُمُ الْأَقْدَمُونَ ﴿٧٦﴾ فَإِنَّهُمْ عَدُوٌّ لِّي ﴾ (واتـە: ئایـا ئێوە دەزانن چی دەپەرسـتن * ئێـوەو باپیرانی پێشـوەکانتان * بەڕاسـتی هەموو ئەوانـە دوژمنـی منن)، ئەگـەر ئەتوانن بە بچوکترین شـێوە زیانم پێ بگەیەنـن، وە هەرچیش لـە تواناتاندایـە لـە فـرت‌و فێـڵ درێغـی مەکـەن، ﴿ إِلَّا رَبَّ الْعَالَمِينَ ﴿٧٧﴾ الَّذِي خَلَقَنِي فَهُوَ يَهْدِينِ ﴾ (واتـە: جگـە لـە پەروەردگـاری جیهانیـان * کە ئەو منی دروسـت کـردوەو هەر ئەویـش هیدایەتـم دەدات)، ئـەو زاتـە تـاک‌و تەنهایە، بـە نـازو نیعمەتی دروسـتکردن، وە نازونیعمەتـی هیدایـەت‌و ڕێنمایـی، بـۆ بەرژەوەندیە ئاینـی‌و دونیاییەکان، پاشـان هەندێ لە گرنگیەکانـی تایبەت کـردوەو فەرموویەتی:
(٧٩-٨٢): ﴿ وَالَّذِي هُوَ يُطْعِمُنِي وَيَسْقِينِ ﴿٧٩﴾ وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ ﴿٨٠﴾ وَالَّذِي يُمِيتُنِي ثُمَّ يُحْيِينِ ﴿٨١﴾ وَالَّذِي أَطْمَعُ أَن يَغْفِرَ لِي خَطِيئَتِي يَوْمَ الدِّينِ ﴿٨٢﴾ ﴾

خـوا ﷻ تـاکو تەنهایـە بـە هەمـوو ئەوانە، پێویسـتە بـە تەنهایـی بپەرسـترێو گوێڕایەڵی بکرێـت، وە واز لـەو بتانـە بهێنـرێ کـە نـە دەتوانـن شـتێ دروسـت بکـەن، نـە ڕێنمایی دەکـەن، نـە نەخـۆش دەکـەون، نـە شـیفا دەدەن، نـە نەخـۆش دەخـەن، نـە ڕزقو ڕۆزی دەدەن، نـە ئـاوو دەدەن، نـە دەمرێنـن نە زینـدوو دەکەنەوە، نە سـوود بەوانـە دەگەیەنن کە دەیانپەرسـتن بـە لابردنـی ناخۆشـیەکان، نە لـە تاوانـەکان پاکـت دەکەنەوە.

ئەمـە بەڵگەیەکـی یەکلاکـەرەوەو ڕوونـە، نـە ئێـوەو نـە بـاوکـو باپیرەکانتـان ناتوانـن بەرهەڵسـتی بکـەن، ئـەوەش بەڵگەیە لەسـەر ئەوەی کە بەشـدارن لـە گومراییـدا، وە وازتان لـە ڕێگای هیدایەتو ژێـری هێناوە، خـوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَحَآجَّهُۥ قَوۡمُهُۥۚ قَالَ أَتُحَٰٓجُّوٓنِّي فِي ٱللَّهِ وَقَدۡ هَدَىٰنِۚ ﴿٨٠﴾ ﴾ الأنعام، (واتـە: گەلەکـەی ئیبراهیـم دەمەقاڵێیـان لەگـەڵ کـرد، فەرمـووی ئایـا ئێـوە دەمـە دەمێم لەگـەڵ دەکـەن لەبارەی خـواوە کە بـە ڕاسـتی ڕێنمایی منـی کـردوە). پاشـان ئیبراهیـم ﷺ داوای لـە پەروەردگـاری کرد، جـا فەرمووی:

(٨٣): ﴿ رَبِّ هَبۡ لِي حُكۡمٗا ﴾ واتـە: (ئـەی پەروەردگارم) زانسـتی زۆرم پێ ببەخشـە، حوکـمو بڕیـارەکانو حـەڵاڵو حەرامی پـێ بناسـم، وە بڕیاری پێبـدەم لە نێـوان خەڵکیدا، ﴿ وَأَلۡحِقۡنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ ﴾ لـە بـڕا پێغەمبەرەکانی.

وَٱجۡعَل لِّي لِسَانَ صِدۡقٖ فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ٨٤ وَٱجۡعَلۡنِي مِن وَرَثَةِ جَنَّةِ
ٱلنَّعِيمِ ٨٥ وَٱغۡفِرۡ لِأَبِيٓ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ٨٦ وَلَا تُخۡزِنِي يَوۡمَ
يُبۡعَثُونَ ٨٧ يَوۡمَ لَا يَنفَعُ مَالٞ وَلَا بَنُونَ ٨٨ إِلَّا مَنۡ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلۡبٖ
سَلِيمٖ ٨٩ وَأُزۡلِفَتِ ٱلۡجَنَّةُ لِلۡمُتَّقِينَ ٩٠ وَبُرِّزَتِ ٱلۡجَحِيمُ لِلۡغَاوِينَ
٩١ وَقِيلَ لَهُمۡ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡ تَعۡبُدُونَ ٩٢ مِن دُونِ ٱللَّهِ هَلۡ يَنصُرُونَكُمۡ
أَوۡ يَنتَصِرُونَ ٩٣ فَكُبۡكِبُواْ فِيهَا هُمۡ وَٱلۡغَاوُۥنَ ٩٤ وَجُنُودُ إِبۡلِيسَ
أَجۡمَعُونَ ٩٥ قَالُواْ وَهُمۡ فِيهَا يَخۡتَصِمُونَ ٩٦ تَٱللَّهِ إِن كُنَّا لَفِي
ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ٩٧ إِذۡ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٩٨ وَمَآ أَضَلَّنَآ إِلَّا
ٱلۡمُجۡرِمُونَ ٩٩ فَمَا لَنَا مِن شَٰفِعِينَ ١٠٠ وَلَا صَدِيقٍ حَمِيمٖ ١٠١ فَلَوۡ
أَنَّ لَنَا كَرَّةٗ فَنَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١٠٢ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗۖ وَمَا كَانَ
أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ ١٠٣ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ١٠٤ كَذَّبَتۡ
قَوۡمُ نُوحٍ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ١٠٥ إِذۡ قَالَ لَهُمۡ أَخُوهُمۡ نُوحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ١٠٦
إِنِّي لَكُمۡ رَسُولٌ أَمِينٞ ١٠٧ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ١٠٨ وَمَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ
عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ١٠٩ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ
وَأَطِيعُونِ ١١٠ ۞قَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ لَكَ وَٱتَّبَعَكَ ٱلۡأَرۡذَلُونَ ١١١

(٨٤): ﴿وَٱجۡعَل لِّي لِسَانَ صِدۡقٖ فِي ٱلۡأٓخِرِينَ وَأَلۡحِقۡنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ﴾ واتــە: باســکردنی چاکــەو ســتایش کردنــم لەناو گەلەکانــدا بــەردەوام بکــە بــۆ هەمیشــەیی، خــوا نزاکــەی گیــرا کــرد، زانســتو حیکمەتــی پێبەخشــی، کــە پێــی بــووە چاکترینـــی پێغەمبـــەران، وە گەیاندنـــی بــە بــرا پێغەمبەرەکانــیو کــردی بــە خۆشەویســتی قبوولکــراو مــەزنو ستایشــکراو، لەنــاو هەمــوو گەلەکانــداو لــە هەمــوو کاتەکانــدا.

خــوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿وَتَرَكۡنَا عَلَيۡهِ فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ١٠٨ سَلَٰمٌ عَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ ١٠٩ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١١٠ إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١١١﴾ الصافات، (واتــە: وە باســکردنی بــە چاکــەی ئیبراهیمــان لــە نــاو گەلانــی داهاتــوودا هێشــتەوە * ســەلام لەســەر ئیبراهیــم * ئــا بــەو شــێوە پاداشــتی چاکــەکاران دەدەینــەوە * بــە ڕاســتی ئــەو لــە بەنــدە ئیماندارەکانــی ئێمەیــە).

(٨٥): ﴿وَٱجۡعَلۡنِي مِن وَرَثَةِ جَنَّةِ ٱلنَّعِيمِ﴾ واتــە: لــە خەڵکانــی بەهەشــت کــە خــوا کردوویەتــی بەمیــرات بۆیــان، خــوا ﷻ وەڵامــی نزاکــەی دایــەوە، پلــەی بەرز کــردەوە، لــە بەهەشــتەکانی پــڕ لــە نازونیعمەتــدا.

(٨٦): ﴿وَٱغۡفِرۡ لِأَبِيٓ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ﴾ (واتــە: لــە باوکــم خــۆش ببــە بەڕاســتی ئــەو لە گومرایانــە) ئــەم دوعــاو نزایــە بــە هــۆی ئــەو پەیمانــەوە بــوو کــە بــە باوکــی گــوت: ﴿سَأَسۡتَغۡفِرُ لَكَ رَبِّيٓۖ إِنَّهُۥ كَانَ بِي حَفِيّٗا ٤٧﴾ مریم، (واتــە: لەمــەودا داوای لێبوردنــت بــۆ دەکــەم لــە پەروەردگــارم چونکــە بــە ڕاســتی پەروەردگــار لەگەڵمــدا میهرەبانــە)، خــوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿وَمَا كَانَ ٱسۡتِغۡفَارُ إِبۡرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوۡعِدَةٖ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوّٞ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنۡهُۚ إِنَّ إِبۡرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٞ ١١٤﴾ التوبــة، (واتــە: وە داوای لــێ خۆشــبوونی ئیبراهیــم بــۆ باوکــی تەنهــا لەبــەر وادەو بەڵێنێــک بــوو کــە بــە

باوکـی دابـوو داوای لێبوردنـی بـۆ بـکات، جـا کـە بـۆی ڕوون بوویـەوەو دڵنیابـوو باوکـی دوژمنـی خوایـە خـۆی لـێ بـەری کـرد بـە ڕاسـتی ئیبراهیـم زۆر لـە خواترس‌و لەسـەرخۆ بـوو).

(٨٧): ﴿ وَلَا تُخۡزِنِي يَوۡمَ يُبۡعَثُونَ ﴾ واتـە: سەرزەنشـتم مەکـە بـە هـۆی تاوانەکانـەوە، وە سـزادان‌و شـەرمەزاری، بەڵکـو خۆشـبەختم بکـە لـەو ڕۆژەدا کـە:

(٨٨-٨٩): ﴿ لَا يَنفَعُ ﴾ سـوودی نیـە تیایـدا ﴿ مَالٞ وَلَا بَنُونَ إِلَّا مَنۡ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلۡبٖ سَلِيمٖ ﴾ بـە ڕاسـتی تەنهـا ئەمـە سـوودی هەیـە لـە لای تـۆ، وە ئـا ئەمـەی کـە مـرۆڤ ڕزگـار دەکات لـە سـزاو شایسـتەی پاداشـتی بـێ سـنووری دەکات، (بریتیـە لـە دڵێکـی پـاک‌و بێگـەرد).

وە (القلـب السـليم) دڵـی سـاغ‌و پـاک مانـای ئەوەیـە سـەلامەت بـێ لـە هاوبەشـدانان‌و گومـان‌و دوودڵـی‌و حـەز کـردن لـە شـەڕو خراپـە، وە بـەردەوام بـوون لەسـەر بیدعـەو گوناهـەکان، سـەلامەتی دڵ ئـەوە دەخـوازێ وەسـف بکـرێ بـە دژەکانـی، بە دڵسـۆزی‌و زانسـت‌و دڵنیایـی‌و حەزکـردن لـە خێـرو چاکـەو جوانکردنـی لەنـاو دڵیـدا، وە پێویسـتە ئیـرادەو ویسـتی شـوێنی خۆشەویسـتی خـوا ﷻ کەوتبـێ، وە هـەواو ئارەزوویشـی شـوێنی پەیامـی ئیسـلام کەوتبـێ، پاشـان باسـی سـیفەتی ئـەو ڕۆژە مەزنـەی کـردوە، وە ئەوەیشـی تیایدایـە لـە پاداشـت‌و سـزا، جـا فەرموویەتـی:

(٩٠): ﴿ وَأُزۡلِفَتِ ٱلۡجَنَّةُ ﴾ واتـە: (بەهەشـت) نزیـک دەکرێتـەوە ﴿ لِلۡمُتَّقِينَ ﴾ بـۆ ئەوانـەی لـە پەروەردگاریـان دەترسـن، ئەوانـەی فەرمانەکانیـان جێبەجـێ کـردوەو دوورکەوتوونەتـەوە لـە قەدەغەکراوەکانـی، وە خۆیـان پاراسـتووە لەوانـەی دەبنـە مایـەی خەشـم‌و قیـن‌و تۆڵـەی ئـەو.

(٩١): ﴿ وَبُرِّزَتِ ٱلۡجَحِيمُ ﴾ واتـە: دۆزەخیـش دەردەخـرێ‌و ئامـادە دەکـرێ، بـە هەمـوو ئـەو سـزایانەی تیایدایـە ﴿ لِلۡغَاوِينَ ﴾ بـۆ ئـەو گومڕایانـەی ڕۆچـوون لەسـەرپێچی خوادا، وە کەللەڕەقیـان کـردوە بەرانبـەر قەدەغەکراوەکانـی‌و پێغەمبەرەکانیـان بـە درۆ دانـاوە، وە ئـەو پەیامـەی بۆیـان هاتـووە ڕەتیـان کردۆتـەوە.

(٩٢-٩٣): ﴿ وَقِيلَ لَهُمۡ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡ تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ هَلۡ يَنصُرُونَكُمۡ أَوۡ يَنتَصِرُونَ ﴾ واتـە: لـەو پەرسـتراوانەدا هیـچ شـتێکیان تێـدا نەبـوو، وە درۆو ڕیسـوایی‌و سەرشـۆڕیان دەرکـەوت، زەرەرو زیانیـان دەرکـەوت‌و پەشـیمان بوونەوەیـان ئاشـکرا بـوو، هـەوڵ‌و کۆشـش‌و

ماندووبوونیشــیان بەفیــڕۆ چــوو.
(٩٤): ﴿ فَكُبْكِبُواْ فِيهَا ﴾ واتــە: دەخرێنــە نــاو ئاگــرەوە ﴿ هُمْ ﴾ واتــە: پەرســتراوەکانیان ﴿ وَٱلْغَاوُۥنَ ﴾ ئەوانــەی دەیانپەرســتن.
(٩٥): ﴿ وَجُنُودُ إِبْلِيسَ أَجْمَعُونَ ﴾ ســەربازەکانی شــەیتان لــە مــرۆڤو جنۆکــەکان، ئەوانەی هانــی خەڵکیــان دەدا بــۆ ســەرپێچی کــردن، وە شــەیتان زاڵ بــوو بەســەریاندا بــە هــۆی هاوبــەش دانــانو بروانەهێنانیــان، ئەوســا بــوون بــە بانگەشــەکەری ئــەو و هــەوڵو کۆششــیان دەدا لــە پێنــاو ڕەزامەنــدی ئــەودا، ئەوانیــش بەبــەردەوام لەنێــوان گوێڕایەڵــی ئــەو و ملکەچیانــدا بــوون، پەیڕەویــان دەکــردن لەســەر هاوبەشــدانانەکەیان.
(٩٦): ﴿ قَالُواْ ﴾ واتــە: ســەربازە گومڕاکانــی ئیبلیــس، وتیــان بــەو بتانــەی کــە دەیانپەرســتن:
(٩٧-٩٨): ﴿ تَٱللَّهِ إِن كُنَّا لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٩٧﴾ إِذْ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ (واتــە: ســوێند بــە خــوا بەڕاســتی ئێمــە لــە گومڕاییەکــی ئاشــکرادا دەژیایــن * کاتێــک کــە ئێوەمــان دەبــردە ڕیــزی پەروەردگــاری جیهانیــان) لــە پەرســتنو خۆشەویســتیو تــرسو هیــوادا، داوامــان لــە ئێــوە دەکــرد وەک چــۆن داوامــان لــە خــوا دەکــرد، ئــەوکات بــەو جــۆرە گومڕایــی خۆیانیــان بــۆ ڕوون بوویــەوە، دانیــان نــا بــە دادپــەروەری خــوادا لە ســزادانیان، ئــەوان یەکســانیان نەکــردوون لەگــەڵ پەروەردگــاری جیهانیانــدا تەنهــا لــە پەرســتندا نەبــێ، نــەک لــە بەدیهێنانــدا، بــە بەڵگــە قســەکەیان: ﴿ بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ ئــەوان دانیــان بــەوەدا نــاوە خــوا پەروەردگــاری هەمــوو جیهانیانــە، کــە بــتو پەرستراوەکانیشــیان لــە چوارچێــوەی دروســتکراوەکانی ئــەودان.
(٩٩): ﴿ وَمَآ أَضَلَّنَآ ﴾ (ئێمــە کــەس گومــڕای نەکردیــن) لــە ڕێبــازی هیدایــەتو ژیــری، وە بانگیــان کردیــن بــۆ ڕێگــای گومڕاییو ســەرپێچی کــردن، ﴿ إِلَّا ٱلْمُجْرِمُونَ ﴾ ئەوانیــش ئــەو دەســەڵاتدارانە بــوون کــە خەڵکیــان بانــگ دەکــرد بــۆ نــاو ئاگــر.
(١٠٠): ﴿ فَمَا لَنَا ﴾ ئــەو کاتــە ﴿ مِن شَٰفِعِينَ ﴾ تــکاو شــەفاعەتمان بــۆ بــکات، بــۆ ئــەوەی ڕزگارمــان بــکات لــە ســزای.
(١٠١): ﴿ وَلَا صَدِيقٍ حَمِيمٍ ﴾ واتــە: یــان هاوڕێیەکــی دڵســۆز ســوودمان پێبگەیەنــێ بــە کەمتریــن ســوود، هەروەکــو چــۆن نەریــت وابــوو لــە دونیــادا.
بــێ هیــوا بــوون لــە هەمــوو خێرێــک، هەڵخەڵەتێنــران بــەوەی بــە دەســتیان هێنــا، ئاواتی

ئەوەیـان دەخواسـت بگەڕێنـەوە بـۆ ژیانـی دونیـا، بـۆ ئـەوەی کـردەوەی چـاک بکەن.
(١٠٢): ﴿ فَلَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً ﴾ واتـە: (خۆزگـە) دەگەڕاینـەوە بـۆ دونیـاو ژیـان دووبـارە دەبوویـەوە ﴿ فَنَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴾ بـۆ ئـەوەی پارێـزراو بیـن لـە سـزاو شایسـتەی پاداشـت بیـن، زۆر دوورو ئەسـتەمە، بەربەسـت دەخرێتـە نێـوان ئـەوانو ئـەوەی ئـارەزووی دەکـەن، بـە ڕاسـتی دەرگـای درۆیـان بەسـەردا داخـرا.
(١٠٣): ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ ﴾ ئـەوەی کـە بۆمـان بـاس کـردن، ﴿ لَآيَةً ﴾ (پەنـدو بەڵگـەی تێدایـە) بـۆ ئێـوە ﴿ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُمْ مُؤْمِنِينَ ﴾ (واتـە: بـەڵام زۆربەیـان بـڕوادار نەبـوون).
(١٠٤): ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ ﴾: (وە بێگومان پەروەردگارت زاڵی بە بەزەییە).
(١٠٥-١٢٢): ﴿ كَذَّبَتْ قَوْمُ نُوحٍ الْمُرْسَلِينَ (١٠٥) إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ نُوحٌ أَلَا تَتَّقُونَ (١٠٦) إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ (١٠٧) فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ (١٠٨) وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ الْعَالَمِينَ (١٠٩) فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ (١١٠) قَالُوا أَنُؤْمِنُ لَكَ وَاتَّبَعَكَ الْأَرْذَلُونَ (١١١) قَالَ وَمَا عِلْمِي بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ (١١٢) إِنْ حِسَابُهُمْ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّي لَوْ تَشْعُرُونَ (١١٣) وَمَا أَنَا بِطَارِدِ الْمُؤْمِنِينَ (١١٤) إِنْ أَنَا إِلَّا نَذِيرٌ مُبِينٌ (١١٥) قَالُوا لَئِنْ لَمْ تَنْتَهِ يَا نُوحُ لَتَكُونَنَّ مِنَ الْمَرْجُومِينَ (١١٦) قَالَ رَبِّ إِنَّ قَوْمِي كَذَّبُونِ (١١٧) فَافْتَحْ بَيْنِي وَبَيْنَهُمْ فَتْحًا وَنَجِّنِي وَمَنْ مَعِيَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ (١١٨) فَأَنْجَيْنَاهُ وَمَنْ مَعَهُ فِي الْفُلْكِ الْمَشْحُونِ (١١٩) ثُمَّ أَغْرَقْنَا بَعْدُ الْبَاقِينَ (١٢٠) إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُمْ مُؤْمِنِينَ (١٢١) وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ (١٢٢) ﴾
(١٠٥): ﴿ كَذَّبَتْ قَوْمُ نُوحٍ الْمُرْسَلِينَ ﴾ تـا کۆتایـی چیرۆکەکـە، خـوا باسـی بەدرۆدانانـی گەلـی نـووح ﷺ دەکات، بـە پێغەمبەرەکەیـان نـووح ﷺ، وە ئەوەیـش بەرپەرچـی داونەتـەوەو ئەوانیـش بەرپەرچیـان داوەتـەوە، لـە سـەرەنجامی هەموویـان، فەرموویەتـی: ﴿ كَذَّبَتْ قَوْمُ نُوحٍ الْمُرْسَلِينَ ﴾ (واتـە: گەلـی نـووح پێغەمبەرانیـان بـە درۆزن دانـا) هەمـوو پێغەمبـەران، بـە درۆدانانـی نووحیـان دانـا بـە بەدرۆدانانـی سـەرجەم پێغەمبـەران، چونکە هەموویـان یەکدەنـگ بـوون لەسـەر یـەک بانگـەوازو یـەک هـەواڵ، جـا بەدرۆدانانـی یەکێکیـان بـەدرۆ دانانـە بـە پەیامـی پێغەمبـەران، بـە درۆیـان دانـا.
(١٠٦): ﴿ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ ﴾ لـە ڕەچەڵەکـدا ﴿ نُوحٌ ﴾ بۆیـە خـوا ﷻ پێغەمبەرانـی لـە ڕەگـەزو ڕەچەڵەکـی خۆیـان نـاردوە، بـۆ ئـەوەی گوێڕایەڵـی بکـەن، وە لەبـەر ئـەوەی حەقیقـەتو ڕاسـتی بناسـن، پێویسـتیان بـەوە نەبـێ بگەڕێـن بـە دوای ڕەچەڵەکیـدا، نـووح ﷺ بـە نـەرمو نیانیـەوە پێـی فەرمـوون: ﴿ أَلَا تَتَّقُونَ ﴾ (ئایـا) لـە خـوای بـەرزو

مـەزن ناترسـن، واز لـەوە بهێنـن کـە لەسـەری دەڕۆن لـە بەندایەتـی کردنـی بتـەکان، وە بـە دڵسـۆزیەوە بەندایەتـی بـۆ خـوای تـاکو تەنهـا بکـەن.

(١٠٧): ﴿ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴾ جـا بوونـی بـە نێـردارو بـۆ لایـان بـە تایبەتـی، پێویسـتە لەسـەریان ئـەو پەیامـەی بۆیـان دێـت وەربیگـرنو بـڕوای پێبهێنـن، وە سوپاسـگوزاری خـوا بکـەن، لەسـەر ئـەوەی تایبەتـی کـردوون بـە پێغەمبـەر، وە بوونـی بـە ئەمیـنو دەسـتپاک، ئـەوە دەخـوازێ کـە ئـەو لـە خۆیـەوە قسـە هەڵنابەسـتێ بـە نـاوی خـوا، نـە لـە وەحـیو نیگـادا زیـاد دەکاتو نـە کەمیـش، بۆیـە پێویسـتە لەسـەریان هەواڵەکـەی بەڕاسـت دابنێـنو گوێڕایەڵـی فەرمانەکانـی بکـەن.

(١٠٨): ﴿ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴾ لـەوەی فەرمانتـان پێدەکـەمو لـەوەی قەدەغەتـان لـێ دەکـەم، بێگومـان ئەمـە ئـەوە دەخـوازێ ئـەو نێـردراوە بـۆ لایـان ئەمیـنو دەسـتپاکە، لەبـەر ئەمەیـە ڕێکـی خسـتووە بـە (الفـاء) کـە بەڵگەیـە لەسـەر هـۆ. جـا هـۆکاری پێویسـتکەری بـاس کـردوە، پاشـان باسـی لەناوچوونـی بەربەسـتەکانی کـردوە، وەک فەرموویەتـی:

(١٠٩): ﴿ وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ﴾ تـا ئەرکـی سەرشـانتان قـورس بـێ، ﴿ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾ ئومێـدم وایـە بـەوە نزیـک ببمـەوەو پاداشـتی بێپایـان بەدەسـت بهێنـم، بـەڵام هەرچـی ئـاواتو ویسـتی منـە ئامۆژگاریـە بـۆ ئێـوە، گرتنەبـەری ڕێگای ڕاسـتانە.

(١١٠): ﴿ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴾نـووح ﷺ ئەمـەی دووبـارە کردوەتـەوە بـە هـۆی دووبـارە بوونـەوەی بانگـەوازی گەلەکـەیو زۆری مانـەوەی لەناویانـدا، وەکـو خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَامًا ﴿١٤﴾ ﴾العنکبـوت، (واتە: نووح ﷺ هـەزار سـاڵ لەناویانـدا مایـەوە جگـە لـە پەنجـا سـاڵ)، وە فەرموویەتـی: ﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّي دَعَوْتُ قَوْمِي لَيْلًا وَنَهَارًا ﴿٥﴾ فَلَمْ يَزِدْهُمْ دُعَائِي إِلَّا فِرَارًا ﴿٦﴾ ﴾نـوح، (واتـە: ئـەی پەروەردگـارم! مـن گەلەکـەی خۆمـم بانـگ کـرد بـە شـەوو بـە ڕۆژ * وە تـا بانگـم دەکـردن ئـەوان زۆرتـر دوور ئەکەوتنـەوە لێـمو هەڵئەهاتـن). ئەوانیـش بانگەوازەکەیـان ڕەتکـردەوەو بەرهەڵسـتیان کـرد، بـەوەی شایسـتەی ئـەو بەرهەڵسـتیە نەبـوو، جـا وتیـان:

(١١١): ﴿ أَنُؤْمِنُ لَكَ وَاتَّبَعَكَ الْأَرْذَلُونَ ﴾ واتـە: چـۆن شـوێنی تـۆ بکەویـن ئێمـە، نابینین شـوێنکەوتوانت جگـە لـە کەسـانی پەسـتو لاوازو بێتوانـاکان نەبـێ، بـەم جـۆرە لووت

بەرزیـان دەرکـەوت بەسـەر حـەق‌و ڕاسـتیدا، وە نەفامیـان بـە حەقیقەتـەکان، بێگومـان ئـەوان ئەگـەر مەبەسـتیان هـەق بوایـە، دەیانـوت: بۆمـان ڕوون بکـەرەوە ڕاسـتی ئـەوەی هێناوتـە بـەو ڕێگایانـەی کـە پێـی دەگـات.

جـا ئەگـەر بیر بکەنـەوە بـە بیرکردنەوە، بۆیـان دەردەکـەوێ شـوێنکەوتووانی نووح ﷺ بـەرزو بەڕێـزن‌و باشـترینی نـاو خەڵکیـن، خـاوەن عەقـڵ‌و ژیریـن، بـە ڕاسـتی بێنـرخ ئـەو کەسـەیە تایبەتمەنـدی عەقڵـی لـە دەسـتدا بـێ، بەندایەتـی بەردەکانـی پـێ چاکتـرو پەسـەندتر بێـت، وە ڕازی بێـت سـوژدەیان بـۆ ببـات‌و بانگیـان بـکات، وە یاخـی بێـت بـۆ بانگـەوازی پێغەمبەرانـی تـەواو کامـڵ.

تەنهـا بـە قسـەکردنی یەکێـک لـەو دوو دوژمنـە دەربـارەی قسـەی پـڕو پـووچ، خراپی خـاوەن پـووچ دەردەکـەوێ، بـێ ئـەوەی تەماشـای ڕاسـتی بانگەشـەی دوژمنەکـەی بکـرێ.

جـا گەلـی نـووح ﷺ کاتـێ بیسـتمان لێیانـەوە، ئـەوان دەربـارەی ڕەتکردنـەوەی بانگـەوازی نـووح ﷺ وتیـان: ﴿ أَنُؤْمِنُ لَكَ وَٱتَّبَعَكَ ٱلْأَرْذَلُونَ ﴾ بونیـادی قسـەکانیان لەسـەر ئـەم بنەمـا دانـا کـە هەمـوو کـەس فەسـادوو بێمانایـی دەزانـێ‌و ڕەتیدەکاتـەوە، بۆمـان دەرکـەوت بێگومـان ئـەوان گومـڕاو سەرلێشـواوو هەڵـەن، ئەگـەر چـی نیشـانەو ئایەتەکانـی نـووح‌و بانگـەوازە مەزنەکـەی نەبینیـن، کـە ئـەو پـەڕی یەکلابوونـەوەو دڵنیایـی تێدایـە لەسـەر ڕاسـتی ئـەو پەیامـەی کـە هێناویەتـی.

قَالَ وَمَا عِلۡمِي بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١١٢ إِنۡ حِسَابُهُمۡ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّيۖ
لَوۡ تَشۡعُرُونَ ١١٣ وَمَآ أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١١٤ إِنۡ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٞ مُّبِينٞ
١١٥ قَالُواْ لَئِن لَّمۡ تَنتَهِ يَٰنُوحُ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمَرۡجُومِينَ ١١٦ قَالَ
رَبِّ إِنَّ قَوۡمِي كَذَّبُونِ ١١٧ فَٱفۡتَحۡ بَيۡنِي وَبَيۡنَهُمۡ فَتۡحٗا وَنَجِّنِي وَمَن
مَّعِيَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١١٨ فَأَنجَيۡنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ فِي ٱلۡفُلۡكِ ٱلۡمَشۡحُونِ
١١٩ ثُمَّ أَغۡرَقۡنَا بَعۡدُ ٱلۡبَاقِينَ ١٢٠ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗۖ وَمَا كَانَ
أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ ١٢١ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ١٢٢ كَذَّبَتۡ
عَادٌ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ١٢٣ إِذۡ قَالَ لَهُمۡ أَخُوهُمۡ هُودٌ أَلَا تَتَّقُونَ ١٢٤ إِنِّي لَكُمۡ
رَسُولٌ أَمِينٞ ١٢٥ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ١٢٦ وَمَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ
مِنۡ أَجۡرٍۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ١٢٧ أَتَبۡنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ
ءَايَةٗ تَعۡبَثُونَ ١٢٨ وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمۡ تَخۡلُدُونَ ١٢٩
وَإِذَا بَطَشۡتُم بَطَشۡتُمۡ جَبَّارِينَ ١٣٠ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ١٣١
وَٱتَّقُواْ ٱلَّذِيٓ أَمَدَّكُم بِمَا تَعۡلَمُونَ ١٣٢ أَمَدَّكُم بِأَنۡعَٰمٖ وَبَنِينَ
١٣٣ وَجَنَّٰتٖ وَعُيُونٍ ١٣٤ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ
١٣٥ قَالُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡنَآ أَوَعَظۡتَ أَمۡ لَمۡ تَكُن مِّنَ ٱلۡوَٰعِظِينَ ١٣٦

(١١٢-١١٣): نووح عليه السلام فەرمووی: ﴿ وَمَا عِلۡمِي بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١١٢ إِنۡ حِسَابُهُمۡ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّيۖ لَوۡ تَشۡعُرُونَ ﴾ واتە: کردەوەکانیانو لێپرسینەوەیان تەنها لەسەر خوایە، بەڵکو من تەنها ڕاگەیاندنم لەسەرە، ئێوەش واز لەوان بێنن، ئەگەر ئەوەی من هێناومە بۆتان ڕاستە، ئەوە دەستی پێوە بگرنو ملکەچی ببن، هەر کەس بە پێی کردەوەی خۆی.

(١١٤): ﴿ وَمَآ أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾ بێبڕوایان ڕوو ڕەش بن، وەکو ئەوە وایە داوایان کردبێ، نووح عليه السلام (هەژارو بێ تواناکان) لە خۆی دوور بخاتەوە، ئەمەش بە هۆی لووت بەرزیو خۆ بە گەورە زانینیانەوە بوو، بۆ ئەوەی بڕوابێنن، جا فەرمووی: ﴿ وَإِذَا جَآءَكَ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِـَٔايَٰتِنَا فَقُلۡ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡۖ كَتَبَ رَبُّكُمۡ عَلَىٰ نَفۡسِهِ ٱلرَّحۡمَةَ ٥٤ ﴾ الأنعام، (واتە: وە کاتێ ئەوانەی کە بڕوایان هەیە بە ئایەتەکانی ئێمە هاتن بۆلات، ئەوە پێیان بڵێ سڵاوتان لێ بێ، پەروەردگارتان بەزەیيو میهرەبانی لەسەر خۆی پێویست کردوە).

(١١٥): ﴿ إِنۡ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٞ مُّبِينٞ ﴾ واتـە: مـن تەنهـا ترسـێنەرو ڕاگەیەنەرم لە لایـەن خواوە، وە ئامۆژگاریکـەرم بـۆ بەنـدەکان، من لـە کارو باردا هیچم بەدەسـت نیە، بەڵکـو کاروبارەکان تەنهـا بە دەسـتی خوایە.

(١١٦): نـووح عليه السلام بـەردەوام بـوو لەسـەر بانگەوازەکـەی بـە درێژایـی شـەوو ڕۆژ، بـە ئاشـکراو بـە نهێنی، هیچ سـوودی نەبوو لەگەڵیانـدا تەنها ڕاکردن نەبـێ، ﴿ قَالُواْ لَئِن لَّمۡ تَنتَهِ يَٰنُوحُ ﴾ (واتـە: وتیـان ئـەی نووح ئەگـەر وازنەهێنی) لە بانگـەواز کردنت بۆ ئـەوەی ئێمە خـوا بە تەنها بپەرسـتین، ﴿ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمَرۡجُومِينَ ﴾ واتـە: بە خراپترین شـێوە دەتکوژین، بەردبارانـت دەکەیـن، وەکـو چۆن سـەگ دەکوژرێت. ڕیسـوایی بۆ ئەوان، چەندە ناشـرین قیزەونـە ئەو بـەراورد کردنەیـان، ئامۆژگاریکاریکی دەسـپاک بە سـۆزو بەزەیـی بۆیان لە خۆیـان زیاتـر، بـەراورد دەکەن بە خراپترین شـت.

بێگومـان دوای ئـەوەی سـتەمیان تـەواو پـڕ بـوو کوفـرو بێبڕواییـان گەیشـتە ئەوپـەڕی، پێغەمبەرەکەیـان دوعـای لێکـردن بە دوعایـەک دەوری دان، فەرمـووی: ﴿ وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى ٱلْأَرْضِ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ دَيَّارًا ﴿٢٦﴾ ﴾نـوح، (واتـە: ئـەی پەروەردگار! مەهێڵە لەسـەر زەوی هیـچ کەسـێک لە بێبڕوایـان، بێگومان ئەگـەر تۆ وازیان لـێ بهێنیت بەندەکانـی تۆ گومڕا دەکەن).

(١١٧-١١٨): وە لێـرەدا ﴿ قَالَ رَبِّ إِنَّ قَوْمِى كَذَّبُونِ ﴿١١٧﴾ فَٱفْتَحْ بَيْنِى وَبَيْنَهُمْ فَتْحًا ﴾ واتـە: کێ گومڕایـە لـە نێوانمانـدا لە نـاوی بەرە، نـووح ﷺ باش دەیزانی ئـەوان گومڕاو سـتەمکارن، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ وَنَجِّنِى وَمَن مَّعِىَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ (واتە: منو ئـەو بڕوادارانەی لەگەڵمـدان رزگار بکە).

(١١٩) ﴿ فَأَنجَيْنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ فِى ٱلْفُلْكِ ﴾ (واتـە: ئێمـەش نـووحو ئەوانـەی لەگەڵـی بـوون رزگارمـان کـردن) لـە کەشـتیەکە ﴿ ٱلْمَشْحُونِ ﴾ (پـڕ کرابوو) لـە خەڵکیو گیانـداران.

(١٢٠): ﴿ ثُمَّ أَغْرَقْنَا بَعْدُ ﴾ واتـە: (پاشـان خنکاندمانـن) دوای نـووح ﷺ، وە ئەوانـەی لەگەڵیـدا بوون لـە ئیمانداران ﴿ ٱلْبَاقِينَ ﴾ واتـە: هەموو گەلەکـەی، ﴿ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ ﴾ واتە: رزگـار بوونی نووحو شـوێنکەوتووانی، وە لەنـاو چوونی ئەوانـەی بەدرۆیان دانا، ﴿ لَءَايَةً ﴾ بەڵگەیە لەسـەر ڕاسـتگۆی پێغەمبەرەکانمانو ڕاسـتی ئـەو پەیامەی کە هێناویانـە، وە بەتاڵی پووچـی ئـەو بەرنامەیەی دوژمنـە بەدرۆ دانەرەکانیان لەسـەری دەڕۆیشـتن.

(١٢٢): ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ﴾ ئـەو زاتـەی کـە زاڵـە بەسـەر دوژمنانیـدا، هەموویانـی خنکانـدنو نوقمـی کـردن ﴿ ٱلرَّحِيمُ ﴾ (بە بەزەییـە) بەرانبەر دۆسـتەکانی، کاتـێ نووحو شـوێنکەوتووانی لـە خاوەن بـڕوا رزگـار کرد.

(١٢٣-١٤٠): ﴿ كَذَّبَتْ عَادٌ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ هُودٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٢٥﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٢٦﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٢٧﴾ أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ ءَايَةً تَعْبَثُونَ ﴿١٢٨﴾ وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ ﴿١٢٩﴾ وَإِذَا بَطَشْتُم بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ ﴿١٣٠﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٣١﴾ وَٱتَّقُوا۟ ٱلَّذِىٓ أَمَدَّكُم بِمَا تَعْلَمُونَ ﴿١٣٢﴾ أَمَدَّكُم بِأَنْعَٰمٍ وَبَنِينَ ﴿١٣٣﴾ وَجَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٣٤﴾ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٣٥﴾ قَالُوا۟ سَوَآءٌ عَلَيْنَآ أَوَعَظْتَ أَمْ لَمْ تَكُن مِّنَ ٱلْوَٰعِظِينَ ﴿١٣٦﴾ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا خُلُقُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٣٧﴾ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿١٣٨﴾ فَكَذَّبُوهُ فَأَهْلَكْنَٰهُمْ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٣٩﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٤٠﴾ ﴾:

(١٢٣): ﴿ كَذَّبَتۡ عَادٌ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴾ تـا کۆتایـی چیرۆکەکە. واتە: گەلی عـاد پێغەمبەرەکەیان هـوود ﷺ بـە درۆدانـا، جا بـە درۆدانانیـان بەرانبەر بـەو، بـەدرۆ دانانی غەیری ئەویشـە لە پێغەمبـەران، چونکە بانگـەوازی هەموویان یەکە.

(١٢٤): ﴿ إِذۡ قَالَ لَهُمۡ أَخُوهُمۡ ﴾ لـە ڕەچەڵـەک ﴿ هُودٌ ﴾ بـە نـەرمو نیانـیو نواندنـی جوان ﴿ أَلَا تَتَّقُونَ ﴾ (ئێـوە لـە خوا ناترسـن)، واز لە هاوبەشـدانان ناهێنـن، وە بەندایەتی جگە لەو.

(١٢٥): ﴿ إِنِّي لَكُمۡ رَسُولٌ أَمِينٞ ﴾ واتـە: خـوا ﷻ منـی ناردووە بۆ ناوتـان وەک ڕەحمەتێکو یارمەتیدانێـک بۆتـان، مـن ئەمینم خۆتان چـاک ئەوە دەزانن لـە منەوە.

(١٢٦): ﴿ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴾ واتـە: مافـی خـوا بدەن ئەویش ترسـانە لێـی، وە مافی من بـدەن بـە گوێڕایەڵـی کردنم لـەوەی فەرمانتـان پێدەکـەمو ڕێگریتـان لێدەکـەم، ئەمە ئەوە پێویسـت دەکات لەسـەرتان شـوێنم بکـەونو گوێڕایەڵـم بکـەن، هیـچ ڕێگریـەک نیە لە بەردەمتانـدا بۆ بـڕوا هێنان.

(١٢٧): مـن لە بەرانبـەر ڕاگەیاندنی پەیامی خـواو ئامۆژگاریەکانم داوای کرێو پاداشـتتان لـێ ناکـەم، هەتا بەلاتانەوە قـورس بێت ﴿ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ (واتە: پاداشـتی مـن تەنها لای پەروەردگـاری جیهانیانە) ئەو زاتـەی پەروەردەی کردوون بە نـازو نیعمەتی، وە فـەزڵو چاکـەو ڕێـزی خـۆی دابارانـدوە بەسـەریاندا، بـە تایبەت ئـەو نـازو نیعمەتەی دۆسـتەکانیو پێغەمبەرانی پێ پـەروەردە کردوە.

(١٢٨): ﴿ أَتَبۡنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ ﴾ واتـە: لە نێو کێوەکاندا ﴿ ءَايَةٗ ﴾ واتە: نیشـانە ﴿ تَعۡبَثُونَ ﴾ واتـە: ئـەو (شـوێنە بەرزانـە) دروسـت دەکـەن بە بـێ سـوودێک بـۆ بەرژەوەنـدی دینو دنیاتان.

(١٢٩): ﴿ وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ ﴾ واتـە: (کۆشـکو قـەڵای مەحکەمو) حـەوزی گەورەی ئـاو سـاز ئـەدەن ﴿ لَعَلَّكُمۡ تَخۡلُدُونَ ﴾ (واتـە: بـە هیـوای ئـەوەی هەمیشـە بمێننـەوە) لـە کاتێکـدا هیـچ ڕێگایـەک نیـە بـۆ مانەوەی هەمیشـەیی لەسـەر زەویـدا بۆ هیچ کەسـێک.

(١٣٠): ﴿ وَإِذَا بَطَشۡتُم ﴾ (واتـە: وە کاتـێ پەلامـاری) دروسـتکراو دەدەن ﴿ بَطَشۡتُمۡ جَبَّارِينَ ﴾ (واتـە: زۆر دڵڕەقانـە پەلاماریان دەدەن) بە کوشـتنو لێدانو بردنیماڵو سـامان. خـوا ﷻ هێزێکـی مەزنـی پێدا بوون، پێویسـت بوو لەسـەریان ئـەو هێزەیان بـۆ گوێڕایەڵی خـوا بەکاربهێنایـە، بـەڵام ئەوان فەخـرو لووت بەرزیـان نواند، وە وتیـان: ﴿ وَقَالُواْ مَنۡ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً ﴾ فصلت (واتـە: کـێ لـە ئێمە بەهێـز ترو بـە تواناتـرە) هێـزو تواناکانیان لە

سـەرپێچی خـوادا بەکارهێنا، وە لە شـتی پـڕو پووچو گێلیـدا، ئا لەبەر ئەمـە پێغەمبەرەکەیان ئـەوەی لێ قەدەغـە کردن.

(١٣١): ﴿ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ﴾ وە واز لـە هاوبـەش دانـانو لووت بەرزیتـان بهێنن ﴿ وَأَطِيعُونِ ﴾ (گوێڕایەڵیـم بکـەن) کاتـێ زانیتـان من نێـردراوی خـوام بۆ ناوتـان، ئەمینو دەسـتپاکو دڵسۆزتانم.

(١٣٢): ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱلَّذِيٓ أَمَدَّكُم ﴾ واتـە: (لـەو زاتـە بترسـن کـە) پێـی بەخشـیون ﴿ بِمَا تَعۡلَمُونَ ﴾ واتـە: پێبەخشـیون بـەوەی نکوڵـی لێناکـرێ لـەو نـازو نیعمەتانـە.

(١٣٣): ﴿ أَمَدَّكُم بِأَنۡعَٰمٖ ﴾ (واتـە: پێـی بەخشـیون) لـە حوشـترو مانگاو مـەڕ ﴿ وَبَنِينَ ﴾ واتـە: زۆری وەچـە، مـاڵو سـامانی زۆر کـردوون، وە منداڵـی زۆر کـردوون، بـە تایبەت نێرینـەکان، باشـترین ئەو دوو بەشـە.

{(١٣٤): ﴿ وَجَنَّٰتٖ وَعُيُونٍ ﴾ واتـە: هەروەها باخچەو باخاتو کانیو سـەرچاوەی زۆر}، ئەمە یادخسـتنەوەیانە بە نیعمەتەکان، پاشـان یادی خسـتوونەتەوە بە پێویسـت بوونی سـزای خوا، فەرموویەتی:

(١٣٥): ﴿ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ﴾ واتـە: مـن -بـە هۆی سـۆزو میهرەبانیم بـۆ ئێـوە- ئەترسـم سـزای سـەختتان بـۆ داببـەزێ، چونکـە سـزای خـوا ئەگـەر دابـەزی ڕەتناکرێتـەوە، ئەگـەر ئێـوە بـەردەوام بـن لەسـەر کوفـرو گومڕاییتان.

(١٣٦): ئـەوان نکوڵیـان کـرد لە حـەقو پێغەمبەرەکەیان بە درۆدانـاو وتیان: ﴿ سَوَآءٌ عَلَيۡنَآ أَوَعَظۡتَ أَمۡ لَمۡ تَكُن مِّنَ ٱلۡوَٰعِظِينَ ﴾ هەمـووی وەک یـەک وایـە، ئامۆژگاریـت کردبـێ یا نەتکردبـێ. ئەمـە ئەوپەڕی سەرکەشـیە، بێگومان گەلێـک حاڵیان بگاتە ئـەوەی ئامۆژگاری خـوا ﷻ کـە کێـوە کـەڕو بەهێـزەکان دەتوێنێتـەوەو دڵـەکان دادەچەڵەکێنـێو لای ئەوان وەک یـەک وایـە، چونکـە گەلێکن سـتەمکاریو گومڕاییان گەیشـتۆتە ئەوپـەڕی، هەموو ئومێدێـک بـە هیدایەتدانیـان بڕاوەتەوەو کۆتایـی پێهاتووە.

إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا خُلُقُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٣٧﴾ وَمَا نَحۡنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿١٣٨﴾ فَكَذَّبُوهُ
فَأَهۡلَكۡنَٰهُمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗۖ وَمَا كَانَ أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿١٣٩﴾
وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٤٠﴾ كَذَّبَتۡ ثَمُودُ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿١٤١﴾ إِذۡ
قَالَ لَهُمۡ أَخُوهُمۡ صَٰلِحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٤٢﴾ إِنِّي لَكُمۡ رَسُولٌ أَمِينٞ ﴿١٤٣﴾
فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٤٤﴾ وَمَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍۖ إِنۡ أَجۡرِيَ
إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٤٥﴾ أَتُتۡرَكُونَ فِي مَا هَٰهُنَآ ءَامِنِينَ ﴿١٤٦﴾
فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٖ ﴿١٤٧﴾ وَزُرُوعٖ وَنَخۡلٖ طَلۡعُهَا هَضِيمٞ ﴿١٤٨﴾
وَتَنۡحِتُونَ مِنَ ٱلۡجِبَالِ بُيُوتٗا فَٰرِهِينَ ﴿١٤٩﴾ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ
﴿١٥٠﴾ وَلَا تُطِيعُوٓاْ أَمۡرَ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ﴿١٥١﴾ ٱلَّذِينَ يُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ
وَلَا يُصۡلِحُونَ ﴿١٥٢﴾ قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلۡمُسَحَّرِينَ ﴿١٥٣﴾ مَآ أَنتَ
إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا فَأۡتِ بِـَٔايَةٍ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١٥٤﴾ قَالَ
هَٰذِهِۦ نَاقَةٞ لَّهَا شِرۡبٞ وَلَكُمۡ شِرۡبُ يَوۡمٖ مَّعۡلُومٖ ﴿١٥٥﴾ وَلَا تَمَسُّوهَا
بِسُوٓءٖ فَيَأۡخُذَكُمۡ عَذَابُ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ﴿١٥٦﴾ فَعَقَرُوهَا فَأَصۡبَحُواْ
نَٰدِمِينَ ﴿١٥٧﴾ فَأَخَذَهُمُ ٱلۡعَذَابُۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗۖ وَمَا كَانَ
أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿١٥٨﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٥٩﴾

(١٣٧): لەبەر ئەمەیە وتیان: ﴿ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا خُلُقُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴾ ئەم بارودۆخانەو نازونیعمەتو هاوشێوەی ئەمانە دابو نەریتی پێشینەکانە، جارێک بێنیازو دەوڵەمەند دەبن، جارێکیش هەژار، ژیان هەر بەو شێوەیەیە، نەک ئەمە میحنەتو نارەحەتیو بەخشش بێ لەلایەن خواوە، وە بەڵاو تاقیکردنەوە بێ لەلایەن بەندەکانی.

(١٣٨): ﴿ وَمَا نَحۡنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴾ئەمە نکوولّی کردنیان بوو لە زیندووکردنەوە، یان دادەبەزێ لەگەڵ پێغەمبەرەکەیانداو گاڵتەی پێدەکەن، گریمان ئێمە ئەگەر زیندوویش بکرێینەوە ئەوە هەروەک دونیا ژیانمان خۆش دەبێ، واتە:

(١٣٩): ﴿ فَكَذَّبُوهُ ﴾ واتە: بەدرۆدانان بووە پیشەو رەوشتیان، هیچ داچەڵەکینەرێک داینەچەڵەکاندن، ﴿ فَأَهۡلَكۡنَٰهُمۡ ﴾ (لەناومان بردن)، ﴿ وَأَمَّا عَادٞ فَأُهۡلِكُواْ بِرِيحٖ صَرۡصَرٍ عَاتِيَةٖ ﴿٦﴾ سَخَّرَهَا عَلَيۡهِمۡ سَبۡعَ لَيَالٖ وَثَمَٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومٗاۖ فَتَرَى ٱلۡقَوۡمَ فِيهَا صَرۡعَىٰ كَأَنَّهُمۡ أَعۡجَازُ نَخۡلٍ خَاوِيَةٖ ﴿٧﴾ ﴾الحاقة، (واتە: بە بایەکی سەختی ساردی بەتینی بە گرمە * خوا زاڵی کرد بەسەریاندا حەوت شەوو هەشت رۆژ بەبێ وچان ئەو گەلەت لەو ماوەیەدا بێگیان کەوتبوون وەک قەدی دارخورمای گەندەڵ)، ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ ﴾ واتە: لە سەر راستی پێغەمبەرمان هوود ﷺ، وە راستی ئەو پەیامەی بۆی دابەزیوە، وە بەتاڵیو پووچی ئەوەی گەلەکەی لەسەری بوون لە هاوبەشدانانو خۆبەزلزانین، ﴿ وَمَا كَانَ أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ ﴾ لەگەڵ بوونی ئەو ئایەتو نیشانانەدا کە پێویست بوو بڕوایان بهێنایە.

(١٤٠): ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ﴾ ئەو زاتەی بەهێزی خۆی گەلی هوودی لەناوبرد، لەسەرئەوەی گەلێکی بەهێزو بەتوانا بوون ﴿ ٱلرَّحِيمُ ﴾ بەسۆزە بە پێغەمبەرەکەی هوود، چونکە رزگاری کرد ئەوەیشی لەگەڵیدا بوو لە بڕواداران.

(١٤١-١٥٩): ﴿ كَذَّبَتْ ثَمُودُ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٤١﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ صَٰلِحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٤٢﴾ إِنِّى
لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٤٣﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٤٤﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ
ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٤٥﴾ أَتُتْرَكُونَ فِى مَا هَٰهُنَآ ءَامِنِينَ ﴿١٤٦﴾ فِى جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٤٧﴾ وَزُرُوعٍ وَنَخْلٍ طَلْعُهَا
هَضِيمٌ ﴿١٤٨﴾ وَتَنْحِتُونَ مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا فَٰرِهِينَ ﴿١٤٩﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٥٠﴾ وَلَا تُطِيعُوٓا۟ أَمْرَ
ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿١٥١﴾ ٱلَّذِينَ يُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴿١٥٢﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلْمُسَحَّرِينَ ﴿١٥٣﴾ مَآ
أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا فَأْتِ بِـَٔايَةٍ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١٥٤﴾ قَالَ هَٰذِهِۦ نَاقَةٌ لَّهَا شِرْبٌ وَلَكُمْ
شِرْبُ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿١٥٥﴾ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٥٦﴾ فَعَقَرُوهَا فَأَصْبَحُوا۟
نَٰدِمِينَ ﴿١٥٧﴾ فَأَخَذَهُمُ ٱلْعَذَابُ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٥٨﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ
لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٥٩﴾ ﴾:

(١٤١): ﴿ كَذَّبَتْ ثَمُودُ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾ تـا کۆتایـی چیرۆکەکـە، ﴿ كَذَّبَتْ ثَمُودُ ﴾ (ثمودیان بە درۆ دانـا) ئەو هۆزە ناسـراوەی لـە مەدائینی حیجردا دەژیـان، ﴿ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾ صالح ﷺ یان بـە درۆ دانـا، ئـەو پێغەمبەرەی کە بـە یەکتاپەرستی هات بۆ ناویـان، ئەو یەکتاپەرستیەی کـە هەمـوو پێغەمبـەران بانگەشـەیان بۆ دەکرد، جـا بە درۆدانانـی صالح ﷺ بـە درۆدانانی هەمووانە.

(١٤٢): ﴿ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ صَٰلِحٌ ﴾ (کاتـێ صالحـی برایـان پێـی وتن) لـە ڕەچەڵەکدا، بە نـەرمو نیانـیو لەسـەرخۆیی: ﴿ أَلَا تَتَّقُونَ ﴾ (ئەوە ئێوە) لـە خوای بەرز ناترسـن، هاوبەش دادەنێنو سـەرپێچی دەکەن.

(١٤٣): ﴿ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ ﴾ (بـە ڕاسـتی مـن پێغەمبەرێکـم) لـە لایـەن خـواوە پەروەردگارتانـەوە، منـی نـاردوە بـۆ ناوتـان، وەک نـەرمو نیانـی بەزەییـەک بۆتـان، ڕەحمەتەکـەی وەربگـرنو ملکەچـی ببن ﴿ أَمِينٌ ﴾ (دەسـتپاک) ئـەوە دەزانن لـە منەوە، بۆیـە پێویسـتە لەسـەرتان بـڕوام پێبهێنـنو بەوەیشـی کـە هێناومـە.

(١٤٤): ﴿ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴾ (واتە: پارێز لە خوا بکەنو گوێڕایەڵی من بکەن).

(١٤٥): ﴿ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ﴾ تـا بڵێـن: ڕێگریمـان دەکەیـت لـە شـوێنکەوتنی خـۆت، تۆ دەتەوێ ماڵو سـامانەکانمان ببەیـت ﴿ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ واتە: داوای پاداشـت ناکـەم لـە کەس جگـە لە ئـەو نەبێ.

(١٤٦-١٤٨): ﴿ أَتُتْرَكُونَ فِى مَا هَٰهُنَآ ءَامِنِينَ ﴿١٤٦﴾ فِى جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٤٧﴾ وَزُرُوعٍ وَنَخْلٍ طَلْعُهَا هَضِيمٌ ﴾ واتـە: (میـوەی گەیـوو) واتە: وا دەزانـن وازتان لێدەهێنرێ بـۆ خۆتان لە

نــازو نیعمەتــدا چێژ وەربگــرن، هەروەکو چۆن ئــاژەڵ چێــژ وەردەگــرێ، بەهاوەنتە وازتان لێدەهێنــرێ، فەرمانتــان پێناکــرێو قەدەغەتــان لێناکــرێ، بەویســتی خۆتــان ئــەم نیعمەتانە بەکاربهێنــن بۆ ســەرپێچی خوا؟

(١٤٩): ﴿ وَتَنْحِتُونَ مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا فَٰرِهِينَ ﴾ واتــە: گەشــتوونەتە ئــەو خۆشــیەی مــاڵ دروســت دەکــەن لــەو چیاکــەرو پتەوانەدا.

(١٥٠-١٥١): ﴿ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ١٥٠ وَلَا تُطِيعُوٓا۟ أَمْرَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴾ واتــە: ئەوانــەی لــە ســنوور دەرچــوون.

(١٥٢): ﴿ ٱلَّذِينَ يُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴾ واتــە: ئەوانــەی وەســفو پیشــەیان فەســادو خراپەکاریــە لەســەر زەویــدا، بە کــردەوەی ســەرپێچی کــردنو بانگــەواز بۆ لای، خراپەکاریــەک چاکســازی تیایدا نیــە، ئەمە زەرەرترین شــتە، چونکە زیانی تــەواوی تێدایە. ئەوانــە خەڵکانێکیــان تێدا بوو بەرهەڵســتی پێغەمبەرەکەیان دەکرد، بانگەشــەیان بۆ ڕێگاکانی گومڕایــی دەکــرد، صاڵــح ﷺ ڕێگــری لێکــردن لــە لەخۆبایی بــوون پێیان، لەوەیــە ئەوانە بــن خوا ﷻ دەربارەیان فەرموویەتــی: ﴿ وَكَانَ فِى ٱلْمَدِينَةِ تِسْعَةُ رَهْطٍ يُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ٤٨ ﴾النمل، (واتــە: لــەو شــارەی صاڵــح نــۆ کەس هەبــوون لــە زەویدا خراپەکاریــان دەکــرد، بە هیچ جــۆرێ چاکەیان نەدەکــرد)، ئەم قەدەغەکــردنو ئامۆژگاریە هیــچ ســوودێکی پێنەگەیاندن، بــە صاڵحیان گوت:

(١٥٣): ﴿ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلْمُسَحَّرِينَ ﴾ واتــە: جادووت کردوە، شــتێک دەکــەی هیچ مانایەکی نیە.

(١٥٤): ﴿ مَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا ﴾ تــۆ چــی چاکەیەکــت هەیــە بەســەر ئێمــەوە، هەتــا بانگمــان بکەیت بــۆ شــوێنکەوتنت؟ ﴿ فَأْتِ بِـَٔايَةٍ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾ ئەمە، لەگەڵ ئــەوەدا تەنهــا بە تەماشــا کردنی بارودۆخــی، وە حاڵەتی ئــەو پەیامەی بانگەشــەی بۆ کردوە، لــە گەورەترینــی بەڵگە ڕوونەکانە لەســەر ڕاســتی ئەو پەیامــەی کە هێناویەتــی، بەڵام ئەوان بــە هــۆی ڕەقبوونــی دڵەکانیــان، داوای ئایــەتو نیشــانەی پێشــنیاریان کرد، کــە بە زۆری ســەرکەوتوو نابــێ ئــەو کەســەی داوای دەکات، چونکــە داوا کردنەکەی لەســەر نکووڵیو عینــادی بونیــاد نراوە نەک لەســەر ڕێ نشــاندان.

(١٥٥): جــا صاڵــح ﷺ فەرمــووی: ﴿ هَٰذِهِۦ نَاقَةٌ ﴾ (واتــە: ئەمە حوشــترێکە) دەردەچێ لە بەردێکی لووســی کــەڕو لاڵ، هەمووتــان بە چاوی خۆتــان دەیبینن ﴿ لَّهَا شِرْبٌ وَلَكُمْ شِرْبُ

﴿ يَوۡمٍ مَّعۡلُومٍ ﴾ واتــە: ڕۆژێــک ئەو ئــاوی بیرەکە دەخواتــەوە، ئێوەش شــیرەکەی دەخۆنەوە، پاشــان ڕۆژەکــەی تر ئێــوە ئاوی بیرەکــە بخۆنەوە.

(١٥٦): ﴿ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ ﴾ بــە ســەربڕین یان غەیری ســەربڕین، ﴿ فَيَأۡخُذَكُمۡ عَذَابُ يَوۡمٍ عَظِيمٍ ﴾ حوشــترەکە لــە بەردەکــەوە دەرچوو، بەڵام ئــەوان هەر بڕوایان نەهێنــاو بەردەوام بوون لەســەر گومراییان.

(١٥٧-١٥٨): ﴿ فَعَقَرُوهَا فَأَصۡبَحُواْ نَٰدِمِينَ ١٥٧ فَأَخَذَهُمُ ٱلۡعَذَابُ ﴾ (واتــە: کەچــی ئەوان ســەریان بڕی ئەوســا پەشــیمان بوونەوە * ئنجا ســزاو تۆڵــە ئەوانی گــرت) ئەویش دەنگێک بــوو دابــەزی بەســەریاندا هەموویانــی لە ناوبــرد، ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ ﴾ لەســەر ڕاســتی ئەو پەیامــەی پێغەمبەرانمــان هێناویانــە، وە پووچــی قســەی بەرهەڵســتکارەکانیان، ﴿ وَمَا كَانَ أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ ﴾.

(١٥٩): ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴾ (واتــە: بــەڵام زۆربەیــان بــڕوادار نەبــوون * بێگومــان پەروەردگــارت زاڵو بــە بەزەییــە).

كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ ٱلْمُرْسَلِينَ (١٦٠) إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ أَلَا تَتَّقُونَ
(١٦١) إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ (١٦٢) فَٱتَّقُوا ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ (١٦٣) وَمَآ
أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ (١٦٤)
أَتَأْتُونَ ٱلذُّكْرَانَ مِنَ ٱلْعَٰلَمِينَ (١٦٥) وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُم
مِّنْ أَزْوَٰجِكُم بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ (١٦٦) قَالُوا لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَٰلُوطُ
لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُخْرَجِينَ (١٦٧) قَالَ إِنِّي لِعَمَلِكُم مِّنَ ٱلْقَالِينَ (١٦٨)
رَبِّ نَجِّنِي وَأَهْلِي مِمَّا يَعْمَلُونَ (١٦٩) فَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ أَجْمَعِينَ (١٧٠)
إِلَّا عَجُوزًا فِي ٱلْغَٰبِرِينَ (١٧١) ثُمَّ دَمَّرْنَا ٱلْـَٔاخَرِينَ (١٧٢) وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم
مَّطَرًا فَسَآءَ مَطَرُ ٱلْمُنذَرِينَ (١٧٣) إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم
مُّؤْمِنِينَ (١٧٤) وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ (١٧٥) كَذَّبَ أَصْحَٰبُ
لْـَٔيْكَةِ ٱلْمُرْسَلِينَ (١٧٦) إِذْ قَالَ لَهُمْ شُعَيْبٌ أَلَا تَتَّقُونَ (١٧٧) إِنِّي لَكُمْ
رَسُولٌ أَمِينٌ (١٧٨) فَٱتَّقُوا ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ (١٧٩) وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ
مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ (١٨٠) أَوْفُوا ٱلْكَيْلَ وَلَا
تَكُونُوا مِنَ ٱلْمُخْسِرِينَ (١٨١) وَزِنُوا بِٱلْقِسْطَاسِ ٱلْمُسْتَقِيمِ (١٨٢)
وَلَا تَبْخَسُوا ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْا فِي ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ (١٨٣)

(١٦٠-١٧٥): ﴿كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ ٱلْمُرْسَلِينَ
(١٦٠) إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ أَلَا تَتَّقُونَ (١٦١) إِنِّي
لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ (١٦٢) فَٱتَّقُوا ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ (١٦٣)
وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ
رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ (١٦٤) أَتَأْتُونَ ٱلذُّكْرَانَ مِنَ
ٱلْعَٰلَمِينَ (١٦٥) وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُم مِّنْ
أَزْوَٰجِكُم بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ (١٦٦) قَالُوا لَئِن لَّمْ
تَنتَهِ يَٰلُوطُ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُخْرَجِينَ (١٦٧) قَالَ إِنِّي
لِعَمَلِكُم مِّنَ ٱلْقَالِينَ (١٦٨) رَبِّ نَجِّنِي وَأَهْلِي مِمَّا
يَعْمَلُونَ (١٦٩) فَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ أَجْمَعِينَ (١٧٠) إِلَّا
عَجُوزًا فِي ٱلْغَٰبِرِينَ (١٧١) ثُمَّ دَمَّرْنَا ٱلْـَٔاخَرِينَ (١٧٢)
وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا فَسَآءَ مَطَرُ ٱلْمُنذَرِينَ (١٧٣)
إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ (١٧٤)
وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ (١٧٥)﴾:

(١٦١-١٦٨): ﴿كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾ تا کۆتایی چیرۆکەکە، لووط ﷺ پێی وتن: ئەوانیش هەروەکو پێشینی خۆیان وت: دڵەکانیان ڕۆچوو بوو لە کوفرو ڕیسواییدا، بۆیە قسەکانیشیان هاوشێوەی یەک بوو، ئەوان فاحیشەو بەدڕەوشتیەکیان دەکرد هیچ کەس پێشیان نەکەوتبوو لە جیهانیان، ئەوان نیکاحو مارەیی نێرینە بۆ نێرینەیان هەڵبژاردبوو، کە زۆر پیس‌و قیزەونە، وە حەزوو ئارەزوویان لە خێزانەکانیاندا بەکارنەدەهێنا، ئەویش بە هۆی زێدەڕۆیی‌و دوژمنکاریانەوە، نووح ﷺ بەردەوام قەدەغەی لـێ دەکردن هەتا ﴿قَالُوا﴾ بە لووطیان وت: ﴿لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَٰلُوطُ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُخْرَجِينَ﴾ (واتە: ئەی لووط ئەگەر وازنەهێنی بێگومان لە دەرکراوان دەبی لەم شارە) کاتێ لووط بینی بەردەوامن لەسەری ﴿قَالَ إِنِّي لِعَمَلِكُم مِّنَ ٱلْقَالِينَ﴾ (واتە: لووط وتی: من زۆر بێزارم لەو کردەوەتان واتە نێربازی) واتە: زۆر ڕقیان لە لووط بوو، ڕێگریان لێدەکردو خۆیان لـێ دەپاراست.

(١٦٩-١٧١): ﴿رَبِّ نَجِّنِي وَأَهْلِي مِمَّا يَعْمَلُونَ﴾ (واتە: ئەی پەروەردگار خۆم‌و ماڵ‌و منداڵم ڕزگار بکە) لە کردەوەو سزای ئەوان، خوا نزاکەی قبووڵ کرد، ﴿فَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ أَجْمَعِينَ (١٧٠) إِلَّا عَجُوزًا فِي ٱلْغَٰبِرِينَ﴾ (واتە: ئنجا ئێمەش لووطو هەموو خێزانەکەیمان ڕزگار کرد) بێجگە لە پیرە ژنی خێزانی لووط نەبێ ئەویش لەگەڵ ئەواندا مایەوە لە سزادا.

(١٧٢-١٧٣): ﴿ ثُمَّ دَمَّرْنَا ٱلْـَٔاخَرِينَ ﴿١٧٢﴾ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا ﴾ واتە: (پاشان ئەوانی ترمان لە ناو برد * بارانێکمان بەسەریاندا باراند) لە وردە بەردی زیخی گڵین ﴿ فَسَآءَ مَطَرُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴾ هەموویانی لەناو برد تا کۆتایی.

(١٧٤-١٧٥): ﴿ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧٤﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴾ (واتە: بە ڕاستی لەمەدا پەندێکی گەورە هەیە * بەڵام زۆربەیان بڕوادار نەبوون * بێگومان پەروەردگارت زاڵو میهرەبانە).

(١٧٦-١٩١): ﴿ كَذَّبَ أَصْحَـٰبُ لْـَٔيْكَةِ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٧٦﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ شُعَيْبٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٧٨﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٧٩﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٨٠﴾ أَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ وَلَا تَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُخْسِرِينَ ﴿١٨١﴾ وَزِنُوا۟ بِٱلْقِسْطَاسِ ٱلْمُسْتَقِيمِ ﴿١٨٢﴾ وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿١٨٣﴾ وَٱتَّقُوا۟ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلْجِبِلَّةَ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٨٤﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلْمُسَحَّرِينَ ﴿١٨٥﴾ وَمَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا وَإِن نَّظُنُّكَ لَمِنَ ٱلْكَـٰذِبِينَ ﴿١٨٦﴾ فَأَسْقِطْ عَلَيْنَا كِسَفًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿١٨٧﴾ قَالَ رَبِّىٓ أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٨٨﴾ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمْ عَذَابُ يَوْمِ ٱلظُّلَّةِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٨٩﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٩٠﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٩١﴾ ﴾:

(١٧٦): ﴿ كَذَّبَ أَصْحَـٰبُ لْـَٔيْكَةِ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾ (أصحاب لئيكة): خاوەن باخە چڕوپڕەکان، ئەوانیش خەڵکی مەدیەن بوون، پێغەمبەرەکەیان بە درۆزن دانا، ئەو پێغەمبەرەی کە وەکو سەرجەم پێغەمبەران پەیامی خوایی بۆ هێنان.

(١٧٧): ﴿ إِذْ قَالَ لَهُمْ شُعَيْبٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴾ (واتە: شوعەیب پێی وتن ئەرێ ئێوە ناترسن) لە خوای بەرز، واز لەوانە بهێنن کە دەبێتە مایەی تووڕە بوونی خوا، لە کوفرو سەرپێچی کردن.

(١٧٨-١٨٠): ﴿ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴾ (واتە: بەڕاستی من پێغەمبەرێکی ئەمینم بۆ ئێوە) ئەوە دەگەیەنی، لە خوا بترسنو گوێڕایەڵیم بکەن. ئەوان لەگەڵ ئەوەدا هاوەڵیان بۆ خوا دادەنا، تەرازوو بازییان دەکرد، فێڵیان دەکرد لە کێشانەو پێوانەدا، لەبەر ئەمە خوا پێی فەرموون:

(١٨١): ﴿ أَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ ﴾ واتە: بە تەواوی پێوانەی بکەن ﴿ وَلَا تَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُخْسِرِينَ ﴾ (واتە: لەو کەسانە مەبن، زیان لە خەڵکی دەدەن) ئەوانەی لە کاتی مامەڵەداماڵی بێ نرخو بە کەم تەماشا دەکەن، بە فڕو فێڵ لە تەرازوو پێوانەدا.

(١٨٢-١٨٣): ﴿ وَزِنُوا۟ بِٱلْقِسْطَاسِ ٱلْمُسْتَقِيمِ ﴾ واتە: بە تەرازووی ڕاستو دادپەروەرانە، کە بۆ هیچ لایەک مەیل نەکات.

وَٱتَّقُواْ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلْجِبِلَّةَ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٨٤﴾ قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ
ٱلْمُسَحَّرِينَ ﴿١٨٥﴾ وَمَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا وَإِن نَّظُنُّكَ لَمِنَ
ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿١٨٦﴾ فَأَسْقِطْ عَلَيْنَا كِسَفًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ إِن كُنتَ
مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١٨٧﴾ قَالَ رَبِّىٓ أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٨٨﴾ فَكَذَّبُوهُ
فَأَخَذَهُمْ عَذَابُ يَوْمِ ٱلظُّلَّةِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٨٩﴾
إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٩٠﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ
لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٩١﴾ وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٩٢﴾ نَزَلَ بِهِ
ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ بِلِسَانٍ
عَرَبِىٍّ مُّبِينٍ ﴿١٩٥﴾ وَإِنَّهُۥ لَفِى زُبُرِ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٩٦﴾ أَوَلَمْ يَكُن لَّهُمْ ءَايَةً
أَن يَعْلَمَهُۥ عُلَمَٰٓؤُاْ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٩٧﴾ وَلَوْ نَزَّلْنَٰهُ عَلَىٰ بَعْضِ ٱلْأَعْجَمِينَ
﴿١٩٨﴾ فَقَرَأَهُۥ عَلَيْهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ مُؤْمِنِينَ ﴿١٩٩﴾ كَذَٰلِكَ سَلَكْنَٰهُ
فِى قُلُوبِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٢٠٠﴾ لَا يُؤْمِنُونَ بِهِۦ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلْعَذَابَ
ٱلْأَلِيمَ ﴿٢٠١﴾ فَيَأْتِيَهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٠٢﴾ فَيَقُولُواْ
هَلْ نَحْنُ مُنظَرُونَ ﴿٢٠٣﴾ أَفَبِعَذَابِنَا يَسْتَعْجِلُونَ ﴿٢٠٤﴾ أَفَرَءَيْتَ
إِن مَّتَّعْنَٰهُمْ سِنِينَ ﴿٢٠٥﴾ ثُمَّ جَآءَهُم مَّا كَانُواْ يُوعَدُونَ ﴿٢٠٦﴾

(١٨٤): ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلْجِبِلَّةَ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾ واتە: (بترسن لەو زاتەی کە ئێوەو) خەڵکانی پێش ئێوەی دروست کردوە، ئنجا هەروەکو چۆن تاکو تەنهایە لە دروستکردنتاندا، وە پێشینی ئێوەیشی دروست کردوە بێ هاوەڵو هاوبەش، دەی ئێوەش بە تاکو تەنها بیپەرستن، وە هەروەکو چۆن نازونیعمەتی بوونو بەخشینی نیعمەتەکانی پێداون، ئێوەش لە بەرانبەردا سوپاسگوزاری بکەن.

(١٨٥): ئەوان بە درۆزنیان داناو قسەکانیان رەتکردەوە، وتیان: ﴿ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلْمُسَحَّرِينَ ﴾ تۆ لە خۆتەوە قسە دەکەی، ئەوەی تۆ دەیڵێی قسەی جادووگەرەکانە، کە سەرەنجام کەس لەسەر ئەوانە تۆڵەی لێ ناکرێتەوە.

(١٨٦): ﴿ وَمَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا ﴾ (واتە: تۆ تەنها مرۆڤێکی وەک ئێمە) هیچ چاکەیەکت نیە بەسەرمانەوە هەتا بانگمان بکەیت بۆ شوێنکەوتنت، ئەمیش وەکو قسەکانی پێش خۆیانە، کە بەو جۆرە بەرهەڵستی پێغەمبەرانیان کردوە، بەم گومانەی بە بەردەوام قسەی لەسەر دەکەنو یەکدەنگن لەسەری، چونکە یەکدەنگن لەسەر بیروباوەڕیو دڵەکانیان لەیەک دەچێ، پێغەمبەرانیش وەڵامیان داونەتەوە بە قسەکانیان: ﴿ إِن نَّحْنُ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَمُنُّ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ﴿١١﴾ ﴾ إبراهيم، (واتە: ئێمە تەنها مرۆڤێکین وەکو ئێوە بەڵام خوا ﷻ منەت دەکا بەسەر ئەو کەسەی خۆی بیەوێ لە بەندەکانی) ﴿ وَإِن نَّظُنُّكَ لَمِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴾ (واتە: ئێمە وا گومانت پێ دەبەین لە درۆزنان بیت) ئەمە بوێریو کەڵلەڕەقی بوو لەلایەن ئەوانەوە، وە ستەمو بوختانێکی گەورە بوو، خۆیان دەیانزانی پێچەوانەکەی تەواوە، چونکە هیچ پێغەمبەرێ لە پێغەمبەرەکان ڕووبەڕووی گەلەکەی نەبووەتەوەو بانگی نەکردوونو مشتو مڕی لەگەڵدا نەکردوون، ئیلا خوا ﷻ لەسەر دەستی چەندین ئایەتو نیشانەی ئاشکرا کردوە، کە بەو ئایەتانە دڵنیابن لە ڕاستگۆییو ئەمانەتی بە تایبەت شوعەیب ﷺ کە ناونراوە بە وتاربێژی

پێغەمبەران، لەبەر جوانی مامەڵەکردنی لەگەڵ گەلەکەیدا، وە مشتومڕ کردنیان بە چاکترین شێوە، بێگومان گەلەکەی دڵنیابوون لە ڕاستگۆیی شوعەیب ﷺ وە ئەوەیشی هێناویەتی ڕاستە، بەڵام هەواڵدانیان بە گومان درۆیەک بوو لەلایەن خۆیانەوە.
(١٨٧): ﴿ فَأَسۡقِطۡ عَلَيۡنَا كِسَفٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ﴾ واتە: (چەند پارچە ئاگرێکمان) لە ئاسمانەوە بۆ بنێرە لە ناومان بباو لە بن دەرمان بێنێ ﴿ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾ (ئەگەر تۆ لە ڕاستگۆیانی) وەکو قسەی براکانیان ﴿ وَإِذۡ قَالُواْ ٱللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا هُوَ ٱلۡحَقَّ مِنۡ عِندِكَ فَأَمۡطِرۡ عَلَيۡنَا حِجَارَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ أَوِ ٱئۡتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٖ ٣٢ ﴾ الأنفال، (واتە: کاتێک دەیانوت ئەی پەروەردگار ئەگەر ئەم قورئانە ڕاستەو لە لایەن تۆوە هاتووە دەی بەرد بەسەرماندا ببارێنە لە ئاسمانەوە خوا بۆی ناردن، یان سزای سەختی پڕ ئازارمان بۆ بنێرە)، یان ئەوان داوای هەندێ ئایەتو نیشانەی پێشنیاریان کرد کە داواکاریەکانی ئەوانی پڕنەدەکردەوەو تەواو نەدەکرد.
(١٨٨): ﴿ قَالَ ﴾ شوعەیب ﷺ وتی: ﴿ رَبِّيٓ أَعۡلَمُ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴾ واتە: داواکردنی دابەزاندنی سزا، وە ڕوودانی ئایەتی پێشنیار کراو، من بۆتان ناهێنمو بۆتان دانابەزێنم، من هیچم لەسەرنیە، تەنها گەیاندنو ئامۆژگاری کردنتان نەبێ، بێگومان ئەوە کردم، بەڵکو پەروەردگارم دەیهێنێ، ئەو زاتەی کە زانایە بە کردەوەکانتانو بارودۆختان، هەر ئەو زاتە پاداشتان دەداتەوەو لێپرسینەوەتان لەگەڵ دەکات.
(١٨٩): ﴿ فَكَذَّبُوهُ ﴾ واتە: ئنجا شوعەیبیان بە درۆزن دانا، بە درۆدانان بووە وەسفێک بۆیان، بێبڕواییش بوو بە خوویەکی هەمیشەییان، بە جۆرێ ئایەتو نیشانەکان هیچ سوودی پێ نەدەگەیاندن، وە هیچ ڕێگەچارەیەک نەبوو لەگەڵیاندا دابەزاندنی سزا نەبێ ﴿ فَأَخَذَهُمۡ عَذَابُ يَوۡمِ ٱلظُّلَّةِ ﴾ واتە: سێبەرێک دایپۆشین هەموویان لە ژێریدا بە زەلیلی کۆبوونەوە، خوا ﷻ سووتاندنی بە سزا، لە ژێریدا مانەوە بە خامۆشی، وە جیاکرانەوە لە وڵاتەکەیان، وە بۆ ماڵی بەدبەختیو سزا دابەزین، ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٍ ﴾ هیچ گەڕانەوەکیان نیە بۆ دونیا تا کردەوەی چاکی تێدا بکەن، بۆ ساتێکیش سزایان لەسەر لانابرێ، بە هیچ شێوەیەکیش تەماشا ناکرێن.
(١٩٠): ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ ﴾ بەڵگەیە لەسەر ڕاستی شوعەیبو ئەو پەیامەی بانگەشەی بۆ دەکرد، وە بەتاڵیو پووچی ئەوەی گەلەکەی لەسەری بوو ﴿ وَمَا كَانَ أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ ﴾ لەگەڵ ئەوەی ئایەتو نیشانەکانیان بینی، چونکە هیچ عەقڵو بیرێکیان نەبوو، هیچ

خێرێکیشیان تێدانەبوو ﴿ وَمَآ أَكۡثَرُ ٱلنَّاسِ وَلَوۡ حَرَصۡتَ بِمُؤۡمِنِينَ ١٠٣ ﴾یوسف، (واتە: وە زۆربەی خەڵکی هەرچەند تۆ سووربیت نابنە ئیماندار).

(١٩١): ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ﴾ واتە: (بە ڕاستی پەروەردگارت هەر ئەو زاڵە) هەر ئەو زاتەیە بەهێزو توانای خۆی ڕێگری کردوە لە زانینی هەموو کەسێ، وە زاڵە بەسەر هەموو بەدیهێنراوێکدا ﴿ ٱلرَّحِيمُ ﴾ ئەو زاتەیە بەزەیی وەسفێتی، لە شوێنەوارەکانی هەموو خێرو چاکەی دونیاو دوارۆژی لەخۆ گرتووە، لەو کاتەی کە خوا ﷻ جیهانی بەدیهێناوە تا کۆتایی، وە لە عیزەتو دەسەڵاتی ئەوەیە کە دوژمنانی لەناو بردووە کاتێ پێغەمبەرەکانیان بەدرۆ زانیوە، وە لەبەزەیی و میهرەبانی ئەوەیە کە دۆستەکانی رزگار کردوە ئەوەیشی شوێنیان کەوتووە لە بڕواداران.

(١٩٢-٢٠٣): ﴿ وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ١٩٢ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلۡأَمِينُ ١٩٣ عَلَىٰ قَلۡبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلۡمُنذِرِينَ ١٩٤ بِلِسَانٍ عَرَبِيّٖ مُّبِينٖ ١٩٥ وَإِنَّهُۥ لَفِي زُبُرِ ٱلۡأَوَّلِينَ ١٩٦ أَوَلَمۡ يَكُن لَّهُمۡ ءَايَةً أَن يَعۡلَمَهُۥ عُلَمَٰٓؤُاْ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ١٩٧ وَلَوۡ نَزَّلۡنَٰهُ عَلَىٰ بَعۡضِ ٱلۡأَعۡجَمِينَ ١٩٨ فَقَرَأَهُۥ عَلَيۡهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ مُؤۡمِنِينَ ١٩٩ كَذَٰلِكَ سَلَكۡنَٰهُ فِي قُلُوبِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ٢٠٠ لَا يُؤۡمِنُونَ بِهِۦ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ ٢٠١ فَيَأۡتِيَهُم بَغۡتَةٗ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ٢٠٢ فَيَقُولُواْ هَلۡ نَحۡنُ مُنظَرُونَ ٢٠٣ ﴾

دوای ئەوەی خوا ﷻ باسی چیرۆکو سەرگوزەشتەی پێغەمبەرانی کرد لەگەڵ گەلەکانیاندا، کە چۆن بانگەوازیان کردن؟ وە چۆنیش وەڵامیان دانەوە؟ وە چۆن خوا ﷻ دوژمنانیانی لەناو برد؟ ئەوە بووبە سەرەنجام بۆیان. ئنجا باسی ئەم پێغەمبەرە بەخشندەو نێردراوە مەزنەی کرد، وە باسی ئەو کتێبەیشی کرد کە هیدایەتو ڕێنمایی تێدایە بۆ ئەو کەسانەی خاوەن عەقڵو ژیرین، فەرموویەتی:

(١٩٢): ﴿ وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ ئەو زاتەی دایبەزاندووە، خولقێنەری ئاسمانەکانو زەویە، پەروەردگاری هەموو جیهانیانە، جیهانیانی سەرەوەو خوارەوە، هەروەکو چۆن پەروەردەی کردوون بە هیدایەتدانیان بۆ بەرژەوەندی دونیاو جەستەکانیان، هەروەها پەروەردەیان دەکات بە هیدایەتدانیان بۆ بەرژەوەندیەکانی ئاینو دوارۆژیان، لە مەزنترین ئەو پەروەردەیە دابەزاندنی ئەم کتێبە بەخشندەیەیە، کە هەموو خێرو چاکەیەک لەخۆدەگرێ، وە هیدایەتو ڕێنمایی تێدایە بۆ بەرژەوەندی هەردوو دونیا، وە خووڕەوشتی بەرز کە لە غەیری ئەودا نیە، وەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ لە مەزندانانیو گرنگی پێدانی تەواوی ئەوەیە کە لەلایەن خواوە دابەزیوە،

نـەک لـە غەیری ئـەو، مەبەسـت تێیـدا سـوودو هیدایەتـی ئێوەیە.
(١٩٣): ﴿ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلۡأَمِينُ ﴾ ئەویـش جبرائیلـە ، کـە ئەو بەڕێزتریـن‌و بەهێزترینی نـاو فریشـتەکانە ﴿ ٱلۡأَمِينُ ﴾ ئەوەیـە کە پارێـزراوە لە زیـاد کردن، یان کـەم کردن.
(١٩٤): ﴿ عَلَىٰ قَلۡبِكَ ﴾ ئـەی موحەممـەد ﷺ ﴿ لِتَكُونَ مِنَ ٱلۡمُنذِرِينَ ﴾ هیدایەتـی پێبدەی بۆ ڕێگـای ڕاسـت، وە ئاگـاداری پێبکەیتەوە لە ڕێگـای گومڕایی.
(١٩٥): ﴿ بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ ﴾ (بـە زمانـی عەرەبی ڕوٚشـن) کـە بەڕێزترینی زمانەکانـە، بە زمانی ئـەو کەسـەی نێـردراوە بۆ ناویـان، وە بانگـەوازی کـردوون، بـە زمانێکـی ڕوون‌و ڕەوان، سـەرنج بـدە چـۆن هەمـوو چاکەکانـی کۆکردۆتـەوە لـەم کتێبـە بەخشـندەیەدا، بێگومان ئـەو قورئانـە باشـترینی کتێبەکانە، وە بـە بەڕێزترینـی فریشـتەکاندا دایبەزاندووە، بۆ سـەر بەڕێزتریـن دروسـتکراو، بـۆ سـەر بەڕێزتریـن پارچـە لـەو دروسـتکراوەدا کـە بریتیـە لە دڵـی، بـۆ سـەر بەڕێزتریـن ئۆممـەت، کە لە نـاو خەڵکیـدا دەرچـوون، بە باشـترین زمان‌و پاراوتریـن‌و بەرفراوانترینیـان، ئەویـش زمانـی عەرەبـی ڕوونکەرەوەیە.
(١٩٦): ﴿ وَإِنَّهُۥ لَفِي زُبُرِ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴾ واتـە: (باسـی قورئان) لـە کتێبی پێشـووەکاندا موژدەی پێـدراوەو بەراسـت دانـراوە، چـۆن هەواڵـی پێدراوە پـڕاو پڕ بـەو شـێوەیە دابەزیوە، ﴿ بَلۡ جَآءَ بِٱلۡحَقِّ وَصَدَّقَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ٣٧ ﴾الصافـات، (واتـە: بەڵکو ئەو پێغەمبـەرە ﷺ حەقی هێناوەو بـڕوای بـە پێغەمبەرانی پێشـوو هەیە).
(١٩٧): ﴿ أَوَلَمۡ يَكُن لَّهُمۡ ءَايَةً ﴾ (واتـە: ئایـا ئەمـە بەڵگەیەکـی ڕوون نەبـوو بۆیـان) لەسـەر ڕاسـتی قورئان ﴿ أَن يَعۡلَمَهُۥ عُلَمَٰٓؤُاْ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ﴾ (واتـە: کە زانایانی نەوەکانی ئیسـرائیل ئەوە دەزانـن) ئەوانـەی لە هەمـوو خەڵکی شـارەزاترن دەربـارەی کتێبـەکان، ئەوان خـاوەن ئەو بابەتـەن، بێگومـان هـەر شـتێ دوو دڵـی تێبکـەوێ، دەگەڕێنرێتـەوە بۆ خاوەن شـارەزایی‌و وردەکاری لـەو بابەتـەدا، بۆیـە قسـەی ئـەوان دەبێتـە بەڵگەو حوججـە بۆ غەیـری خۆیان، هەروەکـو چۆن جادووگـەرەکان ئەوانەی شـارەزایی تەواویـان هەبوو لە زانسـتی جادوودا، دانیـان بەڕاسـتی موعجیزەکـەی مووسـادا هێنـا، کـە ئەوە بـە هیـچ جۆرێک پێـی ناوترێ جـادوو، جـا قسـەی نەفامان لـەدوای ئەمـە هیـچ نرخێکی بـۆ دانانرێ.
(١٩٨): ﴿ وَلَوۡ نَزَّلۡنَٰهُ عَلَىٰ بَعۡضِ ٱلۡأَعۡجَمِينَ ﴾ (واتـە: ئەگـەر ئێمـە ئەو قورئانەمـان دابەزاندایە بـۆ سـەر هەندێ) لەو کەسـانەی کـە تێناگەن لـە زمانی عەرەبـی‌و ناتوانـن دایبڕێژن وەک پێویست.

(١٩٩): ﴿ فَقَرَأَهُۥ عَلَيۡهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ مُؤۡمِنِينَ ﴾ (واتە: ئنجا بخوێنرایەتەوە بەسەریاندا، ئەوان هەر بڕوایان نەدەهێنا) دەیانوت: تێناگەین چی دەڵێت، نازانین بانگەواز بۆچی دەکات، ستایشی خوا بکەن، کە بۆیان هاتووە لەسەر زمانی پاراوترینی بەدیهێنراوەکان، وە بە تواناترینیان لەسەر دەربڕین بۆ مەبەستەکان، بە دەستەواژە ڕوونەکان، وە ئامۆژگارترین کەسیان، وە بۆ ئەوەی دەستپێشخەری بکەن بۆ بەڕاستدانانیو ملکەچی بنو وەریبگرن، بەڵام بە دۆردانانیان بە هۆی گومانو دوو دڵیەوە نەبوو، بەڵکو بە هۆی کوفرو عینادیەوە بوو، ئەمە پیشەی گەلە بەدرۆدانەرەکانە بە میرات یەک لە دوای یەک وەریان گرتووە.
(٢٠٠): ﴿ كَذَٰلِكَ سَلَكۡنَٰهُ فِي قُلُوبِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴾ واتــە: بەدرۆدانانمــان خســتۆتە نــاو دڵی تاوانبارانــەوەو ڕێکمــان خســتوە، هەروەکــو چۆن تیــرە دەخرێتە نــاو دەرزیەوە، بــە جۆرێ تێکــەڵ بــووە بوەتە وەســفێک بــۆی، ئەویش بــە هۆی ســتەمو تاوانیانــەوە، ئا لەبــەر ئەوە.
(٢٠١): ﴿ لَا يُؤۡمِنُونَ بِهِۦ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ ﴾ (واتــە: بــڕوای پێناهێنــن هەتا ســزای ســەخت بــە چــاوی خۆیان دەبینــن) لەســەر بــە درۆ دانانیان.
(٢٠٢): ﴿ فَيَأۡتِيَهُم بَغۡتَةً وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴾ واتە: لە ناکاو دێت بۆیان کاتێ بێ ئاگانو هەست بە دابەزاندنی ناکەن، بۆ ئەوەی بەهێز بێ لە سزادانو تۆڵەکردنەوە لێیان.
(٢٠٣): ﴿ فَيَقُولُواْ ﴾ ئەوســا دەڵێــن: ﴿ هَلۡ نَحۡنُ مُنظَرُونَ ﴾ واتــە: داوا دەکــەن چــاوەڕێ بکرێــنو مۆڵەتیــان پــێ بدرێ، لــە کاتێکــدا کاتی مۆڵــەت پێدان بەســەرچووە، وە ســزایان لەســەر پێویســت بــووە کــە بەرزکردنــەوەی بۆ نیــەو بــۆ ســاتێکیش لەســەریان لانابرێ.
(٢٠٤-٢٠٧): ﴿ أَفَبِعَذَابِنَا يَسۡتَعۡجِلُونَ (٢٠٤) أَفَرَءَيۡتَ إِن مَّتَّعۡنَٰهُمۡ سِنِينَ (٢٠٥) ثُمَّ جَآءَهُم مَّا كَانُواْ يُوعَدُونَ (٢٠٦) مَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يُمَتَّعُونَ (٢٠٧) ﴾:
خــوای بــەرز دەفەرمــوێ: ﴿ أَفَبِعَذَابِنَا ﴾ کــە بریتیــە لە ســزای بــە ئێشــی مەزن، بــە هیچ شــێوەیەک گاڵتــەی پێناکرێو بەکەم تەماشــا ناکرێ ﴿ يَسۡتَعۡجِلُونَ ﴾ چــی وای لێکردوون لــە خۆبایــی بن؟ ئایــا هێــزو توانایەکیــان هەیە ئــارام بگرن لەســەری، یــان هێــزو توانایان هەیــە ڕەتــی بکەنەوە، یان لەســەرخۆیان لای ببــەن؟ یان ئەوەیــە ئێمە بەبێ توانــا دەزانن، وە واگومــان دەبــەن ئێمە توانای ســزادانی ئەوانمــان نیە؟
﴿ أَفَرَءَيۡتَ إِن مَّتَّعۡنَٰهُمۡ سِنِينَ ﴾ واتە: ئایا زانیتە ئەگەر پەلەیان لێ نەکەین لە دابەزاندنی سزادا، وە مۆڵەتیان بدەیت چەند ساڵێک بۆ خۆیان لە دونیادا لەززەت وەربگرن، ﴿ ثُمَّ جَآءَهُم مَّا كَانُواْ يُوعَدُونَ ﴾ (واتە: پاشان بۆیان بێت ئەوەی پەیمانیان پێدراوە) لە سزاو تۆڵە.


مَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يُمَتَّعُونَ ٢٠٧ وَمَآ أَهۡلَكۡنَا مِن قَرۡيَةٍ إِلَّا
لَهَا مُنذِرُونَ ٢٠٨ ذِكۡرَىٰ وَمَا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ٢٠٩ وَمَا تَنَزَّلَتۡ بِهِ
ٱلشَّيَٰطِينُ ٢١٠ وَمَا يَنۢبَغِي لَهُمۡ وَمَا يَسۡتَطِيعُونَ ٢١١ إِنَّهُمۡ عَنِ
ٱلسَّمۡعِ لَمَعۡزُولُونَ ٢١٢ فَلَا تَدۡعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتَكُونَ
مِنَ ٱلۡمُعَذَّبِينَ ٢١٣ وَأَنذِرۡ عَشِيرَتَكَ ٱلۡأَقۡرَبِينَ ٢١٤ وَٱخۡفِضۡ
جَنَاحَكَ لِمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٢١٥ فَإِنۡ عَصَوۡكَ فَقُلۡ إِنِّي
بَرِيٓءٞ مِّمَّا تَعۡمَلُونَ ٢١٦ وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱلۡعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ٢١٧ ٱلَّذِي
يَرَىٰكَ حِينَ تَقُومُ ٢١٨ وَتَقَلُّبَكَ فِي ٱلسَّٰجِدِينَ ٢١٩ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ
ٱلۡعَلِيمُ ٢٢٠ هَلۡ أُنَبِّئُكُمۡ عَلَىٰ مَن تَنَزَّلُ ٱلشَّيَٰطِينُ ٢٢١ تَنَزَّلُ عَلَىٰ
كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٖ ٢٢٢ يُلۡقُونَ ٱلسَّمۡعَ وَأَكۡثَرُهُمۡ كَٰذِبُونَ ٢٢٣
وَٱلشُّعَرَآءُ يَتَّبِعُهُمُ ٱلۡغَاوُۥنَ ٢٢٤ أَلَمۡ تَرَ أَنَّهُمۡ فِي كُلِّ وَادٖ
يَهِيمُونَ ٢٢٥ وَأَنَّهُمۡ يَقُولُونَ مَا لَا يَفۡعَلُونَ ٢٢٦ إِلَّا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَذَكَرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا وَٱنتَصَرُواْ مِنۢ
بَعۡدِ مَا ظُلِمُواْ وَسَيَعۡلَمُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَيَّ مُنقَلَبٖ يَنقَلِبُونَ ٢٢٧

﴿ مَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يُمَتَّعُونَ ﴾ (واتە: سوودیان پێ ناگەیەنێ ئەو هەموو) خۆشیو رابواردنانە؟ واتە: چ شتێک سوودیان پێدەگەیەنێو بێنیازیان دەکات، لە کاتێکدا هەموو شت کۆتایی پێهاتو بەتاڵ بوویەوەو پەرشو بڵاو بوو، وە سزایان بۆ چەند قات بویەوە بە هۆی درێژ بوونەوەی ماوەی مانەوەیان لە دونیادا؟ مەبەست خۆپاراستنە لە تووشبوونی سزاو شایستە بوونیان پێی، بەڵام پێشکەوتنو دواکەوتنی ئەو سزایە هیچ سوودو کەڵکێکیشی نیە لە لای ئەو.

(٢٠٨-٢١٢): ﴿ وَمَآ أَهۡلَكۡنَا مِن قَرۡيَةٍ إِلَّا لَهَا مُنذِرُونَ ٢٠٨ ذِكۡرَىٰ وَمَا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ٢٠٩ وَمَا تَنَزَّلَتۡ بِهِ ٱلشَّيَٰطِينُ ٢١٠ وَمَا يَنۢبَغِي لَهُمۡ وَمَا يَسۡتَطِيعُونَ ٢١١ إِنَّهُمۡ عَنِ ٱلسَّمۡعِ لَمَعۡزُولُونَ ٢١٢ ﴾.

﴿ وَمَآ أَهۡلَكۡنَا مِن قَرۡيَةٍ إِلَّا لَهَا مُنذِرُونَ ﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدات دەربارەی تەواوی دادپەروەری خۆی لە لەناوبردنی بە درۆدانەران، وە بێگومان هیچ شارو شارۆچکەیەک کاولو وێران ناکات مەگەر پاش بیانوو هێنانەوە نەبێ، وە پاش ئەوەی نێردراویان بۆ دەنێرێ دەیانترسێنێ بە ئایەتو نیشانە روونەکان، بانگیان دەکات بۆ هیدایەتو رێگریان لێدەکات لە کاری خراپە، یادی خوایان دێنێتەوە بیرو ئاگاداریان دەکاتەوە لە رۆژ گارەکانی خوا ﷻ لە نازونیعمەتو خەشمو قینی.

﴿ ذِكۡرَىٰ ﴾ بۆ ئەوەی بیێتە بیر کردنەوە بۆیانو بەجێهێنانی بەڵگەو حوججە لەسەریان ﴿ وَمَا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴾ (ئێمە ستەمکار نەبووین) لە لەناوبردنی هەر شاروو شارۆچکەیەکدا پێش ئەوەی ئاگاداریان بکەینەوە، وە سزایان بدەین ئەوان بێ ئاگابن لە ئاگادار کردنەوە، هەروەکو خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبۡعَثَ رَسُولٗا ١٥ ﴾الإسراء (واتە: ئێمە هەرگیز سزای (بەندەکان) نادەین هەتا پێغەمبەر نەنێرین (بۆیان))، ﴿ رُّسُلٗا

﴿مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِ ﴿١٦٥﴾﴾ النساء، (واتــە: پێغەمبەرانمــان نــاردوە کــە مــژدەدەرن‌و ترســێنەرن بــۆ ئــەوەی بــۆ خەڵکــی نەبێــت بەڵگە بەســەر خــواوە دوای (ناردنــی) پێغەمبەران).

دوای ئــەوەی خــوا ﷻ تــەواوی قورئان‌و گەورەیــی ڕوون کردەوە، پاکــی ڕاگرت لە هەموو ســیفەتێکی ناتــەواو، وە پاراســتی -لە کاتــی دابەزاندنــی‌و دوای دابەزاندنی- لە شــەیتانەکانی جنۆکــەو مرۆڤــەکان، جــا فەرمــووی: ﴿وَمَا تَنَزَّلَتۡ بِهِ ٱلشَّيَٰطِينُ ﴿٢١٠﴾ وَمَا يَنۢبَغِي لَهُمۡ﴾ (واتــە: شــەیتانەکان ئــەو قورئانەیــان دانەبەزاندوتــە خــوارەوە) نــە شــیاوی ئــەوەن‌و ﴿وَمَا يَسۡتَطِيعُونَ﴾ نــە لــە توانایاشــیاندایە ئــەوە بکەن.

﴿إِنَّهُمۡ عَنِ ٱلسَّمۡعِ لَمَعۡزُولُونَ﴾ (واتــە: شــەیتانەکان لــە گوێگرتنــی قورئــان بەرکەنــار کــران) دوورخراونەتــەوە، ڕەجــم کردنــی بــۆ ئامــادە کردوون لــە پێنــاو پاراســتنیدا، وە بە جبریلــدا ﷺ دایبەزانــدوە کــە بەهێزترینــی نــاو فریشــتەکانە، کە شــەیتان توانــای نیە لێی نزیکــی بکەوێتــەوە، یان لــە گۆڕەپانیدا بخولێتــەوە، ئەمەش وەک ئــەو ئایەتەیە: ﴿إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿٩﴾﴾ الحجر، (واتــە: بێگومــان هــەر ئێمــە قورئانمــان ناردۆتە خــوارەوەو، بــە دڵنیایی هــەر ئێمەیــش دەیپارێزین).

(٢١٣-٢١٦): ﴿فَلَا تَدۡعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتَكُونَ مِنَ ٱلۡمُعَذَّبِينَ ﴿٢١٣﴾ وَأَنذِرۡ عَشِيرَتَكَ ٱلۡأَقۡرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ وَٱخۡفِضۡ جَنَاحَكَ لِمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٢١٥﴾ فَإِنۡ عَصَوۡكَ فَقُلۡ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تَعۡمَلُونَ ﴿٢١٦﴾﴾:

﴿فَلَا تَدۡعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتَكُونَ مِنَ ٱلۡمُعَذَّبِينَ﴾ خــوا ﷻ قەدەغــە دەکات لــە پێغەمبەرەکــەی وەک بنەمــاو بنچینەیــەک، وە ئوممەتەکەیشــی وەکو ئەوەی شــوێنکەوتەی ئــەون، داواکــردن‌و پەرســتنی غەیــری خــوا ﷻ لــە هەمــوو بەدیهێنــراوەکان، بێگومــان پەرســتنی غەیــری خــوا ﷻ دەبێتە مایەی ســزای بەردەوام‌و هەتــا هەتایی، چونکە شــیرک‌و هاوبــەش دانانــە، ﴿مَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدۡ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ ٱلۡجَنَّةَ وَمَأۡوَىٰهُ ٱلنَّارُ ﴿٧٢﴾﴾ المائدة، (واتــە: بەڕاســتی هەرکــەس هاوبــەش بــۆ خــوا دابنــێ ئــەوە بێگومــان خــوا بەهەشــتی لێ حــەرام کــردوە، وە جــێ‌و شــوێنی ئاگــر دەبێــت) قەدەغەکــردن لــە شــتێ فەرمانکردنە بە پێچەوانەکــەی، قەدەغەکــردن لــە هاوبەشــدانان فەرمانــە بــە بەندایەتــی کردنــی خــوا ﷻ بە دڵســۆزی، وە بــە تــاک‌و تەنهایی‌و بەبێ هــاوەڵ بۆ دانان، وە خۆشویســتن‌و ترســان‌و ئومێدو زەلیلیــی‌و گەڕانــەوە بــۆ لای لــە هەمــوو کاتەکاندا.

دوای ئـەوەی فەرمانـی کـرد بە پێغەمبەرەکەی، ئنجـا فەرمانی کرد بە هەر کەسـێکی غەیری خـۆی‌و، فەرمـووی: ﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴾ (واتـە: خـزمو کەسـە نزیکەکانـت بترسـێنە) ئەوانـەی نزیکترین کەسـن لـە تـۆوە، وە شایسـتەترینیانن بە چاکەکانـی ئاینی‌و دونیایـی، ئەمـە ڕەتکردنەوەی فەرمانـی خوا ﷻ نیە، بە ترسـاندنی هەمـوو خەڵکی هەروەک چـۆن ئەگـەر مـرۆڤ فەرمانی پێبکـرێ بە هەمـوو چاکەکان پاشـان پێـی بوتـرێ: لەگەڵ خـزمو کەسـەکانتدا چاک بـە، ئەمە دەبێتـە تایبەتکـراو، بەڵگەیـە لەسـەر جەختکردنەوەی زیاتـرو مافێکی زیاتریان بەسـەریەوە.

پێغەمبـەر ﷺ ئـەم فەرمانـە خواییـەی جێبەجـێ کـرد، هەمـوو خەڵکـی قورەیشـی ئاگـادار کـردەوە، هـەم گشـتاندی وە هەم تایبەتی کـرد، یادی خسـتنەوەو ئامۆژگـاری کردن، هیچ شـتێک نەما لـە توانای ئەودا لـە ڕووی ئامۆژگاری‌و ڕێنمایـی کردنیانەوە، ئەو لـەو پێناوەدا ئەنجامیـدا، هەر کەس ویسـتی هیدایـەت وەربگرێ هیدایەتیدا، وە هەرکەس ویسـتی پشـتی تێبکا پشـتی تێکرد.

﴿ وَٱخْفِضْ جَنَاحَكَ لِمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ باڵـی بەزەیـی‌و نـەرمو نیانیـت بۆیـان ڕابخـە، وە میهرەبانـی دواندنـت بۆیـان، وە خورەوشـتی جـوانو چاکـەی تـەواو لەگەڵیاندا (بـۆ ئـەو بروادارانـەی شـوێنت کەوتـوون) بێگومـان پێغەمبـەر ﷺ ئـەوەی ئەنجامـدا، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي ٱلْأَمْرِ ﴿١٥٩﴾ ﴾ آل عمران. (واتـە: بـە هـۆی بەزەیـی خواوەیـە بـۆ ئـەوان نـەرمو نیان بـووی ئەگـەر تـۆ بەدخـوو قسـە ڕەقو دڵ ڕەق بوویتایە ئـەوە هەمـوو بڵاوەیـان دەکرد لـە دەورت، کەواتـە لێیان ببـورەو داوای لێبوردنیـان بۆ بکە لـە خـوا، وە ڕاوێژیـان پێ بکـە لە کاروبـاردا).

ئەمـە خورەوشـتی پێغەمبـەرە ﷺ بەرزترینـی خورەوشـتەکانە، کـە بـەو خوورەوشـتە بەرزە بەرژەوەنـدی مـەزن بەدەسـت دێ‌و زیـانو خراپـەی بەرچـاو ڕەت دەکرێتـەوە، هەروەک دیارە.

جـا شـیاوە بۆ کەسـێک کە بـڕوای بـە خـواو پێغەمبەرەکـەی هێنابێ‌و بانگەشـەی شـوێن کەوتـن‌و پەیرەو کردنـی ئـەو بـکات، ببێتـە بار بەسـەر مسـوڵمانانەوەو خورەوشـتی پیس‌و ناشـرینی هەبـێ؟ وە توونـدو ووشـک‌و دڵـڕەق‌و قسـە ناشـرین بـێ لەگەڵیانـدا؟ ئەگـەر تاوانێـک یـان ڕەوشـتێکی ناشـرینیان لێ ببینـێ، وازیان لـێ بهێنـێ‌و لێیان تـووڕە بێ، وە

هیــچ نــەرمو نیانــیو ئەدەبێکــی تێدانەبێ، بەڕاســتی لــەم مامەڵەیــەدا خراپەکاری دەســتەبەر دەبــێو بەرژەوەندیەکانیــش تێــکو پێــک دەشــکێن، لەگەڵ ئــەوەدا دەبینی هەرکەســێک شــوێنی پێغەمبــەری بەخشــندە کەوتبــێ بــە کــەم تەماشــای دەکاتو تۆمەتــی دووڕوویــی دەداتــە پاڵــی، ئــەو کەســە نەفسو دەروونــی خۆی بە تــەواو دەزانــێو بە گــەورەی دادەنێ، وە ســەری ســووڕماوە بــە کردەوەکانــی، ئایا ئەمە بــە هۆی نەفامــیو ڕازاندنەوەی شــەیتانو فێڵکردنــی نیــە بۆی، ئــا لەبەر ئەمەیە خوا ﷻ بــە پێغەمبەرەکــەی فەرموووە: ﴿ فَإِنۡ عَصَوۡكَ ﴾ (ئنجــا ئەگەر ســەرپێچیان کردی) لــە کارێ لــە کاروبارەکاندا، خۆت بەری مەکــە لێیان، وە واز لــە مامەڵەکردنــت مەهێنــە لەگەڵیانــدا، بــەوەی باڵی نەرمو نیانیــان بۆ ڕانەخەیــت، بەڵکو خــۆت بــەری بکە لــە کردەوەکانیــان، ئنجــا ئامۆژگاریان بکــەو ڕێگایان پێ نیشــان بدە، وە هەمــوو تواناکانــت بــۆ ڕەتدانــەوەو تۆبەکردنیان لــەو تاوانانــە بەکاربهێنە.

ئەمــە بــۆ ڕەتکردنەوەی ئــەو گومانەیە کە کەســێک پێــی وابێ وتەی خــوا ﷻ: ﴿ وَٱخۡفِضۡ جَنَاحَكَ ﴾ (باڵــت ڕابخــە) بــۆ بــڕواداران، ئــەوە دەخــوازێ کــە پێغەمبــەر ﷺ ڕازی بێ بە هەمــوو ئەوانەی کــە لێیانەوە دەردەچــێ، لەبەر ئەوەی بــڕوادارن، بۆیە ئەمــەی ڕەتکردۆتەوە بــە ئەمە، خــوا زاناترە.

(٢١٧-٢٢٠): ﴿ وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱلۡعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ٢١٧ ٱلَّذِي يَرَىٰكَ حِينَ تَقُومُ ٢١٨ وَتَقَلُّبَكَ فِي ٱلسَّٰجِدِينَ ٢١٩ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ٢٢٠ ﴾

گەورەتریــن یارمەتیــدەری بەنــدە لەســەر بەجێهێنانــی فەرمانەکانــی خواو پشــت بەســتن بە پەروەردگــاریو داوای یارمەتــی لێــی لەســەر ســەرکەوتنی بــۆ بەجێهێنانی فەرمانــەکان، ئا لەبــەر ئەمــە خــوا ﷻ فەرمانــی کــردوە بە پشــت بەســتن پێــی، جــا فەرموویەتی: ﴿ وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱلۡعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ تەوەکــول بریتیــە لــە پشــت بەســتنی دڵ بــە خــوای بەرزو مــەزن لە بەدەســتهێنانی ســوودەکانو ڕەتکردنــەوەی زیانــەکان، لەگــەڵ متمانــە بوونــی پێــیو باش گومــان بــردن بــە بەدەســتهێنانی داواکــەی، بێگومــان خــوا ﷻ زاڵو بــە بەزەییە بــە زاڵیو دەســەڵاتی خــۆی توانــای هەیــە لەســەر گەیاندنــی خێــرو ڕەتکردنــەوەی شــەڕو خراپە لە بەندەکــەی، وە بــە بەزەیــی خــۆی ئەوەی بــۆ دەکات.

پاشــان ئاگــاداری کردۆتــەوە بە پشــت بەســتن بــە ئامــادە بوونی نزیکــی خــوا، وە دابەزین لــە شــوێنی چاکە.

﴿ ٱلَّذِي يَرَىٰكَ حِينَ تَقُومُ ٢١٨ وَتَقَلُّبَكَ فِي ٱلسَّٰجِدِينَ ﴾ واتــە: ئــەو زاتــە دەتبینێ لەو پەرستشــە

مەزنــە کــە ئەویــش نوێژە، وە کاتــی هەســتانو کڕنووشو ســوژدە بردن.

تایبەتـی کـردوە بـە باسـکردن، لەبەر فـەزڵو شـەرەفو حورمەتـی، وە لەبەر ئـەوەی هەر کەسـێک ئامـادە بێت تیایدا لـە پەروەردگاری نزیـک دەبێتەوە، وە دەترسـێو زەلیل دەبێ، وە هەمــوو کردەوەکانــی بە تەواوەتی ئەنجامــی دەدات، وە کۆمەکـی لێوەردەگرێ بۆ هەموو کاروبارەکانی.

﴿ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ﴾ (ئـەو زاتە) بیســەری هەمــوو دەنگەکانە، بە جیاوازیو جـۆراو جۆریانەوە ﴿ ٱلْعَلِيمُ ﴾ بە زانســتی دەوری هەموو ئاشـکراو نهێنیەکانــی داوە، وە پەنهانو دیارەکانیش، جـا بەندە هەســت بـە بینینی خوا بـکات لـە هەمـوو کاروبارەکانیدا، وە بیسـتنی لـە هەموو ئەوانـەی کـە قسـەی پێـدەکات، وە زانسـتی لـە هەمـوو ئەوانـەی لە نـاو دڵیدایە، لـە هەمو سـوور بـوونو نیەتـەکان، بێگومان ئەوە هـاوکاری دەکات لەسـەر پلەی ئیحسـانو چاکە.

(٢٢١-٢٢٧): ﴿ هَلْ أُنَبِّئُكُمْ عَلَىٰ مَن تَنَزَّلُ ٱلشَّيَـٰطِينُ ﴿٢٢١﴾ تَنَزَّلُ عَلَىٰ كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ ﴿٢٢٢﴾ يُلْقُونَ ٱلسَّمْعَ وَأَكْثَرُهُمْ كَـٰذِبُونَ ﴿٢٢٣﴾ وَٱلشُّعَرَآءُ يَتَّبِعُهُمُ ٱلْغَاوُۥنَ ﴿٢٢٤﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّهُمْ فِى كُلِّ وَادٍ يَهِيمُونَ ﴿٢٢٥﴾ وَأَنَّهُمْ يَقُولُونَ مَا لَا يَفْعَلُونَ ﴿٢٢٦﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ وَذَكَرُوا۟ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱنتَصَرُوا۟ مِنۢ بَعْدِ مَا ظُلِمُوا۟ ۗ وَسَيَعْلَمُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَىَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ ﴿٢٢٧﴾ ﴾:

ئەمـە وەڵامدانەوەیـە بـۆ ئـەو کەسـەی وتـی لـە بەدرۆدانەرانـی پێغەمبـەر ﷺ: موحەممـەد شـەیتانی بـۆ دادەبەزێ، وە قسـەی ئەو کەسـەی وتـی: بێگومان ئەو شـاعیرە، جـا فەرمووی: ﴿ هَلْ أُنَبِّئُكُمْ ﴾ واتـە: هەواڵـی ڕاسـتەقینەتان بدەمێ کـە هیچ گومـانو دوودڵیەکی تێدانیە کـە شـەیتانەکان دادەبەزنـە سـەر کـێ، واتە: بە سـیفەتی ئـەو کەسـانەی کە شـەیتانەکان دادەبەزنە سـەریان.

﴿ تَنَزَّلُ عَلَىٰ كُلِّ أَفَّاكٍ ﴾ واتـە: (دادەبەزنـە سـەر) کەسـێکی زۆر بێژی درۆزنی پـووچو بەتاڵ ﴿ أَثِيمٍ ﴾ زۆر تاوانبـارو سـەرپێچیکار لـە ڕەفتاریدا، ئا ئەمە شـەیتانەکان دادەبەزنە سـەری، حاڵیـان وەکو یـەک گونجاوە.

﴿ يُلْقُونَ ﴾ لەسـەری ﴿ ٱلسَّمْعَ ﴾ کـە لـە ئاسـمانەوە گوێرادەگـرن ﴿ وَأَكْثَرُهُمْ كَـٰذِبُونَ ﴾ واتـە: زۆربـەی ئـەو هەواڵانەیـان درۆیـە، یـەک دانـەی ڕاسـت تێکەڵ سـەد درۆ دەکـەن، حـەقو پووچـی پـێ تێکـەڵ دەکەن، وە هـەق پـەرشو بڵاو دەبـێ بە هۆی کەمبوونیـەوە، ئەمـە سـیفەتی ئەوکەسـانەیە کـە شـەیتانەکان بـۆ سـەریان دادەبـەزن، ئەمە سـیفەتی وەحیەکەیانـە بۆی.

بـەڵام موحەممـەد ﷺ حاڵـی جیـاوازە بـە جیاوازیەکـی زۆر گـەورە، چونکـە ڕاسـتگۆی دەسـتپاکی چاکـەکاریو ژیـری کـۆی کردوەتـەوە لە نێـوان چاکـی دڵو ڕاسـتی زمانو پاکـی کـردەوەکان لـە قەدەغەکراو.

وە ئـەو پەیامـەی دادەبەزێ بۆ سـەری لە لایـەن خواوەیە، بە پارێـزراوی دادەبەزێ، ڕاسـتی مەزنـی لەخۆگرتـووە، هیچ گومـانو دوودڵیەکـی تێدانیە، ئایـا پێغەمبـەر ﷺو، ئەوانە وەکو یـەک وان؟ وە ئایـا لـە یـەک دەچـن مەگەر لە لای کەسـێک شـێت بێت چـاکو خراپ لەیـەک جیـا نەکاتـەوە؟ وە جیاوازی لـە نێوان شـتەکاندا نەکات.

خـوا ﷻ کاتـێ پێغەمبەرەکـەی ﷺ پـاک ڕاگـرت لـە دابەزینـی شـەیتانەکان بـۆ سـەری، هەروەهـا بەری کرد لە شـیعر، جا فەرمـووی: ﴿وَٱلشُّعَرَآءُ﴾ واتە: ئایا هـەواڵو بارودۆخی شـاعیرەکانتان پـێ بڵێم، بە وەسـفی تەواویان، بێگومان ئـەوان ﴿يَتَّبِعُهُمُ ٱلْغَاوُۥنَ﴾ (واتە: گومـڕاکان شـوێنیان دەکەون) کـە لایان داوە لـە ڕێگای هیدایـەت، وە ڕوویـان کردوەتە ڕێگـای گومڕایـی، ئەوان لە خـودی خۆیاندا گومـڕان، وە دەبینی شـوێنکەوتووانیان گومڕاو فاسـیدو خراپەکارانن.

﴿أَلَمْ تَرَ﴾ (واتـە: ئایـا نابینـی) گومڕاییو سـەر لـێ شـێواویان ﴿أَنَّهُمْ فِى كُلِّ وَادٍ﴾ (واتە: ئەوان لە هەموو شـیوێک) لە شـیوەکانی شـیعردا ﴿يَهِيمُونَ﴾ (بەسـەر لێشـێواوی دەڕۆن) جـارێ وەسـف دەکـەن، جـارێ لەکـەدار دەکـەن، جارێ ڕاسـت دەکـەن، جارێ درۆ دەکـەن، جـارێ کەنارگیـرن، جـارێ تێکەڵن، جـارێ دڵیان خۆشـە، جـارێ خەمبارن، جێگیربوونیـان بۆ نیـە، لەسـەر حاڵەتێک لـە حاڵەتەکان ناچەسـپێن.

﴿وَأَنَّهُمْ يَقُولُونَ مَا لَا يَفْعَلُونَ﴾ واتـە: ئەمـە وەسـفی شـاعیرەکانە، ئـەوان قسـەکانیان پێچەوانـەی کردەوەکانیانـە، جـا ئەگـەر بیسـتت شـاعیر پیاهەڵدانـی نـەرمو نیـان دەکات، ئەڵێـی بەڕاسـتی ئەمـە زۆر شـەیدایە، بـەڵام دڵـی بەتاڵە لە خۆشەویسـتی، وە ئەگەر ببیسـتی وەسـف یـان لۆمـە دەکات دەڵێـی: ئەمـە ڕاسـتە، بـەڵام درۆیە. جارێک وەسـفو سـەنای ڕەفتـارێ دەکات کـە خـۆی نەیکـردوە، وە بـە تـۆ دەڵـێ کارێ مەکـە لە کاتێکـدا خۆی وازی لـێ نەهێنـاوەو ئەنجامـی دەدات، وە باس لە بەخشـندەیی دەکات کەچـی خۆی ئەوەی لـێ نەبینـراوە، وە باسـی بوێـریو زیرەکـی دەکا دەبینی خۆی ترسـنۆکترین کەسـە، ئەمە وەسفیانە.

جـا تەماشـا بکـە ئایـا دەگونجـێ لەگـەڵ بارودۆخـی پێغەمبـەر ﷺ ئـەو زاتە ژیـرو عاقڵو

چاکــەکارە، کە هەموو کەسـێکی ژیرو تێگەیشـتوو شـوێنی دەکەوێ، ئـەو پێغەمبەرەی کە بـەردەوام لـە سـەر هیدایەتو دوورە لـە خراپـەکاری، کردەوەکانی پێچەوانـەی یەکتر نین، وە قسـەکانی پێچەوانـەی کردەوەکانـی نەبـوون؟ ئەو زاتەی فەرمـان ناکات تەنهـا بەخێرو چاکـە نەبـێ، قەدەغـە ناکات تەنهـا لە شـەڕو خراپە نەبـێ، وە هەواڵ نـادا تەنهـا دەربارەی ڕاسـتی نەبـێ، وە فەرمانـی نەکـردوە بە شـتێ بێگومـان خۆی یەکـەم کەس ئەنجامـی داوە، وە قەدەغـەی نەکـردوە لە شـتێ بێگومـان خۆی یەکـەم کەس بووە کـە وازی لـێ هێنابێ. ئایـا حاڵـی ئـەمو حاڵی شـاعیرەکان پێکـەوە دەگونجێ، یـان نزیکە لـە ئەوانـەوە؟ یان ئەو پێغەمبـەرە ﷺ جیـاوازە لـەوان لە هەمـوو ڕووەکانـەوە؟ دروودو سـڵاو بۆ سـەر گیانی ئەو پێغەمبـەرە بەڕێـزو تـەواوە بـۆ هەمیشـەیی‌و هەتـا هەتایـی، ئـەو زاتەی نـە شـاعیر بووەو نەجادووگـەرو نەشـێت، بەڵکـو شایسـتەی نیـە تەنها هەمـوو تەواویـەک نەبێ.

دوای ئـەوەی وەسـفی شـاعیرەکانی کـرد بـەو وەسـفەی کـە کـردی، کۆمەڵێکـی لـێ جیاکردنـەوە، ئەوانـەش ئەو کەسـانەن کـە بڕوایان بـە خواو پێغەمبـەر هێنـاوەو کردەوەی چاکیـان ئەنجـام داوە، وە زۆر یـادی خوایان کـردوە، وە تۆڵەیـان لە دوژمنە بتپەرسـتەکان کردۆتـەوە، پـاش ئـەوەی سـتەمیان لـێ کرابوو.

جـا بۆیـە شـیعرەکانیان بووە بـە یەکێک لـە کـردەوە چاکەکانیـانو شـوێنەواری ئیمانیان، لەبەر گشـتگیری شـیعرەکانیان بە وەسـف کردنـی بـڕواداراندو تۆڵەکردنەوە لە بتپەرسـتو بێبڕوایـان، وە لابردنـی پۆخڵەوات لەسـەر ئاینـی خـوا ﷻو ڕوونکردنەوەی ئەو زانسـتانەی سـوودیان هەیە، وە هاندان لەسـەر ڕەوشـتە بەرزو بەڕێزەکان، جـا فەرموویەتی: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَذَكَرُوا۟ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱنتَصَرُوا۟ مِنۢ بَعْدِ مَا ظُلِمُوا۟ ۗ وَسَيَعْلَمُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَىَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ ﴾ دەگەڕێنـەوە بـۆ جێگای لێپرسـینەوە، هیـچ کردەوەیەکی بچووکـو کـردەوەی بەجـێ نەهێشـتوەو تۆماری کـردوە، وە هەموو هـەقو مافێکی داوە.

سوپاسو ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان.

تەفسیری سوورەتی (الشعراء) تەواو بوو.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

طسٓ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْقُرْءَانِ وَكِتَابٍ مُّبِينٍ ﴿١﴾ هُدًى وَبُشْرَىٰ
لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم
بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ﴿٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ زَيَّنَّا لَهُمْ
أَعْمَٰلَهُمْ فَهُمْ يَعْمَهُونَ ﴿٤﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَهُمْ سُوٓءُ ٱلْعَذَابِ
وَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ هُمُ ٱلْأَخْسَرُونَ ﴿٥﴾ وَإِنَّكَ لَتُلَقَّى ٱلْقُرْءَانَ مِن
لَّدُنْ حَكِيمٍ عَلِيمٍ ﴿٦﴾ إِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِأَهْلِهِۦٓ إِنِّىٓ ءَانَسْتُ نَارًا سَـَٔاتِيكُم
مِّنْهَا بِخَبَرٍ أَوْ ءَاتِيكُم بِشِهَابٍ قَبَسٍ لَّعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ ﴿٧﴾ فَلَمَّا جَآءَهَا
نُودِىَ أَنۢ بُورِكَ مَن فِى ٱلنَّارِ وَمَنْ حَوْلَهَا وَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ
ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨﴾ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّهُۥٓ أَنَا ٱللَّهُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٩﴾ وَأَلْقِ عَصَاكَ
فَلَمَّا رَءَاهَا تَهْتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنٌّ وَلَّىٰ مُدْبِرًا وَلَمْ يُعَقِّبْ يَٰمُوسَىٰ لَا تَخَفْ
إِنِّى لَا يَخَافُ لَدَىَّ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿١٠﴾ إِلَّا مَن ظَلَمَ ثُمَّ بَدَّلَ حُسْنًۢا بَعْدَ
سُوٓءٍ فَإِنِّى غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١﴾ وَأَدْخِلْ يَدَكَ فِى جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ
غَيْرِ سُوٓءٍ فِى تِسْعِ ءَايَٰتٍ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَقَوْمِهِۦٓ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَٰسِقِينَ
﴿١٢﴾ فَلَمَّا جَآءَتْهُمْ ءَايَٰتُنَا مُبْصِرَةً قَالُوا۟ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿١٣﴾

## تەفسیری سووڕەتی (النمل)

## مەککیە (٩٣) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٦): ﴿ طسٓ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْقُرْءَانِ وَكِتَابٍ مُّبِينٍ ﴿١﴾ هُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ﴿٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ زَيَّنَّا لَهُمْ أَعْمَٰلَهُمْ فَهُمْ يَعْمَهُونَ ﴿٤﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَهُمْ سُوٓءُ ٱلْعَذَابِ وَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ هُمُ ٱلْأَخْسَرُونَ ﴿٥﴾ وَإِنَّكَ لَتُلَقَّى ٱلْقُرْءَانَ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ عَلِيمٍ ﴿٦﴾ ﴾:

خـوا ﷻ بەندەکانـی ئاگـادار دەکاتـەوە لەسـەر مەزنـی قورئـان، وە ئامـاژەی بـۆ دەکات بـە ئاماژەکردنـێ کـە بەڵگەیە لەسـەر بە گـەورە دانـان، فەرموویەتـی: ﴿ طسٓ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْقُرْءَانِ وَكِتَابٍ مُّبِينٍ ﴾ واتـە: ئەمـە بەرزترینـی ئایەتەکانەو بـە هێزترینی ڕوونکراوەکانەو ئاشـکراترینیانە، لەسـەر گەورەترینی داواکاریـەکانو، چاکتریـن مەبەسـتەکانو کـردەوەکان، وە پاکتریـن ڕەوشـتەکان.

کۆمەڵـە ئایەتێکـە بەڵگـەن لەسـەر هەواڵی ڕاسـتو فەرمانە چاکـەکانو قەدەغـە کردن لە هەمـوو ڕەفتارێکی ناشـرینو ڕەوشـتێکی نامۆ،

کۆمەڵـە ئایەتێکـن لـە ڕوونـیو ئاشـکراییاندا بـۆ کەسـە ژیـرەکان وەکـو ڕووناکی خۆر وان، کۆمەڵـە ئایەتێکـن بەڵگـەن لەسـەر بڕواهێنانو بانگەشـە کردن بۆ گەیشـتن بە یەقینو دڵنیایـی، هەواڵیـان داوە دەربارەی غەیبو پەنهانەکانـی ڕابردوو داهاتـوو، پڕاوپڕن لەوانەی کـە ڕوویان داوەو لەوانەیشـی ڕوودەدەن.

کۆمەڵە ئایەتێکن بەڵگەن لەسەر ناسینی پەروەردگاری مەزن بە ناوە جوانەکانیو سیفاتە بەرزەکانیو کردەوە تەواوەکانی، کۆمەڵە ئایەتێکن پێغەمبەرانو پیاو چاکانیان پێ ناساندووین، بە جۆرێ وەسفی کردوون وەکو ئەوەی بە چاو بیان بینین، بەڵام لەگەڵ ئەمەدا زۆرێ لە خەڵکی

سوودیان لێوەرنەگرتووە، وە زۆرێ لە نکوڵیکاران ڕێنماییان لێوەرنەگرتووە، چونکە ئەوانە هیچ خێروو چاکەیەکیان تێدانیە، وە دڵو دەروونیان پاک نیە، بەڵکو هیدایەتی پێ وەرگرتووە ئەوانەی خوا ﷻ ئایەتی کردوون بە بڕواهێنان، وە بە هۆی ئەو ئایەتانەوە دڵەکانیان ڕووناک بوەتەوە، نهێنیەکانیشیان وەسفکراوە، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ هُدَىٰ وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴾ واتە: هیدایەتیان دەدات بۆ گرتنەبەری ڕێگای ڕاست، وە بۆیانی ڕوونکردۆتەوە ئەوەی کە پێویستە بیگرنە بەر یان وازی لێبهێنن، وە مژدەی پێداون بە پاداشتی خوا ﷻ کە بەندە لەسەر ئەو هیدایەتە بۆ ئەم ڕێگایە.

لەوانەیـە بگوتـرێ: بانگەشـەکارانی ئیمـان زۆرن، ئایـا هـەر کەسـێ بانگەشـەی ئیمانداری بـکات ئـەوەی لێوەردەگیـرێ؟ یان ئەوە پێویسـتی بە بەڵگە هەیـە؟ ئەوە ڕاسـتە لەبەرئەمەیە خوا ﷻ سـیفەتی ئیماندارانـی ڕوون کردۆتـەوە، فەرموویەتی:

﴿ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾ (ئەوانـەی نوێژەکانیـان بـە جێ دێنـن) بە فەرزو سـوننەتەکانی، ئـەوەی ئاشـکرایە ئەنجامـی دەدەن لە پایەو مـەرجو پێویسـتیەکانی، بەڵکو پەسندەکانیشـی، وە ئەوەیشـی نهێنـیو پەنهانـە بریتیە لـە گەردنکەچیو کە ئـەوە ڕووحی نـاو نوێژە، بەوەی وا هەسـت بـکات لـە نـاو نوێژەکەیدا خـوا ﷻ نزیکە لێیـەوە، وە ئـەوەی دەیڵـێو ئەنجامی دەدات بیـری لێبکاتەوەو لێـی ڕابمێنێ.

﴿ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ ﴾ (وە زەکاتەکانیـان دەدەن) ئـەوەی فـەرزە بۆ ئەو کەسـانەی شـیاون ﴿ وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ﴾ واتـە: ئیمانەکەیان گەیشـتۆتە پلەی یەقیـنو دڵنیایی، ئەویش زانسـتی تـەواوە کـە دەگـات بـە دڵو بـە کـردەوەش ئەنجامـی دەدات، وە دڵنیابوونیان بە ڕۆژی دوایـی تـەواوی هەوڵو کۆششـیان دەخـوازێ بـۆی، وە ئاگـاداری کردوونەتەوە لە هۆکارەکانـی سـزاو پێویسـت بوونـی تۆڵە، ئەمـە بنەمـاو بنچینەی هەمـوو خێرێکە.

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ ﴾ (بـە ڕاسـتی ئەوانـەی بڕواناهێنـن بـە ڕۆژی دوایـی) وە بـە درۆی دادەنێـن، وە ئـەو کەسـەش بـە درۆ دادەنێـن کـە هاتـووە بـە چەسـپاندنی، ﴿ زَيَّنَّا لَهُمْ أَعْمَٰلَهُمْ فَهُمْ يَعْمَهُونَ ﴾ (کردەوەکانیانمـان ڕازاندۆتـەوە بۆیـان) بۆیـە ئـەوان بەسـەرگەردانیو سەرلێشـێواوی دەسـوڕێنەوە، خەشـمو قینو تووڕەیی خوا ﷻ دەدەن بەسەر ڕەزامەنـدی ئـەودا، بێگومـان حەقیقەتەکانیـان لـە پێـش چـاو هەڵگێڕدراوەتـەوە، ناهەق بە هـەق دەبینـنو هەقیـش بـە ناهەق.

﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَهُمْ سُوٓءُ ٱلْعَذَابِ ﴾ واتە: (ئەوانە کەسـانێکن سـزای) زۆر توندو سـەختو

مەزنیـان بۆ هەیـە ﴿ وَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ هُمُ ٱلۡأَخۡسَرُونَ ﴾ زەرەرمەنـدی کورتهەڵهێنـاوە لەواندا، چونکـە زەرەرو زیانیـان لـە خۆیان داوە لـە ڕۆژی دواییدا، وە ئیمانو بڕوایشـیان لە دەسـت داوە کـە پێغەمبـەران بانگیـان بۆ دەکەن.

﴿ وَإِنَّكَ لَتُلَقَّى ٱلۡقُرۡءَانَ مِن لَّدُنۡ حَكِيمٍ عَلِيمٍ ﴾ واتـە: بەڕاسـتی ئەم قورئانەی کـە دادەبەزێ بۆ سـەرتۆو وەریدەگـری دادەبەزێ لـە لایەن ﴿ حَكِيمٍ ﴾ (کار دروسـت) هەموو شـتەکان لە جێگـای خۆیانـدا دادەنێ بە پێی پلـەو پایەیـان ﴿ عَلِيمٍ ﴾ زانایە بە نهێنی کاروبـارەکان، وە پەنهانیـان لـە لای خوا ﷻ وەک ئاشـکرایان وایە.

جـا ئەگـەر لـە لایـەن ﴿ حَكِيمٍ عَلِيمٍ ﴾ دەردەکـەوێ کە هەمـوو قورئـان کار دروسـتیو بەرژەوەنـدی بەندەکانـی تێدایـە، لـە لایـەن ئـەو کەسـەوە دابەزێنـراوە کـە شـارەزاترە لە خۆیـان بـە بەرژەوەندیەکانیـان.

(٧-١٤): ﴿ إِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِأَهۡلِهِۦٓ إِنِّيٓ ءَانَسۡتُ نَارٗا سَـَٔاتِيكُم مِّنۡهَا بِخَبَرٍ أَوۡ ءَاتِيكُم بِشِهَابٖ قَبَسٖ لَّعَلَّكُمۡ
تَصۡطَلُونَ ٧ فَلَمَّا جَآءَهَا نُودِيَ أَنۢ بُورِكَ مَن فِي ٱلنَّارِ وَمَنۡ حَوۡلَهَا وَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٨
يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّهُۥٓ أَنَا ٱللَّهُ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ٩ وَأَلۡقِ عَصَاكَۚ فَلَمَّا رَءَاهَا تَهۡتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنّٞ وَلَّىٰ مُدۡبِرٗا وَلَمۡ يُعَقِّبۡۚ
يَٰمُوسَىٰ لَا تَخَفۡ إِنِّي لَا يَخَافُ لَدَيَّ ٱلۡمُرۡسَلُونَ ١٠ إِلَّا مَن ظَلَمَ ثُمَّ بَدَّلَ حُسۡنَۢا بَعۡدَ سُوٓءٖ فَإِنِّي غَفُورٞ رَّحِيمٞ
١١ وَأَدۡخِلۡ يَدَكَ فِي جَيۡبِكَ تَخۡرُجۡ بَيۡضَآءَ مِنۡ غَيۡرِ سُوٓءٖۖ فِي تِسۡعِ ءَايَٰتٍ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَقَوۡمِهِۦٓۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمٗا
فَٰسِقِينَ ١٢ فَلَمَّا جَآءَتۡهُمۡ ءَايَٰتُنَا مُبۡصِرَةٗ قَالُواْ هَٰذَا سِحۡرٞ مُّبِينٞ ١٣ وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسۡتَيۡقَنَتۡهَآ
أَنفُسُهُمۡ ظُلۡمٗا وَعُلُوّٗاۚ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ١٤ ﴾:

﴿ إِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِأَهۡلِهِۦٓ إِنِّيٓ ءَانَسۡتُ نَارٗا ﴾ تـا کۆتایـی چیرۆکەکـە، مانـای ئەوەیـە یـادی ئـەم حاڵەتـە بـەرزو بەڕێـزە بکـەرەوە لـە حاڵەتەکانـی مووسـای کـوڕی عیمران، وە سـەرەتای دابەزینـی وەحـیو نیگـا بـۆی پاککردنەوەی بـە پەیامـی خوایـی، وە قسـەکردنی خوا ﷻ لەگەڵیـدا، جـا کاتـێ مووسـا ؑ لـە مەدیـەن بـۆ چەند سـاڵێک مایـەوە، شـەوڕۆیی کرد بـە خێزانەکـەی لـە مەدیەنـەوە بۆ میسـر، کاتێ لـە نێوەنـدی ڕێگاکـەدا بوو وون بـوو، لە شـەوێکی زۆر تاریکی سـاردا بـە منداڵەکانـی وت: ﴿ إِنِّيٓ ءَانَسۡتُ نَارٗا ﴾ واتە: مـن ئاگرێک لـە دوورەوە بـە دیدەکـەم ﴿ سَـَٔاتِيكُم مِّنۡهَا بِخَبَرٍ ﴾ (واتە: بۆ ئـەوەی بە زوویـی هەواڵێکتان بۆ بێنـم) دەربـارەی ڕێگاکـە ﴿ أَوۡ ءَاتِيكُم بِشِهَابٖ قَبَسٖ لَّعَلَّكُمۡ تَصۡطَلُونَ ﴾ (واتـە: یـان گروو بزوسـکی ئـەو ئاگرەتـان بـۆ دێنـم تـا ئێـوە) خۆتانی پـێ گـەرم بکەنـەوە، ئەمـە بەڵگەیە لەسـەر ئـەوەی وون بـووە، وە سـەرماو سـۆڵە زۆری بۆ خـۆیو خێزانەکـەی هێناوە.

﴿ فَلَمَّا جَآءَهَا نُودِيَ أَنۢ بُورِكَ مَن فِي ٱلنَّارِ وَمَنۡ حَوۡلَهَا ﴾ واتـە: خـوا ﷻ بانگـی لێکردوو هەواڵی پێـدا، ئەم شـوێنە شـوێنێکی ڕێز لێگیـراوو پیرۆزە.

لـە بەرەکەتـیو پیـرۆزی ئـەو شـوێنە خـوا ﷻ داینـاوە بـۆ جێگـای قسـەکردنی لەگـەڵ مووسـادا ، وە پێدانـی پەیامەکەی ﴿ وَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ (پـاکو بێگەردە خوای پەروەردگـاری جیهانیـان) لـەوەی گومانـی ناتـەواوی یـان خراپـی پـێ ببـرێ، بەڵکو ئەو تـەواوە لـە وەسـفو کردەوەکیدا.

﴿ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّهُۥٓ أَنَا ٱللَّهُ ﴾ واتـە: خوا هەواڵیداوە کە بەڕاسـتی ئەو زاتەی بانگی مووسـای کرد، ئـەو خوایەیـە کە شایسـتەیە بـە بەندایەتـی بۆ کردنە، تـاکو تەنهایـەو هاوەڵو هاوبەشـی نیـە، هەر وەک لە دەقێکـی دیکەدا فەرموویەتـی: ﴿ إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدۡنِي وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ﴿١٤﴾ ﴾طـه، (واتـە: بەڕاسـتی هــەر من خوام هیچ پەرسـتراوێکی ڕاسـت نیـە جگـە لـە مـن کەواتە من بپەرسـتە بـە چاکـی نوێژ بـە جێبێنـە تا منـت بێتـەوە یاد)، ﴿ ٱلۡعَزِيزُ ﴾ ئـەو زاڵـە بەسـەر هەمـوو شـتەکان، هەمـوو بەدیهێنـراوەکان ملکەچـی بـوون ﴿ ٱلۡحَكِيمُ ﴾ (کاردروسـتە) لـە فەرمانو دروسـتکردنیدا، وە لە حیکمەتو کاردروسـتی خوا ئەوەیـە مووسـای کـوڕی عیمرانی نـاردوە، زانیویەتی مووسـا  شایسـتەی ئەوەیە بیکات بـە نێـردراو وەحی بـۆ دابەزێنـیو قسـەی لەگەڵدا بـکات، وە لـە عیزەتو دەسـەڵاتی خوا ئەوەیـە پێویسـتە پشـتی پێببەسـتی، خەمبار نەبیـت لـەوەی تەنهایـتو دوژمنەکانت زۆرن، بێگومـان نێوچاوانـی ئەوان بە دەسـتی خوایـە، وە جوڵەو وەستانیشـیان بـە بەڕێوەبردنی ئەوە.

﴿ وَأَلۡقِ عَصَاكَ ﴾ (واتـە: گۆچانەکـەت فـڕێ دە) ئەویـش فڕێـی دا ﴿ فَلَمَّا رَءَاهَا تَهۡتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنّٞ ﴾ (واتـە: ئنجـا کاتـێ بینـی وەک تیرەمار دەجوڵـێ) ئەو نێرینـەی ناو مـارەکان بوو، زۆر بـە پەلـە دەجـوڵا ﴿ وَلَّىٰ مُدۡبِرٗا وَلَمۡ يُعَقِّبۡ ﴾ (واتـە: مووسـا  هەڵهـاتو ئـاوڕی نەدایـەوە) لـە ترسـی مارەکـە کاتێ کـە بینـی، وەک سروشـتی مرۆڤی ئاسـایی!

خوا ﷻ پێی فەرموو: ﴿ يَٰمُوسَىٰ لَا تَخَفۡ ﴾ (واتە: ئەی مووسا  مەترسە). وە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿ أَقۡبِلۡ وَلَا تَخَفۡۖ إِنَّكَ مِنَ ٱلۡأٓمِنِينَ ﴿٣١﴾ ﴾القصص، (واتە: خوا فەرمووی: ئەی مووسا وەرە پێشو مەترسە بەڕاستی تۆ لەو کەسانەی بێ باکو بێ ترسن)، ﴿ إِنِّي لَا يَخَافُ لَدَيَّ ٱلۡمُرۡسَلُونَ ﴾ (واتە: بێگومان پێغەمبەران لای من ناترسن)، چونکە هەموو ترسەکان لە چوارچێوەی قەزاو قەدەرو بەڕێوەبردنو فەرمانی خوادان، ئەوانەی خوا تایبەتی کردوون بە پەیامی خۆیو پاڵفتەی کردوون بۆ وەحیو نیگای، نابێ لە هیچ شتێک بترسن جگە لە خوا، بە

تایبەت کاتێ زیاتر نزیک بوونەوەو قسەی کرد لەگەڵیدا.
﴿ إِلَّا مَن ظَلَمَ ثُمَّ بَدَّلَ حُسْنًا بَعْدَ سُوٓءٍ ﴾ واتە: ( بێجگە لە کەسێ کە ستەمی کردبێ پاشان خراپەکەی گۆڕیبێ بە چاکە ئەوە بەڕاستی من لێبوردەی بە بەزەییم، بێگومان ئەو شتەی جێگای ترس و دڵەڕاوکێیە، بە هۆی ئەو زوڵم و ستەمەوەیە کە پێشی خستووە، بەڵام پێغەمبەران چی بۆ ئەوانە لە دڵتەنگی و ترس؟ لەگەڵ ئەمەدا هەرکەسێ ستەم لە نەفس و دەروونی بکا بە سەرپێچی کردنی خوا ﷻ، پاشان تەوبە بکاو بگەڕێتەوە بۆ لای، خوا ﷻ گوناهەکانی بۆ دەکات بە چاکە، وە سەرپێچیەکانی بۆ دەکات بە گوێڕایەڵی، بێگومان خوا ﷻ لێبوردەی بە بەزەییە، با کەس بێ ئومێد نەبێ لە ڕەحمەت و لێبوردەیی خوا ﷻ، بە ڕاستی خوا ﷻ لە هەموو تاوانەکان خۆش دەبێ، ئەو بە بەزەییترە لە بەندەکانی لە باوک و دایکیان زیاتر.
﴿ وَأَدْخِلْ يَدَكَ فِي جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ ﴾ (واتە: دەستت بخە بە باخەڵتدا بە سپێتی و پرشنگداری دێتە دەرەوە) بەبێ بەڵەکی و ناتەواوی، بەڵکو سپیایەتیەکە چاوی تەماشاکەران بەلای خۆیدا ڕادەکێشێ و ناتوانن سەیری بکەن، ﴿ فِي تِسْعِ ءَايَٰتٍ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَقَوْمِهِۦٓ ﴾ واتە: ئەم دوو ئایەت و نیشانەیە گۆڕینی گۆچان بۆ مارێکی ڕێکردوو، وە دەرهێنانی دەست لە گیرفانەوە بە سپێتی لە کۆی ئەو نۆ ئایەت و نیشانەن، کە مووسا ﷺ بانگەشەی فیرعەون و گەلەکەی پێکرد، ﴿ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَٰسِقِينَ ﴾ (بە ڕاستی ئەوانە گەلێکی لە سنوور دەرچوو بوون) بە هۆی شیرک و هاوبەشدانان و کەللەڕەقیان بەرانبەر بەندەکانی خوا ﷻ، وە لووت بەرزیان لەسەر زەویدا بە ناهەق.
پاشان مووسا ﷺ ڕۆیشت بۆ لای فیرعەون و دارو دەستەکەی، وە بانگی کردن بۆ لای خواو ئایەتەکانی نیشاندان، ﴿ فَلَمَّا جَآءَتْهُمْ ءَايَٰتُنَا مُبْصِرَةً ﴾ (واتە: ئنجا کاتێ موعجیزە ئاشکراو) ڕوونەکانی ئێمەیان بۆ هات کە بەڵگەن لەسەر حەق و ڕاستی، هەروەکو چۆن ڕووناکی خۆر دەبینرا ئەو ئایەت و نیشانانەش دەبینران ﴿ قَالُوا۟ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴾ بەوەوە نەوەستان کە تەنها بڵێن جادووە بەڵکو وتیان: ﴿ مُّبِينٌ ﴾ جادوویەکی ئاشکرایە بە لای هەموو کەسەوە. بەڕاستی ئەمە لە سەرسووڕهێنەرترینی سەرسووڕهێنەرەکانە، ئایەتە ڕوون و ئاشکراکان بکرێن بە گاڵتەجاڕی و ئاشکراترین جادوو؟ ئایا ئەمە گەورەترین لووت بەرزی و ناشرینترین گومان و وەهم و خەیاڵ نیە؟


وَجَحَدُوا۟ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ۚ فَٱنظُرْ كَيْفَ
كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ⑭ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ عِلْمًا ۖ
وَقَالَا ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى فَضَّلَنَا عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّنْ عِبَادِهِ ٱلْمُؤْمِنِينَ
⑮ وَوَرِثَ سُلَيْمَٰنُ دَاوُۥدَ ۖ وَقَالَ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ عُلِّمْنَا مَنطِقَ
ٱلطَّيْرِ وَأُوتِينَا مِن كُلِّ شَىْءٍ ۖ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْمُبِينُ ⑯
وَحُشِرَ لِسُلَيْمَٰنَ جُنُودُهُۥ مِنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ وَٱلطَّيْرِ فَهُمْ
يُوزَعُونَ ⑰ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَوْا۟ عَلَىٰ وَادِ ٱلنَّمْلِ قَالَتْ نَمْلَةٌ يَٰٓأَيُّهَا
ٱلنَّمْلُ ٱدْخُلُوا۟ مَسَٰكِنَكُمْ لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَٰنُ وَجُنُودُهُۥ وَهُمْ
لَا يَشْعُرُونَ ⑱ فَتَبَسَّمَ ضَاحِكًا مِّن قَوْلِهَا وَقَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِىٓ
أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَىَّ وَأَنْ أَعْمَلَ
صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَدْخِلْنِى بِرَحْمَتِكَ فِى عِبَادِكَ ٱلصَّٰلِحِينَ
⑲ وَتَفَقَّدَ ٱلطَّيْرَ فَقَالَ مَا لِىَ لَآ أَرَى ٱلْهُدْهُدَ أَمْ كَانَ
مِنَ ٱلْغَآئِبِينَ ⑳ لَأُعَذِّبَنَّهُۥ عَذَابًا شَدِيدًا أَوْ لَأَا۟ذْبَحَنَّهُۥٓ
أَوْ لَيَأْتِيَنِّى بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ㉑ فَمَكَثَ غَيْرَ بَعِيدٍ فَقَالَ
أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ وَجِئْتُكَ مِن سَبَإٍۭ بِنَبَإٍ يَقِينٍ ㉒

﴿ وَجَحَدُوا۟ بِهَا ﴾ واتە: بێبڕواییان کرد بە ئایەتەکانی خواو دانیان پێدا نەدەناو نکوڵیان لێ دەکرد ﴿ وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ﴾ واتە: نکوڵیو ئینکاریان لەسەر بنەمای گومانو دوو دڵی نەبوو، بەڵکو چاک دەیانزانیو دڵنیابوون بەڕاستی ئەو پەیامە ﴿ ظُلْمًا ﴾ بە هۆی ستەمکاریان بە مافی پەروەردگاریانو نەفسی خۆیان ﴿ وَعُلُوًّا ﴾ وە لەبەر خۆ بەزلزانینیان لەسەر هەقو لەسەر بەندەکان، وە لەسەر ملکەچی کردن بۆ پێغەمبەران، ﴿ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴾ (واتە: ئنجا سەرنج بدە سەرەنجامی خراپەکاران چۆن بوو) خراپترین سەرەنجام، خوا لە ناوی بردنو خنکاندنی لە ناو دەریاداو ڕیسواو سووکی کردن، وە ماڵو سەروەتو سامانیانی کردە میراتی لاوازو هەژارەکان لە بەندەکانی خۆی.

(١٥-٤٤): ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ عِلْمًا ۖ وَقَالَا ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى فَضَّلَنَا عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّنْ عِبَادِهِ
ٱلْمُؤْمِنِينَ (١٥) وَوَرِثَ سُلَيْمَٰنُ دَاوُۥدَ ۖ وَقَالَ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ عُلِّمْنَا مَنطِقَ ٱلطَّيْرِ وَأُوتِينَا مِن كُلِّ شَىْءٍ ۖ إِنَّ
هَٰذَا لَهُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْمُبِينُ (١٦) وَحُشِرَ لِسُلَيْمَٰنَ جُنُودُهُۥ مِنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ وَٱلطَّيْرِ فَهُمْ يُوزَعُونَ (١٧)
حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَوْا۟ عَلَىٰ وَادِ ٱلنَّمْلِ قَالَتْ نَمْلَةٌ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّمْلُ ٱدْخُلُوا۟ مَسَٰكِنَكُمْ لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَٰنُ
وَجُنُودُهُۥ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ (١٨) فَتَبَسَّمَ ضَاحِكًا مِّن قَوْلِهَا وَقَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِىٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ
ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَىَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَدْخِلْنِى بِرَحْمَتِكَ فِى عِبَادِكَ
ٱلصَّٰلِحِينَ (١٩) وَتَفَقَّدَ ٱلطَّيْرَ فَقَالَ مَا لِىَ لَآ أَرَى ٱلْهُدْهُدَ أَمْ كَانَ مِنَ ٱلْغَآئِبِينَ
(٢٠) لَأُعَذِّبَنَّهُۥ عَذَابًا شَدِيدًا أَوْ لَأَا۟ذْبَحَنَّهُۥٓ أَوْ لَيَأْتِيَنِّى بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ (٢١) فَمَكَثَ غَيْرَ
بَعِيدٍ فَقَالَ أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ وَجِئْتُكَ مِن سَبَإٍۭ بِنَبَإٍ يَقِينٍ (٢٢) إِنِّى وَجَدتُّ ٱمْرَأَةً
تَمْلِكُهُمْ وَأُوتِيَتْ مِن كُلِّ شَىْءٍ وَلَهَا عَرْشٌ عَظِيمٌ (٢٣) وَجَدتُّهَا وَقَوْمَهَا يَسْجُدُونَ
لِلشَّمْسِ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ فَهُمْ لَا يَهْتَدُونَ (٢٤) أَلَّا

يَسْجُدُواْ لِلَّهِ ٱلَّذِى يُخْرِجُ ٱلْخَبْءَ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَيَعْلَمُ مَا تُخْفُونَ وَمَا تُعْلِنُونَ ﴿٢٥﴾ ٱللَّهُ لَآ
إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٢٦﴾ قَالَ سَنَنظُرُ أَصَدَقْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٢٧﴾ ٱذْهَب
بِّكِتَٰبِى هَٰذَا فَأَلْقِهْ إِلَيْهِمْ ثُمَّ تَوَلَّ عَنْهُمْ فَٱنظُرْ مَاذَا يَرْجِعُونَ ﴿٢٨﴾ قَالَتْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُاْ إِنِّىٓ أُلْقِىَ إِلَىَّ
كِتَٰبٌ كَرِيمٌ ﴿٢٩﴾ إِنَّهُۥ مِن سُلَيْمَٰنَ وَإِنَّهُۥ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣٠﴾ أَلَّا تَعْلُواْ عَلَىَّ وَأْتُونِى مُسْلِمِينَ
﴿٣١﴾ قَالَتْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُاْ أَفْتُونِى فِىٓ أَمْرِى مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمْرًا حَتَّىٰ تَشْهَدُونِ ﴿٣٢﴾ قَالُواْ نَحْنُ أُوْلُواْ
قُوَّةٍ وَأُوْلُواْ بَأْسٍ شَدِيدٍ وَٱلْأَمْرُ إِلَيْكِ فَٱنظُرِى مَاذَا تَأْمُرِينَ ﴿٣٣﴾ قَالَتْ إِنَّ ٱلْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُواْ قَرْيَةً
أَفْسَدُوهَا وَجَعَلُوٓاْ أَعِزَّةَ أَهْلِهَآ أَذِلَّةً ۖ وَكَذَٰلِكَ يَفْعَلُونَ ﴿٣٤﴾ وَإِنِّى مُرْسِلَةٌ إِلَيْهِم بِهَدِيَّةٍ فَنَاظِرَةٌۢ بِمَ
يَرْجِعُ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٣٥﴾ فَلَمَّا جَآءَ سُلَيْمَٰنَ قَالَ أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٍ فَمَآ ءَاتَىٰنِۦَ ٱللَّهُ خَيْرٌ مِّمَّآ ءَاتَىٰكُم بَلْ أَنتُم
بِهَدِيَّتِكُمْ تَفْرَحُونَ ﴿٣٦﴾ ٱرْجِعْ إِلَيْهِمْ فَلَنَأْتِيَنَّهُم بِجُنُودٍ لَّا قِبَلَ لَهُم بِهَا وَلَنُخْرِجَنَّهُم مِّنْهَآ أَذِلَّةً وَهُمْ صَٰغِرُونَ
﴿٣٧﴾ قَالَ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُاْ أَيُّكُمْ يَأْتِينِى بِعَرْشِهَا قَبْلَ أَن يَأْتُونِى مُسْلِمِينَ ﴿٣٨﴾ قَالَ عِفْرِيتٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ أَنَا۠ ءَاتِيكَ
بِهِۦ قَبْلَ أَن تَقُومَ مِن مَّقَامِكَ ۖ وَإِنِّى عَلَيْهِ لَقَوِىٌّ أَمِينٌ ﴿٣٩﴾ قَالَ ٱلَّذِى عِندَهُۥ عِلْمٌ مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ
قَبْلَ أَن يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ ۚ فَلَمَّا رَءَاهُ مُسْتَقِرًّا عِندَهُۥ قَالَ هَٰذَا مِن فَضْلِ رَبِّى لِيَبْلُوَنِىٓ ءَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ ۖ
وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّى غَنِىٌّ كَرِيمٌ ﴿٤٠﴾ قَالَ نَكِّرُواْ لَهَا عَرْشَهَا نَنظُرْ أَتَهْتَدِىٓ أَمْ
تَكُونُ مِنَ ٱلَّذِينَ لَا يَهْتَدُونَ ﴿٤١﴾ فَلَمَّا جَآءَتْ قِيلَ أَهَٰكَذَا عَرْشُكِ ۖ قَالَتْ كَأَنَّهُۥ هُوَ ۚ وَأُوتِينَا ٱلْعِلْمَ مِن قَبْلِهَا وَكُنَّا
مُسْلِمِينَ ﴿٤٢﴾ وَصَدَّهَا مَا كَانَت تَّعْبُدُ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ إِنَّهَا كَانَتْ مِن قَوْمٍ كَٰفِرِينَ ﴿٤٣﴾ قِيلَ لَهَا ٱدْخُلِى ٱلصَّرْحَ ۖ فَلَمَّا
رَأَتْهُ حَسِبَتْهُ لُجَّةً وَكَشَفَتْ عَن سَاقَيْهَا ۚ قَالَ إِنَّهُۥ صَرْحٌ مُّمَرَّدٌ مِّن قَوَارِيرَ ۗ قَالَتْ رَبِّ إِنِّى ظَلَمْتُ
نَفْسِى وَأَسْلَمْتُ مَعَ سُلَيْمَٰنَ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٤﴾ ﴾:

﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ عِلْمًا ۖ وَقَالَا ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى فَضَّلَنَا عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّنْ عِبَادِهِ ٱلْمُؤْمِنِينَ
﴿١٥﴾ وَوَرِثَ سُلَيْمَٰنُ دَاوُۥدَ ﴾ تا كۆتایی چیرۆكو بەسەرهاتەكە، خوا ﷻ لەم قورئانەدا باسی منەتی خۆی دەكات بەسەر داوودو سولەیمانی كوڕەكەیدا، بە زانستی بەرفراوانو زۆر، بە بەڵگەی (التنكیر) نەناسراوی[1]، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ وَدَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ إِذْ يَحْكُمَانِ فِى ٱلْحَرْثِ إِذْ نَفَشَتْ فِيهِ غَنَمُ ٱلْقَوْمِ وَكُنَّا لِحُكْمِهِمْ شَٰهِدِينَ ﴿٧٨﴾ فَفَهَّمْنَٰهَا سُلَيْمَٰنَ ۚ وَكُلًّا ءَاتَيْنَا حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ ﴿٧٩﴾ ﴾الأنبياء، (واتە: یادی داوودو سولەیمانیش بكەرەوە كاتێك بڕیاردرا دەربارەی ئەو كێڵگە كشتوكاڵیە، كاتێك كە مەڕو ماڵاتی خەڵكی تیایدا بڵاو بوونەوە بە شەوو زیانیان بە كێڵگەكە گەیاند، ئێمەش شایەت بووین لەسەر ئەو دادوەریو بڕیاردانە).

١ - وشەی (علم) لە دەقەكەدا بە (نكرة) نەناسراوی هاتووە، نەناسراویش بۆ زۆریە. وەرگێڕ.

﴿ وَقَالَا ﴾ داوودو سولەیمان سوپاسگوزاری پەروەردگاریان کرد لەسەر ئەو منەتە مەزنەی پێی داون بە فێرکردنیان، وتیان: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى فَضَّلَنَا عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّنْ عِبَادِهِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۝١٥ ﴾ سوپاسو ستایشی خوایان کرد لەسەر ئەوەی کردوونی بە بڕوادار، لە خۆشبەختان، ئەوان لە تایبەتمەندەکان بوون، گومانی تێدانیە بڕواداران چوار پلەیان هەیە: چاکەکاران، پاشان لە سەرووی ئەوانەوە شەهیدەکان، پاشان لەسەرووی ئەوانەوە ڕاستگۆیان، پاشان لە سەرووی ئەوانەوە پێغەمبەران.

داوودو سولەیمان لە تایبەتمەندانی ناو پێغەمبەران بوون، ئەگەرچی لە خوار پلەو پایەی خاوەن عەزمەکانەوە بوون، بەڵام لە کۆی پێغەمبەرە بەرێزەکان بوون، ئەوانەی خوا ستایشیانی کردوە بە ناو هێنانیان، وە لە کتێبەکەیدا وەسفی کردوون بە وەسفکردنێکی مەزن، ئەوانیش ستایشی خوایان کردوە لەسەر گەیشتن بەو پلەو پایە. ئەمە ناونیشانی خۆشبەختیو کامەرانی بەندەیە، ئەوەی سوپاسگوزاری خوا بکات لەسەر ئەو نازو نیعمەتە دینیو دونیاییانەی، وە وابزانی هەموو نیعمەتەکان لە لایەن پەروەردگاریەوەیە، خۆی پێیانەوە هەڵنەکێشێو سەری پێیان سوورنەمێنێ، بەڵکو وا ببینێ ئەوە شایستەی سوپاسگوزاریەکی زۆرە، کاتێ وەسفیانی کرد بە هاوبەشی، ئنجا سولەیمانی ﷺ تایبەت کرد بە وەسفکردن، لەبەر ئەوەی خوا موڵکێکی مەزنی پێدابوو، هەندێ پێشهاتی بۆ هاتبووە پێش بۆ باوکی نەهاتبوو، دروودی خوایان لەسەر بێ، جا فەرموویەتی:

(١٦): ﴿ وَوَرِثَ سُلَيْمَـٰنُ دَاوُۥدَ ﴾واتە: سولەیمان زانستو پێغەمبەرایەتیەکەی بە میرات لە باوکیەوە وەرگرت، زانستی باوکیشی داوە پاڵ زانستی خۆی، دەگونجێ زانستی لە باوکیەوە وەرگرتبێ لەو سەردەمەدا، هەروەک باسکرا لە ئایەتی: ﴿ فَفَهَّمْنَـٰهَا سُلَيْمَـٰنَ ﴾ وە گوتی:- بە شوکرانە بژێری خواو ستایشکردنی نازو نیعمەتەکانی-: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ عُلِّمْنَا مَنطِقَ ٱلطَّيْرِ ﴾ واتە: ئەی خەڵکینە! فێری زمانی باڵندەکان کراوین) سولەیمان ﷺ تێگەیشت لە باڵندەکانو ئەوانیش لێی تێدەگەیشتن، هەروەکو چۆن گفتوو گۆی لەگەڵ هوودا کردو ئەویش بە هەمان شێوە، وە وەک تێگەیشت لە قسەی مێروولەکە بۆ مێروولەکەی دیکە، لە داهاتوودا باسی لێوە دەکەین، ئەم زانستە بۆ هیچ کەسێک نەبوو جگە لە سولەیمان نەبێ ﴿ وَأُوتِينَا مِن كُلِّ شَىْءٍ ﴾ واتە: خوا ﷻ هەموو نیعمەتێکی پێبەخشی بوو، وە هەموو هۆکارەکانی دەسەڵاتو هێزو توانا کە بەهیچ یەکێک لە نەوەکانی ئادەمی نەبەخشیوە، لەبەر ئەمەیە داوای لە پەروەردگاری کرد، فەرمووی:

﴿ وَهَبۡ لِي مُلۡكٗا لَّا يَنۢبَغِي لِأَحَدٖ مِّنۢ بَعۡدِيٓۖ ﴿٣٥﴾ ﴾ص، (واتـە: دەسـەڵاتو پادشـاییەکم پـێ ببەخشـە کـە دوای مـن دەسـت نـەدا بـۆ کەسـیتر)، خـوا ﷻ شـەیتانەکانی بۆ ژێردەسـتە کردبـوو، هەرکارێکـی بویسـتایەو لـە توانایـدا نەبووایـە بۆیـان جێبەجـێ دەکـرد، ﴿ إِنَّ هَٰذَا ﴾ واتـە: وە بـای بـۆ ژێربـار کردبـوو بەیانیان تـا نیـوەڕۆ، مانگێک ڕێگـای دەبڕی، وە نیـوەڕۆ تـا ئیوارانیـش مانگێـک ڕێگای دەبـری، ئەوەی خـوا ﷻ پێبەخشـیوین‌و فەزڵی داویـن‌و تایبەتـی کردوویـن ﴿ لَهُوَ ٱلۡفَضۡلُ ٱلۡمُبِينُ ﴾ واتـە: ڕوون‌و ئاشـکرا، دانـی نـا بـە نیعمەتەکانـی خـوادا، بـە تەواوتریـن دانپێدانان.

(١٧): ﴿ وَحُشِرَ لِسُلَيۡمَٰنَ جُنُودُهُۥ مِنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ وَٱلطَّيۡرِ فَهُمۡ يُوزَعُونَ ﴾ واتـە: سـەربازێکی زۆری بـێ شـوماری جۆراو جۆر بۆ سـولەیمان کۆکرایـەوە، لە نەوەکانی ئـادەم‌و لە جنۆکەو شـەیتانەکان‌و لـە باڵندەکان، ئەوان دەسـتە دەسـتە نمایش دەکـران‌و ڕێکدەخران، سـەرەتاو کۆتاییـان بـۆ دیـاری کرابـوو، بـە جوانتریـن شـێوەی سـوپا ڕێکخرابـوون لە ڕۆیشـتن‌و دابەزینیانـدا، خۆیـان ئامادە کردبـوو بە چاکترین شـێوە، هەموو ئەو سـەربازانە ڕێکخرابوون بـە فەرمانـی ئەو، نەیـان دەتوانی سـەرپێچی بکـەن‌و لێی یاخی ببـن، خـوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ هَٰذَا عَطَآؤُنَا فَٱمۡنُنۡ أَوۡ أَمۡسِكۡ بِغَيۡرِ حِسَابٖ ﴿٣٩﴾ ﴾ص، (واتـە: ئەمـە بەخششـی ئێمەیـە بـۆ تـۆ ئـەی سـولەیمان تۆش دەبەخشـی، یان نابەخشـی لێپرسـینەوەت نیـەو خۆت سەربەسـتیت) واتـە: ببەخشـە بەبـێ لێپرسـینەوە، جا ڕێگـای گرتە بەر بـەم سـەربازە مەزنانەوە لـە هەندێ لە سـەفەرو گەشـتەکانیدا.

﴿ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَوۡاْ عَلَىٰ وَادِ ٱلنَّمۡلِ قَالَتۡ نَمۡلَةٞ ﴾ (واتـە: هەتـا گەیشـتە دۆڵـی مێرولـە، مێرولـە مێینەیـەک وتـی:) هاوڕەگەزەکانی ئاگادار کـردەوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّمۡلُ ٱدۡخُلُواْ مَسَٰكِنَكُمۡ لَا يَحۡطِمَنَّكُمۡ سُلَيۡمَٰنُ وَجُنُودُهُۥ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴾ ئـەم مێروولەیـە ئامۆژگـاری کـرد، مێروولەکانیـش بیسـتیان بە خۆیـان، دەکرێ خـوا بیسـتنێکی دابێت بە مێرولە لـە دەرەوەی عـورف‌و عـادەت بێـت، چونکـە ئاگادارکردنەوەکە بـۆ مێرولەکانە، کە هەموو شـیوەکە بە دەنگـی یـەک مێروولە پـڕ بوو، ئەمـە شـتێکی زۆر سەرسـوڕهێنەرە.

یـان ئەوەیـە دەووروبەری ئاگـادار کردوەتەوە پاشـان هەواڵەکە دەسـتاو دەسـتی کردوە تا گەیشـتووەتە هەمـوو، وە فەرمانـی پێکـردوون بـە ئاگـادار کردنەوە، بـۆ ئـەوەی بچنە ناو شوێنەکانیانەوە.

ئـەو مێروولـە مەزنـی حاڵەتی سـولەیمان‌و سـەربازەکانی‌و گەورەیـی دەسـەڵاتی زانیوە، وە

داوای عــوزرو بیانــووی بــۆ هێناونەتــەوە، کــە ئەوان ئەگەر بتانشــێلن مەبەســتیان ئــەوە نیەو هەســتی پێنا کــەن، ســولەیمان ئەمەی بیســتو لێی تێگەیشــت.

﴿ فَتَبَسَّمَ ضَاحِكًا مِّن قَوْلِهَا ﴾ (واتــە: ئنجــا زەردەخەنــەی کــرد لە قســەی ئــەو مێروولە) ســولەیمان ﷺ ســەری ســوڕما لە قســەکەی‌و زمان پاراوی‌و ئامۆژگاری‌و جوانی دەربڕینی، ئەمــە حاڵــی پێغەمبەرانــە، پڕە لــە ئەدەبی تــەواو لە شــوێنی خۆیدا، ئــەوان پێکەنینیــان تەنها بــزەی ســەر لێــوە، وەکو چــۆن پێغەمبــەر ﷺ تــەواوی پێکەنینــی زەردە خەنە بــوو، بێگومان قاقــای پێکەنیــن بەڵگەیــە لەســەر کــەم عەقڵــی‌و نەبوونــی پــەروەردە، وە نەبوونــی بــزەی پێکەنیــن، وە لە خۆبایی بوون لە ئاســتی شــتێکی سەرســوڕهێنەردا بەڵگەیە لەســەر ناشــرینی ڕەوشــتو خۆ بــەزل زانیــن، پێغەمبەران پــاکو بێگــەردن لەوە.

وە ســولەیمان سوپاســگوزاری خوای کــرد کــە گەیاندوویەتی بەم حاڵــە، فەرمووی: ﴿ رَبِّ أَوْزِعْنِي ﴾ واتــە: ئیلهامم بۆ بکەو ســەرکەوتووم بکــە ﴿ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَالِدَيَّ ﴾ (واتــە: کــە سوپاســی ئــەو چاکــەو نیعمەتانەت بکەم کە ڕشــتووتە بەســەر من‌و دایکو باوکمدا) بەڕاســتی نیعمەت بەســەر دایــکو باوکەوە نیعمەتە بەســەر منداڵیش. داوای کــرد لــە خوا ســەرکەوتووی بکات بەسوپاســگوزاری نیعمەتــە ئاینــی‌و دنیاییەکانیدا، لەســەری‌و لەســەری دایــکو باوکــی ﴿ وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحًا تَرْضَاهُ ﴾ واتــە: ســەرکەوتووم بکــە بــۆ ئــەوەی کــردەوەی چــاک بکــەم تــۆ پێــی ڕازی بیــت، چونکە بــە پێــی فەرمانی تۆیــەو تەنها لەبەر تۆیە، ســەلامەتە لــە خراپەو ناتەواویــەکان ﴿ وَأَدْخِلْنِي بِرَحْمَتِكَ ﴾ کە بەهەشــتە ﴿ فِي ﴾ لە کــۆی ﴿ عِبَادِكَ الصَّالِحِينَ ﴾ (بەندە چاکەکانت)، بەڕاســتی بەزەیی خــوا دانراوە بــۆ پیاوچاکان لەســەر جیاوازی پلــەو پایەکانیــان، ئەمە نموونەیەکە خوا باســی کــردوە دەربارەی حاڵی ســولەیمان ﷺ لە کاتی بیســتنی قســەی مێرولەکــەو بانگ کردنی.

(٢٠): پاشــان نموونەیەکــی دیکــە بــاس دەکات ئەویــش دواندنێتــی لەگــەڵ باڵنــدەدا، جــا فەرموویەتــی: ﴿ وَتَفَقَّدَ الطَّيْرَ ﴾ (واتــە: جــا ســولەیمان چــاوی بــە باڵندەکانــدا گێــڕا)، بەڵگەیە لەســەر ســوور بوونی تەواوی بــۆ جوان ڕێکخســتنی ســەربازەکانی، وە بەڕێوەبردنی کاروبــارە بچــووکو گەورەکانیان بە خودی خۆی، هەتا ئەم کارەی پشــت گوێ نەخســت، ئەویــش بەســەر کردنــەوەی باڵنــدەکان بــوو، وە ســەرنجدانیان بوو بــەوەی ئایــا هەموویان مــاون، یــان شــتێکیان لــێ ون نەبووە؟ ئەمــە مانای دەقەکەیــە، هیچی نەکردوە ئەو کەســەی وتوویەتــی: ســولەیمان ﷺ باڵندەکانــی بەســەر کــردەوە بــۆ ئەوەی تەماشــا بــکات پەپولە

سولەیمانەکە لە کوێیە، بۆ ئەوەی ڕێنیشاندەری بێت بۆ دووری ئاوو نزیکی، هەروەکو پێیان وابوو پەپولە سولەیمانە ئاو دەبینی لە قوڵایی ناو زەویدا، ئەو قسەیە بەڵگەی لەسەر نیە، بەڵکو بەڵگەی عەقڵی بێژەیی ئاماژەن لەسەر پووچی ئەو قسەیە.

بەڵام بەڵگەی عەقڵی ئەگەر مەبەست پێی ئەم مانایە بوایە، دەیگوت: داوای پەپولە سولەیمانەکەی کرد بەڵکو تەماشای ئاوی بۆ بکات، کاتێ بزری کرد ئەوەی وتی، یان گەڕا بە دوای پەپولە سولەیمانەدا، هاوشێوەی ئەم دەستەواژانە. بەڵکو لەبەر ئەوە کەوتە پشکنینی باڵندەکان، تا تەماشای ئامادە بووانو ئامادەنەبووان بکات، وە پابەندبوون بە شوێنو جێگاکانی خۆیانەوە کە بۆی ئامادە کردوون. هەروەها سولەیمان ﷺ پێویستو ناچار نەبوو بە ئاو، تا پێویستی بە ئەندازیاری پەپوولە سولەیمانە بێ. ئەو چەندین شەیتانو عفریتە گەورەکانی لابوو کە دەیانتوانی ئاوی بۆ دەربێنن هەرچەندە لە قوڵایی زەویدا بێ، وە خوا ﷻ بای بۆ ژێربار کردبوو بەیانیان تا نیوەڕۆ، مانگێک ڕێگای دەبڕی، وە نیوەڕۆ تا ئێوارانیش مانگێک ڕێگای دەبڕی، چۆن لەگەڵ ئەمەدا پێویستی بە پەپوولە سولەیمانە دەبێ؟!

ئەم تەفسیرانەی ئەمانەی تێدایەو لەسەر زمانەکان بڵاو بوونەتەوە، جگە لەوان کەسانی تر نایزانێ، ئەو قسانە لە نەوەکانی ئیسرائیلەوە گواستراوەتەوە، ئەو کەسەیشی گواستیەتیەوە بێئاگایە لەوەی پێچەوانەی مانا ڕاستەقینەکانی قورئانە، پاشان بە بەردەوامی دەگوازرێتەوە هەموو کۆمەڵێ لە کۆمەڵەکەی پێشووی وەریدەگرێ، هەتا وادەبینرێ کە ئەوە ڕاستە، ئەو قسە ناشرینانە لە تەفسیرەکاندا هەیە، ئەو بێ مانایانە دەکەونە ناو ئەو تەفسیرانەوە، کەسی ژیرو عاقڵ دەزانێ ئەم قورئانە پیرۆزە عەرەبیە ڕوونو ڕەوانە، کە خوا ﷻ لەگەڵ هەموو خەڵکیدا پێی دواوە بە زاناو نەفامیان، وە فەرمانی پێکردوون بیر لە واتاکانی بکەنەوە، وە جێبەجێی بکەن لەسەر ئەو بێژە عەرەبیانەی ماناکانیان ناسراوە، ئەوەی عەرەبەکان لەلایان ناڕوون نیە، جا ئەگەر کۆمەڵە قسەیەکی بیست گواستراوەتەوە لە غەیری پێغەمبەر ﷺ ئەوە دەیگەڕێنێتەوە بۆ ئەم بنەمایە، ئنجا ئەگەر گونجاو بوو لەگەڵیدا قبوڵی دەکاو وەریدەگرێ، چونکە بێژەکە بەڵگەیە لەسەری، وە ئەگەر پێچەوانەی بوو لە ڕووی بێژەو واتاوە، یان بێژە یان واتا، ڕەتی دەکاتەوەو سوور دەبێ بە پووچیو بەتاڵی، چونکە پێچەوانەی ئەو بنچینەیەی لەلایە، ئەویش ناسینەوەیەتی لە واتای قسەکردنو دیلالەتی.

وە بەڵگـە لەسـەر پشـکنینی سـولەیمان ﷷ بـۆ باڵنـدەکانو دیارنەمانی پەپوولە سـولەیمانە بەڵگەیـە لەسـەر تەواوی ڕێکخسـتنی کاروباری پاشـایەتی بـە خودی خۆی، هەتا ئـەم باڵندە بچکۆلەیـە وون بـوو ﴿ فَقَالَ مَالِيَ لَآ أَرَى ٱلۡهُدۡهُدَ أَمۡ كَانَ مِنَ ٱلۡغَآئِبِينَ ﴾ واتە: ئایا نەبینینـی پەپوولـە سـولەیمانە بـۆ کەمـی وردنەبوونـەوەی مـن دەگەڕێتـەوە، لەبـەر ئەوەی شـاراوەیە لەنـاو ئـەم گەلـە زۆرو زەبەندەدا، یـان ئەوەیە ڕۆیشـتوە بـە بێ ئیـزنو مۆڵەتو فەرمانـی من؟

(٢١): جـا لـەو کاتـەدا لێـی تـووڕە بـوو هەڕەشـەی لێکـردوو وتـی: ﴿ لَأُعَذِّبَنَّهُۥ عَذَابًا شَدِيدًا ﴾ (واتە: سـوێند بێت ئەبێ سـزایەکی زۆر سـەختی بدەم) لە خوار کوشتنەوە ﴿ أَوۡ لَأَاْذۡبَحَنَّهُۥٓ أَوۡ لَيَأۡتِيَنِّي بِسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٖ ﴾ واتـە: (یـان سـەری ببڕن)، یـان دەبـێ بیانوویەکی ڕوونـم بـۆ بهێنێ لەسـەر دواکەوتنی، ئەمـەش لە تـەواوی وەرعو ویژدانی سـولەیمانە ﷷ ئـەو سـوێندی نەخـوارد تەنها بە سـزادان یان کوشـتنی، چونکە ئـەوە نابێ تەنها بـۆ تاوانبار نەبـێ، وە دیـار نەبوونـی پەپوولـە سـولەیمانە دەگونجـێ بیانوویەکـی ڕوونی هەبـێ، لەبەر ئـەوە جیـای کردۆتەوە بـە هـۆی وەرعو ووردبینیەوە.

(٢٢): ﴿ فَمَكَثَ غَيۡرَ بَعِيدٖ ﴾ واتـە: (سـولەیمان زۆر چاوەڕێـی نەکـرد) پاشـان پەپوولە گەڕایـەوە، ئەمـەش بەڵگەیـە لەسـەر هەیبـەتو بـە گـەورە دانانـی سـولەیمان ﷷ لە لای سـەربازەکانی، وە گرنگیدانـی تەواویـان بـە فەرمانەکانی، تەنانـەت ئەم پەپوولە سـولەیمانە کـە دواکەوتـووە بـە هـۆی عـوزرو بیانـووەوە نەیتوانـی بـۆ ماوەیەکـی زۆر دوابکەوێت ﴿ فَقَالَ ﴾ بـە سـولەیمانی وت: ﴿ أَحَطتُ بِمَا لَمۡ تُحِطۡ بِهِۦ ﴾ واتـە: مـن زانسـتێکم لەلایە لـە لای تـۆ نیەو پێـت نەزانیوە، لەگـەڵ ئەوەی خـاوەن زانسـتی بەرفراوانو پلـەی بەرزیت ﴿ وَجِئۡتُكَ مِن سَبَإِۭ ﴾ (وە هەواڵـم بـۆ هێنـاوی) دەربـارەی هۆزێکـی ناسـراو لـە یەمەن ﴿ بِنَبَإٖ يَقِينٍ ﴾ واتـە: بـە هەواڵێکـی ڕاسـتو دروسـتو دڵنیاکـەر، پاشـان ئـەم هەواڵـەی تەفسـیر کـردو وتی:

إِنِّي وَجَدتُّ ٱمۡرَأَةٗ تَمۡلِكُهُمۡ وَأُوتِيَتۡ مِن كُلِّ شَيۡءٖ وَلَهَا
عَرۡشٌ عَظِيمٞ ٢٣ وَجَدتُّهَا وَقَوۡمَهَا يَسۡجُدُونَ لِلشَّمۡسِ
مِن دُونِ ٱللَّهِ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ فَصَدَّهُمۡ عَنِ ٱلسَّبِيلِ
فَهُمۡ لَا يَهۡتَدُونَ ٢٤ أَلَّا يَسۡجُدُواْۤ لِلَّهِ ٱلَّذِي يُخۡرِجُ ٱلۡخَبۡءَ فِي
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَيَعۡلَمُ مَا تُخۡفُونَ وَمَا تُعۡلِنُونَ ٢٥ ٱللَّهُ
لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡعَظِيمِ۩ ٢٦ ۞قَالَ سَنَنظُرُ
أَصَدَقۡتَ أَمۡ كُنتَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ٢٧ ٱذۡهَب بِّكِتَٰبِي هَٰذَا
فَأَلۡقِهۡ إِلَيۡهِمۡ ثُمَّ تَوَلَّ عَنۡهُمۡ فَٱنظُرۡ مَاذَا يَرۡجِعُونَ ٢٨ قَالَتۡ يَٰٓأَيُّهَا
ٱلۡمَلَؤُاْ إِنِّيٓ أُلۡقِيَ إِلَيَّ كِتَٰبٞ كَرِيمٌ ٢٩ إِنَّهُۥ مِن سُلَيۡمَٰنَ وَإِنَّهُۥ
بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ٣٠ أَلَّا تَعۡلُواْ عَلَيَّ وَأۡتُونِي مُسۡلِمِينَ ٣١
قَالَتۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَؤُاْ أَفۡتُونِي فِيٓ أَمۡرِي مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمۡرًا حَتَّىٰ
تَشۡهَدُونِ ٣٢ قَالُواْ نَحۡنُ أُوْلُواْ قُوَّةٖ وَأُوْلُواْ بَأۡسٖ شَدِيدٖ وَٱلۡأَمۡرُ
إِلَيۡكِ فَٱنظُرِي مَاذَا تَأۡمُرِينَ ٣٣ قَالَتۡ إِنَّ ٱلۡمُلُوكَ إِذَا دَخَلُواْ قَرۡيَةً
أَفۡسَدُوهَا وَجَعَلُوٓاْ أَعِزَّةَ أَهۡلِهَآ أَذِلَّةٗۚ وَكَذَٰلِكَ يَفۡعَلُونَ ٣٤
وَإِنِّي مُرۡسِلَةٌ إِلَيۡهِم بِهَدِيَّةٖ فَنَاظِرَةُۢ بِمَ يَرۡجِعُ ٱلۡمُرۡسَلُونَ ٣٥

(٢٣): ﴿ إِنِّي وَجَدتُّ ٱمۡرَأَةٗ تَمۡلِكُهُمۡ ﴾ واتــە: ئافرەتێکــم بینــی پاشــایەتی هــۆزی ســەبەئی دەکــرد، ئــەو ئافرەتــە ﴿ وَأُوتِيَتۡ مِن كُلِّ شَيۡءٖ ﴾ واتــە: هەمــوو شــتێکی پاشــایەتی پێــدراوە لــە مــاڵو چــەکو ســەربازو قــەڵاو هاوشــێوەکانی ﴿ وَلَهَا عَرۡشٌ عَظِيمٞ ﴾ واتــە: کورســی موڵــکو دەســەڵاتەکەی کە لەســەری دادەنیشێ زۆر گەورەیــە، گەورەیــی کورســی بەڵگەیــە لە ســەر مەزنــی دەســەڵاتو هێــزوو زۆری پیــاوی راوێــژکار.

(٢٤): ﴿ وَجَدتُّهَا وَقَوۡمَهَا يَسۡجُدُونَ لِلشَّمۡسِ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ واتــە: ئــەوان موشــریکو هاوەڵدانــەر بــوون خۆریــان دەپەرســت ﴿ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ ﴾ وایــان دەزانــی ئــەوەی ئــەوان لەســەری دەڕۆن هــەقو راســتە ﴿ فَصَدَّهُمۡ عَنِ ٱلسَّبِيلِ ﴾ ((واتــە: بەو هۆیــەوە ڕێگری کردوون لە ڕێگای ڕاســت))، ﴿ فَهُمۡ لَا يَهۡتَدُونَ ﴾ چونکــە ئــەو کەســەی کە پێی وایە ئەو لەســەر حەقە هیــچ ئومێدێک بــۆ هیدایــەت وەرگرتنــی نیە هەتــا بیرو بــڕوای دەگــۆڕێ.

پاشــان فەرموویەتــی: ﴿ أَلَّا ﴾ واتــە: دە بــۆ ﴿ يَسۡجُدُواْۤ لِلَّهِ ٱلَّذِي يُخۡرِجُ ٱلۡخَبۡءَ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾ واتــە: (کڕنــووش نابــەن بــۆ ئــەو زاتــەی) زانایــە بــە شــاراوەکان لــە هەمــوو ئاســمانەکانو زەوی، لــە بەندیهێنەرە بچووکــەکانو تۆوی ڕووەکەکانو شــاراوەی دڵەکان، وە شــاراوەی ئاســمانو زەوی بەدیــار دەخــات، بە دابەزاندنی باران ســەوز کردنــی ڕووەک، وە شــاراوەی زەوی دەردەهێنــێ لــە کاتــی فــوو کردن بــە صــوردا، وە دەرهێنانــی مردووان لــە زەویــدا، بۆ ئــەوەی پاداشــتیان بداتــەوە بــە پێــی کردەوەکانیــان، ﴿ وَيَعۡلَمُ مَا تُخۡفُونَ وَمَا تُعۡلِنُونَ ﴾ (واتــە: دەشــزانێ چــی دەشــارنەوەو چیش ئاشــکرا دەکەن).

(٢٥): ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾ واتــە: بەندایەتــیو ملکــەچ بــوونو زەلیلــیو خۆشەویســتی شایســتە نیــە تەنها بۆ خــوا نەبێ، چونکە پەرســتراوە، خاوەن ســیفاتی تەواوەو نــازو نیعمەتی

پێویستە بۆ ئەو مەبەستە ﴿ رَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡعَظِيمِ ﴾ (واتە: پەروەردگاری عەرشی مەزنە) عەرش بریتیە لە سەقفی هەموو بەدیهێنراوەکان، وە دەوری ئەرزو ئاسمانەکانی داوە، بێگومان ئەم پاشایە خاوەن دەسەڵاتی مەزنو پێگەی گەورەیە، تەنها بۆ ئەو زەلیلو گەردنکەچ دەبنو سوژدەی بۆ دەبەن، پەپوولە سولەیمانەی پاراست کاتێ ئەم هەواڵە مەزنەی هێنا، سولەیمان ﷺ سەری سوورما لەو هەواڵە شاراوەیە.

(٢٧-٢٨): سولەیمان ﷺ بە کەماڵی عەقڵیەوە وتی: ﴿ سَنَنظُرُ أَصَدَقۡتَ أَمۡ كُنتَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ٢٧ ٱذۡهَب بِّكِتَٰبِي هَٰذَا ﴾ وە لە داهاتوودا دەقەکەی دێ، ﴿ فَأَلۡقِهۡ إِلَيۡهِمۡ ثُمَّ تَوَلَّ عَنۡهُمۡ ﴾ واتە: (فڕێی بدە بۆیان) ئنجا لێیان دوور بکەوەرەوە ﴿ فَٱنظُرۡ مَاذَا يَرۡجِعُونَ ﴾ واتە: (پاشان سەرنج بدە چ وڵامێک دەگەڕێننەوە) بۆ تۆ، وە چی دەربارەی دەڵێن.

(٢٩): پەپوولە سولەیمانە نامەکەی لەگەڵ خۆی برد هاویشتی بەسەر پاشادا، پاشاکەش بە گەلەکەی وت: ﴿ إِنِّيٓ أُلۡقِيَ إِلَيَّ كِتَٰبٞ كَرِيمٌ ﴾ واتە: (بە ڕاستی من نامەیەکی) بەڕێزو بە نرخم بۆ هاوێژراوە لەلایەن گەورەترین پاشاکانی سەر زەویەوە، پاشان ناوەڕۆکی نامەکەی بۆیان روون کردەوەو وتی:

(٣٠-٣١): ﴿ إِنَّهُۥ مِن سُلَيۡمَٰنَ وَإِنَّهُۥ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ٣٠ أَلَّا تَعۡلُواْ عَلَيَّ وَأۡتُونِي مُسۡلِمِينَ ﴾ (واتە: بە ڕاستی ئەو نامە بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان دەستی پێکردوە) واتە: خۆتان بە گەورە مەزانن بە سەرمەوە، بەڵکو ملکەچی فەرمانو دەسەڵاتم بن، وە ڕووم تێبکەن بە مسوڵمانێتی، ئەمە لە ئەو پەڕی کورتیە لەگەڵ ڕوونکردنەوەی تەواودا، ئەو نامەیە قەدەغە کردنی خۆبەزلزانینی ئەوان لەخۆ دەگرێ بەسەر سولەیمانەوە، وە مانەوەیان لەسەر ئەو حاڵەی تیایدان، وە ملکەچ بوونی فەرمانەکانو گوێڕایەڵی کردنو ڕۆشتنیان بۆ لای و بانگەواز کردنیان بۆ ئیسلام.

ئەم دەقە ئەوەی تێدایە کە پەسندە کتێب بە ناوی خوا ﷻ دەست پێبکرێ، وە پێشخستنی ناو لە سەرەتای ناونیشانی کتێبەکەدا، لە ژیریو عاقڵی ئەو پاشایە ئەوەبوو کە دەسەڵاتدارانی گەلەکەی کۆکردەوەو پێی گوتن:

(٣٢): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَؤُاْ أَفۡتُونِي فِيٓ أَمۡرِي ﴾ واتە: دەربارەی ئەم کارە هەواڵم بدەنێ چۆن وەڵامی بدەینەوە، ئایا بچینە ژێر فەرمانیەوەو گوێڕایەڵی بکەین، یان چی بکەین؟ ﴿ مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمۡرًا حَتَّىٰ تَشۡهَدُونِ ﴾ واتە: من هیچ فەرمانێک ناکەم بەبێ وەرگرتنی بۆچوونو ڕاوێژ پێ کردنتان.

(٣٣): ﴿ قَالُوا۟ نَحۡنُ أُو۟لُوا۟ قُوَّةٖ وَأُو۟لُوا۟ بَأۡسٖ شَدِيدٖ ﴾ واتــە: ئەگــەر قســەکەی ڕەت بکەیتەوە نەچیتە ژێــر فەرمانــی ئــەوە ئێمــە لــە جەنگــدا خاوەنــی ئازایەتیــن، ئــەوان بــۆ لای ئــەم بۆچوونە چــوون، بــەو جــۆرەی ئەگــەر ڕووی بدایــە ئەوە خــاکوماڵیــان وێــران دەبــوو، هەروەها ئــەوان لەســەر ئــەم بۆچوونــە یــەک دەنــگ نەبوون، کــە بریتیــە لــە هەڵبژاردنــی جەنگ، بەڵکــو وتیــان: ﴿ وَٱلۡأَمۡرُ إِلَيۡكِ ﴾ واتــە: فەرمانو بڕیاریش بە دەســتی تۆیە، چونکــە دەیانزانی خــاوەن عەقڵو ژیریو دڵســۆزە بۆیــان ﴿ فَٱنظُرِي ﴾ واتــە: بیرکردنەوەیەکی قووڵ ﴿ مَاذَا تَأۡمُرِينَ ﴾ (واتــە: چ فەرمانێــک دەدەیت).

(٣٤): ﴿ إِنَّ ٱلۡمُلُوكَ إِذَا دَخَلُوا۟ قَرۡيَةً أَفۡسَدُوهَا ﴾ (واتــە: هــەر کاتــێ بــە زۆر چوونــە شــارێکەوە وێرانــی دەکــەن) بــە کوشــتنو بەدیلگرتــنو تــاڵان کردنی مــاڵو ســامانیانو تێکدانــی شــارو وڵاتیــان ﴿ وَجَعَلُوٓا۟ أَعِزَّةَ أَهۡلِهَآ أَذِلَّةٗ ﴾ واتە: دەســەڵاتدارو گــەورە پیاوانی نــاو خەڵکــی زەلیل دەکــەن، واتە: ئەمە بــۆ چوونێکی بێهێــزە، هەروەها گوێڕایەڵیشــی ناکەم پێــش تاقیکردنــەوە، بــە ناردنی نێــردراو بۆ ناویــان تا بارودۆخیان ئاشــکرا بــکات، ئەو کاتە ئەزانیــن چــی دەکەین، پاشــاکە وتی:

(٣٥): ﴿ وَإِنِّي مُرۡسِلَةٌ إِلَيۡهِم بِهَدِيَّةٖ فَنَاظِرَةُۢ بِمَ يَرۡجِعُ ٱلۡمُرۡسَلُونَ ﴾ (واتــە: جــا مــن دیاریەکی بــە نرخیان بــۆ دەنێرم، ئنجا چــاوەڕوان دەکــەم بزانم نێــردراوەکان بە چیــەوە دەگەڕێنەوە)، ئایا ســولەیمان بەردەوامە لەســەر بۆچوونو قســەی خۆی؟ یان دیاریەکــە فێڵێکی لێدەکاتو بۆچوونــی دەگۆڕێــت، وە بزانم بارودۆخی ســەربازەکانی چۆنە؟

فَلَمَّا جَآءَ سُلَيۡمَٰنَ قَالَ أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٖ فَمَآ ءَاتَىٰنِۦَ ٱللَّهُ خَيۡرٞ مِّمَّآ
ءَاتَىٰكُم بَلۡ أَنتُم بِهَدِيَّتِكُمۡ تَفۡرَحُونَ ٣٦ ٱرۡجِعۡ إِلَيۡهِمۡ فَلَنَأۡتِيَنَّهُم
بِجُنُودٖ لَّا قِبَلَ لَهُم بِهَا وَلَنُخۡرِجَنَّهُم مِّنۡهَآ أَذِلَّةٗ وَهُمۡ صَٰغِرُونَ ٣٧
قَالَ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَؤُاْ أَيُّكُمۡ يَأۡتِينِي بِعَرۡشِهَا قَبۡلَ أَن يَأۡتُونِي مُسۡلِمِينَ
٣٨ قَالَ عِفۡرِيتٞ مِّنَ ٱلۡجِنِّ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبۡلَ أَن تَقُومَ مِن مَّقَامِكَ
وَإِنِّي عَلَيۡهِ لَقَوِيٌّ أَمِينٞ ٣٩ قَالَ ٱلَّذِي عِندَهُۥ عِلۡمٞ مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ أَنَا۠
ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبۡلَ أَن يَرۡتَدَّ إِلَيۡكَ طَرۡفُكَ فَلَمَّا رَءَاهُ مُسۡتَقِرًّا عِندَهُۥ
قَالَ هَٰذَا مِن فَضۡلِ رَبِّي لِيَبۡلُوَنِيٓ ءَأَشۡكُرُ أَمۡ أَكۡفُرُ وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا
يَشۡكُرُ لِنَفۡسِهِۦ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّي غَنِيّٞ كَرِيمٞ ٤٠ قَالَ نَكِّرُواْ لَهَا
عَرۡشَهَا نَنظُرۡ أَتَهۡتَدِيٓ أَمۡ تَكُونُ مِنَ ٱلَّذِينَ لَا يَهۡتَدُونَ ٤١ فَلَمَّا
جَآءَتۡ قِيلَ أَهَٰكَذَا عَرۡشُكِ قَالَتۡ كَأَنَّهُۥ هُوَ وَأُوتِينَا ٱلۡعِلۡمَ مِن قَبۡلِهَا
وَكُنَّا مُسۡلِمِينَ ٤٢ وَصَدَّهَا مَا كَانَت تَّعۡبُدُ مِن دُونِ ٱللَّهِ إِنَّهَا كَانَتۡ مِن
قَوۡمٖ كَٰفِرِينَ ٤٣ قِيلَ لَهَا ٱدۡخُلِي ٱلصَّرۡحَ فَلَمَّا رَأَتۡهُ حَسِبَتۡهُ لُجَّةٗ
وَكَشَفَتۡ عَن سَاقَيۡهَا قَالَ إِنَّهُۥ صَرۡحٞ مُّمَرَّدٞ مِّن قَوَارِيرَ قَالَتۡ رَبِّ
إِنِّي ظَلَمۡتُ نَفۡسِي وَأَسۡلَمۡتُ مَعَ سُلَيۡمَٰنَ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٤٤

(٣٦): ئنجا دیاریەکی بۆ سولەیمان نارد، بە نێردراوانێکدا لە پیاوی ژیرو تێگەیشتووی گەلەکەی، وە ئەوانەی خاوەن بۆچوونی پەسندن لە ناویاندا ﴿فَلَمَّا جَآءَ سُلَيۡمَٰنَ﴾ واتە: کاتێ نێردراوەکان دیاریان بۆ سولەیمان هێنا، ﴿قَالَ﴾ بە توورەیی‌و وەڵامنەدانەوەیانەوە وتی: ﴿أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٖ فَمَآ ءَاتَىٰنِۦَ ٱللَّهُ خَيۡرٞ مِّمَّآ ءَاتَىٰكُم﴾ ئەو ماڵو سامانە هیچ بەهایەکی نیە لە لای من‌و دڵم پێی خۆش نیە، خوا بێنیازی کردووم لێی، وە نازو نیعمەتی زۆری رشتووە بەسەرمدا ﴿بَلۡ أَنتُم بِهَدِيَّتِكُمۡ تَفۡرَحُونَ﴾ (واتە: بەڵکو ئێوە بە دیاریەکەتان دڵخۆش دەبن) چونکە حەزتان لە دونیایە، ئەوەی لە دەستی ئێوەدایە زۆر کەمترە لەوەی خوا بە منی بەخشیوە.

(٣٧): پاشان سولەیمان کاتی تەماشای نێردراوەکەی کرد کەسێکی ژیرو عاقڵە، وە قسەکەی وەکو خۆی دەگەیەنێ پێی گوت: ﴿ٱرۡجِعۡ إِلَيۡهِمۡ﴾ واتە: بە دیاریەکەتەوە بگەڕێرەوە بۆ لایان ﴿فَلَنَأۡتِيَنَّهُم بِجُنُودٖ لَّا قِبَلَ لَهُم﴾ (واتە: سوێند بە خوا ﷻ بۆیان دێنین لە شکرێک) کە لە توانای ئەواندا نەبێ، ﴿بِهَا وَلَنُخۡرِجَنَّهُم مِّنۡهَآ أَذِلَّةٗ وَهُمۡ صَٰغِرُونَ﴾ (واتە: رووبەرووی بینەوە، وە سوێند بە خوا ﷻ بە زەلیلی لە وڵاتەکەیان دەریان دەکەین) نێردراوەکەش گەڕایەوە بۆ ناویان هەواڵی قسەکانی سولەیمانی پێدان، ئەوانیش خۆیان ئامادە کرد بگەڕێنەوە بۆ لای سولەیمان ﵇، وە سولەیمان زانی ئەوان دێن بۆ لای بەوانەی دەورووبەری لە جنۆکەو مرۆڤەکان گوت:

(٣٨): ﴿أَيُّكُمۡ يَأۡتِينِي بِعَرۡشِهَا قَبۡلَ أَن يَأۡتُونِي مُسۡلِمِينَ﴾ (واتە: کامتان تەختی پادشاییەکەیم بۆ دێنن، پێش ئەوەی بە مسوڵمانی بێن بۆ لام) واتە: چونکە حەڵاڵە بۆمان هەڵسووکەوتی پێوە بکەین پێش ئەوەی مسوڵمان بن، ئەوکات ماڵەکەیان رێز لێگیراو دەبێ ﴿قَالَ عِفۡرِيتٞ مِّنَ ٱلۡجِنِّ﴾ عفریت: جنۆکەیەکی گەورەو زۆر بە توانایە، (ئەو جنۆکە گەورەیە وتی:)

(٣٩): ﴿ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبۡلَ أَن تَقُومَ مِن مَّقَامِكَۖ وَإِنِّي عَلَيۡهِ لَقَوِيٌّ أَمِينٞ ﴾ (واتە: من تەختی پاشایەتی ئەوت بۆ دێنم پێش ئەوەی لە جێگای خۆت هەستی وە من بە تواناو دەستپاکم) ڕواڵەتەکەی ئەوەیە سولەیمان ﷺ ئەو کات لە شام بووە، لە نێوانو ئەو و سەبەئدا چوار مانگ ڕێگا هەبووە، دوو مانگ ڕۆیشتنو دوو مانگ گەڕانەوە، لەگەڵ ئەو دووریەدا ئەم عفریتە دەڵێ: من دەتوانم بۆتی بهێنم هەرچەندە گەورەو قوورسو دووربێ پێش ئەوەی لە جێگاکەی خۆت هەستیت، ئەوەی کە دیارە جێگای کۆڕو کۆبوونەوە درێژ خایەنە، دەکرێ بە درێژای بەیانی بێ تا چێشتەنگاو بە ئەندازەی سێ یەکی ڕۆژێک، ئەمەش ئەوپەڕی گریمانەیە، وە کەمجارێ دەبێ کەمتر بێ یان زۆر تر. ئەم جنۆکە مەزنو بەهێزە یەکێکە لە تاکەکانی ژێر دەستی سولەیمان ﷺ، وە لەوەش بەهێزتر:

(٤٠): ﴿ قَالَ ٱلَّذِي عِندَهُۥ عِلۡمٞ مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ ﴾ ڕاڤەزانانـی قورئـان وتوویانە: ئـەوە پیاوێکی زاناو خوانـاس بـووە لە لای سـولەیمان ﷺ، پێـی دەوترا ئاصفی کـوڕی بەرخیا، ئـەو پیاوە ناوی مەزنـی خـوای دەزانـی، ئەو نـاوە مەزنە ئەگـەر داوای پـێ بکـرێ ڕاسـتەوخۆ داواکەی پێ وەردەگیـرێ، ﴿ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبۡلَ أَن يَرۡتَدَّ إِلَيۡكَ طَرۡفُكَ ﴾ (واتـە: مـن بـۆت دێنـم پێش ئەوەی چـاوت بتروکێنـی) بـەوەی داوا لـە خـوا ﷻ دەکات بەو نـاوە مەزنە جـا ڕاسـتەوخۆ ئامادە دەبـێ، ئـەو پیـاوە داوای کـرد لە خـوا ﷻ کۆشـکەکەی بـۆ بهێنێ ڕاسـتەوخۆ ئامـادە بوو ﴿ فَلَمَّا رَءَاهُ ﴾ کاتێـک سـولەیمان ﷺ ﴿ مُسۡتَقِرًّا عِندَهُۥ ﴾ (تەختەکـەی بەلقیسـی لە لای خۆیـدا بینـی) ستایشـی خـوای کرد لەسـەر ئـەو هێـزو توانـاو موڵـکو دەسـەڵاتەی پێی بەخشـیوە، وە ﴿ قَالَ هَٰذَا مِن فَضۡلِ رَبِّي لِيَبۡلُوَنِيٓ ءَأَشۡكُرُ أَمۡ أَكۡفُرُ ﴾ واتـە: (ئەمـە لـە فەزڵـی پەروەردگارمەوەیـە) بـۆ ئـەوەی تاقیـم بکاتـەوە بـەو موڵکو دەسـەڵاتە، سـولەیمان ﷺ یاخـی نەبـوو بـەو موڵکو دەسـەڵاتو هێـزو توانایە کـە خـوا ﷻ پێی دابـوو، وەکو چۆن پیشـەی دەسـەڵاتدارە گومراکانـە، بەڵکـو چـاک دەیزانـی ئـەوە تاقیکردنەوەیـە لـە لایەن پەروەردگاریـەوە، ترسـا لـەوەی وەک پێویسـت شـوکرانە بژێـری ئەو نیعمەتـە نەکات.

پاشـان ڕوونـی کردۆتـەوە شـوکرانە بژێـری هیـچ سـوودێ بـە خـوا ﷻ ناگەیەنـێ، بەڵکـو سـوودو کەڵکـی دەگەڕێتـەوە بـۆ خاوەنەکـەی، جـا فەرمـووی: ﴿ وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشۡكُرُ لِنَفۡسِهِۦۖ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّي غَنِيّٞ كَرِيمٞ ﴾ واتـە: خـوا ﷻ بێنیـازە لـە کـردەوەی بەندەکـەی، بەخشـندەیە خـاوەن خێـرو چاکـەی زۆرە، خێـرو چاکەکانـی شـوکرانە بژێـرو بێبـڕوا دەگرێتـەوە، بـەڵام ئـەوە نەبـێ سوپاسـگوزاری نیعمەتەکانـی دەبێتـە

مایــەی زیــاد کردنیــان، وە بێبڕوایــی بــە نیعمەتــەکان دەبێتــە مایــەی لەناوچوونیــان.
پاشان بەوانەی دەوروبەری فەرموو:
(٤١): ﴿ نَكِّرُوا۟ لَهَا عَرْشَهَا ﴾ واتــە: تەختــی پاشــاییەکەی بــۆ بگــۆڕن بــە کەم یان بــە زیاد، هاوشــێوەی ئــەوە ﴿ نَنظُرْ ﴾ عەقڵــی تاقــی دەکەینــەوە ﴿ أَتَهْتَدِىٓ ﴾ بزانیــن تەختەکــەی دەناســێتەوە، ئەوەنــدە ژیرو وریایە شایســتەی پاشــایەتی بــێ ﴿ أَمْ تَكُونُ مِنَ ٱلَّذِينَ لَا يَهْتَدُونَ ﴾ (واتــە: یان نایناســێتەوە).
(٤٢): ﴿ فَلَمَّا جَآءَتْ ﴾ کاتێــک هــات بــۆ لای ســولەیمان ﷺ، عــەرش‌و کۆشــکەکەی خرایــە ڕوو، ئــەو کاتــێ لە شــارەکەی خۆی دەرچــوو عەرش‌و کۆشــکەکەی بەجێهێشــت: وە ﴿ قِيلَ ﴾ پێــی گوتــرا: ﴿ أَهَٰكَذَا عَرْشُكِ ﴾ واتــە: ئێمــە زانیومانــە تۆ عەرشــێکی مەزنت هەیــە وەکــو ئەمــە، ئایــا ئەوەی تــۆ وەکو ئەمە وایــە کە بۆمــان ئامادە کــردووی؟ ﴿ قَالَتْ كَأَنَّهُۥ هُوَ ﴾ (واتــە: وتــی: هــەر ئەڵێــی ئەوەیــە) ئەمــەش دیــارە لە زیرەکــی‌و زرنگــی بووە، نەیــووت: ئەوە عەرشــەکەی منــە، چونکە گۆڕانــکاری تێدا کرابــوو، وە ڕەتیشــی نەکردەوە چونکــە عەرشــەکەی خــۆی دەناســی، وشــەیەکی بەکارهێنــا دوو ئەگــەر لــە خــۆ دەگرێ، هــەردوو ئەگەرەکەیش ڕاســتن.
ســولەیمان ﷺ ســەری ســوورما لە عاقڵی‌و ژیری ئەو پادشــایە، وە سوپاســی خوای کرد کە خــوا ﷻ لەوە چاکتری پێ بەخشــیوە، بۆیە وتــی: ﴿ وَأُوتِينَا ٱلْعِلْمَ مِن قَبْلِهَا ﴾ واتــە: هیدایەت‌و عەقــڵ‌و چەســپاوی پێ بەخشــیوین، لە پێشــی ئەم پادشــایە ﴿ وَكُنَّا مُسْلِمِينَ ﴾ (ئێمە مســوڵمان بوویــن) ئەویــش بریتیە لــە هیدایەتی بە ســوودی بنچینەیی.
دەگونجــێ ئەمە قســەی پاشــای (ســبأ) بێــت، خوا ﷻ زانســتی پێــداوی دەربــارەی موڵک‌و دەســەڵاتی ســولەیمان‌و هێــزو توانــای، پێــش ئــەم حاڵەتــی بینیمــان، بــە ئامادەکردنی ئەو عەرشــە مەزنــە لــە شــوێنێکی دوورەوە، بۆیە ملکەچی بوویــن‌و بە مســوڵمانی هاتین بۆ لای‌و گەردنکەچــی دەســەڵاتەکەی بووین.
خــوا ﷻ دەفەرمــوێ: ﴿ وَصَدَّهَا مَا كَانَت تَّعْبُدُ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ واتــە: (ئەو شــتانەی کــە بەڵقیس دەیپەرســت لەجیاتــی خــوا بــوو بوونە بەربەســت) لــە بــەردەم مســوڵمان بوونیــدا، ئەگەرنا کەســێکی ژیــرو عاقــڵ بــوو، دەیتوانــی حــەق‌و ناهــەق لــە یەکتــر جیــا بکاتــەوە، بــەڵام عەقیــدەی پــووچ‌و بەتــاڵ ڕووناکــی دڵ‌و دەروون لادەبــات، ﴿ إِنَّهَا كَانَتْ مِن قَوْمٍ كَٰفِرِينَ ﴾ (واتــە: بە ڕاســتی ئــەو لە کاتی خــۆی لە ڕیــزی قەومێکی بێبــڕوا بوو) بەردەوام بوو لەســەر

ئاینەکەیـان، وە جیابوونـەوەی کەسـێک لە شـوێنکەوتووانی ئاینێک، وە بە عەقڵیشـی ئەوان لەسـەر گومڕایـیو هەڵـەن، ئەمـە زۆر بـە کەمـی ڕوودەدا، بۆیە ئەمـە جێگای سەرسـوڕمان نیـە مانـەوەی لەسـەر کوفـرو بێبڕوایی، پاشـان سـولەیمان ﷺ ویسـتی شـتێکی لـە تواناو دەسـەڵاتی خـۆی پێنیشـان بـدات عەقـڵ پێـی سەرسـام بـێ، پێـی ووت بچـۆرە نـاو ئـەو کۆشـکەوە، ئـەوەش شـوێنێکی بـەرزی بەرفـراوان بـوو، ئـەو شـوێنە جێگایـەک بـوو لە شوشـە، ئاو بـە ژێریـدا دەڕۆیی.

(٤٤): ﴿ قِيلَ لَهَا ادْخُلِي الصَّرْحَ فَلَمَّا رَأَتْهُ حَسِبَتْهُ لُجَّةً ﴾(پێـی وتـرا بچـۆرە ناو کۆشـکەکەوە ئنجـا کاتـێ کـە بینـی بـە دەریـای زانـی) شووشـەکان زۆر تەنـکو ڕوون بـوون ئـاو لە ژێریانـەوە دەبینـرا، بەجـۆرێ دەردەکـەوت کـە ئەوە ئـاوەو هیچـی دیکە لە سـەریەوە نیە ﴿ وَكَشَفَتْ عَن سَاقَيْهَا ﴾(هـەردوو قاچـی هەڵکـرد) بۆ ئەوەی تـەڕ نەبـێ، هەروەها ئەمەش لـە ژێـریو ڕەوشـت جوانی بـوو، بێگومـان ئەو پاشـایە ڕێگـری نەکرابـوو لـەوەی بچێتە ئـەو شـوێنە، چونکـە دەیزانـی ئـەو تەنها لەبـەر پلـەو پایـەو ڕێزی بانگکـراوە، دیـارە کە سـولەیمان ﷺ موڵکو دەسـەڵاتەکەی بوونیات نابوو لەسـەر حیکمەتو کار دروسـتی، لە دڵـیدا هیـچ حاڵەتێکـی خراپ نەبـوو، پاش ئەوەی ئـەوەی بینـی، کاتێ کە پادشـاکە قاچی هەڵکـرد پێـی گوترا:

(٤٤): ﴿ إِنَّهُ صَرْحٌ مُّمَرَّدٌ مِّن قَوَارِيرَ ﴾واتـە: (ئـەوە کۆشـکێکە) لـە شوشـەیەکی لووس، ئیتـر پێویسـت نـاکات قاچـت هەڵبکەی، بـەو شـێوەیە کاتێ گەیشـتە لای سـولەیمان، وە ئـەوەی بـە چـاوی خـۆی بینـی، وە پێغەمبەرایەتـیو نێـردراوی بـۆ دەرکـەوت، تەوبـەی کـردوو گەڕایـەوە لـە بێبڕوایـی ﴿ قَالَتْ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي وَأَسْلَمْتُ مَعَ سُلَيْمَانَ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾(واتـە: ئـەی پەروەردگـارم بـە ڕاسـتی من سـتەمم لـە خۆم کـردو لەگەڵ سـولەیماندا ملکـەچ بـووم بـۆ پەروەردگـاری جیهانیان).

ئەمە بەسـەرهاتو چیرۆکی پاشـای سـەبەئە، خوای گەورە بۆی باسـکردووین، وە ئەوەیشی لەگـەڵ سـولەیماندا ڕوویدا، وە جگە لەوەی باسـکرا لەو لـقو پۆیانەو چیرۆکە ئیسـرائیلیانە ئـەوە هیـچ پەیوەنـدی نیـە بـە تەفسـیری قسـەی خـوا ﷻ، ئەویـش لـەو کاروبارانەیە کە جەختـی لەسـەر ناکرێتـەوە لەسـەر بەڵگـەی ئاشـکراو دیـار نەبـێ، وە ئـەو چیرۆکانـەی گواسـتراونەتەوە دەربـارەی ئـەو بابەتـە هەموویـان یـان زۆرینەیان بەو شـێوەیە نیـە، بۆیە پێویسـتە مسـوڵمان خـۆی لێبپارێـزێ نەیخاتـە نێو تەفسـیرەکانەوە، خـوا زاناترە.

(٤٥-٥٣): ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ
صَـٰلِحًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ فَإِذَا هُمْ فَرِيقَانِ
يَخْتَصِمُونَ ﴿٤٥﴾ قَالَ يَـٰقَوْمِ لِمَ تَسْتَعْجِلُونَ
بِٱلسَّيِّئَةِ قَبْلَ ٱلْحَسَنَةِ ۖ لَوْلَا تَسْتَغْفِرُونَ
ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٤٦﴾ قَالُوا۟ ٱطَّيَّرْنَا
بِكَ وَبِمَن مَّعَكَ ۚ قَالَ طَـٰٓئِرُكُمْ عِندَ ٱللَّهِ ۖ بَلْ
أَنتُمْ قَوْمٌ تُفْتَنُونَ ﴿٤٧﴾ وَكَانَ فِى ٱلْمَدِينَةِ
تِسْعَةُ رَهْطٍ يُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا
يُصْلِحُونَ ﴿٤٨﴾ قَالُوا۟ تَقَاسَمُوا۟ بِٱللَّهِ
لَنُبَيِّتَنَّهُۥ وَأَهْلَهُۥ ثُمَّ لَنَقُولَنَّ لِوَلِيِّهِۦ مَا شَهِدْنَا
مَهْلِكَ أَهْلِهِۦ وَإِنَّا لَصَـٰدِقُونَ ﴿٤٩﴾
وَمَكَرُوا۟ مَكْرًا وَمَكَرْنَا مَكْرًا وَهُمْ لَا
يَشْعُرُونَ ﴿٥٠﴾ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ
عَـٰقِبَةُ مَكْرِهِمْ أَنَّا دَمَّرْنَـٰهُمْ وَقَوْمَهُمْ
أَجْمَعِينَ ﴿٥١﴾ فَتِلْكَ بُيُوتُهُمْ خَاوِيَةًۢ بِمَا ظَلَمُوٓا۟ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ
﴿٥٢﴾ وَأَنجَيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴿٥٣﴾﴾

وَلَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَـٰلِحًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ
فَإِذَا هُمْ فَرِيقَانِ يَخْتَصِمُونَ ﴿٤٥﴾ قَالَ يَـٰقَوْمِ لِمَ تَسْتَعْجِلُونَ
بِٱلسَّيِّئَةِ قَبْلَ ٱلْحَسَنَةِ ۖ لَوْلَا تَسْتَغْفِرُونَ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ
تُرْحَمُونَ ﴿٤٦﴾ قَالُوا۟ ٱطَّيَّرْنَا بِكَ وَبِمَن مَّعَكَ ۚ قَالَ طَـٰٓئِرُكُمْ
عِندَ ٱللَّهِ ۖ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ تُفْتَنُونَ ﴿٤٧﴾ وَكَانَ فِى ٱلْمَدِينَةِ
تِسْعَةُ رَهْطٍ يُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴿٤٨﴾
قَالُوا۟ تَقَاسَمُوا۟ بِٱللَّهِ لَنُبَيِّتَنَّهُۥ وَأَهْلَهُۥ ثُمَّ لَنَقُولَنَّ لِوَلِيِّهِۦ
مَا شَهِدْنَا مَهْلِكَ أَهْلِهِۦ وَإِنَّا لَصَـٰدِقُونَ ﴿٤٩﴾ وَمَكَرُوا۟
مَكْرًا وَمَكَرْنَا مَكْرًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٥٠﴾ فَٱنظُرْ
كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ مَكْرِهِمْ أَنَّا دَمَّرْنَـٰهُمْ وَقَوْمَهُمْ
أَجْمَعِينَ ﴿٥١﴾ فَتِلْكَ بُيُوتُهُمْ خَاوِيَةًۢ بِمَا ظَلَمُوٓا۟ ۗ إِنَّ
فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٥٢﴾ وَأَنجَيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟
وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴿٥٣﴾ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ أَتَأْتُونَ
ٱلْفَـٰحِشَةَ وَأَنتُمْ تُبْصِرُونَ ﴿٥٤﴾ أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ
شَهْوَةً مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِ ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ ﴿٥٥﴾

(٤٥): ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَـٰلِحًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ﴾ تـا کۆتایـی چیرۆکەکـە، خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات کـە ئـەو ناردوویەتـی بـۆ لای ثمود ئـەو هـۆزە ناسـراوە برایان لە ڕەچەڵەکـدا صالـح، وە ئـەو فەرمانـی پێکـردوون خوا ﷻ بە تـاکـو تەنها بپەرسـتن، وە واز لە پەرسـتنی بتـو هاوشـێوەکانی بێنـن، ﴿فَإِذَا هُمْ فَرِيقَانِ يَخْتَصِمُونَ﴾ (کەچی ئەوان بـوون بـە دوو کۆمەڵـی دژ بـە یـەک) کۆمەڵێکیـان بـڕوادار، کۆمەڵێکیـان بێبـڕوا، ئەمانە زۆرینەکانیـان بوون.

(٤٦): ﴿قَالَ يَـٰقَوْمِ لِمَ تَسْتَعْجِلُونَ بِٱلسَّيِّئَةِ قَبْلَ ٱلْحَسَنَةِ﴾ واتـە: بۆچـی پەلـە دەکـەن لە ئەنجامدانـی کارە خراپـەکانو سـوور دەبـن لە سـەریان، پێش ئـەوەی کاری چاکـە بکەن، کـە بـە هۆیانەوە ڕەوشـتان چـاک دەبێو کاروبـاری ئاینـیو دونیاییتـان جوان دەبـێ؟ لە کاتێکدا پێویسـت ناکا ئێوە دەستپێشـخەری بکەن بـۆ کارە خراپەکان ﴿لَوْلَا تَسْتَغْفِرُونَ ٱللَّهَ﴾ (بۆچـی داوای لێخۆشـوون ناکـەن لە خـوا ﷻ) بەوەی تەوبـە بکەن لـە هاوەڵدانانو

سـەرپێچی کردنتـان، وە داوای لێبکـەن لێتـان خـۆش ببـێ ﴿لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ بێگومـان ڕەحمەتـی خـوا ﷻ نزیکە لـە چاکە خوازانەوە، وە لەو کەسـەش تەوبـە دەکات لە گوناهـەکان ئەویـش یەکێکە لە چاکـەکاران.

(٤٧): ﴿قَالُواْ﴾ پێغەمبەرەکەیـان کـە صالحە بە درۆزانیو ڕووبەڕووی وەسـتانەوەو وتیان: ﴿اطَّيَّرْنَا بِكَ وَبِمَن مَّعَكَ﴾ پێیـان وابـوو- خـوا ڕوویـان ڕەش بـکا- ئەوان لە ڕووخسـاری صاڵحـدا خێـرو چاکەیـان بـەدی نەکـردوە، وە ئـەو و ئـەو کەسـانەی لـە گەڵیدا بـوون لە بـڕواداران هۆکار بـوون بۆ ڕێگریکـردن لە هەندێ دەسـتکەوتی دنیایی. صاڵـح ﷺ پێیانی گـوت: ﴿طَائِرُكُمْ عِندَ اللَّهِ﴾ واتە: ئەوەی تووشـتان بـووە تەنها بە هـۆی تاوانەکانتانەوەیە ﴿بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ تُفْتَنُونَ﴾ (بەڵکـو ئێـوە گەلێکـن تاقی دەکرێنەوە) بە خۆشـیو ناخۆشـیو خێـرو شـەڕ، بۆ ئەوەی تەماشـا بـکات ئایا ئێـوە تەوبە دەکەن یـان نا؟ ئەمە کارو پیشـەیان بوو لـە بەدرۆزانینـی پێغەمبەرەکەیانو ڕووبـەڕوو بوونەوەیان.

(٤٨): ﴿وَكَانَ فِي الْمَدِينَةِ﴾ واتـە: ئـەو شـارەی صاڵحـی تێدابـوو، کە هەمـوو گەلەکەی لـەوێ کۆبوونـەوە ﴿تِسْعَةُ رَهْطٍ يُفْسِدُونَ فِي الْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ﴾ واتە: (نۆ کەس هەبـوون لـە زەویـدا خراپەکاریـان دەکـرد، بـە هیچ جـۆرێ چاکەیـان نەدەکرد) وەسـفی کـردوون بـە خراپـەکار لە سـەر زەویدا، ئـەوان هیـچ مەبەسـتو کردەوەیەکیـان نەبوو بۆ چاکسـازی، بەڵکـو خۆیـان ئامـادە کردبوو بـۆ دژایەتی کردنـی صاڵـح ﷺ، وە تانەدان لە ئاینەکـەیو بانگـەواز کردنـی گەلەکەیـان بـۆ ئـەو مەبەسـتە، وەک خـوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٥٠﴾ وَلَا تُطِيعُوا أَمْرَ الْمُسْرِفِينَ ﴿١٥١﴾ الَّذِينَ يُفْسِدُونَ فِي الْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴿١٥٢﴾﴾ الشعراء، (واتـە: کەواتـە لـە سـزای خـوا بترسـنو گوێڕایەڵـی مـن بکـەن * وە گوێڕایەڵـی زێدەڕۆیـان مەکـەن * ئەوانەی خراپەکاری دەکەن لەسـەر زەویـداو کردەوەی چـاک ناکەن).

(٤٩): ئـەوان بـەردەوام بـوون لەسـەر ئـەو بارودۆخـە ناشـرینو خراپەیـان، هەتـا بە هۆی دژایەتـی کردنیانـەوە ﴿تَقَاسَمُوا﴾ سـوێندیان خـوارد لـە نـاو یەکتریـدا، هەریەکەیـان ئـەوەی دیکـەی سـوێند دەدا ﴿لَنُبَيِّتَنَّهُ وَأَهْلَهُ﴾ واتـە: لـە شـەودا دەچینـە سـەر ماڵو خێزانـی، هەموویـان دەکوژیـن ﴿ثُمَّ لَنَقُولَنَّ لِوَلِيِّهِ﴾ (واتـە: پاشـان بـە کـەسو کاری صاڵـح ﷺ دەڵێیـن) ئەگەر هەسـتانە سـەرمانو وتیـان ئێوە کوشـتوتانە، ئێمـە نکووڵی لەوە دەکەیـنو ڕەتـی دەکەینەوەو سـوێندیان بۆ دەخۆیـن ﴿وَإِنَّا لَصَادِقُونَ﴾ کۆبوونەوەو

یەکدەنــگ بوون لەســەر ئــەو کارە.
(٥٠): ﴿ وَمَكَرُواْ مَكۡرًا ﴾ واتــە: پیلاتێکیــان دانــا بــۆ کوشــتنی صالح ﷺو مــاڵو منداڵی زۆر بــە نهێنــی، بە هۆی مەترســیان لە کــەس‌و کاری﴿ وَمَكَرۡنَا مَكۡرًا ﴾ (واتــە: ئێمەش پیلاتێکی بەهێزمان دانا) بەســەر خســتنی پێغەمبەرەکەمان صالح ﷺ، وە کار ئاســان کردنی‌و لــە نــاو بردنی گەلــە بەدرۆدانەرەکــەی، ﴿ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴾ (واتــە: لە کاتێکــدا ئەوان هەســتیان پێ نەدەکرد).
(٥١): ﴿ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ مَكۡرِهِمۡ ﴾ ئایا مەبەســتەکانیان بەدەستهێناوە، بەو فــرو فێڵانــە ئامانجەکانیــان دەســتکەوتووە، یــان کارەکەیــان بــۆ پێچەوانە بووەتــەوە، لەبەر ئەمــە فەرموویەتــی: ﴿ أَنَّا دَمَّرۡنَٰهُمۡ وَقَوۡمَهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴾ لــە ناومان بــردن، لە بنچینــە دەرمان هێنــان، دەنگێکــی بەهێــزی ســزایان بۆ هــات، هەموویان ســەرەتا تا کۆتایــی لەناوچوون.
(٥٢): ﴿ فَتِلۡكَ بُيُوتُهُمۡ خَاوِيَةَۢ ﴾ (واتــە: ئنجــا ئــەوە جێــی خانووەکانیانــە چــۆڵو خاڵیــە) دیوارەکانــی ڕووخــاوە بەســەر ســەربانەکانیان، چــۆڵو هۆڵــە لــە دانیشــتوانەکەی، لــە کار کەوتــووەو کەســی تێــدا نەمــاوە﴿ بِمَا ظَلَمُوٓاْ ﴾ واتە: ئەمە ســەرەنجامی ســتەمو هاوبەشــدانانیانە بــۆ خــوا، وە گومڕابوونیــان لەســەر زەوی.
﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴾ (واتــە: بەڕاســتی لــەو بەســەرهاتەدا پەنــدو بەڵگــە هەیــە بــۆ گەلێک) بــە حەقیقەتــەکان بزانن، وە بیــر بکەنــەوە لــە ڕووداوەکانی خوا لــە دۆســتەکانی‌و دوژمنەکانیــدا، بەوانــە پەنــدو ئامۆژ گــاری وەربگــرن، بــۆ ئــەوەی بزانن ســەرەنجامی ســتەمو تاوان لەناو چوونە، بەڵام ســەرەنجامی ئیمانو دادپەروەری ســەرکەوتن‌و ڕزگاربوونە.
(٥٣): ﴿ وَأَنجَيۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴾ واتــە: بڕوادارانمــان ڕزگار کرد، ئەوانــەی بڕوایــان بــە خــواو کتێبــەکانو پێغەمبــەرانو ڕۆژی دوایــیو قەزاو قــەدەر خێرو شــەڕی بــوو، وە خۆیــان دەپاراســت لــە هاوبــەش دانــان بــۆ خــواو ســەرپێچی کــردن، وە کاریــان دەکرد بــە گوێڕایەڵــی خــواو گوێڕایەڵــی پێغەمبەرەکانی.
(٥٤-٥٨):﴿ وَلُوطًا إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِۦٓ أَتَأۡتُونَ ٱلۡفَٰحِشَةَ وَأَنتُمۡ تُبۡصِرُونَ ﴿٥٤﴾ أَئِنَّكُمۡ لَتَأۡتُونَ ٱلرِّجَالَ شَهۡوَةٗ مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِۚ بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ تَجۡهَلُونَ ﴿٥٥﴾ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوۡمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَخۡرِجُوٓاْ ءَالَ لُوطٖ مِّن قَرۡيَتِكُمۡۖ إِنَّهُمۡ أُنَاسٞ يَتَطَهَّرُونَ ﴿٥٦﴾ فَأَنجَيۡنَٰهُ وَأَهۡلَهُۥٓ إِلَّا ٱمۡرَأَتَهُۥ قَدَّرۡنَٰهَا مِنَ ٱلۡغَٰبِرِينَ ﴿٥٧﴾ وَأَمۡطَرۡنَا عَلَيۡهِم مَّطَرٗاۖ فَسَآءَ مَطَرُ ٱلۡمُنذَرِينَ ﴿٥٨﴾ ﴾:

(دەفەرمـوێ:) ﴿ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ ﴾ واتـە: باسـی بەنـدەو پێغەمبەرمـان لـووط ﷺ بکـە، کاتـێ بـە گەلەکەی گـوت -وەکـو بانگخـوازو ئامۆژگـاری کارێک-: ﴿ أَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ ﴾ واتـە: ئـەو کارە زۆر خـراپو ناشـرینە کـە عەقڵو سروشـت بە قیزەونـی دەزانـێ، لەگەڵ شـەریعەتدا ﴿ وَأَنتُمْ تُبْصِرُونَ ﴾ (واتە: ئێـوە دەیبینن‌و دەزانن)، وە دەزانـن چەنـدە ناشـرین‌و بێـزراوە، بـەڵام عینادیتـان کردو ئەوەتـان ئەنجامـدا، بە هۆی سـتەمو بێ شـەرمیتان لـە خوا.

(٥٥): پاشـان ئەو فاحیشـەی تەفسـیر کـردوەو فەرموویەتـی: ﴿ أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِ ﴾ واتـە: چۆن گەیشـتنە ئەم ئاسـتە، حـەزوو ئارەزوەکانتان بـۆ دوای پیاوان دەجولـێ کـە شـوێنی پیسـاییە، وە وازتـان هێناوە لـەوەی خوا بۆتانی دروسـت کـردوە لە ئافرەتـان لە شـوینە پاکـەکان کە نەفـس‌و دەروون حـەزی بۆ ئـەوە دەجولێت، ئێـوە کارو بارەکەتـان بەسـەردا پێچەوانـە بووەتـەوە، شـتی پیسـتان بـەلاوە چاکو پەسـندە، وە شـتی پاکیـش بەلاتانـەوە پیس‌و قێزەونـە، ﴿ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ ﴾ (واتە: بەڵکـو ئێوە گەلێکی نەفامـن) لـە سـنووری خوا دەرچـوون، چاوقایمـن بەرانبـەر بـە قەدەغەکراوەکانی خوا.

فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَخْرِجُوٓاْ ءَالَ
لُوطٍ مِّن قَرْيَتِكُمْۖ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ ﴿٥٦﴾ فَأَنجَيْنَٰهُ
وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ قَدَّرْنَٰهَا مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٥٧﴾ وَأَمْطَرْنَا
عَلَيْهِم مَّطَرًاۖ فَسَآءَ مَطَرُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿٥٨﴾ قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ
وَسَلَٰمٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَىٰٓۗ ءَآللَّهُ خَيْرٌ أَمَّا يُشْرِكُونَ
﴿٥٩﴾ أَمَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ
مَآءً فَأَنۢبَتْنَا بِهِۦ حَدَآئِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ مَّا كَانَ لَكُمْ أَن
تُنۢبِتُواْ شَجَرَهَآۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ ﴿٦٠﴾
أَمَّن جَعَلَ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا وَجَعَلَ خِلَٰلَهَآ أَنْهَٰرًا وَجَعَلَ
لَهَا رَوَٰسِىَ وَجَعَلَ بَيْنَ ٱلْبَحْرَيْنِ حَاجِزًاۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِۚ
بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٦١﴾ أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا
دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَآءَ ٱلْأَرْضِۗ
أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٦٢﴾ أَمَّن يَهْدِيكُمْ فِى
ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَمَن يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ
رَحْمَتِهِۦٓۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِۚ تَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٣﴾

(٥٦): ﴿فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ﴾ (واتە: ئنجا وەڵامی گەلەکەی هیچ نەبوو) نە وەرگرتن بوو، نە سەرزەنشت کردن، نە یادکردنەوە ئامۆژگاری وەرگرتن، بەڵکو وەڵامیان دژایەتیو سەرپێچی بوو، وە هەڕەشەکردن لە پێغەمبەرە ئامۆژگاریکارە دەستپاکەکەیان، بە دەرکردن لە وڵاتەکەی.

پاشان وەڵامی گەلەکەی هیچ نەبوو ﴿إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَخْرِجُوٓاْ ءَالَ لُوطٍ مِّن قَرْيَتِكُمْ﴾ (واتە: جگە لەوەی کە وتیان لووط ﷺو خێزانەکەی لە شارەکە دەربکەن).

وە ئەوەی بوترێ: بۆ ڕقتان لێ هەڵگرتوون، ئەی تاوانیان چی کە دەربەدەریان دەکەن، وتیان: ﴿إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ﴾ واتە: خۆیان پاک دەگرن لە نێربازی، خوا ڕوویان ڕەش بکات، چاکترینی چاکەکانیان لە ئاستی ناشرینترین گوناهەکان دانا، بە سەرپێچی کردنی پێغەمبەرەکەیانەوە نەوەستاون لەوەی ئامۆژگاری کردوون، هەتا گەیشتن بەو ئاستەی دەری بکەن لە شارەکەی، ئەوان وتیان: ﴿أَخْرِجُوهُم مِّن قَرْيَتِكُمْۖ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ ﴿٨٢﴾﴾الأعراف، (واتە: لە شارو وڵاتەکەتان دەریان بکەن، بە ڕاستی ئەوانە کەسانێکن خۆیان پاکو تەمیز ڕادەگرن).

مەفهومو تێگەیشتن لەم قسەیە: ئێوە پیسو بۆگەن بوون، شایستەی ئەوەن سزاو تۆڵە دابەزێتە سەر شارەکەتان، وە ڕزگار بوونی ئەوەی لێی دەردەچێ.

(٥٧) لەبەر ئەمەیە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ قَدَّرْنَٰهَا مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ﴾ کاتێ فریشتەکان هاتن بۆ لای لە وێنەی میواندا، گەلەکەیان ئەمەیان زانی، هاتن بۆ لای لووط ﷺ مەبەستیان کاری خراپ بوو، ئەویش دەرگای لێگرتن، کاری لەسەر نارەحەت بوو. پاشان فریشتەکان هەواڵیان پێدا دەربارەی حاڵی خۆیان، ئەوان هاتوون ڕزگاری بکەن لە نێو ئەو گەلە خراپەدا، وە دەیانەوێ لە ناویان ببەن، بێگومان بەڵێنیان بەیانی زووە، فەرمانیان پێکرد شەوڕۆیی بە خانەوادەکەی بکات، جگە لە ژنەکەی، بەم زووانە تووش دەبێ

ئەوەی کە تووشی گەلەکەی دەبێ، لووط بە شەو خانەوادەکەی دەرکردو ڕزگاریان بوو، لە بەرەبەیاندا لە ناوی بردن، خوا شوێنەکەیانی سەرو ژێر کرد، وە وردە زیخی گڵینی بە دوای یەکدا باراند بەسەریاندا بەبێ پچڕان، هەموو ئەو وردە بەردانە دیاریکراو بوون لە لایەن پەروەردگارتەوە.

(٥٨): لەبەر ئەمە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا فَسَاءَ مَطَرُ الْمُنذَرِينَ ﴾ واتە: بەرد بارانمان کردن بە خراپترین بەرد باران کردن وە بە خراپترین سزا، چونکە ئاگادار کرانەوەو ترسێنران، بەڵام سڵیان نەکردەوەو نەهاتن بە خەبەردا، خوا سزای سەختو توندی دان.

(٥٩): ﴿ قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ وَسَلَامٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ الَّذِينَ اصْطَفَىٰ ۗ آللَّهُ خَيْرٌ أَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾:

﴿ قُلِ ﴾ واتە: بڵێ: ﴿ الْحَمْدُ لِلَّهِ ﴾ (ستایش بۆ ئەو خوایەی) کە شایستەی تەواوی ستایش کردنو وەسفو پیاهەڵدانە بە هۆی تەواوی وەسفەکانیەوە، وە بەخشینەکانی، وە دادپەروەریو حیکمەتی لە سزادانی بە درۆدانەرانو ستەمکاران، هەروەها سڵاو لەسەر ئەو بەندانەی هەڵبژاردوون بەسەر جیهانییاندا، لە پێغەمبەرانو نێردراوان، وە پاڵفتەکراوانی خوا لەناو جیهاندا، ئەویش بە هۆی ئەوەی یادیانی بەرز کردوەتەوەو ڕێزداری کردوون، وە پاراستوونی لە شەڕو پیسی، وە پاراستنی ئەوەی وتوویانە دەربارەی پەروەردگاریان لە ناتەواوی کەمو کورتی.

﴿ آللَّهُ خَيْرٌ أَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾ (واتە: ئایا خوا باشترە یان ئەو بتانەی دەیکەنە هاوبەشی خوا)، ئەمە پرسیارو ئیستیفهامێکە بێگومان جێگیر بووەو زانراوە، واتە: ئا ئەو خوایە پەروەردگارێکی مەزنە، کە خاوەنی وەسفی تەواوەو نەرمو نیانو لەسەرخۆیە، یان ئەو بتانەی کە لەگەڵ ئەودا دەیانپەرست، ئەوانە ناتەواون لە هەموو ڕوویەکەوە، نە سوودیان هەیەو نە زیان لادەبەن، وە خاوەنی نەفسی خۆیانو ئەوانەش نین کە دەیانپەرستن، بە قەد یەک مسقاڵە زەڕە لە خێرو چاکە؟ خوا ﷻ چاکترە لەوەی ئەوان دەیپەرستن.

(٦٠): ﴿ أَمَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَنبَتْنَا بِهِ حَدَائِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ مَّا كَانَ لَكُمْ أَن تُنبِتُوا شَجَرَهَا ۗ أَإِلَٰهٌ مَّعَ اللَّهِ ۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ ﴿٦٠﴾ ﴾:

پاشان خوا ﷻ بە دوورو درێژی باسی ناسینی خۆی کردوە کە بێگومان ئەو پەرستراوی ڕاستەقینەیە، تەنها بەندایەتی ئەو ڕاستە، بەندایەتی جگە لە ئەو پووچو بێ هوودەیە، فەرموویەتی: ﴿ أَمَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ ﴾واتە: کێ ئاسمانەکانی دروست کردوەو ئەوەیشی تیایاندایە لە خۆرو مانگو ئەستێرەو فریشتەو زەویو ئەوەی لە ناویاندایە، لە شاخو دەریاو زەریا داروو درەختو جگە لەوانیش؟ ﴿ وَأَنزَلَ لَكُم ﴾ لە بەر ئێوە ﴿ مِّنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَنبَتْنَا بِهِ

﴿حَدَآئِقَ﴾ واتە: چەندین باخچەی جوانو گەورە ﴿ذَاتَ بَهْجَةٍ﴾ واتە: دیمەنی جوانو سەرنجڕاکێش، لە زۆری داروو درەختو جیاوازی جۆرەکانیو جوانی بەرهەمەکانی ﴿مَّا كَانَ لَكُمْ أَن تُنۢبِتُواْ شَجَرَهَآ﴾ (واتە: کە ئێوە نەتاندەتوانی درەختو ڕواوی ئەو باخچە بڕوێنن) ئەگەر منەتی خوا ﷻ نەبووایە بەسەرتانەوە بە دابەزاندنی باران ﴿أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ﴾ (ئایا هیچ پەرستراوێکی تر لەگەڵ خوادا هەیە) بتوانێ ئەم کاروبارانە بەڕێوە ببات، هەتا بپەرسترێو لەگەڵ خوادا بکرێ بە هاوبەش ﴿بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ﴾ (ئەوان گەلێکن لادەدەن لە ڕێگای ڕاست) خوا یەکسان دەکەن لەگەڵ پەرستراوانی دیکەدا، لەگەڵ ئەوەدا دەزانن خوا ﷻ بەتاکو تەنها خولقێنەری جیهانی سەروو خوارەوەیە، وە دابەزێنەری ڕزقو ڕۆزیە.

(٦١): ﴿أَمَّن جَعَلَ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا وَجَعَلَ خِلَٰلَهَآ أَنْهَٰرًا وَجَعَلَ لَهَا رَوَٰسِىَ وَجَعَلَ بَيْنَ ٱلْبَحْرَيْنِ حَاجِزًا ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٦١﴾﴾:

﴿أَمَّنْ﴾ ئایا ئەو بتانەی لە هەموو ڕوویەکەوە ناتەواون کە هیچ کردەوەیەکیان نیەو ڕزقو ڕۆزیان بەدەست نیە چاکترن؟ یان ئەو خوایەی ﴿جَعَلَ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا﴾ زەوی کردۆتە جێگای ئارامیو نیشتەجێبوونی بەندەکان، بەو هۆیەوە دەتوانن تیایدا بحەسێنەوەو، ماڵی تێدا دروست بکەنو کێڵگەی تێدا بچێننو بڕۆنو بگەڕێنەوە ﴿وَجَعَلَ خِلَٰلَهَآ أَنْهَٰرًا﴾ واتە: لەناو زەویدا چەندین دەریای بەدیهێناوە بەندەکان سوودیان لێوەردەگرن بۆ کشتوکاڵو باخو باخاتو خواردنەوەی خۆیانو ئاژەڵەکانیان ﴿وَجَعَلَ لَهَا رَوَٰسِىَ﴾ واتە: (چەندین) کێوی گەورەی داکوتاوە بۆ ئەوەی تاسەو لەنگەر نەکات، وە وەکو مێخ بە زەویدا داکوتراوە بۆ ئەوەی جووڵە نەکات ﴿وَجَعَلَ بَيْنَ ٱلْبَحْرَيْنِ﴾ (واتە: وە لە نێوان دوو) دەریای سوێرو دەریای شیریندا ﴿حَاجِزًا﴾ بەربەستێکی دروستکردوە بۆ ئەوەی تێکەڵ نەبن، ئەو سوودو قازانجەی لە دەست بچێ کە تیایاندا هەیە، بەڵکو لە نێوانیاندا بەشێک لە زەوی کردۆتە بەربەست سەرچاوەی ئاوەکانیشی دوور خستۆتەوە لە دەریاکان، تا مەبەستو بەرژەوەندیەکان بەدەست بێن، ﴿أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ﴾ (ئایا هیچ پەرستراوێکی دیکە هەیە لەگەڵ خوادا) بتوانێ ئەو کارە بکات، هەتا لێی لابدرێو هاوەڵی لەگەڵدا بپەرسترێ؟ ﴿بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ (بەڵکو زۆربەیان نازانن) هاوەڵو شەریک بۆ خوا ﷻ دادەنێن، بە پەیڕەو کردنی پێشەواکانیان، ئەگەرنا ئەگەر بیانزانایە هەرگیز هاوەڵیان بۆ دانەدەنا.

(٦٢): ﴿أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَآءَ ٱلْأَرْضِ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٦٢﴾﴾:

(خوا دەفەرمویّ:) ﴿ أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَآءَ ٱلْأَرْضِ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ﴾ ئایا کەسێک هەیە وەڵامی ناچارو داماو بداتەوە کاتێ تووشی خەمو پەژارەو نارەحەتی دەبێ، وە داواکاریەکانی لەسەر قوورس‌و گران دەبێ، وە خەریکە لەناو دەچێ لەو ناخۆشیەی کە تیایدایە، جگە لە خوای تاک‌و تەنها؟ وە کێ ناخۆشی‌و بەڵا لادەبات جگە لە خوای تاک‌و تەنها؟ وە کێ دەتانکاتە جێنشینی گەلانی سەر زەوی، ڕزق‌و ڕۆزیتان پێدەداو دەتانگەیەنێ بە نازو نیعمەتەکانی، وە دەبن بە جێنشینی پێشینی خۆتان، هەروەکو ئەوەی ئێوەش دەمرێنێ، لە دوای ئێوەش گەلێکی دیکە دەهێنێ، ئایا پەرستراوێکی تر هەیە لەگەڵ خوادا ئەم کاروبارانە هەڵسووڕێنێ؟

هیچ کەسێ ناتوانێ لەگەڵ خوادا شتێ لەوانە ئەنجام بدات، تەنانەت ئێوە ئەی بتپەرستەکان خۆتان دان بەو ڕاستیەدا دەنێن، ئا لەبەر ئەمە ئەگەر تووشی ناخۆشیەک ببونایە، بە دڵسۆزیەوە لە خوا ﷻ دەپاڕانەوە، چونکە دەیانزانی تەنها خوا دەسەڵاتدارە بەسەر لابردنیدا ﴿ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴾ واتە: بە کەمی بیر دەکەنەوەو قووڵ دەبنەوە لەوکارانەی کە ئەگەر بیرتان لێبکردایەتەوە دەگەڕانەوە بۆسەر هیدایەت، بەڵام بێئاگایی‌و پشتێکردن‌و خۆپاریزی داپۆشیون، جا لەبەرئەمە هیدایەتتان وەرنەگرتووە.

(٦٣): ﴿ أَمَّن يَهْدِيكُمْ فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَمَن يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦٓ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ تَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٣﴾ ﴾:

﴿ أَمَّن يَهْدِيكُمْ فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ﴾ واتە: ئەو زاتە کێیە ڕێنماییتان دەکا کاتێ لە تاریکاییەکانی وشکانی‌و دەریادان، کە نە ڕێنیشاندەرێکتان هەبێ وە نە مامۆستایەک ببینن، وە نە هۆکارێ هەبێ بۆ ڕزگار بوون جگە لە هیدایەتی خوا ﷻ نەبێ بۆتان، وە کارئاسان کردنی ڕێگاکەتان‌و دانانی ئەو هۆکارەی دەبێتە مایەی ڕێنیشاندەرتان ﴿ وَمَن يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦٓ ﴾ واتە: لە نێوان باراندنی باراندا، خوا با دەنێرێ، پاڵی هەور دەنێ، پاشان تێکەڵی یەکتریان دەکات، پاشان کۆیان دەکاتەوە، پاشان دەیانپیتێنێ، ئنجا بەو شێوەیە مژدە بە بەندەکانی دەدات بە پێش دابەزاندنی باران ﴿ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ﴾ (ئایا هیچ پەرستراوێکی دیکە هەیە لەگەڵ خوادا) ئەو کارە بکات؟ یان خوا بەتاک‌و تەنها ئەوە هەڵدەسوڕێنێ؟ جا ئیتر بۆچی هاوبەشتان لەگەڵیدا داناوەو جگە لە ئەو دەپەرستن ﴿ تَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾ خوا بەرزو بڵندە لەوەی ئەوان هاوبەشی بۆ دادەنێن‌و یەکسانی دەکەن لەگەڵ غەیری خۆیدا.

أَمَّن يَبْدَؤُا الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَمَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَآءِ وَالْأَرْضِ
أَءِلَٰهٌ مَّعَ اللَّهِ قُلْ هَاتُوا بُرْهَٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٦٤﴾ قُل
لَّا يَعْلَمُ مَن فِي السَّمَٰوَٰتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ وَمَا يَشْعُرُونَ
أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ﴿٦٥﴾ بَلِ ادَّٰرَكَ عِلْمُهُمْ فِي الْآخِرَةِ بَلْ هُمْ فِي
شَكٍّ مِّنْهَا بَلْ هُم مِّنْهَا عَمُونَ ﴿٦٦﴾ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَءِذَا
كُنَّا تُرَٰبًا وَءَابَآؤُنَا أَئِنَّا لَمُخْرَجُونَ ﴿٦٧﴾ لَقَدْ وُعِدْنَا هَٰذَا
نَحْنُ وَءَابَآؤُنَا مِن قَبْلُ إِنْ هَٰذَا إِلَّا أَسَٰطِيرُ الْأَوَّلِينَ ﴿٦٨﴾
قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ الْمُجْرِمِينَ
﴿٦٩﴾ وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلَا تَكُن فِي ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ ﴿٧٠﴾
وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا الْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٧١﴾ قُلْ عَسَىٰٓ
أَن يَكُونَ رَدِفَ لَكُم بَعْضُ الَّذِي تَسْتَعْجِلُونَ ﴿٧٢﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ
لَذُو فَضْلٍ عَلَى النَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٧٣﴾ وَإِنَّ
رَبَّكَ لَيَعْلَمُ مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمْ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٧٤﴾ وَمَا مِنْ غَآئِبَةٍ
فِي السَّمَآءِ وَالْأَرْضِ إِلَّا فِي كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٧٥﴾ إِنَّ هَٰذَا الْقُرْءَانَ
يَقُصُّ عَلَىٰ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَكْثَرَ الَّذِي هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٧٦﴾

(٦٤): ﴿أَمَّن يَبْدَؤُا الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَمَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَآءِ وَالْأَرْضِ أَءِلَٰهٌ مَّعَ اللَّهِ قُلْ هَاتُوا بُرْهَٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٦٤﴾﴾:

﴿أَمَّن يَبْدَؤُا الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَمَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَآءِ وَالْأَرْضِ﴾ واتە: ئایا ئەو زاتە کێیە کە لە سەرەتاوە بوونەوەر دروست دەکاتو گەشەیان پێ دەدات، پاشان دەیانمرێنێو جارێکی دیکە دوای مردنیان دروستیان دەکاتەوە لە ڕۆژی زیندوو کردنەوەدا؟ وە کێ ڕزقو ڕۆزیتان دەدا لە ئاسمانەکانو زەوی بە بارانو ڕووەک؟ ﴿أَءِلَٰهٌ مَّعَ اللَّهِ﴾ (ئایا هیچ پەرستراوێکی دیکە هەیە لەگەڵ خوادا) ئەو کارە ئەنجام بداو دەسەڵاتی بەسەریدا هەبێ؟

﴿قُلْ هَاتُوا بُرْهَٰنَكُمْ﴾ واتە: (ئەی موحەممەد ﷺ بڵێ:) بەڵگەو حوججەکانتان بێنن لەسەر ئەوەی دەیڵێن، ﴿إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ وە ئەگەرنا بەو جۆرەی کە خۆتان دەڵێن: بتەکان هاوبەشن لە هەندێ لەوانەدا، ئەوە تەنها بانگەشەیە، بە بەڵگە ڕاستیەکەی بسەلمێنن، وە ئەگەرنا بزانن ئێوە لەسەر بەتاڵو پووچن هیچ بەڵگەیەکتان نیە، دەی بگەڕێنەوە بۆ بەڵگەی دڵنیاکەرەوەو سەلماندنی یەکلاکەرەوە، کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بێگومان خوا ﷻ تاکو تەنهایە لە هەموو بەڕێوەبردنەکاندا، وە ئەو شایستەی ئەوەیە هەموو جۆرە بەندایەتیەکی بۆ بکرێ.

(٦٥-٦٨): ﴿قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي السَّمَٰوَٰتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ﴿٦٥﴾ بَلِ ادَّٰرَكَ عِلْمُهُمْ فِي الْآخِرَةِ بَلْ هُمْ فِي شَكٍّ مِّنْهَا بَلْ هُم مِّنْهَا عَمُونَ ﴿٦٦﴾ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا وَءَابَآؤُنَا أَئِنَّا لَمُخْرَجُونَ ﴿٦٧﴾ لَقَدْ وُعِدْنَا هَٰذَا نَحْنُ وَءَابَآؤُنَا مِن قَبْلُ إِنْ هَٰذَا إِلَّا أَسَٰطِيرُ الْأَوَّلِينَ ﴿٦٨﴾﴾:

﴿قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي السَّمَٰوَٰتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدات کە بێگومان ئەو تاکو تەنهایە بە زانستی غەیبو پەنهانی ئاسمانەکانو زەوی، وەک فەرموویەتی: ﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَآ إِلَّا هُوَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا

يَعۡلَمُهَا وَلَا حَبَّةٖ فِي ظُلُمَٰتِ ٱلۡأَرۡضِ وَلَا رَطۡبٖ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ ﴿٥٩﴾ ﴾الأنعام (واتە: وە کلیلی هەموو نهێنیەکان هەر لە لای خوایە کەس نایزانێ جگە لەو، وە خوا دەزانێ چی لە وشکانیو دەریادا هەیە، وە هەر گەڵایەک بکەوێتە خوارەوە خوا پێی دەزانێو هەر دانەوێڵەیەک لە تاریکیەکانی زەویدا بێتو هەر تەڕو وشکێک هەبێت هەر هەموویان لە کتێبی ئاشکرادان) وەک فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلۡغَيۡثَ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡأَرۡحَامِۖ ﴿٣٤﴾ ﴾لقمان، (واتە: بە ڕاستی تەنها لای خوایە زانیاری کاتی هاتنی ڕۆژی دوایی وە هەر خوا باران دەبارێنێ تەنها خوا دەزانێ بەوەی لە منداڵدانی دایکاندایە) تا کۆتایی سوورەتەکە.

ئەم غەیبو پەنهانانەو هاوشێوەکانی زانستو زانیاری دەربارەیان تایبەتن بە خوا ﷻ، نە هیچ فریشتەیەکی نزیک دەیزانێ، وە نە پێغەمبەرێکی نێردراو، جا ئەگەر ئەو زاتە تاکو تەنها بوو بە زانستی ئەوانە، وە بە زانستی دەوری نهێنیو شاراوەکانی دابوو، ئەوە تەنها پێویستە پەرستش بۆ ئەو بکرێ.

پاشان خوا ﷻ هەواڵ دەدات دەربارەی لاوازی زانستی بە درۆدانەران بە ڕۆژی دوایی، لە شتێکەوە دەیگوازێتەوە بۆ شتێکی گرنگتر، فەرموویەتی: ﴿ وَمَا يَشۡعُرُونَ ﴾ واتە: (ئەوان هەست ناکەن) وە نایزانن ﴿ أَيَّانَ يُبۡعَثُونَ ﴾ واتە: کەی زیندوو دەکرێنەوەو لە گۆڕەکانیانەوە هەڵدەستن، واتە: لەبەر ئەوەیە خۆیان ئامادە نەکردوە.

(٦٦): ﴿ بَلِ ٱدَّٰرَكَ عِلۡمُهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِۚ ﴾ واتە: زانستی ئەوان لاوازو کورتەو زانستێکی دڵنیاکەرەوە نیەو ناگاتە نێو دڵ، ئەمەش کەمترینو خوارترین پلەیە بۆ زانست، بێگومان هیچ زانستێکی بەهێزو لاوازیشیان نیە، بەڵکو ﴿ هُمۡ فِي شَكّٖ مِّنۡهَاۖ ﴾ واتە: (ئەوان) لە بارەی ڕۆژی دواییەوە لە گوماندان، وە گومانو دوو دڵی زانستی پێ لادەچێ، چونکە زانست بە هەموو پلەو پایەکانیەوە لەگەڵ گوماندا کۆنابێتەوە ﴿ بَلۡ هُم مِّنۡهَا ﴾ واتە: (بەڵکو ئەوان) دەربارەی ڕۆژی دوایی ﴿ عَمُونَ ﴾ بێگومان چاوەکانیان کوێر بووە، وە هیچ لە دڵەکانیاندا نیە دەربارەی ڕوودانی ڕۆژی دوایی جگە لە گومان نەبێ، بەڵکو ئینکاریان کردوەو بە درۆیان زانیوە.

(٦٧) لەبەرئەمە فەرموویەتی: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبٗا وَءَابَآؤُنَآ أَئِنَّا لَمُخۡرَجُونَ ﴾ زیندووکردنەوە دوورەو مومکین نیە، ئەوان تواناو دەسەڵاتی خوایان پێوانەکرد بە تواناو دەسەڵاتە لاوازەکەی خۆیان.

(٦٨): ﴿ لَقَدۡ وُعِدۡنَا هَٰذَا ﴾ واتە: (سوێند بە خوا ئێمە) بەڵێنی زیندووکردنەوەمان پێدرا ﴿ نَحۡنُ وَءَابَآؤُنَا مِن قَبۡلُ ﴾ واتە: (ئێمەو باوکو باپیرانمان لەمەو پێش) زیندوو کردنەوەش

نەهات، وە هیچ شتێکمان لەو بارەیەوە نەبینی ﴿ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾ (ئەم هەڕەشەیە) تەنها سەرگوزەشتەو هەواڵی پێشینەکانە، بۆ ئەوەیە کات بەسەر ببەن، وە هیچ بنەمایەکی نیەو ڕاستیش نیە.

دوای ئەوەی هەواڵی بەدرۆدانەرانی باسکرد، ئنجا هەواڵەکەی گواستەوە کە ئەوان نازانن کەی ڕۆژی دوایی دێ، پاشان هەواڵیدا دەربارەی لاوازی زانستیان بە ڕۆژی دوایی، پاشان هەواڵیدا کە ئەوە گومانو دوو دڵیە، پاشان هەواڵیدا ئەوە کوێر بوونە لە ئاستی حەق، پاشان هەواڵیدا بە ئینکاری کردنیان بە زیندووکردنەوەو بە دوور دانانی. واتە: بە هۆی ئەم بارودۆخانەوە ترسی ڕۆژی دوایی لە دڵەکانیاندا نەما، بۆیە دەستیان دایە سەرپێچی کردنی خواو بەلایانەوە ئاسان بوو حەقو ڕاستی بەدرۆ دابنێن، وە ڕاستیش بە پووچ، ئارەزووبازیان پێشخست بەسەر بەجێهێنانی پەرستشەکان، بۆیە دونیاو دوارۆژیان لە دەست چوو، پاشان ئاگاداریان دەکاتەوە لەسەر ڕاستی هەواڵی پێغەمبەران، فەرموویەتی:

(٦٩): ﴿ قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٦٩﴾ ﴾:

هیچ تاوانبارێک نابینین بەردەوام بوویێ لەسەر تاوانەکەی، مەگەر خراپترین سەرەنجامی هەبووە، خوا ﷻ سزاو تۆڵەیەکی بۆ ئامادە دەکات کە شایستەو گونجاویێ بە پێی.

(٧٠-٧٢): ﴿ وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلَا تَكُن فِى ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ ﴿٧٠﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٧١﴾ قُلْ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ رَدِفَ لَكُم بَعْضُ ٱلَّذِى تَسْتَعْجِلُونَ ﴿٧٢﴾ ﴾:

﴿ وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلَا تَكُن فِى ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ ﴾واتە:خەمبارو دڵتەنگ مەبە ئەی موحەممەد ﷺ بۆ ئەو بەدرۆدانەرانەو بڕوا نەبوونیان، بەڕاستی تۆ ئەگەر بزانی چەندە شەڕوخراپەیان تێدایەو شایستەی خێر نین، ئەوە نەبێ ئومێد دەبوویتو نە خەمت دەخواردو نە دڵ تەنگ دەبوویت، وە گوێ مەدە بە فرتو فێڵو پیلانەکانیان، چونکە دەرەنجامی پیلانەکانیان دەگەڕێتەوە بۆ خۆیان ﴿ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ ٱللَّهُ ۖ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَٰكِرِينَ ﴿٣٠﴾ ﴾الأنفال، (واتە: ئەوانە فرو فێڵ دەکەن خواش لە بەرانبەر ئەواندا پلان دادەنێ، وە خوا چاکترینی پلان دانەرانە). ئەوانەی زیندوو بوونەوە بە درۆ دائەنێنو بڕوایان بە پەیامی پێغەمبەر نەهێناوە، پەلەی ئەوە دەکەن سزا بدرێن، دەڵێن:

(٧١): ﴿ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾ ئەمەش لە خراپی بۆچوونو نەفامیانەوەیە، چونکە سزادانو کاتەکەی خوا ﷻ دیاری کردوەو ئەندازەی کێشاوە، پێشنەخستنی سزا بۆیان بەڵگە نیە لەسەر هەندێ لە داواکاریەکانیان.

(٧٢): بەڵام لەگەڵ ئەمەدا خوا ﷻ ئاگاداری کردونەتەوە لە ڕوودانی ئەو سزایەی کە پەلەیان

تێدا دەکرد: ﴿ قُلْ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ رَدِفَ لَكُم ﴾ واتە: سزا لە ئێوە نزیک بووەتەوە خەریکە تووشتان دەبێ، ﴿ بَعْضُ ٱلَّذِى تَسْتَعْجِلُونَ ﴾ (واتە: هەندێ) لەو سزایەی (داوای هاتنی دەکەن).

(٧٣-٧٥): ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٧٣﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَيَعْلَمُ مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمْ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٧٤﴾ وَمَا مِنْ غَآئِبَةٍ فِى ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٧٥﴾ ﴾:

﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَشْكُرُونَ ﴾ خوا ﷻ بەندەکانی ئاگادار دەکاتەوە دەربارەی بەرفراوانی بەخشندەیی‌و زۆری فەزڵو چاکەکانی، وە هانیان دەدات لەسەر ستایش‌و شوکرانە بژێریان، وە لەگەڵ ئەمەدا زۆربەی خەڵکی پشتیان کردوەو لە پەروەردگاریان‌و سوپاس گوزاری ناکەن، سەرقاڵ بوون بە نازو نیعمەتەکانەوە لە پێدەری نازو نیعمەتەکان.

(٧٤): ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَيَعْلَمُ مَا تُكِنُّ ﴾ واتە: (پەروەردگارت ئاگادارە بەوەی کە دەیشارنەوە)، ﴿ صُدُورُهُمْ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴾، (لە دڵەکانیانداو ئەوەیشی دەریدەبڕن) با ئاگادار بن بە زانای نهێنی‌و ئاشکرا، وە با چاودێری بکەن.

(٧٥): ﴿ وَمَا مِنْ غَآئِبَةٍ فِى ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ واتە: هیچ شاراوەو نهێنیەک لە نهێنیەکانی جیهانی سەروو خوارەوە نیە، ﴿ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴾ (مەگەر لە کتێبی ڕووندایە) ئەو کتێبە دەوری هەموو ڕووداوەکانی داوە، ئەوەی بووەو ئەوەی دەبێ هەتا ڕۆژی دوایی، هەر ڕووداوێک ڕوویدات ئاشکرابێ یان شاراوە، ئەوە بێگومان پڕاو پڕە، لەگەڵ ئەوەی نووسراوە لە (لوح المحفوظ)دا.

(٧٦-٧٧): ﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَقُصُّ عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَكْثَرَ ٱلَّذِى هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٧٦﴾ وَإِنَّهُۥ لَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٧٧﴾ ﴾:

﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَقُصُّ عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَكْثَرَ ٱلَّذِى هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴾ ئەمە هەواڵدانێکە دەربارەی گەورەیی‌و مەزنی قورئان بە سەر کتێبەکانی پێشوودا، وە درێژە پێدان‌و ڕوونکردنەوەی تێدایە لەو ڕووداوانەی کە جێگای گومانن، وە مایەی جیاوازیە لە لای نەوەکانی ئیسرائیل، ئەم قورئانە بە جۆرێ باسی کردوە ئاڵۆزیەکانی پێ لابردوەو ڕاستی دەرخستووە لەو بابەتانەی جیاوازیان تێدایە. جا ئەگەر خاوەن ئەم پلەو پایە بێ لە گەورەیی‌و ڕوونی‌و ئاشکرایداو لابردنی هەموو جیاوازیەک‌و یەکلاکردنەوەی هەموو ئاڵۆزیەک، ئەوە مەزنترین نیعمەتی خوایە بەسەر بەندەکانەوە، بەڵام هەموو کەسێ لە بەرانبەر نیعمەتەکاندا سوپاسگوزار نیە. لەبەرئەمەیە ڕوونی کردۆتەوە کە سوودو ڕووناکی‌و هیدایەتی قورئان تایبەتە بە بڕواداران.

وَإِنَّهُۥ لَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٧٧﴾ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِى بَيْنَهُم
بِحُكْمِهِۦ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٧٨﴾ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ إِنَّكَ عَلَى
ٱلْحَقِّ ٱلْمُبِينِ ﴿٧٩﴾ إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ وَلَا تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ ٱلدُّعَآءَ
إِذَا وَلَّوْا۟ مُدْبِرِينَ ﴿٨٠﴾ وَمَآ أَنتَ بِهَٰدِى ٱلْعُمْىِ عَن ضَلَٰلَتِهِمْ إِن
تُسْمِعُ إِلَّا مَن يُؤْمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا فَهُم مُّسْلِمُونَ ﴿٨١﴾ وَإِذَا وَقَعَ
ٱلْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَآبَّةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ
ٱلنَّاسَ كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا لَا يُوقِنُونَ ﴿٨٢﴾ وَيَوْمَ نَحْشُرُ مِن كُلِّ أُمَّةٍ
فَوْجًا مِّمَّن يُكَذِّبُ بِـَٔايَٰتِنَا فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴿٨٣﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُو قَالَ
أَكَذَّبْتُم بِـَٔايَٰتِى وَلَمْ تُحِيطُوا۟ بِهَا عِلْمًا أَمَّاذَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ
﴿٨٤﴾ وَوَقَعَ ٱلْقَوْلُ عَلَيْهِم بِمَا ظَلَمُوا۟ فَهُمْ لَا يَنطِقُونَ ﴿٨٥﴾ أَلَمْ
يَرَوْا۟ أَنَّا جَعَلْنَا ٱلَّيْلَ لِيَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبْصِرًا ۚ إِنَّ فِى
ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٨٦﴾ وَيَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ فَفَزِعَ مَن
فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ ۚ وَكُلٌّ أَتَوْهُ
دَٰخِرِينَ ﴿٨٧﴾ وَتَرَى ٱلْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِىَ تَمُرُّ مَرَّ ٱلسَّحَابِ ۚ
صُنْعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ أَتْقَنَ كُلَّ شَىْءٍ ۚ إِنَّهُۥ خَبِيرٌۢ بِمَا تَفْعَلُونَ ﴿٨٨﴾

(٧٧): ﴿ وَإِنَّهُۥ لَهُدًى ﴾ (ئەم قورئانە ڕێنماییە) لە گومڕاییو دوو دڵی ﴿ وَرَحْمَةٌ ﴾ وە بەزەییە دڵیان پێی فێنک دەبێتەوە، کاروباری ئاینیو دونیاییان بە هۆیەوە ڕێک دەبێ ﴿ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴾ بۆ ئەوانەی بڕوایان پێیە تی، بە ڕاستی دەزانن و وەریدەگرن، وە قووڵ دەبنەوە لە ماناکانیو بیری لێدەکەنەوە، بێگومان ئەوانە ڕێنمایی بەدەست دێنن بۆ ڕێگای ڕاست، وە ڕەحمەتێکیان بۆ دەبێ خۆشبەختیو کامەرانیو سەرفرازیو سەرکەوتنی تێدایە.

(٧٨): ﴿ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِى بَيْنَهُم بِحُكْمِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٧٨﴾ ﴾:

﴿ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِى بَيْنَهُم بِحُكْمِهِۦ ﴾ واتە: بە ڕاستی خوا ﷻ دادوەری دەکات لە نێوان دژەکاندا، وە لە داهاتوویەکی نزیکدا حوکمو بڕیار دەدات لە نێوان ئەو کەسانەیان کە جیاوازیان هەیە، بە بڕیاری دادپەروەرانەی، جا کاروبارەکان ئەگەرچی لە دونیادا دوو دڵیو گومانیان تێدا بێ لە نێوان ناکۆکیکاراندا، بە هۆی شاراوەیی بەڵگە، یان هەندێ لە مەبەستەکان، ئەوە بێگومان خوا ﷻ هەق ڕوون دەکاتەوە کە پڕاوپڕە لە گەڵ واقیعدا، کاتێ خوا ﷻ بڕیاری تێدا دەدات ﴿ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ﴾ ئەو زاتە زاڵە بەسەر بەدیهێنراوەکاندا، بۆیە ملکەچی دەبن ﴿ ٱلْعَلِيمُ ﴾ زانایە بە هەموو شتەکانو هەموو قسە جیاوازەکان، وە لەو قسانەیشی کە دەرچوون، وە لە مەبەستەکانیان، وە لە داهاتوودا پاداشتی هەموویان دەداتەوە بەوەی زانیوەیەتی دەربارەیان.

(٧٩-٨١): ﴿ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۖ إِنَّكَ عَلَى ٱلْحَقِّ ٱلْمُبِينِ ﴿٧٩﴾ إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ وَلَا تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا وَلَّوْا۟ مُدْبِرِينَ ﴿٨٠﴾ وَمَآ أَنتَ بِهَٰدِى ٱلْعُمْىِ عَن ضَلَٰلَتِهِمْ ۖ إِن تُسْمِعُ إِلَّا مَن يُؤْمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا فَهُم مُّسْلِمُونَ ﴿٨١﴾ ﴾:

﴿ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ﴾ واتە: پشت بە پەروەردگارت ببەستە لە بەدەستهێنانی بەرژەوەندیەکانو ڕەتکردنەوەی زیانەکان، وە لە گەیاندنی پەیامو بەجێهێنانی ئاینو جیهادکردنی دوژمنان ﴿ إِنَّكَ عَلَى ٱلْحَقِّ ٱلْمُبِينِ ﴾ (بێگومان تۆ لەسەر ئاینێکی ڕاستو) ڕوونو ئاشکرای، وە ئەو

کەسەی لە سەر هەق بێ- بانگەشەی بۆ دەکاو هەڵدەسێ بە سەرخستنی- لە پێشترە لە غەیری خۆی بە پشت بەستن، چونکە ئەو کۆشش بۆ شتێ دەکات دڵنیایە لێیو دەزانێ ڕاستە، هیچ گومانو دوو دڵیەکی تێدانیە، هەروەها ئەو ڕاستە لەوپەڕی ڕوونیدایە، هیچ شاراوەو گومانێکی تێدانیە، ئەگەر ئەرکی سەرشانت بەجێ بهێنی، وە پشت بە خوا ببەستی لە جێبەجێ کردنیدا، ئەوە بێگومان گومڕایی گومڕاکار زیانت پێ ناگەیەنێ، وە هیدایەتی ئەوان لەسەر تۆ نیە، لەبەر ئەمە فەرموویەتی:

(٨٠): ﴿ إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ الْمَوْتَىٰ وَلَا تُسْمِعُ الصُّمَّ الدُّعَاءَ ﴾ (واتە: بێگومان تۆ ناتوانی بانگەوازت بە مردووەکان ببیستێنی، وە ناتوانی بانگەوازت بەوانەی کەڕن بژنەوێنی) کاتێ کە بانگیان دەکەی، وە بە تایبەت ﴿ إِذَا وَلَّوْا مُدْبِرِينَ ﴾ (کاتێ پشت هەڵدەکەنو دەڕۆن) ئەوە بێگومان لە پێشترە لە گوێگرتنیان بە بانگەوازەکەی تۆ.

(٨١): ﴿ وَمَا أَنتَ بِهَادِي الْعُمْيِ عَن ضَلَالَتِهِمْ ﴾ (واتە: وە تۆ ناتوانیت کوێران ڕزگار بکەیت لە گومڕاییەکەیان) هەروەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ ﴿٥٦﴾ ﴾القصص. (واتە: بەڕاستی ئەی موحەممەد ﷺ تۆ ناتوانی ئەو کەسەی خۆشت بوێ ڕێنمایی بکەیت، بەڵام خوا هەر کەسی بوێ ڕێنمایی دەدات)، ﴿ إِن تُسْمِعُ إِلَّا مَن يُؤْمِنُ بِآيَاتِنَا فَهُم مُّسْلِمُونَ ﴾ واتە: تەنها ئەو کەسانەی کە ملکەچی تۆ دەبن، ئەو کەسانەی بڕوایان بە ئایەتەکانی خوا ﷻ هەیەو ملکەچی دەبن بە کردەوەکانیان، هەروەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ إِنَّمَا يَسْتَجِيبُ الَّذِينَ يَسْمَعُونَ وَالْمَوْتَىٰ يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ ثُمَّ إِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾الأنعام (واتە: بە ڕاستی تەنها ئەوانە وەڵامی تۆ ئەدەنەوە کە بە دڵ ئەبیستن مردووەکانیش خوا زیندوویان دەکاتەوە پاشان هەر بۆ لای خوا ﷻ دەگەڕێنەوە.

(٨٢): ﴿ وَإِذَا وَقَعَ الْقَوْلُ عَلَيْهِمْ ﴾ واتە: کاتێ ئەو بەڵێنەی بە خەڵکی دراوە بەسەریاندا هات، کە خوا ﷻ یەکلای کردۆتەوەو کاتەیشی پێویست کردوە، ﴿ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَابَّةً ﴾ (واتە: گیانلەبەرێک دەردێنین) ﴿ مِّنَ الْأَرْضِ ﴾ (لە زەوی) یان گیانلەبەرێک لە گیانلەبەرەکانی سەر زەوی نەک لە ئاسمان، ئەم گیانلەبەرە ﴿ تُكَلِّمُهُمْ ﴾ واتە: قسە لەگەڵ مرۆڤەکاندا دەکات، دەڵێ: بە ڕاستی ئەم خەڵکە بڕوای ڕاستەقینەیان نەهێنا بە ئایەتەکانی خوا، واتە: لەبەر ئەوەی خەڵکی زانستو دڵنیاییان لاواز بووە بە ئایەتو نیشانەکانی خوا ﷻ، بۆیە خوا ئەم گیانلەبەرەی بۆ دەرخستوون، کە یەکێکە لە ئایەتو موعجیزە سەرسووڕهێنەرەکانی، بۆ ئەوەی بۆ خەڵکی ڕوون بکاتەوە لەوەی کە بە گومانو دوو دڵن لێی.

ئەم گیانداره گیاندارێكی بەناوبانگە لە كۆتایی دونیادا دەردەكەوێ، یەكێكە لە نیشانەكانی ڕۆژی دوایی، هەروەک فەرموودەیەکی زۆر لەبارەیەوە هاتووە، وە هیچ بەڵگەیەک دەربارەی جۆرو چۆنێتیان نەهاتووە، بەڵكو دەقە پیرۆزەكە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خوا بۆ خەڵكی دەریدێنێ، وە ئەو قسەكردنەیان لەگەڵ خەڵكیدا لە دەرەوەی دابو نەریتو سروشتە، ئەوە بەڵگەیە لەسەر ڕاستی ئەو هەواڵەی كە خوا داویەتی لە كتێبەكەیدا، خوا زاناترە.

(٨٣-٨٥): ﴿ وَيَوْمَ نَحْشُرُ مِن كُلِّ أُمَّةٍ فَوْجًا مِّمَّن يُكَذِّبُ بِـَٔايَـٰتِنَا فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴿٨٣﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُو قَالَ أَكَذَّبْتُم بِـَٔايَـٰتِى وَلَمْ تُحِيطُوا۟ بِهَا عِلْمًا أَمَّاذَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٨٤﴾ وَوَقَعَ ٱلْقَوْلُ عَلَيْهِم بِمَا ظَلَمُوا۟ فَهُمْ لَا يَنطِقُونَ ﴿٨٥﴾ ﴾:

﴿ وَيَوْمَ نَحْشُرُ مِن كُلِّ أُمَّةٍ فَوْجًا ﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدات دەربارەی حاڵی بە درۆدانەران لە ڕۆژی دواییدا، كە هەموویان كۆدەكاتەوە لە هەموو میللەتێ لە میللەتەكان دەستەو تاقمێ، ﴿ مِّمَّن يُكَذِّبُ بِـَٔايَـٰتِنَا فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴾ سەرەتا بۆ كۆتایان كۆدەكرێتەوە، وە كۆتاش بۆ سەرەتایان، بۆ ئەوەی پرسیارو سەرزەنشتو لۆمە هەموویان بگرێتەوە ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُو ﴾ (تا كاتێ دێن) و ئامادە دەبن، خوا بە سەرزەنشتو لۆمەكردنەوە پێیان دەفەرموێ: ﴿ أَكَذَّبْتُم بِـَٔايَـٰتِى وَلَمْ تُحِيطُوا۟ بِهَا ﴾ واتە: (ئایا ئێوە ئایەتەكانی منتان بە درۆ دەزانیو هیچ زانیاریەكتان دەربارەیان نەبوو) واتە: پێویست بوو لەسەرتان بوەستن هەتا حەقتان بۆ دەردەكەوێ، وە هیچتان نەوتایە بە زانست نەبێ، چۆن شتێكتان بە درۆ زانی لە كاتێكدا زانیاریتان دەربارەی نەبوو؟ ﴿ أَمَّاذَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ واتە: پرسیاریان لێ دەكات دەربارەی زانستو كردەوەیان، دەبینێ زانستیان ئەوە بووە حەقو ڕاستیان بە درۆ زانیوە، وە كردەوەیان بۆ جگە لە خوا بووە، یان لەسەر سوننەتی پێغەمبەر ﷺ نەبووە.

(٨٥): ﴿ وَوَقَعَ ٱلْقَوْلُ عَلَيْهِم بِمَا ظَلَمُوا۟ ﴾ سزایان لەسەر پێویست دەبێ بە هۆی ستەمكاریانەوە كە بەردەوام بوونە لەسەری، وە بەڵگەكانیان بۆ دەخرێتە ڕوو، ﴿ فَهُمْ لَا يَنطِقُونَ ﴾ (ئنجا ئەوان هیچ قسە ناكەن) چونكە هیچ بەڵگەیەكیان پێ نیە.

(٨٦): ﴿ أَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّا جَعَلْنَا ٱلَّيْلَ لِيَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبْصِرًا ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٨٦﴾ ﴾:

﴿ أَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّا جَعَلْنَا ٱلَّيْلَ لِيَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبْصِرًا ﴾ واتە: ئایا نەیانزانیوەو نەیانبینیوە ئەم ئایەتو نیشانە مەزنانەو نیعمەتە بە نرخانە، ئەویش بریتیە لەوەی خوا ﷻ شەوو ڕۆژی بۆ ڕامهێناون، شەو بە تاریكی بۆ ئەوەی پشوو بدەن لە ماندوو بوونیانو خۆیان ئامادە بكەن بۆ

کار، وە خۆر بە ڕۆشنایی بۆ ئەوەی بڵاو ببنەوە بەسەر زەویدا بۆ بەدەستهێنانی ڕزقو ڕۆزیو کاروبارەکانیان ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ (واتە: بە ڕاستی لەمەدا چەند بەڵگەو نیشانە هەیە بۆ کەسانێ ئیمان دێنن) بە یەکتاپەرستی خواو تەواوی نازو نیعمەتەکانی.

(٨٧-٩٠): ﴿وَيَوْمَ يُنفَخُ فِي الصُّورِ فَفَزِعَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ إِلَّا مَن شَاءَ اللَّهُ وَكُلٌّ أَتَوْهُ دَاخِرِينَ ﴿٨٧﴾ وَتَرَى الْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ السَّحَابِ صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ إِنَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَفْعَلُونَ ﴿٨٨﴾ مَن جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ خَيْرٌ مِّنْهَا وَهُم مِّن فَزَعٍ يَوْمَئِذٍ آمِنُونَ ﴿٨٩﴾ وَمَن جَاءَ بِالسَّيِّئَةِ فَكُبَّتْ وُجُوهُهُمْ فِي النَّارِ هَلْ تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٩٠﴾﴾

خوا بەندەکانی دەترسێنێ لەوەی لە پێشیانە لە ڕۆژی دوایی، وە لەو نارەحەتیو دوو دڵیو خەمو پەژارانەی کە تووشی دڵەکانیان دەبێ فەرموویەتی: ﴿وَيَوْمَ يُنفَخُ فِي الصُّورِ فَفَزِعَ﴾ (واتە: ئەو ڕۆژە فوو دەکرێ بە صوردا) بە هۆی فووکردن پیایدا ﴿مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ﴾ واتە: (هەرچی لە ئاسمانەکانو زەویدان) دادەچڵەکێنو شپرزە دەبنو دادەچڵەکێن بە هۆی ئەو مەترسیانەی لە پێشیانە ﴿إِلَّا مَن شَاءَ اللَّهُ﴾ مەگەر کەسێ خوا ڕێزی لێنابێو چەسپاندبێتیو پاراستبێتی لە نارەحەتی ﴿وَكُلٌّ﴾ هەموو دروستکراوەکان لە کاتی فووکردن بە صوردا ﴿أَتَوْهُ دَاخِرِينَ﴾ بە بچووکیو زەلیلیەوە (دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا) هەروەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿إِن كُلُّ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِلَّا آتِي الرَّحْمَٰنِ عَبْدًا ﴿٩٣﴾﴾ مریم، (واتە: هەموو ئەوانەی لە ئاسمانەکانو زەویدان بە بەندەیی دێنە لای خوای میهرەبان) لەو ڕۆژەدا دەسەڵاتدارانو ژێر دەستەکان یەکسانن، لە زەلیلیو گەردن کەچی بۆ پاشای پاشاکان.

(٨٨): وە لە مەترسیەکانی ڕۆژی دوایی تۆ ﴿وَتَرَى الْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً﴾ (واتە: ئەو کێوانە دەبینی وادەزانی دامەزراون) هیچیان لێ کەم ناکات، وە وادەبینی لەسەر حاڵی خۆیان دەمێننەوە، بەڵام لە نارەحەتیو ناخۆشیەکاندا گەیشتۆتە ئەو پەڕی، لەتو پەت بووەو پەرشو بڵاو بووەتەوە، وە بووە بە خۆڵەمێش، لەبەرئەمەیە فەرموویەتی: ﴿وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ السَّحَابِ﴾ (واتە: کاتێ فووکرا بە صوردا چیاکان وەکو هەور دەڕۆن) لەبەر سووکیان، وە نارەحەتیو مەترسی ئەو ڕۆژە، بێگومان ئەوە ﴿صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ إِنَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَفْعَلُونَ﴾ واتە: (ئەمە دروستکراوی ئەو خوایەیە کە هەموو شتێکی بەو پەڕی ڕێکو پێکی دروست کردوە) جا پاداشتان دەداتەوە بە پێی کردەوەکانتان.

مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ خَيْرٌ مِّنْهَا وَهُم مِّن فَزَعٍ يَوْمَئِذٍ ءَامِنُونَ ﴿٨٩﴾
وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَكُبَّتْ وُجُوهُهُمْ فِى ٱلنَّارِ هَلْ تُجْزَوْنَ إِلَّا
مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّمَآ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ رَبَّ هَٰذِهِ ٱلْبَلْدَةِ
ٱلَّذِى حَرَّمَهَا وَلَهُۥ كُلُّ شَىْءٍ ۖ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ
﴿٩١﴾ وَأَنْ أَتْلُوَا۟ ٱلْقُرْءَانَ ۖ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ ۖ
وَمَن ضَلَّ فَقُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴿٩٢﴾ وَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ
سَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ فَتَعْرِفُونَهَا ۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٩٣﴾

(٨٩): پاشـان چۆنێتـی پاداشـتی ڕوونكردوەتـەوەو فەرموویەتـی: ﴿مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ﴾ (الحسنة) نـاوی (جنـس) هەمـوو چاكەیـەك دەگرێتـەوە، قسـەكردن بێـت، یـان كـردەوە، یـان دڵ، ﴿فَلَهُۥ خَيْرٌ مِّنْهَا﴾ ئەمـە كەمترینـی فـەزڵو چاكەیـە.

﴿وَهُم مِّن فَزَعٍ يَوْمَئِذٍ ءَامِنُونَ﴾ واتـە: ئـەوان دڵنیـان لـەو تـرس‌و نارەحەتیانـەی خەڵكـی دەترسـن تووشـی بـن، ئەگەرچـی ئەوانیـش لەگەڵیانـدا دادەچڵەكێـن.

(٩٠): ﴿وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ﴾ (السیئة) نـاوی (جنـس) هەمـوو گوناهێـك دەگرێتـەوە، ﴿فَكُبَّتْ وُجُوهُهُمْ فِى ٱلنَّارِ﴾ واتـە: فـڕێ دەدرێنـە نـاو دۆزەخـەوە بەسـەر ڕوومەتـدا، پێـان دەوتـرێ: ﴿هَلْ تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ (واتـە: ئایـا سـزا دەدرێـن جگـە لـەوەی دەتانكـرد).

(٩١-٩٣): ﴿إِنَّمَآ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ رَبَّ هَٰذِهِ ٱلْبَلْدَةِ ٱلَّذِى حَرَّمَهَا وَلَهُۥ كُلُّ شَىْءٍ ۖ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٩١﴾ وَأَنْ أَتْلُوَا۟ ٱلْقُرْءَانَ ۖ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن ضَلَّ فَقُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴿٩٢﴾ وَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ فَتَعْرِفُونَهَا ۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٩٣﴾﴾:

﴿إِنَّمَآ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ رَبَّ هَٰذِهِ ٱلْبَلْدَةِ ٱلَّذِى حَرَّمَهَا﴾ واتـە: (ئـەی موحەمـەد ﷺ بڵـێ: بێگومـان مـن فەرمانـم پێـدراوە كـە تەنهـا پەروەردگـاری ئـەم شـارە) مەككەی پیـرۆز بپەرسـتم، ئـەو زاتـەی ڕێـزی شـكاندنی ئـەم شـارەی قەدەغـە كـردوە، وە نازو نیعمەتـی ڕشـتووە بەسـەر گەلەكەیـدا، پێویسـتە لەبەرانبـەری ئـەوەدا سوپاسـگوزاری بكـەن ﴿وَلَهُۥ كُلُّ شَىْءٍ﴾ (واتـە: وە هەمـوو شـتێك تەنهـا هـی ئـەو خوایەیـە) لـە جیهانـی سـەرەوەو خـوارەوە، لەبـەر ئـەوە ئەمـەی هێنـاوە تـا كەسـێك وا خەیـاڵ

نـەکات پەروەردگارێتـی خـوا تایبەتـە تەنهـا بـەماڵـی حـەرام ﴿ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴾ واتـە: پەلـە دەکـەم بـۆ ئیسـلام. بێگومـان پێغەمبـەر ﷺ ئەمـەی کـرد، ئـەو یەکەمینـی ئـەم ئۆممەتـە بـوو مسـوڵمان بـوو، ملکەچـی خـۆ بەدەسـتەوەدانی زۆر مـەزن بـوو.

(٩٢): ﴿ وَأَنْ أَتْلُوَا ﴾ هەروەهـا فەرمانـم پێکـراوە بەسـەرتاندا بخوێنمەوە ﴿ ٱلْقُرْءَانَ ﴾ (قورئانـی پیـرۆز) بـۆ ئـەوەی ڕێنمایـی پێوەربگـرنو پەیـڕەوی بکـەن، وە فێـری بێـژەو ماناکانـی ببـن، ئـەوەی لەسـەر شـانی مـن بـوو گەیانـدم، ﴿ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ ﴾ (واتـە: جـا هـەر کەسـێ هیدایەتـی وەرگـرت ئـەوە بێگومـان تەنهـا بـۆ خـۆی هیدایـەت وەردەگـرێ) سـوودەکەی بـۆ خـۆی دەگەڕێتـەوە، وە بەرهەمەکەیشـی هـەر بـۆ خۆیەتـی ﴿ وَمَن ضَلَّ فَقُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴾ (واتـە: هەرکەسـیش گومـڕا بێـت، بڵـێ: بـە ڕاسـتی مـن تەنهـا یەکێکـم لـە ترسـێنەران) هیدایـەتو ڕێنمایـی بەدەسـتی مـن نیـە.

(٩٣): ﴿ وَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ﴾ (واتـە: بڵـێ: سـتایش بـۆ خـوا) ئـەو زاتـەی خاوەنـی ستایشـە لـە سـەرەتاو کۆتـا، وە لـە هەمـوو خەڵکـی بـە تایبـەت خـاوەن تایبەتمەنـدیو پاڵفتەکـراون لـە بەندەکانـی، بێگومـان ئـەوەی ئـەوان ئەنجامـی دەدەن لـە ستایشـیو پیاهەڵدانـی پەروەردگاریـان زیاتـرە لـە غەیـری ئـەوان، بـە هـۆی بـەرزی پلـەو پایـەو تـەواوی نزیکیـان لـە خـواوە، وە زۆری نـازو نیعمەتەکانـی بەسـەریانەوە.

﴿ سَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ فَتَعْرِفُونَهَا ﴾ (واتـە: ئـەو خوایـە بـە زوویـی ئایـەتو نیشـانەکانی نیشـانی ئێـوە دەدات ئێـوەش دەیناسـنەوە) ناسـینەوەیەک ڕێنماییتـان بـکات بـۆ هـەقو ناهـەق. هـەر دەبـێ ئایـەتو نیشـانەکانی نیشـانی ئێـوە بـدات بـۆ ئـەوەی ڕووناکـی پێوەربگـرن لـە تاریکیەکانـدا ﴿ لِّيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَنۢ بَيِّنَةٍ وَيَحْيَىٰ مَنْ حَيَّ عَنۢ بَيِّنَةٍ ۝٤٢ ﴾ الأنفـال، (واتـە: بـۆ ئـەوەی لەنـاو بچـێ ئـەوەی کـە لـە زانسـتی خـوادا لەنـاو چـووەو بـۆ ئـەوەی بـژی لەسـەر بەرچـاوو ڕوونـیو بەڵگـە، ئـەوەی لـە زانسـتی خـوادا دەژی لەسـەر دینداریـی).

﴿ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴾ (واتـە: پەروەردگـاری تـۆ بێئاگـا نیـە لـەو کردەوانـەی ئـەوان دەیکـەن) بەڵکـو دەزانـی ئێـوە چ کردەوەیـەک دەکـەنو لـە چ دۆخێـک دان، وە دەزانـێ ئەنـدازەی پاداشـتی ئـەو کردەوانـە، لـە داهاتـوودا حوکـمو بڕیـار

دەدات لــە نێوانتانــدا بــە بڕیارێــک، ستایشــی لەســەر ئــەو بڕیــارە، وە هیــچ بەڵگــەو حوججەیەکتــان نابێــت بــە جــۆرێ لــە جــۆرەکان لەســەری.

داوای دەکەیــن خــوا بــەردەوام پشــتیوانو یارمەتیدەرمــان بێــت، ئــەو زاتــە بەخشــندەی بەخشــندەکانەو چاکترینــی میهرەبانەکانــە، نــازو نیعمەتــی خــۆی دەگەیەنــێ کاتــی مرۆڤــەکان دەیبــڕن، وەڵامدانــەوەی داواکارانــە، کارئاســانکەری کارە قورســەکانە، دەرگاکانــی فــەڕو بەرەکەتــی والآیــە، لــە هەمــوو کاتــەکان دەبەخشــی بــە بەنــدەکان بەخشــینێکی بــێ پایــان، ئاســانکاری ڕێگاکانــی قورئانــە بــۆ ئەوانــەی ویســتی فێربوونــی دەکــەنو ڕووی تێدەکــەن، ســفرەی خێــرو چاکەکانــی کراوەیــە، ســوپاسو ســتایش بــۆ پەروەردگــاری جیهانییــان.

دروودو ســڵاو بڕژێ بۆ سەر موحەممەد ﷺ و خانەوادەو هاوەڵەکانی.

تەفسیری سوورەتی (النمل) تەواو بوو.


سُورَةُ القَصَصِ
بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
طسٓمٓ ﴿١﴾ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢﴾ نَتْلُواْ عَلَيْكَ
مِن نَّبَإِ مُوسَىٰ وَفِرْعَوْنَ بِٱلْحَقِّ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٣﴾ إِنَّ
فِرْعَوْنَ عَلَا فِي ٱلْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ
طَآئِفَةً مِّنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَآءَهُمْ وَيَسْتَحْيِۦ نِسَآءَهُمْ إِنَّهُۥ كَانَ
مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٤﴾ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُواْ
فِي ٱلْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴿٥﴾

## تەفسیری سووڕەتی (القصص)

## مەککیە (٨٨) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-١٥): ﴿طسٓمٓ ﴿١﴾ تِلْكَ ءَايَٰتُ
ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢﴾ نَتْلُواْ عَلَيْكَ
مِن نَّبَإِ مُوسَىٰ وَفِرْعَوْنَ بِٱلْحَقِّ
لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٣﴾ إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِي
ٱلْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ
طَآئِفَةً مِّنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَآءَهُمْ وَيَسْتَحْيِۦ
نِسَآءَهُمْ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٤﴾ وَنُرِيدُ
أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُواْ
فِي ٱلْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ
ٱلْوَٰرِثِينَ ﴿٥﴾ وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ وَنُرِيَ فِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا مِنْهُم مَّا كَانُواْ
يَحْذَرُونَ ﴿٦﴾ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنْ أَرْضِعِيهِۖ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِي ٱلْيَمِّ وَلَا
تَخَافِي وَلَا تَحْزَنِيٓۖ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٧﴾ فَٱلْتَقَطَهُۥٓ ءَالُ فِرْعَوْنَ
لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًاۗ إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا كَانُواْ خَٰطِـِٔينَ ﴿٨﴾
وَقَالَتِ ٱمْرَأَتُ فِرْعَوْنَ قُرَّتُ عَيْنٍ لِّي وَلَكَۖ لَا تَقْتُلُوهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا وَهُمْ لَا
يَشْعُرُونَ ﴿٩﴾ وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَٰرِغًاۖ إِن كَادَتْ لَتُبْدِي بِهِۦ لَوْلَآ أَن رَّبَطْنَا
عَلَىٰ قَلْبِهَا لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠﴾ وَقَالَتْ لِأُخْتِهِۦ قُصِّيهِۖ فَبَصُرَتْ بِهِۦ عَن جُنُبٍ وَهُمْ
لَا يَشْعُرُونَ ﴿١١﴾ وَحَرَّمْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَرَاضِعَ مِن قَبْلُ فَقَالَتْ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰٓ أَهْلِ بَيْتٍ يَكْفُلُونَهُۥ
لَكُمْ وَهُمْ لَهُۥ نَٰصِحُونَ ﴿١٢﴾ فَرَدَدْنَٰهُ إِلَىٰٓ أُمِّهِۦ كَيْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ وَلِتَعْلَمَ
أَنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٣﴾ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَٱسْتَوَىٰٓ ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا
وَعِلْمًاۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٤﴾ وَدَخَلَ ٱلْمَدِينَةَ عَلَىٰ حِينِ غَفْلَةٍ مِّنْ أَهْلِهَا فَوَجَدَ فِيهَا
رَجُلَيْنِ يَقْتَتِلَانِ هَٰذَا مِن شِيعَتِهِۦ وَهَٰذَا مِنْ عَدُوِّهِۦۖ فَٱسْتَغَٰثَهُ ٱلَّذِي مِن شِيعَتِهِۦ عَلَى ٱلَّذِي مِنْ عَدُوِّهِۦ
فَوَكَزَهُۥ مُوسَىٰ فَقَضَىٰ عَلَيْهِۖ قَالَ هَٰذَا مِنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِۖ إِنَّهُۥ عَدُوٌّ مُّضِلٌّ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾﴾:

﴿ طسٓمٓ ١ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ٢ نَتۡلُواْ عَلَيۡكَ مِن نَّبَإِ مُوسَىٰ وَفِرۡعَوۡنَ بِٱلۡحَقِّ لِقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴾ تـا كۆتایـی چیرۆکەکـە.

﴿ تِلۡكَ ﴾ ئـەم ئایەتانـە شایسـتەی بـە مـەزن دانـانو بـە گـەورە دانانـن ﴿ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ﴾ (ئایەتەکانـی قورئـان ڕوونو ئاشـکران) بـۆ هەمـوو ئـەو کاروبارانـەی بەنـدەکان پێویسـتیان پێیەتـی، لـە ناسـینی پەروەردگاریـانو ناسـینی مافەکانـی، وە ناسـینی دۆسـتو دوژمنەکانـی، وە ناسـینی ڕووداو ڕۆژگارەکانـیو ناسـینی پاداشـتی کـردەوەکان، ئـەم قورئانـە خـوا ﷻ ڕوونـی کردۆتـەوە بەوپـەڕی ڕوونکردنـەوە، وە ئاشـکرای کـردوە بـۆ بەنـدەکان. لـە کـۆی ئەوانـەی دەریخسـتووە چیـرۆکو بەسـەرهاتی مووسـاو فیرعەونـە، بێگومـان لێـرەدا بـەو چیرۆکـە دەسـتی پێکـردوە، وە لـە چەنـد شـوێنێکی دیکـەدا دووبـارەی کردۆتـەوە، وە بـە تایبـەت لێـرەدا بـە درێـژی باسـی فەرمـووە، فەرموویەتـی: ﴿ نَتۡلُواْ عَلَيۡكَ مِن نَّبَإِ مُوسَىٰ وَفِرۡعَوۡنَ بِٱلۡحَقِّ ﴾ بێگومان هـەواڵو سەرگوزشـتەی ئـەوان غەریـبو سەرسـوورهێنەرە.

﴿ لِقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴾ (بـۆ ئەوانـەی بـڕوا دێنـن) سـیاقی دواندنەکـە لەگـەڵ ئەواندایـە، قسـەکردنەکەیش ڕوو لـەوان دەکات، چونکـە ئـەوان ئیمـانو بڕوایەکیـان لەگەڵدایـە دەتوانـن بـە قووڵـی بیـری لێبکەنـەوە، وە هیدایـەتو پەنـدو ئامۆژگـاری لـێ وەربگـرن، ئیمـانو یەقینیـان پێـی زیـاد دەکات، وە چاکەیـان پێـی زۆر دەبـێ، بـەڵام جگـە لـە ئیمانـداران سـوود لـەو چیـرۆکو بەسـەرهاتە وەرناگـرن، تەنهـا پێویسـت بوونـی بەڵگـەو حوججـە نەبـێ لەسـەریان، وە خـوا ﷻ لـە نێوانـی ئـەوانو هیدایـەتو ڕێنماییـدا پەردەیەکـی بەهێـزی دروسـت کـردوە کـە نەتوانـن لێـی تێبگـەن.

(٤): سـەرەتای ئـەم چیرۆکـە: ﴿ إِنَّ فِرۡعَوۡنَ عَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾ (واتـە: بـە ڕاسـتی فیرعـەون بـەرزو زاڵ بـوو لـە زەوی میسـردا) لـە موڵـکو دەسـەڵاتو سـەربازو هێـزو توانـادا، بۆیـە بـوو بـە بـەرزو زاڵ لـەو وڵاتـەدا، نـەک بـەرزو بەڕێـز ﴿ وَجَعَلَ أَهۡلَهَا شِيَعٗا ﴾ واتـە: (خەڵکەکـەی میسـری کـرد بـە) چەندیـن دەسـتەو تاقمـی جیـاواز، بـە پێـی ئـارەزووی خـۆی مامەڵـەی پێـوە دەکـردن، هـەر شـتێکی بویسـتایە بەهێـزو دەسـەڵاتی دەیسـەپاند ﴿ يَسۡتَضۡعِفُ طَآئِفَةٗ مِّنۡهُمۡ ﴾ (واتـە: کۆمەڵێکیانـی لاوازو ژێـر دەسـتە کـرد) ئـەو کۆمەڵـەش بریتـی بـوون لـە نەوەکانـی ئیسـرائیل، ئەوانـەی خـوا فـەزڵو چاکەیانـی دابـوو بەسـەر جیهانیانـدا، ئەوانـەی پێویسـت بـوو لەسـەر فیرعـەون

ڕێزیـان لێبگـرێو بـە گەورەیـان دابنـێ، بـەڵام ئـەو لاوازی کـردن، چونکـە پێـی وابـوو هیـچ ڕێگریـەک لـە بەردەمیـدا نیـە بـۆ لاوازکردنـی ئـەوان، بۆیـە هیـچ بەبـای خەیاڵیـدا نەدەهـات دەربارەیـانو گرنگـی بـە کاروباریـان نـەدەدا، تـا حاڵـی گەیشـتە ئـەوەی ﴿ يُذَبِّحُ أَبْنَآءَهُمْ وَيَسْتَحْيِۦ نِسَآءَهُمْ ﴾ (واتـە: کوڕانـی ئەوانـی سـەردەبڕیو ئافرەتانـی ئەوانـی بـە زیندوویـی دەهێشـتەوە) بـۆ ئـەوەی زیـاد نەکـەنو بڵاونەبنـەوە لـە وڵاتەکەیـداو دەسـەڵات نەکەوێتـە دەسـتیان، ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴾ (واتـە: بەڕاسـتی ئـەو لـە خراپـەکاران بـوو) ئەوانـەی هیـچ مەبەسـتێکیان نەبـوو لـە چاکسـازی ئاینـدا، وە لـە چاکسـازی دنیـادا، ئەمـە یەکێکـە لـە خراپەکاریەکانـی لەسـەر زەویـدا. (٥-٦): ﴿ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾ واتـە: بـە جـۆرێ هـۆکاری بـە لاوازکردنیـان لابەیـن، وە ئـەوەی ڕووبەڕوویـان دەبێتـەوە کۆتایـی پـێ بێنیـنو سەرشـۆڕی بکەیـن ﴿ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً ﴾ (بیانکەینـە پێشـەوا) لـە ئاینـدا، ئـەو پێشـەوایەتیەش لەگـەڵ لاوازیـدا بەدەسـت نایـە، بەڵکـو لەگـەڵ جێگیـر بـوونو بەهێزبوونـی سـەرزەویو دەسـەڵاتی تەواودا دەسـتەبەر دەبـێ ﴿ وَنَجْعَلَهُمُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴾ (بیانکەینـە میـرات بـەران) لـە سـەر زەوی ئەوانـەی سـەرەنجامی چاکیـان هەیـە لـە دونیـا پێـش دواڕۆژ .


وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ وَنُرِيَ فِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا
مِنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَحْذَرُونَ ﴿٦﴾ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ
أَنْ أَرْضِعِيهِ ۖ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِى ٱلْيَمِّ وَلَا تَخَافِى
وَلَا تَحْزَنِىٓ ۖ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٧﴾
فَٱلْتَقَطَهُۥٓ ءَالُ فِرْعَوْنَ لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا ۗ إِنَّ
فِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا۟ خَٰطِـِٔينَ ﴿٨﴾
وَقَالَتِ ٱمْرَأَتُ فِرْعَوْنَ قُرَّتُ عَيْنٍ لِّى وَلَكَ ۖ لَا تَقْتُلُوهُ
عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٩﴾
وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَٰرِغًا ۖ إِن كَادَتْ لَتُبْدِى بِهِۦ لَوْلَآ
أَن رَّبَطْنَا عَلَىٰ قَلْبِهَا لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠﴾ وَقَالَتْ
لِأُخْتِهِۦ قُصِّيهِ ۖ فَبَصُرَتْ بِهِۦ عَن جُنُبٍ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ
﴿١١﴾ وَحَرَّمْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَرَاضِعَ مِن قَبْلُ فَقَالَتْ هَلْ أَدُلُّكُمْ
عَلَىٰٓ أَهْلِ بَيْتٍ يَكْفُلُونَهُۥ لَكُمْ وَهُمْ لَهُۥ نَٰصِحُونَ
﴿١٢﴾ فَرَدَدْنَٰهُ إِلَىٰٓ أُمِّهِۦ كَىْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ وَلِتَعْلَمَ
أَنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٣﴾

﴿ وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ ﴾ (وە دەسەڵاتداریان بکەین لەسەر زەویدا) ئەم هەموو کاروبارانە بەستراون بە ویستو مەشیئەتی خوا ﴿ وَنُرِيَ فِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ ﴾ بە هەمان شێوە دەمانەوێ (نیشانی فیرعەونو هامانی بدەین)، ﴿ وَجُنُودَهُمَا ﴾ (وە سەربازەکانی) کە بە هۆی ئەوانەوە توانا و هێزو ناوبانگو بەرزیو گومڕایی دەکرد ﴿ مِنْهُم ﴾ واتە: لەو دەستە لاوازە ﴿ مَّا كَانُوا۟ يَحْذَرُونَ ﴾ (ئەوەی خۆیان لێ دەپاراست) لە دەرکردنیان لە شارو وڵاتیان، لەبەر ئەمە هەوڵیاندا لەناویان بەرنو شکۆیان بشکێننو منداڵەکانیان بکوژن، هەموو ئەوانە ویستی خوای لەسەر بوو، وە ئەگەر خوا ﷻ کارێکی بوێ هۆکارەکانیشی بۆ ئاسان دەکاتو ڕێگاکانیشی بۆ خۆش دەکات. ئەمەش بەهەمان شێوە، بێگومان خوا ﷻ بە قەزاو قەدەری نووسیویەتیو هۆکارەکانی بۆ داناوە- کە نە دۆستو نە دوژمنەکان هەستیان پێ نەکردوە- ئەوە هۆکارێکە بۆ ئەم مەبەستە.

(٧-٨): ﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنْ أَرْضِعِيهِ ﴾ سەرەتا ئەو چیرۆکە، دوای ئەوەی خوا پێغەمبەرەکەی مووسای ﷺ هێناوە بوونو کردی بە هۆکاری ڕزگار بوونی نەوەکانی ئیسرائیل، فیرعەون لەو سەردەمە ترسناکەدا منداڵی نەوەکانی ئیسرائیلی سەر دەبڕی، خوا وەحی نارد بۆ دایکی مووسا ﷺ کە شیر بدات بە مووساو لای بمێنێتەوە.

﴿ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ ﴾ ئەگەر ترست لە کەسێ هەبوو هەواڵ بگەیەنێت بە دەسەڵاتدارانی فیرعەون ﴿ فَأَلْقِيهِ فِى ٱلْيَمِّ ﴾ واتە: بیخەرە ڕووباری نیلی میسرەوە لە ناو تابووتێکی داخراودا ﴿ وَلَا تَخَافِى وَلَا تَحْزَنِىٓ ۖ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾ واتە: (مەترسە لێیو خەفەتیش مەخۆ بۆی بە ڕاستی ئێمە دەیگێڕینەوە بۆلات وە دەیکەین بە یەکێ لە پێغەمبەران) خوا ﷻ مژدەی دابە دایکی بەوەی کە مووسا ﷺ دەگێڕێتەوە بۆ لای،

وە ئـەو گـەورە دەبێو پارێزراو دەبـێ لە فڕو فێڵەکانیـان، وە خوا ﷻ دەیکات بـە پێغەمبەر، ئەمـە یەکێکـە لـە مژدە مەزنـەکان، وە پێشخسـتنی ئـەم مژدەیە بـۆ دایکی مووسـا ﷺ بۆ ئـەوە بـوو دڵی ئۆقرە بگـرێ، چونکە دەترسـا لێی، وە ئـەو فەرمانەی پێی کرابـوو جێبەجێی کـرد، خسـتیە نێـو دەریاکەوە، خـوا ﷻ ناردی هەتـا خانـەوادەی فیرعەون دۆزیانـەوە، بۆیە بـوو بـە یەکێک لـە دۆزراوەکانیان، ئـەوان ڕاسـتەوخۆ دۆزیانـەوە ﴿لِيَكُونَ لَهُمۡ عَدُوّٗا وَحَزَنًا﴾ واتـە: بـۆ ئـەوەی لـە داهاتـوودا ئـەم دۆزراوەیـە ببێت بـە دوژمنو هـۆی خەمو خەفـەت بۆیـانو خەمباریـان بکات، بێگومان خۆپاراسـتن هیچ سـوودێ ناگەیەنـێ لە هاتنی قـەزاو قـەدەردا، چونکـە ئـەوەی ئـەوان لێـی ترسـان لـە نەوەکانی ئیسـرائیل خوا ویسـتی وابـوو ببێ بـە دەسـەڵاتداریان، لە ژێر دەسـتیاندا پـەروەردە ببێو چاودێـری بکەن.

لـە کاتـی تێڕوانینو سـەرنجداندا دەبینی لـە پێچانەوەی ئەمـەدا بەرژەوەندیەکـی زۆری تێدا بـوو بـۆ نەوەکانی ئیسـرائیل، وە ڕێگـری زۆرێ لـەو کارە خراپانەی دەکرد لـە بەرانبەریان پێـش پێغەمبەرایەتـی، چونکە ئـەو بوو بە یەکێـک لە دەسـەڵاتدارانی وڵات.

بێگومـان مووسـا ﷺ پێـی وابـوو هەر دەبـێ پشـتیوانی لە مافـی گەلەکەی بـکات، وە ئەو خـاوەن هیمەتێکـی بەرزو غیـرەتو پیاوەتیەکی تەواو بـوو، وە لەبەر ئەمـە کاری ئەو گەلە لاوازە گەیشـتە ئـەوە هەنـدێ لـە تاکەکانی ڕووبـەڕووی ئەو گەلـە زاڵو خۆبەگـەورە زانە ببێتـەوە لە سـەر زەویـدا، هەروەک لـە داهاتوودا باسـکردنی دێتـە پێش، ئەمە پێشـەکیەکە بـۆ دەرکەوتن، بەڕاسـتی سـوننەتی خوا بـەو جۆرەیـە کارەکان بـە پلەبەندی بـڕوا قۆناغ بە قۆنـاغ، نەک بـە یەکجارو ڕاسـتەوخۆ.

کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِرۡعَوۡنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا كَانُواْ خَٰطِـِٔينَ﴾ واتە: (بەڕاسـتی فیرعـەونو هامانو لەشـکرو سـەربازەکانیان تاوانبارو هەڵە بوون) ویسـتمان سـزایان بدەین لەسـەر هەڵەکانیـان، وە تۆڵەیان لێبکەینەوە لـە بری فڕو فێـڵو پیلانەکانیان.

(٩): کاتـێ دارودەسـتەی فیرعەون دۆزیانەوەو هەڵیانگرت، خوا ﷻ خۆشەویسـتی مووسـای خسـتە دڵـی خێزانە چاکەخـوازو بەڕێزو بروادارەکـەی فیرعەونەوە، ئاسـیای کچی موزاحیم، ﴿وَقَالَتِ﴾ واتـە: وتـی: ئـەم منداڵـە ﴿قُرَّتُ عَيۡنٖ لِّي وَلَكَۖ لَا تَقۡتُلُوهُ﴾ واتـە: بـۆ ئێمـەی بهێڵـەرەوە، بـۆ ئـەوەی چـاوو دڵمان پێی ڕۆشـن ببێتـەوەو دڵخۆش بیـن پێی لـە ژیانماندا. ﴿عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوۡ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدٗا﴾ واتە: خاڵی نابێ، یان دەیکەین بە خزمەتکارێ کە لە بەرژەوەندی خۆمان بەکاریبهێنین، یان پلەی بەرز دەکەینەوە لەوە زیاتر دەیکەین بە منداڵی

خۆمانو ڕێزی لێدەگرین، ویستی خوا وابوو سوود بە خێزانەکەی فیرعەون بگەیەنێ، ئەو خێزانەی کە ئەو قسەیەی کرد، بێگومان کاتێ مووسا بووە ڕۆشنایی چاوی ژنەکەی فیرعەونو زۆری خۆشویست، لە لای مایەوە وەکو کوڕێکی خۆشەویستی خۆی هەتا گەورە بوو، خوا ﷻ پەیامی پێغەمبەرایەتی بۆ نارد، وە خێزانەکەی دەستپێشخەری کرد بۆ ئیسلام بوونو بڕوای پێ هێنا خوا لێی ڕازی بێ، خوا ﷻ دەربارەی ئەم گفتوگۆو هاتنو ڕۆیشتنە لە بارودۆخی مووسادا فەرموویەتی: ﴿وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ﴾ (لە کاتێکدا ئەوان هەستیان نەدەکرد) ئەوەی قەڵەمی بەسەردا هاتووەو نووسراوە، لە گەیشتنی بەو شوێنەی کە پێی گەیشت. ئەمە لە نەرمو نیانیو بەزەیی خوای گەورەیە، ئەوان ئەگەر هەستیان بەوە بکردایە ئەوە هەم بۆ ئەوانو هەم بۆ مووسا پلەو پایەی تایبەتیان دەبوو.

(١٠): ﴿وَأَصۡبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَٰرِغًا﴾ کاتێ دایکی مووسای ﷺ لە دەستدا خەمو پەژارەیەکی زۆر ڕووی تێکرد، دڵی خاڵی بوو لە هەموو شتێ جگە لە منداڵەکەی، وەکو هەموو مرۆڤێکی ئاسایی لەگەڵ ئەوەدا خوا ڕێگری کردبوو لە خەمو پەژارەو ترس لە منداڵەکەی، وە پەیمانیشی پێدابوو بیگەڕێنێتەوە بۆ لای ﴿إِن كَادَتۡ لَتُبۡدِي بِهِۦ﴾ واتە: نزیک بوو ئەو منداڵە ئاشکرا بکات ﴿لَوۡلَآ أَن رَّبَطۡنَا عَلَىٰ قَلۡبِهَا﴾ (واتە: ئەگەر دڵیمان) نەبەستایەتەوەو بەهێزمان نەکردایە ﴿لِتَكُونَ﴾ بە هۆی ئەو ئارامگرتنو پابەند بوونەیەوە ﴿مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ (یەکێک بێ لە بڕواداران).

بێگومان بەندە ئەگەر تووشی موسیبەتو بەڵایەک بوو، ئارامی گرتو چەسپاو بوو، ئەوە بێگومان ئیمانی پێی زیاد دەکات، ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بەردەوام بوونی خەمو پەژارە بەڵگەیە لەسەر لاوازی ئیمان.

(١١): ﴿وَقَالَتۡ﴾ دایکی مووسا ﷺ ﴿لِأُخۡتِهِۦ قُصِّيهِ﴾ واتە: بە خوشکەکەی مووسای ووت: بڕۆ بگەڕێ بە دوای براکەتدا بەبێ ئەوەی کەس هەستت پێ بکات، ئەویش ڕۆشت گەڕا بەدوایدا ﴿فَبَصُرَتۡ بِهِۦ عَن جُنُبٖ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ﴾ واتە: لە دوورەوە مووسای بینی تێپەڕی بەلایدا هەروەکو کەسێکی ئاسایی.

ئەمەش لە تەواوی سووربوونو خۆپاراستندایە، ئەو ئەگەر تەماشای بکردایەو بڕۆشتایە بۆ لای گومانیان دەبرد کە ئەو خستبێتیە ناو دەریاکەوە، لەوانەیە بەو هۆیەوە زیاتر سووربوونایە لەسەر سەربڕینی، ئەمەش وەک سزایەک بۆ خانەوادەکەی.

(١٢): ﴿وَحَرَّمۡنَا عَلَيۡهِ ٱلۡمَرَاضِعَ مِن قَبۡلُ﴾ لە سۆزو بەزەیی خوا بەرانبەر مووساو دایکی ئەوە

بوو ڕێگری کرد لە مووسا سنگی هیچ ئافرەتێ بگرێ، ئەوانیش بردیان بۆ بازاڕ وەکو بەزەییەک بەرانبەری، بەڵکو کەسێک بدۆزنەوە داوای بکات، خوشکەکەی هات بۆ لایان مووساش بەو حاڵەوە ﴿ فَقَالَتْ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰٓ أَهْلِ بَيْتٍ يَكْفُلُونَهُۥ لَكُمْ وَهُمْ لَهُۥ نَٰصِحُونَ ﴾ واتە: ئایا ماڵێکتان پێ نیشان بدەم کە ئەو منداڵە بۆ ئێوە بە خێوی بکەنو دڵسۆز بن بۆی.

ئەمە هەمـوو ئامانجـی خانـەوادەی فیرعـەون بوو، چونکـە ئـەوان زۆریان خۆشدەویسـت، وە خـوا ﷻ ڕێگـری کردبـوو لـە هەمـوو شـیردەرێک بۆیە ترسـان لـەوەی بمـرێ، کاتێ کـە خوشـکەکەی ئەو قسـەیەی پـێ وتن کـە هاندانـی تێدایە بـۆ بەخێوکردنو پاراسـتنو چاودێـری کـردنو ئامۆژگاریکردنـی، بـە پەلـە وەڵامیـان دایـەوە، ئەویـش ماڵەکـەی پێنیشاندان.

(١٣): ﴿ فَرَدَدْنَٰهُ إِلَىٰٓ أُمِّهِۦ ﴾ (ئنجا مووسـامان گێڕایـەوە بۆ لای دایکی)، ﴿ كَىْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ ﴾ (بـۆ ئـەوەی چاوی پـێ ڕووناک ببێتـەوەو خەفەت نەخوات) بەو شـێوەیە پـەروەردە ببـێ لای دایکـی، بە جـۆرێ پارێـزراوو دڵنیابـێ، وە دڵـی پێ خۆش بـێ، وە لە بەرانبەردا پاداشـتو کرێیەکـی زۆر وەربگرێ لەسـەر پەروەردەکردنی.

﴿ وَلِتَعْلَمَ أَنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ﴾ (بـۆ ئـەوەی بزانێ بەڵێنی خوا ڕاسـتو حەقـە) هەندێ لـەو بەڵێنانـەی پێماندابـوو پێمـان نیشـاندا، بۆ ئـەوەی دڵـی پێی ئـارام ببێتـەوەو ئیمانی پێی زیـاد بـکات، وە بـۆ ئـەوەی بزانێ کـە بێگومـان پەیمانی خـوا لـە پاراسـتنو نێردراوێتیدا بەدەسـت دێ ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ (واتـە: بـەڵام زۆربەیـان نازانـن) جـا ئەگـەر هۆکارەکـە ببینـن تێـک دەچن، بۆیـە ئیمانیانیـش تێک دەچـێ، بە هـۆی نەبوونی زانسـتو زانیاریـان کە بێگومـان خوا لە نێو بـەڵا گرانەکانو بەربەسـتە قورسـەکان، ئاواتە بـەرزو گـەورەکان دادەنێ.

مووسـا ﷺ بـە بەردەوامـی مایـەوە لـە لای داروودەسـتەی فیرعەون لەسـەر ئەو دەسـەڵاتە، وەکـو ئـەوان دەژیـاو جـلو بەرگـی ئەوانـی لەبـەر دەکـرد، دایکیشـی لێـی بێخـەم بوو، یـەکلا بوویـەوە لە نـاو خەڵکیدا کە ئـەو دایکێتی لە شـیرەوە، کـەس ڕێگـری پەیوەندیو خۆشەویسـتی بـۆ دەربڕینی لـێ نەدەکرد.

سـەرنجی ئـەم نـەرمو نیانـیو میهرەبانیـە بـدە، وە پاراسـتنی پێغەمبەرەکەی لە قسـەکردندا، وە کار ئاسـانی بـۆ کردنـی نێـوان ئـەوو دایکـی بە هـۆی شـیردانەوە پێی دەگـوت دایک، هەمـوو ئـەو قسـانەی مووسـاو جگە لـەو دەربـارەی ئەوە ڕاسـتو هـەق بوو.

وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَٱسْتَوَىٰٓ ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى
ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٤﴾ وَدَخَلَ ٱلْمَدِينَةَ عَلَىٰ حِينِ غَفْلَةٍ مِّنْ أَهْلِهَا
فَوَجَدَ فِيهَا رَجُلَيْنِ يَقْتَتِلَانِ هَٰذَا مِن شِيعَتِهِۦ وَهَٰذَا مِنْ عَدُوِّهِۦ ۖ
فَٱسْتَغَٰثَهُ ٱلَّذِى مِن شِيعَتِهِۦ عَلَى ٱلَّذِى مِنْ عَدُوِّهِۦ فَوَكَزَهُۥ
مُوسَىٰ فَقَضَىٰ عَلَيْهِ ۖ قَالَ هَٰذَا مِنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ ۖ إِنَّهُۥ عَدُوٌّ مُّضِلٌّ
مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّى ظَلَمْتُ نَفْسِى فَٱغْفِرْ لِى فَغَفَرَ لَهُۥٓ ۚ إِنَّهُۥ
هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦﴾ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ فَلَنْ أَكُونَ
ظَهِيرًا لِّلْمُجْرِمِينَ ﴿١٧﴾ فَأَصْبَحَ فِى ٱلْمَدِينَةِ خَآئِفًا يَتَرَقَّبُ فَإِذَا
ٱلَّذِى ٱسْتَنصَرَهُۥ بِٱلْأَمْسِ يَسْتَصْرِخُهُۥ ۚ قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰٓ إِنَّكَ لَغَوِىٌّ
مُّبِينٌ ﴿١٨﴾ فَلَمَّآ أَنْ أَرَادَ أَن يَبْطِشَ بِٱلَّذِى هُوَ عَدُوٌّ لَّهُمَا قَالَ
يَٰمُوسَىٰٓ أَتُرِيدُ أَن تَقْتُلَنِى كَمَا قَتَلْتَ نَفْسًۢا بِٱلْأَمْسِ ۖ إِن تُرِيدُ
إِلَّآ أَن تَكُونَ جَبَّارًا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا تُرِيدُ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلْمُصْلِحِينَ
﴿١٩﴾ وَجَآءَ رَجُلٌ مِّنْ أَقْصَا ٱلْمَدِينَةِ يَسْعَىٰ قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ ٱلْمَلَأَ
يَأْتَمِرُونَ بِكَ لِيَقْتُلُوكَ فَٱخْرُجْ إِنِّى لَكَ مِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴿٢٠﴾
فَخَرَجَ مِنْهَا خَآئِفًا يَتَرَقَّبُ ۖ قَالَ رَبِّ نَجِّنِى مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢١﴾

(١٤): ﴿ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ ﴾ (واتە: كاتێ مووسا ﷺ گەیشتە ئەوپەڕی) توانا لە ڕووی هێزو عەقڵو ژیری، ئەویش نزیك چل ساڵانە بەزۆری ﴿ وَٱسْتَوَىٰٓ ﴾ هەموو ئەوانە تەواو بوو ﴿ ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ﴾ واتە: دانايیەیەك حوكمە شەرعیەكانی پێ بناسێتەوە، وە لە نێوانی خەڵكیدا بڕیاری پێبدات، وە زانستێكی زۆریش.

﴿ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾ (واتە: هەر بەو شێوەیە پاداشتی چاكەكاران دەدەینەوە) لە بەندایەتی كردنی خوا، ئەوانەی چاكەكارن بۆ دروستكراوەكانی خوا، ئەمە بەڵگەیە لەسەر تەواوی چاكی مووسا ﷺ.

(١٥): ﴿ وَدَخَلَ ٱلْمَدِينَةَ عَلَىٰ حِينِ غَفْلَةٍ مِّنْ أَهْلِهَا ﴾ (واتە: مووسا چووە ناو شارەوە بێ ئەوەی خەڵكی ئاگایان لێ بێت) یان كاتی خەوی نیوەڕۆ، یان جگە لەو كاتە، لەو كاتانەی كە خەڵكی بێئاگانو بڵاوەیان نەكردوە ﴿ فَوَجَدَ فِيهَا رَجُلَيْنِ يَقْتَتِلَانِ ﴾ واتە: دوو پیاوی بینی لەگەڵ یەكتری شەڕیان دەكردو لەیەكتریان دەدا ﴿ هَٰذَا مِن شِيعَتِهِۦ ﴾ واتە: (ئەمەیان لە كۆمەڵەكەی خۆی بوو) لە نەوەكانی ئیسرائیل ﴿ وَهَٰذَا مِنْ عَدُوِّهِۦ ﴾ (واتە: ئەوی دیكەیان لە دوژمنانی) قیبتی بوو. ﴿ فَٱسْتَغَٰثَهُ ٱلَّذِى مِن شِيعَتِهِۦ عَلَى ٱلَّذِى مِنْ عَدُوِّهِۦ ﴾ (واتە: ئنجا ئەوەیان لە تایفەی خۆی بوو داوای یارمەتی كرد، لە دژی ئەوەی لە تاقمی دووژمنەكەی بوو)، چونكە مووسا ﷺ ناوبانگی دەركردبوو، وە خەڵكی دەیانزانی ئەو لە نەوەی ئیسرائیلە، داوای یارمەتیكردنی لە مووسا ﷺ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی مووسا ﷺ گەیشتووەتە قۆناغێك خەڵكی لێی دەترسنو ئومێدی پێدەكەن، چونكە یەكێكە لە خانەوادەی پاشا.

﴿ فَوَكَزَهُۥ مُوسَىٰ ﴾ واتە: مستەكۆڵەیەكی دا لە دوژمنەكەی، وەك وەڵامدانەوەیەك بۆ بەدەمەوە چوونی پیاوە ئیسرائیلیەكە ﴿ فَقَضَىٰ عَلَيْهِ ﴾ واتە: بەو مستەكۆڵەیە كوشتی، بە

هـۆی توونـدی لێدانـیو هێزی مووسـا ﷺ.
ئەوسـا مووسـا پەشـێمان بوویەوە لەوەی کـە ئەنجامیـدا ﴿قَالَ هَٰذَا مِنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ﴾ واتە: ئەمـە لە جوانکـردنو ڕازاندنەوەو خەتەرەی شـەیتانە ﴿إِنَّهُۥ عَدُوٌّ مُّضِلٌّ مُّبِينٌ﴾ (واتە: بەڕاسـتی ئـەو دوژمنێکـی گومراکـەری ئاشـکرایە) بەو هۆیەشـەوە ئەوەی لەسـەر دەسـتم ڕوویـدا تازە ڕوویـدا، بـە هـۆی دوژمنکاری ئاشـکرایەوەو سـوور بوونی لەسـەر گومراکردن.
(١٦): ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي فَٱغْفِرْ لِي فَغَفَرَ لَهُۥٓ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦﴾﴾:
پاشـان داوای لێخۆشـبوونی لـە پەروەردگاری کـرد ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي فَٱغْفِرْ لِي فَغَفَرَ لَهُۥٓ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ﴾ بـە تایبـەت بـۆ ئەوانـەی پەشـیمان دەبنـەوەو دەگەڕێنەوە بۆ تەوبـەو داوای لێخـۆش بـوون، هەروەکو چـۆن لە مووسـا ﷺ ڕوویدا.
(١٧): ﴿قَالَ رَبِّ بِمَآ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ فَلَنْ أَكُونَ ظَهِيرًا لِّلْمُجْرِمِينَ ﴿١٧﴾﴾:
﴿قَالَ﴾ مووسـا ﷺ فەرمـووی: ﴿رَبِّ بِمَآ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ﴾ (واتـە: بـە هـۆی ئـەو هێـزو توانـای پێـت داوم) بـە لێخۆشـبوونو لێبـوردنو نـازو نیعمەتـی زۆر ﴿فَلَنْ أَكُونَ ظَهِيرًا﴾ واتـە: (هەرگیـز نابمـە) پشـتیوانو هـاوکاری ﴿لِّلْمُجْرِمِينَ﴾ واتـە: (تاوانبـاران) پشـتیوانی کەس ناکـەم لەسـەر سـەرپێچیکردن.
ئەمـە پەیمانێکـە لە لایەن مووسـا ﷺ بـە هۆی منەتی خوا بەسـەریەوە، کە هەرگیز پشـتیوانی لـە تاوانبـار نـەکات، وەکـو چـۆن ئـەو پیـاوە قیبتیەی کوشـت، ئەمـە ئـەوە دەگەیەنـێ نازو نیعمەت پێویسـتە مـرۆڤ بگەیەنێتە ئاسـتێک کاری چاکە بـکاتو واز لە خراپـەکاری بهێنێ.
(١٨-١٩): ﴿فَأَصْبَحَ فِى ٱلْمَدِينَةِ خَآئِفًا يَتَرَقَّبُ فَإِذَا ٱلَّذِى ٱسْتَنصَرَهُۥ بِٱلْأَمْسِ يَسْتَصْرِخُهُۥ ۚ قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰٓ إِنَّكَ لَغَوِىٌّ مُّبِينٌ ﴿١٨﴾ فَلَمَّآ أَنْ أَرَادَ أَن يَبْطِشَ بِٱلَّذِى هُوَ عَدُوٌّ لَّهُمَا قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ أَتُرِيدُ أَن تَقْتُلَنِى كَمَا قَتَلْتَ نَفْسًۢا بِٱلْأَمْسِ ۖ إِن تُرِيدُ إِلَّآ أَن تَكُونَ جَبَّارًا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا تُرِيدُ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلْمُصْلِحِينَ ﴿١٩﴾﴾:
﴿فَأَصْبَحَ فِى ٱلْمَدِينَةِ خَآئِفًا يَتَرَقَّبُ﴾ دوای ئەوەی مووسـا ئەو کەسـەی کوشـت کە ئەو کەسە یەکـێ بـوو لە دوژمنانـی، (بە هۆی ئەو کوشـتنەوە لە شـاردا بە ترسـەوە چاوەڕوانـی دەکرد) ئایـا دارودەسـتەی فیرعەون هەسـتی پێدەکەن یـان نا؟ لەبەر ئەوە ترسـا، چونکـە دەیزانی هیچ کـەس ناتوانـێ کارێ لەو شـێوەیە بـکات جگە لە مووسـا ﷺ لە نەوەکانی ئیسـرائیل.
جـا کاتـێ ئـەو لـەو حاڵـەدا بـوو ﴿فَإِذَا ٱلَّذِى ٱسْتَنصَرَهُۥ بِٱلْأَمْسِ﴾ (لـە نـاکاودا ئـەو نەوەی ئیسـرائیلیەی دوێنـێ داوای یارمەتـی کـرد) بۆ سـەر دوژمنەکـەی ﴿يَسْتَصْرِخُهُۥ﴾ (هانای بۆ مووسـا هێنـا) بـۆ سـەر قیبتیەکی تـر ﴿قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰٓ﴾ بە سەرزەنشـتەوە وتـی: ﴿إِنَّكَ لَغَوِىٌّ

﴿ مُّبِينٌ ﴾ واتــە: (بــە راســتی تۆ) کەسـێکی گومــڕاو چاو نەترســی.
(١٩): ﴿ فَلَمَّآ أَنۡ أَرَادَ أَن يَبۡطِشَ ﴾ (ئنجا کاتێ موســا ویســتی بە توونــدی لێی بدات)، ﴿ بِٱلَّذِي هُوَ عَدُوٌّ لَّهُمَا ﴾ واتــە: لــەو پیــاوەی کــە دوژمنــی هەردووکیانە، واتــە: بــەردەوام ڕووبەڕوو بوونــەوە لــە نێوان قیبتــیو ئیســرائیلیەکەدا هەبوو، لــەو کاتــەدا داوای یارمەتی لە موســا ﷺ کــرد، مووســاش دەمارگیــری گرتــی هەتا ویســتی مســتەکۆڵەیە بــدا لــە قیبتیەکە ﴿ قَالَ ﴾ قیبتیەکە سەرزەنشــتی کوشــتنی کردوو وتی: ﴿ أَتُرِيدُ أَن تَقۡتُلَنِي كَمَا قَتَلۡتَ نَفۡسَۢا بِٱلۡأَمۡسِۖ إِن تُرِيدُ إِلَّآ أَن تَكُونَ جَبَّارٗا فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾ (ئایــا دەتــەوێ بمکوژی هەروەکو دوێنێ کەسـێکت کوشــت تــۆ هەر دەتــەوێ زۆر دارو ملهوڕ بیت لە زەویــدا)، چونکە مەزنترینی شــوێنەوارەکانی ملهوڕی لە ســەر زەویدا کوشــتنی کەسـێکە بە ناهەق ﴿ وَمَا تُرِيدُ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلۡمُصۡلِحِينَ ﴾ (تــۆ ناتەوێ لە پیــاو چــاکان بیــت)، ئەگەرنا، ئەگــەر تۆ دەتــەوێ ڕێکخەرو چاکەخــواز بی ئــەوە نێوانی منو ئــەوت چــاک دەکــرد بەبێ ئــەوەی هیچ کــەس بکــوژی، ئنجا مووســا ﷺ دەســتی هەڵگرد لە کوشــتنی، ســوودی لــە ئامۆژگاریو سەرزەنشــتەکەی وەرگــرت، هــەواڵو دەنگوباس بڵاو بوویــەوە دەربارەی مووســا لــەو دوو ڕووداوەدا، هەتا دارووەدەســتەکەی فیرعــەون کۆبوونەوەو ڕاوێژیان کرد لەســەر کوشــتنی، خــوا ﷻ پیاوێکــی ئامۆژگاریکاری نــارد هەواڵەکەی گەیاندە مووســا، بــەوەی کە دارو دەســتەکەی لە ســەری بڕیاریــان داوە، جا وتی:
(٢٠-٢١): ﴿ وَجَآءَ رَجُلٞ مِّنۡ أَقۡصَا ٱلۡمَدِينَةِ يَسۡعَىٰ قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ ٱلۡمَلَأَ يَأۡتَمِرُونَ بِكَ لِيَقۡتُلُوكَ فَٱخۡرُجۡ إِنِّي لَكَ مِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴿٢٠﴾ فَخَرَجَ مِنۡهَا خَآئِفٗا يَتَرَقَّبُۖ قَالَ رَبِّ نَجِّنِي مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢١﴾ ﴾:
﴿ وَجَآءَ رَجُلٞ مِّنۡ أَقۡصَا ٱلۡمَدِينَةِ يَسۡعَىٰ ﴾ واتــە: پیاوێــک بــە ڕاکــردن هات بۆ لای مووســا وەک ئامۆژگاریو ترســان لەوەی تووشــی ببێ پێش ئەوەی هەستی پێ بکات ﴿ قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ ٱلۡمَلَأَ يَأۡتَمِرُونَ ﴾ واتــە: (دارودەســتەکەی فیرعــەون) ڕاوێــژ لە دژی تــۆ دەکەن ﴿ لِيَقۡتُلُوكَ فَٱخۡرُجۡ ﴾ (بــۆ ئەوەی بتکوژن) جــا دەربچۆ لەم شــارە ﴿ إِنِّي لَكَ مِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴾ (بێگومان من دڵســۆزتم) ئەویش ئامۆژگاریەکــەی لێوەرگرت.
﴿ فَخَرَجَ مِنۡهَا خَآئِفٗا يَتَرَقَّبُ ﴾ (ئەویــش لــە شــار دەرچــوو بــە ترســەوە چاودێــری دەکــرد) بــۆ ئــەوەی نەیکــوژن، وە داوای لــە خــوا ﷻ کــرد، ﴿ قَالَ رَبِّ نَجِّنِي مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ بێگومان مووســا ﷺ تەوبــەی کردبــوو لــە تاوانەکــەی، وە ئەنجامدانی ئەو کارە بە مەبەســتی کوشــتن نەبــوو، بۆیــە هەڕەشــەکردنی ئــەوان لە مووســا زوڵــمو چاونەترســی بوو.

وَلَمَّا تَوَجَّهَ تِلْقَآءَ مَدْيَنَ قَالَ عَسَىٰ رَبِّيٓ أَن يَهْدِيَنِي سَوَآءَ
ٱلسَّبِيلِ ﴿٢٢﴾ وَلَمَّا وَرَدَ مَآءَ مَدْيَنَ وَجَدَ عَلَيْهِ أُمَّةً مِّنَ
ٱلنَّاسِ يَسْقُونَ وَوَجَدَ مِن دُونِهِمُ ٱمْرَأَتَيْنِ تَذُودَانِ قَالَ
مَا خَطْبُكُمَا قَالَتَا لَا نَسْقِي حَتَّىٰ يُصْدِرَ ٱلرِّعَآءُ وَأَبُونَا
شَيْخٌ كَبِيرٌ ﴿٢٣﴾ فَسَقَىٰ لَهُمَا ثُمَّ تَوَلَّىٰٓ إِلَى ٱلظِّلِّ فَقَالَ
رَبِّ إِنِّي لِمَآ أَنزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ ﴿٢٤﴾ فَجَآءَتْهُ إِحْدَىٰهُمَا
تَمْشِي عَلَى ٱسْتِحْيَآءٍ قَالَتْ إِنَّ أَبِي يَدْعُوكَ لِيَجْزِيَكَ
أَجْرَ مَا سَقَيْتَ لَنَا فَلَمَّا جَآءَهُۥ وَقَصَّ عَلَيْهِ ٱلْقَصَصَ قَالَ
لَا تَخَفْ نَجَوْتَ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٥﴾ قَالَتْ إِحْدَىٰهُمَا
يَٰٓأَبَتِ ٱسْتَـْٔجِرْهُ إِنَّ خَيْرَ مَنِ ٱسْتَـْٔجَرْتَ ٱلْقَوِيُّ ٱلْأَمِينُ
﴿٢٦﴾ قَالَ إِنِّيٓ أُرِيدُ أَنْ أُنكِحَكَ إِحْدَى ٱبْنَتَيَّ هَٰتَيْنِ عَلَىٰٓ أَن
تَأْجُرَنِي ثَمَٰنِيَ حِجَجٍ فَإِنْ أَتْمَمْتَ عَشْرًا فَمِنْ عِندِكَ
وَمَآ أُرِيدُ أَنْ أَشُقَّ عَلَيْكَ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ
ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٢٧﴾ قَالَ ذَٰلِكَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ أَيَّمَا ٱلْأَجَلَيْنِ
قَضَيْتُ فَلَا عُدْوَٰنَ عَلَيَّ وَٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٌ ﴿٢٨﴾

(٢٢): ﴿ وَلَمَّا تَوَجَّهَ تِلْقَآءَ مَدْيَنَ قَالَ عَسَىٰ رَبِّيٓ أَن يَهْدِيَنِي سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿٢٢﴾ ﴾:

﴿ وَلَمَّا تَوَجَّهَ تِلْقَآءَ مَدْيَنَ ﴾ بەرەو شاری مەدیەن بە ڕێکەوت کە دەکەوێتە باشووری فەڵەستینەوە، چونکە فیرعەون لەوێ دەسەڵاتی نەبوو ﴿ قَالَ عَسَىٰ رَبِّيٓ أَن يَهْدِيَنِي سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴾ (واتە: وتی: ئومێد دەکەم پەروەردگارم ڕێنماییم بکات) بۆ ڕێگای ڕاستو کورت، بۆ ئەوەی بە ئاسانی بگەم بەو شارە خوای گەورەش هیدایەتیدا بۆ ئەو ڕێگایە هەتا گەیشتە مەدیەن.

(٢٣): ﴿ وَلَمَّا وَرَدَ مَآءَ مَدْيَنَ وَجَدَ عَلَيْهِ أُمَّةً مِّنَ ٱلنَّاسِ يَسْقُونَ وَوَجَدَ مِن دُونِهِمُ ٱمْرَأَتَيْنِ تَذُودَانِ قَالَ مَا خَطْبُكُمَا قَالَتَا لَا نَسْقِي حَتَّىٰ يُصْدِرَ ٱلرِّعَآءُ وَأَبُونَا شَيْخٌ كَبِيرٌ ﴿٢٣﴾ ﴾:

﴿ وَلَمَّا وَرَدَ مَآءَ مَدْيَنَ وَجَدَ عَلَيْهِ أُمَّةً مِّنَ ٱلنَّاسِ يَسْقُونَ ﴾ (واتە: کاتێ گەیشتە سەر ئاوەکەی مەدیەن، بینی لەسەر ئەو ئاوە کۆمەڵێک لە خەڵکی ئاوی) ئاژەڵەکانیان دەدەن، ﴿ وَوَجَدَ مِن دُونِهِمُ ﴾ واتە: (بینی) لە نزیک ئەو خەڵکەوە ﴿ ٱمْرَأَتَيْنِ تَذُودَانِ ﴾ (واتە: دوو ئافرەت ڕێگری) لە ئاژەڵەکانیان دەکەن، لەوەی بچنە سەر ئاوەکە، چونکە نەیاندەتوانی تێکەڵی پیاوان ببن، وە بە هۆی چاوچنۆکیو نەبوونی پیاوەتی لەو پیاوانەدا لە ڕێگەنەدانیان بەو دووانە ئاوی ئاژەڵەکانیان بدەن.

﴿ قَالَ ﴾ مووسا (عليه السلام) پێی وتن: ﴿ مَا خَطْبُكُمَا ﴾ واتە: بارودۆختان چۆنە بەم حاڵەتە؟ ﴿ قَالَتَا لَا نَسْقِي حَتَّىٰ يُصْدِرَ ٱلرِّعَآءُ ﴾ واتە: نەریت وایە ئێمە ناتوانین ئاژەڵەکانمان ئاو بدەین هەتا شوانەکان ئاوی ئاژەڵەکانیان نەدەن، ئەگەر شوێنەکە کەسی لێنەما ئەوە ئێمە ئاویان دەدەین ﴿ وَأَبُونَا شَيْخٌ كَبِيرٌ ﴾ واتە: توانای ئاودانی ئاژەڵەکانی نیە، ئێمەش ئەوەندە بەهێز نین بتوانین ئاویان بدەین، وە پیاویشمان نیە بتوانێت بچێتە نێو ئەو قەرەباڵغیەوە.

(٢٤): ﴿ فَسَقَىٰ لَهُمَا ثُمَّ تَوَلَّىٰٓ إِلَى ٱلظِّلِّ فَقَالَ رَبِّ إِنِّي لِمَآ أَنزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ ﴿٢٤﴾ ﴾:
مووسا بەزەیی پێیاندا هاتەوە ﴿ فَسَقَىٰ لَهُمَا ﴾ (واتە: ئنجا مووسا ﷺ مەڕەکانی بۆ ئاودان) بێ ئەوەی داوای کرێیان لێبکات، مەبەستیشی تەنها ڕەزامەندی خوا بوو. کاتێ مەڕەکانی بۆ ئاودان، ئەو کاتە نیوەڕۆیەکی زۆر گەرم بوو، بە بەڵگەی فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿ ثُمَّ تَوَلَّىٰٓ إِلَى ٱلظِّلِّ ﴾ (واتە: پاشان چووە بەر سێبەرێک) بۆ ئەوەی پشوو بدات لەو سێبەرەدا دوای ماندوو بوونی.
﴿ فَقَالَ ﴾ لەو کاتەدا داوای ڕزقو ڕۆزی لە پەروەردگاری کردو وتی: ﴿ رَبِّ إِنِّي لِمَآ أَنزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ ﴾ واتە: من هەژارم پێویستیم هەیە بە خێرێک بۆم بنێریو ئاسانی بکەی بۆم، ئەمە داواکردنێکە دەربارەی حاڵی خۆی، وە داواکردن بە حاڵ بەهێزترە لە داواکردن بە زمانی قسە کردن، بەردەوام لەم حاڵەتەدا بوو دەپاڕایەوە لە پەروەردگاری.
(٢٥): ﴿ فَجَآءَتْهُ إِحْدَىٰهُمَا تَمْشِي عَلَى ٱسْتِحْيَآءٍ قَالَتْ إِنَّ أَبِي يَدْعُوكَ لِيَجْزِيَكَ أَجْرَ مَا سَقَيْتَ لَنَا ۚ فَلَمَّا جَآءَهُۥ وَقَصَّ عَلَيْهِ ٱلْقَصَصَ قَالَ لَا تَخَفْ ۖ نَجَوْتَ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٥﴾ ﴾:
جا کە ئەو دوو ئافرەتە گەڕانەوە بۆ لای باوکیان، ئەوەی ڕوویدا بۆیان باس کرد، باوکیان یەکێک لە کچەکانی نارد بۆ لای مووسا ﷺ ئەویش هات بۆ لای ﴿ تَمْشِي عَلَى ٱسْتِحْيَآءٍ ﴾ (واتە: بەشەرمەوە دەڕۆیشت بە ڕێگادا) ئەمە بەڵگەیە لەسەر پاکی پێکهاتەکەیو ڕەوشتی بەرزو جوانی، بێگومان شەرم کردن لە ڕەوشتە هەرە بەرزەکانە، بە تایبەت لە ئافرەتان.
وە بەڵگەشە لەسەر ئەوەی مووسا ﷺ ئەوەی کرد وەکو کرێکارێک یان خزمەتکارێک نەیکرد، کە بە پێی عادەتو نەریت شەرم لەوەدا ناکرێ، بەڵکو نەفسی زۆر بەرزو بڵند بوو، ئافرەتەکە بینی چەندە بە ڕەوشتو ئاکارە، بوو بە مایەی ئەوەی زیاتر شەرمی لێ بکات، جا ﴿ قَالَتْ ﴾ بە مووسای گوت: ﴿ إِنَّ أَبِي يَدْعُوكَ لِيَجْزِيَكَ أَجْرَ مَا سَقَيْتَ لَنَا ﴾ واتە: (باوکم بانگت دەکات بۆ ئەوەی پاداشتی ئەوەت بداتەوە کە مەڕەکانت بۆ ئێمە ئاودا) نەک بۆ ئەوەی منەت بکات بەسەرتدا، بەڵکو تۆ دەستپێشخەریت کرد بە چاکە لەگەڵماندا، بە مەبەستی ئەوە پاداشتی بداتەوە لەسەر کردەوە چاکەکەی، مووسا ﷺ وەڵامی دایەوە.

﴿ فَلَمَّا جَآءَهُۥ وَقَصَّ عَلَيۡهِ ٱلۡقَصَصَ ﴾ (واتـە: ئنجا مووسـا ﷺ کاتێ هـات بۆ لای باوکی کچەکە بەسـەرهاتەکەی بـۆ گێڕایەوە) لە سـەرەتاوەو هۆکاری ڕاکردنەکەیشـی باس کرد، هەتـا گەیشـتە لای ﴿ قَالَ ﴾ ترسـەکەی ڕەوانـدەوەو دڵی دایەوەو فەرمـووی: ﴿ لَا تَخَفۡۖ نَجَوۡتَ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ واتـە: بـا تـرس‌و بیمت بڕوا، خـوا تۆی ڕزگار کـرد لەوان، کاتـێ کە گەیشـتووی بەم شـوێنەی ئەوان دەسـەڵاتیان نیە بەسـەریدا.

(٢٦): ﴿ قَالَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا يَٰٓأَبَتِ ٱسۡتَـٔۡجِرۡهُۖ إِنَّ خَيۡرَ مَنِ ٱسۡتَـٔۡجَرۡتَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡأَمِينُ ۝٢٦ ﴾

﴿ قَالَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا ﴾ واتـە: یەکێـک لـە کچـەکان وتـی: ﴿ يَٰٓأَبَتِ ٱسۡتَـٔۡجِرۡهُ ﴾ واتـە: بـە کرێـی بگرە بۆ شـوانی مـەڕەکانو ئاودانیـان ﴿ إِنَّ خَيۡرَ مَنِ ٱسۡتَـٔۡجَرۡتَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡأَمِينُ ﴾ واتـە: مووسـا ﷺ لـە پێشـترە بـۆ ئـەوەی بـە کرێـی بگریـت، چونکە ئـەو هێـزو تواناو دەسـتو داوێـن پاکـە، وە چاکتریـن کـەس بـۆ ئەو مەبەسـتە ئـەو کەسـەیە ئـەو دووانە لـە خۆیـدا کۆبکاتـەوە، واتـە: هێزو توانـای ئـەو کارە کە ئەنجامـی دەدات، وە دەسـتپاکی تێدابـێ‌و خیانەتـکار نەبێت.

ئـەم دوو وەسـفە پێویسـتە ڕەچـاو بکرێـت لـە هەمـوو ئەرکێکـدا کـە دەدرێـت بـە هەر کەسـێک، بـە کرێـکاری بێـت، یـان جگە لـەوە، بێگومـان ناتەواوی دروسـت دەبـێ بە لە دەسـتدانی ئـەو دوو مەرجـە، یـان یەکێکیان، بـەڵام بـە کۆکردنەوەیان بێگومـان کارەکان تـەواو دەبـن، بۆیـە کچەکـەی ئەم قسـەی گـوت، چونکـە هێـزو توانـای مووسـای بینی، لـەو کاتـەی کـە مەڕەکانـی بۆیان ئـاودا بە چوسـتو چالاکیەوە، زانـی چەنـدە بەهێزە، وە ئەمانـەتو دەسـتپاکی‌و دینـداری بینـی، وە بینـی بەزەیـی پێیاندا هاتـەوە لـە کاتێکدا هیچ چاوەڕوانـی پاداشـتی لێنەکـردن، بەڵکـو لـەوەدا مەبەسـتی تەنهـا ڕەزامەندی خـوا بوو.

(٢٧): ﴿ قَالَ إِنِّيٓ أُرِيدُ أَنۡ أُنكِحَكَ إِحۡدَى ٱبۡنَتَيَّ هَٰتَيۡنِ عَلَىٰٓ أَن تَأۡجُرَنِي ثَمَٰنِيَ حِجَجٖۖ فَإِنۡ أَتۡمَمۡتَ عَشۡرٗا فَمِنۡ عِندِكَۖ وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أَشُقَّ عَلَيۡكَۚ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ۝٢٧ ﴾:

﴿ قَالَ ﴾ خاوەنـی مەدیـەن (باوکـی دوو کچەکـە) وتـی: ﴿ إِنِّيٓ أُرِيدُ أَنۡ أُنكِحَكَ إِحۡدَى ٱبۡنَتَيَّ هَٰتَيۡنِ عَلَىٰٓ أَن تَأۡجُرَنِي ﴾ واتـە: (مـن یەکێـک لەم دوو کچـەی خۆم دەدەم بـە تۆ بەو مەرجـەی) ببیـت بـە کرێـکار لـە لای مـن ﴿ ثَمَٰنِيَ حِجَجٖ ﴾ واتە: هەشـت سـاڵ ﴿ فَإِنۡ أَتۡمَمۡتَ عَشۡرٗا فَمِنۡ عِندِكَ ﴾ (واتـە: ئەگـەر دە سـاڵ تـەواو بکـەی) ئـەوە کۆمەکـی هـاوکاری لە لایەن خۆتەوە، پێویسـت نیە لەسـەرت ﴿ وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أَشُقَّ عَلَيۡكَ ﴾ (واتە:

مـن نامـەوێ قورسـی بکـەم لەسـەرت) بیکـەم بـە دەسـاڵ، یـان نامەوێـت کاری قورس‌و گرانـت پێبکـەم، بەڵکـو کاری سـووکت پێدەکەم بـێ ئەوەی مانـدوو بیت ﴿سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ (واتـە: ئەگـەر خـوا بیـەوێ دەمبینی لـە پیاوچـاکان دەبم)، هانـی دا بە کار ئاسـانی‌و جـوان مامەڵە کردن. ئەمە بەڵگەیە لەسـەر ئەوەی پێویسـتە لەسـەر پیـاوی چـاک بە جوانـی مامەڵە لەگـەڵ خەڵکی بـکات، هەرچەندە لـە توانایدا بـوو، ئەوەی لێـی داوا دەکـرێ لە پێشـتر لە غەیـری ئەوە.

(٢٨): ﴿قَالَ ذَٰلِكَ بَيۡنِي وَبَيۡنَكَۖ أَيَّمَا ٱلۡأَجَلَيۡنِ قَضَيۡتُ فَلَا عُدۡوَٰنَ عَلَيَّۖ وَٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٞ ٢٨﴾

﴿قَالَ﴾ مووسـا عليه السلام لـە وەڵامـی داواکاریەکەیدا، فەرمـووی: ﴿ذَٰلِكَ بَيۡنِي وَبَيۡنَكَ﴾ واتـە: ئـەم مەرجـەی باسـت کـرد مـن پێـی رازیـم، بێگومان تـەواو بوو ئـەوەی لـە نێوان مـن‌و تۆدایـە، ﴿أَيَّمَا ٱلۡأَجَلَيۡنِ قَضَيۡتُ فَلَا عُدۡوَٰنَ عَلَيَّ﴾ یەکسـانە ئەگەر هەشـت سـاڵ تـەواو بکـەم کـە پێویسـتە، یـان کۆمەکیت بکـەم بە زیاتـر لەسـەری ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٞ﴾ خـوا بـە ئاگایەو چاودێریمـان دەکات، وە دەزانی بەو گرێبەسـتەی کردوومانە. ئـەم پیـاوە، باوکی ئـەو دوو کچـە، خاوەنی مەدیـەن، پێغەمبەر شـوعەیب نیـە، وەک چۆن بـڵاو بووەتـەوە لـە لای زۆرێـک لە خەڵکـی، بێگومان ئـەم قسـەیە بەڵگەی لەسـەر نیە، وە ئـەو پەڕی ئەوە، ئەوەیە شـارەکەی شـوعەیب عليه السلام مەدیـەن بوو، ئـەم ڕووداوەش لە مەدیەن ڕوویـدا، کامـە پەیوەندی لـە نێوانیاندا؟

هەروەهـا نەزانـراوە مووسـا عليه السلام لەسـەردەمی شـوعەیب عليه السلام ژیـاوە، ئـەی چـۆن دەزانرێ بینیوبەتی؟ جا ئەگەر ئەو کەسـە شـوعەیب بووایە خوا ﷻ باسـی دەکـرد، دوو ئافرەتەکەش ناویـان دەهێنا.

هەروەهـا خـوا گەلەکەی شـوعەیبی لەناوبـرد، بە هـۆی بـە درۆدانانیانەوە، کـەس نەمایەوە تەنهـا ئەوانـە نەبێ کـە بڕوایان پێهێنابـوو، خوا پەنـای بڕوادارانی داوە لـەوەی ڕێگری بکەن لـە کچانـی پێغەمبەرەکەیـان لە ئاودانـی مـەڕو ماڵاتەکەیان، هەتـا پیاوێکی نەناسـراو بێت چاکەیـان لەگەڵـدا بـکات ئاوی ئاژەڵەکانیـان بدات، وە شـوعەیب چۆن ڕازی دەبێ مووسـا وەکـو شـوانێک لە لای بمێنێتـەوەو خزمەتکاری بکات، لە کاتێکدا مووسـا فـەزڵ‌و چاکەی لـەو زیاترەو پلـەو پایەی لـەو بەرزترە. خـوا زاناترە.

۞ فَلَمَّا قَضَىٰ مُوسَى ٱلۡأَجَلَ وَسَارَ بِأَهۡلِهِۦٓ ءَانَسَ مِن جَانِبِ
ٱلطُّورِ نَارٗاۖ قَالَ لِأَهۡلِهِ ٱمۡكُثُوٓاْ إِنِّيٓ ءَانَسۡتُ نَارٗا لَّعَلِّيٓ ءَاتِيكُم
مِّنۡهَا بِخَبَرٍ أَوۡ جَذۡوَةٖ مِّنَ ٱلنَّارِ لَعَلَّكُمۡ تَصۡطَلُونَ
﴿٢٩﴾ فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِيَ مِن شَٰطِيِٕ ٱلۡوَادِ ٱلۡأَيۡمَنِ فِي ٱلۡبُقۡعَةِ
ٱلۡمُبَٰرَكَةِ مِنَ ٱلشَّجَرَةِ أَن يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّيٓ أَنَا ٱللَّهُ رَبُّ
ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٣٠﴾ وَأَنۡ أَلۡقِ عَصَاكَۚ فَلَمَّا رَءَاهَا تَهۡتَزُّ كَأَنَّهَا
جَآنّٞ وَلَّىٰ مُدۡبِرٗا وَلَمۡ يُعَقِّبۡۚ يَٰمُوسَىٰٓ أَقۡبِلۡ وَلَا تَخَفۡۖ
إِنَّكَ مِنَ ٱلۡأٓمِنِينَ ﴿٣١﴾ ٱسۡلُكۡ يَدَكَ فِي جَيۡبِكَ تَخۡرُجۡ
بَيۡضَآءَ مِنۡ غَيۡرِ سُوٓءٖ وَٱضۡمُمۡ إِلَيۡكَ جَنَاحَكَ مِنَ ٱلرَّهۡبِۖ
فَذَٰنِكَ بُرۡهَٰنَانِ مِن رَّبِّكَ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِۦٓۚ إِنَّهُمۡ
كَانُواْ قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّي قَتَلۡتُ مِنۡهُمۡ نَفۡسٗا
فَأَخَافُ أَن يَقۡتُلُونِ ﴿٣٣﴾ وَأَخِي هَٰرُونُ هُوَ أَفۡصَحُ مِنِّي لِسَانٗا
فَأَرۡسِلۡهُ مَعِيَ رِدۡءٗا يُصَدِّقُنِيٓۖ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ﴿٣٤﴾
قَالَ سَنَشُدُّ عَضُدَكَ بِأَخِيكَ وَنَجۡعَلُ لَكُمَا سُلۡطَٰنٗا فَلَا
يَصِلُونَ إِلَيۡكُمَا بِـَٔايَٰتِنَآۚ أَنتُمَا وَمَنِ ٱتَّبَعَكُمَا ٱلۡغَٰلِبُونَ ﴿٣٥﴾

(٢٩): ﴿ فَلَمَّا قَضَىٰ مُوسَى ٱلۡأَجَلَ وَسَارَ بِأَهۡلِهِۦٓ ءَانَسَ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ نَارٗاۖ قَالَ لِأَهۡلِهِ ٱمۡكُثُوٓاْ إِنِّيٓ ءَانَسۡتُ نَارٗا لَّعَلِّيٓ ءَاتِيكُم مِّنۡهَا بِخَبَرٍ أَوۡ جَذۡوَةٖ مِّنَ ٱلنَّارِ لَعَلَّكُمۡ تَصۡطَلُونَ ﴿٢٩﴾ ﴾:

﴿ فَلَمَّا قَضَىٰ مُوسَى ٱلۡأَجَلَ ﴾ (واته: ئنجا كاتێ مووسا ماوه‌ی شوانیه‌كه‌ی ته‌واو كرد). ده‌گونجێ ماوه‌ی پێویستی ته‌واو كردبێ، یان زیاتر له ماوه‌ی پێویست، هه‌روه‌كو گومانی ئه‌وه به مووسا ده‌برێ، چونكه به وه‌فا بوو، تامه‌زرۆیی گه‌یشتنی ده‌كرد بۆ لای خانه‌واده‌كه‌ی‌و دایك‌و باوكی‌و هۆزو ولاته‌كه‌ی، زانی ئه‌و ماوه درێژه ئه‌وه‌ی بیریان بردوه‌ته‌وه كه ئه‌نجامیداوه ﴿ وَسَارَ بِأَهۡلِهِۦٓ ﴾ (واته: شه‌وره‌وی به خێزانه‌كه‌ی كرد) بۆ میسر ﴿ ءَانَسَ ﴾ واته: بینی ﴿ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ نَارٗاۖ قَالَ لِأَهۡلِهِ ٱمۡكُثُوٓاْ إِنِّيٓ ءَانَسۡتُ نَارٗا لَّعَلِّيٓ ءَاتِيكُم مِّنۡهَا بِخَبَرٍ أَوۡ جَذۡوَةٖ مِّنَ ٱلنَّارِ لَعَلَّكُمۡ تَصۡطَلُونَ ﴾ (واته: له دووره‌وه لای ڕاستی كێوی طور ئاگرێكی ڕووناك، به خێزانه‌كه‌ی وت لێره بمێننه‌وه، به ڕاستی من ئاگرێكم بینی، به‌ڵكو هه‌واڵێكی ڕێگاتان بۆ بێنم لای ئه‌و ئاگره، یان چڵۆسكێكی ئاگرتان بۆ بێنم به‌ڵكو خۆتانی پێ گه‌رم بكه‌نه‌وه) ئه‌وان تووشی سه‌رمایه‌ك بوون‌و ڕێگایان وێڵ كردبوو.

(٣٠): ﴿ فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِيَ مِن شَٰطِيِٕ ٱلۡوَادِ ٱلۡأَيۡمَنِ فِي ٱلۡبُقۡعَةِ ٱلۡمُبَٰرَكَةِ مِنَ ٱلشَّجَرَةِ أَن يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّيٓ أَنَا ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٣٠﴾ ﴾:

ئنجا كاتێ هاته نزیكی ئه‌و ئاگره بانگی لێكرا: ﴿ أَن يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّيٓ أَنَا ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ (واته: ئه‌ی مووسا به‌ڕاستی من خوام په‌روه‌ردگاری جیهانییان) هه‌واڵی پێدا به په‌رستراوێتی‌و په‌روه‌ردگارێتی، ئه‌مه ئه‌وه ده‌خوازێ كه فه‌رمانی پێده‌كات به به‌ندایه‌تی كردنی‌و په‌رستنی، هه‌روه‌ك له ده‌قێكی دیكه‌دا به ڕوونی هێناویه‌تی: ﴿ فَٱعۡبُدۡنِي وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ﴿١٤﴾ ﴾ طه. (واته: كه‌واته من بپه‌رسته، به چاكی نوێژ به‌جێ بێنه تا منت بێته‌وه یاد).

(٣١): ﴿ وَأَنْ أَلْقِ عَصَاكَ فَلَمَّا رَءَاهَا تَهْتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنٌّ وَلَّىٰ مُدْبِرًا وَلَمْ يُعَقِّبْ يَٰمُوسَىٰٓ أَقْبِلْ وَلَا تَخَفْ إِنَّكَ مِنَ ٱلْأَمِنِينَ ﴿٣١﴾ ﴾:

﴿ وَأَنْ أَلْقِ عَصَاكَ ﴾ (واتە: گۆچانەکەت فڕێدە) ئەویش فڕێیدا ﴿ فَلَمَّا رَءَاهَا تَهْتَزُّ ﴾ کاتێ گۆچانەکەی بینی زۆر بە خێراییو بە پەلە دەجوولا، وە وێنەیەکی ترسناکی بوو ﴿ كَأَنَّهَا جَآنٌّ ﴾ وەکو مارێکی مەزن وابوو.

﴿ وَلَّىٰ مُدْبِرًا وَلَمْ يُعَقِّبْ ﴾ واتە: پشتی تێکردو ڕایکرد چونکە ترس دڵی داگرتبوو، خوا پێی فەرموو: ﴿ يَٰمُوسَىٰٓ أَقْبِلْ وَلَا تَخَفْ إِنَّكَ مِنَ ٱلْأَمِنِينَ ﴾ (واتە: ئەی مووسا بەرەو ڕووی من بێو مەترسە، چونکە لەوانەی کە بێباکن‌و لەئەماندان). ئەمە ئەوپەڕی ئەمان‌و نەبوونی ترسە خوا پێیداوە.

بێگومان کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَقْبِلْ ﴾ فەرمانکردن بە ڕوو کردنە خوا دەخوازێ، پێویستە لەسەری جێبەجێی بکات، بەڵام دەگونجێ دوای ڕووتێکردنیشی هەر ترسا بێت، جا فەرمووی: ﴿ وَلَا تَخَفْ ﴾ (مەترسە) فەرمانی پێکرد بە دوو شت: ڕوو تێکردن، وە با ترس لە دڵیدا نەمێنێ، بەڵام پێدەچێ بێ ترس ڕووی تێکردبێ، بەڵام هیچ پارێزەرێک‌و ئاسایشێکی بەدی نەکردبێ بیپارێزێ، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ إِنَّكَ مِنَ ٱلْأَمِنِينَ ﴾ (واتە: بەڕاستی تۆ لەو کەسانەی بێباک‌و بێترسن) جا ئەو کاتە مەترسی لە هەموو ڕوویەکەوە دوور کەوتەوە، مووسا ﷺ ڕووی تێکرد بێ ترس، بەڵکو بە دڵنیایی، بە متمانە بوون بە هەواڵی پەروەردگاری ئیمان‌و بڕوای زیادی کردبوو، وە یەقین‌و دڵنیایشی کامڵ بوو، ئەمە نیشانەیەک بوو خوا ﷻ پێی نیشاندا پێش ڕۆیشتنی بۆ لای فیرعەون، بۆ ئەوەی لەسەر دڵنیایی تەواو بێ‌و ببێتە پاداشتێک بۆی بەهێزو بە تواناتر بێ.

(٣٢): ﴿ ٱسْلُكْ يَدَكَ فِى جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ وَٱضْمُمْ إِلَيْكَ جَنَاحَكَ مِنَ ٱلرَّهْبِ فَذَٰنِكَ بُرْهَٰنَانِ مِن رَّبِّكَ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِي۟هِۦٓ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَٰسِقِينَ ﴿٣٢﴾ ﴾:

پاشان ئایەت‌و بەڵگەیەکی دیکەی نیشانی مووسادا، فەرمووی: ﴿ ٱسْلُكْ يَدَكَ ﴾ واتە: دەستت بخەرە ﴿ فِى جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ ﴾ (ناو باخەڵتەوە کاتێ دەریدێنی بە سپێتی دێتە دەرەوەو تیشک دەداتەوە بەبێ ئەوەی بەڵەکی‌و نەخۆشی بێت) ئەویش دەستی خستە ناو باخەڵیەوەو دەریهێنا هەروەکو خوا باسی کرد ﴿ وَٱضْمُمْ إِلَيْكَ جَنَاحَكَ مِنَ ٱلرَّهْبِ ﴾ واتە: دەستت بخەرە سەر سنگت ئەو ترس‌و بیمەت دەڕوا ﴿ فَذَٰنِكَ ﴾ واتە: گۆڕینی گۆچانەکە بۆ ماروو دەرهێنانی دەست بە سپێتی‌و پرشنگداری بەبێ نەخۆشی ﴿ بُرْهَٰنَانِ مِن رَّبِّكَ ﴾ واتە: دوو بەڵگەی یەکلا کەرەوەن لە لایەن خواوە ﴿ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِي۟هِۦٓ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا

﴿ فَـٰسِقِينَ ﴾ (بۆ فیرعەونو داروو دەستەکەی بەڕاستی ئەوان کۆمەڵێکی لە سنور دەرچوو بوون) ئەوان تەنها ئاگادارکردنەوەو فەرمانی پێغەمبەر بەس نیە بۆیان، بەڵکو دەبێ ئایەتو نیشانەی ڕوونکراوەیان بۆ بێ ئەگەر سوودی هەبێ بۆیان.

(٣٣-٣٥): ﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّي قَتَلْتُ مِنْهُمْ نَفْسًا فَأَخَافُ أَن يَقْتُلُونِ ﴿٣٣﴾ وَأَخِي هَـٰرُونُ هُوَ أَفْصَحُ مِنِّي لِسَانًا فَأَرْسِلْهُ مَعِيَ رِدْءًا يُصَدِّقُنِيٓ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ﴿٣٤﴾ قَالَ سَنَشُدُّ عَضُدَكَ بِأَخِيكَ وَنَجْعَلُ لَكُمَا سُلْطَـٰنًا فَلَا يَصِلُونَ إِلَيْكُمَا بِـَٔايَـٰتِنَآ أَنتُمَا وَمَنِ ٱتَّبَعَكُمَا ٱلْغَـٰلِبُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾

جا ﴿ قَالَ ﴾ مووسا ﷺ بیانووی بۆ پەروەردگاری هێنایەوە، داوای یارمەتیو پشتیوانی لێکرد لەسەر ئەو ئەرکەی پێی سپاردووە، وە باسی ئەو بەربەستانەیشی کرد کە تیایدایە، بۆ ئەوەی خوای پەروەردگار لەسەری لابیبات ئەوەی ئەو لێی دەترسێ ﴿ رَبِّ إِنِّي قَتَلْتُ مِنْهُمْ نَفْسًا ﴾ واتە: (من کەسێکم لە ئەوان کوشتووە)، ﴿ فَأَخَافُ أَن يَقْتُلُونِ ﴿٣٣﴾ وَأَخِي هَـٰرُونُ هُوَ أَفْصَحُ مِنِّي لِسَانًا فَأَرْسِلْهُ مَعِيَ رِدْءًا ﴾ واتە: (هاڕوون بکە بە) پشتیوانو یارمەتیدەرم ﴿ يُصَدِّقُنِيٓ ﴾ واتە: (وتەکانم بسەلمێنێ) بێگومان لەگەڵ پشت ڕاستکردنەوەی هەواڵەکاندا حەقو ڕاستی بەهێز دەبێ ﴿ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ﴾ (واتە: من دەترسم کە بە درۆزنم دابنێن) خوا وەڵامی داواکاریەکەی دایەوەو فەرمووی: ﴿ سَنَشُدُّ عَضُدَكَ بِأَخِيكَ ﴾ واتە: بە براکەت بەهێزت دەکەینو یارمەتیت دەدەین.

پاشان مەترسی کوشتنی لەسەر لابردوەو فەرموویەتی: ﴿ وَنَجْعَلُ لَكُمَا سُلْطَـٰنًا ﴾ واتە: دەسەڵاتو پێگەیەک بە هەردووکتان دەدەین لە بانگەوازکردن بە بەڵگەو هەیبەتی خوایی لە بەرانبەر دوژمنەکانتاندا، ﴿ فَلَا يَصِلُونَ إِلَيْكُمَا ﴾ ئەویش بە هۆی ئایەتەکانی ئێمەوە (دەستیان بە ئێوە ناگات) وە ئەوەیشی بەڵگەیە لەسەری لە حەقو ڕاستی، بەو ئایەتانە دەسەڵاتتان بۆ دەستەبەر دەبێو فێڵی خراپەکارانتان لێ دوور دەکەوێتەوە، ئەو ئایەتانە بۆ ئێوە بەهێزتر دەبێ لە سەربازەکانی ئەوان، ﴿ أَنتُمَا وَمَنِ ٱتَّبَعَكُمَا ٱلْغَـٰلِبُونَ ﴾ (تەنها ئێوەو ئەوەی شوێنتان دەکەوێ سەردەکەون) ئەمە پەیمانێک بوو درابوو بە مووسا ﷺ لەو سەردەمەدا، مووسا ﷺ تەنها بوو کاتێ گەڕایەوە بۆ شارەکەی دوای ئەوەی دەربەدەر بوو، بەردەوام بارودۆخەکان بەرەو پێش دەچوو، کاروبارەکانیش دەگۆڕا، هەتا خوا ﷻ پەیمانەکەی بۆی تەواو کرد، وە دەسەڵاتی پێبەخشی لە ناو خەڵکیو وڵاتدا، تا وایلێهات شوێنکەوتووانی زاڵ بوونو بە تەواوەتی دەرکەوتن.


فَلَمَّا جَاءَهُم مُّوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَا بَيِّنَٰتٍ قَالُواْ مَا هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ
مُّفْتَرًى وَمَا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِىٓ ءَابَآئِنَا ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٣٦﴾
وَقَالَ مُوسَىٰ رَبِّىٓ أَعْلَمُ بِمَن جَآءَ بِٱلْهُدَىٰ مِنْ عِندِهِۦ وَمَن
تَكُونُ لَهُۥ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِ ۖ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٣٧﴾
وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ
غَيْرِى فَأَوْقِدْ لِى يَٰهَٰمَٰنُ عَلَى ٱلطِّينِ فَٱجْعَل لِّى صَرْحًا لَّعَلِّىٓ
أَطَّلِعُ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّى لَأَظُنُّهُۥ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٣٨﴾
وَٱسْتَكْبَرَ هُوَ وَجُنُودُهُۥ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَظَنُّوٓاْ
أَنَّهُمْ إِلَيْنَا لَا يُرْجَعُونَ ﴿٣٩﴾ فَأَخَذْنَٰهُ وَجُنُودَهُۥ فَنَبَذْنَٰهُمْ
فِى ٱلْيَمِّ ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٠﴾
وَجَعَلْنَٰهُمْ أَئِمَّةً يَدْعُونَ إِلَى ٱلنَّارِ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ
لَا يُنصَرُونَ ﴿٤١﴾ وَأَتْبَعْنَٰهُمْ فِى هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا لَعْنَةً ۖ
وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ هُم مِّنَ ٱلْمَقْبُوحِينَ ﴿٤٢﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا
مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ مِنۢ بَعْدِ مَآ أَهْلَكْنَا ٱلْقُرُونَ ٱلْأُولَىٰ
بَصَآئِرَ لِلنَّاسِ وَهُدًى وَرَحْمَةً لَّعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٤٣﴾

(٣٦): ﴿ فَلَمَّا جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَا بَيِّنَٰتٍ قَالُواْ مَا هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّفْتَرًى وَمَا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِىٓ ءَابَآئِنَا ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٣٦﴾ ﴾ مووسا ﷺ بە پەیامی پەروەردگاری ڕۆشت ﴿ فَلَمَّا جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَا بَيِّنَٰتٍ ﴾ (ئنجا کاتێ مووسا موعجیزە ڕوونەکانی ئێمەی بۆ هێنان)، ئەو موعجیزانەی کە زۆر ئاشکرانو بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە پێی فەرموون، هیچ کەمو کورتیو شاراوەیەکیان تێدا نیە ﴿ قَالُواْ ﴾ بە ستەمکاریو خۆبەزلزانیو عینادیەوە، وتیان: ﴿ مَا هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّفْتَرًى ﴾ (ئەوەی تۆ هێناوتە تەنها جادوویەکی هەڵبەستراوە)، هەروەکو فیرعەون ووتی لەو حاڵەتەی کە حەقو ڕاستی دەرکەوتو زاڵ بوو بەسەر ناحەقو بەتاڵدا، زانا ژیرەکان ملکەچی حەقیقەتو ڕاستیەکان بوون: ﴿ إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِى عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحْرَ ﴿٤٩﴾ ﴾الشعراء، (واتە: بەڕاستی ئەو مووسا جادووگەرە گەورەکەتانە کە فێری جادووی کردوون)، ئەو کەسێکی بیر تیژەو پاکو بێگەرد نیە، کە لە فرووفێڵو تەڵەکەبازیدا گەیشتۆتە ئەو پلەو پایەی خوا بۆمان باس دەکات، بێگومان مووسا زانیویەتی: ﴿ مَآ أَنزَلَ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴿١٠٢﴾ ﴾الإسراء، (واتە: هیچ کەس ئەم موعجیزانەی نەناردۆتە خوارەوە بێجگە لە پەروەردگاری ئاسمانەکانو زەوی) بەڵام بەدبەختی زاڵە.

﴿ وَمَا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِىٓ ءَابَآئِنَا ٱلْأَوَّلِينَ ﴾ (ئێمە ئەمەمان نەبیستوە لە باوو باپیرە پێشوەکانمان) ﴿ وَلَقَدْ جَآءَكُمْ يُوسُفُ مِن قَبْلُ بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَمَا زِلْتُمْ فِى شَكٍّ مِّمَّا جَآءَكُم بِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا هَلَكَ قُلْتُمْ لَن يَبْعَثَ ٱللَّهُ مِنۢ بَعْدِهِۦ رَسُولًا ۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ مُّرْتَابٌ ﴿٣٤﴾ ﴾غافر، (واتە: سوێند بە خوا بێگومان پێشتر یوسف پێغەمبەرتان بۆ هات بە بەڵگە ڕوونەکانەوە کەچی ئێوە هەر لە گوماندا بوون لەو بەڵگانەی بۆی هێنابوون تا کاتێ یوسف وەفاتی کرد وتتان ئیتر دوای ئەو خوا هیچ پێغەمبەرێکی تر نانێرێ ئا بەو جۆرە خوا

گومڕای دەکات ئەو کەسە زێدەڕۆو دوو دڵە).
(٣٧): ﴿ وَقَالَ مُوسَىٰ رَبِّيٓ أَعۡلَمُ بِمَن جَآءَ بِٱلۡهُدَىٰ مِنۡ عِندِهِۦ وَمَن تَكُونُ لَهُۥ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِۚ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ٣٧ ﴾:
﴿ وَقَالَ مُوسَىٰ ﴾ کاتێ ئەوان پێیان وابوو ئەوەی مووسا ﷺ بۆی هێناون جادوو گومڕاییە ئەوەشی خۆیان لەسەری دەڕۆن هیدایەتو ڕێنماییە، پێی فەرموون: ﴿ رَبِّيٓ أَعۡلَمُ بِمَن جَآءَ بِٱلۡهُدَىٰ مِنۡ عِندِهِۦ وَمَن تَكُونُ لَهُۥ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِ ﴾ واتە: ئەگەر ڕووبەڕوو بوونەوەو ڕوون کردنەوەی ئایەتە ئاشکراکان سوودی نەبێت لەگەڵتان، ئێوە کەللەڕەقیتان کردو سوور بوون لەسەر کوفرو بێبڕواییتان، خوا زانایە بەوەی هیدایەت دراوەو ئەوەشی گومڕایە، وە سەرەنجام بۆ کێیە، ئێمە یان ئێوە؟ ﴿ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾ (واتە: بە ڕاستی خوا ستەمکاران ڕزگار ناکات) سەرەنجامی سەرکەوتن هەر بۆ مووساو شوێنکەوتوانی دەبێت، وە سەرەنجامی زەرەرمەندیو لەناو چوون هەر بۆ فیرعەونو داروو دەستەکەی دەبێ.
(٣٨): ﴿ وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَأُ مَا عَلِمۡتُ لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرِي فَأَوۡقِدۡ لِي يَٰهَٰمَٰنُ عَلَى ٱلطِّينِ فَٱجۡعَل لِّي صَرۡحٗا لَّعَلِّيٓ أَطَّلِعُ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّي لَأَظُنُّهُۥ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ٣٨ ﴾:
﴿ وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ ﴾ فیرعەون کەللەڕەقی کرد بەسەر پەروەردگاریو گەلە گەمژە کەم عەقڵەکەیشی هەڵخەڵەتاندو وتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَأُ مَا عَلِمۡتُ لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرِي ﴾ واتە: (ئەی خەڵکینە! من کەسیتر شک نابەم کە شایستە بێت بەوەی خواتان بێ جگە لە من) تەنها من خواو پەرستراوتانم، جا ئەگەر پەرستراوێکی دیکە هەبێ جگە لەمن ئەوە من دەمزانی، تەماشای ئەم وەرعە تەواوە بکە لە لایەن فیرعەونەوە، چونکە نەیووت: (ما لكم من إله غيري) واتە: هیچ پەرستراوێکتان نیە جگە لە من نەبێ، بەڵکو خۆی پاراستو وتی: ﴿ مَا عَلِمۡتُ لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرِي ﴾، چونکە دەیزانی کەسێکی زاناو بەڕێز لەوێیە، کە هەرچی بڵێ هەر هەق لە لای ئەوە، وە هەر فەرمانێکیش بکات بە گوێی دەکەن.
کاتێ ئەم وتارەی خوێندەوە کە بە مانای ئەوە دێ دەگونجێ پەرستراوێکی دیکە هەبێ جگە لەو، ویستی ڕەتکردنەوەی پەرستراوێکی دیکە بسەلمێنێ، جا بە هامانی وت: ﴿ فَأَوۡقِدۡ لِي يَٰهَٰمَٰنُ عَلَى ٱلطِّينِ ﴾ (واتە: ئەی هامان کورەی ئاگر تاودە) بۆ ئەوەی خشتی سورەکراوەی لێ دروست بکەی، ﴿ فَٱجۡعَل لِّي صَرۡحٗا ﴾ (واتە: ئنجا لەو خشتە) کۆشکێکی بەرزم بۆ دروست بکە ﴿ لَّعَلِّيٓ أَطَّلِعُ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّي لَأَظُنُّهُۥ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴾ (واتە: بەڵکو سەیری خواکەی مووسا بکەمو ببینم بە ڕاستی من وادەزانم ئەو لە درۆزنانە)، بەڵام ئێمە ئەم

گومانە بەجێ دێنین‌و درۆی مووساتان بۆ دەردەخەین. تەماشای ئەم بوێریە مەزنە بکە بەسەر خوا ﷻ، کە هیچ مرۆڤێ پێی نەگەیشتووە، مووسای بە درۆزانی، وە بانگەشەی ئەوەی کرد کە پەرستراوە، وە ڕەتی کردەوە کە هیچ زانیاریەکی هەبێ دەربارەی پەرستراوی ڕاستەقینەو هۆکارەکانی گرتەبەر، بۆ ئەوەی بگات بە پەرستراوی مووسا، هەموو ئەمانە چاوبەستن‌و هەڵخەڵەتاندنی خەڵکی بوو، بەڵام سەرسووڕمان لە داروو دەستەکەیدایە، ئەوانەی پێیان وابوو ئەوان پیاوگەورەی وڵاتن‌و کاروبارەکانی بەڕێوەدەبەن، تەماشا بکە چۆن فیرعەون یاری بە عەقڵیان کردوو هیواو ئاواتەکانی بێ نرخ کردن، دیارە ئەمەش بەهۆی تاوانباریانەوەیە کە بووە بە سیفەتێکی دامەزراو تیایاندا.

ئاینەکەیانی تێکدا، پاشان بە دوای ئەوەدا عەقڵیشیانی تێکدا، خوایە گیان داوای پابەند بوونت لێدەکەین لەسەر ئیمان، دڵەکانمان لامەدە لە ڕێگای ڕاست دوای ئەوەی هیدایەتت داوین، وە لە لایەن خۆتەوە ڕەحمەتی خۆتمان پێ ببەخشە، بە ڕاستی هەر تۆی بەخشندە.

(٣٩): ﴿ وَٱسۡتَكۡبَرَ هُوَ وَجُنُودُهُۥ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ إِلَيۡنَا لَا يُرۡجَعُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾:

خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَٱسۡتَكۡبَرَ هُوَ وَجُنُودُهُۥ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ ﴾ فیرعەون‌و لەشکرەکەی خۆیان بە گەورەزانی بەسەر بەندەکانی خواوە، وە سزایان دەدان بە ناشرینترین شێوە، وە بەرانبەر بە پێغەمبەرانیش لووت بەرز بوون، هەر ئایەت‌و نیشانەیەکیان بۆ بهێنایە بە درۆیان دەزانی، وە پێیان وابوو ئەوەی ئەوان لەسەری دەڕۆن بەرزترو چاکترە، ﴿ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ إِلَيۡنَا لَا يُرۡجَعُونَ ﴾ (واتە: گومانیان وابوو کە زیندوو ناکرێنەوەو ناگەڕێنەوە بۆ لای ئێمە)، ئا لەبەر ئەمە کەللەڕەقی‌و بوێریان دەکرد، ئەگەرنا ئەگەر کردەوەیان بکردایە، یان گومانیان وابووایە کە زیندوو دەکرێنەوەو دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا، ئەوەی کە کردیان نەیان دەکرد.

(٤٠): ﴿ فَأَخَذۡنَٰهُ وَجُنُودَهُۥ فَنَبَذۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡيَمِّۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٠﴾ ﴾:

﴿ فَأَخَذۡنَٰهُ وَجُنُودَهُۥ ﴾ (جا تۆڵەمان لە فیرعەون‌و لەشکرەکەی کردەوە) کاتێ بەردەوام بوون لەسەر عینادی‌و گومراییان ﴿ فَنَبَذۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡيَمِّۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ (فرێمان دانە ناو ئاوی نیلەوە) ئنجا سەرنج بدە سەرەنجامی ستەمکاران چۆن بوو، بە ڕاستی خراپترینی سەرەنجامەکان‌و زەرەرمەندترینیان بوو، سەرەنجامێک سزای دنیایی‌و

سزای دوارۆژی بۆ هەمیشەیی بە دوای خۆیدا هێنا.
(٤١): ﴿ وَجَعَلۡنَٰهُمۡ أَئِمَّةٗ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلنَّارِۖ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا يُنصَرُونَ ٤١ ﴾:
﴿ وَجَعَلۡنَٰهُمۡ أَئِمَّةٗ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلنَّارِ ﴾ واتە: فیرعەون‌و دارو دەستەکەیمان کردە پێشەوایانێک کە خەڵکی پەیڕەویان بکەن‌و شوێنیان بکەون بۆ ماڵی سەرشۆڕی‌و بەدبەختی کە دۆزەخە.
﴿ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا يُنصَرُونَ ﴾ (واتە: وە لە ڕۆژی دواییدا سەرناخرێن) لە سزای خوا، ئەوانە لاوازترن لەوەی بتوانن سزا لەسەر خۆیان لابدەن، وە لە جگە لە خوا هیچ دۆست‌و سەرخەرێکیان نیە.
(٤٢): ﴿ وَأَتۡبَعۡنَٰهُمۡ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا لَعۡنَةٗۖ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ هُم مِّنَ ٱلۡمَقۡبُوحِينَ ٤٢ ﴾:
﴿ وَأَتۡبَعۡنَٰهُمۡ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا لَعۡنَةٗ ﴾ لەم دونیایەدا سزاو سەرشۆڕی‌و نەفرینمان بەدوایاندا نارد، وە لە لای خەڵکیش بە ناشرینی‌و خراپی‌و زەم کردنەوە باس بکرێن، ئەمە شتێکی ڕوون‌و ئاشکرایەو دەبینرێ، بەڕاستی ئەوان پێشەواو سەرمەشقی نەفرین لێکراو بوون لە دونیادا، ﴿ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ هُم مِّنَ ٱلۡمَقۡبُوحِينَ ﴾ (وە لە ڕۆژی دواییدا ئەوانە لە بێزارو) دوور خراوەکانن، ئەوانەی کردەوەی پیس‌و چەپەڵیان هەبوو، ئەوانەی کە تووڕەیی خواو تووڕەیی خەڵک‌و تووڕەیی دەروونی خۆیان بەسەریاندا کۆبووەوە.
(٤٣): ﴿ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ مِنۢ بَعۡدِ مَآ أَهۡلَكۡنَا ٱلۡقُرُونَ ٱلۡأُولَىٰ بَصَآئِرَ لِلنَّاسِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ لَّعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ ٤٣ ﴾:
﴿ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ ﴾ کە بریتیە لە تەورات، ﴿ مِنۢ بَعۡدِ مَآ أَهۡلَكۡنَا ٱلۡقُرُونَ ٱلۡأُولَىٰ ﴾ (لە پاش ئەوەی خەڵکی چەرخە پێشووەکانمان لەناوبرد) ئەوانەی سەرەنجامیان بە لەناوچوونی یەکجاری کۆتایی هات، فیرعەون‌و داروەستەو لەشکرەکەی، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لە دوای دابەزینی تەورات لەناو بردنی یەکجارەکی نەما، لەبەرئەوەی خوا ﷻ جیهادی بێبڕوایانی بە شمشێر دیاری کرد، ﴿ بَصَآئِرَ لِلنَّاسِ ﴾ واتە: کتێبی خوا کە دایبەزاندووە بۆ مووسا ﷺ بەرچاوڕوونی‌و ڕێنمایی تێدایە بۆ خەڵکی بۆ ئەوەی پێی بەرچاوڕوون بن ئەوەی سوودی هەیە بۆیان‌و ئەوەی زیانیان پێدەگەیەنێ، تا بەڵگەو حوجە لەسەر سەرپێچیکار بچەسپێ، وە بڕواداریش سوودی لێوەربگرێ، ببێتە میهرەبانی‌و ڕێنمایی بۆی بۆسەر ڕێگای ڕاست، لەبەرئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ لَّعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ ﴾ (واتە: ڕێنمایی‌و ڕەحمەتە بۆ ئەوانەی بیر بکەنەوەو ئامۆژگاری وەربگرن).

وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلۡغَرۡبِيِّ إِذۡ قَضَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَى ٱلۡأَمۡرَ وَمَا كُنتَ
مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٤٤﴾ وَلَٰكِنَّآ أَنشَأۡنَا قُرُونٗا فَتَطَاوَلَ عَلَيۡهِمُ
ٱلۡعُمُرُۚ وَمَا كُنتَ ثَاوِيٗا فِيٓ أَهۡلِ مَدۡيَنَ تَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ
ءَايَٰتِنَا وَلَٰكِنَّا كُنَّا مُرۡسِلِينَ ﴿٤٥﴾ وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ
ٱلطُّورِ إِذۡ نَادَيۡنَا وَلَٰكِن رَّحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَ لِتُنذِرَ قَوۡمٗا
مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٖ مِّن قَبۡلِكَ لَعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٤٦﴾
وَلَوۡلَآ أَن تُصِيبَهُم مُّصِيبَةُۢ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡ فَيَقُولُواْ
رَبَّنَا لَوۡلَآ أَرۡسَلۡتَ إِلَيۡنَا رَسُولٗا فَنَتَّبِعَ ءَايَٰتِكَ وَنَكُونَ
مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٤٧﴾ فَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلۡحَقُّ مِنۡ عِندِنَا قَالُواْ
لَوۡلَآ أُوتِيَ مِثۡلَ مَآ أُوتِيَ مُوسَىٰٓۚ أَوَلَمۡ يَكۡفُرُواْ بِمَآ أُوتِيَ
مُوسَىٰ مِن قَبۡلُۖ قَالُواْ سِحۡرَانِ تَظَٰهَرَا وَقَالُوٓاْ إِنَّا بِكُلّٖ كَٰفِرُونَ
﴿٤٨﴾ قُلۡ فَأۡتُواْ بِكِتَٰبٖ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِ هُوَ أَهۡدَىٰ مِنۡهُمَآ أَتَّبِعۡهُ
إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٤٩﴾ فَإِن لَّمۡ يَسۡتَجِيبُواْ لَكَ فَٱعۡلَمۡ
أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهۡوَآءَهُمۡۚ وَمَنۡ أَضَلُّ مِمَّنِ ٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ بِغَيۡرِ
هُدٗى مِّنَ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٠﴾

(٤٤): ﴿ وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلۡغَرۡبِيِّ إِذۡ قَضَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَى ٱلۡأَمۡرَ وَمَا كُنتَ مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٤٤﴾ ﴾:

کاتێ خـوا ﷻ ئەو چیرۆکو بەسـەرهاتەی گێرایـەوە بـۆ پێغەمبەرەکـەی کـە خـۆی لـە هەواڵـی نادیـاردا دەبینیـەوە، بەندەکانـی ئاگـادار کـردەوە کـە بێگومان ئـەم چیـرۆکو بەسـەرهاتە هەواڵێکـی ڕاسـتەقینەیە لـە لایـەن خـواوە، وە پێغەمبـەر هیـچ ڕێگایەکـی نەبـووە بۆ ئەو زانسـتە تەنهـا وەحـی نەبـێ، لەبـەر ئەمەیە فەرموویەتـی: ﴿ وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلۡغَرۡبِيِّ ﴾ واتـە: (تـۆ ئـەی موحەممـەد ﷺ لـە لای خۆرئـاوای) کێـوی تـووڕ نەبـووی، کاتێ فەرمانـی پێغەمبەرایەتیمـان دا بـە مووسـا ، ﴿ وَمَا كُنتَ مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴾ واتـە: (تـۆ لە ئامـادە بـووان نەبـووی) لەسـەر ئـەو ڕووداوە، هەتـا بوتـرێ: ئـەو لـەو ڕێگایـەوە هەواڵی بیسـتووە.

(٤٥): ﴿ وَلَٰكِنَّآ أَنشَأۡنَا قُرُونٗا فَتَطَاوَلَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡعُمُرُۚ وَمَا كُنتَ ثَاوِيٗا فِيٓ أَهۡلِ مَدۡيَنَ تَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِنَا وَلَٰكِنَّا كُنَّا مُرۡسِلِينَ ﴿٤٥﴾ ﴾:

﴿ وَلَٰكِنَّآ أَنشَأۡنَا قُرُونٗا فَتَطَاوَلَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡعُمُرُ ﴾ (واتـە: بـەڵام ئێمە چەند چیـنو چەرخمان دروسـت کرد لـە پاش مووسـا ئنجا ماوەیەکـی دوورو درێژیان بەسـەردا تێپەڕی) زانسـت سـڕایەوەو ئایەتـەکان لـە بیرچوونـەوە، ئێمە تۆمان نـارد لە کاتێکـدا زۆر پێویسـتیان بە تۆ بـوو، وە ئـەوەی کـە فێرمان کردیـتو بە وەحـی بۆمان نـاردی ﴿ وَمَا كُنتَ ثَاوِيٗا ﴾ واتـە: نیشـتەجێ، ﴿ فِيٓ أَهۡلِ مَدۡيَنَ تَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِنَا ﴾ واتە: (لە نـاو خەڵکی مەدیەندا) فێریـان بکەیـتو لێیانـەوە فێـر بیـت هەتا ئـەو هەواڵـەی داوتـە دەربارەی مووسـا  لە مەدیـەن ﴿ وَلَٰكِنَّا كُنَّا مُرۡسِلِينَ ﴾ واتـە: بـەڵام ئـەو هەواڵـەی کـە تـۆ هێناوتـە دەربـارەی مووسـا شـوێنەوارێکە لە شـوێنەوارەکانی ئێمە کـە بۆمان نـاردووی، وە وەحیو

نیگایەکـە هیـچ ڕێگـای دیکـە نیـە بـۆ ئـەوە بیزانـی، تەنهـا بـەوە نەبێ کـە پەیامـمـان بۆ ناردووی.

(٤٦): ﴿ وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلطُّورِ إِذْ نَادَيْنَا وَلَٰكِن رَّحْمَةً مِّن رَّبِّكَ لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٍ مِّن قَبْلِكَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٤٦﴾ ﴾

﴿ وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلطُّورِ إِذْ نَادَيْنَا ﴾واتـە: (تـۆ لە لای کێوی طوور نەبووی کاتێ بانگمان کـرد) مووسـا، وە فەرمانمـان پێکرد بچێ بـۆ لای گەلێکی سـتەمکارو پەیامـی ئێمەیان پێ بگەیەنـێ، وە ئایـەتو نیشـانە سەرسـووڕهێنەرەکانی ئێمەیـان پێنیشـان بدات کـە بۆ تۆمان باسـکردوە، مەبەسـت ئەوەیـە ئـەو ڕووداوانـەی کـە دەربـارەی مووسـا ﷺ ڕوویانـدا لەو شـوێنانەدا، ئێمـە بـۆ تۆمـان گێڕاوەتەوە بەبـێ زیادو کەم، لـە دوو حاڵـەت دەرناچێ:

یەکـەم: یـان ئەوەیە ئامـادە بووی‌و بینیوتە، یان ڕۆشـتووی بۆ ئەو شـوێنە لـە خەڵکەکەیەوە فێـری بـووی، ئەگـەر بـەو شـێوەیە بێ ئـەوە بە تـۆ ناوتـرێ پێغەمبـەری خـوا، چونکە ئەو کاروبارانـەی کـە هەواڵیـان لێـدەدرێ بـە بینیـن‌و لێکۆڵینـەوەو خوێنـدن، لـەو کاروبـارە هاوبەشـانەن کـە تایبـەت نیـن بـە پێغەمبـەران، بـەڵام ئەمـە بـە بێگومانـی زانـراوەو کـە شـتی لـەو جـۆرە نەبووە، جـا دۆسـتو دوژمنەکانـت هەموویـان دەزانـن تـۆ نەبینیوتە وە نەڕۆشـتووی فێـری ببی.

دووەم: ئەمەیانـە چەسـپاوە، ئەویش بریتیە لـەوەی ئەم هەواڵە لە لایەنی خـواوە بۆت نێردراوە بـە وەحـی‌و نیگا، جا بـە بەڵگەی یەکلاکـەرەوە ڕاسـتی پێغەمبەرایەتیـت دەرکەوتووەو خوا تـۆی کـردوە بە مایـەی ڕەحمـەت بـۆ بەندەکانـی، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتی: ﴿ وَلَٰكِن رَّحْمَةً مِّن رَّبِّكَ لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٍ مِّن قَبْلِكَ ﴾ (واتـە: بـەڵام ئـەوە بەزەییەکـە لـە پەروەردگارتـەوە بە تۆی داوە، بۆ ئەوەی گەلێک بترسـێنی کـە پێش تۆ هیچ ترسـێنەرێکیان بـۆ نەهاتووە)، واتە: عـەرەبو قورەیـش، بێگومان پەیامـی پێغەمبەرایەتی لە لای ئـەوان نەناسـراو بـووە لە کاتی ناردنـی پێغەمبـەردا، وە پێش ئەویش بـە ماوەیەکی زۆر ﴿ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴾ (واتـە: بەڵکـو بیربکەنـەوە) بـە وردەکاری خێرو چاکـە ئەنجام بـدەن، وە لـە ئەنجامـی شـەڕو خراپـەو وازی لێبهێنـن، جـا تۆ ئەگـەر ئەمە پلـەو پایەت بێ ئـەوە پێویسـتە لەسـەریان پەلە بکەن بـۆ بڕواهێنانو سووپاسـگوزاری خوا بکەن لەسـەر ئەم نیعمەتـەی کـە بە هیچ شـێوەیەک ئەنـدازە ناکرێو سووپاسـگوزاری تـەواو نابێ.

ترسـاندنی پێغەمبـەر ﷺ بـۆ عەرەب ئـەوە ڕەتناکاتـەوە کە بۆ جگە لـە ئەوان نـە نێردرابێ،

بێگومــان ئــەو عەرەبیــە، ئــەو قورئانــەی دابەزیوە بــۆی عەرەبیــە، وە یەکەم گــەل بانگەواز کــران عــەرەب بــوو، بۆیــە پەیامەکــەی بــۆ عــەرەب بنچینەیــەو بــۆ جگــە لــە عــەرەب شــوێنکەوتنە[٢]، وەک خــوا فەرموویەتــی: ﴿ أَكَانَ لِلنَّاسِ عَجَبًا أَنْ أَوْحَيْنَا إِلَىٰ رَجُلٍ مِّنْهُمْ أَنْ أَنذِرِ النَّاسَ وَبَشِّرِ الَّذِينَ آمَنُوا أَنَّ لَهُمْ قَدَمَ صِدْقٍ عِندَ رَبِّهِمْ ۗ قَالَ الْكَافِرُونَ إِنَّ هَٰذَا لَسَاحِرٌ مُّبِينٌ ﴿٢﴾ ﴾یونس، (واتــە: ئایــا بــە لای خەڵکەوە ســەیرە کــە ئێمە نیگامــان کردوە بــۆ پیاوێــک لە خۆیــان (پێمان ووتــووە) کــە مرۆڤەکان ئاگــادار بکــەوە)، ﴿ قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ﴿١٥٨﴾ ﴾الأعـراف، (واتــە: ئــەی موحەممــەد ﷺ بڵــێ: ئــەی خەڵکینــە بە راســتی مــن پێغەمبــەری خوام بــۆ ئێــوە هەمووتان).

(٤٧): ﴿ وَلَوْلَا أَن تُصِيبَهُم مُّصِيبَةٌ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ فَيَقُولُوا رَبَّنَا لَوْلَا أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا فَنَتَّبِعَ آيَاتِكَ وَنَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾:

﴿ وَلَوْلَا أَن تُصِيبَهُم مُّصِيبَةٌ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ﴾ لــە کوفرو ســەرپێچی ﴿ فَيَقُولُوا رَبَّنَا لَوْلَا أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا فَنَتَّبِعَ آيَاتِكَ وَنَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴾ واتە: ئەی موحەممەد ﷺ تۆمان ڕەوانە کردوە بۆ بەرپەرچدانەوەی کردارەکانیانو برینەوەی وتارەکانیان.

(٤٨): ﴿ فَلَمَّا جَاءَهُمُ الْحَقُّ مِنْ عِندِنَا قَالُوا لَوْلَا أُوتِيَ مِثْلَ مَا أُوتِيَ مُوسَىٰ ۚ أَوَلَمْ يَكْفُرُوا بِمَا أُوتِيَ مُوسَىٰ مِن قَبْلُ ۖ قَالُوا سِحْرَانِ تَظَاهَرَا وَقَالُوا إِنَّا بِكُلٍّ كَافِرُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾:

﴿ فَلَمَّا جَاءَهُمُ الْحَقُّ ﴾ (واتــە: ئنجــا کاتێ ڕاســتیان بۆ هات) کە هیــچ گومانێکی تێدانیە ﴿ مِنْ عِندِنَا ﴾ ئەویــش بریتیــە لــە قورئان، کــە لەلایەن ئێمــەوە بــۆت دابەزیوە ﴿ قَالُوا ﴾ بــە درۆیان دادەناو بەرپەرچیــان دایەوەو وتیــان: ﴿ لَوْلَا أُوتِيَ مِثْلَ مَا أُوتِيَ مُوسَىٰ ﴾ واتە: بۆچــی لە ئاســمانەوە بــە یەکجار قورئانــی بۆ دانەبەزیــوە، لەبەرئــەوەی بە جیا جیــا دابەزیوە ئــەوە لەلایــەن خــواوە نیــە، وە ئەمــە چــی بەڵگەیەکــی تیایــە؟ بــە گومانــی ئــەوان ئەگەر قورئــان بە جیــا جیــا دابەزیێ لــە لایەن خــواوە نیە.

بەڵکــو لــە تــەواوی ئــەم قورئانــەو گرنگیدانــی خــوا بەوەی کــە دایبەزانــدوە بــۆی، ئەوەیە کــە بەجیــا جیــا دایبەزانــدوە، بۆ ئــەوەی خــوا دڵــی پێغەمبەرەکــەی جێگیــر بــکاتو ببێتە مایــەی زیــاد بوونــی ئیمــان بــۆ بــڕواداران ﴿ وَلَا يَأْتُونَكَ بِمَثَلٍ إِلَّا جِئْنَاكَ بِالْحَقِّ وَأَحْسَنَ

٢ - بەڵکو پەیامی پێغەمبەر ﷺ بۆ هەموو گەلەکان بنچینەیە، بۆ عەرەبو جگە لە عەرەب، دەکرێت بوترێت سەرەتا بە پەیامی ئیسلام لە عەرەبەوە دەست پێکراوە، ئنجا قۆناغ بە قۆناغ گەیشتووە بە نەتەوەکانی دیکە، هیچ گەلو نەتەوەیەک بەڕێز تر نیە لەوی دیکە بە تەقوای خوا نەبێ. وەرگێڕ.

﴿تَفۡسِيرًا ٣٣﴾ الفرقان. (واتە: هەر نموونەو مەسەلێكت بۆ بێنن (لە ڕەخنەو پێشنیارە نابەجێكانیان) ئێمە وەڵامەكەیمان بۆ تۆ هێناوە بەڕاستیو جوانترین ڕوون كردنەوە) بێگومان پێوانەو ئەندازەكردنیان بە كتێبی مووسا ﷺ پێوانەكردنێكە خۆیان هەڵیان وەشاندۆتەوە، چۆن قورئان پێوانە دەكەن بە كتێبێ كە خۆیان بێبڕوا بوون پێیو ئیمانیان پێ نەهێنا؟ لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿أَوَلَمۡ يَكۡفُرُواْ بِمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ مِن قَبۡلُۖ قَالُواْ سِحۡرَانِ تَظَٰهَرَا﴾ (واتە: ئایا ئەوان پێشتر بێ بڕوا نەبوون بەوەی درابوو بە مووسا ﷺ دەیانوت دوو سیحرو جادوون پشتگیری یەكتر دەكەن) واتە: قورئانو تەورات، هاوكارو پشتیوانی یەكترن لە جادووەكەیانو گومڕا كردنی خەڵكی ﴿وَقَالُوٓاْ إِنَّا بِكُلّٖ كَٰفِرُونَ﴾ (واتە: وە دەیان ووت ئێمە بە هەموویان بێبڕواین).

بەمە ئەوە جێگیر بوو كە بەڕاستی ئەو بێبڕوایانە دەیانەوێ هەق پووچ بكەنەوە بە بێ هیچ سەلماندنێك، وە بەرپەرچی بدەنەوە بە شتێ كە بەرپەرچ نەدرێتەوە، وە قسەی پێچەوانەو جیاواز بكەن، ئەمەش پیشەی هەموو بێبڕوایەكە، لەبەر ئەمە بە ڕوونو ئاشكرایی بێبڕوابوونیان بەو دوو كتێبەو ئەو دوو پێغەمبەرە دەرخستووە، بەڵام ئایا بێبڕوایی ئەوان بە هۆی ئەوەوە بووە بە دوای حەقو ڕاستیدا گەڕاون شوێنی شتێك كەوتوون كە لەو دووانە چاكترە، یان تەنها هەواو نەفسو ئارەزووە؟

(٤٩): ﴿قُلۡ فَأۡتُواْ بِكِتَٰبٖ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِ هُوَ أَهۡدَىٰ مِنۡهُمَآ أَتَّبِعۡهُ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ٤٩﴾:

خوا ﷻ پەیوەستیان دەكات بەوەو فەرموویەتی: ﴿فَأۡتُواْ بِكِتَٰبٖ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِ هُوَ أَهۡدَىٰ مِنۡهُمَآ﴾ (واتە: بڵێ: كتێبێك لە لایەن خواوە بێنن كە ئەو كتێبە ڕاستر بێت لەو دووانە) تەوراتو قورئان ﴿أَتَّبِعۡهُ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴾ (واتە: من شوێنی دەكەوم ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن) نە ئەوانو نە جگە لەوان توانایان نیە كە هاوشێوەی ئەو دوو كتێبە بێنن، بێگومان لەو كاتەی خوا ﷻ مرۆڤی بەدیهێناوە لەم جیهانەدا، كتێبێك نیە وێنەی ئەم دوو كتێبە زانستو هیدایەتو ڕەحمەت بێ بۆ هەموو دروستكراوەكان.

ئەمە ئەوپەڕی ویژدانە ئەگەر بانگخوازێ بڵێ: من مەبەستم حەقو هیدایەتو ڕێنیشاندانە، وە بێگومان ئەم كتێبەم بۆ هێناون هەموو ئەوانە لەخۆ دەگرێو گونجاوە لەگەڵ كتێبەكەی مووسادا ﷺ، پێویستە لەسەر هەمووسمان ملكەچیان بینو شوێنیان بكەوین، چونكە لە هەردووكیاندا هیدایەتو ڕاستی بەدیدەكرێ، جا ئەگەر ئێوە كتێبێكم بۆ بێنن لە لایەن خواوە لەو دوو كتێبە ڕێنمایی زیاتری تێدا بێ ئەوە من شوێنی دەكەوم،

ئەگەرنا واز لە هیدایەتو حەقیقەتێک ناهێنم کە دەیزانم بۆ جگە لە هیدایەتو راستی.

(٥٠): ﴿ فَإِن لَّمْ يَسْتَجِيبُوا لَكَ فَاعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَاءَهُمْ ۚ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ اتَّبَعَ هَوَاهُ بِغَيْرِ هُدًى مِّنَ اللَّهِ ۚ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴿٥٠﴾ ﴾:

﴿ فَإِن لَّمْ يَسْتَجِيبُوا لَكَ ﴾ (واتە: ئنجا ئەگەر وەلامیان نەدایتەوە)و کتێبێکیان نەهێنا لە تەوراتو قورئان چاکتر بێ ﴿ فَاعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَاءَهُمْ ﴾ واتە: ئەوە بزانە وازهێنانیان لە شوێنکەوتنی تۆ، رۆیشتنیان نیە بۆ لای حەقیێ بیناسنەوە، وە بۆ لای هیدایەتیش نیە، بەڵکو ئەوە تەنها شوێنکەوتنی هەواو ئارەزوویانە ﴿ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ اتَّبَعَ هَوَاهُ بِغَيْرِ هُدًى مِّنَ اللَّهِ ﴾ ئەمە گومراترین کەسە، کاتێ هیدایەتو رێگای راستی خراوەتە روو کە دەیگەیەنێتە لای خوا، وە بۆ ماڵی رێزداری، نە لای لێکردوەتەوەو نە رووی تێکردوە، وە هەواو ئارەزووی بانگیان کردوە بۆ گرتنەبەری ئەو رێگایانەی کە دەیگەیەنێت بە لەناوچوونو بەدبەختی، ئەویش شوێنی کەوتووەو وازی لە هیدایەت هێناوە.

ئایا کەسێک هەیە لەمە گومڕا تر بێت؟ بەلام ستەم کردنیو دژایەتیکردنیو حەزنەکردنی لە شوێنکەوتنی هەق وای لێکرد لەسەر گومرایی بمێنێتەوەو شوێنی هیدایەتی خوا نەکەوێ، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴾ واتە: ئەوانەی کە زوڵمو ستەمو عینادی بووە بە وەسفیان، هیدایەتیان بۆ هات رەتیان کردەوە، هەواو ئارەزوویان بۆ خرایە روو شوێنی کەوتن، دەرگاو رێگاکانی هیدایەتیان بەسەرخۆیاندا داخست، لەبەرانبەردا دەرگاکانی گومراییان بەسەر خۆیاندا کردەوە، ئەوان لە گومراییو سەرلێشێواوی خۆیاندا ماونەتەوە، وە لە بەدبەختیو تیاچوونیاندا دووبارە دەبنەوە.

کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَإِن لَّمْ يَسْتَجِيبُوا لَكَ فَاعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَاءَهُمْ ﴾ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەر کەسێک وەلامی پێغەمبەر ﷺ نەداتەوە، وە قسەیەکی دیکە هەڵبژێرێ پێچەوانەی قسەی پێغەمبەر ﷺ ئەوە هیدایەتی هەڵنەبژاردوە، بەڵکو شوێنی هەواو ئارەزووی خۆی کەوتووە.

وَلَقَدْ وَصَّلْنَا لَهُمُ الْقَوْلَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٥١﴾ الَّذِينَ
آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ مِن قَبْلِهِ هُم بِهِ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾ وَإِذَا يُتْلَىٰ
عَلَيْهِمْ قَالُوا آمَنَّا بِهِ إِنَّهُ الْحَقُّ مِن رَّبِّنَا إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلِهِ
مُسْلِمِينَ ﴿٥٣﴾ أُولَٰئِكَ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُم مَّرَّتَيْنِ بِمَا صَبَرُوا وَيَدْرَءُونَ
بِالْحَسَنَةِ السَّيِّئَةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٥٤﴾ وَإِذَا سَمِعُوا
اللَّغْوَ أَعْرَضُوا عَنْهُ وَقَالُوا لَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ سَلَامٌ
عَلَيْكُمْ لَا نَبْتَغِي الْجَاهِلِينَ ﴿٥٥﴾ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ
وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ ﴿٥٦﴾
وَقَالُوا إِن نَّتَّبِعِ الْهُدَىٰ مَعَكَ نُتَخَطَّفْ مِنْ أَرْضِنَا أَوَلَمْ
نُمَكِّن لَّهُمْ حَرَمًا آمِنًا يُجْبَىٰ إِلَيْهِ ثَمَرَاتُ كُلِّ شَيْءٍ رِّزْقًا
مِّن لَّدُنَّا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٧﴾ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِن
قَرْيَةٍ بَطِرَتْ مَعِيشَتَهَا فَتِلْكَ مَسَاكِنُهُمْ لَمْ تُسْكَن مِّن
بَعْدِهِمْ إِلَّا قَلِيلًا وَكُنَّا نَحْنُ الْوَارِثِينَ ﴿٥٨﴾ وَمَا كَانَ رَبُّكَ
مُهْلِكَ الْقُرَىٰ حَتَّىٰ يَبْعَثَ فِي أُمِّهَا رَسُولًا يَتْلُو عَلَيْهِمْ
آيَاتِنَا وَمَا كُنَّا مُهْلِكِي الْقُرَىٰ إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَالِمُونَ ﴿٥٩﴾

(٥١): ﴿ وَلَقَدْ وَصَّلْنَا لَهُمُ الْقَوْلَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٥١﴾ ﴾:

﴿ وَلَقَدْ وَصَّلْنَا لَهُمُ الْقَوْلَ ﴾ واتە: (سوێند بە خوا ئایەتەکانی قورئانمان) بە شوێن یەکدا بۆ ناردوونو گەیاندوومانن، وە کەم کەم دامانبەزاندووە وەکو ڕەحمەتو بەزەییەک بۆتان ﴿ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴾ (تا پەند وەربگرنو بیر بکەنەوە) کاتێ کە ئایەتەکانیان بۆ دووبارە دەکاتەوە، وە لە کاتی پێویستدا بۆیان دادەبەزێنێ، ئەو کات دابەزینی بە جیاجیا دەبێتە ڕەحمەتێک بۆیان، کەواتە: بۆچی ڕووبەڕووی دەوەستنەوە کە ئەوە لە بەرژەوەندی ئەواندایە؟

## بەشێك لە باسکردنی هەندێ سوودو پەندو ئامۆژگاری لەم چیرۆکە سەرسووڕهێنەرەدا.

یەکەم: بێگومان ئایەتو نیشانەکانی خوا ﷻو پەندو ئامۆژگاریەکانی، وە ڕۆژگارەکانی لە ئوممەتەکانی پێشوودا، تەنها کەسی بڕوادار سوودو ڕووناکی لێوەردەگرێ، جا بەندە بە پێی ئیمانەکەی پەندوو عیبرەتی لێ وەردەگرێ، بێگومان خوا ﷻ ئەو چیرۆکانەی لەبەر ئەوان هێناوە، بەڵام خوا هیچ بایەخێک بە غەیری ئەوان نادات، وە هیچ ڕووناکیو هیدایەتێکیان لە هێنانەوەی چیرۆکو بەسەرهاتەکاندا بۆ نیە.

دووەم: خوا ﷻ ئەگەر هەر کارێکی بوێ هۆکاریشی بۆ ڕێک دەخات، وە هۆکارەکانی بۆ دێنێ قۆناغ بە قۆناغ نەک بە یەکجار.

سێیەم: ئوممەتو گەلی لاواز ئەگەر بگاتە ئەوپەڕی لاوازی نابێ تەمبەڵیو تەوەزلی باڵ بکێشێ بەسەریدا بۆ داواکردنی مافەکانی، وە نابێ بێئومێد بێ لە گەیشتنی بە بەرزترین پلەو پایە بە تایبەت ئەگەر ستەم لێکراو بوو، هەروەک خوا نەوەکانی ئیسرائیلی ڕزگار

کـرد، ئـەو گەلـە لاوازە لە کۆتو بەنـدی فیرعەونو دارودەسـتەکەی، وە دەسـەڵاتی پێدان لەسـەر زەویدا، شـارو ولاتی سـتەمکارانی کرد بـە موڵکیان.

چـوارەم: بـە ڕاسـتی ئوممەت مـادام زەلیـلو ژێر دەسـتەیەو مافی خـۆی وەرناگرێو قسـە نـاکات، ئـەوە کاروبـاری دینـیو دونیایـی بۆ ڕێـک نایـەت، وە پێشـەواو گـەورەی تێدا هەڵناکەوێ.

پێنجـەم: نـەرمو نیانـی خوا بـۆ دایکـی مووسـا ﷺ، وە دڵدانەوەی لەسـەر ئەو موسـیبەتەی کـە تووشـی بـوو بە مـژدەدان بەوەی کـە خـوا منداڵەکـەی بـۆ دەگێڕێتەوەو دەیـکات بە یەکێـک لـە پێغەمبەران.

شەشـەم: خـوا ﷻ قـەزاو قەدەری نارەحـەتو ناخۆش تووشـی بەندەکـەی دەکات بۆ ئەوەی پێـی ببەخشـێ دڵخۆشـیەک مەزنتر لـەوە، یان شـەڕو خراپەیەکی لەسـەر لاببـات گەورەتر لـەو بەڵایـە، هەروەکو چۆن بە ویسـتی خۆی دایکی مووسـای تووشـی ئەو خـەمو پەژارەیە کـرد، کـە ئـەوە هۆکارێک بـوو بـۆ ئـەوەی منداڵەکـەی بگاتەوە دەسـتی، بە جـۆرێ کە دڵو دەروونـی پێـی دڵنیـاو ئـارام بـێ، وە چـاوی پێی ڕۆشـن بێتـەوە، وە بە هۆیـەوە زیاد دڵخـۆشو کەیف خـۆش بێ.

حەوتـەم: بێگومـان ترسـی سروشـتی لـە خەڵکـەوە ئیمـان ڕەت ناکاتـەوەو لای نابـات، هەروەکـو چـۆن دایکـی مووسـاو مووسـا تووشـی ئـەو مەترسـیانە بـوون.

هەشـتەم: بەڕاسـتی ئیمـان زیادو کـەم دەکات، مەزنترین شـت کـە ئیمانی پێ زیـاد دەبێو یەقینـی پـێ تەواو دەبـێ ئارامگرتنە لەسـەر نارەحەتیەکان، وە چەسـپاویو جێگیـر بوونە لە لایـەن خـواوە لە کاتی دڵـە ڕاوکێکاندا، هـەروەک خـوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿لَوۡلَآ أَن رَّبَطۡنَا عَلَىٰ قَلۡبِهَا لِتَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١٠﴾ القصص، واتـە: بۆ ئـەوەی ئیمانی پـێ زیادبێو دڵـی پێ ئـارام بێ.

نۆیـەم: لـە مەزنترینـی نیعمەتەکانی خوا بەسـەر بەندەکەیـەوە، وە مەزنتریـن یارمەتی خوا بۆ بەندەکـەی لەسـەر کاروبارەکانـی ئەوەیە خوا ﷻ چەسـپاوی بـکات، وە لە کاتی مەترسـیدا دڵـی جێگیـر بـکات، وە لـەو کاروبارانەی سـەرقاڵو سەرسـام دەبـێ، بێگومان بەوشـێوەیە دەتوانـێ قسـەی ڕاسـتو کردەوەی ڕاسـت بکات، بـە پێچەوانەی ئەو کەسـەی ترسو دوو دڵـیو خەمۆکـی بەردەوامـە، بێگومان ئەو فکـرو مێشـکی دەڕواو عەقڵی لـە جێگەی خۆی نامێنـێ، بۆیـە لەو کاتەدا سـوود لە نەفـسو دەروونـی وەرناگرێ.

دەیـەم: بێگومـان بەندە- ئەگـەر بزانێ قەزاو قـەدەرو بەڵێنی خـوا ڕوودەداو هـەر دەبێ ببی- ئـەوە نابـێ کەمتەرخەمـی بـکات لـە بەکارهێنانـی هۆکارەکاندا کـە فەرمانی پێکـراوە، وە بەکارهێنانـی هـۆکارەکان ڕەتکردنەوەی ئیمـانو بڕوای نیە بە هەواڵی خـوا، چونکە خوا ﷻ پەیمانیـدا بـە دایکی مووسـا ﷺ مووسـای بـۆ بگەڕێنێتـەوە، وە لەگـەڵ ئەوەشـدا هەوڵو کۆششـی بـەردەوام بـوو لەسـەر گێڕانەوەی مووسـا ﷺ، وە خوشـکەکەی نارد بـۆ ئەوەی هەواڵـی بزانـێو وەریبگرێتەوە.

یـازدە: ڕێگـە دراوە ئافـرەت دەربچێتـە دەرەوە بـۆ بەدەسـتهێنانی پێویسـتیەکانی، وە قسـە لەگـەڵ پیاوانـدا بـکات بەبـێ بوونـی مەترسـی، هەروەکو چۆن لە خوشـکەکەی مووسـاو دووکچەکـەی خـاوەن مەدیـەن ڕوویدا.

دوازدە: ڕێگە دراوە بە وەرگرتنی کرێ لەسەر شیردانو کەفالەتی منداڵ.

سێزدە: لە بەزەیی خوا ﷻ بە بەندە لاوازەکەی کە بیەوێ ڕێزی لێبگرێو ئایەتەکانی خۆی پێنیشان بدات، وە بیکات بە شایەت لە ڕوونکراوەکانیدا، بۆ ئەوەی ئیمانی پێی زیاد بکات هەروەک خوا مووسای گێڕایەوە بۆ دایکی، بۆ ئەوەی بزانێ پەیمانی خوا ﷻ ڕاستە.

چـواردە: کوشـتنی بێبڕوا کـە پەیمانی گرێبەسـتنی هەبێ، یـان دابو نەریت دروسـت نیە، چونکە مووسـا ﷺ کوشـتنی پیـاوە قیبتیـە بێبڕواکەی بە تـاوان زانیو داوای لێخۆشـبوونی لە خـوا کرد.

پـازدە: ئـەو کەسـەی خەڵکی بە ناهـەق دەکوژێ بـە خۆبەزلـزانو خراپەکار لەسـەر زەوی تەماشـا دەکرێ.

شـازدە: ئـەو کەسـەی خەڵک دەکـوژێ بە ناحـەق، وە پێی وایە ئـەو چاکەکارە لـە زەویدا، وە تاوانبـاران بـە ڕێـز تەماشـا دەکات، ئـەوە درۆ دەکات لـە بانگەشـەکەیداو کەسـێکی خراپـەکارە، هەروەک خوا ﷻ قسـەی قیبتیەکە دەگێڕێتـەوە: ﴿ إِن تُرِيدُ إِلَّآ أَن تَكُونَ جَبَّارًا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا تُرِيدُ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلۡمُصۡلِحِينَ ﴿١٩﴾ ﴾القصص، لـە ڕووی جێگیـر کـردن بۆیو نەک ئینـکاریو نکووڵی.

حەڤدە: بێگومان هەواڵدان بەکەسێ شتێ دەربارەی ووترا بێت، وەکو ئاگادار کردنەوەیەک بۆ ئەوەی تووشی شەڕو خراپە نەبێت، ئەوە نابێتە نەمیمە -بەڵکو هەندێ جار پێویستە- هەروەک ئەو پیاوە هەواڵی دا بە مووساو ئاگاداری کردەوە، وەک ئامۆژگاریکردن.

هـەژدە: ئەگـەر کەسـێک ترسـا لەوەی لـە مانەوەیدا لـەو جێگایـە بیکوژنو لەنـاوی ببەن،

خـۆی ناخاتــە نــاو نارەحەتیەوەو تەسـلیمی ئـەوەش نابێــت، بەڵکــو خـۆی دوور دەخاتەوە، هــەروەک مووســا ﷺ کردی.

نـۆزدە: لــە کاتی رووبــەڕوو بوونــەوەی دوو خراپــەدا، کە پێویســتە هەر یەکێکیــان ئەنجام بــدات، ئەو ســووکترینیان هەڵدەبژێرێ، وەک مووســا کەوتە نێوان ئەوەی ئەگــەر بمێنێتەوە لــە میســر ئەکــوژرێ، یــان بچێــت بــۆ هەنــدێ وڵات، شــارەزای ڕێگاکــە نەبــوو، وە هیچ ڕێناســێک نەبــوو لەگەڵیــدا ڕێگاکەی پێبناسـێنی، جگە لــە پەروەردگاری، بەڵام ئــەم حاڵەتە نزیکتــرە بۆ ســەلامەتی لــە حاڵەتــی یەکەم، بۆیــە مووســا ﷺ هەڵیبژاردو شــوێنی کەوت.

بیســت: ئەو کەســەی ســەرنج ئەدات لە زانســتدا، ئەگەر پێویســتی کرد قســەی تێــدا بکات، وە ئەگــەر یەکلانەبوویــەوە لــە لای یەکێــک لــەو دوو بۆچوونــە، ئــەوە داوای ڕێنمایــی لە پەروەرگــاری دەکات، وە داوای لێــدەکات هیدایەتی بدات بۆ ڕاســترین ئــەو دوو بۆچوونە، پــاش ئــەوەی لە دڵــەوە مەبەســتی تەنها هــەق دەبــێ‌و دەگەڕێــت بەدوایــدا، بێگومــان خوا کەســێ بــێ هیــوای نــاکات حاڵی بــەم جــۆرە بێــت، وەک چــۆن مووســا ﷺ دەرچوو بۆ مەدیــەن، جــا فەرمــووی: ﴿ عَسَىٰ رَبِّيٓ أَن يَهۡدِيَنِي سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿٢٢﴾ ﴾القصــص، (واتــە: ئومێــد دەکــەم پەروەردگــارم ڕێنماییــم بکات بــۆ ڕێگای ڕاســت‌و حەق).

بیســت‌و یــەک: بەزەیــی هاتنــەوە بــە خەڵکیــداو چاکە کــردن لەگەڵ ئــەوەی دەیناســێ‌و ئــەوەی نایناســێ، لــە ڕەوشــتی پێغەمبەرانــە، وە یەکێک لــە چاکــەکان ئاودانــی ئاژەڵەکان بــوو، وە یارمەتیدانــی بــێ توانا.

بیســت‌و دوو: پەســند بوونی پاڕانەوە بــە ڕوونکردنەوە بارودۆخ‌و شــیکردنەوەی، چونکە خوا حــەز دەکات بەندەکــەی خۆی بە کــەم بزانێ‌و زەلیلــی‌و هەژاری خۆی بۆی ئاشــکرا بکات، هــەر وەک مووســا ﷺ فەرمــووی: ﴿ رَبِّ إِنِّي لِمَآ أَنزَلۡتَ إِلَيَّ مِنۡ خَيۡرٖ فَقِيرٞ ﴿٢٤﴾ ﴾القصص، (واتــە: ئــەی پەروەردگارم بەڕاســتی من هــەژارم بە هەر خێــرو ڕۆزیەک بــۆم بنێری).

بیســت‌و ســێ: شــەرم کردن بــە تایبەت لــە لایەن کەســە بەڕێزەکانەوە لە ڕەوشــتە ســتایش کراوەکانە.

بیســت‌و چــوار: بەنــدە ئەگەر کارێ بۆ خــوا بکات، پاشــان یارمەتیەک درا لەســەر ئەو کارە بەبــێ ئــەوەی مەبەســتی ئەوە بووبــێ، ئەوە لۆمــە ناکرێت لەســەر ئەو یارمەتیــە، وەک چۆن مووســا پاداشــتی خــاوەن مەدیەنی وەرگرت، لــە بری ئەو چاکەی کە مەبەســتی ئــەوە نەبوو پاداشــت بدرێتەوە لەســەری، بەڵکو پاداشــت لــە جیاتی بە دڵیــدا نەهاتبوو.

بیست و پێنج: ڕەوایەتیو ڕێگەپێدانی بە کرێدان، ئەوە دروستە بۆ شوانیو وێنەی ئەویش، لەوەی لە توانایدا نەبێ، بەڵکو ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ داب و نەریت.
بیست و شەش: دروستە لەبری بە کرێگرتن شتێکی پێبدات سوودی هەبێت، ئەگەرچی سوودەکەش هەندێک بێت.
بیست و حەوت: ئەگەر پیاوێک داوا لە کەسێک بکات کچەکەی مارە بکات سەرزەنشت ناکرێ.
بیست و هەشت: چاکترین کرێکار کە کار بۆ مرۆڤ دەکات، ئەو کەسەیە بەهێزو دەستپاک بێت.
بیست و نۆ: بەڕاستی یەکێک لە ڕەوشتە بەرزەکان ئەوەیە مرۆڤ چاک بێت لەگەڵ کرێکارەکەیو خزمەتکارەکەی، ئەرکی قوورسو گران نەخاتە ئەستۆی، لەبەر فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أَشُقَّ عَلَيۡكَۚ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ٢٧﴾ القصص، (واتە: من نامەوێ قورسی بکەم لەسەرت، ئەگەر خوا بیەوێ بێگومان دەمبینی لە پیاو چاکان دەبم).
سی: دروستی گرێبەستی بەکرێدانو غەیری ویش لە گرێبەستەکان، بەبێ شایەتی گرتن، وەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٞ ٢٨﴾ القصص، (واتە: خوا شایەتو چاودێرە لەسەر ئەوەی کە دەیڵێین).
سیو یەک: ئەوەی خوا هێناویەتی لەسەر دەستی مووسا لە بەڵگەو نیشانە ڕوونەکانو موعجیزە ئاشکراکان، لە مارو هەڵگەڕانەوەی دەستی بە سپی بوون بە بێ نەخۆشیو بەڵەکی، وە لە پاراستنی خوا بۆ مووساو هارِوون لە فیرعەون، وە لە خنکان.
سیو دوو: لە گەورەترینی سزاو تۆڵەکان بۆ ئەو کەسانەیە پێشەوان لە شەڕو خراپەدا، ئەویش بە پێی بەرهەڵستی کردنیەتی لە نیشانە ئاشکراکانی خوا، وەک چۆن گەورەترین نیعمەتی خوا بەسەر بەندەکەیەوە، ئەوەیە کردبێتی بە پێشەوا لە خێرو چاکەدا خۆی هیدایەتی وەرگرتبێو هیدایەتی خەڵکیش بدات.
سیو سێ: وە بەڵگەی تێدایە لەسەر پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺ، هەروەک هەواڵی پێداوە بە تێرو تەسەلیو پڕاوپڕو وەک خۆی، گێڕاویەتیەوە بە گێڕانەوە، پێغەمبەران بە ڕاستیان زانیوە، وە پشتیوانی لێکردوە قورئانی ڕاستو ڕوونکراوە، بەبێ بوونی شتێ لەو ڕووداوانە، وە بەبێ بینینی بەشێک لەو بەشانە، وە بەبێ خوێندنێ کە شتێکی خوێندبێ

لـەو بارەیـەوە، وە بەبـێ دانیشـتن لـە کـۆڕو کۆمەڵـی زانایانـدا، ئـەو پەیامە تەنهـا پەیامی خـوای بەسـۆزو بە بەزەییـە، وەحیەکە خوای بەخشـندەی منەتکـەر نازڵی کـردوە بۆ ئەوەی نەفامـانو بێئاگایانی پێ بترسـێنێ.

درودو سـڵاوی خوا لەسـەر ئەو کەسـەی تەنها بە هەواڵەکەی دەزانێ ئـەو پێغەمبەری خوایە، وە تەنهـا بـە فەرمـانو قەدەغەکردنی عەقڵـە ڕووناکەکان ئاگـادار دەکاتەوە کە ئـەو پەیامە لـە لایەن خـواوە هاتـووە، بێگومان هەواڵی پێشـینو دوایین ڕاسـتی ئەو قورئانە دەسـەلمێنن کـە لە لایـەن پەروەردگـاری جیهانیانـەوە هاتووە، وە ئەوەشـی پـەروەردە بووە لەسـەر ئەو خووڕەوشـتە بـەرزو بەڕێزانـەی کـە ناگونجـێ تەنهـا لەگـەڵ بەرزترینـی بەدیهێنراوەکاندا نەبـێ، وە سەرخسـتنی ڕوون بۆ ئایـنو ئۆممەتەکەی، هەتـا ئاینەکەی گەیانـدوە بە درێژایی شـەوو ڕۆژ، وە ئۆممەتەکەی سـەرجەم وڵاتو شـوێنەکانیان لە شمشـێرو ڕم ڕزگار کردوە، وە دڵەکانیـان پـڕ بووە لە زانسـتو ئیمان.

بـە بەردەوامـی ئـەو ئۆممەتانەی عینادو کەللەڕەقن، وە ئەو پاشـاو دەسـەڵاتدارە سـتەمکارانە هەموویـان لـە یـەک کەوانەوە تیـر هاوێـژی دەکەنو فێـڵو تەڵەکـەی بەرانبـەر دەکەن، وە هەمـوو هەوڵێکیـان دەخەنە کار بۆ کوژاندنەوەو شـاردنەوەی لەسـەر زەوی، لـە کاتێکدا خـوا خۆی بـەرزی دەکاتەوەو پرشـنگداری دەکات، وە زیـاد ناکات تەنها بە گەشـە کردن نەبـێ، وە ئایـەتو نیشـانەکانی سـات بەسـات ڕوونتـرو ئاشـکراتر دەبـن، وە هەرکاتێ لە کاتـەکان ئایەتەکانـی خـوا دەردەکـەون دەبنـە مایـەی پەنـد بـۆ خەڵکـیو هیدایـەت بـۆ زانـاکان، وە نـوورو ڕووناکـیو بەرچـاو ڕوونـی بـۆ ئەوانـەی بیـر دەکەنەوە، سـتایش بۆ خـوای تـاکو تەنها.

(٥٢-٥٥): ﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِهِۦ هُم بِهِۦ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾ وَإِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِهِۦٓ
إِنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّنَآ إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلِهِۦ مُسْلِمِينَ ﴿٥٣﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُم مَّرَّتَيْنِ بِمَا صَبَرُوا۟ وَيَدْرَءُونَ
بِٱلْحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٥٤﴾ وَإِذَا سَمِعُوا۟ ٱللَّغْوَ أَعْرَضُوا۟ عَنْهُ وَقَالُوا۟ لَنَآ
أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ لَا نَبْتَغِى ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٥٥﴾ ﴾:

خـوا بـاس لە مەزنـی قورئانو ڕاسـتیو حەقیقەتـی دەکات، وە ئەوانەیشـی بەڕاسـتی خاوەن زانسـتن دەیناسـنەوەو بـڕوای پێ دێنـنو دانی پێـدا دەنێن کە ئـەوە حەقە: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِهِۦ ﴾ ئەوانەیـش خاوەنـی تـەوراتو ئینجیلن، ئەوانەی گـۆڕانو جێگۆڕکێیان لـە کتێبەکانیـان نەکـردوە ﴿ هُم بِهِۦ ﴾ واتـە: ئـەوان بـەم قورئانـەو ئەوەیشـی هێناویەتـی

﴿ يُؤْمِنُونَ ﴾ بـڕوا دێنن.

(٥٣): ﴿ وَإِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ﴾ واتـە: گوێـی لـێ دەگـرنو ملکەچـی دەبـن ﴿ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِهِۦٓ إِنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّنَآ ﴾ (دەڵێـن: بڕوامـان پـێ هێنـا) چونکـە گونجاوە لەگـەڵ ئـەوەی پێغەمبەران هێناویانـە، وە هەمـوو هەواڵـە ڕاسـتەکانو فەرمـانو قەدەغەکراوەکان لـە خۆدەگرێ.

ئـا ئەوانە شـایەتیدانیان سـوودی هەیـە، چونکە ئەوانە هیـچ ناڵێن مەگەر بە زانسـتو بەرچاو ڕوونـی نەبـێ، وە لەبەرئەوەی خاوەن کتێبن، وە جگە لەوانیـش ڕووبەڕووبوونەوەیان بەرانبەر بـە هـەق نابـێ بـە بەڵگـە، چونکە لـە نێـوان نەفامـی یـان خـۆ نەفامکـردنو نکوڵیکردنی حەقـدان، خـوا فەرموویەتـی: ﴿ قُلْ ءَامِنُواْ بِهِۦٓ أَوْ لَا تُؤْمِنُوٓاْ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْعِلْمَ مِن قَبْلِهِۦٓ إِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ سُجَّدًا ﴿١٠٧﴾ ﴾ الإسراء (واتـە: بڵـێ بـاوەڕ دێنن بەم قورئانـە یان باوەڕی پـێ نەهێنـن، بەڕاسـتی ئەوانـەی کە زانیاریـان پێ بەخشـراوە لە پێـش ئەم قورئانـەدا کاتێ بخوێنرێتـەوە بـە سـەریاندا بـە چەسـپانی دەکەون بـە ڕوودا بە سـوژدە بردن)، کـە خوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلِهِۦ مُسْلِمِينَ ﴾ واتـە: (بـە ڕاسـتی ئێمـە لـە پێـش هاتنـی قورئاندا مسـوڵمان بوویـن) ئا لەبەر ئـەم پابەند بوونەمـان خوا منەتی کرد بەسـەرماندا بـە بڕواهێنان، بۆیـە ئـەم قورئانەمـان بە ڕاسـت دانا بڕوامـان بە یەکەم کتێـبو کۆتا کتێب هێنـا، وە جگە لـە ئێمە ئـەم کتێبە بـە درۆ دەخاتـەوەو بڕوا بـە کتێبی یەکـەم دێنێ.

(٥٤): ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ﴾ ئەوانـەی بڕوایـان بـەو دوو کتێبە هێنـا ﴿ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُم مَّرَّتَيْنِ ﴾ (واتە: دووجـار پاداشـتیان پـێ دەدرێ) پاداشـتێ لـە سـەر بڕواهێنانـی یەکـەم، پاداشـتێ لەسـەر بڕواهێنانـی دووەم ﴿ بِمَا صَبَرُواْ ﴾ لەبـەر ئـەوەی خۆڕاگـر بوون لەسـەر ئیمـان، وە پابەند بـوون لەسـەر کـردەوە، هیـچ گومـانو دوو دڵیـەک نەیجوڵانـدن، وە هیـچ دەسـەڵاتو ئارەزوویـەک لـە ئیمـان لاینـەدان ﴿ وَيَدْرَءُونَ بِٱلْحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ ﴾ لـە تایبەتمەندیـە چاکەکانیـان کـە شـوێنەواری ئیمانـی ڕاسـتەقینەیە ئەوەیە ئـەوان بە چاکـە وەڵامی هەموو کەسـێکیان دەدایەوە تەنانەت ئەو کەسەیشـی خراپـەی لەگەڵا دەکردن بـە گوفتارو کردار، ئـەوان لـە بەرانبـەردا بـە گوفتاری سـتایش کـراوو گوفتـاری جـوان وەڵامیـان دەدایەوە، چونکـە دەیانزانـی بە فەزیڵـەتو چاکەی ئەم ڕەوشـتە مەزنـە، بێگومان کەس سـەرکەوتوو نابـێ بۆ ئـەم ڕەوشـتە مەگـەر کەسـێ خـاوەن بەختێکی مـەزن بێ.

(٥٥): ﴿ وَإِذَا سَمِعُواْ ٱللَّغْوَ ﴾ (واتـە: ئەگـەر قسـەی پڕوو پووچ ببیسـتن) لە کەسـێکی نەفامـەوە، لەگەڵیانـدا پێـی بـدوێ ﴿ وَقَالُواْ ﴾ (دەڵێـن) قسـەی بەندەکانـی خـوا ئەوانـەی

خـاوەن عەقـڵو ژیریـن: ﴿لَنَآ أَعۡمَٰلُنَا وَلَكُمۡ أَعۡمَٰلُكُمۡ﴾ واتـە: هەمـوو کەسـێ بـە پێـی کـردەوەی خـۆی پاداشـت دەدرێتەوە، تاوانی هیچ کەسـێکی دیکـە بۆ ئەو نابـێ، ئەمە ئەوە دەگەیەنـێ کـە بـڕواداران خۆیـان بەری دەکەن لـەوەی نەفامان لەسـەری دەڕۆن لە قسـەی پـڕو پـووچو بەتاڵ، وە ئەو قسـانەی هیـچ سـوودێکیان نیە، ﴿سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡ﴾ واتـە: هیچ لە ئێمـە نابیسـتن جگـە لە خێر، بـە پێی نەفامـی خۆتـان ناتاندوێنیـن، ئێوە ئەگەر چـی ڕازیبن بـەم ڕەفتـارە خراپـە بۆ نەفـسو دەروونتان، بێگومـان ئێمە نەفسـی خۆمان پـاک ڕادەگرین لـە قسـەی پـڕوو پـووچ، وە دەیپارێزیـن لـەوەی ڕۆ بچین تیایـدا ﴿لَا نَبۡتَغِي ٱلۡجَٰهِلِينَ﴾ (هاوڕێیەتـی نەفامەکانمـان نـاوێ) لە هیـچ ڕوویێکەوە.

(٥٦): ﴿إِنَّكَ لَا تَهۡدِي مَنۡ أَحۡبَبۡتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ٥٦﴾:

خـوا هـەواڵ دەدات تـۆ ئەی موحەممـەد ﷺ -جگە لـە تۆ لە پێشـترە- تواناو دەسـەڵاتت بە سـەر هیدایەتـی هیچ کەسـدا نیـە، ئەگەرچی خۆشەویسـترین کەس بـێ بە لاتـەوە، چونکە هیدایەتـی سـەرکەتوو کارێکـە لـە توانـای دروسـتکراودا نیـە، وە دروسـتکردنی ئیمان لە دڵدایـە، ئـەوە تەنها بە دەسـتی خوایـە ﷻ، هەر کەسـی بـوێ هیدایەتی دەدات، ئـەو چاکتر دەزانـێ کـێ شایسـتەی هیدایەتـە هیدایەتـی دەدات، لـەوەی کـە شایسـتەی هیدایـەت نیە لەسـەر گومڕایـی دەیهێڵێتەوە.

بەڵام چەسپاندنی هیدایەت بۆ پێغەمبەر ﷺ لەو فەرمایشتەی خوایە ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّكَ لَتَهۡدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ٥٢﴾الشوری. (واتە: بە ڕاستی تۆ خەڵک ڕێنمایی دەکەی بۆ ڕێگای ڕاست) ئەوە هیدایەتی ڕوونکردنەوەو ڕێنیشاندانە، جا پێغەمبەر ﷺ ڕێگای ڕاست ڕوون دەکاتەوەو خەڵکی بۆ هاندەدات، وە هەموو تواناکانی خۆی بەکاردەهێنێ بۆئەوەی خەڵکی ئەو ڕێگایە بگرنەبەر، بەڵام بوونی ئەو کە لە دڵیاندا ئیمان بڕوێنێو ئیمان دروست بکاتو سەرکەوتوویان بکات بۆ کاری چاکە حاشا شتی وانابێ.

جـا ئەگـەر پێغەمبـەر ﷺ توانـای هەبوایـە بەسـەریدا هیدایەتـی ئـەو مامـی (أبـو طالب)ی دەدا کـە چاکـەی لەگـەڵا کـردو سەریخسـتو ڕێگری لە گەلەکـەی کرد لەوەی سـتەمی لێنەکـەن، بـەڵام چاکـەی پێگەیانـد بـە بانگەواز بـۆ ئایـنو ئامۆژگـاری تەواو، کـە لەوە مەزنتـر بـوو مامـی لەگەڵیـدا کـردی، بـەڵام هیدایەت بـە دەسـتی خوایە.

(٥٧-٥٩): ﴿وَقَالُوٓاْ إِن نَّتَّبِعِ ٱلۡهُدَىٰ مَعَكَ نُتَخَطَّفۡ مِنۡ أَرۡضِنَآۚ أَوَلَمۡ نُمَكِّن لَّهُمۡ حَرَمًا ءَامِنٗا يُجۡبَىٰٓ إِلَيۡهِ ثَمَرَٰتُ كُلِّ شَيۡءٖ رِّزۡقٗا مِّن لَّدُنَّا وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ٥٧ وَكَمۡ أَهۡلَكۡنَا

مِن قَرْيَةِۭ بَطِرَتْ مَعِيشَتَهَا ۖ فَتِلْكَ مَسَٰكِنُهُمْ لَمْ تُسْكَن مِّنۢ بَعْدِهِمْ إِلَّا قَلِيلًا ۖ وَكُنَّا نَحْنُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴿٥٨﴾ وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ حَتَّىٰ يَبْعَثَ فِىٓ أُمِّهَا رَسُولًا يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَا ۚ وَمَا كُنَّا مُهْلِكِى ٱلْقُرَىٰٓ إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَٰلِمُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾

خــوا هــەواڵ دەدات بەدرۆدانەرانــی قورەیش‌و خەڵکــی مەککە بە پێغەمبەریــان دەوت: ﴿ إِن نَّتَّبِعِ ٱلْهُدَىٰ مَعَكَ نُتَخَطَّفْ مِنْ أَرْضِنَآ ﴾ (واتــە: ئەگــەر ئێمــە شــوێنی ڕێنمایی تــۆ بکەوین دەفرێنرێیــن لــە خــاک‌و وڵاتەکەمانــدا) بــە کوشــتن‌و بەدیــل گرتــن‌و تاڵانکردنــی ماڵ‌و ســامانمان، چونکــە بەڕاســتی خەڵکی دژایەتــی تۆ دەکــەن‌و پێچەوانەت دەجوڵێنــەوە، ئەگەر ئێمــە شــوێنت بکەویــن ئــەوە ڕوو بــەڕووی دژایەتــی هەمــوو خەڵکــی دەبینــەوە، ئێمەش توانای هەمــوو خەڵکیمــان نیە.

ئــەم قســەیان بەڵگەیــە لەســەر گومانــی خراپیــان بەرانبــەر بــە خــوا، کــە ئــەو ئاینەکــەی ســەرناخات‌و وشــەی خــۆی بەرز ناکاتــەوە، بەڵکو دەســەڵات دەدا بە خەڵکی زاڵ بن بەســەر شــوێنکەوتووانی ئاینەکــەی‌و بە ناشــرینترین شــێوە ســزایان بــدەن، گومانیان وابــوو بەتاڵ‌و پــووچ زاڵ دەبێ بەســەر حەق‌و ڕاســتیدا.

خــوا ﷻ حاڵــی ئــەوان ڕوون دەکاتــەوە بــە پێچەوانــەی هەمــوو خەڵکــی، وە خــوا تایبەتی کــردوون بــە ئاســایش فەرموویەتــی: ﴿ أَوَلَمْ نُمَكِّن لَّهُمْ حَرَمًا ءَامِنًا يُجْبَىٰٓ إِلَيْهِ ثَمَرَٰتُ كُلِّ شَىْءٍ رِّزْقًا مِّن لَّدُنَّا ﴾ واتــە: ئایــا ئێمــە ئەوانمــان جێگیــر نەکــردوە لە حەرەمــی مەککەدا کــە خەڵکــی زۆر پێویســتی پێیانــەو گەشــتیارێکی زۆر ڕوویــان تێــدەکات، دوورو نزیک ڕێــزی لێدەگــرێ، خەڵکەکــەی سەرزەنشــت ناکــرێ، لێــی کەم ناکەنــەوە نە بــە زۆر نە بە کەم.

لــە کاتێکــدا هەمــوو دەوروبــەری ئــەوان لــە شــوێن‌و جێگــاکان مەترســی باڵی کێشــاوە بەســەریاندا لــە هەمــوو ڕوویەکــەوە، وە خەڵکەکــەی لــە ئاســایش‌و ئارامیــدا نیــن، دەی با ستایشــی خــوا بکــەن لەســەر ئەو ئاسایشــە تــەواوە کە خەڵکــی جگە لە ئــەوان بەو شــێوەیە نیــن، وە لەســەر ئــەو ڕزق‌و ڕۆزیــە زۆرەی لە هەمــوو جێگایەکەوە بۆیان دێ لــە میوەهات‌و خــواردن‌و شــمەکەکان، کە بــەو نــازو نیعمەتانە خۆیــان دەرازێننــەوەو بەرفــراوان دەبن.

وە بــا شــوێنی ئــەم پێغەمبــەرە بەخشــندەیە بکەون بۆ ئەوەی ئاســایش‌و خۆشــیان بــۆ تەواو بــکات، دەخیلــە بــە درۆی نەخەنــەوەو لووت بــەرزی نەکــەن بەرانبــەر نیعمەتەکانــی خوا، ئــەو ئاســایش‌و ئارامیــەی هەیانە بێگــۆڕن بە تــرس، وە بە زەلیلــی دوای ســەربەرزی، وە بە

هـەژاری دوای دەوڵەمەنـدی، لەبەرئەمەیە هەڕەشـەی لێکردوون بەوەی بەسـەر ئۆممەتەکانی پێشـینی هێنا، جـا فەرموویەتی:

(٥٨): ﴿ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍۭ بَطِرَتْ مَعِيشَتَهَا ﴾ (واتـە: خەڵکـی زۆر شـارمان لەناوبـرد لە بەر خۆشـگوزەرانی‌و یاخیبوونیان) سـەرقاڵ بـوون پێیەوەو وازیان لـە برواهێنان بـە پێغەمبـەران هێنـا، خـواش لە نـاوی بـردن‌و نـازو نیعمەتەکـەی لێوەرگرتنەوە، و سـزاو تۆڵـەی لەسـەریان حـەڵاڵ کـرد ﴿ فَتِلْكَ مَسَٰكِنُهُمْ لَمْ تُسْكَن مِّنۢ بَعْدِهِمْ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ (واتە: جـا ئـەوە جێ‌و شـوێنەکانیانە لـە پاش تیاچوونـی ئەوان بـۆ ماوەیەکی کەم نەبێ کەسـی تیا نیشـتەجێ نەبـووە) لەبـەر یەک بـە دوای یەکـدا هاتنی لەناوچـوون‌و نەمانیان، وە مەترسـی خەڵکـی دوای خۆیـان لـە شـوێن‌و جێگاکانیـان ﴿ وَكُنَّا نَحْنُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴾ (وە ئێمـە بووینـە میراتگـر) بـۆ بەنـدەکان، دەیانمرێنین پاشـان هەمـوو ئەو نـازو نیعمەتانـەی پێمان بەخشـیبوون دەگەڕێتـەوە بـۆ لای خۆمان، پاشـان دووبـارە دەیانگەڕێنینەوە بـۆ لای خۆمان پاداشـتیان دەدەینـەوە بـە پێـی کردەوەکانیـان. لە حیکمـەت‌و بەزەیـی خوا ئەوەیە سـزای هیـچ گەلێـک نـادات بـە هـۆی بێبڕواییانـەوە پێش پێویسـت کردنـی بەڵگـەو حوججە لە سـەریان بـە ناردنی پێغەمبـەران بۆ لایـان، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتی:

(٥٩): ﴿ وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ ﴾ واتـە: (پەروەردگـارت وێرانکـەری هیـچ شـارێک نەبـووە) بـە هـۆی کوفـرو سـتەمیانەوە ﴿ حَتَّىٰ يَبْعَثَ فِىٓ أُمِّهَا ﴾ واتـە: (هەتـا لـەو شـارە گـەورەی کـە بـۆی دەگەڕێنـەوە) وە هەمـوو ئەوانـەی لـەو لادێیانـە دەژیـن سـەردانی دەکـەن، هەواڵـی ڕوون‌و ئاشـکرایە لە کەس شـاراوە نیـە، ﴿ رَسُولًا يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَا ﴾ (پێغەمبەرێـک ئایەتەکانـی ئێمەیان بەسـەردا بخوێنێتەوە) کە بەڵگەن لەسـەر ڕاسـتی ئەوەی هێناویەتـی‌و بانگەشـەی بـۆ دەکات، بانگەوازەکـەی بگـات بـە نزیـک‌و دووریـان، بـە پێچەوانـەی ناردنـی پێغەمبەری بـۆ لادێ دوورە دەسـتەکان، بێگومان ئـەوە جێگای گومانی دەرنەکەوتن‌و فەرامۆشـکردنە، بەڵام شـارە گـەورەکان جێگای دەرکەوتـن‌و بڵاوبوونەوەیە، بێگومـان هـەواڵ لە شـارەکان کەمتـر فەرامـۆش دەکرێ.

﴿ وَمَا كُنَّا مُهْلِكِى ٱلْقُرَىٰٓ إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَٰلِمُونَ ﴾ (وە ئێمـە وێرانکـەری هیـچ شـارێک نەبوویـن مەگـەر کاتـێ خەڵکەکـەی سـتەمکار بـوو بن) بـە کوفرو سـەرپێچی کـردن، شایسـتەی تۆڵـەو سـزا بـن، بـە پووختـی خوا سـزای هیـچ کەسـێ نادا مەگـەر بە هـۆی سـتەمکردنی‌و پێویسـت بوونـی بەڵگـەو حوججە لەسـەری.

وَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَىْءٍ فَمَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتُهَا ۚ وَمَا عِندَ
ٱللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٠﴾ أَفَمَن وَعَدْنَٰهُ وَعْدًا حَسَنًا
فَهُوَ لَٰقِيهِ كَمَن مَّتَّعْنَٰهُ مَتَٰعَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ثُمَّ هُوَ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ
مِنَ ٱلْمُحْضَرِينَ ﴿٦١﴾ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِىَ
ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٦٢﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ حَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْقَوْلُ رَبَّنَا
هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَغْوَيْنَآ أَغْوَيْنَٰهُمْ كَمَا غَوَيْنَا ۖ تَبَرَّأْنَآ إِلَيْكَ ۖ
مَا كَانُوٓا۟ إِيَّانَا يَعْبُدُونَ ﴿٦٣﴾ وَقِيلَ ٱدْعُوا۟ شُرَكَآءَكُمْ فَدَعَوْهُمْ
فَلَمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَهُمْ وَرَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ۚ لَوْ أَنَّهُمْ كَانُوا۟ يَهْتَدُونَ
﴿٦٤﴾ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ مَاذَآ أَجَبْتُمُ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٦٥﴾
فَعَمِيَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْأَنۢبَآءُ يَوْمَئِذٍ فَهُمْ لَا يَتَسَآءَلُونَ ﴿٦٦﴾ فَأَمَّا
مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَعَسَىٰٓ أَن يَكُونَ مِنَ ٱلْمُفْلِحِينَ
﴿٦٧﴾ وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ وَيَخْتَارُ ۗ مَا كَانَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ ۚ سُبْحَٰنَ
ٱللَّهِ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٨﴾ وَرَبُّكَ يَعْلَمُ مَا تُكِنُّ
صُدُورُهُمْ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٦٩﴾ وَهُوَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ لَهُ
ٱلْحَمْدُ فِى ٱلْأُولَىٰ وَٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَلَهُ ٱلْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٧٠﴾

(٦٠-٦١): ﴿وَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَىْءٍ فَمَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتُهَا ۚ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٠﴾ أَفَمَن وَعَدْنَٰهُ وَعْدًا حَسَنًا فَهُوَ لَٰقِيهِ كَمَن مَّتَّعْنَٰهُ مَتَٰعَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ثُمَّ هُوَ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ مِنَ ٱلْمُحْضَرِينَ ﴿٦١﴾﴾:

﴿وَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَىْءٍ فَمَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتُهَا﴾ ئەمــە هاندانێکــە لــە لایەنــی خــواوە بــۆ بەندەکانــی لەســەر زوهدکــردنو خــۆ بەکــەم دانــان لــە دونیــادا، وە لەخۆبایــی نەبــوون پێــی، وە لەســەر حەزکــردن بــۆ دوارۆژ، وە بیــکات بــە مەبەســتو ئامانجــی خــۆی، وە هەوڵیــان پێبــدات هەمــوو ئەوانــەی پێیــان دراوە لــە زێــروو زیــوو گیانــدارەکانو کــەڵو پــەڵو ئافــرەتو منــداڵو خــواردنو خواردنــەوەکان هەموویــان خۆشــیو ڕازاندنــەوەی ژیانــی دونیــان، واتــە: بــۆ ماوەیەکــی کــەم چێــژی لێوەردەگــرن، ئــەو مــاوە کەمــەش پــڕە لــە نارەحەتــیو ناخۆشــیو دڵــە ڕاوکــێ، وە ســەردەمێکی کــەم خــۆی پــێ دەڕازێنێتــەوە بــە شــانازیو ڕیایــی کــردن، پاشــان بــە پەلــە نامێنــێو هەمــووی دەڕوا، خاوەنەکــەی هیــچ ســوودێکی بــۆ نامێنــێ تەنهــا حەســرەتو پەشــیمانیو بێبــەش بــوون نەبــێ.

﴿وَمَا عِندَ ٱللَّهِ﴾ (ئــەوەی لــە لای خوایــە) لــە نــازو نیعمەتــی جێگیــرو ژیانــی ســەلامەت، ﴿خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ﴾ واتــە: چاکتــرە لــە وەســفو چۆنێتــی، ئــەو نــازو نیعمەتــە بەردەوامــە بــۆ هەمیشــەیی ﴿أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾ واتــە: ئایــا ئێــوە عەقڵتــان نیــە کاروبارەکانــی پــێ بپێــون، وە کام لــەم دوو دونیایــە شایســتەی ئەوەیــە کاری بــۆ بکــەی، ئــەوەش بــە پێــی عەقڵــی بەندەکەیــە چاکــەی دوارۆژ بــدا بەســەر دونیــادا، هیــچ کــەس دونیــا بــە چاکتــر نازانــێ لــە دوارۆژ مەگــەر ناتەواویەــک لــە عەقڵیــدا هەبــێ، ئــا لەبــەر ئەمەیــە عەقڵەکانــی بێــدار کردۆتــەوە لەســەر پێوانەکــردن لــە نێــوان ســەرەنجامی هەڵبژاردنــی

دونیــاو هەڵبژاردنــی دوارۆژ، جــا فەرموویەتــی:
(٦١): ﴿ أَفَمَن وَعَدْنَٰهُ وَعْدًا حَسَنًا فَهُوَ لَٰقِيهِ ﴾ واتــە: ئایــا یەکســانە بــڕواداری کۆشــش بــکا بــۆ دوارۆژ، وە کــردەوەی چــاک ئەنجــام بــدات لەســەر پەیمانــی پەروەردگــاری بــە پاداشــتی چــاک، کــە ئەویــش بەهەشــتەو ئــەوەی لــە ناویدایــە لــە نازونیعمەتــەکان، ئــەوە بــە بێگومــانو بــە دڵنیاییــەوە پێــی دەگــات، چونکــە پەیمانێکــە لــە لایــەن خــوای بەخشــندەی خــاوەن پەیمانەوەیــە کــە هەرگیــز پەیمانــی خــۆی ناشــکێنێ، وە بــۆ بەندەیــەک ڕەزامەنــدی خــوای بەدەســت هێنابــێو دوور کەوتبێتــەوە لــە تووڕەیــیو خەشــمو قینــی ﴿ كَمَن مَّتَّعْنَٰهُ مَتَٰعَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾ واتــە: (وەکــو کەســێک وایــە خۆشــیو ڕابواردنمــان پێــداوە بەخۆشــیو لەزەتــی ژیانــی دنیــا) بــۆ خــۆی لــەو دنیایــەدا وەربگــرێو ببەخشــێو بخــواو بخواتــەوە، وە چێــژوو لــەزەت وەربگــرێ وەکــو ئــاژەڵ، ئەوەنــدە ســەرقاڵ بووبــێ بــە دنیــاوە بیــری لای دوارۆژی نەمابــێ، وە هەرگیــز ســەری بــۆ هیدایەتــی خــوا بــەرز نەکردبــێو ملکــەچ نەبــوو بــێ بــۆ پێغەمبــەران، ئــەو بــەردەوام بــەو شــێوەیە بــێ ئــەوە لــە دونیــادا هیــچ پاشــەکەوت نــاکات جگــە لــە خەســارەتو لەناوچــوون نەبــێ.
﴿ ثُمَّ هُوَ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ مِنَ ٱلْمُحْضَرِينَ ﴾ (واتــە: پاشــان لــە ڕۆژی دواییــدا لــە ئامادەکــراوان دەبــێ) بــۆ لێپرســینەوە، ئــەو چــاک دەزانــێ کــە هیــچ خێرێکــی بــۆ خــۆی پێــش نەخســتووە، بەڵکــو هەمــوو ئــەوەی زیانــی پێدەگەیەنــێ پێشــی خســتووە، پاشــان گوازراوەتــەوە بــۆ ئــەو شــوێنەی پاداشــتی کردەوەکانــی پێــدەدرێ، دەی گومانتــان چــی دەبــێ بــە داهاتــووی ئــەو کەســە؟ وە چــۆن پرســیاری لێدەکــرێو چــی بەســەر دێ؟ دەی بــا کەســی عاقــڵ کامــەی شایســتەیە هەڵیبژێــرێو کامــەی حــەقو ڕاســتە گرنگــی پێبــدات.
(٦٢-٦٦): ﴿ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِيَ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٦٢﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ حَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْقَوْلُ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَغْوَيْنَآ أَغْوَيْنَٰهُمْ كَمَا غَوَيْنَا تَبَرَّأْنَآ إِلَيْكَ مَا كَانُوٓا۟ إِيَّانَا يَعْبُدُونَ ﴿٦٣﴾ وَقِيلَ ٱدْعُوا۟ شُرَكَآءَكُمْ فَدَعَوْهُمْ فَلَمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَهُمْ وَرَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ لَوْ أَنَّهُمْ كَانُوا۟ يَهْتَدُونَ ﴿٦٤﴾ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ مَاذَآ أَجَبْتُمُ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٦٥﴾ فَعَمِيَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْأَنۢبَآءُ يَوْمَئِذٍ فَهُمْ لَا يَتَسَآءَلُونَ ﴿٦٦﴾ ﴾:
ئەمــە هەواڵێکــە لــە لایــەن خــواوە ﷻ لــەوەی پرســیار لــە بەدیهێنــراوەکان دەکات لــە ڕۆژی دواییــدا، بێگومــان پرســیاریان لێــدەکات دەربــارەی بنەڕەتــی شــتەکان، وە لــە

بەندایەتـی کردنـی خـواو وەڵامدانـەوەی پێغەمبەرانـی ﴿ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ ﴾ واتـە: (باسـی ئـەو ڕۆژە بکـە) خـوا بانگـی ئـەو کەسـانە دەکات کـە هاوەڵیـان بـۆ دانـاوە، وە لـە بـری ئـەو دەیانپەرسـتن، وە ئومێـدی ئـەوە دەکـەن سـوودیان پـێ بگەیەنـێو زیانیـان لـێ دوور بخەنـەوە، خـوا بانگیـان دەکات بـۆ ئـەوەی بێتوانایـیو گومڕاییـان دەربخـات ﴿ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِيَ ﴾ (واتـە: پێیـان دەڵـێ لـە کوێـن هاوبەشـەکانی مـن) خـوا هیـچ شـەریکی نیـە، بـەڵام ئـەو بـە پێـی بۆچـوونو درۆهەڵبەسـتانی ئـەوان بـووە، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴾ (واتـە: کـە بـە خەیاڵـی خۆتـان بـە هاوبەشـی منتـان دەزانـی) ئـەوان لـە کوێـن، بـە خـودی خۆیـان، کامەیـە سـوودیان؟ کامەیـە بەرگریـان؟

ئـەوەی زانـراوە بۆیـان ڕوون دەبێتـەوە لـەو حاڵەتـەدا، ئـەوەی پەرسـتوویانەو ئومێدیـان پێـی هەبـووە بەتـاڵو پـەرشو بـڵاوە لـە زاتـی خۆیـدا، ئەوانەشـی ئومێدیـان پێـی هەبـووە، دان بەسـەر نەفسـی خۆیـان دەنێـن بـە گومڕایـیو ڕیسـوایی، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی:

(٦٣): ﴿ قَالَ ٱلَّذِينَ حَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْقَوْلُ ﴾ (واتـە: ئەوانـەی بڕیاری سـزادان بەسـەریاندا چەسـپا) دەسـەڵاتدارو گـەورە پیاوانـی کوفـرو خراپـەکار، داندەنێـن بـە گومڕایـی خۆیـانو گومڕاکردنـی خەڵکـیو دەڵێـن: ﴿ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ ﴾ (پەروەردگارمـان) شـوێنکەوتووەکانمان ﴿ ٱلَّذِينَ أَغْوَيْنَآ أَغْوَيْنَٰهُمْ كَمَا غَوَيْنَا ﴾ (واتـە: ئەوانـەن کـە ئێمـە گومڕامـان کـردن، هـەر وەکـو خۆمـان گومـڕا بوویـن) هەموومـان بەشـدار بوویـن لـە گومڕایـی، وە وشـەی سـزا لەسـەری پێویسـت بـوو.

﴿ تَبَرَّأْنَآ إِلَيْكَ ﴾ (واتـە: خۆمـان بـەری کـرد لێیـان) ئـەوان ئێمەیـان نەپەرسـت بـوو، ئێمـە بەریـن لـە خۆیـانو کردەوەکانیـان، ﴿ مَا كَانُوٓاْ إِيَّانَا يَعْبُدُونَ ﴾ (واتـە: ئەوانـە ئێمەیـان نەدەپەرسـت) بەڵکـو عیبادەتـی شـەیتانەکانیان دەکـرد.

(٦٤): ﴿ وَقِيلَ ﴾ پێیـان دەوتـرێ: ﴿ ٱدْعُواْ شُرَكَآءَكُمْ ﴾ (واتـە: هـاوار بکـەن لـەو بتانـە) لەسـەر ئـەو ئومێـدەی پێتـان هەڵچنیـوون لـە سـوود وەرگرتـن، لەوکاتـە ناخۆشـەدا فەرمانیـان پێدەکـەن هاواریـان لێبکـەن، کـە بەنـدە زۆر پێویسـتی بـەوە هەیـە پەرسـتوویەتی ﴿ فَدَعَوْهُمْ ﴾ (هاواریـان لێدەکـەن) بـۆ ئـەوەی سـوودیان پێبگەیەنـن، یـان شـتێک لـە سـزای خوایـان لەسـەر لابـدەن ﴿ فَلَمْ يَسْتَجِيبُواْ لَهُمْ ﴾ (واتـە: بـەڵام

وەڵامیــان نادەنــەوە) ئەوســا ئەوانــەی بێبــڕوان دەزانــن درۆزنــنو شایســتەی ســزان ﴿وَرَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ﴾ (واتــە: لــەو کاتــەدا ســزای دۆزەخ) بــە چــاوی خۆیــان دەبینــن، دوای ئــەوەی بــە درۆیــان دەزانــیو نکوڵیــان دەکــرد.

﴿لَوْ أَنَّهُمْ كَانُوا۟ يَهْتَدُونَ﴾ واتــە: (ئــاوات دەخــوازن خۆزگــە ڕێگــای ڕاســتیان بگرتایەتــە بــەر) کاتــێ ئــەوەی دروســت بــوو کــە دروســت بــوو، وە هیدایــەت دران بــۆ ڕێگــای بەهەشــت لــە دونیــادا، بــەڵام ئــەوان هیدایەتیــان وەرنەگــرت، هــەر بۆیــە هیدایــەت نــەدران.

(٦٥): ﴿وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ مَاذَآ أَجَبْتُمُ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾ (واتــە: وە ڕۆژێ کــە خــوا بانگیــان دەکاتو پێیــان دەفەرمــوێ چــۆن وەڵامــی پێغەمبەرانتــان دایــەوە) ئایــا بەڕاســتان زانیــنو شــوێنیان کەوتــن یــان بەدرۆتــان دانــانو پێچەوانــەی جوڵانــەوە؟

(٦٦): ﴿فَعَمِيَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْأَنۢبَآءُ يَوْمَئِذٍ فَهُمْ لَا يَتَسَآءَلُونَ﴾ واتــە: خۆیــان ئامــادە نەکــردوە بــۆ وەڵامــی ئــەم پرســیارە، وە ڕێنمایــی ناکرێــن بــۆ ڕێگــەی ڕاســت. ئــەوەی زانــراوە لــەو شــوێنەدا کــەس ڕزگــاری نابــێ مەگــەر وەڵامدانــەوە بــە ڕاســتو ڕوون نەبــێ، پڕاوپــڕ بــێ لەگــەڵ بارودۆخیــان، لــەوەی بڵێــن ئێمــە وەڵاممــان دایــەوە بــە بــڕوا هێنــانو ملکــەچ بــوون، بــەڵام کاتــێ زانیــان بەدرۆیــان دانــاوەو نکوولــێ فەرمانەکانیــان کــردوە، هیــچ قســە ناکــەن، وە ناکــرێ لــە نــاو یەکتریشــدا پرســیار لــە یەکتــر بکــەن، کــە چــۆن وەڵام بدەنــەوە، ئەگەرچــی درۆش بــێ.

(٦٧): ﴿فَأَمَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَعَسَىٰٓ أَن يَكُونَ مِنَ ٱلْمُفْلِحِينَ ﴿٦٧﴾﴾

﴿فَأَمَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا﴾ کاتــێ خــوا ﷻ باســی پرســیاری خەڵکــی کــرد دەربــارەی پەرســتراوەکانیانو پێغەمبەرەکانیــان، باســی ئــەو ڕێگایــەی کــرد کــە بەنــدە پێــی ڕزگــار دەبــێ لــە ســزای خــوا، بێگومــان ڕزگــار بــوون نیــە لــە ســزای دۆزەخ مەگــەر کەســێ وەســف کرابــێ بــە تەوبــە لــە هاوبەشــدانانو ســەرپێچی، بــڕوای بەخــوا هێنابــێو پەرســتبێتی، وە بــڕوای بــە پێغەمبەرەکانــی هێنابــێو بەڕاســتی دانابــن، وە کــردەوەی چاکــی ئەنجامدابــێ بەپێــی شــوێنکەوتنی پێغەمبــەران ﴿فَعَسَىٰٓ أَن يَكُونَ﴾ هــەر کەســێ ئــەم ســیفاتانە لــە خۆیــدا کۆبکاتــەوە ﴿مِنَ ٱلْمُفْلِحِينَ﴾ لــە ڕزگــار بووانــە بــەوەی داواکــراوە، ســەرفرازە لــە تــرس، هیــچ ڕێگایــەک نیــە بــۆ ســەرکەوتن بەبــێ ئــەم کاروبارانــە.

(٦٨-٧٠): ﴿وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ وَيَخْتَارُ مَا كَانَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ سُبْحَـٰنَ ٱللَّهِ وَتَعَـٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٨﴾ وَرَبُّكَ يَعْلَمُ مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمْ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٦٩﴾ وَهُوَ ٱللَّهُ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ لَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلْأُولَىٰ وَٱلْـَٔاخِرَةِ وَلَهُ ٱلْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٧٠﴾﴾:

ئـەم دەقانـە، گشـت دروسـتکراوەکانی خـوای تێدایـە، وە جێبەجێکردنـی ویسـتی لـە هەمـوو ئەوانـەی لەسـەر زەویـدان، وە تـاکو تەنهایـی خـوا بـە هەڵبژاردنـی ئـەوەی هەڵیدەبژێـرێو تایبەتـی دەکات، لـە کەسـەکانو فەرمانـەکانو کاتـەکانو شـوێنەکان، هیـچ کەسـێ هەڵبژاردنـی بـۆ نیـە لـە کاری خـوادا.

خـوا ﷻ پـاکو بێگـەردە لـە هەمـوو ئەوانـەی دەیکەنـە هاوبەشـی، لـە هاوبەشـدانانو پشـتیوانو منـداڵو خیـزانو وێنـەی ئەوانـە، لـەوەی هاوبەشـدانەران هاوبەشـیان بـۆ دانـا، خـوا زانایـە بـەوەی لـە سـنگیان دایـەو بـەوەی ئاشـکرای دەکـەن.

هەمـوو سـوپاس بـۆ ئەو خـوا تـاکو پەرسـتراوی سـتایش کـراوە لـە دونیـاو دوارۆژدا، لەسـەر ئـەو سـیفەتە گـەورەو جوانانـە، لەسـەر ئـەو هەمـوو بەخشـینو چاکـەی داویەتی بـە دروسـتکراوەکان، بڕیـارو حوکـم هـەر بـۆ خوایـە لـە هـەردوو دونیـادا، لـە دونیـا بـە حوکمـی قـەدەری، کـە شـوێنەوارەکەی هەمـوو ئەوانەیـە کـە بەدیهێنـاوەو زۆری کـردوە، وە حوکمـی ئاینـی شـوێنەوارەکەی هەمـوو شـەریعەتەکانو فەرمانـەکانو قەدەغـە کراوەکانـە.

لـە ڕۆژی دواییـدا بڕیـار دەدات بـە حوکمـی قـەدەریو پاداشـتی، بۆیـە فەرموویەتـی: ﴿وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ (واتـە: بـۆ لای ئـەو دەگەڕێنـەوە) پاداشـتی هـەر یەکێکتـان دەداتـەوە بـە پێـی کردەوەکـەی، لـە خێـرو شـەڕ.

قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلَّيْلَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ
ٱلْقِيَٰمَةِ مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِضِيَآءٍ أَفَلَا تَسْمَعُونَ
﴿٧١﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلنَّهَارَ سَرْمَدًا إِلَىٰ
يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِلَيْلٍ تَسْكُنُونَ
فِيهِ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٧٢﴾ وَمِن رَّحْمَتِهِۦ جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ
وَٱلنَّهَارَ لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ
تَشْكُرُونَ ﴿٧٣﴾ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ
كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٧٤﴾ وَنَزَعْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا فَقُلْنَا
هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ فَعَلِمُوٓا۟ أَنَّ ٱلْحَقَّ لِلَّهِ وَضَلَّ عَنْهُم
مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٧٥﴾ ۞ إِنَّ قَٰرُونَ كَانَ مِن قَوْمِ مُوسَىٰ
فَبَغَىٰ عَلَيْهِمْ وَءَاتَيْنَٰهُ مِنَ ٱلْكُنُوزِ مَآ إِنَّ مَفَاتِحَهُۥ لَتَنُوٓأُ
بِٱلْعُصْبَةِ أُو۟لِى ٱلْقُوَّةِ إِذْ قَالَ لَهُۥ قَوْمُهُۥ لَا تَفْرَحْ إِنَّ ٱللَّهَ
لَا يُحِبُّ ٱلْفَرِحِينَ ﴿٧٦﴾ وَٱبْتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ
وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَا وَأَحْسِن كَمَآ أَحْسَنَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ
وَلَا تَبْغِ ٱلْفَسَادَ فِى ٱلْأَرْضِ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٧٧﴾

(٧١-٧٣): ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلَّيْلَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِضِيَآءٍ أَفَلَا تَسْمَعُونَ ﴿٧١﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلنَّهَارَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِلَيْلٍ تَسْكُنُونَ فِيهِ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٧٢﴾ وَمِن رَّحْمَتِهِۦ جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٧٣﴾ ﴾:

﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ ﴾ ئەمە منەتێكە لە لایەن خواوە بۆ بەندەكانی بانگیان دەكات بۆ سوپاسو ستایش كردنی، وە هەستان بە بەندایەتیو بە جێهێنانی مافەكانی، ئەو خوایە لە میهرەبانی خۆی ڕۆژی بۆ داناون بۆ ئەوەی بە دوای فەزڵی خوادا بگەڕێن، وە بڵاوببنەوە بۆ بەدەستهێنانی ڕزقو ڕۆزیان لە ڕووناكیدا، وە شەویشی بۆ داناون بۆ ئەوەی بحەوێنەوەو پشوو بدەنو جەستەو دەروونیان لە ماندوو بوونی ڕۆژ ئارام ببێتەوە، ئەمە لە فەزڵو ڕەحمەتی خوایە بە بەندەكانی، ئایا كەسێك هەیە توانای بەسەر شتێكی ئاوادا هەبێ؟ جا ئەگەر ﴿ جَعَلَ عَلَيْكُمُ ٱلَّيْلَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِضِيَآءٍ أَفَلَا تَسْمَعُونَ ﴾ (واتە: خوا شەوتان بۆ درێژ بكاتەوە تا ڕۆژی قیامەت چ پەرستراوێكی تر جگە لە خوا ڕووناكی ڕۆژتان بۆ دێنێ دەی ئایا ئێوە نابیستن) ئامۆژگاریەكانی خواو ئایەتەكانی بە بیستنی تێگەیشتنو ملكەچ بوون.

وە ئەگەر ﴿ جَعَلَ عَلَيْكُمُ ٱلنَّهَارَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِلَيْلٍ تَسْكُنُونَ فِيهِ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴾ (واتە: خوا ڕۆژ بكاتە هەمیشەیی بۆتان تا ڕۆژی دوایی، چ پەرستراوێكی تر جگە لەخوا، شەوتان بۆ دێنێ ئارامی تیا بگرن، دەی ئایا ئێوە نابینن) شوێنو جێگای پەندە، وە جێگای ئایەتەكان بۆ ئەوەی بەرچاوو ڕووناك بنو ڕێگای ڕاست بگرنە بەر.

وە دەربـارەی شـەو دەفەرمـوێ: ﴿أَفَلَا تَسْمَعُونَ﴾ دەربـارەی ڕۆژیـش: ﴿أَفَلَا تُبْصِرُونَ﴾ چونکـە هێـزی بیسـتن لـە شـەودا بەهێزتـرە لـە بینیـن، وە لـە ڕۆژدا بـە پێچەوانـەوە.

لـەم دەقانـەدا ئاگادارکردنەوەیەک هەیە، پێویسـتە لەسـەر بەندە بیر بکاتەوە لـە نیعمەتەکانی خـواو تیایـدا ڕابمێنـێ، وە بیپێـوێ لەگەڵ کاتـی نەبوونیدا، ئەگـەر پێوای لە نێـوان بوونیو نەبوونـی، بـە عەقڵی جێگـای منەتی خـوای بۆ دەردەکـەوێ، بـە پێچەوانەی ئـەوەی لەگەڵ ڕووداوەکان دەڕوا، وا دەزانـی ئـەم نیعمەتـە هەمیشـە بەردەوامـە، دڵی کوێر بووە لە ئاسـتی سـتایش کردنـی خوا بـە نـازو نیعمەتەکانی، وە خـۆ بە کەمو هەژار نیشـان دابـێ لە هەموو کاتێـک، ئـەم کەسـە نایخاتە بیـری خۆی نە بەسـتایش کـردن، نە بـە یادکردنەوە.

(٧٤-٧٥): ﴿وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِيَ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٧٤﴾ وَنَزَعْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا فَقُلْنَا هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ فَعَلِمُوٓا۟ أَنَّ ٱلْحَقَّ لِلَّهِ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٧٥﴾﴾:

وە ڕۆژێکـدا خوا ﷻ بانگی هاوبەشـدانەران دەکات، ئەوانەی هاوبەشـیان بـۆ داناوە، ئەوانەی پێیـان وایـە خـوا هاوبەشـانێکی هـەن، شایسـتەی ئـەوەن بپەرسـترێن، سـوود دەگەیەننو زیانیـش لادەبـەن، جـا لـە ڕۆژی دواییدا خـوا جورئەتو بوێـریو درۆیان ئاشـکرا دەکات ﴿يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِيَ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ﴾ واتـە: (بانگیـان دەکاتو پێیـان دەفەرمـوێ: لـە کوێـن هاوبەشـەکانی مـن ئەوانـەی کـە ئێـوە بـە هاوبەشـی منتان دادەنان).

بـە بۆچوونـی ئـەوان بـە خـودی کارەکـە، وەک فەرموویەتـی: ﴿وَمَا يَتَّبِعُ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُرَكَآءَ ۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴿٦٦﴾﴾یونـس، (واتـە: پەیڕەویـان نەکردوە ئەوانـەی بێجگە لە خوا دەپەرسـتن پەرسـتراوانێ، ئەوانـە تەنها شـوێن گومان کەوتـوون، وە ئەوانـە تەنها درۆ دەکـەن). کاتێ هەموویـان ئامـادە دەبن خـوا دەهێنێـت ﴿مِن كُلِّ أُمَّةٍ﴾ لـە ئۆممەتە بـە درۆدانەرەکان ﴿شَهِيدًا﴾ (شـایەتێک) شـایەتی دەدات لەوەی ڕووی داوە لە دونیادا، لە هاوبەشدانانیانو بیـرو بڕوایـان، ئەوانـە بە پلـەی هەڵبژێـردراون.

واتـە: هەڵمـان بـژاردوە لـە گـەورەی بـەدرۆ دانـەران، کەسـانێک بەرگریـان لـێ بکەن، وە مشـتومڕ بکـەن لـە بـری براکانیـان، کـە هەموویـان لەسـەر یـەک ڕێگان، جـا ئەگەر

دەرکەوتن بۆ دادگایی ﴿ فَقُلْنَا هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ ﴾ (واتە: ئنجا بە بتپەرستان دەڵێین:) بەڵگەتان بێنن لەسەر ڕاستی هاوبەشدانانتان، ئایا ئێمە فەرمانمان پێکردوون بەوە؟ ئایا من فەرمانم کردوە بە پێغەمبەرانم؟ ئایا شتێکی لەو جۆرەتان بینی لە کتێبەکانم؟ ئایا یەکێکیان تیادایە شایستەی پەرستن بێت؟ ئایا سوودتان پێدەگەیەنن، یان بەرگریتان لێدەکەن لە سزای خوا، یان بێنیازتان دەکەن؟ با ئەنجامی بدەن ئەگەر توانایان هەیە؟ وە بتان بینن ئەگەر دەسەڵاتیان هەیە.

﴿ فَعَلِمُوا ﴾ ئەوسا دەزانن بەتاڵی پووچیو خراپی ئەوەی لەسەری دەڕۆن ﴿ أَنَّ الْحَقَّ لِلَّهِ ﴾ (بە ڕاستی هەق تایبەتە بە خوای) بەرز، هیچ بەڵگەیان بە دەستەوە نەما، بەڵگەی خوا درزی تێخستن ﴿ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ ﴾ (واتە: ئەوەی بە درۆ هەڵیان بەستبوو لێیان گوم دەبێ) لە درۆو بوختان، پەرشو بڵاو بوویەوەو نەما، ئنجا زانیان خوا دادپەروری کردوە لەگەڵیان، کاتێ کە سزای دانەناوە تەنها بۆ ئەوە نەبێ شیاوە.

(٧٦-٨٢): ﴿ إِنَّ قَارُونَ كَانَ مِن قَوْمِ مُوسَىٰ فَبَغَىٰ عَلَيْهِمْ ۖ وَآتَيْنَاهُ مِنَ الْكُنُوزِ مَا إِنَّ مَفَاتِحَهُ
لَتَنُوءُ بِالْعُصْبَةِ أُولِي الْقُوَّةِ إِذْ قَالَ لَهُ قَوْمُهُ لَا تَفْرَحْ ۖ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْفَرِحِينَ (٧٦) وَابْتَغِ
فِيمَا آتَاكَ اللَّهُ الدَّارَ الْآخِرَةَ ۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ الدُّنْيَا ۖ وَأَحْسِن كَمَا أَحْسَنَ
اللَّهُ إِلَيْكَ ۖ وَلَا تَبْغِ الْفَسَادَ فِي الْأَرْضِ ۖ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْمُفْسِدِينَ (٧٧) قَالَ إِنَّمَا أُوتِيتُهُ عَلَىٰ عِلْمٍ
عِندِي ۚ أَوَلَمْ يَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ قَدْ أَهْلَكَ مِن قَبْلِهِ مِنَ الْقُرُونِ مَنْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُ قُوَّةً وَأَكْثَرُ جَمْعًا ۚ
وَلَا يُسْأَلُ عَن ذُنُوبِهِمُ الْمُجْرِمُونَ (٧٨) فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِ فِي زِينَتِهِ ۖ قَالَ الَّذِينَ يُرِيدُونَ
الْحَيَاةَ الدُّنْيَا يَا لَيْتَ لَنَا مِثْلَ مَا أُوتِيَ قَارُونُ إِنَّهُ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٍ (٧٩) وَقَالَ الَّذِينَ
أُوتُوا الْعِلْمَ وَيْلَكُمْ ثَوَابُ اللَّهِ خَيْرٌ لِّمَنْ آمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا وَلَا يُلَقَّاهَا إِلَّا الصَّابِرُونَ
(٨٠) فَخَسَفْنَا بِهِ وَبِدَارِهِ الْأَرْضَ فَمَا كَانَ لَهُ مِن فِئَةٍ يَنصُرُونَهُ مِن دُونِ اللَّهِ وَمَا كَانَ مِنَ
الْمُنتَصِرِينَ (٨١) وَأَصْبَحَ الَّذِينَ تَمَنَّوْا مَكَانَهُ بِالْأَمْسِ يَقُولُونَ وَيْكَأَنَّ اللَّهَ يَبْسُطُ الرِّزْقَ
لِمَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَيَقْدِرُ ۖ لَوْلَا أَن مَّنَّ اللَّهُ عَلَيْنَا لَخَسَفَ بِنَا ۖ وَيْكَأَنَّهُ لَا يُفْلِحُ الْكَافِرُونَ (٨٢) ﴾:

﴿ إِنَّ قَارُونَ كَانَ مِن قَوْمِ مُوسَىٰ فَبَغَىٰ عَلَيْهِمْ ﴾ تا کۆتایی چیرۆکەکە. خوا هەواڵ دەدات دەربارەی حاڵەتی قاروون، ئەوەی کە کردی، وە ئەوەی لەگەڵی کراو ئامۆژگاری پێکرا، خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ قَارُونَ كَانَ مِن قَوْمِ مُوسَىٰ ﴾ واتە: بە ڕاستی قاروون لە نەوەی ئیسرائیل بوو، ئەوان فەزڵ دران بەسەر جیهانیان لە سەردەمی خۆیان، خوا منەتی کرد بەسەریان بەو منەتەی کە کردی، بارودۆخیان گونجاو بوو بۆ بەردەوامی،

بـەلاّم ئـەم قاروونـە، دەسـتدرێژیو سـتەمی لێکـردن، بەو مـاڵو سـامانە مەزنە بێشـوومارە ﴿وَءَاتَيْنَٰهُ مِنَ ٱلْكُنُوزِ﴾ واتـە: (پێمانـدا) گەنجینـەو مـاڵو سـامانێکی زۆر ﴿مَآ إِنَّ مَفَاتِحَهُۥ لَتَنُوٓأُ بِٱلْعُصْبَةِ أُو۟لِى ٱلْقُوَّةِ﴾ (واتـە: کـە بێگومـان هەڵگرتنـی کلیلەکانـی ئـەو قاسـانە بـە زەحمـەت هەڵدەگیـرا بـۆ کۆمەڵێکـی بەهێـز)، (العصبة): لـە دە کەسـەوە بـۆ نـۆ تـا حـەوت کەسـە، واتـە: کلیلـی خەزێنەکانـی کۆمەڵێکی بـە توانـا دەرەقەتـی نەدەهاتن، ئەی گومانـت چیـە بـە گەنجینـەکان؟ ﴿إِذْ قَالَ لَهُۥ قَوْمُهُۥ﴾ (واتـە: گەلەکەی پێیـان وت) وەکو ئامۆژگـاریو ئاگادار کردنەوەی لە سـنوور دەرچـوون ﴿لَا تَفْرَحْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْفَرِحِينَ﴾ واتـە: دڵخـۆش مەبـە بـەم دونیا مەزنـەو لەخۆبایـی مەبـەو فەخری پێـوە مەکە، بـێ ئاگات بکات لە ڕۆژی دوایی، بە ڕاسـتی خوا ئەو کەسـانەی خۆشـناوێن دڵخۆشـن پێـی، کەوتوون بەسـەر خۆشەویستیدا.

(٧٧): ﴿وَٱبْتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ﴾ واتـە: ئـەوەی بـۆ تـۆ دەسـتەبەر بـوو لـە هۆکارەکانـی ڕۆژی دوایـی بـۆ جگـە لـە تـۆ نیـە لـە مـاڵو سـامان، دەی بـەو ماڵو سـامانە ئـەو دونیای پێبەدەسـت بێنـە، خێرو چاکـەی لێ بکە، تەنهـا بۆ بەدەسـتهێنانی حەزو ئـارەزوو بـە کاری مەهێنـە، ﴿وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَا﴾ واتە: فەرمانـت پێناکەین هەمـوو ماڵەکـەت ببەخشـیتو هیچـت بەدەسـتەوە نەمێنـێ، بەڵکو ببەخشـە بـۆ دوارۆژت، چێـژ لـە دونیـاش وەربگـرە بـە جـۆرێ ئاینەکـەت لەکـەدار نـەکات، زیانیشـی نەبێت بۆ ڕۆژی دوایـت، ﴿وَأَحْسِن﴾ (چاکـە بکـە) لەگـەڵ بەندەکانی خـوادا ﴿كَمَآ أَحْسَنَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ﴾ (واتـە: هەرچـۆن خـوا چاکـەی لەگەڵ تـۆدا کردوە) بـەم هەموو ماڵو سـامانە ﴿وَلَا تَبْغِ ٱلْفَسَادَ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ (واتـە: لەسـەر زەویـدا بـە شـوێن خراپـەدا مەگـەڕێ) بـە لـووت بـەرزیو سـەرپێچی کردنی خواو سـەرقاڵ بوون بەنـازو نیعمەتـەکانو لەبیر کردنی ئـەو خوایەی پێـی داوی ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ﴾ (واتە: بە ڕاسـتی خـوا خراپەکارانی خۆشـناوێ) بەڵکـو سـزایان دەدات بە توندترین شـێوە.

قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍ عِندِىٓ ۚ أَوَلَمْ يَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَهْلَكَ
مِن قَبْلِهِۦ مِنَ ٱلْقُرُونِ مَنْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُ قُوَّةً وَأَكْثَرُ جَمْعًا ۚ
وَلَا يُسْـَٔلُ عَن ذُنُوبِهِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ (٧٨) فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ
فِى زِينَتِهِۦ ۖ قَالَ ٱلَّذِينَ يُرِيدُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا يَـٰلَيْتَ لَنَا
مِثْلَ مَآ أُوتِىَ قَـٰرُونُ إِنَّهُۥ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٍ (٧٩) وَقَالَ ٱلَّذِينَ
أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ وَيْلَكُمْ ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيْرٌ لِّمَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ
صَـٰلِحًا وَلَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلصَّـٰبِرُونَ (٨٠) فَخَسَفْنَا بِهِۦ
وَبِدَارِهِ ٱلْأَرْضَ فَمَا كَانَ لَهُۥ مِن فِئَةٍ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ
ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُنتَصِرِينَ (٨١) وَأَصْبَحَ ٱلَّذِينَ تَمَنَّوْا۟
مَكَانَهُۥ بِٱلْأَمْسِ يَقُولُونَ وَيْكَأَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن
يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ ۖ لَوْلَآ أَن مَّنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَا لَخَسَفَ بِنَا ۖ
وَيْكَأَنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَـٰفِرُونَ (٨٢) تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْـَٔاخِرَةُ نَجْعَلُهَا
لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا ۚ وَٱلْعَـٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ
(٨٣) مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ خَيْرٌ مِّنْهَا ۖ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا
يُجْزَى ٱلَّذِينَ عَمِلُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ إِلَّا مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ (٨٤)

(٧٨): ﴿قَالَ﴾ قــاروون -لە وەڵامدانەوەی ئامۆژگــاری گەلەکــەی‌و بێبروایــی بــە نیعمەتەکانــی خــوا- وتــی: ﴿إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍ عِندِىٓ﴾ واتــە: ئــەم ماڵ‌و ســامانەم بەدەســتهێناوە بــە هــۆی کەســابەت‌و شــارەزاییم لەو بــوارەدا، یــان خــوا زانیاری هەیــە دەربارەی مــن، دەزانێ من شایســتەی ئــەوەم، ئیتر بۆچی ئێــوە ئامۆژگاریم دەکەن لەســەر ئەوەی خــوا پێمــی بەخشــیوە؟ خوا ڕوونی دەکاتــەوە بێگومان بەخشــینی بەڵگە نیە لەســەر چاکی ئەو کەســەی پێــی دراوە: ﴿أَوَلَمْ يَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَهْلَكَ مِن قَبْلِهِۦ مِنَ ٱلْقُرُونِ مَنْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُ قُوَّةً وَأَكْثَرُ جَمْعًا﴾ (واتــە: ئایــا قــاروون نەیزانیوە کە بــە ڕاســتی خوا لــە چەرخەکانــی پێش ئەمــدا لە ناوی بــردوە کەســانی وا لە قــاروون بەهێز تربــوون کــۆڕو کۆمەڵیشــیان لەو زیاتر بــوو)، چ ڕێگریــەک هەیە لە لەناو بردنــی قاروون، وەک چــۆن نەریتمــان وابــوو لــە پێش ئەو لــەو مەزنترمــان لە ناو بــردوە، ئەگــەر کارێک بــکات ببێتــە مایــەی لەنــاو چوون؟

﴿وَلَا يُسْـَٔلُ عَن ذُنُوبِهِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ﴾ (واتــە: کاتــێ ســزای خــوا هــات پرســیار ناکرێ لــە تاوانەکانــی ئەم تاوانبــارە)، بەڵکو خــوا تۆڵەیــان لێدەکاتەوە، وە ســزایان دەدات لەســەر ئــەوەی دەربارەیــان دەزانــێ، ئەوانــە، ئەگــەر حاڵەتێکی باشــیان بــۆ خۆیان چەســپاندوە، وە شــایەتیان داوە بــە ڕزگــار بــوون، قســەکانیان وەرگیــراو نیــە، ئــەوە نابێتــە مایــەی ئەوەی ســزایان لەســەر لابرێــت، چونکــە تاوانەکانیان شــاراوە نیــە، قــاروون بەردەوام بوو لەســەر عینــادی‌و گومڕایــی، وە وەرنەگرتنــی ئامۆژگــاری گەلەکەی، دڵی خۆش بــوو لووت بەرزو یاخــی بــوو، سەرســام بــوو بە خــۆی، ئەو مــاڵ‌و ســامانە یاخــی کردبوو.

(٧٩): ﴿فَخَرَجَ﴾ واتــە: ئنجــا قــاروون ڕۆژێک لــە ڕۆژەکان هاتــە دەر، ﴿فِى زِينَتِهِۦ﴾ بــە حاڵەتێــک بەرزتر لــە حاڵەتەکانی دنیا، ماڵ‌و ســەروەت‌و ســامانێکی ئەوتــۆی هەبوو، وە

خـۆی ئامـادەو جـوان کردبـوو بە هەرچـی لـە توانایدا بـوو، ئەو جوانیـەش بە پێـی داب‌و نەریـت بـۆ کەسـێکی وەکو ئـەو بێ شـوومارە، جوانـی دونیـاو ڕازاوەیـی‌و شـانازیەکانی کۆکردبوویـەوە، لـەو حاڵەتـەدا چاوەکانی بـەلای خۆیدا ڕاکێشـا، جوانیەکـەی دڵەکانی پڕ کـرد، ڕازاوەیـی نەفسـەکانی ڕاو کـرد، تەماشـاکاران بـوون بـە دوو بەشـەوە، هەریەکـەو قسـەی دەکـرد بەپێـی ئـەو هیمـەت‌و حـەزەی هەیەتـی، ﴿ قَالَ ٱلَّذِينَ يُرِيدُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴾ واتـە: ئەوانـەی ویسـت‌و ئارەزوویـان بـە دونیـادا هەڵواسـیبوو، دونیـا بـوو بووە کۆتایـی حەزەکانیـان، جگـە لـە دونیـا هیـچ ویسـت‌و ئامانجێکی دیکەیـان نەبـوو، وتیان: ﴿ يَٰلَيْتَ لَنَا مِثْلَ مَآ أُوتِىَ قَٰرُونُ ﴾ واتـە: (ئـای خۆزگـە ئەوەنـدەی بـە قـاروون دراوە ئێمـەش بمـان بووایە) لە جوانـی‌و ڕازاوەییەکانـی دونیـا! ﴿ إِنَّهُۥ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴾ (واتە: بـە ڕاسـتی ئـەو قاروونە خاوەنـی بـەش‌و بەختێکـی گەورەیە).

ڕاسـتیان کـرد بە ڕاسـتی قاروون خـاوەن بەختێکـی مەزن بـوو، ئەگەر کارەکە لـە حەزوو ئـارەزووی ئەوانـدا کۆتایـی پـێ بهاتایە، وە لـە دوای ژیانی دونیـا ژیانـی دواڕۆژ نەبووایە، بێگومـان قـاروون لـە دونیـادا پێـی درابـوو ئەوپـەڕی نازونیعمەت لـە نیعمەتەکانـی دونیا، بـەو شـێوەیە دەیتوانـی هەمـوو داواکاریەکانی بەدەسـت بێنێ، جا بـە پێـی هیممەتی ئەوان ئـەوە بەختێکـی مـەزن بـوو، وە هیممەتێک ئەمـەی کردبێتە ئەوپـەڕی مەبەسـت‌و کۆتایی داواکاریەکانـی، بە ڕاسـتی ئەمـە نزمترین هیمـەت‌و خوارترینیانە، کەمتریـن بەرزبوونەوەی تێدانیـە بۆ مەبەسـتە بـەرزەکان‌و داواکاریە بـە نرخەکان.

(٨٠): ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ ﴾ واتـە: (بـەلام ئـەو کەسـانەی زانسـتیان پـێ درابوو) ئەوانـەی حەقیقەتی شـتەکانیان ناسـیووە، وە تەماشـای ناوەڕۆکی دونیایان کـردوە، کاتێ دونیا ویسـتەکان تەماشـای ڕواڵەتیان کردوە: ﴿ وَيْلَكُمْ ﴾ (هـاوار بۆ ئێوە) بە ئاخ هەڵکێشـانەوە لـەو ئاواتـەی دەیخوازن بـۆ نەفس‌و دەروونیـان، بینـەری بارودۆخیانن‌و نکوولی لە قسـەکەیان دەکـەن ﴿ ثَوَابُ ٱللَّهِ ﴾ (پاداشـتی خـوا) بـە پەلە لە تـام‌و لەززەتـی عیبادەت‌و خۆشەویسـتی‌و ملکـەچ بوونـی‌و ڕووتێکردنـی، وە پاداشـتی داهاتـوو لە بەهەشـتداو ئـەوەی تیایدایـە، لەوەی نەفـس‌و دەروون حـەزی لێـدەکات، چاویـش لەززەتـی پـێ وەردەگـرێ، ﴿ خَيْرٌ ﴾ چاکترە لەمـەی کە ئێـوە ئاواتی بـۆ دەخوازن‌و حـەزی پێدەکەن، ئەمـەش حەقیقەتـی کارەکەیە، بەلام هەرکەسـێ ئەمە بزانـێ بەرز هەڵدەبژێرێ بەسـەر نزمدا، وە کەس ئەو پلەو پایەو سـەرکەوتنەی بـۆ نابـێ، ﴿ إِلَّا ٱلصَّٰبِرُونَ ﴾ (جگـە لـە خۆڕاگـران) ئەوانـەی نەفـس‌و دەروونیـان بەنـد

کـردوە لەسـەر گوێڕایەڵـی خواو لە سـەرپێچی کردنی، وە لەسـەر قـەزاو قەدەرە بە ئێشـەکان، وە ئارامیـان گرتـووە لەسـەر سـەرنج ڕاکێشـی دونیـاو حـەزوو ئارەزووەکانی، کە سـەرقاڵیان نـەکات لـە پەروەردگاریـان، وە ببێتـە بەربەسـت لـە نێوانـی ئـەوانو لـە نێوانی ئـەوەی بۆی دروسـتکراون، ئەوانـە پاداشـتی خوا دەدەن بەسـەر دونیـای فانیدا.

(٨١): کاتـێ کـە کۆتایی پێهـات گومڕایـیو فەخرو شـانازی کردنی قـاروون، وە دونیای بـۆ ڕازابوویـەوەو زۆر سەرسـام بـوو پێـی خـوا سـزایدا ﴿ فَخَسَفۡنَا بِهِۦ وَبِدَارِهِ ٱلۡأَرۡضَ ﴾ (واتـە: ئنجـا قاروونو کۆشـکەکەیمان بـرد بە ناخـی زەویدا) وەک سـزایەک لە شـێوەی کردەوەکـەی، هـەروەک چـۆن نەفـسو دەروونـی بـەرز ڕاگرت بەسـەر بەندەکانـی خوا، خـوا دایگـرت بـە ناخـی زەویـدا، ئـەوەو ئەوەیشـی کـە پێی بوغـرا بـوو، لەمـاڵو هەموو سـەروەتو سـامانەکەی، ﴿ فَمَا كَانَ لَهُۥ مِن فِئَةٖ ﴾ واتـە: هیـچ دەسـتەو کۆمـەڵو خزمەتـکارو سـەربازێک نەبـوو ﴿ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُنتَصِرِينَ ﴾ واتـە: سـزای بـۆ دابـەزی، کـەس نەبـوو سـەری بخـات، وە خۆیشـی نەیتوانی سـەربکەوێ.

(٨٢): ﴿ وَأَصۡبَحَ ٱلَّذِينَ تَمَنَّوۡاْ مَكَانَهُۥ بِٱلۡأَمۡسِ ﴾ واتـە: ئەوانەی ژیانی دونیایان دەویسـت، ئەوانـەی وتیـان: ﴿ يَٰلَيۡتَ لَنَا مِثۡلَ مَآ أُوتِيَ قَٰرُونُ ﴿٧٩﴾ ﴾، ﴿ يَقُولُونَ ﴾ وە بـە خـەمو خەفـەتو پەند وەرگرتنو ترسـانیان لە تووشـبوونی سـزای خـوا دەیانگوت: ﴿ وَيۡكَأَنَّ ٱللَّهَ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦ وَيَقۡدِرُ ﴾ واتە: (وای وا دیارە خوا ڕۆزی زۆر دەکات بـۆ هەر کەسـێک خـۆی بیەوێ لـە بەندەکانی کەمیشـی دەکاتـەوە بۆ هەر کەسـێک خۆی بیـەوێ) ئـەو کات بۆمـان دەرکـەوت بەرفـراوان کردنـی ڕزقو ڕۆزی خـوا بـۆ قـاروون بەڵگـە نیـە لەسـەر ئەوەی خێـری تێدایـە بۆی، بەڕاسـتی ئێمـە هەڵـە بووین کـە دەمانوت: ﴿ إِنَّهُۥ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٖ ﴾ (واتـە: ئـەو قاروونـە خـاوەن بەختێکی مەزنـە)، ﴿ لَوۡلَآ أَن مَّنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡنَا ﴾ واتـە: سـزای نەدایـن لەسـەر ئەوەی کـە وتمان، جا ئەگـەر فـەزڵو منەتی ئەو نەبوایـە ﴿ لَخَسَفَ بِنَا ﴾ (واتـە: ئێمەیشـی دەبرد بەناخـی زەویدا).

لـە نـاو بردنـی قـاروون سـزایەک بوو بـۆی، وە پەنـدو ئامۆژگـاری بـوو بۆ جگـە لەئەو، تەنانـەت ئەو کەسـانەی خۆزگەیان پێ دەخواسـت بینیت چۆن پەشـیمان بوونەوەو بۆچوونی یەکەمیـان گـۆڕا. ﴿ وَيۡكَأَنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴾ واتـە: نە لـە دونیادا نە لـە دوارۆژدا.

(٨٣): ﴿ تِلۡكَ ٱلدَّارُ ٱلۡأٓخِرَةُ نَجۡعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوّٗا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فَسَادٗاۚ وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلۡمُتَّقِينَ ﴿٨٣﴾ ﴾ :

کاتێ خوا ﷻ باسی قاروونی کرد، وە ئەوەی لە دونیادا پێی داوە، وە ئەوەیشی بوو بە دەرئەنجامی کارەکەی، وە خاوەنانی زانست وتیان: ﴿ ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيْرٌ لِّمَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ﴿٨٠﴾ ﴾القصص، خوا ﷻ هانیداوە لە ژیانی دوارۆژدا، وە هەواڵیداوە بەو هۆکارەی پێی دەگات، جا فەرموویەتی: ﴿ تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْأَخِرَةُ ﴾ واتە: (ئەوە ماڵی دوارۆژە) کە خوا هەواڵی پێداوە بەرۆژی دوایی لە کتێبەکانیدا، وە هەواڵی بە پێغەمبەرەکانی داوە کە هەموو نازو نیعمەتەکانی کۆکردۆتەوە، وە هەموو لێڵیو ناخۆشیەکی دوور خستۆتەوە، ﴿ نَجْعَلُهَا ﴾ دەیکەین بە ماڵو شوێنی نیشتەجێ بوون، ﴿ لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا ﴾ واتە: ئەوانەی ویستی لووت بەرزیو خۆبەزلزانیان تێدانیە بەسەر بەندەکانی خواو حەقو ڕاستیدا، ئەی چۆن بە کردەوە ئەو کارە دەکەن؟ ئەمە هەموو سەرپێچیەکان دەگرێتەوە.

جا ئەگەر ئەوان ویستو ئیرادەیان نەبێ خۆیان بە گەورە بزانن لەسەر زەویداو خراپەو دەست درێژی نەکەن، بێگومان ویستو ئیرادەیان دەگەڕێتەوە بۆ لای خواو مەبەستیان دوارۆژە، وە خۆبەکەمزانن بەرانبەر بەندەکانی خواو ملکەچی حەقو ڕاستینو کردەوەی چاکیش ئەنجام دەدەن، ئا ئەوان لە خواترسانو خۆپارێزانن، ئەوانە سەرەنجامی چاکیان بۆ هەیە، لەبەرئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ وَٱلْعَٰقِبَةُ ﴾ واتە: سەرەنجامی سەرکەوتنو سەرفرازی کە جێگیرو بەردەوامە بۆ ئەو کەسەیە لە خوا بترسێو خۆپارێز بێ، وە جگە لە ئەوان- ئەگەرچی هەندێ ڕواڵەتو حەسانەوەیان بۆ هەبێ- ئەوە بەردەوام نیە، وە لەماوەیەکی نزیکدا دەڕوات، وە لە کورتهەڵهێنانی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا زانراوە ئەوانەی دەیانەوێ لووت بەرزی بکەن بەسەر زەویدا یان فەسادو خراپەکاری، ئەوە لە ژیانی دوارۆژدا هیچ بەشێکیان نیە.

(٨٤): ﴿ مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ خَيْرٌ مِّنْهَا ۖ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجْزَى ٱلَّذِينَ عَمِلُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ إِلَّا مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٨٤﴾ ﴾:

خوا هەواڵ دەدات دەربارەی چەند بارە بوونەوەی فەزڵو چاکەو تەواوی دادپەروەری، فەرموویەتی: ﴿ مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ ﴾ (واتە: هەر کەس کارێکی چاک بکات) مەرجی داناوە لە کاری چاکەدا کە خاوەنەکەی پێی هەستێ، چونکە هەندێجار ئەنجامی دەدات بەڵام شتێکی تری پێوە دەبەستێ کە لێی وەرناگیرێ، یان بەتاڵی دەکاتەوە، ئەوە بە کردەوەی چاک هەڵنەستاوە.

(الحَسَنَة): نـاوی ڕەگـەزە هەمـوو فەرمانەكانـی خـواو پێغەمبەرەكـەی دەگرێتـەوە، لـە گوفتـارو كـرداره ئاشـكراو نهێنیەكان، ئەوانەی پەیوەسـتن بـە مافی خواو مافـی بەندەكانی ﴿ فَلَهُۥ خَيۡرٞ مِّنۡهَا ﴾ واتـە: مەزنتـرو گەورەتـرە، وە لە ئایەتێكی تـردا دەفەرموێ: ﴿ فَلَهُۥ عَشۡرُ أَمۡثَالِهَاۖ ﴿١٦٠﴾ ﴾الأنعام (واتـە: ئەوە لـە ڕۆژی دواییـدا دە ئەوەندەی چاكەكەی پاداشـتی بۆ هەیـە) ئـەم زیادكردنـی چاكە هـەر دەبـێ ببـێ، وە هەندێ جـار پەیوەسـت دەبـێ پێیەوە هەنـدێ لـەو هۆكارانـە كـە دەبنە مایـەی چەند جار زیـاد بـوون، ﴿ وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٦١﴾ ﴾البقرة، (واتـە: وە خـوا لەمـەش زیاتری دەكات بۆ هەر كەسـێك كـە خـۆی بیـەوێ) بـە پێـی حاڵـی بكـەرو كردەوەكـەی‌و سـوودو شـوێن‌و جێگاكەی، ﴿ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ ﴾ ئەویـش بریتیـە لـە هەموو ئـەوەی خوا قەدەغەی كـردوە، ﴿ فَلَا يُجۡزَى ٱلَّذِينَ عَمِلُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ إِلَّا مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾ (واتـە: ئـەوە تۆڵـە ناسـەنرێ لەوانەی خراپەكاریـان كـردوە تەنهـا بە ئەنـدازەی ئـەو كردەوانـە نەبێت كـە كردوویانـە)، وەك خـوا فەرموویەتـی: ﴿ مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشۡرُ أَمۡثَالِهَاۖ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجۡزَىٰٓ إِلَّا مِثۡلَهَا وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴿١٦٠﴾ ﴾الأنعام، (واتـە: هـەر كەسـێك چاكـە بـكات ئەوە لـە ڕۆژی دواییـدا دە ئەوەنـدەی چاكەكـەی پاداشـتی بۆ هەیـە، وە هەر كەسـێك خراپە بـكات ئەوە تۆڵـەی لـێ ناسـەنرێ تەنهـا بە وێنـەی خۆی نەبـێ‌و ئەوانـە سـتەمیان لێناكرێ).

إِنَّ ٱلَّذِى فَرَضَ عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍۚ قُل رَّبِّىٓ أَعْلَمُ مَن جَآءَ بِٱلْهُدَىٰ وَمَنْ هُوَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٨٥﴾ وَمَا كُنتَ تَرْجُوٓا۟ أَن يُلْقَىٰٓ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبُ إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَۖ فَلَا تَكُونَنَّ ظَهِيرًا لِّلْكَٰفِرِينَ ﴿٨٦﴾ وَلَا يَصُدُّنَّكَ عَنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بَعْدَ إِذْ أُنزِلَتْ إِلَيْكَۖ وَٱدْعُ إِلَىٰ رَبِّكَۖ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٨٧﴾ وَلَا تَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَۘ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ كُلُّ شَىْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُۥۚ لَهُ ٱلْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٨٨﴾

**(٨٥):** ﴿إِنَّ ٱلَّذِى فَرَضَ عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍۚ قُل رَّبِّىٓ أَعْلَمُ مَن جَآءَ بِٱلْهُدَىٰ وَمَنْ هُوَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٨٥﴾﴾:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِى فَرَضَ عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ﴾ واتە: ئەو خوایەی قورئانی بۆ دابەزاندووی، وە ئەحکامەکانی تێدا فەرز کردووەو حەڵاڵو حەرامی تێدا ڕوونکردوەتەوە، وە فەرمانی پێکردووی بە گەیاندنی بە جیهانییان، وە بانگەشەکردنی ئەحکامەکانی هەموو ئەرک پێ سپێردراوەکان، حیکمەتی خوا ئەوە ناخوازێ ژیان بریتی بێت لە ژیانی دونیاو تەواو، بێ ئەوەی بەندەکان پاداشت بدرێنەوەو سزا بدرێن، بەڵکو هەر دەبێ خوا بتگێڕێتەوە بۆ شوێنی گەڕانەوە، چاکەکاران تیایدا پاداشت وەردەگرن بە پێی چاکەکانیان، خراپەکارانیش بە سەرپێچیەکانیان.

بە ڕاستی هیدایەتی بۆ ڕوون کردوونەتەوەو پرۆگرامی ئاشکرا کردوون، ئەگەر شوێنت کەوتن ئەوە بەشیانەو خۆشبەختیانە، وە ئەگەر یاخی بوون تەنها سەرپێچی کردنی تۆیان هەڵبژارد، وە لەکەدار کردنی ئەوەی هێناوتە لە هیدایەتو بە چاکدانانی ئەوەی لە لایانە لە بەتاڵو پووچ بەسەر حەقدا، هیچ بوارێک نەمابێتەوە بۆ مشتو مڕ، هیچ نەمابێتەوە تەنها پاداشتی کردەوەکان نەبێ لە لایەن خوای زاناو بە ئاگای نهێنیەکانو ئاشکراکان، خاوەن حەقو پووچ کەرەوەی (ناهەق)، لەبەر ئەمە فەرموویەتی: ﴿قُل رَّبِّىٓ أَعْلَمُ مَن جَآءَ بِٱلْهُدَىٰ وَمَنْ هُوَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴾ (واتە: بڵێ: پەروەردگارم زاناترە بەو کەسەی ڕێنمایی ڕاستی هێناوە، وە بەو کەسەی لە گومڕاییەکی ڕوونو ئاشکرا دایە)، بێگومان خوا زانیویەتی پێغەمبەرەکەی هیدایەت دراوو هیدایەت دەرە، وە دوژمنەکانی گومڕاو گومڕاکەرن.

**(٨٦):** ﴿وَمَا كُنتَ تَرْجُوٓا۟ أَن يُلْقَىٰٓ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبُ إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَۖ فَلَا تَكُونَنَّ ظَهِيرًا لِّلْكَٰفِرِينَ ﴿٨٦﴾﴾

﴿ وَمَا كُنتَ تَرْجُوٓاْ أَن يُلْقَىٰٓ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبُ ﴾ واتـە: تۆ چـاوەڕوان نەبووی ئـەم کتێبەت بـۆ دابەزێنـرێ، وە خۆشـت ئامـادە نەکردبـوو، ڕووبەڕووشـی نەبـووی، ﴿ إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ﴾ (واتـە: بـەڵام ڕەحمەتێک بوو لـە لایـەن پەروەردگارتەوە) بۆ تۆو بـۆ بەندەکان، تـۆی نـاردوە بـەم قورئانـە کـە بـە هۆیـەوە ڕەحمی بـە جیهـان کـردوە، وە شـتانێکی فێر کـردوون کـە پێشـتر نەیاندەزانـی، وە پاکـی کردوونەتـەوەو فێـری قورئـانو حیکمەتـی کـردوون، ئەگەرچـی پێشـتر لـە گومڕاییەکی ڕوونـدا بوون.

جـا ئەگـەر زانیت ئـەو قورئانە وەکـو ڕەحمەتێک بـۆ تۆ دابەزیـوە بێگومـان زانیوتە هەموو ئەوانـەی فەرمانـی پێکردوەو قەدەغـەی لێکردوە، ئـەوە ڕەحمەتو فـەزڵو چاکەیە لەلایەن خـواوە، کەواتـە: دڵتەنـگ مەبـە لـە هیـچ شـتێکی، وە وا گومـان مەبـە کـە پێچەوانەکەی چاکتـرو بە سـوودترە، ﴿ فَلَا تَكُونَنَّ ظَهِيرًا لِّلْكَٰفِرِينَ ﴾ واتـە: (هەرگیز) مەبە پشـتیوانو یارمەتیـدەر بـۆ بێبڕوایـان لە بەشـێ لە بەشـەکانی بێبڕوایـی، وە لە کۆی پشـتیوانی کردنیان ئەوەیـە شـتێک دەربـارەی بوتـرێ پێچەوانـەی حیکمـەتو بەرژەوەندیو سـوودو قازانجی بێت .

(٨٧): ﴿ وَلَا يَصُدُّنَّكَ عَنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بَعْدَ إِذْ أُنزِلَتْ إِلَيْكَ ۖ وَٱدْعُ إِلَىٰ رَبِّكَ ۖ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾:

﴿ وَلَا يَصُدُّنَّكَ عَنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بَعْدَ إِذْ أُنزِلَتْ إِلَيْكَ ﴾ (واتـە: وە بـا بێبڕوایـان ڕێگریـت نەکـەن لـە ئایەتەکانی خـوا دوای ئـەوەی دابەزێنـراوە بۆت) بەڵکـو پەیامی خـوا بگەیەنەو جێبەجێـی بکـە، فـرتو فێڵـی ئەوان بـە بـای خەیاڵتا نەیـە، وە شـوێنی هـەواو ئارەزوویان مەکـەوە ﴿ وَٱدْعُ إِلَىٰ رَبِّكَ ﴾ واتـە: بـا بانگـەواز کردنـت بـۆلای خـوا کۆتا مەبەسـتو ئـەو پـەڕی کـردەوەت بـێ، هەرشـتێ پێچەوانـەی ئـەو بانگـەوازە بـوو ڕەتی بکـەرەوە لە ڕووپامایـی یان سـومعەو ناوبانگ، یـان گونجان لەگەڵ مەبەسـتو حەزی شـوێنکەوتووانی بەتـاڵو پـووچ، چونکـە ئـەوە دەبێتـە مایەی هـاوکاری کردنیـان لـە کاروبارەکانیـان، وە لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾ واتـە: (وە مەبە بـە یەکێک لـەو کەسـانەی هاوبـەش دادەنێـن) نە لە هاوبـەش دانانیانـدا، وە نە لـە لقو پۆکانـی، وە نە لە بەشـەکانی کـە هەمـوو سـەرپێچیەکان دەگرێتەوە.

(٨٨): ﴿ وَلَا تَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ ۘ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ كُلُّ شَىْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُۥ ۚ لَهُ ٱلْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٨٨﴾ ﴾:

﴿ وَلَا تَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ ﴾ (واتە: وە لەگەڵ خوادا هیچ پەرستراوێکی تر مەپەرستە)، بەڵکو بە دڵسۆزیەوە بەندایەتی بۆ خوا بکە، ﴿ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾ هیچ کەس شایستەی ئەوە نیە بپەرسترێ، وە خۆشبویسترێو بەندایەتی بۆ بکرێ، جگە لە خوای تەواو نەبێ کە ﴿ كُلُّ شَىْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُۥ ﴾ (واتە: هەموو شتێک لە ناو دەچێ جگە لە زاتی خوا) جا ئەگەر هەموو شتێ جگە لە خوا لە ناو بچێو پەرشو بڵاو بێ، کەواتە: بەندایەتی لە ناو چوو و پووچو بەتاڵو بێ بەهرەیە، بە هۆی بەتاڵی مەبەستەکانیو خراپی سەرەنجامی ﴿ لَهُ ٱلْحُكْمُ ﴾ لە دونیاو دوارۆژدا ﴿ وَإِلَيْهِ ﴾ (تەنها بۆ لای خوا) نەک بۆ لای جگە لەو ﴿ تُرْجَعُونَ ﴾ (دەگەڕێنەوە) جا ئەگەر هەموو شتێ جگە لە خوا بەتاڵو لەناو چوو بێ، وە خوا باقیو زیندوو بێ، کە هیچ پەرستراوێ نیە جگە لەو، وە بڕیارو حوکم تایبەت بە ئەوبێ لە دونیاو دوارۆژدا، وە گەڕانەوەی بەدیهێنراوەکان بۆ لای ئەو بێ، پاداشتیان بداتەوە بە پێی کردەوەکانیان، پێویست دەبێ لەسەر کەسێکی خاوەن عەقڵ بەندایەتی خوای تاکو تەنهای بێ هاوبەش بکات، وە کار بکات بەوەی لە خوا نزیکی دەکاتەوە، وە خۆی بپارێزێ لە تووڕەییو سزای ئەو، وە نەچێتە بەر دیوانی خوا بەبێ تەوبە، وە بەبێ خۆدارنین لە هەڵەو تاوانەکانی.

تەفسیری سووڕەتی (القصص) تەواو بوو.


بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
الٓمٓ ﴿١﴾ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتْرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ﴿٢﴾ وَلَقَدْ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٣﴾ أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن يَسْبِقُونَا سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٤﴾ مَن كَانَ يَرْجُواْ لِقَآءَ ٱللَّهِ فَإِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ لَءَاتٍ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٥﴾ وَمَن جَٰهَدَ فَإِنَّمَا يُجَٰهِدُ لِنَفْسِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِيٌّ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦﴾

## تەفسیری سوورەتی (العنكبوت)

## مەككیە (٦٩) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٣): ﴿ الٓمٓ ﴿١﴾ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتْرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ﴿٢﴾ وَلَقَدْ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٣﴾ ﴾:

خوا هەواڵ دەدا لە تەواوی حیکمەتی، بێگومان حیکمەتی ئەوە ناخوازێ هەر کەسێ بڵێ: (أنا مؤمن) من بڕوادارم، وە بانگەشەی ئیمان بۆ خۆی بکات، ئیتر بۆ خۆیان بە بێ خەمو سەلامەتی دابنیشن بەبێ ئەوەی تووشی فیتنەو نارەحەتی ببن، شتێک ڕووبەڕوویان نەبێتەوە ئیمانو بڕوایان شپرزە بکات، جا ئەگەر کارەکە بەو جۆرە بێت، ئەوە ڕاستگۆ لە درۆزن جیا ناکرێتەوە، وە هەق لە ناهەق، بەڵام سوننەتی خوا لە پێشینداو لەم ئوممەتەشدا، ئەوەیە تاقیان دەکاتەوە بە خۆشیو ناخۆشی، تەنگانەو ئاسانی، دەوڵەمەندیو هەژاری، زاڵ بوونی بێبڕوایان لە هەندێ حاڵەتدا، جیهاد کردنی دوژمنان بە گوفتارو کردار، وە وێنەی ئەوانە لەو فیتنەو تاقیکردنەوانەی کە هەموویان دەگەڕێنەوە بۆ فیتنەی گومانەکان، ئەوانەی دژی عەقیدەو بیروبڕوان، وە ئەو ئارەزووانەی بەرهەڵستی ویستو ئیرادە دەکەن.

هەرکەسێ لە کاتی هاتنی گومانەکاندا ئیمانەکەی جێگیر بێو نەلەقێو ڕەتیان بکاتەوە، بەو حەقو ڕاستیەی لە لایەتی، وە لە کاتی هاتنی ئەو حەزوو ئارەزوانەی کە پاڵنەرن بۆ سەرپێچیو گوناح، یان لە فەرمانی خواو پێغەمبەر لای دەدا، کار بە ناوەڕۆکی ئیمان بکاتو دژی هەواو ئارەزووی کۆشش بکات، ئەوە بەڵگەیە لەسەر ڕاستی ئیمانەکەی.

وە هەر کەسێک لە کاتی هاتنی گوماندا، کاریگەری لە دڵی بکاتو تووشی دوودڵی ببێ، وە لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەی حەزو ئارەزووەکان، تووشی گوناح بوو، یان بەو هۆیەوە وازی لە ئەرکەکان هێنا، ئەوە بەڵگەیە لەسەر نەبوونی ئیمانی ڕاستەقینە.

خەڵکی لەم ڕووەوە چەندین پلەن، لەژماردن نایەت جگە لە خوا خۆی نەبێ، هەیە کەمەو هەیە زۆرە، داوا لە خوا دەکەین چەسپاومان بکات لە ژیانی دنیاو دوارۆژدا، وە دڵمان دابمەزرێنێ لەسەر ئاینەکەی، تاقیکردنەوە بۆ نەفسو دەروونەکان، وەک ئاگری کورە وایە پاکو پیس لە یەکتر جیادەکاتەوە.

(٤): ﴿ أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ السَّيِّئَاتِ أَن يَسْبِقُونَا سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٤﴾ ﴾

واتە: ئایا ئەوانەی هەموو هەوڵو تەقەلاکانیان کاری خراپەو تاوانە، کردەوەکانیان پشت گوێ دەخرێو خوا لێیان بێئاگا دەبێ، یان بەسەریاندا تێدەپەڕێ، لەبەر ئەوە ئەنجامیان داوەو ئەنجامدانی بە لایانەوە ئاسان بووە؟ ﴿ سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴾ واتە: بڕیارەکەیان خراپ بوو، بە ڕاستی ئەوە بڕیارێکی ستەمکارانەیە، چونکە نکوڵی قودرەتو حیکمەتی خوای لەخۆ گرتووە، وە پێیان وایە ئەوان توانایەکیان هەیە ڕێگری لە سزای خوا دەکات، بێگومان ئەوان لاوازترین شتو بێ دەسەڵاترینن.

(٥): ﴿ مَن كَانَ يَرْجُوا لِقَاءَ اللَّهِ فَإِنَّ أَجَلَ اللَّهِ لَآتٍ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴿٥﴾ ﴾

مانای ئەوەیە: ئەی ئەو کەسەی پەروەردگاری خۆش دەوێ، تامەزرۆیە بە نزیکی گەیشتن پێی، پەلە دەکات لە ڕەزامەندی ئەودا، مژدە بێت بە گەیشتن بە خۆشەویست، بێگومان هەر دێت، وە هەموو ئەوەی کە دێت بێگومان نزیکە، جا توێشوو هەڵگرە بۆ کاتی گەیشتنت پێیو بەرەو ڕووی بکەوە ڕێ بە هاوڕێیەتی هیواو ئومێد، بەو ئاواتەی پێی بگەی، بەڵام هەموو کەسێ داوا بکات بە پێی داواکەی پێی نادرێ، وە هەموو کەسێ ئاوات بخوازێ بە پێی ئاواتەکەی پێی نابەخشرێ، بێگومان خوا بیسەری هەموو دەنگەکانە، زانایە بە هەموو نیەتەکان، جا هەر کەسێ ڕاست بکات لەو داواکاریەدا دەستی دەکەوێ ئەوەی ئومێدی دەکات، وە هەر کەسێک درۆ بکات، بانگەشەکەی هیچ سوودێکی پێ ناگەیەنێت، خوا زانایە بەوەی کێ گونجاوە بۆ خۆشویستنی کێش گونجاوو شایستە نیە.

(٦): ﴿ وَمَن جَٰهَدَ فَإِنَّمَا يُجَٰهِدُ لِنَفۡسِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِيٌّ عَنِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٦ ﴾:
﴿ وَمَن جَٰهَدَ ﴾ (واتە: هەرکەسێ جیهادی) نەفسو دروونو شەیتانەکەیو دوژمنە بێبڕواکەی بکات ﴿ فَإِنَّمَا يُجَٰهِدُ لِنَفۡسِهِۦٓ ﴾، (واتە: ئەوە تەنها بۆ خۆی تێدەکۆشێ) چونکە سوودوو بەرهەمەکەی دەگەڕێتەوە بۆی، وە خوا لە هەموو جیهانیان بێنیازە، فەرمانی پێنەکردوون بە تێکۆشان بۆ ئەوەی سوودی بێ بۆی، وە قەدەغەی لێ نەکردون لەوەی کە قەدەغەی کردوە بە هۆی ڕەزیلیو ڕژدیەوە.
بێگومان زانیویەتی فەرمانو قەدەغەکراوەکان ئەوە پێویست دەکات لە سەر ئەرک پێسپێردراو تێکۆشانی بۆ بکات، چونکە نەفسو دەروونی بە سروشت تەمەڵی دەکات لە بەجێهێنانی خێرو چاکە، وە شەیتانەکەیشی ڕێگری لێدەکات، وە بێبڕواو دوژمنەکەی بەرهەڵستی بەجێهێنانی ئاینەکەی دەکات، وە هەموو ئەم بەرهەڵستیانە پێویستیان بە تێکۆشانو کۆششی تەواو هەیە.

وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُكَفِّرَنَّ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ
وَلَنَجۡزِيَنَّهُمۡ أَحۡسَنَ ٱلَّذِي كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ٧ وَوَصَّيۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ
بِوَٰلِدَيۡهِ حُسۡنٗاۖ وَإِن جَٰهَدَاكَ لِتُشۡرِكَ بِي مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٞ
فَلَا تُطِعۡهُمَآۚ إِلَيَّ مَرۡجِعُكُمۡ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ٨
وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُدۡخِلَنَّهُمۡ فِي ٱلصَّٰلِحِينَ
٩ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ فَإِذَآ أُوذِيَ فِي ٱللَّهِ جَعَلَ
فِتۡنَةَ ٱلنَّاسِ كَعَذَابِ ٱللَّهِۖ وَلَئِن جَآءَ نَصۡرٞ مِّن رَّبِّكَ لَيَقُولُنَّ
إِنَّا كُنَّا مَعَكُمۡۚ أَوَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِأَعۡلَمَ بِمَا فِي صُدُورِ ٱلۡعَٰلَمِينَ
١٠ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ
١١ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّبِعُواْ سَبِيلَنَا
وَلۡنَحۡمِلۡ خَطَٰيَٰكُمۡ وَمَا هُم بِحَٰمِلِينَ مِنۡ خَطَٰيَٰهُم مِّن
شَيۡءٍۖ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ١٢ وَلَيَحۡمِلُنَّ أَثۡقَالَهُمۡ وَأَثۡقَالٗا مَّعَ
أَثۡقَالِهِمۡۖ وَلَيُسۡـَٔلُنَّ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عَمَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ
١٣ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ فَلَبِثَ فِيهِمۡ أَلۡفَ سَنَةٍ
إِلَّا خَمۡسِينَ عَامٗا فَأَخَذَهُمُ ٱلطُّوفَانُ وَهُمۡ ظَٰلِمُونَ ١٤

(٧): ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُكَفِّرَنَّ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ وَلَنَجۡزِيَنَّهُمۡ أَحۡسَنَ ٱلَّذِي كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ٧ ﴾:

﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُكَفِّرَنَّ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ ﴾ مانای ئەوەیە ئەوانەی خوا منەتی کردوە بەسەریاندا بە بڕواهێنانو کردەوەی چاک، خوا خراپەکانیان دەسڕێتەوە، چونکە چاکەکان خراپەکان لادەبەن، ﴿ وَلَنَجۡزِيَنَّهُمۡ أَحۡسَنَ ٱلَّذِي كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾ (واتە: بە باشتر لەوەی کە کردوویانە پاداشتیان دەدەینەوە)، ئەویش ئەنجامدانی کارە چاکەکانە لەوانەی پێویستو پەسندن، ئەوە چاکترین شتێکە بەندە ئەنجامی بدات.

(٨): ﴿ وَوَصَّيۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيۡهِ حُسۡنٗاۖ وَإِن جَٰهَدَاكَ لِتُشۡرِكَ بِي مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٞ فَلَا تُطِعۡهُمَآۚ إِلَيَّ مَرۡجِعُكُمۡ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ٨ ﴾:

﴿ وَوَصَّيۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيۡهِ حُسۡنٗا ﴾ واتە: فەرمانمان کردوە بە ئادەمیزاد کە چاکە بکات لەگەڵ دایکو باوکیدا بە کردارو گوفتار، وە بەردەوام بێ لەسەریو پارێزگاری لێبکات، وە سەرپێچیان نەکاتو لەگەڵیاندا خراپ نەبێ، ﴿ وَإِن جَٰهَدَاكَ لِتُشۡرِكَ بِي مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٞ ﴾ (واتە: ئەگەر دایکو باوکت هەوڵیان لەگەڵ دای بۆ ئەوەی هاوبەشم بۆ بڕیار بدەی)، وە هیچ کەس زانستی نیە بە ڕاستی هاوبەش دانان بۆ خوا، وە ئەمە بە مەزنداناني شیرک دەگرێتەوە، ﴿ فَلَا تُطِعۡهُمَآۚ إِلَيَّ مَرۡجِعُكُمۡ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴾ پاداشتتان دەدەمەوە بە پێی کردەوەکانتان، دەی ئێوەش چاک بن لەگەڵ دایکو باوکتانو گوێڕایەڵیان بکەن مەگەر لە سەرپێچی خواو پێغەمبەرەکەی نەبێ، ئەوە بێگومان گوێڕایەڵی خوا لە پێشترە بە سەر هەموو شتێکدا.

(٩): ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُدۡخِلَنَّهُمۡ فِي ٱلصَّٰلِحِينَ ٩ ﴾:

واتە: هەر کەسێ بڕوا بە خوا بێنێو کردەوەی چاک بکات ئەوە خوا پەیمانی

پێداوە بیخاتە نێو بەهەشتەکەیەوە، وە لە ڕیزی چاکەخوازان دایبنێ، لە پێغەمبەرانو ڕاستگۆیانو شەهیدانو پیاو چاکان، هەر یەکەو بە پێی پلەو پایەی خۆی لە لای خوا، جا ئیمانی ڕاستەقینەو کردەوەی چاک ناونیشانی کامەرانی خاوەنەکەیەتی، وە ئەو لە شوێنکەوتووانی خوای بە بەزەییە، وە یەکێکە لە بەندە چاکەکانی ئەو.

(١٠-١١): ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ فَإِذَآ أُوذِىَ فِى ٱللَّهِ جَعَلَ فِتْنَةَ ٱلنَّاسِ كَعَذَابِ ٱللَّهِ وَلَئِن جَآءَ نَصْرٌ مِّن رَّبِّكَ لَيَقُولُنَّ إِنَّا كُنَّا مَعَكُمْ أَوَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ بِمَا فِى صُدُورِ ٱلْعَٰلَمِينَ (١٠) وَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ (١١) ﴾:

خوا ﷻ باسی ئەوەی کردوە کە هەردەبێ ئەو کەسە تاقی بکاتەوە کە بانگەشەی ئیمانو بڕوا دەکات، بۆ ئەوەی ڕاستگۆ لە درۆزن دەرکەوێ، خوا ﷻ ڕوونی کردۆتەوە کە لە ناو خەڵکیدا دەستەیەک هەیە ئارام ناگرن لەسەر ناخۆشیەکان، وە چەسپاو نین لەسەر هەندێ لە بەڵاو نارەحەتیەکان، ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ فَإِذَآ أُوذِىَ فِى ٱللَّهِ ﴾ (واتە: هەندێ لە خەڵکی دەڵێن: بڕوامان بە خوا هێناوە ئنجا کاتێ سزا بدرێ لە پێناوی خوادا) بە ئازار دان، یان بە بردنیماڵو سامان، یان بە هەڕەشە کردن بۆ ئەوەی لە ئاینەکەی هەڵبگەڕێتەوەو شوێنی بەتاڵو پووچ بکەوێ، ﴿ جَعَلَ فِتْنَةَ ٱلنَّاسِ كَعَذَابِ ٱللَّهِ ﴾ واتە: ئازارو سزای خەڵکی دەیکاتە بەربەست لە بڕواهێنانو پابەند بوون لە سەری، هەروەکو چۆن سزا بەربەستە لەوەی کە هۆکاریێتی ﴿ وَلَئِن جَآءَ نَصْرٌ مِّن رَّبِّكَ لَيَقُولُنَّ إِنَّا كُنَّا مَعَكُمْ ﴾ واتە: (ئەگەر لە لایەن پەروەردگارتەوە سەرکەوتنێک بێت دڵنیابە ئەوانە دەڵێن: بێگومان ئێمە لەگەڵ ئێوەدا بووین)، چونکە گونجاوە لەگەڵ هەواو ئارەزوودا، جا ئەم کۆمەڵە لە خەڵکی لەوانەن خوا دەربارەیان فەرموویەتی: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعْبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرْفٍ فَإِنْ أَصَابَهُۥ خَيْرٌ ٱطْمَأَنَّ بِهِۦ وَإِنْ أَصَابَتْهُ فِتْنَةٌ ٱنقَلَبَ عَلَىٰ وَجْهِهِۦ خَسِرَ ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةَ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْخُسْرَانُ ٱلْمُبِينُ (١١) ﴾الحج، (واتە: وە لە ناو خەڵکدا کەسی وا هەیە خوا دەپەرستێ لە قەراغدا جا ئەگەر تووشی خێرو خۆشی بوو دڵخۆش دەبێ، وە ئەگەر تووشی تاقیکردنەوەو بەڵا بوو بەرەو دوا هەڵدەگەڕێتەوە پاشگەز دەبێتەوە لە ئایین زەرەرمەندی دونیاو قیامەت بووە تەنها ئەوەیە زیانو خەسارەتمەندی ڕوونو ئاشکرا).

﴿ أَوَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ بِمَا فِى صُدُورِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ (واتە: ئایا خوا زاناو ئاگادارتر نیە بەوەی لە دڵو دەروونی هەموو کەسدایە)، کاتێ هەواڵی پێداون دەربارەی ئەم دەستەیە، کە بارودۆخیان بەو شێوەیە هەروەکو چۆن وەسفی کردوە بۆتان، بەو جۆرە تەواوی

زانستی خواو بەرفراوانی حیكمەتی ئەوتان بۆ دەردەكەوێ.
(١١): ﴿ وَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ ءَامَنُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْمُنَافِقِينَ ﴾ لە بەر ئەمەیە بەڵاو تاقیكردنەوەی داناوە، بۆ ئەوەی زانستی ئاشكرا بێ دەربارەیان، بە پێی ئەو ئاشكرا بوونە پاداشتیان بداتەوە، نەک تەنها بە پێی زانستی، چونكە ئەوان بەڵگە دێننەوە لەسەر خوا ئەگەر تووشی بەڵاو تاقیكردنەوە ببوایەن پابەند دەبوون.
(١٢-١٣): ﴿ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِلَّذِينَ ءَامَنُوا اتَّبِعُوا سَبِيلَنَا وَلْنَحْمِلْ خَطَايَاكُمْ وَمَا هُم بِحَامِلِينَ مِنْ خَطَايَاهُم مِّن شَيْءٍ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴿١٢﴾ وَلَيَحْمِلُنَّ أَثْقَالَهُمْ وَأَثْقَالًا مَّعَ أَثْقَالِهِمْ وَلَيُسْأَلُنَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَمَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ ﴿١٣﴾ ﴾:
خوا هەواڵ دەدات دەربارەی درۆ هەڵبەستنی بێبروایان، وە بانگ كردنی بڕواداران كە شوێنی ئاینی ئەوان بكەون، وە لە نێو ئەوەدا ئاگادار كردنەوەی بڕوادارانی تێدایە لە بوغرا بوون پێیانو كەوتنە نێو فرتو فێڵەكانیان، خوا فەرموویەتی: ﴿ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِلَّذِينَ ءَامَنُوا اتَّبِعُوا سَبِيلَنَا ﴾ واز لە ئاینی خۆتان بێنن، یان لە هەندێكی، وە شوێنی ڕێبازو ئاینی ئێمە بكەون، ئێمە گرەنتی ئەوەتان پێ دەدەین ﴿ وَلْنَحْمِلْ خَطَايَاكُمْ ﴾ (واتە: تاوانەكانتان لە ئەستۆی ئێمەیە). ئەم كارە بە دەستی ئەوان نیە، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ وَمَا هُم بِحَامِلِينَ مِنْ خَطَايَاهُم مِّن شَيْءٍ ﴾ (واتە: ئەوانە هیچێک لە تاوانو گوناهی بڕواداران هەڵناگرن) نە بە كەمو نە بە زۆر، جا ئەم هەڵگرتنە ئەگەر خاوەنەكەیشی پێی ڕازی بێ ئەوە هیچ سوودێكی نیە، چونكە حەقو ڕاستی تەنها بۆ خوایە، وە خوا ﷻ دەسەڵاتی نەداوە بە بەندە هەڵسوكەوت لە مافی ئەودا بكات تەنها بە فەرمانو بڕیاری خۆی نەبێ، وە بڕیاری ئەو ﴿ أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴿٣٨﴾ ﴾النجم، (واتە: هیچ تاوانبارێک گوناهی تاوانبارێكی تر هەڵناگرێ).
كە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَمَا هُم بِحَامِلِينَ مِنْ خَطَايَاهُم مِّن شَيْءٍ ﴾ هەروەها هەندێجار خەیاڵی وا دەكرێ ئەو بێبروایانەی كە بانگەشەی خەڵكی دەكەن بۆ بێبرواییان- وە وێنەی ئەوان لەوەی خەڵكی بانگ دەكەن بۆ لای بەتاڵو پووچەكەی- هیچ تاوانێكیان لەسەر نیە جگە لەو گوناهەی كردوویانە، وە تاوانی ئەو كەسانەیشیان لەسەر نیە كە غەیری ئەوان كردوویانە، تەنانەت ئەگەر درابێتنە پاڵیشی، خوا هەواڵی دەربارەی ئەم گومانو خەیاڵە داوەو فەرموویەتی:
(١٣): ﴿ وَلَيَحْمِلُنَّ أَثْقَالَهُمْ ﴾ واتە: باری گرانی تاوانەكانیان هەڵدەگرن كە كردوویانە،

﴿ وَأَثْقَالًا مَّعَ أَثْقَالِهِمْ ﴾ ئەویش بریتیە لەو گوناهانەی کە بە هۆی ئەوانەوە ئەنجامدراوە، جا ئەو تاوانەی کەسی شوێنکەوتوو دەیکات، (شوێنکەوتراو) ئەو کەسەی خەڵکی شوێنی دەکەوێ، بەشێکی لەو تاوانەدا هەیە، ئەمە لەبەر ئەوەی شوێنکەوتوو کردەوەی خۆیەتیو خۆی ئەنجامیداوە، وە شوێنکەوتراو هۆکارێک بووە بۆ ئەنجامدانیو بانگەشەی بۆ کردوە، هەروەک چاکە ئەگەر شوێنکەوتوو ئەنجامی بدات ئەوە پاداشتی ئەنجامدانی هەیە، وە ئەو کەسەشی بانگی کردوە بۆی پاداشت وەردەگرێ بە هۆی ئەوەی هۆکار بووە بۆی، ﴿ وَلَيُسْـَٔلُنَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَمَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ ﴾ (واتە: وە بە ڕاستی لە ڕۆژی قیامەتدا پرسیاریان لێدەکرێ لەو درۆو دەلەسانەی لە دونیادا هەڵیان دەبەست)، لە شەڕو خراپەکاریو ڕازاندنەوەی، وە دەڵێن: ﴿ وَلْنَحْمِلْ خَطَايَاكُمْ ﴾.

(١٤-١٥): ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِ فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَامًا فَأَخَذَهُمُ الطُّوفَانُ وَهُمْ ظَالِمُونَ ﴿١٤﴾ فَأَنجَيْنَاهُ وَأَصْحَابَ السَّفِينَةِ وَجَعَلْنَاهَا آيَةً لِّلْعَالَمِينَ ﴿١٥﴾ ﴾:

﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِ ﴾ خوا هەواڵ دەدات دەربارەی حوکمو حیکمەتی لە سزادانی ئەو ئوممەتانەی پێغەمبەرانیان بە درۆ دادەنا، خوا بەندەو پێغەمبەری خۆی نووح ﷺ ناردووە بۆ ناو گەلەکەی، بانگی دەکردن بۆ یەکتاپەرستی بە تاک دانانی خوا بە بەندایەتی کردن و قەدەغەکردنی دانانی بتەکان ﴿ فَلَبِثَ فِيهِمْ ﴾ (واتە: لەناویاندا مایەوە) وەک پێغەمبەرێکی بانگخواز ﴿ أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَامًا ﴾ (واتە: نۆسەدو پەنجا ساڵ، هەزار ساڵ پەنجا کەم) ئەو ماندوو نەدەبوو لە بانگەوازو ئامۆژگاری کردنیان، بە درێژایی شەوو ڕۆژ بانگەوازی دەکردن، بە ئاشکراو بە نهێنی، بەڵام ئەوان هەر ژێر نەبوونو ڕێنماییان وەرنەگرت بەڵکو بەردەوام بووم لەسەر کوفرو لەسنوور دەرچوونیان هەتا پێغەمبەرەکەیان نووح ﷺ نزای لێکردن، لەگەڵ ئەو هەموو ئارامگرتنو لەسەر خۆییەی، جا فەرمووی: ﴿ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّارًا ﴿٢٦﴾ ﴾ نوح. (واتە: ئەی پەروەردگار لەسەر زەویدا هیچ کەسێکی بێبڕوا مەهێڵە) ﴿ فَأَخَذَهُمُ الطُّوفَانُ ﴾ واتە: ئەو ئاوەی کە لە ئاسمانەوە بە خێرایی دابەزی، وە لە زەویشەوە هەڵقوڵا ﴿ وَهُمْ ظَالِمُونَ ﴾ واتە: شایستەی سزا بوون.

فَأَنجَيۡنَٰهُ وَأَصۡحَٰبَ ٱلسَّفِينَةِ وَجَعَلۡنَٰهَآ ءَايَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ
١٥ وَإِبۡرَٰهِيمَ إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُۖ ذَٰلِكُمۡ
خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ١٦ إِنَّمَا تَعۡبُدُونَ مِن
دُونِ ٱللَّهِ أَوۡثَٰنٗا وَتَخۡلُقُونَ إِفۡكًاۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَعۡبُدُونَ مِن
دُونِ ٱللَّهِ لَا يَمۡلِكُونَ لَكُمۡ رِزۡقٗا فَٱبۡتَغُواْ عِندَ ٱللَّهِ ٱلرِّزۡقَ
وَٱعۡبُدُوهُ وَٱشۡكُرُواْ لَهُۥٓۖ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ١٧ وَإِن تُكَذِّبُواْ
فَقَدۡ كَذَّبَ أُمَمٞ مِّن قَبۡلِكُمۡۖ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ
ٱلۡمُبِينُ ١٨ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ كَيۡفَ يُبۡدِئُ ٱللَّهُ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ
يُعِيدُهُۥٓۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ١٩ قُلۡ سِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ
فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ بَدَأَ ٱلۡخَلۡقَۚ ثُمَّ ٱللَّهُ يُنشِئُ ٱلنَّشۡأَةَ ٱلۡأٓخِرَةَۚ
إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ٢٠ يُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَيَرۡحَمُ
مَن يَشَآءُۖ وَإِلَيۡهِ تُقۡلَبُونَ ٢١ وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ فِي
ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِۖ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن
وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ ٢٢ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَلِقَآئِهِۦٓ
أُوْلَٰٓئِكَ يَئِسُواْ مِن رَّحۡمَتِي وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ٢٣

(١٥): ﴿فَأَنجَيۡنَٰهُ وَأَصۡحَٰبَ ٱلسَّفِينَةِ﴾ (واتە: ئنجا نووحو كەسەكانی لە كەشتیەكەدا بوون ڕزگارمان كردن) ئەوانەی لەگەڵیدا سوار بوون، خاوخێزانیو ئەوانەشی لەگەڵیدا بڕوایان هێنا بوو ﴿وَجَعَلۡنَٰهَآ﴾ واتە: كەشتیەكە، یان چیرۆكی نووح ﴿ءَايَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ﴾ (واتە: بە نیشانەیەك بۆ جیهانیان) بۆ ئەوەی پەندی لێوەر بگرن، لە سەر ئەوەی هەر كەسێك پێغەمبەران بەدرۆ بزانێ سەرەنجام لەناو دەچێت، وە بڕوادارانیش خوا لە هەموو نارەحەتیەك دەرگایان بۆ دەكاتەوە، وە لە هەموو تەنگەبەریەك ڕزگاریان دەكات، هەروەها خوا خودی كەشتیەكەی كردوەتە بەڵگەو نیشانەیەك بۆ جیهانیان، بۆ ئەوەی بیكەن بە ڕەحمەتی خوا، كە هۆكارەكانی بۆ دانابوون، كاری كەشتیەكەی بۆ ئاسان كردنو كردنی بە مایەی هەڵگرتنیان، وە هەڵگرتنی كەلو پەلەكانیان، لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێكی دیكە، لە وڵاتێكەوە بۆ وڵاتێكی دیكە.

(١٦-٢٢): ﴿وَإِبۡرَٰهِيمَ إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُۖ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ
تَعۡلَمُونَ ١٦ إِنَّمَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوۡثَٰنٗا وَتَخۡلُقُونَ إِفۡكًاۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَعۡبُدُونَ
مِن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَمۡلِكُونَ لَكُمۡ رِزۡقٗا فَٱبۡتَغُواْ عِندَ ٱللَّهِ ٱلرِّزۡقَ وَٱعۡبُدُوهُ وَٱشۡكُرُواْ لَهُۥٓۖ إِلَيۡهِ
تُرۡجَعُونَ ١٧ وَإِن تُكَذِّبُواْ فَقَدۡ كَذَّبَ أُمَمٞ مِّن قَبۡلِكُمۡۖ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ
ٱلۡمُبِينُ ١٨ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ كَيۡفَ يُبۡدِئُ ٱللَّهُ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥٓۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ١٩
قُلۡ سِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ بَدَأَ ٱلۡخَلۡقَۚ ثُمَّ ٱللَّهُ يُنشِئُ ٱلنَّشۡأَةَ ٱلۡأٓخِرَةَۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ
كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ٢٠ يُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَيَرۡحَمُ مَن يَشَآءُۖ وَإِلَيۡهِ تُقۡلَبُونَ ٢١ وَمَآ أَنتُم
بِمُعۡجِزِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِۖ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ ٢٢
وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَلِقَآئِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ يَئِسُواْ مِن رَّحۡمَتِي وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ

﴿ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُواْ ٱقْتُلُوهُ أَوْ حَرِّقُوهُ فَأَنجَىٰهُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلنَّارِ ۚ إِنَّ
فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٢٤﴾ وَقَالَ إِنَّمَا ٱتَّخَذْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَوْثَٰنًا مَّوَدَّةَ بَيْنِكُمْ فِى
ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ ثُمَّ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكْفُرُ بَعْضُكُم بِبَعْضٍ وَيَلْعَنُ بَعْضُكُم بَعْضًا
وَمَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٢٥﴾ ۞ فَـَٔامَنَ لَهُۥ لُوطٌ ۘ وَقَالَ إِنِّى مُهَاجِرٌ إِلَىٰ رَبِّىٓ ۖ
إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٦﴾ ﴾:

﴿ وَإِبْرَٰهِيمَ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ ﴾ خوا ﷻ باسی ئەوە دەکات پێغەمبەری خۆی کە ئیبراهیمی خۆشەویستیەتی ناردوویەتی بۆ ناو گەلەکەی، بانگیان دەکات بۆ لای خوا، پێی فەرموون: ﴿ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ ﴾ واتە: بە تاکو تەنها بیپەرستن‌و فەرمانەکانی جێبەجێ بکەن ﴿ وَٱتَّقُوهُ ﴾ (لێی بترسن) کە خەشم‌و قینتان لێ هەڵبگرێ‌و سزاتان بدات، ئەویش بەهۆی تاوان‌و سەرپێچی کردنەوە ﴿ ذَٰلِكُمْ ﴾ واتە: بەندایەتی خواو ترسان لێی ﴿ خَيْرٌ لَّكُمْ ﴾ (چاکترە بۆتان) لەوازهێنان لێی، ئەمەش لە بابەتی بەکارهێنانی (أفعل التفضيل) بەوەی لە لایەنەکەی دیکەدا هیچ شتێ لەو جۆرە نیە، بە ڕاستی وازهێنانی لە پەرستشی خواو ترسان لێی، هیچ خێرو چاکەیەکی تێدا نیە بۆ خەڵکی، چونکە هیچ ڕێگایەک نیە بۆ بەدەستهێنانی بەخشندەیی خوا لە دنیاو دواڕۆژدا بە پەرستن‌و ترسان لە خوا نەبێ، وە هەموو خێرێک دەبینرێ لە دنیاو دواڕۆژدا، ئەوە لە شوێنەواری پەرستن‌و ترسانە لە خوا ﴿ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ (واتە: ئەگەر ئێوە بزانن) جا کاروبارەکان بزانن، تەماشا بکەن بزان چی لە پێشترە بە گرنگی پێدان، کاتێ فەرمانی پێکردوون بە پەرستن‌و ترسان لە خوا، بەندایەتی بتەکانی لێ قەدەغە کردوون، وە ناتەواوی‌و شایستە نەبوونیانی بۆ ڕوون کردونەتەوە، فەرموویەتی:

(١٧-١٨): ﴿ إِنَّمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْثَٰنًا وَتَخْلُقُونَ إِفْكًا ﴾ (واتە: بەڕاستی ئێوە لە جیاتی خوا بتانێک دەپەرستن‌و ئێوە درۆیەکی گەورە هەڵدەبەستن) هەڵیدەکۆڵن، وە بە دەستەکانتان دروستی دەکەن، ئنجا ناوی پەرستراوی لێ دەنێن، وە درۆ هەڵدەبەستن بە فەرمانکردن بە پەرستنیان‌و پەیوەست بوون پێیانەوە ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ (واتە: ئەوانەی ئێوە دەیانپەرستن بێجگە لە خوا) لە ناتەواویدا، ئەوە هیچ شتێکی تێدانیە، شایستەی پەرستن بێ، ﴿ لَا يَمْلِكُونَ لَكُمْ رِزْقًا ﴾ وەک ئەوەیە وترابێ: بە ڕاستی بۆمان دەرکەوت ئەم بتانە دروستکراوو ناتەواون، نە سوودیان بە دەستە نە زیان، نە مردن‌و نە ژیان‌و نە زیندووبوونەوە، وە ئەوەی ئەمە وەسفی بێت شیاوی کەمتر

کەمتــر کەمتــر بــە قــەد گەردیلەیەک پەرسـتن نیــە، دڵــەکان پێویســتە داوای پەرســتراوی بکــەنو داواکاریەکانیــان بەدیبێنن، بۆیــە فەرموویەتــی: ﴿ فَٱبۡتَغُواْ عِندَ ٱللَّهِ ٱلرِّزۡقَ ﴾ (واتە: کەواتــە داوای ڕزقو ڕۆزی لــە خــوا بکــە) بێگومــان ئەو کار ئاســەنکەرە بۆی، بــە توانایە، وەڵامــی ئــەو کەســە دەداتەوە کــە داوای لێــدەکات لە کاروبــاری دینــیو دونیایدا.

﴿ وَٱعۡبُدُوهُ ﴾ (بیپەرســتن) بــە تــاکو تەنها هیچ هاوبەشـێکی نیــە، چونکە تەواوە، ســوود زیــان بە دەســتی ئــەوە، تەنهایــە لــە بەڕێوەبردنــدا ﴿ وَٱشۡكُرُواْ لَهُۥٓ ﴾ (واتە: هەر سوپاســی ئــەو بکەن) بــە تاکو تەنهــا، چونکە هەمــوو ئەوانەی بە دروســتکراوەکان دەگــات لە نازو نیعمەتــەکان لــە لایــەن خواوەیــە، وە هەمــوو ئــەو بەربەســتانە لە بەڵاو ناخۆشــی لــە لایەن خواوەیــە، تەنها ئەو بەربەســتیان دەکات.

﴿ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴾ پاداشــتتان دەداتــەوە لەســەر ئەوەی کردووتانــە، وە هەواڵتــان دەداتێ بــەوەی شــاردووتانەتەوەو ئاشــکراتان کــردوە، بترســن لــەوەی بچنــە پێشــیو ئێوە لەســەر هاوبەشــدانان بــن، کار بکــەن بــەوەی لە خــوا نزیکتــان دەکاتەوە، پاداشــتتان دەداتــەوە لەو کاتــەی دەچنە پێشــی.

((١٨): ﴿ وَإِن تُكَذِّبُواْ فَقَدۡ كَذَّبَ أُمَمٞ مِّن قَبۡلِكُمۡۖ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ﴾ (واتــە: وە ئەگــەر ئێــوە بــڕوا نەهێنــن ئــەوە ئۆممەتەکانــی پێــش ئێــوەش بڕوایــان بــە پێغەمبەرەکانیــان نەهێنــا)).

(١٩): ﴿ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ كَيۡفَ يُبۡدِئُ ٱللَّهُ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥٓ ﴾ لــە ڕۆژی دواییدا ﴿ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ﴾، هــەروەک خــوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِي يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهۡوَنُ عَلَيۡهِ ﴿٢٧﴾ ﴾الروم، (واتــە: ئەو خــوا زاتێکــە بەدیهێنانی دەســت پێکردوە، لە پاشــان دووبــارە دروســتی دەکاتەوە، ئەمــە لای خوا زۆر ئاســانە).

(٢٠): ﴿ قُلۡ ﴾ پێیــان بڵــێ: ئەگــەر گومانێکتــان هەیــە لــە دروســتکردندا: ﴿ سِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾ (واتــە: بگەڕێــن بەســەر زەویــدا) بــە جەســتەو دڵەکانتــان، ﴿ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ بَدَأَ ٱلۡخَلۡقَ ﴾ (واتــە: ســەرنج بــدەن کە چــۆن دروســت کراوەکانی لە ســەرەتاوە دروســت کــردوە)، بێگومــان ئێــوە گەلانێــک دەبینن لــە نەوەکانــی ئادەمو گیــان لەبەران، بــەردەوام بونیــان هەیــە قۆنــاغ بــە قۆنــاغ، وە ڕووەکو دارو درەختــەکان دەبینــن، چــۆن دێنــە بوون کات لــە دوای کات، وە هــەورو بــاو وێنــەی ئەوانە دەبینــن بەردەوامن لــە تازەبوونەوەیاندا، بەڵکــو دروســتکراوەکان بــە بەردەوامــی لــە دروســتکردنو دووبارەبوونەوەدان.

سـەرنجیان بـدە لـە کاتی مردنی بچووکیـان کە خەوتنە، لەو کاتەی تاریکی شـەو هێرشـیان بـۆ دەکات، هەموویـان لە جوڵە دەکەونو دەنگیان لـێ دەبـڕێ، لەسـەر جێگاکانیان وەکو مـردوو وان، پاشـان ئـەوان بـەو شـێوەن بـە درێژایـی شـەوەکانیان، تـا ڕۆژ دادێـت، ئنجا دێـن بەخەبـەرداو زینـدوو دەبنەوە لـە مردنەکەیانو دەڵێـن: (الحَمْدُ للهِ الَّذِي أَحْيَانَـا بعْدَ مَا أماتَنَـا وإِلَيْـهِ النُّشُـورُ) (سـتایش بۆ ئـەو خوایەی زینـدووی کردینەوە پاش ئـەوەی مراندنیو گەڕانـەوە تەنهـا بـۆ لای ئـەوە)، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ ثُمَّ ٱللَّهُ ﴾ دوای دووبـارە ﴿ يُنشِئُ ٱلنَّشۡأَةَ ٱلۡأٓخِرَةَ ﴾ (واتـە: بـەدی دێنـی جارێکی تـر) ئەویـش ئـەو بەدیهێنانەیە کە قبووڵـی مـردنو خـەوو نـەکات، بەڵکـو زیندوویيو بـەردەوام بوونـە لە یەکێـک لەو دوو حاڵەتدا.

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴾ توانـاو دەسـەڵاتی خـوا هیـچ شـتێ لـە کاری ناخـات، هـەر وەکـو چۆن توانای هەیە بەسـەر سـەرەتای دروسـت کردن، توانای دەسـەڵاتی لەسـەر دووبارە دروسـتکردنەوە لە پێشـترە.

(٢١): ﴿ يُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَيَرۡحَمُ مَن يَشَآءُۖ ﴾ واتە: (خوا سـزای هەر کەسـێک دەدا کە بیەوێ، وە ڕەحمیـش دەکات بـە هەر کـەس کە بیـەوێ) خوا تـاکو تەنهایە بە بڕیاری پاداشـتی، ئەویـش پاداشـت دانـەوەی گوێڕایەڵانـەو ڕەحمیـان پێدەکات، وە سـزای سـەرپێچیکاران دەداتو دەیانـکات بـە پەنـد ﴿ وَإِلَيۡهِ تُقۡلَبُونَ ﴾ واتـە: دەگەڕێنـەوە بـۆ ئـەوماڵەی کە بڕیـاری سـزاو ڕەحمەتـی بەسـەرتاندا دێـت، جا لـەم دنیایـەدا هۆکارەکانـی ڕەحمەتی خوا بەدەسـت بێنن کـە بریتیە لـە گوێڕایەڵی کـردن، وە دوور بکەونەوە لە هۆکارەکانی سـزای خـوا، ئەویش سـەرپێچی کردنە.

(٢٢): ﴿ وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِۖ ﴾ واتـە: ئـەی بـە درۆدانـەران، ئەوانـەی چاونەتـرسو بوێـرن لەسـەر سـەرپێچی کـردن، وا مەزانـن خـوا بێئاگایـە لێتان، ئێـوە لـە دەسـتی خـوا دەرباز نابـن، نە لـە زەویو نە لە ئاسـمانەکان، بـا تواناو دەسـەڵاتتان یاخیتـان نـەکات، وە ئەوەی نەفـسو دەروونتان بۆتـان دەڕازێنێتـەوەو دەتـان خەڵەتێنێ، لە ڕزگـار بـوون لە سـزای خـوا، هەرگیـز دەربـاز نابن لـە خوا لـە هەمـوو جیهاندا.

﴿ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ ﴾ (واتـە: ئێـوە جگـە لـە خـوا هیـچ دۆسـتێکتان نیە) یارمەتیتـان بـدات، بەرژەوەنـدی دیـنو دونیاتـان بـۆ دەسـتەبەر بـکات ﴿ وَلَا نَصِيرٖ ﴾ سـەرخەرێک سـەرتان بخـات، ناخۆشـیەکانتان لەسـەر لا ببـات.

(٢٣-٢٦): ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَلِقَآئِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ يَئِسُواْ مِن رَّحۡمَتِي وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٢٣﴾ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوۡمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُواْ ٱقۡتُلُوهُ أَوۡ حَرِّقُوهُ فَأَنجَىٰهُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلنَّارِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿٢٤﴾ وَقَالَ إِنَّمَا ٱتَّخَذۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَوۡثَٰنٗا مَّوَدَّةَ بَيۡنِكُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ ثُمَّ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يَكۡفُرُ بَعۡضُكُم بِبَعۡضٖ وَيَلۡعَنُ بَعۡضُكُم بَعۡضٗا وَمَأۡوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٢٥﴾ ۞فَـَٔامَنَ لَهُۥ لُوطٞۘ وَقَالَ إِنِّي مُهَاجِرٌ إِلَىٰ رَبِّيٓۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٢٦﴾ ﴾:

﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَلِقَآئِهِۦٓ ﴾ خوا هەواڵ دەدات ئەوانە كێن خێریان بۆ نەماوەتەوەو شەڕو خراپەیان بەدەست هێناوە، ئەوانەن کە بێبڕواییان کردوە بە خواو پێغەمبەرەکانیو بەوەشی هێناویانە، ئەوانە بە دیداری خوا بێبڕوا بوون، هیچیان نیە جگە لە دونیا، لەبەر ئەمەیە هاوبەش دانانو گوناهیان بۆ خۆیان پێشخستووە، چونکە لە دڵەکانیاندا شتێک نیە بیانترسێنی لە سزای خوا، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ يَئِسُواْ مِن رَّحۡمَتِي ﴾ (واتە: ئەوانە لە بەزەیی من بێ ئومێد بوون) لەبەر ئەوە تەنها کاریان بە یەک هۆکار نەکرد ڕەحمەتی خوای پێ بەدەست بهێنن، ئەگەر تەماحیان هەبووایە لە میهرەبانی ئەودا، ئەوە کردەوەیان بۆ دەکرد، بێئومێد بوون لە ڕەحمەتو بەزەیی خوا لە گەورەترین مەترسیەکانە: ئەویش دوو جۆرە:

یەکەم: بێ ئومێد بوونی بێبڕوایان لێی، وە وازهێنانیان لە هەموو هۆکارەکان لە خوا نزیکیان بکاتەوە.

دووەم: بێ ئومێد بوونی سەرپێچیکاران بە هۆی تاوانە زۆرەکانیانەوە، تاوان دڵیانی داگیر کردوەو تووشی بێ ئومێدی کردوە.

﴿ وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴾ (واتە: ئەوانە سزای سەختیان بۆ هەیە) واتە: زۆر بە ئێش، ئەم دەقانە وەک ئەوە وایە ڕووبەڕووبوونەوەیەک بن لە نێوان قسەکانی ئیبراهیم عليه السلام بۆ گەلەکەیو وەڵامدانەوەی ئەوانیش بۆ ئیبراهیم عليه السلام، خوا زاناترە بەوە.

فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ ٱقْتُلُوهُ أَوْ حَرِّقُوهُ
فَأَنجَىٰهُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلنَّارِ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ
﴿٢٤﴾ وَقَالَ إِنَّمَا ٱتَّخَذْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَوْثَـٰنًا مَّوَدَّةَ بَيْنِكُمْ
فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ ثُمَّ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يَكْفُرُ بَعْضُكُم
بِبَعْضٍ وَيَلْعَنُ بَعْضُكُم بَعْضًا وَمَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ
وَمَا لَكُم مِّن نَّـٰصِرِينَ ﴿٢٥﴾ ۞ فَـَٔامَنَ لَهُۥ لُوطٌ ۘ وَقَالَ
إِنِّى مُهَاجِرٌ إِلَىٰ رَبِّىٓ ۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٦﴾
وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَـٰقَ وَيَعْقُوبَ وَجَعَلْنَا فِى ذُرِّيَّتِهِ
ٱلنُّبُوَّةَ وَٱلْكِتَـٰبَ وَءَاتَيْنَـٰهُ أَجْرَهُۥ فِى ٱلدُّنْيَا ۖ وَإِنَّهُۥ
فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿٢٧﴾ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ
إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلْفَـٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ
مِّنَ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٢٨﴾ أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ وَتَقْطَعُونَ
ٱلسَّبِيلَ وَتَأْتُونَ فِى نَادِيكُمُ ٱلْمُنكَرَ ۖ فَمَا كَانَ جَوَابَ
قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ ٱئْتِنَا بِعَذَابِ ٱللَّهِ إِن كُنتَ مِنَ
ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿٢٩﴾ قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِى عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٣٠﴾

(٢٤-٢٥): ﴿فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن﴾ واتــە: کاتــێ ئیبراهیــم ؑ بانگــی گەلەکــەی کــرد بــۆ لای پەروەردگــاری، بــۆ وەرگرتنــی بانگــەوازو ئامۆژگاریەکــەی، وە بینینــی نیعمەتــی خــوا بەســەریانەوە بــە ناردنــی بــۆ ناویــان، وەڵامــی گەلەکــەی خراپتریــن، وەڵام بــوو ﴿قَالُوا۟ ٱقْتُلُوهُ أَوْ حَرِّقُوهُ﴾ (واتــە: بیکــوژن یــان بیســووتێنن) ناشــرینترین کوشــتن، ئــەوان خەڵکانێکــی بــە توانــاو بــە دەســەڵات بــوون، خــاوەن پلــەو پایــە بــوون، هاویشــتیانە نــاو ئاگــرەوە، ﴿فَأَنجَىٰهُ ٱللَّهُ﴾ (خــوا ڕزگــاری کــرد لێــی.

﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ (واتــە: بێگومــان ئــەو (ڕزگــار بوونــە) چەندیــن بەڵگــەی تێدایــە بــۆ ئەوانــەی بــڕوا دەهێنــن) ئەوانــە پەیامــی پێغەمبــەرانو چاکــەو ئامۆژگاریــان بــە ڕاســت دەزانــن، وە بــە تاڵــی قســەی ئەوانــەی پێچەوانەیانــن، بەڕاســتی بەرهەڵســتکارانی پێغەمبــەران وەکــو ئــەوە وایــە وەســیەتیان بــۆ کرابــێ، وە هەندێکیــان هەندێکــی دیکەیــان هاندابــێ لەســەر بەدرۆدانــان.

(٢٥): ﴿وَقَالَ﴾ ئیبراهیــم ؑ لــە کــۆی ئــەو ئامۆژگاریانــەی کــە کــردی بۆیــان پێــی وتــن: ﴿إِنَّمَا ٱتَّخَذْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَوْثَـٰنًا مَّوَدَّةَ بَيْنِكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ واتــە: ئەوپــەری ئــەو خۆشەویســتیە، ســۆزداریەکی کاتیــە لــە دونیــادا لــە داهاتوویەکــی نزیکدا دەبڕێتــەوەو پەرشو بــڵاو دەبــێ ﴿ثُمَّ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يَكْفُرُ بَعْضُكُم بِبَعْضٍ وَيَلْعَنُ بَعْضُكُم بَعْضًا﴾ واتــە: هەریــەک پەرســتکەرو پەرســتراو خۆیــان بــەری دەکــەن لەیەکتــر ﴿وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُوا۟ لَهُمْ أَعْدَآءً وَكَانُوا۟ بِعِبَادَتِهِمْ كَـٰفِرِينَ ﴿٦﴾﴾ الأحقــاف (واتــە: کاتێکیــش خەڵــک کۆدەکرێنــەوە لــە قیامەتــدا پەرســتراوەکان دەبنــە دوژمنیــان، وە بــە پەرســتنەکەیان بــاوەڕ ناکــەن) چــۆن خۆیــان پەیوەســت دەکــەن بــە پەرســتراوێکەوە

کـە خـۆی بـەری دەکات لەوانـەی دەیپەرسـتن، وە نەفرینشـیان لـێ دەکات؟
وە شـوێن‌و جێگـای پەسـتکەرو پەرسـتراوەکان ﴿ ٱلنَّارُ ﴾ (ئاگـرە) هیـچ کەسـێک نیـە یارمەتیـان بـدات لـە سـزای خـوا، وە ناتوانـێ ڕەتیشـی بکاتـەوە.
(٢٦): ﴿ فَـَٔامَنَ لَهُۥ لُوطٌ ﴾ واتـە: ئیبراهیـم ﷺ بـەردەوام بانگـەوازی گەلەکـەی دەکـرد، ئەوانیـش بـەردەوام بـوون لەسـەر عینادیـان، بـەڵام ئـەوە نەبـێ بـە بانگەوازەکـەی لـوط بـڕوای هێنـا، کـە خـوا کـردی بـە نێـردراو نـاردی بـۆ نـاو گەلەکـەی، هـەر وەکـو بەم نزیکانـە بـاس دەکـرێ.
﴿ وَقَالَ ﴾ کاتـێ ئیبراهیـم ﷺ بینـی بانگـەوازی هیـچ سـوودیان پێناگەیەنـێ، فەرمووی: ﴿ إِنِّى مُهَاجِرٌ إِلَىٰ رَبِّىٓ ﴾ واتـە: لـە زەوی پـڕ لـە خراپـەکاری کۆچـی کـرد بـۆ زەوی پیـرۆز، ئەویـش شـامە.
﴿ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَزِيزُ ﴾ واتـە: ئـەو خوایـەی خـاوەن هێـزە، ئـەو توانـای هەیـە لەسـەر هیدایەتدانیـان، بـەڵام ﴿ ٱلْحَكِيمُ ﴾ حیکمەتـی وا دەخـوازێ، کاتـێ دووری خسـتنەوەو جیـای کردنـەوە، ئـەوان بـەو حاڵەیانـەوە بـوون، خـوا باسـی ئـەوەی نەکـردوە لـە نـاوی بردبـن بـە سـزا، بەڵکـو باسـی کەنارگیـری ئیبراهیـم ﷺ دەکات لـەو گەلـە، وە کـۆچ کردنـی لـە نێوانیـان.
بـەڵام ئـەوە باسـکراوە لـە ئیسـرائیلیەکانەوە، خـوا دەرگـای مێشـولەی بەسـەر گەلەکەیدا کـردەوە، خوێنیانـی خـواردەوەو گۆشـتەکەیانی خـوارد، لـە سـەرەتا تـا کۆتـا لـە نـاوی بـردن، ئەمـەش لەسـەر بەڵگـەی شـەرعی یەکلاکـەرەوە وەسـتاوە، بەڵگـەش لەوبارەیـەوە نیـە، جـا ئەگـەر خـوا لـە ناویانـی بردبایـە بـە سـزا، ئـەوە باسـی دەکـرد، هـەروەک باسـی لـە نـاو بردنـی ئـەو ئوممەتـە بـە درۆ دانەرانـەی کـرد، بـەڵام دەگونجـێ نهێنـی ئـەوە لـەوەدا بێـت ئیبراهیمـی خەلیـل لـە بەسـۆزترین‌و چاکتریـن‌و لەسـەرخۆ تریـن‌و گەورەترینـی دروسـتکراوەکان بێـت، دوعـای لـە گەلەکـەی نەکـرد وەک چـۆن جگـە لـە ئـەو دوعایـان کـرد، خـوای گـەورەش بـە هـۆی ئـەوەوە سـزای گشـتگیری نـەدان، وە ئـەوەی دەبێـت بـە بەڵگـە لەسـەر ئـەوە، ئیبراهیـم ﷺ قسـەی لەگـەڵ فریشـتەکاندا کـرد دەربـارەی لـە نـاو بردنـی گەلەکـەی لـوط ﷺ، وە مشـتومڕی لەگەڵـدا کـردن‌و بەرگـری لێکـردن، لـە کاتێکـدا ئـەوان گەلـی ئـەو نەبـوون، خـوا زاناتـرە.
(٢٧): ﴿ وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَـٰقَ وَيَعْقُوبَ وَجَعَلْنَا فِى ذُرِّيَّتِهِ ٱلنُّبُوَّةَ وَٱلْكِتَـٰبَ وَءَاتَيْنَـٰهُ أَجْرَهُۥ فِى

ٱلدُّنۡيَاۖ وَإِنَّهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٢٧﴾ ﴾:

﴿ وَوَهَبۡنَا لَهُۥٓ إِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ ﴾ واتـە: (بەخشـیمان بـە ئیبراهیـم ئیسـحاقو یەعقـووب) پـاش ئـەوەی کۆچـی کـرد بـۆ شـام ﴿ وَجَعَلۡنَا فِي ذُرِّيَّتِهِ ٱلنُّبُوَّةَ وَٱلۡكِتَٰبَ ﴾ هیـچ پێغەمبەرێـک نەهاتـووە لـە دوای ئـەو بێگومـان لـە نـەوەی ئـەو بـووە، وە کتێبیـش تەنهـا بـۆ نـەوەی ئـەو دابەزیـوە، هەتـا کۆتاییـان هێنـا بـە پێغەمبـەر موحەممـەد ﷺ، وە لەسـەر هەموویـان بـە گشـتی.

ئەمـە لـە مەزنتریـن ڕێـزو شـانازیەکانە، کـە بنچینـەی هیدایـەتو ڕەحمـەتو خۆشـبەختیو سـەرفرازی لـە نەوەکانـی ئـەودا بـێ، وە لەسـەر دەسـتی ئـەوان هیدایەتـدراوان هیدایـەتو ڕێنماییـان وەرگرتـوە، وە بـڕواداران ئیمانیـان هێنـاوە، وە چاکـەکاران چاکەیـان کـردوە ﴿ وَءَاتَيۡنَٰهُ أَجۡرَهُۥ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ ﴾ واتـە: وە لـە دنیـادا پاداشـتمان دایـەوە، لـە ژنـی جـوان بەوپـەڕی جوانـی، وە ڕزقو ڕۆزی بەرفـراوان، وە منـداڵان کـە بـوون بـە ڕۆشـنایی چـاوی، وە ناسـینی خـواو خۆشویسـتنیو گوێڕایەڵـی کردنـی ﴿ وَإِنَّهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾ بەڵکـو ئیبراهیـمو موحەممـەد ﷺ چاکترینـی چاکەکارانـن بـە ڕەهایـی، پلـەو پایەیـان لـە هەموویـان بەرزتـرە، خـوا ﷻ بـۆی کـۆ کردۆتـەوە لـە نێـوان خۆشـبەختی دونیـاو دوارۆژدا.

(٢٨-٣٥): ﴿ وَلُوطًا إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِۦٓ إِنَّكُمۡ لَتَأۡتُونَ ٱلۡفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا
مِنۡ أَحَدٖ مِّنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٢٨﴾ أَئِنَّكُمۡ لَتَأۡتُونَ ٱلرِّجَالَ وَتَقۡطَعُونَ ٱلسَّبِيلَ وَتَأۡتُونَ
فِي نَادِيكُمُ ٱلۡمُنكَرَۖ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوۡمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُواْ ٱئۡتِنَا بِعَذَابِ ٱللَّهِ
إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٢٩﴾ قَالَ رَبِّ ٱنصُرۡنِي عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿٣٠﴾ وَلَمَّا
جَآءَتۡ رُسُلُنَآ إِبۡرَٰهِيمَ بِٱلۡبُشۡرَىٰ قَالُوٓاْ إِنَّا مُهۡلِكُوٓاْ أَهۡلِ هَٰذِهِ ٱلۡقَرۡيَةِۖ إِنَّ أَهۡلَهَا كَانُواْ
ظَٰلِمِينَ ﴿٣١﴾ قَالَ إِنَّ فِيهَا لُوطٗاۚ قَالُواْ نَحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَن فِيهَاۖ لَنُنَجِّيَنَّهُۥ وَأَهۡلَهُۥٓ إِلَّا ٱمۡرَأَتَهُۥ
كَانَتۡ مِنَ ٱلۡغَٰبِرِينَ ﴿٣٢﴾ وَلَمَّآ أَن جَآءَتۡ رُسُلُنَا لُوطٗا سِيٓءَ بِهِمۡ وَضَاقَ بِهِمۡ ذَرۡعٗا
وَقَالُواْ لَا تَخَفۡ وَلَا تَحۡزَنۡۖ إِنَّا مُنَجُّوكَ وَأَهۡلَكَ إِلَّا ٱمۡرَأَتَكَ كَانَتۡ مِنَ ٱلۡغَٰبِرِينَ ﴿٣٣﴾
إِنَّا مُنزِلُونَ عَلَىٰٓ أَهۡلِ هَٰذِهِ ٱلۡقَرۡيَةِ رِجۡزٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ ﴿٣٤﴾ وَلَقَد
تَّرَكۡنَا مِنۡهَآ ءَايَةَۢ بَيِّنَةٗ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾:

لـە پێشـەوە باسـکرا کـە لـووط ؑ بـڕوای هێنـا بـە پێغەمبـەر ئیبراهیـم ؑ، وە بـوو بـە یەکێـک لـە هیدایـەت دراوان، وە باسـیان کـردوە کـە ئـەو یەکێـک نیـە لـە

نه‌وه‌كانـی ئیبراهیـم ﷺ به‌ڵكـو بـرازای ئیبراهیمـه‌، جـا خـوا ده‌فه‌رمـوێ: ﴿وَجَعَلْنَا فِى ذُرِّيَّتِهِ ٱلنُّبُوَّةَ وَٱلْكِتَٰبَ﴾ ئه‌گه‌رچـی گشـتیه پێچه‌وانـه‌ی ئـه‌وه نیـه كـه لـووط ﷺ پێغه‌مبه‌رێكـی نێـردراوه‌و لـه نـه‌وه‌ی ئیبراهیـم نیـه‌، چونكـه ده‌قه‌كـه لـه سـیاقی وه‌سـف‌و سـتایش كردنـی ئیبراهیمـی خه‌لیلـدا هاتـووه‌، وه هه‌واڵیـداوه كـه لـووط ﷺ له‌سـه‌ر ده‌سـتی ئیبراهیـم ﷺ هیدایه‌تـی وه‌رگرتـووه‌، وه هه‌ركه‌سێك له‌سـه‌ر ده‌سـتی هیدایـه‌ت وه‌ربگـرێ، ته‌واوتـره لـه‌وه‌ی كـه لـه ڕووی نه‌سـه‌ب‌و ڕه‌چه‌ڵه‌كـه‌وه هیدایه‌تی وه‌رگرتبـێ بـه نیسـبه‌تی چاكـه‌ی هیدایـه‌ت ده‌ر، وه خـوا زاناتـره‌.

خـوا لووطـی نـارد بـۆ نـاو گه‌له‌كـه‌ی، ئـه‌وان له‌گـه‌ڵ ئـه‌وه‌ی هاوبه‌شـیان بـۆ خـوا داده‌نـا، كۆیـان كردبـوه‌وه لـه نێـوان كاری ناشـرین‌و قیـزه‌ون لـه نێربـازی، وه ڕێگـا بریـن لـه ڕێبـواران، وه بـڵاو بوونـه‌وه‌ی خراپـه‌كاری لـه كـۆڕو كۆمه‌ڵه‌كانیانـدا، جـا لـووط ئامۆژگـاری كـردن ده‌رباره‌ی ئـه‌م كاروبارانـه‌، خراپـی‌و قیزه‌ونـی تاوانه‌كانی بۆیان ڕوون كـرده‌وه‌، وه ئه‌وه‌یشـی ئامـاژه‌ی پێده‌كـرێ لـه سـزایه‌كی زۆر توونـد، بـه‌ڵام ئه‌وان نـه گوێیـان گـرت‌و نـه بیریـان كـرده‌وه‌، ئـه‌وان كوریـان لـه كـور مـاره ئه‌كـرد ﴿فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ ٱئْتِنَا بِعَذَابِ ٱللَّهِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ (واتـه: كه‌چـی وه‌ڵامـی گه‌له‌كـه‌ی ته‌نهـا ئـه‌وه بـوو كـه بـه لووطیـان گـوت: سـزای خوامـان بـۆ بێنـه ئه‌گـه‌ر تـۆ لـه ڕاسـتگۆیانی).

پێغه‌مبه‌ره‌كه‌یـان لێیـان بـێ هیـوا بـوو، وه زانی شایسـته‌ی ئـه‌وه‌ن سـزا بدرێـن، وه ئارامی لـێ بـرا لـه توونـدی بـه درۆزانینیـان، بۆیـه نـزای لێكـردن: ﴿قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِى عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْمُفْسِدِينَ﴾ خـوای گـه‌وره‌ش وه‌ڵامـی نزاكـه‌ی دایـه‌وه‌، فریشـته‌ی نـارد بـۆ لـه نـاو بردنیـان، پێشـتر تێپه‌ڕیـن بـه لای ئیبراهیمـداو مـژده‌ی ئیسـحاقیان پێـداو دوای ئه‌ویـش یه‌عقووب،

وَلَمَّا جَآءَتۡ رُسُلُنَآ إِبۡرَٰهِيمَ بِٱلۡبُشۡرَىٰ قَالُوٓاْ إِنَّا مُهۡلِكُوٓاْ
أَهۡلِ هَٰذِهِ ٱلۡقَرۡيَةِۖ إِنَّ أَهۡلَهَا كَانُواْ ظَٰلِمِينَ ٣١
قَالَ إِنَّ فِيهَا لُوطٗاۚ قَالُواْ نَحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَن فِيهَاۖ لَنُنَجِّيَنَّهُۥ
وَأَهۡلَهُۥٓ إِلَّا ٱمۡرَأَتَهُۥ كَانَتۡ مِنَ ٱلۡغَٰبِرِينَ ٣٢ وَلَمَّآ
أَن جَآءَتۡ رُسُلُنَا لُوطٗا سِيٓءَ بِهِمۡ وَضَاقَ بِهِمۡ ذَرۡعٗاۖ
وَقَالُواْ لَا تَخَفۡ وَلَا تَحۡزَنۡ إِنَّا مُنَجُّوكَ وَأَهۡلَكَ إِلَّا
ٱمۡرَأَتَكَ كَانَتۡ مِنَ ٱلۡغَٰبِرِينَ ٣٣ إِنَّا مُنزِلُونَ عَلَىٰٓ أَهۡلِ
هَٰذِهِ ٱلۡقَرۡيَةِ رِجۡزٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ
٣٤ وَلَقَد تَّرَكۡنَا مِنۡهَآ ءَايَةَۢ بَيِّنَةٗ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ
٣٥ وَإِلَىٰ مَدۡيَنَ أَخَاهُمۡ شُعَيۡبٗا فَقَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ
وَٱرۡجُواْ ٱلۡيَوۡمَ ٱلۡأٓخِرَ وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ
٣٦ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دَارِهِمۡ
جَٰثِمِينَ ٣٧ وَعَادٗا وَثَمُودَاْ وَقَد تَّبَيَّنَ لَكُم
مِّن مَّسَٰكِنِهِمۡۖ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ
فَصَدَّهُمۡ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَكَانُواْ مُسۡتَبۡصِرِينَ ٣٨

پاشان ئیبراهیم ﷺ پرسیاری لێکردن چیتان دەوێ؟ ئەوانیش وەڵامیان دایەوە کە دەیانەوێ گەلەکەی لووط لە ناو بەن، ئنجا ئیبراهیم ﷺ داوای گەڕانەوەی لێکردنو فەرمووی:

(٣٢): ﴿إِنَّ فِيهَا لُوطًا﴾ (واتە: بێگومان لووط لەو شارەدایە) فریشتەکانیش پێیانوت: ﴿لَنُنَجِّيَنَّهُۥ وَأَهۡلَهُۥٓ إِلَّا ٱمۡرَأَتَهُۥ كَانَتۡ مِنَ ٱلۡغَٰبِرِينَ﴾ (واتە: سوێند بە خوا ئێمە لووطو ئەندامانی خێزانەکەی ڕزگار دەکەین جگە لە ژنەکەی کە لە جێماوان دەبێ)، پاشان ڕۆیشتن هەتا گەیشتن بە لووط

(٣٣): ﴿وَلَمَّآ أَن جَآءَتۡ رُسُلُنَا لُوطٗا سِيٓءَ بِهِمۡ وَضَاقَ بِهِمۡ ذَرۡعٗا وَقَالُواْ﴾ بە هاتنیان تێکچوو زۆر دڵتەنگو نارەحەت بوو، چونکە ئەو نەیانی ناسی، وا گومانی برد کە ئەوانە لە کۆمەڵی ڕێبوارو میوانەکانن، بۆیە لێیان ترسا لە گەلەکەی، فریشتەکانیش پێیان وت: ﴿لَا تَخَفۡ وَلَا تَحۡزَنۡ﴾ (واتە: مەترسەو خەم مەخۆ) هەواڵیان پێدا کە ئەوان نێردراوی خوان ﴿إِنَّا مُنَجُّوكَ وَأَهۡلَكَ إِلَّا ٱمۡرَأَتَكَ كَانَتۡ مِنَ ٱلۡغَٰبِرِينَ ٣٣ إِنَّا مُنزِلُونَ عَلَىٰٓ أَهۡلِ هَٰذِهِ ٱلۡقَرۡيَةِ رِجۡزٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ﴾ (واتە: بێگومان ئێمە تۆو خێزانەکەت ڕزگار دەکەین جگە لە ژنەکەت کە ئەو لە جێماوان دەبێ * بەڕاستی ئێمە دەبارێنین بەسەر دانیشتوانی ئەم شارەدا سزایەک لە ئاسمانەوە لەبەر ئەوەی لە فەرمانی خوا دەرچوون).

فریشتەکان فەرمانیان بە لووط کرد شەوڕۆیی بە خانەوادەکەی بکات، کاتێ ڕۆژیان کردەوە خوا وڵاتەکەیانی هەڵگێڕایەوە، ژێرو ژووری کرد، وە بارانێکی باراند بەسەریاندا لە وورده زیخی گڵین بە دوای یەکتردا، هەتا لەناوی بردن، ئنجا کوێر بوونەوەو بوون بە پەندێ لە پەندەکان.

(٣٥): ﴿وَلَقَد تَّرَكۡنَا مِنۡهَآ ءَايَةَۢ بَيِّنَةٗ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ﴾ واتە: لەو شارە بەجێماوەی

لووطـدا شـوێنەوارێکی ڕوونمـان بەجێهێشـت بۆ گـەلو کۆمەڵـێ کە پەنـدو ئامۆژگاری بە دڵەکانیـان وەربگـرن، هەروەکو خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ وَإِنَّكُمْ لَتَمُرُّونَ عَلَيْهِم مُّصْبِحِينَ ۝١٣٧ وَبِالَّيْلِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ۝١٣٨ ﴾الصافات، (واتە: بەڕاسـتی ئێوە دەڕۆن بەسـەر شـوێنەکانیاندا بە بەیانیانـدا * وە بـە شـەودا ئایا ئیتر ژیـر نابن).

(٣٦-٣٧): ﴿ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱرْجُوا۟ ٱلْيَوْمَ ٱلْـَٔاخِرَ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ۝٣٦ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُوا۟ فِى دَارِهِمْ جَٰثِمِينَ ۝٣٧ ﴾

﴿ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ ﴾ واتـە: وە ناردمـان بۆ ئەو گەلـە ناسـراوە ﴿ شُعَيْبًا ﴾ فەرمانی پێکردن بـە بەندایەتـی خوای تـاکو تەنهای بـێ هـاوەڵ، وە بڕواهێنان بـە زیندوو بوونـەوەو هیوای ڕۆژی دوایـیو کار بـۆ کردنـی، وە ڕێگـری لێکـردن لـە خراپەکاریـیو ڕۆچوون لەسـەر زەویـدا، بـە کـەم پێوانەو کێشـانە کردنو ماڵـی خەڵکی بە کـەم زانین، وە هەوڵـدان بۆ ڕێگا بڕیـن، ئـەوان بە درۆیـان داناو بڕوایان پێ نەهێنا، ئەوسـا سـزای خـوا گرتنی ﴿ فَأَصْبَحُوا۟ فِى دَارِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴾ (واتـە: بـە هۆی ئەوەوە لـە خانووەکانی خۆیانـدا ئەژنۆیاندا دابوو مردن).

(٣٨-٤٠): ﴿ وَعَادًا وَثَمُودَا۟ وَقَد تَّبَيَّنَ لَكُم مِّن مَّسَٰكِنِهِمْ ۖ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَكَانُوا۟ مُسْتَبْصِرِينَ ۝٣٨ وَقَٰرُونَ وَفِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ ۖ وَلَقَدْ جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا كَانُوا۟ سَٰبِقِينَ ۝٣٩ فَكُلًّا أَخَذْنَا بِذَنۢبِهِۦ ۖ فَمِنْهُم مَّنْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِ حَاصِبًا وَمِنْهُم مَّنْ أَخَذَتْهُ ٱلصَّيْحَةُ وَمِنْهُم مَّنْ خَسَفْنَا بِهِ ٱلْأَرْضَ وَمِنْهُم مَّنْ أَغْرَقْنَا ۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ۝٤٠ ﴾

﴿ وَعَادًا وَثَمُودَا۟ وَقَد تَّبَيَّنَ لَكُم مِّن مَّسَٰكِنِهِمْ ﴾ واتـە: بـە هەمـان شـێوە گەلـی عادو ثمودیشـمان لـە ناوبرد، کـە بێگومـان چیرۆکەکەیانتـان زانیوە، وە شـتێکتان بۆ ڕوون بوەتـەوە بـە چاوەکانـی خۆتان دەیبینن، لـە شـوێنەوارو جێگا وێـران کراوەکانیان، بە ڕاسـتی ئـەوان پێغەمبەرانیان بۆ هات بـە ئایەتو نیشـانە ڕوونەکانەوە، کە سـوودیان هەیە بۆ بەرچـاو ڕوونـی، بەڵام ئـەوان بەدرۆیـان زانینو مشـتومڕو دەمـە دەمێیان لەگەڵـدا کردن. ﴿ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ ﴾ (واتـە: شـەیتان کـردەوە خراپەکانیانـی بـۆ ڕازانـدەوە) تەنانـەت وا گومانیـان بـرد کـە ئـەوان چاکتـرن لـە پێغەمبـەران،

وَقَٰرُونَ وَفِرۡعَوۡنَ وَهَٰمَٰنَۖ وَلَقَدۡ جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ
فَٱسۡتَكۡبَرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا كَانُواْ سَٰبِقِينَ ﴿٣٩﴾
فَكُلًّا أَخَذۡنَا بِذَنۢبِهِۦۖ فَمِنۡهُم مَّنۡ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِ حَاصِبٗا
وَمِنۡهُم مَّنۡ أَخَذَتۡهُ ٱلصَّيۡحَةُ وَمِنۡهُم مَّنۡ خَسَفۡنَا بِهِ
ٱلۡأَرۡضَ وَمِنۡهُم مَّنۡ أَغۡرَقۡنَاۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظۡلِمَهُمۡ
وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴿٤٠﴾ مَثَلُ ٱلَّذِينَ
ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوۡلِيَآءَ كَمَثَلِ ٱلۡعَنكَبُوتِ
ٱتَّخَذَتۡ بَيۡتٗاۖ وَإِنَّ أَوۡهَنَ ٱلۡبُيُوتِ لَبَيۡتُ ٱلۡعَنكَبُوتِۚ
لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ﴿٤١﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا يَدۡعُونَ مِن
دُونِهِۦ مِن شَيۡءٖۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٤٢﴾ وَتِلۡكَ
ٱلۡأَمۡثَٰلُ نَضۡرِبُهَا لِلنَّاسِۖ وَمَا يَعۡقِلُهَآ إِلَّا ٱلۡعَٰلِمُونَ
﴿٤٣﴾ خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ
لَأٓيَةٗ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٤٤﴾ ٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ
وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَۖ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ
وَٱلۡمُنكَرِۗ وَلَذِكۡرُ ٱللَّهِ أَكۡبَرُۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تَصۡنَعُونَ ﴿٤٥﴾

وە بەهەمـان شـێوە قـاروونو فیرعـەونو هامان کاتێ خوا مووسـای کـوڕی عیمرانی بۆیـان نـارد، بەبەڵگـە ڕوونو ئاشـکراو یەکلاکەرەوەکانـەوە، ئـەوان هەرگیـز ملکەچـی نەبـوون، وە خۆیـان بـە گـەورە دەزانـی لەسـەر زەویـدا بەسـەر بەندەکانـی خـواداو زەلیلیـان کردن، وەحەقو ڕاسـتیان ڕەتکـردەوە کاتێکیـش کـە سـزایان بـۆ دابـەزی نەیانتوانـی خۆیـان ڕزگـار بکـەن ﴿ وَمَا كَانُواْ سَٰبِقِينَ ﴾ (واتـە: نەشـیان توانـی دەربچـن) لـە دەسـتی خـوا، بەڵکـو خۆیانـدا بـە دەسـتەوە.

﴿ فَكُلًّا ﴾ ئـەو گەلـە بـە درۆ دانەرانەمان ﴿ أَخَذۡنَا بِذَنۢبِهِۦ ﴾ (واتـە: بەهـۆی تاوانـی خۆیانـەوە لەنـاو بـرد) هـەر گەلـەو بـە پێـی ئەنـدازەی خـۆی، وە بـە سـزایەکی گونجاو ﴿ فَمِنۡهُم مَّنۡ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِ حَاصِبٗا ﴾ واتە: سـزایەک بـەرد بارانیان بـکاتو لەناویان ببات وەکـو گەلی عـاد، کاتێ کە خـوا ﷻ بایەکـی نەزۆکی بۆیان نـارد، ﴿ سَخَّرَهَا عَلَيۡهِمۡ سَبۡعَ لَيَالٖ وَثَمَٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومٗاۖ فَتَرَى ٱلۡقَوۡمَ فِيهَا صَرۡعَىٰ كَأَنَّهُمۡ أَعۡجَازُ نَخۡلٍ خَاوِيَةٖ ﴿٧﴾ ﴾ الحاقـة، (واتـە: خـوا زاڵـی کرد بە سـەریاندا حەوت شـەوو هەشـت ڕۆژ بەبـێ ووچان ئـەو گەلەت دەبینـی لـەو ماوەیەدا بـێ گیان کەوتبـوو وەک قـەدی دارخورمـای گەندەڵ).

﴿ وَمِنۡهُم مَّنۡ أَخَذَتۡهُ ٱلصَّيۡحَةُ ﴾ وەک گەلـی صالـح ﴿ وَمِنۡهُم مَّنۡ خَسَفۡنَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ ﴾ وەک قـاروون، ﴿ وَمِنۡهُم مَّنۡ أَغۡرَقۡنَا ﴾ وەک فیرعـەونو هامـانو سـەربازەکانیان ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ ﴾ واتـە: ناگونجـێو شایسـتە نیـە خوای بـەرزو مەزن سـتەمیان لێبـکات، بە هۆی دادپـەروەرە تەواوەوەو بێنیـاز بوونی لە هەمـوو بەدیهێنراوەکان، ﴿ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴾ (واتـە: بەڵکـو خۆیان سـتەمیان لەخۆیان کرد) ڕێگـری مافەکانیـان لێکـرد کـە ئەویـش ئەوەیـە ئـەو بـۆ بەندایەتی خـوای تـاکو تەنها دروسـت کـراوە، بـەڵام ئـەوان لە جێگایەکـی دیکـەدا بەکاریان هێنـا، وە سـەرقاڵیان کرد

بــە ئــارەزوو بازیو ســەرپێچی كردن، كاتــێ واگومانیان برد ئەوان ســوودی پــێ دەگەیەنن.
(٤١-٤٣): ﴿ مَثَلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْلِيَآءَ كَمَثَلِ ٱلْعَنكَبُوتِ ٱتَّخَذَتْ بَيْتًاۖ وَإِنَّ أَوْهَنَ ٱلْبُيُوتِ لَبَيْتُ ٱلْعَنكَبُوتِۖ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ ﴿٤١﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ مِن شَيْءٍۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٤٢﴾ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِۖ وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَٰلِمُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾:

﴿ مَثَلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْلِيَآءَ كَمَثَلِ ٱلْعَنكَبُوتِ ٱتَّخَذَتْ بَيْتًا ﴾ ئەمــە نموونەیەكــە خــوا ﷻ هێناویەتیــەوە بــۆ كەســێ كــە لەگــەڵ خــوادا شــتێكی دیكــە دەپەرســتێ، مەبەســتی پێــی ســەربەرز بــوونو بەهێــز كــردنو ســوود وەرگرتنــە، بێگومان كارەكــە بــەو شــێوەیە نیــە، بەڵكو كارەكــە بــە پێچەوانەی مەبەســتی ئــەوە، نموونــەی ئەو كەســە وەكــو جاڵجاڵۆكــە وایــە ماڵێكــی بۆ خۆی دروســت كــردوە، بــۆ ئــەوەی بیپارێزێ لــە گەرمــاو ســەرماو بــەلاو نارەحەتیــەكان، واتــە: ﴿ وَإِنَّ أَوْهَنَ ٱلْبُيُوتِ ﴾ بە ڕاســتی لاوازتریــن ﴿ لَبَيْتُ ٱلْعَنكَبُوتِ ﴾ (مــاڵ ماڵــی جاڵجاڵۆكەیــە) جاڵجاڵۆكــە یەكێكــە لەو گیــان لەبــەرە لاوازانە، ماڵەكەیشــی بــە لاوازترین مــاڵ دادەنــرێ، جا بە دروســتكردنی هیچ زیــاد نــاكات تەنهــا لاوازی نەبــێ. بەهەمــان شــێوە ئــەو كەســانەی جگە لــە خوا شــتانێكی دیكــە دەكــەن بە دۆســت هەژارو بــێ توانان لــە هەمــوو ڕوویەكــەوە، وە كاتــێ دەیانكەن بــە دۆســت لــە جیاتــی خــواو دەیانپەرســتن ئامانجیــان ئەوەیــە بەهــۆی ئەوانــەوە عیزەتو ســەركەوتن بەدەســت بهێنــن، بەڵام لاوازیەكــی دیكە دەخەنە ســەر لاوازیانو زیاتــر بێتوانا دەبن.

ئــەوان پشــتیان بەو پەرســتراوانە بەســتووە لــە زۆرێ لــە بەرژەوەندیەكانیــان، وە خۆیان پیا هەڵدەواســن، ئەوانیــش وازیــان لــێ دێننو زەلیــلو سەرشــۆڕیان دەكەن، بۆیە هیچ ســوودو قازانجێــك بەدەســت ناهێننو هیــچ یارمەتــیو هاوكاریەكیان دەســت ناكەوێت.

جــا ئەگــەر ئــەوان حەقیقەتــی زانســتیان بزانایــە، دەربــارەی حاڵی خۆیــانو حاڵــی ئەوانەی پەرســتوویانە، ئــەو كات نەیاندەپەرســتو بــەری دەبــوون لێــی، وە ڕوویــان دەكــردە پەروەردگــاری بــە دەســەڵاتی میهرەبــان، ئــەو پەروەردگارەی ئەگــەر بەندەكەی پشــتی پێ ببەســتێ ئــەوە بەســیەتی بــۆ دینو دنیــایو هێزی لە ســەر هێــزی زیاتــر دەبێ، لــە دڵیو لە جەســتەیو لــە بــارودۆخو كردەوەكانی.

كاتــێ ڕوونــی كردەوە ئەوپــەڕی لاوازی پەرســتراوی بتپەرســتەكان، بەرز بوویــەوە لەمەوە

بـۆ بەرزتـر لە ئـەو، وە ئـەو پەرسـتراوانە هیچ شـتێک نیـن، بەڵكو چەنـد ناوێكـی ڕووتن ناویـان لـێ نـاونو كۆمەڵـە گومانێكـن بروایـان پێـی هێنـاوە، وە لـە كاتـی لێكۆڵینەوەدا بەتاڵـیو نەبوونیـان بـۆ كەسـی ژیرو عاقـڵ دەردەكـەوێ، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتی:

(٤٢): ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ مِن شَىْءٍ ﴾ واتـە: بـە ڕاسـتی خـوا دەزانێ -ئـەو زانـای پەنهـانو ئاگـادارە بـە هەموو شـتێ- ئـەوان لە جیاتـی خوا چی دەپەرسـتنو هـاواری پێدەكـەن، هەروەكـو خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ إِنْ هِىَ إِلَّآ أَسْمَآءٌ سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَٰنٍ ﴿٢٣﴾ ﴾النجم، (واتـە: ئـەم بتانـە هەر ناوێكـی ڕووتن كە ئێـوەو بـاوو باپیرانتـان لێتان ناون بەبـێ ناوەڕۆک خوا هیچ بەڵگەیەكی لەسـەر پەرسـتراوی ئـەوان نەناردۆتە خـوارەوە)، وە فەرموویەتـی: ﴿ وَمَا يَتَّبِعُ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُرَكَآءَ ۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴿٦٦﴾ ﴾یونـس، (واتـە: پەیڕەویـان نەكـردوە ئەوانـەی بێجگە لە خوا دەپەرسـتنو پەرسـتراوانێ، ئەوانە تەنها شـوێن گومـان كەوتـوون وە ئەوانە تەنهـا درۆ دەكەن).

﴿ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾ ئـەو زاتـەی خـاوەن هێـزی تـەواوە، كە بـەو هێـزەی زاڵە بەسـەر هەمـوو دروسـتكراوەكاندا ﴿ ٱلْحَكِيمُ ﴾ ئەو زاتەیە شـتەكان لـە جێگای خۆی دادەنـێ، ئـەو زاتەیە كە بـە چاكترین شـێوە بەدیهێنراوەكانی دروسـت كـردوە، وە وردبینە لـە كارو فەرمانەكانیدا.

(٤٣): ﴿ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ ﴾ (واتـە: ئـەو وێنـەو نموونانـە بـۆ خەڵكـی دێنینـەوە) لـە پێنـاو ئـەوانو سـوودو بەرژەوەنـدیو فێـر بوونیانـدا، چونكە ئـەو نموونانە ڕوونكـەرەوەی ڕێگاكانـی زانسـتن، وە ئـەو كاروبارانـە نزیـک دەكاتـەوە كـە لـە عەقڵدا جێیـان دەبێتـەوەو هەسـتیان پـێ دەكـرێ، بـە هۆیانـەوە مانـای داواكـراو ڕوون دەبێتەوە، بێگومـان ئـەو نموونانـە لـە بەرژەوەنـدی هەمـوو خەڵكیدان.

﴿ وَمَا يَعْقِلُهَآ ﴾ واتـە: بەڵكـو لێـی تێناگـەنو ڕانامێنـنو سـەرنج نـادەن، وە بـە دڵیان پێـی ژێـر نابـن ﴿ إِلَّا ٱلْعَٰلِمُونَ ﴾ واتە: تەنهـا زانا ڕاسـتەقینەكان نەبێ، ئەوانەی زانسـت گەیشـتووە بەنـاو دڵەكانیان.

ئەمـە سـتایش كردنـی ئەو نموونانەیـە كە خـوا هێناویەتیەوەو هانیداوە لەسـەر سـەرنجدانو بیركردنـەوە لێیـان، ستایشـی ئەو كەسـەی كردوە بیـری لێدەكاتـەوەو لێی تێدەگـات، ئەوە ناونیشـانە بـۆ ئەو كەسـەی خـاوەن زانسـتە، بۆیە دەردەكـەوێ هەركەسـێ لێـی تێنەگاتو

بیـری لــێ نەکاتەوە ئـەوە لە زانایـان نیە.

هـۆکار لـە ئەوەدا بە ڕاسـتی ئـەم نموونانـە کە خـوا لـە قورئانـدا هێناویەتیەوە بـۆ خەڵکی ئـەوە لـە کاروبـارە گـەورەکانو داواکاریـە بەرزەکانـە، خاوەنانـی زانسـت دەزانـن ئـەو نموونانـە لـە پێشـترن لەوانـی تـر، چونکە خـوا گرنگـی پێـداون، وە هانـی بەندەکانی داوە لـە سـەر بیرکردنـەوەی تێفکرین، ئەوانیـش تواناکانیـان دەخەنـە کار بۆ تێگەیشـتن لێیان، بـەڵام هەرکەسـێ لێـی تێنەگاو بیـری لێنەکاتـەوە، لەگـەڵ گرنگیدا ئـەوە بەڵگەیە لەسـەر ئـەوەی ئەو کەسـە لـە خاوەنانـی زانسـت نیە، چونکـە ئەگـەر بابەتـە گرنگـەکان نەزانێ، ئـەوە نەزانینـی جگـە لـەوان لە پێشـترە، لەبـەر ئەمەیـە خـوا ﷻ نموونـەی زۆر هێناوەتەوە دەربـارەی بنەماکانـی ئایـنو وێنـەی ئەوانیش.

(٤٤): ﴿ خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٤٤﴾ ﴾:

واتـە: خـوا ﷻ تـاکو تەنهایـە لـە دروسـتکردنی ئاسـمانەکان بـە بـەرزیو بڵنـدیو بەرفراوانیانـەوە، وە ئەوەیشـی لـە ناویاندایـە لە خـۆرو مانگو ئەسـتێرەکانو فریشـتەکان، وە زەویو ئەوەیشـی لەناویدایـە لـە کێـوو دەشـتاییو چۆڵەوانـی، داروو درەخـتو وێنەی ئەوانەیـش، هەمـوو ئەوانە خوا بە حەقو ڕاسـتی دروسـتی کردوە، بەبێ هوودەو بەبێ سـوود دروسـتی نەکـردوە، بەڵکـو دروسـتی کردوە بۆ ئـەوەی فەرمانو شـەرعەکەی بەجـێ بێت، وە بـۆ ئـەوەی نیعمەتەکانـی تـەواو بـکات بەسـەر بەندەکانیـەوە، وە بۆ ئـەوەی حیکمەتو توانـاو بەڕێوەبردنـی خـوا ببینن، کـە ڕێنیشـاندەریان بێ لەسـەر ئەوەی خوای تـاکو تەنها پەرسـتراو و خۆشەویستو دروسـتکراویانە ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾ (واتە: بەڕاسـتی لـەوەدا بەڵگـە هەیـە بـۆ بـڕواداران) لـە زۆرێ لـەو داواکاریـە ئیمانیانـە، ئەگەر کەسـی بـڕوادار لێـی ڕامێنێ ئـەوە بە چـاوی خـۆی دەیبینێ.

(٤٥): ﴿ ٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَۖ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۗ وَلَذِكۡرُ ٱللَّهِ أَكۡبَرُۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تَصۡنَعُونَ ﴿٤٥﴾ ﴾:

﴿ ٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ ﴾ خـوا ﷻ فەرمان دەکات بـە خوێندنەوەی وەحیەکەی ئەویـش ئـەم کتێبـە مەزنەیـە، مانـای خوێندنـەوەی، شـوێنکەوتنێتی، بـە جێبەجـێ کردنی ئـەوەی فەرمانـی پـێ دەکاتو دوورکەوتنـەوە لـەوەی قەدەغـەی لـێ دەکات، وە ڕێنمایی وەرگرتـن بـە ڕێنماییەکانـیو بە ڕاسـت دانانـی هەواڵەکانـی، وە بیرکردنەوە لـە ماناکانیو خوێندنـەوەی بێژەکانـی، ئـەو کات خوێندنـەوەی بەشـێک دەبێ لـە واتاکەی.

جـا ئەگـەر ئەمـە مانای خوێندنـەوەی کتێب بـێ، دەردەکەوێ کـە بەجێهێنانـی هەموو ئاین لـە نێـو خوێندنـەوەی قورئاندایـە، ئنجـا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾ لـە بابەتی عەطف کردنـی تایبەتە بە سـەر گشـتیەوە، ئەویش لـە فـەزڵو گەورەیی نوێژو شـوێنەوارە جوانەکانێتـی، ئەویـش ﴿ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ﴾ (واتـە: بێگومـان نوێـژ ڕێگـری دەکات لە کاری ناپەسـندو ناشـرین).

(الفحشـاء): هـەر شـتێکە بە مەزن دا بنرێو ناپەسـند بێت لـەو تاوانانەی کە نەفسـی مرۆڤ ئارەزووی دەکات.

(المنکـر): هەمـوو سـەرپێچیەکە کـە عەقـڵو فیطـرەت نکوڵی لێدەکـەن، لـەو ڕووەی کە نوێـژ ڕێگـری دەکات لە خراپەو شـتی ناپەسـند، ئـەو بەندەی کـە نوێژەکانـی بەجێدێنێو پایـەو مەرجەکانـی بە لە خوا ترسـانەوە تـەواو دەکات، دڵـی ڕووناک دەبێو سـنگی پاک دەبێتـەوەو ئیمانـی زیـاد دەکات، وە حـەزوو ئارەزووی بـۆ چاکە دەجوڵـێ، وە کەم دەکات یـان نامێنـێ حـەزوو ئـارەزووی بـۆ خراپە، جـا بە گرنگیـەوە بـەردەوام بوون لەسـەر نوێژ لەم شـێوە ئـەوە ڕێگری دەکات لە کاری ناشـرینو ناپەسـەند، ئەمە لە مەزنترین مەبەسـتو بەرهەمەکانـی نوێـژە، وە لـە نـاو نوێژدا مەبەسـتێکی مەزنتـرو گەورەتر هەیە لەم مەبەسـتە، ئەویـش یادی خـوا دەگرێتەوە، بـە دڵو زمانو جەسـتە، چونکـە خـوا ﷻ بەدیهێنراوەکانی بـۆ بەندایەتـی خـۆی دروسـتکردوە، وە باشـترین بەندایەتیەک کـە بیکەن نوێـژە، وە لە ناو نوێـژدا هەمـوو پەرستشـەکانی ئەندامانـی جەسـتەی تێدایە، کە لـە غەیری ئەودا نیـە، لەبەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ وَلَذِكْرُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ ﴾ (واتـە: زیکـرو یـادی خـوا گەورەتـرە لە هەموو شـتێک).

وە کـە خـوا ﷻ فەرمانی کـردوە بە نوێـژو عیبـادەت کردنـی هەواڵـی داوە یادکردنەوە لە دەرەوەی نوێـژ گەورەتـرە لـە نوێـژ، هەروەکو چـۆن بۆچوونی زۆربـەی ڕاڤەزانانـە، بەڵام یەکـەم لـە پێشـترە، چونکـە نوێژ چاکتـرە لـە یادکردنـەوەی خـوا لـە دەرەوەی نوێژ، وە لەبـەر ئـەوەی خـودی نوێـژ لـە گەورەترینـی زیکرەکانـە، ﴿ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ ﴾ لە خێـرو شـەڕ پاداشـتان دەداتەوە لەسـەر ئەوە بـە تەواوترین پاداشـت.

۞ وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡۖ وَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَأُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ وَإِلَٰهُنَا وَإِلَٰهُكُمۡ وَٰحِدٞ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ٤٦ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَۚ فَٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يُؤۡمِنُونَ بِهِۦۖ وَمِنۡ هَٰٓؤُلَآءِ مَن يُؤۡمِنُ بِهِۦۚ وَمَا يَجۡحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلۡكَٰفِرُونَ ٤٧ وَمَا كُنتَ تَتۡلُواْ مِن قَبۡلِهِۦ مِن كِتَٰبٖ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَۖ إِذٗا لَّٱرۡتَابَ ٱلۡمُبۡطِلُونَ ٤٨ بَلۡ هُوَ ءَايَٰتُۢ بَيِّنَٰتٞ فِي صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَۚ وَمَا يَجۡحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلظَّٰلِمُونَ ٤٩ وَقَالُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ ءَايَٰتٞ مِّن رَّبِّهِۦۖ قُلۡ إِنَّمَا ٱلۡأٓيَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٞ مُّبِينٌ ٥٠ أَوَلَمۡ يَكۡفِهِمۡ أَنَّآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَرَحۡمَةٗ وَذِكۡرَىٰ لِقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ٥١ قُلۡ كَفَىٰ بِٱللَّهِ بَيۡنِي وَبَيۡنَكُمۡ شَهِيدٗاۖ يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلۡبَٰطِلِ وَكَفَرُواْ بِٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ٥٢

(٤٦): ﴿ وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡۖ وَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَأُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ وَإِلَٰهُنَا وَإِلَٰهُكُمۡ وَٰحِدٞ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ٤٦ ﴾:

﴿ وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡ ﴾ خوا مشتوومڕو دەمە دەمێ لەگەڵ خاوەن کتێبەکان قەدەغە کردوە، ئەگەر مشتومڕکەر بەرچاوی ڕوون نەبوو، یان بەبێ بنچینەیەکی ڕێگە پێدراو، وە با مشتومڕ نەکەن مەگەر بە جوانترین شێوە نەبێ، بە ڕەوشتی جوانو لەسەرخۆییو قسەی نەرم، وە بانگەواز کردن بۆ لای خەڵکیو جوانکردنی، وە ڕەتکردنەوەی بەتاڵو ناشرین کردنی، بە نزیکترین ڕێگا بگات بەوە، وە نابێت مەبەست تیایدا تەنها مشتو مڕی ڕووتو سەرکەوتنو حەزکردنی بەرزبوونەوە بێت، بەڵکو دەبێت مەبەست تیایدا ڕوون کردنەوەی حەقو هیدایەتی دروستکراو بێت.

جگە لەوەی ستەمی کردوە لە خاوەن کتێبەکان، بەوەی دەرکەوتبێ لە مەبەستو حاڵی، ئەو هیچ ویستو ئیرادەیەکی حەقی نیە، بەڵگو مشتومڕ دەکات بۆ گێرەشێوێنیو سەرکەوتن، ئەمە هیچ سوودێک نیە لە مشتومڕکردن لەگەڵی، چونکە مەبەست لەوەدا لەدەست چووە.

﴿ وَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَأُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ وَإِلَٰهُنَا وَإِلَٰهُكُمۡ وَٰحِدٞ ﴾ واتە: با مشتومڕ کردنتان لەگەڵ خاوەن کتێب لەسەر ئیمان بوون بێ بەوەی دابەزیوە بۆ ئێوەو ئەوەی دابەزیوە بۆ ئەوان بونیاد نرابێ، وە لەسەر برواهێنان بە پێغەمبەرەکەتانو پێغەمبەرەکەیان، وە لەسەر ئەوەی پەرستراو تاکو تەنهایە، با وتووێژتان لەگەڵ ئەوان بە جۆرێ نەبێ کتێبە ئاسمانیەکانی پێ لەکەدار بکرێ، یان یەکێک لە پێغەمبەران، وەک چۆن کەسی نەفام ئەنجامی دەدا لەکاتی مشتوو مڕکردنی لەگەڵ دژەکەی، هەموو ئەوانەی لە لایانە لەکەداری دەکات لە حەقو ناحەق، ئەمە ستەمەو دەرچوونە لە پێویستو ئادابو ڕەوشتی مشتوو مڕ کردن، بەڕاستی

ئەرکو پێویست ئەوەیە ئەوەی ناحەقە لە کەسی بەرانبەر ڕەت بکرێتەوە، وە ئەوەیشی حەقە لێی وەربگیرێت، وە نابێ هەق ڕەت بکرێتەوە لە بەر قسەکەی ئەگەر چی بێبڕوایش بێ.

هەروەها بنەمای ووتوێژ کردنی خاوەن کتێب پەیوەست بوونی تێدایە بە داننان بە قورئاندا، وە بەو پێغەمبەرەی هێناویەتی، ئەگەر ئەو قسە بکات لە بنەما ئاینیەکاندا کە پێغەمبەرانو کتێبەکان لەسەری یەکدەنگن، وە لەلای وتووێژکاران چەسپاوە، وە حەقیقەتەکانیشیان جێگیر بووە، وە کتێبە پێشوەکانو پێغەمبەران لەگەڵ قورئانو پێغەمبەردان، ڕوونیان کردۆتەوەو ئاماژەیان پێکردووەو هەواڵیان پێداوە، ئەوە پێویستە لەسەری پەیوەست بێ بەڕاست دانانی هەموو کتێبەکانو سەرجەم پێغەمبەران، ئەمەش لە تایبەتمەندی ئیسلامە.

بەڵام ئەگەر بوترێ بڕوا دەهێنین بەوەی کتابی فلان کەس ئاماژەی پێکردوە بێجگە لە کتابی فلان کەس ئەوە ستەمو تاوانە، ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ بەدرۆدانانی، چونکە ئەگەر قورئان بەدرۆ دابنێن، کە ئاماژەی پێکراوەو بەڕاست دانراوە لە لایەن تەوراتەوە، ئەوە بەدرۆ دانەر ئەوەیە کە پێی وایە بڕوای پێی هەیە.

بێگومان هەموو ڕێگایەک پێغەمبەرایەتی هەر پێغەمبەرێ بچەسپێنێ، ئەوە بێگومان هاوشێوەی ئەوەو لەوە مەزنتر ئاماژە دەکات لەسەر پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺ، وە هەر گومانێک پێغەمبەرایەتی موحەممەدی پێ لەکەدار بکرێت، بێگومان وێنەی ئەوە، یان لەوە مەزنتر دەکرێ ئاراستەی پێغەمبەرێکی دیکە بکرێت، جا ئەگەر بەتاڵ بوونەوەی لە غەیری ئەودا چەسپا، ئەوە بەتاڵ بوونەوەی لە حەقی موحەممەد ئاشکراترو ئاشکراتر دەچەسپێ، وە فەرمایشتی خوا ﷻ ﴿ وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ ﴾ واتە: ئێمە ملکەچی فەرمانەکانی ئەوین، وە هەر کەسێ بڕوای پێ بهێنێو بیکا بە پەرستراوی، وە بڕوا بە هەموو کتێبو پێغەمبەران بێنێ، وە ملکەچی خوا بێو شوێنی پێغەمبەرانی کەوتبێ ئەوە خۆشبەختە، وە هەرکەسێ لەم ڕێگایە لابدات ئەوە بەدبەختو گومرایە.

(٤٧): ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ ۚ فَٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۖ وَمِنْ هَٰٓؤُلَآءِ مَن يُؤْمِنُ بِهِۦ ۚ وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾:

﴿ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ﴾ واتە: ئەی موحەممەد ﷺ، ئەم ﴿ ٱلْكِتَٰبَ ﴾ قورئانە پیرۆزە، کە ڕوونکەرەوەی هەموو هەواڵێکی مەزنە، کە بانگگەرە بۆلای هەموو ڕەوشتو ئاکارێکی جوانو فەرمانی تەواو، بەڕاستدانەری کتێبەکانی پێشووە، ئەو کتێبانەی پێغەمبەرانی پێشوو هەواڵیان پێداوە.

﴿ فَٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ ﴾ حەقیان ناسیوە بە جوانترین شێوە، وە تووشی حەسوودیو هەواو ئارەزوو نەبوون ﴿ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ﴾ چونکە دڵنیان ڕاستە بە هۆی ئەو گونجاندنانەی لە لایانە، وە بەهۆی ئەو مژدانەوە، وە بەوەی کە جیای دەکەنەوە لە ناسینی چاکو خراپو ڕاستو درۆ. ﴿ وَمِنْ هَٰٓؤُلَآءِ ﴾ ئەوانەی کە ئامادەن، ﴿ مَن يُؤْمِنُ بِهِۦ ﴾ (کەسانێ بڕوای پێ دێنێ) بڕوا هێنانێ لەسەر بەرچاو ڕوونی، نەک لەسەر هانданو ترساندنی ﴿ وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلْكَٰفِرُونَ ﴾ (واتە: تەنها بێبڕوایانی ڕۆچوو دان نانێن بە ئایەتەکانی ئێمەدا) ئەوانەی پیشەیان نکووڵیو عینادی کردنی حەقە، ئەمەش کورتهەڵهێنانە بۆ ئەو کەسەی بێبڕوایی پێدەکات، ئەو بێبڕواییە نابێ بۆ هیچ کەسێ کە مەبەستی شوێنکەوتنی هەق بێ، ئەگەرنا هەر کەس مەبەستی ڕاست بێ ئەوە هەر دەبێ بڕوای پێ بهێنێ، لەبەر ئەو هەموو ڕوونکردنەوانەی لە خۆی گرتووە، بۆ هەر کەسێ عەقڵی هەبێ، یان ببیستێ، ئەوە شایەتی دەدات.

(٤٨): ﴿ وَمَا كُنتَ تَتْلُوا۟ مِن قَبْلِهِۦ مِن كِتَٰبٍ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَ ۖ إِذًا لَّٱرْتَابَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾:

وە ئەوەی دەبێتە بەڵگە لە ڕاستی ئەو قورئانە، ئەوەیە کە لە لایەن ئەم پێغەمبەرە دەستپاکەوە هاتووە، ئەو پێغەمبەرەی کە گەلەکەی ڕاستگۆییو ئەمانەتو هاتنو دەرچوونو هەموو بارودۆخەکانیان زانیوە، ئەو بە دەستەکانی نانووسێ، وە نازانێ نووسراوێ بخوێنێتەوە، جا هێنانی بەم حاڵە لە دیارترین بەڵگە ڕوونو یەکلاکەرەوەکانە، کە بە هیچ شێوە قبووڵی گومان ناکات، بێگومان ئەو قورئانە لە لایەن خوای بەدەسەڵاتو ستایشکراوەوە هاتووە، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ وَمَا كُنتَ تَتْلُوا۟ ﴾ واتە: (تۆ ئەی موحەممەد نەتـخوێندۆتەوە)، ﴿ مِن قَبْلِهِۦ مِن كِتَٰبٍ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَ ۖ إِذًا ﴾ واتە: (پێش ئەم قورئانە هیچ کتێبێک، وە بە دەستی ڕاستت نەتنووسیوە) ئەگەر تۆ بەم حاڵە بووایەی ﴿ لَّٱرْتَابَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴾ (ئەو کاتە ناڕاستەکان دەکەوتنە گومانەوە) دەیانوت: لە کتێبەکانی پێشووەوە فێری بووە، یان لە بەریانی گرتۆتەوە. بەڵام دایبەزاندوە بۆ سەر دڵی تۆ کتێبێکی گەورە، تەحەددای زمان پاراوانو ڕەوان بێژانو دوژمنە سەرسەختەکانی پێکردوە، کە وێنەی ئەو قورئانە بهێننەوە، یان سووڕەتێک لە وێنەی ئەو، نەیانتوانیو بێدەسەڵات بوون بەوپەڕی بێدەسەڵاتی، بەڵکو نەفسی خۆشیان قسەیەکی لەو جۆرەی بۆ نەکردن، چونکە بە ڕەوان بێژەییو پاراویی قورئانیان دەزانی، وە بێگومان قسەی هیچ مرۆڤێ ناگاتە ئاستی کەلامی خوا، لەبەرئەمەیە فەرموویەتی:

(٤٩): ﴿ بَلْ هُوَ ءَايَٰتٌۢ بَيِّنَٰتٌ فِى صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ ۚ وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾:

﴿ بَلۡ ﴾ واتە: بەڵکو ئەم قورئانە ﴿ ءَايَٰتُۢ بَيِّنَٰتٞ ﴾ (نیشانەکانی ئاشکران) شاراوە نین، ﴿ فِي صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَۚ ﴾ (واتە: لە دڵو دەروونی کەسانێکدایە کە زانستیان پێدراوە) ئەوانیش پێشەوای خەڵکیو عاقڵترینیانن، وە خاوەن ژیریو تەواوترینیانن.

جا ئەگەر ئەو نیشانە ئاشکراو ڕوونانە لە دڵی کەسانی وێنەی ئەوانەدا بێ، ئەوە ئەوان دەبنە بەڵگەو حوجەجە بۆ غەیری خۆیان، وە نکوڵی کردنی جگە لە ئەوان زیانی نابێ، ئەو نکوڵی کردنە تەنها زوڵمو ستەمە، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ وَمَا يَجۡحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾ (واتە: تەنها ستەمکاران دان نانێن بە نیشانەکانی ئێمە) چونکە دانی پێدانانێ مەگەر نەفامێک نەبێ قسە بکات بێ زانیاریی، پەیڕەوی زانایان نەکات، وە ئەو کەسە ئەوەندە بە توانا نیە لە ناسینی حەقیقەت، یان خۆی گێل دەکات دەزانی ئەوە حەقە عینادی دەکات، وە دەزانی ڕاستە پێچەوانەی دەکات.

(٥٠-٥٢): ﴿ وَقَالُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ ءَايَٰتٞ مِّن رَّبِّهِۦۖ قُلۡ إِنَّمَا ٱلۡأٓيَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٞ مُّبِينٌ ﴿٥٠﴾ أَوَلَمۡ يَكۡفِهِمۡ أَنَّآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَرَحۡمَةٗ وَذِكۡرَىٰ لِقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿٥١﴾ قُلۡ كَفَىٰ بِٱللَّهِ بَيۡنِي وَبَيۡنَكُمۡ شَهِيدٗاۖ يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلۡبَٰطِلِ وَكَفَرُواْ بِٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴿٥٢﴾ ﴾:

﴿ وَقَالُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ ءَايَٰتٞ مِّن رَّبِّهِۦ ﴾ واتە: ئەو ستەمکارانەی پێغەمبەریان بەدرۆ دادەنا، کاتێ ئەو پەیامەی هێنا، پێشنیاری دابەزینی چەندین ئایەتی دیاریکراویان کرد، وەک وتیان: ﴿ وَقَالُواْ لَن نُّؤۡمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفۡجُرَ لَنَا مِنَ ٱلۡأَرۡضِ يَنۢبُوعًا ﴿٩٠﴾ ﴾ الإسراء، (واتە: وتیان هەرگیز بڕوات پێ ناهێنین هەتا لەم زەویە کانیاوێکمان بۆ هەڵنە قوڵێنی)، جا دیاریکردنی ئایەتەکان نە لای ئەوانە نە لە لای پێغەمبەر ﷺ هیچ کەس لەو کاروبارەدا هیچی لەسەر نیە، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ قُلۡ إِنَّمَا ٱلۡأٓيَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ ﴾ (واتە: پێیان بڵێ هێنانە خوارەوەی موعجیزەکان تەنها لە لای خوایە) ئەگەر بیەوێ دایدەبەزێنێ یان ڕێگری دەکات ﴿ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٞ مُّبِينٌ ﴾ (واتە: بەڕاستی من تەنها ترسێنەرێکی ئاشکرام) لەمە زیاتر پلەیەکی بەرزترم نیە.

جا ئەگەر مەبەست ڕوون کردنەوەی حەق بێت لە ناحەق، ئەگەر مەبەستەکە بەدەستهات -بە هەر ڕێگایەک بێت- ئەوە پێشنیار کردنی ئایەتو نیشانە دیاریکراوەکان ستەمو تاوانەو لووت بەرزیە بەسەر خواو بەسەر حەقدا.

بەڵکو ئەگەر وادابنرێ ئەو نیشانانە دابەزێنرێ، وە لە دڵیاندا ئەوان بڕوا بەهەق ناهێنن تەنها بەوە نەبێ، ئەوە ئیمان نیە، بەڵکو ئەوە شتێکە بە پێی هەواو ئارەزووەکانیانە، بۆیە بڕوایان هێناوە، نەک لەبەر ئەوە حەقە، بەڵکو لەبەر ئەو نیشانانە، دەی چ سوودێک بەدەست دێت لە دابەزینیدا لەو ڕووەی وادابنرێ؟

(٥١): کاتێ کە مەبەست ڕوونکردنەوەی حەقە، خوا باسی ڕێگای خۆی کردوەو فەرموویەتی: ﴿ أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ ﴾ (واتە: ئایا بۆ ئەوان بەس نیە) لە زانیاریان لە ڕاستی تۆو ڕاستی ئەو پەیامەی هێناوتە ﴿ أَنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ﴾ (واتە: ئێمە قورئانمان ناردۆتە خوارەوە بۆ سەر تۆ دەخوێنرێتەوە بەسەریاندا). ئەمە قسەیەکی کورتو گشتگیرە، زۆرێک لە ئایەتو نیشانەو بەڵگەی ڕوونی تێدایە، بێگومان وەک لە پێشەوە باسکرا تەنها هاتنی پێغەمبەر ﷺ بەو پەیامە بەسە، ئەو کەسێکی نەخوێنەوار بوو، ئەوە لە گەورەترینی بەڵگەکانە لەسەر ڕاستگۆیی.

پاشان بێتواناییان لە دژایەتی کردنیو ڕووبەڕووبوونەوەی نیشانەیەکی دیکەیە لەسەر ڕاستگۆیی، پاشان دەرکەوتنی بە ئاشکرا لەناو خەڵکدا بخوێنرێتەوە بەسەریاندا، وە دەوترێ: ئەوە لەلایەن خواوەیە، پێغەمبەر ﷺ ئاشکرای کردوە، لە کاتێکدا پشتیوانانی کەم بوو، دوژمنانی زۆر بوو، نەیشاردەوە، بەڵکو ئاشکرای کرد لە پێش چاوی هەموو خەڵکی، وە بانگەوازی پێکرد لە نێوان دانیشتوانو خەڵکی دیکەدا، کە ئەمە قسەی خوای پەروەردگارە، ئایا کەسێک هەیە توانای ڕووبەڕوو بوونەوەی بێ، یان بە قسە پێشبڕکێی لەگەڵ بکات؟

پاشان هەواڵ دانی دەربارەی چیرۆکو سەرگوزەشتەی پێشینو ئەو پەنهانەی کە ڕووی داوەو ڕوودەدات لەگەڵ پڕاوپڕ بوونی لەگەڵ واقیعدا، پاشان زاڵ بوونو چاودێری کردنی لەسەر کتێبە پێشووەکانو ڕاستکردنەوەیان بۆ ڕاستی، وە ڕەتکردنەوەی دەستکاری گۆڕانکاری تێیاندا، پاشان هیدایەتی بۆ ڕێگای ڕاستو ناوەند، لە فەرمانو قەدەغەکردنی، فەرمانی بە شتێ نەکردوە، عەقڵ بڵێ: خۆزگە فەرمانی پێ نەکردایە، وە قەدەغەی لە شتێ نەکردوە، عەقڵ بڵێ: خۆزگە قەدەغەی نەکردایە، بەڵکو ئەو قورئانە پڕە لە دادپەروەریو پێوانەو کاربەجێییە، بۆ خاوەن بیناییو بەرچاو ڕوونو عاقڵەکان، پاشان ڕێنیشاندانو ڕێنماییو ئەحکامەکانی بۆ هەموو شوێنو کاتێ دەروات، بە جۆرێ کاروبارەکان چاک نابن بەوە نەبێ.

هەموو ئەوانە بەسن بۆ هەرکەس حەقی بوێو کار بۆ داواکاری هەق بکات، خوا ئەوە بەس نەکات ئەوەی قورئانی بەس نیە، وە خوا شیفای نەدا ئەوەی فورقان شیفای نەدا، هەرکەسێ هیدایەتی لێوەر بگرێتو ئەوی بەس بێت، ئەوە خێری تێدایە بۆی، لەبەر ئەوەیە فەرموویەتی:

﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَىٰ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾ (واتە: بەڕاستی لەم قورئانەدا بەزەیی‌و پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆ بڕواداران) تا بەدەستی بێنن لەو قورئانەدا زانستی زۆرو خێری بەلێزمەو پاککردنەوەی دڵو ڕووحەکانو پاڵفتەکردنی بیروباوەڕەکانو تەواو کردنی رەوشتەکانو سەرکەوتنە خواییەکان.

(٥٢): ﴿ قُلْ كَفَىٰ بِاللَّهِ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ ﴾ (واتە: بڵێ: خوا بەسە بۆ شایەتی دان لە نێوان منو ئێوەدا) من کردوومە بە شایەت، ئەگەر درۆم کرد تۆڵەم لــێ دەکاتەوە بەوەی ئێوە پێتان وایە، وە ئەگەر ئەو پشتیوانیم لێدەکاتو سەرم دەخاتو کارم بۆ ئاسان دەکات، ئەوە ئێوە ئەم شایەتیە گەورەتان بەسە، ئەگەر شتێ لە دڵتاندا دروست بوو کە شایەتیەکەی بەس نیە، ئەوە بێگومان ﴿ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ﴾ لە کۆی زانیاریەکانی حاڵی منو حاڵی ئێوەیە، وە قسەی منە بۆ ئێوە، جا ئەگەر من قسەی بەدەمەوە هەڵدەبەستم -لەگەڵ زانیاری بەوەو توانای لەسەر سزادانم- ئەوە لەکەدار کردنی زانستو تواناو حیکمەتیەتی، وەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيلِ ﴿٤٤﴾ لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ ﴿٤٥﴾ ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِينَ ﴿٤٦﴾ ﴾الحاقة، (واتە: ئەگەر (موحەممەد ﷺ) بە دەم ئێمەوە هەندێ (وتەی) هەڵبەستایە * بێگومان ئێمە بە دەستی خۆمان تۆڵەمان لێ دەسەند * لە پاشان ڕەگی دڵیمان دەبڕی) ﴿ وَالَّذِينَ آمَنُوا بِالْبَاطِلِ وَكَفَرُوا بِاللَّهِ أُولَٰئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ ﴾ کاتێ ئیمان بە خواو فریشتەو کتێبو پێغەمبەرانو ڕۆژی دواییان دۆڕاند، وە کاتێ نازونیعمەتی هەمیشەییان لە دەستدا، کاتێ لە بەرانبەر حەقی ڕاستەقینەدا شتی بەتاڵو پووچو ناشرینیان بەدەستهێنا، وە لە بەرانبەر نازونیعمەتدا هەموو سزایەکی بە ئێشیان تووش بوو، ئەوکاتە نەفسی خۆیانو خانەوادەیان دۆڕاند لە ڕۆژی دواییدا.

وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ وَلَوْلَا أَجَلٌ مُّسَمًّى لَّجَاءَهُمُ الْعَذَابُ
وَلَيَأْتِيَنَّهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٥٣﴾ يَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ
وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌ بِالْكَافِرِينَ ﴿٥٤﴾ يَوْمَ يَغْشَاهُمُ الْعَذَابُ
مِن فَوْقِهِمْ وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِمْ وَيَقُولُ ذُوقُوا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ
﴿٥٥﴾ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ أَرْضِي وَاسِعَةٌ فَإِيَّايَ فَاعْبُدُونِ
﴿٥٦﴾ كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ ثُمَّ إِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴿٥٧﴾ وَالَّذِينَ
آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَنُبَوِّئَنَّهُم مِّنَ الْجَنَّةِ غُرَفًا تَجْرِي
مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا نِعْمَ أَجْرُ الْعَامِلِينَ ﴿٥٨﴾ الَّذِينَ
صَبَرُوا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٥٩﴾ وَكَأَيِّن مِّن دَابَّةٍ لَّا تَحْمِلُ
رِزْقَهَا اللَّهُ يَرْزُقُهَا وَإِيَّاكُمْ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴿٦٠﴾ وَلَئِن
سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ
لَيَقُولُنَّ اللَّهُ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٦١﴾ اللَّهُ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاءُ مِنْ
عِبَادِهِ وَيَقْدِرُ لَهُ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿٦٢﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم
مَّن نَّزَّلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ مِن بَعْدِ مَوْتِهَا
لَيَقُولُنَّ اللَّهُ قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٦٣﴾

(٥٣-٥٥): ﴿ وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ وَلَوْلَا أَجَلٌ مُّسَمًّى لَّجَاءَهُمُ الْعَذَابُ وَلَيَأْتِيَنَّهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٥٣﴾ يَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌ بِالْكَافِرِينَ ﴿٥٤﴾ يَوْمَ يَغْشَاهُمُ الْعَذَابُ مِن فَوْقِهِمْ وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِمْ وَيَقُولُ ذُوقُوا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٥٥﴾ ﴾:

﴿ وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ ﴾ خـوا هـەواڵ دەدات دەربـارەی نەفامـی بەدرۆدانـەران بـە پێغەمبـەرو ئـەوەی هێناویەتـی، ئـەوان بـە پەلـە داوای هێنانـی سـزایان دەكـرد، دەیانگـووت: ﴿ مَتَىٰ هَٰذَا الْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٤٨﴾ ﴾یونـس، (واتـە: دەڵێن كەی ئـەو بەڵێن‌و هەڕەشـەیە دێتـەدی ئەگەر ئێوە راسـت دەكەن)؟

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَوْلَا أَجَلٌ مُّسَمًّى ﴾ (واتـە: ئەگەر مـاوەی دیاریكـراو نەبووایە) كـە دانراوە بـۆ دابەزینی، وە جـارێ ئەوكاتە نەهاتـووە ﴿ لَّجَاءَهُمُ الْعَذَابُ ﴾ (واتە: بێگومان سـزایان بـۆ دەهات) بـە هۆی ئـەوەی ئێمەیـان بەبێ توانـا دادەنـاو حەقیان بـەدرۆ دەزانی، جـا ئەگـەر بە هـۆی نەفامیانـەوە سـزامان بدانایە، ئـەوە قسـەكانیان خێراتر دەبـوو لە بەڵاو موصیبەتەكانیـان، بـەڵام -لەگـەڵ ئـەوەدا- دابەزینی بـە دوور نازانـن، بێگومان سـزایان بۆ دێ ﴿ بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴾ (واتـە: لـە ناكاو هەسـتی پـێ ناكەن).

هەروەكـو چـۆن خوا هەواڵیـدا ڕوویدا، كاتـێ بەرەو لای بەدر ڕۆیشـتن بە لـووت بەرزی‌و خۆبەزلزانینـەوە، پێیـان وابـوو ئـەوان بـە توانـان لەسـەر مەبەسـتەكانیان، خـوا ﷻ ئیهانەی كـردن‌و دەسـەڵاتدارانیانی كوشـت، سـەرجەمی خراپەكارانیانـی لەنـاو برد، هیـچ ماڵێكیان نەمایـەوە بێگومـان ئـەو بەڵایەیان تووش بـوو، خوا بە جۆرێ سـزای بۆ هێنـان كە گومانی ئەوەیـان نەدەبـرد، وە بـۆی دابەزانـدن لە كاتێكدا هەسـتیان پـێ نەدەكرد.

ئەمـە، وە ئەگـەر لـە دونیـادا سـزایان بـۆ دانەبەزیایـە، ئـەوە بێگومـان سـزای دوارۆژ لـە

پێشـیانە کـە هیـچ کەسـێکیان لێـی ڕزگـاری نابـێ، یەکسـانە ئەگەر لـە دنیادا سـزایان بۆ پێـش بخرێ، یـان مۆڵـەت بدرێـن، ﴿ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ ﴾ (واتە: بە ڕاسـتی دۆزەخ دەوری کافرانـی داوە)، بـە هیچ شـێوەیەک دەربـاز بوونیان لێی نیـە، دەوری داون لە هەمـوو لایەکـەوە، هەروەکو چـۆن تاوانو گوناهـو بێبڕوایـیـان دەوری داون، ئا ئەو سـزایە سـزایەکی بە ئێشـە.

(٥٥): ﴿ يَوْمَ يَغْشَىٰهُمُ ٱلْعَذَابُ مِن فَوْقِهِمْ وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِمْ وَيَقُولُ ذُوقُوا۟ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ (واتـە: لـە ڕۆژێکـدا سـزا دایـان دەپۆشـێ لـە لای سـەریانەوەو لـە ژێـر پێیانـەوە، وە خـوا دەفەرمـوێ بچێـژن تۆڵـەی ئـەو کردەوانـەی کە لـە دنیـادا دەتـان کـرد)، بێگومان کردەوەکانتـان هەڵگـەڕاوە بـە سـەرتاندا بە سـزا، وە سـزا هەمووتانی گرتۆتـەوە، هەروەکو چـۆن کوفـرو سـەرپێچی هەمووتانـی گرتەوە.

(٥٦-٥٩): ﴿ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِنَّ أَرْضِى وَٰسِعَةٌ فَإِيَّٰىَ فَٱعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ثُمَّ إِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴿٥٧﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُبَوِّئَنَّهُم مِّنَ ٱلْجَنَّةِ غُرَفًا تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا نِعْمَ أَجْرُ ٱلْعَٰمِلِينَ ﴿٥٨﴾ ٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾:

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ ﴾ (واتـە: ئـەی بەندەکانـم کە بڕواتـان هێناوە) بـە مـنو پێغەمبەرەکەمتان بە ڕاسـت دانـاوە، ئەگـەر نەتانتوانـی بەندایەتـی پەروەردگارتان بکـەن لـە زەویەکـدا ئـەوە بچـن بـۆ جێگایەکی دیکـە، کە لـەو شـوێنە بەندایەتـی خوای تـاکو تەنهای تێـدا دەکرێ، جا شـوێنو جێگـای بەندایەتـی بەرفراوانە، وە پەرسـتراویش یەکـە، وە مردنیـش هەر دەبێ دابیـەزێ بۆتان، پاشـان دەگەڕێنەوە بـۆ لای پەروەردگارتان، ئنجـا پاداشـتی ئەو کەسـە دەداتەوە کە بـە چاکی عیبادەتـی ئەنجامداوەو ئیمـانو کردەوەی چاکـی پێکـەوە کۆکردۆتـەوە، بە دانانی لـە ماڵی بـەرزو جێگـای ڕازاوەو خۆشـدا، هەموو ئەوانـە کۆدەکاتـەوە کـە نەفـسو دەروون حـەزی لـێ دەکاتو چاویـش چێـژی لـێ وەردەگـرێ، وە ئێـوە تیایدا بـە هەمیشـەیی دەمێننەوە.

﴿ نِعْمَ ﴾ ئـای چەنـد چاکـە ئـەو شـوێنو جێگایانەی ناو بەهەشـتی پـڕ لە نـازو نیعمەت ﴿ أَجْرُ ٱلْعَٰمِلِينَ ﴾ (پاداشـتی چاکـەکاران) بـۆ خـوا ﴿ ٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ ﴾ لەسـەر بەندایەتی خـوا ﴿ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴾ (واتـە: تەنهـا پشـت بـە پەروەردگاریان دەبەسـتن) لـەوەدا، ئارامگرتنیـان لەسـەر عیبادەت کردنی خـوا هەوڵو کۆشـش دەخوازێ لـەوەدا، وە دژایەتی

کردنـی شـەیتان کـە بانگیـان دەکات بـۆ دوورکەوتنـەوە لەوانـە، وە پشـت بەسـتنیان بە خـوا ئـەوە دەخـوازێ داوای یارمەتیـان کـردوە لـە خـواو گومانی باشـیان پێی بـردوە، کە بۆیـان بەجـێ بێنـێ، ئـەو کردەوانـەی سـوورن لەسـەر ئەنجامدانـی، وە باسـی تەوەکولـی کـردوە ئەگەرچـی لە نێـو ئارامگرتندایـە، چونکە پێویسـتی بـە ئارامگرتن هەیە لـە هەموو ئەنجامدانـی کارێـکو واز هێنـان لێـی، وە هیـچ کارێ تـەواو نابـێ بە ئارامگرتـن نەبێ.

(٦٠): ﴿ وَكَأَيِّن مِّن دَآبَّةٍ لَّا تَحۡمِلُ رِزۡقَهَا ٱللَّهُ يَرۡزُقُهَا وَإِيَّاكُمۡ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ۝٦٠ ﴾:

﴿ وَكَأَيِّن ﴾ واتـە: خـوا ﷻ گرەنتی دەدا بە دابینکردنـی ڕزقو ڕۆزی بەدیهێنراوەکان، بە هێـزو لاوازیان چەنـدن ﴿ مِّن دَآبَّةٍ ﴾ (گیان لەبەر هەیە) لەسـەر زەویـدا پێکهاتەی بێهێزەو عەقڵـی لاوازە ﴿ لَّا تَحۡمِلُ رِزۡقَهَا ﴾ (واتـە: ڕزقو ڕۆزی خـۆی هەڵناگـرێ)و پاشـەکەوتی نـاکا، بەڵکـو بـەردەوام خـوا ڕزقو ڕۆزی بـۆ فەراهـەم دێنـێ لـە هەموو کاتێکـدا، ﴿ ٱللَّهُ يَرۡزُقُهَا وَإِيَّاكُمۡ ﴾ هەمووتـان پێویسـتیتان بـە خوایـەو هـەژارن بـە نیسـبەت ئـەوەوە، ئەو ڕاگـری ڕزقـی ئێوەیـە، وەکو چۆن هەسـتاوە بەدروسـت کردنتـانو بەڕێوەبردنتان ﴿ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴾ هیـچ شـاراوەیەکی لـێ پەنهـان نیـە، هیچ گیانلەبـەر لەناو نابـات بە هۆی نەبوونـی ڕزقو ڕۆزی، یـان لەبـەر ئـەوەی شـاراوەیەو پـەی پـێ نابات، هـەروەک خوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزۡقُهَا وَيَعۡلَمُ مُسۡتَقَرَّهَا وَمُسۡتَوۡدَعَهَاۚ كُلّٞ فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ ۝٦ ﴾هود، (واتـە: هیـچ گیـان لەبەرێـک نیـە لە زەویـدا مەگەر لەسـەر خوایـە ڕزقو ڕۆزیەکـەی، وە دەزانـێ شـوێنی مانەوەیو شـوێنی لێ دەرچوونـی، هەمووی نوسـراوە لـە کتێبی ڕوون کـەرەوە).

(٦١-٦٣): ﴿ وَلَئِن سَأَلۡتَهُم مَّنۡ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُۖ فَأَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ ۝٦١ ٱللَّهُ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦ وَيَقۡدِرُ لَهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ۝٦٢ وَلَئِن سَأَلۡتَهُم مَّن نَّزَّلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَحۡيَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ مِنۢ بَعۡدِ مَوۡتِهَا لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُۚ قُلِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِۚ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ ۝٦٣ ﴾:

﴿ وَلَئِن سَأَلۡتَهُم مَّنۡ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ ﴾ ئەمـە بەڵگـە لەسـەر ئـەو هاوبـەش دانەرانـەی یەکتاپەرسـتی خـوا لـە بەندایەتـی کـردن بـۆی بەدرۆدەزانن، وە پەیوەسـت کردنیانـە لـەوەی کـە یەکتاپەرسـتی پەروەردگارێتیـان سـەلماندوە، تـۆ ئەگەر پرسـیاریان لـێ بکەیـت کـێ ئاسـمانەکانو زەوی بەدیهێنـاوە، وە کـێ لە ئاسـمانەوە ئاوی دابەزانـدوە زەوی پـێ زینـدوو دەکاتەوە دوای مردنی، وە بەدەسـتی کێیـە بەدیهێنانی هەموو

شـتەکان؟ ﴿ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ﴾ (واتـە: دەڵێــن خـوای تاکو تەنهـا)، دان دەنێن بـە لاوازیو بێ دەسـەڵاتی بتـەکان، وە ئەوەی پەرسـتوویانن لەگـەڵ خوا.

سـەرت سـوڕبمێنێ بـە هەڵبەسـتنو درۆکردنیـان، وە لادانیـان بـۆ لای ئـەوەی کـە خۆیان دان بـە لاوازی دەنێـن، بێگومـان دان بـەوەدا دەنێـن کە ئەو بتە شایسـتەی ئەوە نیە شـتێک بەڕێـوە بیـات، وە بـێ عەقڵـیو گەمژەیـیو گێلی ئـەوان تۆمار بکـە، ئایا دەبینی کـێ لەوە کـەم عەقڵتـرو بەرچـاو ڕوونتـرە لـەوەی بچێـت بـۆ لای بـەردێ، یـان گۆڕێـکو وێنەی ئەوانـە، خۆیشـی بزانێت کە ئـەوە سـوودو زیانێک ناگەیەنێ، وە دروسـت نـاکاتو ڕزقو ڕۆزیـش نـادات، پاشـان ئەوپەڕی دڵسـۆزی بـۆ بنوێنێو چاکترینی پەرستشـی بـۆ بکاتو لەگـەڵ پەروەردگـاردا بیـکات بـە هاوبەش، کـە بەدیهێنـەری بژێویدەرە، سـوود گەیەنەرو زیـان لابەرە.

کەواتـە: بڵـێ: سـتایش بـۆ ئـەو خوایـەی هیدایەتـی ڕوون کردوەتـەوە لـە گومڕایـی، وە بەتاڵـی پووچـی هاوبەشـدانەرانی ئاشـکرا کردوە، بـۆ ئەوەی خۆیـان بپارێـزن ئەوانەی خوا سـەرکەوتوویانی کردوە.

وە بڵـێ: سـتایش بـۆ ئـەو خوایـەی بەدیهێنـەری جیهانـی سـەرو خوارەوەیـە، وە هەسـتاوە بـە بەڕێوەبردنیـانو ڕزقو ڕۆزیـان، وە فراوانـی کـردوە بـۆ هەر کـەس لـە بەندەکانی کە بیـەوێ، وە کەمـی کردوەتـەوە بـۆ هەر کەس کـە بیەوێ بە پێـی حیکمـەتو کاربەجێیی، وە لەبـەر زانسـتو زانیـاری بـەوەی دەگونجێ بـۆ بەندەکانیو ئـەوەی پێویسـتە بۆیان.

(٦٤-٦٩): ﴿وَمَا هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ
إِلَّا لَهْوٌ وَلَعِبٌ ۚ وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ لَهِىَ
ٱلْحَيَوَانُ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٦٤﴾ فَإِذَا
رَكِبُوا۟ فِى ٱلْفُلْكِ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ
ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ
﴿٦٥﴾ لِيَكْفُرُوا۟ بِمَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ وَلِيَتَمَتَّعُوا۟ ۖ
فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٦٦﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّا جَعَلْنَا
حَرَمًا ءَامِنًا وَيُتَخَطَّفُ ٱلنَّاسُ مِنْ حَوْلِهِمْ ۚ
أَفَبِٱلْبَٰطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَةِ ٱللَّهِ يَكْفُرُونَ
﴿٦٧﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا
أَوْ كَذَّبَ بِٱلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُۥٓ ۚ أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ
مَثْوًى لِّلْكَٰفِرِينَ ﴿٦٨﴾ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُوا۟
فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلْمُحْسِنِينَ
﴿٦٩﴾﴾:

وَمَا هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا لَهْوٌ وَلَعِبٌ ۚ وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ لَهِىَ
ٱلْحَيَوَانُ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٦٤﴾ فَإِذَا رَكِبُوا۟ فِى ٱلْفُلْكِ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ
مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ ﴿٦٥﴾
لِيَكْفُرُوا۟ بِمَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ وَلِيَتَمَتَّعُوا۟ ۖ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٦٦﴾
أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّا جَعَلْنَا حَرَمًا ءَامِنًا وَيُتَخَطَّفُ ٱلنَّاسُ مِنْ
حَوْلِهِمْ ۚ أَفَبِٱلْبَٰطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَةِ ٱللَّهِ يَكْفُرُونَ ﴿٦٧﴾
وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِٱلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُۥٓ ۚ
أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَٰفِرِينَ ﴿٦٨﴾ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُوا۟
فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٦٩﴾

خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات دەربـارەی حاڵەتـی دونیـاو دوارۆژ، وە لە چوارچێوەی ئـەوەدا دونیا نەویسـتـیو ڕوو کردنـە دوارۆژ، جـا فەرموویەتـی: ﴿وَمَا هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ﴾ (واتـە: ژیانـی ئـەم دونیایە) لە ڕاسـتیدا ﴿إِلَّا لَهْوٌ وَلَعِبٌ﴾ (واتـە: ڕابواردنێکی بـێ هوودەیە) دڵ پێـی ڕادەبوێـرێو جەسـتەش یاری پێـدەکات، بە هـۆی ئەو زینـەتو چێـژ وەرگرتنانەی خـوا داینـاوە تیایـدا، وە ئـەو حـەزوو ئارەزووانە دڵـە بەرهەڵسـت کارەکان بـەلای خۆیاندا ڕادەکێشـن، کە چـاوە بێئاگـاکان دەبەن، کە دڵخۆشـکەری نەفـسو دەروونـە پووچەکانە، پاشـان بـە پەلە نامێنـێو کۆتایـی پێدێت، خۆشەویسـتەکانی هیچیـان لێی دەسـت ناکەوێ، جگە لـە پەشـیمان بوونەوەو حەسـرەتو ئـاخ هەڵکێشـانو زەرەرمەندی.

بـەڵام ماڵـی دوارۆژ ئـەوە مـاڵو ﴿ٱلْحَيَوَانُ﴾ واتـە: ژیانی تـەواوە، کە لە پێویسـتیەکانی ئەوەیـە جەسـتەی خاوەنانـی لەوپـەڕی بەهێزیـدا بـێ، وە توانایـان لەوپـەڕی بەهێزیـدا بێ، چونکـە جەسـتەو هێزێکن دروسـتکراون بۆ ژیان، وە دەبـێ هەمـوو تەواوکاریەکانی ژیانی تێدابـێ، بۆ ئـەوەی لەززەتەکانی پێ تەواو بێت، لە خۆشـی دڵەکانو ئارەزووی جەسـتەکان، لـە خـواردنو خواردنـەوەو جـووت بـوونو جگە لەوانـەش، لەوەی چـاو نەیبینیـوەو گوێ

نەبیستوەو بە ختورەش بە دڵی كەسدا نەهاتووە.

﴿ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴾ (واتە: ئەگەر ئەوان بیانزانیایە) هەرگیز دونیایان نە دەدا بەسەر دوارۆژدا، وە ئەگەر عاقڵ بووایەن، پشتیان نەدەكرد لەماڵی مانەوەو، روویان بكردایەتە ماڵی رابواردنی كاتی بێ هوودەیی، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەوانەی دەزانن هەر دەبێ دوارۆژ بدەن بەسەر دونیادا، لەوەی دەیزانن لە دۆخی هەردوو ماڵەكە.

(٦٥): پاشان خوا ﷻ بتپەرستانی پەیوەست كردوە بە بەندایەتی كردنی بە دڵسۆزی، لە كاتی نارەحەتیدا, لەو كاتەی سواری كەشتی دەبن‌و شەپۆلی دەریا بە یەكدا دەدات، مەترسی ئەوە دەكەن لەناو بچن، واز لە بتەكانیان دەهێنن بە دڵسۆزیەوە لە خوای تاك‌و تەنها دەپارێنەوە، كەچی كاتێ خوا رزگاریان دەكات لە وشكانی كتووپڕ ئەوان هاوبەش بۆ خوا دادەنێن، ئەی بۆچی بە دڵسۆزیەوە خوا ناپەرستن لەكاتی خۆشی‌و ناخۆشی‌و ئاسانی‌و تەنگانەدا، بۆ ئەوەی ببنە بڕوادارێكی راستەقینە، شایستەی پاداشتی بن‌و سزایان لێ بە دوور بخاتەوە.

(٦٦): ﴿ لِيَكْفُرُوا۟ بِمَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ وَلِيَتَمَتَّعُوا۟ ﴾ بەڵام ئەم هاوبەشدانانەیان لێرەدا دوای ئەوەی نازونیعمەتمان پێ بەخشین، بە رزگار بوونیان لە دەریا، بۆ ئەوەی سەرەنجامیان ئەو كوفرە بێ كە هێناویانە، وە لە بەرانبەر چاكەدا خراپە وەربگرن، وە بۆ ئەوەی چێژو خۆشیەكانیان لە دونیا تەواو بكەن، وەك چێژو خۆشی ئاژەڵەكان، ئەوانە هیچ خەمێكیان نیە تەنها وورگ‌و داوێنیان نەبێ ﴿ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴾ (جا لە مەولا دەزانن) كاتێ لە دونیاوە دەگوازرێنەوە بۆ دوارۆژ، ئاخ‌و ئەسەف هەڵدەكێشن‌و سزای توونديان بۆ ئامادەیە.

(٦٧): ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّا جَعَلْنَا حَرَمًا ءَامِنًا وَيُتَخَطَّفُ ٱلنَّاسُ مِنْ حَوْلِهِمْ ﴾ پاشان خوا ﷻ منەتی كردوە بەسەریاندا بەوەی حەرەمی كردۆتە جێگای ئەمن‌و ئاسایش‌و ئەوان خاوەنی ئەو شوێنەن لە ئاسایش‌و رزق‌و رۆزی بەرفراواندا دەژین، لە كاتێكدا خەڵكی دەوروبەری ئەوان دەفڕێنرێن‌و دەترسن، ئایا بەندایەتی ئەو زاتە ناكەن كە لە برسێتیدا خواردەمەنی بۆ ناردن، وە لە ترس پاراستوونی‌و دڵنیایی پێ بەخشیون؟ ﴿ أَفَبِٱلْبَٰطِلِ يُؤْمِنُونَ ﴾ (واتە: دەی ئایا بڕوا بە ناهەق‌و باتڵ دێنن)، ئەویش ئەوەیە ئەوان لەسەری دەرۆن لە هاوبەش دانان‌و قسەو كردەوە پووچەكان، ﴿ وَبِنِعْمَةِ ٱللَّهِ ﴾ ئەوان (بە نیعمەتی خوا) ﴿ يَكْفُرُونَ ﴾ بێبڕوایی دەكەن، ئەوان عەقڵیان بۆ كوێ رۆیی، وە خەونەكانیان دارنرا،

کاتـێ کـە گومراییانـدا بە سـەر هیدایەتـداو پووچیان دابـە سـەر حەقـداو بەختەوەریان دا بەسـەر بەدبەختیـدا، وە کاتـێ بوون بە سـتەمکارترینی بەدیهێنـراوەکان؟!

(٦٨): ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ﴾ (کـێ لـەوە سـتەمکارترە درۆ بـە نـاوی خـواوە هەڵبەسـتێ) ئـەو گومرایـیو پووچیـەی لـە سـەریەتی بیداتە پاڵ خـوا، ﴿ أَوْ كَذَّبَ بِٱلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُۥٓ ﴾ (واتـە: یـان بـڕوا نەهێنـێ بـە ئاینـی ڕاسـت کاتـێ بۆی هات) لە سـەر دەسـتی پێغەمبەرەکـەی موحەممەد ﷺ.

بـەڵام ئـەم سـتەمکارە عینـادو کەللەڕەقـە دۆزەخ لـە پێشـێتی ﴿ أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَٰفِرِينَ ﴾ (واتـە: ئایـا جێگـای مانـەوە بـۆ بێبڕوایـان لە دۆزەخـدا نیـە)، حەقیان لێ وەربگیرێو سەرشـۆڕو ڕیسـوا بکرێـن پێی، وە ببێتە جێگای هەمیشـەییان کـە هەرگیز لێی دەرنەچن.

(٦٩): ﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُوا۟ فِينَا ﴾ وە ئەوانـەی کـە کۆچیـان کـردوە لـە پێنـاوی خـواداو جیهادیـان لـە دژی دوژمنەکانیان کـردوە، هەموو تواناکانیـان بەکارهێناوە لە شـوێنکەوتنی ڕەزامەنـدی خـوادا ﴿ لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا ﴾ واتە: ئـەو ڕێگایانەی دەیانگەیەنێ بـە ئێمە، ئەویش لەبەر ئـەوەی چاکەخوازن.

﴿ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾ (واتـە: بێگومـان خـوا لەگـەڵ چاکاندایـە) بـە پشـتیوانیو سەرخسـتنو ڕێنمایـی، ئەمـە بەڵگەیە لەسـەر ئەوەی لە پێشـترینی خەڵک بـە پێکانی حەقو ڕاسـتی ئەوانـەن جیهاد دەکـەن، وە بەڵگەیە لەسـەر ئەوەی هەرکەسـێ چاکە بـکات لەوەی فەرمانـی پێکـراوە، خوا ﷻ پشـتیوانی دەکاتو هۆکارەکانی هیدایەتی بۆ ئاسـان دەکات، وە بەڵگەیە لەسـەر ئەوەی هەر کەسـێ هەوڵ بداو تێبکۆشـێ لە بەدەسـتهێنانی زانسـتی شەرعیدا، ئـەوە ڕێنمایـیو پشـتیوانی بە دەسـت دێنـێ لـەو کاروبارانەی خـوا فەرمانی پێکـردوە، وە کاری زانسـتی بـۆ ئاسـان دەبێت، بێگومان بەدەسـتهێنانی زانسـتی شـەرعی لـە جیهادکردنە لـە پێنـاوی خـوادا، بەڵکـو یەکێکە لـە جۆرەکانی جیهـاد، کە کـەس پێی هەڵناسـێت جگە لـە بەنـدە تایبەتەکانـی خـوا نەبـێ، ئەویـش جیهادکردنـە بـە قسـەکردنو زمـان بەرانبەر بێبـڕواو دوو ڕووەکان، وە جیهـاد کـردن لەسـەر فێربوونـی کاروبارەکانی ئاین، وە لەسـەر ڕەتدانـەوەی ئـەو کەسـانەی پێچەوانـەی حـەق دەجوڵێنەوە ئەگـەر چی لەسـەر حەقیش بن.

تەفسیری سوورەتی (العنكبوت) تەواو بوو.


سورة الروم
بسم الله الرحمن الرحيم
الٓمٓ ۝١ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ۝٢ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ ۝٣ فِي بِضۡعِ سِنِينَۗ لِلَّهِ ٱلۡأَمۡرُ مِن قَبۡلُ وَمِنۢ بَعۡدُۚ وَيَوۡمَئِذٖ يَفۡرَحُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ۝٤ بِنَصۡرِ ٱللَّهِۚ يَنصُرُ مَن يَشَآءُۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ۝٥

## تەفسیری سوورەتی (الروم)
## مەککیە (٦٠) ئایەتە
## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٣): ﴿ الٓمٓ ۝١ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ۝٢ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ ۝٣ ﴾:

لەو سەردەمەدا فارس‌و ڕۆمەکان لە بەهێزترینی دەوڵەتانی سەر زەوی بوون، وە لە نێوانیاندا شەڕوو کوشتار هەبوو، وەک دوو وڵاتی هاوسەنگ. فارسەکان بت پەرست‌و موشریک بوون، ئاگریان دەپەرست، ڕۆمەکانیش خاوەن کتێب بوون درابوونە پاڵ تەورات‌و ئینجیل، ئەوان لە مسوڵمانانەوە نزیک تر بوون، حەزیان لە سەرکەوتن‌و دەرکەوتنیان دەکرد بەسەر فارسەکان، بتپەرست‌و موشریکەکان -بە هۆی نزیکیانەوە لە شیرک- حەزیان دەکرد فارس سەر بکەوێ بەسەر ڕۆمدا. فارسەکان سەرکەوتن بەسەر ڕۆمەکان، بە سەرکەوتنێک دەسەڵاتی ڕۆمەکان کۆتایی پێهێنرا لە نزیکترین زەویەکانیان، بتپەرستانی مەککە بەو سەرکەوتنە دڵخۆش بوون، برواداراتیش بێتاقەت بوون، خوا هەواڵی پێدان، وە بەڵێنیدا کە ڕۆمەکان لە داهاتوودا سەردەکەون بەسەر فارسەکان.

(٤-٥): ﴿ فِي بِضۡعِ سِنِينَۗ لِلَّهِ ٱلۡأَمۡرُ مِن قَبۡلُ وَمِنۢ بَعۡدُۚ وَيَوۡمَئِذٖ يَفۡرَحُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ۝٤ بِنَصۡرِ ٱللَّهِۚ يَنصُرُ مَن يَشَآءُۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ۝٥ ﴾:

﴿ فِي بِضۡعِ سِنِينَ ﴾ (واتە: لە ماوەی چەند ساڵێکدا) نۆ یان هەشت، وێنە ئەوە، دە ساڵ زیاتر ناخایەنێت، سێ ساڵ کەمتریش نابێت، سەرکەوتنی فارس بەسەر ڕۆمەکان، پاشان سەرکەوتنی ڕۆمەکان بەسەر فارسەکان، هەموو ئەوانە بە ویست‌و تواناو دەسەڵاتی خوایە، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ لِلَّهِ ٱلۡأَمۡرُ مِن قَبۡلُ وَمِنۢ بَعۡدُ ﴾ (واتە:

هەمـوو کاروبـار تەنها بە دەسـتی خوایـە لە پێش سـەرکەوتن و لـە دوای سـەرکەوتنیش)، سـەرکەوتن تەنها بـە هۆکارەکانەوە نەبەسـتراوە، بەڵکو دەبێ ببەسـترێ بە قـەزاو قەدەرەوە.
﴿وَيَوۡمَئِذٖ﴾ واتـە: لـەو ڕۆژەدا ڕۆمـەکان سـەردەکەون و زاڵ دەبن بە سـەر فارسـەکان ﴿يَفۡرَحُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ۝٤ بِنَصۡرِ ٱللَّهِۚ يَنصُرُ مَن يَشَآءُ﴾ واتـە: دڵخـۆش دەبـن بەسـەرکەوتنی ڕۆمـەکان بەسـەر فارسـەکان، ئەگەر چی هەموویـان بێبڕوان، بـەڵام هەندێ شـەڕ ئاسـانتر لەوی دیکـە، لـەو ڕۆژەدا بتپەرسـتان خەمبـار دەبوون.
﴿وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ﴾ ئـەو زاتـەی خـاوەن دەسـەڵاتە بەسـەر بەدیهێنـراوەکان بـە گشـتی، دەسـەڵات دەدات بە هەر کەسـێک کە بیەوێت، وە دەسـەڵات دەسـێنێتەوە لە هەر کەسـێ کـە بیەوێـت، وە بەڕێـزی دەکات ئـەوەی بیەوێـت، وە بێڕێـزی دەکات ئـەوەی بیـەوێ، هەمـوو ئەوانە بە ویسـتو توانـای خۆیەتی، بۆیـە فەرموویەتی: ﴿ٱلرَّحِيمُ﴾ (بـە بەزەییە) بـە بەنـدە بڕوادارەکانی، چونکـە هۆکارێکی بۆ نووسـیون خۆشـبەختیان دەکاتو سـەریان دەخـات، کە لـە ژمـاردن نایەت.

وَعْدَ اللَّهِ لَا يُخْلِفُ اللَّهُ وَعْدَهُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ
٦ يَعْلَمُونَ ظَاهِرًا مِنَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ الْآخِرَةِ هُمْ
غَافِلُونَ ٧ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا فِي أَنْفُسِهِمْ مَا خَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ
وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ وَأَجَلٍ مُسَمًّى وَإِنَّ كَثِيرًا
مِنَ النَّاسِ بِلِقَاءِ رَبِّهِمْ لَكَافِرُونَ ٨ أَوَلَمْ يَسِيرُوا فِي
الْأَرْضِ فَيَنْظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ كَانُوا
أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَأَثَارُوا الْأَرْضَ وَعَمَرُوهَا أَكْثَرَ مِمَّا
عَمَرُوهَا وَجَاءَتْهُمْ رُسُلُهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ فَمَا كَانَ اللَّهُ
لِيَظْلِمَهُمْ وَلَكِنْ كَانُوا أَنْفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ٩ ثُمَّ كَانَ
عَاقِبَةَ الَّذِينَ أَسَاءُوا السُّوأَى أَنْ كَذَّبُوا بِآيَاتِ اللَّهِ وَكَانُوا
بِهَا يَسْتَهْزِئُونَ ١٠ اللَّهُ يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ
١١ وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يُبْلِسُ الْمُجْرِمُونَ ١٢ وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ مِنْ
شُرَكَائِهِمْ شُفَعَاءُ وَكَانُوا بِشُرَكَائِهِمْ كَافِرِينَ
١٣ وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ يَتَفَرَّقُونَ ١٤ فَأَمَّا الَّذِينَ
آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَهُمْ فِي رَوْضَةٍ يُحْبَرُونَ ١٥

(٦): ﴿ وَعْدَ اللَّهِ لَا يُخْلِفُ اللَّهُ وَعْدَهُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ (٦) ﴾:

﴿ وَعْدَ اللَّهِ لَا يُخْلِفُ اللَّهُ وَعْدَهُ ﴾ (واتــە: ئــەوە بەڵێنــی خوایــە خــواش پێچەوانــەی بەڵێنــی خــۆی نــاکات)، بــاش لــەوە دڵنیــا بــن، بیبرنــەوە، وە بزانــن ئــەوە هــەر دەبێ ڕوو بــدات.

کاتــێ ئــەم دەقانــە دابەزینــە خــوارەوە کــە ئــەم پەیمانــەی تێدابــوو، مســوڵمانان بــە ڕاســتیان دانــاو بتپەرســتانیش بێبــڕوا بــوون پێــی، هەتــا هەنــدێ لــە مســوڵمانانو هەنــدێ لــە بتپەرســتان ڕەهنیــان کــرد لەســەر مــاوەی دیاریکرنــی ســاڵەکان، دوای ئــەوەی ئــەو کاتــە هــات خــوا دایانبــوو، ڕۆمــەکان ســەرکەوتن بەســەر فارســەکاندا، لــە وڵاتەکەیــان دەریــان کــردن کــە پێشــتر فارســەکان لێیــان وەرگــرت بــوون، وە پەیمانــی خــوا هاتەجــێ.

ئەمــە لــە کاروبــارە پەنهانەکانــە کــە خــوا هەواڵــی پێــداوە پێــش ڕوودانــی، وە لــەو ســەردەمی ئەوانــەدا ڕوویــداوە کــە خــوا هەواڵــی پێیــان داوە، لــە مســوڵمانانو بتپەرســتان ﴿ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ (واتــە: بــەڵام زۆربــەی خەڵکــی نازانــن)، ئــەوەی خــوا پەیمانــی پێــداوە ڕاســتە، لەبــەر ئــەوەی دەســتەیەک لــە ئــەوان هەیــە بەڵێنەکانــی خــوا بــە درۆ دەزانــن، وە ئایەتەکانــی بــە درۆ دادەنێــن، ئــا ئەوانــەن نازانــن، واتــە: نــاوەرۆکو دەرەنجامــی شــتەکان نازانــن.

(٧): ﴿ يَعْلَمُونَ ظَاهِرًا مِنَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ الْآخِرَةِ هُمْ غَافِلُونَ (٧) ﴾:

بەڵکــو ﴿ يَعْلَمُونَ ظَاهِرًا مِنَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ﴾ (واتــە: تەنهــا ڕواڵەتــی ئــەم ژیانــی دونیــا دەزانــن) تەماشــای هــۆکارەکان دەکــەن، ئنجــا بڕیــار بــە ڕوودانــی کارەکــە دەدەن، بــە بۆچوونــی ئــەوان هۆکارەکانــی بوونــی هاتووەتــە جــێ، وە دڵنیــان لــە نەبوونــی کارێــک کــە هــۆکاری پێویســتیان بــۆی ئامــادە نەکردبــێ، ئــەوان لەگــەڵ هۆکارەکانــدا

وەســتاون، تەماشــای بەدیهێنــەری هــۆکارەکان ناکــەن کــە هەڵیــان دەســوڕێنێ.
﴿ وَهُمْ عَنِ ٱلْآخِرَةِ هُمْ غَـٰفِلُونَ ﴾ (واتــە: ئــەوان بێئاگــان لــە ڕۆژی دوایــی) دڵەکانیــانو هەواو ئارەزوویــانو ویســتو ئیرادەیــان ڕووی کردوەتــە دنیــاو ئارەزووەکانــی، کارو کۆششــی بــۆ دەکــەنو ڕووی تێدەکــەن، لــە ڕۆژی دوایــی بێئاگــان، نــە بــە بەهەشــت حەزیــان دەجوڵــێ، نــە لــە ئاگــر دەترســن، نــە لــە ڕاگرتنیــان لەبــەر دیوانــی خــوا دەترســنو شــەرمەزار دەبــن، ئەمــە نیشــانەی بەدبەختیــە، وە ناونیشــانی بێئاگاییــە لــە ڕۆژی دوایــی.
بەســەر ســوڕمانەوە ئــەم بەشــەی خەڵکــی لــەڕووی زیرەکیــەوە دەربــارەی ژیانــی دونیــا، گەیشــتوونەتە قۆناغێــک عەقــڵو دڵــەکان سەرســام دەکــەن، شــتی وا سەرســوڕهێنەریان دەرخســتوە لــە ئاگــرەکانو کارەباییــەکانو کەرەســتەی ســوار بوونــی وشــکانیو دەریایــیو هەوایــی، پێــی پێشــکەوتوونو سەرســام بــوون بــە عەقڵیــان، وا دەبینــن جگــە لــە ئــەوان بێتوانــان لــەوەی خــوا توانــای داون بەســەریدا، بۆیــە تەماشــایان دەکــەن بــە چــاوی بەکــەم زانیــنو بــێ نرخیــەوە، لەگــەڵ ئــەوەدا ئــەوان گێلتریــن لــە کاروبــاری ئاینیانــدا، زۆر بێئاگــان لــە دواڕۆژیــان، کەمتریــن زانیاریــان هەیــە دەربــارەی داهاتوویان، کەســانی ژیــرو بەرچــاو ڕوون بینیویانــن لــە نەفامــی خۆیانــدا شــتەکان تێکەڵــی دەکــەن، وە لــە گومڕاییانــدا ســەر لــێ شــێواون، خوایــان لــە بیــر خۆیــان بــردەوە، خــواش ئەوانی لەبیــر خۆیــان بــردەوە، ئەوانــە دەرچــوون لــە فەرمانــی خــوا.
جــا ئەگــەر تەماشــای ئەوەیــان بکردایە خــوا پێــی بەخشــیون، وە توانــای داون بەســەریدا، لــەو بیرۆکــە وردانــەو لــە شــارەزاییان لــە ڕووالەتــی دونیــا، وە بێبەشــبوونیان لــە عەقڵــی بــەرز، ئــەوە دەیانزانــی کاروبــارەکان تەنهــا بــۆ خوایــە، وە حوکــمو بڕیاریــش هــەر بــۆ ئــەوە لــە بەندەکانیــدا، وە بــە هەمــان شــێوە لــە خــوا دەترســانو داوایــان لێدەکــرد ڕووناکــی عەقــڵو ئیمانیــان بــۆ تــەواو بــکات، هەتــا بگــەن پێــیو لــەو گوڕەپانــەدا بــن، ئــەم کاروبارانــە ئەگــەر هاوتــای ئیمــان بکــرێو لەســەری بونیــاد بنــرێ، ئــەوە بــەرز دەبنــەوەو ژیــان خــۆش دەبــێ، بــەڵام لەبــەر ئــەوەی زۆرێــک لەوانــە لەســەر گومڕایــی بونیــاد نــراوە، هیــچ بەرهــەم ناهێنــێ دابەزینــی ڕەوشــتو ئــاکار نەبــێ، وە هۆکارەکانــی نەمــانو لەناوچــوون.
(٨-١٠): ﴿ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِم ۗ مَّا خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ بِلِقَآئِ رَبِّهِمْ لَكَـٰفِرُونَ ﴿٨﴾ أَوَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ

فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَانُوٓا۟ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَأَثَارُوا۟ ٱلْأَرْضَ وَعَمَرُوهَآ
أَكْثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا وَجَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ ۖ فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓا۟
أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٩﴾ ثُمَّ كَانَ عَٰقِبَةَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔوا۟ ٱلسُّوٓأَىٰٓ أَن كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَكَانُوا۟ بِهَا
يَسْتَهْزِءُونَ ﴿١٠﴾ ﴾:

﴿ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا۟ ﴾ واتــە: ئایــا ئــەو بــە درۆ دانەرانــە بیریــان نەکردوەتــەوە، لــە پێغەمبەرانــی خــواو گەیشــتن بــە خزمەتــی پەروەردگــار؟! ﴿ فِىٓ أَنفُسِهِم ﴾ بێگومــان لــە خــودی خۆیــان چەندیــن نیشــانە هەیــە بــۆ ناســینەوەی، ئــەو کەســەی لــە نەبوونــەوە هێناونیــە بــوون، جارێکــی تــر دروســتیان دەکاتــەوە، وە ئــەو کەســەی گواســتونیەتیەوە بــە چەندیــن قۆنــاغ، لــە تکــێ ئــاو بــۆ خوێنــی مەیــو دواتــر بــۆ پارچــە گۆشــتێ، دواتــر بــوو بــە مــرۆڤ، فــووی ڕووحــی کــرد بــە بەریــدا، تــا بــوو بــە منــداڵ، دواتــر بــوو بــە گەنــج، دواتــر پیــری، ناگونجــێ هــەروا بــە هاوەنتــە پشــتگوێیان بخــات، فەرمانیــان پێنەکــرێو قەدەغەیــان لێنەکــرێ، وە پاداشــت نەدرێنــەوەو ســزا نەدرێــن.

﴿ مَّا خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ﴾ واتــە: بــۆ ئــەوەی تاقیتــان بکاتــەوە کــە کــردەوەی کامتــان چاکتــرە؟ ﴿ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾ واتــە: ماوەیەکــی دیاریکــراو، تــا کاتــێ دونیــا کۆتایــی پێدێــتو قیامــەت بــە دوایــدا دێــت، وە زەوی دەگــۆڕێ جگــە لــەم زەویــەو ئاســمانەکانیش.

﴿ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ بِلِقَآئِ رَبِّهِمْ لَكَٰفِرُونَ ﴾ (واتــە: بێگومــان زۆرێ لــە خەڵــک بڕوایــان نیــە بــە خزمەتــی پەروەردگاریــان بگــەن)، بۆیــە خۆیــان ئامــادە نەکــردوە بــۆ گەیشــتن بــە خزمەتــی، وە پێغەمبەرانیشــیان بــە ڕاســت دانەنــاوە کــە هەواڵــی پێــداوە، ئــەم بێبڕواییــە بــە بــێ بەڵگەیــە، بەڵکــو بەڵگــەی یەکلاکــەرەوە هەیــە لەســەر زینــدوو بوونــەوەو پاداشــت، لەبــەر ئەمەیــە ئاگــاداری کردوونەتــەوە بــە گــەڕان بەســەر زەویــدا، وە تەماشــا کردنــی ســەرەنجامی ئەوانــەی پێغەمبەرەکانیــان بــە درۆ زانیــوەو پێچەوانــەی فەرمانــی ئــەوان جوڵاونەتــەوە، بێگومــان ئــەوان زۆر بەهێزتــر بــوون لــە ئەمــان، وە شــوێنەواریان زیاتــر بــوو لەســەر زەوی، لــە دروســتکردنی باڵەخانــەو شــوێنی پیشەســازی، وە لــە چاندنــی داروو درەخــتو کشــتو کاڵ کــردنو ئاودێــری، هێــزو توانــاو شــوێنەواریان هیــچ ســوودی پێنەگەیانــدن، کاتــێ پێغەمبەرانیــان بــەدرۆ دانــا، پێغەمبــەران بــە بەڵگــەی ڕوونو ئاشــکراو حەقــەوە هاتــن بــۆ ناویــان، کاتــێ

تەماشـای شـوێنەوارەكانی ئـەوان دەكـەن نابینـن تەنهـا ئۆمەتێكـی لەناوچـوو نەبـێ، وە مـاڵو پـەردووی ڕووخـاوو ترسـناك، وە سەرزەنشـت كردنـێ لـە لایـەن خەڵكـەوە سـەردەم لـە دوای سـەردەم، بەڕاسـتی ئەمـە سـزای پێشـخراوە نموونـەو سـەرەتایەكە بـۆ سـزای دواڕۆژ، هەمـوو ئـەو ئۆممەتـە لـە نـاو براوانـە خـوا بـەو لـە نـاو بردنـە سـتەمی لێنەكـردن، بەڵكـو خۆیـان سـتەمیان لـە نەفـسو دەروونـی خۆیـان كـردوو بـوون بـە هـۆكاری لـە نـاو بردنیـان.

﴿ ثُمَّ كَانَ عَـٰقِبَةَ ٱلَّذِينَ أَسَـٰٓـُٔوا۟ ٱلسُّوٓأَىٰٓ ﴾ واتـە: حاڵەتێكـی سـەختو ناشـرینە، وە ئـەوە بووەتـە هۆكارێـك بۆیـان چونكـە ﴿ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ وَكَانُوا۟ بِهَا يَسْتَهْزِءُونَ ﴾ ئـەم سـزایە بـە هـۆی خراپـەكاریو گوناهەكانیانەوەیـە، پاشـان ئـەو گاڵتەكـردنو بـەدرۆ زانینـە مەزنتریـن هـۆكاری سـزاكانن.

(١١-١٦): ﴿ ٱللَّهُ يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿١١﴾ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يُبْلِسُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿١٢﴾ وَلَمْ يَكُن لَّهُم مِّن شُرَكَآئِهِمْ شُفَعَـٰٓؤُا۟ وَكَانُوا۟ بِشُرَكَآئِهِمْ كَـٰفِرِينَ ﴿١٣﴾ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ يَتَفَرَّقُونَ ﴿١٤﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ فَهُمْ فِى رَوْضَةٍ يُحْبَرُونَ ﴿١٥﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا وَلِقَآئِ ٱلْـَٔاخِرَةِ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ فِى ٱلْعَذَابِ مُحْضَرُونَ ﴿١٦﴾ ﴾:

خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات كـە ئـەو تـاكو تەنهایـە بـە دەسـتپێكردنی دروسـتكردنی بەدیهێنـراوەكان، لـە پـاش مردنیـان دروسـتیان دەكاتـەوە، پاشـان بـۆ لای ئـەو دەگەڕێنـەوە دوای دروسـتكردنەوەیان، بـۆ ئـەوەی پاداشـتیان بداتـەوە بـە پێـی كردەوەكانیـان، ئـا لەبـەر ئەمـە باسـی پاداشـتی خراپەكارانـی كـردوە، پاشـان پاداشـتی چاكـەكاران، جـا فەرموویەتـی:

﴿ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ ﴾ واتـە: هەمـوو خەڵكـی هەڵدەسـتن بـۆ لای پەروەردگاریـان، ڕۆژی قیامـەت بـە چـاوی خۆیـان دەبینـن، ئـا لـەو ڕۆژەدا ﴿ يُبْلِسُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴾ واتـە: بـێ ئومێـد دەبـن لـە هەمـوو خێرێـك، چونكـە هیچیـان پێـش نەخسـتووە بـۆ ئـەو ڕۆژە جگـە لـە تـاوانو خراپـەكاری لـە بێبڕوایـیو هاوبەشـدانانو سـەرپێچی.

كاتێ هۆكارەكانی سزادانیان بۆ خۆیان پێشخست، وە تێكەڵیان نەكرد بە شتێك لە هۆكارەكانی پاداشت، بێئومێدو موفلیس بوون، وە لێیان ون بوو ئەوەی درۆیان بە دەممەوە دەكرد لە سوودگەیاندنی هاوبەشەكانیان گوایە ئەوان تكایان بۆ دەكەن.

(١٣-١٤): بۆیــه فەرموویەتــی: ﴿ وَلَمْ يَكُن لَّهُم مِّن شُرَكَآئِهِمْ ﴾ (بێگومــان لــه پەرســتراوەکانیان نیــه) ئــەو پەرســتراوانەی کــه لەگــەڵ خــوا پەرســتوویانن، ﴿ شُفَعَٰٓؤُاْ وَكَانُواْ بِشُرَكَآئِهِمْ كَٰفِرِينَ ﴾ (واتــه: تــکا کارانــێ، وە ئــەوان بێبــڕوا دەبــن بــه پەرســتراوەکانیان) بتپەرســتان خۆیــان بــەری دەکــەن لــەوەی کردوویانەتــە هاوبــەش لەگــەڵ خــوادا، وە پەرســتراوانیش خۆیــان بــەری دەکــەن ﴿ تَبَرَّأْنَآ إِلَيْكَ مَا كَانُوٓاْ إِيَّانَا يَعْبُدُونَ ﴿٦٣﴾ ﴾ القصص، (واتــه: ئێمــه بــەری بوویــن لەوانــە بــەری بوونەکەمــان لای تــۆ دەکەیــن ئەوانــە ئێمەیــان نەدەپەرســت) نەفرینیــان لێدەکــەنو لێیــان دوور دەکەونــەوە، ئــا لــەو ڕۆژەدا دەســتەی خێــرو دەســتەی شــەڕ لــە یــەک جیادەبنــەوە، هەروەکــو چــۆن کردەوەکانیــان لــە دونیــادا جیابوویــەوە.

(١٥): ﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾ بــە دڵ بڕوایــان هێنــاوە، وە بــە کــردەوەی چاکیــش بــە ڕاســتیان دانــاوە، ﴿ فَهُمْ فِى رَوْضَةٍ ﴾ (ئــەوان لــە بەهەشــتدا) کــە تیایدایــە جۆرەهــا ڕووەکو ســەوزاییو لەوانــەی حەزیــان لــێ دەکــرێ ﴿ يُحْبَرُونَ ﴾ دڵخۆشــن، وە لــەززەت وەردەگــرن لــە خــواردنو خواردنــەوە بەتامــەکان، وە حــۆری جــوانو خزمەتــکارو منــداڵان، وە دەنگــی خــۆش، وە دیمەنــی سەرســووڕهێنەرو جــوان، وە دڵخۆشــیو چێــژ وەرگرتــن کــە هیــچ کەســێک ناتوانــێ وەســفی بــکات.

وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا وَلِقَآئِ ٱلْـَٔاخِرَةِ
فَأُو۟لَـٰٓئِكَ فِى ٱلْعَذَابِ مُحْضَرُونَ ﴿١٦﴾ فَسُبْحَـٰنَ ٱللَّهِ حِينَ تُمْسُونَ
وَحِينَ تُصْبِحُونَ ﴿١٧﴾ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ
وَعَشِيًّا وَحِينَ تُظْهِرُونَ ﴿١٨﴾ يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ
ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ وَيُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ۚ وَكَذَٰلِكَ تُخْرَجُونَ
﴿١٩﴾ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ إِذَآ أَنتُم بَشَرٌ
تَنتَشِرُونَ ﴿٢٠﴾ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ
أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ
إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦ
خَلْقُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَـٰفُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَٰنِكُمْ ۚ
إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّلْعَـٰلِمِينَ ﴿٢٢﴾ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦ مَنَامُكُم
بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَٱبْتِغَآؤُكُم مِّن فَضْلِهِۦٓ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ
لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ ﴿٢٣﴾ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦ يُرِيكُمُ ٱلْبَرْقَ
خَوْفًا وَطَمَعًا وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَيُحْىِۦ بِهِ ٱلْأَرْضَ
بَعْدَ مَوْتِهَآ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٢٤﴾

(١٦): ﴿ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ﴾ وه‌ ئینكاری نازونیعمه‌ته‌كانیان كردووه‌و له‌ به‌رانبه‌ریدا به‌ كوفرو بێبڕوایی ڕووبه‌ ڕووی بونه‌ته‌وه‌ ﴿ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا ﴾ ئه‌و ئایه‌تانه‌ی پێغه‌مبه‌رانمان بۆی هێناون ﴿ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ فِى ٱلْعَذَابِ مُحْضَرُونَ ﴾ (واته‌: ئا ئه‌وانه‌ له‌ سزای دۆزه‌خدا ئاماده‌ ده‌كرێن) تیایدا، دۆزه‌خ ده‌وریان ده‌دا له‌ هه‌موو ڕووه‌كانه‌وه‌، وه‌ سزای به‌ ئێش ده‌گاته‌ نێو سنگیان، وه‌ ده‌مو چاویان ده‌برژێنی‌و جه‌رگیان ده‌بڕێ، ده‌ی كامه‌یه‌ جیاوازی له‌ نێوان ئه‌و دوو ده‌سته‌دا، ده‌ی كامه‌یه‌ یه‌كسان بوون له‌ نێوان نیعمه‌ت پێدراوان‌و سزادراواندا؟

(١٧-١٩): ﴿ فَسُبْحَـٰنَ ٱللَّهِ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْبِحُونَ ﴿١٧﴾ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَعَشِيًّا وَحِينَ تُظْهِرُونَ ﴿١٨﴾ يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ وَيُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ۚ وَكَذَٰلِكَ تُخْرَجُونَ ﴿١٩﴾ ﴾:

﴿ فَسُبْحَـٰنَ ٱللَّهِ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْبِحُونَ ﴿١٧﴾ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَعَشِيًّا وَحِينَ تُظْهِرُونَ ﴾ ئه‌مه‌ هه‌واڵدانه‌ ده‌رباره‌ی پاكی‌و بێگه‌ردی خوا له‌ ناته‌واوی‌و كه‌م‌و كورتی، وه‌ به‌ پاك ڕاگرتنی له‌ شوبهاندنی به‌ یه‌كێك له‌ دروستكراوه‌كان، فه‌رمانی كردوه‌ به‌ به‌نده‌كان به‌پاك ڕایبگرن‌و یادی بكه‌ن كاتێ ئێواره‌یان لێ دێت‌و كاتێ به‌یانیان لێدێت، وه‌ له‌ كاتی شه‌وو كاتی نیوه‌ڕۆ.

ئه‌م پێنج كاته‌، كاته‌كانی هه‌ر پێنج نوێژه‌كه‌یه‌، خوا فه‌رمانی كردوه‌ به‌ به‌نده‌كانی به‌ پاك ڕاگرتن‌و یادكردنه‌وه‌و ستایش كردن تیایدا، ئه‌وه‌ی ئه‌ركه‌ وه‌كو پێنج فه‌رزه‌كه‌، ئه‌ویشی سونه‌ته‌ وه‌ك زیكری به‌یانیان‌و دوای نوێژه‌كان‌و ئه‌وه‌یشی په‌یوه‌ندی به‌مانه‌وه‌ هه‌یه‌ له‌وانه‌ی په‌سندن، چونكه‌ ئه‌م كاتانه‌ی كه‌ خوا هه‌ڵیبژاردوه‌ -كاتی فه‌رزه‌كانه‌- باشترن له‌ كاته‌كانی دیكه‌.

(١٩): ﴿ يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ ﴾ (واته‌: خوا زیندوو له‌ مردوو ده‌ردێنێ) وه‌ك چۆن

ڕووەک لـە زەویەکـی مـردوو دەردێنـێ، گوڵەگەنـم لـە تـۆو، دار لە تـۆو، جوچکە لـە هێلکە، بـڕوادار لـە بێبـڕوا، وێنـەی ئەوانـەش ﴿ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَيِّ ﴾ (واتـە: مـردوو لـە زینـدوو دەردێنـێ) بـە پێچەوانـەی ئەوەی باسـمان کـرد، ﴿ وَيُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ﴾ (واتـە: وە زەوی زینـدوو دەکاتـەوە لـە پاش مردنو وشـک بوونـی)، بارانـی بەسـەردا دەبارێنێ لـە کاتێکدا ئەو مـردووەو وشـکو بـێ گیانـە، جـا کاتـێ بارانـی بەسـەردا بارانـد، زەوی ڕووەکی لێـدەڕوێو دەجولـێ، زەوی هەڵـدەداتو بـەرز دەبێتـەوەو زەوی دەڕوێنـێ لـە هەموو جۆرە گیـاو گوڵێکی جـوان ﴿ وَكَذَٰلِكَ تُخْرَجُونَ ﴾ (واتـە: هـەر بەو جـۆرە ئێـوەش دەردەهێنرێـن) لـە گۆڕەکانتان. ئەمـە بەڵگەیەکـی یەکلاکـەرەوەو سـەلماندنێکی ڕوونـە، ئەو خوایـەی زەوی زینـدوو دەکاتەوە دوای مردنـی، بێگومـان هـەر ئەویش مـردووەکان زینـدوو دەکاتەوە.

لـە ڕووی عەقڵـەوە هیـچ جیاوازیـەک نیـە لـە نێـوان ئـەو دوو کارەدا، وە ناکـرێ یەکێکیان بە دوور بزانـرێ لەگـەڵ بینینـی ئـەوی دیکەدا.

(٢٠-٢٢): ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ إِذَآ أَنتُم بَشَرٌ تَنتَشِرُونَ ﴿٢٠﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَٰنِكُمْ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّلْعَٰلِمِينَ ﴿٢٢﴾ ﴾

ئەمـە دەسـتپێکێکە بـۆ ژماردنـی ئـەو نیشـانانەی کـە بەڵگـەن لەسـەر تـاکو تەنهایی خـوا بە پەرسـتراوێتیو تـەواوی مەزنـیو جێبەجـێ کردنـی ویسـتو ئیـرادەی، وە تواناو دەسـەڵاتیو جوانـی دروسـتکردنیو فراوانـی بەزەیـیو چاکەکانـی، جـا فەرموویەتـی: ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ﴾ (واتـە: لـە نیشـانەکانی خـوا ئێـوەی لـە خـاک دروسـتکردوە) ئەویش بە دروسـتکردنی بنچینـەی ڕەچەڵـەک، ئـادەم ﷺ ﴿ ثُمَّ إِذَآ أَنتُم بَشَرٌ تَنتَشِرُونَ ﴾ واتـە: ئـەو زاتـەی دروسـتی کردوون لـە یەک بنچینەو یـەک توخم، وە بڵاوتـان دەکاتەوە لەسـەر زەویدا، لـەوەدا بەڵگـەو نیشـانە بەدی دەکـرێ ئەو کەسـەی دروسـتی کردوون لـەم بنچینەیـەو بڵاوی کردوونەتـەوە لەناو زەویدا، ئەوە پەروەردگاری پەرسـتراوە، پاشـای سـتایش کـراوە، بە بەزەییو بەسـۆزە، ئـەو زاتـەی جارێکی دیکـە دروسـتتان دەکاتـەوە دوای مردن.

﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ ﴾ (وە لـە نیشـانەکانی) کـە بەڵگـەن لەسـەر ڕەحمـەتو گرنگـی خـوا بـە بەندەکانـی، وە حیکمەتـی مەزنیو زانسـتی گشـتگیری ﴿ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا ﴾ (واتـە: بـۆی دروسـتکردوون لە نەفسـی خۆتـان هاوسـەرانێک بۆ ئـەوەی ئارام بگرن لـە لایان)

هاوشـانتانو هاوشـانی ئەوانـن، وە هاوشـێوەتانو هاوشـێوەی ئەوانن.
﴿لِّتَسْكُنُوٓاْ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً﴾ (واتـە: بـۆ ئـەوەی ئارام بگـرن لە لایان، وە خۆشەویسـتیو بەزەیـی خسـتۆتە نێوانتـان) بەو جۆرە ڕێکی خسـتووە لەسـەر هاوسـەرگیری چەندین هـۆکاری پاڵنەر بـۆ خۆشەویسـتیو بەزەیی.
بـە ژن هێنـانو چێژ وەرگرتـنو لەززەتو سـوودی زۆر لە بوونـی منـداڵو پەروەردەکردنیانو ئارامگرتـن بـە هۆیانـەوە بـە دەسـتهاتووە، بـە زۆری نابینی لـە نێوانی دوو کەسـدا وەکـو نێوان ژنو مێـرد سـوودو بەزەیی هەبێ، ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ واتـە: بیر لە ئایەتەکانی خـوا دەکەنـەوەو ڕادەمێنـن، وە لە شـتێکەوە دەیگوازنەوە بۆ شـتێکی دیکە.
(٢٢): ﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَٰنِكُمْ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٍ لِّلْعَٰلِمِينَ﴾ زانایـان: ئەوانـەن خاوەنی زانسـتن تێدەگەن لە پەنـدو ئامۆژگاریەکان، وە سـەرنجی ئایـەتو نیشـانەکان دەدەن، ئایـەتو نیشـانەکان لـەو ڕووەوە زۆرن: لـەو ئایەتانـە دروسـتکردنی ئاسـمانەکانو زەویو ئـەوەی لەناویاندایە، بەڕاسـتی ئەوە بەڵگەیە لەسـەر مەزنیو تـەواوی دەسـەڵاتی خوا، ئـەو زاتەی کە ئـەم بەدیهێنـراوە مەزنانـەی دروسـتکردوە، وە تەواوی حیکمەتـی کـە تیایدایـە لـە وردەکاریو فراوانـی زانسـتی خـوا، چونکـە بەدیهێنەر هـەر دەبێ ئـەوەی دروسـتی کـردوە بیزانـێ ﴿أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ﴾ الملك، (واتـە: ئایا ئـەو خوایەی کە ئادەمیـزادی دروسـت کـردوەو ئاگـای لە نهێنیـان نیە).
وە گشـتگیری ڕەحمـەتو چاکەکانـی خـوا کـە لـە دروسـتکردنی ئەوانـەدا چەندین سـوودی گـەورەو مـەزن هەیـە، وە بێگومان ئەو هەر شـتێکی بـوێ دەیکات، کـە چەندیـن تایبەتمەندی لـە خـۆ دەگـرێ، ئەو زاتـە تاکـو تەنهایـە، شایسـتەی ئەوەیە بە تەنهایـی بپەرسـترێ، چونکە لە دروسـتکردندا تاکـە، بۆیە پێویسـتە بە تاکـو تەنهایـی عیبادەتی بۆ بکرێ، هەمـوو ئەمانە بەڵگەی عەقڵیـن، خـوا ﷻ عەقڵەکانـی پێ ئاگـادار کردۆتـەوە، وە فەرمانـی پێکردوون بـە بیر کردنەوەو دەەرهێنانـی پەنـدو ئامۆژگاری تێیانـدا ﴿وَٱخْتِلَٰفُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَٰنِكُمْ﴾ (واتـە: جیاوازی زمـانو ڕەگەزتـان) لە سـەر زۆریو جیاوازیتـان، لەگەڵ ئـەوەدا لە یەک بنچینەوە سـەرچاوەتان گرتووە، وە شـوێنی دەرچوونی قسـەکانتان یەکـە، لەگەڵ ئەوەدا دوو دەنـگ نابینی وەکو یەکتر بـن لـە هەمـوو ڕوویەکـەوە، وە دوو ڕەنـگ نابینـی وێنـەی یەکتر بن لـە گشـت ڕوویەکەوە، بێگومـان جیاوازیەکیـان تێـدا دەدۆزیتـەوە کـە مایـەی ئەوەبـێ لە یەکتـر جیا بینـەوە، ئەمەش بەڵگەیـە لەسـەر تەواوی دەسـەڵاتی خـوا، وە جێبەجێکردنی ویسـتو ئیرادەی.

وە لـە گرنگیـدانو ڕەحمەتـی خـوا بـە بەندەکانـی ئەوەیـە ئـەو جیاوازیـەی دانـاوە بـۆ ئەوەی لەیەکچـوون ڕوونـەدات نەبێتە مایەی پشـێوی، وە زۆرێ لە مەبەسـتو داواکاریەکان لە دەسـت نە چێ.

(٢٣): ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ مَنَامُكُم بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَٱبْتِغَآؤُكُم مِّن فَضْلِهِۦٓ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾:

واتـە: گـوێ گرتنێکـی قـوولو عەقـڵ وەرگرتـن لـە مانـاکانو ئایـەتو نیشـانەکان لـە (ئەو خەوتنەتـان بـە شـەوو ڕۆژداو هەوڵدانتـان بۆ بەهرە وەرگرتن لە بەخششـی خوا) بەڕاسـتی ئەوانە بەڵگـەن لەسـەر میهرەبانی خـوای بەرزو مـەزن، وەک فەرموویەتـی: ﴿ وَمِن رَّحْمَتِهِۦ جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٧٣﴾ ﴾ القصـص، (واتـە: لـە بەزەیـی ئـەو خوایەیـە کـە شـەو و ڕۆژی بـۆ دروسـت کـردوون بـۆ ئەوە ئـارام بگـرن لە شـەوداو بۆ ئـەوە بگەڕێـن بـە دوای ڕزقو ڕۆزی خوادا لـە ڕۆژدا، وە بۆ ئەوەی سوپاسـی خـوا بکەن) وە لە تـەواوی حیکمـەتو دانایـی خـوا بێدەنـگ بوونی خەڵکیـە لە کاتێکـدا بۆ ئەوەی پشـوو بدەنو بحەسـێنەوە، وە بڵاوبوونەوەیـان لـە کاتێکـدا بـۆ بەرژەوەندی ئاینـیو دونیاییان، ئـەوەش تەواو نابـێ تەنهـا بـە هاتنی شـەوو ڕۆژ نەبێ، ئـەو زاتەی تـاکو تەنهایە لـە هەموو ئەوانـەدا هەر ئەو شایسـتەی بەندایەتی بـۆ کردنە.

(٢٤): ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ يُرِيكُمُ ٱلْبَرْقَ خَوْفًا وَطَمَعًا وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَيُحْىِۦ بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾:

﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ يُرِيكُمُ ٱلْبَرْقَ خَوْفًا وَطَمَعًا وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَيُحْىِۦ بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ ﴾ واتـە: لـە نیشـانەکانی ئـەو خوایە ئەوەیـە بارانتان بـۆ دادەبەزێنێ کە شـارو بەندەکانی پـێ دەژیێنێتەوە، وە پێتان نیشـان دەدات پێش دابەزینی چەند پێشـەکیەک، کە هەورە بروسـکەو چەخماخـە کـە تـرسو ئومێـدی تێدایە. (ترسـان لـە هەورە بروسـکەو ئومێـدی بـاران بارین)، ﴿ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ ﴾ (بەڕاسـتی لـەوەدا بەڵگـەو نیشـانەی زۆر هەیـە) کە بەڵگەن لەسـەر گشـتگیری چاکەکانـیو بەرفراوانی زانسـتیو تـەواوی ووردەکاریەکانـی، وە مەزنی حیکمەتو دانایـی، وە بێگومـان ئـەو زاتە مـردوو زیندوو دەکاتـەوە هەروەکو چۆن زەوی زینـدوو کردەوە دوای مردنـی، ﴿ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴾ واتـە: عەقڵیـان هەیە پێـی ژیر دەبن لەوەی کە دەیبیسـتن، وە دەیبینـێو دەیپارێـزێ، وە دەیـکا بە بەڵگە لەسـەر ئەوەی بەڵگەیە لەسـەری.

وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَن تَقُومَ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ بِأَمْرِهِۦ ۚ ثُمَّ إِذَا دَعَاكُمْ
دَعْوَةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ إِذَآ أَنتُمْ تَخْرُجُونَ ﴿٢٥﴾ وَلَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضِ ۖ كُلٌّ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ ﴿٢٦﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ
يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ ۚ وَلَهُ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضِ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٧﴾ ضَرَبَ لَكُم مَّثَلًا
مِّنْ أَنفُسِكُمْ ۖ هَل لَّكُم مِّن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم مِّن
شُرَكَآءَ فِى مَا رَزَقْنَٰكُمْ فَأَنتُمْ فِيهِ سَوَآءٌ تَخَافُونَهُمْ
كَخِيفَتِكُمْ أَنفُسَكُمْ ۚ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ
يَعْقِلُونَ ﴿٢٨﴾ بَلِ ٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَهْوَآءَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ ۖ
فَمَن يَهْدِى مَنْ أَضَلَّ ٱللَّهُ ۖ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٢٩﴾ فَأَقِمْ
وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ
لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ
ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ ۞ مُنِيبِينَ إِلَيْهِ وَٱتَّقُوهُ وَأَقِيمُوا۟
ٱلصَّلَوٰةَ وَلَا تَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٣١﴾ مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُوا۟
دِينَهُمْ وَكَانُوا۟ شِيَعًا ۖ كُلُّ حِزْبٍۭ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴿٣٢﴾

(٢٥): ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَن تَقُومَ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ بِأَمْرِهِۦ ۚ ثُمَّ إِذَا دَعَاكُمْ دَعْوَةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ إِذَآ أَنتُمْ تَخْرُجُونَ ﴿٢٥﴾ ﴾:

واتــە: یەکێکــی تــر لــە نیشــانە مەزنەکانی خــوا، ئەوەیــە ئاســمانو زەوی بــە فەرمانی ئــەو وەســتاون، نــا لەرێنــەوە، ئاســمانەکان نەکەوتــوون بەســەر زەویــدا، لە دەســەڵاتی مەزنــی خوایــە کــە ئاســمانو زەوی گرتوە تــا نەکــەون، لــە توانایــدا هەیــە ئەگــەر بانگــی خەڵکــی بــکات بــە یــەک بانــگ کردن لەســەر زەوی لەناکاو زینــدو ئەبنەوە لــە گۆڕەکانیــان، ﴿ لَخَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾غافر، (واتــە: بە ڕاســتی بەدیهێنانــی ئاســمانەکانو زەوی گەورەترە لــە بەدیهێنانــی خەڵکی، بەڵام زۆربــەی خەڵکــی ئەمــە نازانن).

(٢٦-٢٧): ﴿ وَلَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ كُلٌّ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ ﴿٢٦﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ ۚ وَلَهُ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٧﴾ ﴾:

﴿ وَلَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ (واتــە: ئــەوەی لــە ئاســمانەکانو زەویدایــە تەنهــا هی خوایــە)، هەموویان دروســتکراوو ژێر دەســتی خــوای گــەورەن، کاروباریــان بەڕێوەدەبات بەبــێ ناکۆکیکارو یارمەتیــدەرو بەرهەڵســتکار، هەموویان گوێڕایــەڵو ملکەچی گەورەیی‌و تەواویــی ئەون.

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ﴾ واتــە: دووبــارە دروســتکردنەوەی خەڵــک دوای مردنیــان ﴿ أَهْوَنُ عَلَيْهِ ﴾ (واتــە: ئــەم دروســتکردنەوەی دووەمــە لای خــوا ئاســانترە) لــە ســەرەتای بەدیهێنانیــان، ئەمە بە نیســبەت بیر کردنــەوەو عەقڵــەکان، بێگومــان ئەگەر بە توانــا بێــت لەســەر بەدیهێنــان کــە ئێوە دانــی پێــدا دەنێن، ئــەوە دووبــارە دروســتکردنەوە

ئاسـانترە بەلایـەوە. کاتێ باسـی ئایەتـە مەزنەکانی کرد کە بـەو ئایەتانـە پەندوەرگران پەند وەردەگـرن، وە بـرواداران بیردەکەنـەوەو هیدایەتـدراوان بەرچـاو روون دەبـن، ئنجا باسـی کاری مـەزنو داواکاری گـەورەی کردوە، جـا فەرموویەتی: ﴿ وَلَهُ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ (واتـە: سـیفەتی هــەرە بــەرزو بڵنــد لــە ئاســمانەکانو زەویــدا هەر بــۆ خوایە) ئەویــش بریتیــە لــە هەموو ســیفەتێکی تەواو، وە تــەواوی لەو ســیفەتەدا، وە خۆشەویســتیو ملکەچــی تــەواو لــە دڵی بەنــدە دڵســۆزەکانی، وە پەرســتنیان، جــا نموونەی بــەرز، بریتیە لە ســیفەتی بەرز، وە ئەوەیشــی لەســەر ڕێکدەخرێ.

بۆیــە زانایــان لە حەقی خــوادا پێوەری لــە پێشــتریان بەکاردەهێنا، دەیانوت: هەر ســیفەتێکی تــەواو لە دروســتکراودا، بەدیهێنراوەکەی لە پێشــترە بە وەســف پێکردنی، بــە جۆرێ کەس بەشــدار نەبــێ تیایــدا، وە هــەر ســیفەتێکی ناتەواو دروســتکراو لێــی پارێزراو بــێو بە پاک ڕاگیرابــێ، ئــەوە بۆ خوا زۆر لە پێشــترە.

﴿ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾ واتــە: خــاوەن عیزەتی تــەواوو حیکمەتی بەرفراوانــە، عیزەتو دەســەڵاتی خــوا بەدیهێنراوەکانــی هێناوەتە بــوونو فەرمــان پێکراوەکانی دەرخســتووە، وە بــە حیکمــەتو دانایــی وردەکاریو پوختی لــە دروســت کراوەکاندا کــردوە، وە چاکترین شــەریعەتی بۆ داناون.

(٢٨-٢٩): ﴿ ضَرَبَ لَكُم مَّثَلًا مِّنْ أَنفُسِكُمْ هَل لَّكُم مِّن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم مِّن شُرَكَآءَ فِى مَا رَزَقْنَٰكُمْ فَأَنتُمْ فِيهِ سَوَآءٌ تَخَافُونَهُمْ كَخِيفَتِكُمْ أَنفُسَكُمْ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٢٨﴾ بَلِ ٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَهْوَآءَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ فَمَن يَهْدِى مَنْ أَضَلَّ ٱللَّهُ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾:

﴿ ضَرَبَ لَكُم مَّثَلًا مِّنْ أَنفُسِكُمْ ﴾ (واتــە: خــوا نموونەیەکتــان لــە خــودی خۆتــان بــۆ دێنێتــەوە) ئەمــە نموونەیەکە خــوا هێناوێتیــەوە بۆ ناشــرینی هاوبەش دانــەران، نموونەیەک لــە نەفســی خۆیان، پێویســت بە گەشــتو گــەڕانو کۆچ کــردن نــاکات. ﴿ هَل لَّكُم مِّن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم مِّن شُرَكَآءَ فِى مَا رَزَقْنَٰكُمْ ﴾ واتــە: ئایــا کەســێ لــە بەندەکانتان دەبێــت بــە هاوبەش لەگــەڵ ئێوەدا، بــە جۆری تەماشــایان بکەن ئێــوەو ئــەوان وەکو یەکتر یەکســان بن.

﴿ تَخَافُونَهُمْ كَخِيفَتِكُمْ أَنفُسَكُمْ ﴾ (واتــە: لــەوان دەترســنو حیســابیان بۆ بکــەن وەکو ترســان لە کەســانی وەک خۆتان) واتە: وەک کەســانێکی ئازاد کە لە ڕاســتیدا هاوبەشــتانن،

ئەوانــەی مەترســی دەکــەن ماڵەکەتــان لەگەڵــدا دابــەش بکــەن، وە تایبەت کردنــی هەموو شــتێ بــە حاڵی خــۆی، کارەکــە بەو جۆرە نیــە، بێگومــان هیچ یەکێــک لەوانــەی بەندەتانن نابن بــە هاوبەشــتان لــەو ڕزقو ڕۆزیەی خــوا پێی داون.

ئەمــەو لــە کاتێکــدا ئێوە ئەوانتان دروســت نەکــردوەو ڕزقو ڕۆزیتــان پێنــەداون، ئەوانیش وەکــو ئێــوە بەنــدەن، دەی چــۆن ڕازی دەبــن یەکێــک لــە دروســتکراوەکان بکــەن بــە هاوبــەش‌و لــە ئاســتی خــوا دایبنێن لــە بەندایەتــی کردنــدا، وە ئێــوە ڕازی نابن بە یەکســان کردنــی بەندەکانتــان لەگەڵتاندا؟

ئەمــە لــە سەرســوڕهێنەرترین شــتەکانە لەســەر گێلــی‌و گەمژەیی ئەو کەســەی لەگــەڵ خوا کەسێکی دیکــە دەکات بــە هاوبــەش، بێگومــان ئــەوەی کردویەتــی بــە هاوبــەش بەتاڵو پووچــە، یەکســان نیــە لەگەڵ خــوا، وە لــە بەندایەتیــدا هیچی بەدەســت نیە، ﴿ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْأَيَـٰتِ ﴾ (واتــە: ئــا بــەو جــۆرە نیشــانەکان) ڕوون دەکەینــەوە بــە نموونــەکان ﴿ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴾ (واتــە: بــۆ کەســانێ بــە عەقڵیــان هەســت) بــە ڕاســتیەکان دەکەن‌و دەیناســن، بــەڵام ئــەوەی کــە عەقڵی نیــە، ئەگــەر ئایەتەکانــی بۆ درێــژ بکرێتــەوەو ڕوون بکرێتــەوە، ئــەوە عەقڵێکــی نیــە بەرچــاوی ڕوون بــکات، وە دڵێکــی نیــە حەقیقەتەکانی بۆ دەربخــات، ئەوانــەی قســەیان لەگەڵــدا دەکــرێ‌و دەدوێنرێن.

کەواتــە: لــەم نموونەیــە ئــەوە زانــرا، هەرکەســێ جگە لە خــوا بکاتــە هاوبەش بیپەرســتێ‌و لــە کاروبارەکانیــدا پشــتی تێبــکات، ئــەوە بێگومــان هیچ حــەق‌و ڕاســتیەکی پێ نیــە، دەی چــی وای لێکــرد بــە هەنگاو نــان‌و دەستپێشــخەری لەســەر کاری پــووچ، پووچــی‌و بەتاڵی بــۆ ڕوون بووەتــەوەو بەڵگەکانیشــی دەرکەوتووە؟ بێگومان بۆیان پێویســت کراوە شــوێنی هــەواو ئــارەزوو بکەون، لەبــەر ئەمەیــە فەرموویەتــی: ﴿ بَلِ ٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَهْوَآءَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ ﴾ (واتــە: بەڵکــو ئەوانــەی ســتەمیان کــرد شــوێن ئــارەزووی خۆیــان کەوتــن بــێ شــارەزایی‌و نەزانانــە) دەروونــە ناتەواوەکەیــان ناتــەواوی دەرکەوتووە، کاتێ شــوێنی ئــارەزووی کەوتــووە لــە کاروبارێکــدا عەقــڵ دان بــە خراپیدا دەنێــت‌و سروشــتیش ڕەتی دەکاتــەوە، بــێ ئەوەی زانســتێ ڕێیان پێنیشــان بــدات‌و ڕووناکیــەک پێشــەوایەتیان بکات، ﴿ فَمَن يَهْدِى مَنْ أَضَلَّ ٱللَّهُ ﴾ واتە: ســەرتان ســوورنەمێنێ لە نەبوونــی هیدایەتیان، چونکە خــوا گومــڕای کــردوون بــە هــۆی ســتەمیانەوە، وە ڕێگایەک نیە بۆ کەســێ خــوا گومڕای کردبــێ، چونکــە هیچ کەسێک نیــە بەرهەڵســتی یــان بەربەرەکانێی خــوا بکات.

﴿ وَمَا لَهُم مِّن نَّـٰصِرِينَ ﴾ (واتـە: هیـچ یارمەتیدەرێـک نیـە بـۆ ئـەوان) سـەریان بخـات کاتـێ وشـەی سـزایان لەسـەر پێویسـت دەبـێو پەیوەنـدیو هۆکاریـان دەپچرێ.

(٣٠-٣٢): ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ مُنِيبِينَ إِلَيْهِ وَٱتَّقُوهُ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَلَا تَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٣١﴾ مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُوا۟ دِينَهُمْ وَكَانُوا۟ شِيَعًا ۖ كُلُّ حِزْبٍۭ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴿٣٢﴾ ﴾:

خـوا ﷻ فەرمـان دەکات بە دڵسـۆزی لە هەموو کاروبـارەکان، وە لە بەجێهێنانـی ئاینەکەی، فەرموویەتـی: ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ ﴾ واتـە: دایمەزرێنـە ڕووی بکـەرە ئایـن، ئـەو ئاینـەی کـە پێـی دەوتـرێ ئیسـلامو ئیمـانو چاکە، بـە دڵو مەبەسـتو جەسـتەت بـۆ بەجێهێنانی شـەریعەتەکانی ئایـن ئەوەی ئاشـکرایە، وەک نوێـژو زەکاتو ڕۆژو حـەجو وێنەی ئەوان، وە شـەریعەتە پەنهانەکانـی، وەک خۆشویسـتنو ترسـانو ئومێـدو گەڕانەوە، جا ئیحسـانو چاکـە لـە شـەریعەتە ئاشـکراو نهێنیـەکان، ئەوەیـە، خـوا بپەرسـتی وەک ئـەوەی ببینی، ئەگـەر نەتبینـی ئەو تـۆ دەبینێ.

خـوا ﷻ ڕوو تێکردنـی تایبـەت کـردوە، چونکـە ڕووتێکـردن شـوێنی ڕووتێکردنـی دڵ دەکەوێ، کۆششـی جەستە لەسەر ئەم دوو کارە ڕێکدەخرێ، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ حَنِيفًا ﴾ واتـە: بـەڕوو کردنـە خـوا لەوەدا، پشـت لـە غەیری ئـەو بکە، ئـەم فەرمانەی کە بـە تۆمان کـردوە، ئـەوە ﴿ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ﴾ (واتـە: ئاینی داهێنـراوی خوایە کە خەڵکی لەسـەر دروسـت کـردوە) لە دڵیانـدا جوانی کردوە، جگـە لە ئاینی خـوا هەموویانی ناشـرین کـردوە، بێگومـان هەمـوو حوکمو یاسـاکانی شـەریعەت، ئاشـکراو پەنهـان، خوا دڵـی هەمـوو خەڵکی بـۆ لای ڕاکێشـاوە، لـە دڵیاندا حەقی خۆشەویسـت کردوەو پەسـندی کـردوە، ئەمە حەقیقەتـی فیترەتە.

هـەر کەسـێک لـەم بنەمایـە دەربچێت، ئـەوە ڕووبـەڕووی فیترەتـی بووەتـەوەو تێکیداوە، هـەروەک پێغەمبـەر ﷺ فەرموویەتـی: {مَـا مِـنْ مَوْلُـودٍ إلاَّ يُولَـدُ عَلَى الْفِطْـرَةِ، فَأَبَـوَاهُ يُهَوِّدَانـهِ وَيُنَصِّرَانِـهِ وَيُمَجِّسَـانِه} (رَوَاهُ مُسـلم برقـم: (٦٧٠٠)، عَـنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ)، (واتـە: هەموو مرۆڤێک لەسـەر سروشـتی خواناسـی لە دایک دەبێ، بـەڵام دوایی باوکو دایکـی دەیکەنە جوولەکە، یـان دەیکەنـە نەصرانیی، یـان دەیکەنە مەجووسـیی).

﴿ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ﴾ واتـە: بـۆ هیچ کەسـێک نیـە داهێنراوی خـوا بگـۆڕێ، بەدیهێنراو

دابنێ لە جگە لەوەی خوا دایناوە ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەوەی ئێمە فەرمانمان پێکردوە ﴿ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ﴾ واتە: ڕێگای ڕاست کە دەیگەیەنێ بۆ لای خواو لای شوێنی ڕێزداری، بە ڕاستی هەرکەسێ بە پاکیو ڕاستو دروستی ڕوو بکاتە خوا، ئەوە ڕێگای ڕاستی گرتوەتەبەر لە هەموو شەریعەتەکانیو ڕێگاکانی، ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ ئاینی ڕاست ناناسن، ئەگەر بیشیناسن نایگرنە بەر.

﴿مُنِيبِينَ إِلَيْهِ﴾ ئەمە ئاینی تەفسیری ڕوو کردنە خوایە بۆ ئاینی ڕاستو پاک، بێگومان گەڕانەوە، گەڕانەوەی دڵە، وە ڕاکێشانی هۆکارەکانێتی بۆ ڕەزامەندی خوا ﷻ. کردەوەی دڵ ئەوە جێگیر دەکات جەستە هەستێت بە داخوازیەکانی دڵ، ئەویش هەموو پەرستشەکان دەگرێتەوە، ئاشکراو نهێنی، ئەوەش نابێ تەنها بە وازهێنان لە سەرپێچی ئاشکراو نهێنی نەبێ، بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَٱتَّقُوهُ﴾ ئەمەش ئەنجامدانی فەرمانەکانو وازهێنان لە قەدەغەکراوەکان دەگرێتەوە، لە فەرمان پێکراوەکان نوێژی تایبەت کردوە، چونکە نوێژ خاوەنەکەی بانگ دەکات بۆ ملکەچیو پارێزکاری، وەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ﴿٤٥﴾﴾العنكبوت (واتە: بە ڕاستی نوێژ ڕێگری دەکات لە کاری ناشرینو ناپەسند) ئەمەش یارمەتی دەرە لەسەر خۆپارێزی، پاشان فەرموویەتی: ﴿وَلَذِكْرُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ ﴿٤٥﴾﴾العنكبوت، (واتە: یادی خوا گەورەترە) ئەمەش هاندانێتی لەسەر ملکەچی، وە لە قەدەغە کراوەکانیش بنچینەکەیانی تایبەت کردوە، کە لەگەڵیدا هیچ کردەوەیەک وەرناگیرێ ئەویش هاوبەشدانانە، جا فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾ چونکە هاوبەش دانان دژی ملکەچبوونە کە ڕووحی دڵسۆزیە لە هەموو ڕوویەکەوە، پاشان باسی حاڵی هاوبەشدانەرانی کردوە وەکو ناشرینکردن، فەرموویەتی: ﴿مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُوا۟ دِينَهُمْ﴾ (واتە: لەوانەی کە ئاینەکەیان بەش بەش کرد) لەگەڵ ئەوەدا کە ئاینی خوا ﷻ یەکە، ئەویش بریتیە لە دڵسۆزی بەندایەتی کردن بۆ خوای تاکو تەنها، ئەو هاوبەشدانەرانە بەش بەشیان کرد، هەندێکیان بتیان دەپەرست، وە هەندێکیان خۆرو مانگیان دەپەرست، هەندێکی دیکەیان ئەولیاو پیاو چاکانیان دەپەرست، وە هەندێکیان جولەکەو هەندێکیان گاور، لە بەرئەمەیە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَكَانُوا۟ شِيَعًا﴾ (واتە: بوون بە چەند بەشەوە) هەموو دەستەیەک لەو دەستە هاوبەشدانەرانە خۆشەویستیو دەمارگیریان بۆ یەک هەبوو لەسەر سەرخستنی ئەوەی لە لایانە لە پووچو بەتاڵ، وە فرێدانی بۆچوونی

جگـە لـە خۆیـانو دژایەتی کردنیـان ﴿كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ﴾ (واتـە: هـەر کۆمەڵێکیان) بـەو زانسـتەی پێچەوانـەی زانسـتی پێغەمبەرانـە ﴿فَرِحُونَ﴾ (دڵخـۆش بـوون پێـی) بـۆ خۆیـان حوکمـی ئەوەیـان دەدا کـە ئـەوان لە سـەر ڕاسـتینو بێجگە لـە ئەوانیش لە سـەر پـووچو بەتاڵـە، وە لەمـەدا ترسـاندنی تێدایـە بـۆ مسـوڵمانان لـە بەش بـەش بوونیـان، هەر بەشـێکیان دەمارگیـری هەبـێ بـەوەی کـە لە لایانە لـە حەقو ناحـەق، ئەوکات ئـەوان لەو دووبەرەکـیو بـەش بەش بوونـەدا دەشـوبهێنە هاوبەشـدانەران، بەڵکو ئاین یەکـە، پێغەمبەر یەکـەو پەرسـتراویش یەکە.

وە زۆربـەی کاروبـارە ئاینیـەکان زانایانو پێشـەوایان یەکدەنگـن تێیـدا، وە برایەتی ئیمانی خـوای گـەورە گرێـی داوە بـە تەواوتریـن گرێـدان، دەی بۆچوونـت چۆنە هەمـوو ئەوانە هەڵبوەشـێنرێنەوە، وە لـە جێگایـان دووبەرەکـیو پەرتـەوازە بـوون لـە نێـوان برواداراندا ڕووبـدات، لەسـەر بابەتـە شـاراوەکان یـان لـقو پـۆ جیـاوازەکان، هەندێکیـان هەندێکی دیکەیـان گومـڕا بکـەن، وە کۆمەڵێکیـان لـە کۆمەڵێکـی تـر پێـی جیـا ببنەوە؟ ئایـا ئەمە گەورەترینـی وەسوەسـەکانی شـەیتانو مەزنتریـن ئامانجەکانـی نیە، کـە فێڵی لە بـڕواداران کـردوە؟ وە ئایـا تێکۆشـان بـۆ یەکدەنگـی بـڕواداران، وە لابردنـی ئـەو دووبەرەکیەی لە نێوانیاندایـە لـە سـەر ئەو بنەمـا پووچە، تەنها خـۆی دەبینێتـەوە لە چاکتریـن جیهادکردن لە پێنـاوی خـوادا، وە چاکترینـی ئەو کردەوانەی کـە نزیک کەرەوەن لە خـوا؟ کاتێ خوا ﷻ فەرمانـی کـردوە بـە ملکەچبـوون بـۆی، باسـی ملکەچبوونـی ناچاری کـردوە لـە کاتێکدا ڕوودەدات مـرۆڤ لـە نارەحەتـیو ناخۆشـیدا بێـت، جـا ئەگەر تەنگانەو ناخۆشـی لەسـەر لاچـوو فرێـی دەداتـە پشـتیەوە، ئـەم گەڕانەوەیـە هیچ سـوودێکی بـۆی نیە.

وَإِذَا مَسَّ ٱلنَّاسَ ضُرٌّ دَعَوْاْ رَبَّهُم مُّنِيبِينَ إِلَيْهِ ثُمَّ إِذَآ أَذَاقَهُم
مِّنْهُ رَحْمَةً إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم بِرَبِّهِمْ يُشْرِكُونَ ٣٣ لِيَكْفُرُواْ بِمَآ
ءَاتَيْنَٰهُمْ فَتَمَتَّعُواْ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ٣٤ أَمْ أَنزَلْنَا عَلَيْهِمْ
سُلْطَٰنًا فَهُوَ يَتَكَلَّمُ بِمَا كَانُواْ بِهِۦ يُشْرِكُونَ ٣٥ وَإِذَآ أَذَقْنَا
ٱلنَّاسَ رَحْمَةً فَرِحُواْ بِهَا وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ
إِذَا هُمْ يَقْنَطُونَ ٣٦ أَوَلَمْ يَرَوْاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ
وَيَقْدِرُ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ٣٧ فَـَٔاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ
حَقَّهُۥ وَٱلْمِسْكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ ذَٰلِكَ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يُرِيدُونَ
وَجْهَ ٱللَّهِ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ٣٨ وَمَآ ءَاتَيْتُم مِّن رِّبًا
لِّيَرْبُوَاْ فِىٓ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ فَلَا يَرْبُواْ عِندَ ٱللَّهِ وَمَآ ءَاتَيْتُم مِّن
زَكَوٰةٍ تُرِيدُونَ وَجْهَ ٱللَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُضْعِفُونَ ٣٩
ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ ثُمَّ رَزَقَكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ هَلْ مِن
شُرَكَآئِكُم مَّن يَفْعَلُ مِن ذَٰلِكُم مِّن شَىْءٍ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ
عَمَّا يُشْرِكُونَ ٤٠ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ
أَيْدِى ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُواْ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ٤١

(٣٣-٣٥): ﴿ وَإِذَا مَسَّ ٱلنَّاسَ ضُرٌّ دَعَوْاْ رَبَّهُم مُّنِيبِينَ إِلَيْهِ ثُمَّ إِذَآ أَذَاقَهُم مِّنْهُ رَحْمَةً إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم بِرَبِّهِمْ يُشْرِكُونَ ﴿٣٣﴾ لِيَكْفُرُواْ بِمَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ فَتَمَتَّعُواْ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٣٤﴾ أَمْ أَنزَلْنَا عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنًا فَهُوَ يَتَكَلَّمُ بِمَا كَانُواْ بِهِۦ يُشْرِكُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾:

﴿ وَإِذَا مَسَّ ٱلنَّاسَ ضُرٌّ ﴾ (هەر كاتێ ناڕەحەتی بكەوێ لە خەڵكی) لە نەخۆشیو ترسان لە مردنو وێنەی ئەوانە ﴿ دَعَوْاْ رَبَّهُم مُّنِيبِينَ إِلَيْهِ ﴾ (واتە: هاوار بۆ پەروەردگاریان دەبەنو بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە) وە لەو كاتەدا بیریان دەچێ كە پێشتر هاوەڵیان بۆ خوا دادەنا، چونكە دەزانن ئەوانەی هاواریان پێدەكەن ناتوانن زیان لابەن جگە لە خوا ﴿ ثُمَّ إِذَآ أَذَاقَهُم مِّنْهُ رَحْمَةً ﴾ شیفای نەخۆشیەكانیان بداو ڕزگاریان بكا لە ترس ﴿ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم ﴾ (كتوپڕ دەستەیەك لە ئەوان) ئەو ملكەچیە هەڵ ئەوەشێننەوە كە نواندیان، وە هاوەڵ بۆ خوا دادەنێن كە ناتوانێ هیچیان لێ ڕەت بكاتەوەو بێنیازیشیان بكات، هەموو ئەمانە كوفر كردنە بەوەی خوا پێی داون، وە منەتی پێكردوە بە سەریاندا، كاتێ ڕزگاری كردن لە ناخۆشیو ناڕەحەتی لەسەر لابردن، ئایا لە بەرانبەر ئەم چاكە مەزنەدا بۆچی سوپاس گوزار نەبوونو بەردەوام نەبوون لەسەر دڵسۆزی لە هەموو بارودۆخەكانیاندا ﴿ أَمْ أَنزَلْنَا عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنًا ﴾ واتە: (ئایا بەڵگەیەكی ڕوونمان بۆ ناردوون) ﴿ فَهُوَ ﴾ واتە: ئەو بەڵگەیە ﴿ يَتَكَلَّمُ بِمَا كَانُواْ بِهِۦ يُشْرِكُونَ ﴾ وە پێیان بڵێ: دامەزراو بن لەسەر هاوبەش دانانتان، وە بەردەوام بن لەسەر گومانو دوودڵیتان، بەڕاستی ئەوەی ئێوە لەسەرین هەر ئەوە حەقە، ئەوەیشی پێغەمبەران بانگەشەتان دەكەن بۆ لای بەتاڵو پووچە.

ئایا ئەو دەسەڵاتە لە لایان هەیە هەتا پێویست بكات بە توندی دەست بە هاوبەشدانانەوە بگرن؟ یان بەڵگە عەقڵیو بیستراوەكانو كتێبە ئاسمانیەكانو پێغەمبەرە

بەرێـزەکانو پیـاو چاکانی نـاو مرۆڤایەتی ئەوەیان قەدەغـە کردوە بە توندترین شـێوە، وە مەترسـیان داوە لـە گرتنەبـەری ئەو ڕێگایانـەی دەیانگەیەنێ پێی، وە حوکـمو بڕیاریان داوە بـە تێکچوونـی عەقـڵو ئاینـی ئەو کەسـەی ئەنجامـی دەدات؟ جـا هاوبەشـدانانی ئەوانە بێ بەڵگـەو بێ سـەلماندنە، بەڵکو ئـەوە هەواو ئـارەزووی نەفسـەکانەو خەتەرەی شـەیتانەکانە.

(٣٦-٣٧): ﴿ وَإِذَآ أَذَقۡنَا ٱلنَّاسَ رَحۡمَةً فَرِحُواْ بِهَاۖ وَإِن تُصِبۡهُمۡ سَيِّئَةُۢ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡ إِذَا هُمۡ يَقۡنَطُونَ ﴿٣٦﴾ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقۡدِرُۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿٣٧﴾ ﴾:

﴿ وَإِذَآ أَذَقۡنَا ٱلنَّاسَ رَحۡمَةً فَرِحُواْ بِهَا ﴾ خـوا ﷻ هەواڵ دەدات دەربارەی سروشـتی زۆرێک لـە مرۆڤـەکان لـە هـەردوو حاڵەتـی خۆشـیو ناخۆشـیدا، ئـەوان کاتـێ خـوا ڕەحمـەتو چاکەیەکیـان پێـدەدات لـە دەوڵەمەندیو لەشسـاغیو سـەرکەوتنو وێنەی ئەوانـە دڵخۆش دەبـن پێی بە خۆشـیەکی لـوت بەرزی، نەک خۆشـیەکی سووپاسـگوزارانە بـە نیعمەتەکانی خـوا ﴿ وَإِن تُصِبۡهُمۡ سَيِّئَةُۢ ﴾ واتـە: حاڵەتێکی ناخۆشـیان تووش ببـێ ئەویش ﴿ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡ ﴾ (بـە هـۆی) سـەرپێچیەکانیانەوە ﴿ إِذَا هُمۡ يَقۡنَطُونَ ﴾ واتـە: کتوپڕ بـێ هیوا دەبن لـە نەمانی ئـەو هەژاریو نەخۆشـیە، وە وێنـەی ئەوانە، ئەمـەش نەفامـیو نەزانینێکە لەلایەن ئەوانـەوە ﴿ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقۡدِرُ ﴾ (واتـە: ئایـا ئەوانـە نەیانزانیوە کـە بەڕاسـتی خـوا ڕۆزی فراوان یـان کـەم دەکات بۆ هەر کـەس بیـەوێ) بێهیوایی دوای ئـەوەی زانیویەتـی کە خێرو شـەڕ لـەلای خوایە، بە هەمـان شـێوە ڕزقو ڕۆزی بەرفراوانیو تەنـگ کردنـەوەی لـە دەسـتی ئەودایـە، لـە دەسـتچووەو هیـچ جێگایەکـی نیـە، کەواتـە ئـەی کەسـی عاقـڵ چـاوەڕێ مەکە تەنهـا بـە هـۆکارەکان، بەڵکو بڕوانـە لـە بەدیهێنەری هـۆکارەکان، بۆیـە فەرموویەتـی: ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴾ تەنها ئـەو بڕوادارانە دەزانـن بـە فراوانـی ڕزقو ڕۆزی خـوا بـۆ هـەر کەسـێ بیـەوێو بیگرێتـەوە، وە بەوانـە حیکمـەتو ڕەحمـەتو بەخشـندەیی خوا دەزانـن، وە ڕاکێشـانی دڵەکان بـۆ پاڕانەوەیان لە پەروەردگـار لە هەمـوو داواکاریەکانـی ڕزقو ڕۆزیدا.

(٣٨-٣٩): ﴿ فَـَٔاتِ ذَا ٱلۡقُرۡبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلۡمِسۡكِينَ وَٱبۡنَ ٱلسَّبِيلِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ يُرِيدُونَ وَجۡهَ ٱللَّهِۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿٣٨﴾ وَمَآ ءَاتَيۡتُم مِّن رِّبٗا لِّيَرۡبُوَاْ فِيٓ أَمۡوَٰلِ ٱلنَّاسِ فَلَا يَرۡبُواْ عِندَ ٱللَّهِۖ وَمَآ ءَاتَيۡتُم مِّن زَكَوٰةٖ تُرِيدُونَ وَجۡهَ ٱللَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُضۡعِفُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾:

﴿ فَـَٔاتِ ذَا ٱلۡقُرۡبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلۡمِسۡكِينَ ﴾ واتـە: ببەخشـە بـە خـزمو کـەس -بە پێـی نزیکیو

پێویستیان- مافی خۆی کە شەریعەت پێویستی کردوە، یان هانی لەسەر داوە لە بژێوی ئەرکو واجب، وە بەخشینو دیاریو چاکەو سڵاو کردنو ڕێز گرتنو لێبوردن لە هەڵەو پەڵەی، بەهەمان شێوە ببەخشە بە چینی هەژارو بێ دەرەتان کە هەژاریو پێویستی زۆری پێهێناوە، بۆ ئەوەی پێویستیەکەی پێ پڕبکاتەوە لە خواردەمەنیو جلو بەرگ.

﴿وَٱبۡنَ ٱلسَّبِيلِ﴾ ڕێبوارێک دابڕابێ لە وڵاتەکەی کە لە جێگای گومانی ئەوپەڕی پێویستیدایە، چونکە هیچ ماڵێکی نیە، وە هیچ کەسابەتێکی نیە نەفسی خۆی بەڕێبخات لە گەشتەکەیدا، بە پێچەوانەی ئەو کەسەی لە شارەکەی خۆیدایە، ئەوە ئەگەرچی ماڵیشی نەبێت، بەڵام هەر دەبێ -بەزۆری- لەناو پیشەیەکدا بێ، یان هەر کارێکی دیکە پێویستی خۆی پێ بەڕێبخات، لەبەر ئەمەیە خوا زەکاتی داناوە وەک بەشێک بۆ هەژارو ڕێبواران.

﴿ذَٰلِكَ﴾ واتە: پێدانی خزمی نزیکو هەژار ﴿خَيۡرٌ لِّلَّذِينَ يُرِيدُونَ﴾ (واتە: چاکترە بۆ ئەو کەسانەی) بە هۆی ئەو کردەوانەوە ﴿وَجۡهَ ٱللَّهِۖ﴾ واتە: خێرو پاداشتێکی زۆرو بێ پایان، چونکە لە باشترینی کردەوە چاکەکانە، وە قازانجەکەی تێدەپەڕێ کە گونجاوە لە جێگای خۆیداو بەستراوەتەوە بە دڵسۆزی.

جا ئەگەر مەبەستی پێی ڕەزامەندی خوا نەبوو، ئەوە بۆ بەخشەر نابێتە بەخشەر، ئەگەرچی پێ بەخشراو سوودی لێوەردەگرێ، وەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿لَّا خَيۡرَ فِي كَثِيرٖ مِّن نَّجۡوَىٰهُمۡ إِلَّا مَنۡ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوۡ مَعۡرُوفٍ أَوۡ إِصۡلَٰحِۭ بَيۡنَ ٱلنَّاسِۚ ﴿١١٤﴾﴾ النساء، (واتە: هیچ چاکەیەک نیە لە زۆربەی چپەکردنەکانیاندا مەگەر یەکێک فەرمان بکات بە ماڵ بەخشین، یان چاکە، یان چاکەکردنی نێوان خەڵکی) تێگەیشتنی دەقەکە، ئەمانەی کە چەسپاون، چاکن لەبەر ئەوەی سوود بە بەخشەر دەگەیەنن، بەڵام هەر کەسێک ئەوە ئەنجام ئەدات لە پێناو ڕەزامەندی خوادا بێ، ئەوە ئێمە پاداشتێکی مەزنی دەدەینەوە، وەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ﴾ واتە: ئەوانەی ئەم کردەوانە دەکەن، وە جگە لەوانەش ئەم کردەوانەی دەکەن لە پێناوی خوادا ﴿هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾ ئەوان سەرفرازن بە پاداشتی خوا ڕزگار بوون لە سزای (خوای پەروەردگار).

کاتێ باسی ئەو کردەوەی کردوە کە مەبەست پێی ڕەزامەندی خوایە، ئنجا باسی ئەو کردەوەی کردوە کە مەبەست پێی دونیایە، ﴿وَمَآ ءَاتَيۡتُم مِّن رِّبٗا لِّيَرۡبُوَاْ فِيٓ أَمۡوَٰلِ

﴿ ٱلنَّاسِ ﴾ واتــە: ئــەوەی لــە ماڵەکانــی خۆتــان کــە لــە ســەرووی پێویســتی خۆتانــە، وە مەبەســتتان پێــی ئەوەیــە مــاڵو ســامانەکەتان زیــاد ببێ، بــەوەی بیــدەن بە کەســێ تەماحی ئــەوەی لێبکــەن لەبریــا زیاترتــان بداتێ، جا ئــەم کردەوەیە پاداشــتی لای خوا زیــاد ناکات، چونکــە مەرجەکــەی لــە دەســتداوە کە بریتیــە لە دڵســۆزی، هەروەهــا وێنەی ئــەو کارە کە مەبەســت پێــی زیاتــر ڕێزگرتــنو ڕیــا کــردن بــێ لەگــەڵ خەڵکی هەمــوو ئەمانــە لەلای خــوا زیــاد نــاکاو بەرەکەتــی تێناکــەوێ، ﴿ وَمَآ ءَاتَيْتُم مِّن زَكَوٰةٍ ﴾ واتــە: مــاڵو ســامانێک پاکتــان بکاتــەوە لــە ڕەوشــتی ناشــرین، وە پاکتان بکاتــەوە لــە ڕەزیلــیو ڕژدی، وە زیاتر پێویســتیەکانی پــێ بەخشــراو چارەســەر بــکات ﴿ تُرِيدُونَ ﴾ (مەبەســتتان لــەو کارەدا) ﴿ وَجْهَ ٱللَّهِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُضْعِفُونَ ﴾ واتــە: (تەنهــا ڕەزامەندی خوا بێ ئا ئەوانە) پاداشــتیان چەندیــن قاتــە، ئەوانــەی کــە ماڵەکانیــان لە لای خــوا زیــاد دەکات، وە خــوا ﷻ بەرەکەتی تێدەخــات بۆیــان هەتــا دەبێتە شــتێکی زۆر.

وە کــە خــوا ﷻ دەفەرمــوێ: ﴿ وَمَآ ءَاتَيْتُم مِّن زَكَوٰةٍ ﴾ بەڵگەیــە لەســەر ئــەوەی خێر کردن بــە ناچــاری کــە پەیوەنــدی بــە بەخشــەرەوە هەبێ، یــان پەیوەنــدی بــە قەرزێکــەوە هەبێ نەیدابێتــەوە، خێرەکــە پێــش بخــات بەســەر قەرزەکــەدا، ئەمــە پێــی ناوتــرێ زەکاتو خۆپاکردنــەوەو بەنــدە لەســەری پاداشــت بدرێتــەوە، بــە پێــی شــەرع کردارەکــەی ڕەت دەکرێتــەوە، هەروەکــو خوا ﷻ مەدحــی ئەو کەســەی کــردووە فەرموویەتی: ﴿ ٱلَّذِى يُؤْتِى مَالَهُۥ يَتَزَكَّىٰ ﴿١٨﴾ ﴾ اللیل، (واتــە: ئــەوەی ماڵــی خــۆی دەبەخشــێ تــا دڵو دەروونــی پــاک ببێتــەوە) تەنهــا پێدانــی ماڵ بــە ڕووتی خێــرو چاکە نیــە ئابەم ســیفەتە نەبێ، ئەویــش دەبێ بــە جــۆرێ بێ ئــەو کەســەی ماڵەکــە دەبەخشــێ مەبەســتی خۆپاکردنــەوە بێ.

(٤٠): ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ ثُمَّ رَزَقَكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ۖ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَفْعَلُ مِن ذَٰلِكُم مِّن شَىْءٍ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٤٠﴾ ﴾:

خــوا ﷻ هــەواڵ دەدات ئەو تاکــو تەنهایە، بە دروســتکردنتانو ڕزقو ڕۆزی پێدانتانو دواتر دەتانمرێنــێو زیندووتــان دەکاتــەوە، بێگومــان هیچ یــەک لــەو هاوبەشــانەی هاوەڵدانەران داوای لێدەکــەنو لێــی دەپاڕێنــەوە نابــێ بەشــداربێ لەگــەڵ خــوادا، لــە شــتێک لەمانــەی باســمانکرد، دەی ئیتــر چــۆن هاوبــەش دادەنێــن لەگەڵ کەســێکدا کــە تــاکو تەنهایە لەم کاروبارانــەدا، کەســێکە هیــچ بەڕێوەبردنێکی نیــە تیایاندا بــە جۆرێ لە جــۆرەکان؟ پاکیو بــەرزی بــۆ خوا لەوەی ئــەوان دەیکەنە هاوبەشــی، ئەوە هیــچ زیانێک بە خــوا ﷻ ناگەیەنێ،

بەڵکــو ئۆباڵیــان لە ئەســتۆی خۆیانە.

(٤١): ﴿ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤١﴾ ﴾:

﴿ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ ﴾ خراپــەو بــەلا دەرکەوتــووە لــە وشــکانیو دەریــادا، واتــە: خراپــی بژێــویو کــەمو کورتی و تووشــبوونی بــەڵاو ئافات لە بژێویەکانــدا، وە لەنەفــسو دەروونیانــدا لــە نەخۆشــیو پەتــاو جگــە لــە ئەوانــەش، ئەمیش بــە هــۆی ئەوانەیــە کە پێشــیان خســتووە بــۆ خۆیان لــەو کــردەوە خراپانەی بە سروشــتیان خراپن.

ئەمانــەی کــە باســکرا ﴿ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ ﴾ بــۆ ئــەوەی بزانــن کە بێگومــان خوا تۆڵەســێنەری کردەوەکانــە، بۆیــە نموونەیەکــی بۆ پێشخســتوون لــە تۆڵــەی کردەوەکانیان لــە دونیــادا، ﴿ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾ (بــۆ ئــەوەی بگەڕێنــەوە) لــە کردەوەکانیــان، کــە بووەتە مایــەی فەســادو خراپەکاریــی، تــا بارودۆخیان بــاش بــێو کاروبارەکانیان ڕێــک بێ، پاکی بــۆ ئــەو خوایــەی کــە نیعمەت لــە بەڵاکانیدایــەو فــەزڵو چاکە لە ســزایدایە، بــەڵام ئەگەر پێیانــی بچێژیایــە لــە بری هەموو ئــەو کردەوانەی کردوویانــە، ئەوە هیچ گیانلەبەرێ لەســەر زەویــدا نەدەما.


قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلُ
كَانَ أَكْثَرُهُم مُّشْرِكِينَ (٤٢) فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ الْقَيِّمِ مِن
قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ لَّا مَرَدَّ لَهُ مِنَ اللَّهِ يَوْمَئِذٍ يَصَّدَّعُونَ (٤٣) مَن
كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُ وَمَنْ عَمِلَ صَالِحًا فَلِأَنفُسِهِمْ يَمْهَدُونَ (٤٤)
لِيَجْزِيَ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِن فَضْلِهِ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ
الْكَافِرِينَ (٤٥) وَمِنْ آيَاتِهِ أَن يُرْسِلَ الرِّيَاحَ مُبَشِّرَاتٍ وَلِيُذِيقَكُم
مِّن رَّحْمَتِهِ وَلِتَجْرِيَ الْفُلْكُ بِأَمْرِهِ وَلِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ
تَشْكُرُونَ (٤٦) وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ رُسُلًا إِلَىٰ قَوْمِهِمْ فَجَاءُوهُم
بِالْبَيِّنَاتِ فَانتَقَمْنَا مِنَ الَّذِينَ أَجْرَمُوا وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ
الْمُؤْمِنِينَ (٤٧) اللَّهُ الَّذِي يُرْسِلُ الرِّيَاحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَيَبْسُطُهُ
فِي السَّمَاءِ كَيْفَ يَشَاءُ وَيَجْعَلُهُ كِسَفًا فَتَرَى الْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ
خِلَالِهِ فَإِذَا أَصَابَ بِهِ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ
(٤٨) وَإِن كَانُوا مِن قَبْلِ أَن يُنَزَّلَ عَلَيْهِم مِّن قَبْلِهِ لَمُبْلِسِينَ
(٤٩) فَانظُرْ إِلَىٰ آثَارِ رَحْمَتِ اللَّهِ كَيْفَ يُحْيِي الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا
إِنَّ ذَٰلِكَ لَمُحْيِي الْمَوْتَىٰ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (٥٠)

(٤٢): ﴿قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلُ ۚ كَانَ أَكْثَرُهُم مُّشْرِكِينَ (٤٢)﴾:

﴿قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلُ﴾ واتـە: فەرمـان كـردن بە گـەڕان لەسـەر زەویـدا، گەڕانی جەسـتەو دڵـەكان دەگرێتـەوە، لـێ ورد بوونـەوەو سـەرنجدان بـە سـەرەنجامی پێشـینەكان.

﴿كَانَ أَكْثَرُهُم مُّشْرِكِينَ﴾ (واتـە: كـە زۆربەیـان هاوبـەش دانـەر بـوون بـۆ خـوا) دەبینـن سـەرەنجامیان خراپتریـن سـەرەنجامە، سـزایەک لە بن دەریـان دێنێ، وە سەرزەنشـتو نەفریـن كـردن لـە لایەن دروسـتكراوەكانی خـواوە بـە دوایانـدا دێ، وە ڕیسـوایی بەردەوامیـش، دەی ئاگـادار بـن كارێـک نەكـەن وەكـو كارەكانی ئـەوان، چی بـەوان كرد بەرانبـەر بە ئێـوەش بیكات، بە ڕاسـتی دادپـەروەری خـوا لـە هەمـوو شـوێنو جێگایـەک دایـە.

(٤٣-٤٥): ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ الْقَيِّمِ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ لَّا مَرَدَّ لَهُ مِنَ اللَّهِ ۖ يَوْمَئِذٍ يَصَّدَّعُونَ (٤٣) مَن كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُ ۖ وَمَنْ عَمِلَ صَالِحًا فَلِأَنفُسِهِمْ يَمْهَدُونَ (٤٤) لِيَجْزِيَ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِن فَضْلِهِ ۚ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْكَافِرِينَ (٤٥)﴾:

﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ الْقَيِّمِ﴾ واتـە: بـە دڵـت وەربیگـرە، وە بـە ڕووخسـارت ڕووی تێبکـە، وە بـە جەسـتەت كۆشـش بكـە، بـۆ بەجێهێنانـی ئاینـی ڕاسـتو ڕێـک، فەرمانو قەدەغەكراوەكانـی خـوا جێبەجـێ بكـەو كۆششـی بـۆ بكـە، وە هەسـتە بـەو ئەركانـەی ئاشـكراو نهێنیـن، وە پەلـە بكە لـە كاتو ژیـانو گەنجێتیـت ﴿مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ لَّا مَرَدَّ لَهُ مِنَ اللَّهِ﴾ (واتـە: لـە پێـش ئـەوە ڕۆژێ بێـت لـە لایـەن خـواوە كـە گێڕانـەوەی بـۆ نیـە)، ئەویـش ڕۆژی دواییـە، ئـەو ڕۆژە ئەگەر هـات ڕەتناكرێتەوە، ئەو كەسـانەی كاریان كـردوە دوا ناخرێـن بۆ ئـەوەی كردەوەكانیان تـەواو بكەن، بەڵكـو بەتاڵە لە كـردەوەكان،

هیــچ نامێنێتــەوە پاداشــتی کــردەوەکان نەبێــت ﴿ يَوْمَئِذٍ يَصَّدَّعُونَ ﴾ واتــە: لــەو ڕۆژەدا خەڵکــی لــە یەکتــر جیادەبنەوە، وە بە جیــا جیا دێن بۆ ئــەوەی کردەوەکانیــان ببینن ﴿ مَن كَفَرَ ﴾ (بێبــڕوا بــێ) لــە ئــەوان ﴿ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُۥ ﴾ (واتــە: ئــەوە بێبڕواییەکەی لەســەرە) وە تۆڵــەی لێدەکرێتــەوە، هیچ کەس کردەوەی کەســێکی تــر هەڵناگرێ ﴿ وَمَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا ﴾ لــەو مافانــەی کــە هی خــوای گــەورەن، یــان هــی بەندەکانە، ئــەوەی پێویســتەو ئەویشــی چاکــە ﴿ فَلِأَنفُسِهِمْ ﴾ نــەک بۆ غەیــری ئەوان ﴿ يَمْهَدُونَ ﴾ واتــە: ئامــادەی دەکەن، وە دواڕۆژیــان بــۆ خۆیــان ئــاوەدان دەکەنەوەو خۆیــان ئامــادە دەکەن بــۆ بەدەســتهێنانی پلەو پایەکانــی بەهەشــتوماڵــە ڕازاوەکانی.

وە لەگــەڵ ئەوەشــدا پاداشــتیان کــورت ناکرێتــەوە لەســەر کردەوەکانیــان، بەڵکــو خــوا پاداشــتیان دەداتــەوە لە فەزڵــی بەرفراوانیو بەخشــندەیی بێ ســنوری، کە بــە کردەوەکانیان پێــی ناگــەن، ئەویــش بــە هۆی ئــەوەی خۆشــی دەوێــن، وە ئەگــەر خــوا بەندەیەکی خۆی خــۆش بــوێ چاکەی خــۆی دەبارێنــێ بەســەریدا، وە بەخشــینی بــێ پایانی پێ دەبەخشــێ، وە نازونیعمەتــی ئاشــکراو نهێنــی دەڕێــژێ بە ســەریدا، ئەمــەش بــە پێچەوانــەی بێبڕوایان، بێگومــان کاتــێ خــوا لێیان توورە دەبێو خەشــمو قینیــان لێدەگــرێ، تۆڵەیــان لێدەکاتەوەو ســزایان بــدات، وە بۆیــان زیاد ناکات وەک چــۆن بۆ پێشــینیانی زیاد کردوە، لەبــەر ئەمەیە فەرموویەتــی: ﴿ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾ (واتــە: بەڕاســتی خــوا بێبڕوایانــی خــۆش ناوێ).

(٤٦): ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَن يُرْسِلَ ٱلرِّيَاحَ مُبَشِّرَٰتٍ وَلِيُذِيقَكُم مِّن رَّحْمَتِهِۦ وَلِتَجْرِىَ ٱلْفُلْكُ بِأَمْرِهِۦ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٤٦﴾ ﴾:

﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ ﴾ واتــە: وە لــەو نیشــانەو بەڵگانــەی کــە ئاماژەن لــە ســەر ڕەحمەتی خواو زیندووکردنەوەی مردووەکان، وە لەســەر ئەوەی ئەو پەرســتراوە تاکو تەنهایەو پاشــایەکی ستایشــکراوە، ﴿ أَن يُرْسِلَ ٱلرِّيَاحَ ﴾ (واتــە: چەنــد بایــەک دەنێرێ) پێــش باران ﴿ مُبَشِّرَٰتٍ ﴾ (مــژدەدەرن) بــە جوڵاندنی هــەورەکانو پاشــان کۆکردنەوەیان، بەو شــێوەیە مــژدە دەدا بە نەفــسو دەروونــەکان پێــش دابەزینــی، ﴿ وَلِيُذِيقَكُم مِّن رَّحْمَتِهِۦ ﴾ (واتــە: بۆ ئــەوەی پێتان بچــەژێ هەنــدێ لــە ڕەحمەتی خــۆی) بە بەزەیی خــۆی بارانتان بــۆ دەبارێنێ، شــارو وڵاتی پــێ ئــاوەدان دەکاتــەوە، وە چێــژ لــە ڕەحمەتــی وەردەگــرن، وە دەزانــن تەنهــا ڕەحمەتی خــوا ڕزگارکــەری بەندەکانــەو هۆکارێکــە بــۆ ڕزقو ڕۆزیــان، حــەزو ئارەزووتــان زیاتر دەجوڵــێ بــۆ زیاتــر ئەنجامدانی کــردەوەی چــاک، کە هــۆکاری کردنــەوەی گەنجینەکانی

ڕەحمەتـە، ﴿ وَلِتَجْرِيَ ٱلْفُلْكُ ﴾ (بـۆ ئەوەی کەشـتیەکان بگەڕێن) لـە دەریادا ﴿ بِأَمْرِهِۦ ﴾ (بـە فەرمانـی) قـەدری خـوا ﴿ وَلِتَبْتَغُواْ مِن فَضْلِهِۦ ﴾ (واتـە: وە بۆ ئـەوەی بـە دوای ڕۆزی خـوادا بگەڕێن)، بـە ڕاپەڕاندنی کاروبـارو بەرژەوەندیەکانتـان ﴿ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾ (واتە: تـا سوپاسـگوزاری خـوا بکەن)، ئـەو زاتـەی هۆکارەکانی بـۆ ڕام کـردوونو کارەکانی بۆ ئاسـان کـردوون، ئەمە مەبەسـتە لـە نـازو نیعمەتەکان کـە لـە بەرانبەریاندا سوپاسـگوزاری خـوا بکەن، بـۆ ئەوەی خـوا بۆتان زیـاد بـکاتو بیهێڵێتـەوە بۆتان.

بـەڵام ڕووبـەڕوو بوونـەوەی نیعمەتـەکان بـە کوفرو سـەرپێچی، ئەمـە حاڵی ئەو کەسـەیە نیعمەتـی خـوا دەگـۆڕێ بە کوفـر، ئەو هـۆکاری نەهێشـتنو گواسـتنەوەیەتی بـۆ غەیری خۆی.

(٤٧): ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ رُسُلًا إِلَىٰ قَوْمِهِمْ فَجَآءُوهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَٱنتَقَمْنَا مِنَ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُواْ ۖ وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾:

﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ ﴾ (واتـە: بەڕاسـتی پێـش تـۆ ناردوومانـە) بـۆ لای ئوممەتانـی پێشـوو، ﴿ رُسُلًا إِلَىٰ قَوْمِهِمْ ﴾ (واتـە: پێغەمبەرانێـک بـۆ لای گەلەکانیان) کاتـێ ئینکاریو کەللەڕەقیـان کرد بە یەکتاپەرسـتی خـواو هەقیان بەدرۆ زانـی، پێغەمبەرانیـان هاتن بانگیان دەکـردن بـۆ یەکتاپەرسـتیو دانـان بە حەقـداو پووچی ئـەوەی لەسـەری دەڕۆن لە کوفرو گومڕایـی، بـە بەڵگـەی ڕوونـەوە هاتـن بـۆ لایان، بـەڵام ئـەوان بڕوایـان نەهێنـاو وازیان لـە سەرکەشـیو گومڕاییـان نەهێنـا ﴿ فَٱنتَقَمْنَا مِنَ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُواْ ﴾ (واتـە: ئنجـا تۆڵەمـان سـەند لەوانەیـان تاوانیـان کـرد) وە بڕوادارانـی شـوێنکەوتوانی پێغەمبەرانمان سەرخسـت، ﴿ وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ واتـە: (سەرخسـتنی بڕوادارانمـان) پێویسـت کـرد لەسـەر خۆمـان، وە کردمـان بە یەکێـک لە مافـە دیاریکـراوەکانو پەیمانمان پێـدان، بۆیە هـەر دەبـێ ڕوویدات.

ئێـوەش ئـەی ئـەو کەسـانەی موحەممەد ﷺ بـە درۆ دەزانـن، ئەگەر لەسـەر بـە درۆدانانتان بمێننـەوە، سـزاتان لەسـەر پێویسـت بووەو سەریشـی دەخەین بەسـەرتاندا.

(٤٨-٥٠): ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَيَبْسُطُهُۥ فِى ٱلسَّمَآءِ كَيْفَ يَشَآءُ وَيَجْعَلُهُۥ كِسَفًا فَتَرَى ٱلْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَٰلِهِۦ ۖ فَإِذَآ أَصَابَ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦٓ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿٤٨﴾ وَإِن كَانُواْ مِن قَبْلِ أَن يُنَزَّلَ عَلَيْهِم مِّن قَبْلِهِۦ لَمُبْلِسِينَ ﴿٤٩﴾ فَٱنظُرْ إِلَىٰٓ ءَاثَٰرِ رَحْمَتِ ٱللَّهِ كَيْفَ يُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٥٠﴾ ﴾:

﴿ اللَّهُ الَّذِي ﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدات دەربارەی تەواوی هێزوو دەسەڵاتی‌و سەرجەم نازونیعمەتەکانی، کە بێگومان ئەو ﴿ يُرْسِلُ الرِّيَاحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا ﴾واتە: (بایەکان دەنێرێت بۆ ئەوەی هەورەکان بجولێنن) لە زەویەوە ﴿ فَيَبْسُطُهُ فِي السَّمَاءِ ﴾ واتە: بڵاوی دەکاتەوەو فراوانی دەکات (بە ئاسمانەکاندا) ﴿ كَيْفَ يَشَاءُ ﴾ واتە: بە هەر حاڵەتێ ویستی لەسەر بێ، پاشان ﴿ وَيَجْعَلُهُ ﴾ واتە: ئەو هەورە بەرفراوانە دەکاتە ﴿ كِسَفًا ﴾ واتە: (پارچە پارچە)، هەورێکی چڕو پڕ، هەندێکیان بەسەر هەندێکی دیکەوەن، ﴿ فَتَرَى الْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَالِهِ ﴾ واتە: (ئنجا دەبینی) لە نێو هەورەکەوە نم نم باران دێتە خوارێ، هەموویان پێکەوە دادەبەزن تا دایان بەسەر هەرچیدا تێکی بدەن ﴿ فَإِذَا أَصَابَ بِهِ ﴾ بەو بارانە ﴿ مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴾ هەندێکیان بە دابەزینی مژدە دەدەن بە یەکتری، ئەویش لەبەر ئەوەی زۆر پێویستیان پێیەتی، لە بەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ وَإِنْ كَانُوا مِنْ قَبْلِ أَنْ يُنَزَّلَ عَلَيْهِمْ مِنْ قَبْلِهِ لَمُبْلِسِينَ ﴾ (واتە: ئەگەرچی پێش ئەوەی باران بەسەریاندا بباری) بێهیواو نائومێد بوون بە هۆی دواکەوتنی کاتی باران بارین، کاتێ لەو حاڵەتەدا دابەزی ئەوە پێگەیەکی گەورەی دەبێ بە لایانەوەو دڵیان خۆش دەبی‌و مژدە دەدەن، ﴿ فَانْظُرْ إِلَى آثَارِ رَحْمَتِ اللَّهِ كَيْفَ يُحْيِي الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ﴾ (واتە: ئنجا سەیری ئاسەواری بارانی خوا بکە چۆن زەوی زیندوو دەکاتەوە دوای مردن‌و وشک بوونی)، جا زەوی ڕووەکی لێدەڕوێ‌و دەجوڵێ، زەوی هەڵدەدات‌و بەرزدەبێتەوە، زەوی دەڕوێنێ لە هەموو جۆرە گژوو گیایەکی جوان‌و سەرنجڕاکێش ﴿ إِنَّ ذَلِكَ ﴾ ئەو زاتەی زەوی زیندوو دەکاتەوە دوای مردنی، ﴿ لَمُحْيِي الْمَوْتَى وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾ (واتە: زیندوو کەرەوەی مردوانیشە، وە هەر ئەویش بە دەسەڵاتە بەسەر هەموو شتێکدا)، هیچ شتێ قورس‌و گران نیە لە تواناى خوادا، ئەگەرچی قورس‌و گران بێ بەسەر دروستکراوەکانیەوە، یان عەقڵیان تێدا دەستەوسان بێ.


وَلَئِن أَرْسَلْنَا رِيحًا فَرَأَوْهُ مُصْفَرًّا لَّظَلُّوا مِن بَعْدِهِ يَكْفُرُونَ
٥١ فَإِنَّكَ لَا تُسْمِعُ الْمَوْتَىٰ وَلَا تُسْمِعُ الصُّمَّ الدُّعَاءَ إِذَا وَلَّوْا
مُدْبِرِينَ ٥٢ وَمَا أَنتَ بِهَادِ الْعُمْيِ عَن ضَلَالَتِهِمْ إِن تُسْمِعُ إِلَّا
مَن يُؤْمِنُ بِآيَاتِنَا فَهُم مُّسْلِمُونَ ٥٣ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَكُم
مِّن ضَعْفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِن بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً ثُمَّ جَعَلَ مِن بَعْدِ
قُوَّةٍ ضَعْفًا وَشَيْبَةً يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ وَهُوَ الْعَلِيمُ الْقَدِيرُ
٥٤ وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يُقْسِمُ الْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُوا غَيْرَ
سَاعَةٍ كَذَٰلِكَ كَانُوا يُؤْفَكُونَ ٥٥ وَقَالَ الَّذِينَ أُوتُوا
الْعِلْمَ وَالْإِيمَانَ لَقَدْ لَبِثْتُمْ فِي كِتَابِ اللَّهِ إِلَىٰ يَوْمِ الْبَعْثِ
فَهَٰذَا يَوْمُ الْبَعْثِ وَلَٰكِنَّكُمْ كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ٥٦ فَيَوْمَئِذٍ
لَّا يَنفَعُ الَّذِينَ ظَلَمُوا مَعْذِرَتُهُمْ وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ
٥٧ وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا الْقُرْآنِ مِن كُلِّ مَثَلٍ
وَلَئِن جِئْتَهُم بِآيَةٍ لَّيَقُولَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ أَنتُمْ إِلَّا
مُبْطِلُونَ ٥٨ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ اللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ
٥٩ فَاصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَلَا يَسْتَخِفَّنَّكَ الَّذِينَ لَا يُوقِنُونَ ٦٠

(٥١-٥٣): ﴿وَلَئِنْ أَرْسَلْنَا رِيحًا فَرَأَوْهُ مُصْفَرًّا لَّظَلُّوا مِنْ بَعْدِهِ يَكْفُرُونَ (٥١) فَإِنَّكَ لَا تُسْمِعُ الْمَوْتَىٰ وَلَا تُسْمِعُ الصُّمَّ الدُّعَاءَ إِذَا وَلَّوْا مُدْبِرِينَ (٥٢) وَمَا أَنتَ بِهَادِ الْعُمْيِ عَن ضَلَالَتِهِمْ إِن تُسْمِعُ إِلَّا مَن يُؤْمِنُ بِآيَاتِنَا فَهُم مُّسْلِمُونَ (٥٣)﴾:

﴿وَلَئِنْ أَرْسَلْنَا رِيحًا﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدات دەربارەی حاڵی خەڵکی، ئەوان لەگەڵ ئەم نازونیعمەتانەدا، بە زیندووکردنەوەی زەوی دوای مردنی، وە بڵاو بوونەوەی ڕەحمەتی خوا، ئەگەر بایەکی توونە بنێرین بەسەر ڕووەکو کشتووکاڵەکانیاندا هەمووی لە ناو بیات یان بەشێکی ﴿فَرَأَوْهُ مُصْفَرًّا﴾ (ببینن زەرد بووە) بەرەو لە ناوچوون دەڕوا ﴿لَّظَلُّوا مِنْ بَعْدِهِ يَكْفُرُونَ﴾ (لە پاش ئەو زیانە بێبڕوایی دەکەن).

نازونیعمەتی پێشوویان بیر دەچێ‌و پەلە دەکەن لە کوفرو بێبڕی، ئەوانە هیچ سوودێکی نیە بۆیان نە ئامۆژگاری‌و نە سەرزەنشت کردن﴿فَإِنَّكَ لَا تُسْمِعُ الْمَوْتَىٰ وَلَا تُسْمِعُ الصُّمَّ الدُّعَاءَ﴾ وە بە یەکەم ﴿إِذَا وَلَّوْا مُدْبِرِينَ﴾ (کاتێ ڕوویان لێت وەردەگێڕن بە پشتێکردنەوە) بێگومان بەربەستەکان بۆ ئەوان فەراهەم هاتووە، لە ملکەچبوون‌و گوێگرتنی بە سوود، وەک ئەو بەربەستانەی باسکراوە، لە بیستنی دەنگی هەستەوەری ﴿وَمَا أَنتَ بِهَادِ الْعُمْيِ عَن ضَلَالَتِهِمْ﴾ واتە: (وە تۆ ڕێنماییکەری نابینایان نیت لە گومراییان)، چونکە ئەوان بە هۆی کوێریانەوە نابینن بۆیە توانای بینینیان نیە، ﴿إِن تُسْمِعُ إِلَّا مَن يُؤْمِنُ بِآيَاتِنَا فَهُم مُّسْلِمُونَ﴾ (واتە: تۆ تەنها بە کەسانێ بڕوا دێنی کە بە نیشانەکانی ئێمە بڕوا دێنن)، جا ئەو کەسانەی ڕێنمایی سوودیان پێدەگەیەنی ئەوانەن بڕوایان بە ئایەتەکانی ئێمە هەیە لە ناخەوە، ئەوانە ملکەچی فەرمانەکانی ئێمەن‌و تەسلیمی ئێمە بوون، چونکە پاڵنەری

بەهێزیـان هەیـە بـۆ وەرگرتنـی ئامۆژگـاری، وە ئامـادە بوونیـان تێدایـە بـە بڕواهێنـان بـە هەمـوو ئایەتێـک لـە ئایەتەکانـی خـوا، وە ئامادەیشـیان تێدایـە بـۆ جێبەجـێ کردنـی ئـەوەی لـە تواناییاندایـە لـە فەرمانەکانـی خـواو قەدەغەکراوەکانـی.

(٥٤): ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن ضَعْفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ قُوَّةٍ ضَعْفًا وَشَيْبَةً يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ وَهُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْقَدِيرُ ﴿٥٤﴾ ﴾

﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن ضَعْفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ قُوَّةٍ ضَعْفًا وَشَيْبَةً ﴾ خـوا هـەواڵ دەدا دەربـارەی بەرفراوانـی زانسـتیو مەزنـی توانـایو تـەواوی حیکمەتـی، سـەرەتا ئادەمیـزادی لـە لاوازیـەوە دروسـت کـردوە، ئەویـش قۆناغەکانـی یەکەمیەتـی لـە دروسـت کردنـدا، لـە نوتفەیـەک بـۆ خوێنێکـی مەیـو، دوای ئـەوە بـۆ پارچـە گۆشـتێک، هەتـا بووبـە گیاندارێـک لـە پزدانـی دایکـدا، تـا لـە دایـک بـوو، لـە تەمەنـی منداڵیـدا لـە ئەوپـەڕی لاوازیدایـە، هێـزو توانـای نیـە.

پاشـان خـوا هێـزی زیـاد دەکات تـۆزە تـۆزە هەتـا دەگاتـە گەنجێتـی، بەهێـز دەبـێو توانـای کامـڵ دەبـێ بـە ئاشـکراو نهێنـی، پاشـان دەگوازرێتـەوە لـەم قۆناغـەوە، دەگەڕێتـەوە بـۆ لاوازیو پیـریو پـەک کەوتـن.

﴿ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ﴾ (واتـە: خـوا هەرچـی بـوێ دروسـتی دەکات) بـە پێـی حیکمـەتو کاربەجێیـیو دانایـی خـۆی، لـە حیکمەتـی ئەوەیـە لاوازی بەنـدە نیشـان دەدات، هێـزو توانـای کەوتووەتـە نێـوان دوو لاوازی، نەفـسو دەروونـی هیـچ نیـە لاوازی نەبـێ، ئەگـەر بەهێـز کردنـی خـوا نەبـێ هەرگیـز نەدەگەیشـتە توانـاو دەسـەڵات، ئەگـەر هێـزی لـەوە زیاتـر بـەردەوام بووایـە، ئـەوە یاخـی دەبـوو سـنوورەکانی دەشـکاندو گومـڕا دەبـوو.

وە بەنـدەکان بـا چـاک بزانـن بـە تـەواوی توانـاو دەسـەڵاتی خـوا، شـتەکانی پـێ دروسـت دەکاتو کاروبـارەکان بەڕێـوە دەبـات، هەرگیـز تووشـی مانـدوو بـوونو لاوازی ناتـەواوی نابـێ بـە جـۆرێ لـە جـۆرەکان.

(٥٥-٥٧): ﴿ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يُقْسِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُوا۟ غَيْرَ سَاعَةٍ كَذَٰلِكَ كَانُوا۟ يُؤْفَكُونَ ﴿٥٥﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ وَٱلْإِيمَٰنَ لَقَدْ لَبِثْتُمْ فِى كِتَٰبِ ٱللَّهِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْبَعْثِ فَهَٰذَا يَوْمُ ٱلْبَعْثِ وَلَٰكِنَّكُمْ كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٥٦﴾ فَيَوْمَئِذٍ لَّا يَنفَعُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مَعْذِرَتُهُمْ وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾

﴿ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ ﴾خـوا هـەواڵ دەدا دەربـارەی بـە پەلە هاتنـی ڕۆژ دوایـی، بێگومان ئەگـەر قیامـەت هەڵسـا ﴿ يُقۡسِمُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴾ (واتـە: تاوانبـاران سـوێند دەخـۆن) بـە خـوا کـە ئـەوان ﴿ مَا لَبِثُواْ ﴾ (نەماونەتـەوە) لـە دنیـادا تەنهـا ﴿ سَاعَةٍ ﴾ (سـاتێ نەبـێ) ئـەوە عـوزر هێنانەوەیـە لـە لایـەن ئەوانـەوە لەبـەر ئـەوە سـوودیان پێبگەیەنـێ، وە بەکـورت تەماشـا کردنـی مـاوەی دنیایـە.

لـە ڕاسـتیدا قسـەکانیان هیـچ حەقیقەتێکـی نیـە، خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ كَذَٰلِكَ كَانُواْ يُؤۡفَكُونَ ﴾ واتـە: ئـەوان بـەردەوام لـە دونیـادا لـە ڕاسـتیەکان لایانـدا بـوو، درۆیـان هەڵدەبەسـت، لـە دونیـادا حەقیـان بـە درۆ دەزانـی کـە پێغەمبـەران هێنـا بوویـان، وە لـە دوارۆژدا نکووڵـی کاری هەسـتپێکراویان دەکـرد، ئەویـش مانـەوەی درێـژ خایەنیـان بـوو لـە دونیـا، ئەمـە خورەوشـتە ناشـرینەکانیانە، مـرۆڤ زینـدو دەکرێتـەوە لەسـەر ئـەوەی کـە دەمـرێ.

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ وَٱلۡإِيمَٰنَ ﴾ (واتـە: وە کەسـانێ کـە زانیـاریو ئیمانیـان پێـدراوە وتیـان) خـوا منەتـی کـرد بەسـەریاندا بـەو دوانـە، وە بـووە وەسـفێک بۆیـان، زانسـت بـە هـەقو ئیمانێکـی پەیوەسـت کـراو بـە پەسـند کردنـی حـەق، جـا ئەگـەر ئـەوان حـەق دەناسـنو پەسـندی دەکـەن، ئـەوە دەبـێ قسـەکانیان لەگـەڵ واقیعـدا پـڕاو پـڕ بگونجێـت، گونجـاو بێـت لەگـەڵ بارودۆخیانـدا.

بۆیـە قسـەی حـەقو ڕاسـتیان کـردو وتیـان: ﴿ لَقَدۡ لَبِثۡتُمۡ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ ﴾ واتـە: لـە قـەزاو قەدەریـدا، کـە خـوا لەسـەرتانی نووسـیوە، وە لـە بڕیاریـدا ﴿ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡبَعۡثِ ﴾ واتـە: تەمەنێکتـان کـرد، بیرکـەرەوە بیـری لێدەکاتـەوە، وە پەنـد وەرگـر پەنـدی لێـوەر دەگـرێ، هەتـا ڕۆژی زیندووبوونـەوە هـاتو گەیشـتن بـەو حاڵـە.

﴿ فَهَٰذَا يَوۡمُ ٱلۡبَعۡثِ وَلَٰكِنَّكُمۡ كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ﴾ (واتـە: ئنجـا ئەمـە ڕۆژی زیندووبوونەوەیـە بـەڵام ئێـوە نەتاندەزانـی) بۆیـە نکووڵیتـان لـێ دەکـرد لـە دونیـادا، وە نکوڵیتـان دەکـرد لـە دونیـادا کاتـێ دابنێـن بـۆ گەڕانـەوەو داوای لێخـۆش بـوون، بـەردەوام نەفامـی دروشـمتان بـوو، وە شـوێنەوارەکانی لـە بەدرۆ دانـانو خەسـارەتمەندی داپۆشـەرتان بـوو.

﴿ فَيَوۡمَئِذٖ لَّا يَنفَعُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مَعۡذِرَتُهُمۡ ﴾ (واتـە: جـا لـەو ڕۆژەدا کەسـانێ سـتەمیان کـردوە بەهانـە هێنانـەوە سـوودیان پێناگەیەنێـت) جـا ئەگـەر درۆ بکـەنو پێیـان وابێـت

بەڵگـەو حوججەیـان لەسـەر پێویسـت نەکـراوە، یـان نەیـان توانیـوە ئیمـان بهێنـن، درۆکەیـان دەردەکـەوێ، بـە شـایەتیدانی خـاوەن زانسـتو ئیمـان، وە شـایەتیدانی پێسـتو دەسـتو قاچەکانیـان، وە ئەگـەر داوای بەهانـە بکـەن، کـە بگەڕێنرێنـەوە بـۆ دونیـا جارێکـی دیکـە ناگەڕێنـەوە بـۆ لای ئەوانـەی قەدەغەیـان لێکـراوە، بـە هیـچ شـێوەیەک ناگەڕێنرێنـەوە، بەراسـتی کاتـی بەهانـە هێنانـەوە تـەواو بـوو، عـوزرو بیانوویـان لێوەرناگیـرێ، ﴿ وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴾ واتـە: داوایـان لـێ ناکـرێ پـۆزش بهێننـەوە.

(٥٨): ﴿ وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا الْقُرْآنِ مِن كُلِّ مَثَلٍ ۚ وَلَئِن جِئْتَهُم بِآيَةٍ لَّيَقُولَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ أَنتُمْ إِلَّا مُبْطِلُونَ ﴿٥٨﴾ ﴾

﴿ وَلَقَدْ ضَرَبْنَا ﴾ (واتـە: بـە ڕاسـتی هێناومانەتـەوە) لەبـەر گرنگیـدانو بەزەیـیو نـەرمو نیانـیو جوانـی مامەڵـە کردنمـان ﴿ لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا الْقُرْآنِ مِن كُلِّ مَثَلٍ ﴾ (واتـە: بـۆ خەڵکـی لـەم قورئانـەدا لـە هەمـوو جـۆرە نموونـەو باسـێک) بـۆ ئـەوەی حەقیقەتەکانـی پـێ دەربکـەوێو کارەکانـی پـێ بناسـرێو بیانـووی پـێ ببـڕێ، ئەمـە گشـتگیرە لـە نموونەکانـدا کـە خـوا دەیهێنێتـەوە بـۆ نزیـک کردنـەوەی ئـەو کارانـەی کـە بـە عەقـڵ هەسـتی پێدەکـرێ، وە هەواڵـدان بـەوەی لـە داهاتـوودا چـی ڕوو دەدات، وە دەرکەوتنـی حەقیقەتەکانـی هەتـا وەکـو ئـەوە وایـە ڕوویدابێـت.

وە هەروەهـا لـەم شـوێنەدا، خـوا باسـی ڕۆژی دوایـی دەکات، وە لـە حاڵەتـی تاوانبـاران تیایـداو توونـدی ئـاخ هەڵکێشـانیان، بـە هیـچ شـێوەیەک بیانـوو بەهانـە هێنانەوەیـان لـێ وەرناگیـرێ.

بـەڵام سـتەمکارانی بێبـڕوا تەنهـا عینـادی کردنـی حەقـی ئاشـکراو ڕوونیان هەڵبـژاردوە، لەبـەر ئەمـە فەرموویەتـی: ﴿ وَلَئِن جِئْتَهُم بِآيَةٍ ﴾ واتـە: نیشـانەیەک بەڵگـە بێـت لەسـەر ڕاسـتی ئـەو پەیامـەی هێناوتـە ﴿ لَّيَقُولَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ أَنتُمْ إِلَّا مُبْطِلُونَ ﴾ واتـە: بـە حـەق دەڵێـن: بـە ڕاسـتی ئـەوە بەتـاڵو پـووچو ناحەقـە.

ئەمـەش بـە هـۆی کوفـرو بوێریانـە، وە بـە هـۆی ئەوەیـە خـوا مـۆری نـاوە بەسـەر دڵەکانیانـدا، وە لـە نەفامـی ئەنـدازە بەدەریانـە، بۆیـە فەرموویەتـی: ﴿ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ اللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ خێـرو چاکـە ناچێتـە نـاو دڵیانـەوە، حەقیقەتـەکان وەکـو خـۆی هەسـت پێناکـەن، بەڵکـو حـەق بـە ناحـەق دەبینـنو ناحەقیـش بـە حـەق.

(٥٩): ﴿ كَذَٰلِكَ يَطۡبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ ۝٥٩ ﴾:
﴿ فَٱصۡبِرۡ ﴾ (دان بەخۆتـدا بگـرە) لەسـەر ئـەو فەرمانـەی پێـت کـراوە، وە لەسـەر بانگـەواز کردنیـان بـۆ لای خـوا، جـا ئەگـەر پشـت تێکردنێکـت بینـی لـە لایـەن ئەوانـەوە، بـا ئـەوە ڕێگریـت لێنـەکات، ﴿ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ ﴾ هیـچ گومانێکـی تێدانیە، ئەمـەش یارمەتیـدەرە لەسـەر ئارامگرتـن، بێگومـان بەنـدە ئەگـەر زانـی کردەوەکـەی بـە فیـڕۆ ناچێـت، بەڵکـو دەیبینێتـەوە بـە تەواوەتـی، ناڕەحەتـی لەسـەر ئاسـان دەبێـت، وە هەمـوو گرانـیو قورسـیەکی لەسـەر سـووک دەبێـت، چەنـدە کـردەوەی زۆر بـکات بـە کەمـی دەزانـێ.
﴿ وَلَا يَسۡتَخِفَّنَّكَ ٱلَّذِينَ لَا يُوقِنُونَ ﴾ واتـە: بەڕاسـتی بڕوایـان لاوازەو دڵنیاییـان کەمـە، بـە هـۆی ئـەوەو خەونەکانیـان سـووک بـووەو ئارامـیو خۆڕاگریـان کەمـە، دەخیلـە ئەوانـە بێـزارت نەکـەنو لات نـەدەن، تـۆ ئەگـەر وریایـان نەبێـتو خـۆت لێیـان نەپارێـزی، ئـەوە لـە خشـتەت دەبـەنو دەتترازێنن لـە فەرمـانو قەدەغەکـراوەکان، نەفـسو دەروون یارمەتیـان دەدات لەسـەر ئەمـە، وە داوای گومـانو دوودڵـی دەکات.
ئەمـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی هـەر بڕوادارێـک خـاوەن دڵنیایـیو یەقینـە، عەقڵـی کامڵـە، ئـارام گرتـن لەسـەری ئاسـانە.
وە هـەر کەسـێک دڵنیایـی لاواز بێـت عەقڵیشـی لاوازو سـووکە، جـا یەکـەم بـە کـرۆکو کاکڵـە دێـت، ئـەوی دیکـە بـە پلـەی توێـکڵ دێ، خـوا پشـتیوان بێـت.

تەفسیری سوورەتی (الروم) تەواو بوو.


سُورَةُ لُقۡمَانَ
بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
الٓمٓ ۝ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡحَكِيمِ ۝ هُدٗى وَرَحۡمَةٗ
لِّلۡمُحۡسِنِينَ ۝ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم
بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ ۝ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ
هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ۝ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡتَرِي لَهۡوَ ٱلۡحَدِيثِ
لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ
عَذَابٞ مُّهِينٞ ۝ وَإِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِ ءَايَٰتُنَا وَلَّىٰ مُسۡتَكۡبِرٗا
كَأَن لَّمۡ يَسۡمَعۡهَا كَأَنَّ فِيٓ أُذُنَيۡهِ وَقۡرٗاۖ فَبَشِّرۡهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ۝
إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمۡ جَنَّٰتُ ٱلنَّعِيمِ ۝
خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٗاۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ۝ خَلَقَ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيۡرِ عَمَدٖ تَرَوۡنَهَاۖ وَأَلۡقَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ رَوَٰسِيَ أَن تَمِيدَ
بِكُمۡ وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٖۚ وَأَنزَلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَنۢبَتۡنَا
فِيهَا مِن كُلِّ زَوۡجٖ كَرِيمٍ ۝ هَٰذَا خَلۡقُ ٱللَّهِ فَأَرُونِي مَاذَا
خَلَقَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦۚ بَلِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ۝

## تەفسیری سوورەتی (لقمان)

## مەککیە (٣٤) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٥): ﴿ الٓمٓ ﴿١﴾ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡحَكِيمِ ﴿٢﴾ هُدٗى وَرَحۡمَةٗ لِّلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٣﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ ﴿٤﴾ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿٥﴾ ﴾

﴿ تِلۡكَ ﴾ خوا ﷻ ئاماژە دەکات بە ئاماژە کردنێک کە بەڵگەیە لەسەر مەزنی ﴿ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡحَكِيمِ ﴾ واتە: ئایەتەکانی پڕ لە حیکمەتن و ڕاستو تەواون، لە لایەن کار دروستی بە ئاگاو لێزان دەرچووە.

لە پتەوی و وردی ئەو قورئانە دابەزیوە بە بەرزترین قسەو پاراوترین و ڕوونترینیان، کە بەڵگەیە لەسەر گەورەترین ماناو چاکترینیان، وە لە پتەوی و وردی ئەو قورئانە ئەوەیە کە پارێزراوە لە هەموو گۆڕان و دەستکاری کردنێک، وە زیادەو ناتەواوی و لادانێک.

وە لە پتەوی و وردی ئەوەی لە ناو قورئاندایە لە هەواڵەکانی پێشوو داهاتوو، وە کاروبارە پەنهانەکان هەموویان پڕاو پڕن لەگەڵ واقیعدا، کتێبێ لە کتێبە ئاسمانیەکان پێچەوانەی نەبووە، وە پێغەمبەرێ لە پێغەمبەران بە پێچەوانەی قورئانەوە هەواڵی نەداوە، نەهاتووەو نایەت زانستی هەست پێکراوو مەعقولی ڕاست شتێ لەو قورئانە هەڵبوەشێنێتەوە، وە لە پتەوی و وردی ئەو قورئانە فەرمانی نەکردوە تەنها بە بەرژەوەندی ڕوون و پەتی نەبێ، یان پەسندترینیان، وە قەدەغەی نەکردوە لە شتێ تەنها ئەوە نەبێ خراپەی پەتی و ڕوونە، یان خراپتر لەو، وە زۆرجار دوو شت پێکەوە کۆدەکاتەوە لەگەڵ باسکردنی حیکمەت و سوودی، وە قەدەغە

لــە شــتێ دەکات لەگــەڵ باســکردنی زیانەکــەی، وە لــە پتــەوی‌و وردی قورئــان ئەوەیــە کــۆی کردوەتــەوە لــە نێــوان هانــدان‌و ترســاندندا، وە ئامۆژگــاری ڕەوان، کــە نەفــس‌و دەروونــە چاکــەکان پێــی ڕێــک دەبــن‌و کــردەوە دەکــەن بــە چاکــی.

وە لــە پتــەوی‌و وردی قورئــان تــۆ دەبینــی دەقــەکان دووبــارە بوونەتــەوە، وەکــو چیرۆکــەکان‌و ئەحکامــەکان‌و وێنــەی ئــەوان، هەموویــان ڕێــک کەوتــوون، هیــچ دژیەکێــک‌و جیاوازیەکــی تێدانیــە، جــا هەتــا کەســی خــاوەن بینایــی بیــری لێبکاتــەوە، عەقڵیــش تێبفکــرێ، عەقڵــی گەشــە دەکات‌و دڵــی دەحەپەســێ، لــە گونجــان‌و ڕێــک بوونیــان، وە بــە تــەواوی یــەکلا دەبێتــەوە بەبــێ هیــچ گومــان‌و دوو دڵیــەک کــە ئــەو قورئانــە لــە لایــەن خــوای کاردروســتی ستایشــکراوەوە دابەزیــوە بــەڵام- لەگــەڵ ئــەوەدا خــوا کار دروســتە- بانــگ دەکات بــۆ هەمــوو ڕەوشــتێکی بەخشــندە، وە قەدەغــەی هەموو ڕەوشــتێکی ناشــرین‌و سەرزەنشــتکراو دەکات، زۆربــەی خەڵکــی بێبەشــن لــە هیدایــەت وەرگرتــن لێــی، پشــتیان لــە ئیمــان‌و کــردەوەی چــاک کــردوە، مەگــەر کەســێ خــوا ســەرکەوتووی کردبــێ‌و پاراســتبێتی، ئەوانیــش چاکەخوازانــن لــە بەندایەتــی کردنــی پەروەردگاریــان، وە چاکــەکارن لەگــەڵ خەڵکیــدا، بێگومــان ئــەو قورئانــە ﴿ هُدًى ﴾ (ڕێنماییــە) بۆیــان، ڕێنماییــان دەکات بــۆ ڕێگــای ڕاســت، وە ئاگاداریــان دەکاتــەوە لــە ڕێگاکانــی دۆزەخ، ﴿ وَرَحْمَةً ﴾ (میهرەبانیــە) بۆیــان، خۆشــبەختی دونیــاو دوارۆژ بــە هۆیــەوە بەدەســت دێنــن، وە خێــرو چاکــەی زۆرو پاداشــتی بــێ پایــان‌و خۆشــی‌و دڵخۆشــی، وە گومڕایــی‌و بەدبەختیــان لــێ دوور دەخاتــەوە.

پاشــان وەســفی چاکەکارانــی کــردوە بــە زانســتی تــەواو، ئەویــش دڵنیایــی تــەواوە، کــە کــردەوەو ترســان لــە ســزای خــوا دەخــوازێ، واز لــە ســەرپێچی کردنــی دێنــن، وە وەســفی کــردون بــە کــردەوە، وە لــەو کردەوانــەش دوو کــردەوەی خــاوەن فەزڵــی تایبــەت کــردوە: نوێــژ کــە دڵســۆزی‌و پاڕانــەوە لــە خــوا دەگرێتــەوە، وە بەندایەتــی گشــتگیر بــە دڵ‌و زمــان‌و ئەندامەکانــی جەســتە، کــە لــە نــاو هەمــوو کردەوەکانــدا ئــەم کردەوەیــە دیاریکــراوە، وە زەکات دان کــە خاوەنەکــەی پــاک دەکاتــەوە لــە پیســی‌و ڕەزیلــی، وە ســوود بــە بــرا مســوڵمانەکەی دەگەیەنــێ‌و پێویســتیەکانی پــڕ دەکاتــەوە، وە ئــەوەش دەردەخــات کــە بەنــدە خۆشەویســتی خــوا دەدات بەســەر خۆشەویســتی ماڵــدا، خۆشەویســتەکەی دەردەکات لــە مــاڵ‌و ســامان، لــە پێنــاو خۆشەویســتر لــە

ئـەو، ئەویـش داواکردنـی ڕەزامەنـدی خوایـە ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ﴾ (ئـا ئەوانـە) چاکەخـوازن، کۆیـان کردۆتـەوە لـە نێـوان زانسـتی تـەواوو کـردەوەدا ﴿ عَلَىٰ هُدٗى ﴾ واتـە: (لـە سـەر ڕێنماییەکـی) مەزنـن، هەروەکـو چـۆن نەناسـراو ئـەو مانایـە دەبەخشـێ، جـا ئـەو ڕێنماییـە بەدەسـتهاتووە بۆیـانو پێیانگەیشـتوە، ﴿ مِّن رَّبِّهِمۡ ﴾ (لـە لایـەن پەروەردگاریانـەوە) ئـەو زاتـەی بە بـەردەوام بـە نازونیعمەتەکانـی پەروەردەیـان دەکات، شـەڕوو خراپەیشـیان لـێ دوور دەخاتـەوە.

ئـەم ڕێنماییـەی خـوا ﷻ پێـی گەیانـدوون لـە پـەروەردە کردنـی تایبەتێتـی بـە دۆستەکانی، ئەویـش چاکتریـن جۆرەکانـی پەروەردەکردنـە ﴿ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴾ ئەوانـە گەیشـتوون بـە ڕەزامەنـدی خـواو پاداشـتی دونیـاو دوارۆژیـان، وە سـەلامەتن لـە خەشـمو قیـنو سـزای، ئەویـش لەبـەر ئـەوەی ڕێگـای سـەرکەوتنو سـەرفرازیان گرتۆتـە بـەر، کـە ڕێگایەکـی دیکـە نیـە جگـە لـەوە.

کاتـێ خـوا ﷻ باسـی هیدایەتدراوانـی کـرد بـە قورئـان ئەوانـەی ڕوویـان تێکـردوە، ئنجـا باسـی ئـەو کەسـەی کـرد کـە پشـتی تێکـردوەو پێـی سـەربەرز نەبـووە، وە ئـەو کەسـە سـزا دەدرێ لەسـەر ئـەوە، چونکـە لـە جیاتـی ئـەو قورئانـە هەمـوو بەتاڵێکـی پووچـی هەڵبـژاردوە لـە قسـەکردندا، وازی لـە بەرزترینـی قسـەکانو چاکترینیـان هێنـاوە، وە خراپتریـن قسـەو ناشـرینترینیانی کـردوە بـە بەڵگـە بـۆ خـۆی، جـا لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی:

(٦-٩): ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡتَرِي لَهۡوَ ٱلۡحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ ٦ وَإِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِ ءَايَٰتُنَا وَلَّىٰ مُسۡتَكۡبِرٗا كَأَن لَّمۡ يَسۡمَعۡهَا كَأَنَّ فِيٓ أُذُنَيۡهِ وَقۡرٗاۖ فَبَشِّرۡهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ٧ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمۡ جَنَّٰتُ ٱلنَّعِيمِ ٨ خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٗاۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ٩ ﴾:

﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن ﴾ واتـە: (هەنـدێ لـە خەڵکـی هەیـە) بێبەشو سەرشـۆڕە ﴿ يَشۡتَرِي ﴾ واتـە: هەڵیدەبژێـرێو حـەزی لێـدەکات وەک حەزکردنـی کەسـێ لـە پێناویـدا پـارە خـەرج بـکات ﴿ لَهۡوَ ٱلۡحَدِيثِ ﴾ واتـە: قسـە بـێ هـوودەکان کـە دڵ بـێ ئاگـا دەکـەن، دەبنـە بەربەسـت لـە بـەردەم گەورەتریـن داواکاریـدا، جـا دەچێتـە نێـو ئەمـەوە هەمـوو قسـەیەکی قەدەغەکـراو، وە هەمـوو شـتێکی پـڕوو پـووچو بـێ بایـەخو وڕێنەکـردن لـە قسـەکاندا، کـە هانـدەرن بـۆ کوفـرو تـاوانو سـەرپێچی کـردن،

وە لــە قســەی ئــەو کەســانەی لــە هــەق لایانــداوەو دەمــە دەمــێ دەکــەن لــە ســەر شــتی پــووچو بــێ بنەمــا، بــۆ ئــەوەی ئاینــی ڕاســتی پــێ لــە نــاو ببــەن، لــە غەیبــەت کــردنو قســەهێنانو بــردنو درۆو تانــەو تەشــەرو تۆمــەت، وە لــە گۆرانــیو دۆڵو زوڕنــای شــەیتان، ئــەو ڕووداوانــەی کــە دڵ بێئاگــا دەکاتو هیــچ ســوودێکی تێدانیــە نە بــۆ دیــن نــە بــۆ دونیــا، جــا ئــەم بەشــە لــەو کەســانەن قســەی بێهــوودە دەکــرن لــە قســەی بــاش ﴿ لِيُضِلَّ ﴾ (بــۆ ئــەوەی) خەڵکــی (گومــڕا بکــەن) ﴿ بِغَيْرِ عِلْمٍ ﴾ واتــە: دوای ئــەوەی خــۆی گومڕابــوو خەڵکیــش گومــڕا دەکات، چونکــە گومــڕا کــردن لــە گومڕابوونــەوە پەیــدا دەبــێو ســەرچاوە دەگــرێ، وە گومــڕا کردنــی لــەم قســەو باســەدا ڕێگــری کردنێتــی لــە قســەی بــە ســوودو کــردەوەی چــاکو حەقــی ڕوونکــراوەو ڕێگــای ڕاســت.

ئــەوەی بــۆ تەواو نابــێ هەتــا هیدایەتو ڕاســتی ناشــرین نــەکات، وە ئایەتو نیشــانەکانی خــوا نەکاتــە جێگــای گاڵتــە جــاڕی، وە گاڵتــە بــکات بــە ئایەتــەکانو ئەوانەیشــی شــوێنی کەوتــوون، جــا ئەگــەر کــۆی کــردەوە لــە نێــوان وەســفکردنی بەتــاڵو پــووچو هاندانــی خەڵکــی بــۆی، وە لەکــەدار کردنــی حــەقو گاڵتەکــردن بــە شــوێنکەوتووانی، گومــڕا دەبــێ کەســێک کــە زانســتی پــێ نەبــێ، وە فێڵــی لێــدەکات بــەو سروشــەی کــە بــۆی دەکات، لــەو قســانەی کــە گومــڕا کــراو ناتوانــێ جیــای بکاتــەوەو ڕاســتیەکانی بــۆ دەرناکــەوێ ﴿ أُوْلَـٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴾ (واتــە: ئەوانــە ســزای ڕســواکەریان بــۆ هەیــە)، بــەوەی گومــڕا بــوونو خەڵکیــان گومــڕا کــرد، وە گاڵتەیــان بــە ئایەتەکانــی خــوا کــردو حــەقو ڕاســتی ڕوونیان بــە درۆزانــی، لەبــەر ئەمەیــە فەرموویەتــی: ﴿ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَـٰتُنَا ﴾ بــۆ ئــەوەی بــڕوای پێبهێنــێو ملکەچــی بــێ ﴿ وَلَّىٰ مُسْتَكْبِرًا ﴾ واتــە: ڕوو وەردەگێــڕێ، بــە ڕوو وەرگێڕانێکــی خــۆ بــە گــەورە زانیــنو ڕەتکردنــەوەی ئایەتــەکان، هەرگیــز ناچێتــە نێــو دڵیــەوەو کاریگــەری لــە ســەر دروســت نــاکات، بەڵکــو پشــتی تێــدەکات ﴿ كَأَن لَّمْ يَسْمَعْهَا ﴾ (واتــە: هــەروەک نەیبیســتبێ) بەڵکــو ﴿ كَأَنَّ فِىٓ أُذُنَيْهِ وَقْرًا ﴾ واتــە: (هــەردوو گوێــی) کــەڕ ببــێ، دەنگەکانــی پــێ نەگــا، ئەمــە هیــچ ڕێگــە چارەیــەک نیــە بــۆ ڕێنمایــی کردنــی ﴿ فَبَشِّرْهُ ﴾ (دەی مــژدەی بــدەرێ) بــە مژدەدانــێ کاریگــەری خــەمو پــەژارە لــە دڵــی دروســت بــکات، وە لــە مژدەدانــی ناشــرینو خــراپو تاریــکو تــۆزاوی ﴿ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴾ (بــە ســزایەکی)

سـەختەو بـە ئێـش بـۆ دڵو جەسـتەی، کـە بـە هیـچ جـۆرێ ئەنـدازە نەکـرێ، وە نازانـێ بـە مەزنـی ئـەو سـزایە، ئەمـە مژدەدانـی خراپەکارانـە، خراپترین مژدەیـە، بەڵام مژدەدانـی چاکـەکاران فەرموویەتـی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ واتـە: کۆیـان کردۆتـەوە لـە نێـوان بەندایەتـی کـردن ناوەڕۆکیـان بـە برواهێنـانو ڕواڵەتیـان بـە مسـوڵمان بـوونو کـردەوەی چـاک ﴿لَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلنَّعِيمِ﴾ مژدەیەکـە بۆیـان بـەو کردەوانـەی پێشـیان خسـتووە، وە ڕێزێـک بۆیـان بـە هـۆی ئـەوەی پێشـیان خسـتووە، ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾ واتـە: لـە بەهەشـتانی پـڕ لـە نـازو نیعمەتـدا، نیعمەتـی دڵو ڕووحو جەسـتە ﴿وَعْدَ ٱللَّهِ حَقًّا﴾ ناکـرێ پێچەوانـەی بەڵێنەکانـی بـکاتو بیانگـۆڕێ ﴿وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ تـەواوی عیـززەتو تـەواوی حیکمـەت، لـە عیـززەتو حیکمەتـی سـەرکەوتووی کـردوە ئـەو کەسـەی سـەرکوتوو بـووە، وە ڕیسـوای کـردوە ئـەوەی کـە ڕیسـوا بـووە، بـە پێـی ئـەو زانسـتو حیکمەتـەی کـە دەیخـوازێ تیایانـدا.

(١٠-١١): ﴿خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا وَأَلْقَىٰ فِى ٱلْأَرْضِ رَوَٰسِىَ أَن تَمِيدَ بِكُمْ وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ ﴿١٠﴾ هَٰذَا خَلْقُ ٱللَّهِ فَأَرُونِى مَاذَا خَلَقَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ بَلِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿١١﴾﴾:

خـوا دەخوێنێتـەوە بەسـەر بەندەکانیـدا چەندیـن شـوێنەوار لە شـوێنەوارەکانی دەسـەڵاتی، وە چەندیـن داهێنـان لـە داهێنانـە پـڕ لـە حیکمەتەکانـی، وە چەندیـن نیعمـەت لـە شـوێنەوارەکانی ڕەحمەتـی، جـا فەرموویەتـی: ﴿خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ﴾ حـەوت ئاسـمانی (دروسـت کـردوە) بـە مەزنـیو بەرفراوانـیو چـڕیو بـەرزی بـێ ئەندازەیـەوە ﴿بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا﴾ واتـە: هیـچ پایەیەکـی نیـە، ئەگـەر پایـەی ببوایـە دەبینـرا، بەڵکـو جێگیـرەو تـەواو کـراوە بـە توانـای خـوا.

﴿وَأَلْقَىٰ فِى ٱلْأَرْضِ رَوَٰسِىَ﴾ واتـە: کێـوی مـەزن سەرانسـەری چەسـپاندویەتیو قایمـی کـردوە، بـۆ ئـەوەی ﴿تَمِيدَ بِكُمْ﴾ (نەتـان لەرزێنـێو نەجوڵـێ) جـا ئەگـەر کێـوە داکوتـراوەکان نەبووایـە، زەوی دەلـەرزا، جێگیـر نەدەبـوون ئەوانـەی تیایـدا نیشـتەجێن ﴿وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ﴾ واتـە: بـڵاوی کردوەتـەوە لـەم زەویـە بەرفراوانـەدا هەمـوو بەشـەکانی گیـان لەبـەران کـە ڕامکـراون بـۆ نەوەکانـی ئـادەم، وە بـۆ بەرژەوەنـدیو سـوودەکانیان، کاتـێ کـە بـڵاوی کردوونەتـەوە بەسـەر زەویـدا، خـوا ﷻ زانیویەتـی پێویسـتیان بـە ڕزقو ڕۆزی دەبـێ بـۆ ئـەوەی پێـی بژیـن، جـا لـە ئاسـمانەوە ئاوێکـی

پیــرۆزی بارانــدوە، ﴿ فَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوۡجٖ كَرِيمٍ ﴾ (واتــە: بــە هــۆی ئــەو بارانــەوە هەمــوو جــۆرە ڕووەکێکــی بەکەڵــکو جوانمــان ڕوانــدووە) بــە ســوودو پیــرۆز، گیــان لەبــەر بــڵاوە بــووەکان پێــی دەلەوەڕێــن، هەمــوو گیــان لــە بەریــەک ســوودی لێوەردەگــرێ.

﴿ هَٰذَا ﴾ واتــە: دروســتکردنی جیهانــی ســەروو خــوارو لــە بێگیــانو گیانــدارو پێدانــی ڕزقو ڕۆزیەکانیــان ﴿ خَلۡقُ ٱللَّهِ ﴾ (دروســتکراوی خــوای) تــاکو تەنهــاو بــێ هاوەبەشــن، هەموویــان دان بــەوەدا دەنێــن، تەنانــەت ئێــوەش ئــەی هاوبــەش دانــەران.

﴿ فَأَرُونِي مَاذَا خَلَقَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦۚ ﴾ (واتــە: دەی نیشــانم بــدەن بزانــم ئەوانــی تــر جگــە لــەو زاتــە چییــان دروســت کــردوە) ئەوانــەی کردووتانــن بــە هاوبەشــی خــوا، داوایــان لێدەکــەنو دەیانپەرســتن، ئەمــە ئــەوە دەگەیەنــێ ئەوانیــش مافــی دروســت کردنیــان هەیــە وەک دروســتکردنی خــوا، وە ڕزقو ڕۆزی وەک ڕزقو ڕۆزی ئــەو، ئەگــەر شــتێکیان هەیــە لــەو جــۆرە نیشــانم بــدەن، بــۆ ئــەوەی ڕاســتی بانگەوازەکەتــان دەربکــەوێ لــەوەی شایســتەی پەرســتنن.

ئــەوەی زانــراوە ئــەوان توانایــان نیــە شــتێک لــە دروســتکردن پێشــانیان بــدەن، چونکــە هەمــوو ئەوانــەی باســکران دانیــان بــەوەدا نــاوە ئــەوان دروســتکراوی خــوای تــاکو تەنهــان، بێتواناییــان چەســپا لــە ســەلماندنی دروســت کردنــی شــتێک کــە شایســتەی پەرســتن بــن، بــەڵام بەندایەتــی کردنیــان بــۆ ئــەو پەرســتراوانە لــە بــێ زانســتیو نەبوونــی بەرچــاو ڕوونیــەوە ســەرچاوەی گرتــووە، بەڵکــو لــە نەفامیو گومڕاییەوەیــە، بۆیــە فەرموویەتــی: ﴿ بَلِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴾ واتــە: (بەڵکــو ســتەمکاران لــە گومڕاییەکــی) ڕوونو ئاشــکرا دان کاتــێ شــتێکیان پەرســتووە نــە ســوودو نــە زیــانو نە مــردنو نەژیــانو نــە زیندوکردنــەوەی بەدەســتە، وە وازیــان لــە دڵســۆزی بــۆ بەدیهێنەری ڕۆزیــدەری خاوەنــی هەمــوو کاروبــارەکان هێنــاوە.

وَلَقَدْ آتَيْنَا لُقْمَانَ الْحِكْمَةَ أَنِ اشْكُرْ لِلَّهِ وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا
يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٌ (١٢) وَإِذْ قَالَ
لُقْمَانُ لِابْنِهِ وَهُوَ يَعِظُهُ يَا بُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ
لَظُلْمٌ عَظِيمٌ (١٣) وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ
وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ
إِلَيَّ الْمَصِيرُ (١٤) وَإِن جَاهَدَاكَ عَلَىٰ أَن تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ
لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفًا
وَاتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَيَّ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم
بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ (١٥) يَا بُنَيَّ إِنَّهَا إِن تَكُ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ
خَرْدَلٍ فَتَكُن فِي صَخْرَةٍ أَوْ فِي السَّمَاوَاتِ أَوْ فِي الْأَرْضِ يَأْتِ
بِهَا اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ (١٦) يَا بُنَيَّ أَقِمِ الصَّلَاةَ وَأْمُرْ
بِالْمَعْرُوفِ وَانْهَ عَنِ الْمُنكَرِ وَاصْبِرْ عَلَىٰ مَا أَصَابَكَ إِنَّ ذَٰلِكَ
مِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ (١٧) وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِي الْأَرْضِ
مَرَحًا إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ (١٨) وَاقْصِدْ فِي مَشْيِكَ
وَاغْضُضْ مِن صَوْتِكَ إِنَّ أَنكَرَ الْأَصْوَاتِ لَصَوْتُ الْحَمِيرِ (١٩)

(١٢-١٩): ﴿ وَلَقَدْ آتَيْنَا لُقْمَانَ الْحِكْمَةَ أَنِ اشْكُرْ لِلَّهِ وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٌ (١٢) وَإِذْ قَالَ لُقْمَانُ لِابْنِهِ وَهُوَ يَعِظُهُ يَا بُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ (١٣) وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ (١٤) وَإِن جَاهَدَاكَ عَلَىٰ أَن تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفًا وَاتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَيَّ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ (١٥) يَا بُنَيَّ إِنَّهَا إِن تَكُ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ فَتَكُن فِي صَخْرَةٍ أَوْ فِي السَّمَاوَاتِ أَوْ فِي الْأَرْضِ يَأْتِ بِهَا اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ (١٦) يَا بُنَيَّ أَقِمِ الصَّلَاةَ وَأْمُرْ بِالْمَعْرُوفِ وَانْهَ عَنِ الْمُنكَرِ وَاصْبِرْ عَلَىٰ مَا أَصَابَكَ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ (١٧) وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِي الْأَرْضِ مَرَحًا إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ (١٨) وَاقْصِدْ فِي مَشْيِكَ وَاغْضُضْ مِن صَوْتِكَ إِنَّ أَنكَرَ الْأَصْوَاتِ لَصَوْتُ الْحَمِيرِ (١٩) ﴾:

﴿ وَلَقَدْ آتَيْنَا لُقْمَانَ الْحِكْمَةَ أَنِ اشْكُرْ لِلَّهِ وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٌ ﴾ تا کۆتایی چیرۆکەکە، خوا ﷻ هەواڵ دەدات دەربارەی منەتی خۆی بە سەر بەندە بەڕێزەکەی لوقمان بە حیکمەتو دانایی، ئەویش بریتیە لە زانست بە هەق لە سەر شێوەو حیکمەتی خۆی، جا ئەویش زانستە بە ئەحکامەکان، وە ناسینی ئەوانەی تیایاندایە لە نهێنیو وردەکاریەکان، دەگونجێ مرۆڤ هەندێک جار زانا بێو حەکیم نەبێ، بەڵام حیکمەت پەیوەستە بە زانستەوە بەڵکو بە کردەوەشەوە، ئا لەبەر ئەمەیە حیکمەت ڕاڤەکراوە بە زانستی بە سوودو کردەوەی چاک.

کاتێ خوا ﷻ ئەو منەتە گەورەیەی پێدا، فەرمانی پێکرد سووپاسگوزاری بکات لەسەر ئەوەی پێی بەخشیوە، بۆ ئەوەی پیرۆزی بکات بەوەی پێی بەخشیوە، وە فەزڵو چاکەی

زیاتـری پـێ ببەخشـێ، وە هەواڵـی پێـداوە چاکـەی چاکەخـوازان سـوودو قازانجەکـەی دەگەڕێتـەوە بـۆ خۆیـان، وە هەرکـەس بێبڕوایی بکاو سوپاسـی خـوا نەکات، ئـەوە ئۆباڵی ئـەوە دەکەوێتـە سـەرخۆی، خـوا ﷻ بێنیـازە لە سوپاسـگوزاری ئـەو، ستایشـکراوە لەوەی ئەنـدازەی دەکێشـێو بڕیـاری لەسـەر دەدات، بێنیـازی خوا لـە تایبەتمەنـدی خودیەتی، وە توونـی ستایشـکراوی لـە سـیفاتی تـەواوی، سـتایش کـراو لـە جوانـی دروسـتکردنیدا، لە تایبەتمەندیەکانی خودیەتی، وە هەریەک لەو دوو وەسـفە سـیفاتی تەواون، وە کۆکردنەوەی یەکێکیـان بـۆ لای ئەوی دیکـە تەواوی زیاتـرە بەسـەر تەواویدا.

ڕاڤەزانـان بـۆ چوونـی جیاوازیـان هەیـە، ئایـا لوقمـان پێغەمبەر بـووە یان بەنـدەی چاک؟ خـوای گـەورە هیچـی دەربـارەی بـاس نەکـردوە تەنها ئـەوە نەبێ کـە حیکمەتـی پێداوە، وە باسـی هەنـدێ لەوانـەی کـردوە کە بەڵگـەن لەسـەر حیکمەتی لـە ئامۆژگـاری کردنی کورەکـەی، باسـی بنەمـای حیکمـەتو بنچینـە گەورەکـەی کـردوە، جـا فەرموویەتـی: ﴿ وَإِذْ قَالَ لُقْمَٰنُ لِٱبْنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ ﴾ (واتـە: باسـی ئـەو کاتە بکـە لوقمان بـە کوڕەکەی گـوت کـە ئامۆژگـاری کـرد)، یان قسـەیەکی بـۆ کرد بـەو قسـەیە ئامۆژگـاری کرد بە فەرمانکـردنو قەدەغەکـردن، کـە بەسـترا بـوو بـە هانـدانو ترسـاندن، فەرمانـی پێکرد بە دڵسـۆزی، وە قەدەغـەی لێکـرد لـە هاوبـەش دانان، هـۆکاری ئەوەشـی بـۆ ڕوون کردەوە، فەرمـووی: ﴿ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴾ (واتە: بەڕاسـتی هاوبەش دانان سـتەمێکی زۆر گەورەیـە) ڕووی گەورەیـی ئەوەیـە، هیچ شـتێک لەوە ناشـرین ترو قیزەون تـر نیە لەوەی بەدیهێنـراوێ لـە خـۆڵ یەکسـان بکا بـە خاوەنـی گەردنەکان، وە کەسـێ هیچی بەدەسـت نیـە لـە کاروبـاردا یەکسـانی بـکا بـەوەی هەمـوو کاروبارەکانی بە دەسـتە، وە کەسـێکی ناتـەواوو هـەژار لـە هەموو ڕووەکانەوە، یەکسـان بـکا بە پەروەردگـاری تـەواوو بێنیاز لە هەمـوو ڕووەکانـەوە، وە کەسـێ بە قەد مسـقاڵە زەڕرەیەک نـازو نیعمەتی بەدەسـت نەبێت، یەکسـان بـکا بـەو زاتـەی هەرچی لـە لای خەڵکـی هەیە لـە نیعمەت لـە ئایـنو دونیایو دواڕۆژیـان، وە دڵو جەسـتەکانیان تەنهـا لە لای خوایـە، کەس خراپـەکاری لا نابات تەنها خـوا نەبـێ، ئایا لـەم سـتەمە مەزنتر هەیـە؟! ئایا لـەوە مەزنتر هەیە کەسـێک خوا دروسـتی کردبـێ بـۆ بەندایەتیو یەکتاپەرسـتی خۆی، بچێت ئەو نەفسـە بـەرزو بەڕێـزەی دابەزێنێت بـە خراپتریـن پلـەو پایـە؟ وە بیکات بـە بەندەیەک بۆ شـتێ یەکسـان نەبێ لەگـەڵ هیچدا، سـتەمی لە نەفسـی کردبێ بـە سـتەمێکی گەورە.

کاتــێ فەرمانــی کــرد بــە بەجێهێنانــی مافەکانــی، بــە وازهێنــان لە هاوبــەش دانــان، کە لە داخوازیەکانــی بەجێهێنانــی یەکتاپەرســتیە، فەرمانی کرد بە بەجێهێنانــی مافی دایکو باوک، جــا فەرمــووی: ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ ﴾ واتــە: پەیمانمان لــێ وەرگرت، کردمانە وەســیەت لــەلای، لــە داهاتوودا پرســیاری لێدەکــەن لــە بەجێهێنانی ئــەو کارە، ئایا پاراســتوویەتی یان نــا؟ فەرمانمــان پێــداوە، ﴿ بِوَٰلِدَيْهِ ﴾ (بــە دایکو باوکــی) وە پێمــان وتووە ﴿ أَنِ ٱشْكُرْ لِى ﴾ (سوپاســگوزاری مــن بکــە) بــە هەســتان بــە پەرســتنمو جێبەجێکردنــی مافەکانــم، وە پشــت مەبەســتە بــە نــازو نیعمەتەکانــم لەســەر ســەرپێچیکردنم ﴿ وَلِوَٰلِدَيْكَ ﴾ (دایکو باوکــت) بە چاکەکــردن لەگەڵیاندا، بە قســەی نەرمو نیــانو لەســەرخۆ، وە ڕەفتاری جوانو خــۆ بــە کەم زانین لە ئاســتیانداو ڕێزگرتنیــانو بە گەورە دانانیان، وە هەســتان بــە بژێویانو دوورکەوتنــەوە لــە خراپــە کــردن لەگەڵیــان لە هەمــوو ڕوویەکەوە، بــە گوفتارو بــە کردار.
جــا فەرمانمــان پێکــردوە بەم فەرمانــەو هەواڵمــان پێــداوە کــە ﴿ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴾ واتە: لە داهاتــوودا دەگەڕێیتــەوە بــۆ لای ئەوەی فەرمانی پێکــردووی، وە ئەو مافانەی پێســپاردووی، پرســیارت لــێ دەکات، ئایا پێی هەڵســای، تا پاداشــتی بــێ پایانت بداتەوە؟ یــان ونت کرد، تا ســزای جەرگ بــڕت بدات؟
پاشــان باســی هــۆکاری چاکە کــردن دەکات لەگەڵ دایــکو باوک، لــە دایکدا ﴿ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ ﴾ واتــە: دایکــی هەڵــی دەگــرێ بــە دوو گیانــی) نارەحەتــی لەســەر نارەحەتــی، بــەردەوام تووشــی نارەحەتــی دەبێ، لــەو کاتەی کــە نوتفەیە لە پزدانــی دایکدا، وە نەخۆشــیو لاوازیو قورســیو گۆڕانــی باردۆخی، پاشــان ئازاری منداڵ بــوون، ئەو ئازارە سەختە.
﴿ وَفِصَـٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ ﴾ (واتــە: وە بڕینــەوەی لە شــیر لە دوو ســاڵیەوە) ئەویش پەیوەســتە بــە دایەنــیو لــە ئەســتۆ گرتنــیو شــیردانی، ئایــا چاکــە نــەکات بــەوەی بەرگــەی ئــەو نارەحەتیانــە دەگــرێ لەگــەڵ منداڵەکەیدا، لەگــەڵ ئەوپەڕی خۆشەویســتی جەخت دەکاتەوە لەســەر منداڵەکــەی، وە ئامۆژگــاری دەکات بــە ئەوپــەڕی چاکەکــردن لەگەڵــی ﴿ وَإِن جَـٰهَدَاكَ ﴾ واتــە: باوکو دایکــت ئەوپەڕی هەوڵیانــدا ﴿ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا ﴾ (واتــە: لەســەر ئــەوەی هاوەڵــم بــۆ دابنێــی هیــچ زانیاریەکــت نیە لەو بارەیــەوە ئــەوە بــە گوێیان مەکــە) وا مەزانە ئــەم کارە دەچێتە نێــو چاکەکــردن لەگەڵیاندا، چونکــە حەقی خوا لە پێشــی حەقی هەمــوو کەســێکەوەیە، وە {لاَ طَاعَـةَ لِمَخْلُوقٍ فِي مَعْصِيَةِ

الْخَالِقِ} (رَوَاهُ أَحْمَد: ٢٠٦٧٢، قَالَ شُعيب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَينِ)، واتـە: گوێڕایەڵـی بـۆ بەدیهێنراو نیە لـە سـەرپێچی بەدیهێنەردا.

نەیفەرمـووە: (وإن جاهـداك علـى أن تـشرك بي مـا ليـس لـك بـه علـم فعقهـا)، واتـە: ئەگـەر ئەوپـەڕی هەوڵیانـدا هاوبەشـم بۆ دابنێیت کـە هیچ زانیاریەکـت پێی نیە ئـەوە ئازاریان بدە. بەڵکـو فەرموویەتـی: ﴿ فَلَا تُطِعْهُمَا ﴾ واتە: (گوێڕایەڵیـان مەکە) بە هاوبەشـدانان، بەڵام بـەردەوام بە لەسـەر چاکە کـردن لەگەڵیانـدا، لەبـەر ئەمە فەرموویەتـی: ﴿ وَصَاحِبْهُمَا فِي ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا ﴾ واتـە: بـە چاکی هاوڕێیەتیـان بکە، بەڵام شـوێنکەوتنیان بـەو حاڵەی کە لەسـەر کوفـرو سـەرپێچین ئـەوە شـوێنیان مەکـەوە ﴿ وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَيَّ ﴾ (واتە: شـوێنی ڕێبـازی کەسـێک بکـەوە کـە گەڕاوەتـەوە بـۆ لای مـن) ئەویـش بڕوادارانـە بە خـواو فریشـتەکانو کتێبـەکانو پێغەمبەرانـە، ئەوانـەی ملکەچـی پەروەردگاریـان بوونو گوێڕایەڵیـان کـردوە، وە شـوێنکەوتنی ڕێبازیـان ئەوەیـە شـوێنیان بکـەویت لـە گەڕانـەوە بـۆ لای خـوا، ئەویـش ڕاکێشـانی دڵو ئیرادەیـە بـۆ لای، ئنجـا بـە دوایـدا بـە ئەندامانـی جەسـتەی بەندایەتـی بـکات، بـەوەی خـوا پێـی ڕازیـەو لێی نزیـک دەبێتـەوە، ﴿ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ ﴾ (پاشـان گەڕانەوەتـان بـۆ لای منە)، گوێڕایـەڵو سـەرپێچیکارو جگە لەوانیش ﴿ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ هیـچ لـە خـوا ناشـاردرێتەوە لـە کردەوەکانیـان، ﴿ يَٰبُنَيَّ إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ ﴾ کـە بریتیـە لـە بچووکترینیـانو بـێ قیمەترینیـان ﴿ فَتَكُن فِي صَخْرَةٍ ﴾ واتـە: بکەوێتـە ناوەڕاسـتی ﴿ أَوْ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَوْ فِي ٱلْأَرْضِ ﴾ لـە هـەر جێگایـەک لـە جێگاکانـی ئاسـمانو زەوی ﴿ يَأْتِ بِهَا ٱللَّهُ ﴾ (خـوا دەیهێنـێ) بـە هـۆی فراوانی زانسـتیو تـەواوی لێزانینیو تەواوی دەسـەڵاتی، لەبـەر ئەمەیە فەرموویەتـی: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ ﴾ واتـە: وردبینـە لـە زانسـتو شـارەزاییدا، تەنانەت ئاگـادارە بـە ناوەڕۆکـی نهێنییـەکانو شـاراوەیی دەشـتی چـۆڵو دەریاکان.

مەبەسـت لەمـەدا هاندانـە لە سـەر هەسـتکردن بـە چاودێـری خـوا، وە گوێڕایەڵـی کردنی هەرچـی لـە توانـادا بـێ، وە ترسـاندن لە کـردەوەی ناشـرینو قیـزەون کەم بێ یـان زۆر.

﴿ يَٰبُنَيَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾ هانیـداوە لەسـەر نوێـژ، وە تایبەتـی کـردوە چونکـە نوێـژ گەورەترینـی ئـەو پەرستشـانەیە کـە بـە جەسـتە دەکرێـن ﴿ وَأْمُرْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱنْهَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ﴾ (واتـە: فەرمـان بـە چاکە بکـەو ڕێگری بکە لـە خراپە) ئەویش ئـەوە دەگەیەنێ زانسـتی هەبـێ بـە چاکە تـا فەرمانی پێ بـکات، وە زانسـتی هەبێ بـە خراپە تـا ڕێگری لێ

بـکات، وە فەرمـان کـردن بـەوەی کە تـەواو نابـێ فەرمان بە چاکـە، وە قەدەغـە کردن لە خراپـە تەنهـا بـەوە نەبێ، لـە نەرمو نیانـیو خۆراگرتـن، وە بێگومـان بەڕوونی باسـیکردوە لە فەرمایشـتی خۆیـدا، وەک فەرموویەتی: ﴿وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ﴾ (واتـە: خۆراگرو بە ئارامبە لەسـەر هەر بەڵاو ناخۆشـیەک تووشـت دێ) لـەو ڕووەی کە خۆی بکـەری فەرمان بـە چاکەیـەو دوور دەکەوێتەوە لەوەی قەدەغە کـراوە، ئەمە تەواوکردنـی نەفسو دەروونی لەخـۆ دەگـرێ، لە کاری چاکـەو وازهێنان لـە خراپـە، وە تەواوکردنی جگە لە خۆیشـی لە خۆدەگـرێ بـە فەرمـان پێکردنو قەدەغـە کردنی.

وە کاتـێ زانـرا کـە بێگومـان هـەر دەبـێ تووشـی بـەڵاو ناڕەحەتی ببـێ کاتـێ فەرمانو قەدەغـە دەکات، چونکـە لـە فەرمـانو قەدەغـە کردندا ناڕەحەتیـەک هەیە لە سـەر نەفسو دەروون، بۆیـە خـوا فەرمانـی پێکـردوە بـە ئارامگرتن لـە سـەری، فەرموویەتی: ﴿وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ إِنَّ ذَٰلِكَ﴾ ئـەوەی کـە لوقمان ئامۆژگـاری کوڕەکـەی پێکردوە ﴿مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ﴾ لـەو کارە گەورانەیە کە خوا پێویسـتی کـردوەو گرنگی پێداوە، وە سـەرکەوتوو نابـێ تەنهـا خاوەنانی عـەزم نەبێ.

﴿وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ﴾ واتـە: ڕوو وەرمەگێـڕە، وە ڕوومەتـت بـەڕووی خەڵکـدا گرژ مەکـە بـە جـۆرێ خـۆت لـەوان بـە گەورەتـر بزانـی ﴿وَلَا تَمْشِ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَحًا﴾ واتە: بە لـووت بەرزیو فەخرو شـانازی بـە نیعمەتەکانەوە (مـەڕۆ بە زەویدا) پێـدەری نیعمەتەکانت بیر بچێو سـەرت سـوور بمێنێ بە نەفسو دەروونـت، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ﴾ لـە نەفـسو دەروونو شـێوازو خـۆ بە گـەورە زانینیدا ﴿فَخُورٍ﴾(شـانازی) بە قسـەکانی ﴿وَٱقْصِدْ فِى مَشْيِكَ﴾ واتـە: لـە ڕۆیشـتنتدا لەسـەرخۆبە، نـەک بـە لـووت بـەرزیو خۆ بەزلزانیـەوە ڕێبکەیـت ﴿وَٱغْضُضْ مِن صَوْتِكَ﴾ وەکـو ئەدەبێک لەگەڵ خەڵکـیو لەگەڵ خـوادا ﴿إِنَّ أَنكَرَ ٱلْأَصْوَٰتِ﴾ ناشـرینترینو ناخۆشـترین دەنگـەکان ﴿لَصَوْتُ ٱلْحَمِيرِ﴾ (دەنگـی گوێدرێـژە) جـا ئەگەر لە دەنگی بـەرزدا سـوودو بەرژەوەندیـەک هەبووایە، ئەوە تایبـەت نەدەکـرا بـە گوێدرێژەوە کـە نزمیو گێـژیو دەبەنگـی زانراوە.

ئەو وەسـیەتانە کـە لوقمان وەسـیەتی پێکرد بـە کوڕەکـەی، دایکی هەمـوو حیکمەتەکانە، وە ئەوەیشـی باسـی نەکـردوە لەمەدا خـۆی دەبینێتەوە، وە هەر وەسـێتێک شـتێکی ئەو تۆی خراوەتـە پـاڵ کـە بانـگ بـکات بـۆ ئەنجامدانی ئەگـەر فەرمان بـێ، وە بـۆ وازهێنـان لێی ئەگـەر قەدەغـە کـراو بـێ، ئەمـە بەڵگەیە لەسـەر ئـەوەی کە باسـمان کـرد لە تەفسـیری

(وشـەی) حیکمەتـدا، ئەویـش زانسـتە بە حوکـمو بڕیارو حیکمەتو شـتە پەسـندەکان.
فەرمانـی پێکـردوە بـە بنەمـای ئاین کـە ئەویـش یەکتاپەرسـتیە، وە قەدەغەی لێکـردوە بە هاوبەشـدانان، وە هـۆکاری پێویسـت بوونـی وازهێنان لـە هاوبەشـدانانی ڕوون کردۆتەوە، وە فەرمانـی پێکـردوە بـە چاکـە لەگـەڵ دایـکو باوکـدا، وە هـۆکاری پێویسـتی بـاس کـردوە بـۆ چاکـە کـردن لـە گەڵیانـدا، وە فەرمانـی کـردوە بـە سوپاسـگوزاری خـۆیو سوپاسـگوزاری دایـکو باوکـی، پاشـان فەرمانی کـردوە بە چاکـە کردن لەگـەڵ دایکو بـاوکو گوێڕایەڵـی فەرمانەکانیـان بـە مەرجـێ فەرمان بە سـەرپێچی نەکەن، بـەڵام ئەگەر فەرمانیـان بـە سـەرپێچی کـرد ئەوە نابـێ ئازاریـان بـدات، بەڵکو دەبـێ چاکەیـان لەگەڵدا بـکات، ئەگەرچـی گوێڕایەڵیان نـاکات ئەگەر هەوڵیـان لەگەڵیدا هاوبەش بۆ خـوا دابنێ، وە فەرمانـی پێکـردوە بـە چاودێری کردنی خـواو ترسـاندوویەتی بەوەی دەگەڕێتـەوە بۆ لای، هیـچ کردەوەیەکـی بچـووکو گـەورەی بەجێنەهێشـتووە لە خێرو شـەڕ تۆمـاری کردوە.
وە قەدەغـەی لێکـردوە لـە خۆبـەزل زانیـنو فەرمانـی پێکـردوە بـە خـۆ بەکـەم زانین، وە قەدەغـەی لێکـردوە لە فشـە کردنو شـەڕو خراپە، وە فەرمانـی پێکردوە بە لەسـەرخۆیی لە جوڵـەو قسـەکردندا، وە پێچەوانـەی ئەوەی قەدەغـە کردوە.
فەرمانـی پێکـردوە بە کاری چاکـەو ڕێگری لێکردوە لە کاری خراپـە، وە بەجێهێنانی نوێژو ئارامگرتـن، کـە بـەو دووانە هەمـوو کارێک ئاسـان دەبێت، هـەر وەکو خـوا فەرموویەتی، حەقـی خۆیەتـی کەسـێک ئـەم ئامۆژگاریانـە بـکات تایبـەت بێت بـە حیکمـەتو پێی بە ناوبانـگ بێـت، لەبەر ئەمە لـە منەتی خوا بەسـەریەوە، وە لەسـەر هەموو بەندەکانـی، ئەوەیە حیکمەتەکانـی بۆیـان باس کـردوە، تا ببێتە پێشـەواو سەرمەشـقێک بۆیان.

أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَأَسْبَغَ
عَلَيْكُمْ نِعَمَهُ ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً ۗ وَمِنَ النَّاسِ مَن يُجَادِلُ فِي اللَّهِ
بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَابٍ مُّنِيرٍ ﴿٢٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا
مَا أَنزَلَ اللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا ۚ أَوَلَوْ كَانَ
الشَّيْطَانُ يَدْعُوهُمْ إِلَىٰ عَذَابِ السَّعِيرِ ﴿٢١﴾ ۞ وَمَن يُسْلِمْ
وَجْهَهُ إِلَى اللَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ ۗ
وَإِلَى اللَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ ﴿٢٢﴾ وَمَن كَفَرَ فَلَا يَحْزُنكَ كُفْرُهُ ۚ
إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ فَنُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ
﴿٢٣﴾ نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلًا ثُمَّ نَضْطَرُّهُمْ إِلَىٰ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴿٢٤﴾
وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ ۚ قُلِ
الْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٥﴾ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ
وَالْأَرْضِ ۚ إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ ﴿٢٦﴾ وَلَوْ أَنَّمَا فِي الْأَرْضِ
مِن شَجَرَةٍ أَقْلَامٌ وَالْبَحْرُ يَمُدُّهُ مِن بَعْدِهِ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ
مَّا نَفِدَتْ كَلِمَاتُ اللَّهِ ۗ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٧﴾ مَّا خَلْقُكُمْ
وَلَا بَعْثُكُمْ إِلَّا كَنَفْسٍ وَاحِدَةٍ ۗ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ ﴿٢٨﴾

(٢٠-٢١): ﴿ أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُ ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً ۗ وَمِنَ النَّاسِ مَن يُجَادِلُ فِي اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَابٍ مُّنِيرٍ ﴿٢٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا ۚ أَوَلَوْ كَانَ الشَّيْطَانُ يَدْعُوهُمْ إِلَىٰ عَذَابِ السَّعِيرِ ﴿٢١﴾ ﴾:

خوا ﷻ منەت دەکات بەسەر بەندەکانیدا، وە بانگیان دەکات بۆ سوپاسگوزاریو بینینیو بیئاگایی لێی، جا فەرمووی: ﴿ أَلَمْ تَرَوْا ﴾ واتە: (ئایا) نەتانبینیوە بە چاوو دڵەکانتان ﴿ أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ ﴾ (واتە: بەڕاستی خوا ڕامی هێناوە بۆتان ئەوەی لە ئاسمانەکانە) لە خۆرو مانگو ئەستێرەو هەموو ڕامهێنراون بۆ سوودی بەندەکان.

﴿ وَمَا فِي الْأَرْضِ ﴾ (واتە: ئەوەشی لە زەویدایە) لە گیانلەبەرانو دارو درەختو کشتو کاڵو دەریاو کانزاو وێنەی ئەوان، هەروەکو فەرموویەتی: ﴿ هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ﴿٢٩﴾ ﴾البقرة. (واتە: ئەو زاتە بۆ ئێوەی دروستکردوە هەموو ئەوانەی لە ناو زەویدایە).

﴿ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ ﴾ واتە: هەمووتانی گرتوەتەوەو دایپۆشیون ﴿ نِعَمَهُ ﴾ (نیعمەتە) دیارو ئاشکراو پەنهانو نادیارەکانی، ئەوانەی پێی دەزانینو ئەوانەشی شاراوەیە لەلامان، نیعمەتی دونیاو دین، بەدەستهێنانی سوودەکانو لابردنی زیانەکان، پیشەتان ئەوەیە هەستن بە سوپاس کردنی خوا لەسەر ئەم نیعمەتانە، بە خۆشویستنیو ملکەچ بوونی، وە بەکارهێنانی بۆ یارمەتیدان لەسەر گوێڕایەڵی خوا، وە نابێ بیکاتە یارمەتیدەر بۆ سەرپێچی کردن.

بەڵام لەگەڵ یەک لە دوای یەکی ئەم نیعمەتانەدا ﴿ وَمِنَ النَّاسِ مَن ﴾ (هەندێ لە

خەڵکی) سوپاسی نەکردوە، بەڵکو بێبڕوایی کردوە، وە بێبڕوایشی بەوە کردوە کە دایبارانـدوە بەسەریدا، وە ئینکاری حەقی کردوە کە کتێبەکانی پێ ناردوەو پێغەمبەرانی پێ ڕەوانە کردوە، ئەو کەسە ﴿يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ﴾ واتە: دەمە دەمێ لە پووچو بەتاڵ دەکات بۆ ئەوەی بەرپەرچی حەقی پێبداتەوە، وە ئەو پەیامەی پێ ڕەت بکاتەوە کە پێغەمبەر ﷺ پێی هاتووە، لە فەرمانکردن بە بەندایەتی خوای تاکو تەنها، ئەم دەمەدەمێکارە لەسەر بەرچاو ڕوونی نیە، مشتو مڕی لە زانستەوە سەرچاوەی نەگرتوە تا وازی لێ بهێنرێ خۆی کاری خۆیو لە قسەکانی ببورێت ﴿وَلَا هُدًى﴾ بە هۆیەوە شوێنی هیدایەت دراوان بکەون، ﴿وَلَا كِتَٰبٍ مُّنِيرٍ﴾ نە ڕوونکەرەوەی حەقە، نە بەجێیە، نە گوازراوەتەوە، نە پەیڕەوی پەیڕەوکارانی کردوە.

بەڵکو دەمەدەمێی لە ئایەتەکانی خوا بونیات نراوە لەسەر پەیڕەو کردنی باوباپیرە هیدایەت نەدراوەکانیان، بەڵکو گومڕاو گومڕاکەر بوون، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ (کاتێ پێیان بوترێ شوێنی ئەو ئاینە بکەون خوا ناردوویەتیە خوارەوە) لە سەر دەستی پێغەمبەرانی، بێگومان ئەوە حەقە، وە بەڵگەی ئاشکرایان بۆ ڕوون بکرێتەوە ﴿قَالُواْ﴾ بەرهەڵستی دەکەنو دەڵێن: ﴿بَلْ نَتَّبِعُ مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآ﴾ واز لەوە ناهێنین باوو باپیرانمان لە سەری دەڕۆیشتن بۆ قسەی هیچ کەسێ، جا ئەو کەسە هەرکێ بێت.

خوا ﷻ بەرپەرچی ئەوانو باوباپیرانیانی داوەتەوەو فەرموویەتی: ﴿أَوَلَوْ كَانَ ٱلشَّيْطَٰنُ يَدْعُوهُمْ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ﴾ (واتە: ئەگەرچی شەیتان بانگیان بکات بۆ سزای هەڵگیرساوی ئاگری دۆزەخ) باوو باپیرانیان بە دەمیەوە دەچنو بەشوێنیدا دەڕۆن، وە دەبن بە یەکێک لە خوێندکارەکانی شەیتان، شڵەژان دەستیان بەسەردا دەگرێ، ئایا ئەمە ئەوە دەخوازێ شوێنیان بکەونو بەڕێگای ئەواندا بڕۆن، یان ئەوە دەیانترسێنێ لە گرتنەبەری ڕێگاکانیان، وە بانگیان دەکات لە سەر گومڕاییان وە گومڕایی ئەوەی شوێنیان دەکەوێ.

بانگەوازی شەیتان بۆ ئەوانو باوو باپیرانیان لە بەر خۆشەویستیو سۆز نیە بۆیان، بەڵکو لەبەر دوژمنکاریو فێڵکردنە لێیان، لە ڕاستیدا شوێنکەوتووانی لە دوژمنانی ئەون، ئەوانەی زاڵ بووە بەسەریانداو چاوی بەوە ئۆقرە دەگرێ شایستەی سزای هەڵگیرساوی دۆزەخ بن، بەهۆی بەدەمەوە چوونی بانگەوازەکەی.

(٢٢-٢٤): ﴿ وَمَن يُسْلِمْ وَجْهَهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ ۗ وَإِلَى ٱللَّهِ عَـٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ ﴿٢٢﴾ وَمَن كَفَرَ فَلَا يَحْزُنكَ كُفْرُهُۥٓ ۚ إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ فَنُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٢٣﴾ نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلًا ثُمَّ نَضْطَرُّهُمْ إِلَىٰ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴿٢٤﴾ ﴾

﴿ وَمَن يُسْلِمْ وَجْهَهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ ﴾ واتە: ملکەچی بێو گوێڕایەڵی بکات بە ئەنجامدانی شەریعەتەکان، دڵسۆزیێ بۆ ئاینەکەی ﴿ وَهُوَ مُحْسِنٌ ﴾ (چاکە کاربێ) لەو ئیسلامەدا، بەوەی کردەوەکانی بە پێی شەریعەت بێو شوێنی پێغەمبەر ﷺ کەوتبێ، یان: هەر کەسێ بەڕاستی ڕووبکاتە خوا بە ئەنجامدانی هەموو عیبادەتەکان، وە بەچاکی ئەنجامیان بدا بەوەی بەندایەتی خوا بکات وەک ئەوەی دەیبینێ، جا ئەگەر ئەو خوا نەبینێ بێگومان خوا ئەو دەبینێ، یان: هەر کەسێ ڕووبکاتە خوا بە بەجێهێنانی مافەکانی، وە ئەو چاکەکاربێ لەگەڵ بەندەکانی خوادا، وە مافەکانیان بەجێ بێنێ، ماناکان پەیوەستن بە یەکترەوە، جیاوازی لە نێوانیاندا نیە، تەنها لە ڕووی جیاوازی هاتنی وشەکانەوە، ئەگەرنا هەموویان یەکدەنگن لەسەر بەجێهێنانی سەرجەم دروشمەکانی ئاین، بەجۆرێ ڕێکو پێکو تەواو بێ، هەرکەسێ ئەوەی ئەنجامدا ئەوە سەلامەتە ﴿ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ ﴾ واتە: بەو پەتەی کە هەرکەسێ دەستی پێوە بگرێ بە بەهێزی ڕزگاری دەبێو سەلامەت دەبێ لە لەناوچوون، وە سەرکەوتوو دەبێ بە هەموو خێرو چاکەیەک.

هەر کەسێک بە ڕاستی ڕوونەکاتە خوا، یان چاکەکار نەبێ ئەوە دەستی نەگرتووە بە پەتی بەهێزەوە، وە ئەگەر دەست نەگرێ بەو پەتە بەهێزە، ئەوە دەبێ لەناو بچێ، ﴿ وَإِلَى ٱللَّهِ عَـٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ ﴾ واتە: گەڕانەوەو سەرەتاو کۆتایی (هەموو کارێک تەنها بۆ لای خوایە)، جا حوکمو بڕیار دەدات لە نێوان بەندەکانیدا پاداشتیان دەداتەوە بە پێی کردەوەکانیان، وە سەرەنجامیان پێیان دەگات، دەی با خۆیان ئامادە بکەن بۆ ئەو کارە، ﴿ وَمَن كَفَرَ فَلَا يَحْزُنكَ كُفْرُهُۥٓ ﴾ (واتە: وە هەر کەس بێبڕوا بوو با بێبڕواییە کەی خەفەتبارت نەکات، چونکە ئەوەی لە سەرشانتە لە بانگەوازو گەیاندن درێغیت نەکردوە، جا ئەگەر هیدایەت وەرنەگرێ، ئەوە بێگومان تۆ پاداشتت لەلای خوایە، بۆیە هیچ جێگایەک نەماوەتەوە بۆ خەمباری لەسەر نەبوونی هیدایەتی، چونکە ئەگەر خێری تێدا بوایە خوا هیدایەتی دەدا.

هەروەها خەمبار مەبە لەسەر ئەوەی ئەوان بوێریان کرد بەرانبەرت بە دژایەتی، وە جەنگیان لەگەڵا کردووی، بەردەوام بوون لەسەر گومڕایی‌و بێبڕواییان، وە بۆیان

مەسـوتێ بە هـۆی ئەوەی ئـەوان بە پەلە سـزا نـەدراون، چونکە بێگومـان ﴿إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ فَنُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوٓاْ﴾ (واتـە: گەڕانەوەیـان تەنهـا بـۆلای ئێمەیـە ئنجـا هەواڵیـان دەدەینـێ بـەوەی کردوویانە) لـە بێبڕوایی‌و دژایەتی کردنیـان، وە هەوڵدانی تەواویـان بۆ کوژانەوەی ڕووناکـی خـواو ئازاردانی پێغەمبەرەکـەی ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ واتە: بە ڕاسـتی خـوا ئاگـادارە بـەوەی لەنـاو دڵەکاندایـە، ئـەوەی کـە دەریـان نەبڕیـوە، چ جـای ئـەوەی ئاشـکرایان نەکـردوەو دیـارە؟! ﴿نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلًا﴾ (کەمـێ نازونیعمەتیـان پـێ دەدەین) لـە دونیـادا، بـۆ ئـەوەی تـاوان زیاتـر بکەن‌و سـزایان بـۆ ئامـادە بـێ ﴿ثُمَّ نَضْطَرُّهُمْ﴾ واتـە: ناچاریـان دەکەیـن ﴿إِلَىٰ عَذَابٍ غَلِيظٍ﴾ واتـە: گەیشـتۆتە ئەوپەڕی لـە مەزنی‌و گەورەیـی‌و ئێش‌و ئـازاری.

(٢٥-٢٨): ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۚ قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٥﴾ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿٢٦﴾ وَلَوْ أَنَّمَا فِى ٱلْأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَٰمٌ وَٱلْبَحْرُ يَمُدُّهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَّا نَفِدَتْ كَلِمَٰتُ ٱللَّهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٧﴾ مَّا خَلْقُكُمْ وَلَا بَعْثُكُمْ إِلَّا كَنَفْسٍ وَٰحِدَةٍ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ﴿٢٨﴾﴾:

﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم﴾ ئەگـەر پرسـیار بکـەی لـەو بتپەرسـتانەی کـە هـەق بـە درۆ دەزانن ﴿مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ﴾ (کـێ ئاسـمانەکان‌و زەوی دروسـت کـردوە؟) ئـەوە دەزانـن بتەکانیـان هیـچ شـتێکیان لەوانـە دروسـت نەکـردوە، بـە پەلـە دەڵێـن: خـوا ئەو زاتەیـە بەتـاک‌و تەنهایـی دروسـتی کـردوون، ﴿قُلِ﴾ پێیان بڵـێ‌و پەیوەسـتیان بکە، وە بیانوویـان ببـڕە بـەوەی کـە دانیـان پێدانـاوە لەسـەر ئـەوەی ئینکاریان کـردوە ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ﴾ ئـەو زاتـەی کـە ڕووناکـی ئاشـکرا کـردوە، وە نموونـەی دەرخسـتووە لـە نەفس‌و دەروونـی خۆتـان، جـا ئەگـەر بزانـن ئـەوە دان دەنێـن بـەوەدا، ئـەو کەسـەی کـە تاک‌و تەنهایـە لـە دروسـتکردن‌و بەڕێوەبردنـدا، تەنها ئـەو دەبێ بەتـاک‌و تەنها بپەرسـترێ، بەڵام ﴿أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ لەبـەر ئەوە هاوبەشـیان بـۆ خوا دانـا، وە ڕازیبـوون پێچەوانەی ئـەوە بجوڵێنـەوە کە لەسـەری بـوون، لـەڕووی دەستەوسـانی‌و گومانـەوە، نەک لـە ڕووی بەرچـاو ڕوونی.

پاشـان لـەم دوو ئایەتەدا باسـی نموونـە هێنانەوەی کردوە لـە فراوانی وەسـفەکانی، بۆئەوەی بانگـی بەندەکانـی بکات بۆ ناسـین‌و خۆشویسـتنی، وە بە دڵسـۆزیەوە بیپەرسـتن، جا باسـی

بەرفراوانـی موڵـکو دەسـەڵاتی کـردوە کە هەمـوو ئەوانەی لەنـاو ئاسـمانەکانو زەویدان -ئەمـەش هەمـوو جیهانی سـەروو خـوارەوە دەگرێتەوە- موڵکی ئـەون، کاروباریـان بەڕێوە دەبـات بـە حوکمـی دەسـەڵاتی قـەدەری، وە حوکمـە فەرمـان پێکراوەکانـی، وە حوکمە پاداشـتیەکانی، هەموویـان بەندەو کۆیلـەو ژێربار خـراون، هیچ دەسـەڵاتێکیان نیە، خوا ﷻ دەوڵەمەنـدی بێنیـازە، پێویسـتی بـەوە نیـە کـە یەکێـک لـە بەدیهێنراوەکانی پێویسـتی پێ دەبـێ، ﴿مَآ أُرِيدُ مِنۡهُم مِّن رِّزۡقٖ وَمَآ أُرِيدُ أَن يُطۡعِمُونِ ٥٧﴾الذاریـات، (واتـە: مـن هیـچ ڕۆزیەکـم نـاوێ لێیـان ناشـمەوێ خواردەمەنیـم بدەنـێ).

بە ڕاسـتی کـردەوەی نێـردراوانو پێغەمبەرانو شـەهیدانو پیاوچاکان هیچ سـوودێ بە خوا ناگەیەنـێ، بەڵکـو سـوود بەو کەسـانە دەگەیەنێ کە ئەنجامیـان داوە، خوا بێنیـازە لەخۆیانو کردەوەکانیـان، لـە دەوڵەمەنـدی خـوا ئەوەیـە دەوڵەمەنـدو هـەژاری کـردوون لـە دونیاو دوارۆژدا، پاشـان خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات دەربـارەی حەمـدو ستایشـکردنی، ستایشـکردن لـە تایبەتمەندیەکانـی ئـەو زاتەیـە، ئـەو خوایـە ستایشـکراوە لە هەمـوو ڕوویەکـەوە، ئەو ستایشـکراوە لـە خودیـدا، وە ستایشـکراوە لـە سـیفاتیدا، وە هـەر سـیفەتێ لە سـیفەتەکانی شایسـتەی تەواوتریـن ستایشـکردنە، چونکـە سـیفاتی مەزنو تـەواون، وە هەمـوو ئەوانەی دەیـکاتو دروسـتی کـردوە سـتایش دەکـرێ لـە سـەری، وە هەمـوو ئەوانـەی فەرمانـی پێکـردووەو قەدەغـەی لێکـردوە ستایشـکراوە لەسـەری، وە هەمـوو ئەوانەی بڕیـاری پێداوە دەربـارەی بەندەکانـیو لـە نێوانیاندا لـە دونیاو دوارۆژ ستایشـکراوە لەسـەری.

پاشـان هـەواڵ دەدات دەربـارەی فراوانـیو مەزنـی وتەکانی، بـە جۆرێ دەگات بـە دڵەکان بـە ئەوپـەڕی گەیشـتنو عەقڵەکانی پـێ ڕوونـاک دەبێتەوە، وە پێی سەرسـام دەبـن، وە لە ناسـینیدا ئارامـی دەبەخشـێ بەوانـەی خاوەن ژیـریو بەرچـاو ڕوونیـن، جـا فەرموویەتی: ﴿وَلَوۡ أَنَّمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ مِن شَجَرَةٍ أَقۡلَٰمٞ﴾ (واتـە: بێگومـان ئەگـەر هەرچـی درەخـت لـە زەویدایـە قەڵەمو پێنوس بێ) پێی بنووسـرێ ﴿وَٱلۡبَحۡرُ يَمُدُّهُۥ مِنۢ بَعۡدِهِۦ سَبۡعَةُ أَبۡحُرٖ﴾ (هەمـوو دەریـای زەوی بێتــە مرەکەب) حەوت دەریـای تر دوای ئەوەی کە باسـکرا بێت بــە مرەکـەب، ئەوە پێنوسـەکان دەشـکێنو مرەکەبـەکان تەواو دەبن، هێشـتا تـەواو نەبووە ﴿كَلِمَٰتُ ٱللَّهِ﴾ (وتەکانـی خـوا)، ئەمـە زێدەڕۆیی نیە کە هیـچ حەقیقەتێکی نەبـێ، بەڵکو کاتـێ خـوا زانیویەتـی عەقڵـەکان کـورت بینن لـە دەوردانـی هەندێ لـە سـیفاتەکانی، وە زانیویەتـی ناسـینی بـۆ بەندەکانی چاکترینی ئـەو نیعمەتانەیە کە دایباراندوە بەسـەریاندا، وە

گەورەتریـن دەسـتکەوتە بەدەسـتیان هێنابـێ، ئەویـش وەکو خۆی بەدەسـت نایـەت، بەڵام ئەگـەر هەمووی بەدەسـت نەیـە واز لە هەمـووی ناهێنرێ، خـوا ئاگـاداری کردوونەتەوە بە ئاگـادار کردنەوەیـەک، دڵەکانیان پـێ ڕووناک دەبێتەوەو سـنگیان پـێ دەکرێتەوە، ئەوەی پێـی گەیشـتوون دەیکـەن بە بەڵگە بۆ ئـەوەی پێی نەگەیشـتوون، وە دەڵێـن هەروەکو چۆن بەرێزتریـنو زاناترینیـان بـە پەروەردگاری وتـی: (لاَ نحْـصِي ثَنَاءً عَلَيْـكَ أَنْـتَ كَمَا أَثْنَيْـتَ عَلَى نَفْسِكَ) واتـە: ئێمـە ناتوانین ستایشـکردنت بژمێرین هەروەکو چۆن خۆت ستایشـی نەفسـی خـۆت دەکەیـەت. ئەگەرنا کارەکە لـەوە مەزنتـرو گەورەترە.

ئەمـە نموونـە هێنانەوەیـە لە بابەتـی نزیک کردنـەوەی مانا -کە لـە توانادا نیـە پێی بگات- بـۆ تێگەیانـدنو بیرکردنـەوە، ئەگەرنـا داروو درەختـەکان ئەگـەر چەنـد قـات زیاتـر بن لـەوەی کـە باسـکرا، وە دەریاکانیـش ئەگـەر چەنـد فراوانتر بن لـەوەی کە باسـکرا، ئەوە بێگومـان بـە بیـردا دێ نەمێنـنو کۆتاییان پێ بـێ، چونکـە هەموویـان بەدیهێنراون.

بـەڵام کەلامـی خـوا کۆتایـی پێهێنانـی بەبیـردا نایـە، بەڵکـو بەڵگـەی شـەرعیو عەقڵـی ڕێنمایـی کردوویـن کـە نـە تـەواو دەبـێو نـە کۆتایـی دێ، وە هەمـوو شـتێک کۆتایی دێ جگـە لـە خـواو سـیفاتەکانی، ﴿ وَأَنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴿٤٢﴾ ﴾النجم، (واتـە: بە ڕاسـتی هەمـوو کارێـک سـەرەنجامەکەی هـەر بـۆ لای پەروەردگـارت دەگەڕێتـەوە) جـا ئەگەر عەقـڵ بیـری لـە حەقیقەتو ڕاسـتی یەکەمـی خواو کۆتایـی بکاتـەوە، بێگومان هەر شـتێ بیـرو هـۆش وایدانابـێ لـە کاتـە پێشـوەکان، هەرچۆن ئـەو وادانانـە یەک لـە دوای یەک بـێو هەڵسـەنگێرابێ، ئـەوە خـوا پێـش ئەوەیەو کۆتایـی بۆ نیـە، وە هەرچۆنـی بیرو هۆش عەقـڵ وادابنـێ لە کاتـە دواکەوتـەوەکان، هەرچۆن ئـەو وادانانە یـەک لەدوای یـەک بێو هەڵسـەنگێرابێ، وە هـاوکاری بـکات هەرکەسـێ بە دڵو زمانـی، ئەوە خوای گـەورە دوای ئەوەیـەو کۆتایـی نیە.

خـوا ﷻ لـە هەمـوو کاتەکانـدا بڕیـار دەداتو قسـەدەکات، وە چـی بـوێ ئەنجامـی دەدا، وە ئەگـەر ویسـتی هەبـوو هیـچ ڕێگریـەک لەبـەردەم گوفتـارو کردارەکانیـدا نیـە، جـا ئەگـەر عەقـڵ ئـەوەی بـۆ دەرکـەوتو لێی تێگەیشـت، بـۆی دەردەکـەوێ ئـەو نموونەی خـوا هێناویەتیـەوە دەربـارەی کەلامی بـۆ ئەوەی بەنـدەکان تۆزە تـۆزە بزانـن، وە ئەگەرنا کارەکـە زۆر لـەوە مەزنتـرە، پاشـان باسـی گەورەیـی دەسـەڵاتو تـەواوی حیکمەتـی دەکات، فەرموویەتـی: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾ واتـە: خـاوەن هەمـوو دەسـەڵاتێکە، کە

هەرچـی لـە جیهانی سـەروو خوارەوەیـە لە هێزو دەسـەڵات تەنها هـی ئەوە، بەخشـیویەتی بـە دروسـتکراوەکان، هیـچ هێـزو توانایـەک نیـە تەنهـا بـە هێـزو توانای ئـەو نەبـێ، وە بـە دەسـەڵاتی زاڵـە بەسـەر هەمـوو دروسـتکراوەکانداو کاروباریـان بەڕێوە دەبـات، وە بە حیکمـەتو دانایـی بەدیهێنراوەکانی هێناوەتە بـوون، وە هەر بە حیکمەت دەسـتی پێکردوە، وە ئامانـجو مەبەسـت تێیدا حیکمەتـە، بە هەمان شـێوە فەرمانو قەدەغەکـردن، بە حیکمەت هاتۆتـە بـوون، وە ئامانـجو مەبەسـت تیایـدا حیکمەتـە، ئەو خوایـە کار دروسـتو خاوەن حیکمەتە لە دروسـتکردنو فەرمانیدا، پاشـان باسـی مەزنی تواناو دەسـەڵاتو کەماڵی خۆی کـردوە، وە بێگومان نابێ عەقـڵ وابیر بکاتەوە، جـا فەرموویەتی: ﴿ مَّا خَلْقُكُمْ وَلَا بَعْثُكُمْ إِلَّا كَنَفْسٍ وَاحِدَةٍ ﴾ (واتـە: دروسـتکردنی هەمووتانو زیندووکردنەوەتـان وەک تەنیا کەسـێک وایـە) ئەمە شـتێکە عەقڵـەکان سەرسـام دەکات، بەڕاسـتی دروسـتکردنی هەموو بەدیهێنـراوەکان -لەسـەر زۆریو زیندووکردنەوەیان دوای مـردنو دوای جیاکردنەوەیان لە یـەک چـاو تروکانـدا- وەک دروسـتکردنی نەفسـێک وایە بە لایـەوە، هیـچ ڕوویەک نیە لـە بەدوور تەماشـاکردنی زیندوو بوونەوەو پاداشـت لەسـەر کردەوەکان، مەگـەر نەفامی بە مەزنـیو تواناو دەسـەڵاتی خوا.

پاشـان باسـی بەرفراوانـی بیسـتنی کـردوە، بـە هەمـوو بیسـتراوەکان، وە بینینی بـە هەموو بینراوەکان، وەک فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ ﴾ (واتە: بەڕاسـتی خوا زۆر بیسـەری زۆر بینایە).


أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِىٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى وَأَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٢٩﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِ ٱلْبَٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ ﴿٣٠﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱلْفُلْكَ تَجْرِى فِى ٱلْبَحْرِ بِنِعْمَتِ ٱللَّهِ لِيُرِيَكُم مِّنْ ءَايَٰتِهِۦٓ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿٣١﴾ وَإِذَا غَشِيَهُم مَّوْجٌ كَٱلظُّلَلِ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ فَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا كُلُّ خَتَّارٍ كَفُورٍ ﴿٣٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمْ وَٱخْشَوْا۟ يَوْمًا لَّا يَجْزِى وَالِدٌ عَن وَلَدِهِۦ وَلَا مَوْلُودٌ هُوَ جَازٍ عَن وَالِدِهِۦ شَيْـًٔا إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴿٣٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا وَمَا تَدْرِى نَفْسٌۢ بِأَىِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌۢ ﴿٣٤﴾
سورة السجدة

(٢٩-٣٠): ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِىٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى وَأَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٢٩﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِ ٱلْبَٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ ﴿٣٠﴾ ﴾:

﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ ﴾ هەروەها ئەمەش تاكو تەنهایی خوا دەگرێتەوە لە هەڵسوكەوتو بەڕێوەبردندا، وە بەرفراوانی هەڵسوكەوتی بەجۆرێ شەو دەخاتە ناو ڕۆژو ڕۆژیش دەخاتە ناو شەو، واتە: هەندێكیان دەخاتە ناو ئەویترەوە، جا ئەگەر یەكێكیان یەكێكیانی خستە ناو ئەویترەوە ئەوی دیكەیان دەڕوات، وە خۆرو مانگی ڕامهێناوە هەر یەكەیان بە یاساو ڕێسای خۆی دەگەڕێت، لەو كاتەی دروستی كردوون كەمو كورتیان تێنەكەوتووە، بۆ ئەوەی بەو جۆرە بەرژەوەندیو سوودی بەندەكان تەواو بێ لە دینو دونیایاندا، وە بۆ ئەوەی پەندو سوودی لێوەربگرن ﴿ كُلٌّ ﴾ هەر یەكە لە خۆرو مانگ ﴿ يَجْرِىٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾ (تا ماوەیەكی دیاریكراو دەگەڕێن) ئەگەر ئەو ماوە دیاریكراوە هات ئەوە گەڕانیان دەپچڕێو كۆتایی پێ دێ، وە دەسەڵاتیان لەكار دەكەوێ ئەویش لە ڕۆژی دواییدا، كاتێ كە خۆر دەپێچرێتەوەو مانگیش دەكوژێتەوە، وە ژیانی دونیا كۆتایی پێ دێو ژیانی دوا ڕۆژ دەست پێدەكات، ﴿ وَأَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴾ لە خێرو شەڕ ﴿ خَبِيرٌ ﴾ هیچ شتێكی لێ شاراوە نیە لەوانە، وە پاداشتتان دەداتەوە لەسەر ئەو كردەوانە بە پاداشت دانەوە بۆ گوێڕایەڵانو سزادانی سەرپێچیكاران ﴿ ذَٰلِكَ ﴾ كە بۆی ڕوون كردوونەتەوە لە مەزنیو سیفاتەكانی بە ڕوونكردنەوە ﴿ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ ﴾ (بێگومان تەنها خوا ڕاستە) لە زاتی، وە لە سیفاتەكانی، وە ئاینەكەی حەقە، پێغەمبەرەكانی حەقن، پەیمانی حەقە، هەڕەشەی حەقە، وە بەندایەتی كردنی حەقو ڕاستە ﴿ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِ ٱلْبَٰطِلُ ﴾ (واتە: بەڕاستی ئەوەی هاواری لێدەكەنو دەیپەرستن

بێجگە لەخوا بەتاڵو ناڕاستە) لە زاتو سیفاتەکانیدا، جا ئەگەر خوا نەیهێنایەتە بوون هەرگیز نەئەهاتە بوون، وە ئەگەر یارمەتی خوا نەبووایە هەرگیز نەدەما، جا ئەگەر بەتاڵو پووچ بوو، ئەوە بەندایەتی کردنی پووچترو بێ ماناترە ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْعَلِىُّ﴾ بە زاتی، لەسەرووی هەموو بەدیهێنراوەکانەوەیە، ئەو زاتەی سیفاتەکانی ئەوەندە بەرزن کە بە هیچ جۆرێ لەگەڵ سیفاتی بەدیهێنراوەکاندا ناپێورێ، وە بەرزەو لەسەرووی بەدیهێنراوەکانیەتیو زاڵە ﴿ٱلْكَبِيرُ﴾ ئەو زاتەی خاوەن گەورەییە لە زاتو سیفاتەکانی، وە خاوەن گەورەییە لە دڵەکانی خەڵکی ئاسمانو زەوی.

(٣١-٣٢): ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱلْفُلْكَ تَجْرِى فِى ٱلْبَحْرِ بِنِعْمَتِ ٱللَّهِ لِيُرِيَكُم مِّنْ ءَايَٰتِهِۦٓ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿٣١﴾ وَإِذَا غَشِيَهُم مَّوْجٌ كَٱلظُّلَلِ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ فَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ ۚ وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا كُلُّ خَتَّارٍ كَفُورٍ ﴿٣٢﴾﴾:

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱلْفُلْكَ تَجْرِى فِى ٱلْبَحْرِ بِنِعْمَتِ ٱللَّهِ﴾ واتە: ئایا نەتبینیوە لە شوێنەوارەکانی دەسەڵاتو میهرەبانیو یارمەتی خوا بۆ بەندەکانی، کە دەریاکانی ژێربار کردوە، کە کەشتیەکان بەناویدا دەڕۆن بە فەرمانی قەدەری خوا، وە بە سۆزو چاکەکانی ﴿لِيُرِيَكُم مِّنْ ءَايَٰتِهِۦٓ﴾ کە سوودو بایەخدانی تێدایە، ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ﴾ ئەوان سوود لەم ئایەتانە وەردەگرن، ئارامگرن لەسەر ناڕەحەتی، سوپاسگوزارن لەسەر خۆشی، ئارامگرن لەسەر گوێڕایەڵی خواو و لەسەر پێچیکردنی، وە لەسەر قەزاو قەدەرەکانی، سوپاسگوزارن لەسەر نیعمەتی ئاینیو دنیایی، ئنجا خوا ﷻ باسی بارودۆخی خەڵکی کردوە کاتێ دەچنە ناو دەریاوە، وە شەپۆلەکان دایان دەپۆشن وەکو هەور بەسەریانەوە، ئەوان لەوکاتەدا هاوار لە خوا دەکەن بە دڵسۆزیەوەو ملکەچی دەبن ﴿فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ﴾ (ئنجا کاتێ خوا ڕزگاری کردن بۆ وشکانی) دەبن بە دوو دەستە:- هەندێکیان مامناوەندیە، واتە: بە شێوەیەکی تەواو هەڵنەساوە بە سوپاسگوزاری خوا، بەڵکو تاوانبارو ستەمکارە بەرانبەر نەفسی خۆی.

وە دەستەیەکی تریان بێبڕوایە بە نیعمەتەکانی خواو ئینکاریان دەکات، لەبەرئەمەیە فەرموویەتی: ﴿وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا كُلُّ خَتَّارٍ﴾ واتە: (کەس نیشانەکانی ئێمە ئینکار ناکات جگە لە) پەیمان شکێنێکی سپڵە، لە پەیمان شکێنی ئەو ئەوەیە پەیمانی بە خوا داوە، ئەگەر ڕزگارمان بکەی لەم دەریاو ناڕەحەتیە، ئەوە دەبین بە بەندەی سووپاسگوزار، بەلام غەدرو پەیمان شکێنی کرد، بەوەفا نەبوو بەرانبەر پەیمانەکەی ﴿كَفُورٍ﴾ بێبڕوا بوو بە نیعمەتەکانی خوا، ئایا شایستەی نیە بەوەی خوا ڕزگاری کردن لەم ناڕەحەتیە سوپاسگوزاری نیعمەتەکانی خوا بکەن؟

(٣٣): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْ وَٱخْشَوْاْ يَوْمًا لَّا يَجْزِى وَالِدٌ عَن وَلَدِهِۦ وَلَا مَوْلُودٌ هُوَ جَازٍ عَن وَالِدِهِۦ شَيْـًٔا ۚ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ۖ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴿٣٣﴾ ﴾:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْ وَٱخْشَوْاْ يَوْمًا ﴾ خوا ﷻ فەرمان دەکات بە خۆپارێزیو ترسان لێی کە ئەویش جێبەجێکردنی فەرمانەکانیو وازهێنان لە قەدەغەکراوەکانی دەگرێتەوە، وە داوای لێدەکات ئاورێک بدەنەوە لە ترسان لە ڕۆژی دوایی، ئەو ڕۆژە زۆر ناخۆشە کە هیچ کەسێ تیایدا خەمی هیچی نیە جگە لە نەفسو دەروونی نەبێ، وە ﴿ لَّا يَجْزِى وَالِدٌ عَن وَلَدِهِۦ وَلَا مَوْلُودٌ هُوَ جَازٍ عَن وَالِدِهِۦ شَيْـًٔا ﴾ (واتە: هیچ باوکێ تاوانی ڕۆڵەکەی هەڵناگرێو هیچ ڕۆڵەیەکیش شتێک لە تاوانی باوکی هەڵناگرێ) نە لە چاکەکانی زیاد دەکات نە لە خراپەکانی کەم دەکاتەوە، هەر کەسەو بەپێی کردەوەی خۆی، پاداشتیشی دەستەبەر دەبێ.

با ئاورێک لەم ڕۆژە سەختو ترسناکە بداتەوە، لەوەی بەندە بەهێز دەکاتو خۆپارێزی لەسەری ئاسان دەکات، ئەمە لە میهرەبانی خوایە بە بەندەکان، فەرمانیان پێدەکات بە ترسان لێی کە خۆشبەختیان لەوەدا دەبینرێتەوە، وە پەیمانی پێیان داوە لەسەری پاداشتیان بداتەوە، وە دەیانترسێنێ لە سزاو بێزاریان دەکات بە ئامۆژگاریو مەترسیەکان، ستایش بۆ تۆ ئەی پەروەردگاری جیهانییان.

﴿ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ﴾ (واتە: بێگومان بەڵێنی خوا حەقو ڕاستە) هیچ گومانێکتان تیایدا نەبێ، وە کارێ مەکەن وەک کاری ئەو کەسەی کە پەیمانی خوا بەڕاست نەزانێ، لەبەر ئەمە فەرموویەتی: ﴿ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ﴾ (واتە: کەواتە با ژیانی دونیا هەڵتان نەخەڵەتێنێ) بە جوانیو ڕازاوەییو ئەوەی لە ناویدایە لە فیتنەو ناخۆشی.

﴿ وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴾ شەیتانی فریودەرە بەردەوام فێڵ لە مرۆڤ دەکات، لێی بێئاگا نابێت لە هەموو کاتەکان، بە ڕاستی خوا مافی هەیە بەسەر بەندەکانیەوە، پەیمانو بەڵێنێکی پێداون پاداشتیان دەداتەوە بە پێی کردەوەکانیان، ئایا مافی خوایان داوە، یان کەمتەرخەم بوون. ئەمە کارێکە پێویستە گرنگی پێبدرێت، وە بەندە بیکات بە ئامانجی ڕاستەقینەی، وە بیکات بە سەرمایەی ئەو بازرگانیەی هەوڵی بۆ دەدات، لە مەزنترینی بەربەستەکان لە بەردەمیدا، دونیای دڵرفێنو شەیتانی فێڵبازە، خوا قەدەغەی کردوە لە بەندەکانی دونیا فریویان بدات، یان شەیتانی فریودەر (بە بیانووی بەزەیی خوا) فریویان بدات، ﴿ يَعِدُهُمْ وَيُمَنِّيهِمْ ۖ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا ﴿١٢٠﴾ ﴾ النساء. (واتە: شەیتان بەڵێنیان پێی دەداتو ئاواتو ئومێدیان دەخاتە بەر،

دڵنیابن شەیتان هیچ بەڵێنێکیان پێنادات جگە لە خەڵەتاندن نەبێت).
(٣٤): ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلۡغَيۡثَ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡأَرۡحَامِۖ وَمَا تَدۡرِي نَفۡسٞ مَّاذَا تَكۡسِبُ غَدٗاۖ وَمَا تَدۡرِي نَفۡسُۢ بِأَيِّ أَرۡضٖ تَمُوتُۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرُۢ ٣٤ ﴾:
بە ڕاستی جێگیر بووەو دامەزراوە کە خوای مەزن بە زانستی دەوری دیارو نادیارو ئاشکراو نهێنی داوە، بێگومان خوا بەندەکانی ئاگادار دەکاتەوە لە زۆرێ لە کاروبارە غەیبیو پەنهانەکان، بەڵام ئەم پێنج دانەیە، زانستیانی شاردوەتەوە لە هەموو بەدیهێنراوەکان، نە هیچ پێغەمبەرێکی نێردراو دەیزانێ، وە نە هیچ فریشتەیەکی نزیک، نە غەیری وانیش، جا فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِ ﴾ واتە: دەزانێ کەی (ڕۆژ دوایی) دێ، وەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرۡسَىٰهَاۖ قُلۡ إِنَّمَا عِلۡمُهَا عِندَ رَبِّيۖ لَا يُجَلِّيهَا لِوَقۡتِهَآ إِلَّا هُوَۚ ثَقُلَتۡ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ لَا تَأۡتِيكُمۡ إِلَّا بَغۡتَةٗ ١٨٧ ﴾ الأعراف، (واتە: پرسیارت لێدەکەن لە بارەی ڕۆژی دواییەوە کەی دێت، بڵێ: زانینی ئەوە تەنها لە لای پەروەردگارمە، هیچ کەس ناتوانێ کاتەکەی ئاشکرا بکات جگە لە پەروەردگار، هاتنی قیامەت بۆ ئاسمانەکانو زەویش قورسە، نایەت بەسەرتانداو ڕوونادات لە ناکاو نەبێت).
﴿ وَيُنَزِّلُ ٱلۡغَيۡثَ ﴾ واتە: خوا تاکو تەنهایە بە دابەزاندنی باران، وە کاتی دابەزینیشی دەزانی ﴿ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡأَرۡحَامِ ﴾ (واتە: تەنها خوا دەزانێ بەوەی لە منداڵدانی دایکدا هەیە) ئەو زاتە دروستی دەکات ئەوەی لە ناویدایەو دەزانێ چیە، ئایا نێرە یان مێ، بۆیە فریشتەی ئەرک پێسپێردراو پرسیار لە پەروەردگاری دەکات دەربارەی منداڵدان: ئایا ئەوە نێرە یان مێ؟ خوا چۆنی بوێ بریار دەدات.
﴿ وَمَا تَدۡرِي نَفۡسٞ مَّاذَا تَكۡسِبُ غَدٗا ﴾ (واتە: وە هیچ کەس نازانێ سبەینێ چی دەکات) لە کاروباری دینیو دونیایی، ﴿ وَمَا تَدۡرِي نَفۡسُۢ بِأَيِّ أَرۡضٖ تَمُوتُ ﴾ (واتە: وە هیچ کەس نازانێ لە چ زەویەکدا دەمرێ) بەڵکو خوای بەرزو مەزن ئەو دەزانێ بە هەموو ئەوانە.
کاتێ ئەم شتانەی تایبەت کردوە، زانستی گشتگیر کردوە بە هەموو شتەکان، جا فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرُۢ ﴾ (واتە: بە ڕاستی خوا زاناو ئاگادارە) دەوری دیارو نادیارو ئاشکراو نهێنی داوە، لە حیکمەتە تەواوەکانی، وە نهێنی ئەم پێنج زانستەی لە بەندەکانی شاردوەتەوە، چونکە لە شاردنەوەیدا بەرژەوەندی هەیە کە شاراوە نیە بۆ کەسێک لێی ورد ببێتەوە.

تەفسیری سوورەتی (لقمان) تەواو بوو.


بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
الٓمٓ ① تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ
② أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ بَلْ هُوَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ لِتُنذِرَ قَوْمًا
مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٍ مِّن قَبْلِكَ لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ ③ ٱللَّهُ
ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ
ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ مَا لَكُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِىٍّ وَلَا شَفِيعٍ
أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ④ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ إِلَى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ يَعْرُجُ
إِلَيْهِ فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥٓ أَلْفَ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ⑤ ذَٰلِكَ
عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ⑥ ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ
كُلَّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ وَبَدَأَ خَلْقَ ٱلْإِنسَٰنِ مِن طِينٍ ⑦ ثُمَّ جَعَلَ
نَسْلَهُۥ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ⑧ ثُمَّ سَوَّىٰهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن
رُّوحِهِۦ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ قَلِيلًا
مَّا تَشْكُرُونَ ⑨ وَقَالُوٓا۟ أَءِذَا ضَلَلْنَا فِى ٱلْأَرْضِ أَءِنَّا لَفِى
خَلْقٍ جَدِيدٍۭ بَلْ هُم بِلِقَآءِ رَبِّهِمْ كَٰفِرُونَ ⑩ قُلْ يَتَوَفَّىٰكُم
مَّلَكُ ٱلْمَوْتِ ٱلَّذِى وُكِّلَ بِكُمْ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ ⑪

## تەفسیری سوورەتی (السجدة)

## مەککیە (٣٠) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٣): ﴿ الٓمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ بَلْ هُوَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٍ مِّن قَبْلِكَ لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ ﴿٣﴾ ﴾:

﴿ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ﴾ خوا هەواڵ دەدات بێگومان ئەم کتێبە بەخشندەیە، لە لایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە دابەزیوە، ئەو زاتەی پەروەردەی کردوون بە نیعمەتەکانی، لە مەزنترین پەروەردەکردنی بۆیان، ئەم کتێبەیە کە ئەو بەرژەوەندیانەی تێدایە حاڵیان چاک دەکاتو ڕەوشتیان تەواو دەکات، ئەو کتێبە هیچ گومانو دوو دڵیەکی تێدانیە، لەگەڵ ئەوەدا بەدرۆ دانەرانی پێغەمبەرو ستەمکاران لەوەدا وتیان: موحەممەد ﷺ ئەم قورئانەی هەڵبەستووەو لە لایەن خۆیەوە دروستی کردوە، ئەمە لە گەورەترین کەللەڕەقیو بوێریە لەسەر نکووڵی کردنی کەلامی خوا، وە تۆمەتبار کردنی موحەممەد ﷺ بە گەورەترین درۆ، وە توانای خەڵکی لەسەر قسەیەک وەک قسەی خوا، هەر یەکە لەمانە لە کارە گەورەکانە.

خوا لە وەڵامی ئەوانەی کە وتیان ئەم قورئانە هەڵبەستراوە، فەرمووی: ﴿ بَلْ هُوَ ٱلْحَقُّ ﴾ (واتە: بەڵکو ئەو قورئانە ڕاستە) بەتاڵ ڕووی تێناکات نە لە ئێستاو نە لە دوارۆژدا، دابەزێنراوە لە لایەن کاردروستی ستایش کراوە ﴿ مِن رَّبِّكَ ﴾ دایبەزاندوە وەک میهرەبانیەک بۆ بەندەکان ﴿ لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٍ مِّن قَبْلِكَ ﴾ واتە: ئەوان لە حاڵەتی پێویستدا بوون بە ناردنی پێغەمبەرو دابەزاندنی کتێب، بە هۆی نەبوونی

ترسێنەرەوە، بەڵکو ئەوان لە نەفامی خۆیاندا سەرگەردان بوون، وە لە تاریکی نەفامیدا دەخولانەوە، ئێمە کتێبمان بۆ تۆ دابەزاند ﴿لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ﴾ (بەڵکو هیدایەت وەرگرن) لە گومراییان، تا هەق بناسن و پێشی بخەن.

ئەمانەی خوا باسی کرد، هەموویان دژی بەدرۆدانانی ئەوانە بە قورئان، بێگومان وا پێویست بوو لەسەریان بڕوای پێبهێنن و بەڕاستی دابنێن، چونکە خودی ئەو قورئانە ﴿مِن رَّبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾ بێگومان ئەو قورئانە ﴿ٱلْحَقُّ﴾ حەقیش لە هەموو کاتێکدا وەرگیراوە، وە ئەو قورئانە ﴿لَا رَيْبَ فِيهِ﴾ (هیچ گومانێکی تێدانیە) بە جۆرێ لە جۆرەکان، شتێکی تێدانیە مایەی گومان بێت، هەواڵێکیشی تێدانیە لەگەڵ واقیعدا نەگونجێ، وە شتێکی شاراوەی تێدانیە، دوودڵی لە واتاکانیدا نیە، ئەوانە لە ئەوپەڕی پێویستیدا بوون بە پەیام، بێگومان ئەو قورئانە هیدایەتی تێدایە بۆ هەموو خێرو چاکەیەک.

(٤-٩): ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ مَا لَكُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِىٍّ وَلَا شَفِيعٍ أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ﴿٤﴾ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ إِلَى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥٓ أَلْفَ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٥﴾ ذَٰلِكَ عَـٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَـٰدَةِ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٦﴾ ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ كُلَّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ ۖ وَبَدَأَ خَلْقَ ٱلْإِنسَـٰنِ مِن طِينٍ ﴿٧﴾ ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُۥ مِن سُلَـٰلَةٍ مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ﴿٨﴾ ثُمَّ سَوَّىٰهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِۦ ۖ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَـٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۚ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٩﴾﴾:

﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدات دەربارەی تەواوی دەسەڵاتی لە دروست کردنیدا ﴿ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾ (واتە: ئاسمانەکان و زەوی دروستکردووەو ئەوەی لە نێوانیاندایە لە شەش ڕۆژدا) یەکەم ڕۆژی یەک شەممەیەو کۆتایەکەیشی هەینیە، لەگەڵ توانای دروستکردنی بە چرکەیەک، بەڵام خوا لەسەرخۆو کاردروستە.

﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ﴾ (واتە: پاشان بەرز بوویەوە بۆ سەر عەرش) کە سەقفی دروستکراوەکانە، بەرز بوونەوەیەک شایستە بە گەورەیی خۆی، ﴿مَا لَكُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِىٍّ﴾ (واتە: جگە لە خوا هیچ پشتیوانێکتان نیە) پشتیوانیتان لێ بکات لە کاروبارەکانتانداو سوودتان پێبگەیەنێ، ﴿وَلَا شَفِيعٍ﴾ (وە هیچ تکاکارێک) تکاتان بۆ بکات ئەگەر سزاتان ڕووبەڕوو ببێتەوە.

﴿أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ﴾ (ئایا بۆ بیرناکەنەوە) تا بزانن بەڕاستی بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی،

کـە لە سـەرووی عەرشـی مەزنەوەیـە، ئەو زاتەیـە کە تـاکو تەنهایـە لـە بەڕێوەبردنتانو پشـتیوانی کردنتـان، هەمـوو تـکاکان تایبەتـە بـەو، وە هـەر ئەو شایسـتەی هەمـوو جۆرە پەرستنێکە.

﴿ يُدَبِّرُ ٱلۡأَمۡرَ ﴾ (واتـە: هەمـوو کاروبـارەکان بەڕێـوە دەبـات) بـە فەرمانـی قـەدەریو فەرمانـی شـەرعی، خـوا تاکو تەنها لـە بەڕێوەبردنیـدا، ئـەو بەڕێوەبردنانە لە لایـەن خاوەن توانـاوە دابەزیوە ﴿مِنَ ٱلسَّمَآءِ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ ﴾ (واتە: لە ئاسـمانەوە تـا زەوی) پێی کامەرانو بەدبەخـت دەکات، هـەژارو دەوڵەمەنـد دەکات، سـەربەرزو زەلیـل دەکات، ڕێزدەگـرێو سەرزەنشـت دەکات، کۆمەڵێـک بـەرز دەکاتـەوە، کۆمەڵێکیـش دادەگرێـت، ڕزقو ڕۆزی دادەبەزێنـێ، ﴿ ثُمَّ يَعۡرُجُ إِلَيۡهِ ﴾ واتـە: فەرمـان لـە لای ئـەوەوە دادەبەزێو بـۆ لای ئەویش بـەرز دەبێتـەوە ﴿ فِي يَوۡمٖ كَانَ مِقۡدَارُهُۥٓ أَلۡفَ سَنَةٖ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴾ (واتـە: لـە ڕۆژێکـدا کـە ئەندازەکـەی هەزار سـاڵە لەو سـاڵانەی ئێـوە دەیژمێرن) بـەرز دەبێتەوە بـۆ لای پێی دەگات لـە یـەک چرکەدا.

﴿ ذَٰلِكَ ﴾ ئـەو زاتەی هەموو ئـەو بەدیهێنراوە مەزنانـەی بەدیهێناوە، ئەو زاتـە بەرزبوویەوە بـۆ سـەر عەرشـی مـەزن، وە تـاکو تەنهایـە لـە بەڕێوەبردنـی لە وڵاتـدا ﴿ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴾ (واتـە: زانایـە بـە هەمـوو نهێنیو ئاشـکراکان بە دەسـەڵاتو میهرەبانە)، جا بە بەرفراوانی زانسـتیو، تەواوی دەسـەڵاتیو، بەزەیی گشـتگیری، هێناویەتیە بـوون، وە سـوودو قازانجی تێـدا دانـاوە، بەڕێوەبردنیان گران نیـە بەلایەوە، ﴿ ٱلَّذِيٓ أَحۡسَنَ كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقَهُۥ ﴾ واتـە: هەمـوو دروسـتکراوێک خوا دروسـتی کـردوە، بێگومـان خوا بە چاکترین شـێوە دروسـتی کردوون، بە جۆرێ دروسـتی کردوون شایسـتەن پێی دەگونجێن لەگەڵیـدا، ئەمـە گشـتیە، پاشـان ئادەمیـزادی تایبەت کـردوە بە هـۆی ڕێـزو حورمەتیەوە، فەرموویەتـی: ﴿ وَبَدَأَ خَلۡقَ ٱلۡإِنسَٰنِ مِن طِينٖ ﴾ (واتـە: مرۆڤی لە سـەرەتاوە لە قوڕ دروسـت کـردوە) ئەویش بە دروسـتکردنی ئـادەم ﷺ باوکـی مرۆڤایەتی.

﴿ ثُمَّ جَعَلَ نَسۡلَهُۥ ﴾ واتـە: (پاشـان) نـەوەی مـرۆڤ کـە پێکهاتـووە ﴿ مِّن مَّآءٖ مَّهِينٖ ﴾ (لـە ئـاوی قێزەون) ئەویـش ئەو ئـاوە قێزەونو لاوازەیـە ﴿ ثُمَّ سَوَّىٰهُ ﴾ (پاشـان ڕێکو پێکـی کـرد) بـە گۆشـتەکەیو ئەندامەکانـیو ڕەگەکانـیو خوێنبەرەکانـی، وە بـە جوانی دروسـتی کـرد، هەمـوو ئەندامێکـی لـەو جێگایـە دانـاوە کـە ناگونجـێ بـە جێگایەکی تر ﴿ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِۦ ﴾ (واتـە: فـووی کـرد بە بەریدا لـە ڕووحێک کە خۆی دروسـتی

کـردوە) بـەوەی فریشـتەی بـۆی نـاردووە، فـووی کردوە بـە بەریدا، بەویسـتی خـوا بووە بـە گیانلەبەرێـک، دوای ئـەوەی بێگیـان بـووە، ﴿ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَـٰرَ ﴾ واتە: بـەردەوام پێتـان دەبەخشـێ لە سـوودەکان قۆنـاغ بە قۆنـاغ، تا بیسـتن‌و بینینی پێبەخشـیون ﴿ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴾ ئـەو زاتـەی کە دروسـتی کـردوون‌و وێنای کێشـاون.

(١٠-١١): ﴿ وَقَالُوٓاْ أَءِذَا ضَلَلْنَا فِى ٱلْأَرْضِ أَءِنَّا لَفِى خَلْقٍ جَدِيدٍۭ ۚ بَلْ هُم بِلِقَآءِ رَبِّهِمْ كَـٰفِرُونَ ﴿١٠﴾ ۞ قُلْ يَتَوَفَّىٰكُم مَّلَكُ ٱلْمَوْتِ ٱلَّذِى وُكِّلَ بِكُمْ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ ﴿١١﴾ ﴾:

﴿ وَقَالُوٓاْ ﴾ واتـە: بـەدرۆ دانـەران بە شـێوەی بـە دوور تەماشـاکردنی ڕۆژی دوایی وتیان: ﴿ أَءِذَا ضَلَلْنَا فِى ٱلْأَرْضِ ﴾ واتـە: (ئەگـەر ئێمە) لـەت‌و پەت بووین، وە بـەش بەش بووین لـە جێگـاکان کـە نازانـرێ، ﴿ أَءِنَّا لَفِى خَلْقٍ جَدِيدٍ ﴾ واتـە: (ئایـا) زینـدوو دەکرێینەوە بە زیندووکردنەوەیەکـی تـازە، بـە بۆچوونی ئـەوان ئەمە لـە دوورترینی شـتەکانە، ئەویش بە هـۆی ئـەوەی توانای خوایـان هێناوەتە ئاسـتی توانـای خۆیان.

قسـەکەیان بـۆ گـەڕان نیـە بـە دوای ڕاسـتیدا، بەڵکـو ئـەوە سـتەم‌و عینـادی‌و کوفـرە بە گەیشـتن بـە دیـداری پەروەردگاریـان، بۆیـە فەرموویەتـی: ﴿ بَلْ هُم بِلِقَآءِ رَبِّهِمْ كَـٰفِرُونَ ﴾ (واتـە: بەڵکـو ئـەوان بڕوایان نیە بە خزمەتـی پەروەردگاریـان بگەن)، بێگومان سـەرچاوەو مەبەسـتی قسـەکانیان زانـراوە، ئەگەرنا، ئەگـەر مەبەسـتیان ڕوون کردنەوەی هـەق بووایە، ئـەوە بـۆی ڕوون کردونەتـەوە بـە بەڵگـەی یەکلاکـەرەوە لەسـەر زینـدوو کردنـەوە، کە وەکـو خـۆر وایـە بۆ چـاو، ئەوەندەیـان بەسـە ئەو زانسـتەی لـە لایانە کـە دەزانـن ئەوانە لـە سـەرەتاوە دروسـتکراون لـە نەبوونـەوە، جـا دووبـارە دروسـتکردنەوەیان ئاسـانترە لە سـەرەتای دروسـتکردنیان، بەهەمـان شـێوە زەوی مـردوو، خـوا بارانـی بەسـەردا دەبارێنێ، زینـدوو دەبێتـەوە دوای ئـەوەی مـردوە، جۆرەهـا تـۆوی جیاواز سـەوز دەکات.

﴿ قُلْ يَتَوَفَّىٰكُم مَّلَكُ ٱلْمَوْتِ ٱلَّذِى وُكِّلَ بِكُمْ ﴾ واتـە: (بڵـێ: فریشـتەی گیـان کێشـان) خـوا ئەرکـی گیان کێشـانی پـێ سـپاردووە ﴿ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ ﴾ (واتە: پاشـان بۆ لای پەروەردگارتـان دەگەڕێنـەوە) پاداشـتان دەداتـەوە بـە پێـی کردەوەکانتان، بێگومـان ئێوە نکووڵیتـان لـە زینـدوو بوونـەوە کرد، تەماشـا بکـەن خوا چیتـان بەسـەر دێنێ.

وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلْمُجْرِمُونَ نَاكِسُوا۟ رُءُوسِهِمْ عِندَ رَبِّهِمْ
رَبَّنَآ أَبْصَرْنَا وَسَمِعْنَا فَٱرْجِعْنَا نَعْمَلْ صَٰلِحًا إِنَّا مُوقِنُونَ
﴿١٢﴾ وَلَوْ شِئْنَا لَءَاتَيْنَا كُلَّ نَفْسٍ هُدَىٰهَا وَلَٰكِنْ حَقَّ
ٱلْقَوْلُ مِنِّى لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ
﴿١٣﴾ فَذُوقُوا۟ بِمَا نَسِيتُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَآ إِنَّا نَسِينَٰكُمْ
وَذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْخُلْدِ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٤﴾ إِنَّمَا يُؤْمِنُ
بِـَٔايَٰتِنَا ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا۟ بِهَا خَرُّوا۟ سُجَّدًا وَسَبَّحُوا۟ بِحَمْدِ
رَبِّهِمْ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ۩ ﴿١٥﴾ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ
عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ
يُنفِقُونَ ﴿١٦﴾ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِىَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ
جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ أَفَمَن كَانَ مُؤْمِنًا كَمَن كَانَ فَاسِقًا
لَّا يَسْتَوُۥنَ ﴿١٨﴾ أَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَلَهُمْ
جَنَّٰتُ ٱلْمَأْوَىٰ نُزُلًۢا بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٩﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فَسَقُوا۟
فَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ كُلَّمَآ أَرَادُوٓا۟ أَن يَخْرُجُوا۟ مِنْهَآ أُعِيدُوا۟ فِيهَا
وَقِيلَ لَهُمْ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢٠﴾

(١٢-١٤): ﴿ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلْمُجْرِمُونَ نَاكِسُوا۟ رُءُوسِهِمْ عِندَ رَبِّهِمْ رَبَّنَآ أَبْصَرْنَا وَسَمِعْنَا فَٱرْجِعْنَا نَعْمَلْ صَٰلِحًا إِنَّا مُوقِنُونَ ﴿١٢﴾ وَلَوْ شِئْنَا لَءَاتَيْنَا كُلَّ نَفْسٍ هُدَىٰهَا وَلَٰكِنْ حَقَّ ٱلْقَوْلُ مِنِّى لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿١٣﴾ فَذُوقُوا۟ بِمَا نَسِيتُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَآ إِنَّا نَسِينَٰكُمْ وَذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْخُلْدِ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٤﴾ ﴾:

کاتێ خوا ﷻ باسی گەڕانەوەیانی کرد لە ڕۆژی دواییدا، ئنجا باسی بارودۆخیانی کرد لە پلەو پایەکانیاندا، لەبەر دەستی پەروەردگاریان، جا فەرموویەتی: ﴿ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴾ (ئەگەر دەبینی کاتێ تاوانباران) ئەوانەی بەردەوامن لەسەر گوناهە مەزنەکان ﴿ نَاكِسُوا۟ رُءُوسِهِمْ عِندَ رَبِّهِمْ ﴾ بە ترسانو زەلیل بوونو خەجاڵەتیەوە دان بە گوناهەکانیاندا دەنێن، داوای گەڕانەوە لە پەروەردگاریان دەکەن، دەڵێن: ﴿ رَبَّنَآ أَبْصَرْنَا وَسَمِعْنَا ﴾ واتە: (ئەی پەروەردگاری ئێمە) کارەکەمان بۆ ڕوون بوویەوە، وە بە چاوی ڕاستەقینە بینیمان ﴿ فَٱرْجِعْنَا نَعْمَلْ صَٰلِحًا إِنَّا مُوقِنُونَ ﴾ واتە: ئێمە ئێستاکە دڵنیایی تەواومان هەیە بەوەی بەدرۆمان دەزانی، واتە: بەڕاستی شتێکی ناشرینو حاڵێکی بێزارکەرت بینیوە، وە گەلاڵێکی زیانمەند، وە پرسیارێک کە وەڵام نادرێتەوە، چونکە کاتی مۆڵەت پێدان کۆتایی هاتووە، هەموو ئەمانە بە قەزاو قەدەری خوایە، کاتێ نێوانیانی چۆڵکرد لە نێوان کوفرو سەرپێچیدا، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ وَلَوْ شِئْنَا لَءَاتَيْنَا كُلَّ نَفْسٍ هُدَىٰهَا ﴾ واتە: (ئەگەر بمان ویستایە) ڕێنمایی هەموو خەڵکمان دەکرد، وە هەموویانمان لەسەر ڕێنمایی کۆدەکردەوە، ویستی ئێمە گونجاوە بۆ ئەوە، بەڵام حیکمەتو کاردروستی ڕێگەی نەداوە هەموویان لەسەر ڕێنمایی بن، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ وَلَٰكِنْ حَقَّ ٱلْقَوْلُ مِنِّى ﴾ واتە: (بەڵام بەڵێنی من) پێویستو جێگیر بوەو چەسپاوەو گۆڕانی بەسەردا

ئایـەت ﴿لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ﴾ (واتـە: بێگومـان دۆزەخ پـڕ دەکـەم لە پـەری‌و ئادەمـی تێکـڕا) ئەم پەیمانـە هەر دەبـێ ڕوو‌بـدات، هیـچ لادانێکی نیە، وە هەردەبـێ هـۆکاری بـۆ بڕەخسـێ لـە کوفـرو سـەرپێچی، ﴿فَذُوقُوا بِمَا نَسِيتُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَذَا﴾ واتـە: بـەو تاوانبارانـە دەوتـرێ کـە زەلیـل‌و سەرشـۆڕن‌و داوای گەڕانەوە دەکـەن بـۆ دونیـا، بـۆ ئـەوەی بەدەسـتی بێنـن ئـەوەی لـە دەسـتیان داوە: بەڕاسـتی کاتی گەڕانـەوە بەسـەرچووە، هیـچ نەمانەتـەوە جگـە لە سـزا نەبـێ، دە بچێژن سـزای بـە ئێش، چونکـە گەیشـتن بـەم ڕۆژەتان لەبیـر کردبـوو، ئـەم لەبیرکردنە لەبیـر کردنـی وازهێنانە، واتـە: بـەوەی پشـتان تێکـردو وازتـان لـەوە هێنا کـردەوەی بۆ بکـەن، وەک ئـەوەی کە هەرگیـز پێـی نەگەن‌و نـەڕۆن بـۆ لای ﴿إِنَّا نَسِينَاكُمْ﴾ واتـە: وازمان لێتـان هێناوە بە سـزادان، وەک پاداشـتێک لە جـۆرو ڕەگـەزی کردەوەکانتان، هەروەکو چـۆن لە بیرتان کـرد، لە بیـر کـران ﴿وَذُوقُوا عَذَابَ الْخُلْدِ﴾ واتە: سـزای بـەردەوام بێبڕانـەوە، چونکە سـزا ئەگـەر کاتێکـی دیاریکراوی هەبێ ئـەوە تۆزێ هەناسـەدان‌و ئاسـانکاری تێدایە، بەڵام سـزای دۆزەخ «خـوا پەنامـان بـدات» هیـچ پشـوودانێکی تێدانیـە، وە پچڕاندنیشـی تێدانیە، ﴿بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ لـە کوفـرو تاوان‌و سـەرپێچی.

(١٥-١٧): ﴿إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِآيَاتِنَا الَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا بِهَا خَرُّوا سُجَّدًا وَسَبَّحُوا بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴿١٥﴾ تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ ﴿١٦﴾ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾﴾:

کاتـێ خـوا ﷻ باسـی بێبڕوایانـی کـرد بـە ئایەتەکانـی وە ئەوەی بـۆی داناون لە سـزادان، باسـی بـڕواداران‌و سـیفاتەکانیانی کـرد، وە ئەوەیشـی بـۆی ئامـادە کـردون لـە پاداشـت، فەرمـووی: ﴿إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِآيَاتِنَا﴾ واتـە: بڕوایەکی ڕاسـتەقینە کە نیشـانەکانی ئیمانی تێدا ببینرێ.

ئەوانیـش ﴿الَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا﴾ (واتـە: ئەوانـەی کاتـێ ئامۆژگـاری بکرێـن)، بـە ئایەتەکانـی پەروەردگاریـان، دەقەکانـی قورئـان بخوێنرێتـەوە بەسـەریاندا، وە ئامۆژگاری بکرێـن لەسـەر دەسـتی پێغەمبەرانـی خـوا، وە بانـگ بکرێـن بـۆ یادکردنـەوە گوێـی بـۆ دەگـرن‌و وەری دەگـرن‌و ملکەچـی دەبـن، ﴿خَرُّوا سُجَّدًا﴾ واتـە: ملکەچـی دەبـن، بـە ملکەچبوونـی یـادی خـوا، وە دڵخـۆش دەبـن بـە ناسـینی ﴿وَسَبَّحُوا بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَهُمْ

﴿لَا يَسْتَكْبِرُونَ﴾ (واتـە: بـە پاکـی ستایشـی پەروەردگاریـان دەکەن خۆیان بـە گەورە دانانیـن)، نـە بـە دڵەکانیـان نـە بـە ئەندامانـی جەسـتەیان، چێـژو لـەززەت لـە ملکەچیان وەردەگـرن، بەڵکـو خـۆ بەکـەم زانـن بەرانبەر بـە ئایەتـەکان، بـە چاکی وەریـان گرتووەو تەسـلیمی بـوون، وە رووبـەرووی بوونەتـەوە بە دڵێکـی بەرفـراوان، وە پێی گەیشـتوون بە رەزامەنـدی پەروەردگـاری بەسـۆز، وە ڕێنماییان وەرگرتووە بۆ ڕێگای ڕاسـت ﴿تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ﴾ واتـە: تەنیشـتیان بەرزدەبێتەوەو دوور دەکەوێتـەوە، وە بێزار دەبێ لـە جـێ نوێنـە بەلەزەتەکەی، بـۆ لای بەلەزەتتـر لەوە، وە خۆشەویسـتر لەلایـان کە ئەویش شـەونوێژو پاڕانەوەیـە لە خوای بەرزو مـەزن، لەبەر ئەمەیـە فەرموویەتی: ﴿يَدْعُونَ رَبَّهُمْ﴾ واتـە: (داوا لـە پەروەردگاریـان دەکەن) بـۆ بەدەسـتهێنانی بەرژەوەندی دیـنو دونیایان، وە دوورخسـتنەوەی زیانـی دینو دونیایـان ﴿خَوْفًا وَطَمَعًا﴾ واتە: (بە تـرسو هیواوە) ئەو دوو وەسـفەیان پێکـەوە کۆکردۆتـەوە، بە هۆی ترسـانیان لە ڕەتکردنـەوەی کردەوەکانیان، هیوایـان هەیـە بـە وەرگرتنـی وە دەشترسـن لە سـزای خـوا، وە ئومێدیان هەیە بە پاداشـتی ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ﴾ لـە ڕزقو ڕۆزی، کەم بێ، یان زۆر ﴿يُنفِقُونَ﴾ (دەبەخشـن) باسـی بەسـتنەوەی بەخشـینو نەفەقـەی نەکـردوە، وە ئەو کەسەیشـی کـە پێـی دەدرێ، بۆ ئەوەی بەڵگـە بـێ بۆ گشـتی، بێگومان دەچێتـە نێویەوە ئەو بەخشـینانەی پێویسـتن وەک زەکاتو کەفـارەتو بژێویدانـی ژنـەکان، وە خـزمو نزیکـەکان، وە خێـرو چاکەی پەسـند لە ڕووە چاکەکانـەوە، وە بەخشـینو چاکـە بەماڵو سـامان بە گشـتی یەکسـانە دەوڵەمەنـد بێ، یان هـەژار بـێ نزیـک بێ یـان دوور، بەڵام پاداشـتەکە دەگـۆڕێ بە پێی سـوودو قازانـج، ئەمە کردەوەکانیانە.

بەڵام پاداشـتیان، جـا فەرموویەتـی: ﴿فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ﴾ (ئنجا هیچ کـەس نایزانێ) هەموو نەفـسو دەروونی بەدیهێنـراوەکان دەگرێتەوە، چونکە نەناسـراوە لە سـیاقی نەفیـدا هاتووە، واتـە: هیـچ کەسـێک نازانـێ، ﴿مَّا أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ﴾ (واتـە: هیـچ کـەس نازانـێ چـی شـاراوەتەوە بۆیـان لـە بەهەشـتدا کـە هـۆی گەشـبوونی چاوانن) لـە پاداشـتی زۆرو نازونیعمەتـی بەرفراوانو دڵخۆشـیو چێژوو لەزەتی پـڕ لە شـادومانیو کامەرانی، هەروەکو چـۆن خوا ﷻ لەسـەر زمانـی پێغەمبەرەکـەی فەرموویەتی: {أَعْدَدْتُ لِعِبَادِيَ الصَّالِحِينَ مَالا عَينٌ رَأَتْ، وَلاَ أُذُنٌ سَمِعَتْ، وَلاَ خَطَرَ عَلَى قَلْبِ بَشَرٍ} (رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: ٧٠٦٣).

واتـە: خـوا فەرموویەتـی: ئامـادەم کـردوە بـۆ بەنـدە چاکەکانـم (لـە بەهەشـت دا) نـازو

نیعمەتــی وا تــە هیچ چاوێــک بینیویەتی‌و، نــە هیچ گوێیەک بیســتوویەتی‌و، نە بــە خەیاڵو دڵــی هیــچ کەســێکیش دا هاتوە.

هــەر وەکــو چۆن لە شــەودا نوێژیان کرد، وە پاڕانــەوە، وە کردەوەکانیان شــاردەوە، خوا ﷻ پاداشــتی دانــەوە بــە پێــی کردەوەکانیــان، پاداشــتەکەی بــۆ شــاردوونەتەوە، لەبــەر ئەمەیە فەرموویەتــی: ﴿ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾ (ئــەم پاداشــتە دەدرێنەوە بە هۆی ئــەو کردەوانەی کردوویانە).

(١٨-٢٠): ﴿ أَفَمَن كَانَ مُؤۡمِنٗا كَمَن كَانَ فَاسِقٗاۚ لَّا يَسۡتَوُۥنَ ١٨ أَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَلَهُمۡ جَنَّٰتُ ٱلۡمَأۡوَىٰ نُزُلَۢا بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٩ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فَسَقُواْ فَمَأۡوَىٰهُمُ ٱلنَّارُۖ كُلَّمَآ أَرَادُوٓاْ أَن يَخۡرُجُواْ مِنۡهَآ أُعِيدُواْ فِيهَا وَقِيلَ لَهُمۡ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّذِي كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ٢٠ ﴾:

خــوا ﷻ عەقڵــەکان ئاگــادار دەکاتەوە لەســەر ئەوەی بڕیاری لەســەرداوە تیایدا، لە یەکســان نەبوونــی دوو دژیەکــی جیــاواز، کاردروســتی‌و دانایــی ئەوە دەخــوازێ وەک یــەک نەبن، فەرموویەتــی: ﴿ أَفَمَن كَانَ مُؤۡمِنٗا ﴾ (دەی ئایــا کەســێ ئیمانــدار بووبــێ) دڵــی ئــاوەدان کردبێتــەوە بــە ئیمــان، ئەندامانی جەســتەی ملکەچــی شــەریعەتەکانی بووبــێ، ئیمانەکەی وا دەخــوازێ واز لــەو شــتە بهێنــێ دەبێتــە مایــەی تووڕەیــی‌و خەشــم‌و قینــی خوا، کــە زیان دەگەیەنــێ بــە ئیمانەکەی ﴿ كَمَن كَانَ فَاسِقٗا ﴾ (وەک کەسێکە دەرچووبــێ لە ئیمان‌و فاســق بووبــێ) دڵــی ڕووخابــێ‌و لــە کار کەوتبێ لــە بڕواهێنان، هیــچ ڕێگریەکــی ئاینی نیە بۆیــە ئەندامانی جەســتەی پەلــە دەکەن لە شــوێنکەوتنی نەفامی‌و ســتەم کــردن‌و ئەنجامدانی هەمــوو تــاوان‌و ســەرپێچیەک، وە بــە هــۆی فاســق بوونیەوە لــە فەرمانــی خــوا دەرچووە، ئایــا ئــەم دوو کەســە وەکو یــەک وان؟ ﴿ لَّا يَسۡتَوُۥنَ ﴾ (هەرگیــز وەک یــەک نین) نە لــەڕووی عەقڵــەوە نە لــە ڕووی شــەرعەوە، هــەروەک چۆن شــەو و ڕۆژ یەکســان نین، وە ڕۆشــنایی‌و تاریکیــش، بەهەمان شــێوە پاداشــتیان یەکســان نیە لــە دوارۆژدا.

﴿ أَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾ لە فەرزو ســونەتەکان ﴿ فَلَهُمۡ جَنَّٰتُ ٱلۡمَأۡوَىٰ ﴾ واتــە: ئــەو بەهەشــتانەی کــە جێگــای لەزەتــە، کانگــاو ســەرچاوەی خێرەکانــە، شــوێنی خۆشــیەکان‌و کامەرانــی دڵ‌و ڕووحــەکان‌و جێگــای مانــەوەی هەمیشــەییە، وە نزیک بوون لــە پەروەردگاری پەرســتراوو چێــژو لــەزەت وەرگرتنی لە نزیکــی ئەو، وە تەماشــاکردنی ڕووخســاری‌و بیســتنی قســەکانی ﴿ نُزُلَۢا ﴾ واتە: میوانــداری‌و ڕێزگرتــن لێیان ﴿ بِمَا كَانُواْ

يَعْمَلُونَ ﴾ (واتــە: بــە هــۆی ئــەو کردەوانــەی دەیانکــرد) جــا کردەوەکانیــان کــە خوا بە هۆیانــەوە فەزڵــی خــۆی داوە بەســەریاندا، ئــەوە گەیاندوونــی بەو پلــەو پایە بــەرزو بڵندانە، کــە نەبە بەخشــینی مــاڵ پێی دەگــات، نەبە ســەربازو خزمەتکار، نەبــە منــداڵ، تەنانەت نە بە نەفــسو ڕووحــەکان، بــە هیچ شــێوەیەک لێی نزیــک نابێتــەوە، جگە لە ئیمــانو کردەوەی چــاک نەبێ.

﴿ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فَسَقُواْ فَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ ﴾ واتــە: (وە ئەوانــەی کــە فاســق بوون) جێگاو شــوێنی مانــەوەی هەمیشــەییان ئاگرە، ســزایان لەســەر لانابرێــت بۆ ســاتێکیش بێت، ﴿ كُلَّمَآ أَرَادُوٓاْ أَن يَخْرُجُواْ مِنْهَآ أُعِيدُواْ فِيهَا ﴾ هەرکاتــی بیانــەوێ لــە دۆزەخ دەربچــن، بە هۆی ئەوەی ســزا تینــی بــۆ هێنــاون، دەگەڕێنرێنــەوە بــۆ نــاو دۆزەخ، ئومێــدی ڕزگاربوونیان نامێنــێ، خەمو پــەژارە دایــان دەگرێ.

﴿ وَقِيلَ لَهُمْ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴾ (واتــە: پێیــان دەوتــرێ بچــەژن ســزای ئــەو ئاگــرەی کــە ئێــوە بڕواتــان پــێ نەدەکــرد)، ئەمە ســزای ئاگــرە، کە شــوێنی مانــەوەو جێگایانە، بەڵام ســزای پێــش ئەوە کە پێشــەکیەکە بۆ ئەو ســزایە، ئەویش ســزای بەرزەخــە، بێگومــان خــوا لە فەرمایشــتی خــۆی باســی فەرمووە:


وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَدْنَىٰ دُونَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَكْبَرِ
لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢١﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ ثُمَّ
أَعْرَضَ عَنْهَآ ۚ إِنَّا مِنَ ٱلْمُجْرِمِينَ مُنتَقِمُونَ ﴿٢٢﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا
مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ فَلَا تَكُن فِى مِرْيَةٍ مِّن لِّقَآئِهِۦ ۖ وَجَعَلْنَٰهُ
هُدًى لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٢٣﴾ وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا
لَمَّا صَبَرُوا۟ ۖ وَكَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يُوقِنُونَ ﴿٢٤﴾ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ
يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ
﴿٢٥﴾ أَوَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّنَ ٱلْقُرُونِ
يَمْشُونَ فِى مَسَٰكِنِهِمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ ۖ أَفَلَا يَسْمَعُونَ
﴿٢٦﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّا نَسُوقُ ٱلْمَآءَ إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلْجُرُزِ فَنُخْرِجُ
بِهِۦ زَرْعًا تَأْكُلُ مِنْهُ أَنْعَٰمُهُمْ وَأَنفُسُهُمْ ۖ أَفَلَا يُبْصِرُونَ
﴿٢٧﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْفَتْحُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٢٨﴾
قُلْ يَوْمَ ٱلْفَتْحِ لَا يَنفَعُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِيمَٰنُهُمْ وَلَا هُمْ
يُنظَرُونَ ﴿٢٩﴾ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَٱنتَظِرْ إِنَّهُم مُّنتَظِرُونَ ﴿٣٠﴾
سُورَةُ الأَحْزَابِ

(٢١): ﴿ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَدْنَىٰ دُونَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَكْبَرِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢١﴾ ﴾

واتــه‌: وه‌ بــه‌ فاســقانو بــه‌ درۆدانــه‌ران ده‌چێژیــن نموونه‌یــه‌ک لــه‌ ســزای نزیــک پێــش ڕۆژی دوایــی، ئه‌ویــش ســزای به‌رزه‌خــه‌، پێیــان ده‌چێژیــن هه‌نــدێ لــه‌و ســزایه‌ پێــش مردنیــان، یــان بــه‌ ســزای كوشــتنو وێنــه‌ی ئــه‌وه‌ش، هــه‌روه‌ک ڕوویــدا لــه‌ هاوبــه‌ش دانــه‌ران لــه‌ جه‌نگی بــه‌در، یــان لــه‌ كاتــی مردنــدا، وه‌ک خــوا فه‌رموویه‌تــی: ﴿ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِى غَمَرَٰتِ ٱلْمَوْتِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓا۟ أَيْدِيهِمْ أَخْرِجُوٓا۟ أَنفُسَكُمُ ۖ ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ ٱلْهُونِ ﴿٩٣﴾ ﴾الأنعام، (واتــه‌: خۆزگــه‌ ســته‌مكارانت ده‌بینــی كاتــێ وان لــه‌ ناڕه‌حه‌تــیو ســه‌ختی ســه‌ره‌مه‌رگدا فریشــته‌كان ده‌ســتیان بۆ درێژ ده‌كه‌ن (پێیــان ده‌ڵێن) خۆتــان ده‌رباز بكــه‌ن (لــه‌م ناڕه‌حه‌تی گیانكێشــانه‌) ئه‌مڕۆ پاداشــتی ڕیســواكه‌ر ده‌درێنه‌وه‌)، پاشــان ســزای نزیكیــان بــۆ تــه‌واو ده‌كات لــه‌ ژیانــی به‌رزه‌خــدا.

ئه‌م ده‌قه‌ به‌ڵگه‌یه‌ له‌ســه‌ر چه‌ســپاندنی ســزای نــاو گــۆڕ، وه‌ ده‌لاله‌ته‌كانی ئاشــكرایه‌، بێگومان فه‌رموویه‌تــی: ﴿ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَدْنَىٰ ﴾ واتــه‌: هه‌نــدێ لــه‌و ســزایه‌، به‌ڵگه‌یه‌ له‌ســه‌ر ئــه‌وه‌ی ســزایه‌كی كه‌متر هه‌یه‌ پێش ســزای گه‌وره‌، ئه‌ویش ســزای ئاگــره‌، كاتێ كه‌ چه‌شــتنی ســزای نزیک له‌ دنیــادا، ناگاته‌ مــردن، خوا هه‌واڵــی داوه‌، كه‌ بێگومان ئه‌و ســزایان پێده‌چێــژێ بــۆ ئــه‌وه‌ی بگه‌ڕێنــه‌وه‌ بــۆ لایو داوای لێخۆش بوون بكــه‌ن لــه‌ گوناهه‌كانیان، وه‌ک خــوا فه‌رموویه‌تی: ﴿ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤١﴾ ﴾الروم. (واتــه‌: خراپــه‌ (بــه‌لاو شــێوانو ده‌رد) له‌ وشــكانی زه‌ویو ده‌ریــادا ده‌ركه‌وتــووه‌ بــه‌ هۆی ئــه‌و خراپانه‌ی خه‌ڵكــی كردوویانه‌ بۆ ئــه‌وه‌ی تۆڵه‌ی هه‌نــدێ لــه‌و خراپانــه‌ی كردوویانه‌ پێیــان بچێژێ به‌ڵكــو بگه‌ڕێنه‌وه‌ لــه‌ خراپه‌كاری).

(٢٢): ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ ثُمَّ أَعْرَضَ عَنْهَآ ۚ إِنَّا مِنَ ٱلْمُجْرِمِينَ مُنتَقِمُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾
﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ ثُمَّ أَعْرَضَ عَنْهَآ ﴾ واتە: هیچ کەس لەوە ستەمکارترو دەستدرێژیکەرتر نیە، لەو کەسەی بە ئایەتەکانی پەروەردگاری ئامۆژگاری بکرێ، کە پەروەردگاری پێی گەیاندوە، ئەو زاتەی مەبەستی پەروەردەکردنیەتی، وە تەواو کردنی نیعمەتەکانی بەسەریەوە لەسەر دەستی پێغەمبەرەکانی، فەرمانی پێبکاتو بەرژەوەندیە ئاینیی‌و دونیایەکانی بیر بخاتەوە، وە قەدەغەی لێبکات لە زیانە دینیی‌و دونیاییەکان، کە وا دەخوازێ لە بەرانبەریدا بڕوا بهێنێتو ملکەچی بێتو سوپاسگوزاری بکات، بەڵام ئەم ستەمکارە بە پێچەوانەی ئەوەوە هەستاوە کە پێویستە، نە بڕوای پێهێناوە نە شوێنی کەوتووە، بەڵکو پشتی تێکردوەو وازی لێهێناوە خستوویەتیە پشتیەوە، ئەمە لە گەورەترینی ستەمکارانە، ئەوانە شایستەی توندترین سزان، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ إِنَّا مِنَ ٱلْمُجْرِمِينَ مُنتَقِمُونَ ﴾ (واتە: بە ڕاستی ئێمە تۆڵەسێنەرین لە تاوانباران).

(٢٣-٢٥): ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ فَلَا تَكُن فِى مِرْيَةٍ مِّن لِّقَآئِهِۦ ۖ وَجَعَلْنَٰهُ هُدًى لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٢٣﴾ وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا۟ ۖ وَكَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يُوقِنُونَ ﴿٢٤﴾ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٢٥﴾ ﴾
﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ ﴾ کاتێ خوا ﷻ باسی ئەو ئایەتانەی کرد کە بەندەکانی پێ ئاگادار کردۆتەوە، ئەویش بریتیە لە قورئان کە دایبەزاندووە بۆ سەر موحەممەد ﷺ، باسی ئەوەی کردوە کە قورئان کتێبێکی داهێنراو نیە، وە ئەو کەسەیشی هێناویەتی نامۆ نیە لە ناو پێغەمبەراندا.

بێگومان خوا ﷻ کتێبی داوە بە مووسا ﷺ کە بریتیە لە تەورات، بە ڕاستدانەری قورئان، قورئانیش بەڕاستی دانـاوە، وە بەڵگەکانی جێگیر کردوە ﴿ فَلَا تَكُن فِى مِرْيَةٍ مِّن لِّقَآئِهِۦ ﴾ (واتە: ئنجا گومانت نەبێ بە گەیشتنت بە مووسا) چونکە بەڵگەکانی ڕاستی بە دوای یەکدا هاتوون، هیچ جێگایەک نەماوەتەوە بۆ گومانو دوو دڵی ﴿ وَجَعَلْنَٰهُ ﴾ واتە: ئەو کتێبەی داومانەتە مووسا ﴿ هُدًى لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴾ (واتە: ڕێنماییە بۆ نەوەکانی ئیسرائیل) ڕێنماییان لێوەردەگرت لە بنەماو لقو پۆو شەریعەتەکانی کە گونجاو بوو بۆ ئەو سەردەمەی نەوەکانی ئیسرائیل.

بەڵام ئەم قورئانە پیرۆزە خوا کردوویەتی بە هیدایەت بۆ هەموو خەڵکی بە گشتی،

چونکـە ڕێنمایـی بۆ خەڵکی لـە کاروبـاری ئاینەکەیان تـا ڕۆژی دواییـدا، ئەویش بە هۆی تەواویو بەرزیـەوە، ﴿ وَإِنَّهُۥ فِيٓ أُمِّ ٱلۡكِتَٰبِ لَدَيۡنَا لَعَلِيٌّ حَكِيمٌ ٤ ﴾الزخـرف، (واتە: بـە ڕاستـی ئـەم قورئانە لـە تابلۆی پارێـزراو دایـە لای ئێمە کـە زۆر بڵندەو پرە لـە دانایی).

﴿ وَجَعَلۡنَا مِنۡهُمۡ ﴾ واتـە: لـە نەوەکانـی ئیسـرائیل ﴿ أَئِمَّةٗ يَهۡدُونَ بِأَمۡرِنَا ﴾ واتە: زانا بە شـەرعو ڕێگاکانی هیدایـەت، خۆیان هیدایەتیـان وەرگرتووەو خەڵکیـش هیدایەت دەدەن بـەو هیدایەتـە، ئـەو کتێبەی بۆیـان دابەزیـوە ڕێنماییـە، ئەوانەشـی بڕوایان پێـی هەیە دوو جۆرن:

پێشـەوان ڕێنمایـی خەڵـک دەکـەن، وە شـوێنکەوتووانیان ڕێنماییان لەوانـەوە وەرگرتووە، جۆرێکیـان: بەرزتریـن پلەیـان هەیە لـە دوای پلـەی پێغەمبەرایەتـیو نێردراوێتـی، ئەویش پلـەی ڕاسـتگۆیانە، ئـەو پلـە بەرزەیـان چـۆن بەدەسـتهێناوە بـە هـۆی ئارامگرتن لەسـەر فێربـوونو فێر کـردنو بانگـەواز کـردن بۆ لای خـوا، وە ئازاردان لـە پێناویدا، وە نەفسـیان گرتۆتـەوە لـە سـەرپێچی کردنو لـە ڕۆچـوون لـە ئارەزووبازیدا.

﴿ وَكَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يُوقِنُونَ ﴾ واتـە: لـە بـڕوا بـوون بـە ئایەتەکانـی خـوا گەیشـتنە پلەو پایـەی دڵنیایی، ئەویش زانسـتی تـەواوە بە کردار، چۆن گەیشـتن بە پلەی یەقیـنو دڵنیایی، چونکـە ئەوان فێری زانسـتی ڕاسـتەقینە بـوون، وە بابەتەکانیـان وەرگرت لـە بەڵگەکانیەوە کـە دڵنیایی پێویسـت دەکات.

ئـەوان بـەردەوام فێـری بابەتـەکان دەبـوون، وە بەڵگەیـان بۆ دەهێنایـەوە بە بەڵگـەی زۆر، هەتـا گەیشـتن بەوە، جا بـە ئارامگرتـنو دڵنیابوون پێشـەوایەتی لـە ئایندا بەدەسـت دێت، چەندیـن بابـەت هەیە نەوەکانی ئیسـرائیل جیاوازیان تیایدا هەبوو، هەندێکـی حەقی پێکابوو، هەندێکـی دیکەیـان تووشـی هەڵـە بـوو، یـان بە ئەنقسـت، وە خـوا ﷻ ﴿ يَفۡصِلُ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُواْ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ ﴾، (واتـە: بێگومـان پەروەردگـارت بڕیار دەدات لە نێـوان بەندەکانیـدا لـە ڕۆژی قیامەتـدا، لـەوەی ئەوان تیایـدا جیاواز بـوون)، بەڕاسـتی ئەم قورئانــە دەیگێڕێتــەوە بــۆ نەوەکانـی ئیسـرائیل زۆربـەی ئەو مەسـەلانەی جیاوازیـان تیایدا هەیـە، هـەر جیاوازیـەک لە نێوانیانـدا بووبێت، دەبینرێ لـە قورئان یەکێک لەو دوو قسـەیە بەڕاسـت دانـراوە، ئەو قورئانـە حەقە، جگە لـەو قورئانە هەر شـتێ پێچەوانـەی بێت پووچە.

(٢٦-٢٧): ﴿ أَوَلَمۡ يَهۡدِ لَهُمۡ كَمۡ أَهۡلَكۡنَا مِن قَبۡلِهِم مِّنَ ٱلۡقُرُونِ يَمۡشُونَ فِي مَسَٰكِنِهِمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٍۚ أَفَلَا يَسۡمَعُونَ ٢٦ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّا نَسُوقُ ٱلۡمَآءَ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ ٱلۡجُرُزِ فَنُخۡرِجُ

بِهِۦ زَرۡعٗا تَأۡكُلُ مِنۡهُ أَنۡعَٰمُهُمۡ وَأَنفُسُهُمۡۚ أَفَلَا يُبۡصِرُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾:

﴿ أَوَلَمۡ يَهۡدِ لَهُمۡ ﴾ واتــە: ئایــا ڕوون نەبووەتــەوە بۆ ئەوانــەی پێغەمبەریان بــە درۆدەزانی، وە ڕێنماییــان بــکات بۆ ڕێگــای ڕاســت، ﴿ كَمۡ أَهۡلَكۡنَا مِن قَبۡلِهِم مِّنَ ٱلۡقُرُونِ ﴾ (واتە: کــە ئێمە پێــش ئەمان زۆر گــەلو نەتەوەمان لەناو بــرد) ئەوانەی ڕێگای ئەوانیــان گرتەبەر، ﴿ يَمۡشُونَ فِي مَسَٰكِنِهِمۡۚ ﴾ (واتــە: ئەمــان بــە شــوێن خانــووە وێــران کراوەکانــی ئەوانــدا هاتــوو چــۆ دەکەن)، بە چــاوی خۆیــان دەیبینن، وەک گەلــی هوودو صاڵــحو گەلی لووط. ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٍۚ ﴾ (واتــە: بــە ڕاســتی لەوانــدا چەند بەڵگــەی گەورە هەیــە) دەکرێت بــە بەڵگە لەســەر ڕاســتی ئــەو پێغەمبەرانەی بۆ ناو ئــەوان هاتــوون، وە بەتاڵی ئــەوەی ئەوان لەســەری بوون لــە هاوبەش دانــانو خراپەکاریی، وە لەســەر ئەوەی هەرکەســێ وەکو ئەوان ڕەفتــار بــکات، پێــی دەکرێ وەک چۆن بە هاوشــێوەکانی پێشــووی کرا، وە لەســەر ئەوەی خــوا پاداشــتی بەندەکانی دەداتــەوەو زیندوویــان دەکاتەوە بــۆ کۆکردنەوەو هــاوارو بانگ کردنــی یەکتــری، ﴿ أَفَلَا يَسۡمَعُونَ ﴾ (واتــە: ئایــا ئەوانە نابیســتن) ئایەتو نیشــانەکانی بــۆ ئــەوەی پێــی ژێر بــنو ســوودی لێوەربگرن، جــا ئەگــەر بیســتنێکی ڕاســتو عەقڵێکی تەواویــان بووایــە، لەســەر حاڵەتێــک نەدەمانەوە ببێتــە مایەی لە نــاو چوونیان.

﴿ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ ﴾ (ئایــا) بــە چاوەکانیــان نیعمەتەکانــی ئێمــە نابینــن، وە تــەواوی حیکمەتەکانمــان، ﴿ أَنَّا نَسُوقُ ٱلۡمَآءَ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ ٱلۡجُرُزِ ﴾ (واتــە: کــە ئێمە ئــاو دەنێرین بۆ زەوی وشــکی بــێ ڕووەک) کــە ســەوزی تیــادا نیــە، خــوا بارانــی بۆ دەنێــرێ کە پێشــتر بوونــی نەبــووە تیایدا، لــەوێ هــەورەکان بەتاڵ دەکاتــەوە، یان لە دەریــاکان ﴿ فَنُخۡرِجُ بِهِۦ زَرۡعٗا ﴾ واتــە: گــژو گیا دەڕوێ بــە هەموو جۆرەکانــی ﴿ تَأۡكُلُ مِنۡهُ أَنۡعَٰمُهُمۡ ﴾ ئەویش کــژو گیــای ئاژەڵەکانــە ﴿ وَأَنفُسُهُمۡۚ ﴾ خواردمەنــی مرۆڤەکانــە.

﴿ أَفَلَا يُبۡصِرُونَ ﴾ (واتــە: دەی ئایــا ئــەوان نابینــن) ئــەو چاکــەو منەتانــەی کــە خــوا وڵاتو بەندەکانــی پــێ زینــدوو کردوەتــەوە، تــا بــە هــۆی ئــەو بینیــنو ســەرنجدانەوە هیدایــەت وەربگــرن بــۆ ڕێگــای ڕاســت، بــەڵام کوێــری زاڵــە بەســەریاندا، بێئاگاییــش باڵــی بەســەریاندا کێشــاوە، تەماشــایان نەکــردوە بــە تەماشــاکردنی پیــاوی ڕەســەنو ژیــر، بەڵکــو بــە چــاوی بێئاگاییــەوە تەماشــایان کــردوە، وە وەکــو نەریــت، بۆیــە ســەرکەوتوو نەبــوون بــۆ خێــر.

(٢٨-٣٠): ﴿ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلۡفَتۡحُ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٢٨﴾ قُلۡ يَوۡمَ ٱلۡفَتۡحِ

لَا يَنفَعُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِيمَـٰنُهُمۡ وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ ﴿٢٩﴾ فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ وَٱنتَظِرۡ إِنَّهُم مُّنتَظِرُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾:

تاوانباران پەلە دەکەن لە سزادان کە پەیمانیان پێدرابوو لەسەر بەدرۆ دانان، بە هۆی نەفامیو عینادیانەوە، ﴿وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَـٰذَا ٱلۡفَتۡحُ﴾ (واتە: دەیانوت ئەم حوکمو بڕیارەی قیامەت کەی دەبێت)، کە بڕیار دەدات لە نێوانی ئێمەو ئێوە، بە سزادانمان بە بۆچوونی ئێوە ﴿إِن كُنتُمۡ﴾ (ئەگەر ئێوە) ئەی پێغەمبەران ﴿صَـٰدِقِينَ﴾ (ڕاستگۆن) لە بانگەوازەکەتان؟ ﴿قُلۡ يَوۡمَ ٱلۡفَتۡحِ﴾ (واتە: بڵێ: ڕۆژی بڕیاردان) کە سزای تێدا بەدەست دەهێنن، هیچ سوودێکی بۆتان نابێ، جا بۆیە مۆڵەتان پێدراوە بەڵکو پەند لەوە وەربگرن لەدەستتان چووە، ئەمەش کاتێ دەبێ دڵنیابن، بەلام ئەگەر ڕۆژی بڕیاردان هات، هەموو شتێ کۆتایی پێدێت ﴿لَا يَنفَعُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِيمَـٰنُهُمۡ﴾ چونکە ئەوکات ئیمان هێنان پێویست دەبێ ﴿وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ﴾ واتە: مۆڵەت بدرێن سزایان بۆ دوابخرێت، خەمێکی خۆیان بخۆن.

﴿فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ﴾ (واتە: ڕوویان لێوەرگێڕە) کاتێ دواندنەکانیان گەیشتە حاڵەتی نەفامیو پەلەکردن لە سزادان ﴿وَٱنتَظِرۡ﴾ (تۆ چاوەڕوانی بکە) ئەو کارەی بەسەریاندا دێت، بێگومان هەر دەبێ ببێ، بەلام کاتی دیاریکراوی هەیە، ئەگەر هات نە پێش دەکەوێو نە دوادەکەوێ، ﴿إِنَّهُم مُّنتَظِرُونَ﴾ (ئەوانیش چاوەڕوانی) مردنی تۆ دەکەن، وە چاوەڕوانی ئەوە دەکەن بەسەرهاتی خراپتان بەسەردا بێت، سەرەنجام بۆ خۆپارێزانە.

تەفسیری سوورەتی (السجدة) تەواو بوو.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ ٱتَّقِ ٱللَّهَ وَلَا تُطِعِ ٱلْكَـٰفِرِينَ وَٱلْمُنَـٰفِقِينَ ۗ إِنَّ
ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١﴾ وَٱتَّبِعْ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيْكَ
مِن رَّبِّكَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿٢﴾ وَتَوَكَّلْ
عَلَى ٱللَّهِ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿٣﴾ مَّا جَعَلَ ٱللَّهُ لِرَجُلٍ مِّن
قَلْبَيْنِ فِى جَوْفِهِۦ ۚ وَمَا جَعَلَ أَزْوَٰجَكُمُ ٱلَّـٰٓـِٔى تُظَـٰهِرُونَ
مِنْهُنَّ أُمَّهَـٰتِكُمْ ۚ وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَآءَكُمْ أَبْنَآءَكُمْ ۚ ذَٰلِكُمْ قَوْلُكُم
بِأَفْوَٰهِكُمْ ۖ وَٱللَّهُ يَقُولُ ٱلْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِى ٱلسَّبِيلَ ﴿٤﴾
ٱدْعُوهُمْ لِـَٔابَآئِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ فَإِن لَّمْ تَعْلَمُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ
فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمْ ۚ وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَآ
أَخْطَأْتُم بِهِۦ وَلَـٰكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ
غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٥﴾ ٱلنَّبِىُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ ۖ
وَأَزْوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَـٰتُهُمْ ۗ وَأُو۟لُوا۟ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ
فِى كِتَـٰبِ ٱللَّهِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُهَـٰجِرِينَ إِلَّآ أَن تَفْعَلُوٓا۟ إِلَىٰٓ
أَوْلِيَآئِكُم مَّعْرُوفًا ۚ كَانَ ذَٰلِكَ فِى ٱلْكِتَـٰبِ مَسْطُورًا ﴿٦﴾

## تەفسیری سوورەتی (الأحزاب)

## مەككیە (٧٣) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٣): ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ ٱتَّقِ ٱللَّهَ وَلَا تُطِعِ ٱلْكَـٰفِرِينَ وَٱلْمُنَـٰفِقِينَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١﴾ وَٱتَّبِعْ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿٢﴾ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿٣﴾ ﴾:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ ٱتَّقِ ٱللَّهَ وَلَا تُطِعِ ٱلْكَـٰفِرِينَ وَٱلْمُنَـٰفِقِينَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴾ واتە: ئەی ئەو كەسەی خوا ﷻ منەتی كردوە بەسەریدا بە پێغەمبەرایەتی، وە تایبەتی كردوە بە وەحیو فەزڵو چاكەی خۆی بەسەر هەموو بەدیهێنراوەكان، سوپاس گوزاری نیعمەتی خوا بە، بە ئەنجامدانی خۆپارێزی كە تۆ لە پێشتری بە بەجێهێنانی لە غەیری خۆت، وە ئەوەی پێویستە لەسەر تۆ لە خۆپارێزی مەزنترە لە جگە لەتۆ، كەوابوو فەرمان بەرداری فەرمانەكانو قەدەغەكراوەكانی بە، وە پەیامەكەی بگەیەنە وە وەحی خوا بۆلای بەندەكانی بەجێ بێنە، وە هەرچی لەتواناتدایە لە ئامۆژگاری بۆ خەڵكی دریغی مەكە.

بـا هیچ بەربەستێک لەم پێناوەدا نەبێتە بەربەستت، وە هیچ ڕێگریەک ڕێگریت لێنەكات بۆئەو مەبەستە، گوێ لەو بێبڕوایە مەگرە كە بەئاشكرا دژایەتی خواو پێغەمبەرەكەی دەكات، هەروەها دوو ڕوویەكیش كە كوفرو بەدرۆدانانی لە ناخیدا شاردۆتەوە پێچەوانەكەی دەرخستووە. ئەوانە بەڕاستی دوژمنن، بەگوێیان مەكە لە هەندێ لە كاروبارەكاندا كە پێچەوانەی خۆپارێزیەو هەڵیدەوەشێنێتەوە، وە شوێنی هەواو ئارەزوویان مەكەوە، لە ڕێگای ڕاست لاتدەدەن، ﴿ وَٱتَّبِعْ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ﴾ (واتە: بەڵام شوێنی ئەو وەحیە بكەوە كە لە پەروەردگارتەوە بۆت كراوە) تەنها ئەوە هیدایەتو

میهرەبانیە، وە بەو شوێنکەوتنە ئومێدی پاداشتی پەروەردگارت بکە، بەڕاستی خوا بەوەی دەیکەن ئاگادارە، پاداشتان دەداتەوە بەپێی ئەوەی دەیزانێ لەبارەتانەوە لە خێرو شەڕ. ئەگەر لە دڵتدا شتێک دروست بوو، ئەگەر بە گوێیان نەکەی لە هەواو ئارەزووە گومڕاکەرەکەیاندا ئەوە تووشی زیان دەبی، یان ناتەواویەک لە ڕێنمایی خەڵکدا بەدەست دێ، ئەوە لە نەفسی خۆت دوور بخەرەوە، چی لە تواناتدایە بەکاری بهێنە بۆ بەرگری کردن لەوەو غەیری ئەوەش، ئەویش بریتیە لە پشت بەستن بە خوا، بەوەی کە پشت بە پەروەردگارت ببەستی بە پشت بەستنێک، بە پشت بەستنی کەسێک کە هیچی لە توانادا نیە بۆ نەفسو دەروونی لە زیانو قازانج، وە لە مردنو ژیانو زیندوو بوونەوە، لە سەلامەتیت لە شەڕو خراپەی ئەوان، وە لە بەجێهێنانی ئەو ئاینەی فەرمانت پێکراوە، وە متمانە بەخوا بکە لە بەدەستهێنانی ئەو کارەدا ﴿ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴾ (خوا بەسە پارێزەر بێ) پشتی پێ ببەسترێ لە هەموو کاروبارەکاندا، ئەوەی سوودی هەبێ بۆ بەندەکەی بەوە هەڵدەستێ، ئەویش بە هۆی ئەوەی بە بەرژەوەندی بەندەکەی دەزانێ لەو ڕووەی کە بەندەکەی پێی نازانێ، وە توانای لەسەر گەیاندنی پێی لەو ڕووەی بەندە دەسەڵاتی بەسەریدا نیە، ئەو زاتە میهرەبانترە بە بەندەکەی لە خۆیو لە باوکو دایکی، وە بە بەزەییترە پێی لە هەموو کەسێ بە تایبەت بەندە تایبەتەکانی کە بە بەردەوام چاکەیان لەگەڵدا دەکات بە چاکەکانی، وە نازونیعمەتە ئاشکراو نهێنیەکانی دەبارێنێ بەسەریاندا، بە تایبەت فەرمانی پێکردوەو بە گەیشتنی کاروبارەکانی بۆ لای، وە پەیمانی پێداوە.

ئەوکات پرسیار ناکات لە هەرکارێکی ئاسان بکرێت،، وە نارەحەتیەک سووک بکرێت، وە داواکاریەکان ئاسان بکرێ، وە نارەحەتیەکان لاببرێ، وە بارودۆخەکانو پێویستیەکان بڕیاری لەسەر بدرێ، وە فەڕو بەرەکەتەکان دابەزێ، وە بەڵاو ناخۆشی ڕەت بکرێتەوەو شەڕو خراپە بەرز ببێتەوە، ئەو کات دەبینی بەندەیەکی لاواز کە خوا کاری بۆ ئاسان کردوە بۆ گەورەکەی بە هەندێ کاروبار هەڵدەسێ، ئۆممەتێک لە خەڵکی ناتوانن ئەنجامی بدەن، خوا ﷻ هەندێ شتی بۆ ئاسان دەکات کە قورسو گرانە بەسەر پیاوە گەورەو مەزنەکان، وە پشت بە خوا دەبەسترێ.

(٤-٥): ﴿ مَّا جَعَلَ ٱللَّهُ لِرَجُلٍ مِّن قَلْبَيْنِ فِى جَوْفِهِۦ ۚ وَمَا جَعَلَ أَزْوَٰجَكُمُ ٱلَّٰٓـِٔى تُظَٰهِرُونَ مِنْهُنَّ أُمَّهَٰتِكُمْ ۚ وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَآءَكُمْ أَبْنَآءَكُمْ ۚ ذَٰلِكُمْ قَوْلُكُم بِأَفْوَٰهِكُمْ ۖ وَٱللَّهُ يَقُولُ ٱلْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِى

ٱلسَّبِيلَ ﴿٤﴾ ٱدۡعُوهُمۡ لِأٓبَآئِهِمۡ هُوَ أَقۡسَطُ عِندَ ٱللَّهِۚ فَإِن لَّمۡ تَعۡلَمُوٓاْ ءَابَآءَهُمۡ فَإِخۡوَٰنُكُمۡ فِي ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمۡۚ وَلَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٞ فِيمَآ أَخۡطَأۡتُم بِهِۦ وَلَٰكِن مَّا تَعَمَّدَتۡ قُلُوبُكُمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمًا ﴿٥﴾ ﴾:

**خـوا ﷻ سەرزەنشـتی بەندە کانـی دەکات لە قسـە کردن دەربارەی شـتێ هیـچ حەقیقەتێکی نەبـێ لەنـاو قسـە کاندا، وە خـوای گـەورە دای نەنابـێ هەروەکـو وتوویانـە، بە ڕاسـتی ئەم قسـەیە لـە لایـەن ئێـوەوە درۆو هەڵبەسـتراوە، شـتی خراپـی لـە شـەریعەتدا لە سـەر ڕێک دەخـرێو دادەمـەزرێ. ئـەم دەقـە بنەمایەکی گشـتگیرە لـە قسـەکردن لە هەموو شـتێکدا، وە هـەواڵ دان بـە ڕووداوو بوونـی شـتانێک کـە خـوای بـەرزو مـەزن داینەنـاوە، بـەڵام خـوا ﷻ ئـەم شـتە باسـکراوانەی تایبـەت کردوە بـە هـۆی ڕوودانـیو، وە زۆر پێویسـتی بـە ڕوونکردنەوەیان، جـا فەرموویەتـی: ﴿ مَّا جَعَلَ ٱللَّهُ لِرَجُلٖ مِّن قَلۡبَيۡنِ فِي جَوۡفِهِۦۚ ﴾ (واتە: خـوا داینەنـاوە بـۆ هیچ پیاوێـک دوو دڵ لە ناو سـنگیدا) ئەمـە هەرگیز ڕوونـادات، دەخیلە بـە کەسـێک نەڵێـن: ئەو پیـاوە دوو دڵـی هەیە، ئـەو کاتە ئێوە دروسـتکراوی خـوا بە درۆ دەزانن.**

**﴿ وَمَا جَعَلَ أَزۡوَٰجَكُمُ ٱلَّٰٓـِٔي تُظَٰهِرُونَ مِنۡهُنَّ ﴾ (واتـە: خـوا ئـەو هاوسـەرانەتانی نەکردۆتـە دایکتـان کـە (ظهـار) یـان لەگـەڵ دەکەن) بـەوەی کەسـێکتان بـە خێزانەکەی دەڵـێ: تۆ وەک پشـتی دایکـم وای، یان وەک دایکمـی، خوا خێزانەکانتانـی دانەناوە بە ﴿ أُمَّهَٰتِكُمۡۚ ﴾ واتـە: دایکانتـان، دایکـت ئەو کەسـەیە تۆی لێ بـووە، بەمەش بوەتـە مەزنترینـی ئافرەتانێ بەسـەرتەوە لـە ڕووی حەرامیو قەدەغەکراویـەوە، وە خێزانەکەت حەڵاڵترین کەسـە بۆ تۆ، چـۆن یەکێـک لەو دوو دژ یەکـە بەویتر دەشـوبهێنی؟ ئەمـە کارێکی نادروسـتە هەروەکو خـوا فەرموویەتـی: ﴿ ٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِنكُم مِّن نِّسَآئِهِم مَّا هُنَّ أُمَّهَٰتِهِمۡۖ إِنۡ أُمَّهَٰتُهُمۡ إِلَّا ٱلَّٰٓـِٔي وَلَدۡنَهُمۡۚ وَإِنَّهُمۡ لَيَقُولُونَ مُنكَرٗا مِّنَ ٱلۡقَوۡلِ وَزُورٗاۚ ﴿٢﴾ ﴾ المجادلة، (واتـە: ئەوانەتـان کە زیهـار دەکـەن لەگـەڵ ژنەکانیانـدا ئـەوان دایکـی ئـەوان نیـن دایکی ئـەوان ئـەو ژنانەن ئەوانیـان لـێ بـووە، وە بێگومـان ئـەوان گوفتارێکی خراپی ناپەسـند دەڵێـن)، ﴿ وَمَا جَعَلَ أَدۡعِيَآءَكُمۡ أَبۡنَآءَكُمۡۚ ﴾ (خـوا بـە کـوڕ کراوانتانـی نەکردوە بـە کوڕتان) وە بە کـوڕ کردنی منـداڵ کـە کەسـێک دەیکـرد بـە کـوڕی لـە کاتێکـدا منداڵی ئـەو نەبـوو، یان بـە ناوی ئـەوەوە بانـگ دەکـرا بـە هـۆی ئـەوەی کردوویەتی بـە کـوڕی، کە دیـارە ئـەم کارە لە نەفامیـدا باوبوو، وە لە سـەرەتای ئیسـلامیش هەبوو، خوا ویسـتی بەتاڵی بکاتو بیسـڕێتەوە،**

سـەرەتا خراپـەو ناشـرینی ئاشـکرا کـردوە کـە ئـەوە پـووچو بەتـاڵو درۆیـە، وە هەموو بەتـاڵو درۆیـەک لـە شـەرعدا بوونی نیـەو بەندەکانـی خوای پێ وەسـف ناکـرێ، خوا ﷻ دەفەرمـوێ: خـوا ئـەو بـە کـوڕ کراوانەتـان کـە بانگیـان دەکـەن، یـان بـە نـاوی ئێوەوە بانـگ دەکرێـن نەیکـردوە بـە کـوڕی ئێـوە، چونکـە بەڕاسـتی منداڵەکانتـان ئەوانەن کە لـە ئێـوە بـوون. بـەڵام بـە کـوڕ کراوەکانتان لـە غەیری ئێـوە خوا ئەمـەی دانەنـاوە وەکو ئـەوە، ﴿ ذَٰلِكُمْ ﴾ ئـەو قسـەی، کـە دەیڵێـن: ئەوە کـوڕی فلان کەسـە کـە کردوویەتی بـە کـوڕی، یـان ئـەوە باوکی فـلان کەسـە ﴿ قَوْلُكُم بِأَفْوَٰهِكُمْ ﴾ واتـە: قسـەیەک هیچ حەقیقـەتو واتایەکـی نیـە، ﴿ وَٱللَّهُ يَقُولُ ٱلْحَقَّ ﴾ واتە: (خوا قسـەی دڵنیاکەرەوەو ڕاسـت دەڵێ) لەبـەر ئەوەیە فەرمانی پێکردوون بە شـوێنکەوتنی لە قسـەو شـەریعەتەکەیدا، بێگومان قسـەی حەقـە، شەریعەتەکەشـی حەقـە، وە کردارو گوفتـارە نهێنیـەکان نادرێنە پـاڵ ئەو بە جـۆرێ لە جـۆرەکان، وە لـە ڕێنماییەکانی ئـەو نیە، چونکـە هیدایەتو ڕێنمایـی ناکات بۆ ڕێگـای ڕاسـتو دروسـت نەبێ، ئەگەرچـی هەموو ئەوانە بە ویسـتو ئیرادەی گشـتی خوا ڕوو دەدەن لـە خێرو شـەڕ.

پاشـان بـە ئاشـکرا باسـی وازهێنانـی حاڵەتـی یەکەمـی کـردوە، کـە قسـەی پـووچ لەخۆ دەگـرێ، فەرموویەتـی: ﴿ ٱدْعُوهُمْ ﴾ ئەوانـەی بانگیـان دەکـەن ﴿ لِءَابَآئِهِمْ ﴾ واتـە: ئەوانـەی ئـەو منداڵانەیـان بـووە ﴿ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ ﴾ واتـە: دادپەروەرانەترو ڕاسـترو چاکتـرە لـە لای خـوا ﴿ فَإِن لَّمْ تَعْلَمُوٓاْ ءَابَآءَهُمْ ﴾ (واتە: ئنجـا ئەگەر باوکیان نەناسـن) باوکـە ڕاسـتەقینەکانیان ﴿ فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمْ ﴾ واتـە: بـرای ئاینیو دۆسـتی ئێـوەن لـە ئاینـدا، بە برایەتـی ئیمانی ڕاسـتەقینە بانگیـان بکەنو پشـتیوانیان لێبکەن لەسـەر ئـەوە، جـا وازهێنان لـە بانگکردنی ئەوانـەی کە کراون بە کوڕ شـتێکی حەتمیەو دروسـت نیـە بەکاربهێنـرێ، بـەڵام بانگکردنیـان بـە ناو باوکیانـەوە، ئەگـەر زانیان بانگیـان دەکەن، ئەگـەر باوکیان نەناسـن ئـەوە بە بـرای ئاینیو دۆسـتو خۆشەویسـت بانگیـان دەکەن، با وا گومـان نەبـەن لـە کاتـێ زانیاریان نەبوو دەربـارەی باوکـی ڕاسـتەقینەیان عوزریان هەیە بـە نـاو ئەو کەسـانەی کردوویانـن بە کوڕی خۆیـان بانگیان بکـەن، چونکە مەترسـی بەوە لاناچێت.

﴿ وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَآ أَخْطَأْتُم بِهِۦ ﴾ (واتـە: هیـچ گوناهێکتـان لەسـەر نیـە لەو بانـگ کردنەدا کـە بە نەزانیـن گوتبێتیـان) بەوەی پێشـکەوتبێ لەسـەر زمانـی یەکێکتان،

بانگــی کەســێکی کردبــێ کرابێ بــە کوڕی کەسـێکی دیکــە، ئەمــە گوناهی ناگــات، یان بــە ڕووکــەش باوکی ناسـیبێ، بەو جــۆرە بانگی کردبــێ بەڵام لــە ناوەڕۆکدا باوکــی نەبێ، ئــەوە ئێــوە هیچتان لەســەر نیــە، ئەگــەر هەڵە بێــت، ﴿ وَلَٰكِن ﴾ (بــەڵام) گوناهبــار دەبن بــەوەی ﴿ مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ ﴾ (واتــە: ئەگــەر بەدڵو بە ئەنقســت بێت) لەو قســانەی کە دروســت نیە.

﴿ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ لێتــان خــۆش بــووەو بەزەیــی پێتانــدا هاتووەتــەوە، کاتــێ ســزای نەداون بــەوەی ڕۆیشــتووە، وە لێتان خۆش بووە بــەو هەڵەی کردووتانــە، وە ڕەحمی لێکــردوون کاتــێ بڕیارەکانــی بۆتانــی ڕوون کردوەتــەوە، کــە دەگونجــێ لەگــەڵ دیــن‌و دونیاتــان، ســتایش هــەر بۆ خــوای بەرزە.

(٦): ﴿ النَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ ۖ وَأَزْوَاجُهُ أُمَّهَاتُهُمْ ۗ وَأُولُو الْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللَّهِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُهَاجِرِينَ إِلَّا أَن تَفْعَلُوا إِلَىٰ أَوْلِيَائِكُم مَّعْرُوفًا ۚ كَانَ ذَٰلِكَ فِي الْكِتَابِ مَسْطُورًا ﴿٦﴾ ﴾:

خــوا ﷺ هــەواڵ دەدا بــە بــڕواداران بــە هەواڵێــک حاڵــەت‌و پلــەو پایــەی پێغەمبــەر ﷺ پێ دەناســنەوە، مامەڵــەی لەگەڵــدا دەکــەن بە پێــی ئەو حاڵەتــە، جــا فەرموویەتی: ﴿ النَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ ﴾ (واتــە: پێغەمبــەر ﷺ لە خودی بــڕواداران) نزیکترو لەپێشــترە لە نەفســی خۆیــان، چونکە ئــەو ﷺ خۆی بەخت کــرد بە ئامۆژگاری‌و ســۆزو بەزەیــی‌و نەرم‌و نیانــی لەگەڵیــان، پێغەمبــەر ﷺ گەورەترین منەتی هەیە بەســەریانەوە لە هەمــوو کەس زیاتر، بێگومــان بــە قــەد گەردیلەیەک خێریــان پێنەگەیشــتووەو شــەڕیان لــێ دوور نەخراوەتەوە، تەنهــا لەســەر دەســتی ئەو بــووەو ئەویش هــۆکاری بووە.

بۆیــە پێویســتە لەســەری ئەگەر خواســتی نەفــس دژ بە یــەک بوو، یــان خواســتی یەکێ لە خەڵکــی، لەگــەڵ خواســتی پێغەمبــەر ﷺ، بێگومــان نابــێ قســەی پێغەمبەر ﷺ بخاتە ئاســتی قســەی هەرکەســێکی دیکــە، هەرکــێ بێــت، وە پێویســتە نەفــس‌و مــاڵ‌و منداڵیــان بەخت بکــەن لــە پێنــاو پێغەمبــەردا، وە خۆشەویســتی پێــش بخــەن بەســەر خۆشەویســتی هەمــوو دروســتکراودا، هیــچ نەڵێــن تــا ئــەو دەفەرمــوێ، لــە هیچ شتێکیشــدا پێشــی نەکــەون، ئەو باوکــی بڕوادارانــە، هــەر وەک لە خوێندنــەوەی هەندێ لــە هاوەڵاندا هاتــووە، پەروەردەیان دەکات وەک چــۆن بــاوک منداڵەکــەی پــەروەردە دەکات.

جــا دامەزراوە لەســەر ئــەم باوکایەتیە، خێزانەکانی دایکــی بڕوادارانن، واتە: لــە ڕووی حەرام

بــوونو ڕێزگرتنــەوە، نــەک لــە مانەوە بــە تەنها لــە گەڵیــدا چونکە ئــەوە قەدەغــە کراوە، ئەمــەش وەکــو پێشــەکیەکە کــە تۆزێکــی تر باســی لێــوە دەکرێت لــە چیرۆکــی زەیدی کــوڕی حاریســە، کە پێشــتر بانگ دەکرا بــە (زەیدی کــوڕی موحەممەد) تا خــوا دایبەزاند ﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ ﴾ الأحـزاب، ڕەچەڵـەکو دانەپاڵـی پچڕاند.
لــەم ئایەتــەدا خــوا هەواڵیــداوە بــڕواداران هەموویــان منداڵــی پێغەمبــەرن ﷺ، هیــچ کــەس تایبەتمەنــدو چاکتــر نیــە لەوی دیکە، ئەگــەر دانەپاڵی بانگ کــردن لە یەکێکیــان بپچڕێت، بــە ڕاســتی پەیوەنــدی ئیمانــی لێی دانابــڕێ، بــا خەمبار نەبــێو ئاخ هەڵنەکێشــێ.
وە دامــەزراوە کــە خێزانەکانــی پێغەمبــەر ﷺ دایکانــی بڕوادارانــن، ئــەوان حــەڵاڵ نیــن بۆ کەسێک دوای ئــەو ﷺ، وەک چــۆن خــوا بــە ڕوونــی باســی کــردوە: ﴿ وَلَآ أَن تَنكِحُوٓاْ أَزْوَٰجَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦٓ أَبَدًا ﴾(واتــە: هەرگیــز نابــێ خێزانەکانــی دوای ئــەو مــارە بکــەن).
﴿ وَأُوْلُواْ ٱلْأَرْحَامِ ﴾ واتــە: نزیکــەکان، خزمــی نزیــک بن یــان دوور، ﴿ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِى كِتَٰبِ ٱللَّهِ ﴾ لــە حوکمــی خــوادا، هەندێکیــان بــەش لــەوی دیکــە دەبەن، وە هەندێکیــان چاکــە لەگــەڵ ئــەوی دیکــەدا دەکەن، ئــەوان لە پێشــترن لــە هاوپەیمانیو سەرخستن، وە ئــەو بــە کوڕ کراوانــەی پێشــتر میراتیان دەبرد بــەم هۆکارەوە بەبــێ ئەوەی خزمــی نزیــک بن، خوا ﷻ ئــەو میراتیــەی پچڕاندو داینا بــۆ خزمان، وەک ســۆزو بەزەییو حیکمەتێــک لەلایــەن خۆیــەوە، چونکــە ئەگــەر کارەکــە بــەردەوام بووایە لەســەر نەریتی پێشــوو ئەوە فەســادو شــەڕو خراپــەکاریو بێبەشــبوونی خزمان لــە میرات دروســت دەبوو.
﴿ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ ﴾ واتە: یەکســانە ئەو خزمە نزیکانــە بڕواداری کۆچکردوو بــن، یــان کۆچکــردوو نەبن، چونکــە خزمە نزیکــەکان لە پێشــترن لــەو بوارەدا، ئــەم دەقە بەڵگەیــە لەســەر خاوەندارێتــی خزمە نزیکــەکان لە هەمــوو ڕووەکانــی خاوەندارێتی، وەک خــاوەن دارێتــی مارەبڕیــنو مــاڵو ســامانو جگــە لەوانیــش، ﴿ أَن تَفْعَلُوٓاْ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِكُم مَّعْرُوفًا ﴾ (واتــە: مەگــەر چاکەیــەک بــە دۆســتو خۆشەویســتانتان بکــەن)، واتــە: ئەو دۆســتو خۆشەویســتانە مافێکــی فەرزکراویــان نیــە، بەڵکو ئەوە بە ویســتی ئێوەیــە، ئەگەر ویســتان پێیــان دەبەخشــنو پێیــان دەدەن وەک چاکەیەک ﴿ كَانَ ﴾ ئــەو حوکمەی کە لە پێشــەوە باســکرا ﴿ فِى ٱلْكِتَٰبِ مَسْطُورًا ﴾ (واتــە: بێگومــان نوســراوەو خــوا داینــاوە هەردەبــێ جێبەجــێ ببێ).

وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِيثَٰقَهُمۡ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٖ وَإِبۡرَٰهِيمَ
وَمُوسَىٰ وَعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَۖ وَأَخَذۡنَا مِنۡهُم مِّيثَٰقًا غَلِيظٗا ٧
لِّيَسۡـَٔلَ ٱلصَّٰدِقِينَ عَن صِدۡقِهِمۡۚ وَأَعَدَّ لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابًا أَلِيمٗا
٨ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ جَآءَتۡكُمۡ
جُنُودٞ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِيحٗا وَجُنُودٗا لَّمۡ تَرَوۡهَاۚ وَكَانَ ٱللَّهُ
بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرًا ٩ إِذۡ جَآءُوكُم مِّن فَوۡقِكُمۡ وَمِنۡ أَسۡفَلَ
مِنكُمۡ وَإِذۡ زَاغَتِ ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَبَلَغَتِ ٱلۡقُلُوبُ ٱلۡحَنَاجِرَ
وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠ ١٠ هُنَالِكَ ٱبۡتُلِيَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَزُلۡزِلُواْ
زِلۡزَالٗا شَدِيدٗا ١١ وَإِذۡ يَقُولُ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم
مَّرَضٞ مَّا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ إِلَّا غُرُورٗا ١٢ وَإِذۡ قَالَت طَّآئِفَةٞ
مِّنۡهُمۡ يَٰٓأَهۡلَ يَثۡرِبَ لَا مُقَامَ لَكُمۡ فَٱرۡجِعُواْۚ وَيَسۡتَـٔۡذِنُ فَرِيقٞ
مِّنۡهُمُ ٱلنَّبِيَّ يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوۡرَةٞ وَمَا هِيَ بِعَوۡرَةٍۖ إِن يُرِيدُونَ
إِلَّا فِرَارٗا ١٣ وَلَوۡ دُخِلَتۡ عَلَيۡهِم مِّنۡ أَقۡطَارِهَا ثُمَّ سُئِلُواْ ٱلۡفِتۡنَةَ
لَأٓتَوۡهَا وَمَا تَلَبَّثُواْ بِهَآ إِلَّا يَسِيرٗا ١٤ وَلَقَدۡ كَانُواْ عَٰهَدُواْ
ٱللَّهَ مِن قَبۡلُ لَا يُوَلُّونَ ٱلۡأَدۡبَٰرَۚ وَكَانَ عَهۡدُ ٱللَّهِ مَسۡـُٔولٗا ١٥

(٧-٨): ﴿ وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِيثَٰقَهُمۡ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٖ وَإِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَۖ وَأَخَذۡنَا مِنۡهُم مِّيثَٰقًا غَلِيظٗا ﴿٧﴾ لِّيَسۡـَٔلَ ٱلصَّٰدِقِينَ عَن صِدۡقِهِمۡۚ وَأَعَدَّ لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابًا أَلِيمٗا ﴿٨﴾ ﴾:

خوا ﷻ هەواڵ دەدات ئەو پەیمانی وەرگرتووە لە پێغەمبەران بەگشتی، وە لەخاوەن عەزمەکان بەتایبەتی -ئەوانیش ئەو پێنج پێغەمبەرەن کە باسکراون- پەیمانی بەهێزوو پتەوی وەرگرت، لەسەر بەجێهێنانی ئاینی خواو جیهادکردن لە پێناویدا، وە ئەمە ڕێگایەکە پێغەمبەرانی پێشوو لەسەری ڕۆیشتوون، هەتا کۆتاییان هاتووە بە گەورەو بەڕێزترینیان موحەممەد ﷺ، وە فەرمانی کردوە بە خەڵکی پەیڕەویان بکەن.

لە داهاتوودا خوا پرسیار لە پێغەمبەرانو شوێنکەوتووانیان دەکات دەربارەی ئەم پەیمانە بەهێزو پتەوە، ئایا بە چاکی بەجێیان هێناوەو ڕاستیان کردوە؟ تا پاداشتیان بداتەوە بە بەهەشتانێ پڕ لە نازونیعمەت، یان بێبڕوا بوون پێی، سزایان بدات بە سزایەکی بە ئێش، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ رِجَالٞ صَدَقُواْ مَا عَٰهَدُواْ ٱللَّهَ ﴿٢٣﴾ ﴾، (واتە: لە ناو بڕواداراندا پیاوانێک هەن ڕاستیان کرد لە ئەو پەیمانەی دابوویان بە خوا).

(٩-١١): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ جَآءَتۡكُمۡ جُنُودٞ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِيحٗا وَجُنُودٗا لَّمۡ تَرَوۡهَاۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرًا ﴿٩﴾ إِذۡ جَآءُوكُم مِّن فَوۡقِكُمۡ وَمِنۡ أَسۡفَلَ مِنكُمۡ وَإِذۡ زَاغَتِ ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَبَلَغَتِ ٱلۡقُلُوبُ ٱلۡحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠ ﴿١٠﴾ هُنَالِكَ ٱبۡتُلِيَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَزُلۡزِلُواْ زِلۡزَالٗا شَدِيدٗا ﴿١١﴾ ﴾:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ جَآءَتۡكُمۡ جُنُودٞ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِيحٗا وَجُنُودٗا

﴿ لَمْ تَرَوْهَاۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴿٩﴾ إِذْ جَآءُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنكُمْ ﴾
خـوا ﷻ نـازو نیعمەتەکانـی دەخاتـەوە بیـر بەنـدە بڕوادارەکانـی، وە هانیـان دەدا لەسـەر سوپاسـگوزاری کردنـی کاتـێ لەشـکرێکی زۆریـان بۆهـات لـە خەڵکـی مەککـەو حیجـاز لـە سـەرروویانەوە، وە خەڵکـی نەجدیـش لـە خواریانـەوە، پەیمانیـان بەسـتو بڕیاریانـدا لەسـەر لەنـاو بـردنو ڕیشەکێشـکردنی پێغەمبـەرو هاوەڵانـی، لـە جەنگـی خەندەقـدا.

وە هـاوکارو یارمەتیدەرەکانیـان دەسـتەو تاقمەکانـی جوولەکـە بـوو لـە دەوروبـەری مەدینـە، بـە سـەربازی زۆر مـەزنو خەڵکـی زۆرەوە هاتـن، سـەنگەرو خەندەقـی پێغەمبـەر ﷺ لەسـەرووی مەدینـەوە بـوو، بێبڕوایـان دەوری مەدینەیـان داو کاریان لەسـەر مسـوڵمانان توونـد کـرد، دڵـەکان لـە ترسـدا گەیشـتبوونە گـەروو، هەتـا گومـانو دوو دڵـی لەلایـەن خەڵکـەوە گەیشـتە ئەوپـەڕی، ئەویـش کاتێ کـە ئـەو هـۆکارە پتەوانەیان بینـیو ئـەو نارەحەتیـە قورسـانە، بـەردەوام شـاری مەدینـە ئابڵۆقـە درابـوو بـۆ ماوەیەکی زۆر، کارەکەیـش بـەو شـێوەیە بـوو وەک خـوا وەسـفی کـردوە:
﴿ وَإِذْ زَاغَتِ ٱلْأَبْصَٰرُ وَبَلَغَتِ ٱلْقُلُوبُ ٱلْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠ ﴿١٠﴾ ﴾ (واتە: چاوەکان ئەبڵەق بوونو دڵەکان لە ترسدا گەیشتبوونە گەروو، وە گومانی جۆربەجۆرتان بە خوا دەبرد) واتە: گومانی خراپ کە خوا ﷻ ئاینەکەی سەرناخاتو پەیامەکەی تەواو ناکات، ﴿ هُنَالِكَ ٱبْتُلِيَ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴾ (واتە: لەوێدا ئیمانداران تاقیکرانەوە) بەم فیتنەو بەڵا مەزنە ﴿ وَزُلْزِلُوا۟ زِلْزَالًا شَدِيدًا ﴾ (واتە: وە ڕاوەشێنران بە ڕاوەشانێکی توند) بە ترسو دوو دڵیو برسێتی، ستایش بۆ خوا ئیمانو دڵنیاییان بە چاکی دەرکەوت کە بە هۆیەوە پێشی یەکەمینو دوایین کەوتن، وە کاتێ نارەحەتیەکان توند بوو وە بەچاو بینیانو دڵنیابوون ئیمانەکەیان بەهێزو پتەوتر بوو ﴿ وَلَمَّا رَءَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْأَحْزَابَ قَالُوا۟ هَٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥۚ وَمَا زَادَهُمْ إِلَّآ إِيمَٰنًا وَتَسْلِيمًا ﴿٢٢﴾ ﴾ لەوێدا دووڕوویی دوڕووەکان دەرکەوت، وە ئەوەیشی لە ناخیان بوو ئاشکرا بوو، وەک خوا ﷻ فەرموویەتی:
(١٢): ﴿ وَإِذْ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ مَّا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ إِلَّا غُرُورًا ﴿١٢﴾ ﴾
ئەمـە عـادەتو نەریتـی دووڕووە لـە کاتـی نارەحەتـیو ناخۆشـیدا ئیمانـی چەسـپاو و جێگیـر نابـێ، وە بـە عەقڵـە کـورت بینەکـەی تەماشـای دۆخـی ئێسـتا دەکاتو گومانەکـەی بـە ڕاسـت دەزانـێ.

(١٣): ﴿ وَإِذْ قَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْهُمْ يَٰٓأَهْلَ يَثْرِبَ لَا مُقَامَ لَكُمْ فَٱرْجِعُوا۟ ۚ وَيَسْتَـْٔذِنُ فَرِيقٌ مِّنْهُمُ ٱلنَّبِىَّ يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ وَمَا هِىَ بِعَوْرَةٍ ۖ إِن يُرِيدُونَ إِلَّا فِرَارًا ﴿١٣﴾ ﴾

﴿ وَإِذْ قَالَت طَّآئِفَةٌ ﴾ (کاتێ وتیان دەستەیەک) لە دوو ڕووەکان، دوای ئەوەی شپرزە بوونو خۆڕاگرییان کەم بوو، هەروەها بوون بە یەکێک لە سەرشۆڕان، نە خۆیان ئارامیان گرت، نە وازیان لە خەڵکی هێنا بە خراپەکانیان، ئەم دەستەیە وتیان: ﴿ يَٰٓأَهْلَ يَثْرِبَ ﴾ مەبەستیان پێی ئەوە بوو (ئەی خەڵکی مەدینە). بانگیان کردن بە ناوی وڵاتەوە، ئاماژەیە لەسەر ئەوەی کە ئاینو برایەتی ئیمانی لە دڵەکانیاندا هیچ ڕێزێکی نەبووە، ئەوەشی وای لێکردوون لەسەر ئەو کارە تەنها لاوازیو ساردبوونەوەیەکی سروشتی بووە.

﴿ يَٰٓأَهْلَ يَثْرِبَ لَا مُقَامَ لَكُمْ ﴾ (واتە: ئەی دانیشتوانی مەدینە ئێرە جێگای مانەوەتان نیە) واتە: ئەو شوێنەی بۆی دەرچوون لە دەرەوەی مەدینە، ئەوان سەنگەریان لێ دابوو لە نزیک خەندەقەکەو دەرەوەی مەدینە ﴿ فَٱرْجِعُوا۟ ﴾ (بگەڕێنەوە) بۆ مەدینە، ئەم دەستەیە دەترسان لە جیهاد کردن، دەرکەوت ئەوان توانای جەنگی دوژمنەکانیان نیە، وە فەرمانیان پێدەکردن بە وازهێنان لە جەنگو کوشتار، ئەم دەستەیە خراپترین دەستەو زەرەرمەندترینیانە. وە دەستەیەکی دیکە جگە لەوان تووشی ترسو دڵەڕاوکێ بوون، وە حەزیان دەکرد دوابکەون لە ڕیزی بڕواداران، بۆیە دەستیان کردە بیانووهێنانەوەی بەتاڵو پووچ، ئەوانەن خوا ﷻ دەربارەیان فەرمووی: ﴿ وَيَسْتَـْٔذِنُ فَرِيقٌ مِّنْهُمُ ٱلنَّبِىَّ يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ ﴾ واتە: کۆمەڵێ تر لەوان مۆڵەتی گەڕانەوە لە پێغەمبەر ﷺ دەخوازن، دەیانوت: خانووەکانمان بێ پارێزەرو کەلێناویەو مەترسیان لەسەرە، دەترسین دوژمنان هێرش بکەنە سەریان لە کاتێکدا ئێمە نادیارین، دەی مۆڵەتمان بدە بگەڕێینەوە بۆ ناو خانووەکانمان تا پاسەوانیان بکەین، بێگومان ئەوان درۆیان دەکرد لەو قسانەیاندا.

﴿ وَمَا هِىَ بِعَوْرَةٍ ۖ إِن يُرِيدُونَ ﴾ واتە: (لە کاتێکدا واش نەبوو) تەنها مەبەستیان ﴿ إِلَّا فِرَارًا ﴾ (هەڵاتن بوو)، بەڵام ئەم قسانەیان کردە هۆکارو بیانوویەک بۆ خۆیان، ئەوانە ئیمانیان لاواز بوو، هیچ جێگیر بوونو پابەند بوونێکیان نەبوو لە کاتی ڕوودانی توندیو نارەحەتیەکاندا.

(١٤): ﴿ وَلَوْ دُخِلَتْ عَلَيْهِم مِّنْ أَقْطَارِهَا ثُمَّ سُئِلُوا۟ ٱلْفِتْنَةَ لَءَاتَوْهَا وَمَا تَلَبَّثُوا۟ بِهَآ إِلَّا يَسِيرًا ﴿١٤﴾ ﴾:

﴿ وَلَوْ دُخِلَتْ عَلَيْهِم ﴾ مەدینـە ﴿ مِّنْ أَقْطَارِهَا ﴾ واتـە: ئەگـەر بێبڕوایـان هێرشـیان بکرادایەتـە سـەر مەدینـە لـە هەمـوو لایەکـەوە دەسـتیان بەسـەردا بگرتایـە ﴿ ثُمَّ ﴾ (ئنجـا) پرسـیار لەوانـە بکرایـە ﴿ ٱلْفِتْنَةَ ﴾ واتـە: هەڵگەڕانـەوە لـە ئاینەکەیـانو چوونـە نێـو ئاینـی ئەوانـەی زاڵ بـوون ﴿ لَءَاتَوْهَا ﴾ بـە پەلـە دەچوونـە نێویـەوە ﴿ وَمَا تَلَبَّثُوا۟ بِهَآ إِلَّا يَسِيرًا ﴾ واتـە: هیـچ بەربەسـتو بەهێـزیو خۆڕاگریەکیـان نیـە لـەرووی ئاینیـەوە، بەڵکـو ئەوەنـدەی کـە دەوڵـەت بکەوێتـە ژێـر دەسـتی دوژمـنو داواکاریەکانیـان پـێ بـدرێ، ڕەزامەنـد بـن لەسـەر بێبڕوایـان ئەمـە حاڵیانـە.

(١٥): ﴿ وَلَقَدْ كَانُوا۟ عَـٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ مِن قَبْلُ لَا يُوَلُّونَ ٱلْأَدْبَـٰرَ ۚ وَكَانَ عَهْدُ ٱللَّهِ مَسْـُٔولًا ﴿١٥﴾ ﴾:

لـە کاتێکـدا ئـەوان بێگومـان ﴿ عَـٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ مِن قَبْلُ لَا يُوَلُّونَ ٱلْأَدْبَـٰرَ ۚ وَكَانَ عَهْدُ ٱللَّهِ مَسْـُٔولًا ﴾ (واتـە: ئـەوان لـە پێـش ئـەم ڕووداوە پەیمانیـان بـە خـوا دابـوو کـە پشـت هەڵناکـەنو ڕاناکـەن، وە پەیمانـێ درابـوو لێپرسـراو دەبـێ) خـوا لـە داهاتـوودا پرسـیاریان لێـدەکات دەربـارەی ئـەم پەیمانـە، جـا دەیـان بینـێ هەڵیانوەشـاندۆتەوە، دەی ئێـوە ئـەو کات گومانتـان چۆنـە بـە پەروەردگاریـان؟


قُل لَّن يَنفَعَكُمُ ٱلْفِرَارُ إِن فَرَرْتُم مِّنَ ٱلْمَوْتِ أَوِ ٱلْقَتْلِ وَإِذًا لَّا تُمَتَّعُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٦﴾ قُلْ مَن ذَا ٱلَّذِى يَعْصِمُكُم مِّنَ ٱللَّهِ إِنْ أَرَادَ بِكُمْ سُوٓءًا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ رَحْمَةً ۚ وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٧﴾ ۞ قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلْمُعَوِّقِينَ مِنكُمْ وَٱلْقَآئِلِينَ لِإِخْوَٰنِهِمْ هَلُمَّ إِلَيْنَا ۖ وَلَا يَأْتُونَ ٱلْبَأْسَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٨﴾ أَشِحَّةً عَلَيْكُمْ ۖ فَإِذَا جَآءَ ٱلْخَوْفُ رَأَيْتَهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ تَدُورُ أَعْيُنُهُمْ كَٱلَّذِى يُغْشَىٰ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْمَوْتِ ۖ فَإِذَا ذَهَبَ ٱلْخَوْفُ سَلَقُوكُم بِأَلْسِنَةٍ حِدَادٍ أَشِحَّةً عَلَى ٱلْخَيْرِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ لَمْ يُؤْمِنُوا۟ فَأَحْبَطَ ٱللَّهُ أَعْمَٰلَهُمْ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴿١٩﴾ يَحْسَبُونَ ٱلْأَحْزَابَ لَمْ يَذْهَبُوا۟ ۖ وَإِن يَأْتِ ٱلْأَحْزَابُ يَوَدُّوا۟ لَوْ أَنَّهُم بَادُونَ فِى ٱلْأَعْرَابِ يَسْـَٔلُونَ عَنْ أَنۢبَآئِكُمْ ۖ وَلَوْ كَانُوا۟ فِيكُم مَّا قَٰتَلُوٓا۟ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٢٠﴾ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِى رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ وَلَمَّا رَءَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْأَحْزَابَ قَالُوا۟ هَٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ ۚ وَمَا زَادَهُمْ إِلَّآ إِيمَٰنًا وَتَسْلِيمًا ﴿٢٢﴾

(١٦): ﴿ قُل لَّن يَنفَعَكُمُ ٱلْفِرَارُ إِن فَرَرْتُم مِّنَ ٱلْمَوْتِ أَوِ ٱلْقَتْلِ وَإِذًا لَّا تُمَتَّعُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٦﴾ ﴾:

﴿ قُلْ ﴾ پێیان بڵێ: بە لۆمەکردنەوە لەسەر راکردنیان، وە هەواڵیان پێ بدە ئەو هەڵهاتنە هیچ سوودێکی نیە بۆیان ﴿ لَّن يَنفَعَكُمُ ٱلْفِرَارُ إِن فَرَرْتُم مِّنَ ٱلْمَوْتِ أَوِ ٱلْقَتْلِ ﴾ (واتە: هەڵهاتن سوودتان پێ ناگەیەنێ، ئەگەر لە مردن یان لە کوشتن هەڵبێن) جا ئەگەر ئێوە لە ماڵەکانی خۆتاندا بن ئەوانەی کە کوژرانیان بەسەردا نووسرابوو لە ماڵەکانی خۆشیاندا بوونایە هەر دەمردن، هۆکارەکان سوودیان هەیە بە مەرجێ دژی قەزاو قەدەر نەبێ، ئەگەر قەزاو قەدەر هات هەموو هۆکارەکان بڵاو دەبنەوە، وە هەموو ئامرازەکانیش بەتاڵ دەبنەوە کە مرۆڤ وا گومان دەبات رزگاری دەکات ﴿ وَإِذًا ﴾ کاتێ هەڵهاتن بۆ ئەوەی پارێزراو بن لە مردنو کوشتن، وە لە دونیادا چێژو لەزەت وەربگرن، ئەوە بێگومان ئێوە ﴿ لَّا تُمَتَّعُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ (واتە: بەهرەو خۆشی ژیانتان پێ نادرێ ماوەیەکی کەم نەبێ) خۆشیەک یەکسان نابێت لەگەڵ هەڵهاتنتانو وازهێنانتان لە فەرمانی خوا، وە لە دەستدانی چێژ وەرگرتنی هەتا هەتایی لە نازو نیعمەتی هەمیشەیی.

(١٧): ﴿ قُلْ مَن ذَا ٱلَّذِى يَعْصِمُكُم مِّنَ ٱللَّهِ إِنْ أَرَادَ بِكُمْ سُوٓءًا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ رَحْمَةً ۚ وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٧﴾ ﴾:

پاشان خوا ﷻ روونی کردۆتەوە کە بێگومان هۆکارەکان بە گشتی بە هیچ شێوەیەک بەندە بێنیاز ناکات لە هیچ شتێ، ئەگەر خوا ویستی زیانی لێ بدات، جا فەرموویەتی: ﴿ قُلْ مَن ذَا ٱلَّذِى يَعْصِمُكُم ﴾ واتە: (کێیە ئەو کەسەی) رێگریتان لێدەکات ﴿ مِّنَ ٱللَّهِ إِنْ أَرَادَ بِكُمْ سُوٓءًا ﴾ (لە خوا ئەگەر بیەوێ زیانتان پێ بگەیەنێ)

﴿ أَوۡ أَرَادَ بِكُمۡ رَحۡمَةٗ ﴾ (یــان بەزەیــیو رەحمەتــی بــۆ ئێــوە بــوێ)، چونکــە ئــەو زاتــە دەبەخشــێو رێگــری دەکات، زیــان دەگەیەنــێو ســوود دەبەخشــێ، ئــەو زاتــەی کــە هیــچ خێــرو چاکەیــەک نایــەت لــە لایــەن ئــەوەوە نەبــێ، وە خراپــە دوور ناخاتــەوە تەنهــا ئــەو نەبــێ ﴿ وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيّٗا ﴾ (واتــە: بێجگــە لــە خــوا بــۆ ئــەوان نیــە هیــچ پشــتیوانێک) پشــتیوانیان لــێ بــکاتو ســوودیان پــێ بگەیەنــێ ﴿ وَلَا نَصِيرٗا ﴾ واتــە: (هیــچ یارمەتیدەرێــک نیــە) ســەریان بخــات زیانەکانیــان لــێ دوور بخاتــەوە.

دەی بــا گوێرایەڵــی خــوای تــاکو تەنهــا بکــەن لــە هەمــوو کاروبارەکانیانــدا، ئــەو زاتــەی ویســتو مەشــیئەتی جێبەجــێ بــووە، هیــچ ســوودی پێنەگەیانــد لەگــەڵ وازهێنانی پشــتیوانیو یارمەتــی خــوا هیــچ دۆســتو ســەرخەرێک.

(١٨): ﴿ قَدۡ يَعۡلَمُ ٱللَّهُ ٱلۡمُعَوِّقِينَ مِنكُمۡ وَٱلۡقَآئِلِينَ لِإِخۡوَٰنِهِمۡ هَلُمَّ إِلَيۡنَاۖ وَلَا يَأۡتُونَ ٱلۡبَأۡسَ إِلَّا قَلِيلًا ١٨ ﴾:

پاشــان خــوا ﷻ هەرەشــە لــە بەجێمــاوانو ئەوانــە دەکات کــە کۆســپو تەگەرە دروســت دەکــەنو خەڵکــی ســارد دەکەنــەوە (لــە جیهادکــردن)، جــا فەرموویەتــی: ﴿ قَدۡ يَعۡلَمُ ٱللَّهُ ٱلۡمُعَوِّقِينَ مِنكُمۡ ﴾ (واتــە: بێگومــان خــوا دەزانــێ بــەو کەســانەتان کــە ســاردکەرەوەن) لــە دەرچــوون، لــەو کەســانەی دەرنەچــوون، ﴿ وَٱلۡقَآئِلِينَ لِإِخۡوَٰنِهِمۡ ﴾ (واتــە: بــە براکانیــان دەتــووت) ئەوانــەی دەرچــوو بــوون: ﴿ هَلُمَّ إِلَيۡنَا ﴾ واتــە: بگەڕێنــەوە، وەک لــە پێشــتر وتیــان: ﴿ يَٰٓأَهۡلَ يَثۡرِبَ لَا مُقَامَ لَكُمۡ فَٱرۡجِعُواْ ﴾ (واتــە: ئــەی دانیشــتوانی مەدینــە ئێــرە جێگــای مانەوەتــان نیــە، بگەڕێنــەوە)، ﴿ وَلَا يَأۡتُونَ ٱلۡبَأۡسَ ﴾ ئــەوان لەگــەڵ دواکەوتــنو خەڵــک ساردکردنەوەیان، (ئــەوان نایــەن بــۆ) کوشــتارو جیهــاد کــردن بــە نەفســیان ﴿ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ (زۆر بــە کەمــی نەبــێ) ئــەوان توونددتریــن خەڵــک بــوون لەســەر دواکەوتــن، چونکــە پاڵنــەری پێویســتیان نەبــوو لــە ئیمــانو خۆڕاگرتــن، وە بوونــی داخــوازی تــرس لــە دوورووییو نەبوونــی ئیمانــە.

(١٩): ﴿ أَشِحَّةً عَلَيۡكُمۡۖ فَإِذَا جَآءَ ٱلۡخَوۡفُ رَأَيۡتَهُمۡ يَنظُرُونَ إِلَيۡكَ تَدُورُ أَعۡيُنُهُمۡ كَٱلَّذِي يُغۡشَىٰ عَلَيۡهِ مِنَ ٱلۡمَوۡتِۖ فَإِذَا ذَهَبَ ٱلۡخَوۡفُ سَلَقُوكُم بِأَلۡسِنَةٍ حِدَادٍ أَشِحَّةً عَلَى ٱلۡخَيۡرِۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَمۡ يُؤۡمِنُواْ فَأَحۡبَطَ ٱللَّهُ أَعۡمَٰلَهُمۡۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٗا ١٩ ﴾:

﴿ أَشِحَّةً عَلَيۡكُمۡ ﴾ (لــە ئاســتی ئێــوەدا چرووکــن) بــە جەســتەیان لــە کوشــتارو جیهــاد کــردن، وە مــاڵو ســامانیان لــە کاتــی بەخشــیندا، بــە مــاڵو ســامانو نەفســیان جیهــاد

ناکــەن ﴿ فَإِذَا جَآءَ ٱلْخَوْفُ رَأَيْتَهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ ﴾ وەک تەماشــا کردنــی کەســێک بــێ هــۆش بکــەوێ، ﴿ مِنَ ٱلْمَوْتِ ﴾ (لــە مــردن) لە توونــدیو زۆری ئــەو ترســەی دڵەکانیانی دارنیــوە، وە ئــەو دوو دڵــیو گومانــەی کــە سەرســامی کــردوون، وە ترســانیان لــەوەی ناچــار بکرێــن لەســەر ئــەوەی پێیــان ناخۆشــە لــە شــەڕ کــردن.

﴿ فَإِذَا ذَهَبَ ٱلْخَوْفُ ﴾ (واتــە: جــا ئەگــەر ترســەکە ڕۆیشــتو نەمــا) کەوتنــە حاڵەتــی ئاســایشو دڵنیاییــەوە ﴿ سَلَقُوكُم بِأَلْسِنَةٍ ﴾ واتــە: دەدوێــنو قســەتان لەگــەڵ دەکــەن بــە زمانــی تیــژو بانگەشــەی ناتــەواو، وە کاتــێ گوێــت لێیــان دەبێــت، وا گومــان دەبێــت خــاوەن زیرەکــیو بوێریــن ﴿ أَشِحَّةً عَلَى ٱلْخَيْرِ ﴾ (واتــە: کەچــی چرووکــن لەســەر مــاڵ) کــە داوایــان لێدەکــرێ، ئەمــەش خراپتریــن شــتە لــە ئادەمیــزاددا هەبێــت، چــروک بێــت لــەوەی فەرمانــی پێکــراوە، چــرووک بێــت بــە ماڵــی کــە لــە پێنــاوی خــوا بیبەخشــێ، چــرووک بێــت لــەوەی بــە جەســتەی جیهــادی دوژمنانــی خــوا بــکات، یــان لــە پێنــاوی خــوا بانگــەواز بــکات، چــرووک بێــت بــە خانەدانــی، چــرووک بێــت بــە زانســتو ئامۆژگــاریو بۆچوونــی.

﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ﴾ (ئەوانــەی) حاڵیــان بــەم شــێوەیە ﴿ لَمْ يُؤْمِنُواْ ﴾ (بڕوایــان نەهێنــاوە)، بــە هــۆی نەبوونــی بڕوایانــەوە خــوا کردەوەکانیانــی هەڵوەشــاندەوە ﴿ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴾ (واتــە: ئەمــە بــە لای خــواوە کارێکــی ئاســانە).

بــەڵام بــڕواداران خــوا پاراســتوونی لــە چرووکــی نەفســیان، وە ســەرکەوتووی کــردوون لــە بەخشــینی ئــەوەی فەرمانیــان پێکــراوە، لــە بەخشــینی جەســتەیان لــە کوشــتار لــە پێنــاوی خــواداو بــەرز کردنــەوەی وشــەکەی، وە مــاڵو ســامانیان بــە بەخشــین لــە ڕێگاکانــی خێــردا، وە پلــەو پایــەو زانســتیان.

(٢٠): ﴿ يَحْسَبُونَ ٱلْأَحْزَابَ لَمْ يَذْهَبُواْ وَإِن يَأْتِ ٱلْأَحْزَابُ يَوَدُّواْ لَوْ أَنَّهُم بَادُونَ فِي ٱلْأَعْرَابِ يَسْـَٔلُونَ عَنْ أَنۢبَآئِكُمْ وَلَوْ كَانُواْ فِيكُم مَّا قَٰتَلُوٓاْ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٢٠﴾ ﴾:

﴿ يَحْسَبُونَ ٱلْأَحْزَابَ لَمْ يَذْهَبُواْ ﴾ واتــە: گومانیــان دەبــرد ئــەو کۆمەڵانــەی یەکیــان گرتــووە لەســەر جەنــگ کــردن لــە دژی پێغەمبــەرو هاوەڵەکانــی، نــەڕۆن هەتــا لــە ڕیشــەی دەریــان دێنــن، گومانەکەیــان بەدەســت نەهــاتو بۆچوونەکەیــان پــووچ بــوو.

﴿ وَإِن يَأْتِ ٱلْأَحْزَابُ ﴾ جارێکــی دیکــە ﴿ يَوَدُّواْ لَوْ أَنَّهُم بَادُونَ فِي ٱلْأَعْرَابِ يَسْـَٔلُونَ عَنْ أَنۢبَآئِكُمْ ﴾ واتــە: ئەگــەر ئــەو حیــزبو کۆمەڵانــە بــۆ جــاری دووەم

بگەڕانایــەوە، وەکــو ئــەم جــارە، دووڕوەکان ئاواتیــان دەخواســت، ئــەوان لــە مەدینــەدا نەبوونایــە، وە لــە نزیکیشــی، بەڵکــو لەنــاو عەرەبــە دەشــتەکیەکان بوونایــە، لــە دوورەوە پرســیاریان لــە هەواڵــی ئــەوان بکردایــە، ئایــا چییــان بەســەر هاتــووە؟

تووڕەیــیو دووری بــۆ ئــەوان، ئەوانــە کەســانێک نیــن بــە ئامادەبوونیــان دڵخــۆش بــن، ﴿وَلَوْ كَانُوا فِيكُم مَّا قَاتَلُوا إِلَّا قَلِيلًا﴾ (واتــە: ئەگــەر لەنــاو ئێــوەدا بوونایــە جەنگیان نەدەکــرد زۆر بــە کەمــی نەبــێ) بایەخیــان پــێ مــەدەنو خەفەتیــان بــۆ مەخــۆن.

(٢١): ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾﴾:

﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾ (واتــە: ســوێند بەخــوا بەڕاســتی لــە پێغەمبــەری خــوادا بــۆ ئێــوە سەرمەشــقو پێشــەوایەتی چــاک هەیــە)، بەڕادەیــەک بــە نەفســی خــۆی ئامــادەی جەنگــەکان دەبــوو، ئــەو بــە حورمــەتو تــەواوە، پاڵــەوانو دلێــرو ئازایــە، چــۆن چرووکــی بــە نەفســی خۆتــان دەکــەن لــە کارێکــدا پێغەمبــەر ﷺ بــە نەفســی ئامادەیــە؟! شــوێنی ئــەو بکــەون لــەم کارەو جگــە لەمــەش.

زانــا ئوصولیــەکان ئــەم دەقەیــان بــە بەڵگــە هێناوەتــەوە لەســەر کار کــردن بــە کــرداری پێغەمبــەر ﷺ، بنەمــاو بنچینــە ئەوەیــە ئوممەتەکــەی شــوێنکەوتووی ئــەون لــە ئەحکامەکانــدا، مەگــەر بەڵگەیەکــی شــەرعی هەبــێ ئامــاژە بــکات بــە تایبەتمەنــدی ئــەو بــەو کارە.

شــوێنکەوتنو پێشــەوایەتی دوو جــۆرە: شــوێنکەوتنی چــاکو شــوێنکەوتنی خــراپ، شــوێنکەتنی چــاک لــە پێغەمبەردایــە، بێگومــان ئــەو کەســەی شــوێنی دەکــەوێ ئــەو ڕێگــای گرتۆتــە بــەر کــە دەیگەیەنــێ بەرێــزو حورمــەت لــە لای خــوا ﷻ، کــە ئەویش ڕێگــای ڕاســتە.

بــەلام شــوێنکەوتنی جگــە لــەو ئەگــەر پێچەوانــەی بــوو ئــەوە شــوێنکەوتنی خراپــە، وەک قســەی بێبڕوایــان، کاتــێ پێغەمبەرانیــان بانگیــان کــردن بــۆ ئــەوەی شــوێنیان بکــەون: ﴿إِنَّا وَجَدْنَا آبَاءَنَا عَلَىٰ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰ آثَارِهِم مُّقْتَدُونَ ﴿٢٣﴾﴾الزخرف (واتــە: بە ڕاســتی ئێمــە بــاوو باپیرانــی خۆمــان لەســەر ئاینێــک دیــوە وە بەڕاســتی ئێمــە لەســەر ئاینــی ئــەوان دەڕۆیــن)، ئــەم شــوێنکەوتنی چاکــە کەســێک دەیگرێتەبــەر بــە هیــوای خــواو پاداشــتی ڕۆژی دوایــی بــێ، چونکــە ئــەو ئیمانــەی لەگەڵیایەتــیو ترســان لــە

خــواو هیــوای پاداشــتیو ترســان لــە ســزای هانــی ئــەدات لــە ســەر شــوێنکەوتنی پێغەمبــەر.

(٢٢): ﴿ وَلَمَّا رَءَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْأَحْزَابَ قَالُواْ هَٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ ۚ وَمَا زَادَهُمْ إِلَّآ إِيمَٰنًا وَتَسْلِيمًا ﴿٢٢﴾ ﴾:

کاتــێ خــوا ﷻ باســی حاڵــی دووڕووەکانــی کــرد لــە کاتــی ترســدا، باســی حاڵــی بڕوادارانیشــی کــرد، جــا فەرمــووی: ﴿ وَلَمَّا رَءَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْأَحْزَابَ ﴾ (کاتــێ ئیمانــداران ئــەو کۆمەڵانەیــان بینــی) ئەوانــەی کۆبوونــەوەو دابەزیبوونــە جێگاکانــی خۆیــان، وە تــرس کۆتایــی پێهاتبــوو:

﴿ قَالُواْ هَٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ ﴾ (وتیــان: ئەمــە ئــەو بەڵێنەیــە خــواو پێغەمبەرەکــەی بــە ئێمەیــان دابــوو) دەفەرمــوێ: ﴿ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُواْ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلِكُم ۖ مَّسَّتْهُمُ ٱلْبَأْسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ وَزُلْزِلُواْ حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصْرُ ٱللَّهِ ۗ أَلَآ إِنَّ نَصْرَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ ﴿٢١٤﴾ ﴾البقرة. (واتــە: ئایــا واتــان زانیــوە کــە دەچنــە بەهەشــت کەچــی هێشــتا نەهاتۆتــە ڕێتــان ئــەوەی تووشــی ئەوانــە بــوون کــە لــە پێــش ئێــوەدا تێپەڕیــن کــە لــە ڕێــی خــوادا دووچــاری ســەختیو زەرەرو زیــان بــوون، وە زۆر بــە توونــدی تــەکان دران بــە ڕەنگێــک کــە پێغەمبــەرو ئەوانــەی بڕوایــان هێنابــوو لــە گەڵیــدا دەیانــوت ســەرکەوتنی خــوا کــەی دێــت ئاگــادار بــنو دڵنیابــن بــە ڕاســتی ســەرکەوتنی خــوا نزیکــە)، ﴿ وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ ﴾ ئێمــە ئــەوەی هەواڵمــان پێدرابــوو بینیمــان، ﴿ وَمَا زَادَهُمْ ﴾ ئــەو کارە ﴿ إِلَّآ إِيمَٰنًا ﴾ لــە دڵەکانیانــدا ﴿ وَتَسْلِيمًا ﴾ لــە ئەندامانــی جەســتەیان، وە ملکــەچ بوونیــان بــە فەرمانەکانــی خــوا.

مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ۖ فَمِنْهُم مَّن
قَضَىٰ نَحْبَهُۥ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ ۖ وَمَا بَدَّلُوا۟ تَبْدِيلًا (٢٣) لِّيَجْزِىَ
ٱللَّهُ ٱلصَّٰدِقِينَ بِصِدْقِهِمْ وَيُعَذِّبَ ٱلْمُنَٰفِقِينَ إِن شَآءَ أَوْ
يَتُوبَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا (٢٤) وَرَدَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ
كَفَرُوا۟ بِغَيْظِهِمْ لَمْ يَنَالُوا۟ خَيْرًا ۚ وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ
ٱلْقِتَالَ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا (٢٥) وَأَنزَلَ ٱلَّذِينَ ظَٰهَرُوهُم مِّنْ
أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ مِن صَيَاصِيهِمْ وَقَذَفَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعْبَ
فَرِيقًا تَقْتُلُونَ وَتَأْسِرُونَ فَرِيقًا (٢٦) وَأَوْرَثَكُمْ أَرْضَهُمْ
وَدِيَٰرَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُمْ وَأَرْضًا لَّمْ تَطَـُٔوهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ
شَىْءٍ قَدِيرًا (٢٧) يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ
ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ
سَرَاحًا جَمِيلًا (٢٨) وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ
ٱلْءَاخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا (٢٩)
يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِىِّ مَن يَأْتِ مِنكُنَّ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ يُضَٰعَفْ
لَهَا ٱلْعَذَابُ ضِعْفَيْنِ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا (٣٠)

(٢٣): ﴿مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ۖ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ ۖ وَمَا بَدَّلُوا۟ تَبْدِيلًا (٢٣)﴾: کاتێ خوا ﷻ باسی ئەوەی کرد کە بەراستی دووڕووەکان پەیمانیان دا بە خوا، لە جەنگو جیهاد پشت هەڵنەکەن، ئەو پەیمانەیان شکاند، باسی وەفای بروادارانی کرد پێی، جا فەرمووی: ﴿مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ﴾ واتە: (لەناو بروادارانـدا پیاوانێک هەیە راستیان کرد لە ئەو پەیمانەی دایانبوو بە خوا) بە وەفا بوون، تەواویان کرد، هەموو توانایان خستەکار بۆ رەزامەندی خوا، وە نەفسیان لە گوێرایەڵی خوا بەکارهێنا.

﴿فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ﴾ واتە: ویستو داواکاری ئەوەشی لەسەریەتی لە حەق، لە پێناوی خوا کوژرا، یان مرد، ئەرکی سەرشانی جێبەجێ کردو کەمو کوڕی تێدا نەکرد، ﴿وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ﴾ (واتە: هەندێکیشیان چاوەڕوانن) ئەو بەردەوامە لەسەر تەواو کردنی ئەرکی سەرشانی، هێشتا تەواوی نەکردوە، ئەو لە ئومێدی تەواوکردنێتی، هەوڵ ئەدا لەو بوارەداو بەردەوامە.

﴿وَمَا بَدَّلُوا۟ تَبْدِيلًا﴾ (واتە: هیچ گۆڕانێکیان لە بەڵێنی خۆیاندا نەکردوە)، وەک چۆن جگە لە ئەوان بەڵێنەکەیان گۆڕی، بەڵکو بەردەوام بوون لەسەر پەیمانی خۆیان، نە لایانداو نەگۆڕیان، ئا ئەوانە پیاوی راستەقینەن، غەیری ئەوان بەوێنە پیاون، بەڵام لە رووی سیفەتەوە سیفەتی پیاوەتیان تێدانیە.

(٢٤): ﴿لِّيَجْزِىَ ٱللَّهُ ٱلصَّٰدِقِينَ بِصِدْقِهِمْ وَيُعَذِّبَ ٱلْمُنَٰفِقِينَ إِن شَآءَ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا (٢٤)﴾:

﴿لِّيَجْزِىَ ٱللَّهُ ٱلصَّٰدِقِينَ بِصِدْقِهِمْ﴾ واتە: بە هۆی راستگۆییان لە قسەو بارودۆخو مامەڵە کردنیاندا لەگەڵ خوا، وە یەکسانی رواڵەتو ناخیان خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿هَٰذَا

﴿يَوْمُ يَنفَعُ ٱلصَّـٰدِقِينَ صِدْقُهُمْ ۚ لَهُمْ جَنَّـٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۚ رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١١٩﴾﴾ المائدة، (واتە: خوای گەورە فەرمووی: ئەمە رۆژێکە راستبێژان راستیەکەیان کەڵکیان پێدەگەیەنێ بەهەشتانێکیان بۆ هەیە کە رووبارەکان بە ژێریاندا دەرۆن ئەمێننەوە تیایدا بە هەمیشەیی خوا رازی بووە لێیانو ئەوانیش لە خوا رازی بوون ئەوەیە سەرکەوتنی زۆر گەورە)، واتە: ئەوەی کە دامانناوە لەم بەڵاو فیتنەو نارەحەتیانە بۆ ئەوەی راستگۆ لە درۆزن دەربکەوێ، راستگۆیان پاداشت بدرێنەوە بە هۆی راستیەکانەوە، ﴿وَيُعَذِّبَ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ﴾ (سزای دووڕووەکان بدات)، ئەوانەی دڵو کردەوەیان گۆڕاوە لە کاتی هاتنی فیتنەو بەڵادا، وە بەوەفا نەبوون بەرانبەر ئەو پەیمانەی بە خوایان دابوو.

﴿إِن شَآءَ﴾ (ئەگەر بیەوێ) سزایان بدات بەوەی کە نەیەوێ رێنماییان بکات، بەڵکو خوا زانیویەتی ئەوانە هیچ خێرێکیان تێدانیە بۆیە سەرکەوتووی نەکردن، ﴿أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ﴾ بەوەی سەرکوتوویان بکات بۆ داوای لێ خۆشبوونو گەرانەوە، ئەمەش لە بەخشندەیی‌و فراوانی خوا زۆرتر دەوەشێتەوە، بۆیە ئایەتەکەی بەم دوو ناوە تەواو کرد، کە بەڵگەن لەسەر داوای لێخۆشبوونو فەزڵو چاکەکاری، جا فەرمووی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ لێبوردەیە لە تاوانی ئەو کەسانەی زێدەرۆییان کردوە لەسەر نەفسی خۆیان، ئەگەرچی تاوانیشیان زۆربێ بە مەرجێ داوای لێ خۆشبوونیشیان کردبێ، ﴿رَّحِيمًا﴾ میهرەبانە لەگەڵیان بە رادەیەک سەرکەوتووی کردوون بۆ تەوبە کردن، پاشان لێی وەرگرتوون، وە تاوانەکانیانی پۆشیوە.

(٢٥): ﴿وَرَدَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِغَيْظِهِمْ لَمْ يَنَالُوا۟ خَيْرًا ۚ وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلْقِتَالَ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا ﴿٢٥﴾﴾:

﴿وَرَدَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِغَيْظِهِمْ لَمْ يَنَالُوا۟ خَيْرًا﴾ واتە: خوا ﷻ بەبێ ئومێدی کافرانی گەراندەوە، ئەوەی هەوڵیان بۆیداو سووربوون لەسەری بۆیان بەدەست نەهات، وایان دەزانی سەرەنجامی سەرکەوتن هەر بۆ ئەوانە، بێگومان زۆری رێژەیان یاخی کردبوونو سەرسام بوون بە کۆبوونەوەیان، دڵخۆشبوون بە ژمارەو کەرەستەی جەنگو خۆئامادەکردنیان، خوا ﷻ بایەکی مەزنی بۆیان نارد، ئەویش بایەک بوو لەلای خۆرهەڵاتەوە، چەقی مەڵبەندەکانیانی جوڵاند، وە خێمەکانیانی لەبن دەرهێنا، چراو لاڵەکانیانی کوژاندەوەو بێزاری کردن، وە ترسی خستە نێو دڵیانەوە، بۆیە بەرقو کینەو

توورەییــەوە گەڕانــەوە، ئەمەش لە ســەرکەوتنی خوایــە بۆ بەنــدە بڕوادارەکانی، ﴿ وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلْقِتَالَ ﴾ (واتــە: خــوا بڕوادارانــی لــە جەنگ پاراســت) بە هۆی ئەوەی دروســتی کردبــوو لەو هۆکارە ئاســاییو قەزاو قەدەریانە ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا ﴾ (خوا هەمیشــە بەهێــزو بــە دەســەڵاتە) هیچ کەس نیــە ڕووبــەڕووی ببێتەوە ئیــلا دەدۆڕێ، وە هەر کەســێ داوای ســەرکەوتنی لێبــکات بێگومان ســەری دەخات، هــەر کارێکی بوێ دەستەوســان نابێ، خاوەنانــی هێــزو دەســەڵات هیچ ســوودێک لــە توانــاو دەســەڵاتیان وەرناگــرن ئەگەر خوا یارمەتیــان نەدات بــە تواناو دەســەڵاتی.

(٢٦): ﴿ وَأَنزَلَ ٱلَّذِينَ ظَٰهَرُوهُم مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ مِن صَيَاصِيهِمْ وَقَذَفَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعْبَ فَرِيقًا تَقْتُلُونَ وَتَأْسِرُونَ فَرِيقًا ﴿٢٦﴾ ﴾:

﴿ وَأَنزَلَ ٱلَّذِينَ ظَٰهَرُوهُم ﴾ واتــە: ( (بنــی قریظة) کە پشــتگیری (قوڕەیــشو غەتەفانیان کــرد): ﴿ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ﴾ واتــە: جولەکــە ﴿ مِن صَيَاصِيهِمْ ﴾ خــوا دایبەزانــدن لە قەڵاکانیــان، ســەری خســتن بەســەریاندا، کەوتنــە ژێــر بڕیــاری ئیســلامەوە، ﴿ وَقَذَفَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعْبَ ﴾ (ترســی خســتە نێــو دڵیانــەوە) بۆیــە نەیانتوانــی جەنــگ بکــەن، بەڵکــو خۆیــان دابەدەســتەوەو زەلیــلو سەرشــۆڕ بــوون ﴿ فَرِيقًا تَقْتُلُونَ ﴾ ئەوانیــش پیاوانــی شــەڕکەر بــوون ﴿ وَتَأْسِرُونَ فَرِيقًا ﴾ (کۆمەڵێکــی تریــان بەدیــل گیران) لــە ئافرەتانو منداڵان.

(٢٧): ﴿ وَأَوْرَثَكُمْ أَرْضَهُمْ وَدِيَٰرَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُمْ وَأَرْضًا لَّمْ تَطَـُٔوهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرًا ﴿٢٧﴾ ﴾:

﴿ وَأَوْرَثَكُمْ ﴾ واتــە: پێــی دان ﴿ أَرْضَهُمْ وَدِيَٰرَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُمْ وَأَرْضًا لَّمْ تَطَـُٔوهَا ﴾ واتــە: زەویــەک پێشــتر ڕێــزو حورمەتــی لــە دەســتی خاوەنەکانــی بــوو، نەتاندەتوانی پــێ بخەنە نــاوی، خــوا ﷻ توانــای پــێ بەخشــینو ئەوانــی زەلیــل کــرد، ماڵەکانــی ئەوانتان کــرد بە دەســتکەوتو ئەوانتان کوشــتو بەدیلتان گرتــن ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرًا ﴾ هیچ شــتێک دەستەوســانی ناکات، وە لــە تواناکانی خوا ئەوەیە چارەنووســی بۆ دیــاری کردوون. ئــەم دەســتەیە لــە خاوەنانــی کتێــب (بنو قریظة) بوون لــە یەهوود لــە شــارۆچکەیەک لە دەرەوەی مەدینــە، زۆر دوور نەبــوون، وە کاتــێ پێغەمبــەر ﷺ کۆچــی کــرد بــۆ مەدینــە، هوودنــەو دانیشــتنی لەگەڵــدا کردن نــە جەنگیان لەگەڵــدا بکاو نــە جەنگی لەگەڵــدا بکەن، ئــەوان لەســەر ئاینــی خۆیان مانــەوە هیــچ شــتێکی بەســەریاندا نەگۆڕی.

کاتێ لە ڕۆژی خەندەقدا ئەو ڕۆژەی هەموو حیزبو کۆمەڵەکان بە زۆریانەوە لەسەر پێغەمبەری خوا کۆبوونەوە، مسوڵمانانیش بەڕێژەیەکی کەمەوە وا گومانیان برد کە ئەو حیزبانە پێغەمبەری خواو مسوڵمانان لەڕیشە دەردێنن، هەندێ لە دەسەڵاتدارەکانیان ئەو پەیمانەیان شکاند کە لە نێوان ئەوانو پێغەمبەردا بوو، وە هاوکاریو یارمەتی هاوبەشدانەرانیان کرد لەسەر جەنگ کردنیان.

کاتێ خوا ﷻ هاوبەشدانەرانی سەرشۆڕ کرد، وە پێغەمبەری خوا یەکلا بوویەوە بۆ جەنگ کردنیان، لە قەڵاکانیاندا دەوری گرتن، ئەوانیش ڕازی بوون بە حوکمی سەعدی کوڕی موعاز (خوای لێ ڕازی بێ) ئەوەی چەکی پێیە بکوژرێ، وە خێزانو منداڵەکانیان بکرێتە کۆیلەو ماڵەکانیش ببێتە دەستکەوت.

خوا ﷻ منەتی خۆی تەواو کرد بەسەر پێغەمبەرو بڕوادارانـدا، وە چاوەکانیانی ئۆقرەگرت بە شکانو سەرشۆڕکردنی دوژمنەکانیان، ئەوەی شەڕی کرد کوژرا، وە کۆمەڵێکی تریش بەدیل گیرا، وە سۆزوو بەزەیی خوا بۆ بڕواداران بەردەوامە.

(٢٨-٢٩): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٢٨﴾ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلْـَٔاخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٢٩﴾ ﴾:

کاتێ کە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ کۆبوونەوە لەسەری داوای بژێویو پۆشاکیان لێ کرد، داوایەکیان لێ کرد لە توانای ئەودا نەبوو لە هەموو کاتێکدا، بەردەوام لەسەر داواکاریەکانیان بەردەوام بوون، وە لە ویستو خواستەکانیاندا سەرکەشیو کەللەڕەقیان دەکرد، ئەمە گران بوو بەسەر پێغەمبەر ﷺ هەتا حاڵ گەیشتە ئەوەی بۆ ماوەی مانگێک سوێندی لەسەر خواردن.

خوا ویستی کار ئاسانی بکات بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ، وە پلەی خێزانەکانی بەرز بکاتەوەو لای ببات لەسەریان هەر کارێک پاداشتیان کەم بکاتەوە، فەرمانی کرد بە پێغەمبەرەکەی ﷺ سەرپشکیان بکات، جا فەرمووی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴾ واتە: ئێوە جگە لە ژیانی دونیا داوایەکی دیکەتان نیە، واتان لێهاتووە ڕازی دەبن بە بوونی، وە توڕە دەبن بە لە دەستدانی، من هیچ پێویستیەکم بە ئێوە نیە ئەگەر حاڵتان بەم شێوەیە بێ.

﴿ فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ ﴾ واتە: (دەی هەمووتان وەرن) با شتێکتان پێبدەم ئەوەی لە لامە

لــە ژیانی دونیــا ﴿ وَأُسَرِّحْكُنَّ ﴾ واتە: تەڵاقتــان بدەم ﴿ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴾ (بــە تەڵاقدانێکی چــاک) بەبــێ توورەیــیو لۆمە کــردن، بەڵکــو بــە دڵێکــی فراوانــەوە، پێــش ئــەوەی بگاتە دۆخێکــی نەخوازراو.

﴿ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلْـَٔاخِرَةَ ﴾ واتــە: (ئەگــەر ئێــوە خــواو پێغەمبەرەکــەیو پاداشــتی ڕۆژی دواییتــان دەوێ)، ئــەم شــتانەتان دەوێــتو ئەوپــەڕی مەبەســتتانە، ئەگــەر خــواو پێغەمبەرەکــەیو بەهەشــتان بەدەســت بێنــن، بێباکن لە خۆشــی دونیــاو نارەحەتــیو ئاســانیو گرانــی، وە ڕازین بــەوەی لــە لای پێغەمبەرەو داوای شــتێکی لێناکــەن گــران بێــت بەســەریەوە ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا ﴾ (واتە: ئــەوە بێگومــان خــوا ئامــادەی کــردوە بــۆ چاکــەکاران لە ئێــوە پاداشــتێکی گــەورە).

پاداشــتی دانــاوە لەســەر وەســفکردنیان بــە چاکــە، چونکە ئــەوە هــۆکاری پێویســتە بۆ ئەو مەبەســتە، نــەک لەبــەر ئــەوەی خێزانــی پێغەمبــەرن، تەنهــا ئــەوە بــەس نیــە، بەڵکــو هیچ ســوودێکی نیــە لەگــەڵ نەبوونــی چاکــە، پێغەمبەری خــوا ئازادی کــردن لــەوەدا، ئەوانیش هەموویــان پێغەمبەریــان هەڵبــژارد، یــەک دانەیان لێ دوانەکــەوت (خوا لێیــان ڕازی بێت).

## لەم هەڵبژاردنەدا چەند سوودێك هەیە:

یەکــەم: گرنگیدانــی خــوا بــە پێغەمبەرەکەی، لــەو حاڵەتــەی خێزانەکانی ڕێگایان لەســەری توونــد کرد بــە داواکردنــی دونیایی زۆر.

دووەم: ســەلامەتی لــەم سەرپشــک کردنــەدا لــە داواکاری مافــی خێزانەکان، ئەو بــە ئازادی خۆی مایەوە، ئەگەر بیویســتایە دەیبەخشــی، ئەگەر بیویســتایە نەیدەبەخشــی، ﴿ مَّا كَانَ عَلَى ٱلنَّبِىِّ مِنْ حَرَجٍ فِيمَا فَرَضَ ٱللَّهُ لَهُۥ ﴿٣٨﴾ ﴾ (واتــە: هیــچ نارەحەتــی تاوانێک لەســەر پێغەمبەر ﷺ نیــە لــە (مارەکردنی زەینــەب) کە خــوا بڕیاری دابــوو بۆی).

سێیەم: سەلامەتی خێزانەکانی لە تاوانو ڕووبەڕووبوونەوەی توورەیی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ، خــوا بــەم سەرپشــک کردنەیــان توورەییــان کۆتایی پێهێنــا لە پێغەمبــەر، کە دەبێتــە مایەی توورەبوونــی پەروەردگاریانو ســزایان لەســەر پێویســت دەبێ.

چــوارەم: دەرخســتنی پلەو دەرەجەیــان، وە ئاشــکراکردنی بەرزی ورەو هیمەتیــان، کە خواو پێغەمبەرەکــەی ژیانــی دوارۆژ داواکاریو مەبەســتیانە، جگە لە ژیانی پــەرشو بڵاوی دونیا.

پێنجــەم: ئامادەبوونیــان بــەم هەڵبژاردنــە بە کارێکــی چاکتر، بۆ گەیشــتن بە باشــترین پلەو

پایەکانــی بەهەشــت، وە ببن بــە خێزانی لە دونیــاو دوارۆژدا.
شەشــەم: دەرکەوتنــی گونجــان لــە نیــوان ئــەوو خێزانەکانــی، بێگومــان ئــەو تەواوترینــی دروســتکراوەکانە، وە خــوا ویســتی خێزانەکانیشــی تــەواوو تەواوکەربــن، پــاکو بێگەرد پاککەرەوەبــن ﴿وَٱلطَّيِّبَٰتُ لِلطَّيِّبِينَ وَٱلطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَٰتِ ﴿٢٦﴾﴾النور، (واتــە: ئافرەتــە پاکــەکان بــۆ پیــاوە پاکــەکان وە پیــاوە پاکــەکان بــۆ ئافرەتــە پاکــەکان).
حەوتــەم: ئــەم سەرپشــک کردنــە پاڵنەرێکــە، وە دەبێتە مایــەی قەناعەت کردنێــک دڵ پێی ئاســوودە دەبێتو ســنگ پێی دەکرێتەوە، وە نەوســنیو چڵیســی ســوور بوون دەرواو نامێنی، وە ڕازی نەبــوون کــە دەبێتــە مایەی خەمو خەفەتو دوو دڵیو شــپرزەییو پەشێویو خەمو خەفەت.
هەشــتەم: ئــەم هەڵبژاردنەیــان هۆکارێک بوو پاداشــتی زیاتــرو چەند قات، بۆ ئــەوەی بگەن بــە پلەو پایەیــەک هیچ یەکێ لــە ئافرەتان پێــی نەگات، بۆیــە فەرموویەتی:
(٣٠-٣١): ﴿يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ مَن يَأۡتِ مِنكُنَّ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ يُضَٰعَفۡ لَهَا ٱلۡعَذَابُ ضِعۡفَيۡنِۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٗا ﴿٣٠﴾ وَمَن يَقۡنُتۡ مِنكُنَّ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتَعۡمَلۡ صَٰلِحٗا نُّؤۡتِهَآ أَجۡرَهَا مَرَّتَيۡنِ وَأَعۡتَدۡنَا لَهَا رِزۡقٗا كَرِيمٗا ﴿٣١﴾﴾:
﴿يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ مَن يَأۡتِ مِنكُنَّ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ يُضَٰعَفۡ لَهَا ٱلۡعَذَابُ ضِعۡفَيۡنِۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٗا﴾ کاتێــک خێزانەکانــی پێغەمبەر ﷺ خــواو پێغەمبــەرو ڕۆژی دواییان هەڵبــژارد باســی پاداشــتی دووبەرانبەریانــی کــرد، وە ســزای دوو بەرانبــەر ئەگــەر تاوانــێ ئەنجــام بــدەن، بــۆ ئــەوەی زیاتــر خۆیــان بپارێــزنو سوپاســگوزاری خــوای مــەزن بن، جا داینــاوە بــۆ هــەر یەکێک لــەوان گوناهێکــی گەورە بــکات ســزای دوو بەرانبــەری بدات،

۞ وَمَن يَقْنُتْ مِنكُنَّ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتَعْمَلْ صَٰلِحًا نُّؤْتِهَآ
أَجْرَهَا مَرَّتَيْنِ وَأَعْتَدْنَا لَهَا رِزْقًا كَرِيمًا ٣١ يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِىِّ
لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِنِ ٱتَّقَيْتُنَّ فَلَا تَخْضَعْنَ بِٱلْقَوْلِ
فَيَطْمَعَ ٱلَّذِى فِى قَلْبِهِۦ مَرَضٌ وَقُلْنَ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ٣٢ وَقَرْنَ
فِى بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ وَأَقِمْنَ
ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتِينَ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِعْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِنَّمَا
يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ
تَطْهِيرًا ٣٣ وَٱذْكُرْنَ مَا يُتْلَىٰ فِى بُيُوتِكُنَّ مِنْ
ءَايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱلْحِكْمَةِ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا ٣٤
إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ
وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْقَٰنِتَٰتِ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ وَٱلصَّٰبِرِينَ
وَٱلصَّٰبِرَٰتِ وَٱلْخَٰشِعِينَ وَٱلْخَٰشِعَٰتِ وَٱلْمُتَصَدِّقِينَ
وَٱلْمُتَصَدِّقَٰتِ وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ وَٱلْحَٰفِظِينَ
فُرُوجَهُمْ وَٱلْحَٰفِظَٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا
وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ٣٥

﴿ وَمَن يَقْنُتْ مِنكُنَّ ﴾ واتە: گوێڕایەڵی ﴿ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتَعْمَلْ صَٰلِحًا ﴾ (خواو پێغەمبەرو کردەوەی چاک بکات) جا زۆر بێ یان کەم، ﴿ نُّؤْتِهَآ أَجْرَهَا مَرَّتَيْنِ ﴾ واتە: هەروەک چۆن دەیبەخشین بە غەیری ئەو دووئەوەندە ﴿ وَأَعْتَدْنَا لَهَا رِزْقًا كَرِيمًا ﴾ واتە: (ڕزقو ڕۆزیەکی خۆشمان بۆ ئامادە کردوە) ئەویش بەهەشتە، گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەریان کردوە، کردەوەی چاکیان ئەنجام داوە، جا بەو شێوەیە پاداشتی بۆیان دیاریکردوە.

(٣٢-٣٤): ﴿ يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِىِّ لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِنِ ٱتَّقَيْتُنَّ فَلَا تَخْضَعْنَ بِٱلْقَوْلِ فَيَطْمَعَ ٱلَّذِى فِى قَلْبِهِۦ مَرَضٌ وَقُلْنَ قَوْلًا مَّعْرُوفًا (٣٣) وَقَرْنَ فِى بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ وَأَقِمْنَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتِينَ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِعْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا (٣٣) وَٱذْكُرْنَ مَا يُتْلَىٰ فِى بُيُوتِكُنَّ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱلْحِكْمَةِ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا (٣٤) ﴾

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِىِّ ﴾ ئەمە دواندنە بۆ هەموو خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ ﴿ لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِنِ ٱتَّقَيْتُنَّ ﴾ (واتە: ئێوە وەک هیچ یەک لە ئافرەتانی دیکە نین ئەگەر خۆتان بپارێزن) لە خوا بترسن، ئێوە بەو شێوە پێش دەکەون بەسەر ئافرەتاندا، وە هیچ یەکێک لە ئافرەتان ناگات بە ئێوە، دەی کەوابوو خۆپارێزی بە تەواوی ئەنجام بدەن بە هەموو هۆکارو مەبەستەکانی.

ئا لە بەر ئەمەیە ڕێی پێنیشانداون بۆ پچراندنی هەموو هۆکارە قەدەغەکراوەکان، جا فەرموویەتی: ﴿ فَلَا تَخْضَعْنَ بِٱلْقَوْلِ ﴾ واتە: (بە خەمزەو نازەوە قسە مەکەن) لە دواندنی پیاوان یان بەڕادەیەک ببیستن نەرمو نیانی لە قسەکانتاندا دەربکەوێ، وە قسە بکەن بە قسەیەکی نەرمو ناسک ببێتە مایەی نیازی ﴿ ٱلَّذِى فِى قَلْبِهِۦ مَرَضٌ ﴾ واتە: (ئەو

کەسەی) نەخۆشی ئارەزووی زیناکردنی هەیە، بێگومان ئەو ئامادەیە بە بچوکترین جوولە دەجولێ، چونکە دڵی ناساغە، دڵی ساغ ئارەزووی شتی قەدەغەکراو ناکات، بێگومان ئەوە مەیلی بۆ لای نابات، وە هۆکارەکانیش نایجولێنێ، چونکە دڵی ساغ سەلامەتە لە نەخۆشی.

بە پێچەوانەی دڵی نەخۆش کە دان بەخۆیدا ناگرێ وەک دڵی ساغ، وە ئارام ناگرێ وەکو ئەو ئارامی لەسەر دەگرێ، جا بە بوونی کەمترین هۆکار بانگی بکات بۆلای شتی قەدەغەکراو بەدەمیەوە دەچێو ڕێگری لێ ناکات، ئەم دەقە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هۆکارەکان حوکمو بڕیاریان لێ وەردەگیرێ، بێگومان قسەکردنی بەنازو خەمزەو نەرمو نیانی لە بنەمادا ڕێگە پێدراو و موباحە. بەڵام لەبەر ئەوەی هۆکارە بۆ کاری قەدەغەکراو ڕێگری لێکراوە، بۆیە پێویستە لەسەر ئافرەت لە دواندنی پیاواندا بە خەمزەو نازەوە قسە نەکات. وە کاتێ قەدەغەی لێکردوون قسەکردن بە مەکروو نازەوە لەوانەیە کەسێ واتێبگا ئەوان فەرمانیان پێکراوە بە ڕەقیو وشکی قسە بکەن! بەڵام خوا ئەمەی ڕەت کردۆتەوە بەوەی فەرموویەتی: ﴿ وَقُلْنَ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴾ (واتە: قسەی چاکو بەجێ بکەن) نە پڕبێت لە تووڕەییو وشکی، نە بەمەکرو نازەوە.

سەرنج بدە چۆن فەرموویەتی: ﴿ فَلَا تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ ﴾ نەیفەرمووە: (فلا تلن بالقول) واتە نەرمو نیان مەبن لە قسەکردندا، چونکە قەدەغەکراو قسەکردنی نەرمو نیانیە کە جۆرێ مەکرو نازی تێدابێ لە بەرانبەر پیاو، وە خۆ شکاندنەوەی بۆی. (الخاضع) ئەو کەسەیە تەماحی تێدەکرێ، بە پێچەوانەی ئەو کەسەی بە نەرمو نیانی قسە دەکاتو هیچ جۆرە لە گەردنکەچیو نازی پێوە دیارنیە، بەڵکو هەندێجار بەرزیو زاڵبوونی تێدایە بۆ کەسی بەرانبەر، ئەم کەسە کەسی بەرانبەر تەماحی تێنا کات، لەبەر ئەمەیە خوا ﷻ وەسفی پێغەمبەرەکەی کردوە بە نەرمو نیانیو فەرموویەتی: ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ اللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ﴿١٥٩﴾ ﴾آل عمران، (واتە: بە هۆی بەزەیی خواوەیە بۆ ئەوان نەرمو نیان بووی)، خوا ﷻ بە موساو هاروونی فەرمووە: ﴿ اذْهَبَا إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَىٰ ﴿٤٣﴾ فَقُولَا لَهُ قَوْلًا لَّيِّنًا لَّعَلَّهُ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَىٰ ﴿٤٤﴾ ﴾طه، (واتە: هەردووکتان بڕۆن بۆ لای فیرعەون چونکە بەڕاستی ئەو یاخی بووە * جا قسەی لەگەڵ بکەن بە نەرمو نیانی بەڵکو بیر بکاتەوە یان بترسێ).

وە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَيَطْمَعَ الَّذِي فِي قَلْبِهِ مَرَضٌ ﴾ بەڵگەیە، لەگەڵ ئەوەدا خوا

فەرمانــی پێکــردوە بە پاراســتنی داوێــنو ستایشــکردنی ئەو کەســانەی داوێنیــان دەپارێزن، وە قەدەغــەی کــردوە لــە نزیک کەوتنــەوە لە زینا، بۆیە پێویســتە لەســەر بەنــدە ئەگەر ئەو حاڵەتــەی لــە نەفــسو دەروونیــدا بینی کــە نەرم دەبــێ بــۆ کاری قەدەغەکراو، کاتــێ ببینێ یان ببیســتێ قســەی کەســێ ئارەزووی دەجوڵێنێ، وە ببینێ هۆکارەکانــی تەماحکردنی بەرەو حــەرامو قەدەغەکــراو دەیبــات ئــەوە بابزانێ ئەوە نەخۆشــیە، جــا با هەوڵو کۆشــش بکات لەســەر لاواز کردنی ئەو خۆشــیەو کۆتایــی پێهێنانی ئــەو خەتەرە خراپانەی دروســت دەبن، هــەوڵو تێکۆشــان لــە دەروونیدا لەســەر پاراســتنی ئــەو نەخۆشــیە ترســناکە، وە داواکردنی لــە خــوا بیپارێزێو ســەرکەوتووی بــکات، بێگومان ئــەوە لە داوێن پاراســتنە کــە فەرمانی پێکراوە.

﴿ وَقَرۡنَ فِي بُيُوتِكُنَّ ﴾ واتــە: لــە ماڵەکانتانــدا بمێننــەوە، چونکــە ســەلامەتترە پارێزراوترە بۆتــان ﴿ وَلَا تَبَرَّجۡنَ تَبَرُّجَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ ٱلۡأُولَىٰ ﴾ واتــە: زۆر دەرمەچنــە دەرەوە بە خۆجوان کردنــەوەو خۆدەرخســتن، یــان بۆن خۆشــکردن، وەکو خۆدەرخســتنی ئافرەتانی ســەردەمی نەفامــی یەکــەم، ئەوانــەی نە زانســتیان هەبوو نە دیــن، هەموو ئەمانــە ڕێگریکردنە لە شــەڕو هۆکارەکانی.

کاتــێ فەرمانــی پێکــردوون بە تەقــواو خۆپارێزی بە گشــتی، وە بە لقو پۆکانــی خۆپارێزی ئامــاژەی پێکــردوە، چونکــە بــە هــۆی پێویســتی ئافرەتــان پێــی، بە هەمــان شــێوە فەرمانی پێکــردوون بــە گوێڕایەڵــی، بە تایبــەت نوێــژو زەکات، ئەو دووانــە کە پێویســتی پێیەتیو هەمــوو کەس پێــی ناچارە، ئــەو دووانــە گەورەترینی پەرســتنەکانن، لە نوێژدا دڵســۆزیە بۆ پەرســتراو، لــە زەکاتتــدا چاکەیە بۆ بەنــدەی خوا.

پاشــان فەرمانــی پێکــردن بــە گوێڕایەڵــی بــە گشــتی، جــا فەرمــووی: ﴿ وَأَطِعۡنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ﴾ (واتــە: گوێڕایەڵــی خــواو پێغەمبەرەکەی بکــەن) دەچێتە نێــو گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکــەی، هەمــوو فەرمانێــک فەرمانیــان پێکردبێــت، فەرمانی ئەرکو پێویســت، یان فەرمانی پەســند.

﴿ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ ﴾ (بــە ڕاســتی خــوا دەیەوێــت) بە فەرمــان کردن بــە ئێــوە (خێزانەکانی پێغەمبــەر) لــەوەی فەرمانی پێکــردوون، وە قەدەغەکردن لێتان لەوەی قەدەغــەی لێکردوون، ﴿ لِيُذۡهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجۡسَ ﴾ واتــە: پیســیو شــەڕو گوناهتــان (لــێ دوور بخاتــەوە)، ﴿ أَهۡلَ ٱلۡبَيۡتِ وَيُطَهِّرَكُمۡ تَطۡهِيرٗا ﴾ (واتــە: ئــەی خانــەوادەی پێغەمبەر، وە پــاکو خاوێنتان

بکاتــەوە بــە تەواوەتــی)، هەتــا دەبــن بــە پــاکــو پاکۆکــەر، واتــە: ستایشــی خــوا بکەنو سوپاســگوزرای بــن لەســەر ئــەم فەرمانو قەدەغــە کراوانــە، کە هەواڵــم پێداون بە ســوودو بەرژەوەندیــان، ئەوانــە تــەواوی بەرژەوەندی ئێــوەی تێدایە، خوا نەیویســتووە بــەو فەرمانو قەدەغەکراوانــە ئەرکــی سەرشــانتان قــورسو گــران بــکات، بەڵکــو بــۆ ئەوەیــە نەفــسو دەروونو ڕەوشــتتان پــاک ببێتــەوەو کردەوەکانتــان جوان ببێتو پاداشــتتان گــەورە بێت.

کاتــێ فەرمانــی پێکردن بە کردەوە کــە بریتیە لە ئەنجامدانو وازهێنــان، فەرمانی پێکردوون، ﴿ وَٱذۡكُرۡنَ مَا يُتۡلَىٰ فِي بُيُوتِكُنَّ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱلۡحِكۡمَةِ ﴾ (واتــە: بیر بکەنەوە لــەوەی دەخوێنرێــت لــە ماڵەکانتاندا لــە ئایەتەکانی خواو دانایی)، مەبەســت لــە ئایەتەکانی خــوا: قورئانــە، وە لە حیکمــەت: نهێنیەکانێتی، یان ســوننەتی پێغەمبەرەکەیەتــی، وە فەرمانی پێکــردوون بــە یادکردنــی، یادکردنەوە بــە خوێندنەوەو بیر کردنــەوەو تێرامان لــە ماناکانی دەگرێتــەوە، وە دەرهێنانــی حوکــمو بڕیارەکانــیو کار پێکردنــیو لە یەکدانــەوەی، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا ﴾ (واتــە: بــە ڕاســتی خــوا وردبینی ئاگــادارە)، نهێنــی کاروبارەکان دەزانــێ، ئەوانــەش لە نــاو ســنگەکاندان، پەنهانەکانی ئاســمانەکانو زەوی، ئــەو کردەوانەی دەردەکــەویو دەشــاردرێتەوە، وردبینــیو ئاگاداربوونی خوا هانیان دەدات لەســەر دڵســۆزی کــرداره نهێنیــەکان، وە پاداشــت دانەوەی خوا لەســەر ئــەو کردەوانە.

لــە ماناکانــی (اللطیــف) کــە بەندەکەی دەبــات بۆ لای خێــرو دەیپارێــزێ لە شــەڕو خراپە، بــە چەندین ڕێگای شــاراوە هەســتی پێناکات، وە دەیبــات بــەرەو لای ڕزقو ڕۆزی کە پێی نازانــێ، وە چەندین هۆکاری پێنیشــان دەدات نەفــسو دەروون حەزی لێنــاکات، ئەوە دەبێتە ڕێگایــەک دەیبات بــۆ بەرزترین پلــەو پایەکان.

(٣٥): ﴿ إِنَّ ٱلۡمُسۡلِمِينَ وَٱلۡمُسۡلِمَٰتِ وَٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ وَٱلۡقَٰنِتِينَ وَٱلۡقَٰنِتَٰتِ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ وَٱلۡخَٰشِعِينَ وَٱلۡخَٰشِعَٰتِ وَٱلۡمُتَصَدِّقِينَ وَٱلۡمُتَصَدِّقَٰتِ وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ وَٱلۡحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمۡ وَٱلۡحَٰفِظَٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرٗا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغۡفِرَةٗ وَأَجۡرًا عَظِيمٗا ٣٥ ﴾:

کاتێ خوا ﷻ باســی پاداشــتی خێزانەکانی پێغەمبەری کرد، وە ســزادانیان، ئەگەر گوێڕایەڵی نەکــەن، بێگومــان هیــچ کەس لــە ئافرەتان وەکو ئــەوان نین، ئنجــا باســی ئافرەتانی دیکەی غەیری وانــی کردوە.

وە کاتــێ کــە حوکمو بڕیــاری ئەوانو پیــاوان یەکــن، حوکمەکانی بە هاوبــەش داناوە، جا

فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ﴾ (واتە: بە ڕاستی پیاوە موسوڵمانەکانو ئافرەتە موسوڵمانەکان)، ئەمە لە ڕواڵەتی شەریعەتدا، ئەگەر ئەوان پێی هەستابوون ﴿وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ﴾ (واتە: بڕوادارانی پیاوانو بڕوادارانی ئافرەتان) ئەمە لە کارە شاراوەو نهێنیەکانە، لە بیرو بڕوای دڵو کردارەکانی.

﴿وَٱلْقَٰنِتِينَ﴾ واتە: (پیاوانی) گوێڕایەڵ بە خواو پێغەمبەرەکەی ﴿وَٱلْقَٰنِتَٰتِ وَٱلصَّٰدِقِينَ﴾ (ئافرەتانی گوێڕایەڵو پیاوانی ڕاستگۆ) لە قسەو کردەوەکانیاندا ﴿وَٱلصَّٰدِقَٰتِ﴾ (ئافرەتانی ڕاستگۆ)، ﴿وَٱلصَّٰبِرِينَ﴾ (پیاوانی ئارامگر) لەسەر ناڕەحەتیو بەڵاو موسیبەتەکان ﴿وَٱلصَّٰبِرَٰتِ وَٱلْخَٰشِعِينَ﴾ (ئافرەتانی ئارامگرو پیاوانی ملکەچ) لە هەموو بارودۆخەکانیاندا بە تایبەت لە پەرستنەکانیان بە تایبەتر لە نوێژەکانیان، ﴿وَٱلْخَٰشِعَٰتِ﴾ (ئافرەتانی لە خوا ترس) ﴿وَٱلْمُتَصَدِّقِينَ﴾ (پیاوانی بەخشندە) فەرز بێ یان سوننەت، ﴿وَٱلْمُتَصَدِّقَٰتِ وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ﴾ (ئافرەتانی بەخشندە پیاوانو ئافرەتانی ڕۆژووەوان) ئەوانە فەرزو سوننەت لەخۆ دەگرن ﴿وَٱلْحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمْ﴾ (لە زیناو پێشەکیەکانی) ﴿وَٱلْحَٰفِظَٰتِ﴾، ﴿وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا﴾ واتە: (پیاوانێ کە زۆر یادی خوا دەکەن) لە زۆربەی کاتەکانیاندا، بە تایبەت کاتێ ویردە بەند کراوەکان وەک بەیانیانو ئێواران، وە دوای نوێژە فەرزەکان ﴿وَٱلذَّٰكِرَٰتِ﴾.

﴿أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم﴾ واتە: (خوا ئامادەی کردوە) بۆ ئەوانەی وەسف کراون بەم سیفەتە چاکو جوانو گەورانە، کە دەکەوێتە نێوان بیرو بڕواکانو کردەوەکانی دڵو کردەوەکانی ئەندامانی جەستەو کردەوەکانی زمان، وە سوودی تێپەڕو کورت، وە لە نێوان کارە خێرەکانو وازهێنان لە شەڕ، کە هەر کەسێ پێی هەستێ ئەوە بە هەموو ئاین هەستاوە، ئاشکراو نهێنی، بە ئیسلامو ئیمانو ئیحسان.

خوا ﷻ پاداشتی دانەوە لەسەر کردەوەکانیان بە لێخۆشبوونی گوناهەکانیان چونکە چاکەکان گوناهەکان لادەبەن ﴿وَأَجْرًا عَظِيمًا﴾ کە هیچ ناتوانێ ئەندازەی بکات جگە لەو زاتەی بەخشیویەتی، لەوەی چاو نەیبینیوەو گوێ نەیبیستووە، بەختوورەش بەسەردڵدا نەهاتووە، داوا دەکەین لە خوا بمانگێڕێ بە یەکێک لەوان.

وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ
لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا
مُّبِينًا ﴿٣٦﴾ وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِىٓ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ
أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَٱتَّقِ ٱللَّهَ وَتُخْفِى فِى نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ
مُبْدِيهِ وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَىٰهُ ۖ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ
مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَٰكَهَا لِكَىْ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِىٓ
أَزْوَٰجِ أَدْعِيَآئِهِمْ إِذَا قَضَوْا۟ مِنْهُنَّ وَطَرًا ۚ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا
﴿٣٧﴾ مَّا كَانَ عَلَى ٱلنَّبِىِّ مِنْ حَرَجٍ فِيمَا فَرَضَ ٱللَّهُ لَهُۥ ۖ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِى
ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلُ ۚ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا ﴿٣٨﴾ ٱلَّذِينَ
يُبَلِّغُونَ رِسَٰلَٰتِ ٱللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُۥ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلَّا ٱللَّهَ ۗ وَكَفَىٰ
بِٱللَّهِ حَسِيبًا ﴿٣٩﴾ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن
رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّۦنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٤٠﴾
يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا ﴿٤١﴾ وَسَبِّحُوهُ
بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٤٢﴾ هُوَ ٱلَّذِى يُصَلِّى عَلَيْكُمْ وَمَلَٰٓئِكَتُهُۥ
لِيُخْرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ وَكَانَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا ﴿٤٣﴾

(٣٦): ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾﴾:

﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ﴾ واتە: نابێ‌و ناگونجێ بۆ هیچ کەسێکی بڕوادار جگە لە پەلەکردن نەبێ لە ڕەزامەندی خواو پێغەمبەرەکەی، وە هەڵهاتن لە خەشم‌و قینی‌و بەجێ هێنانی فەرمانەکانی‌و دوورکەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکانی، گونجاونیە بۆ پیاوی بڕوادارو ئافرەتی بڕوادار ﴿إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا﴾ (واتە: کاتێ خواو پێغەمبەر بڕیاری هەر کارێکیان دا) لە کارەکان، وە سەپاندیانو پەیوەست بوون پێیەوە ﴿أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ﴾ واتە: سەرپشکن، ئایا دەیکەن یان نایکەن؟ بەڵکو پیاوو ئافرەتی بڕوادار دەزانێ پێغەمبەر ﷺ لە پێشترە لە نەفسی، هەندێ لە هەواو نەفسی ناکاتە بەربەست لە نێوان خۆی‌و نێوان فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی.

﴿وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا﴾ واتە: (هەر کەسێک سەرپێچی خواو پێغەمبەرەکەی بکات ئەوە بێگومان گومڕا بووە بە گومڕابوونێکی) ڕوون، چونکە وازی لە ڕێگای ڕاست هێناوە کە دەیگەیەنێت بە شوێنی ڕێزداری خوا، بەڵکو ڕێگایەکی گرتووەتە بەر دەیگەیەنێت بە سزای سەختو بە ئێش، سەرەتا باسی هۆکاری پێویستکەری کردوە بە بەرهەڵستی نەکردنی فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی، ئەویش ئیمانە، پاشان بەربەستی ئەوەی باس کردوە، ئەویش ترساندنە بەو گومڕاییەی کە بەڵگەیە لەسەر سزاو تۆڵە.

(٣٧): ﴿وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِىٓ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَٱتَّقِ ٱللَّهَ وَتُخْفِى فِى نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَىٰهُ ۖ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا

وَطَرًا زَوَّجْنَـٰكَهَا لِكَىْ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِىٓ أَزْوَٰجِ أَدْعِيَآئِهِمْ إِذَا قَضَوْا۟ مِنْهُنَّ وَطَرًا ۚ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا ﴿٣٧﴾:

هـۆکاری دابەزینـی ئـەم دەقـە، بێگومـان خـوا ﷻ ویسـتی یاسـاو شـەریعەتێک بـۆ بـڕواداران دابنـێ، ئەوانـەی بـە کوڕکـراوون لـە چوارچێـوەی منداڵـی ڕاسـتەقینەدا نیـن لـە هەمـوو ڕووەکانـەوە، گونـاه نیـە -ئـەو کەسـانەی کردویانـن بـە کـوڕی خۆیـان- خێزانەکانیـان مـارە بکـەن. ئـەم کاروبارانـەی کـراون بـە نەریـت لاناچـن مەگـەر بەڕوداوێکـی گـەورە، خـوا ویسـتی ئـەم یاسـایە قسـەیەک بێـت لـە پێغەمبەرەکـەی‌و کـردەوەی ئـەو بێـت، جـا ئەگـەر کارێکـی بـوێ هۆکارێکـی بـۆ دادەنـێ.

زەیـدی کـوڕی حاریسـە بانـگ دەکـرا بـە زەیـدی کـوڕی موحەممـەد ﷺ، پێغەمبەر ﷺ کردبـووی بـە کـوڕی خـۆی بـە نـاوی ئـەوەوە بانـگ دەکـرا هەتـا دابـەزی: ﴿ ٱدْعُوهُمْ لِـَٔابَآئِهِمْ ﴿٥﴾ ﴾الأحـزاب، (واتـە: بـە نـاوەی باوکیانـەوە بانگیـان بکـەن) ئنجـا پێـی وتـرا: زەیـدی کـوڕی حاریسـە.

زەینەبـی کچـی جەحـش خێزانـی بـوو، ئامـۆزای پێغەمبـەر ﷺ، بێگومـان پێغەمبـەر ﷺ لەدڵـی خۆیـدا وتـی ئەگـەر زەیـد تەڵاقـی دا مـارەی دەکـەم. قـەدەری خـوا وابـوو لـە نێـوان زەینـەب‌و زەیـدی کـوڕی حاریسـە شـتێک ڕوویـدات، داوای لـە پێغەمبـەر کـرد لێـی جیابێتـەوە.

خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِىٓ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ ﴾ واتـە: (کاتـێ بـەو کەسـەت دەوت خـوا بەهـرەی بەسـەریدا ڕشـتووە) بـە ئیسـلام ﴿ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ ﴾ (تۆیـش چاکـەت لەگـەڵ کـردوە) بـە ئـازاد کـردن، کاتـێ هـات بـۆ لات ڕاوێـژی جیابونـەوەی کـرد، پێتـوت -وەک ئامۆژگـاری کردنێـک، لەسـەر بەرژەوەنـدی ئـەو، لەگـەڵ ڕوودانـی لـە دڵتـدا، بەرژەوەنـدی ئـەوت پێشخسـت بەسـەر حـەزی خۆتـدا-: ﴿ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ ﴾ واتـە: (خێزانەکـەت لای خـۆت بهێڵـەوە) لێـی جیـا مەبـەرەوە، ئـارام بگـرە لەسـەر ئـەوەی هاتـووە بـۆت ﴿ وَٱتَّقِ ٱللَّهَ ﴾ (پارێـز لـە خـوا بکـە) لـە هەمـوو کاروبارەکانتـدا بـە گشـتی، وە بـە تایبەتـی لـە کاروبـاری ژنەکـەت، چونکـە بێگومـان خۆپارێـزی هانـدەدا لەسـەر ئارامـی‌و فەرمانـی پێـدەکات.

﴿ وَتُخْفِى فِى نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ ﴾ (واتـە: لـە دڵـی خۆتـدا شـتێک دەشـاریتەوە کـە خـوا ئاشـکرای دەکات) ئـەوەی پێغەمبـەر ﷺ شـاردیەوە، ئەگـەر زەیـد تەڵاقـی

بدات ئەوە دەیخوازێ، ﴿ وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ ﴾ (لە قسەی خەڵکی دەترسی) لە ئاشکرا نەکردنی ئەوەی لە ناختدایە ﴿ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَىٰهُ ﴾ (واتە: خوا لە پێشترە لێی بترسیت) وە گوێیان پێنەدەیت.

﴿ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا ﴾ واتە: (ئنجا کاتێ زەید پێویستی پێنەما) دەروونی ئارام بوو، وازێ لێهێناو لێی جیابوویەوە ﴿ زَوَّجْنَـٰكَهَا ﴾ (ئێمە زەینەبمان لێ مارە کردیت) تەنها لەبەر سوودێکی مەزن ئەوەمان کرد، ئەویش: ﴿ لِكَىْ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِىٓ أَزْوَٰجِ أَدْعِيَآئِهِمْ ﴾ (واتە: بۆ ئەوەی هیچ نارەحەتی نەبێت لەسەر مسوڵمانان لە مارە کردنی ژنانی بە کوڕ کراوانیاندا) کاتێ بتبینن ژنی زەیدی کوڕی حاریسەت مارە کردوە، کە پێشتر دەدراوە پاڵت.

وە کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ لِكَىْ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِىٓ أَزْوَٰجِ أَدْعِيَآئِهِمْ ﴾ گشتگیرە بۆ هەموو کاتەکان، لەو کاتانەی کە دروست نیە، ئەویش پێش کۆتایی هاتنی پێویستی پێی‌و تەڵاقدانێ، ئەوەی بەنددار کردوە بە فەرموودەی: ﴿ إِذَا قَضَوْا۟ مِنْهُنَّ وَطَرًا ۚ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا ﴾ واتە: (کاتێ پێویستیان پێیان نەماو تەڵاقیان دان فەرمانی خوا) هەردەبێ ڕووبدات، هیچ ڕێگرو بەربەستێکی بۆ نیە،

ئەم دەقانە لەسەر ئەم چیرۆکە چەندین سوودو وەدەستهاتوو لەخۆ دەگرێ:

یەکەم: ستایش کردنی زەیدی کوڕی حاریسە، ئەویش لە دوو ڕووەوە:

یەکەمیان: خوا ﷻ لە قورئاندا ناوی هێناوە، ناوی هیچ یەکێک لە هاوەڵانی نەهێناوە بە ناوی خۆیەوە جگە لە زەید.

دووەمیان: خوا ﷻ هەواڵ دەدات نیعمەت‌و بەهرەی ئیسلام‌و ئیمانی پێداوە، ئەمە شایەتیەکە لەلایەن خواوە کە ئەو کەسێکی مسوڵمانی بڕواداری بەڕواڵەت‌و بەناخ، ئەگەرنا هیچ ڕوویەک نیە بۆ تایبەتکردنی بە نیعمەت، ئەگەر مەبەستی پێی نیعمەتێکی تایبەت نەبێ.

دووەم: بێگومان ئازادکراو لە نیعمەتی ئازاد کەردایە.

سێیەم: دروستە مارەکردنی ژنی بە کوڕدانراو، هەروەک ئایەتەکە بەڕوونی ئاماژەی پێدەکات.

چوارەم: فێرکردنی کرداری تەواوترە لە فێرکردنی زارەکی، بە تایبەت ئەگەر بەسترێتەوە بە قسە، بە ڕاستی ئەوە ڕووناکیە لەسەر ڕووناکی.

پێنجـــەم: خۆشەویســـتی لـــە دڵـــی بەنـــدەدا بـــۆ جگـــە لـــە خێـــزانو خزمەتـــکارو مەحرەمەکـــەی ئەگـــەر گرێنەدرابـــێ بـــە شـــتی ترســـناکەوە مـــرۆڤ لەســـەری تاوانبـــار نابـــێ، ئەگەرچـــی خۆزگەکانـــی بـــەوەوە بەســـتراوەتەوە، ئەگـــەر مێردەکـــەی تەڵاقـــی بـــدا ئـــەوە مـــارەی دەکات، بەبـــێ ئـــەوەی هـــەوڵو کۆشـــش بـــکات بـــۆ جیابوونـــەوە لـــە نێوانیانـــدا، یـــان ببێتـــە هـــۆکار بـــە هـــەر جـــۆرێ بـــێ، چونکـــە خـــوا ﷻ هەواڵیـــداوە کـــە بێگومـــان پێغەمبـــەر ﷺ ئـــەوەی لـــە نەفســـی خۆیـــدا شـــاردەوە.

شەشـــەم: پێغەمبـــەری خـــوا پەیامـــی خـــوای بەرِوونـــی گەیانـــد، هیـــچ شـــتێک نەمایـــەوە لـــەو وەحیـــەی بـــۆی هـــات بێگومـــان گەیانـــدی، تەنانـــەت ئـــەم کارەش کـــە سەرزەنشـــت کردنـــی خـــۆی تێدایـــە! ئەمـــە بەڵگەیـــە کـــە ئـــەو پێغەمبـــەری خوایـــە، هیـــچ ناڵـــێ تەنهـــا ئـــەوە نەبـــێ کـــە وەحـــی بـــۆ کـــراوە، وە نایـــەوێ خـــۆی بـــە مـــەزن دابنـــێ.

حەوتـــەم: بێگومـــان ڕاوێـــژ پێکـــراو متمانەپێکـــراوە، پێویســـتە لەســـەری ئەگـــەر ڕاوێـــژی پـــێ بکـــرێ لـــەکارێ لـــەکارەکان بەپێـــی زانیـــاری خـــۆی چـــی لـــە بەرژەوەنـــدی ڕاوێـــژ بۆکراودایـــە ئامـــاژە بـــۆ ئـــەوە بـــکات، ئەگەرچـــی خۆیشـــی حـــەزی لێبـــکات، بەرژەوەندی ڕاوێـــژ بۆکـــراو پێـــش دەخـــات بەســـەر هـــەواو نەفـــسو ئـــەوەی خـــۆی دەیـــەوێ.

هەشـــتەم: بێگومـــان لەبیـــروو ڕای چـــاکو جـــوان بـــۆ کەســـێک کـــە ڕاوێـــژ دەکات لـــە جیابوونـــەوەی خێزانەکـــەی فەرمانـــی پـــێ بکـــرێ بـــە دەســـتپێوە گرتنـــی هەرچـــی لـــە توانایـــدا هەیـــە، ئـــەوە باشـــترە لـــە جیابوونـــەوە.

نۆیـــەم: پێویســـتە لەســـەر بەنـــدە ترســـی خـــوا پێـــش بخـــات بەســـەر ترســـی بەنـــدەدا وە ئـــەوە لـــە پێشـــتر بـــێ بەلایـــەوە.

یـــازدە: فەزیڵـــەو چاکـــەی زەینـــەب دایکـــی بـــڕواداران (خـــوا لێـــی ڕازی بێ) لـــەو ڕووەی خـــوا ﷻ مـــارەی کـــرد لـــە پێغەمبەرەکـــەی ﷺ بەبـــێ داواکـــردنو شـــایەتی، لەبـــەر ئەمەیـــە شـــانازی بەمـــەوە دەکـــرد بەســـەر خێزانەکانی دیکـــەی پێغەمبـــەر ﷺ، وە دەیـــوت: {زَوَّجَكُنَّ أَهَالِيكُـنَّ وَزَوَّجَنِـي اللَّـه مِـنْ فَـوْق سَـبْع سَـمَاوَات} (أَخْرَجَـهُ التِّرمِـذِيُّ برقـم: (٣٢١٣)، وَفي لَفْـظ لِلْبُخَـارِيِّ « كَانَـتْ تَقُـول أَنْكَحَنِـي اللَّـه فِي السَّـمَاء) واتـە: ئێـوە خانەوادەکەتـان مـارەی بڕیـن، بـەڵام مـن لـە حـەوت تەبەقـی ئاسـمانەوە خـوای گـەورە مـارەی بڕیـم.

دوازدە: ئافـرەت ئەگـەر خـاوەن مێـرد بـێ دروسـت نیـە مـارە بکـرێ، وە نـە کۆششـی بـــۆ بکـــرێو نـــە بـــۆ هۆکارەکانـــی، هەتـــا مێردەکـــەی لێـــی جیاببێتـــەوە، وە لێـــی

جیانابێتــەوە هەتــا ســووڕی مانگانــەی تــەواو نەبــێ، چونکــە لــە پێــش تــەواو بوونــی ســووڕی مانگانــەی ئــەو لــە ژێــر بــاری مێردەکەیدایــە، یــان مێردەکــەی مافــی ئــەوەی هەیــە بیگەڕێنێتــەوە، ئەگــەر لــە هەنــدێ ڕوویشــەوە.

(٣٨-٣٩): ﴿ مَّا كَانَ عَلَى ٱلنَّبِيِّ مِنْ حَرَجٍ فِيمَا فَرَضَ ٱللَّهُ لَهُۥ ۖ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِى ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلُ ۚ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا ﴿٣٨﴾ ٱلَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَـٰلَـٰتِ ٱللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُۥ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلَّا ٱللَّهَ ۗ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبًا ﴿٣٩﴾ ﴾.

ئەمــە بەرپەرچدانەوەیــە لــە تانەدانــی ئــەو کەســەی تانــە لــە پێغەمبــەری خــوا دەدات دەربــارەی زۆری خێزانەکانــی، بێگومــان تانەدانــی ئــەو هیــچ تانەیەکــی تێدانیــە، فەرموویەتــی: ﴿ مَّا كَانَ عَلَى ٱلنَّبِيِّ مِنْ حَرَجٍ ﴾ واتــە: هیــچ گوناهــو تاوانێــک (لەســەر پێغەمبــەر ﷺ نیــە)، ﴿ فِيمَا فَرَضَ ٱللَّهُ لَهُۥ ﴾ لــەوەی خــوا بــۆی دانــاوە لــە خێزانــەکان، چونکــە ئەمــە خــوا ﷻ ڕێگــەی پێــداوە بــۆ پێغەمبەرانــی پێــش ئــەو، لەبــەر ئەمەیــە فەرموویەتــی: ﴿ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِى ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلُ ۚ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا ﴾ کەواتــە: هــەر دەبــێ ڕوو بــدات.

پاشــان باســی کــردوە ئەوانــە کێــن لەمــەو پێــش کــە ڕۆیشــتوون، وە ئەمــە داب‌و نەریتیانــە، بێگومــان ئــەوان ﴿ ٱلَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَـٰلَـٰتِ ٱللَّهِ ﴾ (کەســانێ کــە پەیامەکانــی خــوا ڕادەگەیەنــن) ئایــەت‌و بەڵگــەو ســەلمێنراوەکانی خــوا بــۆ بەنــدەکان دەخوێننــەوەو بانگەوازیــان دەکــەن بــۆ لای خــوا ﴿ وَيَخْشَوْنَهُۥ ﴾ (لــە خــوا دەترســن) بەتــاک‌و تەنهــا بەبــێ هاوبــەش ﴿ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا ﴾ (بێجگــە لــە خــوا لــە کەســی دیکــە ناترســن).

جا ئەگەر ئەمە ســوننەتی خوابــێ لە پێغەمبــەرە پارێزراوەکانیدا، ئەوانەی ئەرکی سەرشــانیان بــە چاکــی بەجێهێنــا، ئەویــش بانگەوازکردنی خەڵکــە بۆ لای خواو ترســانە تەنهــا لە ئەو، کــە ئەنجامدانی هەموو فەرمــان پێکراوێک‌و وازهێنــان لە هەموو قەدەغەکــراوێ دەخوازێ، بەڵگەیــە لەســەر ئــەوەی ئــەو هیــچ ناتەواویەکــی تێدانیــە بــە هیــچ جــۆرێ ﴿ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبًا ﴾ (خــوا بەســە) چاودێــری بەندەکانــی بــکات‌و لــە کردەوەکانیان بپرســێ، لەمەدا دەرکەوتــووە نیــکاح‌و مارەبرین لــە ســوننەتی پێغەمبەراندا.

(٤٠): ﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَـٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٤٠﴾ ﴾.

﴿ مَّا كَانَ ﴾ واتــە: بــۆ پێغەمبــەر ﷺ نەبــووە، ﴿ مُحَمَّدٌ ﴾ ﷺ ﴿ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ ﴾ (باوکــی هیــچ یــەک لــە پیاوانتــان نیــە) ئــەی ئۆممــەت، پچڕاندنــی زەیــدی کــوڕی حاریســە لــە پێغەمبــەر لــەم بابەتەیــە.

کاتــێ کــە ئــەم نەفیکردنــە گشــتگیر بــوو بــۆ هەمــوو بارودۆخــەکان، بێگومان قســەکە بــە ڕواڵــەت ئــەوە هەڵدەگــرێ، واتــە: نــە باوکایەتی کــردن بە بــاوک نەبانگەشــەکردنی باوکایەتــی، بێگومــان لــە پێشــەوە چەســپا کــە بەڕاســتی پێغەمبــەر ﷺ باوکــی هەمــوو بڕوادارانــە، وە خێزانەکانیشــی دایکانــی ئەوانــن، بۆیــە خــۆی پاراســتوە بیخاتــە نێــو ئــەم جــۆرەوە، وە ئــەو قەدەغەکراوانــەی بــە گشــتی باســکرا، جــا فەرموویەتــی: ﴿ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ﴾ واتــە: پلــەو پایــەی گوێڕایەڵــی شــوێنکەوتووە، ڕێنمایــی لێوەردەگیــرێو بــڕوای پــێ دەهێنــرێ، پێویســتە خۆشویســتنی پێــش بخــرێ بەســەر هەمــوو کەســێکدا، ئامۆژگاریــکارە بــۆ بــڕواداران، لــە چاکــیو ئامۆژگاریــدا وەکو بــاوک وایــە بۆیــان.

﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا ﴾ واتــە: بــە زانســتی دەوری هەمــوو شــتەکانی داوە، دەزانــێ پەیامەکــەی لــە کوێــدا دادەنــێ، وە کــێ شایســتەیە بــە فــەزڵو چاکــەی وە کــێ شایســتە نیــە.

(٤١-٤٤): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا ﴿٤١﴾ وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٤٢﴾ هُوَ ٱلَّذِى يُصَلِّى عَلَيْكُمْ وَمَلَٰٓئِكَتُهُۥ لِيُخْرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ وَكَانَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا ﴿٤٣﴾ تَحِيَّتُهُمْ يَوْمَ يَلْقَوْنَهُۥ سَلَٰمٌ ۚ وَأَعَدَّ لَهُمْ أَجْرًا كَرِيمًا ﴿٤٤﴾ ﴾:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا ﴾ واتــە: خــوا ﷻ فەرمــان دەکات بــە بــڕواداران بــە زۆر یادکردنــەوەی بــە تەهلیــلو ستایشــکردنو بەپــاک ڕاگرتــنو بــە گەورەدانــانو جگــە لەوانــەش، لــە هەمــوو وتەیــەک نزیکــی تێدابــێ بــۆ لای خــوا، کەمترینــی ئەوانــە مــرۆڤ دەبــێ بــەردەوام بــێ لەســەر یادەکانــی بەیانیــانو ئێــواران، وە ویردەکانــی دوای پێنــج نوێژەکــە، وە ئــەو ویردانــەی لــە کاتــی ڕووداو هۆکارەکانــدان.

﴿ وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴾ واتــە: لــە ســەرەتای ڕۆژو کۆتاییەکــەی، بــە هــۆی فــەزڵو ڕێــزی ئــەو دوو کاتــەوە، وە ئاســانی کارکــردن تیایانــدا ﴿ هُوَ ٱلَّذِى يُصَلِّى عَلَيْكُمْ وَمَلَٰٓئِكَتُهُۥ لِيُخْرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ وَكَانَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا ﴾ واتــە: لــە بەزەیــیو نــەرمو نیانــی خــوا ﷻ بەبــڕواداران ئەوەیــە میهرەبانــی خــۆی دەڕێــژێ

بەسـەریانداو فریشـتەکانیش داوای لێبوردنیـان بـۆ دەکـەن، بـۆ ئـەوەی دەریـان بێنـێ لـە تاریکایـی سـتەمو تـاوانو نەفامـی، بـۆ ڕووناکـیو ئیمـانو سـەرکەوتنو زانسـتو کـردەوە.

ئەمـە مەزنترینـی نیعمەتەکانـی خوایـە بەسـەر بەنـدە گوێڕایەڵـەکان، وا دەخـوازێ سـوپاس گـوزاری بکـەن، وە زۆر یـادی خـوا بکـەن ئـەو زاتـەی نـەرمو نیانـیو میهرەبانـی نوانـدوە بۆیـان، وە هەڵگرانـی عەرشـەکەی بەچاکترینـی فریشـتەکان دانـاوە، وە ئەوانەشـی لـە دەوروو بەریـن بـە پاکـی ستایشـی پەروەردگاریـان دەکـەنو داوای لێخۆشـبوون بـۆ بـڕواداران دەکـەن، دەڵێـن: ﴿ رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَيْءٍ رَّحْمَةً وَعِلْمًا فَاغْفِرْ لِلَّذِينَ تَابُوا وَاتَّبَعُوا سَبِيلَكَ وَقِهِمْ عَذَابَ الْجَحِيمِ ﴿٧﴾ رَبَّنَا وَأَدْخِلْهُمْ جَنَّاتِ عَدْنٍ الَّتِي وَعَدتَّهُمْ وَمَن صَلَحَ مِنْ آبَائِهِمْ وَأَزْوَاجِهِمْ وَذُرِّيَّاتِهِمْ ۚ إِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿٨﴾ وَقِهِمُ السَّيِّئَاتِ ۚ وَمَن تَقِ السَّيِّئَاتِ يَوْمَئِذٍ فَقَدْ رَحِمْتَهُ ۚ وَذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿٩﴾ ﴾ غافـر.

(واتـە: ئـەی پەروەردگارمـان میهرەبانـیو زانیاریـت هەمـوو شـتێکی گرتۆتـەوە دەی خـۆش ببـە لەوانـەی تەوبەیـان کـردوە، وە شـوێن ڕێبـازی تـۆ کەوتـوون، وە بیانپارێزە لـە سـزای دۆزەخ * ئـەی پەروەردگارمـان بیشـیان خـەرە بەهەشـتانێکی هەمیشـەیی کـە بەڵێنـت پێدابـوون ئـەو کەسـانەش چاکـەکار بـوون لـە باووباپیـرانو هاوسـەرانو ڕۆڵەکانیـان بەڕاسـتی هەرتـۆ زاڵـی کار دروسـتی * وە بیانپارێـزە لـە تۆڵـەی تاوانـەکان چونکـە هـەر کەسـێک لـە تۆڵـەی خراپـەو تـاوان بپارێـزی لـەو ڕۆژەدا ئـەوە بێگومان ڕەحمـت پێکـردوە، وە هـەر ئەوەیـە سـەرکەوتنی مـەزن.

ئەمـە میهرەبانـیو ڕەحمەتـی خوایـە بەسـەریانەوە لـە دونیـادا، بـەڵام ڕەحمەتـی میهرەبانـی پێیـان لـە ڕۆژی دوایـی ئـەوە گەورەتریـن ڕەحمـەتو چاکتریـن پاداشـتە ئەویـش سـەرکەوتنو سـەرفرازیە بـە ڕەزامەنـدی خـواو بەخێرهاتنیان، وە بیسـتنی قسـە گەورەکانـی خـواو بینینـی ڕووخسـاری جوانـی، وە بەدەسـتهێنانی پاداشـتی گـەورە کـە ناوەڕۆکـی نازانـرێ جگـە لـەو کەسـەی کـە پێـی بەخشـیون، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی:

تَحِيَّتُهُمْ يَوْمَ يَلْقَوْنَهُۥ سَلَٰمٌۚ وَأَعَدَّ لَهُمْ أَجْرًا كَرِيمًا ﴿٤٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا
ٱلنَّبِىُّ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ شَٰهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿٤٥﴾ وَدَاعِيًا
إِلَى ٱللَّهِ بِإِذْنِهِۦ وَسِرَاجًا مُّنِيرًا ﴿٤٦﴾ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ بِأَنَّ لَهُم
مِّنَ ٱللَّهِ فَضْلًا كَبِيرًا ﴿٤٧﴾ وَلَا تُطِعِ ٱلْكَٰفِرِينَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ
وَدَعْ أَذَىٰهُمْ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿٤٨﴾
يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا نَكَحْتُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ
مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَاۖ
فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٤٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ
إِنَّآ أَحْلَلْنَا لَكَ أَزْوَٰجَكَ ٱلَّٰتِىٓ ءَاتَيْتَ أُجُورَهُنَّ وَمَا مَلَكَتْ
يَمِينُكَ مِمَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَيْكَ وَبَنَاتِ عَمِّكَ وَبَنَاتِ عَمَّٰتِكَ
وَبَنَاتِ خَالِكَ وَبَنَاتِ خَٰلَٰتِكَ ٱلَّٰتِى هَاجَرْنَ مَعَكَ وَٱمْرَأَةً
مُّؤْمِنَةً إِن وَهَبَتْ نَفْسَهَا لِلنَّبِىِّ إِنْ أَرَادَ ٱلنَّبِىُّ أَن يَسْتَنكِحَهَا
خَالِصَةً لَّكَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَۗ قَدْ عَلِمْنَا مَا فَرَضْنَا
عَلَيْهِمْ فِىٓ أَزْوَٰجِهِمْ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ لِكَيْلَا
يَكُونَ عَلَيْكَ حَرَجٌۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٥٠﴾

﴿ تَحِيَّتُهُمْ يَوْمَ يَلْقَوْنَهُۥ سَلَٰمٌۚ وَأَعَدَّ لَهُمْ أَجْرًا كَرِيمًا ﴾ (واتە: ڕۆژێ بڕواداران دەگەنە خزمەتی خوا ﷻ بەخێر هاتنیان بە وشەی سەلامە، وە خوا پاداشتی چاکی بۆ ئامادە کردوون).

(٤٥-٤٨): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ شَٰهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿٤٥﴾ وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذْنِهِۦ وَسِرَاجًا مُّنِيرًا ﴿٤٦﴾ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ بِأَنَّ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَضْلًا كَبِيرًا ﴿٤٧﴾ وَلَا تُطِعِ ٱلْكَٰفِرِينَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ وَدَعْ أَذَىٰهُمْ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿٤٨﴾ ﴾:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ ﴾ ئەم شتانەی کە خوا وەسفی پێغەمبەرەکەی پێکردوە ئەوە مەبەستە لە پەیامەکەیدا، وە کرۆکو کاکڵەو بنچینەیەتی، کە تایبەتە پێیەوە، ئەویش بریتیە لە پێنج شت:

یەکەمیان: بوونی پێغەمبەر بە ﴿ شَٰهِدًا ﴾ واتە: شایەتە لەسەر ئوممەتەکەی بەوەی کردوویانە لە چاکەو خراپە، هەروەکو خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ﴿١٤٣﴾ ﴾البقرة، (واتە: تا ببنە چاودێر بەسەر خەڵکەوە وە پێغەمبەریش چاودێر بێ بەسەر ئێوەوە)، وە فەرموویەتی: ﴿ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍۭ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا ﴿٤١﴾ ﴾النساء، (واتە: ئنجا حاڵی کافران چۆن بێت کاتێ هێنامان لە هەموو ئوممەتێکدا شایەتێک تۆشمان هێنا بە شایەت بەسەر ئەوانەوە)، پێغەمبەر ﷺ شایەتێکی دادپەروەروو وەرگیراوە.

دووەمو سێیەم: بوونی ﴿ وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴾ بە مژدە دەرو ترسێنەر، ئەمە بە پێویست زانینی باسکردنی مژدەدەرو ترسێنەرە، وە ئەوەی مژدەی پێدەداو دەیترسێنێ، وە ئەو کردەوانەی پێویستن بۆ ئەوانە.

جا مژدە پێدراو، بریتین لە بڕوادارانی لە خوا ترس، ئەوانەی بڕواهێنانو کردەوەی چاکو وازهێنان لە سەرپێچیان پێکەوە کۆکردۆتەوە، مژدەیان پێدەدرێ لە ژیانی دونیا بە هەموو

پاداشتێکی دونیایی‌و دینی، ئەوەش لەسەر ئیمانو لە خوا ترسان دامەزراوە، وە لە دوارۆژدا بە نازونیعمەتی هەتا هەتایی.

هەموو ئەو باسکراوانە پێویست دەکات بە دوورو درێژی باس بکرێت، لە تێروو تەسەلی کردەوەکانو نیشانەکانی لە خوا ترسانو جۆرەکانی پاداشت.

ترسێنراو: بریتین لە تاوانبارانو ستەمکاران، خاوەنانی ستەمو نەفامی، لە دونیادا دەترسێنرێن لە سزای دونیاو دوارۆژ کە دامەزراوە لەسەر نەفامی‌و ستەم، وە لە دوارۆژدا بە سزایەکی جەرگ بڕو دوورو درێژ. ئەم ڕستەیە درێژە پێدانەکەی پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی لە قورئانو سوننەت کە ئەوانە دەگرێتەوە.

چوارەم: بوونی بە ﴿ وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ ﴾ واتە: خوا ناردوویەتی خەڵکی بانگ بکات بۆ لای پەروەردگاریان، وە بیان با بۆ لای بەخشندەیی ئەو، فەرمانیان پێ بکات بە بەندایەتی کردنی کە لەو پێناوەدا دروستکراون.

ئەمەش بە پێویست زانینی بەردەوام بوونیتی لەسەر ئەو بانگەوازەی دەیکات، وە باسکردنی وردەکاری ئەوەی بانگەشەی بۆ دەکات، بە ناساندنی پەروەردگاریان بەسیفاتە بەرزو پیرۆزەکانو بە پاک ڕاگرتنی لەوەی شیاو نیە بە گەورەیی ئەو، وە باسکردنی جۆرەکانی پەرستنو بانگەواز کردن بۆ لای خوا بە نزیک ترین ڕێگا، وە پێدانی هەموو مافێک بە خاوەن مافی خۆی، بانگەواز کردن بە دڵسۆزی بۆ لای خوا، نەک بۆ لای نەفسی‌و بەمەزندانانی، وەک چۆن ئەوە دەخرێتە ڕوو لە لایەن زۆرێک لە نەفس‌و دەروونەکان لەم پلەو پایەدا. هەموو ئەوانە بە مۆڵەتی خوای بەرزو مەزنە بۆی لە بانگەوازو فەرمانی‌و ویستو قەدەری.

پێنجەم: بوونی بە ﴿ وَسِرَاجًا مُّنِيرًا ﴾ (چرای ڕووناک کەرەوە) ئەویش ئەوە دەخوازێ خەڵکی لە تاریکیەکی مەزندان، هیچ نوورێک نیە ڕێنماییان بکات لە تاریکیەکانی، زانستێکیش نیە ڕزگاریان بکات لە نەفامیەکانی، هەتا خوا ئەم پێغەمبەرە بەخشندەیەی هێنا، خوا ئەو تاریکیەی پێ ڕووناک کردەوە، وە بە هۆیەوە نەفامەکانی فێر کرد، وە بە هۆیەوە گومڕاکارانی ڕێنمایی کرد بۆ ڕێگای ڕاست.

ئەوانەی خاوەن ئیستیقامەو بەردەوامی بوون، ڕێگای بۆ ڕوون کردنەوە، بە شوێنی ئەم پێشەوایەدا ڕۆیشتن، بە هۆیەوە خێرو شەڕیان ناسی، وە خۆشبەختان لە بەدبەختان، وە ڕووناکیان لێیەوە وەرگرت بۆ ناسینی پەرستراوەکەیان، وە ناسیانەوە بە وەسفە ستایش کراوەکانی‌و و کردەوە پەسندەکانی‌و بڕیارە ژیرانەکانی.

﴿ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ بِأَنَّ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَضْلًا كَبِيرًا ﴾ (واتە: مژدە بدە بە ئیمانداران کە بێگومان بۆ ئەوان هەیە، بەهرەو بەخششێکی گەورە لە لایەن خواوە)، لەم ڕستەیەدا باسی مژدە پێدراوی کردوە، ئەویش بڕوادارانە، وە لە کاتی باس کردنی ئیمان بە تەنها، کردەوە چاکەکان دەچێتە نێویەوە.

وە باسی مژدە پێدراوی کردوە، ئەویش بریتیە لە بەخششێکی گەورەو مەزن کە بە هیچ جۆرێک ئەندازە ناکرێت، لە سەرکەوتن لە دونیادا، وە ڕێنمایی دڵەکانو لێخۆشبوونی گوناهەکانو ئاشکرا کردنی خەمەکانو زۆری ڕزقو ڕۆزیەکان، وە بەدەست هێنانی نیعمەتە دڵخۆشکەرەکانو سەرکەوتن بە ڕەزامەندی پەروەردگاریانو پاداشتی، وە ڕزگار بوون لە تووڕەیی‌و خەشمو قینی.

ئەمە کارکەران چالاک دەکات، پاداشتی خوایان یاد دەخاتەوە لەسەر کردەوەکانیان کە بەو هۆیەوە پشتی پێدەبەستن لەسەر گرتنەبەری ڕێگای ڕاست، ئەمە لە کۆی بڕیاری شەریعەتە، وەک لە حوکمەکانی باس دەکات لە جێگەی ترساندن، ئەو سزایانەی دامەزراون لەسەر ئەوەی پێی بترسێ، بۆ ئەوەی ببێتە یارمەتیدەر لە وازهێنانی ئەوەی خوا قەدەغەی کردوە.

کاتێ کە دەستەیەک لە خەڵکی ئامادەن بۆ بەرهەڵستی کردنی بانگەواز کارانی ڕێگای خوا، لە پێغەمبەرانو شوێنکەوتوانیان، ئەوانیش دوو ڕووەکانن، ئەوانەی بە ڕواڵەت ئیمانیان ئاشکرا کردوە، ئەوانە بێبڕواو گوناهبارن لە ناوەڕۆکدا، وە بێبڕوان بە ئاشکراو بە نهێنێ، خوا ڕێگری کردوە لە پێغەمبەرەکەی گوێڕایەڵیان بکات، لەوەش ئاگاداری کردوەتەوە، جا فەرموویەتی:

﴿ وَلَا تُطِعِ ٱلْكَـٰفِرِينَ وَٱلْمُنَـٰفِقِينَ ﴾ واتە: لە هەر کارێک بەرهەڵستی ڕێگای خوا بکات. بەڵام ئەمە ئازاردانیان ناگرێتەوە، بەڵکو گوێڕایەڵیان مەکە ﴿ وَدَعْ أَذَىٰهُمْ ﴾ (گوێ مەدە بە ئازاردانی ئەوان) بێگومان ئەوە دەبێتە مایەی ڕاکێشانی ئەوانو پاڵنەرێکیشە بۆ وەرگرتنی ئیسلام، لە وازهێنان لە زۆرێک لە ئازاردانیان، بۆ ئەو خانەوادەکەی.

﴿ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ﴾ (پشت بە خوا ببەستە) لە تەواو کردنی کاروبارەکانتو سەرشۆڕ کردنی دوژمنانت ﴿ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴾ (خوا بەسە پشتیوانت بێت) پشتی پێدەبەستریٰ لە کاروبارە گرنگەکان، پێی هەڵدەستێ‌و ئاسانی دەکات بەسەر بەندەکەیەوە.

(٤٩): ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا نَكَحْتُمُ ٱلْمُؤْمِنَـٰتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا ۖ فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٤٩﴾ ﴾:

خوا ﷻ هەواڵ دەدات بە بڕواداران، ئەوان ئەگەر ئافرەتانی بڕواداریان مارە بڕی، پاشان پێش

ئەوەی بچنە لایان تەڵاقیاندا، ئەوە ئەو ئافرەتانە لەسەریان نیە هیچ عیددەیەک بژمێرن بۆ مێردەکانیان. وە فەرمانی پێکردوون بە پێدانی موتعە لەم حاڵەتەدا، شتێک لە ماڵو سامانی دونیا، کە ببێتە مایەی ساڕێژ بوونی هەندێ لە خەمەکانیان، بە هۆی جیابوونەوەیان، وە تەڵاقیان بدەن بە شێوەیەکی جوان بە بێ دژایەتیو تۆمەتبار کردنو جگە لەوانەش.

ئەم دەقە دەکرێتە بەڵگە، کە تەڵاق نابێ مەگەر دوای مارەبڕین، جا ئەگەر تەڵاقیدا پێش ئەوەی مارەی بکات، یان تەڵاقەکەی هەڵواسی بە مارەبڕینەکەوە ئەوە ناکەوێ، چونکە خوا فەرموویەتی: ﴿إِذَا نَكَحْتُمُ ٱلْمُؤْمِنَـٰتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ﴾ تەڵاقی خستوەتە دوای مارەبڕین. ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بێ مارەبڕین تەڵاق دان هیچ بنەمایەکی نیە.

جا ئەگەر تەڵاق جیابوونەوەی تەواوەو قەدەغەکردنی یەکجاری نەکەوێت پێش مارەکردن، ئەوە قەدەغەکردنی ناتەواو بە (ظهار) یان (إيلاء)و وێنەی ئەوانە، لە پێشترە، کە پێش مارەبڕین ناکەوێت، وەک ئەوە ڕاسترینی یەکێک لەو دوو بۆچوونەی زانایانە.

وە دەقەکە بەڵگەیە لەسەر دروستی تەڵاق، چونکە خوا هەواڵی پێداوە دەربارەی برِوادارن، بە جۆرێ لۆمەو سەرزەنشکردنی تێدا نیە، لەگەڵ دەرکردنی دەقەکە بە دواندنی برِواداران. وە لەسەر دروستی تەڵاقدان پێش چوونە لای، وەک خوا ﷻ لە دەقێکی تردا فەرموویەتی: ﴿لَّا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ مَا لَمْ تَمَسُّوهُنَّ ﴿٢٣٦﴾﴾البقرة، (واتە: گوناهتان لەسەر نیە ئەگەر ژنانێک تەڵاق بدەن کە هێشتا نەچووبنە لایان).

وە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئافرەتی تەڵاقدراو پێش چوونە لای عیدەی نیە، بەڵکو تەنها بە تەڵاقدانی بۆی هەیە شوو بکات، ئەگەر بەربەستێ نەبێت. وە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دوای چوونە لای عیدەی لەسەرە.

ئایا مەبەست لە (الدخولو المسيس) چوونە لایەتی، وەک چۆن یەکدەنگی لەسەرە؟ وە بە هەمان شێوە مانەوە لەگەڵ مارە براوەکە، ئەگەر چی چوونە لای ڕووی نەدابێت، هەروەک جێنشینە ژیرەکان (الخلفاء الراشدون) ڕێگەیان پێداوە، ئەوە بۆچوونی ڕاستە، هەرکەسێ بچێتە ژوورەوە بۆ لای، چووبێتە لای یان نا، ئەگەر بەتاکو تەنها بن، ئەوە عیددە پێویستە لەسەری.

وە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی تەڵاقدراو پێش چوونە لای موتعەی پێدەدرێ، لەسەر دەوڵەمەند بە ئەندازەی خۆیو لەسەر هەژار بە ئەندازەی خۆی، ئەمە ئەگەر مارەیی بۆ دیاری نەکرابوو، بەڵام ئەگەر مارەیی پێویستی بۆ دیاری کرابوو، ئەوە بێگومان ئەگەر تەڵاق درا پێش چوونە لای، مارەییەکە دەکرێت بە دوو بەشەوە، ئەوە بەس دەبێت لە موتعە.

وە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێویستە بۆ کەسێک لە ژنەکەی جیابێتەوە پێش چوونە لای یان دوای چوونە لای، با جیابوونەوەکەیان جوان بێت، هەریەک لەو دووانە ستایش بکرێن لەسەری، با ناشرین نەبێت، چونکە لەوەدا شەڕو خراپە دادەمەزرێت لەسەری، لە لەکەدارکردنی هەریەکەیان لەوی تر.

وە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی عیددە مافی مێردە، چونکە خوا فەرموویەتی: ﴿فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ﴾ (واتە: ئەوە لەسەریان نیە بۆ ئێوە هیچ عیددەیەک) بە تێگەیشتن لە دەقەکە دەبێتە بەڵگە، ئەگەر تەڵاقی دا بۆ چوونە لای، ئەوە بۆ ئەو هەیە لەسەر ژنەکەی عیددە بکات. وە بەڵگەیە ئەو جیادەبێتەوە بە مردن، ڕاستەوخۆ دەچێتە ناو عیددەوە، چونکە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ﴾ (واتە: پاشان تەڵاقتاندان). وە بەڵگەیە جگە لەو مارە بڕەی نە چووەتە لایەوە، لە جیابوونەوەکان، بە مردن بێت یان زیندوویی، عیددەیان لەسەرە.

(٥٠): ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَحۡلَلۡنَا لَكَ أَزۡوَٰجَكَ ٱلَّٰتِيٓ ءَاتَيۡتَ أُجُورَهُنَّ وَمَا مَلَكَتۡ يَمِينُكَ مِمَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَيۡكَ وَبَنَاتِ عَمِّكَ وَبَنَاتِ عَمَّٰتِكَ وَبَنَاتِ خَالِكَ وَبَنَاتِ خَٰلَٰتِكَ ٱلَّٰتِي هَاجَرۡنَ مَعَكَ وَٱمۡرَأَةً مُّؤۡمِنَةً إِن وَهَبَتۡ نَفۡسَهَا لِلنَّبِيِّ إِنۡ أَرَادَ ٱلنَّبِيُّ أَن يَسۡتَنكِحَهَا خَالِصَةً لَّكَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۗ قَدۡ عَلِمۡنَا مَا فَرَضۡنَا عَلَيۡهِمۡ فِيٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ وَمَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ لِكَيۡلَا يَكُونَ عَلَيۡكَ حَرَجٞۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ٥٠﴾

خوا ﷻ بە منەت کردنەوە بەسەر پێغەمبەرەکەی بە حەڵاڵ کردنی ئەوەی حەڵاڵی کردوە، کە ئەوو بڕواداران تێیدا بەشدارن، وە ئەوەیشی تایبەتە بە ئەو دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَحۡلَلۡنَا لَكَ أَزۡوَٰجَكَ ٱلَّٰتِيٓ ءَاتَيۡتَ أُجُورَهُنَّ﴾ واتە: (ئەی پێغەمبەر ئێمە حەڵاڵمان کرد بۆ تۆ) ئەو هاوسەرانەت کە مارەییت پێداون، ئەمەش لەوانەیە کە پێغەمبەرو بڕواداران تێیدا بەشدارن، بێگومان بڕوادارانیش بەهەمان شێوە دروستە بۆیان مارەیی بدەن بە ئافرەتان.

﴿مَلَكَتۡ يَمِينُكَ﴾ بە هەمان شێوە حەڵاڵمان کردوە بۆت ئەو کەنیزەکانەی کە کراون بە موڵکت ﴿مِمَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَيۡكَ﴾ (واتە: لەوانەی خوا دەستی تۆی خستووە) لە دەستکەوتی بێبڕوایان، لە کۆیلەو ئازادەکان لەوانەی مێردیان هەیەو لەوانەی بێ مێردن، وە هەروەها لەمەشدا بەشدارن.

بە هەمان شێوەش لەوانەش بەشدارن، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَبَنَاتِ عَمِّكَ وَبَنَاتِ عَمَّٰتِكَ وَبَنَاتِ خَالِكَ وَبَنَاتِ خَٰلَٰتِكَ﴾ کچانی مامو کچانی پوور خوشکی باوک، وە کچانی خاڵ وە کچانی پوور خوشکی دایک، ئەوانەی کە نزیکو دوورن، ئەمەش کوورتهەڵهێنانی حەڵاڵ

کراوەکانە. لە مەفهومی دەقەکە ئەوە وەردەگیرێ جگە لەوان لە خزمان حەڵاڵ نین، هەروەک چۆن لە پێشەوە لە سوورەتی (النساء) باسکرا. بێگومان حەڵاڵ نیە لە خزمانی ئافرەتان جگە لەو چوارەی باسکرا، وە جگە لەوانەش لە لق‌و پۆکان بەرەهایی، وە ڕەچەڵەکەکانیش بەرەهایی، لق‌و پۆی دایک‌و باوک بۆ خوارەوە، وە لق‌و پۆی سەرووی ئەوان لە پشتی ئەو بێگومان دروست نیە.

کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّتِي هَاجَرۡنَ مَعَكَ ﴾ (ئەوانەی کە کۆچیان کرد لەگەڵت) ئەو ئافرەتانەی کۆچیان کردوە بەستۆتەوە تەنها بۆ پێغەمبەر ﷺ هەروەک چۆن ئەوە بۆچوونی ڕاستە لەو دوو بۆچوونە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا، بەڵام بۆ غەیری پێغەمبەر ﷺ بێگومان زانراوە ئەم بەستنەوەیە دروست نیە ﴿ وَٱمۡرَأَةً مُّؤۡمِنَةً إِن وَهَبَتۡ نَفۡسَهَا لِلنَّبِيِّ ﴾ تەنها بە خۆبەخشینی خۆی (بە پێغەمبەر) ﴿ إِنۡ أَرَادَ ٱلنَّبِيُّ أَن يَسۡتَنكِحَهَا ﴾ ئەمە بە پێی ویست‌و ئارەزووی خۆیەتی ﴿ خَالِصَةً لَّكَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾ واتە: خوا ﷻ ئەو ئافرەتەی حەڵاڵ کردوە کە خۆی بەخشیوە بە تۆ. بەڵام بڕواداران ئەوە بۆیان حەڵاڵ نیە ئافرەتێک مارە بکەن تەنها بەوەی نەفسی خۆی پێیان ببەخشێ.

﴿ قَدۡ عَلِمۡنَا مَا فَرَضۡنَا عَلَيۡهِمۡ فِيٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ وَمَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ ﴾ واتە: بە ڕاستی ئێمە دەزانین چیمان لەسەر بڕوادار پێویست کردوە، چی بۆیان حەڵاڵە، وە چی بۆیان حەرامە لە ئافرەتانو کەنیزەکەکان. وە بەوانەمان زانیوەو ئەرکەکانمان ڕوون کردۆتەوە. ئەوەی لە ناو ئەم ئایەتەدایە، لەوەی پێچەوانەی ئەوەیە ئەوە تایبەتە بەتۆ، چونکە خوا ﷻ کردوویەتی بە دواندنێ بۆ پێغەمبەر بە تەنها، بە فەرموودەی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَحۡلَلۡنَا لَكَ ﴾ تا کۆتایی ئایەتەکە.

کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ خَالِصَةً لَّكَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾ واتە: بۆ تۆمان حەڵاڵ کردوە ئەی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوانمان حەڵاڵ نەکردوە، وە بۆ تۆمان فراوان کردوە بۆ غەیری تۆمان فراوان نەکردوە ﴿ لِكَيۡلَا يَكُونَ عَلَيۡكَ حَرَجٞ ﴾ (واتە: لەبەر ئەوەی هیچ لە لات زەحمەت‌و گران نەبێت) ئەمە لە گرنگی پێدانێکی زیاتری خوایە بۆ پێغەمبەرەکەی ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴾ واتە: بەردەوام وەسفکراوە بە لێخۆشبوو میهرەبانی، وە لێخۆشبوون‌و ڕەحمەت‌و بەخشندەیی‌و چاکەی خۆی دادەبەزێنێ بۆ سەر بەندەکانی، بەپێی حیکمەت‌و کاردروستی خۆی، وە هۆکارەکان لەواندا بوونی هەبێ.

۞ تُرْجِى مَن تَشَآءُ مِنْهُنَّ وَتُـْٔوِىٓ إِلَيْكَ مَن تَشَآءُ ۖ وَمَنِ ٱبْتَغَيْتَ
مِمَّنْ عَزَلْتَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكَ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن تَقَرَّ أَعْيُنُهُنَّ
وَلَا يَحْزَنَّ وَيَرْضَيْنَ بِمَآ ءَاتَيْتَهُنَّ كُلُّهُنَّ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ
مَا فِى قُلُوبِكُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَلِيمًا ﴿٥١﴾ لَّا يَحِلُّ لَكَ
ٱلنِّسَآءُ مِنۢ بَعْدُ وَلَآ أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنْ أَزْوَٰجٍ وَلَوْ أَعْجَبَكَ
حُسْنُهُنَّ إِلَّا مَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ
شَىْءٍ رَّقِيبًا ﴿٥٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَدْخُلُوا۟ بُيُوتَ ٱلنَّبِىِّ
إِلَّآ أَن يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيْرَ نَٰظِرِينَ إِنَىٰهُ وَلَٰكِنْ
إِذَا دُعِيتُمْ فَٱدْخُلُوا۟ فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَٱنتَشِرُوا۟ وَلَا مُسْتَـْٔنِسِينَ
لِحَدِيثٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ يُؤْذِى ٱلنَّبِىَّ فَيَسْتَحْىِۦ مِنكُمْ ۖ
وَٱللَّهُ لَا يَسْتَحْىِۦ مِنَ ٱلْحَقِّ ۚ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَٰعًا فَسْـَٔلُوهُنَّ
مِن وَرَآءِ حِجَابٍ ۚ ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ ۚ
وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا۟ رَسُولَ ٱللَّهِ وَلَآ أَن تَنكِحُوٓا۟ أَزْوَٰجَهُۥ
مِنۢ بَعْدِهِۦٓ أَبَدًا ۚ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمًا ﴿٥٣﴾
إِن تُبْدُوا۟ شَيْـًٔا أَوْ تُخْفُوهُ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٥٤﴾

(٥١): ﴿ تُرْجِى مَن تَشَآءُ مِنْهُنَّ وَتُـْٔوِىٓ إِلَيْكَ مَن تَشَآءُ ۖ وَمَنِ ٱبْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكَ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن تَقَرَّ أَعْيُنُهُنَّ وَلَا يَحْزَنَّ وَيَرْضَيْنَ بِمَآ ءَاتَيْتَهُنَّ كُلُّهُنَّ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا فِى قُلُوبِكُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَلِيمًا ﴿٥١﴾ ﴾:

هەروەهـا ئەمـە لـە فراوانـی خوایە بۆسـەر پێغەمبەرەکـەی ﷺ، وە میهرەبانیەتـی بـۆی، کـە ڕێگـەی پێـداوە واز لـە دابەشـکردنی کاتـەکان بهێنـێ لەنـاو خێزانەکانیـدا، لـەڕووی پێویسـت بـوون، جـا پێغەمبـەر ﷺ ئەگـەر کاتەکانـی لـە نێوانیانـدا دابەش بـکات یارمەتیـە بۆیـان. وە لەگـەڵ ئەوەدا، پێغەمبـەر ﷺ ئەوپـەڕی هەوڵی دەخسـتەکار لـە دابەشـکردن لە نێوانیانـدا لە هەموو شـتێکدا، دەیفەرموو: {اللَّهُـمَّ هَذَا قَسْـمِي فِيَا أَمْلِـكُ, فَلاَ تَلُمْنـِي فِيـَا تَمْلِـكُ وَلا أَمْلِكُ} (أَخرَجَهُ أَبُـو دَاوُدَ برقـم: (٢١٣٤)، وَالتِّرمِـذِيُّ برقـم: (١١٤٠)، وَابْنُ مَاجَـهْ (١٩٧١)، وَصَحَّحَـهُ اِبْـنُ حِبَّـانَ وَالْحَاكِمُ, وَلَكِـنْ رَجَّحَ اَلتِّرْمِـذِيُّ إِرْسَـالَه)، واتە: خوایە ئەمە توانـای منـە لـە دابـەش کردنـدا، لۆمەم مەکـە لـەوەی لـە تواناماندا نیە.

جا لێرەدا فەرموویەتی: ﴿ تُرْجِى مَن تَشَآءُ مِنْهُنَّ ﴾ واتە: هەر یەکێ لە خێزانەکانت ویست دوای بخەو لە لای مەمێنەوە ﴿ وَتُـْٔوِىٓ إِلَيْكَ مَن تَشَآءُ ﴾ واتە: (وە کێت ویست) بیگرە خۆت و لەلای بمێنەوە، ﴿ وَمَنِ ٱبْتَغَيْتَ ﴾ واتە: (هەرکامت بوێ) بێتە لات ﴿ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكَ ﴾ (واتە: هیچ گوناهێکت لەسەر نیە) ویست و ئارەزوو لە لای تۆیە لە هەموو ئەوانەدا.

زۆربـەی ڕاڤەزانانـی قورئـان وتویانە: ئەمـە تایبەتە بـەو ئافرەتانە خۆیان پێشـکەش دەکرد، دەیتوانـی هەریەکـێ دوا بخـات و هـەر یەکێکی تـر بباتە لای خـۆی، واتە: ئەگەر ویسـتی بووایـە ئـەو ئافرەتەی خۆی پێشکەشـی دەکرد قبووڵـی دەکرد، وە ئەگەر بیویسـتایە قبووڵی نەدەکرد، خـوا زاناترە.

پاشـان حیکمـەت و دانایـی لـەوەدا ڕوون کردوەتـەوە، جـا فەرموویەتـی: ﴿ ذَٰلِكَ ﴾ واتە:

فـراوان کـردن بـۆت، وە کاروبارەکان بگەڕێتەوە بۆ لات بە دەسـتی خۆتەو سەرپشـکی، وە دابـەش کردنی کاتەکانت لـە نێوانیاندا یارمەتیە بۆیـان ﴿ أَدۡنَىٰٓ أَن تَقَرَّ أَعۡيُنُهُنَّ وَلَا يَحۡزَنَّ وَيَرۡضَيۡنَ بِمَآ ءَاتَيۡتَهُنَّ كُلُّهُنَّ ﴾ چونکـە دەزانـن تۆ وازت لە ئەرکو واجـب نەهێناوە، وە ڕۆ نەچوویـت لە مافێکی پێویسـتدا.

﴿ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا فِي قُلُوبِكُمۡ ﴾ واتـە: (خـوا دەزانێ بـەوەی لە دڵەکانتاندایە) ئەوەی بەسـەری دێـت لـە جێبەجـێ کردنی ئـەو مافانـەی ئەرکـەو پەسـندن، وە لـە کاتـی بەربەرەکانی لە حـەقو مافەکانـدا، بۆیـە فراوانیـت بـۆ کـراوە ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بۆ ئـەوەی دڵی خێزانەکانـت دڵنیابێ.

﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَلِيمًا ﴾ واتـە: زانسـتی فراوانـە، زۆر لەسـەرخۆیە، لـە زانسـتی بۆی دانـاون ئـەوەی بەرژەوەنـدی کاروبـارەکانو زۆرترین پاداشـتتانی تێدایە، وە لە سـەرخۆیی خـوا ئەوەیـە سـزای نـەداون بـە هـۆی ئـەوەی کردووتانـە، وە ئـەوەی دڵەکانتان سـوورە لەسـەری لە شـەڕو خراپە.

(٥٢): ﴿ لَّا يَحِلُّ لَكَ ٱلنِّسَآءُ مِنۢ بَعۡدُ وَلَآ أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجٖ وَلَوۡ أَعۡجَبَكَ حُسۡنُهُنَّ إِلَّا مَا مَلَكَتۡ يَمِينُكَۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ رَّقِيبٗا ٥٢ ﴾:

ئەمـە سوپاسـکردنە لـە لایـەن خـواوە، ئـەو زاتـەی بـەردەوام سوپاسـکراو بووە لـە لایەن خێزانەکانـی پێغەمبەرەکـەی (خوایـان لـێ ڕازی بێـت) کاتـێ خـواو پێغەمبـەرو ژیانـی دواڕۆژیـان هەڵبـژارد، بەزەیـی پێیاندا هاتـەوە، وە پێغەمبـەر ﷺی، کورت کـردەوە لەواندا، جـا فەرمـووی: ﴿ لَّا يَحِلُّ لَكَ ٱلنِّسَآءُ مِنۢ بَعۡدُ ﴾ ئـەم خێزانانـەت ﴿ وَلَآ أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجٖ ﴾ واتـە: ناتوانـی هەندێکیـان تـەڵاق بـدەی، بیگـۆڕی بـە کەسـێکی تر. بەمـە ئەوە دێتـە دەسـت، ئـەوان ئەمان دەبـن لە زیانـەکانو لە تەڵاق، چونکـە خوا بڕیـاری داوە ئەوان خێزانـی ئـەو بـن لـە دونیـاو دواڕۆژدا، جیابوونـەوەش لە نێـوان ئـەوو ئەوانـدا ڕوونادات.

﴿ وَلَوۡ أَعۡجَبَكَ حُسۡنُهُنَّ ﴾ واتـە: (سەرسـام بیـت) بـە جوانـی جگـە لـە ئـەوان، حەڵاڵ نیـە بـۆ تـۆ ﴿ إِلَّا مَا مَلَكَتۡ يَمِينُكَ ﴾ واتـە: (مەگـەر) کەنیـزەک، بەو شـێوەیە دروسـتە بـۆت، چونکـە کەنیزەکـەکان لە پێناخـۆش بوونی ژنەکان، لە ئاسـتی پلەو پایـەی ژنەکانی نیـن لە زیانـدان بە ژنـەکان ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ رَّقِيبٗا ﴾ واتـە: چاودێرە بەسـەر هەموو کارەکانـەوە، وە زانایـە بـەوەی دەگەڕێتـەوە بـۆ لای، وە وە هەسـتاوە بـە بەڕێـوە بردنیـان لەسـەر تەواوتریـن یاسـاو چاکترین پتـەویو وردەکاری.

**(٥٣-٥٤):** ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتَ ٱلنَّبِيِّ إِلَّآ أَن يُؤۡذَنَ لَكُمۡ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيۡرَ نَٰظِرِينَ إِنَىٰهُ وَلَٰكِنۡ إِذَا دُعِيتُمۡ فَٱدۡخُلُواْ فَإِذَا طَعِمۡتُمۡ فَٱنتَشِرُواْ وَلَا مُسۡتَـٔۡنِسِينَ لِحَدِيثٍۚ إِنَّ ذَٰلِكُمۡ كَانَ يُؤۡذِي ٱلنَّبِيَّ فَيَسۡتَحۡيِۦ مِنكُمۡۖ وَٱللَّهُ لَا يَسۡتَحۡيِۦ مِنَ ٱلۡحَقِّۚ وَإِذَا سَأَلۡتُمُوهُنَّ مَتَٰعٗا فَسۡـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٖۚ ذَٰلِكُمۡ أَطۡهَرُ لِقُلُوبِكُمۡ وَقُلُوبِهِنَّۚ وَمَا كَانَ لَكُمۡ أَن تُؤۡذُواْ رَسُولَ ٱللَّهِ وَلَآ أَن تَنكِحُوٓاْ أَزۡوَٰجَهُۥ مِنۢ بَعۡدِهِۦٓ أَبَدًاۚ إِنَّ ذَٰلِكُمۡ كَانَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمًا (٥٣)
إِن تُبۡدُواْ شَيۡـًٔا أَوۡ تُخۡفُوهُ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٗا (٥٤) ﴾

**خوا ﷻ فەرمان بە بەندە بڕوادارەکانی دەکات بە بەئەدەب بوونیان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بە چوونەژوورەوە بۆ ماڵی، پێی فەرموون: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتَ ٱلنَّبِيِّ إِلَّآ أَن يُؤۡذَنَ لَكُمۡ إِلَىٰ طَعَامٍ ﴾ واتە: مەچنە ژوورەوە بۆ ماڵی پێغەمبەر ﷺ بەبێ مۆڵەت وەرگرتن بۆ نانخواردن. وە هەروەها بێ ئەوەی ﴿ نَٰظِرِينَ إِنَىٰهُ ﴾ واتە: چاوەڕوانی پێگەیشتنی بکەن، یان دوای لێبوونەوە دابنیشن.**

**مانای ئەوەیە: ئێوە مەچنە ماڵی پێغەمبەرەوە بە دوو مەرج نەبێ: مۆڵەت وەرگرتنتان بە چوونە ژوورەوە، وە دانیشتنتان بە ئەندازەی پێویست، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ وَلَٰكِنۡ إِذَا دُعِيتُمۡ فَٱدۡخُلُواْ فَإِذَا طَعِمۡتُمۡ فَٱنتَشِرُواْ وَلَا مُسۡتَـٔۡنِسِينَ لِحَدِيثٍ ﴾ واتە: پێش خواردنو دوای خواردن. پاشان حیکمەتو سوودی قەدەغەکردنی باسکردوە، فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ذَٰلِكُمۡ ﴾ واتە: چاوەڕوانی زیاد لە پێویستتان ﴿ كَانَ يُؤۡذِي ٱلنَّبِيَّ ﴾ واتە: پێی بێتاقەت دەبێو گرانە بەسەریەوە بەو شێوەیە بەندتان کردوە لە کاروباری ماڵەکەیو سەرقاڵبوون پێیانەوە ﴿ فَيَسۡتَحۡيِۦ مِنكُمۡ ﴾ (ئەویش شەرمتان لێ دەکات) کە پێتان بڵێ: بڕۆنە دەرەوە، هەروەک چۆن نەریت وایە خەڵکی -بە تایبەت ئەو کەسانەی خاوەن بەخشندەیین لە ناویاندا- شەرم دەکەن خەڵکی لە ماڵەکانیان بکەنە دەرەوە.**

**﴿ وَٱللَّهُ لَا يَسۡتَحۡيِۦ مِنَ ٱلۡحَقِّ ﴾ (واتە: بەڵام خوا لە وتنی هەق شەرم ناکات) جا فەرمانی شەرعی ئەگەر کەسێ وا خەیاڵ بکات وازهێنان لێی وەکو ئەدەبو شەرم کردنێ بەڕاستی خۆڕاگری لە شوێنکەوتنی فەرمانی شەرعیدایە، وە سوورێ لەسەر ئەوەی پێچەوانەی فەرمانی شەرعیە هیچ ئەدەبێکی تێدانیە. خوای بەرزو مەزن شەرم ناکات فەرمانتان پێ بکات لەوەی خێرو چاکەتانی تێدایە، وە نەرمو نیانی لەگەڵ پێغەمبەرەکەیدا هەرکەسێک بێ، ئەمە ئەدەبو ڕەوشتیانە لە چوونە ژوورەوە بۆ ماڵی پێغەمبەر ﷺ، بەڵام ئەدەبو ڕەوشتیان لەگەڵیداو لە دواندنی خێزانەکانی بێگومان یان**

ئەوەیە پێویست بەوە دەکات، یان پێویست ناکات، ئەگەر پێویستی نەکرد بدوێن ئەوە ئەدەب وایە نەدوێن‌و واز بێنن، وە ئەگەر پێویستی کرد، وەک ئەوەی داوای شتێکیان لێ بکەن لە کەل‌و پەل، یان لە قاپ‌و قاجاخی ماڵ، یان جگە لەوانە، ئەوانە پرسیاریان لێدەکرێ ﴿ مِن وَرَآءِ حِجَابٍ ﴾ واتە: لە نێوان ئێوەو ئەواندا پەردەیەک هەبێ لە بینین، چونکە پێویست بەوە ناکات.

بۆیە تەماشا کردنیان رێگە پێنەدراوە بە هەر جۆرێ، وە قسەکردن لەگەڵیاندا وردەکاری تێدایە خوای گەورە درێژەی پێداوە، پاشان باسی حیکمەتی ئەوەی کردووە فەرموویەتی: ﴿ ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ ﴾ واتە: (ئەوەتان خاوێنترە بۆ دڵی ئێوەو ئەوانیش) چونکە بە دوورترە لە گومان، مرۆڤ هەتا دووربێ لەو هۆکارانەی پاڵنەری شەڕو خراپەن، ئەوە پارێزراوترو پاکترە بۆ دڵی.

جا لەبەر ئەمەیە لەو کاروبارە شەرعیانەی خوا روونی کردۆتەوە، زۆرێک لە وردەکاریەکانی، کە بێگومان هەموو کەرەستەکانی شەڕو هۆکارو پێشەکیەکانی رێگری لێکراوە، وە دەبێ بە هەموو جۆرێ لێی دوور بکەوێتەوە، پاشان قسەیەکی کۆکەرەوەو یاسایەکی گشتگیری فەرمووە: ﴿ وَمَا كَانَ لَكُمْ ﴾ ئەی بڕواداران، واتە: شایستەو جوان نیە بۆ ئێوە بەڵکو ناشرینترین شتە ﴿ أَن تُؤْذُوا رَسُولَ اللَّهِ ﴾ ئازاردان بە گوفتار یان بە کردار، بە هەموو ئەوانەی پەیوەندی پێوە هەیە ﴿ أَن تَنكِحُوا أَزْوَاجَهُ مِن بَعْدِهِ أَبَدًا ﴾ (واتە: وە هەرگیز نابێ خێزانەکانی پاش خۆی مارە بکەن)، ئەمەش لە کۆی ئەوانەیە کە ئازاری دەدا، بێگومان پێغەمبەر ﷺ خاوەن پلەو پایەی مەزن‌و رێزو حورمەتە، وە خواستنی ژنەکانی لە دوای ئەو لەکەدار کردنی ئەو پلەو پایەیە.

هەروەها ئەوان خێزانی ئەون لە دونیاو دوارۆژدا، وە بەخێزانیان دەمێنێتەوە لە پاش مردنیشی، لەبەر ئەمەیە حەڵاڵ نیە لە دوای ئەو خێزانەکانی مارە بکەن بۆ هیچ کەسێ لە ئوممەتەکەی ﴿ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ عِندَ اللَّهِ عَظِيمًا ﴾ ئەم ئوممەتە ئەم فەرمانەیان جێبەجێ کردوە، وە خۆیان دوور خستۆتەوە لەوەی خوا نەهی لێکردوە، سوپاس‌و ستایش بۆ خوا.

پاشان خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ إِن تُبْدُوا شَيْئًا ﴾ واتە: ئاشکرای بکەن ﴿ أَوْ تُخْفُوهُ فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا ﴾ دەزانێ بەوەی لەناو دڵتاندایە، وە ئەوەش کە ئاشکراتان کردوە، پاداشتان دەداتەوە لەسەری.

لَا جُنَاحَ عَلَيْهِنَّ فِي ءَابَآئِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآئِهِنَّ وَلَآ إِخْوَٰنِهِنَّ وَلَآ
أَبْنَآءِ إِخْوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآءِ أَخَوَٰتِهِنَّ وَلَا نِسَآئِهِنَّ وَلَا مَا مَلَكَتْ
أَيْمَٰنُهُنَّ ۗ وَٱتَّقِينَ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدًا
﴿٥٥﴾ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِىِّ ۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُوا۟ صَلُّوا۟ عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا ﴿٥٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ
ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَأَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا
مُّهِينًا ﴿٥٧﴾ وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ بِغَيْرِ
مَا ٱكْتَسَبُوا۟ فَقَدِ ٱحْتَمَلُوا۟ بُهْتَٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴿٥٨﴾
يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلْمُؤْمِنِينَ
يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا
يُؤْذَيْنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٥٩﴾ لَّئِن لَّمْ يَنتَهِ ٱلْمُنَٰفِقُونَ
وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَٱلْمُرْجِفُونَ فِى ٱلْمَدِينَةِ
لَنُغْرِيَنَّكَ بِهِمْ ثُمَّ لَا يُجَاوِرُونَكَ فِيهَآ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٦٠﴾ مَّلْعُونِينَ ۖ
أَيْنَمَا ثُقِفُوٓا۟ أُخِذُوا۟ وَقُتِّلُوا۟ تَقْتِيلًا ﴿٦١﴾ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِى
ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلُ ۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا ﴿٦٢﴾

(٥٥): ﴿ لَّا جُنَاحَ عَلَيْهِنَّ فِىٓ ءَابَآئِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآئِهِنَّ وَلَآ إِخْوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآءِ إِخْوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآءِ أَخَوَٰتِهِنَّ وَلَا نِسَآئِهِنَّ وَلَا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُنَّ ۗ وَٱتَّقِينَ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدًا ﴿٥٥﴾ ﴾: کاتێ خوا ﷻ باسی کرد خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ داوای کەلو پەلیان لێناکرێ مەگەر لە پشت پەردەوە، ئەو قسەیەش گشتگیرە، وا پێویستی کرد جیابکرێتەوە ئەوانەی باسکراون لە مەحرەمەکان، وە بێگومان ﴿ لَّا جُنَاحَ عَلَيْهِنَّ ﴾ (هیچ گوناهێکیان لەسەر نیە) لەوەی خۆیان دانەپۆشن لە بەرانبەریاندا، باسی مامو خاڵی نەکردوە، چونکە ئەگەر ئەوان خۆیان نەپارێزن لەو ئافرەتانەی کە پوریانن خوشکی باوکیان، وە خاڵیان خوشکی دایکیان، لە کوڕانی براو خوشک، لەگەڵ ئەوەی ئەوان لەوان بەرزترن، جا دانەپۆشینیان لە بەرانبەر مامو خاڵەکانیان لە پێشترە، چونکە دەقی ئایەتێکی دیکە بەڕوونو ئاشکرایی باسی مامو خاڵ دەکات کە لە پێشترە لەم دەقە.

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَا نِسَآئِهِنَّ ﴾ واتە: گوناهیان ناگات کە لەلای ئافرەتەکانیان حیجاب نەکەن، واتە: ئەو ئافرەتانەی لە ڕەگەزی خۆیانن لە ئایندا، بەمە ئافرەتانی بێبڕوای لێ دەردەچێ. وە دەگونجێ مەبەست پێی ڕەگەزی ئافرەتان بێ، چونکە ئافرەت لە بەرانبەر ئافرەتدا حیجاب ناکات، ﴿ وَلَا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُنَّ ﴾ مادام بەندە لە موڵکی ئەو دایە.

کاتێ گوناهی هەڵگرد لەسەر ئەوانە، مەرجی دانا لە وانو غەیری ئەوانیشدا بە پابەند بوون بە لە خواترسان، وە با لەوەشدا هیچ مەترسیەکی شەرعیش نەبێ، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ وَٱتَّقِينَ ٱللَّهَ ﴾ واتە: لە خوا بترسن لە هەموو بارودۆخەکاندا ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدًا ﴾ شایەتە بەسەر کردەوەی بەندەکان، ئاشکراو نهێنیان، وە قسەکانیان

دەبیستێو جوڵەکانیان دەبینێ، پاشان پاداشتیان دەداتەوە لەسەر ئەوە، بە چاکترین پاداشت.

(٥٦): ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيْهِ وَسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا ﴿٥٦﴾ ﴾

ئەمە ئاگادار کردنەوەی تێدایە لەسەر تەواوی پێغەمبەری خواو بەرزی پلەو پایەی لەلای خواو لە لای بەندەکانی، وە بەرز ڕاگرتنی یادی، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ ﴾ بە ڕاستی خوای بەرزو مەزن ﴿ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ ﴾ (وە فریشتەکانی صەڵاوات دەدەن) لەسەری، واتە: خوا ستایشی پێغەمبەر ﷺ دەکات لە نێوان فریشتەکاندا وە لە پێگەو مەقامی بەرزدا، چونکە خوای بەرزو مەزن خۆشی دەوێ، وە فریشتە نزیکەکان ستایشی دەکەن، وە بۆی دەپاڕێنەوەو گەردن کەچ دەبن ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيْهِ وَسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا ﴾ (واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ئێوەش صەڵاواتو سەلامی زۆر لەسەر بدەن) وەک شوێنکەوتنی خواو فریشتەکانی، وە لە پاداشتی هەندێ لەو مافانەی بەسەریانەوەیە، وە تەواوکردنی ئیمانیانو بە مەزن دانانی ئەو ﷺ، وە لەبەر خۆشەویستیو ڕێز لێگرتنو چاکەی زیاتریانو پاک بوونەوەیان لە گوناهەکان، چاکترین شێوازەکانی صەڵاوات دان کە هاوەڵان فێری بوون: [اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ فِي الْعَالَمِينَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ] ئەم فەرمان کردنە بە صەڵاتو سەلام لەسەر پێغەمبەر ڕێگە پێدراوە لە هەموو کاتەکاندا، وە زۆرێک لە زانایان پێویستیان کردووەو کردوویانە بە ئەرک لە ناو نوێژدا.

(٥٧-٥٨): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَأَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿٥٧﴾ وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ بِغَيْرِ مَا ٱكْتَسَبُواْ فَقَدِ ٱحْتَمَلُواْ بُهْتَٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴿٥٨﴾ ﴾

کاتێ خوا ﷻ فەرمانی کرد بە مەزندانانی پێغەمبەرەکەی، ئنجا قەدەغەی ئازاردانی کردو وە هەڕەشەی کرد، جا فەرمووی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ﴾ (واتە: بەڕاستی کەسانێ کە ئازاری خواو پێغەمبەرەکەی دەدەن) ئەمە هەموو ئازاردانێ دەگرێتەوە بە گوفتاربێ یان بە کردار، لە تانەو تەشەر، یان بە کەم دانانی خۆی یان ئاینەکەی، یان هەر شتێکی دیکە ببێتە مایەی ئازاردانی ﴿ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فِي ٱلدُّنْيَا ﴾ واتە: دووری خستونەتەوەو دەری کردوون لە دونیادا، بێگومان هەر کەسێ تانەو ئازاری پێغەمبەری

خـوا بـدات ئـەوە چارەنووسـی کوشـتنە ﴿ وَٱلْآخِرَةِ وَأَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا مُّهِينًا ﴾ (وە لـە دواڕۆژدا وە سـزای ڕیسـواکەری بـۆ ئامـادە کردوون) ئەمە پاداشـتە لەسـەر ئازاردانی، ئازار بـدرێ بـە سـزای زۆر بەئێـش، جـا ئازاردانـی پێغەمبـەر وەکو ئازاردانی غەیری ئـەو نیە، چونکـە ئـەو ﷺ بەنـدە بـڕوای تـەواو نابێ بـە خوا هەتـا بـڕوا بـە پێغەمبەرەکـەی نەهێنێ. وە ئەوەنـدە بـە گـەورە دانـراوە کـە لـە پێویسـتیەکانی ئیمانە، ئـەوە وای پێویسـت کردوە کـە وەکـو جگـە لەخـۆی نەبـێ، وە ئەگەرچـی ئازاردانـی بڕوادارانیـش مەزنـەو تاوانێکی گەورەیـە، لەبـەر ئەمەیە فەرموویەتـی: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ بِغَيْرِ مَا ٱكْتَسَبُوا۟ ﴾ واتـە: (وە کەسـانێک کە ئـازاری پیـاوانو ئافرەتانی مسـوڵمانان ئەدەن) بەبـێ ئەوەی هیـچ تاوانێکیـان کردبێ شایسـتەی ئـەو ئازاردانە بـێ، ﴿ فَقَدِ ٱحْتَمَلُوا۟ ﴾ بە سـەر شـانیان ﴿ بُهْتَٰنًا ﴾ (بووختان) چونکـە ئازاریان داون بەبێ هـۆکار ﴿ وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴾ (تاوانێکی ئاشـکرا) چونکە دەسـت درێژیان کردۆتە سـەریان، وە سـنوری پیرۆزی خوایان شـکاندووە، لەبـەر ئەمەیە تانەدان لـە تاکەکانی بڕواداران ئازاردان پێویسـت دەکات لەسـەر تانـەدەر، بـە پێـی حاڵەتو بـەرزی پلەو پایـەی، جـا ئازاردانی کەسـێ تانەی لـە هاوەڵێک دابـێ توندتـرە، وە ئازاردانـی کەسـێ تانـەی لە زانایـانو خاوەنانـی ئاین دابـێ مەزنترە لە غەیـری ئەوان.

(٥٩-٦٢): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٥٩﴾ لَّئِن لَّمْ يَنتَهِ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَٱلْمُرْجِفُونَ فِى ٱلْمَدِينَةِ لَنُغْرِيَنَّكَ بِهِمْ ثُمَّ لَا يُجَاوِرُونَكَ فِيهَآ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٦٠﴾ مَّلْعُونِينَ أَيْنَمَا ثُقِفُوٓا۟ أُخِذُوا۟ وَقُتِّلُوا۟ تَقْتِيلًا ﴿٦١﴾ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِى ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلُ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا ﴿٦٢﴾ ﴾.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ ئەمـە ئایەتـە ناونـراوە بـە ئایەتـی حیجـاب، خـوا ﷻ فەرمانـی بـە پێغەمبەرەکـەی کردوە کـە فەرمان بـە ئافرەتان بـکات بە گشـتی، وە لـە خێـزانو کچانـی خۆیـەوە دەسـت پـێ بـکات، چونکە ئـەوان لە پێشـترن، وە لەبـەر ئـەوەی کەسـێک کـە فەرمـان بە جگـە لە خـۆی دەکات دەبێ سـەرەتا لـە ماڵو منـاڵـی خـۆی دەسـت پێبـکات پێـش هەمـوو کـەس، وەک فەرموویەتـی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا ﴿٦﴾ ﴾التحریم، (واتـە: ئـەی ئەوانـەی کـە بڕواتـان هێناوە خۆتـانو کەسو کارتـان بپارێزن لـە ئاگرێـک)، ﴿ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ ﴾ (واتە:

بـا عاباکانیـان بـدەن بەسـەر خۆیانـدا) ئەویـش بەسـەر جلەکانیانەوە لـە سـەرپۆش و عاباو وێنـەوی ئەوانـە، واتـە: دەم و چـاو و سـنگیانی پێ داپۆشـن[٣].

پاشـان حیکمەتی ئەوەی باسـکردوە، جـا فەرموویەتـی: ﴿ ذَٰلِكَ أَدۡنَىٰٓ أَن يُعۡرَفۡنَ فَلَا يُؤۡذَيۡنَ ﴾ (واتـە: ئـەوە نزیکترە بناسـرێن بۆ ئـەوەی ئـازار نەدرێن)، بەڵگەیە لەسـەر بوونی ئـازاردان، بـەو شـێوەی ئەگـەر حیجـاب نەکەن، لەوەیـە وا گومـان ببرێ ئەوانـە داوێن پـاک نین، لە لایـەن ئەوانـەوە کـە دڵیان نەخۆشـە ئـازار بدرێـن، وە لەوەیـە ئیهانـەش بکرێـن، وابزانرێ ئەوانـە کەنیزەکـن، بـێ ئابڕوویـان پێبکـەن ئەوانـە خراپەیـان دەوێ، حیجـاب یەکلایـی کردنەوەیـە بۆ ئەوانـە تەماحیـان تێدەکەن.

﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴾ بـە ڕادەیـەک لێتان خۆش بـوو لەوەی ڕابـورد، وە بەزەیی پێتـان هاتـەوە، بـەوەی بڕیارەکانـی بۆتـان ڕوون کردوەتـەوەو حـەڵاڵ و حەرامـی بۆتـان ئاشـکرا کردوە، ئەمـە داخسـتنی دەرگایە لـە دوو ڕووەوە.

بـەڵام لـە ڕووی خراپەکارانـەوە، بێگومـان هەڕەشـەی لێکـردوون کـە دەفەرموێ: ﴿ لَّئِن لَّمۡ يَنتَهِ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ ﴾ واتـە: نەخۆشـی گومـان یـان ئـارەزوو، ﴿ وَٱلۡمُرۡجِفُونَ فِي ٱلۡمَدِينَةِ ﴾ واتـە: ترسـێنەران دوژمـن، ئەوانـەی کـە بە هـۆی هێزو توانـاو زۆریانـەوە قسـەیان دەکـرد، وە لاوازی مسـوڵمانان.

باسـی جـۆری پڕوپاگەندەکانیانی نەکـردوە، بۆ ئەوەی هەمـوو ئەوانە بگرێتـەوە کە نەفس و دەروونیـان وەحـی و خەتەرەیـان بـۆ دەکەن لە شـەڕو خراپە، لە فـراوان کردن بـە جنێودان بـە ئیسـلام و شـوێنکەوتوانی، وە لەرزاندنـی مسـوڵمانان و ڕیسـوا کردنـی هێـزو توانایـان، بەرەنگاربوونـەوەی مسـوڵمانان بـە خراپەو فاحیشـە، وە جگە لەوانەش لە سـەرپێچیەکان کە دەردەچـوو لە وێنـەی ئەوانەوە.

﴿ لَنُغۡرِيَنَّكَ بِهِمۡ ﴾ واتـە: فەرمانت پێدەکەین بە سـزادان و کوشـتار کردنیان، دەسـەڵاتت دەدەین بەسـەریاندا، پاشـان ئەگەر ئەوەمـان کرد، تواناییان نابێ بەسـەرتدا، هیـچ توانایەکیان

٣)- ئـەم بابەتـە زانایـان بۆچوونـی جیاوازیـان هەیـە لەبارەیەوە، بۆیە دەسـت و ڕووخسـار لەسـەر بۆچوونـی ڕاسـت عـەورەت نین، ئیبـن و عەببـاس دەڵێ: هەمـوو جەسـتەی ئافـرەت عەورەتە جگە لـە دەسـتەکان و دەم و چـاوو، ئیبنـو عومـەر دەڵێ: دەسـتەکان و ڕووخسـارو دەرکەوتنـی مەسـتیلە، ئەمـە بۆچوونـی ئیمـام ئەبـوو حەنیفـەو ئیمام مالـک و ئیمام شـافعیە، تەنها ئیمـام ئەحمـەد پێی وایە دەسـت و ڕووخسـاریش وەکـو هەمـوو جەسـتە عەورەتـە. بـۆ زانیـاری زیاتـر بگەڕێـرەوە بۆ ئەم سـەرچاوانە: (مغني المحتاج شرح النمهاج للخطيب الشربيني، والأستذكار لإبن عبد البر. المحلى لإبن حزم. وەرگێڕ.

نامێنـی بـۆ ڕووبـەڕوو بوونـەوەت، بۆیـە فەرموویەتـی: ﴿ ثُمَّ لَا يُجَاوِرُونَكَ فِيهَآ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ واتـە: پاشـان ماوەیەکی کەم نەبـێ لە مەدینەدا دراوسـێت نابن، بـەوەی بیانکوژی یان شـار بـە دەریـان بکەی.

ئەمـە بەڵگـەی تێدایـە لـە دوورخسـتنەوەو شـاربەدەرکردنی هاوبـەش دانـەران ئەوانەی بە مانەوەیـان لـە نێـو مسـوڵماناندا زیـان دەگەیەنـن، بێگومان ئەمـە یەکلاکردنەوەی شـەڕوو دوورخسـتنەوەیەتی، وە ئـەوان دەبـن بـە ﴿ مَّلْعُونِينَ أَيْنَمَا ثُقِفُوٓا۟ أُخِذُوا۟ وَقُتِّلُوا۟ تَقْتِيلًا ﴾ واتـە: دوورخـراوەن لـە هەر کـوێ ببینرێـن، وە هیچ ئاسایشـێکیان بـۆ نیە، وە هیـچ جێگـاو دانیشـتنێکیان بۆ نیـە، دەترسـن لـەوەی بکوژرێن یـان زیندانـی بکرێن، یان سـزا بدرێـن، ﴿ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِى ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلُ ﴾ (واتـە: خـوا ئـەوەی کـردوە بە سـونەتو بـاو لـە ناو کەسـانێ کـە پێشـتر بـوو ون) هەر کەسـێ ڕۆبچـێ لە سـەرپێچی کردنـدا، وە بوێـریو چاوقایمـی بـکات لـە ئـازاردانو وازنەهێنێ ئـەوە سـزایەکی بە ئێش دەدرێ، ﴿ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا ﴾ واتـە: (هەرگیـز بـاوو سـونەتی خـوا) ناگۆڕێ، بەڵکـو سـونەتو بـاوو نەریتـی خـوا لەگـەڵ ئـەو هۆکارانـەدا دەڕوا کـە ویسـتی خـۆی دەیخوازێ.

يَسْـَٔلُكَ ٱلنَّاسُ عَنِ ٱلسَّاعَةِۖ قُلۡ إِنَّمَا عِلۡمُهَا عِندَ ٱللَّهِۚ وَمَا يُدۡرِيكَ
لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ تَكُونُ قَرِيبًا ٦٣ إِنَّ ٱللَّهَ لَعَنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ وَأَعَدَّ
لَهُمۡ سَعِيرًا ٦٤ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ لَّا يَجِدُونَ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا
٦٥ يَوۡمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمۡ فِي ٱلنَّارِ يَقُولُونَ يَٰلَيۡتَنَآ أَطَعۡنَا ٱللَّهَ
وَأَطَعۡنَا ٱلرَّسُولَا۠ ٦٦ وَقَالُواْ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعۡنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا
فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ٦٧ رَبَّنَآ ءَاتِهِمۡ ضِعۡفَيۡنِ مِنَ ٱلۡعَذَابِ
وَٱلۡعَنۡهُمۡ لَعۡنٗا كَبِيرٗا ٦٨ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ
ءَاذَوۡاْ مُوسَىٰ فَبَرَّأَهُ ٱللَّهُ مِمَّا قَالُواْۚ وَكَانَ عِندَ ٱللَّهِ وَجِيهٗا ٦٩
يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ
لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ
فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١ إِنَّا عَرَضۡنَا ٱلۡأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلۡأَرۡضِ وَٱلۡجِبَالِ فَأَبَيۡنَ أَن يَحۡمِلۡنَهَا وَأَشۡفَقۡنَ مِنۡهَا وَحَمَلَهَا
ٱلۡإِنسَٰنُۖ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومٗا جَهُولٗا ٧٢ لِّيُعَذِّبَ ٱللَّهُ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ
وَٱلۡمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلۡمُشۡرِكِينَ وَٱلۡمُشۡرِكَٰتِ وَيَتُوبَ ٱللَّهُ
عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمَۢا ٧٣

(٦٣-٦٨): ﴿يَسْـَٔلُكَ ٱلنَّاسُ عَنِ ٱلسَّاعَةِۖ قُلۡ إِنَّمَا عِلۡمُهَا عِندَ ٱللَّهِۚ وَمَا يُدۡرِيكَ لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ تَكُونُ قَرِيبًا ﴿٦٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَعَنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ وَأَعَدَّ لَهُمۡ سَعِيرًا ﴿٦٤﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ لَّا يَجِدُونَ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا ﴿٦٥﴾ يَوۡمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمۡ فِي ٱلنَّارِ يَقُولُونَ يَٰلَيۡتَنَآ أَطَعۡنَا ٱللَّهَ وَأَطَعۡنَا ٱلرَّسُولَا۠ ﴿٦٦﴾ وَقَالُواْ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعۡنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴿٦٧﴾ رَبَّنَآ ءَاتِهِمۡ ضِعۡفَيۡنِ مِنَ ٱلۡعَذَابِ وَٱلۡعَنۡهُمۡ لَعۡنٗا كَبِيرٗا ﴿٦٨﴾﴾:

﴿يَسْـَٔلُكَ ٱلنَّاسُ عَنِ ٱلسَّاعَةِ﴾ واتە: خەڵک پرسیارت لێدەکەن دەربارەی ڕۆژی دوایی، پەلەی تێدا دەکەن، وە هەندێکیان ڕوودانی بە درۆ دەزانن، وە بۆ دەستەوسانی ئەوەی هەوڵی پێداوە، ﴿قُلۡ﴾ پێیان بڵێ: ﴿إِنَّمَا عِلۡمُهَا عِندَ ٱللَّهِ﴾ واتە: کەس نازانی جگە لە خوا، نە من و نە غەیری منیش زانستی نیە دەربارەی. لەگەڵ ئەمەدا کەمتەرخەمی تێدا مەکەن، ﴿وَمَا يُدۡرِيكَ لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ تَكُونُ قَرِيبًا﴾ (واتە: تۆ چوزانیت لەوانەیە ڕۆژی دوایی نزیک بێ) تەنها هاتنی ڕۆژی دوایی نزیک بێ، یان دوور، هیچ دەرەنجام و سوودێکی نیە، بەڵکو دەرەنجام خەسارەتمەندی و سەرکەوتن و بەدبەختی و خۆشبەختیە، ئایا بەندە شایستەی سزایە یان شایستەی پاداشتە؟ ئەمە لە داهاتوودا هەواڵتان پێ دەدەم، وە کێ شایستەیە بۆتان وەسف دەکەم، جا وەسفی شایستە بوونی سزای کردوە، وە وەسفی سزا، چونکە وەسفی باسکراو پراوپڕە لەگەڵ ئەوانەی ڕۆژی دوایی بە درۆ دەزانن، جا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَعَنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ (بە ڕاستی خوا نەفرینی لە کافران کردوە) ئەوانەی کوفر و بێبڕوایی بووەتە پیشەیان، وە ڕێگای کوفر کردن بە خوا و کوفر کردن بە پێغەمبەرەکانیان گرتۆتە بەر، وە بەو پەیامەی هێناویانە لە لایەن خواوە، بۆیە خوا ﷻ لە دونیا و دوارۆژدا لە میهرەبانی خۆی دووری خستوونەتەوە، ئەوەش بەسە بۆ سزادان.

﴿ وَأَعَدَّ لَهُمْ سَعِيرًا ﴾ ئاگرێکی هەڵگیرساو، جەستەیان گرتێبەر ئەدات، وە ئازار دەگەیەنێتە نێو سینەیان، وە لە ناو ئەو سزا توونەدا بە هەمیشەیی دەمێننەوەو لێی دەرناچن، تەنانەت بۆ ساتێکیش لەسەریان لاناچێ، ﴿ لَّا يَجِدُونَ ﴾ بۆ ئەوان ﴿ وَلِيًّا ﴾ پشتیوانێک، ئەوەی داوای دەکەن پێیان بدات ﴿ وَلَا نَصِيرًا ﴾ یارمەتیدەرێ سزایان لێ دوور بخاتەوە.

بەڵکو پشتیوانو یارمەتیدەریان نیە، وە سزای هەڵگیرساو دەوری داون، وە تەنگی پێ هەڵچنیون بە جۆرێکی مەزن، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ يَوْمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمْ فِي ٱلنَّارِ ﴾ (واتە: ڕۆژێ دەمو چاویان لە ئاگری دۆزەخدا ئەم دیوو ئەودیوی پێ دەکرێ) ئازار دەچێژن بە گەرمی، وە کارەکەیان بەسەردا توونتر دەبێتەوە، وە حەسرەت دەکێشن لەسەر ئەوەی پێشیان خستووە، ﴿ يَقُولُونَ يَٰلَيْتَنَآ أَطَعْنَا ٱللَّهَ وَأَطَعْنَا ٱلرَّسُولَا۠ ﴾ (دەڵێن: خۆزگە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرمان بکردایە)، ڕزگارمان بووایە لەم سزایە، وە شایستە بووایەن بە پاداشتی بێ پایان!

بەڵام ئەوە ئاواتێکە کاتی بەسەرچووە، هیچ سوودێکیان پێ ناگەیەنێ، حەسرەتو پەشیمانیو خەمو خەفەتو ئێشو ئازار ﴿ وَقَالُواْ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا ﴾ پەیڕەویمان کردن لەسەر گومڕایی ﴿ فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴾ (واتە: ئیتر لە ڕێگای ڕاست گومڕایان کردین) وەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَيَوْمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيْهِ يَقُولُ يَٰلَيْتَنِي ٱتَّخَذْتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلًا ﴿٢٧﴾ يَٰوَيْلَتَىٰ لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا خَلِيلًا ﴿٢٨﴾ لَّقَدْ أَضَلَّنِي عَنِ ٱلذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَآءَنِي وَكَانَ ٱلشَّيْطَٰنُ لِلْإِنسَٰنِ خَذُولًا ﴿٢٩﴾ ﴾ الفرقان، (واتە: وە ڕۆژێکە کە ستەمکار قەپ دەکات بە هەردوو دەستی خۆیداو دەڵێ: خۆزگە لەگەڵ پێغەمبەردا ڕێگای ڕاستم بگرتایەتە بەر * ئای تیاچوون بۆ من خۆزگە فلان کەسم نەکردایە بە هاوەڵو خۆشەویستی خۆم * بە ڕاستی ئەو کەسەی کردم بە هاوەڵ منی لە قورئان وێڵ کرد دوای ئەوەی قورئانم پێگەیشتو بڕوام پێهێنا، وە شەیتان هەمیشە پشت تێکەرو پشت بەردەرە بۆ ئادەمیزاد).

کاتێ زانیان ئەوانو گەورەکانیان شایستەی سزان، ویستیان شیفای دەردیان بەوە بدەن کە گومڕایان کردن، جا فەرموویان: ﴿ رَبَّنَآ ءَاتِهِمْ ضِعْفَيْنِ مِنَ ٱلْعَذَابِ وَٱلْعَنْهُمْ لَعْنًا كَبِيرًا ﴾ (واتە: ئەی پەروەردگارمان دوو بەرانبەر سزایان بدە، وە بەر نەفرینی گەورەی خۆتیان بخە) خوا ﷻ دەفەرموێ: بۆ هەرکامتان سزای دوو بەرانبەر هەیە، هەمووتان

بەشـدار بـوون لـە بێبڕوایـیو سـەرپێچی کـردن، بەشـداریش دەبن لە سـزا، ئەگەر سـزای هەندێکتـان زیاتـر بێـت لەسـەر هەندێکتان بە پێـی جیـاوازی تاوانتان.

(٦٩): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ ءَاذَوْاْ مُوسَىٰ فَبَرَّأَهُ ٱللَّهُ مِمَّا قَالُواْۚ وَكَانَ عِندَ ٱللَّهِ وَجِيهًا ﴿٦٩﴾ ﴾:

خـوا بەندەکانـی ئاگـادار دەکاتەوە لـە ئازاردانی پێغەمبەرەکـەی موحەممـەد ﷺ، پێغەمبەری بەخشـندە، بە بەزەییو بە سـۆز، ئـەوان ڕووبەڕووی بوونـەوە بە پێچەوانەی ئەوەی پێویسـت بـوو لەسـەریان کـە ڕێـزی بگـرنو بـە گـەورەی بزانـن، وە وەک ئـەو کەسـانە نەبن کە ئـازاری مووسـای کـوڕی عیمرانیانـدا، کەلیمـی ڕەحمـان، خـوا مووسـای ﷺ پاککردەوە لـەوەی وتیـان لـەو ئازاردانە، واتـە: خوا پاکی مووسـای ﷺ دەرخسـت.

لـە کاتێکدا مووسـا ﷺ شایسـتەی تۆمـەتو ئـازاردان نەبوو، ئـەو بەڕێزو شـکۆدار بوو لە لای خـوا، نزیـک بوو لـە پەروەردگـاری، لـە تایبەتمەندترینـی پێغەمبـەران بوو، لـە بەندە دڵسـۆزەکانی بوو، ئـەو هەموو فـەزڵو چاکەی دووری نەخسـتنەوە لە ئازادانـیو ڕووبەڕوو بوونـەوەی ئەوەی پێی ناخۆشـە، ئاگاداربـن ئەی بڕواداران، خۆتان بشـوبهێنن بـەوان لەوەدا.

ئازاردانی ئاماژە پێکراو: بریتیە لە قسەی نەوەکانی ئیسرائیل بە مووسا ﷺ، کاتێ بینیان زۆر شەرم دەکاتو خۆی دادەپۆشێ لێیان: ئەو هیچ ڕێگری لێنەکردوە لەو کارە تەنها ئەوە نەبێ کە گونی گەورەیە (خەسیاوە). بەو جۆرە ناوبانگی دەرکرد لەناویاندا، خوا ویستی بەری بکات لەوە، ڕۆژێک (مووسا) خۆی شۆرد، جلەکانی لەسەر بەردێک دانا، بەردەکە جلەکانی بردو ڕایکرد، مووسا ﷺ کەوتە شوێن بەردەکە، تێپەری بە ناو کۆڕێکی نەوەکانی ئیسرائیل، بینیان چاکترین دروستکراوی خوایە، ئەو تۆمەتەی کە پێیان کرد لەسەری نەما.

(٧٠-٧١): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوْلًا سَدِيدًا ﴾ خـوا ﷻ فەرمـان بـە بـڕواداران دەکات لێـی بترسـن لـە هەمـوو حاڵەتەکانیاندا، لە نهێنیو ئاشـکرادا، وە بە تایبەتی قسـەی ڕاسـتو دروسـت، یـان نزیـک لە ڕاسـت، لـە کاتـی نەبوونـی دڵنیایـی، لـە خوێنـدنو یادکردنو فەرمـان بە چاکەو فێربوونی زانسـتو خەڵک فێری زانسـت کردن، وە سـوور بوون لەسـەر ڕاسـتو دروسـتی لـە بابەتـە زانسـتیەکان، وە گرتنە بـەری هەمـوو ڕێگایـەک بیگەیەنێت بـەوە، وە هەمـوو هـۆکارێ یارمەتی بدات بـۆ ئەوە.

وە لە قسەی ڕاستو دروست، نەرمو نیانیو لەسەرخۆیی لە دواندنی خەڵکدا، قسەیەکیش ئامۆژگاری لەخۆ بگرێت، وە ئاماژە کردن بەوەی چاکە.

پاشان باسی ئەوە دەکات کە (مرۆڤ) لەسەر لە خواترسانو قسەی ڕاست دادەمەزرێ، فەرموویەتی: ﴿ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ ﴾ واتە: دەبێتە هۆی چاک بوونی کردەوەکانتانو ڕێگایەک بۆ وەرگرتنیان، چونکە بەکارهێنانی خۆپارێزی کردەوەکان بە هۆیەوە وەردەگیرێن، وەکو خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلۡمُتَّقِينَ ٢٧ ﴾ المائدة، (واتە: ئەویش وتی: خوا (قوربانی) تەنها لە پارێزکاران گیرا دەکات)، مرۆڤی تێدا سەرکەوتوو دەبێ بۆ کردەوەی چاک، هەروەها خوا کردەوەکان چاک دەکات، دەیپارێزێ لەوانەی تێکی دەدەن، وە پاداشتەکەی دەپارێزێو چەند قاتی دەکات، هەروەکو چۆن بەتاڵ بوون لە لەخوا ترسانو قسەی ڕاستو دروست هۆکارێکە بۆ تێکچوونی کردەوەکانو وەرنەگرتنیان، وە دانەمەزراندنی شوێنەوارەکانی لە سەری.

﴿ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ﴾ هەروەها ﴿ ذُنُوبَكُمۡ ﴾ کە هۆکارە بۆ لەناو چوونتان، جا بە خۆپارێزیو لە خواترسان کاروبارەکان ڕێک دەبن، وە هەموو مەترسیەک پاڵ پێوە دەنێ، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴾ (واتە: هەر کەسێک گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی بکات ئەوە بەڕاستی سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەستهێناوە).

(٧٢-٧٣): ﴿ إِنَّا عَرَضۡنَا ٱلۡأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱلۡجِبَالِ فَأَبَيۡنَ أَن يَحۡمِلۡنَهَا وَأَشۡفَقۡنَ مِنۡهَا وَحَمَلَهَا ٱلۡإِنسَٰنُۖ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ٧٢ لِّيُعَذِّبَ ٱللَّهُ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱلۡمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلۡمُشۡرِكِينَ وَٱلۡمُشۡرِكَٰتِ وَيَتُوبَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ٧٣ ﴾:

﴿ إِنَّا عَرَضۡنَا ٱلۡأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱلۡجِبَالِ ﴾ خوا ﷻ پلەو پایەی ئەمانەتی بە مەزن داناوە کە سپاردوویەتی بە ئەرک پێ سپێردراوان، کە بریتیە لە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانو دوورکەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکان، لە حاڵەتی نهێنیو شاراوە، وەک حاڵەتی ئاشکرا، وە خوا سپاردوویەتی بە بەدیهێنراوە مەزنەکانی وەک: ئاسمانەکانو زەویو چیاکان، بە سپاردنێکی ئارەزوومەندانە نەک زۆرەملێ، وە تۆ ئەی ئاسمان ئەگەر بەو ئەسپاردەیە هەستیو وەکو خۆی جێبەجێی بکەی ئەوە پاداشت دەدرێیتەوە، وە ئەگەر پێی هەڵنەستیو جێبەجێی نەکەی ئەوە سزا دەدرێی، ﴿ فَأَبَيۡنَ أَن يَحۡمِلۡنَهَا وَأَشۡفَقۡنَ

مِنۡهَا ﴾ واتــە: (بــەڵام هیچیــان ڕازی نەبوون کــە هەڵیگرن) ترســان لەوەی پێی هەڵنەســتن، نــە بەســەرپێچی کردنــی پەروەردگاریــان، نــە بە زوهد کــردن لە پاداشــتەکەی.
وە خوا ﷻ ســپاردی بە ئادەمیزاد لەســەر ئەو مەرجەی پێشــووە، وەریگرتو خســتیە ئەستۆی بەراســتی ئەو زۆر ســتەمکارو نەزانە، ئەم ئەرکە قورسو گرانەی خســتە ئەســتۆی خۆی.
خەڵکی بە پێی بەجێهێنانو بەجێ نەهێنانیان بوون بەسێ بەشەوە:
دوو ڕووەکان: دەریانخستووە، ئەوان پێی هەستاون بە ڕوواڵەت نەک بە ناخ.
هاوبەشدانەران: وازیان لێهێنا بە ڕواڵەتو بە پەنهان.
برواداران: پێی هەستانو بەجێیان هێنا بە ئاشکراو بە نهێنی.
خــوا ﷻ باســی کــردەوەی ئــەم ســێ جــۆرەی کــردوە ئــەوەی بۆیــان دەبــێ لە پاداشــتو لــە ســزا، دەفەرمــوێ: ﴿ لِّيُعَذِّبَ ٱللَّهُ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱلۡمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلۡمُشۡرِكِينَ وَٱلۡمُشۡرِكَٰتِ وَيَتُوبَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمَۢا ﴾ (واتــە: بــۆ ئــەوەی خــوا ســزای بدات پیــاوانو ئافرەتانــی دووڕوو وە پیــاوانو ئافرەتانی هاوبەشــدانەر، وە لە پیاوانو ئافرەتانــی ئیمانــدار تەوبە وەرگــرێ، وە خــوا لێبوردەی میهرەبانە)، ســتایش بــۆ خوای بەرز کاتــێ ئــەم ئایەتــەی تــەواو کــردوە بــەم دوو نــاوە گــەورەو پیــرۆزە کــە بەڵگەن لەســەر تــەواوی لێبوردەیــی خــواو فراوانــی ڕەحمەتــیو گشــتگیری بەخشــندەیی، لەگــەڵ ئەوەی بڕیــار لەســەر دراوان زۆربەیــان شایســتەی لێخۆشــبوونو میهرەبانــی ئەو نین، بــە هۆی دوو ڕوویــیو هاوبــەش دانانیانەوە.

تەفسیری سوورەتی (الأحزاب) تەواو بوو.


سورة سبإ
بسم الله الرحمن الرحيم
الحمد لله الذي له ما في السموات وما في الأرض وله الحمد في الآخرة وهو الحكيم الخبير ١ يعلم ما يلج في الأرض وما يخرج منها وما ينزل من السماء وما يعرج فيها وهو الرحيم الغفور ٢ وقال الذين كفروا لا تأتينا الساعة قل بلى وربي لتأتينكم عالم الغيب لا يعزب عنه مثقال ذرة في السموات ولا في الأرض ولا أصغر من ذلك ولا أكبر إلا في كتب مبين ٣ ليجزي الذين ءامنوا وعملوا الصالحات أولئك لهم مغفرة ورزق كريم ٤ والذين سعو في ءاياتنا معاجزين أولئك لهم عذاب من رجز أليم ٥ ويرى الذين أوتوا العلم الذي أنزل إليك من ربك هو الحق ويهدي إلى صراط العزيز الحميد ٦ وقال الذين كفروا هل ندلكم على رجل ينبئكم إذا مزقتم كل ممزق إنكم لفي خلق جديد ٧

## تەفسیری سووڕەتی (سبا)

## مەككیە (٥٤) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٢): ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١﴾ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا ۚ وَهُوَ ٱلرَّحِيمُ ٱلْغَفُورُ ﴿٢﴾ ﴾:

﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى ﴾ (واتە: هەموو ستایشێک بۆ خوا)، (الحمد): ستایش کردنە بە سیفاتە جوانەکانو کردارە چاکەکان، ستایش بۆ خوای بەرزو مەزن، چونکە لەسەر هەموو سیفاتەکانی ستایش دەکرێ، لەبەر ئەوەی سیفاتی تەواون، وە لەسەر کارەکانیشی ستایشی دەکرێ، چونکە لە نێوان بازنەی ئەو چاکەدایە کە ستایشو سوپاسی دەکرێ، وە ئەو دادپەروەریەی کە ستایشی لەسەر دەکرێ، داندەنرێ بە حیکمەتی (خوا) تیایدا.

لێرەدا (خوای بەرز) ستایشی خۆی کردوە، لەسەر ئەوەی ﴿ لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ﴾ موڵکو بەندەی ئەون بە ستایش کردنی هەڵیان دەسوڕێنێ، ﴿ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلْءَاخِرَةِ ﴾ چونکە لە دوارۆژدا، ستایشو پیاهەڵدانی دەردەکەوێ کە لە دونیادا بەو شێوە نیە.

جا ئەگەر خوا دادوەری کرد لە نێوان دروستکراوەکاندا، هەموو خەڵکی بینیان چۆن بڕیاریدا، بە تەواوی دادپەروەریو حیکمەتی تیایدا، هەموویان ستایشی دەکەن لەسەر ئەو دادپەروەریە، تەنانەت ئەوانەشی تۆڵەیان لێدەکرێتەوەو خراونەتە ناو ئاگر دڵەکانیان پڕە لە ستایشی خوا، بێگومان ئەمە لە پاداشتی کردەوەکانیانە، بێگومان خوا دادپەروەرە لە بڕیاردانی بە سزایان.

بەڵام دەرکەوتنی ستایشی خوا لە بەهەشتدا، ئەوە بەڵگەی یەک لە دوای یەکی لەسەر هاتووە،

وە بەڵگەی بیستن‌و عەقڵی لەسەر ڕێک هاتوە، بێگومان ئەوان لە بەهەشتدا، نازونیعمەتە یەک لە دوای یەکەکانی خوا دەبینن، وە زۆری خێرو فەڕو بەرەکەت‌و فراوانی بەخشینەکانی، لە دڵی خەڵکی بەهەشتدا ئاواتێک نەماوەتەوە، یان ویستێک، بێگومان لە سەرووی ئەوەی ئاواتی بۆ خواستوەو ویستی کردوە پێی دراوە، بەڵکو چاکەیان پێ دەبەخشرێ کە پەیوەست نیە بە ئاواتەکانیان، وە بە خەیاڵیشیاندا نەهاتووە، لەم حاڵەتەدا گومانت چۆنە بە ستایش کردنی پەروەدگاریان، لەگەڵ ئەوەدا ڕێگریەکانی بەردەم ناسینی خوا پەرش‌و بڵاو دەبێ، ناسین‌و ستایشی خوا دەبێتە خۆشەویسترین شت بە لای خەڵکەکەیەوە لە هەموو نازونیعمەتەکان، وە بە لەزەترە بەلایانەوە لە هەموو لەزەتێک.

لەبەر ئەمەیە ئەگەر خوای گەورە ببینن‌و قسەکانی ببیستن لە کاتی دواندنی لەگەڵیاندا، ئەوە هەموو نازونیعمەتەکانیان بیر دەباتەوە، وە زیکرو یادی خوا بۆ ئەوان لەناو بەهەشتدا وەکو هەناسەدانی لێ دێ، بەردەوام دەبێ لە هەموو کاتەکاندا.

ئەمە ئەگەر داتە پاڵ ئەوە، کاتێ کە بۆ ئەهلی بەهەشت دەردەکەوێ، لە بەهەشتدا هەموو کاتێک لە مەزنی‌و گەورەیی‌و جوانی پەروەردگاریان‌و بەرفراوانی کەماڵی دا ئەوەیە کە پێویست دەکات لەسەریان بە تەواوی ستایش‌و پیاهەڵدانی بکەن، ﴿وَهُوَ ٱلۡحَكِيمُ﴾ لە دەسەڵات‌و بەڕێوەبردنیدا داناو کاردروستە لە فەرمان‌و قەدەغەکردنیدا ﴿ٱلۡخَبِيرُ﴾ وردبینە، ئاگادارە بەسەر کاروبارە نهێنی‌و شاراوەکان، ئا لەبەر ئەمەیە درێژەی داوە بە زانیاریی، وەک فەرموویەتی: ﴿يَعۡلَمُ مَا يَلِجُ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ واتە: (خوا دەزانێ چی دەچێ بەناو زەویدا) لە باران‌و دانەوێڵەو گیاندار ﴿وَمَا يَخۡرُجُ مِنۡهَا﴾ (وە چی لێدەردەچێ) لە جۆرەها ڕووەکو جۆرەها گیاندار ﴿وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ (چی دێتە خوارەوە لە ئاسمان) لە موڵکو ڕزق‌و ڕۆزی‌و قەزاو قەدەرەکان ﴿وَمَا يَعۡرُجُ فِيهَا﴾ (چی بۆ سەردەکەوێ) لە فریشتەکان‌و ڕووحەکان‌و غەیری وانیش.

کاتێ باسی بەدیهێنراوەکانی کردو حیکمەتی خۆی تیایانداو زانستی بە بارودۆخەکانیان، ئنجا باسی لێبوردەیی‌و میهرەبانی خۆی کرد، فەرمووی: ﴿وَهُوَ ٱلرَّحِيمُ ٱلۡغَفُورُ﴾ واتە: ئەو زاتەی کە میهرەبانی‌و لێخۆشبوون وەسفی ئەوە، بە بەردەوام کاریگەری میهرەبانی‌و لێخۆشبوونی خوا دادەبەزێ بەسەر بەندەکانیدا لە هەموو کاتێکدا بە پێی بەجێهێنانی داخوازیەکانیان.

(٣-٥): ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَا تَأۡتِينَا ٱلسَّاعَةُۖ قُلۡ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتَأۡتِيَنَّكُمۡ عَٰلِمِ ٱلۡغَيۡبِۖ لَا يَعۡزُبُ عَنۡهُ مِثۡقَالُ ذَرَّةٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَآ أَصۡغَرُ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكۡبَرُ إِلَّا فِي

﴿ كِتَٰبٖ مُّبِينٖ ﴿٣﴾ لِّيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ ﴿٤﴾ وَٱلَّذِينَ سَعَوۡ فِيٓ ءَايَٰتِنَا مُعَٰجِزِينَ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٞ مِّن رِّجۡزٍ أَلِيمٞ ﴿٥﴾ ﴾:

كه‌ خوا ﷻ مه‌زنی خۆی ڕوون كردەوە بەوەی وەسفی خۆی پێكردوە، ئه‌م هۆكارێك بوو بۆ به‌ مه‌زندانانیو به‌پاك ڕاگرتنیو بڕوا بوون پێی، ئنجا باسی جۆره‌كانی خەڵكی كرد، ده‌سته‌یه‌كیان وه‌كو پێویست خوایان نه‌ناسیوه‌و ڕێزیان نه‌گرتووه‌، هه‌روه‌ها وه‌كو پێویست به‌ مه‌زنیان دانه‌ناوه‌، به‌ڵكو بێبڕواییان پێكردوه‌ له‌سه‌ر دووباره‌ دروستكردنه‌وه‌ی مردووه‌كانو هاتنی، به‌و شێوه‌یه‌ به‌رپه‌رچی پێغه‌مبه‌ره‌كانیان داوه‌ته‌وه‌، جا فه‌رموویه‌تی: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾ واته‌: (ئه‌وانه‌ی بێبڕوا بوون) به‌ خواو پێغه‌مبه‌ره‌كانیو ئه‌و په‌یامه‌یشی هێناویانه‌، به‌ هۆی بێبڕواییانه‌وه‌ وتیان: ﴿ لَا تَأۡتِينَا ٱلسَّاعَةُۖ ﴾ واته‌: (ڕۆژی دواییمان به‌سه‌ردا نایه‌ت) هیچ نیه‌ ته‌نها ژیانی ئه‌م دونیایه‌ نه‌بێت ده‌مرینو زیندوو ده‌بینه‌وه‌. خوا فه‌رمانی كرد به‌ پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی ﷺ وه‌ڵامی قسه‌كانیان بداته‌وه‌و به‌تاڵی بكاته‌وه‌، وه‌ سوێند بخوا له‌سه‌ر زیندوو كردنه‌وه‌، بێگومان له‌ داهاتوودا دێت، به‌ڵگه‌ ده‌هێنێته‌وه‌ به‌ به‌ڵگه‌یه‌ك، هه‌ركه‌سێ دانی پێدا بنێت، ناچار ده‌بێت زیندوو كردنه‌وه‌ به‌ پێویست بزانێت، ئه‌ویش زانستی گشتگیری خوایه‌، فه‌رموویه‌تی: ﴿ عَٰلِمِ ٱلۡغَيۡبِۖ ﴾ واته‌: (زانای) هه‌موو په‌نهانه‌كانه‌ له‌ چاوی ئێمه‌، وه‌ له‌ زانستی ئێمه‌، جا چی ده‌ڵێیت ده‌رباره‌ی ئاشكراكان؟!

پاشان جه‌ختی له‌ زانیاریی كردوه‌ته‌وه‌و فه‌رموویه‌تی: ﴿ لَا يَعۡزُبُ عَنۡهُ ﴾ واته‌: له‌ زانستی خوا په‌نهان نابێ ﴿ مِثۡقَالُ ذَرَّةٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾ واته‌: هه‌موو شته‌كان، به‌ خودو به‌شه‌كانی، ته‌نانه‌ت بچوكترین به‌شه‌كان، ئه‌ویش گه‌ردیله‌كانه‌ ﴿ وَلَآ أَصۡغَرُ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكۡبَرُ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ ﴾ واته‌: زانستی خوا ده‌وری داوه‌و قه‌ڵه‌می پیا هێناوه‌، وه‌ كتێبی ڕوون له‌ خۆی گرتووه‌، كه‌ ئه‌ویش (اللوح المحفوظ)ه‌.

ئه‌و زاته‌ی به‌ قه‌د گه‌ردیله‌ك له‌ زانستی شاراوه‌ نیه‌، له‌ویش كه‌متر، له‌ هه‌موو كاته‌كاندا، وه‌ ده‌زانی زه‌وی چه‌نده‌ له‌ مردووه‌كان كه‌مده‌كاتو چی ماوه‌ته‌وه‌ له‌ جه‌سته‌كانیان، به‌ توانایه‌ له‌سه‌ر زیندوو كردنه‌وه‌یان، زیندوو كردنه‌وه‌یان سه‌رسوڕهێنه‌رتر نیه‌ له‌م زانسته‌ی ده‌وری هه‌موو شتێكی داوه‌.

پاشان باس له‌ مه‌به‌ستو ئامانجی زیندوو كردنه‌وه‌ ده‌كات، فه‌رموویه‌تی: ﴿ لِّيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ (واته‌: بۆ ئه‌وه‌ی پاداشتی ئه‌وانه‌ بداته‌وه‌ بڕوایان هێناوه‌) به‌ دڵه‌كانیان،

خوایـان بـە ڕاسـت دانـاوە، وە پێغەمبەرەکانیـان بەڕاسـت داناوە بەڕاسـتداناێکی ڕاسـتەقینە ﴿ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ ﴾ وەک بـە ڕاسـت دانانێـک بـۆ ئیمانەکەیـان ﴿ أُو۟لَـٰٓئِكَ لَهُم مَّغْفِرَةٌ ﴾ (واتـە: بـۆ ئەوانـە لێبـوردن هەیـە) لـە گوناهەکانیـان، بـە هـۆی ئیمـانو کردەوەیـان، بەرگریـان لـێ دەکات لـە هەمـوو شـەڕو سـزایەک ﴿ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴾ بـە هـۆی چاکەکانیانـەوە، هەمـوو داواکاریەکیان بـۆ دەسـتەبەر دەبێت، وە ئـەوەی حەزی لێدەکـەنو ئاواتـی پێدەخوازن.

﴿ وَٱلَّذِينَ سَعَوْ فِىٓ ءَايَـٰتِنَا مُعَـٰجِزِينَ ﴾ واتـە: هەوڵیان داوە (بڕوا بە نیشـانەکانی خوا نەکرێ) و کوفریـان پێکـردوە، دەستەوسـانن لە ئاستی ئـەوەی هێناویەتـیو ئەوەیشـی دایبەزاندوە، وەک چـۆن دەسەوسـانیان کـرد لـە دووبـارە دروسـتکردنەوە دوای مـردن ﴿ أُو۟لَـٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ ﴾ واتـە: (بـۆ ئەوانـە هەیـە سـزایەکی) زۆر بـە ئێـش بـۆ جەسـتەو دڵەکانیان.

(٦): ﴿ وَيَرَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ ٱلْحَقَّ وَيَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴿٦﴾ ﴾:

﴿ وَيَرَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ ٱلْحَقَّ ﴾ کاتـێ خـوا ﷻ باسـی نکووڵـی ئەوانـەی کـرد کـە نکووڵـیو ئینـکاری زینـدوو بوونەوەیان کـرد، ئەوانـە وایان دەزانـی ئـەوەی خـوا بـۆ پێغەمبەرەکـەی ﷺ دایبەزانـدووە هـەق نیـە، ئنجـا باسـی حاڵـی سـەرکەوتووانی کـرد لـە بەنـدەکان، ئەوانیش خاوەنانی زانسـتن، ئـەوان وا دەزانـن ئەوەی خـوا دایبەزانـدووە بـۆ سـەر پێغەمبەرەکـەی لـە کتێـب، وە ئەوەشـی لـە خـۆ گرتـووە لە هەواڵـەکان، ئـەوە هەقو ڕاسـتە. واتـە: هەق لـەوەدا کورتهەڵهێنـراوە، هەر شـتێ پێچەوانەو دژی بێـت بەتـاڵو پووچـە، چونکە ئەوانە بە زانسـت گەیشـتنە پلـەی دڵنیایی ﴿ وَيَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴾ هەروەهـا دەزانـن خـوا لـە فەرمـانو قەدەغـە کراوەکانیـدا (ڕێنمایـی خەڵـک دەکات بـۆ ڕێگـای سـتایش کراو).

بـەو شـێوەیە ئـەوان دڵنیا بوون بەڕاسـتی دروسـتی ئـەوەی پێغەمبـەر ﷺ هەواڵی پێـداوە لە چەندین ڕووەوە:

یەکەم: لە ڕووی زانستیانەوە، ئەوەی پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێداوە.

دووەم: لەڕووی ڕێک بوونی لەگەڵ کاروبارە واقعیو کتێبەکانی پێشوو.

سێیەم: لە ڕووی ئەوەی بە چاو دەیبینن لەو هەواڵانە.

چــوارەم: لــەو ڕووی ئــەوەی دەیبینــن لــەو ئایەتــە مەزنانــەی کــە لــە گــەردوونو خودی خۆیانــدا بــەدی دەکرێ.
پێنجەم: لە ڕووی گونجانیان لەوەی ناوە بەرزو سیفاتەکانی ئاماژەی پێدەکەن.
وە دەزانــن لــە فەرمــانو قەدەغەکراوەکانــدا، ئەوانــە ڕێنمایــی دەکــەن بۆ ڕێگای ڕاســتو ڕەوان، فەرمــان دەکــەن بــە هەمــوو ســیفەتێک نەفــسو دەروون پــاک بکاتەوەو پاداشــت زیــاد بــکات، وە ســوودی هەبێ بــۆ ئــەو کەســەی ئەنجامــی دەداو غەیری ئەویــش، وەک ڕاســتگۆیی‌و دڵســۆزی‌و چاکــە لەگــەڵ دایــکو باوکــداو پەیوەنــدی خزمایەتــی‌و چاکــە لەگــەڵ هەموو دروســتکراوەکاندا، وە وێنەی ئەوانە. وە قەدەغە دەکات لە هەموو ســیفەتێکی ناشــرین کــە نەفــس پیــس دەکاتو ئەجرو پاداشــت لەنــاو دەباو تــاوانو خراپە پێویســت دەکات لــە هاوبــەش دانــانو زیناو ســوودو ڕیباو ســتەم لــە خوێنڕشــتنو ماڵو ناموســدا، ئەمــە چاکــەو فەزیڵەتــی خاوەنانی زانســتەو نیشــانەیەکە بــۆ ئــەوان، بێگومان مــرۆڤ هەتا زانســتو بەڕاســت دانانــی مەزنتــر بێ بــەو هەواڵانــەی پێغەمبــەر هێناویەتی، وە شــارەزایی تــەواوی هەبــێ بــە فەرمــانو قەدەغەکراوەکانــی، ئــەوە لــە خاوەنانی زانســتە ئەوانــەی خوا کردوونــی بــە بەڵگەو حوججە، لەســەر ئــەو پەیامــەی پێغەمبــەر هێناویەتی، خــوا ﷻ بەڵگە بــەوان دەهێنێتەوە لەســەر بەدرۆدانــەرانو نکوولیکارانــدا هاتووە، هەروەک چــۆن لەم دەقەو جگە لــەم دەقەشــدا هاتووە.
(٧-٩): ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ هَلۡ نَدُلُّكُمۡ عَلَىٰ رَجُلٖ يُنَبِّئُكُمۡ إِذَا مُزِّقۡتُمۡ كُلَّ مُمَزَّقٍ إِنَّكُمۡ لَفِي خَلۡقٖ
جَدِيدٍ ﴿٧﴾ أَفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَم بِهِۦ جِنَّةُۢۗ بَلِ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ فِي ٱلۡعَذَابِ وَٱلضَّلَٰلِ
ٱلۡبَعِيدِ ﴿٨﴾ أَفَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَىٰ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِۚ إِن نَّشَأۡ نَخۡسِفۡ
بِهِمُ ٱلۡأَرۡضَ أَوۡ نُسۡقِطۡ عَلَيۡهِمۡ كِسَفٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّكُلِّ عَبۡدٖ مُّنِيبٖ ﴿٩﴾ ﴾
﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾ لــە ڕووی بەدرۆدانــانو گاڵتــە پێکــردنو بە دوور زانین، وە باســی ڕووی بــە دوور دانانــی کــردوە. واتــە: هەندێکیــان بــە هەندێکــی دیکەیــان وت: ﴿ هَلۡ نَدُلُّكُمۡ عَلَىٰ رَجُلٖ يُنَبِّئُكُمۡ إِذَا مُزِّقۡتُمۡ كُلَّ مُمَزَّقٍ إِنَّكُمۡ لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدٍ ﴾ مەبەســتیان لــەو پیــاوە پێغەمبــەر بــوو ﷺ، ئــەو پیــاوە شــتێکی هێنــاوە ئادەمیــزاد ســەری ســووڕدەمێنێ پێــی، هەتا ئــەوان پێیــان وابــوو ئەمــە شــتێکی سەرســووڕهێنەرە گاڵتەی پێدەکــەن، وە ئەو چــۆن دەڵێ ئێــوە زینــدوو دەکرێنــەوە، دوای ئــەوەی ڕزینو پارە پــارە بوونو جەســتەتان پەرشو بڵاو بوویــەوە؟! ئــەم پیــاوە کە ئەمــەی هێنــاوە ئایا:

أَفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَم بِهِۦ جِنَّةٌۢ بَلِ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْآخِرَةِ
فِى ٱلْعَذَابِ وَٱلضَّلَـٰلِ ٱلْبَعِيدِ ﴿٨﴾ أَفَلَمْ يَرَوْا۟ إِلَىٰ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ
وَمَا خَلْفَهُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۚ إِن نَّشَأْ نَخْسِفْ بِهِمُ ٱلْأَرْضَ
أَوْ نُسْقِطْ عَلَيْهِمْ كِسَفًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً
لِّكُلِّ عَبْدٍ مُّنِيبٍ ﴿٩﴾ ۞ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ مِنَّا فَضْلًا ۖ
يَـٰجِبَالُ أَوِّبِى مَعَهُۥ وَٱلطَّيْرَ ۖ وَأَلَنَّا لَهُ ٱلْحَدِيدَ ﴿١٠﴾ أَنِ ٱعْمَلْ
سَـٰبِغَـٰتٍ وَقَدِّرْ فِى ٱلسَّرْدِ ۖ وَٱعْمَلُوا۟ صَـٰلِحًا ۖ إِنِّى بِمَا تَعْمَلُونَ
بَصِيرٌ ﴿١١﴾ وَلِسُلَيْمَـٰنَ ٱلرِّيحَ غُدُوُّهَا شَهْرٌ وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ ۖ
وَأَسَلْنَا لَهُۥ عَيْنَ ٱلْقِطْرِ ۖ وَمِنَ ٱلْجِنِّ مَن يَعْمَلُ بَيْنَ يَدَيْهِ بِإِذْنِ
رَبِّهِۦ ۖ وَمَن يَزِغْ مِنْهُمْ عَنْ أَمْرِنَا نُذِقْهُ مِنْ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١٢﴾
يَعْمَلُونَ لَهُۥ مَا يَشَآءُ مِن مَّحَـٰرِيبَ وَتَمَـٰثِيلَ وَجِفَانٍ كَٱلْجَوَابِ
وَقُدُورٍ رَّاسِيَـٰتٍ ۚ ٱعْمَلُوٓا۟ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكْرًا ۚ وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِىَ
ٱلشَّكُورُ ﴿١٣﴾ فَلَمَّا قَضَيْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَوْتَ مَا دَلَّهُمْ عَلَىٰ مَوْتِهِۦٓ
إِلَّا دَآبَّةُ ٱلْأَرْضِ تَأْكُلُ مِنسَأَتَهُۥ ۖ فَلَمَّا خَرَّ تَبَيَّنَتِ ٱلْجِنُّ
أَن لَّوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ٱلْغَيْبَ مَا لَبِثُوا۟ فِى ٱلْعَذَابِ ٱلْمُهِينِ ﴿١٤﴾

﴿ أَفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ﴾ (بەدەم خواوە درۆ دەکات) بوێـری کـرد بەسـەریداو ئـەوەی وتـی وتـی ﴿ أَم بِهِۦ جِنَّةٌ ﴾ (یان شـێتە)؟ ئەمـە شـتێکی نامـۆ نیە لـە ئـەوەوە چونکە شـێتی هونـەرە. هەمـوو ئەمانـە لەلایـەن ئەوانـەوە لـە ڕووی عینادیو سـتەمکردنەوە بـوو، بێگومان ئەوان بـاش دەیانزانی کە ئەو ڕاسـتگۆترینو عاقڵترینی دروستکراوەکانی خوایـە، وە لـە زانسـتو زانیاریـان ئـەوان دەسـتیان پێکـردوو گەڕانـەوە بـۆ دژایەتی کردنـی، ئـەوان نەفـسو ماڵیـان بەخشـی لـەوەی بەرهەڵسـتی خەڵکـی لێبکـەن، جـا ئەگەر ئەو درۆزنو شـێت بووایە پێویسـتی نەدەکـرد لـە سـەرتان ئـەی ئەو کەسـانەی خۆتـان بـە عاقـڵ دەزانـن گـوێ بگـرن لـە قسـەکانی، وە جیـاوازی بکەوێتـە نێوانتـان لە بانگەوازەکەیـدا، بێگومـان شـێت پێویسـت نـاکات کەسـی عاقـڵ لای لێبکاتـەوە، یـان گرنگـی بـدات بە قسـەکانی، ئەگەر عینادیو سـتەمی ئێـوە نەبووایـە ئەوە پەلەتـان دەکرد بـۆ بەدەمـەوە هاتنـی، وە ڕووتان دەکـردە بانگەوازەکەی، بەڵام نیشـانە ترسـێنەرەکان هیچ سـوود ناگەیەنن بە کەسـانێک بڕواناهێنـن، لەبەر ئەمەیـە فەرموویەتی: ﴿ بَلِ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْآخِرَةِ ﴾ وە کەسـانێک لە ئەوان ئەو قسـەیان کـرد ﴿ فِى ٱلْعَذَابِ وَٱلضَّلَـٰلِ ٱلْبَعِيدِ ﴾ واتە: لـە بەدبەختیەکـی مـەزنو گومڕاییەکـی دووردان، کـە بـە هیـچ شـێوەیەک نزیـک نیە لە ڕاسـتیەوە، چ بەدبەختـیو گومڕاییـەک گەورەتـرە لـە ئینـکاری کردنیان لە توانـای خوا لە زیندووکردنـەوە، وە بەدرۆدانانـی پێغەمبەرەکەیان کە هێنابووی بۆیـان، وە گاڵتە پێکردنیان، وە جەختکردنەوەیـان ئـەوەی ئـەوان هێناویانـە هەقە، جا هەقیـان بە بەتاڵو پـووچ بینی، وە پـووچو گومڕاییـان بە هـەقو هیدایەت زانی، پاشـان ئاگاداریـان دەکاتەوە لەسـەر بەڵگەی عەقڵـی لـە بـە دوور دانەنانی زینـدوو بوونەوە، کە ئـەوان بە دووریـان دادەنا، بـەڵام ئەگەر ئـەوان سـەرنجی ئـەوە بدەن کـە لە بـەردەمو پشـتیانەوەیە، لـە ئاسـمانەکانو زەوی، توانای

خـوا دەبینـن لە ناویاندا، کە گەشـە بە عەقڵـەکان دەدات، وە لـە مەزنی زانا گـەورەکان پێی سەرسـام دەبـن، وە بێگومان دروسـتکردنی ئاسـمانو زەویو مەزنیانو ئەوەی لـە نێویاندایە لـە دروسـتکراوەکان، گەورەتـرە لە دووبـارە دروسـتکردنەوەی مرۆڤ لـە دوای مردنیان لە گۆڕەکانیـان، چـی وای لێکـردوون لەسـەر ئـەو بەدرۆدانانەتان، لەگـەڵ ئـەوەدا دان دەنێن بـەوەی لـەوە گەورەتـرو مەزنتـرە؟ بەڵێ ئـەوە هەواڵێکـی غەیبـیو پەنهانیە تا ئێسـتا نەیان بینیـوە بـە چاو لەبـەر ئەوەیـە بـەدرۆی دەزانن.

خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿إِن نَّشَأْ نَخْسِفْ بِهِمُ ٱلْأَرْضَ أَوْ نُسْقِطْ عَلَيْهِمْ كِسَفًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ (واتـە: ئەگـەر بمانەوێـت دەیانبەیـن بـە ناخـی زەویـدا)، (یـان دەیخەینـە خـوار بەسـەریاندا چەنـد پارچەیـەک لـە ئاسـمان)، واتـە: لـە سـزا، چونکـە زەویو ئاسـمان لـە ژێـر فەرمانـی ئێمـەدان، ئەگـەر فەرمانیـان پێبکەیـن یاخـی نابـن، دەی ئاگـادار بـن لـە بەردەوامبوونتـان لەسـەر بەدرۆدانـان، ئەگینـا سـزاتان دەدات بـە توونترین سـزا ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ﴾ واتـە: دروسـتکردنی ئاسـمانەکانو زەویو ئـەوەی لـە نێوياندايـە لـە دروسـتکراوەکان ﴿لَأٓيَةً لِّكُلِّ عَبْدٍ مُّنِيبٍ﴾ (واتـە: نیشـانەیە بـۆ هـەر بەندەیەکـی ڕوو لـە خـوا). مـرۆڤ هەتـا زیاتـر ملکەچـی خوابـێ ئـەوە زیاتـر سـوود لـە ئایـەتو نیشـانەکان وەردەگـرێ، چونکـە بەنـدەی ملکـەچ ڕوو دەکا لـە پەروەردگـاری، ئیـرادەو ویسـتەکانی ئاڕاسـتەی پەروەردگـاری دەکات، وە لـە هەمـوو کاروبارێکـدا دەگەڕێتـەوە بـۆ لای تـا نزیـک دەبێتـەوە لـە پەروەردگـاری، هیـچ خەمێکـی نابـێ جگـە لـە سـەرقاڵ بـوون بـە بەدەسـتهێنانی ڕەزامەنـدی ئـەو، جـا تەماشـا کردنـی بـۆ بەدیهێنـراوەکان تەماشـاکردنێکی پـڕ لـە بیرکردنـەوەو پەنـد وەرگرتنـە، نـەک تەماشـاکردنێکی بێئاگـاو بـێ سـوود.

(١٠-١١): ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ مِنَّا فَضْلًا يَٰجِبَالُ أَوِّبِي مَعَهُۥ وَٱلطَّيْرَ وَأَلَنَّا لَهُ ٱلْحَدِيدَ ﴿١٠﴾ أَنِ ٱعْمَلْ سَٰبِغَٰتٍ وَقَدِّرْ فِي ٱلسَّرْدِ وَٱعْمَلُوا۟ صَٰلِحًا إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١١﴾﴾:

واتـە: بەڕاسـتی منەتـی خۆمـان کـرد بەسـەر بەنـدەو پێغەمبەرمـان داوود ﷺ، وە فـەزڵو بەهـرەی خۆمانمـان پێیـدا لەزانسـتی بەسـوودو کـردەوەی چـاکو نـازو نیعمەتـی ئاینیو دنیایـی. لـە نیعمەتەکانـی لەسـەری، خـوا تایبەتی کـرد بـە داوودەوە لە بێگیانـەکان، وەک کێـوەکانو زینـدەوەران لـە باڵنـدەکان، لەگەڵیدا زیکـرو تەسـبیحی پەروەردگاریان بکەنو وەڵامـی بدەنـەوە، ئەمە نیعمەتـە بەسـەریەوەو لـە تایبەتمەندیەکانی ئەوە کە بـۆ هیچ کەس

نەبــووە پێــش ئــەوو دوای ئەویــش، بێگومــان ئــەوە دەبێتە وزەیــەک بۆیو بۆ جگــە لە ئەو لەســەر تەســبیح کردن، کاتێ کــە ئەو زینــدەوەورو گیانلەبەرانــە دەبینــن وەڵام دەدەنەوە بە تەســبیحی پەروەردگاریــان وە بە گــەورە دانانو ســتایش کردنی، ئەوە دەبێتــە مایەی ئەوەی زیاتــر یادی خــوا بکەن.

وە لەوانــە: بێگومــان ئەوانــە هەروەکــو زۆرێــک لــە ڕاڤەزانانــی قورئــان وتوویانە ئــەوە لە دەنــگ خۆشــی داود بــووە، خــوا ﷻ دەنگێکــی خۆشــی پێدابــوو کە پێشــکەوتبوو بەســەر غەیــری ئــەودا، کاتــێ کــە یــادی خــواو بــە گەورەدانــانو ستایشــی بکردایــە بــەو دەنگە ناســکو خۆشــە، هەمــوو ئەوانــە لــە مــرۆڤو جنۆکــەکان وەڵامیــان دەدایــەوە، تەنانــەت باڵنــدەو کێوەکانیــش یــادو ستایشــی پەروەردگاریــان دەکــرد.

لەوانــە: بێگومان دەگونجێ پاداشــتی زیکرکردنەکەی بۆ بەدەســت بــێ، چونکە ئەو هۆکاری ئەوەیــە، وە یادکردنــی ئــەوان لــە شــوێنکەوتنی ئــەو بــوو، وە لــە فــەزڵو چاکەکانــی خوا لەســەری ئەوەیــە ئاســنی بۆ نەرم کــرد، بۆئەوەی پۆشــاکی داپۆشــەری پێ دروســت بکەن، وە فێــری چۆنێتــی دروســتکردنی کــرد، بەوەی لــە چینی زرێــدا ئەنــدازەی ئەڵقەکانی وەک یــەک بــن، بەو شــێوەیە دروســتی بــکات، پاشــان هەندێکی بــکات بە نــاو ئــەوی دیکەدا، خوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿وَعَلَّمۡنَٰهُ صَنۡعَةَ لَبُوسٖ لَّكُمۡ لِتُحۡصِنَكُم مِّنۢ بَأۡسِكُمۡۖ فَهَلۡ أَنتُمۡ شَٰكِرُونَ ٨٠﴾ الأنبیاء، (واتــە: وە داودمــان فێــری دروســتکردنی پۆشــاکی زرێ کرد بۆ ئێــوە تا بتانپارێزێ لە کاتی شــەڕو کوشــتارتاندا دەی ئایا ئێوە سوپاســگوزارن)، کاتێ باســی منەتــی خۆی کــرد بەســەریدا، وە لەســەر خانەوادەکــەی فەرمانــی پێکرد سوپاســگوزاربێو کــردەوەی چــاک بــکات، وە هەســت بە چاودێــری خوا بکات بەســەریەوە بە چاکســازیو خۆپاراســتنی لــە خراپــەکان، بێگومان ئــەو بینــەری کردەوەکانتانــە ئاگادارە بەســەریانەوە، هیــچ شــتێکی لێ شــاراوە نیە.

(١٢-١٤): ﴿وَلِسُلَيۡمَٰنَ ٱلرِّيحَ غُدُوُّهَا شَهۡرٞ وَرَوَاحُهَا شَهۡرٞۖ وَأَسَلۡنَا لَهُۥ عَيۡنَ ٱلۡقِطۡرِۖ وَمِنَ ٱلۡجِنِّ مَن يَعۡمَلُ بَيۡنَ يَدَيۡهِ بِإِذۡنِ رَبِّهِۦۖ وَمَن يَزِغۡ مِنۡهُمۡ عَنۡ أَمۡرِنَا نُذِقۡهُ مِنۡ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ١٢ يَعۡمَلُونَ لَهُۥ مَا يَشَآءُ مِن مَّحَٰرِيبَ وَتَمَٰثِيلَ وَجِفَانٖ كَٱلۡجَوَابِ وَقُدُورٖ رَّاسِيَٰتٍۚ ٱعۡمَلُوٓاْ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكۡرٗاۚ وَقَلِيلٞ مِّنۡ عِبَادِيَ ٱلشَّكُورُ ١٣ فَلَمَّا قَضَيۡنَا عَلَيۡهِ ٱلۡمَوۡتَ مَا دَلَّهُمۡ عَلَىٰ مَوۡتِهِۦٓ إِلَّا دَآبَّةُ ٱلۡأَرۡضِ تَأۡكُلُ مِنسَأَتَهُۥۖ فَلَمَّا خَرَّ تَبَيَّنَتِ ٱلۡجِنُّ أَن لَّوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ٱلۡغَيۡبَ مَا لَبِثُواْ فِي ٱلۡعَذَابِ ٱلۡمُهِينِ ١٤﴾:

کاتێ خـوا ﷻ باسـی فـەزڵو چاکەی خـۆی کـرد بەسـەر داوود ﷺ، ئنجا باسـی فەزڵو بەهـرەی خـۆی کرد بەسـەر کورەکـەی سـولەیمان ﷺ، خوا ﷻ بـای رامهێنا بـە فەرمانی سـولەیمان بـرواو هەڵیبگـرێ، وە هەموو ئەوانە هەڵبگـرێ کەلەگەڵیـدان، وە ماوەیەکی زۆر دوور ببـڕێ لەماوەیەکـی کەمدا، بەیـەک ڕۆژ ماوەی دوومانگی ڕێکـردن ببڕێ ﴿ غُدُوُّهَا شَهۡرٞ ﴾ واتـە: سـەرەتای بەیانی تا نیـوەڕۆ ﴿ وَرَوَاحُهَا شَهۡرٞ ﴾ وە دوای نیـوەڕۆ تا خۆرئاوا ﴿ وَأَسَلۡنَا لَهُۥ عَيۡنَ ٱلۡقِطۡرِ ﴾ واتـە: مسـمان بـۆ توانـدەوەو رامهێنا، سـەرجەم هۆکارەکانیمان بـۆ ئاسـانکرد لـە دەرهێنانو دروسـتکردنی قـاپو قاجاخو جگە لـە ئەویش.

هەروەهـا خـوا ﷻ جنۆکـەو شـەیتانەکانی بـۆ ڕامهێنـا نەیاندەتوانـی لـە فەرمانـی دەربچن، ﴿ وَمَن يَزِغۡ مِنۡهُمۡ عَنۡ أَمۡرِنَا نُذِقۡهُ مِنۡ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ﴾ (واتـە: ئەگـەر هـەرکام لـەوان لـە فەرمانـی ئێمـە لابـدات سـزای ئاگـری هەڵگیرسـاوی پـێ دەچێژیـن).

سـولەیمان هەرچـی بویسـتایە پێیانـی ئەنجـام دەدا ﴿ مِن مَّحَٰرِيبَ ﴾ (پەرسـتگا) ئـەوەش دروسـتکردنی هەمـوو بینـاو باڵەخانەیەکی گەورەو زەبەلاحـە ﴿ وَتَمَٰثِيلَ ﴾ واتە: پەیکەری گیانلەبـەرانو بێگیانـەکان، لـە وردەکاری پیشـەو توانایـان لەسـەر ئـەوە، وە کارکردنیـان لەسـەر ئەوە.

﴿ وَجِفَانٖ كَٱلۡجَوَابِ ﴾ واتـە: (چەندیـن قاپـی نانخواردن) وەکـو حەوزی گەورە دروسـتیان دەکـرد بـۆ سـولەیمان بـۆ نانخـواردن، چونکـە پێویسـتی پێیەتـی بـە پێچەوانـەی غەیری ئـەو کە پێویسـتی پـێ نیـە ﴿ وَقُدُورٖ رَّاسِيَٰتٍ ﴾ بۆیان دروسـت دەکـرد، چەنـد قازانو مەنجەڵـی دامـەزراو کـە لەبـەر گەورەییـان لە جێگـای خۆیـان نەدەجوڵان.

کاتـێ باسـی منەتـی خـۆی کـردوە بەسـەریانەوە، فەرمانـی پێکـردوون بە سوپاسـکردن، ﴿ ٱعۡمَلُوٓاْ ءَالَ دَاوُۥدَ ﴾ (واتـە: ئـەی خانـەوادەی داوود کار بکـەن)، ئەویـش داوودو منـداڵو خانەوادەکەیەتـی، چونکـە منـەت لەسـەر هەموویانـە، وە زۆرێـک لـەو بەرژەوەندیانـە دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەوان ﴿ شُكۡرٗاۚ ﴾ سوپاسـگوزاری خـوا بکـەن لەسـەر ئـەوەی پێـی بەخشـیونو پێشـی خسـتوون، ﴿ وَقَلِيلٞ مِّنۡ عِبَادِيَ ٱلشَّكُورُ ﴾ زۆربـەی بەنـدەکان شـوکرانە بژێـری خوانیـن، لەسـەر پێدانی نـازو نیعمەتـەکانو دوورخسـتنەوەی ناخۆشـیو نارەحەتیـەکان لێیـان.

شـوکرانە بژێـری: دانپێدانانـی دڵـە بـە منەتـی خـوای بـەرز، وە وەرگرتنێتی بـە خۆبەکەم زانینـەوە، وە بەکارهێنانـی لـە گوێڕایەڵـی خوادا، وە پاراسـتنی لـە بەکارهێنانی سـەرپێچی.

بــەردەوام شــەیتانەکان هەمــوو کارێکــی بیناســازیو کارەکانــی دیکەیــان بــۆ ســولەیمان دەکــرد ﷺ، هەمــوو کارکردنــیّ دایــان بەگوێــی ئادەمیــزادداو پێیــان ڕاگەیاندبــوو، کــە ئــەوان کار لــە غەیــبو پەنهــان دەکــەن، وە ئاگــادارن بەســەر هەمــوو وردەکاریــەکان، خــوا ﷻ ویســتی درۆکەیــان نیشــانی خەڵکــی بــدات، لــەم بانگەشــەیەدا، بۆیــە ئــەوان مانــەوە لەســەر کارەکــەی خۆیــان، وە خــوای گــەورە مردنــی هێنــا بەســەر ســولەیمانداو خــۆی دابــوو بەســەر گاڵۆکەکەیــدا، ئەویــش ئــەو داردەســتە بــوو، جــا کاتــیّ تێدەپەڕین بەلایــدا ئەویــش کەوتبــوو بەســەریدا، وایاندەزانــی زینــدوەو لێــی دەترســان، بــەو شــێوەیە بــۆ مــاوەی یــەک ســاڵ لەســەر کارەکانیــان بــەردەوام بــوون، وە وتــراوە: هەتــا خــۆرەو مۆریانــەی زەوی داردەســتەکەیان خــوارد، ئــەو دار دەســتەی بەردەوامــی چاودێــری دەکــرد، هەتــا دارەکــە هێــزی نەمــاو کــەوت، ئنجــا ســولەیمانیش کەوتــە خــوارەوە، شــەیتانەکان بڵاوەیــان کــردو بــۆ مرۆڤەکانیــش دەرکــەوت کــە بەڕاســتی جنۆکــەکان ﴿لَّوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ٱلۡغَيۡبَ مَا لَبِثُواْ فِي ٱلۡعَذَابِ ٱلۡمُهِينِ﴾ (واتــە: کــە ئەگــەر غەیبیــان بزانیایــە لــە ســزای ڕیســواکەردا نەدەمانــەوە)، ئەویــش بریتــی بــوو لــە کاری قــورس لەســەریان، جــا ئەگــەر ئــەوان لــە پەنهانیــان بزانیایــە، ئــەوە بــە مردنــی ســولەیمانیان دەزانــی کــە زۆر ســوور بــوون لەســەری، بــۆ ئــەوەی ســەلامەت بــن لــەو نارەحەتیــەی لەســەرین.

لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ ءَايَةٌ جَنَّتَانِ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ
كُلُوا مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ وَاشْكُرُوا لَهُ بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ
﴿١٥﴾ فَأَعْرَضُوا فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ سَيْلَ الْعَرِمِ وَبَدَّلْنَاهُم بِجَنَّتَيْهِمْ
جَنَّتَيْنِ ذَوَاتَيْ أُكُلٍ خَمْطٍ وَأَثْلٍ وَشَيْءٍ مِّن سِدْرٍ قَلِيلٍ
﴿١٦﴾ ذَٰلِكَ جَزَيْنَاهُم بِمَا كَفَرُوا وَهَلْ نُجَازِي إِلَّا الْكَفُورَ ﴿١٧﴾
وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ الْقُرَى الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا قُرًى ظَاهِرَةً
وَقَدَّرْنَا فِيهَا السَّيْرَ سِيرُوا فِيهَا لَيَالِيَ وَأَيَّامًا ءَامِنِينَ ﴿١٨﴾
فَقَالُوا رَبَّنَا بَاعِدْ بَيْنَ أَسْفَارِنَا وَظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ فَجَعَلْنَاهُمْ
أَحَادِيثَ وَمَزَّقْنَاهُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ
شَكُورٍ ﴿١٩﴾ وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُ فَاتَّبَعُوهُ إِلَّا
فَرِيقًا مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَمَا كَانَ لَهُ عَلَيْهِم مِّن سُلْطَانٍ
إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يُؤْمِنُ بِالْآخِرَةِ مِمَّنْ هُوَ مِنْهَا فِي شَكٍّ
وَرَبُّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ حَفِيظٌ ﴿٢١﴾ قُلِ ادْعُوا الَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن
دُونِ اللَّهِ لَا يَمْلِكُونَ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي
الْأَرْضِ وَمَا لَهُمْ فِيهِمَا مِن شِرْكٍ وَمَا لَهُ مِنْهُم مِّن ظَهِيرٍ ﴿٢٢﴾

(١٥-٢١): ﴿لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ ءَايَةٌ جَنَّتَانِ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ كُلُوا مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ وَاشْكُرُوا لَهُ بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ ﴿١٥﴾ فَأَعْرَضُوا فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ سَيْلَ الْعَرِمِ وَبَدَّلْنَاهُم بِجَنَّتَيْهِمْ جَنَّتَيْنِ ذَوَاتَيْ أُكُلٍ خَمْطٍ وَأَثْلٍ وَشَيْءٍ مِّن سِدْرٍ قَلِيلٍ ﴿١٦﴾ ذَٰلِكَ جَزَيْنَاهُم بِمَا كَفَرُوا وَهَلْ نُجَازِي إِلَّا الْكَفُورَ ﴿١٧﴾ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ الْقُرَى الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا قُرًى ظَاهِرَةً وَقَدَّرْنَا فِيهَا السَّيْرَ سِيرُوا فِيهَا لَيَالِيَ وَأَيَّامًا ءَامِنِينَ ﴿١٨﴾ فَقَالُوا رَبَّنَا بَاعِدْ بَيْنَ أَسْفَارِنَا وَظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ فَجَعَلْنَاهُمْ أَحَادِيثَ وَمَزَّقْنَاهُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿١٩﴾ وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُ فَاتَّبَعُوهُ إِلَّا فَرِيقًا مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَمَا كَانَ لَهُ عَلَيْهِم مِّن سُلْطَانٍ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يُؤْمِنُ بِالْآخِرَةِ مِمَّنْ هُوَ مِنْهَا فِي شَكٍّ وَرَبُّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ حَفِيظٌ ﴿٢١﴾﴾:

(سـبأ) هۆزێکـی ناسـراوە لـە یەمـەن، شـوێنی نیشـتەجێ بوونیـان شـارێکە پێـی دەوترێ: (مـأرب)، لـە نیعمـەتو میهرەبانیەکانی خـوا بۆ خەڵکی بە گشـتی بۆ عەرەبیش بـە تایبەتی، باسـی کردوە لـە قورئانـدا هەواڵی ئەو گەلانـەی لە ناوچـوونو سـزادراون، لەوانەی نزیکی عەرەبـن، بـۆ ئـەوەی شـوێنەوارەکانیان ببینرێ، خەڵکـی هەواڵەکانیـان بگوازنەوە، تـا ببێتە بانگەشـەکەرێ بۆ بە ڕاسـت دانـانو نزیک کەرەوەیەک بـۆ ئامۆژگاری، جـا فەرموویەتی: ﴿لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ﴾ واتـە: ئـەو شـوێنەی خەڵکی (سـبأ) تیایدا نیشـتەجێبوون ﴿ءَايَةٌ﴾ نیشـانە لێـرەدا: ئـەو نـازو نیعمەتە زۆرەیـە خوا پێیدابـوون، وە بـەلاو نارەحەتی لـێ بەدوور خسـتبوون، کـە وای پێویسـت دەکرد بیپەرسـتنو سوپاسـگوزاری بکەن.

پاشـان نیشـانەکەی شـیکردوەتەوە بـە وتـەی: ﴿جَنَّتَانِ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ﴾ (واتـە: دوو باخـات لای ڕاسـتو لای چەپ) ئـەوان دەریایەکـی گەورەیان هەبوو، لـە هەموو لایەکەوە لافاوێکـی زۆری بـۆ دەهـات، بەنداوێکـی پتـەوو قایمیـان لـێ دروسـت کرد، بـۆ ئەوەی

ئـاوەکان کـۆ بکاتەوە، لە هەمـوو لایەکەوە لافـاوەکان دەهاتن لـەو بەنـداوە کۆدەبوونەوە، ئەوانیـش دابەشـیان دەکـرد بەسـەر باخچەکانیاندا کـە لە لای ڕاسـتی ئەو دەریایـەو لە لای چەپـی بـوو، ئـەو دوو باخـە مەزنـە ئـەوە بەرهەمـی پێـدەدان بەشـیانی دەکـرد، وە دڵیـان پێـی خۆش دەبـوو، خوا فەرمانـی پێکردن بـە سوپاسـگوزاری نیعمەتەکانی کـە باراندبووی بەسـەریاندا لە چەندیـن ڕووەوە:

یەکەم: زۆربەی بژێوی ژیانیان لەسەر ئەم دوو باخە بوو.

دووەم: خـوا شـارەکەیانی کـرد بـە شـارێکی پـاکو خـۆش، بـە هـۆی چاکـی کـەشو هەواکـەیو کەمـی ناسـازگاری، وە بەدەسـتهێنانی ڕزقو ڕۆزیو خۆشـگوزەرانی تیایـدا.

سـێیەم: خـوا بەڵێنی پێـدان ئەگەر سوپاسـگوزاری بکەن، لێیـان خۆش ببێـتو ڕەحمیان پێ بـکات، بۆیـە فەرموویەتـی: ﴿ بَلۡدَةٞ طَيِّبَةٞ وَرَبٌّ غَفُورٞ ﴾ (واتـە: وڵاتێکی پـاکو خۆشو پەروەردگارێکـی لێبوردە).

چـوارەم: بێگومـان خـوا زانی ئـەوان پێویسـتیان پێ دەبـێ لە بازرگانـیو کارو پیشـەیاندا، بـۆ لای ئـەرزی پیرۆز -بـە ڕواڵـەت وادەردەکەوێت شـام بێـت- هۆکارەکارەکانـی بۆیان ئاسـان کـرد، کـە بە ئاسـانی بتوانن پێـی بگەن، لە ئاسـایشو نەترسـان، وە گرێدانی شـارو شـارۆچکەکان بـەو شـارەو شـارەکانی دیکـە، بە جـۆرێ نەبێتـە بارگرانـی بـە هەڵگرتنی بژێـوی ڕێگا.

﴿ وَجَعَلۡنَا بَيۡنَهُمۡ وَبَيۡنَ ٱلۡقُرَى ٱلَّتِي بَٰرَكۡنَا فِيهَا قُرٗى ظَٰهِرَةٗ وَقَدَّرۡنَا فِيهَا ٱلسَّيۡرَۖ ﴾ واتـە: ڕێگایـەک توانایـان هەیـە بیناسـنەوە بە جـۆرێ لێی ون نابـن، ﴿ لَيَالِيَ وَأَيَّامًا ءَامِنِينَ ﴾ واتـە: بـە دڵنیایـیو بێ ترسـەوە تێپەڕ دەبن لەو شـەوو ڕۆژانـەدا بێ ترس، ئەمـەش تەواوی نیعمەتـی خوایـە لەسـەریان کە پاراسـتوونیو ئاسایشـی پێـداون لە ترس.

بـەڵام ئەوان پشـتیان لەو خوایـە کرد کـە نازونیعمەتی پێدابـوون، وە لـە بەندایەتی کردنی، وە لـووت بەرزیـان کـرد بەرانبـەر نیعمەتەکانـی، تەنانـەت هەتـا داوایـان کـردو ئاواتیان خواسـت مـاوەی ڕێگای سـەفەریان دوور بخاتەوە لەو شـارو لادێیانەی کە ڕۆیشـتنیان بۆی ئاسـان کرابـوو ﴿ وَظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ ﴾ بـە بێبڕوایی کردنیان بـە خواو بـە نازونیعمەتەکانی، خوایـش سـزای دان بـە هـۆی ئـەم نیعمەتـەی کـە گومڕای کـردن، بـەو هۆیـەوە لافاوی وێرانـکاری بـۆ نـاردن کـە بەنداوەکەیانـی تێکـداو بـاخو باخـاتو باخچەکانیانـی وێران کـردو لـە ناوبرد.

ئـەو بـاخ‌و بێسـتانە خـۆش‌و سەرسـوورهێنەرانە خـوا بـە هـۆی لافاوەکـەوە گـۆڕی بـە دارودرەختـێ هیچ سـوودێکی نەبێ، لەبـەر ئەمەیە فەرمووبەتـی: ﴿ وَبَدَّلْنَٰهُم بِجَنَّتَيْهِمْ جَنَّتَيْنِ ذَوَاتَىْ أُكُلٍ ﴾ واتـە: (دوو باخـی چاکی بەرووبـووم داری ئەوانمان گـۆڕی بە دوو باخی خراپـی خـاوەن بەرێکـی)، واتـە: شـتێکی کەم لـە خـواردن کە هیـچ سـوودێکی ئەوتۆی بۆیـان نیـە، ﴿ خَمْطٍ وَأَثْلٍ وَشَىْءٍ مِّن سِدْرٍ قَلِيلٍ ﴾ (واتـە: تفـت‌و تـاڵ‌و دارگـەز، وە کەمـێ لـە داری نەبـک) هەمـوو ئەمانـە داری ناسـراون، ئەمـەش بەپێـی کردەوەکانیان.

جـا هـەروەک سوپاسـگوزاری چاکیـان گـۆڕی بـە کوفـری خـراپ‌و ناشـرین، ئـەو نازونیعمەتەیـان بـۆ گۆڕا بەوەی کە باسـکرا، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتی: ﴿ ذَٰلِكَ جَزَيْنَٰهُم بِمَا كَفَرُوا۟ ۖ وَهَلْ نُجَٰزِىٓ إِلَّا ٱلْكَفُورَ ﴾ واتـە: ئایا تۆڵە دەسـێنین بە تۆڵە سـەندنەوەی سـزا جگە لـەو کەسـە نەبـێ بێبڕوایـی کـردوە بە خـواو لـووت بـەرز بـووە بەرانبـەر نیعمەتەکانی؟

جـا کاتـێ ئەوەی تووشـیان بـوو وا تووشـیان بوو، بـەش بەش‌و پـەرش‌و بڵاوبوونـەوە بە وڵاتانـدا، دوای ئـەوەی کـۆک‌و پێکەوە بـوون، خوا ﷻ کردنی بـە داسـتانێ خەڵکی لە ناو خۆیانـدا باسـیان بـکات، وە بکرێـن بە پەندو نمونەیـان پـێ بهێنرێتەوە، پێیـان بوترێ: بەش بـەش بوون وەک خەڵکی (سـبأ) وە هەموو کەسـێ باسـی سەرگوزەشـتەی ئەوانـی دەکرد.

بـەڵام پەنـدو ئامۆژگـاری سـوودی نیـە تیایاندا، تەنهـا ئەوە نەبـێ خـوا فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴾، (بـە ڕاسـتی لـەو بەسـەرهاتەدا چەند نیشـانە هەیە بۆ هەمـوو خۆڕاگـرو شـوکرانە بژێر) خۆڕاگریێ لەسـەر نارەحەتـی‌و ناخۆشـیەکان، لەبەر خوا بەرگەیـان بگـرێ، تـووڕەو خەمبـار نەبـێ بەڵکو ئارامی لەسـەر بگـرێ، شـوکرانە بژێر بێ بـە نیعمەتەکانـی خـوا، وە دانـی پێدابنـێ‌و ستایشـی ئـەو زاتە بکات کـە پێی بەخشـیوە، وە بەکاریبهێنـێ لە گوێڕایەڵـی کردنیدا.

ئەمـە ئەگـەر گوێـی لـە بەسـەرهاتەکەیان بـوو، وە ئـەوەی لەوانـەوە ڕوویدا بەسـەریانەوە هـات، بـەو شـێوەیە دەزانیـن ئـەو سـزایە پاداشـتی بێبڕوایـی کردنیانـە بـە نیعمەتـی خوا، وە هـەر کەسـێک وەکـو ئـەوان بکات بـەو شـێوەی پێدەکـرێ وەک ئـەوان پێیـان کرا، بێگومـان سووپاسـگوزاری خـوا پارێـزەری نازونیعمەتەکانـە، وە پاڵنـەری تۆڵەکردنەوەیە، پێغەمبەرانـی خـوا ڕاسـتگۆن لەو هەواڵانـەی داویانە، وە بێگومان پاداشـت هەقـە، هەروەکو چـۆن نموونەکانـی دونیا لـە ژیانـی دونیادا.

پاشـان باسـی کـردوە کـە بێگومـان گەلـی (سـبأ) لـەو گەلانـەن شـەیتان گومانـی خۆی

لەوانـدا بەدیهێنـا، کاتێ بە پەروەردگـاری وت: ﴿ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغۡوِيَنَّهُمۡ أَجۡمَعِينَ ٨٢ إِلَّا عِبَادَكَ مِنۡهُمُ ٱلۡمُخۡلَصِينَ ٨٣ ﴾ ص، (واتـە: سـوێند بـە عیزەتـت هـەر هەموویان گومـڕا دەکەم * ئەوانەیـان نەبـێ کـە بەنـدی پـاکو هەڵبـژاردەی تـۆن)، ئەمـە گومانێک بوو لـە لایەن ئیبلیسـەوە نـەک دڵنیایی، وە هیـچ هەواڵێکی لەلایەن خـواوە بۆ نەهاتبوو کە ئـەو هەموویان گومـڕا دەکات تەنهـا ئەوانە نەبـێ خوا جیـای کردووەتەوە.

ئەوانـەو هاوشـێوەکانیان لەوانەن گومانەکەی ئیبلیس ڕاسـت دەرچوو لەسـەریان کە بانگیانی کـردو گومـڕای کـردن، ﴿ فَٱتَّبَعُوهُ إِلَّا فَرِيقٗا مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾ (واتە: بۆیە ئیمانـداران نەبێ هەموویـان شـوێنی ئیبلیس کەوتن) لەو کەسـەی کوفـری نەکرد بە نیعمەتی خـوا، بێگومان ئـەوە نەچووەتـە ژێر گومانی ئیبلیسـەوە، وە دەگونجێ بەسـەرهاتی (سـبأ) کۆتایـی پێهاتبێ بەو ئایەتە: ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّكُلِّ صَبَّارٖ شَكُورٖ ﴾.

پاشـان دەسـتی پێکـردووەو فەرموویەتـی: ﴿ وَلَقَدۡ صَدَّقَ عَلَيۡهِمۡ ﴾ واتـە: لەسـەر ڕەگەزی ئادەمیـزاد، ئەوجـا دەقەکـە گشـتگیر دەبێ لـە هەمـوو ئەوانەی شـوێنی شـەیتان کەوتوون.

پاشـان خوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ وَمَا كَانَ لَهُۥ ﴾ واتە: شـەیتان، ﴿ عَلَيۡهِم مِّن سُلۡطَٰنٍ ﴾ واتە: دەسـەڵاتو زاڵ، زۆر لێکردنێک لەسـەر ئـەوەی بیەوێ لە ئیمانـداران، بەڵام حیکمەتی خوا وای خواسـتووە دەسـەڵاتی ئـەوەی هەبێ خەتـەرە بکات بـە نەوەکانی ئادەم.

﴿ إِلَّا لِنَعۡلَمَ مَن يُؤۡمِنُ بِٱلۡأٓخِرَةِ مِمَّنۡ هُوَ مِنۡهَا فِي شَكّٖ ﴾ واتـە: بـۆ ئـەوەی تاقـی بکرێنەوە، ڕاسـتگۆ لـە درۆزنـی پـێ دەربکـەوێ، وە بزانـرێ کـێ ئیمانی ڕاسـتو دروسـتە، لە کاتی تاقـی کردنـەوەدا جێگیرو چەسـپاو دەبێ، وە گومانە شـەیتانیەکان فـڕێ دەدا، لەوەی ئیمانی تـەواو نیـە، بـە کەمترین گومـان دەلـەرزێ، وە بـە کەمترین بانگ کـردن بـۆ پێچەوانەی نامێنـێ، خـوا داینـاوە بـە تاقیکردنەوەیـەک بەندەکانـی پـێ تاقـی بکاتـەوە، وە پیـس لـە پـاک لە یەکتـر جیـا بکاتـەوە، ﴿ وَرَبُّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٍ حَفِيظٞ ﴾ بەنـدەکان دەپارێزێ، وە کردەوەکانیـان دەپارێـزێ، وە پاداشـتیان دەپارێـزێ، بە تـەواوی دەیانداتەوە.

(٢٢-٢٣): ﴿ قُلِ ٱدۡعُواْ ٱلَّذِينَ زَعَمۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَمۡلِكُونَ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا لَهُمۡ فِيهِمَا مِن شِرۡكٖ وَمَا لَهُۥ مِنۡهُم مِّن ظَهِيرٖ ٢٢ وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنۡ أَذِنَ لَهُۥۚ حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمۡ قَالُواْ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمۡۖ قَالُواْ ٱلۡحَقَّۖ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡكَبِيرُ ٢٣ ﴾:

﴿ قُلِ ﴾ واتـە: ئـەی پێغەمبەر ﷺ بەو هاوبەشـدانەرانە بڵـێ: کە لەگەڵ خـوادا هاوەڵیانداناوە

کـە نە سـوودی هەیە نـە زیان، بـێ توانایی‌و پووچـی بەندایەتـی کردنیـان ڕوون بکەرەوە: ﴿ٱدۡعُواْ ٱلَّذِينَ زَعَمۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ واتـە: (هـاوار بکـەن لەوانـەی) پێتان وابوو هاوبەشـی خـوان، ئەگـەر هاوارکردنەکەتـان سـوودی هەیـە، بە ڕاسـتی ئـەوان هەمـوو هۆکارەکانی بێتواناییـان تێـدا کۆبووەتـەوە، وە نەبوونی وەڵامدانـەوەی داواکردن لە هەمـوو ڕوویەکەوە. بێگومـان ئـەوان خاوەنـی کەمتریـن موڵـک نیـن، ﴿لَا يَمۡلِكُونَ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ (واتـە: بـە قـەد هـەرە وردیلەیەکیـان بـە دەسـت نیـە نـە لـە ئاسـمانەکانو نـە لـە زەویـدا) لـە ڕووی سـەربەخۆییەوە، وە نە لـە ڕووی بەشـداربوونەوە، بۆیـە فەرموویەتـی: ﴿وَمَا لَهُمۡ﴾ واتـە: لـەو پەرسـتراوانەی پێتان وایـە ﴿فِيهِمَا﴾ واتە: لـە ئاسـمانەکانو زەوی ﴿مِن شِرۡكٖ﴾ واتـە: نـە هاوبەشـی کـەم نـە هاوبەشـی زۆر، هیچ موڵکێکیـان نیـەو بەشـداریش نیـن لـە هیـچ موڵکێکدا. ئـەوە ماوە بوتـرێ: لەگـەڵ ئەوەدا، هەنـدێ جـار دەبنـە پشـتیوانو یارمەتـی دەری خـوا، وە وەزیـری، جـا داواکـردن لێیـان سـوودی دەبـێ، چونکـە ئـەوان -بـە هـۆی ئـەوەی موڵـک پێویسـتی پێیانە- چارەسـەری پێویسـتیەکانی ئـەو کەسـە دەکەن خـۆی پێیانەوە هەڵدەواسـێت، خـوا ﷻ ئەم پلـەو پایەی ڕەت کردوەتـەوەو فەرموویەتـی: ﴿وَمَا لَهُۥ﴾ واتـە: خـوای بـەرزو تـاکو تەنهـاو زاڵ، ﴿مِنۡهُم﴾ واتـە: لـەو پەرسـتراوانە، ﴿مِّن ظَهِيرٖ﴾ واتـە: یارمەتیدەرو وەزیـرو، هاوکاری بـکات لـە موڵـکو بەڕێوەبردندا.


وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُۥ حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن
قُلُوبِهِمْ قَالُوا۟ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ قَالُوا۟ ٱلْحَقَّ وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ
﴿٢٣﴾ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ قُلِ ٱللَّهُ
وَإِنَّآ أَوْ إِيَّاكُمْ لَعَلَىٰ هُدًى أَوْ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢٤﴾ قُل
لَّا تُسْـَٔلُونَ عَمَّآ أَجْرَمْنَا وَلَا نُسْـَٔلُ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢٥﴾ قُلْ
يَجْمَعُ بَيْنَنَا رَبُّنَا ثُمَّ يَفْتَحُ بَيْنَنَا بِٱلْحَقِّ وَهُوَ ٱلْفَتَّاحُ ٱلْعَلِيمُ
﴿٢٦﴾ قُلْ أَرُونِىَ ٱلَّذِينَ أَلْحَقْتُم بِهِۦ شُرَكَآءَ كَلَّا بَلْ هُوَ ٱللَّهُ
ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٧﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ
بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٨﴾
وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٢٩﴾
قُل لَّكُم مِّيعَادُ يَوْمٍ لَّا تَسْتَـْٔخِرُونَ عَنْهُ سَاعَةً وَلَا تَسْتَقْدِمُونَ
﴿٣٠﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَن نُّؤْمِنَ بِهَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَلَا
بِٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ مَوْقُوفُونَ عِندَ
رَبِّهِمْ يَرْجِعُ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ ٱلْقَوْلَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ
ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ لَوْلَآ أَنتُمْ لَكُنَّا مُؤْمِنِينَ ﴿٣١﴾

هیــچ نەماوەتــەوە جگــە لــە تــکاو شــەفاعەت نەبــێ، ئەویشــی ڕەتکردوەتــەوە بــەوە کــە دەفەرمــوێ: ﴿وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُۥ﴾ (واتــە: وە تــکا کــردن لای خــوا ســوودی نیــە، مەگــەر بــۆ کەســێ خــوا ڕێگــە بــدات)، ئەمــە جۆرەکانــی خــۆ هەڵواســینە، کــە بتپەرســتان خۆیــان هەڵواســی بــە بتەکانیان لــە مــرۆڤو دارو جگــە لەوانــەش، خــوا بڕیــەوەو پووچــیو بەتاڵــی ڕوون کــردوە بــە ڕوونکردنەوەیەکــی یەکلاکــەرەوە، لــە بەشــەکانی هاوبەشــدانان، لــە بنەڕەتــەوە دەریهێنــا.

چونکــە هاوبــەش دانــەر بــۆ ئــەوە هــاوار دەکاتو دەپاڕێتــەوە لــە غەیــری خــوا، ئومێــدی قازانجــی لێبــکات، ئــەم ئومێــد بــوون بــوو بــە هــۆکاری ئــەوەی هاوبــەش دابنێــت، جــا ئەگــەر داوا لــە جگــە لــە خــوا بکات، نــە خاوەنــی ســوودو زیــان بێــت، نــە بەشــدار بێــت لەگــەڵ خــوادا، نــە یارمەتیــدەرو پشــتیوانی بێــت، نەتوانــی شــەفاعەت بــۆ کــەس بــکات بەبــێ مۆڵەتــی خــوا، ئــەم پاڕانــەوەو عیبــادەت کردنــە بــە پێــی عەقڵــی سەرلێشــێواویو پووچــە.

بەڵکــو داواکاری مەبەســتی هاوبەشــدانەر پێچەوانــە دەبێتــەوە، ئــەو مەبەســتی ئــەوە بــوو ســوودی پێبگەیەنــێ، خــوا بەتاڵــیو نەبوونــی ڕوون کــردەوە، وە لــە دەقەکانــی دیکــەدا ڕوونــی کردوەتــەوە کــە زیانــی هەیــە بــۆ ســەر ئەوانــەی دەیپەرســتن، لــە ڕۆژی دواییــدا هەندێکیــان بێبــروا دەبــن بــەوی دیکەیــان، وە هەندێکیــان نەفریــن لــەوی دیکــە دەکــەن، شــوێنو جێگایــان ئاگــرە، ﴿وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُوا۟ لَهُمْ أَعْدَآءً وَكَانُوا۟ بِعِبَادَتِهِمْ كَٰفِرِينَ ﴿٦﴾﴾ الأحقاف، (واتــە: کاتێکیــش خەڵــک کــۆ دەکرێنــەوە لــە قیامــەت، پەرســتراوەکان دەبنــە دوژمنیــان).

سەرســوڕمان لەوەدایــە، کەســی هاوبــەش دانــەر لــووت بــەرزی دەنوێنــی لــە ئاســتی

ملکـچ بـوون بـۆ پێغەمبـەران، پێـی وایـە، ئەوانـە مرۆڤـن، بـەڵام ڕازیـە بپاڕێتـەوەو هـاوار بـکات لـە بـەردو دار، لـووت بـەرزی دەکات لـە دڵسـۆزبوونی بـۆ خـوای بـە بەزەیـی، وە ڕازیـە بـە بەندایەتـی ئـەوەی زیانـی نزیکتـرە لـە سـوودی، گوێڕایەڵـی دوژمنتریـن دوژمنـی دەکات ئەویـش شـەیتانە.

خـوا ﷻ دەفـەرمـوێ: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمْ قَالُواْ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْۖ قَالُواْ ٱلْحَقَّۖ ﴾ (واتـە: هەتـا کاتـێ تـرس‌و بیـم لـە دڵـی تـکاکاران لادەبـرێ، دەڵێـن: پەروەردگارتـان چـی بڕیارێکـی فەرمـوو، دەڵێـن ڕاسـتی فەرمـوو) دەگونجـێ ڕانـاو لێـرەدا بگەڕێتـەوە بـۆ هاوبەشـدانەران، چونکـە ئـەوان باسـکراون لـە قسـەکەدا، یاسـایەکیش هەیـە لـە ڕانـاوەکان، کـە دەگەڕێتـەوە بـۆ نزیکتریـن باسـکراو.

ماناکـە بـەم شـێوەی لـێ دێـت: ئەگـەر ڕۆژی دوایـی هـات تـرس‌و بیـم لـە دڵـی هاوبەشـدانەران لابـرا، وە کاتـێ هەڵیان گێڕایـەوە لای خۆیان پرسـیاریان لێکـرا دەربارەی حاڵیـان لـە دونیـا، وە بـە درۆدانیـان بـە هـەق‌و ڕاسـتی کـە پێغەمبـەران هێنابوویـان، ئـەوان دانـی پێدادەنێـن، ئـەوەی ئـەوان لەسـەری بـوون لـە کوفـرو هاوبەشـدانان بەتاڵ‌و پـووچ بـوو، وە ئەوەیشـی خـوا ﷻ فەرمـووی، وە پێغەمبـەران هەواڵیـان پێـدا ئـەوە هەق‌و ڕاسـتە، بەڵکـو ئـەوەی لـەوەو پێـش دەیـان شـاردەوە دەرکەوتـووە، وە دەزانـن بەڕاسـتی هـەق تەنهـا لـەلای خوایـەو دان بـە تـاوان‌و گوناهەکانیانـدا دەنێـن، ﴿ وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ﴾ بـە زاتـی، لـە سـەرووی هەمـوو بـەدی هێنراوەکانیەتـی زاڵـە بەسـەریاندا، وە بـەرزی‌و ڕێـزی بـەوەی خـاوەن سـیفاتە بـەرزو مەزنەکانـە ﴿ ٱلْكَبِيرُ ﴾ (گەورەیـە) لـە زات‌و سـیفاتەکانیدا، وە لـە بـەرزی ئـەو زاتـە ئەوەیـە حوکـم‌و بڕیارەکانـی بـەرزە، نەفـس‌و دەروونـەکان ملکەچـی دەبـن، تەنانـەت نەفسـی خـۆ بـەزل زانـان‌و هاوبەشـدانەران.

ئـەم مانایـە مانایەکـی ئاشـکراو ڕوون‌و دیـارە، سـیاقی دەقەکـە بەڵگەیـە لەسـەر ئەمـە، وە دەگونجـێ ڕاناوەکـە بگەڕێتـەوە بـۆ فریشـتەکان، بـەو شـێوەی خـوا ﷻ ئەگـەر قسـە بـکات بـە وەحـی فریشـتەکان ببیسـتن ڕادەچڵەکێـن‌و سـوژدە دەبـەن، جـا یەکەمینیـان کـە سـەری بـەرز دەکاتـەوە جبریلـە، خـوا قسـەی لەگـەڵ دەکات بـە وەحـی کردنـی ئـەوەی دەیـەوێ، ئەگـەر ڕاچڵەکیـن لـە دڵـی فریشـتەکاندا نەمـا وە تـرس‌و بیـم ڕۆیـی هەندێکیـان پرسـیار لـە هەندێکـی دیکەیـان دەکـەن دەربـارەی ئـەو قسـەیەی پێـی ڕاچڵەکیـن: پەروەردگارتـان چـی وت؟ هەندێکیـان بـە هەندێکـی دیکەیـان دەڵێـن:

هەقـی فەرمـوو، یـان بـە كورتـی، چونكـە دەزانـن ئـەو هیـچ ناڵـێ جگـە لـە هـەق نەبـێ، یـان دەڵێـن: وای وتو وای وت، بـەو قسـەیەی كـە بیسـتبوویان لێـی، ئەویـش هـەر هەقـە.

جـا بـەم شـێوەیە ماناكـە وای لـێ دێ: ئـەو بتپەرسـتانەی لەگـەڵ خـوادا ئـەو پەرسـتراوانەیان دەپەرسـت كـە بێتوانایـیو ناتەواویمـان بـۆ وەسـف كـردن، وە نەبوونـی سـوودو قازانجیـان لـە هەمـوو ڕووەكان چـۆن پشـتیان كـرد لـە دڵسـۆزی بەندایەتـی كردنـی پەروەردگـاری مـەزن، بـەرزی گـەورە، ئـەو زاتـەی كـە فریشـتە بەڕێـزەكانو ئەوانـەی نزیكـن لـە بەدیهێنـراوەكان لـە كاتـی بیسـتنی قسـەكانیدا تووشـی ڕاچڵەكینو تـرس دەبـن، وە هەموویـان دان بـە خـوادا دەنێـن، كـە ئـەوان هیـچ ناڵێـن جگـە لـە هـەق نەبـێ، دەی دەبـێ دۆخـی ئـەو بتپەرسـتانە چـۆن بـێ كـە لـووت بەرزیـان كـردوە بەرانبـەر ئـەو زاتـەی ئەمـە پلـەو پایـەو مەزنـی موڵـكو دەسـەڵاتەكەی بـێ؟! بـەرزی بـۆ خـوای بـەرزو گـەورە لـە هەمـوو هاوبـەش دانانـی هاوبـەش دانـەران، وە درۆهەڵبەسـتنو درۆكانیـان.

(٢٤-٢٧): ﴿قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۖ قُلِ اللَّهُ ۖ وَإِنَّا أَوْ إِيَّاكُمْ لَعَلَىٰ هُدًى
أَوْ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴿٢٤﴾ قُل لَّا تُسْأَلُونَ عَمَّا أَجْرَمْنَا وَلَا نُسْأَلُ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢٥﴾ قُلْ يَجْمَعُ
بَيْنَنَا رَبُّنَا ثُمَّ يَفْتَحُ بَيْنَنَا بِالْحَقِّ وَهُوَ الْفَتَّاحُ الْعَلِيمُ ﴿٢٦﴾ قُلْ أَرُونِيَ الَّذِينَ أَلْحَقْتُم بِهِ
شُرَكَاءَ ۖ كَلَّا ۚ بَلْ هُوَ اللَّهُ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿٢٧﴾﴾

﴿قُلْ﴾ خـوا ﷻ فەرمـان بـە پێغەمبەرەكـەی موحەممـەد ﷺ دەكات، دەربـارەی ئـەو كەسـەی هـاوەڵ بـۆ خـوا دادەنێـتو بەڵگـە بـۆ خـۆی دەهێنێتـەوە، بڵـێ: ﴿مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ (واتـە: كـێ ڕۆزیتـان دەدات لـە ئاسـمانەكانو زەویـدا)، ئـەوان هـەر دەبـێ دانـی پێـدا بنێـن ئـەوە خوایـە، ئەگـەر دانـی پێـدا نەنێـن ئـەوە ﴿قُلِ اللَّهُ﴾ (بڵـێ خـوا) بێگومـان نابینـی كەسـێ ئـەم قسـەیە ڕەت بكاتـەوە.

جـا ئەگـەر بـۆت دەركـەوت خـوا بـە تـاكو تەنهـا ڕزقو ڕۆزیتـان دەدات لـە ئاسـمانەكانو زەوی، وە بارانتـان بـۆ دەبارێنـێو ڕووەكتـان بـۆ سـەوز دەكاتو ئاوتـان بـۆ هەڵدەقوڵێنـێ لـە زەویـەوە، لـە بەرهەمـی دارو درختەكانتـان بـۆ دەردێنـێ، هەمـوو گیاندارانـی بۆتـان دانـاوە، بـۆ سـوودو ڕزقو ڕۆزیتـان، ئـەی بۆچـی لەگـەڵ ئـەودا شـتێ دەپەرسـتن هیـچ ڕزقو ڕۆزیەكتـان پێنـاداتو هیـچ سـوودێكی بۆتـان نیـە؟

وە خـوا ﷻ کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِنَّآ أَوۡ إِيَّاكُمۡ لَعَلَىٰ هُدًى أَوۡ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴾ واتـە: یەکێـک لـەم دوو دەسـتەیە ئێمـە یـان ئێـوە لەسـەر هیدایەتیـن، لـە سـەرووی ئـەوی ترەوەیـە، یـان لـە گومڕاییەکـی ڕوون دایـە، نووقـم بـووە تیایـدا، ئـەم قسـەیە کەسـێک دەیڵێـت هـەقو ڕاسـتی بـۆ ڕوون بووبێتـەوە، سـوور بێـت لەسـەر ئـەو هەقـەی لەسـەری ڕۆیشـتووە، وە پووچـی ئـەوەی دژەکـەی لەسـەری دەڕوات.

واتـە: بێگومـان شـیمان کـردەوە بـە بەڵگـەی ڕوونو ئاشـکرا، لای ئێمـەو لای ئێـوە، کـە بـە هـۆی ئـەو بەڵگانـەوە دەزانێـت بـە زانسـتێکی دڵنیاکـەرەوەی بـێ گوومـانو دوو دڵـی، کـێ لـە ئێمـە ڕاسـتەو کێـش ناڕاسـتو ناهەقـە، کـێ هیدایـەت دراوەو کـێ گومڕایـە؟ هەتـا وای لێدێـت دیـاری کـردن دوای ئـەوە هیـچ سـوودێکی نابـێ.

تـۆ ئەگـەر لـە نێو کەسـانێک بـی کـە خەڵکـی بانـگ دەکات بـۆ بەندایەتـی بەدیهێنەری هەمـوو دروسـتکراوەکان، بەڕێـوەی دەبـات بـە هەمـوو جـۆرە بەڕێوەبردنـەکان، هەمـوو نیعمەتەکانـی پێـدراوە، ئـەو زاتـەی ڕزقو ڕۆزی داونو هەمـوو نیعمەتەکانـی پێگەیانـدوون، بەربەسـتی هەمـوو نارەحەتیەکانـی کـردوە، ئـەو زاتـەی خـاوەن هەمـوو سـتایشو موڵکێکـە بـە گشـتی، هـەر یەکـە لـە فریشـتەکان لـە خـواری ئەوانـەوە، ملکەچـی شـکۆمەندی ئـەون، زەلیلـن لـە بـەردەم مەزنـی ئـەودا، هەمـوو شـەفاعەت کاران لێـی دەترسـن، هیـچ کەسـێکیان ناتوانـێ شـەفاعەت بـکات تەنهـا بـە مۆڵەتـی ئـەو نەبـێ، بـەرزی گەورەیـە لـە زاتو سـیفەتو کردارەکانـی، ئـەو زاتـە خـاوەن هەمـوو تەواویەکـە، خـاوەن هەمـوو گەورەییەکـە، هەمـوو جوانیەکـە، هەمـوو سـتایشو پیاهەڵدانێکـە، بانـگ دەکات بـۆ نزیـک بوونـەوە لـە کەسـێک ئەمـە پلـەو پایـەی بێـتو بـە دڵسـۆزی کـردەوەی بـۆ بـکات، وە ڕێگـری دەکات لـە بەندایەتـی کردنـی غەیـری ئـەو، وە لـە نێـوان کەسـێکدا نزیـک دەبێتـەوە لـە بـتو پەیکـەرو گـۆڕ، نـە دروسـت دەکات، نـە ڕزقو ڕۆزی دەدات، نـە خاوەنـی نەفسـی خۆیەتـی، نـە ئـەوەی بەندایەتـی بـۆ دەکات، نـە سـوود نـە زیـان نـە مـردن نـە ژیـان نـە زینـدوو کردنـەوە، بەڵکـو ئەوانـە بـێ گیانـن، نـە عەقڵیـان هەیـەو نـە دوعـای ئەوانـە دەبیسـتن لێیـان دەپاڕێنـەوە، ئەگـەر بیشـی بیسـتن ناتوانـن وەڵامیـان بدەنـەوە، وە لـە ڕۆژی دوایـی بێبروایـی بـە هاوڵدانانیـان دەکـەن، خۆیـان لێیـان بـەری دەکـەن، وە نەفریـن لـە یەکتـر دەکـەن، هیـچ بەشـێکیان نیـە لـە موڵـکو دەسـەڵات، بەشـداریش نیـن تیایـدا، هیـچ

شەفاعەتێکیشیان نیە سەربەخۆ بن تیایدا جگە لە خوا، ئەو هاوار لە کەسێ دەکات ئەمە وەسفێتی، هەرچی لە توانایدا بێت خۆی لێی نزیک دەکاتەوە، دژایەتی ئەو کەسە دەکات بە دڵسۆزی خوا دەپەرستێو جەنگی لەگەڵدا دەکات، پێغەمبەرانی خوا بە درۆ دەزانێ ئەوانەی بە دڵسۆزیەوە ڕوویان کردۆتە خوای تاکو تەنها، بۆت ڕوون دەبێتەوە کام لەم دوو دەستەیە هیدایەت دراوە لە گومڕایی، بەدبەختە لە خۆشبەختی، پێویست بەوە ناکات ئەوەت بۆ دەستنیشان بکرێ، چونکە وەسفی حاڵ ڕوونترە لە زمانی قسەکردن.

﴿ قُل ﴾ پێیان بڵێ: ﴿ لَّا تُسْـَٔلُونَ عَمَّآ أَجْرَمْنَا وَلَا نُسْـَٔلُ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴾ واتە: هەر یەکە لە ئێمەو لە ئێوە خۆیو کردەوەی خۆی، ئێوە ﴿ لَّا تُسْـَٔلُونَ ﴾ (پرسیارتان لێناکرێ) لەو تاوانو گوناهانەی ئێمە کردوومانە، ئەگەر کردبێتمان، وە ئێمەش پرسیارمان لێناکرێ دەربارەی کردەوەکانی ئێوە، دەی با مەبەستی ئێمەو ئێوە گەڕان بێ بەدوای ڕاستیەکانو گرتنەبەری ڕێگای ویژدان بێ، وە واز لەوە بێنن ئێمە دەیکەین، وە با نەبێتە بەربەست لە بەردەمتاندا لە شوێنکەوتنی هەقو ڕاستی، چونکە حوکمی دونیا لە سەر ڕواڵەت دەدرێن، هەقیش شوێنیان دەکەوێو بەتاڵو پووچیش دوور دەکەوێتەوە، بەڵام کردەوەکان ئەوە شوێنو ماڵێکی تر هەیە دادپەروەری تێدا دەکەن دادپەروەرترینی دادپەروەران، وە خوا یەکلای دەکاتەوە لە نێوان دژەکاندا کە دادپەروەرترینی دادپەروەرانە.

لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ قُلْ يَجْمَعُ بَيْنَنَا رَبُّنَا ثُمَّ يَفْتَحُ بَيْنَنَا ﴾ واتە: بڕیار لە نێوانماندا دەدات، ڕاستگۆ لە درۆزن دەردەکەوێ، وە ئەو کەسەی شایستەی پاداشتە لەو کەسەی شایستەی سزایە، ئەو زاتە چاکترینی دادپەروەرانە، ﴿ قُلْ ﴾ پێیان بڵێ: ئەی پێغەمبەر، وە ئەو کەسەی لە جێگای تۆیە: ﴿ أَرُونِىَ ٱلَّذِينَ أَلْحَقْتُم بِهِۦ شُرَكَآءَ ﴾ واتە: (ئادەی نیشانم دەن ئەو هاوبەشانەی بردبووتانە ڕیزی خواوە) ئەوان لە کوێن؟ ئایا ڕێگایەک هەیە بۆ ناسینەوەیان؟ ئایا ئەوان لە زەویدان یان لە ئاسمان؟ بێگومان زانای پەنهانو ئاشکرا پێی ڕاگەیاندووین کە لە بوونەوەردا هیچ هاوەڵێکی نیە، ﴿ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِ قُلْ أَتُنَبِّـُٔونَ ٱللَّهَ بِمَا لَا يَعْلَمُ ﴿١٨﴾ ﴾ یونس، (واتە: ئەوانە بێجگە لە خوا شتانێک دەپەرستن کە نە زیانیان پێ دەگەیەنن،

نــە ســوودو قازانــج، وە دەڵێــن: ئــەو بتانــە تکاکارمانــن لای خــوا ئــەی موحەممــەد ﷺ بــە وانــە بڵــێ: ئایــا ئێــوە هــەواڵ دەدەن بــە خــوا بــە شــتێک کــە بــێ ئاگایــە لێــی). ﴿ وَمَا يَتَّبِعُ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُرَكَآءَۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنۡ هُمۡ إِلَّا يَخۡرُصُونَ ٦٦ ﴾یونــس، (واتــە: پەیڕەویــان نەکــردوە ئەوانــەی بێجگــە لــە خــوا دەپەرســتن پەرســتراوانێ هاوبەشــانێ بــۆ خــوا ئەوانــە تەنهــا شــوێن گومــان کەوتــوون، وە ئەوانــە تەنهــا درۆ دەکــەن بــە گومــانو گۆتــرە شــت دەڵێــن).

بــە هەمــان شــێوە دروســتکراوە تایبەتەکانــی لــە پێغەمبــەرانو نێــردراوان هیــچ شــتێک نازانــن دەربــارەی ئــەوەی هاوەڵــی هەبــێ، ئــەی هاوبەشــدانەران نیشــانم بــدەن ئــەو هاوبەشــانەی لــە ڕیــزی خــوادا داتــان نــاون بــە بۆچوونــە بەتــاڵو پووچەکەتــان لەگــەڵ خــوادا، ﴿ شُرَكَآءَ ﴾ (هاوبەشــەکان).

ئــەم پرســیارە توانایــان نیــە وەڵامــی بدەنــەوە، بۆیــە فەرموویەتــی: ﴿ كَلَّا ﴾ واتــە: خــوا نــە هاوبەشــی هەیــەو نــە هاوشــانو نــە دژ ﴿ بَلۡ هُوَ ٱللَّهُ ﴾ (بەڵکــو خــوا زاتێکــە) کــە هیــچ کــەس شایســتەی پەرســتن نیــە غەیــری ئــەو، ﴿ ٱلۡعَزِيزُ ﴾ ئــەو زاتــەی کــە زاڵــە بەســەر هەمــوو شــتێکدا، جگــە لــەو بەزیــوە، ژێربــار خــراوە، ڕامهێنــراوە، ﴿ ٱلۡحَكِيمُ ﴾ ئــەو زاتــەی ووردبینــە لــە دروســتکردنیدا، وە چاکتریــن شــەریعەتی دانــاوە، وە ئەگــەر لــە حیکمــەتو لــە شــەریعەتدا نەبووایــە تەنهــا فەرمــان کــردن بــە یەکتاپەرســتیو خواپەرســتن بــە دڵســۆزی، ئــەوەی خۆشویســتبێو کردبێتــی بــە ڕێگــای ڕزگاربــوون، وە هاوبەشــدانانی قەدەغــە کردبــێ، وە ئــەوەی کردبێتــە ڕێگایــەک بــۆ گومڕایــیو لەناوچــوون، تەنهــا ئــەوە بــەس بــوو بــۆ ســەلماندنی تــەواویو حیکمەتــی خــوا ﷻ جــا چــۆن، وە هەمــوو ئەوانــەی خــوا فەرمانــی پێکــردوەو قەدەغــەی لێکــردوە گشــتگیرن لــە ســەر حیکمــەتو دانایــی؟!

(٢٨-٣٠): ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةٗ لِّلنَّاسِ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗا وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ٢٨ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلۡوَعۡدُ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ٢٩ قُل لَّكُم مِّيعَادُ يَوۡمٖ لَّا تَسۡتَـٔۡخِرُونَ عَنۡهُ سَاعَةٗ وَلَا تَسۡتَقۡدِمُونَ ٣٠ ﴾

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةٗ لِّلنَّاسِ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗا ﴾ خــوا هــەواڵ دەدات ئــەو پێغەمبەرەکــەی نەنــاردووە مەگــەر بــۆ ئــەوە مــژدە بــدا بــە هەمــوو خەڵکــی بــە پاداشــتی خــوا، پێیــان ڕابگەیەنــێ بــەو کردەوانــەی پێویســتن بــۆ پاداشــتی خوایــی، وە بیانترســێنێ

لــە ســزاو تۆڵــەی خــوا، وە هەواڵیــان پــێ بــدا بــەو کردەوانــەی پێویســتن بــۆ ئــەو مەبەســتە، تــۆ هیــچ شــتێکت لــەو کاروبــارەدا نیــە، هەمــوو ئەوانــەی پێشــنیاری دەکــەن بــۆت بەدرۆدانــەرانو نکوڵیــکاران ئــەوە لــە پیشــەی تــۆ نیــە، بەڵکــو بــە دەســتی خــوای بــەرزو مەزنــە.

﴿ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴾ واتــە: زانســتی ڕاســتەقینەیان نیــەو نازانــن، بەڵکــو یــان نەفامــن یــان کەللــەڕەقو ئینــکارن، کار بــە زانســتەکەیان ناکــەن، هەروەکــو ئــەوە وایــە زانســتیان نەبــێ، نەبوونــی زانســتیان بووەتــە مایــەی ئــەوەی کــە وەڵام نەدرێنــەوە لــەو پێشــنیارەی کردوویانــە بــۆ پێغەمبــەر، کــە هــۆکارە بــۆ ڕەتکردنــەوەی بانگەوازەکــەی.

جــا لــەوەی پێشــنیاریان کردبــوو، پەلەکردنیــان بــوو لــە ســزادانیان کــە ئاگاداریانــی کردبــووەوە لێــی، دەفەرمــوێ: ﴿ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلۡوَعۡدُ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴾ (واتــە: وە دەڵێــن: ئــەم بەڵێنــی ڕۆژی دواییــە کــەی دێ ئەگــەر ئێــوە ڕاســتگۆن)، ئەمــە ســتەمێکە لەلایــەن ئەوانــەوە، چ پەیوەندیــەک هەیــە لــە نێــوان ڕاســتگۆیی ئــەو لــە نێوان هەواڵــدان بــە کاتــی ڕوودانــی؟ ئایــا ئەمــە ڕەتکردنــەوەی هــەقو گەمژەیــی نیــە لــە عەقڵــدا؟ ئایــا ئاگــادار کردنــەوە لــە کاروبــاری دونیــادا ئەگەربــێ بــۆ لای گەلێــک ڕاســتگۆیی‌و ئامۆژگــاری بزانــن، وە دوژمنێکیــان هەبــێ چاوەڕێــی هەلێکیــان لێبــکاو لــە ئامادەباشــیدا بــێ بۆیــان، ئــەو پێیــان بڵــێ: وا دوژمنەکەتــان بــەرەو لاتــان دێ دەیــەوێ لــە بنچینــە دەرتــان بێنــێ، ئەگــەر هەندێکیــان بڵێــن: ئەگــەر تــۆ ڕاســتدەکەی پێمــان بڵــێ لــە چ کاتێکــدا دێ؟ وە ئێســتا لــە کوێیــە؟ ئایــا بــەم کەســە دەوتــرێ عاقــڵ یــان پێــی دەوتــرێ گەمــژەو شــێت؟

ئەمــە هەواڵــدەر دەگونجــێ ڕاســت بــکاو درۆ بــکات، وە دوژمــن دەکــرێ کەســێکی دیکــە بــێ، وە دەکــرێ ئەوانیــش بەربەســتێکیان هەبــێ بەرگــری لــە خۆیــان بکــەن، جــا چــۆن کەســێ ڕاســتگۆترین بەدیهێنــراوەکان بــەدرۆ بزانــێ، مەعصــومو پارێــزراوە لــە هەواڵیــدا لــە خۆیــەوە هەرگیــز قســە نــاکات، (هەواڵــی پێبــدا) بــەو ســزایەی دڵنیاکــەرەوە، کــە هیــچ بەربەســتێکی نیــەو هیــچ کــەس نیــە ســەری بخــات؟ ئایــا ڕەتکردنــەوەی هەواڵەکــەی بەبیانــووی نەبوونــی ڕوونکردنــەوە لــە کاتــی ڕوودانیــدا لەوپــەڕی گەمژەیــی نیــە؟!!

﴿ قُلْ ﴾ پێیان بڵێ، وەک هەواڵدانێ بە کاتی ڕوودانی کە هیچ گومانێکی تێدانیە ﴿ لَّكُم مِّيعَادُ يَوْمٍ لَّا تَسْتَـْٔخِرُونَ عَنْهُ سَاعَةً وَلَا تَسْتَقْدِمُونَ ﴾ (واتە: بەڵێنی ئێوە ڕۆژێکە نەساتێک دوادەکەون لێی نەساتێک پێش دەکەون)، دەی خۆتان بپارێزن لەو ڕۆژەو خۆتانی بۆ ئامادە بکەن.

(٣١-٣٣): ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَن نُّؤْمِنَ بِهَـٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَلَا بِٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ ۗ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّـٰلِمُونَ مَوْقُوفُونَ عِندَ رَبِّهِمْ يَرْجِعُ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ ٱلْقَوْلَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ لَوْلَآ أَنتُمْ لَكُنَّا مُؤْمِنِينَ ﴿٣١﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوٓا۟ أَنَحْنُ صَدَدْنَـٰكُمْ عَنِ ٱلْهُدَىٰ بَعْدَ إِذْ جَآءَكُم ۖ بَلْ كُنتُم مُّجْرِمِينَ ﴿٣٢﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ بَلْ مَكْرُ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ إِذْ تَأْمُرُونَنَآ أَن نَّكْفُرَ بِٱللَّهِ وَنَجْعَلَ لَهُۥٓ أَندَادًا ۚ وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ وَجَعَلْنَا ٱلْأَغْلَـٰلَ فِىٓ أَعْنَاقِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾:

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَن نُّؤْمِنَ بِهَـٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَلَا بِٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ ۗ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّـٰلِمُونَ مَوْقُوفُونَ عِندَ رَبِّهِمْ يَرْجِعُ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ ٱلْقَوْلَ ﴾ دیارە کە خوا ﷻ باسی کاتی تایبەتی ئەوانە دەکات کە پەلەیان دەکرد لە سزاداندا، هەر دەبێ تووشی ببن لە کاتی هاتنی خۆیدا، لێرەدا باسی حاڵیان دەکات لەو ڕۆژەدا، تۆ ئەگەر حاڵیان ببینی کاتێ وەستاون لەبەردەم پەروەردگاریان، دەسەڵاتداران و شوێنکەوتووانیان لە کوفرو گومراییدا، هەموویان کۆکراونەتەوە، بەڕاستی کارێکی گەورەو مەترسیدار دەبینی، وە دەبینی چۆن هەندێکیان دەگەڕێنەوە بۆ لای هەندێکی دیکەیان لە قسەکردندا، ﴿ يَقُولُ ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ ﴾ ئەوانیش شوێنکەووتوانن ﴿ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ ﴾ ئەوانیش دەسەڵاتدارانن: ﴿ لَوْلَآ أَنتُمْ لَكُنَّا مُؤْمِنِينَ ﴾ (واتە: ئەگەر ئێوە نەبوونایە بێگومان ئێمە بڕوادار بووین)، بەڵام ئێوە بوون بە بەربەست لە نێوان ئێمەو بڕواهێناندا، کوفرو بێبڕوایتان لەلامان جوانکرد، ئێمەش لەسەر ئەوە شوێنتان کەوتین، مەبەستیان لەو قسەیەدا ئەوەیە کە سزا تەنها بۆ دەستەڵاتداران بێ جگە لە شوێنکەوتووەکان.

قَالَ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا لِلَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا أَنَحْنُ صَدَدْنَاكُمْ
عَنِ الْهُدَىٰ بَعْدَ إِذْ جَاءَكُمْ ۖ بَلْ كُنتُم مُّجْرِمِينَ ٣٢ وَقَالَ الَّذِينَ
اسْتُضْعِفُوا لِلَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا بَلْ مَكْرُ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ إِذْ
تَأْمُرُونَنَا أَن نَّكْفُرَ بِاللَّهِ وَنَجْعَلَ لَهُ أَندَادًا ۚ وَأَسَرُّوا النَّدَامَةَ
لَمَّا رَأَوُا الْعَذَابَ ۚ وَجَعَلْنَا الْأَغْلَالَ فِي أَعْنَاقِ الَّذِينَ كَفَرُوا ۚ
هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ٣٣ وَمَا أَرْسَلْنَا فِي قَرْيَةٍ
مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَا إِنَّا بِمَا أُرْسِلْتُم بِهِ كَافِرُونَ ٣٤
وَقَالُوا نَحْنُ أَكْثَرُ أَمْوَالًا وَأَوْلَادًا وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ٣٥
قُلْ إِنَّ رَبِّي يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاءُ وَيَقْدِرُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ
النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ٣٦ وَمَا أَمْوَالُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُم بِالَّتِي تُقَرِّبُكُمْ
عِندَنَا زُلْفَىٰ إِلَّا مَنْ آمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا فَأُولَٰئِكَ لَهُمْ جَزَاءُ
الضِّعْفِ بِمَا عَمِلُوا وَهُمْ فِي الْغُرُفَاتِ آمِنُونَ ٣٧ وَالَّذِينَ
يَسْعَوْنَ فِي آيَاتِنَا مُعَاجِزِينَ أُولَٰئِكَ فِي الْعَذَابِ مُحْضَرُونَ ٣٨
قُلْ إِنَّ رَبِّي يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَيَقْدِرُ لَهُ ۚ
وَمَا أَنفَقْتُم مِّن شَيْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُ ۖ وَهُوَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ ٣٩

﴿ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ لِلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُوٓاْ ﴾ (واتە: ئەوانەی خۆیان بە گەورە دادەنا بەوانەی ژێر دەستەو لاواز کرابوون دەوت) تێیان دەگەیاندن، وە هەواڵیان پێدەدان کە بەڕاستی هەمووان بەشدارن لە ستەمو تاواندا: ﴿ أَنَحۡنُ صَدَدۡنَٰكُمۡ عَنِ ٱلۡهُدَىٰ بَعۡدَ إِذۡ جَآءَكُم ﴾ واتە: (ئایا ئێمە ڕێگریمان لێکردن لە ڕێنموویی) بەهێزو توانای دەسەڵاتمان؟! ﴿ بَلۡ كُنتُم مُّجۡرِمِينَ ﴾ واتە: (بەڵکو خۆتان تاوانبار بوون) تاوانو گوناهتان هەڵبژارد، ئێوە زۆرتان لێنەکرابوو لەسەری، ئەگەرچی ئێمە لە پێش چاوتان جوانمان کرد، ئێوە هیچ فەزڵو چاکەیەکتان نیە بەسەر ئێمەوە.

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ بَلۡ مَكۡرُ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ إِذۡ تَأۡمُرُونَنَآ أَن نَّكۡفُرَ بِٱللَّهِ وَنَجۡعَلَ لَهُۥٓ أَندَادٗا ﴾ (واتە: ژێر دەستەو چەوساوەکان دەڵێن: بەوانەی خۆبەزلزان بوون بەڵکو پیلانی ئێوە بە شەوو بە ڕۆژ چەواشەی کردین کاتێ فەرمانتان پێدەداین کە بێبڕوابین بە خوا، وە وێنەو هاوبەشی بۆ دابنێین)، واتە: بەڵکو ئەوەی تووشی کارەساتی کردین ئێوە بوون، وە گومڕاییتان گەیشت بە ئێمە، ئێوە بە شەوو بە ڕۆژ چەواشەتان دەکردین بێبڕواییتان لە لا جوان دەکردینو بانگەشەی ئێمەتان بۆی دەکرد، وە دەتانوت: ئەوە ڕاستەو تانەتان لە هەقو ڕاستی دەداو ناشرینتان دەکرد، پێتان وابوو بەتاڵو پووچە، بەردەوام ئێوە فرتو فێڵتان لەگەڵ ئێمەدا کرد، تا گومڕاتان کردینو تووشی فیتنەو بەڵا بووین.

ئەم گفتوگۆو قسەیە لە نێوانیاندا هیچ سوودێکی نیە، تەنها ئەوە نەبێ هەندێکیان خۆیان بەری دەکەن لە هەندێکی دیکەیان بە هۆی ئەو پەشیمانیە گەورە، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ وَأَسَرُّواْ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ﴾ واتە: (هەموویان پەشیمانی دەشارنەوە کاتێ سزای دۆزەخ دەبینن)، ئەو بەڵگە هێنانەوەیان نامێنێ کە هەندێکیان دەیانکرد بە بەڵگە بەسەر هەندێکی دیکەیانەوە، بۆ ئەوەی ڕزگاریان بێ لە سزا، وە دەزانێ ئەو کەسێکی ستەمکارەو شایستەی ئەوەیە، هەر یەکە لەوان پەشیمان دەبێتەوە بەوپەڕی پەشیمان بوونەوە، وە ئاوات دەخوازێ ئەگەر ئەو لەسەر هەق بووایە،

وە وازی لە بەتاڵو پووچ بهێنایە کە گەیاندی بەم سزایە، ئەمە لە نەفسی خۆیاندا دەشارنەوە، چونکە دەترسن لە ڕیسوا بوون، لە داننان بە تاوانی خۆیاندا.

وە لە هەندێ لە هەڵوێستەکانی ڕۆژی قیامەت کاتێ دەخرێنە دۆزەخەوە ئەو پەشیمان بوونەوە بە ئاشکرا دەردەخەن، (وەک خوا دەفەرموێ): ﴿ وَيَوْمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيْهِ يَقُولُ يَـٰلَيْتَنِى ٱتَّخَذْتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلًا ﴿٢٧﴾ يَـٰوَيْلَتَىٰ لَيْتَنِى لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا خَلِيلًا ﴿٢٨﴾ ﴾الفرقان، (واتە: ڕۆژێکە کە ستەمکار قەپ دەکا بە هەردوو دەستی خۆیداو دەڵێ خۆزگە لەگەڵ پێغەمبەردا ڕێگای ڕاستم بگرتایەتە بەر * ئای تیاچوون بۆ من خۆزگە فلان کەسم نەکردایە بە هاوەڵو خۆشەویستی خۆم)، وە فەرموویەتی: ﴿ وَقَالُوا۟ لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِىٓ أَصْحَـٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١٠﴾ فَٱعْتَرَفُوا۟ بِذَنۢبِهِمْ فَسُحْقًا لِّأَصْحَـٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١١﴾ ﴾الملك (واتە: وە دەڵێن: ئەگەر قسەی پێغەمبەرانمان ببیستایە یان تێبگەیشتینایە ئەمڕۆ لە هاوڕێیانی دۆزەخ نەدەبووین * ئیتر پێیان نا لە گوناهەکانیان کەوابوو دووری لە میهرەبانی خوا بۆ هاوڕێیانی دۆزەخ).

﴿ وَجَعَلْنَا ٱلْأَغْلَـٰلَ فِىٓ أَعْنَاقِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ﴾، (واتە: زنجیرو تەوقمان کردە گەردنی بێبڕوایان) تەوق دەکرێن وەک چۆن زیندانی لە زینداندا بە ئیهانەو لۆمەکردنەوە تەوق لە ملی دەکرێ، هەروەکو خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ إِذِ ٱلْأَغْلَـٰلُ فِىٓ أَعْنَـٰقِهِمْ وَٱلسَّلَـٰسِلُ يُسْحَبُونَ ﴿٧١﴾ فِى ٱلْحَمِيمِ ثُمَّ فِى ٱلنَّارِ يُسْجَرُونَ ﴿٧٢﴾ ﴾غافر، (واتە: کاتێ زنجیرو تەوقیان لە گەردندایە پێی ڕادە کێشرێن * لە ناو ئاوی زۆر گەرمدا پاشان لە دۆزەخدا دەسوتێنرێن). ﴿ هَلْ يُجْزَوْنَ ﴾ لەم سزاو تۆڵەیەدا، وە لەو کۆتو بەندە بەهێزانەدا ﴿ إِلَّا مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾ لە کوفرو تاوانو سەرپێچی؟!

(٣٤-٣٨): ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَـٰفِرُونَ ﴿٣٤﴾ وَقَالُوا۟ نَحْنُ أَكْثَرُ أَمْوَٰلًا وَأَوْلَـٰدًا وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿٣٥﴾ قُلْ إِنَّ رَبِّى يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٦﴾ وَمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ أَوْلَـٰدُكُم بِٱلَّتِى تُقَرِّبُكُمْ عِندَنَا زُلْفَىٰٓ إِلَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَـٰلِحًا فَأُو۟لَـٰٓئِكَ لَهُمْ جَزَآءُ ٱلضِّعْفِ بِمَا عَمِلُوا۟ وَهُمْ فِى ٱلْغُرُفَـٰتِ ءَامِنُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلَّذِينَ يَسْعَوْنَ فِىٓ ءَايَـٰتِنَا مُعَـٰجِزِينَ أُو۟لَـٰٓئِكَ فِى ٱلْعَذَابِ مُحْضَرُونَ ﴿٣٨﴾ ﴾:

﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَـٰفِرُونَ ﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدات دەربارەی ئەو ئوممەتانەی پێشوو کە پێغەمبەرانیان بەدرۆ دەزانی حاڵی ئەوانیش هەروەکو حاڵی ئەم بەدرۆدانەرانە وایە کە پێغەمبەرەکەیان موحەممەد بەدرۆ دەزانن، بێگومان خوا ﷻ ئەگەر نێردراوێ بنێرێ بۆ شارێ لە شارەکان، ئەوە دەوڵەمەندو خاوەن نازونیعمەتەکان وا شانازی بەخۆیانەوە دەکەن پێی بێبڕوا دەبن، ﴿ وَقَالُوا۟ نَحْنُ أَكْثَرُ أَمْوَٰلًا وَأَوْلَـٰدًا ﴾ واتە: (ئێمە سامانو

منداڵمان زۆرترە)، لەو کەسانەی شوێنی ڕاستی کەوتوون ﴿وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ﴾ واتە: (ئێمە قەت سزا نادرێین) لە سەرەتا، ئێمە زیندووناکرێینەوە، جا ئەگەر زیندووکراینەوە ئەو کەسەی ماڵو منداڵی پێداوین لە دونیادا، لە دوارۆژدا لەوە زیاترمان پێدەداو سزامان نادات.

خوا ﷻ وەڵامی دانەوە بەوەی فراوانی ڕزقو ڕۆزیو گرتنەوەی بەڵگەنیە لەسەر ئەوەی ئێوە پێتان وایە، چونکە ڕزقو ڕۆزی لە ژێر ویستی خوادایە، ئەگەر بیەوێ فراوانی دەکات بۆ بەندەکەی، وە ئەگەر بیەوێ دەیگرێتەوە.

وە ماڵو منداڵەکان شتانێک نین کە لە خوا نزیکتان بکاتەوە، بەڵکو ئەوەی لەخوا نزیکی دەکاتەوە بڕواهێنانە بە پەیامی پێغەمبەرانو کردەوەی چاکە، کە ئەوە لە پێویستیەکانی ئیمانە، ئەوانە پاداشتی دووبەرانبەریان هەیە لەلای خوا، یەک چاکە بە دە چاکەی هاوشێوەی بۆ حەوت سەد دووبەرانبەر، بۆ چەندین قاتی دیکەی زۆر، کە کەس نایزانێ جگە لەخوا، ﴿وَهُمْ فِي الْغُرُفَاتِ آمِنُونَ﴾ واتە: ئەوان لە کۆشکە بەرزەکانی بەهەشتدا لە ئاسایشو دڵنیاییدان، پارێزراون لە نارەحەتیو ناخۆشیەکان لە جۆرەها نازونیعمەت چێژ وەردەگرن، وە پارێزراون لە دەرکردن تیایداو خەمبار بوونیان. بەڵام ئەوانەی هەوڵی پووچەڵ کردنەوەی نیشانەکانی ئێمە دەدەن لەو ڕووەی کە ئێمە دەستەوسانین، وە پێغەمبەرەکانمان بەدرۆ دەزانن، ﴿أُولَٰئِكَ فِي الْعَذَابِ مُحْضَرُونَ﴾ (ئەوانە لە سزای دۆزەخدا ئامادەکراون).

(٣٩): ﴿قُلْ إِنَّ رَبِّي يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَيَقْدِرُ لَهُ ۚ وَمَا أَنفَقْتُم مِّن شَيْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُ ۖ وَهُوَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ ﴿٣٩﴾﴾

پاشان خوا ﷻ دووبارەی دەکاتەوە کە بێگومان ئەو ﴿يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَيَقْدِرُ لَهُ﴾ (واتە: ڕۆزی هەر کام لە بەندەکانی بیەوێ فراوان یان کەمی دەکات بۆی) بۆ ئەوەی ڕێکی بخات لەسەری ئەوەی کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَنفَقْتُم مِّن شَيْءٍ﴾ (ئێوە هەر شتێک ببەخشن) بەخشینی فەرز، یان سوننەت بە نزیک یان دراوسێ، یان هەژار یان هەتیوو ﴿فَهُوَ﴾ خوای بەرز ﴿يُخْلِفُهُ﴾ (جێگای پڕ دەکاتەوە) وانەزانن کە بەخشین ڕزقو ڕۆزی کەم دەکات، بەڵکو خوا پەیمانی داوە بە جێ پڕکردنەوە بۆ ئەو کەسەی دەبەخشێ، ئەو زاتەی ڕۆزی دەدات بە بەندەکانی بۆ هەر کەسێک کە خۆی بیەوێ، وە کەمی دەکات بۆ هەر کەسێک کە خۆی بیەوێ ﴿وَهُوَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ﴾ (ئەو خوا چاکترینی ڕۆزیدەرانە)، کەوابوو تەنها داوای ڕزقو ڕۆزی لەو بکەن، وە هەوڵبدەن لەو هۆکارانەی فەرمانی پێ کردوون پێی.

وَيَوۡمَ يَحۡشُرُهُمۡ جَمِيعٗا ثُمَّ يَقُولُ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ أَهَٰٓؤُلَآءِ إِيَّاكُمۡ كَانُواْ
يَعۡبُدُونَ ٤٠ قَالُواْ سُبۡحَٰنَكَ أَنتَ وَلِيُّنَا مِن دُونِهِمۖ بَلۡ كَانُواْ
يَعۡبُدُونَ ٱلۡجِنَّۖ أَكۡثَرُهُم بِهِم مُّؤۡمِنُونَ ٤١ فَٱلۡيَوۡمَ لَا يَمۡلِكُ
بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٖ نَّفۡعٗا وَلَا ضَرّٗا وَنَقُولُ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ ذُوقُواْ عَذَابَ
ٱلنَّارِ ٱلَّتِي كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ٤٢ وَإِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٖ
قَالُواْ مَا هَٰذَآ إِلَّا رَجُلٞ يُرِيدُ أَن يَصُدَّكُمۡ عَمَّا كَانَ يَعۡبُدُ ءَابَآؤُكُمۡ
وَقَالُواْ مَا هَٰذَآ إِلَّآ إِفۡكٞ مُّفۡتَرٗىۚ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلۡحَقِّ لَمَّا
جَآءَهُمۡ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّبِينٞ ٤٣ وَمَآ ءَاتَيۡنَٰهُم مِّن كُتُبٖ
يَدۡرُسُونَهَاۖ وَمَآ أَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهِمۡ قَبۡلَكَ مِن نَّذِيرٖ ٤٤ وَكَذَّبَ
ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ وَمَا بَلَغُواْ مِعۡشَارَ مَآ ءَاتَيۡنَٰهُمۡ فَكَذَّبُواْ
رُسُلِيۖ فَكَيۡفَ كَانَ نَكِيرِ ٤٥ ۞ قُلۡ إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍۖ أَن
تَقُومُواْ لِلَّهِ مَثۡنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُواْۚ مَا بِصَاحِبِكُم مِّن
جِنَّةٍۚ إِنۡ هُوَ إِلَّا نَذِيرٞ لَّكُم بَيۡنَ يَدَيۡ عَذَابٖ شَدِيدٖ ٤٦ قُلۡ
مَا سَأَلۡتُكُم مِّنۡ أَجۡرٖ فَهُوَ لَكُمۡۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِۖ وَهُوَ عَلَىٰ
كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٞ ٤٧ قُلۡ إِنَّ رَبِّي يَقۡذِفُ بِٱلۡحَقِّ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ ٤٨

(٤٠-٤٢): ﴿ وَيَوۡمَ يَحۡشُرُهُمۡ جَمِيعٗا ثُمَّ يَقُولُ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ أَهَٰٓؤُلَآءِ إِيَّاكُمۡ كَانُواْ يَعۡبُدُونَ ﴿٤٠﴾ قَالُواْ سُبۡحَٰنَكَ أَنتَ وَلِيُّنَا مِن دُونِهِمۖ بَلۡ كَانُواْ يَعۡبُدُونَ ٱلۡجِنَّۖ أَكۡثَرُهُم بِهِم مُّؤۡمِنُونَ ﴿٤١﴾ فَٱلۡيَوۡمَ لَا يَمۡلِكُ بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٖ نَّفۡعٗا وَلَا ضَرّٗا وَنَقُولُ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّتِي كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿٤٢﴾ ﴾:

﴿ وَيَوۡمَ يَحۡشُرُهُمۡ جَمِيعٗا ﴾ واتـە: (ڕۆژێ خـوا هەموویـان کۆدەکاتـەوە) ئەوانـەی بەندایەتی غەیری خوایان کـردووەو ئەوانەیش لە غەیری خـوا پەرسـتراون، لە فریشـتەکان ﴿ ثُمَّ يَقُولُ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ﴾ (پاشـان) خـوا بـە فریشـتەکان دەفەرمـوێ: بـە شـێوەی سەرزەنشـت کردن لـەو کەسـانەی پەرسـتوویانن: ﴿ أَهَٰٓؤُلَآءِ إِيَّاكُمۡ كَانُواْ يَعۡبُدُونَ ﴾ (واتـە: ئایـا ئەوانـە لـە دونیـا ئێوەیان دەپەرسـت؟) ئەوانیـش خۆیان بـەری دەکـەن لـە بەندایەتـی کردنیـان ﴿ قَالُواْ سُبۡحَٰنَكَ ﴾ واتـە: پاکـیو بێگـەردی بۆ تۆ لـە هاوبـەشو هاوشـان، ﴿ أَنتَ وَلِيُّنَا مِن دُونِهِم ﴾ (تەنیـا تۆ گـەورەی ئێمەی نـەک ئەوان) ئێمـە پێویسـتیمان بـە پشـتیوانی تۆ هەیە) چـۆن بانگی جگـە لە تۆمـان دەکەین بـۆ بەندایەتی کردنمـان، یـان چـۆن دەگونجـێ جگە لـە تۆ کەسـێکی تـر دابنێین بـە پشـتیوانو هاوبەش؟! بەڵام ئـەو هاوبەشـدانەرانە ﴿ كَانُواْ يَعۡبُدُونَ ٱلۡجِنَّ ﴾ واتە: شـەیتانەکان فەرمانیـان پێدەکردن بە بەندایەتـی کردنـی ئێمـە یان جگە لـە ئێمـە، ئەوانیـش گوێڕایەڵیـان دەکردن.

گوێڕایەڵـی کردنیـان بەندایەتـی بـۆ کردنیانە، چونکـە بەندایەتـی گوێڕایەڵیـە، هەروەکو چۆن خـوا ﷻ لەگـەڵ هەمـوو ئەوانـەدا دەدوێ کـە لەگـەڵ ئـەودا هاوبەشـیان دانـاوە، فەرمووویەتی: ﴿ أَلَمۡ أَعۡهَدۡ إِلَيۡكُمۡ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعۡبُدُواْ ٱلشَّيۡطَٰنَۖ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴿٦٠﴾ وَأَنِ ٱعۡبُدُونِيۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ ﴿٦١﴾ ﴾ یس، (واتـە: ئـەی نەوەکانـی ئادەم ئایا وەسـیەتم بـۆ نەکردن کە شـەیتان نەپەرسـتن، چونکـە بەڕاسـتی شـەیتان دوژمنی ئاشـکرای ئێوەیـە، وە ئایا وەسـیەتم بۆ نەکـردن کە من بپەرسـتن ئەمـە ڕێگای ڕاسـتە).

﴿ أَكۡثَرُهُم بِهِم مُّؤۡمِنُونَ ﴾ واتــە: زۆربەیان بــڕوا بە جنۆکەکان دەکــەن، ملکەچیانن، چونکە ئیمــانو بــڕوا بریتیە لە بە ڕاســت دانانێــک گوێڕایەڵی پێویســت بکات.
کاتــێ بــەری دەبــن لێیــان خــوا ﷻ پێیــان دەفەرمــوێ: ﴿ فَٱلۡيَوۡمَ لَا يَمۡلِكُ بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٖ نَّفۡعٗا وَلَا ضَرّٗا ﴾ واتــە: (ئنجــا ئەمــڕۆ ناتوانــن هیچ ســوودو زیانێــک بە یەکتــر بگەیەنــن)، هەموو هــۆکارەکان لــە نێوانیاندا دەپچــڕێ، وە هەندێکیان لــە هەندێکی دیکەیــان دەپچڕێن، ﴿ وَنَقُولُ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ ﴾ (وە بــە ســتەمکاران) ئەوانــەی کوفــرو ســەرپێچیان کــردوە -دوای ئــەوەی دەیانخەینــە ناو ئاگــر- دەڵێین: ﴿ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّتِي كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴾ (واتە: ســزای ئاگری دۆزەخ بچێــژن ئــەوەی ئێــوە بڕواتــان پــێ نەبــوو) ئەمڕۆ بــە چاوی خۆتــان بینیوتــانو چوونە نێویــەوە، لــە پاداشــتی بــەدرۆ دانانەکەتــان، وە ســزایەک بــە بە هــۆی ئــەو بەدرۆدانانەتــان، لە ڕانەکــردن لــە هۆکارەکانی.
(٤٣-٤٥): ﴿ وَإِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٖ قَالُواْ مَا هَٰذَآ إِلَّا رَجُلٞ يُرِيدُ أَن يَصُدَّكُمۡ عَمَّا كَانَ يَعۡبُدُ ءَابَآؤُكُمۡ وَقَالُواْ مَا هَٰذَآ إِلَّآ إِفۡكٞ مُّفۡتَرٗىۚ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلۡحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمۡ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّبِينٞ ﴿٤٣﴾ وَمَآ ءَاتَيۡنَٰهُم مِّن كُتُبٖ يَدۡرُسُونَهَاۖ وَمَآ أَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهِمۡ قَبۡلَكَ مِن نَّذِيرٖ ﴿٤٤﴾ وَكَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ وَمَا بَلَغُواْ مِعۡشَارَ مَآ ءَاتَيۡنَٰهُمۡ فَكَذَّبُواْ رُسُلِيۖ فَكَيۡفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿٤٥﴾ ﴾:
﴿ وَإِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٖ قَالُواْ ﴾ خــوا ﷻ هەواڵ دەدات دەربارەی حاڵەتی هاوبەشــدانەران، کاتێ ئایەتو نیشــانە ڕوونەکانی بەســەریاندا دەخوێنرێتەوە، وە بەڵگە ئاشــکراکانو ســەلمێنراوە یەکلاکــەرەوەکان، کــە بەڵگــەن لەســەر هەمــوو خێــرو چاکەیەکو ڕێگــرن لە هەموو شــەڕو خراپەیــەک، کــە مەزنترین نیعمەتە بۆیــان هاتــووە، وە گەورەترین منەتە پێیان گەیشــتووە، کە لــە بەرانبەردا پێویســت دەکات بــڕوای پێبێننو بەڕاســتی بزاننو ملکەچو تەســلیمی بین، کەچی ئــەوان ڕووبــەڕووی دەبنــەوە بــە پێچەوانــەی ئــەوەی پێویســتە لەســەریان، ئــەوەی پەیامــی بۆ هێنــاون بە درۆی دەزانــنو دەڵێــن: ﴿ مَا هَٰذَآ إِلَّا رَجُلٞ يُرِيدُ أَن يَصُدَّكُمۡ عَمَّا كَانَ يَعۡبُدُ ءَابَآؤُكُمۡ ﴾ واتــە: ئەمــە مەبەســتەکەیەتی، کاتــێ فەرمانتــان پێدەکات بە دڵســۆزی بــۆ خوا، بۆ ئــەوەی واز بهێنــن لــە ڕێگای باوباپیرانتــان، ئەوانەی بە مەزنیــان دادەنێنو بە شــوێن پێیانــدا دەڕۆن، هەقیان ڕەتکــردەوە بە قســەی گومڕایــان، هیچ ســەلماندنێ بە دەســتەوە نەبوو.
ئــەوە چ گومانێکــە ئەگــەر پێغەمبــەران فەرمان بــە هەندێ لە گومــڕاکان بکەن بە شــوێنکەوتنی هەق، بانگەشــەی ئەوە بکەن هێشــتا براکانیان لە ســەر ڕێگای باپیرانیانو بەردەوامن لەســەری؟ ئــەم گێلــیو گەمژەییــە، وە ڕەتکردنەوەی هەق بە قســەکانی گومڕاکان، ئەگەر ســەرنج بدەی لە

ڕەتکردنــەوەی هەمــوو هەقێــک، ئەگەر ئەمــە دەرەنجامی بێت، ئــەوە تەنها قســەی گومراکەران لــە هاوبــەش دانــەرانو بێبڕوایانو فەلســەفە زانــانو خاچپەرســتەکان، وە ئەوانەی گومــڕانو لە دینــی خــوا دەرچوون، ئەوان سەرمەشــقی هەمــوو ئەوانەن هەقو ڕاســتی ڕەتدەکەنــەوە تا ڕۆژی دوایی.

کاتــێ ڕەفتــاری باپیرانیــان بە بەڵگەیــان هێنایەوە، وە کردیانە بەربەســت لە پەیامــی پێغەمبەران، پاشــان دوای ئەمــە تانەیانــدا لــە هــەق، ﴿وَقَالُواْ مَا هَٰذَآ إِلَّآ إِفۡكٞ مُّفۡتَرٗى﴾ واتــە: درۆیەکەو هەڵبەســتووە ئــەوەی ئەم پیــاوە هێناویەتی.

﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلۡحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمۡ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّبِينٞ﴾ واتــە: (بێبڕوایــان بەڕاســتی بــە قورئانیــان دەوت) جادویەکی ئاشــکرایە ڕوون بەلای هەموو کەســێکەوە، چونکــە هەقیان بەدرۆ دەزانــیو دەیــان ڕازاندەوە لــە لای گێلەکان.

کاتــی ڕوونــی کردەوە ئــەوەی هەقیان پــێ ڕەتکــردەوە، بێگومــان ئەوانە کۆمەڵە قســەیەکن لە خــوار پلــەو پایــەی گومانــەوەن، ئیتر چــۆن دەکرێــن بە بەڵگە، باســی کــرد ئــەوان، وە ئەگەر کەســێک بیەوێــت بەڵگەیــان بــۆ بهێنێتــەوە، ئــەوە ئــەوان هیــچ (کتێبێ) شــتێکیان نیە پشــتی پــێ ببەســتن، بۆیــە فەرمــووی: ﴿وَمَآ ءَاتَيۡنَٰهُم مِّن كُتُبٖ يَدۡرُسُونَهَا﴾ (واتــە: پێشــتر چەنــد کتێبێکمــان پێ نەدابــوون کە بیانخوێننــەوە) هەتا ببێتە پشــتوانێک بۆیان، ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهِمۡ قَبۡلَكَ مِن نَّذِيرٖ﴾ (واتــە: وە پێــش تــۆ هیــچ پێغەمبەرێکــی ترســێنەرمان بــۆ نەنــاردوون) هەتا قســەکانیو ڕەفتارەکانــی لەلایــان مابێتــەوە بەو هۆیــەوە پەیامەکەی تــۆ ڕەت بکەنــەوە، ئەوان هیــچ زانســتێکیان نیــە، هەروەها هیچ شــوێنەوارێکی زانســتیش.

پاشــان ترســاندوونی کەچــی بەو ئوممەتــە بــە درۆدانەرانەی پێش ئــەوان کــردوە، فەرموویەتی: ﴿وَكَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ وَمَا بَلَغُواْ﴾ واتــە: (کەســانێ پێش ئەمان (قورەیشــیەکان) بڕوایان بــە پێغەمبــەران نەهێنــا) ئەمانــەی دەدوێنرێــن نەگەیشــتبوونە ﴿مِعۡشَارَ مَآ ءَاتَيۡنَٰهُمۡ﴾ (واتــە: دەیەکــی ئــەوەی بەوانمــان دابــوو)، ﴿فَكَذَّبُواْ﴾ واتە: ئــەو ئوممەتانــەی پێش ئــەوان (بڕوایان نەهێنــا) ﴿رُسُلِيۖ فَكَيۡفَ كَانَ نَكِيرِ﴾ (واتــە: بــە پێغەمبــەران جا چــۆن بوو تۆڵەســەندنی ئێمە لــەوان) ئینکاری مــن لەســەریانو تۆڵەی مــن بۆیان.

بــە ڕاســتی زانیمان چۆن ســزای دان، لەناو ئەوانــدا هەندێکی خنکانــد، وە هەندێکیانــی لەناو برد بــە بایەکــی نــەزۆک، بەدەنــگ، وە بە لەرزین، لــە ڕۆچوون لەنــاو زەویدا، وە بــە ناردنی بەرد لە ئاســمانەوە، دەی ئاگــادار بــن ئــەی بەدرۆدانەران ئەگەر بــەردەوام بن لەســەر بــە درۆدانان ئەوە

ســزاتان دەدات وەک چۆن پێشــووتانی ســزادا، وە تووشــی بەڵاتان بکات وەک پێشــینەکانتانی تــووش کرد.

(٤٦-٥٠): ﴿قُلۡ إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍۖ أَن تَقُومُواْ لِلَّهِ مَثۡنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُواْۚ مَا بِصَاحِبِكُم مِّن جِنَّةٍۚ إِنۡ هُوَ إِلَّا نَذِيرٞ لَّكُم بَيۡنَ يَدَيۡ عَذَابٖ شَدِيدٖ ﴿٤٦﴾ قُلۡ مَا سَأَلۡتُكُم مِّنۡ أَجۡرٖ فَهُوَ لَكُمۡۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٞ ﴿٤٧﴾ قُلۡ إِنَّ رَبِّي يَقۡذِفُ بِٱلۡحَقِّ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ ﴿٤٨﴾ قُلۡ جَآءَ ٱلۡحَقُّ وَمَا يُبۡدِئُ ٱلۡبَٰطِلُ وَمَا يُعِيدُ ﴿٤٩﴾ قُلۡ إِن ضَلَلۡتُ فَإِنَّمَآ أَضِلُّ عَلَىٰ نَفۡسِيۖ وَإِنِ ٱهۡتَدَيۡتُ فَبِمَا يُوحِيٓ إِلَيَّ رَبِّيٓۚ إِنَّهُۥ سَمِيعٞ قَرِيبٞ ﴿٥٠﴾﴾:

﴿قُلۡ﴾ ئـەی پێغەمبـەر! بڵـێ: بـەو بەدرۆدانـەرە نکوڵیکارانـە، ئەوانـەی بەرهەڵسـتی لـە هەق دەکـەنو بـەدرۆی دەزانـن، وە لەکـەدار کردنـی ئـەو پەیامـەی هێناویەتـی: ﴿إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍ﴾ (مـن ئامۆژگاریتـان) بـە یـەک شـت، ئامـاژەی پێدەکـەم بۆتـانو ئامۆژگاریتان دەکـەم لـە گرتنەبەری: ئەویـش ڕێگایەکـی بـە وێژدانانەیە، بانگتـان ناکەم بۆ ئەوەی شـوێنی قسـەی مـن بکـەون، وە بۆ لای ئـەوەی واز لە قسـەی من بهێنن بەبـێ بەڵگەی پێویسـت بۆ ئەو مەبەسـتە، ئەویـش ﴿أَن تَقُومُواْ لِلَّهِ مَثۡنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ﴾ واتـە: هەڵسـن بە هیمـەتو چالاکیەوە، وە مەبەسـتتان شـوێنکەوتنی ڕاسـتی بێو دڵسـۆزبوون بۆ خوا بە کۆو لێکۆڵینەوە لـەوەدا بکەنو سـەرنجی بـدەن، وە بـە تەنیا هەریەکـەو لەگەڵ خۆیـدا بـدوێ دەربارەی ئـەو پەیامە.

جـا ئەگـەر ئێوە دوو دوو، یەک یەک بۆ خوا هەسـتان، بیـرو فکرتان بەکارهێنـاو بە گەورەتان زانـی، وە سـەرنجی بارودۆخـی پێغەمبەرەکەتـان دا: ئایا ئەو شـێتە سـیفاتی شـێتەکانی تێدایە لە قسـەکردنو شـێوازو وەسـفیدا، یان ئـەو پێغەمبەرێکی ڕاسـتگۆیە، ئاگادارتان دەکاتـەوە لەوەی زیانـی هەیـە بۆتانو لـەوەی لە پێشـتانە لە سـزای زۆر تووند؟

ئەگـەر ئـەم ئامۆژگاریەیـان وەرگـرتو بەکاریـان هێنا ئـەوە بۆیـان ڕوون دەبێتـەوە زیاتر لە غەیـری خۆیـان، کـە پێغەمبـەر ﷺ شـێت نیە، چونکـە شـێوازی وەکو شـێوازی شـێتەکان نیە، لـە هەناسـەهەڵبڕینو تێکەڵ کـردنو تێڕوانینیـان، بەڵکو شـێوازی ئەو چاکترینی شـێوازەکانە، وە جوڵەکانـی گەورەتریـن جووڵەیـە، ئـەو تەواوترینـی بەدیهێنراوەکانـە لـە ڕووی ئـەدەبو لەسـەرخۆییو هێمنـیو خـۆ بەکەم زانینـەوە، ئەمەش دەسـت نادات بـۆ عاقڵترین پیـاو نەبێت.

پاشـان ئەگـەر سـەرنجی قسـە پاراوەکانیو قسـە جوانەکانـیو ئەو وشـانەی کە دڵ پـڕ دەکەن لە هێمنیو ئاسـایشو ئیمـانو ئەوانەی دەروونەکان پـاک دەکەنەوە، دڵـەکان پاڵفتە دەکەن، وە بانگ دەکات بۆ ڕەوشـتی بەرزو جوان، وە سەرزەنشـتی خوڕەوشـتی ناشـرینو قیزەون دەکات،

ئەگـەر قسـە بکات چـاو بەلای خۆیـدا ڕادەکێشـێ بە هـۆی هەیبـەتو گەورەیـیو مەزنیەوە، ئایـا ئەمە دەشـوبهێتە ورێنەو قسـەی تێکەڵی شـێتەکان؟!

هەر کەسـێک سـەرنج بـدا لە بارودۆخو مەبەسـتی (موحەممـەد ﷺ)، دەزانێ ئایا ئـەوە پێغەمبەرە یـان نا؟ یەکسـانە ئەگـەر بە تەنها بیر بکاتەوە، یـان لەگەڵ غەیری خۆیدا، بێگومـان دەبێ لەوەی ئـەو پێغەمبـەری خوایـەو نێـردراوی ئەوە بە ڕاسـتی، بـە تایبەت دوێنـراوان کە ئـەو پێغەمبەرە هاوەڵیانـە، سـەرەتاو کۆتایـی بارودۆخـی چـاک دەزانـن، ڕێگریەکـی دیکـە بەدیدەکرێت لە بەرانبـەر نەفسـەکاندا لە شـوێنکەوتنی بانگخواز بۆ لای هـەق، ئەویش ئەوەیە ئەو ماڵو سـامانی خەڵکـی دەبات لە بـری هیدایەت پێدانیان، وە کـرێ وەردەگرێ لەسـەر بانگەوازەکەی، خوا ﷻ پاکـیو بێگـەردی پێغەمبەرەکـەی ڕوون کردۆتەوە لـەو کارەو فەرموویەتی: ﴿ قُلْ مَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ ﴾ واتـە: لەسـەر ئەوەی شـوێنی هەق بکـەون ﴿ فَهُوَ لَكُمْ ﴾ واتە: شـایەتیتان بۆ دەدەم ئـەو پاداشـتە هەر بـۆ خۆتانـە ﴿ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى اللَّهِ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ ﴾ واتە: (پاداشـتی من تەنهـا لەسـەر خوایە، ئـەو خوایە بەسـەر هەموو شـتێکدا ئاگادارە) بە زانسـتی پەی بـەوە دەبات کـە مـن بانگـەوازی بۆ دەکـەم، جا ئەگەر مـن درۆ بکەم ئـەوە سـزام دەداو تۆڵـەم لێدەکاتەوە، وە ئاگادارە بەسـەر کردەوەکانی ئێوەیشـەوە، بۆتان دەپارێزێ پاشـان پاداشـتان دەداتەوە.

کاتـێ بەڵگەو سـەلماندنەکانی لە سـەر ڕاسـتی هەقو بەتاڵـیو پووچی ناڕاسـت ڕوون کردەوە، هەواڵیـدا کـە ئەمـە سـوننەتو نەریتی ئـەوە، بـە ڕاسـتی پەروەردگـار، ﴿ يَقْذِفُ بِالْحَقِّ ﴾ واتە: (هەق دەدا) بەسـەر ناهەقـدا ﴿ بَلْ نَقْذِفُ بِالْحَقِّ عَلَى الْبَاطِلِ فَيَدْمَغُهُ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ وَلَكُمُ الْوَيْلُ مِمَّا تَصِفُونَ ﴿١٨﴾ ﴾ الأنبیـاء. (واتـە: بـەو هۆیـەوە بەتاڵ مێشـکی دەپـژێو تێک دەشـکێ، ئنجا دەسـت بەجـێ بەتـاڵ دەفەوتێو لەناو دەچـێ)، چونکە لەم شـوێنەدا هەقـی ڕوون کردۆتەوە، وە قسـەی بەدرۆدانەرانـی ڕەت کردۆتـەوە، بۆ ئـەوەی ببێتە پەندێـک بۆ ئەوانەی پەنـد وەردەگرن، وە نیشـانەیەک بۆ ئەوانەی سـەرنج دەدەن.

بێگومـان تـۆ بینیت چۆن پـەرشو بڵاو بوویەوە قسـەی بەدرۆدانـەران، وە درۆو عینادیان ڕوون بوویـەوەو هـەقو ڕاسـتیش بـە جوانـی دەرکـەوت، بەتـاڵو پووچیـش لەناوچـوو، ئەویش بە هۆی ئاشـکرا کردنـی، ﴿ عَلَّامُ الْغُيُوبِ ﴾ (زانـای نهێنیو ئاشـکراکان) ئەو زاتەی کـە دەزانێ چـی لـە دڵەکاندایـە لـە خەتـەرەو گومـان، وە دەشـزانێ چـی لـە بەرانبەر ئـەوە دایە بـە بەڵگە بەرهەڵسـتی لێدەکات.

ئەگــەر قســە بکات چــاو بەلای خۆیــدا ڕادەکێشــێ بە هــۆی هەیبــەتو گەورەیــیو مەزنیەوە، ئایــا ئەمە دەشــوبهێتە وڕینەو قســەی تێکەڵی شــێتەکان؟!

هەر کەســێک ســەرنج بــدا لە بارودۆخو مەبەســتی (موحەممــەد ﷺ)، دەزانێ ئایا ئــەوە پێغەمبەرە یــان نا؟ یەکســانە ئەگــەر بە تەنها بیر بکاتەوە، یــان لەگەڵ غەیری خۆیدا، بێگومــان دەبێ لەوەی ئــەو پێغەمبــەری خوایــەو نێــردراوی ئەوە بە ڕاســتی، بــە تایبەت دوێنــراوان کە ئــەو پێغەمبەرە هاوەڵیانــە، ســەرەتاو کۆتایــی بارودۆخــی چــاک دەزانــن، ڕێگریەکــی دیکــە بەدیدەکرێت لە بەرانبــەر نەفســەکاندا لە شــوێنکەوتنی بانگخواز بۆ لای هــەق، ئەویش ئەوەیە ئەوماڵو ســامانی خەڵکــی دەبات لە بــری هیدایەت پێدانیان، وە کــرێ وەردەگرێ لەســەر بانگەوازەکەی، خوا ﷻ پاکــیو بێگــەردی پێغەمبەرەکــەی ڕوون کردۆتەوە لــەو کارەو فەرموویەتی: ﴿ قُلْ مَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ ﴾ واتــە: لەســەر ئەوەی شــوێنی هەق بکــەون ﴿ فَهُوَ لَكُمْ ﴾ واتە: شــایەتیتان بۆ دەدەم ئــەو پاداشــتە هەر بــۆ خۆتانــە ﴿ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى اللَّهِ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ ﴾ واتە: (پاداشــتی من تەنهــا لەســەر خوایە، ئــەو خوایە بەســەر هەموو شــتێکدا ئاگادارە) بە زانســتی پەی بــەوە دەبات کــە مــن بانگــەوازی بۆ دەکــەم، جا ئەگەر مــن درۆ بکەم ئــەوە ســزام دەداو تۆڵــەم لێدەکاتەوە، وە ئاگادارە بەســەر کردەوەکانی ئێوەیشــەوە، بۆتان دەپارێزێ پاشــان پاداشــتان دەداتەوە.

کاتــێ بەڵگەو ســەلماندنەکانی لە ســەر ڕاســتی هەقو بەتاڵــیو پووچی ناڕاســت ڕوون کردەوە، هەواڵیــدا کــە ئەمــە ســوننەتو نەریتی ئــەوە، بــە ڕاســتی پەروەردگــار، ﴿ يَقْذِفُ بِالْحَقِّ ﴾ واتە: (هەق دەدا) بەســەر ناهەقــدا ﴿ بَلْ نَقْذِفُ بِالْحَقِّ عَلَى الْبَاطِلِ فَيَدْمَغُهُ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ وَلَكُمُ الْوَيْلُ مِمَّا تَصِفُونَ ﴿١٨﴾ ﴾ الأنبیاء. (واتــە: بــەو هۆیــەوە بەتاڵ مێشــکی دەپــژێو تێک دەشــکێ، ئنجا دەســت بەجــێ بەتــاڵ دەفەوتێو لەناو دەچــێ)، چونکە لەم شــوێنەدا هەقــی ڕوون کردۆتەوە، وە قســەی بەدرۆدانەرانــی ڕەت کردۆتــەوە، بۆ ئــەوەی ببێتە پەندێــک بۆ ئەوانەی پەنــد وەردەگرن، وە نیشــانەیەک بۆ ئەوانەی ســەرنج دەدەن.

بێگومــان تــۆ بینیت چۆن پــەرشو بڵاو بوویەوە قســەی بەدرۆدانــەران، وە درۆو عینادیان ڕوون بوویــەوەو هــەقو ڕاســتیش بــە جوانــی دەرکــەوت، بەتــاڵو پووچیــش لەناوچــوو، ئەویش بە هۆی ئاشــکرا کردنــی، ﴿ عَلَّامُ الْغُيُوبِ ﴾ (زانــای نهێنیو ئاشــکراکان) ئەو زاتەی کــە دەزانێ چــی لــە دڵەکاندایــە لــە خەتــەرەو گومــان، وە دەشــزانێ چــی لــە بەرانبەر ئــەوە دایە بــە بەڵگە بەرهەڵســتی لێدەکات.

قُلۡ جَآءَ ٱلۡحَقُّ وَمَا يُبۡدِئُ ٱلۡبَٰطِلُ وَمَا يُعِيدُ ﴿٤٩﴾ قُلۡ إِن ضَلَلۡتُ
فَإِنَّمَآ أَضِلُّ عَلَىٰ نَفۡسِيۖ وَإِنِ ٱهۡتَدَيۡتُ فَبِمَا يُوحِيٓ إِلَيَّ رَبِّيٓۚ إِنَّهُۥ
سَمِيعٞ قَرِيبٞ ﴿٥٠﴾ وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ فَزِعُواْ فَلَا فَوۡتَ وَأُخِذُواْ مِن
مَّكَانٖ قَرِيبٖ ﴿٥١﴾ وَقَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِهِۦ وَأَنَّىٰ لَهُمُ ٱلتَّنَاوُشُ مِن
مَّكَانِۭ بَعِيدٖ ﴿٥٢﴾ وَقَدۡ كَفَرُواْ بِهِۦ مِن قَبۡلُۖ وَيَقۡذِفُونَ
بِٱلۡغَيۡبِ مِن مَّكَانِۭ بَعِيدٖ ﴿٥٣﴾ وَحِيلَ بَيۡنَهُمۡ وَبَيۡنَ مَا يَشۡتَهُونَ
كَمَا فُعِلَ بِأَشۡيَاعِهِم مِّن قَبۡلُۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ فِي شَكّٖ مُّرِيبِۭ ﴿٥٤﴾

بەندەكانی فێر دەكاتو بۆیان ڕوون دەكاتەوە، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ قُلۡ جَآءَ ٱلۡحَقُّ ﴾ واتە: (هەقو ڕاستی) دەركەوتو ئاشكرابوو، وەك دەركەوتنی خۆر، وە دەسەڵاتیشی دەركەوت ﴿ وَمَا يُبۡدِئُ ٱلۡبَٰطِلُ وَمَا يُعِيدُ ﴾ (بەتاڵ نەماو دروست نابێتەوەو دووبارە ناگەڕێتەوە) واتە: پەرشو بڵاو بوویەوە، وە فەرمانی پووچ بوویەوەو دەسەڵاتی نەما، جارێكی دیكە نە دروست دەبێتەوەو نە دووبارە دەبێتەوە.

كاتێ هەق دەركەوت بەوەی پێغەمبەر ﷺ بانگەشەی بۆی كرد، ئەوانەی بەدرۆیان دادەنا تۆمەتباریان دەكرد بە گومڕایی، هەواڵی پێدان بەهەقو بۆیانی ڕوون كردەوە، وە بێدەسەڵاتیانی ئاشكرا كرد لە بەرەنگاربوونەوەی، وە هەواڵی پێدان تۆمەتبار كردنیان بە گومڕایی ئەو، هیچ لە هەق كەم ناكاتەوە، وە پاڵنانێت بەو پەیامەی هێناویەتی، جا ئەو ئەگەر گومڕابێ -حاشا لە ئەوە، بەڵام ئەمە لە ڕووی خۆدابەزاندنە لە مشتو مڕ كردن- ئەوە زیانەكەی تەنها بۆ خۆیەتی، واتە: گومڕاییەكەی كورتهەڵهێنراوە لەسەر خۆی تێناپەڕێ بۆ كەسێكی تر. ﴿ وَإِنِ ٱهۡتَدَيۡتُ ﴾ (وە ئەگەر ڕێنماییكار بم) ئەوە لە نەفسو تواناو دەسەڵاتی مندا نیە، بەڵكو هیدایەتم بە هۆی ﴿ يُوحِيٓ إِلَيَّ رَبِّيٓ ﴾ (واتە: ئەو قورئانەوەیە كە پەروەردگارم بۆی ناردووم)، ئەوە بەشی هیدایەتی منە، هەروەك بەشی هیدایەتی جگە لە منیشە، بەڕاستی پەروەردگارم ﴿ سَمِيعٞ ﴾ (بیسەری) هەموو قسەو دەنگەكانە بە گشتی ﴿ قَرِيبٞ ﴾ (نزیكە) لەو كەسەی داوای لێدەكاتو دەیپەرستێ.

(٥١-٥٤): ﴿ وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ فَزِعُواْ فَلَا فَوۡتَ وَأُخِذُواْ مِن مَّكَانٖ قَرِيبٖ ﴿٥١﴾ وَقَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِهِۦ وَأَنَّىٰ لَهُمُ
ٱلتَّنَاوُشُ مِن مَّكَانِۭ بَعِيدٖ ﴿٥٢﴾ وَقَدۡ كَفَرُواْ بِهِۦ مِن قَبۡلُۖ وَيَقۡذِفُونَ بِٱلۡغَيۡبِ مِن مَّكَانِۭ بَعِيدٖ
﴿٥٣﴾ وَحِيلَ بَيۡنَهُمۡ وَبَيۡنَ مَا يَشۡتَهُونَ كَمَا فُعِلَ بِأَشۡيَاعِهِم مِّن قَبۡلُۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ فِي شَكّٖ مُّرِيبِۭ ﴿٥٤﴾ ﴾:

خـوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ تَرَىٰٓ ﴾ (ئەگـەر دەبینی) ئەی پێغەمبەر ﷺ، ئەوەیشـی لە جێگای تۆیـە، حاڵـی ئـەو بـە درۆدانەرانـە ﴿ إِذْ فَزِعُوا۟ ﴾ (زۆر دەترسـن) کاتـێ سـزایان بینی، وە ئـەوەی پێغەمبـەران هەواڵیان پێداون، ئەوەشـی بە درۆیـان زانی، کارێکی ترسـێنەرو دژوارو دیمەنێکـی سـامناک دەبینـی، وە حاڵەتێکـی نکووڵـی کراوو ناخۆشـیەکی توونـد، ئەویش کاتێکـە سـزایان لەسـەر پێویسـت دەبـێ، هیـچ بـواری هەڵهاتـن‌و ڕزگاربوونیـان نامێنـێ ﴿ وَأُخِذُوا۟ مِن مَّكَانٍ قَرِيبٍ ﴾ واتـە: دوور نیـە لـە جێگای دۆزەخـەوە، بەڵکو دەبرێن پاشـان فـڕێ دەدرێنـە نـاو دۆزەخ، ﴿ وَقَالُوٓا۟ ﴾ لەو حاڵەتـەدا (وتیـان): ﴿ ءَامَنَّا ﴾ (بڕوامان) بە خـوا هێنـاو بە ڕاسـتمان دانـا ئەوەی بـە درۆمـان دەزانـی ﴿ وَأَنَّىٰ لَهُمُ ٱلتَّنَاوُشُ ﴾ (چۆن) باوەڕیـان دەسـت دەکەوێـت ﴿ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ ﴾ (واتـە: لـە شـوێنی دوورەوە) بێگومان بەربەسـت خراوەتـە نێـوان ئـەوان‌و ئـەو، لەو کاتـەدا دەبێتـە یەکێک لـە شـتە مەحاڵەکان، جـا ئەگـەر ئـەوان بڕوایـان بهێنایـە لە کاتـی خۆیدا، ئـەوە ئیمانەکەیـان وەرگیـراو دەبوو، بـەڵام ئـەوان ﴿ كَفَرُوا۟ بِهِۦ مِن قَبْلُ وَيَقْذِفُونَ ﴾ واتـە: دەیانهاویشـت ﴿ بِٱلْغَيْبِ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ ﴾ بـە قسـە پووچەکانیـان لـە دوورەوە، بۆ ئـەوەی هەقی پێ لەنـاو ببەن، بەڵام هیـچ ڕێگایـەک نیـە بـۆ ئـەوە، وە چـۆن هیـچ ڕێگایەک نیـە بۆ هاویشـتنی شـتیکی زۆر دوور بـە مەبەسـتی پێکان، ناهەقیش هەر بەو شـێوەیە، ئەسـتەمە سـەربکەوێ بەسـەر هەقدا، یـان بەرهەڵسـتی بکات، بەڵکـو کاتێ پەلامـار دەدات هەق لـە بێناگاییدا بێـت، ئەگەر هەق دەربکـەوێ‌و ناهـەق بەرگـری بـکات، ئـەوە ناهەق لە نـاو دەبات.

﴿ وَحِيلَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ مَا يَشْتَهُونَ ﴾ (واتـە: بەربەسـت دەخرێتـە نێـوان ئـەوان‌و ئـەوەی ئـارەزووی دەکـەن) لـە ئـارەزووەکان‌و لـەزەت‌و مـاڵ‌و سـامان‌و منـداڵ‌و خزمەتـکارو سـەربازەکان، تـاک‌و تەنهـا بـە کردەوەکانیانـەوە، بـە تەنهـا دێـن وەک دروسـتکران، وە هەمـوو دەسـەڵاتەکانیان جـێ دەهێڵـن.

﴿ كَمَا فُعِلَ بِأَشْيَاعِهِم ﴾ (واتـە: هەروەکـو بـە هاوشـێوەکانیان کـرا) لـە ئۆممەتـە پێشـینەکان، کاتێـک لەناوچوونیـان بـۆ هـات، بەربەسـت دەخرێتە نێـوان ئـەوان‌و ئەوەی ئـارەزووی دەکـەن، ﴿ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ فِى شَكٍّ مُّرِيبٍۭ ﴾ واتـە: لە گومان‌و دوو دڵیـدان، لەبەر ئەوە بڕوایـان نەهێنـا، کاتـێ داوای لێبـوردن دەکـەن لێیـان نابوورێ.

تەفسیری سووڕەتی (سبأ) تەواو بوو.


سورة فاطر
بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ جَاعِلِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا أُو۟لِىٓ
أَجْنِحَةٍ مَّثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ يَزِيدُ فِى ٱلْخَلْقِ مَا يَشَآءُ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ
كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ١ مَّا يَفْتَحِ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحْمَةٍ فَلَا مُمْسِكَ لَهَا
وَمَا يُمْسِكْ فَلَا مُرْسِلَ لَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ٢
يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ هَلْ مِنْ خَٰلِقٍ غَيْرُ ٱللَّهِ
يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ٣

## تەفسیری سووڕەتی (فاطر)

## مەككیە (٤٥) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٢): ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ جَاعِلِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا أُو۟لِىٓ أَجْنِحَةٍ مَّثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ يَزِيدُ فِى ٱلْخَلْقِ مَا يَشَآءُ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١﴾ مَّا يَفْتَحِ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحْمَةٍ فَلَا مُمْسِكَ لَهَا ۖ وَمَا يُمْسِكْ فَلَا مُرْسِلَ لَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢﴾ ﴾:

﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾

خوا ﷻ ستایشی نەفسی پاكو بێگەردی خۆی دەكات لە سەر دروستكردنی ئاسمانەكانو زەوی، ئەوەشی لەناو ئاسمانەكانو زەویدایە لە دروستكراوەكان، چونكە ئەوە بەڵگەیە لەسەر تەواوی دەسەڵاتی خواو فراوانی موڵكیو گشتگیری ڕەحمەتیو داهێنانی حیكمەتیو دەوردانی زانستی، كاتێ خوا ﷻ باسی دروستكردنی كرد، دوای ئەوە باسی ئەو شتەی كرد كە فەرمان لەخۆدەگرێ، ئەویش واتە: ﴿ جَاعِلِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا ﴾ (فریشتەكانی كردوە بە نێردراوانێك) لە بەڕێوەبردنی كاروبارە قەدەریەكاندا، وە نێوەندێك لە نێوان ئەوو دروستكراوەكانی بۆ گەیاندنی فەرمانە ئاینیەكانی، بێگومان فریشتەكانی كردوە بە نێردراو، هیچ یەكێكی لەوان جیانەكردۆتەوە، ئەمە بەڵگەیە لەسەر تەواوی گوێڕایەڵیان بۆ پەروەردگاریان، وە ملكەچبوونی فەرمانەكانی، هەروەك فەرموویەتی: ﴿ لَّا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴿٦﴾ ﴾التحريم (واتە: نا فەرمانی خوا ناكەن لەوەی فەرمانیان پێ بدات، وە هەر چ فەرمانێكیان پێ بدرێ دەیكەن).

كاتێ فریشتەكان بەڕێوەبراون -بە ئیزنی خوا- خوا نەیانی كردوە بە جێنشینی خۆی، باسی هێزو توانایانی كردوە لەسەر ئەو كارە، وە تیژڕەوی ڕێكردنیان لەوەی كردوونی، ﴿ أُو۟لِىٓ أَجْنِحَةٍ ﴾ (خاوەنی چەند جۆر) باڵن پێی دەفڕن، ئەو فەرمانەی پێیان سپێردراوە بەپەلە جێبەجێی دەكەن ﴿ مَّثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ ﴾ واتە: تیایاندایە دوو باڵی هەیە، وە سێ باڵ، وە چوار باڵ، بە پێی داخوازی

حیكمەتی خۆی ﴿ يَزِيدُ فِي الْخَلْقِ مَا يَشَاءُ ﴾ واتە: هەندێ دروست كراوەكانی زیاد دەكات بەسەر هەندێكی دیكەدا، لە سیفاتی دروستكردنیاندا، وە لە هێزو جوانی، لە زیادبوونی ئەندامەكانیانو دەنگ خۆشیو ئاوازە خۆشەكان ﴿ إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾ توانای خوا بەو شێوەیە كە خۆی ئارەزووی دەكات، هیچ شتێكی لێ یاخی نابێ، لەوانەش: زیادەی بەدیهێنراوەكانی هەندێكیان بەسەر هەندێكی دیكەوە.

پاشان خوا ﷻ باسی تاكو تەنهایی خۆی كردوە لە بەڕێوەبردنو بەخشینو گرتنەوەدا، جا فەرموویەتی: ﴿ مَا يَفْتَحِ اللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحْمَةٍ فَلَا مُمْسِكَ لَهَا ۖ وَمَا يُمْسِكْ ﴾ واتە: (هەر كاتێ خوا دەروازەی ڕەحمەتی خۆی لە خەڵكی بكاتەوە هیچ كەس ناتوانێ بەری بگرێ هەر كاتێكیش دەروازەی ڕەحمەتی بگرێتەوە) لێیان، ﴿ فَلَا مُرْسِلَ لَهُ مِن بَعْدِهِ ﴾ (واتە: كەس ناتوانێت لە دوای گرتنەوەكەی خوا بێجگە لە خوا بیكاتەوە)، ئەمە پەیوەست كردن بە خوا پێویست دەكات، وە خۆ بەكەم زانینو پێویست بوون بە خوا لە هەموو ڕووەكانەوە، وە بانگی كەس نەكات جگە لەو نەبێت، وە لە كەس نەترسێو ئومێد نەكات، تەنها بە ئەو نەبێت، ﴿ وَهُوَ الْعَزِيزُ ﴾ ئەو زاتەی زاڵە بەسەر هەموو شتەكاندا ﴿ الْحَكِيمُ ﴾ ئەو زاتەی هەموو شتەكان لە جێگای خۆیان دادەنێ بە پێی پلەو پایەكانیان.

(٣-٤): ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ ۚ هَلْ مِنْ خَالِقٍ غَيْرُ اللَّهِ يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاءِ
وَالْأَرْضِ ۚ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ (٣) وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ ۚ وَإِلَى اللَّهِ
تُرْجَعُ الْأُمُورُ (٤) ﴾:

﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ ﴾ خوا ﷻ فەرمان بە خەڵكی دەكات سوپاسی نیعمەتەكانی بكەن لەسەریان، ئەمەش گشتگیرە بە دان پێدانان بە دڵو ستایشكردن بە زمانو ملكەچبوون بە جەستە، بێگومان باسكردنی نیعمەتەكانی خوا پاڵنەرێكە بۆ سوپاسگوزاری، پاشان هەواڵی پێداون لەسەر بنچینەی نیعمەتەكانی، ئەویش: دروستكردنو ڕزقو ڕۆزیە، جا فەرموویەتی: ﴿ هَلْ مِنْ خَالِقٍ غَيْرُ اللَّهِ يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ ﴾، (واتە: ئایا بێجگە لە خوا دروستكەرێكی تر هەیە كە ڕۆزیتان بدات لە ئاسمانو زەویدا).

بێگومان كاتێ زانراوە هیچ یەكێك لە بەدیهێنراوەكان نیە بە دروستكردنو ڕۆزیدان جگە لە خوا نەبێ، ئەوەی لێ بەرهەم دێ كە بەڵگەیە لەسەر یەكتاپەرستیو بەندایەتی خوا، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴾ واتە: ڕوو وەردەگێڕن لە بەندایەتی كردنی بەدیهێنەری ڕۆزیدەر بۆ بەندایەتی كردنی بەدیهێنراوی ڕۆزی پێدراو؟!

وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ
(٤) يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا
وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ (٥) إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ
عَدُوًّا إِنَّمَا يَدْعُوا۟ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُوا۟ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ (٦) ٱلَّذِينَ
كَفَرُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُم
مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ (٧) أَفَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ فَرَءَاهُ حَسَنًا فَإِنَّ
ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ
حَسَرَٰتٍ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا يَصْنَعُونَ (٨) وَٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ
ٱلرِّيَٰحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَسُقْنَٰهُ إِلَىٰ بَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَحْيَيْنَا بِهِ ٱلْأَرْضَ
بَعْدَ مَوْتِهَا كَذَٰلِكَ ٱلنُّشُورُ (٩) مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعِزَّةَ فَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ جَمِيعًا
إِلَيْهِ يَصْعَدُ ٱلْكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلْعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرْفَعُهُۥ وَٱلَّذِينَ
يَمْكُرُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَكْرُ أُو۟لَٰٓئِكَ هُوَ يَبُورُ
(١٠) وَٱللَّهُ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ جَعَلَكُمْ أَزْوَٰجًا
وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلْمِهِۦ وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٍ
وَلَا يُنقَصُ مِنْ عُمُرِهِۦٓ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ (١١)

﴿ وَإِن يُكَذِّبُوكَ ﴾ (ئەگـەر بڕوایـان پـێ نەهێنایـت) ئـەی پێغەمبـەر ﷺ ئـەوە تـۆ سەرمەشـقت بـۆ هەیـە بەوانـەی لەپێـش خۆتـن لـە نێـردراوان ﴿ فَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ ﴾ (واتـە: بـە ڕاسـتی پێغەمبەرانی پێـش تـۆش بڕوایـان پـێ نەهێنـرا) بەدرۆ دانـەران لەنـاو بـران، خـوا پێغەمبـەرانو شـوێنکەوتووانیانی ڕزگار کرد، ﴿ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴾ (واتـە: هەمـوو کاروبارەکان تەنهـا بـۆ لای خـوا دەگەڕێنـەوە).

(٥-٧): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴿٥﴾ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّا إِنَّمَا يَدْعُوا۟ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُوا۟ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٦﴾ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ ﴿٧﴾ ﴾:

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ ﴾(ئـەی خەڵکینـە! بێگومـان بەڵێنـی خوا) بـە زینـدوو کردنـەوەو پاداشـت دانـەوەی کـردەوەکان ﴿ حَقٌّ ﴾ واتـە: هیـچ گومـانو دوودڵیەکـی تێدانیـە، بەڵگە بیسـتراوەکانو سـەلماندنە عەقڵیـەکان ئاماژەن لەسـەر ئەوە، جا ئەگـەر پەیمانـی خوا ڕاسـت بـێ کەواتـە خۆتانی بـۆ ئامـادە بکـەنو کاتـە پیرۆزەکانتان بەکاربهێنـن لە کـردەوەی چاکدا، با هیچ شـتێک نەبێتـە ڕێگـر لەبەردەمیدا، ﴿ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ﴾ (واتـە: دەی کەواتـە بـا ژیانـی دونیـا فریوتـان نـەدات)، بـە لەزەتەکانو ئـارەزووەکانو داواکاریەکانـی نەفـسو دەروون تـا بێئاگاتـان بـکات لـەوەی لـە پێناویدا دروسـتکراون ﴿ وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴾ (بـا بـە بەزەیـیو لێبـوردەی خـوا فریوتـان نـەدات) کـە بریتیـە لە: ﴿ ٱلشَّيْطَٰنَ ﴾ ئـەو شـەیتانەی لـە ڕاسـتیدا دەوژمنتانە ﴿ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ﴾ واتـە: بـا دوژمنایەتـی ئێـوە بـۆ شـەیتان لەسـەر بـە ئاگایی بێ، لـە هیـچ کاتێکدا بـێ ئاگـا مەبـن لـە دوژمنایەتی شـەیتان، چونکە ئەو دەتـان بینێو ئێـوە ئەو نابینـن، وە ئەو بـەردەوام لـە بۆسـەدایە بۆتان.

﴿ إِنَّمَا يَدْعُواْ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُواْ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴾ (واتـە: بێگومان شـەیتان تاقمو کۆمەڵەکەی بانـگ دەکات بـۆ ئـەوەی ببنـە هاوەڵانـی ئاگـری هەڵگیرسـاو) ئەمـە ئامانجو مەبەسـتێتی لەوانـەی شـوێنی کەوتـوون، ئەویـش ئەوەیە ئەوپـەڕی ئیهانـە بکرێن بە سـزای تووند.
پاشـان باسـی کردوە خەڵکی دابـەش دەبن بەپێـی گوێڕایەڵی شـەیتانو گوێڕایەڵی نەکردنی بـۆ دوو بەش، وە باسـی پاداشـتی هەریەکەیانی کردوە، جـا فەرموویەتی: ﴿ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾ واتـە: ئینـکاریو نکوولّیـان کرد لـەوەی پێغەمبـەران هێناویانـە، وە کتێبەکان ئامـاژەی پێ دەکـەن ﴿ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ﴾ لەنـاو ئاگـری دۆزەخـدا، ئـەو ئاگـرە لـە زاتو وەسـفیدا توونده، ئـەوان بۆ هەمیشـەیی تیایـدا دەمێننەوە.
﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ بـە دڵەکانیان، بـەوەی خوا بانگی کردوە بـۆ بڕواهێنان پێی ﴿ وَعَمِلُواْ ﴾ (وە کردەوەیـان ئەنجامـداوە) بـە پێی داخوازی ئـەو ئیمانە، بە ئەندامانی جەسـتەیان، کردەوە ﴿ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ ﴾ لێبـووردن بـۆ گوناهەکانی ئەوان هەیە، شـەڕو ناڕەحەتی لەسـەریان لادەبرێ ﴿ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ ﴾ داواکاریەکەیان دەسـتەبەر دەبێ.
(٨): ﴿ أَفَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ فَرَءَاهُ حَسَنًا ۖ فَإِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ ۖ فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَٰتٍ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٨﴾ ﴾:
خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ أَفَمَن زُيِّنَ لَهُۥ ﴾ (ئایا کەسـێ بـۆی جوان کراوە) کـردەوە خراپو ناشـرینەکانی، شـەیتان بـۆی ڕازاندۆتەوەو لـە پێش چاوی جوانی کـردوە ﴿ فَرَءَاهُ حَسَنًا ﴾ واتـە: (بـە چـاکو جـوان دەیبینـێ) وەکـو چۆن کەسـێ خـوا هیدایەتـی دابێ بـۆ ڕێگای ڕاسـتو ئاینـی پتەو، ئایـا ئەمەو ئەوە یەکسـانن؟
یەکەم: کردەوەی خراپی کردوە، حەقی بە ناحەق داناوەو ناحەقیشی بە حەق داناوە.
دووەم: کردەوەی چاکی کردوە، حەقی بە حەق بینیوە، ناحەقیش بە ناحەق.
بەڵام هیدایەتو گومڕایی لە دەستی خوادایە ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ ﴾ واتە: (بەڕاستی خوا هەر کەسێکی بوێ گومڕای دەکات وە هەر کەسێکی بوێ ڕێنمایی دەکات دەی کەواتە بە خەفەت خواردن) لەسەر گومڕاکان ئەوانەی کردەوە خراپەکانیان لە پێش چاو جوانکراوە، وە شەیتان بەرهەڵستی لێکردوون لە گرتنەبەری ڕێگای حەق ﴿ حَسَرَٰتٍ ﴾ (خۆت مەفەوتێنە) تۆ هیچت لەسەر نیە تەنها گەیاندن نەبێ، وە لەسەرتۆ نیە هیدایەتی ئەوان، خوا ﷻ خۆی پاداشتیان دەداتەوە بە پێی کردەوەکانیان ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴾ (واتە: بەڕاستی خوا بەوەی ئەوان دەیکەن ئاگادارە).

(٩): ﴿ وَٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَرۡسَلَ ٱلرِّيَٰحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَسُقۡنَٰهُ إِلَىٰ بَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَحۡيَيۡنَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَاۚ كَذَٰلِكَ ٱلنُّشُورُ ﴿٩﴾ ﴾:

﴿ وَٱللَّهُ ﴾ خــوا ﷻ هــەواڵ دەدات دەربــارەی تــەواوی توانــاو دەســەڵاتو بەرفراوانــیو بەخشــندەیی، بێگومــان ئــەو ﴿ ٱلَّذِىٓ أَرۡسَلَ ٱلرِّيَٰحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَسُقۡنَٰهُ إِلَىٰ بَلَدٍ مَّيِّتٍ ﴾ خــوای گــەورە دایدەبەزێنــێ بەســەریدا ﴿ فَأَحۡيَيۡنَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَا ﴾ (واتــە: زەوی پــێ زیندوو دەكەینــەوە لــە پــاش وشــك بــوونو مردنــی، وڵاتو بەندەكانی پێ ئــاوەدان دەبنــەوە، وە ئاژەڵەكانــی پێــی دەگەشــێنەوەو لەناو ئەو نــازو نیعمەتانــەدا چێــژ وەردەگرن، ﴿ كَذَٰلِكَ ﴾ ئــەو زاتــەی زەوی زینــدو كردوەتــەوە دوای مردنی، مــردووەكان دەردێنی لــە گۆڕەكانیان، پــاش پارە پــارە بوونیان، بارانیان بەســەردا دەبارێنــێ، وەك چۆن باراندویەتی بەســەر زەوی مــردوودا، بــۆی دابەزاندوون، جەســتەو ڕووحەكانی پێ زینــدوو دەكاتەوە لەنــاو گۆڕەكان، وە دێــن بــۆ ئامادەبوونیــان لەبــەردەم خوادا بۆ ئــەوەی بڕیــار بدات لــە نێوانیاندا بــە بڕیاری دادپــەروەری خۆی.

(١٠): ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡعِزَّةَ فَلِلَّهِ ٱلۡعِزَّةُ جَمِيعًاۚ إِلَيۡهِ يَصۡعَدُ ٱلۡكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلۡعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرۡفَعُهُۥۚ وَٱلَّذِينَ يَمۡكُرُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٞۖ وَمَكۡرُ أُوْلَٰٓئِكَ هُوَ يَبُورُ ﴿١٠﴾ ﴾:

﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡعِزَّةَ فَلِلَّهِ ٱلۡعِزَّةُ جَمِيعًا ﴾ واتە: ئەی ئەو كەســەی عیزەتو ســەربەرزیت دەوێ داوای بكــە لــەو كەســەی بــە دەســتیەتی، بێگومــان عیزەت بــە دەســتی خوایە، بەدەســتیش نایــەت بــە گوێڕایەڵــی كردنــی خوا نەبــێ، بێگومان باســی كــردوە كــە دەفەرموێ: ﴿ إِلَيۡهِ يَصۡعَدُ ٱلۡكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ ﴾ (واتــە: وتــەی پــاكو چــاك تەنها بۆ لای خــوا ســەردەكەوێ) لە خوێندنــی قورئــانو یادكردنــەوەو ســتایش كردنو بــە گەورە دانــان، وە هەموو قســەیەكی چــاكو پــاك، بــەرز دەكرێتەوە بــۆ لای خــواو دەخرێتە ڕوو، خــوا ستایشــی خاوەنەكەی دەكات لەســەری، لە نێوان فریشــتە بــەرزو بەڕێزەكانــدا، ﴿ وَٱلۡعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ ﴾ (كردەوەی چــاك) لــە كردەوەكانــی دڵو كردەوەكانــی ئەندامانــی جەســتە﴿ يَرۡفَعُهُۥ ﴾ هەروەهــا خــوا ﷻ (كــردەوەی چــاك بــەرزی دەكاتــەوە) وەكو قســەی چــاك، وتراوە: كــردەوەی چــاك قســەی پــاك بــەرز دەكاتــەوە، ئــەوكات وای لــێ دێــت قســەی پاكو چــاك بە پێــی كــردەوەی چــاك دەبــێ، كردەوە چاكــەكان قســە پاكەكان بــەرز دەكەنــەوە، ئەگەر كــردەوەی چاكــی نەبوو، ئەوە قســەی بــەرز نابێتەوە بۆ لای خــوا، ئەم كردەوانــەی كە بەرز دەكرێنــەوە بــۆ لای خوا، خــوا خاوەنەكەی بــەرز دەكاتــەوەو دەســەڵاتی پێدەدات.

بەڵام گوناهەکان بە پێچەوانەیە، خاوەنەکەی دەیەوێ پێی بەرز بێتەوە، وە فڕو فێڵ دەکات، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ سەری، هیچی بۆ زیاد نابێ جگە لە ئیهانەو سەرزەنشتو بێنرخی نەبێ، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ وَٱلۡعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرۡفَعُهُۥۚ وَٱلَّذِينَ يَمۡكُرُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٞۖ ﴾ ئیهانە دەکرێن لە ناو دۆزەخدا بە ئەوپەڕی ئیهانە کردن، ﴿ وَمَكۡرُ أُوْلَٰٓئِكَ هُوَ يَبُورُ ﴾ واتە: (فێڵو پیلانی ئەوانە) لەناو دەچێو پەرشو بڵاو دەبێتەوە، هیچ سوودێکیان پێ ناگەیەنێ، چونکە فێڵو پیلانێکە بە پووچو بەتاڵو لە پێناو پووچو بەتاڵدا.

(١١): ﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ ثُمَّ جَعَلَكُمۡ أَزۡوَٰجٗاۚ وَمَا تَحۡمِلُ مِنۡ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلۡمِهِۦۚ وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٖ وَلَا يُنقَصُ مِنۡ عُمُرِهِۦٓ إِلَّا فِي كِتَٰبٍۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ١١ ﴾:

﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ ﴾ خوا ﷻ باسی دروستکردنی ئادەمیزاد دەکات، وە بەم قۆناغانە دەیگوازێتەوە لە خاکو خۆڵەوە بۆ نوتفەیەکو وە دوای ئەوە، ﴿ ثُمَّ جَعَلَكُمۡ أَزۡوَٰجٗاۚ ﴾ واتە: بەردەوام دەتانگوازێتەوە قۆناغ لە دوای قۆناغ هەتا دەتانگەیەنێ بە نێرو مێ، نێر مێ دەخوازێ، وە مەبەست لە خواستنی نێر وەچەو منداڵە، ئەگەرچی مارەبڕینو هاوسەرگیری هۆکاری بوونی وەچەیە، بەڵام بێگومان ئەوە گرێدراوە بە قەزاو قەدەرو زانستی خوا، ﴿ وَمَا تَحۡمِلُ مِنۡ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلۡمِهِۦۚ ﴾ (واتە: هیچ مێینەیەک دووگیان نابێو سکەکەی دانانێ مەگەر بە ئاگاداری خوا) بە هەمان شێوە قۆناغەکانی ئادەمیزاد هەموویان بە زانستو قەزاو قەدەری خوایە.

﴿ وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٖ وَلَا يُنقَصُ مِنۡ عُمُرِهِۦٓ ﴾ واتە: ئەو کەسەی تەمەن تەمەنێکی درێژ دەکات، ﴿ إِلَّا ﴾ تەنها بە زانستی خوایە، یان: لە تەمەنی مرۆڤ کەم ناکات کە ئەو لەوەدایە پێی بگا، ئەگەر ئەو هۆکارانەی نەگرتایەتە بەر وەک زیناو سەرپێچی کردنی دایکو باوک، پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی، وە وێنەی ئەوانە کە باسکراوە، ئەوانە لە هۆکارەکانی کورتی تەمەنن.

مانای ئەوەیە درێژیو کورتی تەمەن بە هۆکارو بەبێ هۆکارە، هەموو ئەوانە بە زانستی خوای بەرزو مەزنە، بێگومان ئەوەی چەسپاندوە، ﴿ فِي كِتَٰبٍۚ ﴾ (لە کتێبدا) کۆی کردۆتەوەو هەموو ئەوانەی بەسەر بەندەدا دێ، لە هەموو کاتەکانیو ڕۆژگارەکانی ژیانیدا ﴿ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ﴾ واتە: دەوردانی زانستی بە هەموو ئەو زانیاریە زۆرانە، وە دەوردانی کتێبی تیایدا، ئەمە سێ بەڵگەی ڕوونە لە بەڵگەکانی زیندوو کردنەوەو

بڵاوبوونــەوە، هەموویــان عەقڵین، خوا ﷻ لەم ئایەتــەدا ئاماژەی پێکــردوە: زیندووکردنەوەی زەوی دوای مردنــی، ئــەو زاتــەی زینــدووی دەکاتــەوە هــەر ئــەو دەیمرێنــێ، وە ئادەمیزاد دەگوازێتــەوە لــەو قۆناغانە.

جــا ئەو زاتــەی هێناویەتیــە بوونو گواســتوویەتیەوە چین لــە دوای چیــن، وە دۆخ لە دوای دۆخ، هەتــا گەیشــتۆتە ئــەوەی بــۆی ئەنــدازە کــردوە، بێگومــان ئەو زاتــە لەســەر دووبارە دروســتکردنەوەی بــە تواناتــرە، ئــەوە ئاســانترە لــەلای، وە دەوردانــی زانســتی بــە هەمــوو بەشــەکانی جیهانــی ســەروو خواروو وردو درشــتو گەورەیە کــە لە ناو دڵەکانــدان، وە ئەو کۆرپەلانــەی کــە لــە پزدانەکانــدان، وە درێــژی تەمەنو کــورت کردنەوەیان، چەســپاندنی هەمــوو ئەوانــە لــە کتێبدایــە، جا ئــەو زاتەی ئەمــە وەســفێتی ئاســانە بەلایــەوە، وە دووبارە زیندووکردنــەوەی مــردووەکان ئاســانو ئاســانترە، بــەرزی بــۆ ئــەو خوایەی خێــرو چاکەی زۆرە، وە بەندەکانــی ئاگــادار کردۆتــەوە لــەوەی بەرژەوەنــدی ئەوانــی تێدایــە لــە ژیانــی دونیــاو دوارۆژیاندا.

وَمَا يَسْتَوِي الْبَحْرَانِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ سَائِغٌ شَرَابُهُ وَهَٰذَا
مِلْحٌ أُجَاجٌ وَمِن كُلٍّ تَأْكُلُونَ لَحْمًا طَرِيًّا وَتَسْتَخْرِجُونَ
حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا وَتَرَى الْفُلْكَ فِيهِ مَوَاخِرَ لِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ
وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢﴾ يُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَيُولِجُ
النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي
لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ذَٰلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ الْمُلْكُ وَالَّذِينَ
تَدْعُونَ مِن دُونِهِ مَا يَمْلِكُونَ مِن قِطْمِيرٍ ﴿١٣﴾ إِن
تَدْعُوهُمْ لَا يَسْمَعُوا دُعَاءَكُمْ وَلَوْ سَمِعُوا مَا اسْتَجَابُوا لَكُمْ
وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثْلُ خَبِيرٍ
﴿١٤﴾ يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَنتُمُ الْفُقَرَاءُ إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ هُوَ الْغَنِيُّ
الْحَمِيدُ ﴿١٥﴾ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿١٦﴾
وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ بِعَزِيزٍ ﴿١٧﴾ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ وَإِن
تَدْعُ مُثْقَلَةٌ إِلَىٰ حِمْلِهَا لَا يُحْمَلْ مِنْهُ شَيْءٌ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ
إِنَّمَا تُنذِرُ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِالْغَيْبِ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ
وَمَن تَزَكَّىٰ فَإِنَّمَا يَتَزَكَّىٰ لِنَفْسِهِ وَإِلَى اللَّهِ الْمَصِيرُ ﴿١٨﴾

(١٢-١٤): ﴿وَمَا يَسْتَوِي الْبَحْرَانِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ سَائِغٌ شَرَابُهُ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَمِن كُلٍّ تَأْكُلُونَ لَحْمًا طَرِيًّا وَتَسْتَخْرِجُونَ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا وَتَرَى الْفُلْكَ فِيهِ مَوَاخِرَ لِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢﴾ يُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَيُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ذَٰلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ الْمُلْكُ وَالَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِ مَا يَمْلِكُونَ مِن قِطْمِيرٍ ﴿١٣﴾ إِن تَدْعُوهُمْ لَا يَسْمَعُوا دُعَاءَكُمْ وَلَوْ سَمِعُوا مَا اسْتَجَابُوا لَكُمْ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثْلُ خَبِيرٍ ﴿١٤﴾﴾:

﴿وَمَا يَسْتَوِي الْبَحْرَانِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ سَائِغٌ شَرَابُهُ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ﴾ ئەمە هەواڵێکە دەربارەی تواناو حیکمەتی میهرەبانی خوا ﷻ، کە بێگومان ئەو دوو دەریای دروستکردوە بۆ بەرژەوەندی جیهانی سەر زەوی بە گشتی، وە ئەو یەکسانی نەکردوون وەکو یەک، چونکە بەرژەوەندی وادەخوازێ دەریاکان سازگارو شیرین بن، خواردنەوەیان خۆش‌و بە لەزەت بێ بۆ ئەوەی ئەوانەی لێی دەخۆنەوە سوودی لێوەربگرن‌و کشتوکاڵی پێ دەکەن، وە بەشێکی دیکەیان سوێرو تاڵ‌و تفت بن، بۆ ئەوەی ئەو هەوایەی بە دەوری زەویدایە تێک نەچێ، بە کۆمەڵە بایەک کە لە دەریاکاندا کۆمەڵە بایەک دەمرن، وە لەبەر ئەوەی وەستاوەو ڕێناکات، سوێریەکەی ڕێگری لێدەکات لە گۆڕان، بۆ ئەوەی گیاندارەکانی بە تامترو بە چێژترین، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿وَمِن كُلٍّ﴾ لە دەریای سوێرو شیرین ﴿تَأْكُلُونَ لَحْمًا طَرِيًّا﴾ (گۆشتی تەڕوو تازە دەخۆن) ئەویش ئەو ماسیانەیە ڕاوکردنیان لە دەریادا ئاسانە ﴿وَتَسْتَخْرِجُونَ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا﴾ (دەریدەهێنن) لە مرواری‌و سەدەف‌و دوڕ و جگە لەوانیش کە لەناو دەریادا هەن، ئەمە بەرژەوەندی مەزنی تێدایە بۆ بەندەکان.

هەروەها لە بەرژەوەندی‌و سوودەکانی دەریا ئەوەیە خوا ﷻ ڕامیهێناوە بۆ ئەو کەشتیانەی

بەناویدا دەڕۆنو دەریاکە لەت دەکەنو دەیبرن لە هەرێمێکەوە بۆ هەرێمێکی تر، وە لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی تر، هەموو ئەو خەڵکانەو کەلو پەلی بازرگانییەکانیان هەڵدەگرێ، بەو شێوەیە لە فەزڵو چاکەی خوا شتانێکی زۆر دەستەبەر دەبێ، لەبەر ئەمە فەرموویەتی: ﴿لِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦ وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ﴾ (واتە: بۆ ئەوەی هەندێ ڕزقو ڕۆزی خوا پەیدا بکەن وە تا ستایشی خوا بکەن).

هەروەها لە فەزڵو چاکەکانی خوا ئەوەیە شەو دەکا بە ناو ڕۆژداو ڕۆژیش دەکا بە ناو شەودا، هەر کە یەکێکیان بێت ئەوی دیکەیان نامێنێ، یەکێکیان زیاد دەکاو ئەوی دیکەیان کەم دەکاتو یەکسانیش دەبن، جا بەو شێوەیە بەرژەوەندی بەندەکان دەستەبەر دەبێ لە جەستەیانو گیاندارەکانیانو داروو درەختو کشتووکاڵەکانیان.

وە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿كُلّٞ يَجۡرِي لِأَجَلٖ مُّسَمّٗىۚ﴾ واتە: هەر یەکە لە خۆرو مانگ لە خولگەی خۆیان دەسوڕێنەوە هەتا خوا ویستی لەسەربێ، جا ئەگەر ماوەی دیاریکراویان هاتو کۆتایی دونیا نزیک بووەوە، سووڕانەوەیان دەپچڕێ، دەسەڵاتیان لە کار دەکەوێ، مانگ دەکوژێتەوەو خۆر تاریک دەبێو ئەستێرەکانیش بڵاو دەبنەوە.

کاتێ خوا ﷻ ڕوونیکردەوە، ئەوەی ڕوونیکردەوە لەم بەدیهێنراوە مەزنانە، وە ئەوەی تیایاندایە لەو پەندانەی کە بەڵگەن لەسەر تەواویو فەزڵو چاکەکانی خوا ﷻ فەرمووی: ﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡ لَهُ ٱلۡمُلۡكُۚ﴾ واتە: ئەو زاتەی تاکو تەنهایە بە دروست کردنی ئەوانەی باسکران وە رامهێنانیان، ئەو پەروەردگاری پەرستراوە خاوەنی هەموو موڵکە ﴿وَٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ﴾ (واتە: ئەوانەی ئێوە هاواریان لێدەکەن بێجگە لە خوا)، لە بتو هاوشێوەکانیان، ﴿مَا يَمۡلِكُونَ مِن قِطۡمِيرٍ﴾ واتە: خاوەنی هیچ نین نە کەم نە زۆر، تەنانەت توێکڵە سپێکەی سەر ناوکی خورما کە ئەوە بێنرخترین شتە، ئەمەش بە دەقکردنی نەفیو گشتگیریە، ئەی چۆن داوایان لێدەکرێ، ئەوان هیچ موڵکێکیان بە دەست نیە لە موڵکی ئاسمانەکانو زەوی؟

لەگەڵ ئەمەدا ﴿إِن تَدۡعُوهُمۡ﴾ (ئەگەر نزاو هاواریان لێبکەن) ئەوان نابیستن، چونکە ئەوان لە نێوان بێگیانو مردووەکانو فریشتەکان سەرقاڵن بە گوێڕایەڵی پەروەردگاریان، ﴿وَلَوۡ سَمِعُواْ﴾ (ئەگەر ببیستن) بە شێوەی گریمانەو وادانان ﴿مَا ٱسۡتَجَابُواْ لَكُمۡۖ﴾ (وەڵامتان نادەنەوە)، چونکە هیچیان بە دەست نیە، وە زۆربەیان ڕازی نین بە بەندایەتی ئەو کەسەی دەیپەرستێ، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يَكۡفُرُونَ بِشِرۡكِكُمۡۚ﴾ واتە: بەری

دەبن لێتانو دەڵێن: ﴿ سُبْحَٰنَكَ أَنتَ وَلِيُّنَا مِن دُونِهِم ﴿٤١﴾ ﴾سبأ، (واتە: فریشتەکان دەڵێن: پاکیو بێگەردی بۆ تۆ تەنها تۆ گەورەی ئێمەی نەک ئەوان) ﴿ وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثْلُ خَبِيرٍ ﴾ واتە: هیچ کەس ئاگادارت ناکات ڕاستگۆتربێ لە خوای زانای شارەزا، دڵنیابە ئەم کارەی هەواڵی پێداوە وەک ئەوە وایە بەچاو بینرابێ، با هیچ گومانو دوودڵیەکت نەبێ لە سەری.

ئەم دەقە پیرۆزانە بەڵگەی ڕونو ئاشکراو یەکلاکەرەوەیان لەخۆگرتووە، کە بەڵگەن لەسەر ئەوەی بێگومان خوای بەرزو مەزن پەرستراوە، هیچ کەس شایستەی پەرستن نیە غەیری ئەو، وە بەندایەتی کردنی جگە لەو پووچەو پەیوەستە بە پووچەوە، هیچ سوودێ بەو کەسە ناگەیەنێ کە دەیپەرستێ.

(١٥-١٨): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِ ۖ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿١٥﴾ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿١٦﴾ وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٍ ﴿١٧﴾ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۚ وَإِن تَدْعُ مُثْقَلَةٌ إِلَىٰ حِمْلِهَا لَا يُحْمَلْ مِنْهُ شَىْءٌ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰٓ ۗ إِنَّمَا تُنذِرُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ۚ وَمَن تَزَكَّىٰ فَإِنَّمَا يَتَزَكَّىٰ لِنَفْسِهِۦ ۚ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٨﴾ ﴾:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِ ﴾ خوا ﷻ لەگەڵ هەموو خەڵکیدا دەدوێ، وە هەواڵیان پێدەدا بە بارودۆخو وەسفیان کە بێگومان ئەوان هەژارن لە لای خوا ﷻ لە چەندین ڕووەوە:

هەژارن لە بەدیهێنانتاندا، ئەگەر ئەو ئێوەی بەدینەهێنایە، بەدینەدەهاتن.

هەژارن لە ئامادەکردنیاندا بە هێزو ئەندامەکانی جەستەیان، ئەگەر خوا ﷻ ئامادەی نەکردایەن بەو جۆرە ئەوە ئامادە نەدەبوون بۆ هیچ کارێک.

هەژارن لە یارمەتیدان بە بژێویو ڕزقو ڕۆزیو نازو نیعمەتە ئاشکراو نهێنیەکان، جا ئەگەر فەزڵو چاکەو ئاسانکاری خوا نەبوایە بۆ کاروبارەکان، ئەوە ڕزقو ڕۆزیو نازو نیعمەتیان بۆ دەستەبەر نەدەبوو.

هەژارو دەستەوسانن لە لابردنی نارەحەتیو بەڵاکانو ڕێگری ناخۆشیەکانو لابردنیان، ئەگەر خوا لەسەریان لای نەبردایەو لە نارەحەتیەکان ڕزگاری نەکردایەن، گرانیەکانی لەسەریان لانەبردایە، ئەوە بە بەردەوام لەناو ناخۆشیو کێشەدا بوون.

هەژارو بێ توانان بۆ لای خوا ﷻ لە پەروەردە کردنیان بە جۆرەها پەروەردەکردنو بەڕێوەبردن.

هەژارن لای خوا ﷻ لە پەرستنو خۆشویستنیان بۆیو بەندایەتی کردنیان، وە بەندایەتی کردنیان بە دڵسۆزی بۆ خوای بەرزو مەزن، ئەگەر سەرکەووتوی نەکردبان بۆ ئەم کارە، ئەوە لەناو دەچوونو ڕوحو دڵو حاڵیان تێک دەچوو.

هەژارن لای خوا لە فێرکردنیان لەوەی کە نایزانن، وە کارو کردەوەیان بەوەی بەرژەوەندی ئەوانی تێدایە، جا ئەگەر فێرکردنی خوا نەبووایە ئەوان فێر نەدەبوون، وە ئەگەر سەرکەوتنی ئەو نەبووایە چاکە خواز نەدەبوون.

ئەوان پێویستیان بە خوایە بە هەموو ماناو ئیعتیبارێ، یەکسانە ئەگەر هەست بکەن بە هەندێ لە جۆرەکانی پێویستیو هەژاری، یان هەست نەکەن، بەڵام سەرکەوتوو لە ناو ئەواندا ئەو کەسەیە بە بەردەوام هەژاری خۆی ببینێ لە هەموو کاروبارە ئاینیو دونیاییەکانیداو ملکەچی بۆ بنوێنێ.

وە داوا لە خوا بکات بە قەد چاو تروکانێ نەیداتە دەست نەفسی، یارمەتی بدات لە هەموو کاروبارەکانی، وە هاوڕێیەتی ئەمە بکات لە هەموو کاتێکدا، ئەمە چاکترە بۆی بە پشت بەستنی تەواو بە پەروەردگارو پەرستراوی، ئەو زاتەی بە بەزەییترە بۆ ئەو لە دایک بۆ منداڵەکەی.

﴿ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلۡغَنِيُّ ٱلۡحَمِيدُ ﴾ واتە: ئەو زاتەی بێنیازی تەواوە لە هەموو رووەکانەوە، پێویستی بەوە نیە کە دروستکراوەکانی پێویستیان پێیەتی، وە هەژار نیە بۆ شتێ کە دروستکراوەکان هەژار دەبن بۆی، ئەویش بە هۆی ئەوەی سیفاتەکانی تەواوو بەرزو گەورەیە.

لە دەوڵەمەندیو بێنیازی ئەو، ئەوەیە بەدیهێنراوەکانی لە دونیاو دوارۆژدا بێنیاز دەکات، ﴿ ٱلۡحَمِيدُ ﴾ ستایشکراوە لە زاتو ناوەکانی، چونکە هەموو ناوەکانی جوانن، وە ستایشکراوە لە سیفاتەکانیدا، لەبەر ئەوەی هەموویان بەرزن، وە ستایشکراوە لە کردارەکانیدا، چونکە فەزڵو چاکەو حیکمەتو میهرەبانیان تێدایە، وە ستایشکراوە لە فەرمانو قەدەغەکراوەکانیدا، ئەو زاتە ستایشکراوە ئەوەی لە ناویدایە، وە لەسەر ئەوەی لەوەوەیە، ئەو ستایشکراوە لە بێنیازیو دەوڵەمەندی.

﴿ إِن يَشَأۡ يُذۡهِبۡكُمۡ وَيَأۡتِ بِخَلۡقٖ جَدِيدٖ ﴾ واتە: دەگونجێ مەبەست: ئەگەر خوا بیەوێ لەناوتان دەبات، وە خەڵکی دیکە دێنێ جگە لەئێوە، زیاتر گوێڕایەڵی خوا دەکەن، ئەمە هەڕەشەکردنی تێدایە بە لەناوچوونو ئیبادەکردن، بێگومان ویستی خوا ﷻ کورتنەکراوەتەوە لەوەدا، دەگونجێ مەبەست لەوەدا چەسپاندنی زیندووکردنەوەو بڵاو کردنەوە بێ، وە بێگومان ویستی خوا جێبەجێکارە لە هەموو شتێکدا، وە لە دووبارە زیندووکردنەوەتان دوای مردنتان، دروستکراوێکی نوێ، بەڵام خوا کاتێکی دیاری کردوە بۆ ئەوە، نە پێش دەکەوێو نە دوا دەکەوێ.

﴿ وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٍ ﴾ (واتە: ئەمە بۆ خوا کارێکی گرانو) قەدەغەو دەستەوستان نیە، وە بەڵگەیە لەسەر مانای کۆتایی ئەوەی دوای ئەوە باسی کردوە، فەرموویەتی: ﴿ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴾ واتە: لە ڕۆژی دواییدا هەریەکەو بە پێی کردەوەی خۆی پاداشتی دەدرێتەوە، هیچ کەس تاوانی کەسێکی دیکە هەڵناگرێ، ﴿ وَإِن تَدْعُ مُثْقَلَةٌ ﴾ واتە: نەفسێکی بارگران بە تاوان داوا لە کەسێ بکات بۆ هەڵگرتنی هەندێ لە گوناهەکەی، ﴿ لَا يُحْمَلْ مِنْهُ شَيْءٌ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰٓ ﴾ (واتە: هیچ بارە گوناهێ هەڵناگرێ، هەرچەندە خزمیش بێت) بێگومان تاوانی نزیکیش هەڵناگیرێ، بارودۆخی ڕۆژی دوایی وەک دونیا نیە، دڵسۆز یارمەتی دڵسۆز بداتو هاوڕێ بۆ هاوڕێکەی چاک بێت، بەڵکو لە ڕۆژی دواییدا کەسێک ئاوات دەخوازێت حەقو مافی بەسەر کەسێکەوە هەبێ، ئەگەرچی دایکو باوکو کەسە نزیکەکانیشی بێ.

﴿ إِنَّمَا تُنذِرُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾ واتە: ئەوانە بە ترساندن بێدار دەبنەوەو سوودی لێوەر دەگرن، ئەوانەن لە خوا دەترسن بە پەنهان، واتە: ئەوانە لێی دەترسن لە حاڵەتی نهێنیو ئاشکرادا، وە ئەوانەی نوێژەکانیان بەرپا دەکەن، بە سنوورەکانیو مەرجەکانیو پایەکانیو واجبەکانی بە گەردنکەچیەوە، چونکە ترسان لە خوا وا لە بەندە دەکات لەوە بترسێ کردەوەکانی بە فیرۆ بچێت، وە هەڵبێت لەوەی دەترسێ تووشی سزای بکات، نوێژ بانگ دەکات بۆ لای چاکە، وە ڕێگری دەکات لە کاری ناشرینو ناپەسند.

﴿ وَمَن تَزَكَّىٰ فَإِنَّمَا يَتَزَكَّىٰ لِنَفْسِهِۦ ﴾ واتە: هەر کەسێک نەفسی خۆی پاک بکاتەوە بە دوورکەوتنەوە لە عەیبو ناتەواویەکان، وەک ڕیاو ڕووپاماییو خۆ بە گەورە زانینو درۆو فرتو فێڵو دووڕوویيو وێنەی ئەوانە لە ڕەوشتە ناشرینەکان، وە خۆی برازێنێتەوە بە ڕەوشتە بەرزەکان، لە ڕاستگۆییو دڵسۆزیو خۆ بە کەم زانینو نەرمو نیانیو ئامۆژگاری بۆ بەندەکانو سەلامەتی دڵو دەروون لە ڕقو کینەو ئیرەیی بردنو وێنەی ئەو دووانە لە ڕەوشتە ناشرینەکان، بێگومان پاک ڕاگرتنی دڵو دەروون سوودەکەی دەگەڕێتەوە بۆ خۆی، هیچ شتێ لە کردەوەکەی بە فیرۆ ناچێت.

﴿ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ ﴾ (واتە: گەڕانەوە بۆ لای خوایە) پاداشتی دەدرێتەوە لەوەی پێشی خستووە، لێپرسینەوەیان لێدەکات لەوەی کردوویانە، هیچ کردەوەیەکی گەورەو بچووکی بەجێ نەهێشتووە ئیللا تۆماری کردوە.

وَمَا يَسْتَوِي ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ ﴿١٩﴾ وَلَا ٱلظُّلُمَٰتُ وَلَا ٱلنُّورُ
﴿٢٠﴾ وَلَا ٱلظِّلُّ وَلَا ٱلْحَرُورُ ﴿٢١﴾ وَمَا يَسْتَوِي ٱلْأَحْيَآءُ وَلَا
ٱلْأَمْوَٰتُ إِنَّ ٱللَّهَ يُسْمِعُ مَن يَشَآءُ وَمَآ أَنتَ بِمُسْمِعٍ مَّن فِي
ٱلْقُبُورِ ﴿٢٢﴾ إِنْ أَنتَ إِلَّا نَذِيرٌ ﴿٢٣﴾ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ بَشِيرًا
وَنَذِيرًا وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ ﴿٢٤﴾ وَإِن يُكَذِّبُوكَ
فَقَدْ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ
وَبِٱلزُّبُرِ وَبِٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُنِيرِ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ أَخَذْتُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟
فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿٢٦﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ
مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ ثَمَرَٰتٍ مُّخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهَا وَمِنَ ٱلْجِبَالِ
جُدَدٌۢ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ ﴿٢٧﴾
وَمِنَ ٱلنَّاسِ وَٱلدَّوَآبِّ وَٱلْأَنْعَٰمِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ كَذَٰلِكَ
إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُا۟ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ ﴿٢٨﴾
إِنَّ ٱلَّذِينَ يَتْلُونَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا
رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً يَرْجُونَ تِجَٰرَةً لَّن تَبُورَ ﴿٢٩﴾ لِيُوَفِّيَهُمْ
أُجُورَهُمْ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِۦٓ إِنَّهُۥ غَفُورٌ شَكُورٌ ﴿٣٠﴾

(١٩-٢٤): ﴿ وَمَا يَسْتَوِي ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ ﴿١٩﴾ وَلَا ٱلظُّلُمَٰتُ وَلَا ٱلنُّورُ ﴿٢٠﴾ وَلَا ٱلظِّلُّ وَلَا ٱلْحَرُورُ ﴿٢١﴾ وَمَا يَسْتَوِي ٱلْأَحْيَآءُ وَلَا ٱلْأَمْوَٰتُ إِنَّ ٱللَّهَ يُسْمِعُ مَن يَشَآءُ وَمَآ أَنتَ بِمُسْمِعٍ مَّن فِي ٱلْقُبُورِ ﴿٢٢﴾ إِنْ أَنتَ إِلَّا نَذِيرٌ ﴿٢٣﴾ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ ﴿٢٤﴾ ﴾:

خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات لـە حیکمەتـی ئـەودا دژەکان یەکسـان نین، وە ئەوەیشـی داینـاوە لـە سروشـتی بەندەکانیـدا ﴿ وَمَا يَسْتَوِي ٱلْأَعْمَىٰ ﴾ ئـەو کەسـەی بینایـی لـە دەسـتداوە، ﴿ وَٱلْبَصِيرُ ﴿١٩﴾ وَلَا ٱلظُّلُمَٰتُ وَلَا ٱلنُّورُ ﴿٢٠﴾ وَلَا ٱلظِّلُّ وَلَا ٱلْحَرُورُ ﴿٢١﴾ وَمَا يَسْتَوِي ٱلْأَحْيَآءُ وَلَا ٱلْأَمْوَٰتُ ﴾ (واتـە: بینـا * وە نـە تاریکسـتانو ڕووناکـی وەک یەکـن * وە نـە سـێبەرو خۆرەتـاو * نـە زینـدووانو مـردووان وەک یەکـن)، هـەر وەک ئـەوە لـە لای ئێـوە چەسـپاوەو هیچ گومانێـک قبـووڵ نـاکات، ئەمانـەی کـە باسـکران یەکسـان نیـن، جـا بـەو شـێوەیە بزانــن نەبوونــی یەکسـانی ئەوانــەی بــە مەعنــەوی پێچەوانــەی یەکــن لــە پێشــترە.

نـە بـڕوادار لەگـەڵ بێبـڕوا یەکسـانن، نـە هیدایەتـدراو نـە گومـڕا، نـە زانـاو نـە نەفـام، نـە خاوەنانـی بەهەشـت نـە خاوەنانـی ئاگـر، نـە زیندوویـی دڵـەکانو نـە مردوویـان، جا لـە نێوانـی ئەمانـەدا جیاوازیـەک هەیـە کـەس نایزانـێ تەنهـا خـوا نەبـێ، جـا ئەگـەر پلـەو پایەکانـت زانـیو شـتەکانت جیاکـردەوە، وە ڕوون بوویـەوە ئـەوەی کـە دەبـێ کێبڕکـێ بـکات لـە بەدەسـتهێنانیدا لـە دژەکـەی، بـا ئـەو کەسـەی خۆراگـرە چـی لـە پێـشو شایسـتەیە ئـەوە بـۆ خـۆی هەڵبژێـرێ.

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُسْمِعُ مَن يَشَآءُ ﴾ بیسـتنی تێگەیشـتنو وەرگرتـن، چونکـە خـوای بـەرزو مەزن ئـەو هیدایەتـدارو سـەرخەرە ﴿ وَمَآ أَنتَ بِمُسْمِعٍ مَّن فِي ٱلْقُبُورِ ﴾، (واتـە: بـەڵام تـۆ ناتوانی ئـەی موحەممـەد ﷺ پەیامەکـەت ببیسـتێنی بەوانـەی لـە گۆڕەکانـدان)، واتـە: ئەوانـەی

دڵەکانیان مردووە، یان وەک چۆن بانگ کردنت سوودی نیە بۆ ئەوانەی لە گۆڕەکاندان، بەهەمان شێوە سوودی نیە بۆ کەسێکی ڕوو وەرگێڕی کەللەڕەقی عیناد، بەلاَم پیشەی تۆ ڕاگەیاندنو ئاگادارکردنەوەیە، وە گەیاندنی ئەوەی پێی نێردراوی، لێت وەردەگیرێ یان نا.

لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ إِنۡ أَنتَ إِلَّا نَذِيرٌ ﴿٢٣﴾ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ ﴾ واتە: (تۆ تەنها ترسێنەری) ئەوەی ناردنمان بۆ تۆ حەقە، چونکە خوا تۆی ناردوو پاش ماوەیەک لە ناردنی پێغەمبەران، کوێربوونەوەو سڕینەوەی ڕێگاکانو نەمانی زانست، وە گرنگیو پێویستیەکی مەزن بۆ ناردنت، خوا تۆی نارد بە ڕەحمەت بۆ هەموو جیهان.

بە هەمان شێوە ئەوەی تۆمان پێی ناردووە لە ئاینی بەهێزو پتەو ڕێگای ڕاست، حەقەو پووچ نیە، بەهەمان شێوە ئەوەی ئێمە تۆمان پێی ناردووە لەم قورئانە مەزنە، ئەوەشی لە خۆی گرتووە لەم یادە پڕ لە حیکمەتە حەقەو ڕاستە، ﴿ بَشِيرٗا ﴾ (مژدە دەری) بۆ ئەو کەسەی گوێڕایەڵیت دەکات، بە ئومێدی پاداشتی ئێستاو داهاتوو، ﴿ وَنَذِيرٗا ﴾ (ترسێنەری) بۆ ئەو کەسەی سەرپێچیت دەکات، (بە ترسان لە) سزای خوا لە ئێستاو داهاتوو، تۆ داهێنراونیت لە پێغەمبەران.

جا هەر ﴿ مِّنۡ أُمَّةٍ ﴾ (ئوممەتێک) لە ئوممەتە پێشینەکانو سەدە ڕابردووەکان، ﴿ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٞ ﴾ (واتە: پێغەمبەرێکی ترسێنەری تێدا هاتووە) بەڵگەو حوجەی خوایان لەسەر پێویست بکات، ﴿ لِّيَهۡلِكَ مَنۡ هَلَكَ عَنۢ بَيِّنَةٖ وَيَحۡيَىٰ مَنۡ حَيَّ عَنۢ بَيِّنَةٖۗ ﴿٤٢﴾ ﴾ الأنفال، (واتە: بۆ ئەوەی لەناو بچێ ئەو کەسەی بە لای خواوە لەناو چووە لە ڕووی بەڵگەوە، وە بۆ ئەوەی بژی ئەوەی بەلای خواوە دەژی لە ڕووی بەڵگەوە).

(٢٥-٢٦): ﴿ وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدۡ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَبِٱلزُّبُرِ وَبِٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُنِيرِ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ أَخَذۡتُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۖ فَكَيۡفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿٢٦﴾ ﴾:

﴿ وَإِن يُكَذِّبُوكَ ﴾ واتە: ئەگەر بە درۆت بزانن ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەو هاوبەش دانەرانە، تۆ یەکەم پێغەمبەر نیت بە درۆیان زانیبێت ﴿ فَقَدۡ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ ﴾ (واتە: ئەوە بێگومان لە پێش ئەوانیشەوە کەسانێک بڕوایان نەهێنا، پێغەمبەرەکانیان هاتنە لایان بە موعجیزەکان) کە

بەڵگەبوون لەسەر حەق، وە لەسەر ڕاستیان لەوەی هەواڵیان پێدابوو، ﴿ وَبِٱلزُّبُرِ ﴾ واتە: ئەو کتێبانەی نووسراون، کە زۆرێک لە حوکمەکانی تێدایە ﴿ وَبِٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُنِيرِ ﴾ واتە: (بەو کتێبەی) ڕووناککەرەوەیە لە هەواڵە ڕاستەکانیو حوکمە دادپەروەرەکانی، جا بەدرۆدانیان بە پێغەمبەرەکانیان بە هۆی گومانو دوو دڵی نەبوو، یان بە هۆی کەمتەرخەمی پێغەمبەران، بەڵکو بە هۆی ستەمو عینادیانەوە بوو.

﴿ ثُمَّ أَخَذۡتُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾ (واتە: پاشان ئەوانەیان بێبڕوا بوو قارم لێگرتن) بە جۆرەها سزا ﴿ فَكَيۡفَ كَانَ نَكِيرِ ﴾ (واتە: جا چۆن بوو تۆڵەسەندنی ئێمە) لەوان؟ تووندترینو مەزنترین تۆڵە بوو، دەخیلە ئاگاداربن بە هۆی درۆزانینی ئەم پێغەمبەرە بەخشندەیە، تووشی بەلا بین وەک چۆن ئەوان تووش بوون، لە سزای بە ئێشو ڕیسواییو سەرشۆڕی.

(٢٧-٢٨): ﴿ أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦ ثَمَرَٰتٖ مُّخۡتَلِفًا أَلۡوَٰنُهَاۚ وَمِنَ ٱلۡجِبَالِ جُدَدُۢ بِيضٞ وَحُمۡرٞ مُّخۡتَلِفٌ أَلۡوَٰنُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٞ ٢٧ وَمِنَ ٱلنَّاسِ وَٱلدَّوَآبِّ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ مُخۡتَلِفٌ أَلۡوَٰنُهُۥ كَذَٰلِكَۗ إِنَّمَا يَخۡشَى ٱللَّهَ مِنۡ عِبَادِهِ ٱلۡعُلَمَٰٓؤُاْۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ ٢٨ ﴾:

خوا باسی دروستکردنی شتە دژیەکەکان دەکات، کە سەرچاوەیان یەکەو کەرەستەیان یەکە، وە جیاوازیان تێدایە وەکو ئەوەی بە چاو دەبینرێ، تا ببێتە بەڵگە بۆ بەندەکان لەسەر تەواوی دەسەڵاتیو داهێنانی حیکمەتی.

لەوانە: خوا ﷻ لە ئاسمانەوە بارانی بارانـدوە، ئینجا ڕواندوویەتی بە باران لە جۆرەها میوەی جیاوازو ڕووەکی جۆراو جۆر کە لە پێش چاوی بینەرانە، لە کاتێکدا ئاو یەکەو زەویش یەکە.

وە لەوانە: ئەو کێوانەی خوا کردوویەتی بە مێخ، دەبینی چەند کێوێکی تێهەڵکێشن، بەڵکو یەک کێون، ڕەنگی جیاوازیان هەیە، تیایاندایە چەندین ڕێگای سپی، وە تیایدایە چەندین ڕێگای زەردو سوور، وە تیایدایە زۆر ڕەشی تۆخە.

وە لەوانە: ئادەمیزادو زیندەوەرو ئاژەڵی ماڵاتیش جیاوازیان تێدایە لە ڕەنگو وەسفو دەنگو شێوازەکاندا کە بە چاو دەبینرێ، شایەتی بۆ دراوە لەلایەن بینەرەوە، وە هەموویان لە یەک بنچینەو یەک کەرەستەن.

جیاوازیـان بەڵگەیەکـی عەقڵیـە لەسـەر ویسـتی خـوای گـەورە، کـە تایبەتـی کـردوە ئـەوەی تایبەتـی کـردوە تیایانـدا، بـە ڕەنـگو وەسـفو قـودرەتو توانـای خـوا ﷻ لـە سـەر بەدیهێنانیـان بـەو جـۆرە، وە حیکمـەتو میهرەبانـی ئـەو، ئـەو جیـاوازیو جیاکاریـە بەرژەوەنـدیو سـوودو ناسـینی خەڵکـی هەندێکیـان بـۆ هەندێکـی دیکەیانـی تێدایـە، کـە شـتێکی ڕوونو ئاشـکرایە، هەروەهـا بەڵگەیـە لەسـەر فراوانـی زانسـتی خوا، کـە مـردوو لـە گۆڕەکانـەوە زینـدوو دەکاتـەوە، بـەڵام کەسـی بێئاگـا تەماشـای ئـەم شـتانەو جگـە لەمانـەش دەکات بـە چـاوی بێئاگایـی، هیـچ بیـری لێناکاتـەوەو سـەرنج نـادات، بەڵکـو ئـەوە سـوودی لێوەردەگـرێ کـە لـە خـوای بـەرزو مـەزن دەترسـێ، وە بـە بیـرو بۆچوونـی ڕاسـت ڕووی حیکمـەت دەزانـێ لەوانـەدا.

لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُا۟﴾ جـا هـەر کەسـێک زانـا بـێ بـە خـوا ئـەوە زۆرتـر لێـی دەترسـێ، ترسـان لـە خـوا ئـەوە پێویسـت دەکات لەسـەری کـە واز لـە سـەرپێچی بهێنـێ، وە خـۆی ئامـادە بـکات بـۆ گەیشـتن بـەو کەسـەی لێـی دەترسـێ، ئەمـەش بەڵگەیـە لەسـەر چاکـی زانسـتو زانیاریـی، بێگومـان زانسـت پاڵنـەرە بـۆ ترسـان لـە خـوا، ئەوانـەی لێـی دەترسـن ڕێـز لێگیـراون لـە لای ئـەو، هـەروەک خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ ۚ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِيَ رَبَّهُۥ ﴿٨﴾﴾البينة، (واتـە: خـوا لێیـان ڕازی بـوو، وە ئـەوان لـە خـوا ڕازی بـوون، ئەمـە بـۆ کەسـێکە کـە لـە خـوا بترسـێ)، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ﴾ واتـە: (بێگومـان خـوا زاڵـە) بـە تـەواوی زاڵێتـی، وە لـە زاڵـی ئـەو ئـەم بەدیهێنـراوە دژیەکانـەی دروسـتکردوە، ﴿غَفُورٌ﴾ (لێبوردەیـە) لـە گوناهـی تەوبـەکاران.

(٢٩-٣٠): ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَتْلُونَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً يَرْجُونَ تِجَٰرَةً لَّن تَبُورَ ﴿٢٩﴾ لِيُوَفِّيَهُمْ أُجُورَهُمْ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ غَفُورٌ شَكُورٌ ﴿٣٠﴾﴾

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَتْلُونَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ﴾ واتـە: (بـە ڕاسـتی ئەوانـەی کـە کتێبـی خـوا دەخوێننـەوە) واتـە: شـوێنی دەکـەون لـە فەرمانەکانیـداو جێبەجێیـان دەکـەن، وە لـە قەدەغەکراوەکانیـدا وازی لێدێنـن، وە لـە هەواڵەکانیـدا بەڕاسـتی دەزانـن بڕوایـان پێیەتی، ئـەو قسـانەی پێـش ناخـەن بەسـەریدا کـە پێچەوانەیەتـی، هەروەهـا دەیخوێننـەوەو ماناکانـی لێکدەدەنـەوە.

پاشـان تایبەتـی کـردوە لـە خوێندنـەوەدا دوای ئـەوەی نوێـژی گشـتگیر کـردوە کـە کۆڵەکـەی دیـنو ڕووناکـی مسـوڵمانانو تـەرازووی ئیمـانو نیشـانەی ڕاسـتی ئیسـلامە، وە بەخشـین لەسـەر خزمـەکانو هـەژارو یەتیمـەکانو جگـە لـە ئەوانیـش، لـە زەکاتو کەفارەتـەکانو نـەزرو خێـرو چاکـەکان ﴿سِرًّا وَعَلَانِيَةً﴾ (بـە نهێنـیو ئاشـکرا) لـە هەمـوو کاتەکانـدا دەبەخشـن.

﴿يَرْجُونَ﴾ بەوانـە (چاوەڕوانـی) ﴿تِجَـٰرَةً لَّن تَبُورَ﴾ واتـە: (بازرگانیەکـە هەرگیـز زەرەر نـاکاو لەنـاو ناچـێ، بەڵکـو بازرگانیەکـە لـە گەورەترینـی بازرگانیەکانو بەرزتریـنو چاکترینیانـە، بێگومـان ئەویـش ڕەزامەنـدی پەروەردگاریـانو سـەرکەوتنە بـە پاداشـتە بـێ پایانەکانـی، ڕزگـار بوونـە لـە خەشـمو قیـنو سـزاکانی، ئەمـە ئـەوەی تێدایـە بێگومـان ئـەوان کردەوەکانیـان بـە دڵسـۆزی ئەنجـام دەدەن، لـە ئەنجامدانـی کردەوەکانیانـدا مەبەسـتو نیـازی خراپیـان نیـە.

خـوا ﷻ باسـیکردوە کـە بێگومـان ئـەوان ئـەوەی چاوەڕوانیـان کـردوە بـە دەسـتیان هێنـاوە، بۆیـە فەرموویەتـی: ﴿لِيُوَفِّيَهُمْ أُجُورَهُمْ﴾ واتـە: پاداشـتی کردەوەکانیـان، بـە پێـی کەمـیو زۆریو چاکـیو نەبوونـی، ﴿وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِۦٓ﴾ پاداشـتێکی زیاتریـان بداتـەوە ﴿إِنَّهُۥ غَفُورٌ شَكُورٌ﴾ لـە گوناهەکانیـان خـۆش بـووە، وە چاکـەی کەمـی لێوەرگرتـوون.

وَٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ هُوَ ٱلْحَقُّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ
يَدَيْهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِعِبَادِهِۦ لَخَبِيرٌۢ بَصِيرٌ ﴿٣١﴾ ثُمَّ أَوْرَثْنَا ٱلْكِتَٰبَ
ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا ۖ فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ وَمِنْهُم
مُّقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌۢ بِٱلْخَيْرَٰتِ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ
ٱلْفَضْلُ ٱلْكَبِيرُ ﴿٣٢﴾ جَنَّٰتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا يُحَلَّوْنَ
فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَلُؤْلُؤًا ۖ وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ ﴿٣٣﴾
وَقَالُوا۟ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَذْهَبَ عَنَّا ٱلْحَزَنَ ۖ إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٌ
شَكُورٌ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِىٓ أَحَلَّنَا دَارَ ٱلْمُقَامَةِ مِن فَضْلِهِۦ لَا يَمَسُّنَا
فِيهَا نَصَبٌ وَلَا يَمَسُّنَا فِيهَا لُغُوبٌ ﴿٣٥﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَهُمْ
نَارُ جَهَنَّمَ لَا يُقْضَىٰ عَلَيْهِمْ فَيَمُوتُوا۟ وَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُم مِّنْ
عَذَابِهَا ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى كُلَّ كَفُورٍ ﴿٣٦﴾ وَهُمْ يَصْطَرِخُونَ
فِيهَا رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا نَعْمَلْ صَٰلِحًا غَيْرَ ٱلَّذِى كُنَّا نَعْمَلُ ۚ
أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُ ۖ
فَذُوقُوا۟ فَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ﴿٣٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ عَٰلِمُ
غَيْبِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٣٨﴾

(٣١-٣٥): ﴿وَٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ هُوَ ٱلْحَقُّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِعِبَادِهِۦ لَخَبِيرٌۢ بَصِيرٌ ﴿٣١﴾ ثُمَّ أَوْرَثْنَا ٱلْكِتَٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا ۖ فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌۢ بِٱلْخَيْرَٰتِ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْكَبِيرُ ﴿٣٢﴾ جَنَّٰتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَلُؤْلُؤًا ۖ وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ ﴿٣٣﴾ وَقَالُوا۟ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَذْهَبَ عَنَّا ٱلْحَزَنَ ۖ إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٌ شَكُورٌ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِىٓ أَحَلَّنَا دَارَ ٱلْمُقَامَةِ مِن فَضْلِهِۦ لَا يَمَسُّنَا فِيهَا نَصَبٌ وَلَا يَمَسُّنَا فِيهَا لُغُوبٌ ﴿٣٥﴾﴾:

﴿وَٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ﴾

خوا ﷻ باسیکردوە ئەو کتێبەی وەحی کردوە بـۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ، ﴿هُوَ ٱلْحَقُّ﴾ لەوەی کـە حەقو ڕاسـتی زۆری لەخۆ گرتـووە، وەک ئەوە وایە حـەق لـەوەدا کورتهەڵهێنرابێ، با لـە دڵتانـدا خـەمو بێـزاری نەبـێ، وە بە کەمو سـووک تەماشـای مەکـەن، جا ئەگـەر ئەوە حـەق بـێ ئەوە پێویسـتە هەمـوو ئەوانەی کـە بەڵگەن لەسـەری لە مەسـەلە پەرسـتراوێتیو پەنهانـەکانو غەیـری ئەوانیـش پڕاوپڕبـێ لەگـەڵ واقیعدا، نابێ مەبەسـت پێی ئـەوە بێ کە پێچەوانـەی ڕواڵەتی بێو ئەوەیشـی بەڵگەیە لەسـەری.

﴿مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ﴾ (واتـە: ئەو قورئانە ڕاسـتەو پشـتیوانی کتێبەکانـی پێش خۆیەتی)، لـە کتێبـەکانو پێغەمبـەران، چونکـە هەواڵـی پێـداوە جـا کاتـێ دەرکـەوت بـە هـۆی دەرکەوتنیەوە ڕاستیەکەیشـی ئاشـکرا بـوو، ئەو قورئانە مـژدەو هەواڵی پێداوە، وە بەڕاسـتی دانـاوە، لەبـەر ئەمەیـە نابێ بۆ هیچ کەسـێ بـڕوای بـە کتێبەکانی پێشـوو هەبـێو بێبڕوابێ بـە قورئـان، چونکە بێبڕوایی پێـی بڕوابوونی بە کتێبەکانـی دیکە هەڵدەوەشـێنێتەوە، چونکە لـە کـۆی هەواڵـی کتێبەکانـی پێشـوودا، هەواڵدانە دەربـارەی قورئـان، وە هەواڵەکانیشـی پڕاوپـڕە لەگـەڵ هەواڵەکانـی قورئانـدا. ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِعِبَادِهِۦ لَخَبِيرٌۢ بَصِيرٌ﴾ (واتـە: بێگومان

خـوا بـە بەندەکانـی ئاگـادارو بینایـە) دەیبەخشـێ بە هەمـوو ئۆممـەتو بە هەموو کەسـێ ئەوەی شایسـتەیە بـە بارودۆخی،

لەوانە: شەریعەتەکانی پێشوو شیاو نین تەنها بۆ کاتو سەردەمی خۆیان نەبێ، لەبەر ئەمەیە بەردەوام خوا ﷻ پێغەمبەرانی ناردووە، نێردراو لە دوای نێردراو، تا کۆتای پێهێناون بە موحەممەد ﷺ، جا ئەویش ئەم شەریعەتەی هێناوە کە لەگەڵ بەرژەوەندیەکانی خەڵکدا دەگونجێ تا ڕۆژی دوایی، وە گرەنتی دەدا بە هەموو خێرو چاکەیەک لە هەموو کاتێکدا.

لەبەر ئەمەیە کە ئەم ئۆممەتە تەواوترینی ئۆممەتەکانە لەرووی عەقڵەوە، وە خاوەن چاکترین بیرۆکەنو دڵیان زۆر نەرمەو نەفسیان زۆر پاکە، خوا ﷻ پاڵفتەی کردوونو ئاینی ئیسلامی بۆ هەڵبژاردوون، وە قورئانی پێبەخشیوون کە چاودێرو پارێزگارە لەسەر هەموو کتێبەکان، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ ثُمَّ أَوْرَثْنَا ٱلْكِتَـٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا ﴾ (واتە: پاشان ئەو قورئانەمان بەخشی بە کەسانێ کە لە ناو بەندەکانماندا هەڵمان بژاردوون) ئەوانیش ئەم ئۆممەتەن: ﴿ فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ ﴾ (ئینجا هەندێکیان ستەمکارن لە خودی خۆیان)، بە سەرپێچی کردن جگە لە کوفرو بێبڕوایی، ﴿ وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ ﴾ (هەندێکیان مامناوەندن) ئەوەی لەسەر شانی پێویستە جێبەجێی دەکات بە کورتی، وازی لە حەرامکراو هێناوە ﴿ وَمِنْهُمْ سَابِقٌۢ بِٱلْخَيْرَٰتِ ﴾ واتە: هەوڵی بۆ دەداو کۆششی بۆ دەکات، بۆیە پێشکەوتووە بەسەر غەیری خۆیدا، ئەو فەرزەکان جێبەجێ دەکاتو سوننەتەکانیش بە زۆری ئەنجام دەدات، وازی هێناوە لە حەرامکراو ئەوەیشی کە خراپە.

هەموویـان خـوا ﷻ هەڵیبـژاردوون بـە بەخشـینی ئـەم کتێبـە، ئەگەرچـی پلـەو پایەیـان جیاوازبـێو بارودۆخیـان جیاکرابێتەوە، هەریەکەیان بەشـێکیان هەیە لەو بەخشـینە، تەنانەت ئەوانەشـی سـتەم لـە خۆیـان دەکـەن، چونکـە بێگومـان هـەر کەسـێک بنچینـەی ئیمانو زانسـتەکانی ئیمـانو کـردەوەی ئیمانـی هەبێ، ئـەوە لـە میراتگرانـی کتێبە.

چونکـە مەبەسـت لـە میراتگریو بەخشـینی کتێـب بەخشـینی زانسـتو کردەوەپێکردنو خوێندنـەوەیو دەرهێنانـی واتاکانێتـی، وە کـە دەفەرمـوێ: ﴿ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ﴾ دەگەڕێتـەوە بۆ ئەوانـەی بـە فەرمانی خوا پێشـکەوتوون بـە هۆی کـردەوە چاکەکانیانەوە، بۆ ئـەوەی بوغرا نەبـێو لە خـۆی دەرنەچـێ بەهـۆی کردەوەکانیـەوە، بەڵکو چاکـەکان پێش ناخـات تەنها بـە یارمەتـی خـواو پشـتیوانی ئەو نەبـێ، بۆیە پێویسـتە لەسـەری خۆی سـەرقاڵ بـکات بە سوپاسـگوزاری خـوا لەسـەر ئـەو نیعمەتەی خوا پێـی داوە.

﴿ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَضۡلُ ٱلۡكَبِيرُ ﴾ واتــە: میراتگــریو بەخشــینی کتێبــی پیــرۆز کــە قورئانــە بــۆ ئــەو کەســەیە خــوا ﷻ هەڵبیــژاردووە لەنێــوان بەندەکانــی، ئــەوەش فەزڵێکــی گەورەیــە، کــە هەمــوو نازونیعمەتــەکان لەچــاوی ئــەو نیعمەتــەدا وەکــو نەبــوون وان، جا گەورەتریــن نیعمــەت بــە ڕەهایــیو گەورەترین فــەزڵو چاکــە بەخشــینی ئــەم قورئانەیە.
پاشــان باســی پاداشــتی ئەوانەی کردوە کــە کتێبی پــێ بەخشــیون فەرموویەتی: ﴿ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ يَدۡخُلُونَهَا ﴾ واتــە: بەهەشــتانێک داروو درەخــتو ســێبەرو باخچەی جــوانو ڕووباری هەڵقــوڵاوو تــەلارو باڵەخانــەی بــەرزو ڕازاوەی لەخۆگرتووە بــۆ هەتا هەتاییــەو هەرگیز لە دەســتیان ناچــێ، وە ژیانێــک کە قــەت کۆتایی پــێ نایەت.
(العــدن): واتــە: مانــەوە، جــا: ﴿ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ ﴾ واتــە: بەهەشــتانێک کــە جێگــەی مانەوەیــە، داویەتیــە پــاڵ مانــەوە، چونکــە مانــەوەی هەتــا هەتایــی وەســفی ئەو بەهەشــتەو خەڵکەکەیەتــی، ﴿ يُحَلَّوۡنَ فِيهَا مِنۡ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٖ ﴾ (واتــە: لەوێــدا بــە بازنــی ئاڵتــونو مــرواری دەڕازێنرێنــەوە) ئەویــش بازنــە دەخرێتە هەردوو دەســت لەوەی پێیان خۆشــە، وە دەبینــن ئــەوە لــە هەمــووی چاکتــرە، پیــاوانو ئافرەتــان لــە خۆڕازاندنــەوە لەناو بەهەشــتدا یەکســانن ﴿ وَلُؤۡلُؤٗا ﴾، خۆیــان دەڕازێننــەوە بە مــرواری، کــە ڕێک دەخرێ لەســەر جلو جەســتەیان ﴿ وَلِبَاسُهُمۡ فِيهَا حَرِيرٞ ﴾ (واتــە: پۆشــاکیان تێیــدا) لــە حەریــری ئاوریشــمی نەرمو تەنکو ئاوریشــمی سەوزو ئەســتوورە، ﴿ وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَذۡهَبَ عَنَّا ٱلۡحَزَنَ ﴾ کاتــێ خوای گــەورە نازو نیعمــەتو لەزەتەکانــی تەواوکرد بۆیــان (ئەوان دەڵێن: ســوپاس بــۆ ئــەو خوایــە کــە خەفەتــی لابردینو نەیهێشــت) کــە ئەمــە هەمــوو خــەمو بێتاقەتیەک دەگرێتــەوە، هەرگیــز تووشــی خــەم نابن، نە بەهــۆی ناتەواوی لــە جوانیان، نە لــە خواردنو خواردنەوەکانیــان، نــە لــە چێژوو لەزەتیــان، نە لــە جەســتەیانو نەمانەوەیان بــە بەردەوامی.
ئــەوان لــە نــازو نیعمەتێکدان لە ســەرووی ئــەوەوە شــتێکی دیکە نابینــن، ئــەو نازونیعمەتە بۆیــان لــە بــەردەوام بووندایــە ﴿ إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٞ ﴾ کاتــێ لــە هەڵەکانمــان خــۆش بوو، ﴿ شَكُورٌ ﴾ کاتــێ چاکەکانمانــی وەرگــرتو چەنــد ئەوەندە زیــادی کرد بۆمــان، وە لە فــەزڵو چاکــەی خــۆی ئەوەندەی پێمان بەخشــی کــە کــردەوەو ئاواتەکانمان پێــی ناگات، بــە میهرەبانــی ئــەو ڕزگاریان بوو لە هەموو ناخۆشــیو مەترســیەک، وە بە سوپاســگوزاریو فــەزڵو چاکــەی ئــەو هەمــوو شــتێکی خــوازراو پەســندیان بــۆ دەســتەبەر بــوو، ﴿ ٱلَّذِيٓ أَحَلَّنَا ﴾ واتە: نیشــتەجێی کردین بە نیشــتەجێبوون، نەک نیشــتەجێیەکی کاتــیو تێپەڕبوون

﴿ دَارَ ٱلْمُقَامَةِ ﴾ واتـە: ئـەو ماڵـەی بەردەوامـەو هەمیشـەییە، وە ئـەو ماڵەی مـرۆڤ حەز دەکات تیایـدا بمێنێتـەوە بـە هـۆی زۆری خێرو خێـراتو بـەردەوام بوونی خۆشـیەکانیو نەمانـی نارەحەتیەکان.

ئـەو نیشـتەجێ بوونـە ﴿ مِن فَضْلِهِۦ ﴾ (لە فەزڵـی خوایە) بەسـەرمانەوە، وە لە بەخشـندەیی ئـەوە نـەک بـە هـۆی کردەوەکانمـان، جـا ئەگـەر بـە هـۆی فـەزڵو چاکـەی ئـەو نەبێ نەدەگەیشـتین بـەوەی پێی گەیشـتوون.

﴿ لَا يَمَسُّنَا فِيهَا نَصَبٌ وَلَا يَمَسُّنَا فِيهَا لُغُوبٌ ﴾ واتە: بە هیچ شێوەیەک دڵو جەستە لە بەهەشتدا ماندوو نابن، هەروەها ماندووش نابن بە هۆی چێژ وەرگرتنی زۆرەوە، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خوا ﷻ لە جەستەکانیاندا هێزو دروستکردنەوەی تەواویان پێدەبەخشێ، وە هۆکارەکانی پشوودانو بەردەوام بوونیان بۆ دەرەخسێنێ کە بەم سیفەتە بێ، بەجۆرێ هەرگیز دووچاری ماندوو بوونو ئەرکو زەحمەتو خەمو خەفەتو پەژارە نەبن.

وە بەڵگەیـە لەسـەر ئەوەی ئـەوان لەناو بەهەشـتدا ناخەون، چونکە سـوودی خـەو بۆ نەمانی ماندوێتیـە، وە بەدەسـتهێنانی پشـوودانو حەوانەوەیـە، خەڵکـی بەهەشـتیش بـە پێچەوانەی ئـەوەن، وە لەبـەر ئـەوەی خـەو مردنـی بچووکـە، خەڵکی بەهەشـتیش تووشـی ئـەو مردنە نابـن، خـوا بمانگێـرێ لە ئـەوان بە منـەتو بەخشـندەیی خۆی.

(٣٦-٣٧): ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَهُمْ نَارُ جَهَنَّمَ لَا يُقْضَىٰ عَلَيْهِمْ فَيَمُوتُوا۟ وَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُم مِّنْ عَذَابِهَا ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى كُلَّ كَفُورٍ ﴿٣٦﴾ وَهُمْ يَصْطَرِخُونَ فِيهَا رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا نَعْمَلْ صَٰلِحًا غَيْرَ ٱلَّذِى كُنَّا نَعْمَلُ ۚ أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُ ۖ فَذُوقُوا۟ فَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ﴿٣٧﴾ ﴾:

کاتـێ خـوا ﷻ باسـی حاڵـی ئەهلی بەهەشـتو نـازو نیعمەتەکانی کـرد، ئینجا باسـی حاڵی ئەهلـی دۆزەخو سـزادانیانی دەکاتو دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ﴾ واتـە: نکووڵیان کرد لـەوەی پێغەمبەرەکانیـان بۆیـان هێنـاون لـە ئایەتـەکان، وە ئینکاری گەیشـتن بـە خوایان دەکـرد ﴿ لَهُمْ نَارُ جَهَنَّمَ ﴾ (ئاگـری دۆزەخیـان بـۆ هەیە) تیایدا سـزا دەدرێـن بە توند تریـن سـزاو بـە ئێشـترینیان، ﴿ لَا يُقْضَىٰ عَلَيْهِمْ ﴾ بە مـردن ﴿ فَيَمُوتُوا۟ ﴾ تـا بحەوێنەوە ﴿ وَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُم مِّنْ عَذَابِهَا ﴾ (واتـە: هەروەهـا هەنـدێ لە سـزای دۆزەخیان لەسـەر سـووک ناکـرێ). جـا توونـدیو سـەختی سـزا بەردەوامـە لەسـەریان لـە هەمـوو کاتو ساتەکاندا.

﴿ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي كُلَّ كَفُورٖ ٣٦ وَهُمۡ يَصۡطَرِخُونَ فِيهَا ﴾ (واتـە: ئـا بـەو جـۆرە تۆڵـە دەسـەنین لـە هەمـوو بێبڕوایـەک، ئەوان) هـاوار دەکـەنو دەڵێـن: ﴿ رَبَّنَآ أَخۡرِجۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا غَيۡرَ ٱلَّذِي كُنَّا نَعۡمَلُ ﴾ (واتـە: ئـەی پەروەردگارمـان لە دۆزەخ دەرمـان بێنە، تا کـردەوەی چـاک بکەیـن، جیاواز لـەوەی دەمان کـرد) دان بـە تاوانەکانی خۆیـان دەنێنو دەزانـن خـوا دادپـەروەرە بۆیان، بـەڵام لە غەیری کاتـی خۆیـدا داوای گەڕانەوەیـان کرد. پێیـان دەوتـرێ: ﴿ أَوَلَمۡ نُعَمِّرۡكُم مَّا ﴾ واتـە: سـاڵانێکو تەمەنێـک ﴿ يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ ﴾ واتـە: وەری بگرێـت ئـەوەی دەیەوێـت بیر بکاتەوە لـە کردەوە، نـازو نیعمەتمان پێـدان لـە دونیـا، وە هۆکارەکانـی ڕەحمەتمـان بـۆ براندنـەوەو تەمەنمـان درێژ کـردەوە، ئایەتەکانمـان بۆ ناردنو هەڕەشـەمان پێگەیاندن، وە تاقیمان کردنەوە بە خۆشـیو ناخۆشـی، بـۆ ئـەوەی بگەڕێنەوە بـۆ لامانو ملکـەچ بن.

ترسـاندن هیـچ سـوودێکی نەبـوو بۆتـانو ئامۆژگاریـش کەڵکی نەبـوو بۆتان، سـزامان بۆ دواخسـتن، هەتـا ئەجەلتان کۆتایـی پێهاتو تەمەنتـان تەواو بـوو، ماڵی توانـای ئەنجامدانی کردەوەتـان بـە خراپتریـن حاڵەتـەکان بەجێهێشـتو گەیشـتن بەم ماڵـە کە ماڵی پاداشـتە لەسـەر کـردەوەکان، داوای گەڕانەوەتـان کرد؟

ئەسـتەمە ئەسـتەم، کاتـێ توانـا بەسـەرچوو، خـوای بـە سـۆزو بەزەیـی خەشـمو تووڕەیی بـۆ پێویسـت کـردنو، سـزای ئاگـر لەسـەرتان توونـد بـوو، خەڵکانـی بەهەشـت ئێوەیان بیرچـوو، تیایـدا بمێننـەوە بـۆ هەمیشـەیی، لـە سـزای سەرزەنشـت کراوبـن! لەبـەر ئەمەیە فەرموویەتـی: ﴿ فَذُوقُواْ فَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ﴾ (واتـە: دەی ئەو سـزایە بچێژن چونکە هیـچ یاریدەدەرێـک بۆ سـتەمکارەکان نیە)، سـەریان بخاتو لـە دۆزەخ دەریـان بێنێ، یان لەسـەریان سـووک بـکات لە سـزای دۆزەخ.

(٣٨): ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَٰلِمُ غَيۡبِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ٣٨ ﴾:

(دوای ئـەوەی) خـوا ﷻ باسـی پاداشـتی خەڵکانی هەردوو ماڵـی کرد، وە باسـی کردەوەی ئـەو دوو دەسـتەیەی کـرد، ئنجـا هەواڵیداوە دەربـارەی بەرفراوانـی زانسـتیو ئاگاداربوونی لـە نهێنـی ئاسـمانەکانو زەوی، کە شـاراونەتەوە لـە پێش چـاوی دروسـتکراوەکان، وە لە زانسـتیان، بێگومـان خوا زانایـە بە نهێنیەکان، ئەوەشـی شـاراوەتەوە لە خێرو شـەڕو پاکیو جگـە لەوانـەش، دەبەخشـێ بـە هـەر یەکێک بـەوەی شایسـتەیەتیو هەر کەسـێ بـە پێی پلەو پایـەی خۆی.

هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ فِي ٱلْأَرْضِ فَمَن كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُۥ وَلَا يَزِيدُ ٱلْكَٰفِرِينَ كُفْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ إِلَّا مَقْتًا وَلَا يَزِيدُ ٱلْكَٰفِرِينَ كُفْرُهُمْ إِلَّا خَسَارًا ﴿٣٩﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ شُرَكَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَرُونِي مَاذَا خَلَقُوا۟ مِنَ ٱلْأَرْضِ أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَمْ ءَاتَيْنَٰهُمْ كِتَٰبًا فَهُمْ عَلَىٰ بَيِّنَتٍ مِّنْهُ بَلْ إِن يَعِدُ ٱلظَّٰلِمُونَ بَعْضُهُم بَعْضًا إِلَّا غُرُورًا ﴿٤٠﴾ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ يُمْسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ أَن تَزُولَا وَلَئِن زَالَتَآ إِنْ أَمْسَكَهُمَا مِنْ أَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِهِۦٓ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴿٤١﴾ وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ لَئِن جَآءَهُمْ نَذِيرٌ لَّيَكُونُنَّ أَهْدَىٰ مِنْ إِحْدَى ٱلْأُمَمِ فَلَمَّا جَآءَهُمْ نَذِيرٌ مَّا زَادَهُمْ إِلَّا نُفُورًا ﴿٤٢﴾ ٱسْتِكْبَارًا فِي ٱلْأَرْضِ وَمَكْرَ ٱلسَّيِّئِ وَلَا يَحِيقُ ٱلْمَكْرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِۦ فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا سُنَّتَ ٱلْأَوَّلِينَ فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحْوِيلًا ﴿٤٣﴾ أَوَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِي ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَكَانُوٓا۟ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعْجِزَهُۥ مِن شَيْءٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلْأَرْضِ إِنَّهُۥ كَانَ عَلِيمًا قَدِيرًا ﴿٤٤﴾

(٣٩): ﴿ هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ فِي ٱلْأَرْضِ فَمَن كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُۥ وَلَا يَزِيدُ ٱلْكَٰفِرِينَ كُفْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ إِلَّا مَقْتًا وَلَا يَزِيدُ ٱلْكَٰفِرِينَ كُفْرُهُمْ إِلَّا خَسَارًا ﴿٣٩﴾ ﴾:

﴿ هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ فِي ٱلْأَرْضِ فَمَن كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُۥ وَلَا يَزِيدُ ٱلْكَٰفِرِينَ كُفْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ إِلَّا مَقْتًا ﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدات دەربارەی تەواوی حیکمەتی‌و میهرەبانی بە بەندەکانی، ئەو بڕیاری داوە بە قەزاو قەدەری لە پێشوو، هەندێکیان بکاتە جێنشینی هەندێکی دیکە لەسەر زەویدا، وە بۆ هەر ئوممەتێ لە ئوممەتەکان ترسێنەرێ بنێرێ، تا تەماشا بکرێ چۆن ڕەفتار دەکەن، جا ئەوەی کوفر بەخوا بکات، وە بەوەی پێغەمبەرانی هێناویانە، ئەوە بێگومان کوفرەکەی لەسەریەتی، تاوانو سزاکەیشی هەر لەسەریەتی، هیچ کەس بۆی هەڵناگرێ، وە بێبڕوا هیچی بۆ زیاد ناکرێ جگە لە خەشم‌و قین‌و تووڕەیی پەروەردگاری نەبێت بۆی، جا چ تووڕەییەک مەزنترە لە تووڕەیی پەروەردگاری بەخشندە؟!

﴿ وَلَا يَزِيدُ ٱلْكَٰفِرِينَ كُفْرُهُمْ إِلَّا خَسَارًا ﴾ واتە: (بێبڕوایی کافران هیچیان بۆ زیاد ناکات بێجگە لە زەرەرمەندی نەبێت) زەرەرمەندی نەفس‌و دەرون‌و ماڵ‌و کردەوەکانیان دەبن، وە پلەو پایەیان لە بەهەشتدا، جا بێبڕوا بەردەوام لە بەدبەختی‌و زەرەرمەندی دایە، وە ڕیسوایی‌و سووکی‌و بێبەش بوون لە لای خواو لە لای خەڵکی.

(٤٠): ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ شُرَكَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَرُونِي مَاذَا خَلَقُوا۟ مِنَ ٱلْأَرْضِ أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَمْ ءَاتَيْنَٰهُمْ كِتَٰبًا فَهُمْ عَلَىٰ بَيِّنَتٍ مِّنْهُ بَلْ إِن يَعِدُ ٱلظَّٰلِمُونَ بَعْضُهُم بَعْضًا إِلَّا غُرُورًا ﴿٤٠﴾ ﴾:

خـــوا ﷻ بـــێ توانایـــی پەرســـتراوی هاوبەشـــدانەرانو ناتەواویـــان، وە بەتاڵـــیو پووچـــی هاوبەشـــدانانەکەیان لـــە هەمـــوو ڕوویەکـــەوە ڕوون دەکاتـــەوە، دەفەرمـــوێ: ﴿ قُلْ ﴾ ئـــەی پێغەمبـــەر ﷺ پێیـــان بڵـــێ: ﴿ أَرَءَيْتُمْ ﴾ واتـــە: هەواڵـــم بدەنـــێ دەربـــارەی هاوبەشـــەکانتان ﴿ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ (واتـــە: ئـــەو هاوبەشـــانەی لـــە جیاتـــی خـــوا دەتانپەرســـتن)، ئایـــا شایســـتەی پاڕانـــەوەو بەندایەتـــی بـــۆ کردنـــن؟ جـــا ﴿ أَرُونِي مَاذَا خَلَقُوا۟ مِنَ ٱلْأَرْضِ ﴾ (واتـــە: نیشـــانم بـــدەن لـــە زەویـــدا چیـــان دروســـتکردوە)، ئایـــا دەریایـــان دروســـتکردوە، یـــــان کێویـــــان دروســـــتکردوە، یاخـــــود گیانـــــداران یاخـــــود بێگیانـــــەکان؟ بێگومـــــان دانـــی پێدادەنێـــن کـــە بەدیهێنـــەری هەمـــوو شـــتەکان خـــوای بـــەرزو مەزنـــە، یـــان لـــە هاوبەشـــــەکانتان بـــــەژدارن ﴿ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ ﴾ (لـــــە ئاســـــمانەکان) لـــــە دروســـــتکردنیانو بەڕێوەبردنیـــان؟ بێگومـــان دەڵێـــن بەشـــدار نیـــن.

جـــا ئەگـــەر هیـــچ شـــتێکیان دروســـت نەکردبـــێو لەگـــەڵ بەدیهێنـــەردا بەشـــدار نەبووبـــن لـــە دروســـتکردندا، ئـــەی بۆچـــی دەتانپەرســـتنو هاوارتـــان پـــێ دەکـــردن، لەگـــەڵ ئـــەوەی دان بـــە بـــێ تواناییانـــدا دەنێـــن؟ بـــە بەڵگـــەی عەقڵـــی ڕاســـتی بەندایەتـــی ئـــەوان ڕەتکرایـــەوەو دەرکـــەوت پووچـــە.

پاشـــان باســـی بەڵگـــەی بیســـتنی کـــردوە ئەویـــش بـــە هەمـــان شـــێوە ڕەتکراوەتـــەوە، لەبـــەر ئەمەیـــە فەرموویەتـــی: ﴿ أَمْ ءَاتَيْنَٰهُمْ كِتَٰبًا ﴾ (واتـــە: یـــان کتێبێکمـــان پێـــداون)، باســـی ئـــەوەی بـــۆ کـــردوون کـــە هاوبەشـــیان بـــۆی دانـــاوە، فەرمانـــی پێکـــردوون بـــە هاوبەشـــدانانو بەندایەتـــی کردنـــی بتـــەکان ﴿ فَهُمْ ﴾ ئـــەوان لـــە هاوبەشـــدانانیاندا ﴿ عَلَىٰ بَيِّنَتٍ ﴾ (لـــە ســـەر بەڵگـــەن) لـــەو کتێبـــەی کـــە بۆیـــان دابەزیـــوە لەســـەر ڕاســـتیو دروســـتی هاوبەشـــدانان؟ کارەکـــە بـــەو شـــێوەیە نیـــە، بێگومـــان ئـــەوان پێـــش قورئـــان کتێبیـــان بـــۆ دانەبەزیـــوە، پێـــش پێغەمبەریـــش نێردراویـــان بـــۆ نەهاتـــووە. ئەگـــەر وادابنرێ کتێبیـــان بـــۆ دابەزیـــوەو پێغەمبەریـــان بـــۆ نێـــردراوە، وە پێیـــان وابـــێ ئـــەو کتێبـــە فەرمانـــی پێکـــردوون بـــە هاوبەشـــدانان، ئـــەوە ئێمـــە دان بـــە درۆکانیانـــدا دەنێیـــنو دڵنیایـــن لـــەوە، چونکـــە خـــــوا ﷻ فەرموویەتـــی: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِىٓ إِلَيْهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعْبُدُونِ ﴿٢٥﴾ ﴾الأنبيـاء، (واتـــە: وە ئێمـــە نەمـــان نـــاردووە پێـــش تـــۆ هیـــچ پێغەمبـــەرێ مەگـــەر وەحیمـــان بـــۆ نەنـــاردووە بـــەوەی کـــە بێگومـــان جگـــە لەمـــن هیـــچ پەرســـتراوێکی ڕاســـت نیـــە کەواتـــە تەنهـــا مـــن بپەرســـتن)، جـــا پێغەمبـــەرانو کتێبـــەکان

هەموویـان یەکدەنگـن لەسـەر فەرمـان کـردن بـە دڵسـۆزیو ملکـەچ بـوون بـۆ خـوای گـەورە، ﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ ۝٥﴾ البينة، (واتـە: فەرمانیـان پـێ نەدرابـوو مەگـەر بـەوەی کـە پەرستشـی خـوا بکـەن بـە دڵسـۆزی ملکەچـی بـۆ بکـەن).

جـا ئەگـەر وتـرا: ئەگـەر بەڵگـەی عەقڵـیو نەقڵـی ئامـاژە دەکـەن لـە سـەر پووچـیو بەتاڵـی هاوبەشـدانان، چـی وای لـە هاوبەشـدانەران کـرد لەسـەر هاوبەشـدانان، لەگـەڵ ئـەوەدا تیایاندایـە خەڵکـی خـاوەن عەقـڵو ژیـریو زیرەکـی؟ خـوا ﷻ وەڵامـی دایـەوە بـە وتـەی خـۆی: ﴿بَلۡ إِن يَعِدُ ٱلظَّٰلِمُونَ بَعۡضُهُم بَعۡضًا إِلَّا غُرُورًا﴾ واتـە: ئـەوەی لەسـەری ڕۆیشـتن هیـچ بەڵگەیەکیـان پـێ نەبـوو دەربـارەی، بەڵکـو وەسـیەتی هەندێکیـان بـوو بـۆ هەندێکـی دیکەیـان، وە ڕازاندنـەوەی هەندێکیـان بـە هەندێکیـان، وە پەیڕەوکردنـی دوواکەوتـوو بـە پێشـینە گومـڕاکان، وە ئاواتێـک بـوو شـەیتان منەتی کـرد بەسـەریانداو کـردەوە ناشـرینەکانیانی بـۆ ڕازانـدەوە، جـا لـە دڵیانـدا گەشـەی کـردوو بـووە سـیفەتێ لـە سـیفاتەکانیان، تـا لابـردنو جیاکردنـەوەی قـورسو گـران بـوو، بۆیـە بـەو جـۆرە مانـەوە لەسـەر بێبڕوایـیو هاوبەشـدانانی پـووچو پـەرشو بـڵاو.

(٤١): ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُمۡسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ أَن تَزُولَاۚ وَلَئِن زَالَتَآ إِنۡ أَمۡسَكَهُمَا مِنۡ أَحَدٖ مِّنۢ بَعۡدِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورٗا ۝٤١﴾:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُمۡسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ أَن تَزُولَاۚ وَلَئِن زَالَتَآ إِنۡ أَمۡسَكَهُمَا مِنۡ أَحَدٖ مِّنۢ بَعۡدِهِۦٓۚ﴾ خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات دەربـارەی تـەواوی دەسـەڵاتو تـەواوی میهرەبانـیو بەرفراوانـی لەسـەرخۆیيو لێبوردنـی، بەڕاسـتی خـوا ئاسـمانەکانو زەوی ڕاگیـر دەکات بـۆ ئـەوەی لـە ڕێـڕەوی خۆیـان لانـەدەن، چونکـە ئەگـەر لـە ڕێـڕەوی خۆیـان لابـدەن، هیـچ بەدیهێنراوێـک ناتوانـێ ڕایـان بگرێـت، وە توانـاو دەسـەڵاتیان دەستەوسـان دەبـێ.

بـەڵام خـوا ﷻ بڕیاریـداوە ببـێ وەک چـۆن بـووە، بـۆ ئـەوەی جێگیـر بـوون بـۆ خەڵکـی دەسـتەبەربێو سـوودی تـەواو بەدەسـتبهێنن، بـۆ ئـەوەی بزانـن بـە دەسـەڵاتو هێـزوو توانـای مەزنـی خـوا، ئابـەو جـۆرە دڵەکانیـان پـڕ دەبـێ لـە گەورەیـیو مەزنـیو خۆشەویسـتیو ڕێـز بـۆ خـوا، وە بـۆ ئـەوەی بزانـن بـە تـەواوی لەسـەر خۆیـیو لێبوردەیـی خـوا بـە مۆڵەتدانـی گوناهبـاران، وە سـزانەدانی سـەرپێچیکاران بـە پەلـە، لەگـەڵ ئـەوەدا ئەگـەر فەرمـان بـکات بـە ئاسـمان بـەرد دەبارێنـێ بـە سـەریاندا،

وە ئەگـەر مۆڵـەت بـدات بـە زەوی قووتیـان دەدات، بـەڵام لێبوردەیـیو لەسـەرخۆییو بەخشـندەیی خـوا دەوری داون واتـە: ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴾ (واتـە: بێگومـان خـوا لەسـەرخۆی لێبوردەیـە).

(٤٢-٤٣): ﴿ وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ لَئِن جَآءَهُمْ نَذِيرٌ لَّيَكُونُنَّ أَهْدَىٰ مِنْ إِحْدَى ٱلْأُمَمِ فَلَمَّا جَآءَهُمْ نَذِيرٌ مَّا زَادَهُمْ إِلَّا نُفُورًا ﴿٤٢﴾ ٱسْتِكْبَارًا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَكْرَ ٱلسَّيِّئِ وَلَا يَحِيقُ ٱلْمَكْرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِۦ فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا سُنَّتَ ٱلْأَوَّلِينَ فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحْوِيلًا ﴿٤٣﴾ ﴾:

﴿ وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ ﴾ ئەوانـەی بـە درۆیـان دەزانیـت ئـەی پێغەمبـەر ﷺ سـوێندیان دەخـوارد بە سـوێند خواردنێکـی زۆر قـووڵ ﴿ لَئِن جَآءَهُمْ نَذِيرٌ لَّيَكُونُنَّ أَهْدَىٰ مِنْ إِحْدَى ٱلْأُمَمِ ﴾ واتـە: ڕێنمایـی کارتـر دەبـن لـە جوولەکـەو گـاورەکان کەچـی بەوەفـا نەبـوون بەرانبـەر بـەو سـوێندو پەیمانانـەی کـە دایـان.

﴿ فَلَمَّا جَآءَهُمْ نَذِيرٌ ﴾ (ئینجـا کاتـێ پێغەمبەرێکـی ترسـێنەریان بـۆ هـات) ڕێنماییـان وەرنەگـرت، چاکتـر نەبـوون لـە یەکێـک لـە ئۆممەتەکانـی پێشـوو لـە وەرگرتنـی هیدایـەت، بەڵکـو ﴿ مَّا زَادَهُمْ ﴾ ئـەو ترسـێنەرەی کـە خـوا نـاردی بـۆ ناویـان هیچـی بۆیـان زیـاد نەکـرد ﴿ إِلَّا نُفُورًا ﴾ جگـە گومڕایـیو عینـادی زیاتـر.

ئـەو سـوێند خواردنەیـان کـە باسـکرا بـە مەبەسـتێکی چـاکو داواکاریەکـی ڕاسـتەقینە نەبـوو، ئەگەرنـا سـەرکەوتوو دەبـوون بـۆی، بەڵکـو لەبـەر خۆبەزلزانیـن بـوو لەنـاو زەویـداو بەسـەر خەڵـکو بەسـەر حەقـەوە، وە قسـەکانیان درۆو ناڕاسـت بوو مەبەسـتیان پێـی فـڕو فێـڵ بـوو، کـە ئـەوان لەسـەر حەقـنو سـوورن لەسـەر بەدەسـتهێنانی، تـا لەخۆباییـەکان پێـی لـە خۆبایـی دەبـن، وە پەیڕەوکارانیـش شـوێنیان دەکـەون، ﴿ وَلَا يَحِيقُ ٱلْمَكْرُ ٱلسَّيِّئُ ﴾ (واتـە: فێـڵو پیلانـی خـراپ) کـە مەبەسـتێتیو مەبەسـتی خراپەکاریـە، وە ئامانجـیو ئەوەیشـی دەیداتـە پاڵـی پـووچو بەتاڵـە ﴿ إِلَّا بِأَهْلِهِۦ ﴾ فـڕو فێڵەکەیـان تەنهـا زیـان بـە خۆیـان دەگەیەنـێ، خـوا ﷻ ڕوونـی کردۆتـەوە بـۆ بەندەکانـی لـەم قسـانەدا، وە لـەو سـوێندانەدا، ئـەوان درۆ دەکـەن لـەوەداو سـاختەچین، ڕیسـواییو سـووکیان ڕوون بوویـەوەو دەرکـەوت، فـڕو فێڵەکەیـان بـۆ سـەرخۆیان گەڕایـەوە، خـوای گـەورە پیلانەکانیانـی نـاو سـینەیانی هەڵوەشـاندەوە، هیچیـان بـۆ نەمایـەوە تەنهـا ئـەوە نەبـێ چاوەڕوانـی ئـەوە بکـەن سـزایان لەسـەر حـەڵاڵ بـێ، کـە

ئـەوە سـوننەتی خوایـە لـە گەلـە پێشـینەکاندا، بـە هیـچ شـێوەیەک گۆڕانـی بەسـەردا نایـەت، بێگومـان هەرکەسـێ لەسـەر سـتەمو عینـادی بـڕوا، وە خـۆی بەگـەورە بزانـێ بەسـەر بەندەکانـدا سـزاو تۆڵـەی خـوای لەسـەر حـەڵاڵ دەبـێ، وە نیعمەتەکانـی لـێ دادەڕنـێ، دەی بـا ئەوانـە ئاگـاداری خۆیـان بـن، کـە ئەوانـی پێشـنیان چیـان بەسـەر هـات.

(٤٤-٤٥): ﴿ أَوَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَكَانُوا أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعْجِزَهُ مِن شَيْءٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ إِنَّهُ كَانَ عَلِيمًا قَدِيرًا ﴿٤٤﴾ وَلَوْ يُؤَاخِذُ اللَّهُ النَّاسَ بِمَا كَسَبُوا مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهْرِهَا مِن دَابَّةٍ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمْ إِلَىٰ أَجَلٍ مُّسَمًّى فَإِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِعِبَادِهِ بَصِيرًا ﴿٤٥﴾ ﴾

خـوا ﷻ (ئینسـان) هانـدەدا بـۆ گـەڕان بـە زەویـدا لـە دڵو جەسـتەکاندا بـۆ پەنـد وەرگرتـن، نـەک تەنهـا بـۆ بینیـنو بێئاگایـی، وە بـۆ ئـەوەی تەماشـای سـەرەنجامی ئـەو گەلانـە بکـەن کـە پێـش ئـەوان بـوون، لەوانـەی پێغەمبەرانیـان بـەدرۆ دەزانـی، مـاڵو سـەروەتو منداڵیـان لەمـان زۆرتـر بـوو، لەمانیـش بەهێزتـر بـوون، سـەر زەویان ئـاوەدان کـردەوە چاکتـر لـە ئاوەدانکردنـەوەی ئەمـان، کاتـێ کـە سـزایان بـۆ هـات هێـزوو توانایـان سـوودی نەبـوو بۆیـان، وە مـاڵو منداڵیشـیان بێنیـازی نەکـردن لـە سـزای خـوا، خـوا ﷻ توانـاو قـودرەتو ویسـتی خـۆی تیایانـدا جێبەجـێ کـرد.

﴿ وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعْجِزَهُ مِن شَيْءٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ ﴾ بـە هـۆی تەواوی زانسـتو دەسـەڵاتی، ﴿ إِنَّهُ كَانَ عَلِيمًا قَدِيرًا ﴾، پاشـان خـوا ﷻ باسـی تـەواوی لەسـەرخۆیی‌و مۆڵەتـدانو چاوەڕوانـی سـتەمکارانو تاوانبارانـی کـردوە، جـا فەرموویەتـی:

وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِمَا كَسَبُوا۟ مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهْرِهَا مِن دَآبَّةٍ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۖ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِعِبَادِهِۦ بَصِيرًۢا ﴿٤٥﴾

﴿وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِمَا كَسَبُوا۟﴾ لە تاوانەکان ﴿مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهْرِهَا مِن دَآبَّةٍ﴾ واتە: سزا دەیانی گرتەوە تەنانەت ئەو گیاندارانەشی کە ئەرک پێ سپێردراو نین ﴿وَلَٰكِن﴾ بەڵام خوا مۆڵەتیان دەداو لێیان بێئاگا نابێ ﴿يُؤَخِّرُهُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۖ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِعِبَادِهِۦ بَصِيرًۢا﴾ پاداشتیان دەداتەوە بە پێی ئەوەی دەیزانێ دەربارەیان لە خێرو شەڕ.

تەفسیری سووڕەتی (فاطر) تەواو بوو.


سُورَةُ يسٓ
بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
يسٓ ١ وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْحَكِيمِ ٢ إِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ٣ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ٤ تَنزِيلَ ٱلْعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ٥ لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أُنذِرَ ءَابَآؤُهُمْ فَهُمْ غَٰفِلُونَ ٦ لَقَدْ حَقَّ ٱلْقَوْلُ عَلَىٰٓ أَكْثَرِهِمْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ٧ إِنَّا جَعَلْنَا فِىٓ أَعْنَٰقِهِمْ أَغْلَٰلًا فَهِىَ إِلَى ٱلْأَذْقَانِ فَهُم مُّقْمَحُونَ ٨ وَجَعَلْنَا مِنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَٰهُمْ فَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ ٩ وَسَوَآءٌ عَلَيْهِمْ ءَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ١٠ إِنَّمَا تُنذِرُ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلذِّكْرَ وَخَشِىَ ٱلرَّحْمَٰنَ بِٱلْغَيْبِ فَبَشِّرْهُ بِمَغْفِرَةٍ وَأَجْرٍ كَرِيمٍ ١١ إِنَّا نَحْنُ نُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا۟ وَءَاثَٰرَهُمْ وَكُلَّ شَىْءٍ أَحْصَيْنَٰهُ فِىٓ إِمَامٍ مُّبِينٍ ١٢

## تەفسیری سوورەتی (یس)

## مەککیە (٨٣) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-١٢): ﴿ يسٓ ١ وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْحَكِيمِ ٢
إِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ٣ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ
٤ تَنزِيلَ ٱلْعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ٥ لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ
أُنذِرَ ءَابَآؤُهُمْ فَهُمْ غَٰفِلُونَ ٦ لَقَدْ حَقَّ
ٱلْقَوْلُ عَلَىٰٓ أَكْثَرِهِمْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ٧ إِنَّا
جَعَلْنَا فِىٓ أَعْنَٰقِهِمْ أَغْلَٰلًا فَهِىَ إِلَى ٱلْأَذْقَانِ
فَهُم مُّقْمَحُونَ ٨ وَجَعَلْنَا مِنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ
سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَٰهُمْ فَهُمْ
لَا يُبْصِرُونَ ٩ وَسَوَآءٌ عَلَيْهِمْ ءَأَنذَرْتَهُمْ
أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ١٠ إِنَّمَا تُنذِرُ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلذِّكْرَ وَخَشِىَ ٱلرَّحْمَٰنَ بِٱلْغَيْبِ فَبَشِّرْهُ
بِمَغْفِرَةٍ وَأَجْرٍ كَرِيمٍ ١١ إِنَّا نَحْنُ نُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا۟ وَءَاثَٰرَهُمْ وَكُلَّ
شَىْءٍ أَحْصَيْنَٰهُ فِىٓ إِمَامٍ مُّبِينٍ ١٢ ﴾:

﴿ يسٓ ١ وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْحَكِيمِ ﴾ ئەمە سوێندێکە لە لایەن خوای گەورەوە بە قورئانی پڕ لە دانایی‌و حیکمەت، ئەویش بریتیە لە دانانی شتێک لە جێگای خۆیدا، دانانی فەرمان‌و قەدەغە کردن لەو جێگایەی شایستەیە پێیان، وە دانانی پاداشت بە خێرو شەڕ لەو جێگایەی شیاوە پێیان، جا بڕیارە شەرعی‌و پاداشتە جەزائیە کانی هەموویان ئەوپەڕی حیکمەت لە خۆ دەگرن. لە حیکمەت‌و دانایی ئەم قورئانە کۆی کردۆتەوە لە نێوان باسکردنی بڕیارو حیکمەتە کەی، عەقڵە کانی ئاگادار کردۆتەوە لەسەر هۆکارە کان‌و ئەو وەسفانەی کە پێویست بوو بۆ ڕێکخستنی بڕیارە کان لە سەری.

﴿ إِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾ (بە ڕاستی تۆ لە پێغەمبەرانی خوای) ئەم سوێند لەسەر خوراوە پەیامی موحەممەدە ﷺ، وە تۆ لە کۆی پێغەمبەرانی، تۆ شتێکی تازەو

داهێنـراو نیـت لـە نـاو پێغەمبەرانـدا، هەروەهـا ئـەوەی هێناوتـە لـەو بنچینـە ئاینیانەیـە کـە پێغەمبـەران هێناویانـە.

هەروەهـا هەرکەسـێ سـەرنج بـدا بـە بـارودۆخو وەسـفی پێغەمبـەران، وە جیـاوازی نێـوان ئـەوانو جگـە لـە ئەوانیـش بزانـێ، ئـەوە دەزانـێ تـۆ لـە هەڵبـژاردەی نـاو پێغەمبەرانـی، بـەوەی کـە تیاتدایـە لـەو سـیفاتە تـەواو و ڕەوشـتە جوانانـە.

شـاراوە نیـە لـە نێـوان سـوێند پـێ خـوراو کـە قورئانـی پـڕ لـە حیکمەتـە، وە لـە نێوان سـوێند لەسـەر خـوراو کـە پەیامـی پێغەمبـەر موحەممـەدە ﷺ لـە پەیوەندیـدا، بێگومـان ئەگـەر هیـچ بەڵگـەو شـایەتێک لەسـەر پەیامـی پێغەمبـەر نەبووایـە، جگـە لـەم قورئانـە پـڕ لـە داناییـە، ئـەوە بـەس بـوو بکـرێ بـە بەڵگـەو شـایەت لەسـەر پێغەمبەرایەتـی موحەممـەد ﷺ، بەڵکـو قورئانـی مـەزن لـە بەهێزترینـی ئـەو بەڵگـە بەردەوامانەیـە لەسـەر نێردراوێتـی پێغەمبـەر ﷺ، جـا بەڵگەکانـی قورئـان هەموویـان سـەلماندنن بـۆ پێغەمبەرایەتـی موحەممـەد.

پاشـان هەواڵیـداوە بـە مەزنترینـی وەسـفەکانی پێغەمبـەر ﷺ کـە بەڵگەیـە لەسـەر نێردراوێتـی ئـەو، ئەویـش بێگومـان ئـەو پێغەمبـەرە ﴿ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾ (لەسـەر ڕێبـازی ڕاسـتە) دەیگەیەنێتـە لای خـوا ﷻ وەماڵـی پـڕ لـە ڕێـزی، وە ئـەو ڕێگـا ڕاسـتە کردەوەکانـی دەگرێتـەوە، ئەویـش کـردەوە چاکەکانـە، کـە چاکـە بـۆ دڵو جەسـتەو دنیـاو دوارۆژو خورەوشـتی بـەرزوو نەفـسو دڵـی پـاک، ئەجـرو پاداشـت زیـاد دەکات، ئـا ئەمەیـە ڕێگـای ڕاسـت بریتیـە لـە وەسـفی پێغەمبـەر، وە وەسـفی ئـەو ئاینـەی هێناویەتـی، سـەرنجی گەورەیـی ئـەم قورئانـە پیـرۆزە بـدە، چـۆن کـۆی کردۆتـەوە لـە نێـوان بەڕێزترینـی سـوێندەکان لەسـەر گەورەتریـن سـوێند لەسـەر خـوراو، تەنهـا هەواڵـی خـوا بەسـە، بـەڵام خـوای گـەورە بەڵگـەی ڕوونو سـەلماندنی یەکلاکـەرەوەی هێناوەتـەوە لـەم شـوێنەدا، لەسـەر ڕاسـتی ئـەوەی سـوێندی لەسـەر خـواردووە لـە پەیامـی پێغەمبەرەکـەی، وە ئـەوەی ئاگـاداری کردووینەتـەوە لەسـەری، ئامـاژەی بـۆ کردوویـن بـە ئاماژەیەکـی نـەرمو نیـان بـۆ گرتنەبـەری ڕێگاکـەی.

ئـەم ڕێگـا ڕاسـتە ﴿ تَنزِيلَ ٱلْعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ (واتـە: قورئـان دابەزێنـراوە لەلایـەن خـوای زاڵـی میهرەبانـەوە)، ئـەو زاتـە کـە قورئانـی پـێ دابەزانـدووە بـۆ ئـەوەی ببێتـە ڕێگایـەک بـۆ بەندەکانـی بیانگەیەنێتـە لای ئـەو، بـە عیزەتـی خـۆی پاراسـتوویەتی

لــە گــۆڕانو دەســتکاریکردن، وە بــە هــۆی ئــەو قورئانــەوە ڕەحمــی بــە بەندەکانــی کــردوە، ڕەحمەتێــک گەیاندوویەتــی پێیــان، هەتــا گەیاندوونــی بــە ماڵــی میهرەبانــی خــۆی، لەبــەر ئەمەیــە دەقەکــەی بــەم دوو نــاوە بەڕێــزە تــەواو کــردوە (العزیــز) وە (الرحیــم): بــە دەســەڵاتو میهرەبــان.

کاتێ خـوا ﷻ سـوێندی خـوارد لەسـەر پەیامەکـەیو بەڵگـەی لەسـەری هێنایەوە، باسـی زۆر پێویسـتی کـرد پێـی، جـا فەرموویەتـی: ﴿ لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أُنذِرَ ءَابَآؤُهُمْ فَهُمْ غَٰفِلُونَ ﴾ (واتـە: بـۆ ئـەوەی گەلـێ بترسـێنی لـە سـزا کـە بـاوو باپیرانیـان نەترسـێنرابوون ئـەوان بێئاگـا بـوون) ئەوانیـش عەرەبـە نەخوێنـدەوارەکان بـوون، ئەوانـەی بـە بـەردەوام خاڵـی بـوون لـە کتێـبو لـە نەبوونـی پێغەمبـەران، نەفامـی کوێـری کردبـوون، وە گومڕایـی تەنگـی پـێ هەڵچنیبـوون، خەڵکانـی زانـاو عاقـڵ بـە گێلـیو گەمژەیـی ئـەوان دەهاتنـە پێکەنیـن، خـوا پێغەمبەرێکـی بـۆ نـاردن لـە نەفـسو دەروونی خۆیـان، پاکیـان دەکاتەوەو فێـری کتێـبو حیکمەتیـان دەکات، ئەگەرچـی ئـەوان لـە پێشـتر لـە گومڕاییەکـی ڕوونـدا بـوون، عەرەبـە نەخوێنـدەوارەکان دەترسـێنێ، وە ئەوەیشـی وەکـو ئـەوان وایـە لـە نەخوێندەواریـدا، وە باسـی خاوەنانـی کتێـب دەکات لەوانـەی کتێبیـان لـە لایـە، جـا نیعمەتـی خـوا بـەو پەیامـە تایبەتـە بـە عـەرەب، وە بـۆ جگـە لـە عەرەبیـش بـە گشـتی. بـەڵام ئەوانـەی نێـردراوی بـۆ ناویـان بـۆ ترسـاندنیان پـاش ئـەوەی ئاگـادارت کردنەوە، بــوون بــە دوو بەشــەوە: بەشــێکیان ئــەوەی هێناوتــە ڕەتیــان کــردەوە، ترســانیان وەرنەگــرت، ئەوانیــش ئەوانــەن خــوا دەربارەیــان فەرموویەتــی: ﴿ لَقَدْ حَقَّ ٱلْقَوْلُ عَلَىٰٓ أَكْثَرِهِمْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾ واتــە: ئەوانــەی قــەزاو قــەدەرو ویســتیان بەســەردا جێبەجــێ کــراوە، ئەوانــە هەمیشــە لــە کوفــرو هاوبــەش دانانیانــدان، چونکــە بەڕاســتی بەڵێنــی خــوا چەســپاوەو لەســەریان هاتۆتــە دی، دوای ئــەوەی حەقیــان بــۆ خرایــە ڕوو بەرپەرچیــان دایــەوە، جــا ئــەو کاتــە تۆڵەیــان لێکرایــەوەو بــووە مــۆر بەســەر دڵەکانیانــەوە.

ئینجـا باسـی ئـەو بەربەسـتانەی کـردوە کـە ڕێگـرن لـە گەیشـتنی ئیمـان بـە دڵەکانیان، فەرموویەتــی: ﴿ إِنَّا جَعَلْنَا فِىٓ أَعْنَٰقِهِمْ أَغْلَٰلًا ﴾ (واتــە: وەک کەســانێ وان کــە تەوقمــان کردبێتــە گەردنیــان)، ﴿ أَغْلَٰلًا ﴾واتــە: ئەویــش کــۆی (غــل)، وە (الغــل) بریتیــە لــەوە لــە گــەردن دەکــرێ، (وەک چــۆن گوێدرێــژ ڕەشــمە دەکــرێ) ئــەو خســتنە گەردنــە وەکــو بەنــد کردنــی پیــاو وایــە.

وە ئــەم گەردنانــەی کــە لــە ملەکانــدان زۆر مەزنـــن بێگومـــان گەیشـــتوونەتە چەناگەکانیـانو سـەریانی پـێ بـەرز کراوەتـەوە بـۆ سـەرەوە ﴿ فَهُم مُّقۡمَحُونَ ﴾ واتـە: سـەریان بـەرز کردبێتـەوە لـە توونـدی ئـەو تەوقـەی لـە گەردنیـان کـراوە، ناتوانـن بـۆ خـوارو ئەمـلاو ئـەولا بیجوڵێنـن.

﴿ وَجَعَلۡنَا مِنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ سَدّٗا وَمِنۡ خَلۡفِهِمۡ سَدّٗا ﴾ واتـە: (بەربەسـتمان لـە بـەردەمو لە پشـتیانەوە دانـاوە)، بەربەسـتێک ڕێگریـان دەکات لـە بڕواهێنـان، ﴿ فَهُمۡ لَا يُبۡصِرُونَ ﴾ (واتـە: بێگومـان ئـەوان ڕاسـتی نابینـن) نەفامـیو گومڕایـی لـە هەمـوو لایەکـەوە دەوری داون، ترسـاندن هیـچ سـوودێکی نیـە بۆیـان.

﴿ وَسَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴾ (واتـە: وە بـۆ ئـەوان یەکسـانە چ بیانترسـێنی یـان نەیانترسـێنی بـڕوا ناهێنـن)، چـۆن کەسـێ بـڕوا دێنـێ مـۆر درابـێ بەسـەر دڵیـدا.

بەشـی دووەم: ئەوانـەی ئاگادارکردنـەوەو ترسـاندنیان قبوولکـرد، خـوا ﷻ باسـی کـردوونو فەرموویەتـی: ﴿ إِنَّمَا تُنذِرُ ﴾ واتـە: بێگومـان سـوودو ئامۆژگـاری لـە ترسـاندنەکەت وەردەگـرێ ﴿ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلذِّكۡرَ ﴾ واتـە: ئـەو کەسـەی مەبەسـتی شـوێنکەوتنی حەقـە، ﴿ وَخَشِيَ ٱلرَّحۡمَٰنَ بِٱلۡغَيۡبِ ﴾ (لـە خـوای میهرەبـان دەترسـێ کـە نادیـارە) هەرکەسـێ وەسـف بکـرێ بـەم دووکارە، مەبەسـتی چـاک لـە گـەڕان بـە دوای حەقـداو ترسـان لـە خـوای مـەزن، ئەوانـە سـوود لـە پەیامەکـەت وەردەگـرن، وە بـە فێربوونـی پـاک دەبنـەوە، وە ئـەم کەسـەی سـەرکەوتوو بـووە لـەم دوو کارەدا ﴿ فَبَشِّرۡهُ بِمَغۡفِرَةٖ ﴾ لـە گوناهەکانـی ﴿ وَأَجۡرٖ كَرِيمٍ ﴾ بـە هـۆی کـردەوەو نیەتـە چاکەکانـی.

﴿ إِنَّا نَحۡنُ نُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ ﴾ زیندوویـان دەکەینـەوە دوای مردنیـان بـۆ ئـەوەی پاداشـتیان بدەینـەوە بـە پێـی کردەوەکانیـان ﴿ وَنَكۡتُبُ مَا قَدَّمُواْ ﴾ واتـە: (هەرچـی پێشـتر کردوویانـە) لـە خێـرو شـەڕ، ئەویـش ئـەو کردەوانەیانـە کـە بـەردەوام بوونـە لەسـەریو لـە ژیانیانـدا ئەنجامیـان داوە ﴿ وَءَاثَٰرَهُمۡ ﴾ ئەویـش شـوێنەواری خێـرو شـوێنەواری شـەڕە، کـە ئـەوان هـۆکار بـوون لـە بوونیـدا، لـە مـاوەی ژیانیـانو دوای کۆچکردنیـان، ئـەو کردەوانـەی دروسـت بـووە لـە میانـەی قسـەو ڕەفتـارو بارودۆخەکانیانـدا، جـا هـەر چاکەیـەک کەسـێک کاری پـێ کردبـێ بـە هـۆی

زانستو فێرکردنو ئامۆژگاری، یان فەرمانی کردبێ بە چاکەو ڕێگری کردبێ لە خراپە، یان زانستێ لە لای خوێندکارەکانی بەجێی هێشتبێ، یان لە کتێبێکدا سوودی لێوەربگیرێ لە ژیانیو دوای مردنیدا، یان صەدەقە یان چاکەیە، کەسێکی دیکە پەیڕەوی ئەوی کردبێ، یان کاری لە مزگەوتێکدا کردبێ، یان شوێنێ لە شوێنەکان کە خەڵکی سوودی لێوەردەگرن، وە ئەوەیشی لەوانە بچێ، ئەوە لەو شوێنەوارانەیەتی کە بۆی دەنووسرێ، وە بەهەمان شێوە کردەوەی خراپیش، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی[٤]: واتە: هەر کەسێک سوننەتێکی چاک دابنێ ئەوە پاداشتی ئەوەی هەیە، وە پاداشتی ئەو کەسەی کاری پێدەکا تا ڕۆژی دوایی، وە هەرکەسێک ڕێگایەکی خراپ دابنێت ئەوە تاوانەکەی لەسەر خۆیەتی، وە تاوانی ئەو کەسەیشی کە کاری پێدەکات تا ڕۆژی دوایی.

ئەم پێگەیە پلەو پایەی بانگەواز بۆ لای خواو ڕێنمایی بۆ ڕێگاکەیت بۆ ڕوون دەکاتەوە، بە هەر هۆکارو ڕێگایەک بگات بەوەوە، وە دابەزینی پلەو پایەی ئەو کەسەی پاڵنەرەو بانگەشە دەکات بۆ لای خراپە.

دەبێتە پێشەوا تیایدا، بێگومان ئەوە نزمترینی بەدیهێنراوەو تاوانبارترینیانە، ﴿وَكُلَّ شَيْءٍ﴾ لە کردەوەو نیەتو جگە لەوانیش ﴿أَحْصَيْنَاهُ فِي إِمَامٍ مُّبِينٍ﴾ واتە: (هەژمارمان کردوە لە) کتێبێکدا، کە بریتیە لە دایکی کتێبەکان، وە سەرجەم کتێبەکانیش دەگەڕێنەوە بۆ لای ئەو، ئەو کتێبەی بەدەستی فریشتەکانە ئەویش (لوح المحفوظ).

---

٤) [«مَنْ سَنَّ في الإِسْلاَمِ سُنَّةً حَسَنَةً فَعُمِلَ بهَا بَعْدَهُ كُتِبَ لَهُ مثْلُ أَجْرِ مَنْ عَمِلَ بهَا وَلاَ يَنْقُصُ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْءٌ، وَمَنْ سَنَّ في الإِسْلاَمِ سُنَّةً سَيِّئَةً فَعُمِلَ بهَا بَعْدَهُ كُتِبَ عَلَيْهِ مِثْلُ وِزْرِ مَنْ عَمِلَ بِهَا وَلاَ يَنْقُصُ مِنْ أَوْزَارِهِمْ شَيْءٌ»] رواه مسلم برقم: (٦٩٧٥).

وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلًا أَصۡحَٰبَ ٱلۡقَرۡيَةِ إِذۡ جَآءَهَا ٱلۡمُرۡسَلُونَ
١٣ إِذۡ أَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهِمُ ٱثۡنَيۡنِ فَكَذَّبُوهُمَا فَعَزَّزۡنَا بِثَالِثٖ فَقَالُوٓاْ
إِنَّآ إِلَيۡكُم مُّرۡسَلُونَ ١٤ قَالُواْ مَآ أَنتُمۡ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا
وَمَآ أَنزَلَ ٱلرَّحۡمَٰنُ مِن شَيۡءٍ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا تَكۡذِبُونَ ١٥ قَالُواْ
رَبُّنَا يَعۡلَمُ إِنَّآ إِلَيۡكُمۡ لَمُرۡسَلُونَ ١٦ وَمَا عَلَيۡنَآ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ
ٱلۡمُبِينُ ١٧ قَالُوٓاْ إِنَّا تَطَيَّرۡنَا بِكُمۡۖ لَئِن لَّمۡ تَنتَهُواْ لَنَرۡجُمَنَّكُمۡ
وَلَيَمَسَّنَّكُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٞ ١٨ قَالُواْ طَٰٓئِرُكُم مَّعَكُمۡۚ أَئِن
ذُكِّرۡتُمۚ بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ مُّسۡرِفُونَ ١٩ وَجَآءَ مِنۡ أَقۡصَا ٱلۡمَدِينَةِ
رَجُلٞ يَسۡعَىٰ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱتَّبِعُواْ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ٢٠ ٱتَّبِعُواْ
مَن لَّا يَسۡـَٔلُكُمۡ أَجۡرٗا وَهُم مُّهۡتَدُونَ ٢١ وَمَا لِيَ لَآ أَعۡبُدُ
ٱلَّذِي فَطَرَنِي وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ٢٢ ءَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً
إِن يُرِدۡنِ ٱلرَّحۡمَٰنُ بِضُرّٖ لَّا تُغۡنِ عَنِّي شَفَٰعَتُهُمۡ شَيۡـٔٗا
وَلَا يُنقِذُونِ ٢٣ إِنِّيٓ إِذٗا لَّفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ٢٤ إِنِّيٓ ءَامَنتُ
بِرَبِّكُمۡ فَٱسۡمَعُونِ ٢٥ قِيلَ ٱدۡخُلِ ٱلۡجَنَّةَۖ قَالَ يَٰلَيۡتَ قَوۡمِي
يَعۡلَمُونَ ٢٦ بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ ٱلۡمُكۡرَمِينَ ٢٧

(١٣): ﴿ وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلًا أَصۡحَٰبَ ٱلۡقَرۡيَةِ إِذۡ جَآءَهَا ٱلۡمُرۡسَلُونَ ﴿١٣﴾ ﴾:

تـا کۆتایـی چیرۆکەکە. (خـوا دەفەرموێ:) وێنـە بـۆ بەدرۆدانەرانـی پەیامەکـەت بێنـەرەوە، ئەوانـەی بانگەوازەکـەت ڕەت دەکەنـەوە، وێنەیـەک پەنـدی لێوەربگرنو ببێتـە ئامۆژگاریـەک ئەگـەر سـەرکەوتوو بـوون بـۆ خێر، ئـا ئـەو نموونەیـە: خەڵکی ئـەو شـارە، ئەوەشـی لێیانـەوە ڕوویـدا لـە بەدرۆدانانـی پێغەمبەرانـی خـوا، ئەوەیشـی بەسـەریان هـات لـە سـزاو تۆڵـە، ئەگـەر سـوود لـە دیاریکردنی ئەو شـارە هەبووایە، خـوا دیاری دەکـرد، جـا خـۆ تێهەڵقورتان لـەوەو هاوشـێوەی ئـەوە، لە بابەتـی ئەرک خسـتنە سەرشـانی خۆو قسـەکردنە بە بێ زانسـت، ئـا لەبەر ئەمەیە ئەگەر کەسـێ قسـە لەم بـوارەدا بـکات دەبینی جـۆرێ لە هەڕەمەکـیو تێکەڵ کـردنو جیاوازی تـووش دەبێ جێ بـە خۆی ناگـرێ لەوەی کـە دەیزانێ، بێگومان ڕێگای زانسـتی ڕاسـتەقینە، وەسـتانە لەگەڵ حەقیقەتەکانـدا، وە واز هێنانـی خـۆ تێهەڵقورتاندن لەوەی سـوودی نیە، ئا بـەو جۆرە نەفسو دەروون پـاک دەبێتەوەو زانسـت زیـاد دەکات، لەو ڕووەی نەفام وا گومـان دەبات بێگومان زیـاد بوونـی بـە باسـکردنی بـۆ چوونـەکان کـە بەڵگەیـان لەسـەر نیـە، هیـچ سـوودێک بەدەسـت ناهێنن تەنها شـێواندنی بیرو هۆشـەکان نەبـێ، وە ڕاهاتن بەو شـتانەی گوماناوین. وە بەڵگـە لەسـەر ئـەوەی ئـەم شـارە خـوا کردوویەتی بـە نموونـە بـۆ ئەوانـەی لەگەڵیان دەدوێ، ﴿ إِذۡ جَآءَهَا ٱلۡمُرۡسَلُونَ ﴾ (کاتـێ پێغەمبەرانیـان بۆ هات) لە لایـەن خوای بەرزەوە، فەرمانیـان پێدەکـردن بـە بەندایەتی خـوای تاکو تەنهاو دڵسـۆزیو ملکەچ بـوون بۆی، وە ڕێگریـان لێ دەکـەن لە هـاوەڵ دانانو سـەرپێچیکردن.

(١٤-١٥): ﴿ إِذۡ أَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهِمُ ٱثۡنَيۡنِ فَكَذَّبُوهُمَا فَعَزَّزۡنَا بِثَالِثٖ فَقَالُوٓاْ إِنَّآ إِلَيۡكُم مُّرۡسَلُونَ ﴿١٤﴾ قَالُواْ مَآ أَنتُمۡ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا وَمَآ أَنزَلَ ٱلرَّحۡمَٰنُ مِن شَيۡءٍ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا تَكۡذِبُونَ ﴿١٥﴾ ﴾:

﴿إِذْ أَرْسَلْنَآ إِلَيْهِمُ ٱثْنَيْنِ فَكَذَّبُوهُمَا فَعَزَّزْنَا بِثَالِثٍ﴾ واتــە: (کاتــێ دوو پێغەمبەرمــان نــارد بــۆ ناویــان بڕوایــان پێ نەکــردن) بەهێزمان کردن بە سـێیان، ئینجـا بوون بە ســێ پێغەمبەر، وەک گرنگــی دانێــک لــە لایــەن خــواوە پێیــانو بەجێهێنانی بەڵگـەو حوججە بــە یەک لە دوای یــەک هاتنــی پێغەمبەران بۆ ناویــان ﴿فَقَالُوٓا۟﴾ پێیان وتن: ﴿إِنَّآ إِلَيْكُم مُّرْسَلُونَ﴾ (واتــە: بێگومان ئێمــە نێردراوین بــۆ لای ئێوە).

وەڵامیــان دانــەوە بــەو وەڵامــەی، بــە بــەردەوام ناســراوە لای ئــەو کەســەی بانگــەوازی پێغەمبــەران ڕەت دەکاتــەوە، جــا ﴿قَالُوا۟ مَآ أَنتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا﴾ واتــە: (وتیــان ئێــوە ئادەمیەکــن وەک ئێمــەن) ئــەوە چیە فــەزڵو چاکــەی ئێوەی داوە بەســەر ئێمــەداو تایبەتی کــردوون لــە ئێمە؟

پێغەمبــەران بــە گەلەکانیــان وت: ﴿قَالَتْ لَهُمْ رُسُلُهُمْ إِن نَّحْنُ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَمُنُّ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ﴿١١﴾﴾ إبراهیم، (واتــە: پێغەمبەرەکانیــان پێیــان وتن ئێمە هــەر ئادەمیەکیــن وەکــو ئێــوە، بــەڵام خــوا منەت دەنــێ بە ســەر هــەر کام لــە بەندەکانیدا کە بیــەوێ دەیکاتــە پێغەمبــەر). ﴿وَمَآ أَنزَلَ ٱلرَّحْمَٰنُ مِن شَىْءٍ﴾ واتــە: نکووڵیــان لە هەموو پەیامــەکان کــرد، پاشــان بــە هەمان شــێوە نکووڵــی ئەوانەیــان کرد کــە دواندوونیــان، جا وتیــان: ﴿إِنْ أَنتُمْ إِلَّا تَكْذِبُونَ﴾ (واتــە: ئێــوە تەنهــا درۆزنــنو درۆ دەکەن).

(١٦): ﴿قَالُوا۟ رَبُّنَا يَعْلَمُ إِنَّآ إِلَيْكُمْ لَمُرْسَلُونَ ﴿١٦﴾﴾:

ئــەو ســێ پێغەمبــەرە وتیــان: ﴿رَبُّنَا يَعْلَمُ إِنَّآ إِلَيْكُمْ لَمُرْسَلُونَ﴾ واتــە: (پەروەردگارمــان دەزانــێ بەڕاســتی ئێمــە نێردراویــن بــۆ لای ئێــوە)، جا ئەگــەر ئێمــە درۆ بکەین، ئــەوە خوا ڕیســوایيمان ئاشــکرا دەکاتو بەپەلــە ســزامان دەدات.

(١٧): ﴿وَمَا عَلَيْنَآ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٧﴾﴾:

واتــە: (ئێمــە تەنهــا گەیاندنــی ئاینەکەمان لەســەرە بــە ڕوونــی) گەیاندنی بە ڕوونــی ئەوەیە کــە بــە هۆیــەوە داواکاریەکان بەدەســت دێ، جگە لەم ئایەتو نیشــانە پێشــنیار کراوانە، وە ســزای لــە پێشــیش لە لای ئێمــە نیە، بەڵکــو ئەرکو پیشــەی ئێمە کــە بریتیە لــە گەیاندنی ڕوون، پێــی هەســتاینو ڕوونمــان کــردەوە بۆتــان، جــا ئەگــەر هیدایــەت وەربگــرن ئەوە بەختێکــی چــاکو ســەرکەوتنتانە، وە ئەگــەر گومڕا بــوون، ئــەوە ئێمە هیچمان بە دەســت نیە لــەو کاروبارەدا.

(١٨): ﴿قَالُوٓا۟ إِنَّا تَطَيَّرْنَا بِكُمْ ۖ لَئِن لَّمْ تَنتَهُوا۟ لَنَرْجُمَنَّكُمْ وَلَيَمَسَّنَّكُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾:

جـا خەڵکی شـارەکە بــە پێغەمبەرەکانیــان وت: ﴿إِنَّا تَطَيَّرْنَا بِكُمْ﴾ واتــە: هیچمان نەبینی بــە هاتنتــان بۆ ناومــانو پەیوەندی کردنتــان پێمانــەوە جگە لە شــەڕو خراپە نەبــێ، ئەمەش لــە سەرسـوڕهێنەرترین شـتەکانە، کەسێک باشـترین نیعمەتیان پێشـکەش بـکات کە خوا بەخشـیویەتی بەسـەر بەندەکانـدا، وە گەورەتریـن ڕێــز بــە هۆیــەوە ڕێزیـان لێبگـرێ، وە پێویسـتیان پێـی لـە سـەرووی هەمـوو پێویسـتیەکانەوەیە، بە شـەڕو خراپـە لێـی تێبگەن، شـەڕو خراپـە زیادی کرد لەسـەر ئەو شـەڕو خراپەیەی لەسـەری بـوون، وە ڕەشـبین بوون پێـی!! بـەڵام ڕیسـواییو نەبوونـی یارمەتـیو سـەرنەکەوتن کارێ بە خاوەنەکـەی دەکات دوژمنەکەیشـی پێـی نەکردبێ.

پاشـان هەڕەشـەیان لێکردنو وتیان: ﴿لَئِن لَّمْ تَنتَهُوا لَنَرْجُمَنَّكُمْ﴾ واتە: (ئەگەر وازنەهێنن) دەتـان کوژینو بـەرد بارانتـان دەکەین، بە ناشـرینترین کوشـتن ﴿وَلَيَمَسَّنَّكُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ واتــە: (بە ڕاسـتی لە لایـەن ئێمـەوە دووچاری سـزایەکی پڕ ئێشو ئـازار دەبن).

(١٩): ﴿قَالُوا طَائِرُكُم مَّعَكُمْ ۚ أَئِن ذُكِّرْتُم ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ ﴿١٩﴾﴾:

پێغەمبەرانیـان پێیـان گوتـن: ﴿طَائِرُكُم مَّعَكُمْ﴾ (شـومی ئێـوە بەخۆتانەوەیـە) ئەویـش بریتیــە لــەو هاوبەشـدانانو شــەڕو خراپــەی کــە تــووش بــوون بــە نارەحەتیو ناخۆشــیو بەرزبوونــەوەی نــازو نیعمــەت دەخــوازێ ﴿أَئِن ذُكِّرْتُم﴾ واتــە: بە هۆی ئــەوەی ئێمە ئامۆژگاریمــان کــردن لــەوەی ســوودو قازانجــی ئێــوەی تێدایە، ئــەوەی وتتــان بەرانبەرمان وتتـانو درێغیتـان نەکـرد ﴿بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ﴾ (واتــە: بەڵکــو ئێــوە گەلێکــن لە ســنوور دەرچــوون) ڕۆدەچــن لــە قســەکانیاندا، بانگەشــەکردنیان هیــچ ســوودێکیان پــێ ناگەیەنــێ جگــە لــە ڕاکــردنو خۆبەزلزانیــن نەبێ.

(٢٠): ﴿وَجَاءَ مِنْ أَقْصَى الْمَدِينَةِ رَجُلٌ يَسْعَىٰ قَالَ يَا قَوْمِ اتَّبِعُوا الْمُرْسَلِينَ ﴿٢٠﴾﴾:

﴿وَجَاءَ مِنْ أَقْصَى الْمَدِينَةِ رَجُلٌ يَسْعَىٰ﴾ واتــە: (وە لــەو پــەڕی شـارەکەوە پیاوێک بە پەلە هات) ســوور بوو لەسـەر ئامۆژگاری گەلەکەی کاتێ بیسـتی کە پێغەمبەرانیان بانگەشـەیان دەکـەنو ئـەو بڕوای پێیـان هێنـاوەو زانیویەتی کە گەلەکـەی چۆن ڕەتیـان کردۆتەوە، جا پێیانـی فەرمـوو: ﴿يَا قَوْمِ اتَّبِعُوا الْمُرْسَلِينَ﴾ فەرمانـی کرد بــە شـوێنکەوتنیان، وە ئامۆژگـاری کردن لەسـەر ئەوە، وە شـایەتی بۆ دان بــە پێغەمبەرایەتی.

(٢١): ﴿اتَّبِعُوا مَن لَّا يَسْأَلُكُمْ أَجْرًا وَهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٢١﴾﴾:

پاشــان باسـی جەخـت کردنــەوە دەکات لەسـەر ئەو شـایەتیەی کــە داویەتیو بانگەشـەی

بـۆ دەکات، فەرموویەتـی: ﴿ ٱتَّبِعُواْ مَن لَّا يَسۡـَٔلُكُمۡ أَجۡرٗا ﴾ واتە: شـوێنی کەسـێ بکەون ئامۆژگاریتـان دەکات، بـە ئامۆژگاریکردنـێ خێرو چاکـەی هەر بۆ خۆتان دەبـێ، وە ماڵو سـامانەکانی لێتـان نـاوێو داوای کـرێ ناکات لەسـەر ئامۆژگـاریو ڕێنماییەکانـی بۆتان، ئەمـە ئـەوە پێویسـت دەکات شـوێنی ئەو کەسـە بکەویـت کە ئەمە وەسـفیەتی.
ئـەوەی ماوەتـەوە بوتـرێ لەوەیـە بانگەشـە بـکاتو داوای کـرێ نـەکات، بـەڵام لەسـەر حەقیـش نەبـێ، جا ئـەم گومانـەی ڕواندۆتەوە بە وتـەی: ﴿ وَهُم مُّهۡتَدُونَ ﴾ (کـە ئەوان ڕێنمایـی کـراون)، چونکـە ئەوان بانگـەواز ناکـەن مەگەر عەقڵی تـەواو شـایەتی چاکێتی بـۆ بـدات، وە قەدەغـەو ڕێگـری ناکـەن، مەگەر عەقڵی ڕاسـتو تەواو شـایەتی ناشـرینیو خراپـی بـۆ بدات.
(٢٢): ﴿ وَمَا لِيَ لَآ أَعۡبُدُ ٱلَّذِي فَطَرَنِي وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ٢٢ ﴾:
پێدەچـێ گەلەکـەی ئامۆژگاریەکەیـان وەرنەگرتبـێ، بەڵکـو لۆمـەو سەرزەنشـتیان کردبێ لەسـەر شـوێنکەوتنی پێغەمبەرانو بەدڵسۆزی پەرسـتنی خوای تاکو تەنها، جا وتی: ﴿ وَمَا لِيَ لَآ أَعۡبُدُ ٱلَّذِي فَطَرَنِي وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴾ واتـە: چـی ڕێگریـم لێدەکات لـە بەندایەتی ئەو کەسـەی شایسـتەی بەندایەتـی بـۆ کردنە، چونکە ئـەو زاتە منـی بەدیهێنـاوەو ڕزقو ڕۆزی پێـداون، وە سـەرەنجامی هەمـوو بەدیهێنـراوەکان بۆ لای ئەوە، پاداشـتیان دەداتـەوە بە پێی کردەوەکانیـان، جـا ئـەو زاتـەی دروسـتکردنو ڕۆزیدانـی بـە دەسـتە، وە بڕیار لـە نێوان بەندەکانـدا لـە دونیـاو دواڕۆژ، ئـەو زاتـە شایسـتەی ئەوەیە بپەرسـترێو سـتایش بکرێو بـە گـەورە دابنـرێ، جگە لەو کەسـەی نەسـوودی بەدەسـتەو نە زیـان، وە نە بەخشـینو نە گرتنـەوە، نـە ژیـانو نە مـردنو نـە زیندووبوونەوە، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتی:
(٢٣): ﴿ ءَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً إِن يُرِدۡنِ ٱلرَّحۡمَٰنُ بِضُرّٖ لَّا تُغۡنِ عَنِّي شَفَٰعَتُهُمۡ شَيۡـٔٗا وَلَا يُنقِذُونِ ٢٣ ﴾:
﴿ ءَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً إِن يُرِدۡنِ ٱلرَّحۡمَٰنُ بِضُرّٖ لَّا تُغۡنِ عَنِّي شَفَٰعَتُهُمۡ ﴾ چونکـە هیـچ کـەس تـکاو شـەفاعەت ناکا لـەلای خـوا بـە مۆڵەتی ئـەو نەبێ، تـکای ئـەوان هیچ سـوودێکی نیـە، ئـەوان ناتوانن کـەس ڕزگار بکەن لـەو زیانەی خـوا بیەوێ پێـم بگەیەنێ.
(٢٤): ﴿ إِنِّيٓ إِذٗا لَّفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ٢٤ ﴾:
﴿ إِنِّيٓ إِذٗا ﴾ واتـە: ئەگـەر بەندایەتـی پەرسـتراوێ بکەم ئەمە وەسـفی بێـت، ﴿ لَّفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ﴾ (واتـە: بێگومـان من ئـەو کاتە لە گومڕاییەکی زۆر ئاشـکرادام)، کـۆی کردۆتەوە

لـەم قسـەیەدا لـە نێـوان ئامۆژگاریـانو شـایەتیدان بـۆ پێغەمبـەران بـە پێغەمبەرایەتـی، وە هیدایەتـدانو هەواڵـدان بـە دیاریکردنی بەندایەتی خـوای تاکو تەنها، وە باسـکردنی بەڵگە لەسـەریان، بێگومـان بەندایەتـی جگـە لە خوا بەتـاڵو پووچە، وە باسـی سـەلماندنی کردوە لەسـەریان، هەواڵیـداوە بـە گومڕابوونـی ئـەوەی دەیانپەرسـتێ، وە ئاشـکراکردنی ئیمانـی لەگـەڵ ترسـێکی زۆری لەوەی بیکـوژن، جـا فەرموویەتی:

(٢٥): ﴿ إِنِّيٓ ءَامَنتُ بِرَبِّكُمۡ فَٱسۡمَعُونِ ٢٥ ﴾:

(واتـە: بـە ڕاسـتی مـن بـڕوام هێنا بـە پەروەردگارتـانو دە ئێـوەش گوێتـان لێبـێ)، ئینجا گەلەکـەی کوشـتیان، کاتـێ ئەمەیـان لێ بیسـتو بانگەوازی کـردن بەوەی کـە پێی کرا.

(٢٦-٢٧): ﴿ قِيلَ ٱدۡخُلِ ٱلۡجَنَّةَۖ قَالَ يَٰلَيۡتَ قَوۡمِي يَعۡلَمُونَ ٢٦ بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ ٱلۡمُكۡرَمِينَ ٢٧ ﴾:

جـا ﴿ قِيلَ ﴾ لەو کاتـەدا پێی وترا: ﴿ ٱدۡخُلِ ٱلۡجَنَّةَ ﴾ (بڕۆ بەهەشـتەوە) جـا بە هۆی ئەو ڕێـزەی پێی دراوە لەسـەر یەکتاپەرسـتیو دڵسـۆزیو ئامۆژگاری گەلەکـەی، دوای مردنی وتـی وەک چۆن لـە ژیانیـدا ئامۆژگاری کـردن: ﴿ يَٰلَيۡتَ قَوۡمِي يَعۡلَمُونَ ٢٦ بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي ﴾ واتـە: بەو شـتەی کە لێم خۆشـبووە، جۆرەها سـزای لەسـەرم لابـردووە ﴿ وَجَعَلَنِي مِنَ ٱلۡمُكۡرَمِينَ ﴾ (وە بردمیـە ڕیـزی ڕێزگیراوانەوە) بە جۆرەها پاداشـتی دڵخۆشـکەر، واتە: ئەگـەر ئـەو زانیاریـە بگاتە دڵی ئـەوان ئەوە هاوبەشـیان بۆ خـوا دانەدەنا.


۞ وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ مِنۢ بَعۡدِهِۦ مِن جُندٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا
كُنَّا مُنزِلِينَ ٢٨ إِن كَانَتۡ إِلَّا صَيۡحَةٗ وَٰحِدَةٗ فَإِذَا هُمۡ خَٰمِدُونَ
٢٩ يَٰحَسۡرَةً عَلَى ٱلۡعِبَادِۚ مَا يَأۡتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُواْ بِهِۦ
يَسۡتَهۡزِءُونَ ٣٠ أَلَمۡ يَرَوۡاْ كَمۡ أَهۡلَكۡنَا قَبۡلَهُم مِّنَ ٱلۡقُرُونِ
أَنَّهُمۡ إِلَيۡهِمۡ لَا يَرۡجِعُونَ ٣١ وَإِن كُلّٞ لَّمَّا جَمِيعٞ لَّدَيۡنَا مُحۡضَرُونَ
٣٢ وَءَايَةٞ لَّهُمُ ٱلۡأَرۡضُ ٱلۡمَيۡتَةُ أَحۡيَيۡنَٰهَا وَأَخۡرَجۡنَا مِنۡهَا حَبّٗا
فَمِنۡهُ يَأۡكُلُونَ ٣٣ وَجَعَلۡنَا فِيهَا جَنَّٰتٖ مِّن نَّخِيلٖ
وَأَعۡنَٰبٖ وَفَجَّرۡنَا فِيهَا مِنَ ٱلۡعُيُونِ ٣٤ لِيَأۡكُلُواْ مِن ثَمَرِهِۦ
وَمَا عَمِلَتۡهُ أَيۡدِيهِمۡۚ أَفَلَا يَشۡكُرُونَ ٣٥ سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِي
خَلَقَ ٱلۡأَزۡوَٰجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلۡأَرۡضُ وَمِنۡ أَنفُسِهِمۡ
وَمِمَّا لَا يَعۡلَمُونَ ٣٦ وَءَايَةٞ لَّهُمُ ٱلَّيۡلُ نَسۡلَخُ مِنۡهُ ٱلنَّهَارَ
فَإِذَا هُم مُّظۡلِمُونَ ٣٧ وَٱلشَّمۡسُ تَجۡرِي لِمُسۡتَقَرّٖ لَّهَاۚ
ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ٣٨ وَٱلۡقَمَرَ قَدَّرۡنَٰهُ مَنَازِلَ حَتَّىٰ
عَادَ كَٱلۡعُرۡجُونِ ٱلۡقَدِيمِ ٣٩ لَا ٱلشَّمۡسُ يَنۢبَغِي لَهَآ أَن تُدۡرِكَ
ٱلۡقَمَرَ وَلَا ٱلَّيۡلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِۚ وَكُلّٞ فِي فَلَكٖ يَسۡبَحُونَ ٤٠

(٢٨): ﴿ وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ مِنۢ بَعۡدِهِۦ مِن جُندٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا كُنَّا مُنزِلِينَ ٢٨ ﴾:

خـوا ﷻ دەربـارەی سـزای گەلەکـەی فەرموویەتـی: ﴿ وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ مِنۢ بَعۡدِهِۦ مِن جُندٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ﴾ واتـە: پێویسـتی نەکردوە سـزایان لەسـەر سەخت بکەیـن، لەشـکرێکیان لـە ئاسـمانەوە بـۆ دابەزێنیـن بـە لەنـاو بردنیـان ﴿ وَمَا كُنَّا مُنزِلِينَ ﴾ (ئێمـە دابەزێنـەر نەبوویـن) بـە هـۆی پێویسـت نەبوونـی ئـەوە، وە مەزنی توانـاو دەسـەڵاتی خـواو لاوازی ئادەمیزاد، ئـەوان بچوکتریـن شـت لە سـزا تووشـیان ببـێ بەسـیانە.

(٢٩): ﴿ إِن كَانَتۡ إِلَّا صَيۡحَةٗ وَٰحِدَةٗ فَإِذَا هُمۡ خَٰمِدُونَ ٢٩ ﴾:

﴿ إِن كَانَتۡ ﴾ واتـە: هـۆی تیاچوونیـان ﴿ إِلَّا صَيۡحَةٗ وَٰحِدَةٗ ﴾ تەنهـا یەک دەنگـی گەورە بـوو هەندێ لە فریشـتەکان هـاواری پێکـرد ﴿ فَإِذَا هُمۡ خَٰمِدُونَ ﴾ دڵیان لـەتو پەت بوو لەنـاو سـنگیاندا، بـەو دەنگە بێـزار بـوون، کتووپڕ لـە جووڵە کەوتـن‌و مردن، نـە دەنگ‌و نـە جوڵـەو نـە ژیانیـان نەمـا، دوای ئـەو لـووت بـەرزی‌و خۆبەزلزانیەیـان، وە ڕووبـەڕوو بوونـەوەی بەڕێزترینـی دروسـتکراوەکان بە قسـەی ناشـرین‌و ناپەسـند، بەو جۆرە سـزایان لەسـەر خۆیان پێویسـت کرد.

(٣٠): ﴿ يَٰحَسۡرَةً عَلَى ٱلۡعِبَادِۚ مَا يَأۡتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ٣٠ ﴾:

خـوا ﷻ بـە داخی سـەخت بـە بەنـدەکان فەرموویەتـی: ﴿ يَٰحَسۡرَةً عَلَى ٱلۡعِبَادِۚ مَا يَأۡتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴾ (ئـای پەشـیمانی داخـی سـەخت بـۆ ئـەو بەندانـەی هـەر پێغەمبەرێکیـان بـۆ بهاتایـە هـەر گاڵتەیـان پێدەکـرد) ئای چەنـد مەزنـە بەدبەختیان، کوێرەوەریـان چەنـدە دوورو درێـژە، چەنـدە نەفامـن کاتێ ئەم سـیفەتە ناشـرینەیان هەیە، کـە هـۆکاری هەمـوو بەدبەختـی‌و سـزاو تۆڵەیەکە؟!

(٣١-٣٢): ﴿ أَلَمۡ يَرَوۡاْ كَمۡ أَهۡلَكۡنَا قَبۡلَهُم مِّنَ ٱلۡقُرُونِ أَنَّهُمۡ إِلَيۡهِمۡ لَا يَرۡجِعُونَ ﴿٣١﴾ وَإِن كُلٌّ لَّمَّا جَمِيعٌ لَّدَيۡنَا مُحۡضَرُونَ ﴿٣٢﴾ ﴾:

خـوا ﷻ ده‌فه‌رمـوێ: ئایـا ئه‌وانـه نه‌یانبینیـوه، وه په‌ندیان لـه‌و به‌درۆدانه‌رانـه‌ی پێش خۆیان وه‌رنه‌گرتـووه، كه خوا له ناوی بردن‌و سـزای له‌سـه‌ر پێویسـت كردن، هیچیـان نه‌گه‌رانه‌وه بـۆ دونیـا، وه بـۆ هه‌تـا هه‌تایـی ناگه‌ڕێنـه‌وه. وه لـه داهاتـوودا خـوا ﷻ جارێكـی دیكـه دروسـتیان ده‌كاتـه‌وه لـه دوای مردنیان، ئامـاده ده‌بن له‌به‌رده‌م په‌روه‌ردگاریانـدا، بۆ ئه‌وه‌ی دادپـه‌روه‌ری لـه نێوانیانـدا بـكات بـه بڕیارێكـی دادپه‌روه‌رانـه، كه بـه قـه‌د گه‌ردیله‌یه‌ك سـته‌می تێدانیه، ﴿ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَٰعِفۡهَا وَيُؤۡتِ مِن لَّدُنۡهُ أَجۡرًا عَظِيمًا ﴿٤٠﴾ ﴾ النسـاء، (واتـه: وه ئه‌گـه‌ر چاكه‌یه‌كـت هه‌بێت خـودا چه‌ند قاتـی ده‌كاته‌وه‌و ده‌یبه‌خشـێت له لایه‌ن خۆیـه‌وه پاداشـتێكی گه‌وره).

(٣٣-٣٦): ﴿ وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلۡأَرۡضُ ٱلۡمَيۡتَةُ أَحۡيَيۡنَٰهَا وَأَخۡرَجۡنَا مِنۡهَا حَبًّا فَمِنۡهُ يَأۡكُلُونَ ﴿٣٣﴾ وَجَعَلۡنَا فِيهَا جَنَّٰتٍ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعۡنَٰبٍ وَفَجَّرۡنَا فِيهَا مِنَ ٱلۡعُيُونِ ﴿٣٤﴾ لِيَأۡكُلُواْ مِن ثَمَرِهِۦ وَمَا عَمِلَتۡهُ أَيۡدِيهِمۡۚ أَفَلَا يَشۡكُرُونَ ﴿٣٥﴾ سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡأَزۡوَٰجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلۡأَرۡضُ وَمِنۡ أَنفُسِهِمۡ وَمِمَّا لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾:

﴿ وَءَايَةٌ لَّهُمُ ﴾ (نیشـانه‌و به‌ڵگه‌یـه‌ك بۆ ئـه‌وان) له‌سـه‌ر زیندوو كردنـه‌وه‌و بڵاو كردنه‌وه، وه وه‌سـتان لـه به‌رده‌سـتی خوای گه‌وره بۆ پاداشـت دانـه‌وه‌ی كـرده‌وه‌كان، ئه‌م ﴿ ٱلۡأَرۡضُ ٱلۡمَيۡتَةُ ﴾ (زه‌ویـه مـردووه) خوا بارانی به‌سـه‌ردا باراندو‌ و زیندووی كردۆتـه‌وه دوای مردنی ﴿ وَأَخۡرَجۡنَا مِنۡهَا حَبًّا فَمِنۡهُ يَأۡكُلُونَ ﴾ لـه هه‌مـوو چه‌شـنه‌كانی كشـتوكاڵ‌و لـه هه‌موو چه‌شـنی ڕووه‌كـه‌كان كـه ئاژه‌ڵه‌كانیـان ده‌یخـۆن ﴿ وَجَعَلۡنَا فِيهَا ﴾ واتـه: (به‌دیمـان هێنـاوه) لـه‌و زه‌ویه مـردوه ﴿ جَنَّٰتٍ ﴾ واته: چه‌نـد باخێك، دارو دره‌ختـی زۆری تێدایه، بـه تایبه‌تـی دار خورمـاو تـرێ، ئـه‌و دوو داره به‌رێزترینی نـاو داره‌كانن ﴿ وَفَجَّرۡنَا فِيهَا ﴾ واتـه: لـه زه‌ویدا (هه‌ڵمـان قوڵانـدووه)، ﴿ مِنَ ٱلۡعُيُونِ ﴾ (له كانیـاوه‌كان).

وه به‌دیمـان هێنـاوه لـه زه‌ویـدا ئـه‌و داروو دره‌ختانـه‌و خورمـاو تـرێ، ﴿ لِيَأۡكُلُواْ مِن ثَمَرِهِۦ ﴾ (بـۆ ئـه‌وه‌ی به‌رووبوومـی میوه‌كان بخـۆن) هـه‌م وه‌ك بژێوی‌و هـه‌م وه‌ك میوه بیخـۆن‌و له‌زه‌تـی لێوه‌ربگرن.

﴿ وَمَا عَمِلَتۡهُ أَيۡدِيهِمۡ ﴾ لـه كاتێكدا ئه‌و به‌روو بووومانه ده‌سـتی ئه‌وان دروسـتی نه‌كردووه‌و پێكـی نه‌هێناوه، به‌ڵكو دروسـتكراوی بڕیـارده‌ری بڕیـارده‌ره‌كان‌و چاكترینـی ڕۆزیده‌رانه،

وە هەروەها دەستی ئەوان پێکی نەهێناوە بە لێنانو ئامادەکردن جگە لەویش، بەڵکو خوا ئەم بەرووبوومانەی هێناوەتە بوون، هیچ پێویستێکیان بە لێنانو ئامادەکردن نیە، ڕاستەوخۆ لە دارەکە وەردەگیرێو هەر لەو کاتەدا دەخورێ، ﴿ أَفَلَا يَشْكُرُونَ ﴾ (ئایا سوپاسی خوا ناکەن) ئەو زاتەی ئەو نازونیعمەتەی پێداونو بە چاکەی خۆی هێناویەتیە بوون، کە بەو هۆیەوە بەرژەوەندی ئاینیو دونیاییان ڕێک دەخرێ؟ ئایا ئەو زاتەی زەوی زیندوو کردۆتەوە دوای مردنی، ئینجا کشتوکاڵو دارودرەختی لێ دەرهێناوەو بەروبوومی بە لەزەتی لەو دارانە دەرهێناوە، ئەو بەروبوومانەی لەسەر ئەو چڵانە دەرخستووەو زەوی وشکی هەڵقوڵاندووە بە کانیاو، ئایا بە توانا نیە لەوەی مردوو دروست بکاتەوە؟ بەڵێ بێگومان ئەو دەسەڵاتی هەیە بەسەر هەموو شتێکدا ﴿ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَزْوَٰجَ كُلَّهَا ﴾ واتە: هەموو چەشنەکان ﴿ مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ ﴾ جۆراو جۆری کردوە لە زەویدا لەو چەشنانە کە ژماردنیان گرانە ﴿ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ ﴾ جۆراو جۆری کردوە بۆ نێرو مێ، وە جیاوازی کردوە لە نێوان دروستکردنو خورەوشتو وەسفی ئاشکراو نهێنیان ﴿ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ ﴾ لەو بەدیهێنراوانەی دروستکراونو پەنهانن لە زانستی ئێمە، کە هێشتا دروست نەکراون.

پاکیو بێگەردی بۆ خوا ﷻ لە دانانی هاوەڵ یان پشتیوان یان یارمەتیدەر یان وەزیر یان هاوڕێ یان خۆشەویست، یان هاوشێوە یان وێنەی ئەو لە سیفاتە تەواوو گەورەکانیدا، یان دەستەوسان بێ لە شتێ کە بیەوێ.

(٣٧-٤٠): ﴿ وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلَّيْلُ نَسْلَخُ مِنْهُ ٱلنَّهَارَ فَإِذَا هُم مُّظْلِمُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلشَّمْسُ تَجْرِى
لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا ۚ ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴿٣٨﴾ وَٱلْقَمَرَ قَدَّرْنَٰهُ مَنَازِلَ حَتَّىٰ عَادَ كَٱلْعُرْجُونِ
ٱلْقَدِيمِ ﴿٣٩﴾ لَا ٱلشَّمْسُ يَنۢبَغِى لَهَآ أَن تُدْرِكَ ٱلْقَمَرَ وَلَا ٱلَّيْلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِ ۚ وَكُلٌّ فِى فَلَكٍ
يَسْبَحُونَ ﴿٤٠﴾ ﴾

﴿ وَءَايَةٌ لَّهُمُ ﴾ (بەڵگەو نیشانەیە بۆ ئەوان) لەسەر جێبەجێ کردنی ویستو ئیرادەی خواو تەواوی دەسەڵاتی، وە زیندوو کردنەوەی مردو دوای مردنیان ﴿ ٱلَّيْلُ نَسْلَخُ مِنْهُ ٱلنَّهَارَ ﴾ واتە: دابەزاندنی ڕووناکی گەورە کە زەوی دادەپۆشێ ئێمە دەیگۆڕین بە تاریکیو لە جێگایدا دایدەنێین، ﴿ فَإِذَا هُم مُّظْلِمُونَ ﴾ (ئنجا لە ناکاودا تاریکی هەموویان دەگرێتەوە) بە هەمان شێوە دابەزینی ئەم تاریکیە کە دایپۆشیونو گشتاندوونی، بە دەرکەوتنی خۆر هەموو وڵاتەکان ڕووناک دەبنەوە، خەڵکیش بڵاو

دەبنـەوە بـۆ بەدەسـتهێنانی بەرژەوەندیەکانیـان، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ وَٱلشَّمۡسُ تَجۡرِي لِمُسۡتَقَرّٖ لَّهَاۚ ﴾ واتـە: خۆریـش بـەردەوام بـەرەو بنکەی خـۆی لـە گەڕانەوەدایە، ئـەو جێگایـەی خـوا بـۆی دیاریکـردوە، ناتوانـێ تێپەڕێنـێو کەمـی بکاتـەوە، وە خـۆی هیچ شـتێکی بەدەسـت نیـەو ناتوانـێ یاخی بێ لە دەسـەڵاتی خـوا، ﴿ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ﴾ ئـەو زاتـەی لـە دەسـەڵاتی خـۆی ئـەو بەدیهێنـراوە مەزنانـە بەڕێوە دەبـات بـە تەواوترین بەڕێـوە بردنو چاکترین یاسـا، ﴿ ٱلۡعَلِيمِ ﴾ کە بە زانسـتی خـۆی داناوە لـە بەرژەوەندی بەنـدەکانو سـوودو قازانج بـۆ دیـنو دونیایان.

﴿ وَٱلۡقَمَرَ قَدَّرۡنَٰهُ ﴾ (بـۆ مانگیش چەنـد قۆناغێکمان دانـاوە) هەموو شـەوێ جارێک پێی دادەبـەزێ ﴿ حَتَّىٰ ﴾ هەتـا تـەواو بچـووک دەبێتـەوە، ئینجا وەکـو ﴿ كَٱلۡعُرۡجُونِ ٱلۡقَدِيمِ ﴾ لقـی دار خورمـای کـۆن کـە بـە هـۆی کۆنـیو وشـک بوونیـەو بچـووک بووەتـەوەو چەماوەتـەوە، دوای ئـەوە بـە بـەردەوام تـۆزە تـۆزە زیـاد دەکات هەتـا تـەواو ڕوونـاک دەبێتـەوەو ڕووناکیەکـەی پـەرشو بـڵاو دەبێتەوە.

﴿ وَكُلّٞ ﴾ هـەر یەکـە لـە خـۆرو مانـگو شـەوو ڕۆژ خـوا ئەنـدازەی کـردوە بـە ئەندازە کردنـێ ناتوانـن تێپەڕێنـن، هـەر یەک لـەوان دەسـەڵاتو کاتێکـی دیاریکـراوی هەیە، ئەگـەر یەکێکیـان دەرکەوت ئـەوی دیکەیـان بوونـی نامێنێ، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتی: ﴿ لَا ٱلشَّمۡسُ يَنۢبَغِي لَهَآ أَن تُدۡرِكَ ٱلۡقَمَرَ ﴾ واتـە: (خـۆر بـۆی نیـە بگـات بـە مانـگ) لەو دەسـەڵاتەیدا کـە بریتیـە لە شـەو، هەرگیز نابـێ لە شـەودا خۆر ببینـرێ ﴿ وَلَا ٱلَّيۡلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِۚ ﴾ (شـەویش ناتوانـێ پێشـکەوێ لـە ڕۆژ) بچێتـە نێـو ڕۆژەوە پێـش تـەواو بوونی دەسـەڵاتی ﴿ وَكُلّٞ ﴾ هەریەکـە لە خۆرو مانـگو ئەسـتێرەکان، ﴿ فِي فَلَكٖ يَسۡبَحُونَ ﴾ واتـە: بە بـەردەوام لـە خولگەیەکـدان، هەمـوو ئەمانـە بەڵگەیەکی ئاشـکراو سـەلماندنێکی درەوشـاوەن لەسـەر مەزنـی بەدیهێنەرو مەزنی وەسـفەکانی، بـە تایبەت وەسـفکردنی تواناو دەسـەڵاتو حیکمـەتو زانسـت لـەم جێگایەدا.


وَءَايَةٌ لَّهُمْ أَنَّا حَمَلْنَا ذُرِّيَّتَهُمْ فِي ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴿٤١﴾ وَخَلَقْنَا
لَهُم مِّن مِّثْلِهِۦ مَا يَرْكَبُونَ ﴿٤٢﴾ وَإِن نَّشَأْ نُغْرِقْهُمْ فَلَا صَرِيخَ لَهُمْ
وَلَا هُمْ يُنقَذُونَ ﴿٤٣﴾ إِلَّا رَحْمَةً مِّنَّا وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٍ ﴿٤٤﴾ وَإِذَا
قِيلَ لَهُمُ ٱتَّقُوا۟ مَا بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَمَا خَلْفَكُمْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ
﴿٤٥﴾ وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ مِّنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِمْ إِلَّا كَانُوا۟ عَنْهَا
مُعْرِضِينَ ﴿٤٦﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ أَنفِقُوا۟ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ قَالَ ٱلَّذِينَ
كَفَرُوا۟ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَنُطْعِمُ مَن لَّوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ أَطْعَمَهُۥٓ إِنْ
أَنتُمْ إِلَّا فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٤٧﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ
صَٰدِقِينَ ﴿٤٨﴾ مَا يَنظُرُونَ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً تَأْخُذُهُمْ وَهُمْ
يَخِصِّمُونَ ﴿٤٩﴾ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ تَوْصِيَةً وَلَآ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمْ
يَرْجِعُونَ ﴿٥٠﴾ وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَإِذَا هُم مِّنَ ٱلْأَجْدَاثِ إِلَىٰ رَبِّهِمْ
يَنسِلُونَ ﴿٥١﴾ قَالُوا۟ يَٰوَيْلَنَا مَنۢ بَعَثَنَا مِن مَّرْقَدِنَا ۜ هَٰذَا مَا وَعَدَ
ٱلرَّحْمَٰنُ وَصَدَقَ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٥٢﴾ إِن كَانَتْ إِلَّا صَيْحَةً
وَٰحِدَةً فَإِذَا هُمْ جَمِيعٌ لَّدَيْنَا مُحْضَرُونَ ﴿٥٣﴾ فَٱلْيَوْمَ لَا تُظْلَمُ
نَفْسٌ شَيْـًٔا وَلَا تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٥٤﴾

(٤١-٥٠): ﴿ وَءَايَةٌ لَّهُمْ أَنَّا حَمَلْنَا ذُرِّيَّتَهُمْ فِي ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴿٤١﴾ وَخَلَقْنَا لَهُم مِّن مِّثْلِهِۦ مَا يَرْكَبُونَ ﴿٤٢﴾ وَإِن نَّشَأْ نُغْرِقْهُمْ فَلَا صَرِيخَ لَهُمْ وَلَا هُمْ يُنقَذُونَ ﴿٤٣﴾ إِلَّا رَحْمَةً مِّنَّا وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٍ ﴿٤٤﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّقُوا۟ مَا بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَمَا خَلْفَكُمْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٤٥﴾ وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ مِّنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِمْ إِلَّا كَانُوا۟ عَنْهَا مُعْرِضِينَ ﴿٤٦﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ أَنفِقُوا۟ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَنُطْعِمُ مَن لَّوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ أَطْعَمَهُۥٓ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٤٧﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٤٨﴾ مَا يَنظُرُونَ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً تَأْخُذُهُمْ وَهُمْ يَخِصِّمُونَ ﴿٤٩﴾ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ تَوْصِيَةً وَلَآ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمْ يَرْجِعُونَ ﴿٥٠﴾ ﴾:

﴿ وَءَايَةٌ لَّهُمْ ﴾ واتــە: وە بەڵگــەی ئاشــکراو ســەلماندنێکی تــر بۆ ئــەوان لەبەر ئــەوەی خوا بەتــاکو تەنها پەرســتراوە، چونکــە تەنها ئەو پێــدەری نازونیعمەتەکانــە، وە دوور خەرەوەی بــەڵاو ناخۆشــیەکانە، لــە کــۆی نیعمەتەکانــی ﴿ أَنَّا حَمَلْنَا ذُرِّيَّتَهُمْ ﴾ واتــە: (بێگومــان ئێمە نەوەکانــی ئەوانمــان هەڵگرتــووە) زۆربــەی ڕاڤەزانانــی قورئــان وتوویانــە: مەبەســت لــەوە باپیرانیانــە ﴿ وَخَلَقْنَا لَهُم ﴾ واتــە: (بۆمــان بەدیهێنــاون) بــۆ ئەوانــەی لــە دوای ئــەوان دێن ﴿ مِّن مِّثْلِهِۦ ﴾ واتــە: لــە وێنەی ئەو کەشــتیانە، واتە: ڕەگەزی ﴿ مَا يَرْكَبُونَ ﴾ (کە ســواری ببــن) باســی نازونیعمەتــی خــۆی کردوە بەســەر باپیرانیانــدا، بــە هەڵگرتنیان لەناو کەشــتی، چونکە نازونیعمەت لەســەر ئــەوان، نازونیعمەتە لەســەر وەچەکانیان، ئەم جێگایــە ئاڵۆزترینی جێگاکانــە بەلامەوە لە تەفســیردا.

بێگومــان ئــەوەی زۆرێ لــە ڕاڤەزانانــی قورئــان باســیانکردوە کــە مەبەســت لــە (الذرية) باپیرانــە، لــە قورئانــدا وەچــە بەکارنەهێنــراوە بــە مانای باپیــران، بەڵکــو جۆرێ لــە ئاڵۆزی تێدایــە، وە دەرهێنانــی قســەکە لــە بابەتــی خــۆی ناگونجــێ لەگــەڵ قســەی پەروەردگاری

جیهانیـان، چونکــه مەبەســت لە قســەی خــوای گــەورە ڕوونکردنەوەیــە بــۆ بەندەکانی، وە پێدەچــێ گریمانەیەکــی لەمــە چاکتــر هەبــێ، ئەویش ئەوەیە مەبەســت لــە (ذریـة) ڕەگەز بێــت، ئــەوان ئەوانــن بە خــودی خۆیــان، چونکە ئــەوان لــە وەچــەی ئادەمن، بــەڵام وتەی خوا ئــەم مانایــە هەڵدەوەشــێنێتەوە، وەک فەرموویەتــی: ﴿ وَخَلَقْنَا لَهُم مِّن مِّثْلِهِۦ مَا يَرْكَبُونَ ﴾ (واتــە: بــە وێنــەی کەشــتی شــتانێکی تریشــمان بــۆ دروســت کــردوون کە ســواری بن) ئەگــەر مەبەســت پێــی ئــەوە بێ دروســتمان کــردوە لــە وێنــەی ئەو کەشــتیە بــۆ ئەوانەی کــە دوێنــراون، تا ســواری بین لــە جۆرەها کەشــتی، ئەو کات ماناکــەی دووبــارە دەبێتەوە، ئــەوەش ناگونجــێ لەگــەڵ پاراوەیــیو ڕەوانبێــژی قورئاندا.

ئەگــەر مەبەســت پێــی لە وتــەی خــوا ﷻ ﴿ وَخَلَقْنَا لَهُم مِّن مِّثْلِهِۦ مَا يَرْكَبُونَ ﴾ حوشــتر، کە بریتیــە لــە کەشــتی وشــکانی، ماناکــە جێگیــرو ڕوون بوویــەوە، هەروەهــا شــتێکی دیکــە دەمێنێتــەوە کــە ڕســتەکە جــۆرێ لــە ئاڵــۆزی تێدایــە، بێگومــان ئەگــەر مەبەســت پێی ئەم مانایــە بــێ، دەیفەرمــوو: (وَآيَـةٌ لَهُـمْ أَنَّـا حَمَلْنَاهـم في الْفُلْـكِ الْمَشْـحُونِ، وَخَلَقْنَـا لَهُـمْ مِـنْ مِثْلِه مَـا يَرْكَبُـونَ) واتــە: بەڵگەیەکــی تــر بــۆ ئــەوان کە بێگومــان ئێمــە ئەوانمان لە کەشــتی پڕدا هەڵگرتــووە، وە بــە وێنــەی کەشــتی شــتانێکی تریشــمان بۆ دروســت کردون کە ســواری بیــن، یــان ئەوەیە بڵــێ لــە یەکەمــدا: نەوەکانیانمــان هەڵگرتووە، وە لــە دووەمــدا: ئەوانمان هەڵگرتــووە، بێگومــان ماناکــە دەرناکــەوێ تــا نەوتــرێ: ڕاناوەکــە دەگەڕێتەوە بــۆ (ذرية) وەچــەکان، خــوا زاناترە بــە حەقیقەتــی دۆخەکە.

کاتــێ لە نووســیندا گەیشــتم بەم شــوێنە مانایەکــم بۆ دەرکەوت کــە دوور نیە لە مەبەســتی خــوای گــەورە، ئەویش ئەوەیە هەرکەســێ گەورەیی کتێبــی خوا بزانــێ، وە ڕوونکردنەوەی تــەواوی لە هەموو ڕووەکانــەوە دەربارەی کاروبارەکانی ئێســتاو ڕابــردوو داهاتوو، بێگومان ئەو لە هەموو شــتێکدا باســی بەرزتریــن مانــا دەکاو تەواوترینی ئەوانەی کــە لەگەڵ دۆخیدا بگونجــێ، کەشــتیەکان لــە بەڵگــەو نیشــانەکانی خــوای بــەرزو مەزنــن، وە نیعمەتــی ئەون بەســەر بەندەکانیــەوە، لــە کاتێکــدا دایباراندووە بەســەریاندا بــە بەردەوامی بوونــی تا ڕۆژی دوایــی، ئەگــەر چی بــەردەوام بووە لە هەموو ســەردەمێکدا تا ســەردەمی دابەزاندنــی قورئان.

کاتــێ خــوا ﷻ دواندنــی بــە قورئــانو باســی حاڵەتی کەشــتیەکانی کــرد، خــوا ﷻ زانی لە داهاتــوودا کەشــتی دەبێتــە مەزنتریــن بەڵگەو نیشــانەکان لە ســەردەمێکی دیکــەدا، جگە لە کاتو ســەردەمی ئــەوان، کاتــێ فێــری چۆنێتی دروســتکرنی کەشــتی دەریاییــان دەکات،

وە ئەوانەیشی کە بە هۆی ئاگرەوە دەجوڵێنرێن، ئەوانەیشی بە ئاسماندا دەڕۆن وەک باڵندەکانو وێنەی ئەوانیش، وە هەڵگری وشکانی (وەک سەیارەو وێنەی ئەوانیش)، لەوەی کە نیشانە مەزنەکان ڕووینەداوە، تەنها لە وەچەکاندا نەبێ، لە قورئاندا ئاماژەی کردوە لەسەر بەرزترین جۆر لە جۆری نیشانەکان، جا فەرموویەتی: ﴿وَءَايَةٌ لَّهُمْ أَنَّا حَمَلْنَا ذُرِّيَّتَهُمْ فِي ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ﴾ واتە: پڕە لە خەڵکو کەرەستەکانیان.

خوا ﷻ هەڵیگرتنو ڕزگاری کردن بەو هۆکارانەی کە فێری کردن لە نقوم بوون، لەبەر ئەمەیە ئاگاداری کردوونەتەوە لەسەر نیعمەتەکانی کاتێ ڕزگاری کردن لەگەڵ ئەوەی توانای هەبوو لە ناویان بیات، وەک فەرموویەتی: ﴿وَإِن نَّشَأْ نُغْرِقْهُمْ فَلَا صَرِيخَ﴾ واتە: (ئەگەر بمانەوێ نوقمیان دەکەین) هیچ کەسێک نیە بێت بە هانایانەوە، یارمەتیان بدات لە کاتی نارەحەتیانداو ناخۆشیان لەسەر لابدات ﴿وَلَا هُمْ يُنقَذُونَ﴾ (ڕزگاریش ناکرێن) لەوەی ئەوان تیایدان ﴿إِلَّا رَحْمَةً مِّنَّا وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٍ﴾ کاتێ نوقمان نەکردن بە هۆی نەرمو نیانیمان بۆیان، وە چێژ وەرگرتنیان تا ماوەیەک، بەڵکو بگەڕێنەوە یان هەست بەوە بکەن کە لەدەستیان داوە.

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّقُوا۟ مَا بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَمَا خَلْفَكُمْ﴾ واتە: (ئەگەر پێیان بوترێ: خۆتان بپارێزن لەو سزایە لە بەردەمتاندایە، وە لەوەی لە پشتانەوەیە) لە ژیانی بەرزەخو قیامەت، وە ئەوەیشی لە دونیادایە لە سزاکان ﴿لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ (تا ڕەحمتان پێ بکرێ) پشتیان لەوە کرد، ئەگەر هەر ئایەتو نیشانەیەکیان بۆ بهاتایە، سەریان پێ بەرز نەدەبوو، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ مِّنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِمْ إِلَّا كَانُوا۟ عَنْهَا مُعْرِضِينَ﴾ واتە: (هەر بەڵگەو ئایەتێکمان لە ئایەتەکانی پەروەردگاریان بۆ بێت ئەوان هەر ڕوو وەردەگێڕن)، وە دانەپاڵی ئایەتو نیشانەکان بۆ لای پەروەردگاریان بەڵگەیە لەسەر تەواویو ڕوونکردنەوەیان، چونکە هیچ شتێ ڕوونتر نیە لە ئایەتەکانی خوا.

بێگومان لە کۆی پەروەردەکردنی خوا بۆ بەندەکانی ئەوەیە ئایەتو نیشانەکانی پێ گەیاندوون کە دەیکەن بە بەڵگە لەسەر ئەوەی سوودیان پێدەگەیەنێ لە دینو دونیایاندا.

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ أَنفِقُوا۟ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ﴾ واتە: لەو ڕزقو ڕۆزیەی کە خوا منەتی پێی کردوە بە سەرتاندا خۆ ئەگەر بیەوێ لێتان دادەڕنێ ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟﴾ ئەوانەی دژایەتی حەقیان دەکردو بەڵگەیان بە ویستو مەشیئەتی خوا دەهێنایەوە: ﴿أَنُطْعِمُ مَن لَّوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ أَطْعَمَهُۥٓ إِنْ أَنتُمْ﴾ ئەی بڕواداران ﴿إِلَّا فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴾ کاتێ

فەرمانمـان پێدەکـەن بـەوە، ئەمـە لەوانەیـە کـە بەڵگەیـە لەسـەر ئەوپـەڕی نەفامیـان، یان خۆنەفـام کـردنو گرفتاریـان، چونکە ویسـتو مەشـیئەت نایێتـە بەڵگە بۆ سـەرپێچیکار بە هیـچ شـێوەیەک، ئەگەرچی خوا ﷻ هەرشـتێکی بوێ دەبێ، وە هەر شتێکیشـی نـەوێ نابێ، بێگومـان خـوا بەندەکانـی بەهێـز کردوە کـە دەتوانـن ئەرکـەکان جێبەجێ بکـەنو دوور بکەونـەوە لـە قەدەغە کـراوەکان، جا ئەگـەر وازیـان هێنا لـەوەی فەرمانیان پێکـراوە ئەوە دیـارە بـە ویسـتی خۆیانە، نـەک بـە زۆرو زەبەند.

﴿ وَيَقُولُونَ ﴾ بـە شـێوەی بە درۆدانـانو پەلەکردن لە سـزادا دەیانـوت: ﴿ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾ واتـە: (ئـەم بەڵێنـە کـەی دێت ئەگـەر ئێوە ڕاسـت دەکەن).

خـوا ﷻ فەرمـووی: بـا ئەوە بـە دوور نەزانـن بێگومان ئەو سـزایە نزیکـە ﴿ مَا يَنظُرُونَ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً ﴾ (واتـە: ئەمانـە چاوەڕوانـی هیچ ناکەن مەگەر شـریخەو دەنگێکـی بەهێز) ئەویـش فـوو کردنە بە صـوڕدا ﴿ تَأْخُذُهُمْ ﴾ تووشـیان دەبـێ ﴿ وَهُمْ يَخِصِّمُونَ ﴾ واتە: ئـەوان بێئاگـان لێـی، هەرگیـز بـە بـای خەیاڵیانـدا نەهاتووە لـە کاتێ کـە لە نـاو خۆیاندا قسـەو دەمـە قاڵـێ دەکەن، ئەو سـزایە بـە زۆری دەرناکەوێ تەنها لـە کاتی بێئاگایـدا نەبێ. وە ئەگـەر لـە بێئاگاییـدا بیانگرێ، ئـەوە مۆڵـەت نادرێـن ﴿ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ تَوْصِيَةً ﴾ واتە: (ئەوسـا ناتوانـن هیـچ وەسـێتێک بکـەن) نە کـەم نـە زۆر ﴿ وَلَآ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمْ يَرْجِعُونَ ﴾ (واتـە: یـان بگەڕێنەوە بـۆ لای کـەسو کاریان).

(٥١-٥٤): ﴿ وَنُفِخَ فِى ٱلصُّورِ فَإِذَا هُم مِّنَ ٱلْأَجْدَاثِ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ ﴿٥١﴾ قَالُوا۟ يَٰوَيْلَنَا مَنۢ بَعَثَنَا مِن مَّرْقَدِنَا ۜ هَٰذَا مَا وَعَدَ ٱلرَّحْمَٰنُ وَصَدَقَ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٥٢﴾ إِن كَانَتْ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً فَإِذَا هُمْ جَمِيعٌ لَّدَيْنَا مُحْضَرُونَ ﴿٥٣﴾ فَٱلْيَوْمَ لَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا وَلَا تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٥٤﴾ ﴾:

﴿ وَنُفِخَ فِى ٱلصُّورِ فَإِذَا هُم مِّنَ ٱلْأَجْدَاثِ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ ﴿٥١﴾ ﴾ فـووی یەکـەم: بریتیـە لـە فووی ترسـانو مـردن، ئەمـە فـووی زیندوو کردنـەوەو بڵاوکردنەوەیە، جـا ئەگەر فوو کـرا بـە صـووردا، لە گۆڕەکانیان بـە پەلە دێنە دەر بـۆ ئامادە بوون بـۆ لای پەروەردگاریان، تواناى لەسـەرخۆییو خۆ دواخسـتنیان نیە.

ئـا لـەو حاڵەتـدا بەدرۆدانەران بێـزار دەبـنو حەسـرەتو پەشـیمانی هەڵدەکێشـنو دەڵێن: ﴿ يَٰوَيْلَنَا مَنۢ بَعَثَنَا مِن مَّرْقَدِنَا ﴾ واتـە: (ئـەی هـاوار کـێ زینـدووی کردینـەوە) لـەو خەوەمانـدا لـە نـاو گـۆڕەکان، چونکە لە هەنـدێ فەرموودەدا هاتـووە، بێگومان بـۆ ئەوانەی

لــە نــاو گۆڕەکانــدان ســەرخەوێک هەیــە پێــش فوو کــردن بە صــوردا.
وەڵام دەدەنــەوە، پێیــان دەوتــرێ: ﴿ هَٰذَا مَا وَعَدَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَصَدَقَ ٱلۡمُرۡسَلُونَ ﴾ واتە: ئەمــەی کــە خــوا بەڵێنــی پێــداون پێــی، وە پێغەمبەرانیــش پەیمانیان پێــداون، ڕاســتگۆییان دەرکــەوت، وەک ئــەوەی بــە چــاو بیبینرێ.
وا مەزانــە باســکردنی (رحمــن) لەم جێگایــەدا، تەنها بۆ هــەواڵ دانە لە پەیمانــی، بەڵکو ئەوە بــۆ هــەواڵ دانــە بــەوەی لــەو ڕۆژە مەزنــەدا بــە جــۆرێ میهرەبانی خــوا دەبینن کــە بە بای خەیاڵیشــدا نەهاتــووە، وە ژمێریارانیــش نەیان ژمــاردووە، وەک خــوا دەفەرموێ: ﴿ ٱلۡمُلۡكُ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡحَقُّ لِلرَّحۡمَٰنِ ﴿٢٦﴾ ﴾الفرقــان، (واتــە: لــەو ڕۆژەدا فەرمــان ڕەوایەتــی تەنهــا بۆ خوای میهرەبانــە)، ﴿ وَخَشَعَتِ ٱلۡأَصۡوَاتُ لِلرَّحۡمَٰنِ ﴿١٠٨﴾ ﴾طــە. (واتــە: لــە ترســی خــوای میهرەبان هەمــوو دەنگــەکان نــزم دەبن)، وە وێنــەی ئەوانەیــش، لەوەی نــاوی ڕەحمانی تێدا باســکرا بێ.
﴿ إِن كَانَتۡ ﴾ زینــدوو بوونــەوە لــە گــۆڕەکان ﴿ إِلَّا صَيۡحَةً وَٰحِدَةً ﴾ ئیســرافیل فــوو دەکات بــە صوردا، جەســتەکان زینــدوو دەبنــەوە ﴿ فَإِذَا هُمۡ جَمِيعٌ لَّدَيۡنَا مُحۡضَرُونَ ﴾ (کــتو پــڕ لە لای ئێمــە ئامادە دەبــن) یەکەمینو کۆتــاکان، ئادەمیزادو جنۆکــە، بۆ ئەوەی لێپرســینەوەیان لــێ بکرێ.
﴿ فَٱلۡيَوۡمَ لَا تُظۡلَمُ نَفۡسٞ شَيۡـٔٗا ﴾ (واتــە: ئەمــڕۆ هیــچ جــۆرە ســتەمێ لــە کــەس ناکرێ) لــە چاکەکانــی کــەم ناکرێتــەوەو لە خراپەکانیشــی زیــاد ناکــرێ ﴿ وَلَا تُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴾ (واتــە: وە جگــە لــەوەی دەتــان کرد پاداشــتو ســزا نادرێنــەوە) لە خێــر یــان لــە شــەڕ، هەر کەســێ خێــری بینــی با ستایشــی خــوا بــکات لەســەری، وە هەر کەســێ جگــە لــەوەی بینی بــا لۆمــەی کەس نــەکات نەفســی خــۆی نەبێ.

إِنَّ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ ٱلۡيَوۡمَ فِي شُغُلٖ فَٰكِهُونَ ٥٥ هُمۡ وَأَزۡوَٰجُهُمۡ
فِي ظِلَٰلٍ عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ مُتَّكِـُٔونَ ٥٦ لَهُمۡ فِيهَا فَٰكِهَةٞ
وَلَهُم مَّا يَدَّعُونَ ٥٧ سَلَٰمٞ قَوۡلٗا مِّن رَّبّٖ رَّحِيمٖ ٥٨ وَٱمۡتَٰزُواْ
ٱلۡيَوۡمَ أَيُّهَا ٱلۡمُجۡرِمُونَ ٥٩ ۞أَلَمۡ أَعۡهَدۡ إِلَيۡكُمۡ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ
أَن لَّا تَعۡبُدُواْ ٱلشَّيۡطَٰنَۖ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ٦٠ وَأَنِ
ٱعۡبُدُونِيۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ ٦١ وَلَقَدۡ أَضَلَّ مِنكُمۡ
جِبِلّٗا كَثِيرًاۖ أَفَلَمۡ تَكُونُواْ تَعۡقِلُونَ ٦٢ هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِي
كُنتُمۡ تُوعَدُونَ ٦٣ ٱصۡلَوۡهَا ٱلۡيَوۡمَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡفُرُونَ ٦٤
ٱلۡيَوۡمَ نَخۡتِمُ عَلَىٰٓ أَفۡوَٰهِهِمۡ وَتُكَلِّمُنَآ أَيۡدِيهِمۡ وَتَشۡهَدُ أَرۡجُلُهُم
بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ٦٥ وَلَوۡ نَشَآءُ لَطَمَسۡنَا عَلَىٰٓ أَعۡيُنِهِمۡ
فَٱسۡتَبَقُواْ ٱلصِّرَٰطَ فَأَنَّىٰ يُبۡصِرُونَ ٦٦ وَلَوۡ نَشَآءُ لَمَسَخۡنَٰهُمۡ
عَلَىٰ مَكَانَتِهِمۡ فَمَا ٱسۡتَطَٰعُواْ مُضِيّٗا وَلَا يَرۡجِعُونَ
٦٧ وَمَن نُّعَمِّرۡهُ نُنَكِّسۡهُ فِي ٱلۡخَلۡقِۚ أَفَلَا يَعۡقِلُونَ ٦٨
وَمَا عَلَّمۡنَٰهُ ٱلشِّعۡرَ وَمَا يَنۢبَغِي لَهُۥٓۚ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ وَقُرۡءَانٞ مُّبِينٞ
٦٩ لِّيُنذِرَ مَن كَانَ حَيّٗا وَيَحِقَّ ٱلۡقَوۡلُ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ٧٠

(٥٥-٥٨): ﴿إِنَّ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ ٱلۡيَوۡمَ فِي شُغُلٖ فَٰكِهُونَ ﴿٥٥﴾ هُمۡ وَأَزۡوَٰجُهُمۡ فِي ظِلَٰلٍ عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ مُتَّكِـُٔونَ ﴿٥٦﴾ لَهُمۡ فِيهَا فَٰكِهَةٞ وَلَهُم مَّا يَدَّعُونَ ﴿٥٧﴾ سَلَٰمٞ قَوۡلٗا مِّن رَّبّٖ رَّحِيمٖ ﴿٥٨﴾﴾

﴿إِنَّ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ ٱلۡيَوۡمَ﴾ کاتێ خوا ﷻ باسـی ئەوەیکـرد کـە بێگومـان هیـچ کـەس پاداشـت نادرێتـەوە مەگـەر بـە پێـی کردەوەکـەی، ئنجـا باسـی پاداشـتی هـەردوو دەسـتەکەی کـرد، بـە خەڵکانـی بەهەشـت دەسـتی پێکـردو هەواڵیـدا، بێگومـان ئـەوان لـەو ڕۆژەدا ﴿فِي شُغُلٖ فَٰكِهُونَ﴾ لـە خۆشـیو شـادی سـەرقاڵی نەفـسو دەروونتـان، لـە هەمـوو ئەوانـەی نەفـسو دەروون حـەزی پێـدەکاو چـاو لەززەتـی لێوەردەگرێ، ئـاوات خـوازان ئاواتی بۆ دەخـوازن، لـەو خۆشـیانە کچانی پاکیـزەی زۆر جوانـن، کە پـەردەی کچێنیـان لانەچووە، هەروەکـو خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿هُمۡ وَأَزۡوَٰجُهُمۡ﴾ (خۆیـانو هاوسـەرەکانیان) لە حۆریە چـاو گەشـەکان، ئەوانەی جوانی ڕووخسـارو جەسـتەو ڕەوشـتیان لە خۆیانـدا کۆکردۆتەوە ﴿فِي ظِلَٰلٍ عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ﴾ لـە سـەر تەختی ڕازاوەو جـوان بە جلو بەرگی سـەرنجڕاکێش ﴿مُتَّكِـُٔونَ﴾ پاڵیـان داوەتـەوە لـە سـەری، پاڵدانەوەیـەک لە سـەر تـەواوی پشـوودانو دڵنیایـیو لـەزەت.

﴿لَهُمۡ فِيهَا فَٰكِهَةٞ﴾ (لـەو بەهەشـتەدا بۆیان ئامادەیـە میوەهاتی) زۆرو زەبەنـد، لە هەموو جـۆرە میوەهاتـە بـە لەزەتـەکان، لـە تـریو هەنجیـرو هەنـارو جگـە لەوانیـش ﴿وَلَهُم مَّا يَدَّعُونَ﴾ واتـە: ئـەوەی داوای دەکـەن، داوای هـەر شـتێ بکـەنو ئاواتـی بۆ بخـوازن بە ئاسـانی پێـی دەگەن.

هەروەهـا بۆیـان هەیـە ﴿سَلَٰمٞ﴾ سـڵاویان بـۆ بەدەسـت دێ ﴿مِّن رَّبّٖ رَّحِيمٖ﴾ (لـە لایـەن پەروەردگـاری میهرەبانـەوە) جـا لەمـەدا قسـەکردنی پەروەردگارە لەگـەڵ خەڵکی

بەهەشتو سڵاوکردنێتی لێیان، وە جەختی کردۆتەوە بە وتەی: ﴿قَوۡلٗا﴾ جا ئەگەر پەروەردگاری بە بەزەیی سڵاوی لێکردن ئەوە سەلامەتی تەواویان بۆ دەستەبەر دەبێ لە هەموو ڕووەکانەوە، کە هیچ سڵاوێک لەوە گەورەتر نیەو هیچ نازونیعمەتێک ناگاتە هاوشانی.

دەی گومانت چۆنە بە سڵاوی پاشای پاشاکان، پەروەردگاری مەزن، بە سۆزی بەزەیی، بۆ خەڵکانێ لە ماڵی ڕێزداری ئەودان، ئەوانەی ڕەزامەندی خۆی بۆی حەڵاڵ کردوون، هەرگیز لێیان تووڕە نابێ.

ئەگەر خوا بڕیاری ئەوەی نەدایە ئەوان نامرن یان دڵیان لە جێگای خۆی لاناچێ لە خۆشیو گەشاوەییدا، ئەوە بێگومان ڕوویدەدا، ئومێد دەکەین پەروەردگارمان بێبەشمان نەکات لەو نازونیعمەتە، وە پێمان ببەخشێ نازونیعمەتی بینینی ڕوومەتی بەخشندەی خۆی.

(٥٩- ٦٧): ﴿وَٱمۡتَٰزُواْ ٱلۡيَوۡمَ أَيُّهَا ٱلۡمُجۡرِمُونَ ٥٩ أَلَمۡ أَعۡهَدۡ إِلَيۡكُمۡ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعۡبُدُواْ
ٱلشَّيۡطَٰنَۖ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ٦٠ وَأَنِ ٱعۡبُدُونِيۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ ٦١ وَلَقَدۡ
أَضَلَّ مِنكُمۡ جِبِلّٗا كَثِيرًاۖ أَفَلَمۡ تَكُونُواْ تَعۡقِلُونَ ٦٢ هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ ٦٣
ٱصۡلَوۡهَا ٱلۡيَوۡمَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡفُرُونَ ٦٤ ٱلۡيَوۡمَ نَخۡتِمُ عَلَىٰٓ أَفۡوَٰهِهِمۡ وَتُكَلِّمُنَآ أَيۡدِيهِمۡ وَتَشۡهَدُ
أَرۡجُلُهُم بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ٦٥ وَلَوۡ نَشَآءُ لَطَمَسۡنَا عَلَىٰٓ أَعۡيُنِهِمۡ فَٱسۡتَبَقُواْ ٱلصِّرَٰطَ فَأَنَّىٰ
يُبۡصِرُونَ ٦٦ وَلَوۡ نَشَآءُ لَمَسَخۡنَٰهُمۡ عَلَىٰ مَكَانَتِهِمۡ فَمَا ٱسۡتَطَٰعُواْ مُضِيّٗا وَلَا
يَرۡجِعُونَ ٦٧﴾:

دوای ئەوەی خوا ﷻ باسی پاداشتی لە خوا ترسانی کرد، ئینجا باسی پاداشتی تاوانبارانی کرد، ﴿وَٱمۡتَٰزُواْ ٱلۡيَوۡمَ أَيُّهَا ٱلۡمُجۡرِمُونَ﴾ ئەوان لە ڕۆژی دواییدا پێیان دەوترێ جیاببنەوە لە بڕواداران، بکەونە لا بۆ ئەوەی سەرزەنشتیان بکات، وە لە پێش چاوی هەموو خەڵکی ڕیسواو سەرشۆڕیان بکات پێش ئەوەی بیانخاتە ئاگر، جا پێیان دەڵێ: ﴿أَلَمۡ أَعۡهَدۡ إِلَيۡكُمۡ﴾ واتە: ئایا فەرمانم پێنەکردنو وەسیەتم بۆ نەکردن لەسەر زمانی پێغەمبەرانم، وە پێم نەوتن: ﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعۡبُدُواْ ٱلشَّيۡطَٰنَ﴾ واتە: (ئەی نەوەکانی ئادەم) گوێڕایەڵی شەیتان مەکەن؟ هەموو جۆرەکانی کوفرو سەرپێچی دەچنە ناو ئەم سەرزەنشت کردنەوە، چونکە هەمووی گوێڕایەڵی کردنی شەیتانو بەندایەتی کردنە بۆی ﴿إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ﴾ (چونکە بەڕاستی شەیتان دوژمنی ئاشکرای ئێوەیە)

ئاگـادارم کردنـەوە بەوپـەڕی ئاگـادار کردنـەوە، وە ئێومم ترسـاند لـە گوێڕایەڵـی کردنی شـەیتانو هەواڵـم پێدان بەوەی بانگتـان دەکات بۆ لای خـۆی، ﴿ وَأَنِ ٱعۡبُدُونِي ﴾ فەرمانم پێکـردن بـە جێبەجـێ کردنی فەرمانەکانـم، وە وازهێنـان لـە قەدەغەکراوەکانم، ﴿ هَٰذَا ﴾ واتـە: بەندایەتیـمو گوێڕایەڵیم، وە سـەرپێچیکردنی شـەیتان ﴿ صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ ﴾ (ڕێگای ڕاسـتە) جـا زانسـتی ڕێگـای ڕاسـتو کردەوەکانی دەگەڕێتـەوە بۆ ئـەم دوو کارە.

واتـە: پارێزگاریتـان لـە بەڵێنەکـەم نەکـرد، وە کارتـان بـە وەسـیەتم نەکرد، پشـتیوانیتان لـە دوژمنەکـەی خۆتان کـرد ﴿ وَلَقَدۡ أَضَلَّ مِنكُمۡ جِبِلّٗا كَثِيرًا ﴾ واتـە: خەڵکێکی زۆری (لـێ گومـڕا کـردن) ﴿ أَفَلَمۡ تَكُونُواْ تَعۡقِلُونَ ﴾ واتـە: ئایـا عەقڵێکتـان نەبـوو فەرمانتان پێ بـکات بـە خۆشویسـتنی پەروەردگارتـانو پشـتیوانی ڕاسـتەقینەتان، وە لۆمەتـان بـکات لـەوەی خراپترینـی دوژمنەکانتـان بکەن بە دۆسـت، جا ئەگەر ئێـوە عەقڵێکی تەندروسـتان هەبووایـە چـۆن کاری واتـان دەکرد.

ئەگـەر ئێـوە گوێڕایەڵـی شـەیتانتان کـردو گەیشـتن بە خواتـان بـەدرۆ دانـا، وە قیامەتتان ڕەتکـردەوە کـە ماڵی پاداشـتە، بۆیە سـزاتان لەسـەر پێویسـت بـوو، ﴿ هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ ﴾ (ئەمـە ئـەو دۆزەخەیـە کـە بەڵێنتان پـێ درابـوو)، وە بە درۆتـان دەزانی، دەی بـە چـاوی خۆتـان تەماشـای بکـەن، ئـا ئـەو کاتە دڵـەکان شـپرزە دەبنو چـاوەکان ئەبڵـەق دەبـن، تـرسو نارەحەتـی گەورەیان تـووش دەبێ.

پاشـان ئـەو سـزایەیان بـۆ تـەواو دەکات، بـەوەی فەرمانیـان پێدەکات بـە ئاگـر، وە پێیان دەوتـرێ: ﴿ ٱصۡلَوۡهَا ٱلۡيَوۡمَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡفُرُونَ ﴾ واتـە: بچنـە نـاو دۆزەخـەوە، با گەرمی دەورتـان بگـرێو بە توندترین شـێوە سـزاتان بدات، بـە هـۆی بێبڕواییتان بـە ئایەتەکانی خواو بـە درۆدانانـی پێغەمبەران.

خـوا ﷻ لە ڕوون کردنەوەی وەسـفی ناشـرینو قێزەونیـان لە ماڵی بەدبەختیـدا فەرموویەتی: ﴿ ٱلۡيَوۡمَ نَخۡتِمُ عَلَىٰٓ أَفۡوَٰهِهِمۡ ﴾ (واتـە: ئەمـڕۆ مۆر دەدەین بەسـەر دڵەکانیاندا) بەوەی لاڵیان دەکەیـن، هیـچ قسـە ناکەن، توانایـان نیە لـە نکوولێ کردنی ئـەوەی کردوویانـە لە کوفرو بێبڕوایـی ﴿ وَتُكَلِّمُنَآ أَيۡدِيهِمۡ وَتَشۡهَدُ أَرۡجُلُهُم بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴾ واتـە: ئەندامەکانـی جەسـتەیان شـایەتیان لەسـەر دەدەن بەوەی کردوویانە، وە دەیانهێنێتە قسـەکردن ئەو زاتەی هەموو شـتێکی هێناوەتە قسـەکردن.

﴿ وَلَوۡ نَشَآءُ لَطَمَسۡنَا عَلَىٰٓ أَعۡيُنِهِمۡ ﴾ (واتـە: ئەگـەر بمانـەوێ ڕووناکی چاویـان ناهێڵین)

بەوەی چاوەکانیان ببەین، وەک چۆن دەربڕینیانمان لە ناو برد ﴿ فَاسْتَبَقُوا الصِّرَاطَ ﴾ واتە: پەلە بکەنو پێشبڕکێ بکەن بۆ (ڕێگای ڕاست)، چونکە ئەو ڕێگایە بۆ گەیشتن بە بەهەشت ﴿ فَأَنَّىٰ يُبْصِرُونَ ﴾ (جا چۆن دەیبینن)، کە بێگومان چاوەکانیان ڕووناکی نەماوەو کوێر بووە.

﴿ وَلَوْ نَشَاءُ لَمَسَخْنَاهُمْ عَلَىٰ مَكَانَتِهِمْ ﴾ واتە: (ئەگەر بمانەوێ) جوڵەیان ناهێڵین ﴿ فَمَا اسْتَطَاعُوا مُضِيًّا ﴾ (واتە: بە هۆی ئەو گۆڕینەوەیان نە دەتوانن) بۆ پێش بڕۆن ﴿ وَلَا يَرْجِعُونَ ﴾ نە بۆ دواوە، تا دوور بن لە ئاگر، مانای ئەوەیە: ئەو بێبڕوایانە، وشەی سزایان لەسەر پێویست بووەو هەر دەبێ سزا بدرێن.

وە لەو جێگەیەدا، هیچ شتێک نیە جگە لە ئاگر نەبێ کە هەڵگیرساوە، وە هیچ کەس ڕزگاربوونی بۆ نیە تەنها بە تێپەڕبوون نەبێ بەسەر پردی (صراط)دا، ئەمیش ناتوانێ مەگەر ئیماندار، ئەوانەی ڕێ دەکەن بە ڕووناکیەکانیان، بەڵام ئەوانە، هیچ پەیمانێکیان لە لای خوا نیە لە ڕزگار بوونی ئاگر.

ئەگەر خوا بیەوێ بیناییان لێ وەردەگرێو جوڵەیان دەهێڵی، ڕێنمایی ناکرێن بۆ بڕینی پردەکە ئەگەر چی پەلەش بکەن، وە ئەگەر بیەوێ جوڵەیان دەبڕێ، توانای پێشکەوتنو دواکەوتنیان نیە، مەبەست ئەوەیە: ئەوان تێی ناپەڕێنن، بۆیە ڕزگاریان نابێت.

(٦٨): ﴿ وَمَن نُّعَمِّرْهُ نُنَكِّسْهُ فِي الْخَلْقِ أَفَلَا يَعْقِلُونَ ﴿٦٨﴾ ﴾:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَمَن نُّعَمِّرْهُ ﴾ (تەمەنی هەرکەس درێژ بکەین) لە نەوەکانی ئادەم ﴿ نُنَكِّسْهُ فِي الْخَلْقِ ﴾ واتە: دەگەڕێتەوە بۆ ئەو حاڵەتەی کە سەرەتا بووە، حاڵەتی لاوازی، لاوازی عەقڵو لاوازی هێزو توانا.

﴿ أَفَلَا يَعْقِلُونَ ﴾ (ئایا ژیر نابن) کە بێگومان ئادەمیزاد لاوازە لە هەموو ڕوویەکەوە، سوود لە هێزو عەقڵیان وەربگرن، بەکاری بهێنن لە گوێڕایەڵی خوادا.

(٦٩-٧٠): ﴿ وَمَا عَلَّمْنَاهُ الشِّعْرَ وَمَا يَنبَغِي لَهُ ۚ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ وَقُرْآنٌ مُّبِينٌ ﴿٦٩﴾ لِّيُنذِرَ مَن كَانَ حَيًّا وَيَحِقَّ الْقَوْلُ عَلَى الْكَافِرِينَ ﴿٧٠﴾ ﴾:

خوا ﷻ پێغەمبەرەکەی ﷺ پاک ڕاگرتووە لەوەی هاوبەشدانەران تۆمەتباریان کردوە کە گوایە ئەو شاعیرە، ئەوەیشی هێناویەتی شیعرە، فەرموویەتی: ﴿ وَمَا عَلَّمْنَاهُ الشِّعْرَ وَمَا يَنبَغِي لَهُ ﴾ (واتە: ئێمە ئەو موحەممەدەمان ﷺ فێری شیعر نەکردوەو شیعر وتن شیاوی ئەو نیە) ئەمە شتێکی ئەستەمە کە ئەو شاعیر بێت، چونکە ئەو ژیرو ڕێنمایی کراوە،

شـاعیرەکان گومـڕان تەنهـا گومـڕاکان شـوێنیان دەکـەون، وە لەبـەر ئەوەی خـوا هەموو گومانەکانـی بڕیوەتـەوە کـە گومڕاکان خۆیـان پێوە هەڵواسـیوە لەسـەر پێغەمبەرەکەی.
جـا ئەوەشـی بڕیوەتـەوە کە بۆی بنوسـرێ یان بـۆی بخوێنـرێ، هەواڵی داوە، کـە بێگومان ئـەو فێـری شـیعری نەکـردووەو شـیعر وتـن شـیاوی ئـەو نیـە ﴿ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ وَقُرۡءَانٞ مُّبِينٞ ﴾ واتـە: ئـەوەی پێغەمبـەر هێناویەتـی زیکـرو یادێکـە ئەوانەی خاوەن دڵن سـوودی لێوەردەگـرن، هەمـوو داواکاریـە ئاینیـەکان، ئـەو پەیامـە هەمـووی بـە تەواوەتـی لـە خۆ گرتـووە، ئـەوە بیـری عەقڵـەکان دەخاتەوە، ئەوەی خـوا دایناوە لـە فیترەتیان لـە فەرمان بە هەمـوو چاکەیـەکو ڕێگری لـە هەمـوو خراپەیەک.
﴿ وَقُرۡءَانٞ مُّبِينٞ ﴾ واتـە: ڕوون کەرەوەیـە بۆ ئەو کەسـەی داوای ڕوون کردنـەوە دەکات، لەبـەر ئەمـە (معمـول)ی لابـردوە، بـۆ ئـەوەی بەڵگـە بێـت کـە بێگومـان ئـەو قورئانـە ڕوونکـەرەوەی هەمـوو حەقـە، بـە بەڵگـە دوورو درێـژو کورتـەکان، وە ڕوونکـەرەوەی هەمـوو پووچـەکانو بەڵگـە لەسـەر پووچیان.
بـە هەمان شـێوە خـوا دایبەزاندووە بـۆ سـەر پێغەمبەرەکـەی ﴿ لِّيُنذِرَ مَن كَانَ حَيّٗا ﴾ واتە: دڵـی زینـدوو وریـا، ئەو کەسـە خـۆی پاک دەکاتـەوە بـەم قورئانە، ئەو کەسـە زانسـتو کـردەوەی زیـاد دەکات، وە قورئانیـش بـۆ دڵـی وەکـو بارانێکـی لـێ دێت بـۆ زەویەکی چـاکو پـاک ﴿ وَيَحِقَّ ٱلۡقَوۡلُ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾ (واتـە: بەڵێنـی سـزا بسـەپێ بەسـەر بێبڕواایانـدا) لەبـەر ئـەوەی ئـەوان ئەو قورئانـە بووەتە بەڵگـەو حوجەی خوا بەسـەریانەوە، وە بیانوویـان بڕاوەتـەوە، کەمتریـن بیانـوو گومانیـان نەماوە کـە بیهێننەوە.


أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا خَلَقْنَا لَهُم مِّمَّا عَمِلَتْ أَيْدِينَا أَنْعَامًا فَهُمْ لَهَا مَالِكُونَ ٧١ وَذَلَّلْنَاهَا لَهُمْ فَمِنْهَا رَكُوبُهُمْ وَمِنْهَا يَأْكُلُونَ ٧٢ وَلَهُمْ فِيهَا مَنَافِعُ وَمَشَارِبُ أَفَلَا يَشْكُرُونَ ٧٣ وَاتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ آلِهَةً لَّعَلَّهُمْ يُنصَرُونَ ٧٤ لَا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَهُمْ وَهُمْ لَهُمْ جُندٌ مُّحْضَرُونَ ٧٥ فَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ إِنَّا نَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ٧٦ أَوَلَمْ يَرَ الْإِنسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ٧٧ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُ قَالَ مَن يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ ٧٨ قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ ٧٩ الَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ الشَّجَرِ الْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَا أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ ٨٠ أَوَلَيْسَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِقَادِرٍ عَلَىٰ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُم بَلَىٰ وَهُوَ الْخَلَّاقُ الْعَلِيمُ ٨١ إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئًا أَن يَقُولَ لَهُ كُن فَيَكُونُ ٨٢ فَسُبْحَانَ الَّذِي بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ٨٣

سورة الصافات

**(٧١-٧٣):** ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا خَلَقْنَا لَهُم مِّمَّا عَمِلَتْ أَيْدِينَا أَنْعَامًا فَهُمْ لَهَا مَالِكُونَ ﴿٧١﴾ وَذَلَّلْنَاهَا لَهُمْ فَمِنْهَا رَكُوبُهُمْ وَمِنْهَا يَأْكُلُونَ ﴿٧٢﴾ وَلَهُمْ فِيهَا مَنَافِعُ وَمَشَارِبُ أَفَلَا يَشْكُرُونَ ﴿٧٣﴾ ﴾:

خوا ﷻ فەرمان بە بەندەکانی دەکات بە سەرنجدانی ئەوەی ڕامیهێناوە لەوەی ئاژەڵەکانی بۆ زەلیل کردوون، وە ئەوانی کردوە بە خاوەنیان، گوێڕایەڵیان دەکەن لە هەر کارێک کە بیانەوێ، وە سوودو قازانجێکی زۆری تیایاندا داناوە بۆیان لە هەڵگرتنی کەرەستەو بارە قورسەکانیان، لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە، وە لە خواردنیاندا، وە بۆ گرمکردنەوە لەخوری‌و کوڵک‌و مووەکانیان شتومەکی ناوماڵ کە کەڵکی لێوەردەگرن تا ماوەیەک، وە جوانییان تێدایە، جگە لەو سوودانەی بە چاو دەبینرێن ﴿ أَفَلَا يَشْكُرُونَ ﴾ (ئایا بۆ سوپاسگوزار نابن) ئەو زاتەی کە ئەم نیعمەتانەی پێ بەخشیون، وە بەدڵسۆزی بەندایەتی بۆ بکەن، وە چێژی لێوەرمەگرن بە چێژ وەرگرتنێک بەتاڵ بێ لە پەندو ئامۆژگاری‌و بیر کردنەوە.

**(٧٤-٧٥):** ﴿ وَاتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ آلِهَةً لَّعَلَّهُمْ يُنصَرُونَ ﴿٧٤﴾ لَا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَهُمْ وَهُمْ لَهُمْ جُندٌ مُّحْضَرُونَ ﴿٧٥﴾ ﴾:

﴿ وَاتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ آلِهَةً لَّعَلَّهُمْ يُنصَرُونَ ﴾ ئەمە ڕوونکردنەوەیەکە بۆ بەتاڵی‌و پووچکردنەوەی پەرستراوی هاوبەش دانەران کە لەگەڵ خوادا دایانتابوو، وە ئومێدی سەرکەوتن‌و تکایان لێدەکردن. بێگومان ئەو پەرستراوانە لە ئەوپەڕی بێ توانایيدان ﴿ لَا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَهُمْ ﴾ (ناتوانن سەریان بخەن) وە ناتوانن نەفسی خۆیشیان سەربخەن، جا ئەگەر ئەوان نەتوانن سەریان بخەن چۆن خۆیان سەردەخەن؟ سەرکەوتن دوو مەرجی هەیە: تواناو ئیرادە، جا ئەگەر توانای بوو دەمێنێتەوە: ئایا دەیەوێ ئەو کەسە سەربخات

كـە دەيپەرسـتێ يان نا؟ جـا ڕەتكردنـەوەی توانـا ڕەتكردنەوەی هـەردوو كارەكەيە.
﴿ وَهُمْ لَهُمْ جُندٌ مُّحْضَرُونَ ﴾ واتـە: ئـەوان ئامـادەن، وە ئـەوان لەنـاو سـزادان، هەندێكيـان خۆيـان بـەری دەكـەن لە هەندێكـی، ئايا بۆچی لـە دنيادا خۆيـان بەری نەكرد لـە بەندايەتی كردنـی ئەوانـە، وە بەدڵسـۆزيەوە بەندايەتيـان نەكـرد بـۆ ئەو زاتـەی كە موڵكو سـوودو زيـانو بەخشـينو گرتنـەوە بە دەسـتی ئەوە، وە ئـەو چاكتريـن پشـتيوانو يارمەتيدەرە؟
(٧٦): ﴿ فَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ إِنَّا نَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٧٦﴾ ﴾:
﴿ فَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ ﴾ واتە: با قسـەی بە درۆدانـەران خەمبارت نەكات ئەی پێغەمبەر ﷺ مەبەسـت لـە قسـە: ئەوەيە سـياقەكە بيێت بـە بەڵگە لەسـەری، هـەر قسـەيەك پێغەمبەری پـێ ناشـرين بكەن، يـان ئـەو پەيامـەی هێناويەتی.
واتـە: دڵت سـەرقاڵ مەكە بە خەم خـواردن لەسـەريان ﴿ إِنَّا نَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴾ (واتـە: بەڕاسـتی ئـەوەی دەيشـارنەوەو ئەوەی ئاشـكرای دەكەن ئێمـە دەيزانين) پاداشـتيان دەدەينـەوە، بـە پێـی ئـەو زانياريەی هەمانـە دەربارەيـان، ئەگەرنا قسـەی ئەوان زيـان بە تۆ ناگەيەنێت.
(٧٧-٨٣): ﴿ أَوَلَمْ يَرَ الْإِنسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴿٧٧﴾ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُ قَالَ مَن يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ ﴿٧٨﴾ قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ ﴿٧٩﴾ الَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ الشَّجَرِ الْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَا أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ ﴿٨٠﴾ أَوَلَيْسَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِقَادِرٍ عَلَىٰ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُم بَلَىٰ وَهُوَ الْخَلَّاقُ الْعَلِيمُ ﴿٨١﴾ إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئًا أَن يَقُولَ لَهُ كُن فَيَكُونُ ﴿٨٢﴾ فَسُبْحَانَ الَّذِي بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٨٣﴾ ﴾:
ئـەم دەقـە پيرۆزانـە باسـكردنی گومانـی نكوولێكارانـی زينـدوو كردنـەوەی تێدايـە، وە وەڵامدانەوەيـان بـە چاكتريـنو ڕوونتريـن وەڵامدانـەوە، جـا فەرموويەتـی: ﴿ أَوَلَمْ يَرَ الْإِنسَانُ ﴾ (واتـە: ئايـا ئادەميـزاد نەيزانيـوە) ئـەوەی نكوولـی زينـدوو بوونـەوە دەكاتو گومانـی هەيـە لێـی، لە شـتێک دڵنيايـی تـەواوی پێدات بـە ڕوودانـی، ئەويش: دروسـتكردنەوەيەتی ﴿ مِن نُّطْفَةٍ ﴾ (لـە نوتفەيـەک) پاشـان دەيگوازێتەوە قۆنـاغ بە قۆناغ هەتـا گەورە بـووەو، بووە بە گەنـجو لاوو عەقڵی كامڵ بـووە، ﴿ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴾ (واتـە: كەچـی يەكسـەر دەبێتـە دوژمنێكـی ديـار) دوای ئـەوەی سـەرەتای بەديهێنانی لە نوتفەيـەک بـووە، بـا تەماشـای جياوازی بـكات لە نێـوان ئـەو دوو حاڵەتەدا، وە بـا بزانێت

ئـەو زاتـەی ئـەوی بەدیهێنـاوە لە نەبوونـەوە، بـە تواناتـرە جارێکی تـر دروسـتی بکاتەوە دوای ئـەوەی پـارە پـارە بـوو، ﴿ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا ﴾ (واتـە: وە نموونەمان بـۆ دێنێتەوە) بۆ هیچ کەسـێک دروسـت نیە نموونـە بهێنێتـەوە، ئەویش بە پێوانـە کردنی توانـای بەدیهێنەر بـە توانـای بەدیهێنـراو، وە ئـەوەی کـە دوورە لـە توانـای بەدیهێنـراوەوە بـە دور بێـت لە توانـای بەدیهێنەر.

ئـەم نموونەیـەی شـیکردوەتەوە بـە فەرمایشـتی خـوا ﷻ: ﴿ قَالَ ﴾ ئـەو مرۆڤـە دەڵێـت: ﴿ مَن يُحْيِ الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ ﴾ واتـە: کەسـێک هەیـە ئێسـکەکان دروسـت بکاتـەوە؟ پرسـیارێکی نکوڵیـە، بـۆ هیـچ کەسـێک نیـە دروسـتیان بکاتـەوە دوای ئـەوەی ڕزیون. ئـەم ڕووی گومـانو نموونـە هێنانەوەیـە، ئەویـش بریتیـە لـەوەی ئـەم کارە لـە ئەوپەڕی دووریدایـە کـە لـە ئاسـتی توانـای ئادەمیـزادە، ئـەم قسـەیەی دەرچـووە لـەم مرۆڤـەوە لە بێئاگاییەتـیو سـەرەتایی دروسـتکردنی بیر چووە، جـا ئەگەر بیر بکاتەوە لە دروسـتکردنی، دوای ئـەوەی ئەگـەر شـتێکی باسـکراو نەبووایـە، ئـەوە بە چاوی خـۆی دەیبینـی، هەرگیز ئـەم نموونـەی نەدەهێنایەوە.

خـوا وەڵامـی دەربارەی ئەم بـە دوردانانـەی داوەتەوە بـە وەڵامێکـی ڕوونو ڕەوان، ﴿ قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ ﴾ (واتـە: بڵـێ: ئـەو زاتە زیندوویان دەکاتـەوە کە یەکەمجار بەدیهێنـاون)، ئەمـە تەنهـا بیرکردنـەوەی خۆیەتـی دەزانـێ بە زانستێکی دڵنیاکـەرەوە کە هیـچ گومـانو دوو دڵیەکـی تێدانیـە، ئـەو زاتەی بەدیهێنـاوە یەکەم جـار بە توانایە لەسـەر دووبـارە دروسـتکردنەوەی جارێکـی دیکە، ئەوە ئاسـانترە لەسـەر توانا، ئەگـەر بیرکەرەوە بیـری لـێ بکاتـەوە، ﴿ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ ﴾ (ئـەو بـە هەمـوو دروسـتکراوێک زاناو ئاگایـە) ئەمـە بەڵگـەی دووەمە لەسـەر سـیفاتەکانی خـوای بەرزو مـەزن، ئەویـش ئەوەیە بێگومـان زانسـتی دەوری هەموو بەدیهێنراوەکانـی داوە لە هەموو ڕوویەکیانـەوەو لە هەموو کاتەکانـدا، وە دەزانـێ زەوی چەندە لە جەسـتەی مـردووەکان کەم دەکاتەوە، وە ئەوەیشـی ماوەتـەوە، وە دەزانـێ بـە پەنهـانو ئاشـکرا، جـا ئەگـەر بەنـدە دانینا بـەم زانسـتە مەزنەدا، دەزانـێ ئـەوە مەزنتـرو گەورەترە لـە دروسـتکردنەوەی مـردوەکان لە نـاو گۆڕەکانیان.

پاشـان باسـی بەڵگەی سـێیەم دەکات، دەفەرموێ: ﴿ الَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ الشَّجَرِ الْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَا أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ ﴾ (واتـە: زاتـێ کـە لـە درەختـی سـەوز ئاگـری بـۆ دروسـت کـردوون ئیتـر ئێـوە ئاگـری پـێ دەکەنـەوە)، جـا ئەگـەر ئاگرێکـی وشـکی دەرهێنـا لە

دارێکــی تــەڕ کە لەوپــەڕی تەڕیدایــە، لەگەڵ ئــەوەی هەردوو کیــان دژیــەکو پێچەوانەی یەکتــرن، جــا دەرهێنانــی مردووان لــە گۆڕەکانیــان وەکو ئەوە وایە. پاشــان باســی بەڵگەی چوارەمــی کــردووەو فەرموویەتــی: ﴿ أَوَلَيۡسَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ ﴾ (واتــە: ئایــا زاتــێ کــە ئاســمانەکانو زەوی بەدیهێناوە) بــەو بەرفراوانیو مەزنیــە ﴿ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يَخۡلُقَ مِثۡلَهُم ﴾ واتــە: ناتوانــێ جارێکــی دیکــە دروســتیان بکاتــەوە؟ ﴿ بَلَىٰ ﴾ (بەڵــێ) توانای هەیــە بەســەر ئــەوەدا، چونکــە بێگومــان دروســتکردنی ئاســمانەکانو زەوی گەورەتــرە لە دروســتکردنی ئادەمیــزاد ﴿ وَهُوَ ٱلۡخَلَّٰقُ ٱلۡعَلِيمُ ﴾ (واتە: هەر ئەویش دروســتکەری زانایە) ئەمــە بەڵگــەی پێنجەمە کــە بێگومان خــوا ﷻ بەدیهێنەرە، هەمــوو بەدیهێنراوەکان ســەرەتاو دواییــان، بچووکو گەورەیان هەموویان شــوێنەوارێکن لــە شــوێنەواری بەدیهێنانو توانای خــوا، وە بێگومــان ئــەو زاتــە هیــچ بەدیهێنراوێک لێــی یاخی نابــێ ئەگەر بیەوێ دروســتی بکات.

جــا دووبارە دروســتکردنەوەی مــردووەکان یەکێکە لە شــوێنەوارەکانی دروســتکردنی خوا، لەبــەر ئەمەیــە فەرموویەتــی: ﴿ إِنَّمَآ أَمۡرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيۡـًٔا ﴾ (واتــە: بەڕاســتی کاری ئــەو (خــوا) ئەمەیــە هەرکاتــێ بیــەوێ شــتێک بەدیبێنێ) نەناســراوە لــە ســیاقی (شرط)دا هاتوە، بــۆ ئــەوەی هەموو شــتێک بگرێتــەوە، ﴿ أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴾ واتە: (کــە پێی بڵێ: ببە دەســتبەجێ دەبــێ بەبێ هیــچ بەربەســتێک) ﴿ فَسُبۡحَٰنَ ٱلَّذِي بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيۡءٍ ﴾ ئەمــە بەڵگــەی شەشــەمە، بێگومان خــوای بەرزو مــەزن خاوەنی هەمــوو موڵکەکانــە، هەموو ئەوانــەی کە نیشــتەجێن لە جیهانی ســەروو خــوارەوە موڵکی ئــەون، وە بەنــدەی ڕامهێنراوو ژێــر باری ئــەون، بەڕێوەیــان دەبات بە قەزاو قــەدەرە حوکمیــەکانو بڕیارە شــەرعیەکانو بڕیارە پاداشــتیەکانی.

جــا دووبــارە بەدیهێنانەوەیــان لــە لایــەن خــواوە دوای مردنیــان بــۆ ئەوەیــە بــە تــەواوی دەســەڵاتی بڕیاری پاداشــتیان لەســەر جێبەجێ بکات، بۆیــە فەرموویەتی: ﴿ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴾ (وە بــۆ لای ئەویــش دەگەڕێنــەوە) بەبێ هیــچ گومــانو دوودڵیەک، بە هــۆی زۆری بەڵگە ڕوونو ئاشــکراو یەکلاکــەرەوەکان لەســەر گەڕانەوەیــان، پاکــیو بێگەردی بــۆ ئەو زاتەی هیدایــەتو شــیفاو ڕووناکــی داناوە لە قســەکانیدا.

تەفسیری سووڕەتی (یس) تەواو بوو.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ صَفّٗا ١ فَٱلزَّٰجِرَٰتِ زَجۡرٗا ٢ فَٱلتَّٰلِيَٰتِ ذِكۡرًا ٣ إِنَّ
إِلَٰهَكُمۡ لَوَٰحِدٞ ٤ رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا وَرَبُّ
ٱلۡمَشَٰرِقِ ٥ إِنَّا زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِزِينَةٍ ٱلۡكَوَاكِبِ ٦ وَحِفۡظٗا
مِّن كُلِّ شَيۡطَٰنٖ مَّارِدٖ ٧ لَّا يَسَّمَّعُونَ إِلَى ٱلۡمَلَإِ ٱلۡأَعۡلَىٰ وَيُقۡذَفُونَ
مِن كُلِّ جَانِبٖ ٨ دُحُورٗاۖ وَلَهُمۡ عَذَابٞ وَاصِبٌ ٩ إِلَّا مَنۡ خَطِفَ
ٱلۡخَطۡفَةَ فَأَتۡبَعَهُۥ شِهَابٞ ثَاقِبٞ ١٠ فَٱسۡتَفۡتِهِمۡ أَهُمۡ أَشَدُّ خَلۡقًا أَم
مَّنۡ خَلَقۡنَآۚ إِنَّا خَلَقۡنَٰهُم مِّن طِينٖ لَّازِبِۭ ١١ بَلۡ عَجِبۡتَ وَيَسۡخَرُونَ
١٢ وَإِذَا ذُكِّرُواْ لَا يَذۡكُرُونَ ١٣ وَإِذَا رَأَوۡاْ ءَايَةٗ يَسۡتَسۡخِرُونَ ١٤
وَقَالُوٓاْ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّبِينٌ ١٥ أَءِذَا مِتۡنَا وَكُنَّا تُرَابٗا وَعِظَٰمًا
أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ ١٦ أَوَءَابَآؤُنَا ٱلۡأَوَّلُونَ ١٧ قُلۡ نَعَمۡ وَأَنتُمۡ دَٰخِرُونَ
١٨ فَإِنَّمَا هِيَ زَجۡرَةٞ وَٰحِدَةٞ فَإِذَا هُمۡ يَنظُرُونَ ١٩ وَقَالُواْ يَٰوَيۡلَنَا
هَٰذَا يَوۡمُ ٱلدِّينِ ٢٠ هَٰذَا يَوۡمُ ٱلۡفَصۡلِ ٱلَّذِي كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ٢١
۞ ٱحۡشُرُواْ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ وَأَزۡوَٰجَهُمۡ وَمَا كَانُواْ يَعۡبُدُونَ ٢٢ مِن دُونِ
ٱللَّهِ فَٱهۡدُوهُمۡ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡجَحِيمِ ٢٣ وَقِفُوهُمۡۖ إِنَّهُم مَّسۡـُٔولُونَ ٢٤

## تەفسیری سوورەتی (الصافات)

## مەككیە (١٨٢) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-١١): ﴿ وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ صَفّٗا ١ فَٱلزَّٰجِرَٰتِ زَجۡرٗا ٢ فَٱلتَّٰلِيَٰتِ ذِكۡرًا ٣ إِنَّ إِلَٰهَكُمۡ لَوَٰحِدٞ ٤ رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا وَرَبُّ ٱلۡمَشَٰرِقِ ٥ إِنَّا زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِزِينَةٍ ٱلۡكَوَاكِبِ ٦ وَحِفۡظٗا مِّن كُلِّ شَيۡطَٰنٖ مَّارِدٖ ٧ لَّا يَسَّمَّعُونَ إِلَى ٱلۡمَلَإِ ٱلۡأَعۡلَىٰ وَيُقۡذَفُونَ مِن كُلِّ جَانِبٖ ٨ دُحُورٗاۖ وَلَهُمۡ عَذَابٞ وَاصِبٌ ٩ إِلَّا مَنۡ خَطِفَ ٱلۡخَطۡفَةَ فَأَتۡبَعَهُۥ شِهَابٞ ثَاقِبٞ ١٠ فَٱسۡتَفۡتِهِمۡ أَهُمۡ أَشَدُّ خَلۡقًا أَم مَّنۡ خَلَقۡنَآۚ إِنَّا خَلَقۡنَٰهُم مِّن طِينٖ لَّازِبِۭ ١١ ﴾:

ئەمە سوێندێكە لەلایەن خوای گەورەوە بە فریشتە بەرێزەكان، لە كاتی بەندایەتی كردنو بەڕێوەبردنیان بە مۆڵەتی پەروەردگاریان، لەسەر یەكتاپەرستیو پەروەردگاریتی، جا فەرموویەتی: ﴿ وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ صَفّٗا ﴾ واتە: ڕیز بوون لە خزمەتی پەروەردگاریاندا، ئەوانیش فریشتەكانن.

﴿ فَٱلزَّٰجِرَٰتِ زَجۡرٗا ﴾ ئەوانیش فریشتەكانن، دەخوڕن بەسەر هەورەكانو جگە لەوانیش بە فەرمانی خوا ﷻ ﴿ فَٱلتَّٰلِيَٰتِ ذِكۡرًا ﴾ ئەوانیش ئەو فریشتانەن كە وتەی خوا دەخوێنن.

جا كاتێ خوا دەپەرستنو لە فەرمانی دەرناچن بە قەد چاوتروكانێ سوێندی پێ خواردوون لەسەر پەروەردگاریتی، جا فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ إِلَٰهَكُمۡ لَوَٰحِدٞ ﴾ (واتە: بەڕاستی پەرستراوی ئێوە تاكو تەنهایە) هاوبەشی نیە لە پەرستراوێتیدا، دەی كەواتە بە دڵسۆزیەوە خۆشتان بوێو لێی بترسنو ئومێدتان پێی هەبێ، وە هەموو جۆرە بەندایەتیەكانی دیكەش ﴿ رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا وَرَبُّ

﴿ٱلْمَشَـٰرِقِ﴾ واتــە: ئــەو زاتــە بەدیهێنــەری ئــەم دروســتکراوانەیەو ڕزقو ڕۆزیان پــێ دەداو کاروبارەکانیــان بەڕێــوە دەبــات، جــا وەک چــۆن هاوبەشــی نیــە لــە پەروەردگارێتیــدا، بــە هەمــان شــێوە هاوبەشــی نیــە لــە پەرســتراوێتیدا، وە زۆرجــار خــوا ﷻ یەکتاپەرســتی پەرســتراوێتی دەچەســپێنێ بــە یەکتاپەرســتی پەروەردگارێتــی، چونکــە بەڵگەیە لەســەری، بێگومــان بتپەرســتەکانیش دانیــان بــە یەکتاپەرســتی پەروەردگارێتیــدا نــاوە لــە بەندایەتــی کردنیانــدا، بۆیــە ناچاریــان دەکات بــەوەی دانیــان پێدانــاوە لەســەر ئــەوەی نکوڵیــان کــردوە.

خــوا ﷻ خۆرهەڵاتــی تایبــەت کــردوە بــە ناوهێنــان تــا بەڵگەبــێ لەســەر خۆرنشــین، یــان لەبــەر ئــەوەی خۆرهەڵاتــی ئــەو ئەســتێرانەیە کــە بــەم نزیکانــە باســی دەکات، جــا لەبــەر ئەمــە فەرموویەتــی: ﴿إِنَّا زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِزِينَةٍ ٱلْكَوَاكِبِ ﴿٦﴾ وَحِفْظًا مِّن كُلِّ شَيْطَـٰنٍ مَّارِدٍ ﴿٧﴾ لَّا يَسَّمَّعُونَ إِلَى ٱلْمَلَإِ ٱلْأَعْلَىٰ﴾ (واتــە: بێگومــان ئێمــە ئاســمانی دونیامــان بــە جوانــی ئەســتێرەکان ڕازاندۆتــەوە * وە لــە هەمــوو شــەیتانێکی ســەرکەش پاراســتوومانە * ناتوانــن گــوێ بگــرن بــۆ ئــەو فریشــتانەی لــە بەرزتریــن پلــەدان).

خوا ﷻ لە ئەستێرەکاندا دوو سوودی مەزنی باسکردوە:

یەکــەم: ئەســتێرەکان جوانــی ئاســمانەکانن، ئەگــەر ئەســتێرەکان نەبوونایــە ئــەوە ئاســمانەکان تاریکــی دایانــی دەپۆشــی بەبــێ ڕووناکــی، بــەڵام جوانــی کــردوون بــۆ ئــەوەی دەورووبەریــان ڕوونــاک ببێتــەوە، وە ڕێنیشــاندەر بــێ لــە تاریکایــی دەشــتو دەریــادا، وە چەندیــن بەرژەوەنــدی تێدایــە کــە بــەو هۆیــەوە بەدەســت دێــت.

دووەم: پاســەوانی ئاســمان لــە هەمــوو شــەیتانێکی ســەرکەش، بــە هــۆی یاخیبوونیــەوە گــوێ هەڵدەخــا بــۆ فریشــتە هــەرە بــەرزەکان، ئەگــەر لــە ئاســمانەوە ببیســتێ لێیــان ئاگــر بــاران دەکــرێ ﴿مِن كُلِّ جَانِبٍ﴾ (لــە هەمــوو لایەکــەوە) بــۆ ئــەوەی دەریــان بــکاتو دووریــان بخاتــەوە لــە گوێگرتنــی ئــەوەی فریشــتە خــاوەن پلەوپایــەکان دەیڵێــن ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ وَاصِبٌ﴾ واتــە: (ســزایان) بەردەوامــە، ئامــادە کــراوە بۆیــان بــە هــۆی یاخــی بوونیــان لــە گوێڕایەڵــی پەروەردگاریــان.

ئەگــەر خــوای گــەورە جیــای نەکردایەتــەوە ئــەوە دەبــووە بەڵگــە لەســەر ئــەوەی ئــەوان هیــچ شــتێک نابیســتن، بــەڵام فەرموویەتــی: ﴿إِلَّا مَنْ خَطِفَ ٱلْخَطْفَةَ﴾ واتــە: مەگــەر کەســێ لــە شــەیتانەکان بــە دزیــەوەو بــە شــاراوەیی وشــەیەک ببــات ﴿فَأَتْبَعَهُۥ شِهَابٌ

ثَاقِبٌ ﴾ (واتــە: ئەویــش ئەســتێرەیەکی ڕوونــاک شــوێنی دەکــەوێو دەیســوتێنێ) هەنـدێ جـار ئەسـتێرەکە دەیگرێتـەوە پێـش ئـەوەی بیگەیەنـێ بـە دۆسـتەکانی، بـەو شـێوەیە هەواڵـی ئاسـمان دەپچـڕێ، وە هەنـدێ جـار هەواڵـی پێـدەدا پێـش ئـەوەی ئەسـتێرەکە لێـی بـدات، جـا ئـەو هەواڵـە تێکـەڵ بـە سـەد درۆ دەکـەن ئومێـدی پێدەکـەن بەهـۆی ئـەو وشـەیەی لـە ئاسـمانەوە بیسـتوویانە.

کاتـێ ئـەم بەدیهێنـراوە مەزنانـەی ڕوونکـردەوە فەرمـووی: ﴿ فَٱسْتَفْتِهِمْ ﴾ واتـە: پرسـیار لـە نکوڵیکارانـی دروسـتکراوەکانیان بکـە دوای مردنیـان ﴿ أَهُمْ أَشَدُّ خَلْقًا ﴾ واتـە: ئایـا ئـەوان دروسـتکراوێکی بەهێـزن کـە بیانهێنێتـە بـوون دوای مردنیـان؟ ﴿ أَم مَّنْ خَلَقْنَآ ﴾ (واتـە: یـان ئـەوەی ئێمـە دروسـتمان کـردوە) لـەم بەدیهێنراوانـە؟ بێگومـان هـەر دەبـێ دانـی پێدابنێـن کـە دروسـتکردنی ئاسـمانەکانو زەوی گەورەتـرە لـە دروسـت کردنـی خەڵکـی، کەواتـە ناچاریـان دەکات دان بـە زیندووکردنـەوەدا بهێنـن، بەڵکـو ئەگـەر بگەڕێنـەوە بـۆ نەفسو دەروونیـانو بیـری لـێ بکەنـەوە دەزانـن سـەرەتای دروسـتکردنیان لـە قوڕێکـی نەرمـی لینجـاوی بـووە، گرانتـرە لـەلای عەقـڵو بیـر لـە دروسـتکردنەوەیان دوای مردنیـان، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ إِنَّا خَلَقْنَٰهُم مِّن طِينٍ لَّازِبٍۭ ﴾ واتـە: بەهێـزی توونـد، وەک خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٢٦﴾ ﴾الحجر، (واتـە: بێگومـان ئێمـە ئادەمیزادمـان دروسـتکرد لـە قوڕێکـی ڕەشـی ترشـاوی ڕەق).

(١٢-٢١): ﴿ بَلْ عَجِبْتَ وَيَسْخَرُونَ ﴿١٢﴾ وَإِذَا ذُكِّرُوا۟ لَا يَذْكُرُونَ ﴿١٣﴾ وَإِذَا رَأَوْا۟ ءَايَةً يَسْتَسْخِرُونَ ﴿١٤﴾ وَقَالُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ﴿١٦﴾ أَوَءَابَآؤُنَا ٱلْأَوَّلُونَ ﴿١٧﴾ قُلْ نَعَمْ وَأَنتُمْ دَٰخِرُونَ ﴿١٨﴾ فَإِنَّمَا هِىَ زَجْرَةٌ وَٰحِدَةٌ فَإِذَا هُمْ يَنظُرُونَ ﴿١٩﴾ وَقَالُوا۟ يَٰوَيْلَنَا هَٰذَا يَوْمُ ٱلدِّينِ ﴿٢٠﴾ هَٰذَا يَوْمُ ٱلْفَصْلِ ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢١﴾ ﴾:

﴿ بَلْ عَجِبْتَ ﴾ (بـەڵام تـۆ سـەرت سـووڕماوە) ئـەی پێغەمبـەر ﷺ یـان ئـەی ئادەمیـزاد، لـە بـە درۆدانانـی ئـەو کەسـەی زیندووکردنـەوە بـە درۆ دادەنێـت، پـاش ئـەوەی ئایـەتو نیشـانە مەزنـەکانو بەڵگـە ڕاسـتەقینەکانت پێیـان نیشـاندا، لـە ڕاسـتیدا ئـەوە جێگـای سەرسـووڕمانە، چونکـە نکوڵـیو ئینـکاری نـاوێ ﴿ وَيَسْخَرُونَ ﴾ سەرسـوڕهێنەر تـر لـە نکوڵیـان ئـەوان گاڵتـە دەکـەن بـەوەی کـە ئـەو هەواڵـەی هێناوە دەربـارەی زیندووکردنـەوە، تەنهـا بـە نکوڵیکردنـەوە نەوەسـتان، هەتـا گاڵتەجاڕیشـیان

زیـاد کـرد بەرانبـەر وتـەی حـەق ﴿ وَإِذَا ذُكِّرُوا ﴾ لـەوە سەرسـوڕهێنەر تـر ئـەوان (کاتێ ئامۆژگـاری بکرێـن) بـەوەی کـە بـە عەقـڵو سروشـتیان دەیزانـن، وە سـەرنجیان بـۆ لای ڕادەکێشـێ ﴿ لَا يَذْكُرُونَ ﴾ (ئامۆژگـاری وەرناگـرن) جـا ئەگـەر نەفامـی بـێ ئـەوە گەورەترینـی بەڵگەکانـە لەسـەر گەمژەیـیو گێلیـان، کاتـێ کـە یادکرانـەوە بە شـتێک کـە لـە سروشـتیاندا جێگیـرەو بـە عەقڵیـان دەیزانـن، قبووڵـی هیـچ ئالۆزیـەک نـاکات، وە ئەگـەر خـۆ نەفـام کـردنو عینـادی بـێ، ئـەوە سەرسـووڕهێنەرترو نامۆتـرە.
هەروەهـا لـە سەرسـووڕهێنەرەکان ئەوەیـە ئـەوان ئەگـەر بەڵگەیـان لەسـەر پێویسـت بکـرێ، وە ئـەو ئایـەتو نیشـانانەیان یـاد بخرێتـەوە کـە پیـاوە گـەورەکان ملکەچـی دەبـنو خـاوەن دڵـەکان گوێـی بـۆ ڕادەگـرن، ئـەوە گاڵتـەی پـێ دەکـەنو سـەریان پێـی سـووڕ دەمێنـێ.
هەروەهـا یەکێـک لـە شـتە سەرسـووڕهێنەرەکان قسـەکانیانە دەربـارەی حـەق کاتـێ کـە بۆیـان هاتـووە: ﴿ إِنْ هَٰذَا إِلَّا سِحْرٌ مُبِينٌ ﴾ (ئـەم قورئانـە هیـچ نیـە جگـە لـە جادوویەکـی ئاشـکرا). جـا بەرزترینـی شـتەکانو گەورەترینیـان کـە حـەقو ڕاسـتیە هێنایانـە ئاسـتی خراپتریـن شـتو بـێ نرخترینیـان.
هەروەهـا لـە سـەر سـووڕهێنەرەکان ئەندازەکردنـی توانـاو دەسـەڵاتی پەروەردگـاری ئاسـمانەکانو زەویـە لـە ئاسـت توانـاو دەسـەڵاتی ئادەمیزادێکـی ناتـەواو لـە هەمـوو ڕووەکانـەوە، جـا بـە دووریان زانـیو نکوڵیـان کـرد، وتیـان: ﴿ أَإِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَامًا أَإِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ۝١٦ أَوَآبَاؤُنَا الْأَوَّلُونَ ﴾ واتـە: (ئایـا ئێمـە کـە مردیـنو بوویـن بەخـۆڵ ئایـا ئێمـە زینـدوو دەکرێینـەوە؟ * لەگـەڵ بـاو باپیرانـی پێشـینمان).
کاتـێ ئەمـە ئەوپـەڕی عەقـڵو مەعریفەیان بـوو، خـوا ﷻ فەرمانیکـرد بـە پێغەمبەرەکەی وەڵامیـان بداتـەوە بـە وەڵامێکـی گشـتگیر لـە سـەر پـەروەردە کردنیـان، جـا فەرمووی: ﴿ قُلْ نَعَمْ ﴾ (بڵـێ: بـەڵێ) زینـدوو دەکرێنـەوە، ئێـوەو بـاوو باپیرانـی پێشـینانتان، ﴿ وَأَنْتُمْ دَاخِرُونَ ﴾ (واتـە: ئێـوە زەلیـلو بـێ نرخـن) نـە دەتوانـن بەرگـری بکـەن نـە دەتوانـن یاخـی بـن لـە توانـاو دەسـەڵاتی خـوا.
﴿ فَإِنَّمَا هِيَ زَجْرَةٌ وَاحِدَةٌ ﴾ (واتـە: چونکـە ئـەو زینـدوو بوونەوەیـە هـەر یـەک دەنگـە) ئیسـرافیل فـوو دەکا بـە صـوردا، ﴿ فَإِذَا هُمْ ﴾ (دەسـتبەجێ ئـەوان) زینـدوو دەکرێنـەوە لـە گۆڕەکانیـان، ﴿ يَنْظُرُونَ ﴾ (دەڕوانـن) وەک چـۆن سـەرەتا دروسـتکران، بـە هەمـان

شێوە بە سەرجەم ئەندامانی جەستەیان زیندوو دەکرێنەوە بە ڕووتیو بە پێی پەتی، جا لەو کاتەدا پەشیمان بوونەوەو ڕیسواییو خەسارەتمەندی ئاشکرا دەکەن، وە داوای مردنی خۆیان دەکەن.

﴿ وَقَالُواْ يَٰوَيۡلَنَا هَٰذَا يَوۡمُ ٱلدِّينِ ﴾ (واتە: وە دەڵێن: وای بۆ خۆمان ئەمە ڕۆژی تۆڵەسەندنەوەو پاداشت دانەوەیە) بێگومان دان بە وەدا دەنێن بەوەی لە دونیا گاڵتەیان پێدەکرد، پێیان دەوترێ: ﴿ هَٰذَا يَوۡمُ ٱلۡفَصۡلِ ﴾ (واتە: ئەمە ئەو ڕۆژی بڕیار دانەیە) لە نێوان بەندەکاندا ئەوەی لە نێوان ئەوانو پەروەردگاریاندایە لە مافەکان، وە ئەوەی لە نێوان ئەوانو غەیری ئەواندایە لە بەدیهێنراوەکان.

(٢٢-٢٦): ﴿ ٱحۡشُرُواْ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ وَأَزۡوَٰجَهُمۡ وَمَا كَانُواْ يَعۡبُدُونَ ﴿٢٢﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَٱهۡدُوهُمۡ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡجَحِيمِ ﴿٢٣﴾ وَقِفُوهُمۡۖ إِنَّهُم مَّسۡـُٔولُونَ ﴿٢٤﴾ مَا لَكُمۡ لَا تَنَاصَرُونَ ﴿٢٥﴾ بَلۡ هُمُ ٱلۡيَوۡمَ مُسۡتَسۡلِمُونَ ﴿٢٦﴾ ﴾:

واتە: ئەگەر ئامادە بکرێن لە ڕۆژی دواییدا، وە ئەوەی بەدرۆیان دەزانیو گاڵتەیان پێ دەکرد بە چاو ببینن، فەرمانیان پێدەکرێ بۆ ناو ئاگر، ئەو ئاگرەی بەدرۆیان دەزانی، جا دەوترێ: ﴿ ٱحۡشُرُواْ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ﴾ (واتە: ئەوانەی ستەمیان) دەکرد لە دەروونی خۆیان بە کوفرو هاوبەشدانانو سەرپێچی کردن ﴿ وَأَزۡوَٰجَهُمۡ ﴾ ئەوانەی وەکو ئەوان کردەوەیان کردوە، هەر یەکە دەدرێتە پاڵ ئەو کەسەی لە کردەوەدا وەکو یەک وان.

﴿ وَمَا كَانُواْ يَعۡبُدُونَ ﴿٢٢﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ (واتە: لەگەڵ ئەوانەش دەیانپەرستن * جگە لە خوا) لەو بتانەی پێیان وابوو هەموویان کۆبکەنەوە ﴿ فَٱهۡدُوهُمۡ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡجَحِيمِ ﴾ واتە: ڕێگای دۆزەخیان پێ نیشان بدەن، ﴿ وَقِفُوهُمۡ ﴾ دوای ئەوەی بڕیاریان بۆ دەردەچێ بۆ ناو ئاگر، وە دەزانن ئەوان بە هەڵدێرا چوون، پێیان دەوترێ: (ڕایان وەستێنن) پێش ئەوەی بیانگەیەننە دۆزەخ، ﴿ إِنَّهُم مَّسۡـُٔولُونَ ﴾ (بێگومان پرسیاریان لێدەکرێ) لەو درۆو بوختانانەی کە لە دنیا کردوویانە، تا لە پێش چاوی هەموو خەڵکی درۆکانیان ئاشکرا بێو ڕیسوا بن.

مَا لَكُمْ لَا تَنَاصَرُونَ ﴿٢٥﴾ بَلْ هُمُ الْيَوْمَ مُسْتَسْلِمُونَ ﴿٢٦﴾ وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ
عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ ﴿٢٧﴾ قَالُوا إِنَّكُمْ كُنتُمْ تَأْتُونَنَا عَنِ الْيَمِينِ ﴿٢٨﴾
قَالُوا بَل لَّمْ تَكُونُوا مُؤْمِنِينَ ﴿٢٩﴾ وَمَا كَانَ لَنَا عَلَيْكُم مِّن سُلْطَانٍ
بَلْ كُنتُمْ قَوْمًا طَاغِينَ ﴿٣٠﴾ فَحَقَّ عَلَيْنَا قَوْلُ رَبِّنَا إِنَّا لَذَائِقُونَ ﴿٣١﴾
فَأَغْوَيْنَاكُمْ إِنَّا كُنَّا غَاوِينَ ﴿٣٢﴾ فَإِنَّهُمْ يَوْمَئِذٍ فِي الْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ
﴿٣٣﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَفْعَلُ بِالْمُجْرِمِينَ ﴿٣٤﴾ إِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا قِيلَ لَهُمْ
لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٣٥﴾ وَيَقُولُونَ أَئِنَّا لَتَارِكُوا آلِهَتِنَا
لِشَاعِرٍ مَّجْنُونٍ ﴿٣٦﴾ بَلْ جَاءَ بِالْحَقِّ وَصَدَّقَ الْمُرْسَلِينَ ﴿٣٧﴾ إِنَّكُمْ
لَذَائِقُو الْعَذَابِ الْأَلِيمِ ﴿٣٨﴾ وَمَا تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ
﴿٣٩﴾ إِلَّا عِبَادَ اللَّهِ الْمُخْلَصِينَ ﴿٤٠﴾ أُولَٰئِكَ لَهُمْ رِزْقٌ مَّعْلُومٌ ﴿٤١﴾
فَوَاكِهُ وَهُم مُّكْرَمُونَ ﴿٤٢﴾ فِي جَنَّاتِ النَّعِيمِ ﴿٤٣﴾ عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَابِلِينَ
﴿٤٤﴾ يُطَافُ عَلَيْهِم بِكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ ﴿٤٥﴾ بَيْضَاءَ لَذَّةٍ لِّلشَّارِبِينَ
﴿٤٦﴾ لَا فِيهَا غَوْلٌ وَلَا هُمْ عَنْهَا يُنزَفُونَ ﴿٤٧﴾ وَعِندَهُمْ قَاصِرَاتُ
الطَّرْفِ عِينٌ ﴿٤٨﴾ كَأَنَّهُنَّ بَيْضٌ مَّكْنُونٌ ﴿٤٩﴾ فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ
بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ ﴿٥٠﴾ قَالَ قَائِلٌ مِّنْهُمْ إِنِّي كَانَ لِي قَرِينٌ ﴿٥١﴾

پێیان دەوترێ: ﴿مَا لَكُمْ لَا تَنَاصَرُونَ﴾ واتە: ئەوە ئەمڕۆ چیتان بەسەر هاتووە؟ چی وایلێکردوون هەتا یەکێکتان یارمەتی ئەوی دیکە نادات، وە نایەت بە هاواریەوە، دوای ئەوەی لە دنیادا پێتان وابوو بێگومان پەرستراوەکانتان بەرگریتان لێدەکەن لە سزاو دەتان پۆشن، وە تکاتان بۆ دەکەن لە لای خوا ﷻ، جا وەکو ئەوە وایە ئەوان وەڵامی ئەم پرسیارە نەدەنەوە، چونکە بێگومان زەلیلیی‌و بچووکی زاڵ بووە بەسەریاندا، وە ملکەچی ئاگری دۆزەخ بوون، زۆر دەترسن بەو هۆیەوە هیچ قسەیەک ناکەن، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿بَلْ هُمُ الْيَوْمَ مُسْتَسْلِمُونَ﴾ (واتە: نەخێر یارمەتی یەکتر نادەن بەڵکو ئەوان هەموو لەو ڕۆژەدا گەردن کەچن بۆ خوا).

(٢٧-٣٩): ﴿وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ ﴿٢٧﴾ قَالُوٓاْ إِنَّكُمْ كُنتُمْ تَأْتُونَنَا عَنِ ٱلْيَمِينِ ﴿٢٨﴾ قَالُواْ
بَل لَّمْ تَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ ﴿٢٩﴾ وَمَا كَانَ لَنَا عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍۭ بَلْ كُنتُمْ قَوْمًا طَٰغِينَ ﴿٣٠﴾ فَحَقَّ عَلَيْنَا قَوْلُ
رَبِّنَآ إِنَّا لَذَآئِقُونَ ﴿٣١﴾ فَأَغْوَيْنَٰكُمْ إِنَّا كُنَّا غَٰوِينَ ﴿٣٢﴾ فَإِنَّهُمْ يَوْمَئِذٍ فِى ٱلْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ ﴿٣٣﴾ إِنَّا
كَذَٰلِكَ نَفْعَلُ بِٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٣٤﴾ إِنَّهُمْ كَانُوٓاْ إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٣٥﴾ وَيَقُولُونَ أَئِنَّا
لَتَارِكُوٓاْ ءَالِهَتِنَا لِشَاعِرٍ مَّجْنُونٍۭ ﴿٣٦﴾ بَلْ جَآءَ بِٱلْحَقِّ وَصَدَّقَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٣٧﴾ إِنَّكُمْ لَذَآئِقُواْ ٱلْعَذَابِ
ٱلْأَلِيمِ ﴿٣٨﴾ وَمَا تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٣٩﴾﴾:

﴿وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ﴾ کاتێ کۆدەکرێنەوە خۆیان‌و هاوەڵ‌و پەرستراوەکانیان، ڕێگای دۆزەخیان نیشاندراو وەستێنران، ئینجا پرسیاریان لێکراو وەڵامیان نەدایەوە، ڕوویان کردە یەکترو هەندێکیان لۆمەو سەرزەنشتی هەندێکی دیکەی دەکرد لەسەر گومڕابوون‌و گومڕا کردنیان، جا شوێنەوکەوتوان بە سەرمەشق‌و دەسەڵاتدارانیان وت: ﴿إِنَّكُمْ كُنتُمْ تَأْتُونَنَا عَنِ ٱلْيَمِينِ﴾ (واتە: بەڕاستی ئێوە بوون لە لای ڕاست‌و حەقەوە هاتنە لامان نەتانهێڵا شوێنی بکەوین)، واتە: بەهێزو زاڵ بوونەوە گومڕاتان کردین، ئەگەر ئێوە نەبوونایە ئێمە

برواداردەبووین، ﴿ قَالُوا ﴾ (گومراکەرەکان پێیان دەڵێن): ﴿ بَل لَّمْ تَكُونُوا مُؤْمِنِينَ ﴾ واتە: ئێوە بەردەوام هاوبەشتان دادەنا هەروەک چۆن ئێمە هاوبەشمان دانابوو، چ چاکەیەکی ئێوە بەسەرمانەوەیە؟ وە چ شتێ سەرزەنشت کردنی ئێمە پێویست دەکات؟ ﴿ وَمَا كَانَ لَنَا عَلَيْكُم مِّن سُلْطَانٍ ﴾ واتە: لە کاتێکدا هەڵبژاردنی کوفر زاڵ بوو بەسەرتاندا ﴿ بَلْ كُنتُمْ قَوْمًا طَاغِينَ ﴾ (واتە: بەڵکو خۆتان گەلێکی یاخی بوون) لە سنووری خۆتان دەرچووبوون ﴿ فَحَقَّ عَلَيْنَا ﴾ ئێمەو ئێوە ﴿ قَوْلُ رَبِّنَا إِنَّا لَذَائِقُونَ ﴾ سزا، واتە: بڕیاری پەروەردگارمان سەپا بەسەرماندا، کە ئێمەو ئێوە سزا دەچێژین، وە بەشدار دەبین تیایدا ﴿ فَأَغْوَيْنَاكُمْ إِنَّا كُنَّا غَاوِينَ ﴾ واتە: بانگمان کردن بۆ ئەو ڕێگایەی ئێمە لەسەری بووین کە ئەویش گومڕایی بوو، ئێوەش بە دەممانەوە هاتن، دەی کەواتە: سەرزەنشتی ئێمە مەکەن، سەرزەنشتی خۆتان بکەن.

خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ فَإِنَّهُمْ يَوْمَئِذٍ ﴾ لە ڕۆژی دواییدا ﴿ فِي الْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ ﴾ (لە سزادا هاوبەشن) ئەگەر چی ئەندازەی سزاکانیان بە پێی تاوانەکانیانە، وەک چۆن لە دونیادا بەشدار بوون لەسەر کوفر، لە دوارۆژیشدا بەشدار بوون لە سزاکەی، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَفْعَلُ بِالْمُجْرِمِينَ ﴾ (واتە: بێگومان ئێمە تاوانباران بەو جۆرە لێدەکەین).

پاشان باسی کردوە کە تاوانەکانیان گەیشتۆتە ئەوپەڕی، جا فەرموویەتی: ﴿ إِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ ﴾ (واتە: بە ڕاستی هەر کاتێ بەوانە بوترایە هیچ پەرستراوێک نیە بێجگە لە خوا) وە بانگەواز بکرایەن بۆ لایو فەرمانیان پێ بکرایە بە وازهێنان لە پەرستنی جگە لەو، ﴿ يَسْتَكْبِرُونَ ﴾ (خۆیان بە گەورە دەزانی) لە ئاستیداو لەسەر ئەو کەسەی هێناویەتی.

﴿ وَيَقُولُونَ ﴾ لە دژی ئەودا دەیانوت: ﴿ أَئِنَّا لَتَارِكُوا آلِهَتِنَا ﴾ (واتە: ئایا ئێمە واز لە پەرستراوەکانمان بێنین) کە بەردەوام دەیانپەرستین ئێمەو باوو باپیرانمان ﴿ لِشَاعِرٍ مَّجْنُونٍ ﴾ (لە بەر قسەی شاعیرێکی شێت) مەبەستیان پێی: موحەممەد ﷺ بوو ، بەپشتێکردنی نەوەستان ـخوا ڕوویان ڕەش بکا- وە نە بە بەدرۆدانانی هەتا حوکمیان دا بەسەریدا بە ستەمکارترینی حوکمو بڕیارو کردیان بە شاعیرێکی شێت، ئەوان باش دەیانزانی ئەو شیعر نازانێو شاعیر نیە، وە وەسفی ئەو ناگونجێ لەگەڵ وەسفی ئەواندا، بێگومان ئەو عاقڵترینی دروستکراوەکانی خوایە، وە مەزنترینیانە لە بیرو بۆچووندا.

لەبەر ئەمەیە خوا ﷻ قسەکەیانی هەڵوەشاندۆتەوەو فەرموویەتی: ﴿ بَلْ جَاءَ ﴾ موحەممەد ﷺ ﴿ بِالْحَقِّ ﴾ هاتنی ڕاستی، وە ئەوەیشی هێناویەتی لە شەریعەتو کتێب حەقو ڕاستە، ﴿ وَصَدَّقَ الْمُرْسَلِينَ ﴾ واتە: هاتنی ڕاستی پێغەمبەرانە، ئەگەر هاتنو نێردراوی ئەو نەبووایە پێغەمبەران

نەدەبوون بە ڕاستگۆ، ئەو نیشانەو موعجیزەیەکە بۆ هەموو پێغەمبەرێکی پێش خۆی، چونکە ئەوان هەواڵو مژدەیان بە هاتنی دابوو، خوا بەڵێنو پەیمانی لێوەرگرتن، ئەگەر هات بۆ ناویان بڕوای پێبهێننو یارمەتی بدەن، ئەوانیش ئەوەیان لە گەلەکانیان وەرگرت، کاتێ هات ڕاستی پێغەمبەران دەرکەوت ئەوانەی پێش ئەو بوون، وە درۆی دژەکانیان ڕوون بوویەوە، ئەگەر وادابنرێت ئەو نەهاتبایە، وە ئەوان هەواڵی هاتنیان پێدابوو، ئەوە ڕاستگۆییەکەیانی ناشرین دەکرد. هەروەها پێغەمبەرانی بەڕاست داناوە، بەو پەیامەی هاتووە کە ئەوان پێی هاتوون، وە بانگەشەی کردوە بەوەی ئەوان بانگەشەیان بۆ کردوە، وە بڕوای پێهێناونو هەواڵیداوە بە ڕاستی پەیامەکەیانو پێغەمبەرایەتیو شەریعەتەکەیان.

کاتێ قسەکەی پێشوویان: ﴿إِنَّا لَذَآئِقُونَ﴾ (بە ڕاستی دەبێ بیچێژین) قسەیەکە لە لایەن ئەوانەوە دەرچووە، دەگونجێ ڕاست بێت یان جگە لەوە، خوا هەواڵی داوە بە قسەی یەکلاکەرەوە کە ڕاستی دڵنیایی نەبێ هیچ هەڵناگرێ، ئەویش هەواڵی دەرچووە لە لایەن خواوە، فەرموویەتی: ﴿إِنَّكُمْ لَذَآئِقُواْ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَلِيمِ﴾ واتە: (ئێوە دەبێ بیچێژن سزایەکی) بە ئێشو بە ئازار، ﴿وَمَا تُجْزَوْنَ﴾ لە چەشتنی سزای بە ئێشدا ﴿إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ (واتە: تەنها ئەوەی کە کردووتانە) ئێمە ستەممان لێنەکردوون، بەڵکو دادپەروەر بووین لەگەڵتان؟ کاتێ ئەم دواندنە قسەیەکی گشتگیرە، وە مەبەست پێی: بتپەرستانە، خوا بڕوادارانی جیاکردوەتەوەو فەرموویەتی:

(٤٠-٤٩): ﴿إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٤٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ رِزْقٌ مَّعْلُومٌ ﴿٤١﴾ فَوَٰكِهُ وَهُم مُّكْرَمُونَ ﴿٤٢﴾ فِى جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٤٣﴾ عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٤٤﴾ يُطَافُ عَلَيْهِم بِكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ ﴿٤٥﴾ بَيْضَآءَ لَذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ ﴿٤٦﴾ لَا فِيهَا غَوْلٌ وَلَا هُمْ عَنْهَا يُنزَفُونَ ﴿٤٧﴾ وَعِندَهُمْ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ عِينٌ ﴿٤٨﴾ كَأَنَّهُنَّ بَيْضٌ مَّكْنُونٌ ﴿٤٩﴾﴾

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ﴾ (واتە: بەڵام بەندە پاکو هەڵبژاردەکانی خوا) بێگومان ئەوان سزای بە ئێش ناچێژن، چونکە بە دڵسۆزیەوە کارو کردەوەیان کردوە بۆ خوا، ئەویش پاڵفتەی کردوونو تایبەتی کردوون بە میهرەبانیو بەزەیی خۆی.

﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ رِزْقٌ مَّعْلُومٌ﴾ واتە: (ئەوان ڕزقو ڕۆزی دیاریکراویان بۆ هەیە) نادیار نیە، بەڵکو ئەوە ڕزقو ڕۆزیەکی مەزنو گەورەیە، خۆ گێل ناکرێ لە ئاستیدا، کەس ناگات بە ناوەڕۆکی. کە بەم فەرمایشتەی تەفسیری کردوە: ﴿فَوَٰكِهُ﴾ لە هەموو جۆرەکانی میوە کە نەفس پێی دڵخۆش دەبێ، بە لەزەتەکانی لە ڕەنگو تامەکانی ﴿وَهُم مُّكْرَمُونَ﴾ (وە ئەوان ڕێز لێگیراون) لۆمە نەکراونو بە کەم نەزانراون، بەڵکو بە مەزن دانراونو ڕێز لێگیراون.

هەندێکیان ڕێز لە هەندێکیان دەگرنو فریشتە بەڕێزەکان ڕێزو حورمەتیان لێدەگرن، لە هەموو دەرگایەکەوە دەچنە ژوورەوە بۆ لایان، وە پیرۆزباییان لێدەکەن بە گەیشتن بەوپەڕی پاداشت، وە بەڕێزترینی ڕێزلێگیراوان ڕێزیان لێدەگرێ، جۆرەها کەرامەتیان پێدەبەخشێ، لە نازو نیعمەتەکانی دڵو ڕۆحەکانو جەستەکان.

﴿ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴾ واتە: ئەو بەهەشتانەی نیعمەتو خۆشیەکان وەسفێتی، بەو جۆرە کۆی کردوەتەوە لەوەی کە چاو نەیبینیوە، گوێ نەیبیستووە، بە ختووره بەسەر دڵدا نەهاتووە، وە پارێزراوە لە هەموو شتێک زیان بە نیعمەتەکانی بگەیەنێ، لە هەموو ناخۆشیو نارەحەتیەکان.

وە لە ڕێز لێنانیان لە لای پەروەردگاریان، وە ڕێزگرتنی هەندێکیان لە هەندێکی تریان، ئەوان لەسەر ﴿ سُرُرٍ ﴾ (تەختو کورسی) ئەویش شوێنی بەرزە، ڕازاوەتەوە بە جۆرەها جلوبەرگی ڕازاوەو سەرنجراکێش، ئەوان پاڵیان داوەتەوە لەسەری بە شێوەی حەوانەوە دڵنیاییو دڵخۆشی، ﴿ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴾ (بەرانبەر یەکتر) لە نێوان یەکدا، دڵیان لە ئاستی یەکتری پاکو پاڵفتەیە، وە چێژیان وەرگرتووە بە کۆکردنەوەی هەندێکیان لەگەڵ هەندێکی تریان، بێگومان بەرانبەر بوونیان بە ڕووخساریان، بەڵگەیە لەسەر بەرانبەری دڵەکانیان، وە بە ئەدەب بوونی هەندێکیان لەگەڵ هەندێکی دیکەیان، پشتی تێنەکردوە، یان خستبێتیە تەنیشتیەوە، بەڵکو ئەو لەبەرانبەر بوونە بەڵگەیە لەسەر تەواوی دڵخۆشی بە ئەدەب بوونیان لەگەڵ یەکتری.

﴿ يُطَافُ عَلَيۡهِم بِكَأۡسٖ مِّن مَّعِينِۭ ﴾ واتە: ئەو مندالانەی ئامادە کراون بۆ خزمەتکردنیان لە پەرداخی نایابدا خواردنەوەی بە لەزەتو بادەی جوانو سەرنجراکێش لە گولاوی سەرمۆر بە میسک، ئەویش بریتیە لە بادەی شەراب بە سەریاندا دەگێڕن، وە ئەو شەرابە پێچەوانەیە لەگەڵ شەرابی دونیادا لە هەموو ڕوویەکەوە، چونکە ئەو لە ڕەنگیدا ﴿ بَيۡضَآءَ ﴾ (زۆر سپیە) لە چاکترین ڕەنگەکانە، وە لە تامیدا ﴿ لَذَّةٖ لِّلشَّٰرِبِينَ ﴾ ئەوانەی دەیخۆنەوە لەزەتی لێوەردەگرن، لە کاتی خواردنەوەو دوای خواردنەوەیشدا. ئەو شەرابە پارێزراوە لە تێکدانی عەقڵو سەرخۆشکردنی، وە سەرئێشەو بێزاری تێدا نیە.

کاتێ باسی خواردنو خواردنەوەو کۆڕی دانیشتنەکانیانی کرد، وە سەرجەم نازونیعمەتەکانی وردو درشتیان لە ناو ئەم وتەیەدا کە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴾، بەڵام بۆیە بە درێژی باسی ئەم شتانەی کردوە تا نەفسەکان تامەزرۆی بن، ئینجا باسی ژنەکانیانی کردوە، جا فەرموویەتی: ﴿ وَعِندَهُمۡ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرۡفِ عِينٞ ﴾ واتە: وە لای خەڵکی ئەم ماڵە پڕ لە نازو نیعمەتە حۆری جوان هەیە کە هەموو وەسفەکانیان تەواوە، جگە لە مێردەکانیان سەیری کەس ناکەن.

یان ئەوەیە جگە لە مێردەکەی سەیری کەس ناکات بە هۆی پاکیو پێویست نەبوونی بە غەیری ئەو، وە بە هۆی جوانی مێردەکەیو تەواوی بە جۆرێ لە بەهەشتدا داوای کەسێکی دیکە ناکا جگە لە ئەو نەبێ، وە حەز ناکا تەنها لەو نەبێ، یان ئەوەیە مێردەکەی سەیری کەس ناکات جگە لەو، ئەویش بەڵگەیە لەسەر تەواویی ئەو ئافرەتەو جوانی لە ڕادەبەدەری، کە پێویستی کردوە لەسەر مێردەکەی تەنها چاوی لەسەر ئەو بێتو سەیری کەسی تر نەکات، هەروەها سەیر نەکردنی کەس بەڵگەیە لەسەر کورتهەڵهێنانی نەفسو خۆشەویستی بۆی، وە هەردوو ماناکە تەواوو ڕاستن.

هەموو ئەمانە بەڵگەن لەسەر جوانی پیاوانو ئافرەتان لە بەهەشتدا، وە خۆشویستنی هەندێکیان بۆ هەندێکی دیکەیان، خۆشەویستیەک جگە لەو تەماحی لە هیچ کەس ناکات، وە هەموویان داوێن پاکن، ئەو بەهەشتە نە حەسوودیو ئیرەیی تێدایە، نە ڕق لێبوونەوەو نە توورە بوون ئەویش بە هۆی نەبوونی هۆکارەکانی. ﴿عِينٌ﴾ واتە: (چاویان زۆر جوانە) چاویان زۆر جوانو ڕەشە ﴿كَأَنَّهُنَّ﴾ واتە: حۆریەکان (وەک) ﴿بَيْضٌ مَّكْنُونٌ﴾ واتە: هێلکەی داپۆشراو وان، ئەویش بە هۆی جوانیو پاکییان، وە ڕەنگەکانیان جوانترین ڕەنگو سەرنجڕاکێشترینیانە، هیچ لێڵیو ناشرینیەکی تێدا نیە.

(٥٠-٦١): ﴿فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ ﴿٥٠﴾ قَالَ قَائِلٌ مِّنْهُمْ إِنِّي كَانَ لِي قَرِينٌ ﴿٥١﴾ يَقُولُ
أَإِنَّكَ لَمِنَ الْمُصَدِّقِينَ ﴿٥٢﴾ أَإِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَامًا أَإِنَّا لَمَدِينُونَ ﴿٥٣﴾ قَالَ هَلْ أَنتُم مُّطَّلِعُونَ ﴿٥٤﴾
فَاطَّلَعَ فَرَآهُ فِي سَوَاءِ الْجَحِيمِ ﴿٥٥﴾ قَالَ تَاللَّهِ إِن كِدتَّ لَتُرْدِينِ ﴿٥٦﴾ وَلَوْلَا نِعْمَةُ رَبِّي لَكُنتُ مِنَ
الْمُحْضَرِينَ ﴿٥٧﴾ أَفَمَا نَحْنُ بِمَيِّتِينَ ﴿٥٨﴾ إِلَّا مَوْتَتَنَا الْأُولَىٰ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿٥٩﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ
الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿٦٠﴾ لِمِثْلِ هَٰذَا فَلْيَعْمَلِ الْعَامِلُونَ ﴿٦١﴾﴾:

﴿فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ ﴿٥٠﴾ قَالَ قَائِلٌ مِّنْهُمْ﴾ کاتێ خوا ﷻ باسی نازونیعمەتەکانیانو تەواوی دڵخۆشیان دەکات، بە خواردنو خواردنەوەکانو خێزانە زۆر جوانەکانیان، وە کۆڕی دانیشتنیان، ئنجا باسی گفتوگۆیانی کردوە لەناو یەکتردا، وە قسەکردنیان دەربارەی ئەو ڕووداوانەی لە ڕابردوودا ڕوویانداوە، ئەوان بەردەوام لە گفتوگۆو پرسیارکردندان لە یەکتری، هەتا ڕازی خۆیان باس دەکەن تا یەکێ لەوان دەڵێ: ﴿إِنِّي كَانَ لِي قَرِينٌ﴾ واتە: (من هاوڕێیەکم هەبوو) لە دونیادا، نکوڵی زیندووکردنەوەی دەکردو لۆمەو سەرزەنشتمی دەکرد لەسەر ئەوەی بە ڕاستم دەزانی،

يَقُولُ أَءِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُصَدِّقِينَ ﴿٥٢﴾ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَـٰمًا أَءِنَّا
لَمَدِينُونَ ﴿٥٣﴾ قَالَ هَلْ أَنتُم مُّطَّلِعُونَ ﴿٥٤﴾ فَٱطَّلَعَ فَرَءَاهُ فِى سَوَآءِ
ٱلْجَحِيمِ ﴿٥٥﴾ قَالَ تَٱللَّهِ إِن كِدتَّ لَتُرْدِينِ ﴿٥٦﴾ وَلَوْلَا نِعْمَةُ رَبِّى
لَكُنتُ مِنَ ٱلْمُحْضَرِينَ ﴿٥٧﴾ أَفَمَا نَحْنُ بِمَيِّتِينَ ﴿٥٨﴾ إِلَّا مَوْتَتَنَا
ٱلْأُولَىٰ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿٥٩﴾ إِنَّ هَـٰذَا لَهُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٦٠﴾
لِمِثْلِ هَـٰذَا فَلْيَعْمَلِ ٱلْعَـٰمِلُونَ ﴿٦١﴾ أَذَٰلِكَ خَيْرٌ نُّزُلًا أَمْ شَجَرَةُ
ٱلزَّقُّومِ ﴿٦٢﴾ إِنَّا جَعَلْنَـٰهَا فِتْنَةً لِّلظَّـٰلِمِينَ ﴿٦٣﴾ إِنَّهَا شَجَرَةٌ
تَخْرُجُ فِىٓ أَصْلِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٦٤﴾ طَلْعُهَا كَأَنَّهُۥ رُءُوسُ ٱلشَّيَـٰطِينِ
﴿٦٥﴾ فَإِنَّهُمْ لَـَٔاكِلُونَ مِنْهَا فَمَالِـُٔونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ ﴿٦٦﴾ ثُمَّ إِنَّ لَهُمْ
عَلَيْهَا لَشَوْبًا مِّنْ حَمِيمٍ ﴿٦٧﴾ ثُمَّ إِنَّ مَرْجِعَهُمْ لَإِلَى ٱلْجَحِيمِ ﴿٦٨﴾
إِنَّهُمْ أَلْفَوْا۟ ءَابَآءَهُمْ ضَآلِّينَ ﴿٦٩﴾ فَهُمْ عَلَىٰٓ ءَاثَـٰرِهِمْ يُهْرَعُونَ ﴿٧٠﴾
وَلَقَدْ ضَلَّ قَبْلَهُمْ أَكْثَرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٧١﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا فِيهِم
مُّنذِرِينَ ﴿٧٢﴾ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿٧٣﴾
إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٧٤﴾ وَلَقَدْ نَادَىٰنَا نُوحٌ فَلَنِعْمَ
ٱلْمُجِيبُونَ ﴿٧٥﴾ وَنَجَّيْنَـٰهُ وَأَهْلَهُۥ مِنَ ٱلْكَرْبِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٦﴾

وە ﴿ يَقُولُ ﴾ پێی دەوتم: ﴿ أَءِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُصَدِّقِينَ ﴿٥٢﴾ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَـٰمًا أَءِنَّا لَمَدِينُونَ ﴾ (واتە: ئایا بە ڕاستی تۆ لەوانەی بڕوات هەیە بە زیندوو بوونەوە * ئایا کاتێ مردین و بووین بە خاک و ئێسقانی ڕزیو ئایا ئێمە سزا دەدرێین). واتە: پاداشت دەدرێینەوە بە پێی کردەوەکانمان؟! واتە: چۆن بڕوا بەم شتە دوور لە ڕاستییە دەکەی کە لەوپەڕی سەرسوورمان دایە، ئەویش ئەوەیە کاتێ ئێمە مردین و پارە پارە بووین، وە بووین بە خاک و ئێسقانی ڕزیو، ئایا ئێمە زیندوو دەکرێینەوەو پاشان لێپرسینەوەمان لێدەکرێ و پاداشتی کردەوەکانمان دەدرێتەوە؟!

واتە: بەهەشتیەکە بە براکانی دەڵێ: ئەمە چیرۆکی منە، ئەمە هەواڵی من و هاوڕێکەمە، من بەردەوام بڕوادارێکی بەڕاستدانەر بووم، ئەویش بەردەوام بەدرۆدانەری زیندووکردنەوە بوو، هەتا مردین پاشان زیندووکراینەوە، من گەیشتم بەو نازونیعمەتەی کە ئێوە بە چاوی خۆتان دەیبینن کە پێشتر پێغەمبەران هەواڵیان پێدابوو، ئەویش بێگومان گەیشتە سزا، ﴿ هَلْ أَنتُم مُّطَّلِعُونَ ﴾ (واتە: ئایا ئێوە تەماشا ناکەن) تا سەرنجی بدەین خۆزگەو خۆشیمان زیاد بکا لەوەی کە تیایدان، جا ئەوە بە شێوەیەک بێ بەچاو ببینرێ؟

بە ڕواڵەت وادەردەکەوێ حاڵی خەڵکانی بەهەشت، وە دڵخۆشکردن و گونجانی هەندێکیان بە هەندێکی دیکەیان، ئەوانیش وەڵامیان دایەوە کاتێ کە وتی: شوێنی کەوتن بە دوای ئەودا بۆ ئەوەی سەیری هاوڕێکەی بکەن ﴿ فَٱطَّلَعَ ﴾ (ئینجا) هاوڕێکەی خۆی بینی ﴿ فِى سَوَآءِ ٱلْجَحِيمِ ﴾ (لە ناوەڕاستی دۆزەخداو سزا دەوری داوە) جا ﴿ قَالَ ﴾ وتی: بە لۆمە کردنەوە لە سەر حاڵ و باری و

شـوکرانە بژێـری خـوا لەسـەر نازونیعمەتەکانـی کـە ڕزگـاری کـرد لـە فێڵـی هاوڕێکـەی: ﴿ تَٱللَّهِ إِن كِدتَّ لَتُرۡدِينِ ﴾ واتـە: (سـوێند بـە خـوا خەریـک بـوو) منیـش هەڵدێـری بـە هـۆی ئـەو گومـانو دوودڵیانـەی بـە بۆچوونـی خـۆت باسـت دەکـرد ﴿ وَلَوۡلَا نِعۡمَةُ رَبِّي ﴾ (ئەگـەر نیعمەتـی پەروەردگـارم نەبووایـە) لەسـەر ئـەوەی کـە پابەنـدی کـردم لەسـەر ئیسـلام ﴿ لَكُنتُ مِنَ ٱلۡمُحۡضَرِينَ ﴾ (واتـە: منیـش لـە ئامـادە کـراوان دەبـووم) لەنـاو سـزادا لەگـەڵ تـۆ، ﴿ أَفَمَا نَحۡنُ بِمَيِّتِينَ ﴿٥٨﴾ إِلَّا مَوۡتَتَنَا ٱلۡأُولَىٰ وَمَا نَحۡنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴾ واتـە: کەسـی بـڕوادار دڵخۆشـە بـە نیعمەتەکانـی خـوا بـۆ خەڵکانـی بەهەشـت بـە هەمیشـەیی‌و بەردەوامـی تیایـدا، وە سـەلامەت بـوون لـە سـزا، ئەمـە پرسـیارە بـە مانـای چەسـپاندنو دان پێدانـان دێـت، واتـە: بـڕوادار بـە هـاوڕێ سـزادراوەکەی دەڵـێ: ئایـا تـۆ پێـت وابـوو ئێمـە نامریـن جگـە لـە مردنـی یەکەممـان نەبـێ، وە زینـدوو ناکرێینـەوە دوای ئـەوە سـزا نادرێیـن؟

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَأَقۡبَلَ بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٍ يَتَسَآءَلُونَ ﴾ وە لابردنـی (المعمـول) جێگـا جێگـای لـەزەت‌و دڵخۆشـیە، ئـەوە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی ئـەوان پرسـیاریان لێدەکـرێ لـە هەمـوو ئەوانـەی لەزەتـی لێوەردەگـرن بـە قسـەکردنو بـاس کردنـی، وە ئـەو بابەتانـەی کـە ناکۆکـی‌و ئاڵـۆزی تیایانـدا ڕوویـداوە.

وە بێگومـان ئـەوەی زانـراوە لەزەتـی خاوەنانـی زانسـت بـە پرسـیارکردن دەربـارەی زانسـت‌و لێکۆڵینـەوە لێـی لـە سـەرووی ئـەو لەزەتانەوەیـە کـە لە قسـەو باسـی دونیادا هەیـە، ئەمـان لـەم جۆرەدا بەشـێکی چاکیـان بۆ هەیـە، بۆیان دەسـتەبەر دەبێ لە زانسـتە ڕاستەقینەکانی بەهەشـت کـە بـە هیـچ شـێوەیەک تەعبیـری لێناکرێ.

کاتـێ خـوا ﷻ باسـی نیعمەتەکانـی بەهەشـتی کردو وەسـفی کرد بـەم وەسـفە جوانانە، ستایشـی کردو بکەرانـی تامەزرۆ کردو هانیدان لەسـەر کارکردن، جـا فەرمووی: ﴿ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴾ کـە بـە هۆیـەوە هەمـوو خێـرێ بـە دەسـتی دەهێنـن، وە هەموو ئەوانـەی نەفـس ئـارەزووی دەکات‌و حـەزی لێـدەکات، وە هەموو خراپەو مەترسـیەکی لـێ دوور خسـتوونەتەوە، ئایا سـەرکەوتنێ هەیـە لەسـەرووی ئەمەوە، یان ئـەوە ئامانجی ئامانجەکانـە، وە کۆتایـی کۆتاییەکانـە، کاتـێ ڕەزامەنـدی پەروەردگاری ئاسـمانەکانو زەوی بـۆ حـەڵاڵ کـردون، وە دڵخـۆش بـوون بـە نزیکـی ئـەو، وە نازونیعمەتیـان وەرگرتـووە بـە ناسـینی‌و دڵخـۆش بوون بـە بینینـی‌و وتە جـوانو بـە نرخەکانی؟

﴿لِمِثْلِ هَٰذَا فَلْيَعْمَلِ ٱلْعَٰمِلُونَ﴾ (واتە: وا تێبکۆشن) ئەوە شایستەترە لە پێناویدا بەخشرێ بە نرخترینی بەنرخەکان، وە لە پێشترە عاریفانو خواناسانو ژیرەکانی خۆیان بۆی ئامادە بکەن، وە ئاخ هەڵکێشان بۆ ئەو کەسەی خاوەن غیرەتو ورەیەکی بەرزە کاتەکانی بەسەر ببات بەبێ سەرقاڵبوونی بە کردەوەکردن بۆ نزیک بوونەوە لەو ماڵە، ئەی چۆن بە گوناهەکانیەوە دەچێ بۆ بەهەشت؟!

(٦٢-٧٤): ﴿أَذَٰلِكَ خَيْرٌ نُّزُلًا أَمْ شَجَرَةُ ٱلزَّقُّومِ ﴿٦٢﴾ إِنَّا جَعَلْنَٰهَا فِتْنَةً لِّلظَّٰلِمِينَ ﴿٦٣﴾ إِنَّهَا شَجَرَةٌ تَخْرُجُ فِىٓ أَصْلِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٦٤﴾ طَلْعُهَا كَأَنَّهُۥ رُءُوسُ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴿٦٥﴾ فَإِنَّهُمْ لَءَاكِلُونَ مِنْهَا فَمَالِـُٔونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ ﴿٦٦﴾ ثُمَّ إِنَّ لَهُمْ عَلَيْهَا لَشَوْبًا مِّنْ حَمِيمٍ ﴿٦٧﴾ ثُمَّ إِنَّ مَرْجِعَهُمْ لَإِلَى ٱلْجَحِيمِ ﴿٦٨﴾ إِنَّهُمْ أَلْفَوْا۟ ءَابَآءَهُمْ ضَآلِّينَ ﴿٦٩﴾ فَهُمْ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمْ يُهْرَعُونَ ﴿٧٠﴾ وَلَقَدْ ضَلَّ قَبْلَهُمْ أَكْثَرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٧١﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا فِيهِم مُّنذِرِينَ ﴿٧٢﴾ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿٧٣﴾ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٧٤﴾﴾:

﴿أَذَٰلِكَ خَيْرٌ﴾ واتە: ئەو نازونیعمەتەی وەسفمان کرد بۆ خەڵکانی بەهەشت باشترە، یان ئەو سزایەی کە لەناو دۆزەخدایە؟ کام لەو دوو خواردنە لە پێشترە؟ ئەوەی وەسفکراوە لە بەهەشتدا ﴿أَمْ﴾ یان خواردنی خەڵکانی ناو ئاگر ئەویش بریتیە لە: ﴿شَجَرَةُ ٱلزَّقُّومِ ﴿٦٢﴾ إِنَّا جَعَلْنَٰهَا فِتْنَةً﴾ (واتە: بەری درەختی زەقوم * بێگومان ئێمە ئەو دارەمان کردە هۆی تاقیکردنەوە) واتە: سزاو تۆڵە ﴿لِّلظَّٰلِمِينَ﴾ (بۆ ئەوانەی ستەم لە نەفسی خۆیان دەکەن) بە کوفرو سەرپێچی کردن.

﴿إِنَّهَا شَجَرَةٌ تَخْرُجُ فِىٓ أَصْلِ ٱلْجَحِيمِ﴾ واتە: (بە ڕاستی ئەوە دارێکە) لە ناوەڕاستی دۆزەخدایە، ئەمە جێگایەتی، وە کانگاو سەرچاوەی خراپترین سەرچاوەیە، وە خراپترین شوێنی چاندن بەڵگەیە لە خراپیو کەمی ئەو شتەی چێنراوە، لەبەر ئەمەیە خوا ﷻ ئاگادارمان دەکاتەوە لەسەر شەڕو خراپەی بەوەی باسی کردوە کە لە کوێ سەوز دەبێ، وە بەوەی باسی کردوە لە سیفەتی بەرهەمەکەی، بێگومان ئەو دارە وەک ﴿رُءُوسُ ٱلشَّيَٰطِينِ﴾ (سەری شەیتانەکانە) دوای ئەوە پرسیار مەکە لە تامی کە چەندە ناخۆشەو؟ چی لە هەناو و سکیان دەکات؟ هیچ ڕێگا چارەو لادانێکیان نیە لە خۆپاراستن لەو دارە.

لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ فَإِنَّهُمْ لَآكِلُونَ مِنْهَا فَمَالِئُونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ ﴾ ئەمە خواردنی خەڵکانی ناو ئاگرە، بەڕاستی خراپترین خواردن خواردنی ئەوانە.

پاشان باسی خواردنەوەکانیانی کردووەو فەرموویەتی: ﴿ ثُمَّ إِنَّ لَهُمْ عَلَيْهَا ﴾ واتە: لە دوای ئەو خواردنە ﴿ لَشَوْبًا مِّنْ حَمِيمٍ ﴾ ئاوێکی زۆر گەرم، کە لە گەرمیدا گەیشتۆتە ئەوپەڕی، هەروەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَإِن يَسْتَغِيثُوا۟ يُغَاثُوا۟ بِمَآءٍ كَٱلْمُهْلِ يَشْوِى ٱلْوُجُوهَ ۚ بِئْسَ ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتْ مُرْتَفَقًا ﴿٢٩﴾ ﴾الکهف، (واتە: وە ئەگەر لە تینوانا هاواری ئاو بکەن ئاوێکیان بۆ دەهێنرێ وەک مسی تواوە، یان وەک چڵکو چەپەڵی ڕۆن زەیت وایە ڕووخسارەکان دەبرژێنێ، ئای چ خواردنەوەیەکی پیسو خراپەو؟ ئای چ شوێنو جێگایەکی خراپە؟!) هەروەکو خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَسُقُوا۟ مَآءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَآءَهُمْ ﴿١٥﴾ ﴾محمد (واتە: ئاوی کوڵاو کوڵیان دەرخوارد بدرێ کە ڕیخۆڵەکانیان پارچە پارچە بکات).

﴿ ثُمَّ إِنَّ مَرْجِعَهُمْ ﴾ واتە: سەرەنجامو شوێنو جێگای مانەوەیان ﴿ لَإِلَى ٱلْجَحِيمِ ﴾ (بۆ دۆزەخە) بۆ ئەوەی چێژ لە سزای توونـدو گەرمی مەزنی وەربگرن، کە لەسەرووی ئەوەوە هیچ نارەحەتیەکی دیکە نیە.

وەک ئەوەیە وترابێ: چ شتێ ئێوەی گەیانـدە ئەم ماڵە؟ دەڵێ: ﴿ إِنَّهُمْ أَلْفَوْا۟ ﴾ واتە: بینیان، ﴿ ءَابَآءَهُمْ ضَآلِّينَ ﴿٦٩﴾ فَهُمْ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمْ يُهْرَعُونَ ﴾ واتە: (باو باپیرانی خۆیان بە گومڕایی) پەلەیان دەکرد لە گومڕاییدا لایان نەکردەوە لەوەی پێغەمبەرانیان بانگیان بۆ دەکردن، وە لایان نەکردەوە لە ئاگادار کردنەوەی کتێبەکان، وە نە بۆ قسەی ئامۆژگاریکاران، بەڵکو پشتیان تێیان کرد، بەوەی کە وتیان: ﴿ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقْتَدُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾الزخرف، (واتە: بە ڕاستی ئێمە باو باپیرانی خۆمان لەسەر ئاینێک دیوە، وە بە ڕاستی ئێمە لەسەر ئاینی ئەوان دەڕۆین)، ﴿ وَلَقَدْ ضَلَّ قَبْلَهُمْ ﴾ واتە: پێش ئەو دوێنراوانە ﴿ أَكْثَرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾ (زۆربەی گەلە پێشینەکان گومڕا بوون) کەمێک لە ئەوان بڕوایان هێناو ڕێنماییان وەرگرت ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا فِيهِم مُّنذِرِينَ ﴾ (واتە: بێگومان ئێمە لەناو خۆیانـدا ترسێنەرمان بۆ ناردن) دەیانترساندن لە زێدەڕۆییو گومڕاییان، ﴿ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴾ (واتە: ئنجا سەرنج بدە سەرەنجامی ترسێنراوەکان چۆن بوو)، بێگومان سەرەنجامیان تیاچوونو ڕیسواییو سووکی

بــوو، دەی بــا ئەوانــە ئاگــادار بــن لــە بــەردەوام بوونیــان لەســەر گومڕایــی، ئەگینــا تووشــیان دەبــێ وەک چــۆن تووشــی ئەوانــەی پێــش وان بــوو.

کاتــێ کــە ترســێنراوان هەموویــان گومــڕا نەبــوون بەڵكــو تیایانــدا بــوو بــڕوای هێنابــوو بــە دڵســۆزیەوە خــوای دەپەرســت، خــوا ﷻ جیــای کــردەوە لــە تیاچــوون، جــا فەرمــووی: ﴿إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلۡمُخۡلَصِينَ﴾ واتــە: ئــەو بەندانــەی خــوا هەڵبــژاردوون، وە تایبەتــی کــردوون بــە میهرەبانــی خــۆی بــە هــۆی دڵســۆزیانەوە، بێگومــان ســەرەنجامی ئــەوان ستایشــکراوە. پاشــان نموونەیەكــی باســكردوە لــە ســەرەنجامی ئۆممەتــە بــە درۆدانــەرەكان، فەرموویەتــی:

(٧٥-٨٢): ﴿وَلَقَدۡ نَادَىٰنَا نُوحٞ فَلَنِعۡمَ ٱلۡمُجِيبُونَ ٧٥ وَنَجَّيۡنَٰهُ وَأَهۡلَهُۥ مِنَ ٱلۡكَرۡبِ ٱلۡعَظِيمِ ٧٦ وَجَعَلۡنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلۡبَاقِينَ ٧٧ وَتَرَكۡنَا عَلَيۡهِ فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ٧٨ سَلَٰمٌ عَلَىٰ نُوحٖ فِي ٱلۡعَٰلَمِينَ ٧٩ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٨٠ إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٨١ ثُمَّ أَغۡرَقۡنَا ٱلۡأٓخَرِينَ ٨٢﴾:

خــوا ﷻ هــەواڵ دەدات دەربــارەی بەنــدەو پێغەمبەرەكــەی نــووح ﷺ یەكەمینــی پێغەمبــەران، ئــەو کاتــێ گەلەكــەی بانگكــرد بــۆ لای خــوا ﷻ لــەو مــاوە دوورو درێــژەدا، بانگەوازەكــەی هیچــی بۆیــان زیــاد نەكــرد تەنهــا هەڵهاتــن نەبێ، ئــەو داوای لــە پەروەردگــاری کــرد وتــی: ﴿رَّبِّ لَا تَذَرۡ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ دَيَّارًا ٢٦﴾نــوح، (واتــە: ئــەی پەروەردگــارا! لەســەر زەوی هیــچ كەســێک لــە بێبڕوایــان مەهێڵــە)، وە فەرمــووی: ﴿قَالَ رَبِّ ٱنصُرۡنِي عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ٣٠﴾العنكبــوت، (واتــە: ئــەی پەروەردگــارم! یارمەتیــم بــدەو زاڵــم بكــە بەســەر ئــەو گەلــە خراپــە کارەدا)، خــوا ﷻ دوعاكــەی گیــرا کــرد، وە ستایشــی خــۆی کــردو فەرمــووی: ﴿فَلَنِعۡمَ ٱلۡمُجِيبُونَ﴾ (واتــە: ئینجــا ئێمــەش زۆر چــاک وەڵامــی ئەومــان دایــەوە) بــۆ داوای داواكاران، وە بیســتنی لالانــەوەو خۆبەكــەم زانینیــان.

وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلْبَاقِينَ ﴿٧٧﴾ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي ٱلْآخِرِينَ ﴿٧٨﴾ سَلَٰمٌ
عَلَىٰ نُوحٍ فِي ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧٩﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِي ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٨٠﴾ إِنَّهُۥ
مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٨١﴾ ثُمَّ أَغْرَقْنَا ٱلْآخَرِينَ ﴿٨٢﴾ ۞ وَإِنَّ مِن
شِيعَتِهِۦ لَإِبْرَٰهِيمَ ﴿٨٣﴾ إِذْ جَآءَ رَبَّهُۥ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٤﴾ إِذْ قَالَ
لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَاذَا تَعْبُدُونَ ﴿٨٥﴾ أَئِفْكًا ءَالِهَةً دُونَ ٱللَّهِ تُرِيدُونَ
﴿٨٦﴾ فَمَا ظَنُّكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٧﴾ فَنَظَرَ نَظْرَةً فِي ٱلنُّجُومِ ﴿٨٨﴾
فَقَالَ إِنِّي سَقِيمٌ ﴿٨٩﴾ فَتَوَلَّوْا۟ عَنْهُ مُدْبِرِينَ ﴿٩٠﴾ فَرَاغَ إِلَىٰٓ ءَالِهَتِهِمْ
فَقَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ ﴿٩١﴾ مَا لَكُمْ لَا تَنطِقُونَ ﴿٩٢﴾ فَرَاغَ عَلَيْهِمْ ضَرْبًۢا
بِٱلْيَمِينِ ﴿٩٣﴾ فَأَقْبَلُوٓا۟ إِلَيْهِ يَزِفُّونَ ﴿٩٤﴾ قَالَ أَتَعْبُدُونَ مَا تَنْحِتُونَ
﴿٩٥﴾ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ قَالُوا۟ ٱبْنُوا۟ لَهُۥ بُنْيَٰنًا فَأَلْقُوهُ
فِي ٱلْجَحِيمِ ﴿٩٧﴾ فَأَرَادُوا۟ بِهِۦ كَيْدًا فَجَعَلْنَٰهُمُ ٱلْأَسْفَلِينَ ﴿٩٨﴾
وَقَالَ إِنِّي ذَاهِبٌ إِلَىٰ رَبِّي سَيَهْدِينِ ﴿٩٩﴾ رَبِّ هَبْ لِي مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ
﴿١٠٠﴾ فَبَشَّرْنَٰهُ بِغُلَٰمٍ حَلِيمٍ ﴿١٠١﴾ فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ ٱلسَّعْيَ قَالَ يَٰبُنَيَّ
إِنِّيٓ أَرَىٰ فِي ٱلْمَنَامِ أَنِّيٓ أَذْبَحُكَ فَٱنظُرْ مَاذَا تَرَىٰ ۚ قَالَ يَٰٓأَبَتِ
ٱفْعَلْ مَا تُؤْمَرُ ۖ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٠٢﴾

وەڵامی دایەوە بە وەڵامدانەوەیەک پڕاو پڕ بە پێی داواکەی خۆی، نووح ﷺ و کەس‌و کاری لە تەنگانەی گەورە ڕزگار کرد، وە هەموو بێبڕوایانی نقوم کرد، وەچەو نەوەی ئەوی هێڵایەوە بە دوای یەکتردا، هەموو ئادەمیزاد لە وەچەی نووحن ﷺ، وە ستایشی چاکی بەردەوامی بۆ دانا تا کاتی دوایی، ئەویش لەبەر ئەوەی چاکەکار بوو بۆ خەڵکی، ئەمەش سوننەتی خوا ﷻ لە چاکەکاراندا، ستایشیان بڵاو بکاتەوە بە پێی چاکەکانیان، خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ (بێگومان ئەو لە بەندە بڕوادارەکانی ئێمە بوو) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئیمان بەرزترین پلەی بەندەکانە، وە ئەو ئیمانە هەموو شەریعەتەکانی ئاین‌و بنەماکانی‌و لق‌و پۆپەکانی لەخۆدەگرێ، چونکە خوا ﷻ ستایشی بەندە تایبەتەکانی خۆی پێکردووە.

(٨٣-١١٢): ﴿ وَإِنَّ مِن شِيعَتِهِۦ لَإِبْرَٰهِيمَ ﴿٨٣﴾ إِذْ جَآءَ رَبَّهُۥ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٤﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ
وَقَوْمِهِۦ مَاذَا تَعْبُدُونَ ﴿٨٥﴾ أَئِفْكًا ءَالِهَةً دُونَ ٱللَّهِ تُرِيدُونَ ﴿٨٦﴾ فَمَا ظَنُّكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٧﴾
فَنَظَرَ نَظْرَةً فِي ٱلنُّجُومِ ﴿٨٨﴾ فَقَالَ إِنِّي سَقِيمٌ ﴿٨٩﴾ فَتَوَلَّوْا۟ عَنْهُ مُدْبِرِينَ ﴿٩٠﴾ فَرَاغَ إِلَىٰٓ ءَالِهَتِهِمْ
فَقَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ ﴿٩١﴾ مَا لَكُمْ لَا تَنطِقُونَ ﴿٩٢﴾ فَرَاغَ عَلَيْهِمْ ضَرْبًۢا بِٱلْيَمِينِ ﴿٩٣﴾ فَأَقْبَلُوٓا۟ إِلَيْهِ يَزِفُّونَ
﴿٩٤﴾ قَالَ أَتَعْبُدُونَ مَا تَنْحِتُونَ ﴿٩٥﴾ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ قَالُوا۟ ٱبْنُوا۟ لَهُۥ بُنْيَٰنًا فَأَلْقُوهُ فِي
ٱلْجَحِيمِ ﴿٩٧﴾ فَأَرَادُوا۟ بِهِۦ كَيْدًا فَجَعَلْنَٰهُمُ ٱلْأَسْفَلِينَ ﴿٩٨﴾ وَقَالَ إِنِّي ذَاهِبٌ إِلَىٰ رَبِّي سَيَهْدِينِ ﴿٩٩﴾
رَبِّ هَبْ لِي مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٠٠﴾ فَبَشَّرْنَٰهُ بِغُلَٰمٍ حَلِيمٍ ﴿١٠١﴾ فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ ٱلسَّعْيَ قَالَ يَٰبُنَيَّ إِنِّيٓ
أَرَىٰ فِي ٱلْمَنَامِ أَنِّيٓ أَذْبَحُكَ فَٱنظُرْ مَاذَا تَرَىٰ ۚ قَالَ يَٰٓأَبَتِ ٱفْعَلْ مَا تُؤْمَرُ ۖ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ
مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٠٢﴾ فَلَمَّآ أَسْلَمَا وَتَلَّهُۥ لِلْجَبِينِ ﴿١٠٣﴾ وَنَٰدَيْنَٰهُ أَن يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ ﴿١٠٤﴾ قَدْ صَدَّقْتَ ٱلرُّءْيَآ ۚ
إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِي ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٠٥﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْبَلَٰٓؤُا۟ ٱلْمُبِينُ ﴿١٠٦﴾ وَفَدَيْنَٰهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ ﴿١٠٧﴾

﴿ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الْآخِرِينَ ﴿١٠٨﴾ سَلَامٌ عَلَىٰ إِبْرَاهِيمَ ﴿١٠٩﴾ كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ ﴿١١٠﴾ إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُؤْمِنِينَ ﴿١١١﴾ وَبَشَّرْنَاهُ بِإِسْحَاقَ نَبِيًّا مِّنَ الصَّالِحِينَ ﴿١١٢﴾ ﴾:

﴿ وَإِنَّ مِن شِيعَتِهِ لَإِبْرَاهِيمَ ﴾ تا کۆتایی چیرۆکەکە، واتە: بێگومان لە پەیڕەوکارانو شوێنکەوتووانی نووح ﷺ ئیبراهیمی خەلیل ﷺ بوو، وە ئەوەیشی لەسەر ڕێگای ئەوە، لە پێغەمبەرایەتیو نێردراوێتیو بانگەوازی خەڵکی بۆ لای خوا، وە وەڵامدانەوەی پاڕانەوە ﴿ إِذْ جَاءَ رَبَّهُ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴾ (واتە: کاتێ بە دڵێکی ساغەوە بەرەو پەروەردگاری هات) لە هاوبەشدانانو گومانو دوودڵیو ئەو شەهوەتو ئارەزووانەی ڕێگرن لە بەردەم حەقو کارپێکردنیدا، جا ئەگەر دڵی بەندە ساغ بوو، ئەوە سەلامەت دەبێ لە هەموو شەڕو خراپەیە، وە هەموو خێرو چاکەیەکی بۆ دەستەبەر دەبێت.

لە ساغێتی دڵ ئەو پارێزراوە لە فروفێڵ کردن لە خەڵکیو ئیرەیی پێ بردنیان، وە جگە لەوانەش خوڕەوشتە ناشرینەکان، لەبەر ئەمەیە ئامۆژگاری خەڵکی کردوە لەبەر خوای گەورە، وە لە باوکیو گەلەکەیەوە دەستی پێکردوەو وتویەتی: ﴿ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِ مَاذَا تَعْبُدُونَ ﴾ (واتە: کاتێ بە باوکیو گەلەکەی وت چی دەپەرستن؟) ئەم پرسیارە بە مانای نکوڵیکردنە، وە پەیوەست کردنیانە بە بەڵگەو حوججە.

﴿ أَئِفْكًا آلِهَةً دُونَ اللَّهِ تُرِيدُونَ ﴾ واتە: ئایا جگە لە خوا شتێکی درۆینە دەپەرستن کە پەرستراو نەبێو شایستەی پەرستن نەبێ، گومانتان چۆنە بە پەروەردگاری جیهانیان، کە بەسەرتان بهێنێ لە کاتێکدا ئێوە بەندایەتی جگە لەو دەکەن؟ ئەمەش ترساندنیانە لە پاداشت دانەوەیان بە تۆڵەو سزا لەسەر بەردەوام بوونیان بە هاوبەشدانان.

﴿ فَمَا ظَنُّكُم بِرَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾ واتە: ئاخۆ گومانتان چۆنە بەرانبەر پەروەردگاری جیهانیان بە ناتەواویەک هەتا لەگەڵ ئەودا شتانێکتان کردە هاوبەش.

ئیبراهیم ﷺ ویستی بتەکانیان بشکێنێ، وە توانای ئەوەی هەبوو، لە کاتی بێناگایی ئەواندا ئەو هەلەی قۆستەوە، کاتێ کە ڕۆیشتن بۆ جەژنێ لە جەژنەکانیان لە گەڵیاندا دەرچوو، ﴿ فَنَظَرَ نَظْرَةً فِي النُّجُومِ ﴿٨٨﴾ فَقَالَ إِنِّي سَقِيمٌ ﴾ (واتە: ئینجا سەیرێکی ئەستێرەکانی کرد * وتی من نەخۆشم نایەم بۆ جەژنەکەتان). لە فەرموودەی

ڕاستدا هاتووە: (ئیبراهیم ﷺ هەرگیز درۆی نەکردوە، جگە لە سێ درۆ نەبێ، وتی: ﴿إِنِّي سَقِيمٌ﴾ (من نەخۆشم) وە قسەی ئەو کە وتی: ﴿بَلْ فَعَلَهُ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا ﴿٦٣﴾﴾ الأنبياء، (واتە: بەڵکو ئەم بتە گەورەیان ئەوەی کردوە) وە دەربارەی خێزانەکەی، وتی: ئەوە خوشکمە).

مەبەست لە دواکەوتنی لە ئەوان ئەوە بوو تا بتوانێ پەرستراوەکانیان بشکێنێ، ﴿فَتَوَلَّوْا عَنْهُ مُدْبِرِينَ﴾ جا لەبەر ئەمە (ئەوانیش پشتیان تێکردو ڕۆیشتن بۆ دەرەوەی شار) کاتێ هەلی بۆ هاتە پێش ﴿فَرَاغَ إِلَىٰ آلِهَتِهِمْ﴾ واتە: بە پەلە ڕۆیشت بۆ لایان بە شێوەیەکی زۆر نهێنی ﴿فَقَالَ﴾ بە گاڵتەجارییەوە پێی وتن: ﴿أَلَا تَأْكُلُونَ ﴿٩١﴾ مَا لَكُمْ لَا تَنطِقُونَ﴾ واتە: (ئەوە بۆ شتێک ناخۆن * ئەوە چیتانە قسە ناکەن) چۆن شایستەی پەرستنە لە کاتێکدا ئەو کەمترە لەو ئاژەڵانەی دەخۆن یان قسە دەکەن؟ جا ئەم بتانە بێگیانن نە دەخۆنو نەقسە دەکەن ﴿فَرَاغَ عَلَيْهِمْ ضَرْبًا بِالْيَمِينِ﴾ واتە: بە هەموو هێزو توانای دای لە بتەکان هەتا وورد ووردی کردن جگە لە گەورەکەیان، بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ لای.

﴿فَأَقْبَلُوا إِلَيْهِ يَزِفُّونَ﴾ واتە: (گەلەکەی زانیان) بە پەلەو هەڵەداوان هاتن، مەبەستیان ئەوە بوو سزاو ئازاری بدەن، دوای ئەوەی لێکۆڵینەوەیان کرد، وتیان: ﴿مَن فَعَلَ هَٰذَا بِآلِهَتِنَا إِنَّهُ لَمِنَ الظَّالِمِينَ ﴿٥٩﴾﴾ الأنبياء، (واتە: کێ ئەمەی کردوە بە خواکانمان بەڕاستی ئەو کەسە لە ستەمکارانە) وە پێیان وترا: ﴿قَالُوا سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُ إِبْرَاهِيمُ ﴿٦٠﴾﴾ الأنبياء، (واتە: چەند کەسێک وتیان گوێمان لە لاوێک بوو باسی بتەکانی دەکرد بە خراپە پێی دەڵێن ئیبراهیم) دەیوت: ﴿وَتَاللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصْنَامَكُم بَعْدَ أَن تُوَلُّوا مُدْبِرِينَ ﴿٥٧﴾﴾ الأنبياء، (واتە: سوێند بە خوا پیلان دادەنێم بۆ لەناو بردنی بتەکانتان دوای ئەوەی پشتتان تێکردن) ئەوانیش سەرزەنشتو لۆمەیان کرد، ئەویش وتی: ﴿قَالَ بَلْ فَعَلَهُ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا فَاسْأَلُوهُمْ إِن كَانُوا يَنطِقُونَ ﴿٦٣﴾ فَرَجَعُوا إِلَىٰ أَنفُسِهِمْ فَقَالُوا إِنَّكُمْ أَنتُمُ الظَّالِمُونَ ﴿٦٤﴾ ثُمَّ نُكِسُوا عَلَىٰ رُءُوسِهِمْ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا هَٰؤُلَاءِ يَنطِقُونَ ﴿٦٥﴾ قَالَ أَفَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكُمْ شَيْئًا وَلَا يَضُرُّكُمْ ﴿٦٦﴾﴾ الأنبياء، (واتە: ئیبراهیم وتی نەخێر بەڵکو ئەم بتە گەورەیان ئەوەی کردوە دە پرسیار لە بتە شکاوەکان بکەن ئەگەر ئەوانە قسە دەکەن * ئنجا گەڕانەوە بۆلای یەکتری سەریان کرد بە یەکدا جا

لەنــاو خۆیانــدا هەندێکیــان وتیــان بەڕاسـتی ئێــوە هــەر خۆتــان ســتەمکارن * پاشــان ســەر بــەرەو خــوار کرانــەوە گەڕانــەوە بــۆ ســەر ســەختیو نەفامیەکەیــان بەڕاســتی تــۆ دەتزانــی ئــەو بتانــە قســە ناکــەن * ئیبراهیــم وتــی: دەی ئێــوە دەپەرســتن؟ جگــە لــە خــوا شــتانێ کــە هیــچ قازانــجو ســوودێکتان پــێ ناگەیەنــێ، وە هیــچ زیانێکیشــتان لــێ نــادەن).

﴿ قَالَ ﴾ لێــرەدا ﴿ أَتَعۡبُدُونَ مَا تَنۡحِتُونَ ﴾ واتــە: (بتانێــک دەپەرســتن) بەدەســتەکانی خۆتــان دەیتاشــنو دروســتی دەکــەن؟ چــۆن دەیانپەرســتن؟ وە ئێــوە خۆتــان دروســتان کــردوون، وە وازتــان هێنــاوە لــە دڵســۆزی بــۆ خــوا؟ ئــەو زاتــەی: ﴿ خَلَقَكُمۡ وَمَا تَعۡمَلُونَ ٩٦ قَالُواْ ٱبۡنُواْ لَهُۥ بُنۡيَٰنًا ﴾ واتــە: (لــە کاتێکــدا خــوا ﷻ بەدیهێنــەری خۆتــانو ئەو بتانەیشــە دروســتان کــردوون * وتیــان: بینایەکــی بــۆ دروســت بکــەن) بــا زۆر بــەرز بێــت، وە پــڕی بکــەن لــە ئاگــر ﴿ فَأَلۡقُوهُ فِي ٱلۡجَحِيمِ ﴾ (واتــە: فڕێــی بدەنــە نــاو ئاگــرەوە) لــە پاداشــتی شــکاندنی پەرســتراوەکانیان ﴿ فَأَرَادُواْ بِهِۦ كَيۡدًا ﴾ بــۆ ئــەوەی بیکــوژن بــە ناشــرینترین کوشــتن ﴿ فَجَعَلۡنَٰهُمُ ٱلۡأَسۡفَلِينَ ﴾ خــوا ﷻ فێڵەکەیانــی ڕەتکــردەوە بــۆ گەردنــی خۆیــان، وە ئاگــری لەســەر ئیبراهیــم عليه السلام بــە ســاردو بــێ زیــان کــرد.

﴿ وَقَالَ إِنِّي ذَاهِبٌ إِلَىٰ رَبِّي ﴾ کاتــێ ئــەو کارەیــان پێکــردو بەڵگــەو حوججــەی لەســەریان پێویســت کــرد، وە بیانــووی بۆیــان هێنایــەوە، واتــە: وتــی مــن کــۆچ دەکــەم بــۆ لای پەروەردگــارم بــە مەبەســتی زەوی پیــرۆزو پــڕ لــە فــەڕو بەرەکــەت، زەوی شــام ﴿ سَيَهۡدِينِ ﴾ ڕێگــام پێنیشــان دەدات بــەوەی خێــری منــی تێدایــە، لــە کاروبــاری دیــنو دنیــام، لــە دەقێکــی تــردا فەرمــووی: ﴿ وَأَعۡتَزِلُكُمۡ وَمَا تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَأَدۡعُواْ رَبِّي عَسَىٰٓ أَلَّآ أَكُونَ بِدُعَآءِ رَبِّي شَقِيّٗا ٤٨ ﴾ مریــم، (واتــە: وە دوورە پەرێــز دەبــم لــە ئێــوەو ئــەو شــتانەش دەیپەرســتن جگــە لــە خــوا، تەنهــا پەروەردگــارم دەپەرســتم ئومێــدەوارم لــە پەرســتنو نــزای پەروەردگــارم دا بــێ هیــواو نائومێــد نەبــم).

﴿ رَبِّ هَبۡ لِي ﴾ (ئــەی پەروەردگــار پێــم ببەخشــە) منداڵێــک، ببێــت ﴿ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾ (یەکێــک لــە چاکەخــوازان) ئەویــش کاتــێ بێئومێــد بــوو لــە گەلەکــەیو هیــچ خێرێکــی تیایانــدا نەبینــی، داوای کــرد لــە خــوا منداڵێکــی چاکــی پــێ ببەخشــێ، خــوا ســوودی تێبخــات لــە ژیانیــداو لــە دوای مردنــی.

خــوا دووعاکــەی قبــوڵ کــردو فەرمــووی: ﴿ فَبَشَّرۡنَٰهُ بِغُلَٰمٍ حَلِيمٖ ﴾ (واتــە: ئێمــەش

مـژدەی کوڕێکـی لەسـەرخۆمان پێـدا) ئەویـش ئیسـماعیل بـوو ﷺ بـە دڵنیایی، پاشـان دوای ئـەم مژدەیـە باسـی مژدەدانـی ئیسـحاقی کـرد، خـوا لـە مژدەدانـی بـە ئیسـحاق فەرمـووی: ﴿ فَبَشَّرْنَٰهَا بِإِسْحَٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسْحَٰقَ يَعْقُوبَ ﴿٧١﴾ ﴾هـود (واتـە: مژدەمـان پێـدا بـە ئیسـحاق ﷺ وە لـە دوای ئیسـحاق یەعقـوب) ئەمـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی ئیسـحاق سـەربڕاو نیـە، خـوا ﷻ وەسـفی ئیسـماعیلی کـردوە بـە لەسـەرخۆیی، ئەویـش ئـارام گرتـنو ڕەوشـتی جـوانو سـینە فراوانـیو لێبـوردن لـە کەسـی تاوانبـار لـە خـۆ دەگـرێ.

﴿ فَلَمَّا بَلَغَ ﴾ (جـا کاتـێ گـەورە بـوو) ئـەو منداڵـە ﴿ مَعَهُ ٱلسَّعْىَ ﴾ واتـە: لەگەڵیـدا ئیـشو کار بـکات، گەیشـتە تەمەنێـک کـە لای بـاوکو دایکـی خۆشەویسـت بـوو، ئـەرکو گرانـی نەمابـوو، سـوودو قازانجـی هاتبـووە پێـش، ئیبراهیـم ﷺ پێـی فەرمـوو: ﴿ إِنِّىٓ أَرَىٰ فِى ٱلْمَنَامِ أَنِّىٓ أَذْبَحُكَ ﴾ واتـە: بێگومـان لـە خـەودا بینیـم خـوا فەرمانـی پێکـردووم بـە سـەربڕینت، خـەوی پێغەمبەرانیـش وەحـیو نیگایـە ﴿ فَٱنظُرْ مَاذَا تَرَىٰ ﴾ (واتـە: جـا سـەرنج بـدە دەڵێـی چـی) بـە ڕاسـتی فەرمانـی خـوا هـەر دەبـێ جێبەجـێ بکرێـت.

﴿ قَالَ ﴾ ئیسـماعیل بـە خۆڕاگـریو ڕازی بوونـی بـە پەروەردگـاریو چاکـە لەگـەڵ دایـکو باوکیـدا وتـی: ﴿ يَٰٓأَبَتِ ٱفْعَلْ مَا تُؤْمَرُ ﴾ واتـە: فەرمانـی خـوا جێبەجـێ بکـە ﴿ سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴾ (واتـە: دڵنیابـە دەمبینـی بـە ویسـتی خـوا لـە خۆڕاگـران دەبـم). هەواڵیـدا بـە باوکـی ئـەو دڵنیایـە لەسـەر خۆڕاگـری، ئەویشـی بەسـتوەتەوە بـە ویسـتی خـواوە، چونکـە هیـچ شـتێ نابـێ بـە بـێ ویسـتی خـوا ﷻ.

فَلَمَّآ أَسۡلَمَا وَتَلَّهُۥ لِلۡجَبِينِ ﴿١٠٣﴾ وَنَٰدَيۡنَٰهُ أَن يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُ ﴿١٠٤﴾
قَدۡ صَدَّقۡتَ ٱلرُّءۡيَآۚ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٠٥﴾ إِنَّ
هَٰذَا لَهُوَ ٱلۡبَلَٰٓؤُاْ ٱلۡمُبِينُ ﴿١٠٦﴾ وَفَدَيۡنَٰهُ بِذِبۡحٍ عَظِيمٖ ﴿١٠٧﴾ وَتَرَكۡنَا
عَلَيۡهِ فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ﴿١٠٨﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ ﴿١٠٩﴾ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي
ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١١٠﴾ إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١١١﴾ وَبَشَّرۡنَٰهُ
بِإِسۡحَٰقَ نَبِيّٗا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١١٢﴾ وَبَٰرَكۡنَا عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ إِسۡحَٰقَۚ
وَمِن ذُرِّيَّتِهِمَا مُحۡسِنٞ وَظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ مُبِينٞ ﴿١١٣﴾ وَلَقَدۡ مَنَنَّا
عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿١١٤﴾ وَنَجَّيۡنَٰهُمَا وَقَوۡمَهُمَا مِنَ ٱلۡكَرۡبِ
ٱلۡعَظِيمِ ﴿١١٥﴾ وَنَصَرۡنَٰهُمۡ فَكَانُواْ هُمُ ٱلۡغَٰلِبِينَ ﴿١١٦﴾ وَءَاتَيۡنَٰهُمَا
ٱلۡكِتَٰبَ ٱلۡمُسۡتَبِينَ ﴿١١٧﴾ وَهَدَيۡنَٰهُمَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ
﴿١١٨﴾ وَتَرَكۡنَا عَلَيۡهِمَا فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ﴿١١٩﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰ مُوسَىٰ
وَهَٰرُونَ ﴿١٢٠﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٢١﴾ إِنَّهُمَا
مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٢٢﴾ وَإِنَّ إِلۡيَاسَ لَمِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿١٢٣﴾
إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِۦٓ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾ أَتَدۡعُونَ بَعۡلٗا وَتَذَرُونَ أَحۡسَنَ
ٱلۡخَٰلِقِينَ ﴿١٢٥﴾ ٱللَّهَ رَبَّكُمۡ وَرَبَّ ءَابَآئِكُمُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٢٦﴾

﴿ فَلَمَّآ أَسۡلَمَا ﴾ واتـە: (كاتـێ ملكـەچ بـوون) ئیبراهیـمو كوڕەكـەی ئیـسـماعیل، سـوور بـوو لەسـەر كوشـتنی منداڵەكـەی، بەرهەمـی دڵەكـەی، بـە جێبەجـێ كردنـی فەرمانـی پەروەردگـاریو ترسـان لە سـزاو تۆڵـەی، وە كوڕەكـەی نەفـسو دەروونـی دڵنیـا كـردەوە لەسـەر ئارامگرتـن، وە ئاسـان بـووە بەلایـەوە لـە گوێڕایەڵـی پەروەردگـاریو ڕەزامەنـدی دایـكو باوكـی ﴿ وَتَلَّهُۥ لِلۡجَبِينِ ﴾ واتـە: بـە ڕوودا ئیـسـماعیلی خسـتە سـەر زەوی بـۆ ئـەوەی سـەری ببـڕێ، لەوكاتـەدا ئیبراهیـم ﷺ ڕوویكـردە ئاسـمان بۆئـەوەی لەكاتـی سـەربڕیندا ڕووخسـاری كوڕەكـەی نەبینێ

﴿ وَنَٰدَيۡنَٰهُ ﴾ (ئێمـەش بانگمـان كرد) لەو حاڵەتـە ناخۆشو كارە سەرسـوڕهێنەرەدا ﴿ أَن يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُ ﴿١٠٤﴾ قَدۡ صَدَّقۡتَ ﴾ واتـە: ئـەوەی فەرمانـت پێكـرا جێبەجێت كرد، تـۆ خۆڕاگر بوویـت لەسـەر ئـەوە، هەمـوو هۆكارەكانـت جێبەجـێ كـرد، هیـچ نەمایـەوە تەنهـا ئەوە نەبـێ هێنانی چەقۆكە لـە گەردنیـدا ﴿ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾ (واتە: ئێمە بەوشـێوەیە پاداشـتی چاكـەكاران دەدەینـەوە) لـە بەندەكانمانـدا، ئەوانـەی ڕەزامەنـدی ئێمەیـان پێش خسـتووە بەسـەر ئارەزووەكانـی نەفـسو دەروونیاندا.

﴿ إِنَّ هَٰذَا ﴾ ئـەوەی ئیبراهیممـان پێ تاقیكـردەوە ﴿ لَهُوَ ٱلۡبَلَٰٓؤُاْ ٱلۡمُبِينُ ﴾ واتە: ئاشـكراو ڕوونـە، كـە پاڵفتەیـی ئیبراهیـم بەوهۆیـەوە دەركـەوت، وە تـەواوی خۆشەویسـتی بـۆ پەروەردگـاری، چونكـە كاتـێ خـوا ئیـسـماعیلی بەخشـی یـە ئیبراهیـم، خۆشیویسـت بـە خۆشویسـتنێكی تونـد، ئـەوە خەلیلـی خـوای میهرەبانـە، وە خەلیلـی بەرزتریـن جۆرەكانی خۆشەویسـتیە، ئـەوە پلـەو پایەیەكـە هاوبەشـی وەرناگـرێ، وە وا دەخـوازێ كـە هەمـوو بەشـەكانی دڵ پەیوەسـت بێـت بـە خۆشویسـتراو.

كاتـێ بەشـێك لـە بەشـەكانی دڵی پەیوەسـت بوو بـە كوڕەكەیەوە، خـوا ویسـتی پاڵفتەی

بـکاتو خۆشەویسـتیەکەی تاقـی بکاتەوە، فەرمانی پێکرد ئەوە سـەربڕی کە خۆشەویسـتی پەروەردگاری بەرتەسـکو جەنجـاڵ کردوە.

کاتـێ خۆشەویسـتی خوای پێش خسـت بەسـەر هـەواو نەفـسو ئارەزوویدا، وە سـوور بوو لەسـەر سـەربڕینی، وە ئـەو بەرتەسـکیە نەما لە دڵـی ئیبراهیمدا، سـەربڕین هیچ سـوودێکی نەمـا، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ هُوَ ٱلْبَلَـٰٓؤُا۟ ٱلْمُبِينُ ﴿١٠٧﴾ وَفَدَيْنَـٰهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ ﴾ واتە: لە بـری سـەربڕین بەرانێکـی مەزنـی دیـاری کـرا، ئیبراهیم سـەری بـڕی، جا مەزن بـوو لەو ڕووەی لـە پێنـاو ئیسـماعیلدا بـوو، وە لەو ڕووەی ئەوە لـە چوارچێوەی پەرستشـە مەزنەکان بـوو، وە لـەو ڕووەی بـوو بـە قوربانـیو سـوننەتێک تـا ڕۆژی دوایـی، ﴿ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِى ٱلْـَٔاخِرِينَ ﴿١٠٨﴾ سَلَـٰمٌ عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ﴾ واتـە: سـتایش کردنـی ڕاسـتەقینەی ئیبراهیمـان لەنـاو خەڵکیـدا هێشـتەوە، وەک چۆن لە پێشـین، جا هەموو کاتـێ دوای ئیبراهیـم ﷺ ئەو تیایدا خۆشەویسـتەو بەگـەورە دانراوەو سـتایش کراوە.

﴿ سَلَـٰمٌ عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ﴾ واتە: سڵاوی لەسەر بێت، وەک وتەی خوا ﷻ ﴿ قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ وَسَلَـٰمٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَىٰٓ ﴿٥٩﴾ ﴾النمل، (واتە: ئەی موحەممەد ﷺ بڵێ: هەموو سوپاسو ستایش بۆ خوا وە سەلامو درود لەسەر ئەو بەندانەی خوا هەڵیبژاردون بۆ پێغەمبەرایەتی).

﴿ كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾ (واتـە: ئـا بەوشـێوەیە پاداشـتی چاکـەکاران دەدەینـەوە) لـە بەندایەتی خـواو مامەڵە کردن لەگەڵ دروسـتکراوەکانیدا، نارەحەتیەکانیان لەسـەر لادەبەین، وە سـەرەنجامو ستایشـی چاکیان بـۆ دادەنێین.

﴿ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ (واتـە: بەڕاسـتی ئەو لـە بەندە بڕوادارەکانـی ئێمەیە) ئەوانەی بـە هـۆی ئیمانەوە گەیشـتوون بە پلەی دڵنیایـی، هەر وەک خـوا فەرموویەتی: ﴿ وَكَذَٰلِكَ نُرِىٓ إِبْرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلْمُوقِنِينَ ﴿٧٥﴾ ﴾ الأنعام، (واتـە: بـەو شـێوەیە نیشـانی ئیبراهیمماندا دەسـەڵاتو خاوەنێتی خوا بـۆ ئاسـمانەکانو زەوی بۆ ئەوەی لە ڕیزی بـڕوادارە ڕاسـتەقینەکاندا بێ).

(١١٣): ﴿ وَبَـٰرَكْنَا عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ إِسْحَـٰقَ ۚ وَمِن ذُرِّيَّتِهِمَا مُحْسِنٌ وَظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ مُبِينٌ ﴿١١٣﴾ ﴾:

﴿ وَبَشَّرْنَـٰهُ بِإِسْحَـٰقَ نَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴾ (واتـە: مـژدەی ئیسـحاقمان پێـدا کـە دەبێتـە پێغەمبەرێـک لـە چـاکان) ئەمـە مـژدەی دووەمـە بە ئیسـحاق کـە لـە نـەوەی یەعقووبە، جـا مـژدەی دا بە بـوونو مانـەوەی نەوەکانی، وە بوونـی بـە پێغەمبەرێکی لە چـاکان ئەوە مژدەیەکـی یـەک لـە دوای یەکە.

﴿ وَبَٰرَكۡنَا عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ إِسۡحَٰقَ ﴾ واتــە: فــەڕو بەرەکەتمان ڕشــت بەســەر ئیبراهیمو ئیســحاقدا، کــە بریتیــە زیاد بوون لــە زانســتو وەچەکانیان، خــوا لە نەوەکانیــان ســێ ئۆممەتی مەزنی بــڵاو کــردەوە، ئۆممەتی عەرەب لــە وەچەی ئیســماعیل، وە ئومەتی نەوەکانی ئیســرائیل، وە ئۆممەتــی ڕۆم لە وەچەکانی ئیســحاق.

﴿ وَمِن ذُرِّيَّتِهِمَا مُحۡسِنٞ وَظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ مُبِينٞ ﴾ واتــە: لــە نەوەکانیاندا هەبوو چاکەکارو خراپــەکار، دادپــەروەرو ســتەمکارو ئــەوەی ســتەمەکەی ڕوون بووەتــەوە بــە کوفــرو هاوبەشــدانان، لەوەیــە ئەمــەش لــە بابەتــی بــە وەهمدا چــوون بــێ، بێگومان خــوا ﷻ کاتێ فەرمــووی: ﴿ وَبَٰرَكۡنَا عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ إِسۡحَٰقَ ﴾ وا دەخــوازێ ئــەو بەرەکەتــە لــە وەچەکانیانــدا هەبێــت، بێگومــان لە تــەواوی فەڕو بەرەکــەت ئەوەیە کــە وەچە هەموویــان چاکەخواز بن. خــوا هەواڵــی داوە بێگومــان تیایاندایــە چاکەکارو ســتەمکار، خــوا زاناترە.

(١١٤-١٢٢): ﴿ وَلَقَدۡ مَنَنَّا عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ١١٤ وَنَجَّيۡنَٰهُمَا وَقَوۡمَهُمَا مِنَ ٱلۡكَرۡبِ ٱلۡعَظِيمِ ١١٥ وَنَصَرۡنَٰهُمۡ فَكَانُواْ هُمُ ٱلۡغَٰلِبِينَ ١١٦ وَءَاتَيۡنَٰهُمَا ٱلۡكِتَٰبَ ٱلۡمُسۡتَبِينَ ١١٧ وَهَدَيۡنَٰهُمَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ١١٨ وَتَرَكۡنَا عَلَيۡهِمَا فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ١١٩ سَلَٰمٌ عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ١٢٠ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٢١ إِنَّهُمَا مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١٢٢ ﴾:

﴿ وَلَقَدۡ مَنَنَّا عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴾ تا کۆتایی چیرۆکەکە.

خوا ﷻ باسی منەتی خۆی دەکات بەسەر دوو بەندەو دوو پێغەمبەرەکەی کە مووساو هاڕوونی کوڕانی عیمرانن، بە پێغەمبەرایەتیو نێردراوی، وە بانگەوازکردنیان بۆلای خوا، وە ڕزگار کردنی خۆیانو گەلەکەیان لە دوژمنەکەیان فیرعەون، وە سەرکەوتنیان بەسەر فیرعەوندا هەتا خوا ﷻ لەپێش چاویان خنکاندی، خوا ﷻ کتێبی ڕوونکەرەوەی بۆ دابەزاندن ئەویش تەورات بوو، کە بڕیارو ئامۆژگاریو وردو درشتی هەموو شتێکی لەخۆ گرتبوو، وە خوا هیدایەتی دان بۆ ڕێگای ڕاست، بەوەی ئاینێکی بۆیان دانا خاوەن بڕیارو شەریعەتێکی ڕاست، دەیانیگەیاندە لای خوا، وە منەتی کرد بەسەریاندا بە گرتنەبەری.

﴿ وَتَرَكۡنَا عَلَيۡهِمَا فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ١١٩ سَلَٰمٌ عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ١٢٠ ﴾ واتــە: ناوبانگێکــی چــاکو ستایشــکراوی پــێ بەخشــین لــە پاشــینەکاندا، وە لــە پێشــینەکاندا لە پێشــترە ﴿ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٢١ إِنَّهُمَا مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾ (واتــە: بە ڕاســتی ئێمە ئابەو جۆرە پاداشــتی کارچــاکان دەدەینەوە * بێگومــان هەردووکیان لــە بەنــدە ئیماندارەکانــی ئێمەن).

(١٢٣-١٣٢): ﴿ وَإِنَّ إِلْيَاسَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾ أَتَدْعُونَ بَعْلًا وَتَذَرُونَ أَحْسَنَ ٱلْخَٰلِقِينَ ﴿١٢٥﴾ ٱللَّهَ رَبَّكُمْ وَرَبَّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٢٦﴾ فَكَذَّبُوهُ فَإِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ ﴿١٢٧﴾ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿١٢٨﴾ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِى ٱلْءَاخِرِينَ ﴿١٢٩﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰٓ إِلْ يَاسِينَ ﴿١٣٠﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٣١﴾ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٣٢﴾ ﴾

خـوا ﷻ ستایشـی بەندەو پێغەمبەر ئیلیـاس دەکات بە پێغەمبەرایەتیو نێـردراویو بانگەوازی بـۆ لای خـوا، ئـەو فەرمانـی بـە گەلەکـەی کـرد بـە لـە خـوا ترسـان بەندایەتیکردنـی بەتـاکو تەنهـا، وە قەدەغـەی لێکـردن لـە عیبادەتکردنـی بتێـک کـە پێی دەوتـرا: (بعل) وە وازهێنانیـان لـە بەندایەتـی کردنـی خـوا، ئـەو زاتەی دروسـتی کـردوون بـە چاکترین شـێوە، وە پـەروەردەی کـردوون بە چاکترین پـەروەردە، وە نـازو نیعمەتی ئاشـکراو نهێنی پێبەخشیون.

ئێـوە چـۆن وازتان لـە بەندایەتی خوایەک هێنا ئەمە وەسـفی بـێ، بـۆ بەندایەتیکردنی بتێک نـە زیانـی هەیەو نـە سـوود، نـە دروسـت دەکاتو نـە ڕۆزی دەدات، بەڵکو نـە دەخواو نە قسـە دەکات؟! ئایا ئەمـە مەزنتریـن گومڕاییو گێلـیو گەمژەیی نیە؟!

﴿فَكَذَّبُوهُ﴾ لەوەی بانگی كرد بۆ لای ملكەچی نەبوون، خوا ﷻ هەڕەشەی لێكردن ﴿فَإِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ﴾ واتە: لە ڕۆژی دواییدا لە ناو سزادان، باسی سزای دنیایی نەكردوە.

﴿إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ﴾ واتە: ئەوانەی خوای گەورە هەڵیبژاردوون‌و منەتی كردوە بەسەریاندا بە شوێنكەوتنی پێغەمبەرەكەی، بێگومان ئەوانە ئامادەی سزا نابن، بەڵكو پاداشتی بێ پایانیان هەیە لەلایەن پەروەردگاریان، ﴿وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ﴾ واتە: لە سەر ئیلیاس ﴿فِي ٱلْآخِرِينَ﴾ وەسف‌و ستایشی چاك.

فَكَذَّبُوهُ فَإِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ ١٢٧ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ١٢٨
وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي ٱلْآخِرِينَ ١٢٩ سَلَٰمٌ عَلَىٰٓ إِلْ يَاسِينَ ١٣٠ إِنَّا
كَذَٰلِكَ نَجْزِي ٱلْمُحْسِنِينَ ١٣١ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ
١٣٢ وَإِنَّ لُوطًا لَّمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ١٣٣ إِذْ نَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ أَجْمَعِينَ
١٣٤ إِلَّا عَجُوزًا فِي ٱلْغَٰبِرِينَ ١٣٥ ثُمَّ دَمَّرْنَا ٱلْآخَرِينَ ١٣٦ وَإِنَّكُمْ
لَتَمُرُّونَ عَلَيْهِم مُّصْبِحِينَ ١٣٧ وَبِٱلَّيْلِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ١٣٨ وَإِنَّ
يُونُسَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ١٣٩ إِذْ أَبَقَ إِلَى ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ١٤٠
فَسَاهَمَ فَكَانَ مِنَ ٱلْمُدْحَضِينَ ١٤١ فَٱلْتَقَمَهُ ٱلْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ
١٤٢ فَلَوْلَآ أَنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُسَبِّحِينَ ١٤٣ لَلَبِثَ فِي بَطْنِهِۦٓ إِلَىٰ يَوْمِ
يُبْعَثُونَ ١٤٤ فَنَبَذْنَٰهُ بِٱلْعَرَآءِ وَهُوَ سَقِيمٌ ١٤٥ وَأَنۢبَتْنَا
عَلَيْهِ شَجَرَةً مِّن يَقْطِينٍ ١٤٦ وَأَرْسَلْنَٰهُ إِلَىٰ مِاْئَةِ أَلْفٍ أَوْ
يَزِيدُونَ ١٤٧ فَـَٔامَنُوا۟ فَمَتَّعْنَٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ ١٤٨ فَٱسْتَفْتِهِمْ
أَلِرَبِّكَ ٱلْبَنَاتُ وَلَهُمُ ٱلْبَنُونَ ١٤٩ أَمْ خَلَقْنَا ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ إِنَٰثًا
وَهُمْ شَٰهِدُونَ ١٥٠ أَلَآ إِنَّهُم مِّنْ إِفْكِهِمْ لَيَقُولُونَ ١٥١ وَلَدَ
ٱللَّهُ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ١٥٢ أَصْطَفَى ٱلْبَنَاتِ عَلَى ٱلْبَنِينَ ١٥٣

﴿سَلَٰمٌ عَلَىٰٓ إِلْ يَاسِينَ﴾ واتە: سڵاو لە لایەن خواوە، وە لەلایەن بەندەكانیەوە لەسەری ﴿إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِي ٱلْمُحْسِنِينَ ١٣١ إِنَّهُمَا مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ خوا ﷻ ستایشی كرد وەك چۆن ستایشی براكانی كرد، درووودو سەلام بۆسەر هەموویان بە گشتی.

(١٣٣-١٣٨): ﴿وَإِنَّ لُوطًا لَّمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ١٣٣ إِذْ نَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ أَجْمَعِينَ ١٣٤ إِلَّا عَجُوزًا فِي ٱلْغَٰبِرِينَ ١٣٥ ثُمَّ دَمَّرْنَا ٱلْآخَرِينَ ١٣٦ وَإِنَّكُمْ لَتَمُرُّونَ عَلَيْهِم مُّصْبِحِينَ ١٣٧ وَبِٱلَّيْلِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ١٣٨﴾:

﴿وَإِنَّ لُوطًا لَّمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ١٣٣ إِذْ نَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ أَجْمَعِينَ﴾ ئەمە ستایشكردنێكە لەلایەن خوای بەرزو مەزنەوە لە سەر بەندەو پێغەمبەرەكەی لووط عليه السلام، بە پێغەمبەرایەتی‌و نێردراوی‌و بانگەشەكردنی گەلەكەی بۆلای خوا، وە قەدەغەكردنیان لە هاوبەش دانان‌و كاری فاحیشە.

كاتێ وازیان نەهێنا خوا ﷻ ئەوو خانەوادەكەی بە گشتی ڕزگار كرد لەشەودا دەرچوون، ﴿إِلَّا عَجُوزًا فِي ٱلْغَٰبِرِينَ﴾ واتە: ئەوەی مایەوە بۆ ئەوەی سزا بدرێ، خێزانی لووط بوو، چونكە لەسەر ئاینی ئەو نەبوو.

﴿ ثُمَّ دَمَّرْنَا ٱلْآخَرِينَ ﴾ (پاشان ئەوانمان لەناو برد) بە جۆرێ شارەکەمان هەڵگێڕا بەسەریاندا ﴿ فَجَعَلْنَا عَالِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ ﴿٧٤﴾ ﴾الحجر، (واتە: ئینجا ئەو شارەمان سەروو ژێر کردو گڵی بەردینمان بەسەردا باراند) هەتا وردو خاش بوون ﴿ وَإِنَّكُمْ لَتَمُرُّونَ عَلَيْهِم ﴾ واتە: (ئێوە تێدەپەڕن) بەسەر شاری گەلی لووطدا ﴿ مُّصْبِحِينَ ﴿١٣٧﴾ وَبِٱلَّيْلِ ﴾ واتە: (بە بەیانیانو بە شەودا) لەو کاتانەدا زۆر بەسەریا دێنو دەڕۆنو تێدەپەڕن، کە هیچ گومانو دوو دڵیەکی تێدا نیە ﴿ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴾ (ئایا ئیتر ژیر نابن) بە ئایەتو نیشانەو پەندەکان، وە سەرزەنشت دەکرێ لەوەی لەناو چوون پێویست دەکات.

(١٣٩-١٤٨): ﴿ وَإِنَّ يُونُسَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٣٩﴾ إِذْ أَبَقَ إِلَى ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴿١٤٠﴾ فَسَاهَمَ فَكَانَ مِنَ ٱلْمُدْحَضِينَ ﴿١٤١﴾ فَٱلْتَقَمَهُ ٱلْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ ﴿١٤٢﴾ فَلَوْلَآ أَنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُسَبِّحِينَ ﴿١٤٣﴾ لَلَبِثَ فِى بَطْنِهِۦٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٤٤﴾ فَنَبَذْنَٰهُ بِٱلْعَرَآءِ وَهُوَ سَقِيمٌ ﴿١٤٥﴾ وَأَنۢبَتْنَا عَلَيْهِ شَجَرَةً مِّن يَقْطِينٍ ﴿١٤٦﴾ وَأَرْسَلْنَٰهُ إِلَىٰ مِاْئَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ ﴿١٤٧﴾ فَـَٔامَنُوا۟ فَمَتَّعْنَٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ ﴿١٤٨﴾ ﴾:

﴿ وَإِنَّ يُونُسَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾ تا کۆتایی چیرۆکەکە. ئەمە ستایشکردنە لەلایەن خواوە بۆ بەندەو پێغەمبەرەکەی یونسی کوڕی مەتا ﷺ، هەروەک چۆن ستایشی برا پێغەمبەرەکانی کردوە بە پێغەمبەرایەتیو نێردراوێتیو بانگەواز بۆ لای خوا ﷻ.

خوا ﷻ باسی کردوە کە بێگومان سزای دنیایی یونسی داوە، ڕزگاری کردوە لێی بەهۆی ئیمانو کردەوە چاکەکانی ﴿ إِذْ أَبَقَ ﴾ واتە: (کاتێ ڕایکرد) لە پەروەردگاری بە تووڕەییەوە، پێی وابوو ئێمە تەنگانەی بەسەردا ناهێنین، زیندانی کرد لە زگی نەهەنگێکدا، خوا باسی تووڕەبوونی نەکردوە، وە ئەو تاوانەیشی کە ئەنجامی داوە چونکە لە باسکردنیدا هیچ سوودێکی تێدا نیە بۆ ئێمە، بەڵام سوودی بۆ ئێمە ئەوەیە کە ئەو گوناهی کردوەو خوا سزای داوە، لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەرێکی بەڕێزو خۆشەویست بووە، دوای ئەوە ڕزگاری کردوە لەو سزایە، وە سەرزەنشتکردنی لەسەر لابردووە، وە بۆی داناوە هەر شتێ هۆکاری سەرفرازی ئەو بێ.

کاتێ کە ڕایکرد پەنای بردە بەر ﴿ إِلَى ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴾ کەشتیەکی پڕ لە خەڵکو کەرەستە، کاتێ کە سوار بوو لەگەڵ جگە لەخۆیدا، وە کەشتیەکەش پڕەو باری قورسە، وا پێویستی کرد هەندێ لەسەر نشینەکان بخەنە دەریاوە، وەکو ئەوە وایە فەزڵو چاکەی هیچ کەسێکیان نەدابێ بەسەر ئەوی دیکەدا، بۆیە تیروپشکیان کرد

لەسەر ئەو کەسەی لە قورعەکەدا دەردەچێ فڕێ بدرێتە ناو دەریاوە، ئەمەش وەک دادپەروەریەک لەلایەن خەڵکی ناو کەشتیەکە. بە ڕاستی خوا ﷻ ئەگەر کارێکی بوێ هۆکارەکانیشی بۆ دەڕەخسێنێ.

کاتێ کە قورعەیان کرد، لە قورعەکەدا ناوی یونس ﷺ دەرچوو ﴿ فَكَانَ مِنَ ٱلْمُدْحَضِينَ ﴾ واتە: ئەو لە دۆڕاوان بوو، فڕێدراوە ناو دەریاکە ﴿ فَٱلْتَقَمَهُ ٱلْحُوتُ وَهُوَ ﴾ (واتە: ئینجا نەهەنگێک قووتی دا ئەویش) لەوکاتەی قووتیدا ﴿ مُلِيمٌ ﴾ واتە: کارێکی کرد سەرزەنشت بکرێ لەسەری، ئەویش تووڕەبوونی بوو.

﴿ فَلَوْلَآ أَنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُسَبِّحِينَ ﴾ واتە: (خۆ ئەگەر ئەو لە یادکارانی خوا نەبوایە) لە کاتی پێشوودا بەبەندایەتیکردنی پەروەردگاریو یادکردنو ستایشکردنی، وە لەناو سکی نەهەنگەکەدا، کاتێ کە وتی: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ)، ﴿ لَلَبِثَ فِى بَطْنِهِۦٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴾ (واتە: تا زیندوو دەکرێنەوە لەناو سکی نەهەنگەکەدا دەمایەوە) دەبووە گۆڕستانی، بەڵام بەهۆی یاد کردنیەوەو بەندایەتی کردنی بۆ خوا، خوا ڕزگاری کرد، بەو شێوەیە خوا بڕواداران ڕزگار دەکات کاتێ تووشی نارەحەتی بوون.

﴿ فَنَبَذْنَٰهُ بِٱلْعَرَآءِ ﴾ بەوەی نەهەنگەکە فڕێی دا لە ناو سکیەوە لە زەویەکی ڕووت، ئەویش زەوی خاڵیو ڕووتە لە هەموو کەسێک، بەڵکو خاڵیو ڕووتە لە دارو درەخت ﴿ وَهُوَ سَقِيمٌ ﴾ واتە: نەخۆش کەوت، بەهۆی زیندانی بوونی لە سکی نەهەنگەکەدا، هەتا وەک بێچوویەکی لێهات وەک لەناو هێلکەدا بێت.

﴿ وَأَنۢبَتْنَا عَلَيْهِ شَجَرَةً مِّن يَقْطِينٍ ﴾ (واتە: وە ڕووەکێکی کولەکەمان بەسەریدا ڕواند) سێبەری بۆ کرد بە سێبەر بۆ کردن، چونکە سارد بوو سێبەرەکەیشی سارد بوو، مێشوولەی بەسەردا نەدەکەوت، ئەمەش بەهۆی بەزەییو چاکەی خوا بوو بەسەریەوە.

پاشان بەزەییەکی تری بەسەردا باراند، منەتی کرد بەسەریدا بە منەتێکی مەزن، ئەویش ئەوەیە ئەو ناردی ﴿ إِلَىٰ مِاْئَةِ أَلْفٍ ﴾ (بۆ لای سەد هەزار) لە خەڵکی ﴿ أَوْ يَزِيدُونَ ﴾ (یان زیاتر) لەوە. مانای ئەوەی ئەگەر زیاتر نەبوو بن کەمتر نەبوون، بانگی کردن بۆ لای خوای بەرزو مەزن.

﴿ فَـَٔامَنُوا۟ ﴾ (بڕوایان هێنا) بوون بە شوێنکەوتووی ئەو، چونکە ئەو بانگیانی کرد، ﴿ فَمَتَّعْنَٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ ﴾ بەو هۆیەوە سزامان لەسەر لابردن، دوای ئەوەی هۆکارەکانی دامەزرا.

خـوا ﷻ فەرمـووی: ﴿ فَلَوْلَا كَانَتْ قَرْيَةٌ ءَامَنَتْ فَنَفَعَهَآ إِيمَٰنُهَآ إِلَّا قَوْمَ يُونُسَ لَمَّآ ءَامَنُواْ كَشَفْنَا عَنْهُمْ عَذَابَ ٱلْخِزْيِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَمَتَّعْنَٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٩٨﴾ ﴾یونـس، (واتـە: جـا بـا خەڵکـی شـارێ لەو شـارانەی هەڕەشـەیان لێکـرا بڕوایـان بهێنایـە وە بڕواکەیان سـوودی بۆیـان هەبوایـە بەڵام گەلـی یونس ﷺ کاتـێ هەمـوو بڕوایان هێنـا (پێش هاتنی سـزاکە لامـان بـرد لەسـەریان سـزای سەرشـۆڕیو ڕیسـوایی لـە ژیانـی دنیـادا بەهرەو خۆشـیمان پێـدان تـا ماوەیـەک کاتـی مردنیان).

(١٤٩-١٥٧): ﴿ فَٱسْتَفْتِهِمْ أَلِرَبِّكَ ٱلْبَنَاتُ وَلَهُمُ ٱلْبَنُونَ ﴿١٤٩﴾ أَمْ خَلَقْنَا ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ إِنَٰثًا وَهُمْ شَٰهِدُونَ ﴿١٥٠﴾ أَلَآ إِنَّهُم مِّنْ إِفْكِهِمْ لَيَقُولُونَ ﴿١٥١﴾ وَلَدَ ٱللَّهُ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿١٥٢﴾ أَصْطَفَى ٱلْبَنَاتِ عَلَى ٱلْبَنِينَ ﴿١٥٣﴾ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿١٥٤﴾ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿١٥٥﴾ أَمْ لَكُمْ سُلْطَٰنٌ مُّبِينٌ ﴿١٥٦﴾ فَأْتُواْ بِكِتَٰبِكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٥٧﴾ ﴾

خوا بە پێغەمبەرەکەی دەفەرموێ: ﴿ فَٱسْتَفْتِهِمْ ﴾ واتە: پرسیار لەوانە بکە هاوبەش بۆ خوا دادەنێن، ئەوانەی فریشتەکانیان پەرستووە، وە پێیان وابوو ئەوانە کچی خوان، جا کۆیان کردەوە لە نێوان هاوبەش دانان بە خواو وەسفکردنی بەوەی شایستەی گەورەیی ئەو نیە ﴿ أَلِرَبِّكَ ٱلْبَنَاتُ وَلَهُمُ ٱلْبَنُونَ ﴾ واتە: (ئایا کچان بۆ پەروەردگارتەو کوڕانیش هی ئەوانە) بە ڕاستی ئەمە دابەشکردنێکی نادروستو قسەیەکی ستەمکارانەیە، لەو ڕووەی کچیان بۆ خوا داناوە، وە لەو ڕووەی کەمترینو لاوازترینی ئەو دوو بەشەی کە بریتیە لە کچان ڕازی نابن بیدەنە پاڵ نەفسو دەرونیان، هەروەک لە دەقێکی تردا فەرموویەتی: ﴿ وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ ٱلْبَنَٰتِ سُبْحَٰنَهُۥ وَلَهُم مَّا يَشْتَهُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾النحل. (واتە: ئەو بتپەرستانە کچان بۆ خوا دادەنێن پاکو بێگەردی بۆ خواو بۆ خۆشیان چیان پێ خۆشە دایدەنێن).

وە لـەو ڕووەی فریشـتەکانیان دانـاوە بـە کچانـی خـواو بڕیاریـان لەسـەری داوە، خـوا درۆکەیانـی ڕوون کردوەتـەوەو فەرموویەتـی: ﴿ أَمْ خَلَقْنَا ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ إِنَٰثًا وَهُمْ شَٰهِدُونَ ﴾ واتـە: (یـان ئـەوان بـە دیـارەوە بوون کـە ئێمـە فریشـتەکانمان بـە مێینە دروسـت کـرد ؟) کارەکە بـەو جۆرە نیـە بێگومان ئەوان ئامـادەی دروسـتکردنیان نەبوون. بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی ئـەوان ئـەو قسـەیەیان کـردوە بە بـێ زانسـت، بەڵکـو درۆیان بە نـاوی خـواوە هەڵبەسـتووە، بۆیـە فەرموویەتـی: ﴿ أَلَآ إِنَّهُم مِّنْ إِفْكِهِمْ ﴾ واتـە: بە درۆی ئاشـکرایان ﴿ لَيَقُولُونَ ﴿١٥١﴾ وَلَدَ ٱللَّهُ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴾ (واتـە: دەیانـوت: خـوا منداڵـی بـووەو بێگومـان ئەوانـە درۆزنـن). ﴿ أَصْطَفَى ﴾ واتە: هەڵبـژاردوە،


ما لكم كيف تحكمون ﴿١٥٤﴾ أفلا تذكرون ﴿١٥٥﴾ أم لكم سلطان مبين ﴿١٥٦﴾
فأتوا بكتابكم إن كنتم صادقين ﴿١٥٧﴾ وجعلوا بينه وبين الجنة
نسبا ولقد علمت الجنة إنهم لمحضرون ﴿١٥٨﴾ سبحان الله عما
يصفون ﴿١٥٩﴾ إلا عباد الله المخلصين ﴿١٦٠﴾ فإنكم وما تعبدون ﴿١٦١﴾
ما أنتم عليه بفاتنين ﴿١٦٢﴾ إلا من هو صال الجحيم ﴿١٦٣﴾ وما منا إلا
له مقام معلوم ﴿١٦٤﴾ وإنا لنحن الصافون ﴿١٦٥﴾ وإنا لنحن المسبحون
﴿١٦٦﴾ وإن كانوا ليقولون ﴿١٦٧﴾ لو أن عندنا ذكرا من الأولين ﴿١٦٨﴾ لكنا
عباد الله المخلصين ﴿١٦٩﴾ فكفروا به فسوف يعلمون ﴿١٧٠﴾ ولقد
سبقت كلمتنا لعبادنا المرسلين ﴿١٧١﴾ إنهم لهم المنصورون ﴿١٧٢﴾
وإن جندنا لهم الغالبون ﴿١٧٣﴾ فتول عنهم حتى حين ﴿١٧٤﴾ وأبصرهم
فسوف يبصرون ﴿١٧٥﴾ أفبعذابنا يستعجلون ﴿١٧٦﴾ فإذا نزل بساحتهم
فساء صباح المنذرين ﴿١٧٧﴾ وتول عنهم حتى حين ﴿١٧٨﴾ وأبصر
فسوف يبصرون ﴿١٧٩﴾ سبحان ربك رب العزة عما يصفون ﴿١٨٠﴾
وسلام على المرسلين ﴿١٨١﴾ والحمد لله رب العالمين ﴿١٨٢﴾
سورة ص

﴿ ٱلْبَنَاتِ عَلَى ٱلْبَنِينَ ﴿١٥٣﴾ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴾ (واتە: کچان بەسەر کوڕاندا * چیتانە چۆن بڕیاری وادەدەن) ئەمە حوکمو بڕیارێکی ستەمکارانەیە؟ ﴿ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴾ (واتە: دەی ئایا بیر ناکەنەوە) ئەم پڕو پووچو ستەمکارانە جیاناکەنەوە، بە ڕاستی ئێوە ئەگەر بیرتان بکردایەتەوە ئەم قسەیەتان نەدەکرد.

﴿ أَمْ لَكُمْ سُلْطَٰنٌ مُّبِينٌ ﴾ واتە: بەڵگەیەکی ڕوون لەسەر قسەکانتان هەیە، لە کتێب یان پێغەمبەر. هەموو ئەمانە واقعی نیە، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ فَأْتُوا۟ بِكِتَٰبِكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾ (واتە: دەی کتێبەکەتان بێنن ئەگەر ڕاست دەکەن). بێگومان هەرکەسێ قسەیەک بکات، هیچ بەڵگەیەکی شەرعی لەسەر نەبێ، ئەوە درۆزنێکی بە ئەنقەستە، یان قسە بە ناوی خواوە دەکات بە بێ زانست.

(١٥٨-١٦٠): ﴿ وَجَعَلُوا۟ بَيْنَهُۥ وَبَيْنَ ٱلْجِنَّةِ نَسَبًا ۚ وَلَقَدْ عَلِمَتِ ٱلْجِنَّةُ إِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ ﴿١٥٨﴾ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٥٩﴾ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿١٦٠﴾ ﴾:

﴿ وَجَعَلُوا۟ بَيْنَهُۥ وَبَيْنَ ٱلْجِنَّةِ نَسَبًا ۚ وَلَقَدْ عَلِمَتِ ٱلْجِنَّةُ إِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ ﴾ هاوبەشدانەران لە نێوان خواو جنۆکەدا خزمایەتیان بڕیاردا، کاتێ پێیان وابوو کە بەڕاستی فریشتەکان کچانی خوان، دایکانیشیان لە جنۆکەکانن. لە کاتێکدا جنۆکەکان دەیانزانی ئامادە دەکرێن لەبەر دەستی خوا وەکو بەندەیەکی زەلیل، بۆ ئەوەی پاداشتیان بداتەوە، ئەگەر لە نێوان خواو جنۆکەدا خزمایەتی هەبوایە بەوشێوەیە نەدەبوو، ﴿ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ ﴾ (پاکو بێگەردی بۆ خوا) پاشای مەزن، تەواوو لەسەرخۆ، لەوەی هاوبەشدانەران وەسفی پێ دەکەن، لە هەموو وەسفێک بێتە مایەی بێبڕوایی‌و هاوبەشدانانیان.

﴿ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلۡمُخۡلَصِينَ ﴾ بێگومـان خـوا نەفسـی پـاک نەکردوەتـەوە لەوەی بـڕواداران وەسـفی دەکـەن، چونکـە ئـەوان وەسـفی ناکـەن مەگـەر شایسـتەی گەورەیـیو مەزنـی ئـەو بێـت، بەوشـێوەیە بـوون بـە دڵسـۆز.

(١٦١-١٦٣): ﴿ فَإِنَّكُمۡ وَمَا تَعۡبُدُونَ ١٦١ مَآ أَنتُمۡ عَلَيۡهِ بِفَٰتِنِينَ ١٦٢ إِلَّا مَنۡ هُوَ صَالِ ٱلۡجَحِيمِ ١٦٣ ﴾:

واتـە: ئـەی هاوبەشـدانەران، ئـەو بتانـەش کـە دەیانپەرسـتن لەگـەڵ خـوا، ئێـوە ناتوانـن کـەس تووشـی فیتنـەو گومڕایـی بکـەن بێجگـە لـەو کەسـەی خـوا بڕیـاری داوە لـە خەڵکانـی دۆزەخـە، قـەزاو قـەدەری خوایـی بەسـەریدا دەچەسـپێت، مەبەسـت لەمـەدا ڕوون کردنـەوەی بێتواناییـان بـوو، وە بێتوانایـی پەرسـتراوەکانیان لـە گومـڕا کردنـی کەسـێک، وە ڕوون کردنـەوەی تـەواوی توانـاو دەسـەڵاتی خـوا، واتـە: بەتەماحـی گومڕاکردنـی بەندەکانـی خـواو کۆمەڵـە سـەرفرازەکەی مەبـن.

(١٦٤-١٦٦): ﴿ وَمَا مِنَّآ إِلَّا لَهُۥ مَقَامٞ مَّعۡلُومٞ ١٦٤ وَإِنَّا لَنَحۡنُ ٱلصَّآفُّونَ ١٦٥ وَإِنَّا لَنَحۡنُ ٱلۡمُسَبِّحُونَ ١٦٦ ﴾:

﴿ وَمَا مِنَّآ إِلَّا لَهُۥ مَقَامٞ مَّعۡلُومٞ ﴾ ئەمـە ڕوونکردنـەوەی بەریبوونـی فریشـتەکانی تێدایـە لـەوەی هاوبەشـدانەران دەربارەیـان وتوویانـە: بێگومـان ئـەوان بەنـدەی خوان، سـەرپێچی ناکـەن بـە قـەد چـاو تروکانـێ، هـەر یەکێـک لـە ئـەوان پلـەو شـوێنی تایبەتـی خـۆی هەیـە، خـوا ﷻ فەرمانـی کـردوە پێـی، نـە تێـی دەپەڕێنـێو نـە سـنوور دەشـکێنێ، ئـەوان هیچیـان لـەو کاروبـارەدا نیـە.

﴿ وَإِنَّا لَنَحۡنُ ٱلصَّآفُّونَ ﴾ (بـە ڕاسـتی ئێمـە هەموومـان بەڕیـز وەسـتاوین) بـۆ بەندایەتیکردنـی خـواو جێبەجێکردنـی فەرمانەکانـی ﴿ وَإِنَّا لَنَحۡنُ ٱلۡمُسَبِّحُونَ ﴾ (بێگومـان ئێمـە هەمیشـە پاکـیو بێگـەردی) خـوا دەڵێیـن بـەوەی شایسـتەیە پێـی، دەی چـۆن دەگونجـێ ئەوانـە ببـن بەهاوبەشـی خـوای بـەرزوو مـەزن؟

(١٦٧-١٨٢): ﴿ وَإِن كَانُواْ لَيَقُولُونَ ١٦٧ لَوۡ أَنَّ عِندَنَا ذِكۡرٗا مِّنَ ٱلۡأَوَّلِينَ ١٦٨ لَكُنَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلۡمُخۡلَصِينَ ١٦٩ فَكَفَرُواْ بِهِۦۖ فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ ١٧٠ وَلَقَدۡ سَبَقَتۡ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا ٱلۡمُرۡسَلِينَ ١٧١ إِنَّهُمۡ لَهُمُ ٱلۡمَنصُورُونَ ١٧٢ وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ ٱلۡغَٰلِبُونَ ١٧٣ فَتَوَلَّ عَنۡهُمۡ حَتَّىٰ حِينٖ ١٧٤ وَأَبۡصِرۡهُمۡ فَسَوۡفَ يُبۡصِرُونَ ١٧٥ أَفَبِعَذَابِنَا يَسۡتَعۡجِلُونَ ١٧٦ فَإِذَا نَزَلَ بِسَاحَتِهِمۡ فَسَآءَ صَبَاحُ ٱلۡمُنذَرِينَ ١٧٧ وَتَوَلَّ عَنۡهُمۡ حَتَّىٰ حِينٖ ١٧٨ وَأَبۡصِرۡ فَسَوۡفَ يُبۡصِرُونَ ١٧٩ سُبۡحَٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلۡعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ١٨٠ وَسَلَٰمٌ عَلَى ٱلۡمُرۡسَلِينَ ١٨١ وَٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ١٨٢ ﴾:

﴿ وَإِن كَانُوا۟ لَيَقُولُونَ ١٦٧ لَوْ أَنَّ عِندَنَا ذِكْرًا مِّنَ ٱلْأَوَّلِينَ ١٦٨ لَكُنَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ١٦٩ فَكَفَرُوا۟
بِهِۦ ﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدات بێگومان هاوبەشدانەران ئاواتیان دەخواستو دەیانوت: ئەگەر کتێبێکمان بۆ بهاتایە وەک چۆن پێشینانمان بۆیان هاتبوو، ئەوە بە دڵسۆزیەوە بەندایەتی خوامان دەکرد، بەڵکو ئێمە لە بەندە پاکو خاوێنەکانی خوا دەبووین.

ئەوان لەوەدا درۆیان کرد، بێگومان باشترین کتێبیان بۆ هاتو بێبروا بوون پێی، بۆیە زانرا ئەوان یاخین لە حەقو ڕاستی ﴿ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴾ (بە زوویی دەزانن) سزاو تۆڵە کاتێ کە تووشیان دەبێ، با وا هەست نەکەن ئەوان لە دونیادا سەرکەوتوون، بێگومان پێشتر خوا بڕیاریداوە، بەڵکو وشەی خوا پێشکەوتووە کە هیچ گەڕانەوەیەکی بۆ نیە، وە هیچ پێچەوانەیەکی نیە بۆ بەندە نێردراوەکانیو سەربازە سەرکەوتووەکانی، بێگومان ئەوان سەرکەوتوون، وە یارمەتیدراون لە لایەن پەروەردگاریانەوەو سەرخراون بە سەرخستنێکی سەربەرزانە، دەتوانن ئاینەکەیان بەجێ بهێنن تیایدا.

ئەمە مژدەیەکی مەزنە بۆ ئەو کەسەی کە بە سەربازی خوا وەسف دەکرێ، بەوەی باروودۆخی ڕاستو ڕێکە، وە کوشتاری ئەوانە دەکات کە فەرمانکراوە بە کوشتنیان، ئەو بە بەردەوام سەرکەوتوو یارمەتیدراوە.

پاشان فەرمانیکردوە بە پێغەمبەرەکەی بە پشتتێکردنی ئەوانەی عینادیو نکوڵی دەکەنو حەقو ڕاستی وەرناگرن، بێگومان هیچ نەماوەتەوە تەنها چاوەڕوانی حەلاڵبوونی سزا بەسەریانەوە، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ وَأَبْصِرْهُمْ فَسَوْفَ يُبْصِرُونَ ﴾ (وە بیان بینە لەمەولا ئەوانیش دەبینن چیان بەسەر دێت) چۆن سزایان بۆ حەلاڵ دەبێت، بێگومان بۆیان حەلاڵ دەکات ﴿ فَإِذَا نَزَلَ بِسَاحَتِهِمْ ﴾ واتە: سزا دابەزی بە سەریاندا ﴿ فَسَآءَ صَبَاحُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴾ (واتە: ئەوسا ترسێنراوان چ ڕۆژێکی خراپو تەنگیان دەبێت) چونکە ڕۆژێکی پڕ لە شەڕوو سزاو لە بن دەرهێنانە.

پاشان فەرمانەکە دووبارە دەکاتەوە بە وازهێنان لێیانو هەڕەشە لێکردنیان بە تووشبوونی سزا.

کاتێ لەم سوورەتەدا باسی زۆرێ لە قسە ناشرینەکانی ئەوانی کرد کە پێی وەسف کرابوو، نەفسی خۆی بە پاک ڕاگرت لەوانە، جا فەرمووی: ﴿ سُبْحَٰنَ

رَبِّكَ ﴾ واتــە: پاكــیو بێگــەردی بــۆ خــوای بــەرز ﴿ رَبِّ ٱلْعِزَّةِ ﴾ واتــە: ئــەو زاتــەی بــاڵا دەســتە، زاڵــە بەســەر هەمــوو شــتێكدا، وە بەدەســەڵاتە بــە ســەر هەمــوو خراپەیەكــدا كــە هاوبەشــدانەران وەســفی ئــەوی پێدەكــەن ﴿ وَسَلَٰمٌ عَلَى ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾ (ســڵاو بــۆ گشــت پێغەمبــەران) بەهــۆی ســەلامەتیان لــە گونــاەو بــەڵاكان، وە ســەلامەتی ئــەوەی هاوبەشــدانەران وەســفی بەدیهێنــەری ئاســمانەكانو زەوییــان پــێ كــردوە ﴿ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ (ســوپاسو ســتایش بــۆ پەروەردگــاری جیهانیــان) (الألــف و الــلام) بــۆ هەمووانــە (الإســتغراق) هەمــوو جۆرەكانــی ســتایش كــردن لــە ســیفەتە تــەواوو مەزنــەكان، وە لــەو كــردارەی جیهانیانــی پــێ كــردوە، وە نــازو نیعمەتــی پــێ بەخشــیون، وە هەمــوو بــەڵاو ناخۆشــیەكانی لــێ دوور خســتوونەتەوە، وە ڕێكــی خســتوون لــە جوڵــەو وەســتانیاندا، وە لەســەرجەم بارودۆخەكانیــان، هەمــووی تایبەتــە بەخــوای بــەرزو مــەزن. ئــەو زاتــە پــاك ڕاگیــراوە لــە هەمــوو ناتەواویــەك، ستایشــكراوە بــە هەمــوو تەواویــەك، خۆشەویســتو بــە مــەزن دانــراوە. وە پێغەمبەرانــی بــە بــەردەوام پارێــزراون، هەركەســێك شــوێنی ئــەوان بكــەوێ ســەلامەتی بــۆ دەبــێ لــە دونیــاو دوارۆژدا، وە دوژمنانــی لــە ناوچــوونو ناخۆشــیان بــۆ هەیــە لــە دونیــاو دوارۆژدا.

تەفسیری سوورەتی (الصافات) تەواو بوو.


بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
صٓ وَٱلْقُرْءَانِ ذِى ٱلذِّكْرِ ﴿١﴾ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى عِزَّةٍ وَشِقَاقٍ ﴿٢﴾
كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ فَنَادَوا۟ وَّلَاتَ حِينَ مَنَاصٍ ﴿٣﴾ وَعَجِبُوٓا۟
أَن جَآءَهُم مُّنذِرٌ مِّنْهُمْ ۖ وَقَالَ ٱلْكَٰفِرُونَ هَٰذَا سَٰحِرٌ كَذَّابٌ ﴿٤﴾
أَجَعَلَ ٱلْءَالِهَةَ إِلَٰهًا وَٰحِدًا ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ عُجَابٌ ﴿٥﴾ وَٱنطَلَقَ ٱلْمَلَأُ
مِنْهُمْ أَنِ ٱمْشُوا۟ وَٱصْبِرُوا۟ عَلَىٰٓ ءَالِهَتِكُمْ ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ يُرَادُ ﴿٦﴾
مَا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِى ٱلْمِلَّةِ ٱلْءَاخِرَةِ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا ٱخْتِلَٰقٌ ﴿٧﴾ أَءُنزِلَ
عَلَيْهِ ٱلذِّكْرُ مِنۢ بَيْنِنَا ۚ بَلْ هُمْ فِى شَكٍّ مِّن ذِكْرِى ۖ بَل لَّمَّا يَذُوقُوا۟ عَذَابِ
﴿٨﴾ أَمْ عِندَهُمْ خَزَآئِنُ رَحْمَةِ رَبِّكَ ٱلْعَزِيزِ ٱلْوَهَّابِ ﴿٩﴾ أَمْ لَهُم مُّلْكُ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ۖ فَلْيَرْتَقُوا۟ فِى ٱلْأَسْبَٰبِ ﴿١٠﴾ جُندٌ
مَّا هُنَالِكَ مَهْزُومٌ مِّنَ ٱلْأَحْزَابِ ﴿١١﴾ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ
وَعَادٌ وَفِرْعَوْنُ ذُو ٱلْأَوْتَادِ ﴿١٢﴾ وَثَمُودُ وَقَوْمُ لُوطٍ وَأَصْحَٰبُ
لْـَٔيْكَةِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلْأَحْزَابُ ﴿١٣﴾ إِن كُلٌّ إِلَّا كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ
فَحَقَّ عِقَابِ ﴿١٤﴾ وَمَا يَنظُرُ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً مَّا لَهَا
مِن فَوَاقٍ ﴿١٥﴾ وَقَالُوا۟ رَبَّنَا عَجِّل لَّنَا قِطَّنَا قَبْلَ يَوْمِ ٱلْحِسَابِ ﴿١٦﴾

## تەفسیری سوورەتی (ص)

## مەککیە (٨٨) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-١١): ﴿ صٓ وَٱلْقُرْءَانِ ذِى ٱلذِّكْرِ ﴿١﴾ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى عِزَّةٍ وَشِقَاقٍ ﴿٢﴾ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ فَنَادَوا۟ وَّلَاتَ حِينَ مَنَاصٍ ﴿٣﴾ وَعَجِبُوٓا۟ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٌ مِّنْهُمْ ۖ وَقَالَ ٱلْكَٰفِرُونَ هَٰذَا سَٰحِرٌ كَذَّابٌ ﴿٤﴾ أَجَعَلَ ٱلْءَالِهَةَ إِلَٰهًا وَٰحِدًا ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ عُجَابٌ ﴿٥﴾ وَٱنطَلَقَ ٱلْمَلَأُ مِنْهُمْ أَنِ ٱمْشُوا۟ وَٱصْبِرُوا۟ عَلَىٰٓ ءَالِهَتِكُمْ ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ يُرَادُ ﴿٦﴾ مَا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِى ٱلْمِلَّةِ ٱلْءَاخِرَةِ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا ٱخْتِلَٰقٌ ﴿٧﴾ أَءُنزِلَ عَلَيْهِ ٱلذِّكْرُ مِنۢ بَيْنِنَا ۚ بَلْ هُمْ فِى شَكٍّ مِّن ذِكْرِى ۖ بَل لَّمَّا يَذُوقُوا۟ عَذَابِ ﴿٨﴾ أَمْ عِندَهُمْ خَزَآئِنُ رَحْمَةِ رَبِّكَ ٱلْعَزِيزِ ٱلْوَهَّابِ ﴿٩﴾ أَمْ لَهُم مُّلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ۖ فَلْيَرْتَقُوا۟ فِى ٱلْأَسْبَٰبِ ﴿١٠﴾ جُندٌ مَّا هُنَالِكَ مَهْزُومٌ مِّنَ ٱلْأَحْزَابِ ﴿١١﴾ ﴾:

ئەمە ڕوون کردنەوەیەکە لەلایەن خواوە دەربارەی حاڵی قورئان، وە حاڵی بەدرۆدانەران بەو پەیامەی هێناویەتی، جا فەرموویەتی: ﴿ صٓ وَٱلْقُرْءَانِ ذِى ٱلذِّكْرِ ﴾ واتە: (سوێند بە قورئان) خاوەن ڕێزو حورمەتێکی مەزن، یادخەرەوەی بەندەکانە هەموو ئەوانەی پێویستیان پێیەتی لە زانست بە ناوو سیفاتو کردارەکانی خوا، وە لە زانست بە حوکمەکانی گەڕانەوەو پاداشت، خوا ئامۆژگاریان دەکات لە بنەماکانی ئاینیانو لقو پۆکانی.

لێرەدا پێویست ناکات باسی سوێند لەسەر خوراو بکات، بێگومان حەقیقەتی کارەکە سوێند پێ خوراو و سوێند لەسەر خوراو یەک شتن، ئەویش ئەم قورئانەیە کە وەسف کراوە بەم وەسفە، جا ئەگەر قورئان وەسف کرابوو بەم وەسفە، زانراوە پێویستی بەندەکان بە قورئان لە سەرووی هەموو پێویستیەکانەوەیە، وە پێویست دەبێ لەسەریان

بـڕوای پێبهێنــن‌و بــە ڕاسـتی دابنێــن، وە ڕوو بكەنــە دەرهێنانی ئــەوەی پەنــدو ئامۆژگاری تێدایــە بۆیان.

خــوا ﷻ هیدایەتــی ئــەو كەســەی دا هیدایەتــی لەمــە وەرگــرت، وە بێبــڕواكان یاخی بوون پێــی، وە بەوەیشــی دایبەزانــدووە، وە لەگەڵیانــدا بــوو ﴿ عِزَّةٍ وَشِقَاقٍ ﴾ ڕۆچــوون‌و ڕێگری كــردن لــە بڕواهێنان پێی‌و خۆبەزل زانین لە ئاستیدا، وە ئاشــووب ســازن‌و دژی دەوەســتن لــە ڕەتكردنــەوەی‌و بەتــاڵ كردنــەوەی، وە لە تانــەدان لــەوەی هێناویەتی.

هەرەشــەی لێكــردوون بــە لەناوبردنیان وەك ســەدەكانی ڕابــردوو كــە پێغەمبەرانیان بە درۆ دادەنــا، ئــەوان كاتــی لەناوچوونیان هــات هاواریان كــردو داوای یارمەتیان كــرد بە لابردنی ســزا لەســەریان، بــەلام ﴿ وَّلَاتَ حِينَ مَنَاصٍ ﴾ واتــە: ئــەو كاتە كاتــی ڕزگار بــوون نەماوە، لــەوەی تێــی كەوتــوون، هیــچ دەرچەیەكیــان نەمــا كاتــێ تــووش بــوون، دەی بــا ئەوانــە ئاگاداربــن لــەوەی بــەردەوام نەبن لەســەر ڕۆچــوون‌و خۆبەزلزانیــن، ئەگینــا بەلایان تووش دەبــێ وەك چــۆن تووشــی ئەوانــەی پێش ئــەوان هات.

﴿ وَعَجِبُوٓاْ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٌ مِّنْهُمْ ﴾ واتــە: بــەدرۆ دانــەران بــە شــتێك ســەریان ســوڕما جێگای سەرســوڕمان نەبــوو، ترســێنەرێكیان بۆ هــات بۆ ئەوەی بتوانن شــتی لێوەربگرن‌و بیناســنەوە بــە چاكتریــن ناســینەوە، وە لەبــەر ئەوەی لــە گەلەكەیانــە، دەمارگیــری نەتەوایەتــی نەبێتە بەربەســت لەبــەردەم شــوێنكەوتنی، ئەمــەش سوپاســگوزاری خــوای دەوێ لەســەریان، وە ئەوپــەڕی ملكەچبــوون بۆی.

بــەلام بابەتەكەیــان پێچەوانە كردەوە، ســەریان ســوڕما سەرســوڕمانێكی نكوولــی كارانە، وە لە كوفرو ســتەمیانەوە وتیــان: ﴿ هَٰذَا سَٰحِرٌ كَذَّابٌ ﴾ (واتە: ئەمــە جادووگەرێكی درۆزنە). وە تاوانەكــەی -لە لایــان- بێگومان ئــەو ﴿ أَجَعَلَ ٱلْـَٔالِهَةَ إِلَٰهًا وَٰحِدًا ﴾، واتە: چــۆن ڕێگری دەكات لــە دانانــی هاوبــەش‌و بتــەكان، وە فەرمــان دەكات بەدڵســۆزی بەندایەتــی كردن بۆ خــوای تــاك‌و تەنهــا﴿ إِنَّ هَٰذَا ﴾ ئەمەی كــە (موحەممــەد ﷺ) هێناویەتی ﴿ لَشَىْءٌ عُجَابٌ ﴾ واتــە: جێگای سەرســوڕمانە بــە هۆی پووچــی‌و خراپییەوە.

﴿ وَٱنطَلَقَ ٱلْمَلَأُ مِنْهُمْ ﴾ (واتــە: گــەورەكان بە پەلە دەرچــوون) ئەوانەی قســەیان وەردەگیرا، هانــی گەلەكانیان دەدا لەســەر پەیوەســت بــوون بەوەی ئەوان لەســەری دەڕۆن لــە هاوبەش دانــان، ﴿ أَنِ ٱمْشُواْ وَٱصْبِرُواْ عَلَىٰٓ ءَالِهَتِكُمْ ﴾ واتە: بەردەوام بن لەســەر (پەرســتنی خواكانتان)، كۆششــی نەفس‌و دەروونتــان بكــەن لــە خۆڕاگرتــن لەســەر ئاینەكەتــان‌و پەرستشــتان، بــا

هیـچ کەسـێک ڕێگـری‌و بەرهەڵسـتی ئەوەتان لێنـەکات ﴿ إِنَّ هَٰذَا ﴾ (بەڕاسـتی ئەمە) کە موحەممـەد ﷺ پێـی هاتـووە لـە قەدەغەکردن لـە بەندایەتی کردنـی ﴿ لَشَيْءٌ يُرَادُ ﴾ واتە: مەبەسـت‌و نیەتـی چـاک نیـە لـەوەی دەڵێـت تەنها خـوا بپەرسـتن، ئەمـە گومانێکـە تەنها کەسـانی گێـل‌و گەمـژەی پێدەخەڵەتـێ، بێگومـان هەر کەسـێ بانگەشـە بکات بۆ قسـەی حـەق، یـان جگـە لـە حـەق، قسـەکەی ڕەتناکرێتـەوە بە ناشـرین کردنـی نیەتـی، نیەت‌و کـردەوەی بۆ خۆیەتی، بەڵکـو ڕەت دەکرێتەوە بـە بەرانبەرەکەی بـەوەی بەتاڵی دەکاتەوەو فاسـدی دەکات لـە بەڵگـەو سـەلماندنەکان، ئـەوان مەبەسـتیان ئـەوە بـوو موحەممـەد ﷺ بـۆ ئـەوە بانگیـان دەکات ببێتـە دەسـەڵاتدار لەناویانـداو بـە مـەزن تەماشـای بکـەن‌و ببنە شـوێنکەوتووی.

﴿ مَا سَمِعْنَا بِهَٰذَا ﴾ ئـەو قسـەی کـە دەیڵێـت، وە ئـەو ئاینەی بانگەشـەی بـۆ دەکات ﴿ فِي الْمِلَّةِ الْآخِرَةِ ﴾ واتـە: لـە کاتـی کۆتـا ئاینـدا، ئێمە شـتی لـەو جۆرەمـان لـە باوکانمانەوە پـێ نەگەیشـتوون، باوکانیشـمان لـە باپیرانیانـەوە شـتی وەهایان پێ نەگەیشـتووە، شـوێن باپیرانتـان بکـەون، بێگومان تەنها ئـەو حەقە، وە ئەوەشـی موحەممەد بانگەشـەی بۆ دەکات تەنها هەڵبەسـتن‌و درۆیەکـە خۆی هەڵیبەسـتووە.

هەروەهـا ئەمـەش گومانێکـە لـە ڕەگـەزو شـێوەی گومانەکانی پێشـوویانە، کاتـێ حەقیان ڕەت کـردەوە بـەوەی کـە نابێتە بەڵگە بـۆ بچووکترین قسـە، ئەویش قسـەیەکە پێچەوانەی قسـەی باوباپیرانیانـە، ئەمـە چـۆن دەبێتـە بەڵگـە لە سـەر بەتاڵی‌و پووچـی؟ ﴿ أَؤُنزِلَ عَلَيْهِ الذِّكْرُ مِن بَيْنِنَا ﴾ چـی فـەزڵ‌و چاکـەی ئـەوەی داوەتـە سـەر ئێمـەدا هەتـا قورئـان بۆ ئەو دابـەزێ بـۆ جگـە لە ئێمـەو خـوا تایبەتی بـکات بـەو پەیامەوە.

هەروەهـا ئەمـەش گومانێکی دیکەیـە، کامەیە بەڵگە تیایدا لەسـەر ڕەتکردنەوەی قسـەکانی پێغەمبـەر ﷺ؟ ئایـا هەمـوو پێغەمبـەران ئـەو وەسـفەیان نەبـووە خـوا ﷻ منەتـی کـردوە بەسـەریاندا، بـە پەیامـی خـۆی‌و فەرمانـی پێکردوون بـە بانگـەوازی خەڵکی بـۆ لای خوا. ئـەو قسـانەی لـە ئەوانـەوە دەرچـووە بە هیـچ شـێوەیەک ناگونجێ بـۆ ڕەتکردنـەوەی ئەو پەیامـەی پێغەمبـەر هێناویەتی، خـوا ﷻ هەواڵیدا ئەو قسـانە لە کوێوە سـەرچاوەی گرتووە، بێگومـان ئەوان ﴿ فِي شَكٍّ مِّن ذِكْرِي ﴾ واتـە: (لە گوماندان لە قورئانەکـەی من) هیچ بەڵگەو زانسـتێکیان لا نیـە، کاتـێ کەوتنە نـاو گومانەوەو پێـی ڕازیبـون، و حەقـی ڕوونکراوەیان بـۆ هات، ئەوان سـوور بوون لەسـەر بـەردەوام بوونیان لەسـەر گومانەکانیان، ئەو قسـانەیان

کـرد کە کردیان بـۆ ڕەتکردنەوەی حـەق، نەک لـە بەڵگەیەکی ڕوونکراوەوە سـەرچاوەی گرتبـێ، بەڵکـو ئـەوە درۆ هەڵبەسـتنێک بـوو لـە لایەن ئەوانـەوە، ئـەوەی زانـراوە ئەوەی خاوەنـی ئـەم سـیفاتەیە بە گومـانو عینادیەوە قسـە دەکات، ئەوە قسـەکانی وەرگیـراو نیە، وە بـە کەمترین شـێوە حـەق لەکەدار نـاکات، بێگومان تەنها بە قسـە کردنی سەرزەنشـتو لۆمەکردنـی ڕووبـەڕوو دەبێتەوە، لەبـەر ئەمەیە هەڕەشـەی لێکردوون بە سـزا، فەرموویەتی: ﴿ بَل لَّمَّا يَذُوقُوا۟ عَذَابِ ﴾ واتـە: (بەڵکـو ئەوانـە هێشـتا سـزای منیـان نەچەشـتووە)، بۆیە ئەو قسـانەیان کـردوو چاو قایم بوون لەسـەری، ئەوانـە لە دونیـادا چێژیان وەرگرتبوو، سـزای خوایـان تـووش نەبـوو بـوو، ئەگـەر سـزای خوایان بچەشـتایە ئـەوە بـەو جـۆرە بوێریان نەدەکرد.

﴿ أَمْ عِندَهُمْ خَزَآئِنُ رَحْمَةِ رَبِّكَ ٱلْعَزِيزِ ٱلْوَهَّابِ ﴾ (واتـە: یان خەزێنەکانی بەزەیی پەروەردگارت لای ئەوانـە کـە زاڵـی بەخشـندەیە)، بە هەر کەسـێک بیانـەوێ بیبەخشـن وە ڕێگری بکەن لـە هـەر کەسـێ کـە بیانـەوێ، کاتـێ وتیـان: ﴿ أَءُنزِلَ عَلَيْهِ ٱلذِّكْرُ مِنۢ بَيْنِنَا ﴾ واتـە: ئەمـە فـەزڵو میهرەبانـی خوایـەو بە دەسـتی ئـەوان نیـە، هەتا قەدەغـەی بکەن لەسـەر خوا ﷻ.

﴿ أَمْ لَهُم مُّلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ﴾ بـە جـۆرێ ئـەوان دەسـەڵاتدار بـن لەسـەر ئـەوەی دەیانـەوێ ﴿ فَلْيَرْتَقُوا۟ فِى ٱلْأَسْبَٰبِ ﴾ (واتـە: ئەگـەر وایـە دەبا بـەرز ببنـەوە لەناو هۆکارەکانـی بـەرز بوونـەوەدا) تـا دەیانگەیەنێتە ئاسـمان، دەرگـای ڕەحمـەت بپچڕێنن لە پێغەمبەر ﷺ.

چـۆن قسـە دەکەن لـە کاتێکدا ئـەوان بێتواناتریـنو لاوازترینـی دروسـتکراوەکانی خوان، بەوەی قسـەی لەسـەر بکەن؟! یـان مەبەسـتیان یەکگرتـنو هاوکاریکردنی یەکترە لەسـەر سەرخسـتنی پـووچو بەتاڵو ڕیسـواکردنی حـەق؟ ئەوەش حەقیقـەتو ڕاسـتە، بێگومان ئەم مەبەسـتە بۆیان تـەواو نابێ، بەڵکـو هەوڵەکانیـان بەفیرۆ چـووەو سـەربازەکانیان بەزێنراوو دۆڕاوە، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ جُندٌ مَّا هُنَالِكَ مَهْزُومٌ مِّنَ ٱلْأَحْزَابِ ﴾ (واتـە: لەشـکرو کۆمەڵێکـی بێ نرخن لـەو کۆمەڵانـەی دژی پێغەمبەرانن بە زوویی دەشـکێنرێنو سەرشـۆڕ دەبن).

(١٢-١٥): ﴿ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَعَادٌ وَفِرْعَوْنُ ذُو ٱلْأَوْتَادِ ﴿١٢﴾ وَثَمُودُ وَقَوْمُ لُوطٍ وَأَصْحَٰبُ لْـَٔيْكَةِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلْأَحْزَابُ ﴿١٣﴾ إِن كُلٌّ إِلَّا كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ فَحَقَّ عِقَابِ ﴿١٤﴾ وَمَا يَنظُرُ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً مَّا لَهَا مِن فَوَاقٍ ﴿١٥﴾ ﴾:

خوا ﷻ ئاگاداریان دەکاتەوە بەسەریان بێنێو سزایان بدات وەک چۆن سزای ئۆممەتەکانی پێش ئەوانیدا، ئەوانەی بەهێزترو بە تواناتر بوون لە ئەمان، وە یەکگرتووتر و بە کۆمەڵتر بوون لەسەر پووچو بەتاڵ، ﴿ قَوۡمُ نُوحٖ وَعَادٞ ﴾ گەلی هوودیش ﴿ وَفِرۡعَوۡنُ ذُو ٱلۡأَوۡتَادِ ﴾ واتە: سەربازە مەزنەکانو هێزە زۆرو زەبەندەکان.

﴿ وَثَمُودُ ﴾ گەلی صالح ﴿ وَقَوۡمُ لُوطٖ وَأَصۡحَٰبُ لۡـَٔيۡكَةِۚ ﴾ واتە: خاوەن باخە چڕو پڕەکان، ئەوانیش گەلی شوعەیب بوون، ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلۡأَحۡزَابُ ﴾ ئەوانەی کۆ بوونەوە بەهێزو تواناو ژمارەو خۆئامادە کردنیان بۆ ڕەتکردنەوەی حەقو ڕاستی، بەڵام هیچ سوودێکی پێ نەگەیاندن.

﴿ إِن كُلٌّ ﴾ لە ئەوانە ﴿ إِلَّا كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ فَحَقَّ ﴾ لەسەریان ﴿ عِقَابِ ﴾ سزای خوا. وە ئەوانە چی پاکو خاوێنیان دەکاتەوە کە تووشی سزا نەبن وەکو چۆن پێش ئەوان تووش بوون؟

با چاوەڕوانی ﴿ صَيۡحَةٗ وَٰحِدَةٗ مَّا لَهَا مِن فَوَاقٖ ﴾ واتە: (دەنگێکی زۆر گەورە بکەن ئەو دەنگە) هیچ گەڕانەوەو ڕەتکردنەوەیەکی بۆ نیە، لەناویان دەباو لە بنجو بنەوانە دەریان دێنێ، ئەگەر بەردەوام بن لەسەر ئەوەی لەسەری بوون.

(١٦-١٧): ﴿ وَقَالُواْ رَبَّنَا عَجِّل لَّنَا قِطَّنَا قَبۡلَ يَوۡمِ ٱلۡحِسَابِ ١٦ ٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱذۡكُرۡ عَبۡدَنَا دَاوُۥدَ ذَا ٱلۡأَيۡدِۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ١٧ ﴾:

﴿ وَقَالُواْ ﴾ واتە: بە درۆدانەران لە نەفامیو عینادی کردنی حەقو پەلەکردنیان لە سزاداندا دەیانوت: ﴿ رَبَّنَا عَجِّل لَّنَا قِطَّنَا ﴾ واتە: بەشەکانمان، وە ئەوەیشی بۆت دیاری کردووین لە سزا بە پەلە ﴿ قَبۡلَ يَوۡمِ ٱلۡحِسَابِ ﴾ (پێش ڕۆژی لێپرسینەوە) سوور بوون لەسەر ئەم قسەیەو پێیان وابوو تۆ ئەی موحەممەد ﷺ ئەگەر ڕاست دەکەی نیشانەی ڕاستیەکەت با هاتنی سزا بێ بۆمان.

ٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱذْكُرْ عَبْدَنَا دَاوُۥدَ ذَا ٱلْأَيْدِ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿١٧﴾ إِنَّا سَخَّرْنَا ٱلْجِبَالَ مَعَهُۥ يُسَبِّحْنَ بِٱلْعَشِىِّ وَٱلْإِشْرَاقِ ﴿١٨﴾ وَٱلطَّيْرَ مَحْشُورَةً ۖ كُلٌّ لَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿١٩﴾ وَشَدَدْنَا مُلْكَهُۥ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْحِكْمَةَ وَفَصْلَ ٱلْخِطَابِ ﴿٢٠﴾ ۞ وَهَلْ أَتَىٰكَ نَبَؤُا۟ ٱلْخَصْمِ إِذْ تَسَوَّرُوا۟ ٱلْمِحْرَابَ ﴿٢١﴾ إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَىٰ دَاوُۥدَ فَفَزِعَ مِنْهُمْ ۖ قَالُوا۟ لَا تَخَفْ ۖ خَصْمَانِ بَغَىٰ بَعْضُنَا عَلَىٰ بَعْضٍ فَٱحْكُم بَيْنَنَا بِٱلْحَقِّ وَلَا تُشْطِطْ وَٱهْدِنَآ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلصِّرَٰطِ ﴿٢٢﴾ إِنَّ هَٰذَآ أَخِى لَهُۥ تِسْعٌ وَتِسْعُونَ نَعْجَةً وَلِىَ نَعْجَةٌ وَٰحِدَةٌ فَقَالَ أَكْفِلْنِيهَا وَعَزَّنِى فِى ٱلْخِطَابِ ﴿٢٣﴾ قَالَ لَقَدْ ظَلَمَكَ بِسُؤَالِ نَعْجَتِكَ إِلَىٰ نِعَاجِهِۦ ۖ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْخُلَطَآءِ لَيَبْغِى بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَقَلِيلٌ مَّا هُمْ ۗ وَظَنَّ دَاوُۥدُ أَنَّمَا فَتَنَّٰهُ فَٱسْتَغْفَرَ رَبَّهُۥ وَخَرَّ رَاكِعًا وَأَنَابَ ۩ ﴿٢٤﴾ فَغَفَرْنَا لَهُۥ ذَٰلِكَ ۖ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلْفَىٰ وَحُسْنَ مَـَٔابٍ ﴿٢٥﴾ يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَٰكَ خَلِيفَةً فِى ٱلْأَرْضِ فَٱحْكُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا نَسُوا۟ يَوْمَ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٦﴾

خوا ﷻ بە پێغەمبەرەکەی فەرموو: ﴿ ٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ ﴾ (واتە: ئارام بگرە لەسەر ئەو قسانەی کە دەیکەن) وەک چۆن ئارامیان گرت پێغەمبەرانی پێش تۆ، بێگومان قسەکانیان هیچ زیانێک بە حەق ناگەیەنێ، وە زیانیش بەئێوە ناگەیەنێ لەهیچ شتێکدا، بەڵکو زیان بە نەفسی خۆیان دەگەیەنێ.

(١٨-٢٠): ﴿ إِنَّا سَخَّرْنَا ٱلْجِبَالَ مَعَهُۥ يُسَبِّحْنَ بِٱلْعَشِىِّ وَٱلْإِشْرَاقِ ﴿١٨﴾ وَٱلطَّيْرَ مَحْشُورَةً ۖ كُلٌّ لَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿١٩﴾ وَشَدَدْنَا مُلْكَهُۥ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْحِكْمَةَ وَفَصْلَ ٱلْخِطَابِ ﴿٢٠﴾ ﴾:

﴿ وَٱذْكُرْ عَبْدَنَا دَاوُۥدَ ﴾ کاتێ خوا ﷻ فەرمانیکرد بە پێغەبەرەکەی بە ئارامگرتن لەسەر گەلەکەی، ئینجا فەرمانی پێکرد ئارام بگرێ لە پەرستشی خوای تاکو تەنهادا، وە حاڵی بەندە خواناسەکان بهێنێتەوە یادی، وەک لە ئایەتێکی دیکەدا فەرموویەتی: ﴿ فَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا ﴿١٣٠﴾ ﴾ طه، (واتە: کەواتە ئەی موحەممەد ﷺ ئارام بگرە لەسەر ئەوەی ئەوان دەیڵێنو پەروەردگارت بە پاکی ڕابگرەو سوپاسی بکە لە پێش هەڵاتنی خۆرو لەپێش ئاوابوونی).

لە گەورەترینی خواناسانو عیبادەتکاران نێردراوی خوا داوود بوو ؈ ﴿ ذَا ٱلْأَيْدِ ﴾ خاوەن هێزێکی مەزن، لە بەندایەتیکردنی خوای بەرزو مەزن لە جەستەو دڵیدا ﴿ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴾ واتە: گەڕاوە بوو بۆ لای خوا لە هەموو کاروبارەکانیدا، بە گوێڕایەڵیو خۆشەویستیو پەرستنو ترسانو هیواو ئومێدو زۆر گەردن کەچیو پاڕانەوە، زۆر دەگەڕایەوە بۆ لای کاتێ ڕوو بەڕووی هەندێ کەمو کورتی ببوایەتەوە، بە خۆداڕنینو تەوبەی ڕاستەقینە.

وە لە تامەزرۆییو زۆری گوێڕایەڵی پەروەردگاریو بەندایەتی کردنی بۆی، خوا ﷻ چیاکانی ڕامهێنا لەگەڵیدا تەسبیحاتو ستایشی پەروەردگاریان دەکرد، ﴿ بِٱلْعَشِىِّ

﴿وَٱلۡإِشۡرَاقِ﴾ سـەرەتای ڕۆژو کۆتاییەکـەی، ﴿وَٱلطَّيۡرَ مَحۡشُورَةٗ﴾ (باڵندەکانــی) ڕامهێنـا لەگـەڵ داوودا ﷺ بـە کۆمـەڵ، ﴿كُلّٞ﴾ هەریەکـە لـە کێـوەکانو باڵندە بۆ خـوای بەرزو مـەزن، ﴿أَوَّابٞ﴾ بـە جێبەجـێ کردنـی فەرمانـی خـوای مـەزن، ﴿يَٰجِبَالُ أَوِّبِي مَعَهُۥ وَٱلطَّيۡرَ ١٠﴾سبأ، (واتـە: ئەی چیـاکانو باڵنـدەکان لەگـەڵ داوود ﷺ زیکرو تەسـبیح بڵێنـەوە) ئەمـە منەتـی خـوای گەورەیـە بەسـەریەوە بـە بەندایەتـی کردن.

پاشـان باسـی منەتـی خـۆی دەکات بەسـەریەوە بـە پاشـایەتیەکی مـەزن، فەرموویەتـی: ﴿وَشَدَدۡنَا مُلۡكَهُۥ﴾ واتـە: پاشـایەتی ئەومـان بەهێـز کـرد بـەوەی پێمـان بەخشـیبوو لـە هـۆکارەکان، وە زۆری ژمـارەو خۆئامـادە کردنیـان کـە بەو هۆیـەوە موڵکو دەسـەڵاتی بەهێـز بوو.

پاشـان باسـی منەتـی خـۆی دەکات بـە سـەریەوە بـە زانسـت، فەرموویەتـی: ﴿وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡحِكۡمَةَ﴾ پێغەمبەرایەتـیو زانسـتی مـەزن ﴿وَفَصۡلَ ٱلۡخِطَابِ﴾ واتـە: چارەسـەرکردنی کێشـەو گرفتـی خەڵکی.

(٢١-٢٦): ﴿وَهَلۡ أَتَىٰكَ نَبَؤُاْ ٱلۡخَصۡمِ إِذۡ تَسَوَّرُواْ ٱلۡمِحۡرَابَ ٢١ إِذۡ دَخَلُواْ عَلَىٰ دَاوُۥدَ فَفَزِعَ مِنۡهُمۡۖ قَالُواْ لَا تَخَفۡۖ خَصۡمَانِ بَغَىٰ بَعۡضُنَا عَلَىٰ بَعۡضٖ فَٱحۡكُم بَيۡنَنَا بِٱلۡحَقِّ وَلَا تُشۡطِطۡ وَٱهۡدِنَآ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلصِّرَٰطِ ٢٢ إِنَّ هَٰذَآ أَخِي لَهُۥ تِسۡعٞ وَتِسۡعُونَ نَعۡجَةٗ وَلِيَ نَعۡجَةٞ وَٰحِدَةٞ فَقَالَ أَكۡفِلۡنِيهَا وَعَزَّنِي فِي ٱلۡخِطَابِ ٢٣ قَالَ لَقَدۡ ظَلَمَكَ بِسُؤَالِ نَعۡجَتِكَ إِلَىٰ نِعَاجِهِۦۖ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلۡخُلَطَآءِ لَيَبۡغِي بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٍ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَقَلِيلٞ مَّا هُمۡۗ وَظَنَّ دَاوُۥدُ أَنَّمَا فَتَنَّٰهُ فَٱسۡتَغۡفَرَ رَبَّهُۥ وَخَرَّۤ رَاكِعٗاۤ وَأَنَابَ۩ ٢٤ فَغَفَرۡنَا لَهُۥ ذَٰلِكَۖ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلۡفَىٰ وَحُسۡنَ مَـَٔابٖ ٢٥ يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلۡنَٰكَ خَلِيفَةٗ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱحۡكُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِٱلۡحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلۡهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدُۢ بِمَا نَسُواْ يَوۡمَ ٱلۡحِسَابِ ٢٦﴾:

کاتـێ خـوا ﷻ باسـی ئەوەی کـرد کـە خیتابـی بڕینـەوەو یەکلاکردنـەوەی کێشـەکانی بەخشـی بـە داوود ﷺ لـە نێـو خەڵکیـدا، بـەو شـێوەیەش ناسـرابوو، ئنجـا باسـی هەواڵی ئـەو دوو داواچیـەی کـرد، کـە هاتنـە خزمەتـی دەربـارەی کێشـەیەک، خـوای گـەورە کردیانـی بـە مایـەی تاقیکردنەوە بـۆ داوود ﷺ، وە کردی بـە ئامۆژگاری بـە هۆی کەمو کـوڕیو ناتەواویەکـەوە ئەنجامـی دابـوو، ئنجـا خـوا ﷻ تەوبـەی لێوەرگـرتو لێی خۆش بـوو، وە ئـەو کێشەیشـی بۆ برانـدەوە، خوا بـە پێغەمبەری خـۆی موحەممـەد ﷺی فەرمووە: ﴿وَهَلۡ أَتَىٰكَ نَبَؤُاْ ٱلۡخَصۡمِ﴾ (ئایـا هەواڵـی داواچیەکانـت پـێ گەیشـتووە)، بێگومان ئەوە

هەواڵێکـی سەرسـوورِ هێنـەر بـوو ﴿ إِذۡ تَسَوَّرُواْ ﴾ (کاتێ سـەرکەوتن) بـۆ لای داوود ﷺ، ﴿ ٱلۡمِحۡرَابَ ﴾ شـوێنی عیبـادەت کردنـی بەبـێ هیـچ مۆڵـەتو ئاگـادار کردنەوەیـەک، وە لـە دەرگایـەوە نەچـوون بـۆ لای، لەبـەر ئەوەیـە کاتـێ چوونـە ژورەوە بـەو شـێوەیە، ئەویـش داچڵـەکاو ترسـا لێیان، پێیـان وت: ئێمـە ﴿ خَصۡمَانِ ﴾ (دوو داواچین) مەترسـە، ﴿ بَغَىٰ بَعۡضُنَا عَلَىٰ بَعۡضٍ ﴾ (واتـە: یەکێکمـان سـتەمی لەوی دیکـە کردوە) بە سـتەم کردن، ﴿ فَٱحۡكُم بَيۡنَنَا بِٱلۡحَقِّ ﴾ واتـە: (لـە نێوانماندا) بـە دادپـەروەری بڕیار بدە، با حـەزو مەیلت نەبـێ بـۆ لای یەکێکمـان ﴿ وَلَا تُشۡطِطۡ وَٱهۡدِنَآ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلصِّرَٰطِ ﴾ (واتـە: لە ڕاسـتی لامەدە لە بڕیارەکەتـدا، وە ڕێنماییـان بکـە بۆ ڕێگای ڕاسـت).

مەبەست لەمەدا دوو داواچیەکە بێگومان زانیان مەبەستیان حەقی ئاشکراو ڕوونە، جا ئەگەر بەو شێوەیە بێ بەسەرهاتەکەی خۆیان بەشێوەیەکی ڕاستەقینە بۆی باس دەکەن، پێغەمبەری خوا داوود ﷺ بێتاقەت نەبوو بەوەی ئامۆژگاریان کرد، وە سەرزەنشتی نەکردن.

یەکێکیـان وتـی: ﴿ إِنَّ هَٰذَآ أَخِي ﴾ (ئەمـە برامـە) باسـی برایەتـی کـردوە لە دینـدا یان لە ڕەچەڵـەک یـان لـە هاوڕێیەتـی، بەهـۆی نەبوونی سـتەم کـردن، چونکە سـتەمکردنی ئەو مەزنتـرە لـە سـتەمکردنی کەسـێکی دیکـە، ﴿ لَهُۥ تِسۡعٌ وَتِسۡعُونَ نَعۡجَةً ﴾ واتـە: (نـەوەدو نـۆ) مـەڕی هەیە، کـە ئەوەش خێرێکی زۆرە پێویسـتە قەناعـەت بکات بەوەی خـوا ﷻ پێیداوە، ﴿ وَلِيَ نَعۡجَةٌ وَٰحِدَةٌ ﴾ واتـە: (منیـش تەنهـا یەک مـەڕم هەیـە) تەماحی تێکـردوە، ﴿ فَقَالَ أَكۡفِلۡنِيهَا ﴾ واتـە:وازی لێبێنـە بۆمـن‌و بـە منـی بسـپێرە ﴿ وَعَزَّنِي فِي ٱلۡخِطَابِ ﴾ واتـە: لـە قسـەکردندا زاڵـە بەسـەرمدا، بـەردەوام وازم لێناهێنـێ، تـا لێـی وەرگرتم یـان خەریک بوو وەریدەگرت.

داوود ﷺ کاتـێ گوێـی لە قسـەکانیان بـوو فەرمووی:-ئـەوەی زانراوە لەمیانەی قسـەکانی پێشـوویاندا ئەمـە حەقیقـەت‌و ڕاسـتیە، لەبـەر ئەمـە پێویسـتی نەکرد کەسـی بەرانبەر قسـە بـکات، هیـچ ڕوویـەک نیە بـۆ ڕەخنەگرتنی قسـەی قسـەکەر: بۆچـی داوود ﷺ بڕیاریدا پێش ئـەوەی گوێ لـە داواچیەکەی تر بگـرێ ؟-: ﴿ لَقَدۡ ظَلَمَكَ بِسُؤَالِ نَعۡجَتِكَ إِلَىٰ نِعَاجِهِۦ ﴾ (واتـە: سـوێند بـە خوا سـتەمی لێکـردی کـە داوات لێـدەکات تاقـە مەڕەکـەت بخاتە ناو مەڕەکانـی خـۆی) ئەمەش پیشـەی زۆرێ لەوانەیە کـە ماڵەکەیـان تێکەڵی یەکتـر دەکەن.

جـا فەرمـووی: ﴿ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلۡخُلَطَآءِ لَيَبۡغِي بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٍ ﴾ (واتـە: بێگومـان زۆر لـە شـەریک‌و هاوبەشـان سـتەم لە یەکتـری دەکەن) چونکە سـتەم کـردن لە سـیفاتی نەفس‌و

دەروونەکانە، ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾ بە راستی ئەو ئیمانو کردەوە چاکەی هەیانە رێگریان دەکات لە ستەمکردن ﴿ وَقَلِيلٌ مَّا هُمْ ﴾ (ئەوانەش زۆر کەمن) هەروەک خوا ﷻ فەرمویەتی: ﴿ وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ ٱلشَّكُورُ ﴿١٣﴾ ﴾ سبأ، (واتە: زۆر کەمێ لە بەندەکانی من هەیە شوکرانە بژێرن)، ﴿ وَظَنَّ دَاوُۥدُ ﴾ (داوود زانی) کاتێ حوکمی لە نێوانیاندا کرد ﴿ أَنَّمَا فَتَنَّٰهُ ﴾ واتە:ئێمە تاقیمان کردۆتەوە، ئەم کێشەیەمان بۆ رێکخستووە بۆ ئەوەی بێدار ببێتەوە، ﴿ فَٱسْتَغْفَرَ رَبَّهُۥ ﴾ کاتێ کە ئەوەی لێدەرچوو ﴿ وَخَرَّ رَاكِعًا ﴾ واتە: سوژدەی برد ﴿ وَأَنَابَ ﴾ گەڕایەوە بۆ لای خوا بە تەوبەکردنێکی راستەقینەو بەندایەتی کردن، ﴿ فَغَفَرْنَا لَهُۥ ذَٰلِكَ ﴾ (ئێمەش لەو هەڵەی ئەو خۆش بووین) کە لێیەوە دەرچوو، وە خوا ﷻ رێزی لێگرت بە جۆرەها رێزگرتن، جا فەرموویەتی: ﴿ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلْفَىٰ ﴾ واتە: پلەو پایەی بەرزەو نزیکە لە ئێمەوە، ﴿ وَحُسْنَ مَـَٔابٍ ﴾ واتە: دوارۆژێکی چاکیشی هەیە.

وە ئەم تاوانەی داوود ﷺ کردوویەتی، خوا ﷻ باسینەکردوە لەبەر نەبوونی پێویستی باس نەکردنی، قسەکردن لەم بابەتەدا کە دەچێتە چوارچێوەی لەخۆبایبوونو رۆچوونەوە، بەڵکو سوودو قازانج ئەوەیە کە خوا ﷻ بۆی باسکردوین لە بەزەییو نەرمو نیانی بۆ پێغەمەرەکەی داوود ﷺ، کە تەوبەو گەڕانەوەی لێوەرگرتوەو پلەو پایەی بەرز کردۆتەوە، جا دوای تەوبەو داوای لێخۆشبوونەکەی حاڵی چاکتر بووە لە پێشتر، ﴿ يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَٰكَ خَلِيفَةً فِى ٱلْأَرْضِ ﴾ (واتە: ئەی داوود ﷺ ئێمە تۆمان کرد بە جێنشین لە زەویدا) کێشەی ئاینیو دنیایی چارەسەر بکەی، ﴿ فَٱحْكُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ ﴾ واتە: بە دادپەروەری، ئەمەش پێی ناگات تەنها بە زانستی پێویستو زانست بە واقیع نەبێ، وە توانـاو دەسەڵاتیش لەسەر جێبەجێکردنی حەق ﴿ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ ﴾ (واتە: شوێنی هەواو ئارەزوو مەکەوە) مەیلت هەبێ لەگەڵ کەسێکدا بە هۆی خزمایەتی یان هاورێیەتی یان خۆشەویستی، یان رقلێبوونەوە لە کەسی بەرانبەر﴿ فَيُضِلَّكَ ﴾ هەواو ئارەزوو ﴿ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾ وە دەرت بکات لە رێگای راست ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾ (واتە: بێگومان ئەوانەی لە رێگای خوا لادەدەنو گومرا دەکەن)، بە تایبەت ئەوانەی بە ئەنقەست دەیکەن ﴿ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا نَسُوا۟ يَوْمَ ٱلْحِسَابِ ﴾ ئەگەر یادی خوایان بکردایەو ترسی بکەوتایەتە ناو دڵەکانیانەوە، لایان نەدەداو مەیلی شوێنکەوتنی هەواو ئارەزووی خراپەکاریان نەدەکرد.

وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَٰطِلًاۚ ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ
كَفَرُواْۚ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿٢٧﴾ أَمْ نَجْعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ
ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَٱلْمُفْسِدِينَ فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ ٱلْمُتَّقِينَ كَٱلْفُجَّارِ
﴿٢٨﴾ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ
ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢٩﴾ وَوَهَبْنَا لِدَاوُۥدَ سُلَيْمَٰنَۚ نِعْمَ ٱلْعَبْدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ
﴿٣٠﴾ إِذْ عُرِضَ عَلَيْهِ بِٱلْعَشِىِّ ٱلصَّٰفِنَٰتُ ٱلْجِيَادُ ﴿٣١﴾ فَقَالَ إِنِّىٓ أَحْبَبْتُ
حُبَّ ٱلْخَيْرِ عَن ذِكْرِ رَبِّى حَتَّىٰ تَوَارَتْ بِٱلْحِجَابِ ﴿٣٢﴾ رُدُّوهَا عَلَىَّۖ
فَطَفِقَ مَسْحًۢا بِٱلسُّوقِ وَٱلْأَعْنَاقِ ﴿٣٣﴾ وَلَقَدْ فَتَنَّا سُلَيْمَٰنَ
وَأَلْقَيْنَا عَلَىٰ كُرْسِيِّهِۦ جَسَدًا ثُمَّ أَنَابَ ﴿٣٤﴾ قَالَ رَبِّ ٱغْفِرْ لِى وَهَبْ
لِى مُلْكًا لَّا يَنۢبَغِى لِأَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِىٓۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ ﴿٣٥﴾
فَسَخَّرْنَا لَهُ ٱلرِّيحَ تَجْرِى بِأَمْرِهِۦ رُخَآءً حَيْثُ أَصَابَ ﴿٣٦﴾ وَٱلشَّيَٰطِينَ
كُلَّ بَنَّآءٍ وَغَوَّاصٍ ﴿٣٧﴾ وَءَاخَرِينَ مُقَرَّنِينَ فِى ٱلْأَصْفَادِ ﴿٣٨﴾ هَٰذَا
عَطَآؤُنَا فَٱمْنُنْ أَوْ أَمْسِكْ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٩﴾ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلْفَىٰ وَحُسْنَ
مَـَٔابٍ ﴿٤٠﴾ وَٱذْكُرْ عَبْدَنَآ أَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّى مَسَّنِىَ ٱلشَّيْطَٰنُ
بِنُصْبٍ وَعَذَابٍ ﴿٤١﴾ ٱرْكُضْ بِرِجْلِكَۖ هَٰذَا مُغْتَسَلٌۢ بَارِدٌ وَشَرَابٌ ﴿٤٢﴾

**(٢٧-٢٩):** ﴿ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَٰطِلًاۚ ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿٢٧﴾ أَمْ نَجْعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَٱلْمُفْسِدِينَ فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ ٱلْمُتَّقِينَ كَٱلْفُجَّارِ ﴿٢٨﴾ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢٩﴾ ﴾:

﴿ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَٰطِلًا ﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدات دەربارەی تەواوی حیکمەتی لە دروست کردنی ئاسمانەکانو زەوی، کە بە بێهوودە دروستی نەکردوون، واتە: بە هاوەنتەو هەر لەخۆوە بە گاڵتەو گەپ بە بێ سوودو بەرژەوەندی، ﴿ ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾ (واتە: ئەوە گومانی ئەو کەسانەیە کە بێبڕوابوون) بە پەروەردگاریان، کاتێ پێیان وابووە ئەوە شایستە نیە بە گەورەیی خوا، ﴿ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنَ ٱلنَّارِ ﴾ (واتە: هاوار بۆ ئەوانەی کە بێبڕوابوون لە ئاگری دۆزەخ) بێگومان حەقیان لێوەردە گرێتەوە، وە تۆڵەیان لێدەکاتەوە بە ئەوپەڕی تۆڵەکردنەوە.

بە ڕاستی خوا ئاسمانەکانو زەوی بە حەقو بۆ حەق دروست کردوە، دروستی کردوون بۆ ئەوەی بەندەکان بزانن بە تەواوی زانستو توانـاو بەرفراوانی دەسەڵاتی، وە خوا ﷻ بە تەنها پەرستراوە، جگە لە ئەو کەسێک نیە بە قەد گەردیلەیەکی دروست کردبێ لە ئاسمانەکانو زەوی، بێگومان زیندوو بوونەوە حەقە، لە داهاتوودا خوا نێوانی چاکو خراپ لە یەکتر جیا دەکاتەوە.

با کەسی نەفام گومان نەبات بە حیکمەتی خوا کە وەک یەکتر تەماشایان دەکات لە بڕیاریدا، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ أَمْ نَجْعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَٱلْمُفْسِدِينَ فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ ٱلْمُتَّقِينَ كَٱلْفُجَّارِ ﴾ (واتە: ئایا ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوەی چاکەکانیان کردوە لەگەڵ خراپەکاراندا لە زەویدا وەک یەک دادەنرێن،

یـان خۆپارێـزان وەک بەد کـرداران لێدەکەین) ئەمە شـیاوی حیکمەتو بڕیـاری ئێمە نیە.

﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ ﴾ (واتـە: ئـەم قورئانـە کتێبێکی پیـرۆزە ناردوومانەتە خوارەوە بـۆ تـۆ)، خێرێکـی زۆرو زانسـتێکی بـێ ئەنـدازەی تێدایـە، هەمـوو هیدایەتێکـی تێدایە لە گومڕایـیو شـیفاو چارەسـەر لـە هـەر نەخۆشـیەک، وە هەمـوو ڕووناکیەک لـە تاریکیدا ڕۆشـنایی لێوەردەگیـرێ، وە هەمـوو بڕیارێک ئەرک پێسـپێردراوان پێویسـتیان پێی هەیێ، بەڵگـەی یەکلاکـەرەوەی تێدایـە بـۆ هەمـوو داواکاریەک، ئا ئـەوە گەورەتریـن کتێبە کە لەنـاو هەمـوو جیهـان لەوکاتە خـوا بەدیهێناوە.

﴿ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ ﴾ واتـە: حیکمـەت لـە دابەزینـی، بـۆ ئەوەیە خەڵکـی بیر لـە ئایەتەکانی بکاتـەوە، زانسـتی تێـدا دەربهێننو سـەرنجی نهێنـیو بڕیارەکانی بـدەن، بێگومـان بە قووڵ بوونـەوەو بیـر کردنەوە تیایداو سـەرنجدان لە ماناکانـیو دووبارە بیرکردنـەوە جار لە دوای جـار، هەسـت بـە فـەڕو بەرەکەتو خێـری دەکـرێ، ئەمـە بەڵگەیە لەسـەر هاندان لەسـەر بیرکردنـەوەو تێڕامانـی قورئـان، بێگومـان ئـەوە چاکترینـی کردەوەکانـە، بیـر کردنەوەو تێڕامـان لـەم قورئانـە، چاکتـر لـە پەلەکـردن لـە خوێندنەوەیدا چونکـە بە پەلە کـردن ئەم مەبەسـتە بەدەسـت نایەت. ﴿ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾ واتە: خاوەن عەقڵە سـاغەکان، بیری لێدەکەنـەوە بـە تێڕامـانو قـووڵ بوونەوەیـان هەموو زانسـتێکی ویسـتراو بەدەسـت دێنن، ئەمـە بەڵگەیـە لەسـەر ئەوەی بـە پێـی دڵو عەقڵی مـرۆڤ بیرکردنـەوەو سـوود وەرگرتن لـەم کتێبە بەدەسـت دێت.

(٣٠-٤٠): ﴿ وَوَهَبْنَا لِدَاوُۥدَ سُلَيْمَٰنَ ۚ نِعْمَ ٱلْعَبْدُ ۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿٣٠﴾ إِذْ عُرِضَ عَلَيْهِ بِٱلْعَشِيِّ
ٱلصَّٰفِنَٰتُ ٱلْجِيَادُ ﴿٣١﴾ فَقَالَ إِنِّىٓ أَحْبَبْتُ حُبَّ ٱلْخَيْرِ عَن ذِكْرِ رَبِّى حَتَّىٰ تَوَارَتْ بِٱلْحِجَابِ ﴿٣٢﴾
رُدُّوهَا عَلَىَّ ۖ فَطَفِقَ مَسْحًۢا بِٱلسُّوقِ وَٱلْأَعْنَاقِ ﴿٣٣﴾ وَلَقَدْ فَتَنَّا سُلَيْمَٰنَ وَأَلْقَيْنَا عَلَىٰ كُرْسِيِّهِۦ جَسَدًا
ثُمَّ أَنَابَ ﴿٣٤﴾ قَالَ رَبِّ ٱغْفِرْ لِى وَهَبْ لِى مُلْكًا لَّا يَنۢبَغِى لِأَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِىٓ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ ﴿٣٥﴾ فَسَخَّرْنَا
لَهُ ٱلرِّيحَ تَجْرِى بِأَمْرِهِۦ رُخَآءً حَيْثُ أَصَابَ ﴿٣٦﴾ وَٱلشَّيَٰطِينَ كُلَّ بَنَّآءٍ وَغَوَّاصٍ ﴿٣٧﴾ وَءَاخَرِينَ مُقَرَّنِينَ فِى
ٱلْأَصْفَادِ ﴿٣٨﴾ هَٰذَا عَطَآؤُنَا فَٱمْنُنْ أَوْ أَمْسِكْ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٩﴾ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلْفَىٰ وَحُسْنَ مَـَٔابٍ ﴿٤٠﴾ ﴾

کاتـێ خـوا ﷻ ستایشـی داوودی کـرد عليه السلام، وە باسـی ئـەوەی کـرد کـە بۆ ئەو بـووەو لە ئـەوەوە بـووە، ئنجا ستایشـی سـولەیمانی کوڕی کـرد، جـا فەرموویەتی: ﴿ وَوَهَبْنَا لِدَاوُۥدَ سُلَيْمَٰنَ ﴾ واتـە: بەهـۆی سـولەیمانەوە نـازو نیعمەتـی خۆمـان بەخشـی بـە داوود عليه السلام، وە کردمـان بـە مایەی ئۆقـرە گرتنـی چاوەکانی.

﴿ نِعۡمَ ٱلۡعَبۡدُ ﴾ سولەیمان ﷺ (بەندەیەکی چاک بوو) شایستەی ستایش کردن بوو، ﴿ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴾ واتە: گەڕاوە بوو بۆ لای خوا لە هەموو کاروبارەکانیدا، بە گوێڕایەڵیو ملکەچی خۆشەویستیو یادکردنەوەو زۆر پاڕانەوەو گەردنکەچی، وە کۆشش کردن بۆ ڕەزامەندی خواو پێشخستنی بەسەر هەموو شتێکەوە.

ئا لەبەر ئەمە، کاتێ ئەسپە ڕەسەنەکان نیشانی سولەیمان درا، کە لە وەسفەکانیان لە کاتی وەستانیاندا یەکێک لە قاچەکانیان بەرز دەکردەوە، دیمەنێکی زۆر جوانو سەرنج ڕاکێشو سەرسوڕهێنەری دەبەخشی، بە تایبەت بۆ ئەو کەسەی پێویستی پێیەتی وەک پاشاکان، بەردەوام نیشانی دەدراو دەخرایە ڕوو، هەتا لە چاو گوم بوون، سەرقاڵی کرد لە نوێژی ئێوارەو یادکردنی.

سولەیمان ﷺ پەشیمان بوویەوە لەوەی ڕوویدا، وە نزیکبوونەوە لە خوای گەورە بەوەی سەرقاڵی کرد لە یادکرنەوەی، وە پێشخستنی خۆشەویستی خوا بەسەر خۆشەویستی جگە لەو، جا فەرمووی: ﴿ إِنِّيٓ أَحۡبَبۡتُ حُبَّ ٱلۡخَيۡرِ ﴾ واتە: حەزی خۆشەویستیم بەوادا کە بریتیە لەماڵو سامان بە گشتی، وە لەم شوێنەدا مەبەست پێی ئەسپەکانە، ﴿ عَن ذِكۡرِ رَبِّي حَتَّىٰ تَوَارَتۡ بِٱلۡحِجَابِ ﴾ (واتە: بەسەر یادو عیبادەتی پەروەردگارمدا کە سەیری ئەسپەکانم دەکرد هەتا لە چاو ونبوون). ﴿ رُدُّوهَا عَلَيَّۖ ﴿٣٣﴾ ﴾ص، (واتە: جارێکی تر ئەو ئەسپانەم بۆ بگێڕنەوە) ئەوانیش گەڕاندیانەوە ﴿ فَطَفِقَ ﴾ دەستی هێنا پیایدا ﴿ مَسۡحَۢا بِٱلسُّوقِ وَٱلۡأَعۡنَاقِ ﴾ واتە: شمشێرەکەی هێنا بە دەستو قاچو گەردنی ئەسپەکاندا، ﴿ وَلَقَدۡ فَتَنَّا سُلَيۡمَٰنَ ﴾ واتە: سولەیمانمان تاقیکردەوە بە نەهێشتنی موڵکو دەسەڵاتەکەیو جیابوونەوەی لێی، بە هۆی نارێکیەکەوە کە سروشتی مرۆڤ دەیخوازێ، ﴿ وَأَلۡقَيۡنَا عَلَىٰ كُرۡسِيِّهِۦ جَسَدًا ﴾ واتە: (لاشەیەکمان هاوێشتە سەر کورسیەکەی) شەیتانێک بوو، خوا ﷻ بڕیاری دابوو لەسەر کورسی دەسەڵاتەکەی دابنیشێ، هەڵسو کەوت بە موڵکو دەسەڵاتەکەی بکات لەو ماوەیەی سولەیمان ﷺ تووشی فیتنە بوو، ﴿ ثُمَّ أَنَابَ ﴾ پاشان سولەیمان ﷺ گەڕایەوە بۆ لای خواو داوای لێ خۆشبوونی کرد.

جا ﴿ قَالَ رَبِّ ٱغۡفِرۡ لِي وَهَبۡ لِي مُلۡكٗا لَّا يَنۢبَغِي لِأَحَدٖ مِّنۢ بَعۡدِيٓۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡوَهَّابُ ﴾ (واتە: سولەیمان ﷺ وتی: ئەی پەروەردگارم لێم خۆشبەو دەسەڵاتو پادشایەتیم پێ ببەخشە کە دوای من دەست نەدا بۆ کەسیتر، بێگومان تەنها تۆی بەخشندەی هەموو شتێک) خوا ﷻ داواکەی لێی وەرگرتو لێی خۆش بوو، موڵکو دەسەڵاتی بۆ گەڕاندەوە،

موڵـکو دەسـەڵاتێکی پێیـدا بـە هیـچ کـەس نەیدابـوو لـە دوای ئـەو، ئەویـش ڕامهێنانی شـەیتانەکان بـوو، چـی بـوێ لە ماڵ بۆی دروسـت دەکـەن، وە بچنـە ناو قوڵایـی دەریاوە، درو گەهـەرو مەرجانـی بـۆ بێنـن، هەرکەسـێ لـەوان سـەرپێچی بکردایـە کـۆتو بەندی دەکـردو دەیبەسـتەوە، پێمـان وت: ﴿ هَٰذَا عَطَآؤُنَا ﴾ چاوی پێی ئوقـرەی گرت ﴿ فَٱمۡنُنۡ ﴾ بەسـەر هەرکێدا دەتەوێ ﴿ أَوۡ أَمۡسِكۡ ﴾ (یان بیگرەوە) بۆ هەر کەسـێ ویسـتت لەسـەریەتی ﴿ بِغَيۡرِ حِسَابٖ ﴾ هیـچ تـاوانو لێپرسـینەوەت نیە لـەوەدا، چونکـە خوا دەیزانی بـە تەواوی دادپـەروەری سـولەیمانو چاکـی بڕیارەکانی.

وا مەزانـە ئەمـەی بـۆ سـولەیمانە تەنهـا لـە دونیادایـە بێجگـە لـە دوارۆژ، بەڵکو لـە دونیادا چاکەیەکـی زۆر مەزنـی بـۆ هەیـە، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلۡفَىٰ وَحُسۡنَ مَـَٔابٖ ﴾ واتـە: لـە نزیکراوانـە لـە لای خـوا، لـە ڕێزگیراوانە بـە جۆرەها ڕێزگرتـن لە لای خوا.

## بەشێك

ئـەوەی ڕوون بووەتـەوە بـۆ ئێمـە لە سـوودو وەدەسـتهاتوو حیکمەتـەکان، لـە چیرۆکـو سەرگوزەشـتەی داوودو سـولەیمان (علیهمـا السـلام):

یەکـەم: خـوا ﷻ بـۆ پێغەمبەرەکەی موحەممـەد ﷺ هەواڵی پێشـین دەگێڕێتـەوە، بۆ ئەوەی دڵـی دابمەزرێنـێو دەروونـی دڵنیابـێ، وە بیخاتـەوە یـادی لـە بەندایەتـیو ئارامگرتـنو گەڕانـەوەی ئـەوان، تـا تامـەزرۆ بێت بۆ کێبڕکـێ کردنیـانو نزیک بوونەوە بـۆ لای خوا، کـە ئـەوان پێی نزیـک بوونـەوە، وە ئارامگرتن لەسـەر ئـازار درانـی لە لایـەن گەلەکەی، لەبـەر ئەمـە کاتێ خـوا ﷻ باسـیکردوە لە ئازاردانـی گەلەکـەیو قسـەکردنیان دەربارەیو ئـەو پەیامـەی هێناویەتی، فەرمانـی پێکردوە ئارام بگـرێ، وە داوود ﷺی بخاتـەوە یاد، بۆ ئەوەی پێـی دڵنیـا ببێتەوە.

دووەم: خـوا ﷻ سـتایش دەکاتو ئـەو کەسـەی خۆشـدەوێ کـە هێـزو توانـای هەبـێ لە گوێڕایەڵـی کردنیـدا، هێـزی دڵو جەسـتە، بێگومـان بە دەسـتی دێنـێ لە شـوێنەوارەکانی گوێڕایەڵـیو چاکیـانو زۆریـان، کـە بە هیچ شـێوەیەک لەگـەڵ لاوازیدا ئەوانە بە دەسـت نایـەن، بۆیە پێویسـتە لەسـەر بەندە هۆکارەکان بەدەسـت بێنـێ، وە پەنا نەباتە بـەر تەنبەڵیو دەسـت بەتاڵـی کـە هۆکارن بـۆ نەمانی هێـزو لاوازی نەفـسو دەروون.

سێیەم: گەڕانــەوە بۆ لای خــوا لە هەمــوو کاروبارەکاندا، لــە وەســفەکانی پێغەمبەرانی خواو دروســتکراوە تایبەتەکانێتــی، وەک چــۆن خــوا ستایشــی داوودو ســولەیمانی کــردوە بــەو گەڕانــەوە، دەی بــا پەیــڕەوکاران پەیــڕەوی ئــەوان بکــەن، وە ڕێنمایی وەرگــران ڕێنمایی لەوانەوە وەربگــرن، ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡۗ ٩٠ ﴾الأنعام (واتە: ئا ئەوانــەن کــە خوا هیدایەتــی داون جــا پەیــڕەوی هیدایەتی ئــەوان بکەن).

چــوارەم: ئــەوەی خــوا ڕێزی لێنــاوە بــە پێغەمبەرەکــەی داوود ﷺ لە دەنگخۆشــی، کە خوا بــە هۆیــەوە دایناب‌ــوو ئــەو کێوانەی کــەڕن‌و ئــەو باڵندانــەی لاڵن وەڵامــی بدەنــەوە، ئەگەر یــادی خــوای بکردایــە بە تەســبیح کــردن، ئەوانیش لەگــەڵ ئەودا یــادی خوایــان دەکرد لە ئێواران‌و دەمــەو بەیانیان.

گرنگــی دانی خــوای گەورە بــە پێغەمبەرانی کاتــێ هەندێ کــەم‌و کــوڕی‌و ناتەواویان لێوە دەردەچــێ، بــە تاقیکردنەوەیــان کە بــەو جۆرە مەترســیان لەســەر لادەبــات، وە دەگەڕێنەوە بــۆ حاڵەتێــک چاکتر لە حاڵەتــی پێشــوویان، هەروەکو چۆن لــە داوودو ســولەیمان ڕوویدا (علیهما الســلام).

پێنجــەم: بێگومــان پێغەمبەران (ســڵاوی خوایان لەســەر بێت) مەعصوم‌و پارێــزراون لە هەڵە، لــەوەی بــڵاوی دەکەنەوە دەربــارەی خوای گــەورە، چونکە مەبەســتی پەیامی خــوا تەنها بە پارێــزراوی دەســتەبەر دەبێ، بێگومــان هەندێجار هەندێ هەڵــە لە پێغەمبەرانــەوە ڕوودەدات، کــە سروشــتی مــرۆڤ وا دەخــوازێ، بــەڵام خــوا ﷻ فریایــان‌دەکــەوێ‌و دەستپێشــخەری دەکات بــە لێبوردنیان.

شەشــەم: داوود ﷺ زۆربــەی کاتەکانــی پەیوەســت بــوو بــە پەرســتگاکەیەوە بــە خزمەت کردنی پەروەردگاری، لەبەر ئەمە دوو داواچیەکە بەســەر دیواری پەرســتگاکەدا ســەرکەوتن، چونکــە ئەگــەر پەرســتگاکەی چــۆڵ بکردایە، کــەس نەدەهات بــۆ لای، هەمــوو کاتەکەی دانەنــا بــۆ خەڵکــی، لەگــەڵ زۆری هاتنی کێشــەو گرفتــەکان بــۆ لای، بەڵکــو کاتێکی دانا بەتــاڵ بێــت بەتــاک‌و تەنهایی خــوای تێدا بپەرســتێ، چــاوو دڵی گــەش بێت بە پەرســتش کردنــی، وە یارمەتی بدات لەســەر دڵســۆزی لــە هەمــوو کاروبارەکاندا.

حەوتــەم: پێویســتە ئــەدەب‌و ڕەوشــت بــەکار بهێنــرێ لــە چوونــە ژوورەوە بــۆ لای دەســەڵاتداران جگــە لەوانیــش، چونکــە دوو داواچیەکــە کاتــێ چوونــە ژوورەوە بــۆ لای داوود ﷺ لــە حاڵەتێکــی ئاســاییدا نەبوو، وە لە دەرگای ئاســاییەوە نەڕۆشــتنە ژورەوە، لێیان

ترساو نارەحەت بوو بەسەریەوە، پێی وابوو ئەوە شیاو نیە بەو حاڵە.
هەشتەم: خراپی مامەڵەو بێ ڕەوشتی نابێتە ڕێگر لەبەردەم دادوەردا بۆ ئەوەی بڕیار بەحەق‌و ڕاستی نەدات.
نۆیەم: تەواوی نەرم‌و نیانی داوود ، لێیان تووڕە نەبوو کاتی هاتنە ژوورەوە بە بێ مۆڵەت، لە کاتێکدا ئەو پاشا بوو، نە بێزاری کردن‌و نە سەرزەنشت.
دەیەم: دروستە قسەی ستەم لێکراو لەوەی ستەمی لێدەکات بڵێت: تۆ ستەمت لێکردم، یان: ئەی ستەمکار، وێنەی ئەوانەش، چونکە ئەوان وتیان: ﴿ خَصۡمَانِ بَغَىٰ بَعۡضُنَا عَلَىٰ بَعۡضٖ ﴾ (واتە: دوو داواچین یەکێکمان ستەمی لەوی تر کردوە).
یازدەم: ئامۆژگاریکەر ئەگەر پلەو پایەی بەرز بێت‌و زانستی زۆر بێت، ئەگەر کەسێ ئامۆژگاری کرد، تووڕەو بێتاقەت نابێت، بەڵکو پەلە دەکات لە وەرگرتن‌و ستایش کردن، بێگومان دوو داواچیەکە ئامۆژگاری داوودیان کرد بێزار نەبوو، تووڕەش نەبوو، واشی لێنەکرد لە حەق لابدات، بەڵکو بریاری دا بە حەقی پەتی.
دوازدەم: بێگومان تێکەڵاوی لە نێوان خزمان دۆستاندا، وە زۆر پەیوەستبوون بە ماڵ‌و سامانەوە دەبێتە هۆی ناکۆکی نێوانیان‌و ستەم کردنی هەندێکیان لەسەر هەندێکی دیکەیان، هیچ شتێک ئەوە ڕەتناکاتەوە تەنها لە خوا ترسان‌و خۆڕاگرتن لەسەر کاروبارەکان نەبێ، بە ئیمان‌و کردەوەی چاک، ئەمە کەمترین شتە لە لای خەڵکی.
سێزدەم: بەڕاستی داوای لێخۆشبوون‌و بەندایەتی کردن بە تایبەت نوێژ، دەبێتە مایەی کەفارەتی گوناهەکان، بێگومان خوا لە داوود خۆش بوو بە هۆی داوای لێخۆشبوون‌و سوژدە بردنی.
چواردەم: ڕێزگرتنی خوا بۆ بەندەکەی داوود بە نزیک بوونەوەی لێی‌و چاکی پاداشت، بۆ ئەوەی کەسێ گومان نەبات ئەوەی ڕوویدا لێیانەوە، پلەو پایەیان کەمدەکاتەوە لە لای خوا، ئەمە لە تەواوی میهرەبانیەتی خوایە بۆ بەندە دڵسۆزەکانی، بە ڕاستی ئەگەر لێیان خۆش ببێت شوێنەواری گوناهەکانیان ناهێڵێت، هەموو ئەو شتانەی لەسەر ئەو شوێنەوارە دروست دەبێ لایدەبات، هەتا لە دڵی خەڵکیدا نامێنی، چونکە خەڵکی ئەگەر بزانن بە هەندێ لە گوناهەکانیان، لە دڵیاندا شتێک دروست دەبێت پلەیان دادەبەزێ لە پلەو پایەی پێشوویان، خوای گەورە ئەو شوێنەوارانەی لابردوە، ئەوە شتێکی گەورە نیە لە لای بەخشندەی لێبوردە.

پازدەم: بڕیاردانو دادوەری لە نێوان خەڵکیدا پلەیەکی ئاینیە، پێغەمبەرانی خواو پاشان بەندە تایبەتمەندەکانی دەیبەن بەڕێوە، بێگومان پیشەی ئەو کەسەی پێی هەڵدەستێ، بڕیاردانە بە حەقو دورکەوتنەوەیە لە هەواو ئارەزوو، دادوەریو بڕیاردان بە حەق پێویستی بە زانستو شارەزایی هەیە لە کاروبارە شەرعیەکان، وە زانست بە وێنەی ڕووداوەکە کە بڕیاری لەسەر دەدرێ، وە چۆنیەتی خستنە ناو بڕیاری شەرعی، جا کەسێک نەفامو ناشارەزا بێت بە یەکێک لەو دوو کارە ناگونجی بۆ بڕیاردان، وە نابێ دەستپێشخەری بۆ بکات.

شازدەم: پێویستە دادوەر ئاگاداری هەواو ئارەزووی بێت، وە بیرو هۆشی لە لای بێت، چونکە نەفسو دەروونەکان خاڵی نابن لێی، بەڵکو کۆششی نەفسی دەکات بەوەی حەقو ڕاستی مەبەستی بێت، وە لە کاتی بڕیارداندا هەموو خۆشەویستی ڕقو کینەیەک لە نێوان ئەو دوو دژەدا وەلا بنێت.

حەڤدەم: بەڕاستی سولەیمان ﷺ لە چاکەکانی داوودە ﷺ، وە لە منەتەکانی خوایە بەسەریەوە، کاتێ خوا پێی بەخشی، لە گەورەترینی نیعمەتەکانی خوا بۆ سەر بەندەکەی، ئەوەیە منداڵێکی چاکی پێ ببەخشێ، جا ئەگەر زانا بوو، ئەوە ڕووناکیە لەسەر ڕووناکی.

هەژدەم: ستایشکردنی خوا ﷻ لەسەر سولەیمانو وەسفکردنی، لەوەی کە فەرموویەتی: ﴿ نِعۡمَ ٱلۡعَبۡدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴾.

نۆزدەم: زۆری خێرو چاکەکانی خوا بە بەندەکانی، ئەوەیە منەت دەکات بەسەریاندا بە کردەوە چاکەکانو ڕەوشتە بەرزەکان، پاشان ستایشیان دەکات پێی ئەو زاتە خاوەن فەزڵو چاکەو بەخشینە.

بیستەم: سولەیمان ﷺ خۆشویستنی خوای پێشخست بەسەر هەموو شتێکدا.

بیستو یەک: هەر شتێ بەندە سەرقاڵ بکات لە بەندایەتی کردنی خوا ئەوە شومو سەرزەنشت کراوە، با لێی جیاببێتەوەو ڕوو بکاتە ئەوەی سوودو کەڵکی هەیە بۆی.

بیستو دوو: یاسای بەناوبانگ: هەر کەسێک واز لە شتێ بهێنێ لەبەر خوا، ئەوە خوا ﷻ لەوە چاکتری پێ دەبەخشێ.

سولەیمان ﷺ دای لە ملی ئەسپە چاکەکان کە خۆشەویست بوون لە دڵدا، خۆشویستنی خوای پێشخست بەسەریاندا، خوا ﷻ لە بری ئەوەدا شتێکی چاکتری پێ بەخشی، بەوەی

بـای بـۆ ژێـر بارخسـتو ڕامهێنـا، کە بـە فەرمانی ئەو دەڕۆیشـت بۆ هەر شـوێنێ ویسـتی لەسـەر بووایە، سـەر لەبەیانـی تا نیوەڕۆ مانگـێ ڕێگای دەبـڕی، وە نیوەڕۆ بۆ ئێـوارە مانگێ ڕێگـای دەبـڕی، وە شـەیتانەکانی بۆ ڕامهێنـا، ئەوانەی خاوەن توانا و دەسـەڵاتن بەسـەر ئەو کارو کردەوانـەی کـە مرۆڤەکان توانایان بەسـەریدا نیە.

بیستو سێ: بێگومان ڕامهێنانی شەیتانەکان بۆ هیچ کەسێک نیە دوای سولەیمان ﷺ.

بیسـتو چـوار: سـولەیمان ﷺ دەسـەڵاتدارێکی پێغەمبەر بوو، هەر شـتێ ویسـتی لەسـەر بوایـە دەیکـرد، بـەڵام هیچی نەدەویسـت جگـە لـە دادپـەروەری نەبووبێ، بـە پێچەوانەی پێغەمبـەری خـوا، چونکە ئەو ویسـتو ئیرادەی شـوێنی فەرمانی خوا کەوتووە، شـتێ ناکاو واز لـە شـتێ ناهێنـێ بـە فەرمانی خـوا نەبـێ، وەک حاڵـی پێغەمبەرمان موحەممـەد ﷺ ئەم حاڵـە تەواوترە.

(٤١-٤٤): ﴿ وَٱذۡكُرۡ عَبۡدَنَآ أَيُّوبَ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلشَّيۡطَٰنُ بِنُصۡبٖ وَعَذَابٍ ﴿٤١﴾ ٱرۡكُضۡ بِرِجۡلِكَۖ هَٰذَا مُغۡتَسَلُۢ بَارِدٞ وَشَرَابٞ ﴿٤٢﴾ وَوَهَبۡنَا لَهُۥٓ أَهۡلَهُۥ وَمِثۡلَهُم مَّعَهُمۡ رَحۡمَةٗ مِّنَّا وَذِكۡرَىٰ لِأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿٤٣﴾ وَخُذۡ بِيَدِكَ ضِغۡثٗا فَٱضۡرِب بِّهِۦ وَلَا تَحۡنَثۡۗ إِنَّا وَجَدۡنَٰهُ صَابِرٗاۚ نِّعۡمَ ٱلۡعَبۡدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٞ ﴿٤٤﴾ ﴾.

﴿ وَٱذۡكُرۡ ﴾ واتـە: لـە کتێبی خـاوەن باسـدا ﴿ عَبۡدَنَآ أَيُّوبَ ﴾ بـە چاکترین باسـکردن، وە ستایشـی بکـە بە جوانترین سـتایش کردن، کاتێ تووشـی نەخۆشـیو نارەحەتی بـوو ئارامی گـرت لەسـەری، سـکاڵای نەبـردە لای هیچ کەسـێک جگـە لـە پەروەردگـاری، وە پەنای نەبـرد تەنهـا بۆ لای ئـەو نەبێ.

﴿ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ ﴾ (هـاواری لـە پەروەردگـاری کرد) تەنهـا داوای لەو کرد، سـکاڵای نەبردە لای کەسـێکی دیکە وتی: ئـەی پەروەردگـارم: ﴿ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلشَّيۡطَٰنُ بِنُصۡبٖ وَعَذَابٍ ﴾ واتە: بەڕاسـتی مـن شـەیتان تووشـی زەحمـەتو نارەحەتـیو ئـازاری کـردووم، زاڵـی کردبوو بەسـەر جەسـتەیدا، فـووی دەکرد بە جەسـتەیدا هەتا کێـمو جەراعەتی دەرئەکرد، پاشـان لە گیانیـدا هاتـە خوارەوە تـا کارەکەی لەسـەر نارەحەت بوو، وە بەهەمان شـێوە مـاڵو منداڵی تیاچـوو. پێـی وتـرا: ﴿ ٱرۡكُضۡ بِرِجۡلِكَ ﴾ واتـە: پێت بدە بـە زەویدا، بـۆ ئـەوەی کانیاوێکی سـارد بێتـە دەرەوە خۆتـی پـێ بشـۆری لێـی بخۆیتـەوە، پاشـان نەخۆشـیو نارەحەتیـت لەسـەر لابچـێ، ئەویـش ئـەوەی کـرد بۆیە ئـازارو ناخۆشـیەکەی نەمـاو خوا ﷻ شـیفایدا،

وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ أَهْلَهُۥ وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ رَحْمَةً مِّنَّا وَذِكْرَىٰ لِأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ
﴿٤٣﴾ وَخُذْ بِيَدِكَ ضِغْثًا فَٱضْرِب بِّهِۦ وَلَا تَحْنَثْ ۗ إِنَّا وَجَدْنَٰهُ صَابِرًا ۚ نِّعْمَ
ٱلْعَبْدُ ۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿٤٤﴾ وَٱذْكُرْ عِبَٰدَنَآ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ أُو۟لِى
ٱلْأَيْدِى وَٱلْأَبْصَٰرِ ﴿٤٥﴾ إِنَّآ أَخْلَصْنَٰهُم بِخَالِصَةٍ ذِكْرَى ٱلدَّارِ ﴿٤٦﴾
وَإِنَّهُمْ عِندَنَا لَمِنَ ٱلْمُصْطَفَيْنَ ٱلْأَخْيَارِ ﴿٤٧﴾ وَٱذْكُرْ إِسْمَٰعِيلَ
وَٱلْيَسَعَ وَذَا ٱلْكِفْلِ ۖ وَكُلٌّ مِّنَ ٱلْأَخْيَارِ ﴿٤٨﴾ هَٰذَا ذِكْرٌ ۚ وَإِنَّ لِلْمُتَّقِينَ
لَحُسْنَ مَـَٔابٍ ﴿٤٩﴾ جَنَّٰتِ عَدْنٍ مُّفَتَّحَةً لَّهُمُ ٱلْأَبْوَٰبُ ﴿٥٠﴾ مُتَّكِـِٔينَ
فِيهَا يَدْعُونَ فِيهَا بِفَٰكِهَةٍ كَثِيرَةٍ وَشَرَابٍ ﴿٥١﴾ ۞ وَعِندَهُمْ قَٰصِرَٰتُ
ٱلطَّرْفِ أَتْرَابٌ ﴿٥٢﴾ هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِيَوْمِ ٱلْحِسَابِ ﴿٥٣﴾ إِنَّ هَٰذَا
لَرِزْقُنَا مَا لَهُۥ مِن نَّفَادٍ ﴿٥٤﴾ هَٰذَا ۚ وَإِنَّ لِلطَّٰغِينَ لَشَرَّ مَـَٔابٍ
﴿٥٥﴾ جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿٥٦﴾ هَٰذَا فَلْيَذُوقُوهُ حَمِيمٌ
وَغَسَّاقٌ ﴿٥٧﴾ وَءَاخَرُ مِن شَكْلِهِۦٓ أَزْوَٰجٌ ﴿٥٨﴾ هَٰذَا فَوْجٌ
مُّقْتَحِمٌ مَّعَكُمْ ۖ لَا مَرْحَبًۢا بِهِمْ ۚ إِنَّهُمْ صَالُوا۟ ٱلنَّارِ ﴿٥٩﴾ قَالُوا۟
بَلْ أَنتُمْ لَا مَرْحَبًۢا بِكُمْ ۖ أَنتُمْ قَدَّمْتُمُوهُ لَنَا ۖ فَبِئْسَ ٱلْقَرَارُ ﴿٦٠﴾
قَالُوا۟ رَبَّنَا مَن قَدَّمَ لَنَا هَٰذَا فَزِدْهُ عَذَابًا ضِعْفًا فِى ٱلنَّارِ ﴿٦١﴾

﴿ وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ أَهْلَهُۥ ﴾ واتــە: (وە ژن‌و منداڵەکانیمــان پــێ بەخشــیەوە)، وتــراوە: خــوای گــەورە زینــدووی کردوونەتــەوە بــۆی ﴿ وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ ﴾ (ئەوەنــدەی تریشــمان لەگەڵـی دابــە ئــەو) لــە دونیــا، خــوا دەوڵەمەنــدی کــردو ماڵێکــی زۆرو زەبەنــدی پــێ بەخشــی، ﴿ رَحْمَةً مِّنَّا ﴾ (بــە میهرەبانیــەک لەلایــەن ئێمــەوە) بــە بەندەمــان ئەیــوب ﷺ، کاتــێ ئارامــی گــرت ئێمــەش چەســپاومان کــرد بــە ڕەحمەتــی خۆمــان، وە پاداشــتمان دایــەوە لــە ئێســتاو لــە داهاتــوودا.
﴿ وَذِكْرَىٰ لِأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾ واتــە: بــۆ ئــەوەی ئەوانــەی خــاوەن عەقڵــن پەنــدو ئامۆژگــاری وەربگــرن لــە حاڵــی ئەیــوب ﷺ، وە بــۆ ئــەوەی بزانــن هەرکەســێ ئــارام بگــرێ لەســەر ناخۆشــی‌و ناڕەحەتــی، بێگومــان خــوای گــەورە پاداشــتی دەداتــەوە بــە پاداشــتێ لــە ئێســتاو لــە داهاتــوودا، وەڵامــی پاڕانەوەکانــی دەداتــەوە ئەگــەر داوای لــێ بــکات ﴿ وَخُذْ بِيَدِكَ ضِغْثًا ﴾ چەپکــی شــووڵ ﴿ فَٱضْرِب بِّهِۦ وَلَا تَحْنَثْ ﴾ (واتــە: پێــی بــدە لــە خێزانەکــەت یەکجــارو ســوێندەکەت مەشــکێنە) ڕاڤەزانانــی قورئــان وتوویانــە ئەیــوب ﷺ لــە نەخۆشــی‌و ناڕەحەتیەکەیــدا تــووڕە بــوو لــە خێزانەکــەی لــە هەنــدێ لــە کاروبارەکانــدا، جــا ســوێندی خــوارد: ئەگــەر خــوا شــیفای بــدا ئــەوە ســەد داری لــێ ئــەدات، کاتــێ خــوا ﷻ شــیفایدا خێزانەکەیشــی ئافرەتێکــی چاکەخــواز بــوو بــۆی، خــوا ڕەحمــی پێکــردو ڕەحمــی بــە مێردەکەیشــی کــرد، بڕیاریــدا ســەد دانــە شــووڵ کۆبکاتــەوەو بیــدا لــە خێزانەکــەی بــۆ ئــەوەی ســوێندەکەی بەجــێ بێنــێ.
﴿ إِنَّا وَجَدْنَٰهُ ﴾ واتــە: ئەیــوب ﷺ ﴿ صَابِرًا ﴾ واتــە: تاقیمــان کــردەوە بــە نەخۆشــی‌و ناڕەحەتیەکــی مــەزن، لــە پێنــاوی خــوادا ئارامــی گــرت، ﴿ نِّعْمَ ٱلْعَبْدُ ﴾ (بەندەیەکــی چــاک بــوو) پلــەی بەندایەتــی کامــڵ کردبــوو لــە خۆشــی‌و ناڕەحەتیــدا، وە لــە

نارەحەتـــیو ئاســـاییدا ﴿ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴾ ئـــەو زۆر گوێڕایەڵـــی خـــوا بـــوو لـــە کاروبـــارە ئاینـــیو دونیاییەکانیـــدا، زۆر یـــادی پەروەردگـــاری دەکـــردو دەپاڕایـــەوەو خۆشـــی دەویســـتو دەیپەرســـت.

(٤٥-٤٧): ﴿ وَٱذۡكُرۡ عِبَٰدَنَآ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ أُوْلِي ٱلۡأَيۡدِي وَٱلۡأَبۡصَٰرِ ٤٥ إِنَّآ أَخۡلَصۡنَٰهُم بِخَالِصَةٖ ذِكۡرَى ٱلدَّارِ ٤٦ وَإِنَّهُمۡ عِندَنَا لَمِنَ ٱلۡمُصۡطَفَيۡنَ ٱلۡأَخۡيَارِ ٤٧ ﴾:

خـــوا ﷻ دەفەرمـــوێ: ﴿ وَٱذۡكُرۡ عِبَٰدَنَآ ﴾ (باســـی بەندەکانـــی ئێمـــە بکـــە) ئەوانـــەی بـــە دڵســـۆزیەوە بەندایەتیمـــان دەکـــەن، بـــە بـــاس کردنێکـــی چـــاک، ﴿ إِبۡرَٰهِيمَ ﴾ خەلیـــل ﴿ وَإِسۡحَٰقَ ﴾ کـــوڕی ئیبڕاهیـــم ﴿ وَيَعۡقُوبَ أُوْلِي ٱلۡأَيۡدِي ﴾ وە یەعقوبـــی کـــوڕی ئیســـحاق، واتـــە: خـــاوەن هێـــزو توانـــا بـــوون لەســـەر بەندایەتـــی کردنـــی خـــوا ﴿ وَٱلۡأَبۡصَٰرِ ﴾ واتـــە: (وە خـــاوەن) بینایـــی بـــوون لـــە ئاینـــی خـــوا.

خـــوا ﷻ وەســـفی کـــردن بـــە زانســـتی بـــە ســـوودو کـــردەوەی چاکـــی زۆر، ﴿ إِنَّآ أَخۡلَصۡنَٰهُم بِخَالِصَةٖ ﴾ (واتـــە: بەڕاســـتی ئێمـــە پاڵفتەمـــان کـــردن بـــە پاڵفتەکردنێکـــی) مـــەزن، وە تایبەتمەندیەکـــی بـــێ پایـــان، ئەویـــش: ﴿ ذِكۡرَى ٱلدَّارِ ﴾ بیرهێنانـــەوەی ڕۆژی دواییمـــان لـــە دڵیانـــدا چەســـپاند، وە کارکردن بـــۆی چاکترینـــی کاتەکانیان، وە دڵســـۆزیو ترســـان لەخـــوا وەســـفی بەردەوامیـــان بـــوو، وە کردمانـــن بـــە یادکـــەرەوەی ڕۆژی دوایـــی، کەســـی ژیـــرو عاقـــڵ پەنـــدو ئامۆژگـــاری لـــە بارودۆخیـــان وەربگـــرێ، ﴿ وَإِنَّهُمۡ عِندَنَا لَمِنَ ٱلۡمُصۡطَفَيۡنَ ﴾ ئەوانـــەی خـــوای گـــەورە هەڵبـــژاردوون لـــە نـــاو بەدیهێنراوەکانـــدا، ﴿ ٱلۡأَخۡيَارِ ﴾ ئەوانـــەی بۆیـــان هەیـــە لـــە هەمـــوو خوڕەوشـــتێکی جـــوانو کردەوەیەکـــی ڕاســـتو دروســـت.

(٤٨-٤٩): ﴿ وَٱذۡكُرۡ إِسۡمَٰعِيلَ وَٱلۡيَسَعَ وَذَا ٱلۡكِفۡلِۖ وَكُلّٞ مِّنَ ٱلۡأَخۡيَارِ ٤٨ هَٰذَا ذِكۡرٞۚ وَإِنَّ لِلۡمُتَّقِينَ لَحُسۡنَ مَـَٔابٖ ٤٩ ﴾:

﴿ وَٱذۡكُرۡ إِسۡمَٰعِيلَ وَٱلۡيَسَعَ وَذَا ٱلۡكِفۡلِۖ وَكُلّٞ مِّنَ ٱلۡأَخۡيَارِ ﴾ واتـــە: باســـی ئـــەو پێغەمبەرانـــە بکـــە بـــە چاکتریـــن باســـکردن، وە ستایشـــیان بکـــە بـــە جوانتریـــن ستایشـــکردن، چونکـــە هەموویـــان لـــە هەڵبژێردراوانـــن، ئەوانـــەی خـــوا هەڵبـــژاردوون لـــە نێوانـــی خەڵکیـــدا، وە چاکتریـــن دۆخیشـــی بـــۆ هەڵبـــژاردوون لـــە کـــردەوەو ڕەوشـــتو ســـیفاتە جوانەکانـــدا، ﴿ هَٰذَا ﴾ واتە: باســـکردنی ئـــەو پێغەمبـــەرە پاڵفتەکراوانەو باســـی ســـیفاتەکانیان ﴿ ذِكۡرٞ ﴾ لـــەم قورئانـــە خـــاوەن زیکـــرەدا، کەســـانی ژیـــر پەنـــد لـــە بارودۆخیـــان وەردەگـــرن، وە

پەیـڕەوکاران تامـەزرۆ دەبـن بـۆ پەیـڕەوی کـردن بـە سـیفاتە جوانەکانیـان، وە دەزانـی ئـەوەی خـوا منەتـی کـردوە بەسـەریاندا لـەو وەسـفە پاکانـە، وە بـڵاو کردنـەوەی ستایشـیان لـە نـاو خەڵکیـدا.

ئەمـە جۆرێکـە لـە جۆرەکانـی یادکردنـەوە، ئەویـش یادکردنـەوەی خەڵکانـی چاکـە، وە لـە جۆرەکانـی یادکردنـەوە: باسـکردنی پاداشـتی خـاوەن چاکـەو خـاوەن خراپەیـە، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿وَإِنَّ لِلْمُتَّقِينَ﴾ واتـە: (بێگومـان خۆپارێـزانو ئەوانـەی دەترسـن) لـە پەروەردگاریـان بـە جێبەجـێ کردنـی فەرمانـەکانو دوورکەوتنـەوە لـە قەدەغەکـراوەکان، لـە هەمـوو بڕواداریکـی پیـاوو ئافرەتـان﴿لَحُسْنَ مَـَٔابٍ﴾ سـەرەنجامێکی چـاک، وە جـێو ڕێگایەکـی خـۆش.

(٥٠-٥٤): ﴿ جَنَّٰتِ عَدْنٍ مُّفَتَّحَةً لَّهُمُ ٱلْأَبْوَٰبُ ﴿٥٠﴾ مُتَّكِـِٔينَ فِيهَا يَدْعُونَ فِيهَا بِفَٰكِهَةٍ كَثِيرَةٍ وَشَرَابٍ ﴿٥١﴾ وَعِندَهُمْ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ أَتْرَابٌ ﴿٥٢﴾ هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِيَوْمِ ٱلْحِسَابِ ﴿٥٣﴾ إِنَّ هَٰذَا لَرِزْقُنَا مَا لَهُۥ مِن نَّفَادٍ ﴿٥٤﴾﴾:

پاشـان شـیکردۆتەوەو درێـژەی پێـداوە، فەرموویەتـی: ﴿جَنَّٰتِ عَدْنٍ﴾ واتە: بەهەشـتانێ جێگایەکـی ئێجگاریـن خاوەنەکـەی بـە هیـچ جـۆرێ نایگۆڕێتـەوە، بـە هـۆی تـەواویو کەماڵـی نازونیعمەتەکانـی، وە لێی دەرناچـنو دەرناکرێـن، ﴿مُّفَتَّحَةً لَّهُمُ ٱلْأَبْوَٰبُ﴾ دەرگای خانـوو شـوێنی نیشـتەجێیان لـە پێنـاو ئەوانـدا کراوەیـە، پێویسـت بـەوە نـاکات خۆیـان بیکەنـەوە، بەڵکـو ئـەوان خزمـەت کـراون، ئەمـەش بەڵگەیـە لەسـەر ئەمـانو ئاسایشـی تەواوەتـی، شـتێک نیـە لـە بەهەشـتەکاندا کـە پێویسـت بـکات لـە پێناویـدا دەرگـا دابخـرێ، ﴿مُتَّكِـِٔينَ فِيهَا﴾ پاڵیـان داوەتـەوە لەسـەر کورسـی ڕازاوەو جێگـای خـۆش ﴿يَدْعُونَ فِيهَا﴾ واتـە: فەرمـان بـە خزمەتکارەکانیـان دەکـەن بۆیـان بهێنـن﴿بِفَٰكِهَةٍ كَثِيرَةٍ وَشَرَابٍ﴾ (واتـە: میوەهاتـی زۆرو جۆرەهـا خواردنـەوە) لـە هەمـوو ئەوانـەی نەفـس ئـارەزووی دەکاو چـاو لەزەتـی پـێ وەردەگـرێ، ئەمـەش بەڵگەیە لەسـەر تەواوی ئارامـیو دڵنیایـی وە تـەواوی چێـژو لـەزەت ﴿وَعِندَهُمْ﴾ لـە خێزانەکانیـان حۆریـە چـاو گەشـەکان ﴿قَٰصِرَٰتُ﴾ تەنهـا چاویـان بڕیوەتـە مێردەکانیـان، وە مێردەکانیشـیان تەنهـا چاویـان بڕیوەتـە ئـەوان، لەبـەر جوانـی هەموویـان، وە خۆشویسـتنی هەریەکەیـان بـۆ ئـەوی دیکـە، وە تەمـاح نەکردنـی جگـە لـەو، وە بـە هیـچ شـێوەیەک خێزانەکـەی بـە هیـچ ناگۆڕێتـەوە وە لـە بـری هیچـدا داینانـێ ﴿أَتْرَابٌ﴾ واتـە: لـە یـەک تەمەندان،

چاکترین تەمەنی گەنجێتیو جوانترینو بە لەزەترینی ﴿ هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ ﴾ (ئەمە ئەو نازونیعمەتەیە کە بەڵێنتان پێدراوە) ئەی لە خواترسان، ﴿ لِيَوْمِ الْحِسَابِ ﴾ پاداشتە لەسەر کردەوە چاکەکانتان ﴿ إِنَّ هَٰذَا لَرِزْقُنَا ﴾ (بە ڕاستی ئەمە ڕزقو ڕۆزی ئێمەیە) کە بەخشیمانە بە خاوەنی ماڵی پڕ لە نازو نیعمەت ﴿ مَا لَهُ مِن نَّفَادٍ ﴾ واتە: (هەرگیز تەواو بوونی بۆ نیە)، وە ناپچڕێ، بەڵکو لە هەموو کاتەکاندا بەردەوامە، بەردەوام لە زیاد بووندایە بۆ هەموو بەندەکان.

ئەمە مەزنو گەورە نیە بە لای پەروەردگاری بەخشندەی بە بەزەیی میهرەبانی چاکەخواز، بێنیازی دەوڵەمەند، ستایشکراوی بە سۆز، پاشای هەموو جیهان، گەورەو جوانو منەتکار، خاوەن فەزڵی درەوشانەوە، وە ڕێزی یەک لە دوای یەک، ئەو زاتەی نازونیعمەتەکانی لە ژماردن نایە، وە هەرگیز دەوری هەندێ لە چاکەی نادرێ.

(٥٥-٦٤): ﴿ هَٰذَا ۚ وَإِنَّ لِلطَّاغِينَ لَشَرَّ مَآبٍ (٥٥) جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ الْمِهَادُ (٥٦) هَٰذَا فَلْيَذُوقُوهُ
حَمِيمٌ وَغَسَّاقٌ (٥٧) وَآخَرُ مِن شَكْلِهِ أَزْوَاجٌ (٥٨) هَٰذَا فَوْجٌ مُّقْتَحِمٌ مَّعَكُمْ ۖ لَا مَرْحَبًا بِهِمْ ۚ إِنَّهُمْ
صَالُو النَّارِ (٥٩) قَالُوا بَلْ أَنتُمْ لَا مَرْحَبًا بِكُمْ ۖ أَنتُمْ قَدَّمْتُمُوهُ لَنَا ۖ فَبِئْسَ الْقَرَارُ (٦٠) قَالُوا رَبَّنَا مَن قَدَّمَ
لَنَا هَٰذَا فَزِدْهُ عَذَابًا ضِعْفًا فِي النَّارِ (٦١) وَقَالُوا مَا لَنَا لَا نَرَىٰ رِجَالًا كُنَّا نَعُدُّهُم مِّنَ الْأَشْرَارِ (٦٢)
أَتَّخَذْنَاهُمْ سِخْرِيًّا أَمْ زَاغَتْ عَنْهُمُ الْأَبْصَارُ (٦٣) إِنَّ ذَٰلِكَ لَحَقٌّ تَخَاصُمُ أَهْلِ النَّارِ (٦٤) ﴾:

﴿ هَٰذَا ﴾ ئەمە پاداشتی لەخوا ترسانە کە وەسفمان کرد ﴿ وَإِنَّ لِلطَّاغِينَ ﴾ واتە: زێدەڕۆییان لە کوفرو سەرپێچیدا ﴿ لَشَرَّ مَآبٍ ﴾ خراپترین پاشەڕۆژو سەرەنجامیان بۆ هەیە.

پاشان درێژەی پێداوەو فەرموویەتی: ﴿ جَهَنَّمَ ﴾ دۆزەخێکە کە کۆبوەتەوە تیایدا هەموو سزایەک، وە گەرمیەکەی زۆر توندە، وە قوڵایی گەیشتۆتە ئەوپەڕی ﴿ يَصْلَوْنَهَا ﴾ واتە: سزا دەدرێن تیایدا بە سزایەک لە گشت لایەکەوە دەور دراون، بۆ ئەوان هەیە لەلای سەریانەوە چەند چینێک لە ئاگر وەک هەوری ڕەش، وە لە ژێریانیشەوە چەند چینێکی دیکە هەیە ﴿ فَبِئْسَ الْمِهَادُ ﴾ (چ جێگایەکی بەدو خراپە) کە دیاریکراوە بۆیان وەک شوێنی نیشتەجێبوونو مانەوەیان، ﴿ هَٰذَا ﴾ ئەم جێگایەو ئەم سزا توندو ڕیسواییو سوکیە ﴿ فَلْيَذُوقُوهُ حَمِيمٌ ﴾ (دەبا بچێژن) ئاوێکی گەرم، کە گەرمیەکەی زۆر توندە، کاتێ دەیخۆنەوە هەناویان دەردێنێ،

﴿ وَغَسَّاقٌ ﴾ (کێـمو زوخـاو) ئـەوە پیسـترین شـتە لـە خواردنـەوەدا لـە چڵـکو پیسـاییەکانیان تـاڵو ناخـۆشو بۆنێکـی بێزارکـەر ﴿ وَءَاخَرُ مِن شَكْلِهِۦٓ ﴾ واتـە: چەنـد جـۆرێ تـر (لـە جـۆری) ﴿ أَزْوَٰجٌ ﴾ چەنـد جۆرێکـە لـە جۆرەکانـی سـزا، سـزای پـێ دەدرێـنو سەرشـۆڕ دەکرێـن، کاتـێ دەهێنرێـن بـۆ سـەر ئاگـر هەندێکیـان قسـەو تۆمـەت بەهەندێکـی دیکەیـان دەکـەن، دەڵێـن: ﴿ هَٰذَا فَوْجٌ مُّقْتَحِمٌ مَّعَكُمْ ﴾ دۆزەخ ﴿ لَا مَرْحَبًۢا بِهِمْ إِنَّهُمْ صَالُوا۟ ٱلنَّارِ ﴾ (واتـە: گومراکانیـش دەڵێـن بەخێـر نەیـەن، بێگومـان ئەوانـە دەچنـە نـاو ئاگـری دۆزەخ)﴿ قَالُوا۟ ﴾ ئەوانیـش ئەوانـەی بـەرەو لایـان دەڕۆن، دەڵێـن: ﴿ بَلْ أَنتُمْ لَا مَرْحَبًۢا بِكُمْ أَنتُمْ قَدَّمْتُمُوهُ ﴾ (واتـە: بەڵکـو ئێـوە بەخێـر نەیـەن، ئێـوە پێشـتان هێنـا بۆمـان لـە) سـزا: ﴿ لَنَا ﴾ بـەوەی بانگـەوازی ئێمەتـان دەکـرد، تووشـی فیتنـەو گومراییتـان کردیـنو ئێـوە بـوون بـە هـۆکار ﴿ فَبِئْسَ ٱلْقَرَارُ ﴾ جێگـای هەمووانـە، جێگـای خراپـەو شـەڕە.

پاشـان دووعـا لـەو گومراکارانـە دەکـەن کـە گومرایـان کـردن، جـا ﴿ قَالُوا۟ رَبَّنَا مَن قَدَّمَ لَنَا هَٰذَا فَزِدْهُ عَذَابًا ضِعْفًا فِى ٱلنَّارِ ﴾ (واتـە: دەڵێـن: ئـەی پەروەردگارمـان هـەر کـەس، هـۆی پێـش هێنانـی ئـەم سـزایە بـوو بـۆ ئێمـە، ئـەوە سـزای ئـەو لـە دۆزەخـدا دوو چەندانـە بکـە)، وە لـە دەقێکـی دیکـەدا فەرموویەتـی: ﴿ قَالَ لِكُلٍّ ضِعْفٌ وَلَٰكِن لَّا تَعْلَمُونَ ﴿٣٨﴾ ﴾ الأعـراف، (واتـە: پەروەردگـار فەرمـووی: بـۆ هەرکامتـان سـزای دوو بەرانبـەرە، بـەڵام ئێـوە نازانـنو بێئاگـان).

وَقَالُوا۟ مَا لَنَا لَا نَرَىٰ رِجَالًا كُنَّا نَعُدُّهُم مِّنَ ٱلْأَشْرَارِ ﴿٦٢﴾ أَتَّخَذْنَٰهُمْ
سِخْرِيًّا أَمْ زَاغَتْ عَنْهُمُ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴿٦٣﴾ إِنَّ ذَٰلِكَ لَحَقٌّ تَخَاصُمُ أَهْلِ
ٱلنَّارِ ﴿٦٤﴾ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ مُنذِرٌ ۖ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّارُ ﴿٦٥﴾
رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفَّٰرُ ﴿٦٦﴾ قُلْ هُوَ نَبَؤٌا۟
عَظِيمٌ ﴿٦٧﴾ أَنتُمْ عَنْهُ مُعْرِضُونَ ﴿٦٨﴾ مَا كَانَ لِىَ مِنْ عِلْمٍۭ بِٱلْمَلَإِ ٱلْأَعْلَىٰٓ
إِذْ يَخْتَصِمُونَ ﴿٦٩﴾ إِن يُوحَىٰٓ إِلَىَّ إِلَّآ أَنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٧٠﴾ إِذْ قَالَ
رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن طِينٍ ﴿٧١﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ
فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٧٢﴾ فَسَجَدَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ
أَجْمَعُونَ ﴿٧٣﴾ إِلَّآ إِبْلِيسَ ٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٧٤﴾ قَالَ
يَٰٓإِبْلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَىَّ ۖ أَسْتَكْبَرْتَ أَمْ كُنتَ
مِنَ ٱلْعَالِينَ ﴿٧٥﴾ قَالَ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ ۖ خَلَقْتَنِى مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ
﴿٧٦﴾ قَالَ فَٱخْرُجْ مِنْهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ ﴿٧٧﴾ وَإِنَّ عَلَيْكَ لَعْنَتِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلدِّينِ
﴿٧٨﴾ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿٧٩﴾ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ
ٱلْمُنظَرِينَ ﴿٨٠﴾ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْوَقْتِ ٱلْمَعْلُومِ ﴿٨١﴾ قَالَ فَبِعِزَّتِكَ
لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٨٢﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٨٣﴾

﴿ وَقَالُوا۟ ﴾ کاتێ لە ناو ئاگردان وتیان: ﴿ مَا لَنَا لَا نَرَىٰ رِجَالًا كُنَّا نَعُدُّهُم مِّنَ ٱلْأَشْرَارِ ﴾ واتە: ئێمە پێمان وابوو ئەوانە خراپەکارانن، شایستەی ئاگری دۆزەخن، ئەوانیش بڕوادارانن، دۆزەخیان گومیان کردوون -خوا ڕوویان ڕەش بکات- ئایا دەیانبینین لە ناو دۆزەخ؟

﴿ أَتَّخَذْنَٰهُمْ سِخْرِيًّا أَمْ زَاغَتْ عَنْهُمُ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴾ واتە: نەبینینیان دوو هۆکاری هەیە: یان ئەوەیە ئێمە هەڵە بووین لەوەی دامانناببوون لە خراپەکاران، بەڵکو ئەوان لە چاکەکارانن، قسەکانی ئێمە لە ڕووی گاڵتە پێکردنەوە بوو پێیان، ئەمە ڕاستیەکەیە، وەکو خوا ﷻ بە خەڵکی دۆزەخ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْ عِبَادِى يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١٠٩﴾ فَٱتَّخَذْتُمُوهُمْ سِخْرِيًّا حَتَّىٰٓ أَنسَوْكُمْ ذِكْرِى وَكُنتُم مِّنْهُمْ تَضْحَكُونَ ﴿١١٠﴾ ﴾ المؤمنون، (واتە: بێگومان لە دونیادا کۆمەڵێک لە بەندەکانی من دەیانوت ئەی پەروەردگارمان ئێمە بڕوامان هێناوە دەی لێیان خۆش بەو ڕەحمیان پێ بکە، چونکە تۆ چاکترینی میهرەبانانیت * کەچی ئێوە گاڵتەتان پێیان دەکرد تا (ئەو گاڵتەکردنەتان بە (ئەوان یادی منی لەبیر بردنەوە، وە ئێوەش هەمیشە بە ئەوان پێدەکەنین).

کاری دووەم: لەوەیە ئەوان چاوەکانیان لە بینینی ئیمانداران لەگەڵیاندا لە سزادان کەلا بووبێ، ئەگەرنا ئەوە ئەوانیش سزا دەدرێن بەڵکو چاوەکانی ئێمە نایانبینن، ئەو بیرو باوەڕەی لە دونیادا هەیانبوو، وە زۆرو حوکمو بڕیاریان دەربارەی ئیمانداران بە ئاگر دڵیانی دامەزراندو بوو بە مۆرێک بەسەر دڵیاندا، کاتێ چوونە دۆزەخەوە حاڵیان هەر بەو شێوەیە بوو، پاشان وتیان ئەوەی کە وتیان.

دەگونجێ قسەکانیان گۆڕینی حەقیقەتو ڕاستیەکان بێ وەکو چۆن لە دونیادا دەیانکرد، تەنانەت لە ناو ئاگریشدا قسەکانیان دەگۆڕی، لەبەر ئەمەیە خەڵکی ئەعراف بە خەڵکی دۆزەخ دەڵێن: ﴿ أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقْسَمْتُمْ لَا يَنَالُهُمُ ٱللَّهُ بِرَحْمَةٍ ۚ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ لَا خَوْفٌ عَلَيْكُمْ وَلَآ أَنتُمْ

﴿تَحۡزَنُونَ ٤٩﴾ الأعراف، (واتە: ئایا ئەوانە هەژارە بڕوادارەكان هەر ئەوانە نین كە ئێوە لە دونیادا سوێندتان دەخوارد كە خوا بەر میهرەبانی خۆیان ناخات خوا بە هەژارە بڕوادارەكان ئەڵێ بچنە بەهەشتو هیچ مەترسیەكتان لەسەر نیە وە ئێوە خەم ناخۆن)، خوا ﷻ جەخت دەكاتەوە لەسەر ئەوەی هەواڵیداوە، وە ئەو ڕاستگۆی ڕاستگۆیانەو فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ﴾ ئەوەی بۆم باسكردن ﴿لَحَقٌّ﴾ هیچ گومانو دوودڵیەكی تیا نیە ﴿تَخَاصُمُ أَهۡلِ ٱلنَّارِ﴾ (واتە: شەڕە قسەی دۆزەخیانە).

(٦٥): ﴿قُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ مُنذِرٞۖ وَمَا مِنۡ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ ٦٥﴾:

﴿قُلۡ﴾ ئەی پێغەمبەر ﷺ بەو بەدرۆدانەرانە بڵێ: ئەگەر داوای شتێكیان لێ كردی، كە نە لە توانای تۆدایەو نە بە دەستی تۆیە: ﴿إِنَّمَآ أَنَا۠ مُنذِرٞ﴾ واتە: (من تەنها ترسێنەرێكم) ئەمە ئەوپەڕی دەسەڵاتی منە، بەڵام كاروبارەكان هەمووی بەدەستی خوایە، من فەرمانتان پێ دەكەمو قەدەغەتان لێدەكەم، وە هانتان دەدەم لەسەر خێرو دوورتان دەخەمەوە لە شەڕ، جا هەر كەسێ هیدایەت وەربگرێ ئەوە بۆ خۆیەتی، وە هەركەسێكیش گومڕابێ ئەوە لەسەریەتی، ﴿وَمَا مِنۡ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُ﴾ هیچ كەسێک نیە بپەرسترێو بەندایەتی بۆ بكرێ بەڕاستی جگە لە خوا، ﴿ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ﴾ (تەنهای بە دەسەڵات).

ئەمە دانپێدانانی پەرستراوێتیەتی بەم بەڵگە یەكلاكەرەوەیە، ئەویش تاکو تەنهایی خواو دەسەڵاتێتی بەسەر هەموو شتێكدا، چونكە دەسەڵاتی تەواو پەیوەستە بە تەنهایی، ناكرێ دوو دەسەڵات هەبن وەكو یەكتر بن لە دەسەڵاتیاندا، ئەو زاتەی بە دەسەڵاتە بەسەر هەموو شتێكدا خوای تاکو تەنهایە، كە هیچ هاوشانێكی نیە تەنها ئەو شایستەی ئەوەیە بە تەنهایی بپەرسترێ، هەروەكو چۆن بە دەسەڵاتە بە تاکو تەنهایی.

(٦٦): ﴿رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡغَفَّٰرُ ٦٦﴾

هەروەها بڕیاری ئەوەی داوە بە یەكتاپەرستی پەروەردگاریێتی، فەرموویەتی: ﴿رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا﴾ واتە:دروستكەرو پەروەردەكارو بەڕێوەبەریانە، بە هەموو جۆرەكانی بەڕێوەبردن ﴿ٱلۡعَزِيزُ﴾ ئەو زاتەی خاوەنی هێزە، بەو هێزە بەدیهێنراوە مەزنەكانی بەدیهێناوە ﴿ٱلۡغَفَّٰرُ﴾ لێبوردەیە لە هەموو گوناهەكان بچووکو گەورەیان، بۆ كەسێ داوای لێخۆشبوون بكاو خۆی دابڕنێ لێیان.

ئا ئەمە ئەو زاتەیە پێویستەو شایستەیە بپەرسترێ، جگە لەو نە دروست دەكاو نە ڕزقو ڕۆزی دەداو نە زیان دەگەیەنێ، نە سوود دەگەیەنێو نە زیان لادەبا، وە نە هیچ دەسەڵاتێكی هەیە لە

کاروباردا. وە توانای بەڕێوەبردنی نیە، وە لێبوردنو لێخۆشبوون بە دەستی ئەو نیە.
(٦٧): ﴿ قُلۡ هُوَ نَبَؤٌاْ عَظِيمٌ ﴿٦٧﴾ ﴾: ﴿ قُلۡ ﴾ پێیان بڵێ: بە ترسو ئاگادارکردنەوەو وشیارکردنەوەیان: ﴿ هُوَ نَبَؤٌاْ عَظِيمٌ ﴾ واتە: ئەو هەواڵەی پێمداون دەربارەی زیندووکردنەوەو پاداشت لەسەر کردەوەکان هەواڵێکی زۆر گەورەیە، پێویستە ئەوپەڕی گرنگی پێ بدرێ نابێ لێی بێئاگابێ، بەڵام..
(٦٨): ﴿ أَنتُمۡ عَنۡهُ مُعۡرِضُونَ ﴿٦٨﴾ ﴾: (واتە: ئێوە گوێی پێ نادەن) هەروەکو ئەوە وایە لە پێشتانەوە لێپرسینەوەو سزاو پاداشت نەبێت.
(٦٩-٧٠): ﴿ مَا كَانَ لِيَ مِنۡ عِلۡمِۭ بِٱلۡمَلَإِ ٱلۡأَعۡلَىٰٓ إِذۡ يَخۡتَصِمُونَ ﴿٦٩﴾ إِن يُوحَىٰٓ إِلَيَّ إِلَّآ أَنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٞ مُّبِينٌ ﴿٧٠﴾ ﴾: ئەگەر گومانتان هەبوو لە قسەکانمدا وە دوو دڵ بوون لەهەواڵەکانم، ئەوە بێگومان من هەواڵێکتان پێ دەدەم هیچ زانیاریەکم نیە دەربارەی، وە لەو بارەیەشەوە هیچ کتێبێکیم نەخوێندۆتەوە، جا هەواڵدانی من پێی وەکو خۆی بەبێ زیادو کەم گەورەترین شایەتیە بۆ ڕاستگۆیی من، وە چاکترین بەڵگەیە لەسەر ڕاستی ئەو پەیامەی هێناومە، ئا لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی:
﴿ مَا كَانَ لِيَ مِنۡ عِلۡمِۭ بِٱلۡمَلَإِ ٱلۡأَعۡلَىٰٓ ﴾ واتە: (ئەگەر وەحیم بۆ نەهاتایە من هیچ ئاگام لە کۆمەڵی هەرە بڵندی) فریشتەکان نەدەبوو، ﴿ إِذۡ يَخۡتَصِمُونَ ﴾ (واتە: کاتێ دەمە قاڵێیان دە کرد دەربارەی ئادەم ﷺ) ئەگەر خوای گەورە فێری نەکردباмو وەحی بۆ نەناردایەم، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ إِن يُوحَىٰٓ إِلَيَّ إِلَّآ أَنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٞ مُّبِينٌ ﴾ واتە: ترسێنەرێکی ئاشکرا، هیچ ترسێنەرێک نیە بەهێزتربێ لە ترساندنی ئەو ﷺ.
(٧١-٧٦): ﴿ إِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقُۢ بَشَرٗا مِّن طِينٖ ﴿٧١﴾ فَإِذَا سَوَّيۡتُهُۥ وَنَفَخۡتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٧٢﴾ فَسَجَدَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمۡ أَجۡمَعُونَ ﴿٧٣﴾ إِلَّآ إِبۡلِيسَ ٱسۡتَكۡبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٧٤﴾ قَالَ يَٰٓإِبۡلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسۡجُدَ لِمَا خَلَقۡتُ بِيَدَيَّۖ أَسۡتَكۡبَرۡتَ أَمۡ كُنتَ مِنَ ٱلۡعَالِينَ ﴿٧٥﴾ قَالَ أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡهُ خَلَقۡتَنِي مِن نَّارٖ وَخَلَقۡتَهُۥ مِن طِينٖ ﴿٧٦﴾ ﴾:
پاشان باسی دەمە دەمێی فریشتەکانی کردووە فەرموویەتی: ﴿ إِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ﴾ بە شێوەی هەواڵ پێدان، ﴿ إِنِّي خَٰلِقُۢ بَشَرٗا مِّن طِينٖ ﴾ واتە: توخمی مرۆڤ لە قوڕ، ﴿ فَإِذَا سَوَّيۡتُهُۥ ﴾ واتە: شێوەی جەستەیم ڕێکخستو تەواوم کرد، ﴿ وَنَفَخۡتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴾ (واتە: ڕوحێک من خاوەنی ئەوم فووم پێدا کردوو گیانم پێ بەخشی ئێوەی فریشتە هەمووتان سوژدەی بۆ بەرن)، فریشتەکان نەفسیان جێگیر بوو لەسەر ئەوە، تا کاتێ دروستکردنی تەواو دەبێو فووی ڕووح دەکرێ بەبەریدا، فەرمان بەرداری پەروەردگاریان دەبنو ڕێز لە ئادەم ﷺ

دەگرن، کاتێ دروستکردنی لە ڕووی جەستەو ڕووحەوە کامڵ دەبێ، خوا ﷻ ئادەمو فریشتەکان تاقی دەکاتەوە لە زانستدا، فەزڵو چاکەی ئادەم دەردەکەوێ بەسەر فریشتەکاندا، فەرمانیان پێدەکات سوژدەی بۆ ببەن.

ئەوانیش سوژدەیان برد ﴿ كُلُّهُمۡ أَجۡمَعُونَ ۝٧٣ إِلَّآ إِبۡلِيسَ ﴾ سوژدەی نەبرد، ﴿ ٱسۡتَكۡبَرَ ﴾ لووت بەرزی نواند لە بەرانبەر فەرمانی پەروەردگاری، وە لەسەر ئادەم ﴿ وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾ لە زانستی خوای گەورەدا.

جا ﴿ قَالَ ﴾ خوا ﷻ بە سەرزەنشتو سەرکۆنەکردنەوە بە ئیبلیسی فەرموو: ﴿ مَا مَنَعَكَ أَن تَسۡجُدَ لِمَا خَلَقۡتُ بِيَدَيَّۖ ﴾ (چی شتێ ڕێگری لێکردی کە سوژدە ببەی بۆ کەسێ من بە دەستی خۆم دروستم کردوە) وە ڕێزو حورمەتم لێگرتووەو تایبەتم کردوە بەم تایبەتمەندیە بەسەر هەموو دروستکراوەکاندا، ئەویش ئەوە دەخوازێ لووت بەرزی بەسەردا نەنوێنی ﴿ أَسۡتَكۡبَرۡتَ ﴾ (خۆت بە گەورە زانی) لە ڕێگری کردنت ﴿ أَمۡ كُنتَ مِنَ ٱلۡعَالِينَ ﴾ (یاخود لە بەرزو بڵندەکان).

﴿ قَالَ ﴾ جا ئیبلیس بەرهەڵستی پەروەردگاری کردو لە ڕوویدا وەستاو هەڵیوەشاندەوە، وتی: ﴿ أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡهُ خَلَقۡتَنِي مِن نَّارٖ وَخَلَقۡتَهُۥ مِن ﴾، (واتە: من لە ئادەم چاکترم چونکە منت لە ئاگر دروستکردوە، بەڵام ئەو لە قوڕ) ئیبلیس پێی وابوو پێکهاتەی ئاگر چاکترە لە پێکهاتەی قوڕ ئەمەش قیاسێکی خراپە، چونکە پێکهاتەی ئاگر کەرەستەی شەڕو خراپەو بەرزیو هەڵەشەییو سەرەڕۆییو سووکیە، وە پێکهاتەی قوڕ کەرەستەیەکی لەسەر خۆو خۆ بە کەم زانو نەرمو نیانە، سەرجەم دارودرەختو ڕووەکەکان لەوێوە دەردەچن، ئەو زاڵە بەسەر ئاگرداو دەیکوژێنێتەوە، ئاگریش پێویستی بە کەرەستەیەک هەیە پێی هەستێ، بەڵام قوڕ خۆی بۆ خۆی وەستاوە، ئەمە قیاسی شێخو گەورەی گەلێکە، کە بەراوردی کردوە بەو کارە زارەکیە لەلایەن خواوە، بێگومان دەرکەوتووە ئەوپەڕی بەتاڵیو فەسادی، ئەی چی دەڵێی دەربارەی قیاسی خوێندکارەکان کە پێچەوانەی حەق وەستاونەتەوە بە قیاسەکانیان، بێگومان هەموو ئەوانە ئەوپەڕی پووچیو خراپیە لەم قیاسەدا.

(٧٧): ﴿ قَالَ فَٱخۡرُجۡ مِنۡهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٞ ۝٧٧ ﴾: ﴿ قَالَ ﴾ خوا بە ئیبلیسی فەرموو: ﴿ فَٱخۡرُجۡ مِنۡهَا ﴾ واتە: (بچۆرە دەرەوە) لە ئاسمانو شوێنی ڕێزدار، ﴿ فَإِنَّكَ رَجِيمٞ ﴾ واتە: (بەڕاستی تۆ) دوورخراویو سەرزەنشت کراوی.

(٧٨): ﴿ وَإِنَّ عَلَيۡكَ لَعۡنَتِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ۝٧٨ ﴾: ﴿ وَإِنَّ عَلَيۡكَ لَعۡنَتِيٓ ﴾ واتە: دەر کردنو دوور کردنەوە، ﴿ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴾ واتە: بۆ هەمیشەیی.

(٧٩): ﴿ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِيٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ٧٩ ﴾ (واتە: ئیبلیس وتی: ئەی پەروەردگارم دەی مۆڵەتم بدە تا ڕۆژێ زیندوو دەکرێینەوە) بە هۆی توندی دژایەتی کردنی ئادەمو نەوەکانی، بۆ ئەوەی بتوانێ گومرای بکات، ئەوکەسەی خوا بڕیاری داوە گومرای بکات.

(٨٠-٨١): ﴿ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ٨٠ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْوَقْتِ ٱلْمَعْلُومِ ٨١ ﴾ ﴿ قَالَ ﴾ خوا ﷻ وەڵامی داواکەی دایەوە، کاتێ حیکمەتی ئەوەی ویست، فەرمووی: ﴿ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ٨٠ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْوَقْتِ ٱلْمَعْلُومِ ﴾ (واتە: دەی بەڕاستی تۆ لە مۆڵەت دراوانی * تا ڕۆژی کاتی دیاریکراو)، کاتێ نەوەکان کامڵ دەبن، تاقیکردنەوەش تەواو دەبێت.

(٨٢-٨٣): ﴿ قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ٨٢ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ٨٣ ﴾ ئیبلیس کاتێ زانی مۆڵەتدراوە، بە هۆی پیسیو خراپیەوە بە ئاشکرا توندی دوژمنایەتی خۆی ڕاگەیاند بەرانبەر پەروەردگاریو ئادەمو نەوەکانی، جا وتی: ﴿ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴾ واتە: بە مەزنیت هەموویان گومڕا دەکەم، پێدەچێ (باء) بۆ سوێند خواردن بێت، ئەو سوێندی خواردووە بە عیزەتی خوا هەموویان گومڕا دەکات.

﴿ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴾ (واتە: ئەوانەیان نەبێ کە بەندەی پاکو هەڵبژێردراوی تۆن) ئیبلیس زانی خوا دەیانپارێزی لە فرتو فێڵەکانی.

وە پێدەچێ (باء) بۆ پشت بەستن بێت (الإستعانة)، ئیبلیس کاتێ زانی ئەو بێتوانایە لە هەموو ڕوویەکەوە، وە ئەو ناتوانێ کەس گومڕا بکات بە ویستی خوا نەبێ، پشتی بەستبێ بە عیزەتی خوا لەسەر گومڕا کردنی نەوەکانی ئادەم، ئەمە دوژمنی خوایە بە حەقیقەت.

ئێمە ئەی پەروەرگارمان بێتواناو کەمتەرخەمین، دانمان بە تۆدا ناوە بە هەموو نیعمەتێک، نەوەی کەسێکین ڕێزو حورمەتت لێ گرتووە، پشت بە عیزەتی مەزنیو تواناو میهرەبانی بەرفراوانی تۆ دەبەستین بۆ هەموو بەدیهێنراوەکان، وە پشت بە ڕەحمەتت دەبەستین کە بە هۆیەوە نازو نیعمەتە ئاینیو دنیاییەکانت گەیاندووە بە ئێمە، وە بەهۆیەوە بەڵاو ناخۆشیت لێ دوورخستینەتەوە، یارمەتیمان بدە لەسەر دژایەتی کردنی ئیبلیس، وە بمان پارێزە لە شەڕو هاوبەش دانانی، گومانی چاک بە تۆ دەبەین نزاکانمان گیرا بکەیت، بڕوامان بە بەڵێنت هەیە کە پێمانت فەرمووە: ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِيٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ ٦٠ ﴾ غافر، (واتە: وە پەروەردگارتان فەرموویەتی: لێم بپاڕێنەوە وەڵامتان دەدەمەوە)، ئەوە لێت پاڕاینەوە وەک فەرمانت پێکردین، دەی نزاکەمان گیرا بکە وەک چۆن بەڵێنت پێداوین ﴿ إِنَّكَ لَا تُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ ١٩٤ ﴾ آل عمران، (واتە: بێگومان تۆ بەڵێن ناشکێنیت).

قَالَ فَالْحَقُّ وَالْحَقَّ أَقُولُ ﴿٨٤﴾ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكَ وَمِمَّن تَبِعَكَ مِنْهُمْ
أَجْمَعِينَ ﴿٨٥﴾ قُلْ مَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُتَكَلِّفِينَ
﴿٨٦﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ ﴿٨٧﴾ وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُ بَعْدَ حِينٍ ﴿٨٨﴾

(٨٤-٨٨): ﴿ قَالَ فَالْحَقُّ وَالْحَقَّ أَقُولُ ﴿٨٤﴾ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكَ وَمِمَّن تَبِعَكَ مِنْهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٨٥﴾ قُلْ مَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُتَكَلِّفِينَ ﴿٨٦﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ ﴿٨٧﴾ وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُ بَعْدَ حِينٍ ﴿٨٨﴾ ﴾

﴿ قَالَ ﴾ خـوا ﷻ فەرمـووی: ﴿ فَالْحَقُّ وَالْحَقَّ أَقُولُ ﴾ واتـە: حـەق وەسـفی منـە، حەقیش قسـەی منـە، ﴿ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكَ وَمِمَّن تَبِعَكَ مِنْهُمْ أَجْمَعِينَ ﴾ (واتە: بە ڕاسـتی دۆزەخ پـڕ دەکـەم لـە تـۆو نەوەکانـتو ئەوانـەی لـە ئادەمیـزاد شـوێنت دەکـەون تێکـڕا). کاتـێ پێغەمبـەر ﷺ بەڵگـەی بـۆ خەڵکـی ڕوون کـردەوەو ڕێگـای پـێ نیشـاندان، خـوا ﷻ پێـی فەرمـوو: ﴿ قُلْ مَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ ﴾ واتـە: لەسـەر گەیاندنـی ئـەم پەیامـە ﴿ مِنْ أَجْرٍ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُتَكَلِّفِينَ ﴾ واتـە: بانگەشـەی شـتێ بکـەم هی مـن نیە، وە لەسـەر شـتێ بوەسـتم هیـچ زانیاریەکـم دەربارەی نەبـێ، شـوێنی هیـچ ناکـەوم جگـە لـەوەی خـوا وەحـی بـۆ کـردووم.

﴿ إِنْ هُوَ ﴾ واتـە: ئەم وەحیو قورئانـە، ﴿ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ ﴾ (واتە: تەنهـا پەندو ئامۆژگاریە بـۆ هەمـوو جیهانیـان) یـادی پێدەکەنـەوەو هەمـوو ئەوانـەی سـوودیان پێدەگەیەنـێ لـە بەرژەوەندیەکانـی دیـنو دونیایان، پاشـان دەبێتە شـەرەفو بەرزیەک بۆ هەمـوو جیهانیان، وە دەبێتـە بەڵگـەو حوججـەو بیانـوو بڕین لەسـەر عینادەکان.

ئـەم سـوورەتە مەزنـە گشـتگیرە لەسـەر: یادی خـوای خـاوەن حیکمـەت، هەواڵـی مەزن، بەڵگـەو بیانـوو بڕینـی لەسـەر ئـەوەی قورئـان بـە درۆ دادەنێـتو دژایەتـی دەکاتو پێغەمبەریـش بـە درۆ دادەنێـت، وە هـەواڵ دان دەربارەی بەندە دڵسـۆزەکان، وە پاداشـتی لە خـوا ترسـانو سەرکەشـەکان، لەبەر ئەمەیە سـوێندی خـواردووە لە سـەرەتاکەی بەوەی ئەم قورئانـە خاوەن زیکرو یادە، وە لە کۆتاییشـدا وەسـفی کردوە بەوەی زیکـرو یادکردنەوەیە بـۆ جیهانیان.

وە زۆر یادکردنـەوە لـەم سـوورەتەدا لە نێوان ئـەوە دایە، وەک خـوا فەرموویەتی: ﴿ وَٱذۡكُرۡ عَبۡدَنَا ﴿١٧﴾ ﴾ص، (واتـە: بیـری بەندەمـان)، ﴿ وَٱذۡكُرۡ عِبَٰدَنَآ ﴿٤٥﴾ ﴾ص، (واتـە: بیـری بەندەکانمـان)، ﴿ رَحۡمَةٗ مِّنَّا وَذِكۡرَىٰ لِأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿٤٣﴾ ﴾ص، (واتـە: بـە میهرەبانـی لە لایەن خۆمانـەوە بـۆ پەنـدو ئامۆژگـاری بـۆ خاوەنانـی ژیـرو بیرو هـۆش) خوایـە فێرمـان بکە ئـەوەی نایفامیـن، وە بیرمـان بخەرەوە ئـەوەی لەبیرمـان چـووە، بیرچوونـەوەی بێئاگایی و بیرچوونـەوەی وازهێنان.

﴿ وَلَتَعۡلَمُنَّ نَبَأَهُۥ ﴾ واتـە: (دەزانـن) هەواڵـی قورئان، ﴿ بَعۡدَ حِينِۭ ﴾ (واتە: پـاش ماوەیەک) ئەویش ئەو کاتەیە سـزایان لەسـەر پێویسـت دەبـێ و هەموو هۆکارەکانیـان دەپچڕێ.

تەفسیری سوورەتی (ص) تەواو بوو.


بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ١ إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ
ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ فَٱعْبُدِ ٱللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ ٱلدِّينَ ٢ أَلَا
لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلْخَالِصُ ۚ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ
مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلْفَىٰٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَحْكُمُ
بَيْنَهُمْ فِى مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَنْ هُوَ
كَٰذِبٌ كَفَّارٌ ٣ لَّوْ أَرَادَ ٱللَّهُ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا لَّٱصْطَفَىٰ
مِمَّا يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ ۖ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّارُ
٤ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۖ يُكَوِّرُ ٱلَّيْلَ عَلَى
ٱلنَّهَارِ وَيُكَوِّرُ ٱلنَّهَارَ عَلَى ٱلَّيْلِ ۖ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ ۖ
كُلٌّ يَجْرِى لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ۗ أَلَا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفَّٰرُ ٥

## تەفسیری سووڕەتی (الزمر)
## مەککیە (٧٥) ئایەتە
## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٣): ﴿ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ١ إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ فَٱعْبُدِ ٱللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ ٱلدِّينَ ٢ أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلْخَالِصُ ۚ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلْفَىٰٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِى مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَنْ هُوَ كَٰذِبٌ كَفَّارٌ ٣ ﴾:

﴿ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ١ إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ ﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدات دەربارەی مەزنی قورئانو مەزنی ئەو کەسەی قسەی پێدەکاو دایبەزاندووە، بێگومان ئەو قورئانە لەلایەن خوای باڵادەستی کاربەجێ دابەزێنراوە، ئەو زاتەی کە وەسفی پەرستراوێتیە بۆ خەڵکی، ئەویش بە هۆی مەزنیو کەماڵیەوە، وە ئەو عیزەتو باڵادەستیەی زاڵە بەسەر هەموو بەدیهێنراوێکداو، هەموو شتێکی بۆ زەلیل بووە، وە حیکمەتو کاردروستی لە دروست کردنو فەرمانیدا. بێگومان قورئان دابەزێنراوی ئەو زاتەیە کە ئەمە وەسفێتی، قسەکردنیش وەسفە بۆ قسەکەر، وەسفیش شوێنی وەسفکراو دەکەوێ، هەروەک چۆن خوا تەواوە لە هەموو ڕوویەکەوە کە هیچ هاوشێوەو وێنەیەکی نیە، بە هەمان شێوە قسەکانیشی تەواوە لە گشت ڕوویەکەوەو وێنەی نیە، تەنها ئەمە بەسە بۆ وەسفی قورئان، بەڵگەیە لەسەر پلەو پایەی.

بەڵام لەگەڵ ئەمەدا ڕوونکردنەوەیەکی زیاتری دا لەسەر تەواوی بەو کەسەی کە دایبەزاندوە بۆی، ئەویش موحەممەدە ﷺ کە باشترینی بەدیهێنراوەکانە، بۆیە زانراوە ئەوە چاکترینی کتێبەکانە، وە ئەوەیشی دایبەزاندوە حەقو ڕاستیە، بە حەقو ڕاستی دابەزێنراوە کە هیچ گومانێکی تێدانیە، بۆ ئەوەی خەڵکی دەربێنێ لە تاریکیەوە بۆ ڕووناکی، وە دابەزێنراوە بە

گشـتگیری لەسـەر حـەق، بـە هەواڵـە ڕاسـتەقینەییەکانو حوکـمو بڕیـارە دادپەروەرەکانی. هەر شـتێک قورئـان بەڵگەبـێ لەسـەری ئـەوە مەزنترینـی جۆرەکانـی حەقـە، لـە هەمـوو داواکاریە زانسـتیەکان، وە لـە دوای حـەق هیـچ شـتێکی دیکـە نیـە جگـە لـە گومرایـی. کاتـێ بـە حەق دابەزێنـراوە گشـتگیرە لەسـەر حەق، بۆ هیدایەتـی حەق لەسـەر بەرێزترینی خەڵکـی نازونیعمەتی زۆر گەورەو مەزنی تێدایە، وە پێویسـتە سوپاسـگوزاری لەسـەر بکرێ، ئەویش دڵسـۆزی ئاینداریە بۆ خـوا، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتی:

(٢): ﴿ فَٱعۡبُدِ ٱللَّهَ مُخۡلِصٗا لَّهُ ٱلدِّينَ ﴾ واتـە: بـە دڵسـۆزیەوە ئاینـداری بۆ خوا ﷻ بکە، لە شـەریعەتە ئاشـکراو نهێنیەکانـدا: ئیسـلامو ئیمـانو ئیحسـان، بـەوەی خـوا بەتاکو تەنهـا بپەرسـتەو تەنها مەبەسـتت ئەو بـێ، جگە لـە مەبەسـتەکانی دیکە.

(٣): ﴿ أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلۡخَالِصُ ﴾ واتـە: (بێـدار بـە ئاینـی گەردنکەچـیو پـاکو خاوێـن هـەر بـۆ خوایـە) ئەمـە دان پێدانانـە بە فەرمان کـردن بە دڵسـۆزی، وە ڕوونکردنەوەی ئـەوەی کە بێگومان هـەروەک چـۆن خاوەنـی هەمـوو تـەواویو کەماڵیەکـە، وە خاوەنـی فـەزڵو چاکەیـە بەسـەر بەندەکانیـەوە لـە هەمـوو ڕووەکانەوە، بەهەمان شـێوە خاوەنـی ئاینێکی پاکو پاڵفتەیـە لە هەموو خەڵتـەو ناتەواویـەک. ئەویـش ئەو ئاینەیـە کە هەڵبـژاردوە بۆ نەفسـی خـۆی، وە ڕازی بووە بۆ پاڵفتەترینـی دروسـتکراوەکانی، فەرمانـی پێکـردوون بە جێبەجـێ کردنی، چونکە یەکتاپەرسـتی بـۆ خـوا ﷻ لـە خۆ دەگـرێ لـە خۆشەویسـتیو ترسـانو هیـواو ئومێـدو گەڕانـەوە بـۆ لای لە بەندایەتـی کردنیـدا، وە لـە بەدەسـتهێنانی داواکاری بەندەکانی.

وە ئـەوەی دڵـەکان چـاکو پـاک دەکاتـەوە بەبـێ هـاوەڵ بـۆ دانـان لە شـتێک لـە بەندایەتی کردنیـدا، بێگومـان خـوا بەریـە لـە هاوبەشـدانان، ئـەو بێنازتریـن کەسـە لـەوەی هاوبەشـی بۆ دابنرێ، هاوبەشـدانان تێکـدەری دڵەکانو ڕووحەکانو دونیاو دوا ڕۆژە، نەفسـەکان سـەرگەردان دەکات بـە ئەوپـەڕی سـەرگەردانی، جـا فەرموویەتـی: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَ ﴾ (واتـە: کەسـانێ جگـە لـە خـوا چەنـد پەرسـتراوێکیان بۆ خـوا دانـاوە)، پشـتیان پێ دەبەسـتن بـە بەندایەتـی کردنیـانو پاڕانەوەیـان لێی، بیانـوو بۆ خۆیـان دەهێننەوەو دەڵێـن: ﴿ مَا نَعۡبُدُهُمۡ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلۡفَىٰٓ ﴾ (واتـە: تەنهـا بـۆ ئـەوە دەیانپەرسـتین نزیکمـان بکەنەوە لە خـوا) بۆ ئەوەی داواکاریەکانمـان بـۆ لای خوا بـەرز بکەنەو تکامـان بۆ بکەن لە لای ئـەو، ئەگەرنا ئێمـە دەزانین ئـەو پەرسـتراوانە نە دروسـت دەکـەن، نـە ڕزقو ڕۆزی دەدەن، نە دەسـەڵاتیان لـە کاروبارەکاندا هە یە.

واتــە: ئــەوان وازیــان هێنا لــەوەی خــوا ﷻ فەرمانی پێیان کــردوە لــە دڵســۆزی، وە بوێریان کرد بەرانبــەر گەورەتریــن قەدەغە کــراوەکان ئەویش هاوبەشــدانان بوو، وە ئەو زاتەی کە هیچ شــتێک هاوشــێوەو وێنــەی نیــە پاشــای مەزنە قیاســیان کردو هێنایەنــە ئاســتی دەســەڵاتدارەکانی دنیا، وە پێیــان وابــوو- بە عەقڵــە فاســیدو بۆچوونە نەخۆشــەکانیان- پاشــاو دەســەڵاتداران هەروەکو چۆن پێیــان ناگــات تەنهــا لە ڕێگــەی پیاو ماقــوڵانو تــکاکارانو وەزیرەکانــەوە نەبێ، ناتــەواوی ژێر دەســەکانیان بــەرز بکەنــەوە بۆ لایان، وە بــە مەزنیان دابنێنو هەندێ لە دەســەڵاتیان پێ ببەخشــن، خــوای مەزنیش بەو شــێوەیەیە.

ئــەم قیاســە لــە خراپترینــی قیاســەکانە، ئەویش یەکســانی لــە خۆ دەگــرێ لــە نێــوان بەدیهێنەرو بەدیهێنــراودا، لەگــەڵ بوونــی جیاوازیەکــی مــەزن لــە نێوانیانــدا بــە عەقــڵو بــە نەقــڵو بــە سروشــت، بێگومــان پاشــاکان لەبــەر ئــەوە پێویســتیان بــە نێوەندگیری هەیە لــە نێــوان خۆیانو ژێــر دەســتەکانیاندا، چونکــە لــە بارودۆخــی ئــەوان نازانــن، بۆیە وا پێویســت دەکات کەســێک لــە بارودۆخیــان ئاگاداریــان بکاتەوە، ڕەنگــە لە دڵیاندا ســۆزو بەزەییــەک نەبێ بەرانبــەر خاوەنی پێداویســتیو داواکاریەکان، وا پێویســت بکات کەســێ قســەیان لەگەڵدا بــکاتو بەزەییان بجوڵێ بەرانبــەری، وە پێویســتیان بە تــکاکارو وەزیرەکان هەیە، وە لێیان دەترســن، بۆیــە ناتەواوی ئەوانە دەســتەبەر دەکــەن کــە ئەوان تکایــان بۆ کــردوون، وەک لەبەرچــاو گرتنێ بۆ ئەوانو پاراســتنی دڵەکانیــان، لــە کاتێکــدا ئەوانیــش هەر هــەژارن، هەندێجــار ڕێگــری دەکەن بە هۆی مەترســیان لە هــەژاری.

بــەڵام پەروەردگــاری بــەرزو مــەزن ئــەو زاتەیــە بــە زانســتی دەوری کارە ئاشــکراو نهێنیەکانی داوە، ئــەو زاتــە پێویســتی بەوە نیــە کەســێ هەواڵی پێبــدا دەربــارەی بارودۆخی بەنــدەکانو ژێر دەســتەکانی، ئەو زاتە بڵندە میهرەبانترینی میهرەبانەکانەو بەخشــندەترینی بەخشــندەکانە، پێویســتی بــە کەســێک نیــە لــە بەدیهێنراوەکانــی وای لێبــکات بەزەیی بــە بەندەکانیــدا بێتــەوە، بەڵکو ئەو بــە بەزەییتــرە پێیــان لە نەفســی خۆیانو لە دایــکو باوکیانیــش، ئەو زاتــە هانیــان دەداو بانگیان دەکات بــۆ لای ئــەو هۆکارانــەی کــە میهرەبانی ئــەوی پێ بە دەســت بهێنن، ئەوەی ئــەو دەیەوێ بــۆ بەرژەوەندیەکانیــان خۆیانیش بۆ نەفــسو دەروونیــان نایانەوێ.

ئــەو بێنیــازو دەوڵەمەندە خاوەنــی دەوڵەمەندی تەواوە، ئەگــەر هەموو بەدیهێنراوەکان لە ســەرەتاوە بــۆ کۆتاییان لــە جێگایەک کۆببەنــەوەو داوای لێبکــەن داواکاریو ئاواتــی هەریەکەیان جێبەجێ بــکات، ئــەوە هیچ لە دەوڵەمەنــدی ئەو کەم ناکــەن، وە هیچ کەم نــاکا لەوەی لەلایەتــی، تەنانەت

هـەروەک کەمکردنی دەریایـەک ئەگەر دەزوویەک بخەیتـە ناوی‌و دەریبێنــی، هەموو تکاکاران لێــی دەترســن، هیچ کەسـێکیان تـکا ناکەن بـە مۆڵەتی ئـەو نەبی، خاوەنــی هەموو شـەفاعەتێکە بە گشــتی.

ئـا بـەم جیاوازییانــە نەفامــی هاوبەشــدانەران‌و گەمژەیــی مەزنیــان دەردەکــەوێ، وە زۆر بوێریان لەســەری، هەروەهــا دەزانــێ حیکمــەت لـە هاوبەشـداناندا ئەوەیـە خـوا ﷻ لێــی خـۆش نابــێ، چونکـە ناشــرین کــردن بەرانبــەر بە خــوا لەخۆدەگــرێ، لەبەرئەمەیـە بڕیــاری داوە لە نێــوان ئەو دوودەســتەیەدا دڵســۆزان‌و هاوبەشـدانەران، وە لە چوارچێوەیشیدا هەڕەشـەکردن لە هاوبەشدانەران فەرموویەتــی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡ فِي مَا هُمۡ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ﴾ (واتــە: بێگومــان خوا بڕیــار دەدات لە نێوانیانــدا لــەو شــتانەدا کــە ئەوان تیایــدا جیــاواز بوون).

بێگومــان زانــراوە بڕیــاری خوا بۆ بــڕواداره دڵســۆزەکان بەهەشــتانی پڕ لـە نازونیعمەتــە، وە ئەو کەسەشــی هاوەڵــی بـۆ دادەنــێ ئەوە خوا بەهەشــتی لــێ حــەرام دەکاو جێگــای دۆزەخە.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي﴾ واتــە: سـەرکەوتووی نـاکات بــۆ هیدایەت بۆ ڕێگای ڕاســت، ﴿مَنۡ هُوَ كَٰذِبٞ كَفَّارٞ﴾ واتــە: وەسـفی درۆ بێ یان بێبڕوایــی، بە جۆرێ ئامۆژ گــاری‌و ئایەتەکانی بۆ دێ، ئەوە لەســەری لانەچــێ ئــەوەی پێی وەســفکراوە، وە خوا ئایەتەکانی نیشــان بــدات نکوڵــی‌و بێبڕواییان پــێ بــکات‌و بــە درۆیــان بزانــێ. ئەمــە چــۆن هیدایــەت وەردەگــرێ کــە دەرگای لەســەرخۆی داخســتووە؟ وە ســزادراوە بــەوەی خــوا مۆری داوە بەســەر دڵیدا کە ئــەو هەرگیــز بڕواناهێنێ.

(٤): ﴿لَّوۡ أَرَادَ ٱللَّهُ أَن يَتَّخِذَ وَلَدٗا لَّٱصۡطَفَىٰ مِمَّا يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۚ سُبۡحَٰنَهُۥۖ هُوَ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ ٤﴾:

﴿لَّوۡ أَرَادَ ٱللَّهُ أَن يَتَّخِذَ وَلَدٗا﴾ (واتــە: ئەگــەر خــوا ﷻ بیویســتایە منداڵێــک بۆ خۆی بڕیــار بدات) وەک چــۆن پێــی وابــووە ئەوەی پێــی وابووە لــە گەمژەکانی نــاو خەڵکــی، ﴿لَّٱصۡطَفَىٰ مِمَّا يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُ﴾ واتــە: ئــەو کێی بویســتایە لە نــاو دروســتکراوەکانیدا هەڵیدەبــژارد، وە تایبەتی دەکرد بــە نەفســی خــۆی، وە دەیکــردە منداڵی خــۆی، هیــچ پێویســتیەکی بەوە نەبــووە منــداڵ بۆ خۆی دابنــێ ﴿سُبۡحَٰنَهُۥ﴾ (پاکــی‌و بێگــەردی بــۆ خــوا) لــە وەی بێبڕوایــان گومانــی پێدەبــەن، یان نکووڵیــکاران دەیدەنــە پاڵی.

﴿هُوَ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ﴾ واتــە: تەنهایــە لــە زاتیــداو لە ناوەکانــی‌و لــە ســیفاتەکانیدا، هاووێنەو شــێوەی نیــە لە شــتێ لەوانــەدا، ئەگەر منداڵــی بووایە واپێویســت دەکــرد لەو بچووایــە لە تاک‌و تەنهاییــدا، چونکــە هەندێکــی بەشــێکە لــە ئــەو زاڵــە بەســەر هەمــوو جیهــان، جیهانی ســەرەوەو خــوارەوە، جــا ئەگــەر منداڵی بووایــە ئــەوە زاڵ نەدەبوو، وە لــە باوکیەوە وەریدەگــرت‌و دەگونجا

بـۆی. تەنهایـیو زاڵێتـی خـوا تەواو کـەری یەکترین، تـاکو تەنها هەر دەبـێ زاڵ بێـت، زاڵیش هـەر دەبێـت تەنهـا بێت، ئـەوەش هاوبەشـی ڕەتدەکاتـەوە بە هەمـوو جۆرێک.

(٥-٧): ﴿ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۖ يُكَوِّرُ ٱلَّيْلَ عَلَى ٱلنَّهَارِ وَيُكَوِّرُ ٱلنَّهَارَ عَلَى ٱلَّيْلِ ۖ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ ۖ كُلٌّ يَجْرِى لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ۗ أَلَا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفَّٰرُ ﴿٥﴾ خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلْأَنْعَٰمِ ثَمَٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍ ۚ يَخْلُقُكُمْ فِى بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ خَلْقًا مِّنۢ بَعْدِ خَلْقٍ فِى ظُلُمَٰتٍ ثَلَٰثٍ ۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ ٱلْمُلْكُ ۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ ﴿٦﴾ إِن تَكْفُرُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ عَنكُمْ ۖ وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَ ۖ وَإِن تَشْكُرُوا۟ يَرْضَهُ لَكُمْ ۗ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۗ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرْجِعُكُمْ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٧﴾ ﴾:

خـوا ﷻ هەواڵ دەدات کـە بێگومان ئەو ﴿ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ﴾، واتە: (ئاسـمانەکانو زەوی بەدیهێنـاوە) بـە حیکمـەتو بەرژەوەندی، وە بـۆ ئەوەی فەرمان بـە بەندەکان بـکاتو قەدەغەیان لـێ بـکاتو پاداشـتو سـزایان بداتـەوە.﴿ بِٱلْحَقِّ ۖ يُكَوِّرُ ٱلَّيْلَ عَلَى ٱلنَّهَارِ وَيُكَوِّرُ ٱلنَّهَارَ عَلَى ٱلَّيْلِ ﴾ واتـە: هـەر یەکێک لە شـەوو ڕۆژ دەهێنێ بەسـەر ئـەوی ترداو لـە جێگای دایدەنـێ، ئەمە لەگەڵ ئـەوەدا کۆناکاتـەوە، بەڵکـو ئەگەر دانەیەکیـان هات ئەوەی دیکە دەسـەڵاتی نامێنـێو دەڕوات.

﴿ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ ﴾ بـە ڕێکخسـتنێکی ڕێـکو پێـکو ورد ﴿ كُلٌّ ﴾ (هەریەکە لە) خـۆرو مانگ ﴿ يَجْرِى ﴾ لـە ژێر کاریگـەری ڕامهێنانی خـوا، ﴿ لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾ ئەویش کۆتایی هاتنـی ژیانـی ئـەوماڵەو تێکچوونیەتـی، ئنجا خوا کەرەسـتەکانی لە نـاو دەبات لە خـۆرو مانگ، خەڵکـی دروسـت دەکاتـەوە بە دروسـتکردنێکی تـازە، بۆ ئـەوەی جێگیر بـن لە ماڵـی مانەوەدا، بەهەشـت یان دۆزەخ.

﴿ أَلَا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ﴾ (واتـە: بێداربـە ئـەو زاتـە زاڵـی لێبوردەیە) کە کـەس زاڵ نابێ بەسـەریدا، زاڵە بەسـەر هەمـوو شـتێکدا هیـچ شـتێکی لـێ یاخـی نابێت، ئـەو زاتە لـە عیزەتـی ئـەم بەدیهێنراوە مەزنانـەی بـەدی هێنـاوە، وە ڕامی هێنـاون بە فەرمانـی ئـەو بگەڕێـن، ﴿ ٱلْغَفَّٰرُ ﴾ (لێبوردەیە) بۆ داوای لێخۆشـبوونی بەنـدە بڕوادارەکانـی، هەروەکـو خوا فەرموویەتـی: ﴿ وَإِنِّى لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ثُمَّ ٱهْتَدَىٰ ﴿٨٢﴾ ﴾ طـه (واتـە: بەڕاسـتی مـن زۆر لێبوردەم لەو کەسـەی تەوبەی کردبێو بـاوەڕی هێنابـێو کـردەوەی چاکـی کردبـێ، پاشـان بـەردەوام بووبـێ لەسـەر ئـەو ڕێبـازە)، لێبوردەیـە بـۆ ئـەو کەسـەی هاوەڵی بۆ دانـاوە، دوای ئـەوەی نیشـانە مەزنەکانی بینـیو داوای لێ خۆشـبوونی کرد.

خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ ثُمَّ جَعَلَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَأَنزَلَ لَكُم
مِّنَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ ثَمَٰنِيَةَ أَزۡوَٰجٖۚ يَخۡلُقُكُمۡ فِي بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡ
خَلۡقٗا مِّنۢ بَعۡدِ خَلۡقٖ فِي ظُلُمَٰتٖ ثَلَٰثٖۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡ لَهُ
ٱلۡمُلۡكُۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ فَأَنَّىٰ تُصۡرَفُونَ ٦ إِن تَكۡفُرُواْ فَإِنَّ
ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنكُمۡۖ وَلَا يَرۡضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلۡكُفۡرَۖ وَإِن تَشۡكُرُواْ يَرۡضَهُ
لَكُمۡۗ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٞ وِزۡرَ أُخۡرَىٰۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرۡجِعُكُمۡ
فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَۚ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ٧
۞ وَإِذَا مَسَّ ٱلۡإِنسَٰنَ ضُرّٞ دَعَا رَبَّهُۥ مُنِيبًا إِلَيۡهِ ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُۥ نِعۡمَةٗ
مِّنۡهُ نَسِيَ مَا كَانَ يَدۡعُوٓاْ إِلَيۡهِ مِن قَبۡلُ وَجَعَلَ لِلَّهِ أَندَادٗا لِّيُضِلَّ
عَن سَبِيلِهِۦۚ قُلۡ تَمَتَّعۡ بِكُفۡرِكَ قَلِيلًا إِنَّكَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِ
٨ أَمَّنۡ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيۡلِ سَاجِدٗا وَقَآئِمٗا يَحۡذَرُ ٱلۡأٓخِرَةَ
وَيَرۡجُواْ رَحۡمَةَ رَبِّهِۦۗ قُلۡ هَلۡ يَسۡتَوِي ٱلَّذِينَ يَعۡلَمُونَ وَٱلَّذِينَ
لَا يَعۡلَمُونَۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ٩ قُلۡ يَٰعِبَادِ ٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمۡۚ لِلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٞۗ
وَأَرۡضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٌۗ إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجۡرَهُم بِغَيۡرِ حِسَابٖ ١٠

(٦): وە لە عیزەتی خوا ئەوەیە کە ﴿خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ﴾ (واتە: ئێوەی لە تاکە کەسێک ئادەم دروست کردوە) بەو هەموو زۆریو بڵاوبوونەوەتان لەسەر زەویدا ﴿ثُمَّ جَعَلَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا﴾ (واتە: پاشان لەو کەسە هاوسەرێکی بەدیهێناوە) ئەویش بۆ ئەوەی لە لای بحەسێتەوەو ئارام بگرێ، هاوسەرەکەیشی بە هەمان شێوە، ﴿وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ﴾ واتە: دروستی کردوە بۆتان بە قەدەرێک دابەزاندووە، وەک میهرەبانیەک بۆتان ﴿ثَمَٰنِيَةَ أَزۡوَٰجٖ﴾ (هەشت جووت) ئەویش ئەوەیە لە سوورەتی ئەنعام باسی کردوە: ﴿ثَمَٰنِيَةَ أَزۡوَٰجٖۖ مِّنَ ٱلضَّأۡنِ ٱثۡنَيۡنِ وَمِنَ ٱلۡمَعۡزِ ٱثۡنَيۡنِ ١٤٣﴾، (واتە: هەشت جووت ئاژەڵو ماڵات لە مەڕ دووانو لە بزن دووان)، ﴿وَمِنَ ٱلۡإِبِلِ ٱثۡنَيۡنِ وَمِنَ ٱلۡبَقَرِ ٱثۡنَيۡنِ ١٤٤﴾ (واتە: لە حوشتر دووانو لە ڕەشە وڵاخ دووان).

وە تایبەتی کردوون بە ناو هێنان لەگەڵ ئەوەدا ئاژەڵو جگە لە ئەوانیشی دابەزاندووە بۆ بەرژەوەندی بەندەکان، ئەمەش بە هۆی زۆری سوودو بەرژەوەندیان، وە لەبەر ڕێزو تایبەتمەندیان بە هەندێ شت ناگونجێ بۆ غەیری ئەو، وەکو قوربانیو گویزەوانە، پێویست بوونی زەکات تیایانداو تایبەتمەندیان بە خوێن بایی.

دوای ئەوەی باسی دروستکردنی باوکو دایکمانی کرد، باسی سەرەتای دروستبوونمانی کرد، جا فەرمووی: ﴿يَخۡلُقُكُمۡ فِي بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡ خَلۡقٗا مِّنۢ بَعۡدِ خَلۡقٖ﴾ واتە: (لە سکی دایکتان دروستان دەکات) بە دروستکردن دوای دروست کردن، ئێوە لە دۆخێکدان دەستی هیچ دروستکراوێکتان پێناگات دەستتان پێوە بدات، وە چاوێک نیە تەماشاتان بکات، ئەو زاتە ئێوەی پەروەردە کردوە لەو شوێنە تەسکو تەنگەدا ﴿فِي ظُلُمَٰتٖ ثَلَٰثٖ﴾ (واتە: لە سێ تاریکیدا) تاریکی ناو سک، تاریکی ناو منداڵدان، تاریکی پەردەی کۆرپەلە، ﴿ذَٰلِكُمُ﴾ ئەو زاتەی بەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەویە، وە خۆرو مانگی ڕامهێناوەو ئاژەڵەکانی دروست

کردوە ﴿ٱللَّهُ رَبُّكُمۡ﴾ واتە: ئەو پەرستراوەی پەروەردەی کردوونو کاروبارتان بەڕێوە دەبات، هەر وەک تاکو تەنهایە لە دروستکردنو پەروەردەکردندا، هاوبەشی نیە لەوانەدا، ئەو تاکو تەنهایە لە پەرستراوێتیداو هاوبەشی نیە.

لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿لَهُ ٱلۡمُلۡكُۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ فَأَنَّىٰ تُصۡرَفُونَ﴾ (واتە: دەسەلاتو پاشایەتی هەر هی ئەوە هیچ پەرستراوێ جگە لە زاتی ئەو نیە کەواتە چۆن لە ئاینی ڕاست لادەدرێن) دوای ئەم ڕوون کردنەوەیە بۆ بەندایەتی کردنی بتەکان، ئەوانەی هیچ شتێک بەڕێوە نابەن، هیچ دەسەڵاتێکیان لەو کاروبارەدا نیە؟!

(٧): ﴿إِن تَكۡفُرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنكُمۡ﴾ (واتە: ئەگەر ئێوە بێبڕوا بن ئەوە بێگومان خوا بێنیازە لە ئێوە) بێبڕوایی ئێوە زیان بە خوا ناگەیەنێ وەک چۆن گوێڕایەڵیتان سوود بە ئەو ناگەیەنێ، بەڵام فەرمانو قەدەغەکردنی بۆتان ڕوونو پەتیە لە فەزڵو چاکە ﴿وَلَا يَرۡضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلۡكُفۡرَ﴾ (واتە: وە ڕازی نیە بە بێبڕوایی بۆ بەندەکانی) بە هۆی تەواوی چاکەکانی بۆتان، وە دەزانی بێبڕوایی بەدبەختتان دەکات بە جۆرێ هەرگیز خۆشبەخت نابن بۆ هەمیشەیی، وە لەبەر ئەوە دروستی کردوون بۆ بەندایەتی کردنی، ئەوەش ئامانجێکە بەدیهێنراوەکانی لەو پێناوەدا بەدیهێناوە، ڕازی نابێ داوا لە بەدیهێنراوەکانی بکەن.

﴿وَإِن تَشۡكُرُواْ﴾ (ئەگەر سوپاسگوزرای) خوا بکەن بە یەکتاپەرستیو بە دڵسۆزیەوە گەردنکەچی بن، ﴿يَرۡضَهُ لَكُمۡ﴾ (لێتان ڕازی ئەبێ) بە هۆی میهرەبانیەوە بۆتان، وەبە خۆشویستنی بە چاکەکردن لەگەڵتاندا، وە لەبەر کردەوەکانتان کە لەو پێناوەدا دروست کراون.

هەر وەکو چۆن خوا زیانی پێناگات بە هاوبەشدانانتانو سوودیش وەرناگرێ بە کردەوەکانتانو یەکتاپەرستیتان، بەو شێوەیە هەریەکێ لە ئێوە، کردەوەی بۆ خۆیەتی لە خێرو لە شەڕ، ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٞ وِزۡرَ أُخۡرَىٰ﴾ (واتە: هیچ گوناهبارێ گوناهی کەسێکی تر هەڵناگرێ)، ﴿ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرۡجِعُكُمۡ﴾ (واتە: پاشان گەڕانەوەتان هەر بۆ لای خوایە) لە ڕۆژی دواییدا ﴿فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾ (واتە: ئەوسا هەواڵتان دەداتێ بەوەی کە دەتان کرد) هەواڵێک زانستی دەوری داوە، قەڵەمی بەسەردا هێناوە، وە لەسەرتانی نووسیوە پارێزەرە بەڕێزەکان، ئەندامەکانی جەستەتان شایەتی پێی داوە، پاداشتی هەریەکەتان دەداتەوە بەوەی شایستەیەتی.

﴿إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ واتە: (خوا ئاگادارە) بە خودی سینەکان، ئەوەیشی تیایدایە لە وەسفکردنی چاک یان خراپ، مەبەست لەم هەواڵە پاداشتدانەوەیە بە دادپەروەری تەواو.

(٨): ﴿ وَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَٰنَ ضُرٌّ دَعَا رَبَّهُۥ مُنِيبًا إِلَيْهِ ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُۥ نِعْمَةً مِّنْهُ نَسِىَ مَا كَانَ يَدْعُوٓاْ إِلَيْهِ مِن قَبْلُ وَجَعَلَ لِلَّهِ أَندَادًا لِّيُضِلَّ عَن سَبِيلِهِۦ ۚ قُلْ تَمَتَّعْ بِكُفْرِكَ قَلِيلًا ۖ إِنَّكَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلنَّارِ ﴿٨﴾ ﴾:

﴿ وَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَٰنَ ضُرٌّ دَعَا رَبَّهُۥ مُنِيبًا إِلَيْهِ ﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدات دەربارەی ڕێزو چاکەکانی بەندەکەی، وە کەمی سوپاسگوزاری بەندەکەی، ئەو بەندەیەی کاتێ تووشی زیانێک دەبێ لە نەخۆشی یان هەژاری یان کەوتنە ناو ناخۆشیو پەژارەی دەریاو زەریا یاخود جگە لەوە، ئەو باش دەزانێ هیچ کەس لەو حاڵەتەدا ڕزگاری ناکات جگە لە خوا نەبێ، داوای لێ دەکات بە ملکەچیو خۆ بەکەم زانینەوە، وە پەنای بۆ دەبات لە لابردنی ئەوەی تووشی بووەو زۆر پێداگری لەسەر دەکات. ﴿ ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُۥ ﴾ خوا ﴿ نِعْمَةً مِّنْهُ ﴾ بەوەی نارەحەتیو خەمو پەژارەکەی لەسەر لابرد، ﴿ نَسِىَ مَا كَانَ يَدْعُوٓاْ إِلَيْهِ مِن قَبْلُ ﴾ واتە: ئەو نارەحەتیەی بیر دەچێت کە لە خوا دەپاڕایەوە لەو پێناوەدا، بە جۆرێ وەکو ئەوە وایە هەرگیز تووشی ناخۆشی نەبوو بێت، وە بەردەوام دەبێ لەسەر هاوبەش دانان بۆ خوا.

﴿ وَجَعَلَ لِلَّهِ أَندَادًا لِّيُضِلَّ عَن سَبِيلِهِۦ ﴾ واتە: بۆ ئەوەی خۆی گومڕا بکاتو خەڵکیش گومڕا بکات، چونکە گومڕا کردن لقێکە لە گومڕایی، ئەو هەستاوە بە پێویستکراو بۆ ئەوەی بەڵگە بێت بۆ پەیوەست.

﴿ قُلْ ﴾ بەم یاخیە بڵێ کە نازونیعمەتی خوای گۆڕیوە بە بێبڕوایی: ﴿ تَمَتَّعْ بِكُفْرِكَ قَلِيلًا ۖ إِنَّكَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلنَّارِ ﴾ بێنیازت ناکا ئەوەی لەزەتی لێوەردەگری ئەگەر سەرەنجام دۆزەخ بێت، ﴿ أَفَرَءَيْتَ إِن مَّتَّعْنَٰهُمْ سِنِينَ ﴿٢٠٥﴾ ثُمَّ جَآءَهُم مَّا كَانُواْ يُوعَدُونَ ﴿٢٠٦﴾ مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يُمَتَّعُونَ ﴿٢٠٧﴾ ﴾ الشعراء. (واتە: تۆ پێم بڵێ ئەگەر چەند ساڵێ بە خۆشی بیان ژێنین × لە پاشان ئەو سزایەی کە لێی ترسێنرابوون بێت بۆیان × سوودیان پێناگەیەنێ ئەو هەموو خۆشیو ڕابواردنەی بەوان درابوو).

(٩): ﴿ أَمَّنْ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ سَاجِدًا وَقَآئِمًا يَحْذَرُ ٱلْءَاخِرَةَ وَيَرْجُواْ رَحْمَةَ رَبِّهِۦ ۗ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٩﴾ ﴾:

﴿ أَمَّنْ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ سَاجِدًا وَقَآئِمًا يَحْذَرُ ٱلْءَاخِرَةَ وَيَرْجُواْ رَحْمَةَ رَبِّهِۦ ﴾ (واتە: هاوبەشدانەران چاکترن یان کەسێ ملکەچو پەرستکارە بۆ خوا لەکاتەکانی شەودابە سوژدە بردنو ڕاوەستان لە سزای دوارۆژ دەترسێتو بە هیوای بەزەیی پەروەردگاریێتی)، ئەمە بەراورد کردنە لە نێوان ئەو کەسەی گوێڕایەڵی خوا دەکاو جگە لەو، وە لە نێوان زاناو نەفامدا، ئا ئەمە لەو کاروبارانەیە لە عەقڵدا چەسپیوە، وە بە دڵنیایی جیاوازیەکەی زانراوە، ئەو کەسەی پشتی لە گوێڕایەڵی

پەروەردگاری کردوەو شوێنی هەواو ئارەزووی کەوتووە، وەکو ئەو کەسە نیە گوێڕایەڵی پەروەردگاری دەکات بە چاکترینی عیبادەتەکان ئەویش نوێژە، وە چاکترینی کاتەکان ئەویش کاتەکانی شەوە، وەسفی کردوە بەزۆری کردەوەو چاکترینیان، پاشان وەسفی کردوە بە ترس‌و ئومێد بوون، وە باسی کردوە ئەوەی پەیوەستە بە ترسەوە سزای خوایە لەسەر تاوانەکانی پێشوو، وە ئەوەی پەیوەستە بە ئومێد بوون بە میهرەبانی خوا وەسفی کردوە بە کردەوەی ئاشکراو نهێنی.

﴿ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ ﴾ (واتە: بڵێ: ئایا یەکسانن ئەوانەی) خوا دەناسن‌و زانستیان هەیە دەربارەی ئاینی شەریعەتەکەی‌و ئاینی پاداشتی، وە ئەوەیشی لەوەدایە لە نهێنی‌و حیکمەتەکان ﴿ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ شتێ لەوانە؟ ئەوانەو ئەوانە هیچیان یەکسان نین، وەک چۆن یەکسان نیە شەوو ڕۆژو ڕۆشنایی‌و تاریکی‌و ئاوو ئاگر، ﴿ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ ﴾ ئەگەر یاد بخرێنەوە ﴿ أُولُو الْأَلْبَابِ ﴾ واتە: خاوەن عەقڵە چاک‌و زیرەکەکان، ئا ئەوانە شتی بەرز پێشدەخەن بەسەر شتی نزمدا، وە زانست پێش دەخەن بەسەر نەفامیدا، وە گوێڕایەڵی خوا بەسەر سەرپێچیدا، چونکە عەقڵێکیان هەیە ڕێنیشاندەریانە بۆ سەرنجدان لە داهاتوو، بە پێچەوانەی ئەو کەسەی دڵ‌و عەقڵی نیە، بێگومان ئەو کەسە هەواو ئارەزووی خۆی دەپەرستێ.

(١٠): ﴿ قُلْ يَا عِبَادِ الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا رَبَّكُمْ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا فِي هَٰذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةٌ وَأَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةٌ إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُمْ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿١٠﴾ ﴾:

﴿ قُلْ يَا عِبَادِ الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا رَبَّكُمْ ﴾ واتە: بڵێ‌و بانگەواز بکە بۆ بەڕێزترینی بەدیهێنراوەکان ئەوانیش بڕواداران، فەرمانیان پێ بکە بە چاکترینی فەرمانەکان، ئەویش خۆپارێزی‌و لەخوا ترسانە، وە هۆکاری پێویستیان بۆ باس بکە دەربارەی خۆپارێزی، ئەویش پەروەردگارێتی خوایە بۆیان‌و پێدانی نازونیعمەتەکانێتی بەسەریانەوە، کە وادەخوازێ ئەوان لێی بترسن‌و خۆپارێز بن، لەو نازونیعمەتانەش ئەوەیە خوا ﷻ منەتی کردوە بەسەریاندا بەبڕواهێنان، بێگومان ئەوەش خۆپارێزی پێویست دەکات. وەکو دەڵێی: ئەی بەخشندە ببەخشە، وە ئەی زیرەک بجەنگە. وە باسی پاداشتی چالاکەکەری کردوە بۆیان لە دونیادا، فەرموویەتی: ﴿ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا فِي هَٰذِهِ الدُّنْيَا ﴾ (واتە: کەسانێ لەم دونیایەدا چاکەیان کردوە پاداشتی چاکیان بۆ هەیە) بە بەندایەتی کردنی پەروەردگاریان بۆ ئەوان هەیە ﴿ حَسَنَةٌ ﴾ وە ڕزق‌و ڕۆزیەکی بەرفراوان‌و نەفس‌و دەروونێکی ئارام کەرەوەو دڵێکی کراوە، هەروەکو خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ مَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً ﴿٩٧﴾ ﴾ النحل، (واتە: هەرکەس

لە نێر یان لە مێ كردەوەی چاكی كردبێ‌و بڕواداریش بوویێت ئەوە سوێند بە خوا بە ژیانێكی خۆش دەیانژێنین)، ﴿ وَأَرۡضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٌ ﴾ (واتە: زەوی خوا بەرفراوانە) ئەگەر ڕێگریتان لێكرا لە بەندایەتی خوا لە شوێنێكدا ئەوە كۆچ بكەن بۆ شوێنێكی دیكە، بەندایەتی پەروەردگارتانی تێدابكەن‌و ئاینەكەتانی تێدا ڕابگرن.

كاتێ فەرمووی: ﴿ لِلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٌ ﴾ بۆ هەندێ لەنەفسەكان بوارێک هەبووە لەم جێگایەدا، ئەویش ئەوەیە دەقەكە گشتیە، بێگومان هەركەسێ چاكە بكات ئەوە لەدنیادا چاكەی بۆ دەبێ، چی دەوترێ دەربارەی كەسێ بڕوای هێنابێ لەزەویەكدا، بچەوسێتەوە تێیداو سەرزەنشت بكرێ، ئەوەی بۆ دەستەبەر نابێ، ئەم گومانەی ڕەتكردۆتەوە، بە فەمایشتی خۆی فەرمویەتی: ﴿ وَأَرۡضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٌ ﴾ وە لێرەدا مژدەیەک هەیە پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی پێكردوە بە وتەی: {لاَ يَزَالُ مِنْ أُمَّتِي أُمَّةٌ قَائِمَةٌ بِأَمْرِ اللَّهِ مَا يَضُرُّهُمْ مَنْ كَذَّبَهُمْ وَلاَ مَنْ خَالَفَهُمْ حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللَّهِ وَهُمْ عَلَى ذَلِكَ} (أخرجه البخاري: ٧٠٢٢) واتە: بەردەوام دەستەیەک هەیە لە ئۆممەتی من لەسەر حەق‌و ڕاستی ئاشكران، زیانیان پێ ناگەیەنێ ئەو كەسەی بە درۆیان دەزانێ‌و سەرشۆڕیان دەكات وە ئەو كەسەیشی پێچەوانەیان دەجوڵێ، هەتا فەرمانی خوا دێ ئەوان لەسەر حەق‌و ڕاستین.

ئەم فەرمودە ئاماژەی پێدەكات لە نزیكەوە، ئەویش ئەوەیە خوا ﷻ هەواڵیداوە زەوی ئەو بەرفراوانە. جا هەركاتێ ڕێگریتان لێكرا لە بەندایەتی خوا لەجێگایەک، ئەوە كۆچ بكەن بۆ جێگایەكی دیكە. ئەمە گشتیە بۆ هەموو سەردەم‌و شوێنێک، بێگومان پێویستە بۆ هەموو كۆچكەرێ پەنایەک هەبێ لەلای مسوڵمانان پەنای بۆ ببات، وە جێگایەک هەبێ بتوانێ ئاینەكەی خۆی تێدا بەرپا بكات.

﴿ إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجۡرَهُم بِغَيۡرِ حِسَابٖ ﴾ (واتە: بەڕاستی تەنها دان بە خۆداگران بێ ژمارە پاداشتیان دەدرێتەوە) ئەمەش گشتیە بۆ هەموو جۆرەكانی ئارامگرتن: ئارامگرتن لەسەر قەزاو قەدەرە بەئێشەكان، نابێ پێی تووڕەبێ‌و نارازی بێ. ئارامگرتن لەسەر سەرپێچیەكان نابێ ئەنجامیان بدات، ئارامگرتن لەسەر گوێڕایەڵی خوا هەتا ئەنجامی دەدات، خوا ﷻ پەیمانیداوە بە خۆڕاگران‌و ئارامگران بە پاداشتێكی بێ ژمارە، واتە: پاداشتێک بەبێ سنوورو بێ ژماردن‌و بەبێ ئەندازە، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ فەزڵ‌و چاكەی ئارامگرتن‌و پلەو پایەی لەلای خوا، وە ئەو یارمەتیدەرە لەسەر هەموو كاروبارەكان.

قُلْ إِنِّيٓ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ ٱلدِّينَ (١١) وَأُمِرْتُ لِأَنْ أَكُونَ
أَوَّلَ ٱلْمُسْلِمِينَ (١٢) قُلْ إِنِّيٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ
(١٣) قُلِ ٱللَّهَ أَعْبُدُ مُخْلِصًا لَّهُۥ دِينِي (١٤) فَٱعْبُدُوا۟ مَا شِئْتُم مِّن دُونِهِۦ
قُلْ إِنَّ ٱلْخَٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ
أَلَا ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْخُسْرَانُ ٱلْمُبِينُ (١٥) لَهُم مِّن فَوْقِهِمْ ظُلَلٌ مِّنَ ٱلنَّارِ
وَمِن تَحْتِهِمْ ظُلَلٌ ذَٰلِكَ يُخَوِّفُ ٱللَّهُ بِهِۦ عِبَادَهُۥ يَٰعِبَادِ فَٱتَّقُونِ (١٦)
وَٱلَّذِينَ ٱجْتَنَبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ أَن يَعْبُدُوهَا وَأَنَابُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ
فَبَشِّرْ عِبَادِ (١٧) ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ
أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ (١٨)
أَفَمَنْ حَقَّ عَلَيْهِ كَلِمَةُ ٱلْعَذَابِ أَفَأَنتَ تُنقِذُ مَن فِي ٱلنَّارِ (١٩)
لَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ رَبَّهُمْ لَهُمْ غُرَفٌ مِّن فَوْقِهَا غُرَفٌ مَّبْنِيَّةٌ تَجْرِي
مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ وَعْدَ ٱللَّهِ لَا يُخْلِفُ ٱللَّهُ ٱلْمِيعَادَ (٢٠) أَلَمْ تَرَ
أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَسَلَكَهُۥ يَنَٰبِيعَ فِي ٱلْأَرْضِ ثُمَّ
يُخْرِجُ بِهِۦ زَرْعًا مُّخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ
يَجْعَلُهُۥ حُطَٰمًا إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِأُو۟لِي ٱلْأَلْبَٰبِ (٢١)

**(١١-١٦):** ﴿قُلْ إِنِّيٓ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ ٱلدِّينَ (١١) وَأُمِرْتُ لِأَنْ أَكُونَ أَوَّلَ ٱلْمُسْلِمِينَ (١٢) قُلْ إِنِّيٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ (١٣) قُلِ ٱللَّهَ أَعْبُدُ مُخْلِصًا لَّهُۥ دِينِي (١٤) فَٱعْبُدُوا۟ مَا شِئْتُم مِّن دُونِهِۦ قُلْ إِنَّ ٱلْخَٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَلَا ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْخُسْرَانُ ٱلْمُبِينُ (١٥) لَهُم مِّن فَوْقِهِمْ ظُلَلٌ مِّنَ ٱلنَّارِ وَمِن تَحْتِهِمْ ظُلَلٌ ذَٰلِكَ يُخَوِّفُ ٱللَّهُ بِهِۦ عِبَادَهُۥ يَٰعِبَادِ فَٱتَّقُونِ (١٦)﴾:

﴿قُلْ﴾ ئـەی پێغەمبەر ﷺ بڵێ بە خەڵکی: ﴿إِنِّيٓ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ ٱلدِّينَ﴾ ئەم وتەی خوا ﷻ کە لە سەرەتای ئەم سوورەتەیە: ﴿فَٱعْبُدِ ٱللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ ٱلدِّينَ (٢)﴾ (واتە: بەندایەتی بۆ خوا بکە بە دڵسۆزیەوە بۆی ملکەچ بە).

**(١٢):** ﴿وَأُمِرْتُ لِأَنْ أَكُونَ أَوَّلَ ٱلْمُسْلِمِينَ﴾ (واتە: فەرمانم پێدراوە کە یەکەمی مسوڵمانان بم) چونکە من بانگەوازکاری ڕێنماییکاری خەڵکیم بۆ لای پەروەردگاریان، بۆیە پێویستە من یەکەم کەس بم فەرمانی خوا جێبەجێ بکەمو یەکەم کەس بم مسوڵمان بم، ئەم کارە هەر دەبێ لە پێغەمبەرداﷺ ڕوو بدات، وە لەو کەسانەش کە پێیان وایە شوێنکەتووی ئەون، پێویستە ئیسلامەتی ڕەنگ بداتەوە لە کردەوە ئاشکراکانیاندا، وە دڵسۆز بوون بۆ خوا ﷻ لە کردەوە ئاشکراو نهێنیەکانیان.

**(١٣):** ﴿قُلْ إِنِّيٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي﴾ لەوەی فەرمانی پێکردووم لە دڵسۆزبوونو مسوڵمان بوون ﴿عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ تیایدا دەمێنێتەوە ئەو کەسەی هاوەڵی داناوە، وە سزا دەدرێ ئەو کەسەی سەرپێچی کردوە.

**(١٤-١٥):** ﴿قُلِ ٱللَّهَ أَعْبُدُ مُخْلِصًا لَّهُۥ دِينِي (١٤) فَٱعْبُدُوا۟ مَا شِئْتُم مِّن دُونِهِۦ﴾ هەروەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ (١) لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ (٢) وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ (٣) وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ (٤) وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ (٥) لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ (٦)﴾ الكافرون، (واتە: بڵێ ئەی بێبڕواینە × من ئەو بتانە ناپەرستم کە ئێوە دەیپەرستن × وە ئێوەش خوای

مـن ناپەرستن کـە من دەیپەرسـتم × وە من ئەو خواپەرسـتیە ناکـەم کە ئێـوە دەیکەن × وە ئێـوەش ئـەو خواپەرسـتیە ناکـەن کـە من دەیکـەم × ئاینـی خۆتان بـۆ خۆتـان، ئاینی خۆم بۆ خـۆم).

﴿ قُلْ إِنَّ ٱلْخَـٰسِرِينَ ﴾ حەقیقـەت ئـەوان ﴿ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ﴾ کاتـێ بێبەشـیان کـردن لـە پاداشـت، وە بـە هۆیانـەوە شایسـتەی خراپتریـن سـزا بـوو، ﴿ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ﴾ جیایـان دەکاتـەوە نێوانـی ئـەوانو ئـەوان، خـەمو پـەژارە بـە تەواوەتـی دایاندەگـرێو تووشـی زەرەرمەندیەکـی گـەورە دەبـن ﴿ أَلَا ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْخُسْرَانُ ٱلْمُبِينُ ﴾ ئـەو خەسـارەتمەندیەی کـە هاوشـێوەی نیـە، ئەویـش خەسـارەتمەندی بەردەوامـە، هیچ قازانجێـک لە دوای نایـە بەڵکو هیـچ سـەلامەتیەکیش.

(١٦): پاشـان باسـی توونـدی نارەحەتـیو بەدبەختیـان دەکات جـا فەرموویەتـی: ﴿ لَهُم مِّن فَوْقِهِمْ ظُلَلٌ مِّنَ ٱلنَّارِ ﴾ واتـە: (بـۆ ئـەوان هەیە لـەلای سـەریانەوە) چەند پارچەیـەک هەوری ڕەش لـە سـزای مـەزن، ﴿ وَمِن تَحْتِهِمْ ظُلَلٌ ﴾ (واتـە: لـە ژێریانیشـەوە چەنـد چینێـک هەیە) ﴿ ذَٰلِكَ ﴾ ئـەو وەسـفەی کە وەسـفی سـزای خەڵکی ناو ئاگرمـان پێکـرد گورزێکە خوا ﷻ بەندەکانـی پـێ دەترسـێنێ بـۆ لای ڕەحمـەتو میهرەبانـی خـۆی، ﴿ يُخَوِّفُ ٱللَّهُ بِهِۦ عِبَادَهُۥ ۚ يَـٰعِبَادِ فَٱتَّقُونِ ﴾ ئـەوەی داینـاوە بـۆ بەدبەختـان لـە سـزا، هۆکارێکە بانگـی بەندەکانـی دەکات بۆ خۆپارێـزی، وە سەرزەنشـت کردنێکـە لەوەی سـزا پێویسـت دەکات.

پاکـیو بێگـەردی بـۆ ئەو خوایـەی بەزەیی بـە بەندەکانیدا هاتۆتـەوە لە هەموو شـتێکدا، وە ڕێگـای گەیشـتن پێـی بۆیان ئاسـان کـردوە، وە هانیداون لەسـەر گرتنەبـەری، وە نەفسو دەروونەکانـی تامـەزرۆ کـردوە بـۆ لایو دڵەکانیشـی بـۆی ئـارام کـردوە، وە ئاگـاداری کردوونەتـەوە بـۆ کارکـردن جگـە لـەو بەوپـەڕی ئاگادارکردنـەوە، وە باسـی هـۆکارە سەرزەنشـتکراوەکانی کـردوە لـە وازهێنانی.

(١٧-١٨): ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱجْتَنَبُوا۟ ٱلطَّـٰغُوتَ أَن يَعْبُدُوهَا وَأَنَابُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ ۚ فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴿١٧﴾ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿١٨﴾ ﴾:

کاتـێ خوا ﷻ باسـی حاڵـی تاوانبارانی کرد، ئنجا باسـی حاڵی ئەوانەی کـردوە گەڕاونەتەوە بـۆ لای خـوا، وە پاداشـتەکانیان، جـا فەرمـووی: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱجْتَنَبُوا۟ ٱلطَّـٰغُوتَ أَن يَعْبُدُوهَا ﴾ (واتـە: کەسـانێ کـە پەرسـتنی بـتو هەمـوو پەرسـتراوانی تـر خۆیـان پاراسـتووە) مەبەسـت لە (طاغـوت) لـەم شـوێنەدا بەندایەتـی جگە لـە خوایـە، دورکەوتوونەتەوەو خۆیان پاراسـتووە

لــە بەندایەتــی کردنــی، ئەمە لــە چاکتریــن پارێزگاریە لە لایەن کاردروســتی بــە حیکمەتی زانــاوە، چونکــە ســتایش کــردن ئــەو کەســە دەگرێتەوە خــۆی دور دەگــرێ لــە بەندایەتی کردنی.

﴿ وَأَنَابُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ ﴾ بــە بەندایەتــی کردنــیو بــە دڵســۆزیو ملکــەچ بــوون بــۆی، وازیــان هێنا لــە بەندایەتــی بتــەکان بــۆ لای بەندایەتی پاشــای زۆر زاناو گەڕانــەوە، وە لە هاوبەشــدانانو ســەرپێچیکردن بــۆ لای یەکتاپەرســتیو گوێڕایەڵی.

﴿ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ ﴾ کــە بــە هیــچ جــۆرێ ئەنــدازە ناکــرێ، وە وەسفیشــی نازانــرێ، جگــە لــەو زاتــەی ڕێــزی لێگرتــوون بــەو مژدەیەوە، ئەمە گشــتگیرە بــۆ مــژدەدان لە ژیانــی دنیادا بە ستایشــی چــاکو خــەوی چاکــەو یارمەتــی پەروەردگار لــە لایەن خــواوە، کە لــە میانەی ئــەو مــژدەوە ڕێــزی خــوا دەبینن لــە دنیــاو دواڕۆژدا، وە مژدەیان بــۆ هەیە لــە دواڕۆژدا لە کاتــی ســەرەمەرگو لە نــاو گــۆڕو لــە دواڕۆژ، وە کۆتایی مژدە، ئــەوەی مژدەیــان پێدەدا پەروەردگــاری بەخشــندە لە بەردەوامــی ڕەزامەندیو چاکەکانی ئاسایشــیان لەناو بەهەشــتدا.

(١٨): دوای ئەوەی هەواڵی دا ئەوان مژدەیان بۆ هەیە، خوا فەرمانی کردوە بە مژدەدانیان، وە باسی ئەو وەسفەی کردوە شایستەی ئەوەن مژدەیان پێبدرێ، جا فەرموویەتی: ﴿ فَبَشِّرْ عِبَادِ ١٧ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ ﴾ (واتە: کەواتە مژدە بدە بە بەندەکانم × ئەوانەی گوێ دەگرن بۆ قسەو گوفتار) ئەمە ڕەگەزە گشت قسەیەک دەگرێتەوە، ئەوان گوێ دەگرن لە ڕەگەزی قسەو گوفتار، بۆ ئەوەی جیای بکەنەوە لە نێوان ئەوەی پێویست بکات هەڵبژێرن لەوەی پێویست بکات لێی دووربکەونەوە، جا ئەمە -لە خۆڕاگریو ژیریانە- ئەوان شوێنی چاکترینی دەکەون. وە چاکترینی قسەکان بە ڕەهایی قسەی خوای گەورەو پێغەمبەرەکەیەتی، وەک لەم سووڕەتەدا فەرموویەتی: ﴿ ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ ٱلْحَدِيثِ كِتَٰبًا مُّتَشَٰبِهًا ٢٣ ﴾الزمر. (واتە: خوا جوانترین فەرمایشتی ناردوەتە خوارەوە قورئانێکە ئایەتەکانی لە یەکچووی دووپات کراوەن).

لــەم دەقــەدا خاڵێکــی جوان بــەدی دەکرێ ئەویش: خــوا ﷻ کاتــێ هەواڵــی داوە دەربارەی ئەوانــەی ســتایش کــراون، بێگومان ئەوانە گوێبیســتی قســەو گوفتار دەبن، پاشــان شــوێنی چاکترینــی ئەو قســانە دەکــەون، وەکو ئــەوەی وترابێ: ئایــا ڕێگایەک هەیە بۆ ناســینەوەی چاکترینیــان، هەتا وەســف بکرێن بە ســیفاتی خــاوەن دڵــەکان، وە تا لە شــوێنەوارەکەیەوە بزانیــن ئــەوە لــە خــاوەن دڵو هۆشــەکانە؟ وتــرا: بەڵــێ، چاکترینیــان ئەوەیــە خــوا باســی کــردوە: ﴿ ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ ٱلْحَدِيثِ كِتَٰبًا مُّتَشَٰبِهًا ﴾.

(دەفەرمـوێ:) ﴿ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ﴾ بـۆ چاكتریـن ڕەوشـتو كـردەوەكان، ﴿ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمْ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾ واتـە: خـاوەن عەقڵە زیرەكـەكان. لە ژێـریو خۆڕاگریـان ئـەوان چاكیـان ناسـیوە لـە غەیـری چـاك، وە ئـەوەی پێویسـتە بە چـاك بزانـرێ بـە چاكیـان زانیـوە، ئەمـەش نیشـانەی عەقڵـە، بەڵكـو نیشـانەیەك نیە بۆ عەقـڵ بێجگـە لەوە، بێگومان ئەو كەسـەی قسـە چاكو خراپـەكان لە یەكتـر جیاناكاتەوە، خـاوەن عەقڵـی ڕاسـت نیـە، یان جیـای دەكاتـەوە، بـەڵام هـەواو ئـارەزووی زاڵە بەسـەر عەقڵیـدا، عەقڵـی شـوێنكەوتووی ئارەزوویەتـی، بۆیـە چاكی پەسـند نەكردوە، ئـەوە عەقڵی ناتەواوە.

(١٩-٢٠): ﴿ أَفَمَنْ حَقَّ عَلَيْهِ كَلِمَةُ ٱلْعَذَابِ أَفَأَنتَ تُنقِذُ مَن فِى ٱلنَّارِ ﴿١٩﴾ لَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ رَبَّهُمْ لَهُمْ غُرَفٌ مِّن فَوْقِهَا غُرَفٌ مَّبْنِيَّةٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ وَعْدَ ٱللَّهِ لَا يُخْلِفُ ٱللَّهُ ٱلْمِيعَادَ ﴿٢٠﴾ ﴾

﴿ أَفَمَنْ حَقَّ عَلَيْهِ كَلِمَةُ ٱلْعَذَابِ أَفَأَنتَ تُنقِذُ مَن فِى ٱلنَّارِ ﴿١٩﴾ لَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ رَبَّهُمْ لَهُمْ ﴾ واتـە: ئایـا كەسـێك بەڵێنـی سـزای لەسـەر پێویسـت بووبێـت، بـە هـۆی بـەردەوام بوونـی لەسـەر گومڕایـیو عینـادیو بێبڕوایـی، ئـەوە تۆ هیـچ توانایەكت نیە بـۆ ڕێنمایی كردنـی، ناتوانی كەسـێ ڕزگـار بكەیت كە لە ئاگری دۆزەخدایـە. بەڵام دەوڵەمەندی ئەوپـەڕی دەوڵەمەندی، سـەركەوتن ئەوپـەڕی سـەركەوتن بـۆ خۆپارێزانە، ئەوانـەی بۆیان ئامـادە كراوە لـە ڕێزو حورمـەتو جۆرەهـا نـازو نیعمەت، كـە هیچ كـەس ناتوانـێ ئەنـدازەی بكات.

(٢٠): ﴿ لَهُمْ غُرَفٌ ﴾ واتـە: كۆشـكو تـەلاری بـەرز ڕازاوەتـەوە لـە جوانـیو پاكـیو ڕووناكیـدا لـە دەرەوە نـاوەوەی دەبینـرێ، لـە نـاوەوەش دەرەوەی دەبینـرێ، وە لـە بـەرزیو بڵنـدیو ئـەو ماڵانـە دەبینـرێ وەك چـۆن ئەسـتێرەكان لـە ڕۆژهـەڵات، یـان لـە ڕۆژئـاوا دەبینرێـن، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ مِّن فَوْقِهَا غُرَفٌ ﴾ واتـە: هەنـدێ لـەو نهۆمانـە لـە سـەرووی هەندێكـی دیكـەوەن، ﴿ مَّبْنِيَّةٌ ﴾ (بونیـاد نـراون) بـە زێـڕو زیـو، قوڕەكـەی میسـكی بـۆن خۆشـە.

﴿ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ﴾ هەڵقـوڵاوە، ئـاوی باخچـە ڕازاوەكانو دارە پاكـەكان دەدات، جۆرەهـا بەرهەمی بەلـەزەتو میوەی تازە پێگەیشـتوو پێشـكەش دەكات. ﴿ وَعْدَ ٱللَّهِ لَا يُخْلِفُ ٱللَّهُ ٱلْمِيعَادَ ﴾ (واتـە: ئەمـە بەڵێنـی خوایـە خـواش بەڵێنـی خـۆی دەباتـە سـەر) پەیمانی بە خۆپارێـزان داوە بـەم پاداشـتە، هەر دەبێ بیباتە سـەر، دەی ئێـوەش سـیفاتەكانی خۆپارێزی لـە خۆتانـدا بێننـە دی، بۆ ئـەوەی پاداشـتی بـێ پایانتـان بدرێتەوە.

(٢١): ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَسَلَكَهُۥ يَنَٰبِيعَ فِى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ يُخْرِجُ بِهِۦ زَرْعًا مُّخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَجْعَلُهُۥ حُطَٰمًا ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢١﴾ ﴾:

﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَسَلَكَهُۥ يَنَٰبِيعَ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾ خـوا ﷻ یـادی خاوەن دڵو عەقڵە ژیـرەکان دەخاتـەوە، لـەو بارانـەی لـە ئاسـمانەوە باراندوویەتـی، ئنجـا ئـەو بارانـە دەبات بـە نـاوی زەویـدا، کانیاوەکانـی لێدەردێنـێ بـە شـێوەیەکی سـووکـو ئاسـان، ﴿ ثُمَّ يُخْرِجُ بِهِۦ زَرْعًا مُّخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهُۥ ﴾ لـە گەنـمو جـۆو برنـجو جگـە لەوانە، ﴿ ثُمَّ يَهِيجُ ﴾ (پاشـان وشـک دەبێتـەوە) لـەو کاتەی بـە تەواوەتـی پێدەگات، یان لەو کاتەی تووشـی بەڵاو نەخۆشـیەک دەبێـت ﴿ فَتَرَىٰهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَجْعَلُهُۥ حُطَٰمًا ﴾ لەتو پەتـی دەکات ﴿ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾ یـادی پێدەکەنـەوە، لـە گرنگـی دانـی پەروەردگاریـانو بەزەیی هاتنـەوەی بە بەندەکانـی، کاتـێ ئەو ئاوەی بۆ ئاسـان کردوون، وە لـە گەنجینەی زەویدا بۆی پاراسـتوون بـە پێـی بەرژەوەندیەکانیان.

وە یـادی پێدەکەنـەوە بـە تـەواوی دەسـەڵاتی خوا کـە بێگومان ئـەو زاتە مـردوو زیندوو دەکاتـەوە، وەک چـۆن زەوی زینـدوو کـردەوە دوای مردنی، وە یـادی پێدەکەنەوە کە ئەو زاتـەی ئەنجامـدەری هەمـوو ئەوانەیە، هـەر ئەو شایسـتەی بەندایەتی بـۆ کردنە.

خوایـە بمانگێـڕی لـە خـاوەن دڵـەکان، ئەوانـەی باسـتکردوون بـە یادکردنـەوەو ڕێنمایی وەرگرتنیـان، بـەوەی پێـت بەخشـیون لـە عەقڵـەکان، وە نهێنـی کتێبەکـەتو ئایەتەکانی خـۆت پێیان نیشـانداوە، کە نەگەیشـتووە بە غەیـری ئەوان، بەڕاسـتی تەنها تۆ بەخشـندەی.

أَفَمَن شَرَحَ اللَّهُ صَدْرَهُ لِلْإِسْلَامِ فَهُوَ عَلَىٰ نُورٍ مِّن رَّبِّهِ ۚ فَوَيْلٌ
لِّلْقَاسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكْرِ اللَّهِ ۚ أُولَٰئِكَ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴿٢٢﴾
اللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ الْحَدِيثِ كِتَابًا مُّتَشَابِهًا مَّثَانِيَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ
جُلُودُ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ
إِلَىٰ ذِكْرِ اللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُدَى اللَّهِ يَهْدِي بِهِ مَن يَشَاءُ ۚ وَمَن
يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ ﴿٢٣﴾ أَفَمَن يَتَّقِي بِوَجْهِهِ سُوءَ
الْعَذَابِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ۚ وَقِيلَ لِلظَّالِمِينَ ذُوقُوا مَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ
﴿٢٤﴾ كَذَّبَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَأَتَاهُمُ الْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ
لَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٥﴾ فَأَذَاقَهُمُ اللَّهُ الْخِزْيَ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ۖ وَلَعَذَابُ
الْآخِرَةِ أَكْبَرُ ۚ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ ﴿٢٦﴾ وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِي
هَٰذَا الْقُرْآنِ مِن كُلِّ مَثَلٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٧﴾ قُرْآنًا عَرَبِيًّا
غَيْرَ ذِي عِوَجٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿٢٨﴾ ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا رَّجُلًا فِيهِ
شُرَكَاءُ مُتَشَاكِسُونَ وَرَجُلًا سَلَمًا لِّرَجُلٍ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًا ۚ
الْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٩﴾ إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم
مَّيِّتُونَ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عِندَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ ﴿٣١﴾

**(٢٢):** ﴿ أَفَمَن شَرَحَ اللَّهُ صَدْرَهُ لِلْإِسْلَامِ فَهُوَ عَلَىٰ نُورٍ مِّن رَّبِّهِ ۚ فَوَيْلٌ لِّلْقَاسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكْرِ اللَّهِ ۚ أُولَٰئِكَ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴿٢٢﴾ ﴾:

﴿ أَفَمَن شَرَحَ اللَّهُ صَدْرَهُ لِلْإِسْلَامِ ﴾ ئایا یەکسانە کەسێ خـوا ﷻ سـینەی گوشـاد کردبێ بۆ ئیسـلام، بەرفـراوان بووبێت بـۆ وەرگرتنی، بڕیارەکانـی خـواو کارپێکردنیـان، گوشـاد بووبـێ بیلبیلـەی چاوەکانـی لەسـەر بەرچاو ڕوونـی لەکارەکانیـدا، ئەویـش مەبەسـتە لە فەرمایشـتی خوا ﷻ کـە فەرمویەتی: ﴿ فَهُوَ عَلَىٰ نُورٍ مِّن رَّبِّهِ ﴾ (واتـە: ئەو لەسـەر ڕێبازی ڕووناکـی پەروەردگارێتی) وەکو کەسـێک بـەو شـێوەیە نەبـێ؟ بـە بەڵگـەی ئایەتـی: ﴿ فَوَيْلٌ لِّلْقَاسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكْرِ اللَّهِ ﴾ واتـە: دڵـی نـەرم نابێ لە ئاسـتی کتێبی خـواداو بیر لـە ئایەتەکانی ناکاتـەوەو بەیادکردنـەوەی دڵی ئـارام نابـێ، بەڵکو پشـتی لە پەروەردگـاری کردوە، لای کردۆتـەوە بۆ غەیری ئـەو، ئا ئەوانە سـزای زۆر توونديـان بۆ هەیـە وە شـەڕی گـەورە، ﴿ أُولَٰئِكَ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴾ چ گومڕاییەک گەورەتـرە لـە گومڕایی کەسـێ پشـتی لـە دۆسـتو پشـتیوانەکەی کردبـێ، وە لـە هەموو خۆشـبەختیەک لـە ڕووتێکردنـی، وە دڵی ڕەق بووە لـە بەرانبەر یادی خـواداو ڕووی کردۆتە هەمـوو ئەوانـەی زیانـی پێدەگەیەنێت.

**(٢٣):** ﴿ اللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ الْحَدِيثِ كِتَابًا مُّتَشَابِهًا مَّثَانِيَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَىٰ ذِكْرِ اللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُدَى اللَّهِ يَهْدِي بِهِ مَن يَشَاءُ ۚ وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ ﴿٢٣﴾ ﴾:

﴿ اللَّهُ نَزَّلَ ﴾ خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات دەربارەی ئـەو کتێبەی دایبەزانـووە ﴿ أَحْسَنَ الْحَدِيثِ ﴾ (چاکتریـنو جوانتریـن فەرمایشـتە) بە ڕەهایـی، جا چاکترین فەرمایشـت قسـەی خوایە، وە چاکتریـن کتێبـی دابەزێنـراو لە فەرمایشـتی خوا ئـەم قورئانەیە. جـا ئەگەر ئـەو قورئانە زۆر چاک بـێ بێگومـان زانـراوە ئاخاوتنەکانی پاراوتریـن ئاخاوتـنو ڕوونتریـنو دیارترینیانن، وە ماناکانیشـی گەورەترینـی ماناکانـن، چونکە چاکترین فەرمایشـتە لە ئاخاوتـنو ماناکەیدا،

لەیەکچـووە لــە جوانیو یەکگرتوویــیو نەبوونــی جیاوازی بە هیــچ جۆرێــک. تەنانەت هەر کاتــێ کەســی ژێــر بیــری لێبکاتــەوەو تیایــدا ڕابمێنــێ، دەبینــێ لە ڕێــکو پێکی ســەرنجی تەماشــاکاران بــەلای خۆیدا ڕادەکێشــێ، وە دڵنیا دەبێ کــە ئەو قورئانە لە لایــەن خوای خاوەن حیکمەتــی کاردروســتی زۆر زاناوە دابەزیــوە، ئەمە مەبەســتی لەیەکچوونە لــەم جێگایەدا. بــەڵام کــە دەفەرمــوێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞ ٧ ﴾آل عمـران، (واتــە: ئــەو خوایــە ناردوویەتیە خــوارەوە بۆت قورئــان هێندێکی ئایاتــی کە مەبەســتەکانیان ڕۆشــنن ئــەو ئایەتانــە بنەڕەتــی قورئانــن، وە ئەوانی تــر ئایاتێکن کــە مەبەستەکانیان ڕۆشــن نین)، مەبەســت لــەم ئایەتە کــە ماناکەی ناڕۆشــنە لــەلای زۆرێ لــە خەڵکــی، وە ئــەم ناڕۆشــنیە لاناچــێ تەنها بــە گەڕاندنــەوەی نەبێ بــۆ لای ئــەو ئایەتانەی مەبەســتەکانیان ڕۆشــنە، لەبــەر ئەمەیــە فەرموویەتــی: ﴿ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞ ٧ ﴾ لەیەکچوونــی لــە هەندێکیــدا دانــاوە.

وە لێــرەدا هەمــووی بەلەیەکچــوون دانــاوە، واتە: لــە چاکیو جوانیــدا، چونکــە فەرموویەتی: ﴿ أَحۡسَنَ ٱلۡحَدِيثِ ﴾ ئەویــش ســووڕەتو ئایەتەکانە، هەموویان لەیەکتر دەچن وەک باســمان کــرد، ﴿ مَّثَانِيَ ﴾ دووپــات کراوەیــە تیایــدا چیرۆکــەکان، ئەحــکامو بڕیــارەکان، بەڵێــنو هەڕەشــەکان، ســیفەتی چاکــەکاران، ســیفەتی خراپــەکاران، وە هەروەهــا ناوەکانــی خــواو ســیفەتەکانی، ئەمــەش لــە گەورەیــیو چاکیەتــی، بێگومــان خــوای بــەرزو مــەزن زانیویەتی پێویســتی خەڵکی بــۆلای ماناکانی کە پاککــەرەوەی دڵەکانن و تەواوکەری ڕەوشــتەکانن، وە ئــەو مانایانــە بۆ دڵەکان وەکــو ئاو وان بۆ ئاودانــی دارەکان، جا هەروەک چــۆن دارەکان هەتا ئــاو نەدرێــنو لێیانەوە دووربــێ کەم دەکــەن، بەڵکو هەندێ جــار لە ناو دەچــن، وە هەرکاتێ چەندبــارە ئــاو بدرێن بەرهەمــی چاکیان دەبێ بــە جۆرەها بەرهەمی بە ســوود، بەهەمان شــێوە دڵــیش وایە بــەردەوام پێویســتی بەوەیە ماناکانــی خوا دووبــارە بکرێتەوە بەســەریدا، ئەگەر لە هەمــوو قورئانــدا یەکجــار ماناکە دووبــارە بێتەوە ئەوە هیــچ کاریگەریەکی نەدەبــوو، وە هیچ ئەنجامێکی بەدەســت نەدەهێنا.

لەبــەر ئەمەیە لــەم تەفســیرەدا ڕێگای خوای بەخشــندەم گرتۆتە بــەر وەک پەیــڕەو کردنێک بــەوەی کە تەفســیری ئــەو قورئانەیە، هەرگیــز نابینی تیایدا گواســتنەوە بــۆ جێگایەکی دیکە، بەڵکــو لە هــەر جێگایەکــدا دەبینی تەفســیرەکەی بە تــەواوی کــراوە، بەبــێ لەبەرچاوگرتنی ڕاڤەکردنــی ئــەو دەقــەی پێشــووە کــە لــە یــەک دەچــن، ئەگەرچــی لــە هەنــدێ جێگــادا

ڕاڤەکردنەکـەی لـە هەندێکـی بەرفراوانتـرەو سـوودو وەدەسـتهاتووی زیاترە، ئا بەو شـێوەیە پێویسـتە لەسـەر خوێنـەری قورئان ئەو کەسـەی بیر لە ماناکانـی دەکاتەوەو سـەرنجی دەدات بـا بە هیچ شـێوەیەک واز لەبیرکردنـەوە نەهێنێ لە هەمـوو جێگاکانیدا, بێگومـان بەو هۆیەوە خێرێکـی زۆرو بێ سـنوور بەدەسـت دێنێت.

کاتـێ ئـەم قورئانە مەزنـە بەم مەزنـیو گەورەیـە کاریگەری دروسـتکردوە لە دڵی کەسـانی ژێـرو هیدایەتـدراودا، لەبـەر ئەمەیە خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ﴾ (واتـە: ئـەو کەسـانەی لـە پەروەردگاریـان دەترسـن پێسـتیان تـەزووی پیـادێ بە بیسـتنی قورئـان) لـەوەی تیایدایـە لـە ترسـێنەری بێزارکـەر، ﴿ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ ﴾ واتـە: کاتـی ئومێـد بـوونو هاندان ئـەو قورئانە هەندێ جـار هانیـان دەدا بۆ کاری چاکـە، وە هەندێ جار دەیانترسـێنێ لـە کاری خراپە، ﴿ ذَٰلِكَ ﴾ ئەوەی خوا ﷻ باسـی کردوە لـە کاریگـەری قورئان لەوانـدا ﴿ هُدَى ٱللَّهِ ﴾ واتـە: ڕێنمایی خوایـە بۆ بەندەکانـی، ئەویش لـە کـۆی فـەزڵو چاکەکانێتـی بەسـەریانەوە ﴿ يَهْدِى بِهِۦ ﴾ واتـە: بـە هـۆی ئـەو قورئانەوە (ڕێنمایـی دەکات)، ﴿ مَن يَشَآءُ ﴾ (واتـە: هـەر کەسـی بوێ) لـە بەندەکانی.

دەگونجـێ مەبەسـت لـە فەرمایشـتی خـوا ﷻ: ﴿ ذَٰلِكَ ﴾ واتە: ئـەو قورئانە بێ کە وەسـفمان کـرد بۆتـان، ﴿ هُدَى ٱللَّهِ ﴾ کـە هیـچ ڕێگایـەک نیـە بگـا بە خـوا تەنهـا لـەوەوە نەبێت، ﴿ يَهْدِى بِهِۦ مَن يَشَآءُ ﴾ لـە بەندەکانـی لەوانـەی مەبەسـتیان چاکـە، هەروەکـو خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ يَهْدِى بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضْوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ ﴿١٦﴾ ﴾المائـدة، (واتە: خوا ڕێنموونـی کەسـێکی پـێ دەکات کە شـوێن ڕەزامەندی ئەو بکـەوێ بۆ ڕێگەکانـی ئارامیو ئاشـتی)، چونکـە هیـچ ڕێگایـەک نیـە بیگەیەنێ بـە لای خـوا تەنهـا یارمەتی ئەو نەبـێ، وە سـەرکەوتوو کردنـی بـۆ ڕوو کردنە کتێبەکـەی، جا ئەگەر ئەمە بەدەسـت نەهـات ئەوە هیچ ڕێگایـەک نیـە بـۆ ڕێنمایـی، وە ئەوە هیـچ نیە تەنهـا گومراییەکـی ڕوونو بەدبەختـی نەبێ.

(٢٤-٢٦): ﴿ أَفَمَن يَتَّقِى بِوَجْهِهِۦ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ وَقِيلَ لِلظَّٰلِمِينَ ذُوقُوا۟ مَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ ﴿٢٤﴾ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَأَتَىٰهُمُ ٱلْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٥﴾ فَأَذَاقَهُمُ ٱللَّهُ ٱلْخِزْىَ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَعَذَابُ ٱلْـَٔاخِرَةِ أَكْبَرُ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٢٦﴾ ﴾:

﴿ أَفَمَن يَتَّقِى بِوَجْهِهِۦ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾ واتـە: ئایـا ئـەو کەسـە یەکسـانە کـە خوا ﷻ هیدایەتـی دابێو سـەرکەوتووی کردبێ بۆ گرتنەبەری ڕێگای گەیشـتن بەماڵـی ڕێز، لەگەڵ ئـەو کەسـەی لـە گومڕاییدابێو بـەردەوام بێ لەسـەر عینادی هەتـا قیامەتی دێ، هەتا سـزای

مەزنــی بــۆ دێ، ئینجا بــە دەمو چاوی کە پیرۆزترینی ئەندامی جەســتەیەتی، وە کەمترین شــتێ لە ســزا تووشــی ببێ کاریگــەری لێ دەکات، ئــەو بەو ڕووخســارەی خۆی لە ســزا دەپارێزێ، چونکــە دەســتو قاچەکانی کــۆتو زنجیر کــراون، ﴿ وَقِيلَ لِلظَّٰلِمِينَ ﴾ ئەوانەی ســتەمیان لە خۆیــان کــردوە بە کوفــرو ســەرپێچی کــردنو سەرزەنشــتو لۆمەکردنــەوە: ﴿ ذُوقُواْ مَا كُنتُمۡ تَكۡسِبُونَ ﴾ (واتــە: بچێژن ســزای ئــەو کردەوانەی لــە دونیا دەتــان کرد).

(٢٥): ﴿ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ ﴾ لــەو ئوممەتانــەی وەک چــۆن ئەوانــەش بەدرۆیــان دانــا، ﴿ فَأَتَىٰهُمُ ٱلۡعَذَابُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَشۡعُرُونَ ﴾ ســزایان بــۆ هات لــە بێئاگای ســەرەتای ڕۆژدا، یان لە کاتــی ســەرقاڵیو گفتوگۆیاندا.

(٢٦): ﴿ فَأَذَاقَهُمُ ٱللَّهُ ﴾ بــەو ســزایە ﴿ ٱلۡخِزۡيَ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا ﴾ ڕیســوا بوون لــە لای خواو لە لای خەڵکــی، ﴿ وَلَعَذَابُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَكۡبَرُۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ﴾ بــا خۆیان بپارێــزن ئەوانە لە بــەردەوام بونیان لە بەدرۆدانــان، تــا تووشــیان نەبــێ وەکو ئەوانەی کە تووشــیان بوو لە ســزا.

(٢٧-٣١): ﴿ وَلَقَدۡ ضَرَبۡنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٖ لَّعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ ٢٧ قُرۡءَانًا عَرَبِيًّا غَيۡرَ ذِي عِوَجٖ لَّعَلَّهُمۡ يَتَّقُونَ ٢٨ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلٗا رَّجُلٗا فِيهِ شُرَكَآءُ مُتَشَٰكِسُونَ وَرَجُلٗا سَلَمٗا لِّرَجُلٍ هَلۡ يَسۡتَوِيَانِ مَثَلًاۚ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِۚ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ٢٩ إِنَّكَ مَيِّتٞ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ٣٠ ثُمَّ إِنَّكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عِندَ رَبِّكُمۡ تَخۡتَصِمُونَ ٣١ ﴾

﴿ وَلَقَدۡ ضَرَبۡنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٖ ﴾ خــوا ﷻ هــەواڵ دەدات کــە بــە ڕاســتی نموونــەی هێناوەتەوە لــەم قورئانەدا لــە هەموو نموونــەکان، نموونەی چاکــەکارانو نموونەی خراپــەکاران، وە نموونــەی یەکتاپەرســتیو هاوبەشــدانان، هەمــوو ئــەو نموونانــە حەقیقەتــی شــتەکان نزیــک دەکاتــەوە، وە حیکمــەت لــەوەدا: ﴿ لَّعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ ﴾ (بــۆ ئــەوەی پەنــدو ئامۆژگــاری وەربگرن) کاتێ حەقیقەتیان بــۆ ڕوون دەکەینەوە، دەزانن‌و کــردەوەی پێدەکەن.

(٢٨): ﴿ قُرۡءَانًا عَرَبِيًّا غَيۡرَ ذِي عِوَجٖ ﴾ کردوومانــە بــە قورئانێکی عەرەبی، قســەو فەرمایشــتەکانی ڕوونــەو ماناکانی ئاســانە بــە تایبەت لــەلای عــەرەب، ﴿ غَيۡرَ ذِي عِوَجٖ ﴾ واتە: هیــچ ناتەواویو کــەمو کورتیەکــی تێدانیــە بــە هیــچ جۆرێک، نــە لە قســەو فەرمایشــتەکانی نە لــە ماناکانی، ئەمــەش تەواوی ڕێکو پێکــیو بەردەوامبوونــی دەگرێتەوە، هەروەکو خــوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبۡدِهِ ٱلۡكِتَٰبَ وَلَمۡ يَجۡعَل لَّهُۥ عِوَجَاۜ ١ قَيِّمٗا ٢ ﴾الكهــف (واتــە: هەمــوو ســوپاسو ســتایش بۆ ئــەو خوایەی کــە ناردوویەتیە خــوارەوە قورئان بۆ ســەر بەندەی خۆیو هیــچ جــۆرە لاریەکی تێــدا دانەنــاوە × کتێبێکی ڕاســتو پایــەدارە)، ﴿ لَّعَلَّهُمۡ يَتَّقُونَ ﴾ خوای

بـەرزو مـەزن، کاتـێ ڕێگاکانی خۆپارێزیو لە خوا ترسـانی زانسـتیو کرداری بۆمان ئاسـان کـردوە، بـە هـۆی ئـەم قورئانە عەرەبیـە ڕاسـتو ڕەوانەوە، کـە خـوا هێناویەتیـەوە تیایدا لە هەمـوو نموونەیەک.

(٢٩): پاشـان نموونـەی هێناوەتەوە بـۆ هاوبەشـدانانو یەکتاپەرسـتی، فەرموویەتی: ﴿ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلًا﴾ واتـە: پیاوێکی بەنـدە ﴿فِيهِ شُرَكَآءُ مُتَشَٰكِسُونَ﴾ (هی چەند کەسـێکە ئاژاوەیانە لەسـەر ئەو کەسـە) ئەو خاوەنانە زۆرن، وە یەکدەنگ نین لەسـەر یەک حاڵەت، تا ئەو کەسـە دڵنیابێتـەوە، بەڵکـو ئـەوان جیـاوازو دووبەرەکـن لە نـاو یەکتـردا، هەریەکـەو داواکاریەکی هەیـە بـۆی جێبەجـێ بـکات، بـە پێچەوانـەی ئەویتـرەوە، گومانی چـی دەبەی بـە حاڵی ئەو کەسـەی لەگەڵ ئـەو هاوبەشـە جیاوازانەدا بێ؟

﴿وَرَجُلًا سَلَمًا لِّرَجُلٍ﴾ (واتـە: پیاوێکیـش کـە تەنهـا بەندەی پیاوێکـە) بە دڵسـۆزیەوە کاری بـۆ دەکاتو مەبەسـتی گەورەکەی خـۆی دەزانێ، وە پشـووی تەواوی بەدەسـتهێناوە، ﴿هَلْ يَسْتَوِيَانِ﴾ واتـە: ئایـا ئـەم دوو پیـاوە یەکسـانو وەک یەکـن ﴿مَثَلًا﴾؟ نەخێر یەکسـان نیـن، بـە هەمان شـێوە هاوبەشـدانەریش چەنـد هاوبەشـێکی هەیـە پێچەوانـەی یەکترین، لەم دەپارێتـەوە پاشـان لـەو دەپارێتـەوە، دەبینـی جـێ بە خۆیـەوە ناگـرێ، وە دڵی لە شـوێنێکدا ئـارام ناگرێ، وە یەکتاپەرسـتی دڵسـۆز بـۆ پەروەردگاری خـوا ﷻ پاڵفتەی کـردوە لە هەموو هاوبەشـدانانێک، ئـەو بەندەیـە لەوپەڕی حەسـانەوەو ئارامـیو دڵنیاییدایە.

جـا ﴿هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًا ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ﴾ لەسـەر ڕوون کردنـەوەی حـەق لـە بەتـاڵو پـووچو ڕێنیشـاندانی نەفامـەکان ﴿بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ (واتـە: بـەڵام زۆربەیـان نازانـن).

(٣٠): ﴿إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ﴾ واتـە: هەمووتـان هـەر دەبێ بمـرن، ﴿وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ ٱلْخُلْدَ أَفَإِيْن مِّتَّ فَهُمُ ٱلْخَٰلِدُونَ ﴿٣٤﴾﴾ الأنبيـاء (واتـە: بڕیارمـان نـەداوە بـۆ هیچ کەسـێک لە پێـش تـۆوە مانەوەی هەمیشـەیی نەمـری، ئنجا ئەگـەر تۆ بمـری دوا مردنی تۆ جـا ئایا ئەوان ژیانیـان بـەردەوام دەبێو نامـرن نەخێر).

(٣١): ﴿ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ عِندَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ﴾ لـەوەی ناکۆکیتـان بـوو تیایـدا، جیاتان دەکاتـەوە بە بڕیاری دادپەروەرانەی، وە پاداشـتی هەر یەکەتان دەداتـەوە بە پێی کردەوەکەی، ﴿أَحْصَىٰهُ ٱللَّهُ وَنَسُوهُ ﴿٦﴾﴾ المجادلـة (واتـە: کـە خـوا هەمووی ژمـاردوە، وە خۆیـان لە بیریان چووە).

فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَبَ عَلَى ٱللَّهِ وَكَذَّبَ بِٱلصِّدْقِ
إِذْ جَآءَهُۥٓ ۚ أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَـٰفِرِينَ ﴿٣٢﴾ وَٱلَّذِى
جَآءَ بِٱلصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِۦٓ ۙ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴿٣٣﴾
لَهُم مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمْ ۚ ذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٣٤﴾
لِيُكَفِّرَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ أَسْوَأَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ وَيَجْزِيَهُمْ أَجْرَهُم
بِأَحْسَنِ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٣٥﴾ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ
عَبْدَهُۥ ۖ وَيُخَوِّفُونَكَ بِٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ ۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ
فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴿٣٦﴾ وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّضِلٍّ ۗ
أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِعَزِيزٍ ذِى ٱنتِقَامٍ ﴿٣٧﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ
ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۚ قُلْ أَفَرَءَيْتُم مَّا تَدْعُونَ
مِن دُونِ ٱللَّهِ إِنْ أَرَادَنِىَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ هَلْ هُنَّ كَـٰشِفَـٰتُ
ضُرِّهِۦٓ أَوْ أَرَادَنِى بِرَحْمَةٍ هَلْ هُنَّ مُمْسِكَـٰتُ رَحْمَتِهِۦ ۚ
قُلْ حَسْبِىَ ٱللَّهُ ۖ عَلَيْهِ يَتَوَكَّلُ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴿٣٨﴾ قُلْ يَـٰقَوْمِ
ٱعْمَلُوا۟ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنِّى عَـٰمِلٌ ۖ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٣٩﴾
مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴿٤٠﴾

**(٣٢-٣٥):** ﴿فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَبَ عَلَى ٱللَّهِ وَكَذَّبَ بِٱلصِّدْقِ إِذْ جَآءَهُۥٓ ۚ أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَـٰفِرِينَ ﴿٣٢﴾ وَٱلَّذِى جَآءَ بِٱلصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِۦٓ ۙ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴿٣٣﴾ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمْ ۚ ذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٣٤﴾ لِيُكَفِّرَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ أَسْوَأَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ وَيَجْزِيَهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٣٥﴾﴾:

﴿فَمَنْ أَظْلَمُ﴾ خـوا ﷻ دەفەرمـویٚ: بـە ترسـاندنو ئاگـادار کردنـەوە، هیـچ کەس لـەوە سـتەمکارتر نیـە، ﴿مِمَّن كَذَبَ عَلَى ٱللَّهِ﴾ (واتـە: لـەو کەسـەی کـە درۆ بـە نـاوی خـواوە دەکات)، یـان ئەوەیـە شـتیٚ دەداتـە پاڵـی شایسـتەی گەورەیی ئـەو نیە، یـان بـە بانگەشـەی پیٚغەمبەرایەتی، یـان بە هەوبەشـدانان بـەوەی خوا ﷻ ئـەوەی فەرمووە، یـان هەواڵـی بەوە داوە، یـان بریاری بەو شـتە داوە، ئەو درۆ بـکات ئەمە دەچیٚتـە نیٚو وتەی خـوا ﷻ: ﴿وَأَن تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٣﴾﴾ الأعـراف، (واتـە: وە حەرامی کـردوە کە بە دەم خـواوە شـتانیٚک بڵیٚـن کە نایزانـن)، ئەگەر نەفـام بوو، وە ئەگەرنـا ئەوە خراپتـرو خراپترە، ﴿وَكَذَّبَ بِٱلصِّدْقِ إِذْ جَآءَهُۥٓ﴾ واتـە: کـیٚ لـەوە سـتەمکارترە حەقی بۆ هاتبیٚ پشـت بەسـت بـە بەڵگـەکانو بـەدرۆی خسـتبیٚتەوە، جـا بەدرۆدانانی سـتەمیٚکی مەزنـە لەلایەن ئـەوەوە، چونکـە ڕەتکردنـەوەی حەقە دوای ئەوەی بـۆی ڕوون بوەتەوە، جا ئەگەر کـۆی کردبیٚتەوە لـە نیٚـوان درۆکـردن لەسـەر خـواو بەدرۆدانانـی حەق، ئەوە سـتەمە لەسـەر سـتەم ﴿أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَـٰفِرِينَ﴾ (واتـە: ئایـا لـە دۆزەخـدا جیٚگەیـەک نیە بـۆ بیٚبڕوایـان) لەو دۆزەخـەدا چارەسـەر وەربگـرن، وە مافی خـوا وەربگریٚ لە هەمـوو سـتەمکارو بیٚبڕوایەک ﴿إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾﴾ لقمان، (واتـە: بـە ڕاسـتی هاوبەشـدانان سـتەمیٚکی مەزنە).

(٣٣): کاتـیٚ باسـی درۆزنـی بەدرۆدانـەری کـرد، لەگـەڵ باسـکردنی تـاوانو سـزاکەی، ئنجا باسـی ڕاسـتگۆو بەڕاسـتدانەرو پاداشـتەکەی کرد، فەرمـووی: ﴿وَٱلَّذِى جَآءَ بِٱلصِّدْقِ﴾

(واتــە: ئەو كەســەش ڕاســتی‌و حەقیقەتــی هێناوە) لە قســەو كــردەوەی، پێغەمبــەران دەچنە نــاو ئــەوەوە، ئەوانــەش لە جێگــای ئەوان دانیشــتوون، لەو كەســەی ڕاســتی كــردوە لەوەی وتوویەتــی دەربــارەی هەواڵــی خــواو بڕیارەكانی، وە لەوەشــی كردوویەتی لە ســیفەتەكانی ڕاستگۆیی.

﴿ وَصَدَّقَ بِهِۦٓ ﴾ واتــە: (بڕوایشــی پێیەتــی) بــە ڕاســتی، چونكــە هەنــدێ جــار ئادەمیــزاد ڕاســتی دەهێنــێ، بــەڵام هەندێ جار بە ڕاســت دانانــرێ، بە هۆی لــووت بەرزییــەوە، یان بە كەمزانینــی ئــەو كەســەی هێناویەتــی، بۆیە هــەر دەبێ ســتایش بكرێ بەڕاســتی‌و بەڕاســت دانانی، جا ڕاســتگۆیی بۆی بەڵگەیە لەســەر زانســت‌و دادپەروەری، وە بەڕاســتدانانی بەڵگەیە لەســەر خۆبەكــەم دانــان‌و لــووت بــەرز نەبوونــی، ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ﴾ ئەوانــەی هــەردوو كارەكە كۆدەكەنــەوە، ﴿ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴾ (ئەوانــە خوانــاس‌و دینــدارن)، چونكە هەموو بەشــەكانی خۆپارێــزی دەگەڕێتــەوە بۆ ڕاستی بە حــەق‌و بەڕاســت دانانی.

(٣٤): ﴿ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمْ ﴾ (واتــە: هەرچیــان بوێت لــە لای پەروەردگاریان بۆیان ئامادەیــە) لــە پاداشــت، لەوەی چــاو نەیبینیوەو گــوێ نەیبیســتووەو بە ختوورە بــە دڵی هیچ كەســدا نەهاتــووە، جا هەرشــتێ ویســت‌و ئیــرادەی ئەوانــی پێوە بەســترابێت، لە بەشــەكانی لــەزەت‌و نــازو نیعمەتەكان، ئــەوە بۆیان دەســتەبەرو ئامادەیە.

﴿ ذَٰلِكَ جَزَآءُ ﴾ (واتــە: ئا ئەوەیە پاداشــتی) ئەوانەی بەندایەتــی پەروەردگاریان دەكەن، وەكو ئــەوەی بینیبێتیــان، ئەگــەر ئــەوان پەروەردگاریــان نەبینــی بێت، ئــەوە بێگومان ئــەو ئەوان دەبینێــت ﴿ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾ (چاكــەكاران) بــۆ بەندایەتی خوا.

(٣٥): كــرداری ئادەمیــزاد ســێ حاڵەتــی بــۆ هەیــە: یــان خراپترینــە، یــان چاكترینــە، یان نــە خراپترینــەو نــە چاكترینە، بەشــی كۆتایــی بەشــی موبــاح‌و شــیاوو ڕەوابینراوەكانە، وە ئەوەشــی پەیوەســت نیــە نــە بــە پاداشــت نە بە ســزا.

خراپتریــن: هەمــوو ســەرپێچیەكانە بــە گشــتی، وە چاكتریــن: گوێڕایەڵیەكانــە بە گشــتی. بــەم درێــژە پێدانــە مانــای ئایەتەكــە ڕوون دەبێتــەوە، وە بێگومــان كە خــوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ لِيُكَفِّرَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ أَسْوَأَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ ﴾ (واتــە: بــۆ ئــەوەی خــوا چاوپۆشــی بــكات لــە خراپترینــی ئــەو گوناهانــەی ئەنجامیانــداوە) واتە: گوناهــە بچووكەكانیان، بــە هۆی چاكەو خۆپارێزیان.

﴿ وَيَجْزِيَهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾ (واتــە: بــۆ ئــەوەش پاداشــتیان بداتــەوە بــە

چاکتریـن لـەوەی دەیانکرد) واتـە: بە هەمـوو چاکەکانیـان ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظۡلِمُ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖۖ وَإِن تَكُ حَسَنَةٗ يُضَٰعِفۡهَا وَيُؤۡتِ مِن لَّدُنۡهُ أَجۡرًا عَظِيمٗا ٤٠ ﴾ النسـاء (واتـە: بـە ڕاسـتی خـوا بە قەد تۆزقاڵێـک سـتەم نـاکات، خـۆ ئەگـەر چاکەیـەک هەبێـت چەنـد بەرانبـەری دەکات و لە لایـەن خۆیەوە پاداشـتی گـەورەو بێ سـنوور دەبەخشـێت).

(٣٦-٣٧): ﴿ أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبۡدَهُۥۖ وَيُخَوِّفُونَكَ بِٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦۚ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٖ ٣٦ وَمَن يَهۡدِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّضِلٍّۗ أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِعَزِيزٖ ذِي ٱنتِقَامٖ ٣٧ ﴾:

﴿ أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبۡدَهُۥ ﴾ واتـە: ئایـا لە بەخشـندەیی و ڕێـزو هاوکاری خوا بـۆ بەندەکەی، کـە هەسـتاوە بـە بەندایەتـی کردنـی و فەرمانەکانـی بەجێهێنـاوەو دوورکەوتۆتـەوە لـە قەدەغەکراوەکانـی، بەتایبـەت تەواوترینـی دروسـتکراوەکان بەندایەتـی کـردن بـۆ پەروەردگـاری ئەویـش موحەممـەد ﷺ بێگومـان ئـەو خوای بەسـە لـە کاروبـاری ئاینی و دنیاییـدا، وە بەرپەرچـی ئەوە دەداتەوە کـە دەیەوێ خراپـەی بەرانبەر بکات ﴿ وَيُخَوِّفُونَكَ بِٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ ﴾ (واتـە: وە دەترسـێنن بەوانـەی جگـە لـە خـوا) لە بتەکان کـە زیانت پـێ بگەیەنن، ئەمەش لـە گومڕایـی و سەرلێشـێواویانە ﴿ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٖ ٣٦ وَمَن يَهۡدِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّضِلٍّ ﴾ چونکـە ڕێنمایـی و گومڕاکـردن بەدەسـتی خوایـە، ئـەو زاتە هـەر شـتێکی بوێ دەبێ، وە هەر شـتێکی نـەوێ نابێ ﴿ أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِعَزِيزٖ ﴾ خاوەنی دەسـەڵاتی تـەواوە بـەو دەسـەڵاتەی زاڵە بەسـەر هەمـوو شـتێکدا، وە عیزەتی بەسـە بـۆ بەندەکەی، وە بەرپەرچـی فڕوفێڵەکانیان دەداتەوە ﴿ ذِي ٱنتِقَامٖ ﴾ (تۆڵە سـێنەرە) لەو کەسـەی سـەرپێچی دەکات، دەی خۆتـان بپارێـزن لـە هـەر شـتێ دەبێتە هـۆکار بـۆ تووڕەیی ئەو.

(٣٨): ﴿ وَلَئِن سَأَلۡتَهُم ﴾ واتـە: ئەگـەر پرسـیار لـەو گومڕایانە بکـەی ئەوانەی دەترسـێنن بـە غەیری خـوا، وە بەڵگەیان لەسـەر پێویسـت بکەی لـە نەفس و دەروونـەکان، ﴿ مَّنۡ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ ﴾ (واتـە: کێ ئاسـمانەکان و زەوی دروسـت کـردوە؟) ئەوە ناچەسـپێنن بـۆ بەدیهێنراوەکانیـان کـە دروسـتی کردبـێ ﴿ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُۚ ﴾ (بێگومـان دەڵێـن خـوا) بە تـاک و تەنهایی دروسـتی کـردوە. ﴿ قُلۡ ﴾ پێیـان بڵێ: لاوازی پەرسـتراوەکانیان بسـەلمێنە دوای ئـەوەی توانـای خـوات بۆیـان ڕوونکـردەوە ﴿ أَفَرَءَيۡتُم ﴾ واتـە: دەی پێـم بڵێن: ﴿ مَّا تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ إِنۡ أَرَادَنِيَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ ﴾ هـەر زیانـێ بـێ ﴿ هَلۡ هُنَّ كَٰشِفَٰتُ ضُرِّهِۦٓ ﴾ (واتە: ئایا ئـەو پەرسـتراوانە دەتوانـن) ئـازارو زیانـی ئەوم لـێ لادەن بە گشـتی یان بە سـوو کردنی لە قۆناغێکـەوە بـۆ قۆناغێکـی دیکـە؟ ﴿ أَوۡ أَرَادَنِي بِرَحۡمَةٍ ﴾ سـوودێکم پـێ بگەیەنێ لـە ئاینم

یــان لە دونیــام، ﴿ هَلْ هُنَّ مُمْسِكَاتُ رَحْمَتِهِۦ ﴾ (واتە: ئایــا ئەوان دەتوانن بەهــرەو میهرەبانی خــوا) لــێ بگرنەوە؟ لــە داهاتــوودا دەڵێــن: ناتوانــن زیــان لاببــەن، وە ناشــتوانن میهرەبانی بگرنەوە.

پێیــان بڵێ: دوای ئــەوەی بەڵگەی یەکلاکەرەوە ڕوون بوویەوە لەســەر ئــەوەی خوای تاکو تەنها پەرســتراوە، وە ئەو دروســتکەری دروســتکراوەکانە، ســوودو زیان تەنها بەدەست ئەوە، بێگومــان جگــە لــەو بێدەســەڵاتو دەستەوەســانە لە هەمــوو ڕوویەکــەوە لە دروســتکردنو ســوودو زیــان، تــۆ تەنها ئەوت بەســە لــە بەرهەڵســتی فرو فێڵــی ئــەوان: ﴿ قُلْ حَسْبِيَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ يَتَوَكَّلُ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴾ پشــت پــێ بەســتوان تەنهــا پشــت بــەو دەبەســتن لــە بەدەســتهێنانی بەرژەوەندیەکانیــانو بەرپەرچدانــەوەی زیانەکانیــان، ئــەو زاتــەی بــەس بوون بەدەســیەتی مــن هــەر ئــەوم بەســە، ئەو بەســە بۆمن لــە هەمــوو ئەوانــەی گرنگن بــۆمو ئەوانەیشــی کە گرنگیــان پــێ نادەم.

(٣٩-٤٠): ﴿ قُلْ يَٰقَوْمِ ٱعْمَلُوا۟ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنِّى عَٰمِلٌ ۖ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٣٩﴾ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴿٤٠﴾ ﴾:

﴿ قُلْ ﴾ ئــەی پێغەمبەر ﷺ پێیــان بڵێ: ﴿ يَٰقَوْمِ ٱعْمَلُوا۟ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ ﴾ واتە: لەســەر ئەو ڕێبــازەی خۆتــان کاربکــەن کــە پێــی ڕازیــن، لــە بەندایەتی کردنــی ئەوەی کە شایســتەی بەندایەتــی نیــە، وە هیچ شــتێکی لــە فەرمــانو کاروباردا نیــە ﴿ إِنِّى عَٰمِلٌ ﴾ (منیش لەســەر ڕێبــازی خــۆم کاردەکەم) لەســەر ئەو ڕێبــازەی کە بانگەشــەم کردن بۆ لای، لە دڵســۆزیو ملکەچبــوون بــۆ خــوای تــاکو تەنهــا ﴿ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴾ (واتــە: ئنجــا بــەم زووانــە دەزانن) ســەرەنجام بــۆ کێیە؟!

(٤٠): ﴿ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ ﴾ لــە دونیــادا ﴿ وَيَحِلُّ عَلَيْهِ ﴾ لە دواڕۆژدا ﴿ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴾ لەســەری لانابــرێ. ئەمــە هەڕەشــەکردنێکی مەزنــە بۆیــان، ئەوان دەزانن شایســتەی ســزای بێبڕانــەوەن، بەڵام ســتەمو عینــادی درزو کەلێنی خســتۆتە نێــوان ئــەوانو بڕواهێنان.

إِنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ لِلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ
فَلِنَفْسِهِۦ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم
بِوَكِيلٍ ﴿٤١﴾ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَٱلَّتِى
لَمْ تَمُتْ فِى مَنَامِهَا فَيُمْسِكُ ٱلَّتِى قَضَىٰ عَلَيْهَا ٱلْمَوْتَ
وَيُرْسِلُ ٱلْأُخْرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ
يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾ أَمِ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُفَعَآءَ قُلْ
أَوَلَوْ كَانُوا۟ لَا يَمْلِكُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَعْقِلُونَ ﴿٤٣﴾ قُل
لِّلَّهِ ٱلشَّفَـٰعَةُ جَمِيعًا لَّهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ثُمَّ
إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٤٤﴾ وَإِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَحْدَهُ ٱشْمَأَزَّتْ
قُلُوبُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ وَإِذَا ذُكِرَ ٱلَّذِينَ مِن
دُونِهِۦٓ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿٤٥﴾ قُلِ ٱللَّهُمَّ فَاطِرَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضِ عَـٰلِمَ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَـٰدَةِ أَنتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ
فِى مَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٤٦﴾ وَلَوْ أَنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مَا فِى
ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفْتَدَوْا۟ بِهِۦ مِن سُوٓءِ ٱلْعَذَابِ
يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَبَدَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مَا لَمْ يَكُونُوا۟ يَحْتَسِبُونَ ﴿٤٧﴾

**(٤١):** ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ لِلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَلِنَفْسِهِۦ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ ﴿٤١﴾ ﴾:

﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ لِلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ ﴾ **خوا ﷻ هەواڵیداوە کە بێگومان قورئانی دابەزاندووە بۆ سەر پێغەمبەرەکەی کە حەق لەخۆدەگرێ، لە هەواڵو فەرمانو قەدەغەکراوەکانی، کە بنچینەی هیدایەتو ڕێنماییە، وە ڕاگەیەنراوە بۆ ئەو کەسەی دەیەوێ بگات بە خواو ماڵی ڕێزداری، وە ئەوە دەبێتە بەڵگەو حوججە بۆ سەر هەموو جیهان،** ﴿ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ ﴾ **(جا هەر کەسێ ڕێنمایی وەربگرێ) بە ڕووناکی قورئانو شوێنی فەرمانەکانی بکەوێ** ﴿ فَلِنَفْسِهِۦ ﴾ **واتە: سوودی ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ خودی خۆی،** ﴿ وَمَن ضَلَّ ﴾ **(هەر کەسێ لاڕێ بێ) دوای ئەوەی هیدایەتی بۆ ڕوونکرایەوە،** ﴿ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ﴾ **(واتە: ئەوە بێگومان زیانی گومڕابوونەکەی هەر بۆ خۆیەتی) خوا هیچ زیانێکی پێناگات،** ﴿ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ ﴾ **(واتە: تۆ بریکار نیت بەسەریانەوە) تا بڕوا بهێنن، کردەوەکانیان بپارێزیو لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکەی لەسەریان، وە ناچاریان بکەی بەوەی خۆت دەتەوێ، بەڵکو تۆ ڕاگەیەنەری، ئەوەی فەرمانت پێکراوە پێیان دەگەیەنی.**

**(٤٢):** ﴿ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَٱلَّتِى لَمْ تَمُتْ فِى مَنَامِهَا فَيُمْسِكُ ٱلَّتِى قَضَىٰ عَلَيْهَا ٱلْمَوْتَ وَيُرْسِلُ ٱلْأُخْرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾ ﴾:

**خوا ﷻ هەواڵ دەدات ئەو تاکو تەنهایە بە هەڵسوڕاندنی کاروباری بەندەکان لە کاتی بەئاگایيو خەوتنیاندا، وە لە حاڵەتی ژیانو مردنیان، جا فەرموویەتی:** ﴿ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا ﴾ **(واتە: خوا گیانەکان دەکێشێ لە کاتی مردنیاندا) ئەمە گیان کێشانی گەورەیە، گیان کێشانی مردن، وە هەواڵیداوە کە بێگومان ئەو گیانەکان دەکێشێ، وە دانەپاڵی (فعل) بۆ لای نەفسی خۆی ﷻ، ئەوە ڕەت ناکاتەوە کە فریشتەی گیان کێشانو پشتیوانەکانی**

ڕاسپاردبێ بەوە، هەروەکو فەرموویەتی: ﴿ قُلْ يَتَوَفَّىٰكُم مَّلَكُ ٱلْمَوْتِ ٱلَّذِى وُكِّلَ بِكُمْ ﴾ ﴿السجدة، (واتە: ئەی موحەممەد ﷺ بڵێ: فریشتەی گیان کێشان کە گیان کێشانی ئێوەی پێ سپێراوە دەتان مرێنێ)، ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا وَهُمْ لَا يُفَرِّطُونَ ﴾ ﴿الأنعام، (واتە: تا کاتی مردنی یەکێکتان دێت نێردراوەکانمان گیانی دەکێشن کە هیچ سستیو کەمتەرخەمیەک ناکەن لە کارەکانیاندا)، چونکە خوای بەرزو مەزن شتەکان دەداتە پاڵی خۆی، بەو جۆرەی کە ئەو بەدیهێنەری هەڵسوڕێنەرە، وە دەیداتە پاڵ هۆکارەکانی بەو جۆرەی کە لە سونەتو کاردروستی خوای بەرزوو مەزندا ئەوەیە، بۆ هەموو کارێ لە کارەکان هۆکارێکی داناوە، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّتِى لَمْ تَمُتْ فِى مَنَامِهَا ﴾ (واتە: وە ئەوەی نەمردبێت لەکاتی خەوتنیدا) ئەمەش مردنی بچوکە، واتە: ئەو گیانە ڕادەگرێ کە لە کاتی خەوەکەیدا نەمردووە ﴿ فَيُمْسِكُ ﴾ لەو دوو نەفسە: ئەو نەفسەی ﴿ ٱلَّتِى قَضَىٰ عَلَيْهَا ٱلْمَوْتَ ﴾ (بڕیاری مردنی داوە) ئەویش ئەو نەفسەیە کە مردووە، یان بڕیاریداوە کە لە خەوەکەیدا بمرێ ﴿ وَيُرْسِلُ ﴾ ئەو نەفسەی ﴿ ٱلْأُخْرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾ تا ڕزقو ڕۆزی تەواو دەبێو ماوەی دیاریکراوی دێت ﴿ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ لە سەر تەواوی دەسەڵاتی خواو زیندووکردنەوەی مردوو دوای مردنیان. ئەم ئایەتە دەبێتە بەڵگە کە بێگومان ڕووحو نەفس جەستەیەکی ڕاگیراون بە خودی خۆیان، ناوەڕۆکی جیاوازە لەگەڵ ناوەڕۆکی جەستەدا، وە ئەویش بەدیهێنراوەو ژێر بارخراوە، خوا چۆن بیەوێ هەڵیدەسووڕێنێ لە مردنو گرتنەوەو ناردن، وە بێگومان ڕووحی زیندوو مردووەکان بەیەک دەگەن، کۆدەبنەوەو گفتو گۆدەکەن، خوا ﷻ ڕووحی زیندووەکان دەنێرێ، وە ڕووحی مردووەکان دەگرێتەوە.

(٤٣-٤٤): ﴿ أَمِ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُفَعَآءَ ۚ قُلْ أَوَلَوْ كَانُوا۟ لَا يَمْلِكُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَعْقِلُونَ ﴿٤٣﴾ قُل لِّلَّهِ ٱلشَّفَٰعَةُ جَمِيعًا ۖ لَّهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾

خوا ﷻ نکوڵی دەکات لەسەر ئەو کەسەی ﴿ أَمِ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُفَعَآءَ ﴾ جگە لە خوا کەسانێکی دیکە دەکا بە تکاکار، پەیوەست دەبێ پێیانەوە داوایان لێدەکاو دەیانپەرستێ، ﴿ قُلْ ﴾ پێیان بڵێ: -بە ڕوونکردنەوەی نەفامیان کە ئەو بتانە شایستەی هیچ جۆرە پەرستنێک نین-: ﴿ أَوَلَوْ كَانُوا۟ ﴾ ئەوانەی داتان ناون بە تکاکار ﴿ لَا يَمْلِكُونَ شَيْـًٔا ﴾ واتە: تۆزقاڵە زەرەیەک نە لەئاسمانەکانو نە لە زەویان بەدەست نیە، وە نە بچوکتر لەوانەو نە گەورەتریش، بەڵکو عەقڵێکیشیان نیە شایستەی ئەوەی بن ستایشی پێ بکرێن، چونکە ئەوانە بێگیانن لە بەردو دارو وێنەو مردووەکان، ئایا دەوترێ کەسێ ئەوانە دەکات بە پەرستراو عاقڵە؟ یان ئەو کەسە

گومراترین و نەفامترینی ناو خەڵکیە وە ستەمکار ترینیانە؟

(٤٤): ﴿قُل﴾ پێیان بڵێ: ﴿لِّلَّهِ ٱلشَّفَٰعَةُ جَمِيعًا﴾ (تکا هەمووی هەر بۆ خوایە) چونکە کاروبارەکان هەموویان بۆ خوان، هەموو تکا کاری لێی دەترسێ، هیچ کەس ناتوانێ تکاو شەفاعەت بکات بە مۆڵەتی ئەو نەبێ، جا ئەگەر بەزەیی بەندەکەی ویست مۆڵەت ئەدات بە تکاکاری بەخشندە لەلای، کە تکای بۆ بکات، وەک میهرەبانیەک بە هەردووکیان.

پاشان بریاریداوە کە بێگومان تکاو شەفاعەت هەمووی بۆ خوایە: ﴿لَّهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ ئەوانەی تیایاندایە لە زاتەکان و کردەوەکان و سیفاتەکان، جا پێویست وایە داوای تکا بکرێ لەو کەسەی خاوەنێتی و بە دڵسۆزیەوە بەندایەتی بۆ بکرێ، ﴿ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ (واتە: پاشان هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە) جا پاداشتی دڵسۆز دەداتەوە بە پاداشتی بێ پایان، هەر کەسێکیش هاوەڵی بۆ دانابێ بە سزای بە ئێش.

(٤٥-٤٦): ﴿وَإِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَحْدَهُ ٱشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَإِذَا ذُكِرَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦٓ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿٤٥﴾ قُلِ ٱللَّهُمَّ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ عَٰلِمَ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ أَنتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ فِى مَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٤٦﴾﴾:

خوا ﷻ باسی حاڵی هاوبەشدانەران دەکات، وە ئەوەیشی هاوەبەشدانانیانی پێویست کردوە، بێگومان ئەوان ﴿وَإِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ﴾ (واتە: کاتێ یادی خوا بکرێ بەتاک و تەنها) یەکتاپەرستی بۆ ئەو، وە فەرمانیان پێ بکرێ بە دڵسۆزی و ملکەچبوونی خواو وازهێنان لەوەی دەپەرسترێ لە غەیری ئەو، ئەوان تێکدەچن و بێزار دەبن و را دەکەن، وە پێیان ناخۆشە بەوپەڕی پێ ناخۆشبوون.

﴿وَإِذَا ذُكِرَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦٓ﴾ (واتە: کەچی کاتێ ناوی پەرستراوانی بێجگە لە خوا ببرێت) لە بتەکان و هاوشێوەکانیان، وە کەسێک بانگەشە بکات بۆ بەندایەتی کردنیان و ستایشیان بکات ﴿إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ﴾ (یەکسەر شادوو ڕوخۆش دەبن) بەو بانگکردنە، دڵخۆش دەبن بە یادکردنەوەی پەرستراوەکانیان، چونکە هاوبەشدانان گونجاوەو ڕێک دێتەوە لەگەڵ هەواو ئارەزوویان، ئا ئەم حاڵەتە خراپترین و ناشرینترینی حاڵەتەکانە، بەڵام وادەو بەڵێنیان ڕۆژی پاداشت دانەوەیە، جا لەو ڕۆژەدا حەق و مافیان لێ وەردەگیرێ، وە تەماشا دەکرێ: ئایا پەرستراوەکانیان سوودیان پێ دەگەیەنن کە جگە لە خوا هاواریان پێدەکردن؟

(٤٦): لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿قُلِ ٱللَّهُمَّ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ واتە: بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی و بەڕێوەبەریان ﴿عَٰلِمَ ٱلْغَيْبِ﴾ ئەو زاتەی پەنهانە لە پێش چاوی ئێمەو زانستمان، ﴿وَٱلشَّهَٰدَةِ﴾ ئەوەی کە دەیبینین ﴿أَنتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ فِى مَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾

(واتە: هەر تۆ دادوەری دەکەیت لە نێوان بەندەکانتدا لەوەی ئەوان تیایدا جیاواز بوون) لە گەورەترینی جیاوازیەکان: جیاوازی یەکتاپەرستە دڵسۆزەکان ئەوانەی کە وتیان: ئەوەی ئەوان لەسەری بوون تەنها ئەوە حەق بوو، وە چاکەیان بۆ هەیە لە دوارۆژدا، وە ئەو بتپەرستانەی کە جگە لە تۆ شتانێکیان پەرستووە، وە لەگەڵ تۆدا یەکسانیان کردوە شتێک کە شایستەی یەکسان کردن نیە، وە بە کەم تەماشات دەکەن، وە بە کەمت دادەنێن ئەوپەڕی بەکەم دانان، وە لە کاتی باسکردنی پەرستراوەکانیاندا مژدە دەدەن بەیەکتر، بەڵام لە کاتی باسکردنی تۆدا تێکدەچنو بێزار دەبن، لەگەڵ ئەمەدا ئەوان پێیان وابوو لەسەر حەقن، غەیری ئەوانیش لەسەر بەتاڵو پووچە، وە سەرەنجامی چاکیان بۆ هەیە.

خوا فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلْمَجُوسَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿١٧﴾ ﴾الحج، (واتە: بەڕاستی کەسانێ کە بڕوایان هێناوەو کەسانێ کە بوون بە جوولەکە، وە ئەستێرە یان فریشتە پەرستەکانو گاورەکان (نەسرانیەکان) وە ئاگر پەرستەکانو ئەوانەی هاوبەشیان بۆ خوا دانا بێگومان خوا بڕیار دەدات لە نێوانیاندا (جیایان دەکاتەوە لە یەکتر کۆمەڵێ بۆ بەهەشت کۆمەڵێکی تریان بۆ دۆزەخ) لە ڕۆژی دواییدا بەڕاستی خوا بە هەموو شتێکدا ئاگادارە). خوا ﷻ هەواڵیداوە بە دادپەروەری لە نێوانیانداو دوای ئەوە فەرموویەتی: ﴿ هَٰذَانِ خَصْمَانِ ٱخْتَصَمُواْ فِى رَبِّهِمْ ۖ فَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِّن نَّارٍ يُصَبُّ مِن فَوْقِ رُءُوسِهِمُ ٱلْحَمِيمُ ﴿١٩﴾ يُصْهَرُ بِهِۦ مَا فِى بُطُونِهِمْ وَٱلْجُلُودُ ﴿٢٠﴾ وَلَهُم مَّقَٰمِعُ مِنْ حَدِيدٍ ﴿٢١﴾ ﴾الحج، (واتە: ئەمانە دوو کۆمەڵی دژ یەکن دەمە قاڵێو کێشەیانە دەربارەی پەروەردگاریان جا ئەوانەی کە بێبڕوا بوون لە ڕۆژی دواییدا پۆشاکیان بۆ دەبڕدرێت پڕ بە بەریان لە ئاگر بەسەریاندا دەڕژێنرێ ئاوی زۆر گەرم × دەتوێنرێتەوە بەو ئاوە گەرمە ئەوەی لەناو سکیاندایەو پێستەکانیش یان × بۆیان ئامادەیە گوزری ئاسنی) تا ئەوەی فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُدْخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَلُؤْلُؤًا ۖ وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ ﴿٢٣﴾ ﴾الحج، (واتە: بە ڕاستی خوا ئەوانەی کە بڕوایان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردوە دەیانخاتە بەهەشتانێک ڕووبارەکان بە ژێریاندا دەڕۆن ئەوانە دەڕازێنرێنەوە لەو بەهەشتانەدا بە بازنی ئاڵتونو مرواری وە پۆشاکیان لە بەهەشتدا ئاوریشمە).

وە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمْ يَلْبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلْمٍ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْأَمْنُ وَهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٨٢﴾ ﴾الأنعام، (واتە: ئەوانەی کە بڕوایان هێناوەو بڕواکەیان تێکەڵ بە ستەم هاوەڵ دانان

نەکردوە هێمنیو ئاسایش تەنها بۆ ئەوانەیە هەر ئەوانەش ڕێنمایی کراون).

﴿ إِنَّهُۥ مَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ ٱلْجَنَّةَ وَمَأْوَىٰهُ ٱلنَّارُ ﴿٧٢﴾ ﴾المائدة، (واتە: بە ڕاستی هەر کەس هاوبەش بۆ خوا دابنێ ئەوە بێگومان خوا بەهەشتی لێ حەرام کردوە وە جێو شوێنی ئاگر دەبێت)، لەم ئایەتەدا ڕوونکردنەوەی گشتگیری دروستکردنو گشتگیری زانستو گشتگیری بڕیارێتی لە نێوان بەندەکانیدا، جا بە تواناى هەموو شتەکانی هێناوەتە بوون، وە بەزانستی دەوری هەموو شتەکانی داوە، ئەمە بەڵگەیە لەسەر بڕیاردانی لە نێوان بەندەکانیو زیندووکردنەوەکەیان، وە زانستی بە کردەوەکانیان چاکو خراپیان، وە بەئەندازەی پاداشتیان، وە بەدیهێنانی بەڵگەیە لەسەر زانستی ﴿ أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ ﴿١٤﴾ ﴾الملك، (واتە: ئایا ئەو خوایەی کە مەردوومی دروست کردوە ئاگای لە نهێنی یان نیە)؟!

(٤٧-٤٨): ﴿ وَلَوْ أَنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفْتَدَوْا۟ بِهِۦ مِن سُوٓءِ ٱلْعَذَابِ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ وَبَدَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مَا لَمْ يَكُونُوا۟ يَحْتَسِبُونَ ﴿٤٧﴾ وَبَدَا لَهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا كَسَبُوا۟ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾:

﴿ وَلَوْ أَنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفْتَدَوْا۟ بِهِۦ مِن ﴾ دوای ئەوەی خوا ﷻ باسیکرد ئەو دادوەرە لە نێوان بەندەکانیداو باسی ناشرینی قسەو وتاری هاوبەشدانەرانی کرد، وەک ئەوەیە نەفسو دەرون تامەزرۆی ئەوەبێ کە خوا چیان لێدەکات لە ڕۆژی دواییدا، جا هەواڵیداوە کە بێگومان بۆ ئەوان هەیە ﴿ سُوٓءِ ٱلْعَذَابِ ﴾ واتە: توندترینو خراپترینی سزا، هەر وەکو چۆن توندترینو ناشرینترین کوفریان کرد. بێگومان ئەوان -ئەگەر وا دابنرێ- هەموو ئەوەی لە زەویدایە لە زێڕو زیوو گەوهەرو گیاندارانو دارو درەختو کشتووکاڵەکانو هەموو ناوماڵەکانو ئەوەندەی تریشی لەگەڵدابێ، پاشان لە جیاتی ڕزگار بوونی خۆیان لە سزای ڕۆژی دوایی بیاندایەت، لێیان وەرنەدەگیراو بێنیازی نەدەکردن لە سزای خوا ﴿ يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا مَنْ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٩﴾ ﴾الشعراء، (واتە: ڕۆژێ کە ماڵو سامانو منداڵو نەوە سوود ناگەیەنن × بێجگە لە کەسێ بێتە خزمەتی خوا بە دڵێکی ساغو پاکو خاوێنەوە).

وَبَدَا لَهُمْ سَيِّئَاتُ مَا كَسَبُوا وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِۦ
يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٤٨﴾ فَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَٰنَ ضُرٌّ دَعَانَا ثُمَّ إِذَا خَوَّلْنَٰهُ
نِعْمَةً مِّنَّا قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍۭ بَلْ هِىَ فِتْنَةٌ وَلَٰكِنَّ
أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٩﴾ قَدْ قَالَهَا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَمَآ
أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿٥٠﴾ فَأَصَابَهُمْ سَيِّئَاتُ
مَا كَسَبُوا وَٱلَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْ هَٰٓؤُلَآءِ سَيُصِيبُهُمْ سَيِّئَاتُ
مَا كَسَبُوا وَمَا هُم بِمُعْجِزِينَ ﴿٥١﴾ أَوَلَمْ يَعْلَمُوٓا أَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ
ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ
﴿٥٢﴾ قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا
مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُۥ هُوَ
ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ وَأَنِيبُوٓا إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا لَهُۥ مِن
قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿٥٤﴾ وَٱتَّبِعُوٓا أَحْسَنَ
مَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ
بَغْتَةً وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴿٥٥﴾ أَن تَقُولَ نَفْسٌ يَٰحَسْرَتَىٰ
عَلَىٰ مَا فَرَّطتُ فِى جَنۢبِ ٱللَّهِ وَإِن كُنتُ لَمِنَ ٱلسَّٰخِرِينَ ﴿٥٦﴾

**(٤٨):** ﴿ وَبَدَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مَا لَمْ يَكُونُوا يَحْتَسِبُونَ ﴾ (واتـە: وە لەلایەن خـواوە بۆیان دەرکـەوت شـتی وا کـە ئـەوان بیریـان لێنەکردۆتـەوە) گومانیـان بـۆ نەچـووە نارەحەتیو ناخۆشـی مەزنو، تۆڵەی گەورە، ئـەوان لـە پێشـدا بڕیاریـان دەدا بـۆ خۆیان بـە پێچەوانـەی ئـەوە، ﴿ وَبَدَا لَهُمْ سَيِّئَاتُ مَا كَسَبُوا ﴾ واتـە: (بۆشـیان دەرکـەوت) ئـەو کاروبارانـەی زیانیـان پێدەگەیەنـێ بە هـۆی ئـەو خراپانـەی خۆیـان بەدەسـتیان هێنـا، ﴿ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴾ (واتـە: وە دەوری گرتن ئەو سـزایەی ئەوان گاڵتەیـان پێدەکـرد) لە هەرەشـەو سـزا کە دابـەزی بۆیـان، وە ئەوەی بەسـەریاندا هات لـە سـزاو تۆڵە.

**(٤٩-٥٢):** ﴿ فَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَٰنَ ضُرٌّ دَعَانَا ثُمَّ إِذَا خَوَّلْنَٰهُ نِعْمَةً مِّنَّا قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍۭ بَلْ هِىَ فِتْنَةٌ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٩﴾ قَدْ قَالَهَا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿٥٠﴾ فَأَصَابَهُمْ سَيِّئَاتُ مَا كَسَبُوا وَٱلَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْ هَٰٓؤُلَآءِ سَيُصِيبُهُمْ سَيِّئَاتُ مَا كَسَبُوا وَمَا هُم بِمُعْجِزِينَ ﴿٥١﴾ أَوَلَمْ يَعْلَمُوٓا أَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾ ﴾:

﴿ فَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَٰنَ ضُرٌّ ﴾ خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات دەربـارەی حاڵـی مرۆڤو سروشـتی، کاتێ کـە تووشـی زیانێـک دەبـێ لـە نەخۆشـی یـان نارەحەتـی، یـان خـەمو پـەژارە ﴿ دَعَانَا ﴾ (هاوارمـان بـۆ دێنـێ) و پێداگـری دەکات لـە ڕزگاربـوون لـەوەی تووشـی بـووە ﴿ ثُمَّ إِذَا خَوَّلْنَٰهُ نِعْمَةً مِّنَّا ﴾ زیـانو نارەحەتیەکەمـان لەسـەری لابـرد، جارێکـی تـر دەگەڕێتـەوە بۆ بێبروایـی کـردن بـە پەروەردگـاری، وە لە بەرانبـەر چاکەکانیـدا خراپـە دەکات، وە ﴿ قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍ ﴾ واتـە: (دەڵـێ: ئـەم بەهرەیـەم پێدراوە) بە زانسـتێ لەلایـەن خواوە، من شایسـتەی ئـەوەمو حەقی خۆمە، چونکە بەخشـندەم لەسـەری، یـان بە هـۆی لێزانینی خۆمەوە بـە ڕێگاکانی بەدەسـتهێنانی.

خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ بَلۡ هِيَ فِتۡنَةٞ ﴾ (واتـە: بەڵکـو ئـەوە) تاقیکردنەوەیەکـی خواییـە، بەندەکانـی پـێ تاقـی دەکاتـەوە، تـا بزانـرێ کـێ سوپاسـگوزاری دەکاتو کـێ بێبڕوایی پێـدەکات ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴾ (واتـە: بـەڵام زۆربەیـان نازانـن) بەڵکو تاقـی کردنەوە بـە بەخشـش دادەنێـن، وە چاکـەی تەواویان لـەلا تێکـەڵ دەبێ، هەندێجـار ئـەو تێکەڵبوونە دەبێتـە مایـەی خێر یان شـەڕ.

خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ قَدۡ قَالَهَا ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ ﴾ (واتە: بێگومان ئەم قسـەیە کەسـانی پێش ئەمانیـش کردیـان) واتـە: وتیـان: ﴿ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمٍ ﴾ بـە بـەردەوام ئـەم قسـەیە وەک میـرات بەجێمـاوە لـە لای بـە درۆدانەران، کـە هەرگیـز دان بـە نیعمەتـی پەروەردگاریاندا نانێـنو مافـی پـێ نادەن، بـەردەوام ئەوە پیشـەیان بوو تا لەناو چـوون، وە بێنیـازی نە کردن، ﴿ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴾ کاتـێ سـزایان بـۆ هات.

(٥١): ﴿ فَأَصَابَهُمۡ سَيِّـَٔاتُ مَا كَسَبُواْۚ ﴾ (واتـە: ئنجـا دووچاریـان بـوو تۆڵـەی ئـەو خراپانـەی کردبوویـان)، (السـيئات) لـەم جێگایـەدا بـە مانـای تۆڵەکردنـەوەکان دێ، چونکـە زیان بە مرۆڤ دەگەیەنێو خەمبـاری دەکات، ﴿ وَٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡ هَٰٓؤُلَآءِ سَيُصِيبُهُمۡ سَيِّـَٔاتُ مَا كَسَبُواْ ﴾ ئـەوان هەرگیـز چاکتـر نین لـە پێشـینی خۆیـان، وە بێتاوانـیو بەرائەتیان بۆ نەنووسـراوە لە کتێبـە ئاسـمانیەکاندا کە سـزا نەدرێن.

(٥٢): دوای ئـەوەی باسـی کـرد ئـەوان بوغـرا بـوون بە مـاڵو سـامان- وە پێیـان وابوو بە هـۆی نەفامیانـەوە- بوونـی مـاڵ بەڵگەیە لەسـەر چاکی حاڵـی خاوەنەکەی، خـوا ﷻ هەواڵی پێـدان ڕزقو ڕۆزی ئـەو بەڵگـە نیە لەسـەر ئـەوە، وە بێگومـان ئەو خوایـە ﴿ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ ﴾ (واتـە: ڕۆزی فـراوان دەکات بۆ هەرکەسـێ بیـەوێ) لە بەندەکانی، یەکسـانە ئەگەر چـاک بـێ یـان خـراپ ﴿ وَيَقۡدِرُ ﴾ واتـە: ڕزقو ڕۆزی تەنـگ دەکات بـۆ هـەر کەسـێ بیـەوێ، چـاک بـێ یـان خـراپ، ڕزقو ڕۆزی خـوا هاوبەشـە لـە نێـوان هەمـوو خەڵکیدا، وە بڕواهێنـانو کـردەوەی چـاک تایبەتـە بە چاکترینـی خەڵکـی ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴾ واتـە: بەرفراوانـیو تەنگـی ڕزقو ڕۆزی، چونکـە دەزانن سـەرچاوەی ئـەو ڕزقو ڕۆزیـە دەگەڕێتـەوە بـۆ کار دروسـتیو میهرەبانی، وە بێگومـان خوا ﷻ شـارەزاترە بە حاڵی بەندەکـەی، هەنـدێ جـار ڕزقو ڕۆزیان لەبـەر تەنـگ دەکات، وەک میهرەبانیـەک بۆیان، چونکـە ئەگـەر بەرفراوانـی بـکات گومـڕا دەبـن لەسـەر زەویـدا، خـوا ﷻ لـەوەدا چاکـی ئاینەکەیـان لەبەرچـاو دەگرێ، کـە بنچینەی خۆشـبەختیو سـەرکەوتنیانە.

(٥٣-٥٩): ﴿ قُلْ يَـٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ وَأَنِيبُوٓا۟ إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا۟ لَهُۥ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿٥٤﴾ وَٱتَّبِعُوٓا۟ أَحْسَنَ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ بَغْتَةً وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴿٥٥﴾ أَن تَقُولَ نَفْسٌ يَـٰحَسْرَتَىٰ عَلَىٰ مَا فَرَّطتُ فِى جَنۢبِ ٱللَّهِ وَإِن كُنتُ لَمِنَ ٱلسَّـٰخِرِينَ ﴿٥٦﴾ أَوْ تَقُولَ لَوْ أَنَّ ٱللَّهَ هَدَىٰنِى لَكُنتُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٥٧﴾ أَوْ تَقُولَ حِينَ تَرَى ٱلْعَذَابَ لَوْ أَنَّ لِى كَرَّةً فَأَكُونَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٥٨﴾ بَلَىٰ قَدْ جَآءَتْكَ ءَايَـٰتِى فَكَذَّبْتَ بِهَا وَٱسْتَكْبَرْتَ وَكُنتَ مِنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٥٩﴾ ﴾:

خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات دەربـارەی ئـەو بەندانـەی زێدەڕۆییـان کـردوە بـە بەرفراوانـی بەخشـندەیی‌و هانیـان دەدات لەسـەر گەڕانەوە پێـش ئەوەی دەرفەتـی گەڕانەوەیـان نەمێنێ، فەرموویەتـی: ﴿ قُلْ ﴾ ئـەی پێغەمبـەر ﷺ وە ئـەو کەسەیشـی لـە جێگـای ئـەوە لـە بانگ خوازانـی ئاینـی خوا، بەنـدەکان ئاگادار بکەنـەوە دەربـارەی پەروەردگاریان: ﴿ يَـٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ ﴾ (واتـە: ئـەی بەندەکانـم ئـەی ئەوانەی خۆتـان زۆر گوناهبـار کردوە)، بـە شـوێنکەوتنی ئـەوەی نەفس‌و دەروونیـان بانگیان دەکـەن بۆ گونـاە، وە هـەوڵ دان بۆ تورەکردنـی زانـای پەنهـان ﴿ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ﴾ واتـە: بـێ هیـوا مەبـن لـە میهرەبانی خـوا، بە دەسـتی خۆتان خۆتان تووشـی نارەحەتـی بکەن‌و بڵێن: بەڕاسـتی گوناهمـان زۆرەو ناتەواویەکانمـان کەڵەکـە بـووە، بـە هـۆی ئـەوەوە بـەردەوام بن لەسـەر سـەرپێچی، بەڵام پەروەردگارتـان بناسـن بـە ناوەکانی کە بەڵگەن لەسـەر ڕێـزو میهرەبانی، وە بزانـن بێگومان خـوا ﷻ ﴿ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ﴾ (واتـە: لە هەمـوو گوناهەکان خۆش دەبێ) لە هاوبەشـدانان‌و زینـاو ڕیباو سـتەم‌و جگە لەوانەش لـە گوناهە گەورەو بچووەکـەکان ﴿ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴾ واتـە: وەسـفی لێبوردەیـی‌و میهرەبانیـە، دوو وەسـفن تایبەتـن، خودین، خودی ئـەو لەو دوو وەسـفە جیانابێتـەوە، بـەردەوام شـوێنەواری لە بوونـەوەردا بـەدی دەکرێـت، لار دەبێتەوە بۆ لای بوونـەوەر، دەسـتەکانی فراوانـە لە چاکـەدا بە درێژایی شـەوو ڕۆژ، بـەدوای یەکدا نازو نیعمـەت دەدات بەسـەر بەندەکانـدا، وە فـەزڵ‌و چاکەکانـی لـە نهێنی‌و ئاشـکرادا، بەخشـین خۆشەویسـترە بەلایـەوە لە گرتنەوە، میهرەبانی پێشـی تورەیی کەوتووەو زاڵ بووە بەسـەریدا، بـەڵام بـۆ لێخۆشـبوون‌و میهرەبانی‌و بەدەسـتهێنانیان چەندین هـۆکار هەیە، ئەگـەر بەندە پێی هەڵنەسـێت ئـەوە دەرگـای میهرەبانی‌و لێخۆشـبوونی بەسـەر خۆیـدا داخسـتووە، مەزنترین‌و گەورەترینیانـە بەڵکـو جگـە لـەوە هۆکارێکـی دیکە نیـە: گەڕانەوە بـۆ لای خوا بـە داوای لێخۆشـبوونی ڕاسـتەقینەو پاڕانـەوەو گەردن کەچی‌و پەرسـتن، ئـەم هۆکارە گـەورەو ڕێگا

مەزنــە بــۆ ئــەوان هەیە. لەبــەر ئەمەیــە خــوا ﷻ فەرمانی کــردوە بــە گەڕانــەوەو پەلەکردن تیایــدا، جــا فەرموویەتــی: ﴿ وَأَنِيبُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّكُمۡ ﴾ (واتە: بگەڕێنــەوە بــۆ لای پەروەردگارتان) بــە دڵەکانتــان ﴿ وَأَسۡلِمُواْ لَهُۥ ﴾ (واتــە: گەردن کەچــی ئەو بن) بــە ئەندامەکانی جەســتەتان، ئەگــەر (الإنابة) بــە تەنهــا هاتبوو ئــەوە کردەوەکانی جەســتەش لەخــۆ دەگــرێ، وە ئەگەر کــۆی بکاتــەوە لــە نێوانیانــدا، وەک لــەم جێگایەدا هاتــووە، ئەوە ماناکــە بەو شــێوەیەیە کە باســمان کرد.

وە کــە خــوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِلَىٰ رَبِّكُمۡ وَأَسۡلِمُواْ لَهُۥ ﴾ (واتە: بــۆ لای پەروەردگارتانو گەردن کەچــی ئــەو بن) بەڵگەیە لەســەر دڵســۆزی، جــا بەبێ دڵســۆزی کــردەوەی ئاشــکراو نهێنی هیــچ ســوودو بایەخێکــی نیــە. ﴿ مِن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَكُمُ ٱلۡعَذَابُ ﴾ (واتــە: بــەر لەوەی ســزاتان) بــۆ بێت هاتنێــک بەرپەرچ نەدرێتــەوە ﴿ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴾ (واتە: پاشــان یارمەتــی نادرێن). هــەر وەکو ئــەوە وایــە وترابــێ: گەڕانــەوەو ئیســلام چیــە؟ وردەکاریو کردەوەکانی چیە؟ خــوا وەڵامی داوتــەوە بە فەرمایشــتی خــۆیو فەرموویەتی:

(٥٥): ﴿ وَٱتَّبِعُوٓاْ أَحۡسَنَ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُم ﴾ (واتــە: شــوێنی چاکتریــن شــتێ بکەون کــە نێردراوەتــە خــوارەوە بۆتان لــە پەروەردگارتانــەوە) لەوەی خــوا فەرمانی پێکــردوون لە کــردەوە نهێنیەکان، وەک خۆشویســتنی خواو ترســان لێیو ئومێد بوون پێــی، وە ئامۆژگاری بــۆ بەندەکانیو حەزکــردن لەخێرو چاکــە بۆیانو وازهێنــان لە پێچەوانــەی ئەوانە.

لــە کــردەوە ئاشــکراکان وەک نوێــژو زەکاتو ڕۆژو حــەجو جۆرەکانــی چاکــەو جگــە لەوانیــش، لــەوەی خــوا فەرمانی پێکــردوە، ئەوە چاکترین شــتێکە کــە بۆمــان نێردراوەتەوە خــوارەوە لەلایــەن پەروەردگارمانــەوە، جا شــوێنکەوتووی فەرمانەکانی خوا لــەم کاروبارانەو هاوشــێوەکانیان مســوڵمانی گەردنکەچە.

﴿ مِّن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَكُمُ ٱلۡعَذَابُ بَغۡتَةٗ وَأَنتُمۡ لَا تَشۡعُرُونَ ﴾ هەمــوو ئەمانە هاندانە لەســەر پەلە کــردنو بەدەســت هێنانی هەل.

(٥٦): پاشــان ئاگــاداری کردوونەتــەوە، ﴿ أَن ﴾ بــەردەوام نەبــن لەســەر بێ ئاگاییــان، هەتا بۆیــان دێ لەو ڕۆژەی پەشــیمان دەبنەوە تیایدا، پەشــیمان بوونەوەش هیچ ســوودێکی نیە، وە ﴿ تَقُولَ نَفۡسٞ يَٰحَسۡرَتَىٰ عَلَىٰ مَا فَرَّطتُ فِي جَنۢبِ ٱللَّهِ ﴾ (واتە: ئەوســا کەســێ بڵێ ئەی مەخابن لەســەر ئــەوەی کەمتەرخەمیم کــرد) لە جێبەجێ کردنــی حەقی خوا ﴿ وَإِن كُنتُ ﴾ لــە دونیادا ﴿ لَمِنَ ٱلسَّٰخِرِينَ ﴾ (لــە گاڵتەچیــان بــووم) لە هاتنــی پاداشــتدا هەتا بە چاوی خــۆم بینیم.

أَوْ تَقُولَ لَوْ أَنَّ ٱللَّهَ هَدَىٰنِى لَكُنتُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٥٧﴾ أَوْ تَقُولَ
حِينَ تَرَى ٱلْعَذَابَ لَوْ أَنَّ لِى كَرَّةً فَأَكُونَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ
﴿٥٨﴾ بَلَىٰ قَدْ جَآءَتْكَ ءَايَـٰتِى فَكَذَّبْتَ بِهَا وَٱسْتَكْبَرْتَ وَكُنتَ
مِنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٥٩﴾ وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ تَرَى ٱلَّذِينَ كَذَبُوا۟ عَلَى
ٱللَّهِ وُجُوهُهُم مُّسْوَدَّةٌ ۚ أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْمُتَكَبِّرِينَ
﴿٦٠﴾ وَيُنَجِّى ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ بِمَفَازَتِهِمْ لَا يَمَسُّهُمُ ٱلسُّوٓءُ
وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦١﴾ ٱللَّهُ خَـٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ
شَىْءٍ وَكِيلٌ ﴿٦٢﴾ لَّهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَٱلَّذِينَ
كَفَرُوا۟ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَـٰسِرُونَ ﴿٦٣﴾ قُلْ
أَفَغَيْرَ ٱللَّهِ تَأْمُرُوٓنِّىٓ أَعْبُدُ أَيُّهَا ٱلْجَـٰهِلُونَ ﴿٦٤﴾ وَلَقَدْ
أُوحِىَ إِلَيْكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ
لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ﴿٦٥﴾ بَلِ
ٱللَّهَ فَٱعْبُدْ وَكُن مِّنَ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴿٦٦﴾ وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ
قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَٱلسَّمَـٰوَٰتُ
مَطْوِيَّـٰتٌۢ بِيَمِينِهِۦ ۚ سُبْحَـٰنَهُۥ وَتَعَـٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٧﴾

**(٥٧):** ﴿ أَوْ تَقُولَ لَوْ أَنَّ ٱللَّهَ هَدَىٰنِى لَكُنتُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴾ (لـو) لـەم جێگایـەدا بـۆ ئـاوات خواسـتنە، واتـە: خۆزگـە خـوا هیدایەتـی بدایـەم تـا ببـم بـە کەسـێکی لـە خواتـرس‌و خۆپارێـز، بـۆ ئـەوەی پارێـزراو بـم لـە سـزاو تۆڵـەو شایسـتەی پاداشـت بـم، وە (لـو) لێـرەدا (شرطیـة) نیـە، چونکـە ئەگـەر (شرطیـة) بوایـە، ئەوە بەڵگەیـان دەهێنایـەوە بـە قـەزاو قـەدەر لەسـەر گومراییـان، ئەویـش بەڵگەیەکـی پـووچ‌و بەتاڵـە، وە لـە ڕۆژی دواییـدا هەمـوو بەڵگەیەکـی پـووچ لەنـاو دەچێ‌و پـەرش‌و بـڵاو دەبێتـەوە.

**(٥٨):** ﴿ أَوْ تَقُولَ حِينَ تَرَى ٱلْعَذَابَ ﴾ (واتـە: کاتێـک سـزا دەبینـێ) دڵنیـا دەبـێ بـە هاتنـی بڵێـت: ﴿ لَوْ أَنَّ لِى كَرَّةً ﴾ ئەگـەر جارێکـی تـر بگەڕێمـەوە بـۆ دونیـا، ئەوسـا مـن ﴿ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾ (لـە چاکـە کاران دەبـم) خـوا ﷻ فەرموویەتـی بـە ڕاسـتی ئـەوە ڕوونـاداتو هیـچ سـوودێکی نیـە، ئەمـە تەنهـا ئاواتێکـی پـووچ‌و بەتاڵـەو حەقیقـەت‌و ڕاسـتی بـۆ نیـە، بێگومـان تـازە نابێتـەوە بـۆ بەنـدە ئەگـەر بگەڕێنرێتـەوە، ڕوونکردنـەوە لـە دوای ڕوونکردنـەوەی یەکـەم.

**(٥٩):** ﴿ بَلَىٰ قَدْ جَآءَتْكَ ءَايَـٰتِى ﴾ (واتـە: ڕاسـت ناکەیـت خـۆ بێگومـان بەڵگـەو ئایەتەکانـی منـت بۆهـات) ئـەو بەڵگانـەی هیـچ گومـانو دوو دڵیەکـی تێـدا نیـە لەسـەر ڕاسـتی، ﴿ فَكَذَّبْتَ بِهَا وَٱسْتَكْبَرْتَ ﴾ لـە شـوێنکەوتنیان ﴿ وَكُنتَ مِنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴾ (وە تـۆ لـە بێبڕوایـان بوویـت) داواکردنـی گەڕانـەوە بـۆ دونیـا شـتێکی گاڵتەجاڕیـە ﴿ وَلَوْ رُدُّوا۟ لَعَادُوا۟ لِمَا نُهُوا۟ عَنْهُ وَإِنَّهُمْ لَكَـٰذِبُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾ الأنعـام، (واتـە: وە ئەگـەر بگەڕێنرێنـەوە بـۆ دونیـا بێگومـان دووبـارە دەگەڕێنـەوە بـۆ ئـەو کارانـەی کـە لێیـان قەدەغەکرابـوو، بەڕاسـتی ئەوانـە درۆزنـن).

**(٦٠-٦١):** ﴿ وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ تَرَى ٱلَّذِينَ كَذَبُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ وُجُوهُهُم مُّسْوَدَّةٌ ۚ أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى

لِلْمُتَكَبِّرِينَ ﴿٦٠﴾ وَيُنَجِّي ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ بِمَفَازَتِهِمْ لَا يَمَسُّهُمُ ٱلسُّوٓءُ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦١﴾﴾:

﴿وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ تَرَى ٱلَّذِينَ كَذَبُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ وُجُوهُهُم مُّسْوَدَّةٌ﴾ خـوا ﷻ هــەواڵ دەدات دەربـارەی سەرشـۆڕی ئـەو کەسـانەی درۆیـان بەسـەریەوە کـردوە، بێگومـان ئەوانـە روویـان ڕەشـە لـە ڕۆژی دواییـدا وەکـو شـەوێکی تاریـک، خەڵکانـی تایبـەت بـەوە دەیانناسـنەوە، جـا بێگومـان حـەقو ڕاسـتی ڕۆشـنو ڕوونـە وەکـو بەرەبەیـان، هەروەکـو چـۆن ڕووی حەقیـان ڕەش کـرد بـە درۆ کـردن، خـوای گـەورەش ڕووی ئەوانـی ڕەش کـرد، وەک پاداشـتێک لـە جـۆری کردەوەکانیـان، بـۆ ئـەوان ڕوو ڕەشـی هەیـەو سـزای زۆر سـەختیش لـە نـاو دۆزەخـدا، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْمُتَكَبِّرِينَ﴾ (واتـە: ئایـا لـە دۆزەخـدا شـوێنێک نیـە بـۆ ئەوانـەی خۆیـان بـە گـەورە دەزانـن)، لـە ئاسـتی حەقـدا، وە لـە ئاسـتی بەندایەتـی کردنـی پەروەردگاریـان، ئەوانـەی درۆی بـۆ هەڵدەبەسـتن؟ بەڵـێ سـوێند بـە خـوا! بـە ڕاسـتی سـزایەکی ڕیسـواکەرو پـڕ لـە توورەیـی تێدایـە، لـووت بەرزانـی پـێ ئـازار دەدرێ، حـەقو مافیـان لـەو سـزایە لێوەردەگیـرێ.

درۆ هەڵبەسـتن لەسـەر خـوا درۆکـردن دەگرێتـەوە لەسـەری بـە دانانـی هاوبـەش‌و منـداڵ‌و خێـزان، وە هەواڵـدان دەربـارەی بـە شـتێ شایسـتە نەبـێ بـە گەورەیـی ئـەو، یـان بانگەشـەی پێغەمبەرایەتـی، یـان قسـەکردن لـە شـەریعەتەکەیدا بـەوەی ئـەو نەیوتبـێ، وە هەواڵـدان بـەوەی ئـەو وتبێتـی‌و کردبێتـی بـە شـەریعەت.

(٦١): کاتـێ باسـی حاڵـی لـووت بەرزانـی کـرد، باسـی حاڵـی پارێزکارانیـش دەکات، دەفەرمـوێ: ﴿وَيُنَجِّي ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ بِمَفَازَتِهِمْ﴾ بـە ڕزگـار بوونیـان، ئەویـش بـە هـۆی ئـەوەی کەرەسـتەی ڕزگاربوونیـان لەگەڵدایـە، ئەویـش لەخـوا ترسـانە، کـە ئـەوە ئامادەکاریـە بـۆ هەمـوو نارەحەتـی‌و ناخۆشـیەک، ﴿لَا يَمَسُّهُمُ ٱلسُّوٓءُ﴾ ئـەو سـزایەی کـە تووشـیان دەبێـت، ﴿وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ (نـە خـەم دەخـۆن) سـزاو ترسـی لێیـان ڕەتکردۆتـەوە، ئەمـەش ئەوپـەڕی ئاسایشـە.

ئـەوان ئاسایشـی تەواویـان بـۆ هەیـە، دەبـێ بـە هاوەڵیـان تـا دەیانگەیەنـێ بـە ماڵـی سـەلامەت، جـا ئـەو کاتـە پارێـزراو دەبـن لـە هەمـوو ناخۆشـی‌و بێزاریـەک، وە بەسـەریادا دێ گەشـاوەیی‌و خۆشـگوزەرانی، وە دەڵێـن: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَذْهَبَ عَنَّا ٱلْحَزَنَ ۖ إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٌ شَكُورٌ ﴿٣٤﴾﴾ فاطـر. (واتـە: وە ئـەوان دەڵێـن: هەمـوو سـوپاس بـۆ

ئـەو خوایـە کـە خەفەتـی لابردیـن‌و نەیهێشـت بەڕاسـتی پەروەردگارمـان لێبـووردەی شایسـتەی سوپاسـە).

(٦٢-٦٣): ﴿ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٞ ٦٢ لَّهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ٦٣ ﴾:

خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات دەربـارەی مەزنـی‌و تەواوێتـی خـۆی، وە زەرەرو زیانـی ئـەو کەسـە پێویسـت دەکات بێبڕوایی پـێ دەکات، جا فەرموویەتـی: ﴿ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖ ﴾ (واتـە: خـوا بەدیهێنـەری هەمـوو شـتێکە) ئـەم دەسـتەواژەو ئەوەیشـی هاوشـێوەیەتی زۆرن لـە قورئانـی پیـرۆزدا، بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی هەمـوو شـتەکان -جگـە لـە خـواو نـاوو سـیفاتەکانی- بەدیهێنـراون، ڕەتکردنـەوەی تێدایـە لەسـەر هـەر یـەک لـەوەی کـە وتوویەتـی بـە کۆنـی هەنـدێ لـە بەدیهێنـراوەکان، وەک ئـەو فەلسـەفە زانانـەی کـە وتوویانـە زەوی‌و ئاسـمانەکان کۆنـن، وە وەک ئەوانـەی وتوویانـە ڕووحەکانیـش کۆنـن، وە وێنـەی ئەوانـە لـە قسـەی خـاوەن پـووچ‌و بەتاڵـەکان، کـە پەکخسـتنی بەدیهێنـەر لەخـۆ دەگـرێ لـە بەدیهێنراوەکانـی.

فەرمایشـت‌و قسـەی خـوا ﷻ لـەو شـتانە نیـە کـە دروسـتکراوە، چونکـە قسـەکردن سـیفاتی قسـەکەرە، وە خـوا ﷻ بـە نـاوو سـیفاتەکانی یەکەمـە، پێـش ئـەو هیـچ شـتێک نەبـووە، جـا موعتەزیلـەکان ئـەم دەقـەو وێنـەی ئەمەیـان کردۆتـە بەڵگـە لەسـەر ئەوەی کـە قسـەی خـوا بەدیهێنـراوە، ئەمـە ئەوپـەڕی نەفامیـە چونکـە خـوا ﷻ خـاوەن ئـەو نـاوو سـیفاتانەیە بـە هەمیشـەیی، وە سـیفاتێک لـە سـیفاتەکانی بـۆ دروسـت نەبـووەو وە هەرگیـز لـە کاریـش ناکـەون لـە هیـچ کاتێکـدا.

شـایەت لەمـەدا خـوا هەواڵیـداوە دەربـارەی نەفسـی پیـرۆزی، بێگومـان ئـەو بەدیهێنـەرە بـۆ هەمـوو جیهانـی سـەرو خـوارەوە، وە ئـەو بەسـەر هەمـوو شـتێکدا سەرپەرشـتیارە، سەرپەرشـتیارێتی تەواویـش پێویسـتە سەرپەرشـتیار زانیـاری لەسـەر بێـت بـەوەی سەرپەرشـتیارە لەسـەری، وە دەوردانـی بـە وردەکاریەکانـی.

وە لـە توانایـی تـەواو لەسـەر ئـەوەی سەرپەشـتیارە بەسـەریەوە بـۆ ئەوەیـە بتوانێـت هەڵس‌و کەوتـی پێـوە بـکات، وە لـە پاراسـتنی ئـەوەی سەرپەرشـتیارە لەسـەری، وە لـە حیکمـەت‌و زانیـن بـە ڕووەکانـی ڕاپەڕانـدن، بـۆ ئـەوەی ڕاپەڕێنـی‌و بەڕێـوەی ببـات بـەوەی شایسـتەیە، سەرپەرشـتیاری تـەواو نابـێ تەنهـا بـە ئەوانـە نەبێـت.

ئـەوەی زانـراوو دانپێـدا نـراوە، خـوا ﷻ پـاکو خاوێنـە لـە هەمـوو ناتەواویـەک لـە هـەر سـیفەتێک لـە سـیفەتەکانی، جـا ڕاگەیاندنـی بـەوەی سەرپەرشـتیارە بەسـەر هەمـوو شـتێکدا، بەڵگەیـە لەسـەر بەرفراوانـی زانسـتی بـە هەمـوو شـتەکان، وە تـەواوی دەسـەڵاتی بەسـەر بەڕێوەبردنـی، وە تـەواوی هەڵسـوڕانیو تـەواوی حیکمەتـی کـە بـە هۆیـە شـتەکان لـە جێگـای خۆیـان دادەنـێ.

(٦٣): ﴿ لَّهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾ واتـە: کلیلەکانـی ئاسـمانو زەوی، بـە زانسـتو بەڕێوەبـردن (بـە دەسـتی خوایـە) ﴿ مَّا يَفۡتَحِ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحۡمَةٖ فَلَا مُمۡسِكَ لَهَاۖ وَمَا يُمۡسِكۡ فَلَا مُرۡسِلَ لَهُۥ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴾ فاطر، (واتـە: خـوا هـەر بەهـرەو چاکەیـەک بـۆ خەڵـک بـەرەڵا بـکاتو بیکاتـەوە ئیتـر بەرگـری کەرێکـی بـۆ نیـە، وە خـوا هـەر بەهرەیـەک بگرێتـەوە ئیتـر لـە پـاش گرتنـەوەی خـوا بەرەڵاکـەرو نێـرەری بـۆ نیـە، وە خـوا زاڵـی کاردروسـتە).

خـوا ﷻ کاتـێ مەزنـی خـۆی ڕوون کـردەوە کـە واپێویسـت دەکات دڵـەکان پـڕ بـن بـۆی لـە مەزنـیو ڕێـزو گەورەیـی، ئنجـا باسـی حاڵەتـی پێچەوانـەی ئـەوەی کـردەوە، خوایـان نەناسـیو بـە گەورەیـان نەزانـی بـەو جـۆرەی شـیاوێتی، جـا فەرمـووی: ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ﴾ کـە بەڵگـەن لەسـەر حـەقو ڕێگـای ڕاسـت ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴾ (واتـە: هـەر ئەوانـە زەرەرمەنـدن) زیانیـان پێگەیشـت کـە بـەو هۆیـەوە، دڵەکانـی پـێ چـاک دەبـوون لـە پەرسـتنو دڵسـۆزی بـۆ خـوا، وە بـەو هۆیەشـەوە زمانەکانـی پـێ چـاک دەبـێ لـە سـەرقاڵ بوونیـان بـە یـادی خـوا، وە ئەندامەکانـی جەسـتەی پـێ چـاک دەبـوو، لـە جیاتـی ئـەوە هەمـوو خراپەیـەک بـۆ دڵـەکانو جەسـتەکانیان پەسـند کـرد، وە بەهەشـتی پـڕ لـە نـازو نیعمەتیـان دۆڕانـد، لـە بـری ئـەوەدا سـزای بـە ئێشـیان تـووش بـوو.

(٦٤): ﴿ قُلۡ أَفَغَيۡرَ ٱللَّهِ تَأۡمُرُوٓنِّيٓ أَعۡبُدُ أَيُّهَا ٱلۡجَٰهِلُونَ ٦٤ ﴾:

﴿ قُلۡ ﴾ ئـەی پێغەمبـەر ﷺ بـەو نەفامانـە بڵـێ، ئەوانـە بانگـت دەکـەن بـۆ بەندایەتـی غەیـری خـوا: ﴿ أَفَغَيۡرَ ٱللَّهِ تَأۡمُرُوٓنِّيٓ أَعۡبُدُ أَيُّهَا ٱلۡجَٰهِلُونَ ﴾ (واتـە: ئایـا ئێـوە داوام لێدەکـەن بێجگـە لـە خـوا شـتێکی تـر بپەرسـتم ئـەی نەزانـان)؟! ئـەم فەرمانـە لـە نەفامیتانـەوە دەرچـووە، ئەگەرنـا ئەگـەر ئێـوە زانسـتتان هەبووایـە بـەوەی خـوای بـەرزو مـەزنو تـەواوە لـە هەمـوو ڕووەکانـەوە، وە پێـدەری هەمـوو نیعمەتەکانـە، ئـەو شایسـتەی

بەندایەتـی بـۆ كردنـە، غەیـری ئـەو ناتـەواوە لـە هەمـوو ڕوویەكـەوە، نـە سـوودی هەیـەو نـە زیـان، بۆچـی فەرمانـم پێدەكـەن بـە پەرسـتنی ئەوانـە.

(٦٥): ﴿ وَلَقَدْ أُوحِىَ إِلَيْكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ٦٥ ﴾:

وە لەبـەر ئـەوەی هاوبەشـدانان كـردەوەكان هەڵدەوەشـێنێتەوە بارودۆخـەكان تێكـدەدات، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ وَلَقَدْ أُوحِىَ إِلَيْكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكَ ﴾ لـە هەمـوو پێغەمبـەران، ﴿ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ ﴾ (واتـە: ئەگـەر هاوبـەش بـۆ خـوا دابنێیـت بـە ڕاسـتی كـردەوەت هەڵدەوەشـێتەوە)، ئەمـە تاكـی دراوە پاڵـە (مفرد مضـاف)ە كـە گشـت كردەوەیـەك دەگرێتـەوە.

جـا هەمـوو پێغەمبـەران (گوتوویانـە:) بێگومـان هاوبـەش دانـان هەڵوەشـێنەرەوەی هەمـوو كردەوەكانـە، هەروەكـو خـوا ﷻ لـە سـوورەتی ئەنعامـدا فەرموویەتـی: ﴿ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهْدِى بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۚ وَلَوْ أَشْرَكُوا۟ لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ٨٨ ﴾ الأنعـام، (واتـە: ئـەوە ڕێنمایـی خوایـە ڕێنمایـی هـەر بەندەیەكـی پێـدەكات لـە بەندەكانـی كـە خـوا بیـەوێ، وە ئەگـەر هاوبەشـیان ڕەوا بدایـە بـۆ خـوا بێگومـان ئـەو چاكانـەی كردبوویـان هەمـووی بـێ پاداشـت دەردەچـوو).

﴿ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ﴾ (واتـە: بێگومـان لـە زەرەرمەنـدان دەبیـت) ئاینەكـەتو دواڕۆژت، جـا بـە هاوبـەش دانـان كـردەوەكان هەڵدەوەشـێنەوەو تێـك دەچـنو خاوەنەكـەی شایسـتەی سـزاو تۆڵـە دەبێـت. پاشـان فەرموویەتـی:

(٦٦): ﴿ بَلِ ٱللَّهَ فَٱعْبُدْ وَكُن مِّنَ ٱلشَّـٰكِرِينَ ٦٦ ﴾:

﴿ بَلِ ٱللَّهَ فَٱعْبُدْ ﴾ (واتـە: بەڵكـو تەنهـا خـوا بپەرسـتە)، دوای ئـەوەی هەواڵیـدا نەفامەكان فەرمانـی پێدەكـەن بـە هاوبـەش دانـانو هەواڵیدا دەربـارەی خراپیو ناشـرینی ئـەو كارە، ئنجـا فەرمانـی كـرد بـە دڵسـۆزیو فەرمـووی: ﴿ بَلِ ٱللَّهَ فَٱعْبُدْ ﴾ واتـە: بـە دڵسـۆزیەوە بەندایەتـی بـۆ خـوای تـاكو تەنهـای بـێ هـاوەڵ بكـە، ﴿ وَكُن مِّنَ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴾ (واتـە: لـە سوپاسـگوزارانی خوابـە) لەسـەر سـەركەوتوو بـوون لەلایـەن خـواوە، هەروەكـو چـۆن خـوای بـەرزو مـەزن سـوپاس دەكـرێ لەسـەر نازونیعمەتەكانـی دونیـا، وەك لـەش سـاغیو خۆشـگوزەرانیو بەدەسـتهێنانی ڕزقو ڕۆزیو جگـە لەوانیـش، بەهەمـان شـێوە سـوپاسو سـتایش دەكـرێ لەسـەری بـە نـازو نیعمەتـە ئاینیـەكان، وەك سـەركەوتنو دڵسـۆزیو خۆپارێـزی.

بەڵکـو نیعمەتـی ئایـن نیعمەتـی ڕاسـتەقینەیە، وە بیر کردنـەوە لـەوەی کـە ئـەوە لـە لایـەن خواوەیـە، وە سوپاسـگوزاری کـردن لەسـەری، پارێزراویـە لـە بـەڵای لەخۆبایـی بـوون کـە تووشـی زۆرێ لـە کارکـەران بـووە بـە هـۆی نەفامیانـەوە، ئەگەرنـا ئەگـەر مـرۆڤ حەقیقەتـی بارودۆخـەکان بزانـێ، لـە خۆبایـی نابـێ بـە نازونیعمەتـێ حـەق وایـە لـە بەرانبەریـدا زیاتـر سوپاسـگوزاربێ.

(٦٧): ﴿ وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطْوِيَّٰتُۢ بِيَمِينِهِۦۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٧﴾ ﴾:

﴿ وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطْوِيَّٰتُۢ بِيَمِينِهِۦ ﴾ خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ئـەو هاوبـەش دانەرانـە خوایـان نەناسـیوەو بەمەزنیـان دانەنـاوە بـەو جـۆرەی شـیاوێتی، بەڵکـو پێچەوانـەی ئـەوە ڕەفتاریـان کـردوە لـە هاوبەشـدانانیان بـۆی، ئـەوەی کـە ناتـەواوە لـە وەسـفو کرداریـدا، جـا وەسـفەکانی ناتـەواوە لـە هەمـوو ڕووێکـەوە، کردەوەکانیشـی هیـچ سـوودو زیانێکـی نیـە، وە هیـچ بەخشـین‌و گرتنەوەیەکـی نیـە، وە هیـچ شـتێکی لـە کاروبارەکانـدا بـە دەسـت نیـە.

جـا ئـەم بەدیهێنـراوە ناتەواوەیـان یەکسـان کـرد بـە بەدیهێنـەری پەروەردگـاری مـەزن، ئـەو زاتـەی کـە هەمـوو سـەر زەوی لـە ڕۆژی دواییـدا لـە چنگـی ئـەو دایـە، وە ئاسـمانەکانیش بـە فراوانـی‌و مەزنیانـەوە بـە دەسـتی ڕاسـتی ئـەو پێچراونەتـەوە. هـەر کەسـێ هاوبەشـی بـۆ دابنـێ ئـەوە بـە مەزنـی دانەناوەو لـەو سـتەمکارتر نیـە، ﴿ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾ واتـە: پـاکـو بڵنـدە، وە بـەرزو مەزنـە لـە هاوبەشـدانانیان بـۆی.


وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ
إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ
﴿٦٨﴾ وَأَشْرَقَتِ ٱلْأَرْضُ بِنُورِ رَبِّهَا وَوُضِعَ ٱلْكِتَٰبُ وَجِاْىٓءَ
بِٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَقُضِيَ بَيْنَهُم بِٱلْحَقِّ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ
﴿٦٩﴾ وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴿٧٠﴾
وَسِيقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًا حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا
فُتِحَتْ أَبْوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَآ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ
يَتْلُونَ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِ رَبِّكُمْ وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ
هَٰذَا قَالُواْ بَلَىٰ وَلَٰكِنْ حَقَّتْ كَلِمَةُ ٱلْعَذَابِ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ
﴿٧١﴾ قِيلَ ٱدْخُلُوٓاْ أَبْوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَا فَبِئْسَ مَثْوَى
ٱلْمُتَكَبِّرِينَ ﴿٧٢﴾ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ رَبَّهُمْ إِلَى ٱلْجَنَّةِ
زُمَرًا حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا وَفُتِحَتْ أَبْوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا
سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَٱدْخُلُوهَا خَٰلِدِينَ ﴿٧٣﴾ وَقَالُواْ
ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي صَدَقَنَا وَعْدَهُۥ وَأَوْرَثَنَا ٱلْأَرْضَ
نَتَبَوَّأُ مِنَ ٱلْجَنَّةِ حَيْثُ نَشَآءُ فَنِعْمَ أَجْرُ ٱلْعَٰمِلِينَ ﴿٧٤﴾

**(٦٨-٧٠):** ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ ﴿٦٨﴾ وَأَشْرَقَتِ ٱلْأَرْضُ بِنُورِ رَبِّهَا وَوُضِعَ ٱلْكِتَٰبُ وَجِاْىٓءَ بِٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَقُضِيَ بَيْنَهُم بِٱلْحَقِّ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٦٩﴾ وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴿٧٠﴾﴾:

كاتێ خوا ﷻ ترساندنی لە مەزنی خۆی، ئنجا بە بارودۆخی دوایی ترساندنی، وە هانیدانو ئاگاداری كردنەوەو فەرمووی: ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ﴾ ئەویش دەنگێكی مەزنە، كەس بە مەزنی نازانێ جگە لە بەدیهێنەرەكەی، وە ئەوەی خوا ﷻ ئاگاداری كردۆتەوە بە زانستی خۆی لە بەدیهێنراوەكانی، ئیسرافیل عليه السلام فوو دەكا بە صوردا كە یەكێكە لە فریشتە نزیكەكان، وە یەكێكە لە هەڵگرانی عەرشی خوای بە بەزەیی.

﴿فَصَعِقَ﴾ بێ هۆش دەكەون یان دەمرن، لەسەر جیاوازی ئەو بیرو بۆچوونە، ﴿مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ﴾ واتە: (ئەوەی لە ئاسمانەكانو زەویدایە) هەموویان، كاتێ دەنگی صور دەبیستن بە هۆی گەورەییەوە تەواو بێزاریو ترس روویان تێدەكات ﴿إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ﴾ (مەگەر كەسانێ خوا بیەوێ نەمرن) لەوانەی خوا ﷻ جێگیری كردوون لە كاتی فوو كردن بە صوردا، ئەوانە نامرن، وەك شەهیدان یان هەندێ لەوانو جگە لەوانیش. ئەمە فووی یەكەمە، فووی مردنە، وە فووی تۆقینو نارەحەتیە.

﴿ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ﴾ واتە: (پاشان جارێكی تر فوو دەكرێ بە صوردا) فووی دووەم: فووی زیندووكردنەوە، ﴿فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ﴾ واتە: (لە گۆڕەكانیانەوە ڕاست دەبنەوە) بۆ زیندووكردنەوەو لێپرسینەوەیان، بێگومان دروستكردنی جەستەو ڕووحیان تەواو بووە، چاویان دەرپۆقیوە ﴿يَنظُرُونَ﴾ (چاوەڕوان دەكەن) كە خوا چیان لێدەكات.

(٦٩): ﴿وَأَشْرَقَتِ ٱلْأَرْضُ بِنُورِ رَبِّهَا﴾ (وە زەوی لەو ڕۆژەدا بە نوری پەروەردگاری ڕووناك

دەبێتەوە) لەمەدا ئەوە دەردەکەوێ کە ئەو ڕووناکیانەی بوونیان هەیە لە ڕۆژی دواییدا پەرش‌و بڵاو دەبن‌و نامێنن، خوا ﷻ هەواڵیداوە کە بێگومان خۆر دەپێچرێتەوەو ڕووناکی نامێنێ، وە مانگیش ڕۆدەچێ‌و دادەڕوخێ، ئەستێرەکانیش دەکەونە خوارەوەو وورد وورد دەبن، جا ئەو کاتە خەڵکی لە تاریکیدان، لەو کاتەدا زەوی بە نوری پەروەردگاری ڕووناکدەبێتەوە، کاتێ دەردەکەوێ‌و دادەبەزێ بۆ دادوەریکردن لەنێوانیاندا، ئا لەو ڕۆژەدا خوا هێزێک دەبەخشێ بە خەڵکی، دروستیان دەکات بە دروستکردنێکی بەهێزتر، بەرگەی ئەوە دەگرن کە نورو ڕووناکی خوا نەیان سوتێنێ‌و بتوانن ئەو ببینن، چونکە ڕووناکی خوای مەزن ئەگەر دەربکەوێ ئەوە هەرچی لەسەر زەویدایە تا چاو بڕ بکات دەیسوتێنێ ﴿وَوُضِعَ ٱلۡكِتَٰبُ﴾ واتە: کتێبی کردەوەکان وە دادگایی خوا، وە دانان‌و بڵاوکردنەوەی، بۆ ئەوەی بیخوێنێتەوە ئەوەی تیایدایە لە چاکەو خراپەکان، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿وَوُضِعَ ٱلۡكِتَٰبُ فَتَرَى ٱلۡمُجۡرِمِينَ مُشۡفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَٰوَيۡلَتَنَا مَالِ هَٰذَا ٱلۡكِتَٰبِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةٗ وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحۡصَىٰهَاۚ وَوَجَدُواْ مَا عَمِلُواْ حَاضِرٗاۗ وَلَا يَظۡلِمُ رَبُّكَ أَحَدٗا ٤٩﴾ الكهف، (واتە: نامەی کردەوەکان دابەش دەکرێ، ئنجا تاوانباران دەبینی زۆر دەترسن لەو هەموو تاوانەی کە تێیدایەو دەڵێن: ئای هاوار بۆ ئێمە ئەم نامەو دەفتەرە چییە؟ هیچ کردەوەیەکی بچووک‌و گەورەی بەجێ نەهێشتووەو تۆماری کردوە هەر کردەوەیەکیان کردبێ تیایدا ئامادەیەو پەروەردگارت ستەم لە کەس ناکات)، وە بە کارکەر دەوترێ بە ئەوپەڕی دادپەروەری‌و ویژدانەوە: ﴿ٱقۡرَأۡ كِتَٰبَكَ كَفَىٰ بِنَفۡسِكَ ٱلۡيَوۡمَ عَلَيۡكَ حَسِيبٗا ١٤﴾ الإسراء، (واتە: نامەکەت بخوێنەرەوە ئەمرۆ خۆت بەسە بە ژمێریار بەسەر خۆتەوە)، ﴿وَجِاْيٓءَ بِٱلنَّبِيِّـۧنَ﴾ (واتە: پێغەمبەران دەهێنرێن) بۆ ئەوەی پرسیاریان لێ بکرێ دەربارەی گەیاندنی پەیامەکەیان، وە لە ئوممەتەکەیان، وە شایەتیان لەسەر دەدرێ. ﴿وَٱلشُّهَدَآءِ﴾ شایەتەکان لە فریشتەکان، وە ئەندامانی جەستەو زەوی.

﴿وَقُضِيَ بَيۡنَهُم بِٱلۡحَقِّ﴾ واتە: بە دادپەروەریەکی تەواوو مەزن، چونکە لێپرسینەوەیەکە لەلایەن ئەو زاتەی کە بەقەد تۆزقاڵێک ستەم ناکات، وە ئەو زاتەی کە دەوری هەموو شتێکی داوە، وە کتێبەکەی کە بریتیە لە (لوح المفوظ) هەموو کردەوەکانی تێدایە، وە فریشتە بەڕێزەکان ئەوانەی لە فەرمانی پەروەرگاریان دەرناچن، بێگومان ئەوانەی کردوویانە فریشتەکان نووسیویانە، وە دادپەروەرترینی شایەتەکان، شایەتی دەدەن لەسەر ئەو بڕیارە، جا بڕیارە دەدات بەوە ئەو زاتەی کە ئەندازەی کردەوەکان دەزانێ، وە ئەندازەی شایستە بوونیان بە پاداشت‌و سزا، دادپەروەریەک دەستەبەر دەبێ هەموو خەڵکی دانی پێدادەنێن، وە دان بە خوادا دەنێن بە ستایش‌و دادپەروەری،

وە بە دادپەروەری ئەو دەزانن لە مەزنیو زانستو کار دروستیو میهرەبانی، کە هەرگیز بە دڵیاندا نەهاتووە، وە زمانیشیان تەعبیری لێ نەکردوە، ئا لەبەر ئەمەیە فەرمووویەتی:

(٧٠): ﴿ وَوُفِّيَتۡ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا عَمِلَتۡ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِمَا يَفۡعَلُونَ ﴾ (واتە: وە لەو ڕۆژەدا هەموو کەسێک چی کردوە بە تێرو تەواوی پاداشت دەدرێتەوە وە خوا خۆیشی ئاگادارە بەو کردەوانەی کە دەیکەن).

(٧١-٧٥): کاتێ خوا ﷻ باسی بڕیاری خۆی کرد لە نێوان بەندەکانیدا -ئەوانەی کۆی کردونەتەوە لە دروستکردنو ڕزقو ڕۆزی پێدانو بەڕێوەبردنیدا وە کۆکردنەوەیان لە دونیاداو کۆکردنەوەیان لە دواڕۆژدا- خوا ﷻ لە کاتی پاداشت دانەوەیاندا لە یەکتر جیایان دەکاتەوە، وەک چۆن جیابوونەوە لە دونیادا، بە بڕواهێنانو بێبڕواییو خۆپارێزیو گوناهو تاوان، جا فەرمووی: ﴿ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ ﴾ واتە: (ئەوسا ئەوانەی بێبڕوا بوون ڕاپێچ دەکرێن) بە ڕاپێچ کردنێکی پڕ لە توندو تیژی، لێیان دەدرێ بە قامچی بە ئێش، لەو فریشتە زەبر بەدەستە توورەو توندو تیژانە بۆ لای خراپترین زیندانو ناخۆشترین جێگا، ئەویش ئەو دۆزەخەیە کە هەموو سزایەکی تێدا کۆبووەتەوەو هەموو بەدبەختیەکی تێدا ئامادەیە، هیچ خۆشیەکی تێدانیە، هەروەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ يَوۡمَ يُدَعُّونَ إِلَىٰ نَارِ جَهَنَّمَ دَعًّا ١٣ ﴾الطور، (واتە: پاڵیان پێوە دەنێن بە پاڵنان، ئەویش لەبەر ئەوەی ڕێگری لە چوونە نێوی دەکەن، وە ڕاپێچ دەکرێن بۆ دۆزەخ، ﴿ زُمَرًا ﴾ واتە: کۆمەڵ کۆمەڵ، هەر دەستەیەک لەگەڵ دەستەیەکدا، کە کردەوەکانیان گونجاوە لەگەڵ یەکداو هەوڵو کۆششیان بۆ یەک ئامانج بووە، هەندێکیان نەفرین لەوی دیکە دەکەن، وە هەندێکیشیان خۆیان لەوی دیکە بەری دەکەن، ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا ﴾ واتە: تا دەگەنە نزیکی ئەو گۆڕەپانە، ﴿ فُتِحَتۡ ﴾ (بۆیان دەکرێتەوە)، واتە: لە پێناو ئەواندا ﴿ أَبۡوَٰبُهَا ﴾ لەبەر هاتنیانو دابەزینیان.

﴿ وَقَالَ لَهُمۡ خَزَنَتُهَآ ﴾ (واتە: دەرگاوانەکانی دۆزەخ بەوان دەڵێن) پیرۆزباییان لێدەکەن بە بەدبەختی هەتا هەتاییو سزای هەمیشەیی، وە سەرزەنشتیان دەکەن لەسەر کردەوەکانیان کە گەیاندوونی بەم شوێنە ناخۆشە، ﴿ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ ﴾ (واتە: ئایا پێغەمبەرانتان) لە ڕەگەزی خۆتان بۆ نەهات، دەیانناسنو وە ڕاستگۆییان دەزانن، وە دەتوانن شتیان لێوەربگرن؟ ﴿ يَتۡلُونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِ رَبِّكُمۡ ﴾ واتە: (ئایەتەکانی پەروەردگارتان بەسەردا بخوێننەوە)، خوا ﷻ پێغەمبەرانی پێ ناردوە، کە بەڵگەیە لەسەر حەقی دڵنیاکەرەوە بە ڕوونترین سەلماندنەکان، ﴿ وَيُنذِرُونَكُمۡ لِقَآءَ يَوۡمِكُمۡ هَٰذَا ﴾ واتە: ئەمە وا پێویست دەکا لەسەرتان شوێنی بکەون، وە خۆتان بپارێزن لە

سزای ئەم ڕۆژە، بە لە خواترسانو خۆپارێزی، بێگومان حاڵی ئێوە پێچەوانەی ئەم حاڵە بوو؟ ﴿ قَالُواْ ﴾ دان بە تاوانەکانیاندا دەنێن، وە بەڵگەو حوججەی خوا لەسەریان پێویست بووەو دەڵێن: ﴿ بَلَىٰ ﴾ بەڵێ: بێگومان پێغەمبەرانی پەروەردگارمان هاتن بۆ ناومان بە ئایەتو نیشانە ڕوونەکان، وە بۆیان ڕوون کردینەوە بە ئەوپەڕی ڕوونکردنەوە، وە ئاگاداریان کردینەوە لەم ڕۆژە، ﴿ وَلَٰكِنْ حَقَّتْ كَلِمَةُ ٱلْعَذَابِ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾ واتە: (بەڵام بڕیاری سزا دراوە بەسەر ئێمەی بێبڕواایاندا) بە هۆی بێبڕواییانەوە سزایان لەسەر پێویست بوو، کە ئەو سزایە بۆ هەر کەسێکە بێبڕوا بێت بە ئایەتو نیشانەکانی خواو نکوڵی بکات لەوەی پێغەمبەران هێناویانە، دانیان بە تاوانەکانیاندا ناو بەڵگەیان لەسەر پێویست بوو.

(٧٢): جا ﴿ قِيلَ ﴾ بە شێوەی ئیهانەکردنو زەلیل کردن پێیان دەوترێ: ﴿ ٱدْخُلُوٓاْ أَبْوَٰبَ جَهَنَّمَ ﴾ واتە: (لە دەرگاکانی دۆزەخەوە بچنە ژورەوە) هەر دەستەیەک لەو دەرگایەی شایستەیە بە ئەو و لەگەڵ کردەوەکانیدا دەگونجێ ﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَا ﴾ بە هەمیشەیی تیایدا ناگوازرێنەوە، وە سزایان لەسەر لاناچێ بۆ ساتێکیش بێ تەماشا ناکرێن ﴿ فَبِئْسَ مَثْوَى ٱلْمُتَكَبِّرِينَ ﴾ واتە: خراپترین مەنزڵگایەو ئاگر جێگاو ڕێگایانە، ئەویش بە هۆی لووت بەرزیان لەسەر حەق، خوا ﷻ پاداشتی دانەوە لە ڕەگەزی کردەوەکانیان بەسەرزەنشتو زەلیلیو سووکیو ڕیسوایی.

(٧٣): پاشان دەربارەی خەڵکانی بەهەشت فەرموویەتی: ﴿ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ رَبَّهُمْ ﴾ (واتە: وە کەسانێ لە پەروەردگاریان دەترسن دەبرێن) دەیپەرستن بە یەکتاپەرستیو گوێڕایەڵی دەکەن، بە ڕێزو سەربەرزیەوە دەبرێن، کۆدەکرێنەوە وەکو نوێنەرە بەڕێزو پڕ لە شکۆکان ﴿ إِلَى ٱلْجَنَّةِ زُمَرًا ﴾ دڵیان خۆشەو مژدە دەدەن، هەر پۆلێ لەگەڵ پۆلێکی دیکە، کە کردەوەکانیان لەگەڵ یەکتر دەگونجێو ڕێک دێتەوە، ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا ﴾ واتە: هەتا دەگەنە شوێنی پێشوازی کردنو ماڵە جوانو ڕازاوەکان، بۆنو سروەی بەهەشتیان بەسەردا دێو کاتی چوونە ژورەوەیانەو، وە کاتی مانەوەیی هەمیشەییان هاتووە لە نازو نیعمەتەکان، ﴿ وَفُتِحَتْ ﴾ بۆیان ﴿ أَبْوَٰبُهَا ﴾ دەرگاکانی دەکرێنەوە بەڕێزەوە، بۆ بەڕێزترینی خەڵک، بۆ ئەوەی ڕێزیان لێ بگیرێ تیایدا ﴿ وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا ﴾ (دەرگاوانەکان بەوان دەڵێن) پیرۆزباییو بەخێرهاتنیان دەکەن: ﴿ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ ﴾ واتە: سلاوتان لێبێ لە هەموو بەڵاو شەڕو ناخۆشیەک ﴿ طِبْتُمْ ﴾ واتە: دڵەکانتان پاکو خاوێن بوو بە ناسینی خواو خۆشویستنو ترسان لێی، وە زمانتان پاک بوو بە یادکردنەوەییو ئەندامانی جەستەیشتان بە گوێڕایەڵی کردنی ﴿ فَٱدْخُلُوهَا خَٰلِدِينَ ﴾ (جا بە هۆی پاکیتانەوە بڕۆنە ناو بەهەشت بە هەمیشەیی) چونکە ماڵی پاکو خاوێنە، شایستە نیە

پێی تەنها پاکو خاوێنەکان نەبن.

دەربارەی ئاگر فەرموویەتی: ﴿ فُتِحَتْ أَبْوَٰبُهَا ﴾ وە دەربارەی بەهەشت: ﴿ وَفُتِحَتْ ﴾ بە (الواو) ئاماژەیە کە دۆزەخیان تەنها بە گەیشتنیان بۆ بەر دەرگاکانی دۆزەخ، دەرگاکانیان بۆ دەکرێتەوە بەبێ چاوەڕوانیو بەبێ مۆڵەت، وە بۆ ئەوەی کردنەوە بە ڕوویاندا بە گەیشتنیان مەزنترو نارەحەترە بە سزادانیان، بەڵام بەهەشتیان چونکە ئەو شوێنە شوێنێکی بەرزو گران بەهایە کەس پێی ناگاو هەموو کەسێ بەدەستی ناهێنێ، تەنها کەسانێ نەبێ هۆکاری پێویستیان پێ بێ بۆ ئەو بەهەشتە، وە لەگەڵ ئەوەدا بۆ چوونە نێوی پێویستیان بە تکاکردنی بەرێزترینی تکاکاران دەبێ، بۆیە تەنها بە گەیشتنیان دەرگاکانیان بۆ ناکرێتەوە، بەڵکو لەلای خوا داوا دەکەن پێغەمبەر موحەممەد ﷺ تکایان بۆ بکات، ئنجا خوا ﷻ دەیکاتە تکاکار بۆیان.

لەم ئایەتانە بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی کە دۆزەخو بەهە شت چەندین دەرگایان هەیە دەکرێنەوەو دادەخرێن، وە بۆ هەر یەک لەوانە دەرگاوانی خۆی هەیە، ئەوانیش دووماڵی تایبەتن هیچ کەس ناچێتە ناویانەوە مەگەر کەسێ شایستە بێت، بە پێچەوانەی سەرجەمی شوێنو جێگاکانی دیکە.

﴿ وَقَالُواْ ﴾ کاتێ دەخرێنەوە ناو بەهەشتەوەو جێگیر دەبن، ستایشی پەروەردگاریان دەکەن لەسەر ئەو نازونیعمەتەی پێی بەخشیونو دەڵێن: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى صَدَقَنَا وَعْدَهُۥ ﴾ واتە: پەیمانی بەهەشتی پێداین، لەسەر زمانی پێغەمبەرانی ئەگەر بڕوامان هێناو چاکەخواز بووین، بەڵێنەکەی خۆی لەگەڵماندا بردە سەر، وە ئەو منەتەی کردی بەسەرماندا بەجێی هێنا، ﴿ وَأَوْرَثَنَا ٱلْأَرْضَ ﴾ واتە: زەوی بەهەشت، ﴿ نَتَبَوَّأُ مِنَ ٱلْجَنَّةِ حَيْثُ نَشَآءُ ﴾ واتە: لە هەر شوێنو جێگایەک بمانەوێو جێگۆڕکێ بکەین لە هەر نازونیعمەتێ بمانەوێ، هیچ شتێک کە ئێمە بمانەوێ لێمان قەدەغە ناکرێ ﴿ فَنِعْمَ أَجْرُ ٱلْعَٰمِلِينَ ﴾ (واتە: ئای چەند چاکە پاداشتی چاکەکاران) ئەوانەی کۆششیان کردوە بە بەندایەتی پەروەردگاریان لە ماوەیەکی کەمی بڕاوهێناندا، جا بەو هۆیەوە خێرێکی مەزنی بەردەوامیان بەدەستهێناوە.

ئەم ماڵە مەزنە کە شایستەی وەسفو ستایش کردنە بە حەقیقەت، کە خوا ﷻ دەیبەخشێ بە تایبەتمەندترینی بەدیهێنراوەکانی، وە بە بەخشندەییو گەورەیی خۆی دەیکات بە شوێنی نیشتەجێ بوونیان، بەرزترینو چاکترینیانی بۆ بونیاد دەنێ، وە بە دەستەکانی دەیچێنێ، وە بەمیهرەبانیو ڕێزی خۆی دەوری داوە، کە بە هەندێکی خەمبار دڵخۆش دەکات، لێڵی لادەبات، پاکی جێگیر دەکات.

وَتَرَى ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ حَآفِّينَ مِنْ حَوْلِ ٱلْعَرْشِ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ ۖ وَقُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْحَقِّ وَقِيلَ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٧٥﴾

(٧٥): ﴿وَتَرَى ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ﴾ (وە فریشتەکان دەبینی) ئەی بینەر لەو ڕۆژە مەزنەدا ﴿حَآفِّينَ مِنْ حَوْلِ ٱلْعَرْشِ﴾ واتە: وەستاون لە خزمەتی پەروەردگاریاندا، لە دەوری عەرشەکەی کۆبوونەتەوە، گەردن کەچی مەزنیو گەورەی ئەون، دان بە تەواوی ئەودا دەنێن، جوانی ئەو داپۆشیون ﴿يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ﴾ واتە: بە پاکی رادەگرن لەهەر شتێ شایستەی مەزنی ئەو نەبێ، لەوەی هاوبەشدانەران دایانە پاڵی، وە لەوەیشی نەیاندابێتە پاڵی.
﴿وَقُضِىَ بَيْنَهُم﴾ واتە: (دادوەری کرا) لە نێوان یەکەمینو دوایینەکان لە دروستکراوەکاندا، ﴿بِٱلْحَقِّ﴾ بەو دادپەروەریەی کە هیچ گومانێکی تێدانیە، وە هیچ نکوڵیەک نیە لەلایەن ئەو کەسەی حەق دەکەوێتە سەری ﴿وَقِيلَ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾ (واتە: دەوترێت هەموو ستایش هەر بۆ خوایە کە پەروەردگاری جیهانیانە) باسی قسەکەری نەکردوە کێیە، لەبەر ئەوەی ببێتە بەڵگە کە هەموو دروستکراوەکان دانیان بە ستایشی پەروەردگاردا ناوە، وە بە حیکمەتو کاردروستی لەسەر ئەو دادپەروەریەی کردوویەتی بۆ خەڵکانی بەهەشتو خەڵکانی دۆزەخ، ستایشی فەزڵو چاکە، وە ستایشی دادپەروەریو چاکە.

تەفسیری سووڕەتی (الزمر) تەواو بوو.


سورة غافر

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

حمٓ ① تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ② غَافِرِ ٱلذَّنۢبِ وَقَابِلِ ٱلتَّوْبِ شَدِيدِ ٱلْعِقَابِ ذِى ٱلطَّوْلِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ إِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ③ مَا يُجَٰدِلُ فِىٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَلَا يَغْرُرْكَ تَقَلُّبُهُمْ فِى ٱلْبِلَٰدِ ④ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَٱلْأَحْزَابُ مِنۢ بَعْدِهِمْ وَهَمَّتْ كُلُّ أُمَّةٍۭ بِرَسُولِهِمْ لِيَأْخُذُوهُ وَجَٰدَلُوا۟ بِٱلْبَٰطِلِ لِيُدْحِضُوا۟ بِهِ ٱلْحَقَّ فَأَخَذْتُهُمْ فَكَيْفَ كَانَ عِقَابِ ⑤ وَكَذَٰلِكَ حَقَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّهُمْ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ⑥ ٱلَّذِينَ يَحْمِلُونَ ٱلْعَرْشَ وَمَنْ حَوْلَهُۥ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيُؤْمِنُونَ بِهِۦ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَىْءٍ رَّحْمَةً وَعِلْمًا فَٱغْفِرْ لِلَّذِينَ تَابُوا۟ وَٱتَّبَعُوا۟ سَبِيلَكَ وَقِهِمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ ⑦

## تەفسیری سوورەتی (غافر)
## مەککیە (٨٥) ئایەتە
## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٣): ﴿ حمٓ ١ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ٢ غَافِرِ ٱلذَّنۢبِ وَقَابِلِ ٱلتَّوْبِ شَدِيدِ ٱلْعِقَابِ ذِى ٱلطَّوْلِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ إِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ٣ ﴾:

﴿ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ﴾ خوا هەواڵ دەدات دەربارەی کتێبە مەزنەکەی بەوەی دابەزێنراوە لە لایەن خوای پەرستراوەوە، بە هۆی تەواوی‌و تاک‌و تەنهایی بە کردەوەکانی، ﴿ ٱلْعَزِيزِ ﴾ ئەو زاتەی زاڵە بە دەسەڵاتی بەسەر هەموو دروستکراوێکدا ﴿ ٱلْعَلِيمِ ﴾ (زانایە) بە هەموو شتێک، ﴿ غَافِرِ ٱلذَّنۢبِ ﴾ (لێبووردەیە) بۆ گوناهباران ﴿ وَقَابِلِ ٱلتَّوْبِ ﴾ (واتە: تەوبە وەرگرە) لە تەوبەکاران، ﴿ شَدِيدِ ٱلْعِقَابِ ﴾ (واتە: تۆڵەی سەختە) لەسەر ئەو کەسەی چاو قایمی‌و بوێریی دەکات لەسەر گوناهەکان‌و داوای لێخۆشبوون ناکات لێیان ﴿ ذِى ٱلطَّوْلِ ﴾ واتە: (خاوەن) بەخشش‌و چاکەی بەرفراوانە.

کاتێ بڕیاری دا لە تەواوی خۆی، ئەوەش وا پێویستی کرد بە تاک‌و تەنها بپەرسترێ‌و بە دڵسۆزیەوە کردەوەی بۆ ئەنجام بدرێ، فەرمووی: ﴿ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ إِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ﴾ (واتە: هیچ پەرستراوێک نیە بێجگە لە ئەو گەڕانەوەی هەمووان هەر بۆ لای ئەوە).

ڕووی گونجان بە باسکردنی دابەزینی قورئان لە لایەن خواوە، کە وەسف کراوە بەم وەسفانە، بێگومان ئەم وەسفانە پێویستکاری هەموو ئەوانەیە کە قورئان لەخۆی دەگرێ لە واتاکان، چونکە قورئان: یان هەواڵە دەربارەی ناوو سیفات‌و کارەکانی خوا، ئەمانەش ناوەکان‌و وەسفەکان‌و کارەکانن.

یان هەواڵدانە دەربارەی پەنهانە ڕابردوو داهاتووەکان، ئەویش لە فێرکردنی خوای زانایە بۆ بەندەکانی، یان هەواڵدانە دەربارەی نیعمەتە مەزن‌و بێ پایانەکانی، وە ئەوەشی دەگات بەوانە لە

فەرمانەکان، لەبەر ئەوە وتەی خوا ﷻ دەبێتە بەڵگە لەسەری، وەک فەرموویەتی ﴿ ذِى ٱلطَّوۡلِ ﴾.
یان هەواڵدانە لە تۆڵە سەختەکانی، ئەوەشی پێویستی دەکاتو دەیخوازێ لە گوناهەکان، لەبەر ئەوەی ئەم ئایەتە دەبێتە بەڵگە لەسەری کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ شَدِيدِ ٱلۡعِقَابِ ﴾، یان بانگکردنی گوناهبارانە بۆ داوای لێخۆشبوونو گەڕانەوەو، ئەوەش دەبێتە بەڵگە لەسەری کە دەفەرموێ: ﴿ غَافِرِ ٱلذَّنۢبِ وَقَابِلِ ٱلتَّوۡبِ شَدِيدِ ٱلۡعِقَابِ ﴾، یان هەواڵ دانە بەوەی خوای تاکو تەنها بەدیهێنەرو پەرستراوە، وە هێنانەوەو پێویست بوونی بەڵگەی عەقڵیو نەقڵی لەسەر ئەوەو سوور بوون لەسەری، وە قەدەغەکردن لە بەندایەتی بێجگە لە خوا، هێنانەوەی بەڵگەی عەقڵیو نەقڵی لەسەر خراپی ئەوەو ترساندن لێی، ئەوەش دەبێتە بەڵگە لەسەری وتەی خوا ﷻ: ﴿ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾، یان هەواڵدانە دەربارەی بڕیاری پاداشتی دادپەروەرانەی، وە پاداشتی چاکەکارانو سزای سەرپێچیکاران، ئەمەش دەبێتە بەڵگە لەسەری وتەی خوا ﷻ: ﴿ إِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ ﴾ (واتە: گەڕانەوەی هەمووان هەر بۆ لای ئەوە).

(٤-٦): ﴿ مَا يُجَٰدِلُ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَلَا يَغۡرُرۡكَ تَقَلُّبُهُمۡ فِي ٱلۡبِلَٰدِ ٤ كَذَّبَتۡ قَبۡلَهُمۡ قَوۡمُ نُوحٖ وَٱلۡأَحۡزَابُ مِنۢ بَعۡدِهِمۡۖ وَهَمَّتۡ كُلُّ أُمَّةِۭ بِرَسُولِهِمۡ لِيَأۡخُذُوهُۖ وَجَٰدَلُواْ بِٱلۡبَٰطِلِ لِيُدۡحِضُواْ بِهِ ٱلۡحَقَّ فَأَخَذۡتُهُمۡۖ فَكَيۡفَ كَانَ عِقَابِ ٥ وَكَذَٰلِكَ حَقَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّهُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ ٦ ﴾:
خوا ﷻ هەواڵ دەدات ﴿ مَا يُجَٰدِلُ ﴾ (دەمەقاڵێ ناکات) لە ئایەتو نیشانەکانی خوادا ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾ (واتە: بێجگە لە بێبڕوایان) مەبەست لە دەمەقاڵێو مشتومڕ لێرەدا، دەمەقاڵێکردنە بۆ ڕەتکردنەوەی ئایەتەکانی خواو بەراورد کردنیان بە پووچو بەتاڵ، ئەمە لە پیشەی بێبڕوایانە، بەڵام بڕواداران ملکەچی خوا دەبن، ئەو زاتەی حەقو ڕاستی دەخاتە ڕوو بۆ ئەوەی بەتاڵو پووچی پێ لابەرێو نەیهێڵێ.

نابێ ئادەمیزاد فریو بخوات بە حاڵی مرۆڤی دونیایی، وا گومان ببات بێگومان بەخشینی خوا بۆ ئەو کەسە لە دونیادا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خۆشی دەوێو ئەو لەسەر حەقو ڕاستیە، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ فَلَا يَغۡرُرۡكَ تَقَلُّبُهُمۡ فِي ٱلۡبِلَٰدِ ﴾ واتە: (با فریوت نەدات) هاتوو چۆوو گەڕانیان بە جۆرەها بازرگانیەکانو کارو کەسابەتەکان، بەڵکو پێویستە لەسەر بەندە بایەخ بدات بە حەق، وە تەماشای حەقیقەتە شەرعیەکان بکاتو خەڵکیان پێ پێوانە بکات، با حەق بە خەڵکی پێناسە نەکات، وەکو چۆن لەسەری دەڕوات ئەو کەسەی نە زانستی هەیەو نەعەقڵ.

(٥): ﴿ كَذَّبَتۡ قَبۡلَهُمۡ ﴾ پاشان هەڕەشەی کردوە لەو کەسەی دەمەقاڵێ بە ئایەتەکانی خوا ﷻ دەکات بۆ ئەوەی پووچو بەتاڵیان بکاتەوە، وەکو چۆن خەڵکانێ پێش ئەو لە ئوممەتەکان

ئەوەیان کرد لە ﴿قَوْمُ نُوحٍ﴾ وعادیش ﴿وَٱلْأَحْزَابُ مِنۢ بَعْدِهِمْ﴾ (واتە: وە دەستەو تاقمەکانی دوای ئەوانیش) ئەوانەی کۆبوونەوە بۆ ئەوەی حەق پووچ بکەنەوەو بەتاڵو پووچ سەربخەن.

﴿وَهَمَّتْ كُلُّ أُمَّةٍ﴾ حاڵیان گەیشتە ئەوەی (هەر گەلێک ویستوویەتی) لە گەلەکان ﴿بِرَسُولِهِمْ لِيَأْخُذُوهُ﴾ واتە: پێغەمبەرەکەیان بکوژن، ئەمە ئەوپەڕی هەوڵیانە بەرانبەر بە پێغەمبەران، ئەوانەی سەرمەشقی چاکەخوازان دەکەن، وە ئەوانەی حەقو ڕاستیان لەلایە کە هیچ گومانو دوو دڵیەکی تێدانیە، ویستیان بیانکوژن، ئایا دوای ئەو گومڕاییو بەدبەختیە هیچ هەیە بۆیان جگە لە سزایەکی مەزن نەبێ کە لێی ڕزگاریان نەبێ؟

لەبەر ئەمەیە دەربارەی سزای دونیاو دوارۆژیان فەرموویەتی: ﴿فَأَخَذْتُهُمْ﴾ واتە: (ئیتر قاری من گرتنی) بە هۆی بە درۆ دانانیانو کۆبوونەوەیان، ﴿فَكَيْفَ كَانَ عِقَابِ﴾ واتە: (جا چۆن بوو تۆڵەسەندنی من لێیان)؟ بە ڕاستی توندترین سزاو خراپترینیان هیچ نیە جگە لە دەنگێکی ناخۆش، یان باراندنی بەرد بەسەریاندا، یان فەرمان کردن بە زەوی کە قووتیان بدات، یان دەریا نوقمیان بکات، جا کتووپڕ ئەوانە هەموویان جوڵەیان نەماو مردن.

(٦): ﴿وَكَذَٰلِكَ حَقَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟﴾ هەروەکو چۆن پێویست بوو لەسەر ئەوانە پێویست بوو لەسەریان وشەی گومڕایی، کە بەهۆیەوە سزایان بۆ بەدیهات، بۆیە فەرمویەتی: ﴿أَنَّهُمْ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ﴾ واتە: (ئەوانە هاوەڵی ئاگرن).

(٧-٩): ﴿ٱلَّذِينَ يَحْمِلُونَ ٱلْعَرْشَ وَمَنْ حَوْلَهُۥ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيُؤْمِنُونَ بِهِۦ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَىْءٍ رَّحْمَةً وَعِلْمًا فَٱغْفِرْ لِلَّذِينَ تَابُوا۟ وَٱتَّبَعُوا۟ سَبِيلَكَ وَقِهِمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ ﴿٧﴾ رَبَّنَا وَأَدْخِلْهُمْ جَنَّٰتِ عَدْنٍ ٱلَّتِى وَعَدتَّهُمْ وَمَن صَلَحَ مِنْ ءَابَآئِهِمْ وَأَزْوَٰجِهِمْ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ ۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٨﴾ وَقِهِمُ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ۚ وَمَن تَقِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ يَوْمَئِذٍ فَقَدْ رَحِمْتَهُۥ ۚ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٩﴾﴾:

خوا ﷻ هەواڵ دەدا بە تەواوی بەزەیی خۆی بە بەندە بڕوادارەکانی، وە ئەوەی بۆی نووسیون لە هۆکارەکانی خۆشبەختیان لەو هۆکارانەی کە لە دەرەوەی توانای ئەوانە، لە داوای لێخۆشبوونی فریشتە نزیکەکان بۆیان، وە پاڕانەوەیان بۆیان بەوەی تیایدایە لە بەرژەوەندیەکانی دینو دوارۆژیان، لە چوارچێوەی ئەوەشدا هەواڵی داوە دەربارەی هەڵگرانی عەرشو ئەوانەش لە دەوری ئەوانن و نزیکیشیان لە پەروەردگاریان، وە زۆری بەندایەتی کردنیانو ئامۆژگاریان بۆ بەندەکانی خوا، چونکە زانیاریان هەیە خوا ئەوەی خۆش دەوێ لە ئەوان، جا فەرموویەتی: ﴿ٱلَّذِينَ يَحْمِلُونَ ٱلْعَرْشَ﴾ واتە: (ئەو فریشتانەی هەڵگری) عەرشی خوای میهرەبانن، ئەو عەرشەی کە لە سەرووی هەموو بەدیهێنراوەکانە، مەزنترینیانەو بەرفراوانترینیانەو چاکترینیانەو نزیکترینیانە لە خواوە، کە

دەوری ئاسمانەکانو زەویو کورسی داوە، ئەو فریشتانە خوا ئەرکی هەڵگرتنی عەرشی مەزنی پێ سپاردوون، گومانی تێدانیە ئەوانە لە گەورەترینی فریشتەکانو مەزنترینو بەهێزترینیانن.
هەڵبژاردنیان لە لایەن خواوە بۆ هەڵگرتنی عەرشەکەیو پێشخستنیان لە باسکردنداو نزیک بوونەوەیان لێیەوە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەوان چاکترینی ناو فریشتەکانن، خوا فەرموویەتی: ﴿ وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَٰنِيَةٌ ١٧ ﴾الحاقة، (واتە: وە لەو ڕۆژەدا هەشت فریشتە تەختی پەروەردگاری تۆ هەڵ دەگرێ لە ژوور هەموو فریشتەکانی ترەوە)، ﴿ وَمَنْ حَوْلَهُۥ ﴾(واتە: ئەوانەش بە دەوری دان) لە فریشتە نزیکەکان لە پلەو پایەو چاکێتی ﴿ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ ﴾ (واتە: ستایشو تەسبیحاتی پەروەردگاریان دەکەن) ئەمە ستایش کردنیانە بە زۆری بەندایەتی کردنیان بۆ خوا، بە تایبەت تەسبیحاتو ستایش کردن، سەرجەم عیبادەتەکان دەچنە ناو تەسبیحیاتی خواو ستایش کردنی، چونکە بە پاک ڕاگرتنی پەروەردگارە لەوەی بەندە بۆ جگە لە ئەو بەکاری بێنێت، وە ستایش کردنی خوای بەرزو مەزنە، بەڵکو ستایش کردن بریتیە لە بەندایەتی خوا، بەڵام قسەی بەندە: (سبحان الله وبحمده) ئەو لە نێو ئەوەدایەو لە کۆی پەرستشەکانە.
﴿ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾ (واتە: وە داوای لێبوردن دەکەن بۆ ئەوانەی ئیماندارن) ئەمە لە کۆی سوودەکانی ئیمانە، وە چاکەکانی زۆر زۆرن، بەڕاستی ئەو فریشتانەی کە تاوانیان لەسەر نیە داوای لێخۆشبوون بۆ بڕواداران دەکەن، جا بڕوادار بە بڕواهێنانی بووەتە هۆکار بۆ ئەم فەزڵو چاکە مەزنە.
پاشان کاتێ لێخۆشبوون تەواو نابێ تەنها بە داواکردن نەبێ، خوا باسی سیفاتی پاڕانەوەکانیانی کردوە بۆیان بە لێخۆشبوون، بە باسکردنی بەوەی کە تەواو نابێ تەنها بەوە نەبێ، فەرموویەتی: ﴿ رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَىْءٍ رَّحْمَةً وَعِلْمًا ﴾ (واتە: ئەی پەروەردگارمان میهرەبانیو) زانیاری تۆ دەوری هەموو شتێکی داوە، هیچ شتێکت لێ شاراوە نیە، لە زانستی تۆ گوم نابێ قورسایی گەردیلەیەک لە ئاسمانەکانو زەویدا، وە بچووکترو گەورەتر لەوە، بەزەیی تۆ هەموو شتێکی گرتوەتەوە، جا گەردوون بە بەرزاییو نزماییەوە پڕ بووە لە میهرەبانی خواو هەمووی گرتوەتەوە، گەیشتووە بە هەموو دروستکراوەکان.
﴿ فَٱغْفِرْ لِلَّذِينَ تَابُوا۟ ﴾ لە هاوبەشدانانو سەرپێچی کردن ﴿ وَٱتَّبَعُوا۟ سَبِيلَكَ ﴾ بە شوێنکەوتنی پێغەمبەرانت، بە یەکتاپەرستیتو گوێڕایەڵیت ﴿ وَقِهِمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ ﴾ واتە: بیانپارێزە لە سزا، وە بیانپارێزە لە هۆکارەکانی سزا.

رَبَّنَا وَأَدْخِلْهُمْ جَنَّٰتِ عَدْنٍ ٱلَّتِي وَعَدتَّهُمْ وَمَن صَلَحَ
مِنْ ءَابَآئِهِمْ وَأَزْوَٰجِهِمْ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ ۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ
ٱلْحَكِيمُ ﴿٨﴾ وَقِهِمُ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ۚ وَمَن تَقِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ
يَوْمَئِذٍ فَقَدْ رَحِمْتَهُۥ ۚ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٩﴾ إِنَّ
ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُنَادَوْنَ لَمَقْتُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ مِن مَّقْتِكُمْ
أَنفُسَكُمْ إِذْ تُدْعَوْنَ إِلَى ٱلْإِيمَٰنِ فَتَكْفُرُونَ ﴿١٠﴾ قَالُوا۟ رَبَّنَآ
أَمَتَّنَا ٱثْنَتَيْنِ وَأَحْيَيْتَنَا ٱثْنَتَيْنِ فَٱعْتَرَفْنَا بِذُنُوبِنَا فَهَلْ
إِلَىٰ خُرُوجٍ مِّن سَبِيلٍ ﴿١١﴾ ذَٰلِكُم بِأَنَّهُۥٓ إِذَا دُعِىَ ٱللَّهُ
وَحْدَهُۥ كَفَرْتُمْ ۖ وَإِن يُشْرَكْ بِهِۦ تُؤْمِنُوا۟ ۚ فَٱلْحُكْمُ لِلَّهِ
ٱلْعَلِىِّ ٱلْكَبِيرِ ﴿١٢﴾ هُوَ ٱلَّذِى يُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُنَزِّلُ لَكُم مِّنَ
ٱلسَّمَآءِ رِزْقًا ۚ وَمَا يَتَذَكَّرُ إِلَّا مَن يُنِيبُ ﴿١٣﴾ فَٱدْعُوا۟ ٱللَّهَ
مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿١٤﴾ رَفِيعُ
ٱلدَّرَجَٰتِ ذُو ٱلْعَرْشِ يُلْقِى ٱلرُّوحَ مِنْ أَمْرِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ
مِنْ عِبَادِهِۦ لِيُنذِرَ يَوْمَ ٱلتَّلَاقِ ﴿١٥﴾ يَوْمَ هُم بَٰرِزُونَ ۖ لَا يَخْفَىٰ
عَلَى ٱللَّهِ مِنْهُمْ شَىْءٌ ۚ لِّمَنِ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ ۖ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿١٦﴾

**(٨):** ﴿ رَبَّنَا وَأَدْخِلْهُمْ جَنَّٰتِ عَدْنٍ ٱلَّتِى وَعَدتَّهُمْ ﴾ لەسـەر زمانـی پێغەمبەرەکانـت ﴿ وَمَن صَلَحَ ﴾ واتـە: چاکـەکار بـوون بە ئیمـانو کـردەوەی چـاک ﴿ مِنْ ءَابَآئِهِمْ وَأَزْوَٰجِهِمْ ﴾ (واتـە: لـە باووباپیرانیـانو هاوسـەرانیانو دۆسـتو هاوڕێکانیـان ﴿ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ ﴾ (وە نەوەکانیـان). ﴿ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ﴾ (واتـە: بـە ڕاسـتی هـەر تۆ زاڵـی کاردروسـتی) بە دەسـەڵاتی بەسـەر هەمـوو شـتێکدا، مەترسـیان بـۆ ئاشـکرا دەکـەیو دەریدەخـەیو بەهۆیەوە دەیانگەیەنـی بـە هەمـوو خێرێـک، ﴿ ٱلْحَكِيمُ ﴾ ئـەو زاتـەی شـتەکان لـە جێگـای خۆیـان دادەنێـت.

خوایە داوای شـتێکت لێناکەیـن حیکمەتی تۆ پێچەوانەکەی بخوازێـت، بەڵکو لە حیکمەتو داناییـت -کـە هەواڵـت پێداوە لەسـەر زمانـی پێغەمبەرەکانـت، وە فەزڵو چاکـەت ئەوەی خواسـتووە- لە بڕواداران خۆشـبێت.

**(٩):** ﴿ وَقِهِمُ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ﴾ واتـە: (بیـان پارێـزە) لـە تۆڵـەی کـردەوە خراپـەکان، چونکە زیـان بـە خاوەنەکـەی دەگەیەنـێ ﴿ وَمَن تَقِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ يَوْمَئِذٍ ﴾ (واتە: چونکە هەرکەسـێک لـە تۆڵـەی خراپـەو تـاوان بپارێـزی) لـە ڕۆژی دواییـدا ﴿ فَقَدْ رَحِمْتَهُۥ ﴾ میهرەبانـی تـۆ بەردەوامـە لەسـەر بەندەکان، هیچ شـتێ ڕێگری لێنـاکات تەنها تاوانو سـەرپێچی بەندەکان نەبـێ، جـا هـەر کەسـێ تـۆ پاراسـتبێتت لـە گوناهەکان ئـەوە سـەرکەوتووت کـردوە بۆ چاکـەکانو پاداشـتی چاکە ﴿ وَذَٰلِكَ ﴾ واتـە: نەمانی مەترسـی بە پاراسـتنی گوناهەکانو بەدەسـتهێنانی خۆشویسـتراوەکان، بـە بەدەسـتهێنانی میهرەبانـی ﴿ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴾ کـە هیـچ سـەرکەوتنێک نیە هاوشـێوەی بـێ، وە کێبڕکێـکاران کێبڕکێی لەوە چاکتـر ناکەن. بێگومـان ئـەم پاڕانەوەیـە لەلایـەن فریشـتەکانەوە تـەواوی زانیاریـان لەخۆدەگـرێ بـە پەروەردگاریـان، وە پاڕانـەوەو تکاکـردن لـە خـوا بەنـاوە جوانەکانـی، کـە حـەز دەکات

بەندەکانی بەو ناوانەی لێی بپاڕێنەوە، پاڕانەوەیەک گونجاو بێ لەگەڵ ناوەکەیدا، کاتێ پاڕانەوەکانیان بۆ بەدەستهێنانی میهرەبانیو لابردنی شوێنەواری ئەوەی نەفسی مرۆڤەکان دەیخوازی، کە خوا دەزانێ ناتەواوەو سەرپێچیە، وە هاوشێوەی ئەوانە لەو ڕێبازو هۆکارانە کە خوا ﷻ بە زانست دەوری داون، پاڕاونەتەوەو تکایان کردوە بە خوای میهرەبانی زانا.

هەروەها تەواوی ڕەوشتو ئەدەبی فریشتەکان لەخۆ دەگرێ بە دانپێدانانیان بە پەروەردگاریتی خوا، پەروەردگاریتی گشتیو تایبەتی، وە بێگومان ئەوان هیچ شتێکیان لەو کاروبارەدا نیە، بەڵکو پاڕانەوەیان لە پەروەردگاریان دەرچووە لەلایەن کەسێکی هەژار لە هەموو ڕووەکانەوە، لە پاڕانەوەیدا دەم ناکوتێ بە جۆرێ لە جۆرەکان، بێگومان ئەوە تەنها فەزڵو ڕێزو چاکەی خوایە بەسەریانەوە.

هەروەها گونجانو ڕێکەوتنیان لەگەڵ پەروەردگاریاندا ئەوپەڕی گونجان لەخۆ دەگرێ بە خۆشویستنی ئەوەی خوا ﷻ خۆشی دەوێ: لەو کردەوانەی کە بریتین لەو عیبادەتانەی ئەنجامیان داوە، وە کۆششیان کردوە بە کۆششی خۆشەویستان، وە لەو کرێکارانەی کە بریتین لە بڕواداران، ئەوانەی خوا ﷻ خۆشیانی دەوێ لە نێوانی دروستکراوەکانیدا، هەموو دروستکراوە ئەرک پێسپێردراوەکان خوا ڕقی لێیانە، جگە لە بڕواداران لە ئەوان، جا لە خۆشویستنی فریشتەکان بۆ بڕواداران لە خوا پاڕاونەتەوە بۆیان، وە کۆششیان کردوە بۆ چاکی بارودۆخیان، چونکە پاڕانەوە بۆ کەسێ لە گەورەترینی بەڵگەکانە لەسەر خۆشویستنی، چونکە ناپاڕێتەوە تەنها بۆ ئەو کەسە نەبێ کە خۆشی دەوێ.

هەروەها ئەوەش لەخۆدەگرێ کە خوا ﷻ شیکردۆتەوەو درێژەی پێداوە لە پاڕانەوەکانیان دوای ئەوەی کە فەرموویەتی: ﴿ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ (واتە: داوای لێخۆشبوون دەکەن بۆ ئەوانەی بڕوایان هێناوە) ئاگادار کردنەوەیەکی جوانو سەرنجڕاکێشی تێدایە لەسەر چۆنیەتی بیرکردنەوەو تێڕامان لە کتێبی خوا، وە نابێ ئەو کەسەی بیر دەکاتەوە کورتی بکاتەوە تەنها لەسەر مانای قسەو فەرمایشتەکەی، بەڵکو دەبێ بیر لە مانای فەرمایشتەکەیشی بکاتەوە، ئەگەر لێی تێگەیشت بە تێگەیشتنێکی ڕاستو دروست لەسەر شێوەی خۆی، بە عەقڵی دەڕوانێتە ئەو کارەو ئەو ڕێگایەیشی دەیگەیەنێ پێی، وە ئەوەیشی تەواو نابێ تەنها بەوە نەبێو ئەوەیشی لەسەری وەستاوە، وە سوور بوو لەسەر ئەوەی کەخوا دەیەوێ، هەروەکو چۆن سوور دەبێ کە ئەو مەبەستی مانای تایبەتێتی،

کـە قسـەو فەرمایشـتەکە بەڵگـەن لەسـەری. وە ئەویشـی سـوور بـوون پێویسـت دەکات، بـەوەی خوا ویسـتو ئیرادەی لەسـەریەتی دوو شـتە:
یەکـەم: زانینـیو سـوور بوونی بـەوەی کە لە شـوێنکەتووی مانایە، وە ئەوەیشـی لەسـەری وەستاوە.
دووەم: زانسـتی بـەوەی کـە بێگومـان خـوا ﷻ بـە هەموو شـتێ دەزانـێ، وە خـوا فەرمانی کـردوە بـە بەندەکانـی بەبیرکردنـەوەو تێرامـان لـە کتێبەکەیدا.
بێگومـان خـوا زانیویەتی کەچی پێویسـتە لـەو مانایانەدا، وە ئـەو هەواڵیداوە کـە کتێبەکەی ڕێنمایـی کارو ڕووناکـیو ڕوونکەرەوەیـە بـۆ هەمـوو شـتێ، وە ئـەو قورئانـە پاراوترینو ڕەوانبێژترینـی فەرمایشـتەکانە، وە گەورەترینیانـە لـەڕووی ڕوونکردنەوەوە، ئا بەو شـێوەیە بەنـدە زانسـتی مـەزنو خێـری زۆر بەدەسـت دێنـێ، بەپێی ئـەوەی خوا ﷻ سـەرکەوتووی کـردوە بـۆی. بێگومـان لـەم تەفسـیرەماندا شـتێکی زۆر هەیـە وەکـو ئەمە کە خـوا منەتی کردوە بەسـەرماندا بـە هۆیەوە.
هەندێجـار لـە هەنـدێ ئایەتـدا ماناکـەی شـاراوەیە بـۆ کەسـێ کـە بەبیرێکـی ڕاسـتەقینە سـەرنجی نـەدات- داوا دەکەین لە خوای گـەورە دەرگای ڕەحمەتی خۆیمـان بۆ واڵا بکات لـە گەنجینـەی پڕ لـە میهرەبانی خـۆی تـا ببێتـە هۆکارێک بـۆ چاکبوونـی بارودۆخمانو بارودۆخی سـەرجەم مسـوڵمانان- هیچمان بەدەسـتەوە نیە تەنها ئەوە نەبێ خۆمان هەڵبواسـین بـە بەخشـندەیی ئـەودا، وە تکاو پاڕانـەوە بـە چاکەکانی، ئەو چاکانـەی بە بـەردەوام تیایدا دەژیـن لـە هەمـوو سـاتەکاندا، وە داوا دەکەین لـە فەزڵی خوا کـە بمان پارێزێ لە شـەڕی نەفـسو دەروونمـان، کـە ڕێگـرە بـۆ گەیشـتن بـە ڕەحمەتی ئـەو، بەڕاسـتی تـۆ ڕێزدارو بەخشـندەی، ئـەو زاتـەی فەزڵو چاکـەی بە هـۆی هۆکارەکانـەوە داباراندووە بەسـەرماندا، هەروەهـا ئەوەش لەخـۆ دەگرێ کە بێگومان هاوشـان لەخێـزانو منداڵو هـاوڕێ، کامەران دەبـێ بـە هاوشـانەکەی، وە پەیوەندی کردنی پێیـەوە دەبێتە هـۆکاری بەدەسـتهێنانی خێرو چاکەیـەک بـۆی، لـە دەرەوەی کـردەوەی خـۆی، وە هـۆکاری کردەوەکـەی، هەروەکو چـۆن فریشـتەکان بـۆ بـڕواداران دەپاڕێنـەوە، وە بـۆ ئـەو کەسـانەیش چاکەکار بـوون لە باپیرانیـانو هاوسـەرانو ڕۆڵەکانیان.
هەنـدێ جـار دەوتـرێ: بێگومان هەر دەبـێ چاکەکاریـان بوونی هەبـێ، لەبەر فەرمایشـتی خـوا ﷻ: ﴿ وَمَن صَلَحَ ﴾ ئـەو کاتە ئەوە دەبێتـە دەرەنجامی کردەوەکانیـان، وە خوا زاناترە.

(١٠-١٢): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُنَادَوْنَ لَمَقْتُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ مِن مَّقْتِكُمْ أَنفُسَكُمْ إِذْ تُدْعَوْنَ إِلَى ٱلْإِيمَٰنِ فَتَكْفُرُونَ ١٠ قَالُواْ رَبَّنَآ أَمَتَّنَا ٱثْنَتَيْنِ وَأَحْيَيْتَنَا ٱثْنَتَيْنِ فَٱعْتَرَفْنَا بِذُنُوبِنَا فَهَلْ إِلَىٰ خُرُوجٍ مِّن سَبِيلٍ ١١ ذَٰلِكُم بِأَنَّهُۥٓ إِذَا دُعِىَ ٱللَّهُ وَحْدَهُۥ كَفَرْتُمْ ۖ وَإِن يُشْرَكْ بِهِۦ تُؤْمِنُواْ ۚ فَٱلْحُكْمُ لِلَّهِ ٱلْعَلِىِّ ٱلْكَبِيرِ ١٢ ﴾:

خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات دەربـارەی ئـەو سەرشـۆڕیو ڕیسـواییەی کـە تووشـی بێبڕوایـان دەبـێ، وە داواکردنـی گەڕانەوەیانو دەرچوونیـان لەئاگر، وە ڕێگریکردنی ئـەو داواکاریەو سەرزەنشـت کردنیـان، فەرموویەتـی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾ بـەو جۆرە هێناویەتـی بۆئەوەی هەمـوو جۆرەکانـی بێبڕوایـی بگرێتـەوە: لـە بێبڕوایـی بەخـوا، یـان بەکتێبەکانـی، یـان بەپێغەمبەرانـی، یـان بـەڕۆژی دوایـی، کاتـێ دەخرێنـە دۆزەخـەوەو دان بـەوەدا دەنێن کە ئـەوان شایسـتەی ئـەو شـوێنەن، بەهـۆی ئـەو گونـاهو تاوانانـەی ئەنجامیـان داوە، تـوورە دەبـن لـە نەفـسو دەروونی خۆیـان بەئەوپەڕی تـووڕە بوون، لـەو کاتەدا بانـگ دەکرێنو پێیـان دەوتـرێ: ﴿ لَمَقْتُ ٱللَّهِ ﴾ واتـە: (تووڕەییو خەشـمی خوا) لەسـەرتان، ﴿ إِذْ تُدْعَوْنَ إِلَى ٱلْإِيمَٰنِ فَتَكْفُرُونَ ﴾ واتـە: کاتـێ پێغەمبـەرانو شـوێنکەوتووانیان بانگیـان کـردن بـۆ بڕواهێنـان، وە بەڵگەکانیـان بـۆ ڕوون کردنـەوە کـە حەقی پـێ ڕوون دەبێتەوە، بـەڵام ئێوە بڕواتـان نەهێنـاو خۆتـان گرتـەوە لـە بڕواهێنان کە خـوا ﷻ لـەو پێناوەدا ئێوەی دروسـت کـردوە، وە دەرچـوون لـەو میهرەبانیـە بەرفراوانـەی ئـەوە، بۆیە لێتـان تووڕە بوو خەشـمو قینـی لێگرتن.

جـا ئەمـە ﴿ أَكْبَرُ مِن مَّقْتِكُمْ أَنفُسَكُمْ ﴾ واتـە: ئـەم تورەیـیو خەشـمو قینـە بەردەوامـە لەسـەرتان لەلایـەن خـوای بەخشـندەوە، وە بووەتە حـاڵو سـیفەت بۆتان، تـا گەیاندنی بەو حاڵـەی کـە گەیاندنی، ئـا ئەمڕۆ تورەییو خەشـمو سـزای خواتان لەسـەر پێویسـت دەبێ، کاتـێ بـڕواداران ڕەزامەنـدی خواو پاداشـتی بەدەسـت دەهێنن.

(١١): جـا ئـەو کاتـە ئاواتی گەڕانـەوە دەخـوازن، وە ﴿ قَالُواْ رَبَّنَآ أَمَتَّنَا ٱثْنَتَيْنِ ﴾ (واتـە: دەڵێن ئـەی پەروەردگارمـان تۆ دووجـارت مراندووین) مەبەسـتیان مردنـی یەکەمـە، وە لەنێوانی ئـەو دوو فووکردنـە بـە صـوردا، لەسـەر ئـەوەی کـە وتـراوە. یـان نەبوونـی تـەواو پێش هاتنـە بوونیـان، پاشـان مراندنیـان دوای بەدیهێنانیـان ﴿ وَأَحْيَيْتَنَا ٱثْنَتَيْنِ ﴾ واتـە: ژیانـی دونیـاو ژیانی دوارۆژ ﴿ فَٱعْتَرَفْنَا بِذُنُوبِنَا فَهَلْ إِلَىٰ خُرُوجٍ مِّن سَبِيلٍ ﴾ واتە: ئاخ هەڵدەکێشـنو حەسـرەت دەخـۆنو ئـەوە دەڵێن، بەڵام هیچ سـوودێکی نیـە بۆیان، وە سەرەنشـت دەکرێن

لەسەر ئەوەی کاروکردەوەیان نەکردوە کە هۆکاربێ بۆ رزگاربوون، پێیان دەوترێ:
(١٢): ﴿ ذَٰلِكُم بِأَنَّهُۥٓ إِذَا دُعِىَ ٱللَّهُ وَحْدَهُۥ ﴾ واتە: ئەگەر بانگ بکرایە بۆ یەکتاپەرستی خواو بە دڵسۆزی کارکردن بۆیو قەدەغەکردن لە هاوبەشدانان پێی ﴿ كَفَرْتُمْ ﴾ (بێبڕوا دەبوون) پێی، وە دڵتان پڕ دەبوو لە خەمو پەژارەو ڕاتان دەکرد لێی بەوپەڕی ڕاکردن ﴿ وَإِن يُشْرَكْ بِهِۦ تُؤْمِنُوا۟ ﴾ واتە: ئەو کەسەی کە ئەم پلەو پایەی پێ بەخشیون، وە نیشتەجێی کردوون لەسەر ئەم قسەو جێگایە، ئێوە بێبڕوایی دەکەن بە ئیمانو بڕوادەهێنن بە کوفر، ڕازی دەبن بەوەی کە شەڕو خراپەکاریە لە دونیاو دوارۆژدا، وە حەزتان لەوە نیە کە خێرو چاکە لە دونیاو دوارۆژدا، هۆکاری بەدبەختیو زەلیلیو تورەیی پەسند دەکەن، وە خۆتان دەگرنەوە لەوەی کە هۆکاری سەرکەوتنو سەرفرازیو خۆشبەختیە ﴿ وَإِن يَرَوْا۟ سَبِيلَ ٱلرُّشْدِ لَا يَتَّخِذُوهُ سَبِيلًا وَإِن يَرَوْا۟ سَبِيلَ ٱلْغَىِّ يَتَّخِذُوهُ سَبِيلًا ﴿١٤٦﴾ ﴾ الأعراف، (واتە: وە ئەگەر ئاینی ڕاستو دروست ببینن نایکەن بە ڕێبازو ئاینی خۆیان، وە ئەگەر ڕێگەی گومڕاییو ئاینی چەوت ببینن دەیکەن بە ئاینو ڕێباز بۆخۆیان).

﴿ فَٱلْحُكْمُ لِلَّهِ ٱلْعَلِىِّ ٱلْكَبِيرِ ﴾، (العلي): ئەو زاتەیە بەرزی ڕەهای بۆ هەیە لە هەموو ڕووەکانەوە، بەرزی زات، بەرزی ڕێز، وە بەرزی زاڵ بوون.

وە لەبەرزی ڕێزیو تەواوی دادپەروەری خوای بەرزو مەزن بێگومان ئەو هەموو شتەکان لەجێگای خۆیاندا دادەنێ، وە یەکسانی ناکات لە نێوانی لە خواترسانو تاوانبارانیدا ﴿ ٱلْكَبِيرِ ﴾ ئەو زاتەیە کە خاوەنی گەورەییو مەزنیو بڵندیە، لە ناوەکانیو سیفاتەکانیو کردارەکانی، پاکو بێگەردە لە هەموو ناتەواویو کەمو کوڕیەک، جا ئەگەر حوکمو بڕیار بۆ خوای مەزن بوو، بێگومان بڕیاری لەسەر داون بە مانەوەی هەمیشەیی، وە بڕیارەکەی گۆڕانو جێگۆڕکێی بەسەردا نایەت.

(١٣-١٧): ﴿ هُوَ ٱلَّذِى يُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُنَزِّلُ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ رِزْقًا ۚ وَمَا يَتَذَكَّرُ إِلَّا مَن يُنِيبُ ﴿١٣﴾ فَٱدْعُوا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿١٤﴾ رَفِيعُ ٱلدَّرَجَٰتِ ذُو ٱلْعَرْشِ يُلْقِى ٱلرُّوحَ مِنْ أَمْرِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ لِيُنذِرَ يَوْمَ ٱلتَّلَاقِ ﴿١٥﴾ يَوْمَ هُم بَٰرِزُونَ ۖ لَا يَخْفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِنْهُمْ شَىْءٌ ۚ لِّمَنِ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ ۖ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿١٦﴾ ٱلْيَوْمَ تُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ ۚ لَا ظُلْمَ ٱلْيَوْمَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿١٧﴾ ﴾:

﴿ هُوَ ٱلَّذِى يُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ ﴾ خوا ﷻ باسی نیعمەتە مەزنەکانی دەکات بەسەر بەندەکانیەوە، بە ڕوونکردنەوەی حەق لە پووچو بەتاڵ، بەوەی نیشانی بەندەکانی دەدات هەندێ لە ئایەتە دەروونیو گەردوونیو قورئانیەکان، کە بەڵگەن لەسەر هەموو داواکراوو

مەبەستێ، ڕوونکەرەوەی هیدایەتو ڕێنماییـن لـە گومرایـی، بەجـۆرێ لە پێـش چاوی ئـەو کەسـەی سـەرنج دەداتو ڕادەمێنـێ کەمترین گومـانو دوو دڵی نامێنێ لە ناسـینەوەی حەقیقەتەکان.

ئەمـەش لـە گەورەترینـی نیعمەتەکانێتـی بەسـەر بەندەکانیەوە، بەجـۆرێ لەحەقو ڕاسـتیدا گومـانو دوو دڵـی نەهێشـتوە، بەڵکـو بەڵگەکانـی جـۆراو جـۆر کـردوەو نیشـانەکانی ڕوون کردۆتـەوە ﴿لِّيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَنۢ بَيِّنَةٍ وَيَحْيَىٰ مَنْ حَيَّ عَنۢ بَيِّنَةٍ ۝٤٢﴾ الأنفـال. (واتـە: بۆئـەوەی تیابچـێ ئەو کەسـەی تیاچووە بـە بەڵگەوە وە بۆئـەوەی بژی ئەو کەسـەی دەژی بـە بەڵگـەوە). جـا هەرکاتێ مەسـەلەو بابەتەکان گەورەو مـەزن بن، ئەو بەڵگانەی لەسـەری دێنـەوە زۆرترو ئاسـانترن.

تەماشـای یەکتاپەرسـتی بکـە، کاتێ کـە بابەتەکـەی لەگەورەترینـی بابەتەکانـە، بەڵکو لە مەزنترینیانـە، بەڵگـەکان لـەو بارەیـەوە زۆرن، عەقڵـیو نەقڵـی، وە جۆراو جـۆرن، خوا ﷻ نمونـەی بـۆ هێناوەتـەوە، وە بەڵگـەی زۆریشـی بۆ هێناوەتـەوە، لەبـەر ئەوەیە لێرەدا باسـی کـردوە، وە باس لـە کۆمەڵێ لـە بەڵگەکانـی دەکات، فەرموویەتـی: ﴿فَٱدْعُوا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ﴾ (واتـە: کەواتـە لـە خـوا بپاڕێنـەوەو بـە پاکـی بـۆی گەردن کـەچ بـن). کاتێ باسـیکرد کـە بێگومـان ئـەو ئایەتەکانـی نیشـانی بەندەکانـی دەدا، هەواڵیـداوە دەربـارەی نیشـانەیەکی مـەزنو فەرموویەتـی: ﴿وَيُنَزِّلُ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ رِزْقًا﴾ واتـە: باران، بـەو بارانە ڕزقو ڕۆزی دەدرێـن وە ئێـوەو ئاژەڵەکانتـان دەژین، ئەوەش بەڵگەیە لەسـەر ئەوەی هەموو نیعمەتـەکان لـە خواوەیە.

لـەو نیعمەتانـە: نیعمەتەکانـی ئایـن، ئەویـش بابەتـە ئاینیـەکانو بەڵگەیـە لەسـەریان، وە ئەوەیشـی بە شـوێنی ئـەودا دێ لە کـردەوە پێکردنـی، وە نیعمەتـە دونیاییەکان بە گشـتی، وەک ئـەو نیعمەتانـەی کە لەبارانەوە سـەرچاوە دەگـرێ، کە وڵاتو بەندەکانـی پێ زیندوو دەبێتەوە.

وە ئەمـە بەڵگەیـەو بەڵگەیەکـی یەکلاکەرەوەیـە کـە ئەو خوایە تـاکو تەنهایـەو هەر ئەو پەرسـتراوە، ئـەو زاتـەی پێویسـتە بـە دڵسـۆزیەوە گـەردن کەچـی بـۆ بکرێ هـەر وەکو چـۆن ئـەو پێـدەری نازونیعمەتەکانە، ﴿وَمَا يَتَذَكَّرُ﴾ (واتـە: وە کـەس بیرناکاتەوە) بە نیشـانەکان کاتـێ یـادی دەخرێتـەوە ﴿إِلَّا مَن يُنِيبُ﴾ (واتـە: مەگـەر کەسـێ ڕوو لە خوا بێـت) بـە ڕوو کردنە خۆشەویسـتیو ترسـان لێـیو گوێڕایەڵـی کردنیو ملکـەچ بوونی، ئا

ئەمــە ســوود لە نیشــانەکان وەردەگریّو دەبێتــە ڕەحمەتێک بــۆیو بینایی‌و بەرچــاو ڕوونی زیــاد دەبێ.
کاتــێ نیشــانەکان بیر کردنەوەو ســەرنجدان بەرهــەم دەهێنــن، وە بیر کردنەوەش دڵســۆزی بــۆ خــوا پێویســت دەکات، کارەکەی ڕێکخســتووە بە (فـاء) کە بەڵگەیە لەســەر (السببیة) فەرموویەتــی: ﴿ فَٱدۡعُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ﴾ ئەمــە گشــتگیرە بــە پاڕانــەوەی پەرســتش‌و پاڕانــەوەی داواکردن.
دڵســۆزیش مانای ئەوەیە: دڵســۆزبوونی مەبەســت بۆ خوا لــە هەموو پەرستشــەکاندا، ئەوانەی کــە پێویســتن‌و ئەوانەی کە پەســەندن، مافەکانی خــواو مافەکانی بەندەکانی، واتە: دڵســۆزبن بــۆ خــوا لە هەموو ئــەوەی ئاینــداری پێدەکەن‌و نزیــک دەبنەوە پێــی لە خوا.
﴿ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴾ (واتــە: هەرچەنــدە بێبڕوایانیــش پێیــان ناخــۆش بێت) با بــە بیرتاندا نەیــەت‌و گرنگیــان پــێ مــەدەن، با ئــەوە لــە ئاینەکەتــان دوورتــان نەخاتەوە، وە بــا لۆمەی لۆمــەکاران بێزارتــان نــەکات، چونکــە بێبڕوایــان ڕقیــان لــە دڵســۆزی بــۆ خــوای تــاک‌و تەنهایــە بــە ئەوپــەری ڕق لێبوون، وەک خــوا فەرموویەتــی: ﴿ وَإِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَحۡدَهُ ٱشۡمَأَزَّتۡ قُلُوبُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِۖ وَإِذَا ذُكِرَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦٓ إِذَا هُمۡ يَسۡتَبۡشِرُونَ ٤٥ ﴾الزمــر، (واتە: وە کاتێــک یــادی خــوا بکرێ بە تــاک‌و تەنهــا تێکدەچێ وە بێــزار دەبێ دڵی کەســانێ کە بڕوایــان نیــە بــە ڕۆژی دوایــی کەچی کاتێــک نــاوی پەرســتراوانی بێجگە لە خــوا ببرێت یەکســەر شــادو ڕووخۆش دەبن).
(١٥): پاشــان خــوا ﷻ باســی هەنــدێ لە گەورەیــی‌و مەزنی خۆی کــردوە کە وا پێویســت دەکات بەدڵســۆزیەوە بەندایەتی بــۆ بکرێ، جا فەرموویەتــی: ﴿ رَفِيعُ ٱلدَّرَجَٰتِ ذُو ٱلۡعَرۡشِ ﴾ بــەرزو بڵندە ئەو زاتەی کە لەســەرووی عەرشــەوەیەو تەختــی فەرمانڕەوایــی تایبەتە بەو، وە پلــەو پایەکانی بــەرز بوەتەوە بــە بەرزبوونەوەیــەک پێی جیاواز بــووە لــە بەدیهێنراوەکانی، وە وەســفەکانی گــەورە بوو، زاتیشــی بــەرز بوویــەوە، ئەوەی لێــی نزیک دەبێتــەوە تەنها بە کــردەوەی چاکــی پاکی پاڵفتــە کە بریتیە لە دڵســۆزی، ئــەو زاتەی پلەی ئەو کەســانە بەرز دەکاتــەوەو لەخــۆی نزیکیان دەکاتــەوە، وە دایان دەنێ لــە ســەرووی بەدیهێنراوەکانیەوە.
پاشــان باســی نیعمەتەکانی کردوە بەســەر بەندەکانی، بە پەیام‌و وەحــی، فەرموویەتی: ﴿ يُلۡقِي ٱلرُّوحَ ﴾ واتــە: ئــەو وەحیەی کە بــۆ ڕووح‌و دڵــەکان وەک‌و ڕووح وایە بۆ جەســتەکان، جا هــەروەک چــۆن جەســتە بەبێ ڕووح نــاژی بەهەمان شــێوە ڕووح‌و دڵ بەبــێ ڕووحی وەحی

ناگونجێ‌و سەرکەوتوو نابێ، جا خوا ﷻ ﴿ يُلْقِى ٱلرُّوحَ مِنْ أَمْرِهِۦ ﴾ (واتە: بە فەرمانی خۆی وەحی دەنێرێ) کە سوودو بەرژەوەندی بەندەکانی تێدایە، ﴿ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ﴾ (واتە: بۆ سەر هەر کەس لە بەندەکانی کە بیەوێ) ئەوانیش پێغەمبەرانن، ئەوانەن خوا ﷻ ڕێزی لێگرتوون‌و تایبەتی کردوون بە وەحی خۆی‌و بانگەواز کردنی بەندەکانی.

سوودی ناردنی پێغەمبەران بریتیە لە دەستەبەر بوونی خۆشبەختی بۆ بەندەکان لە دین‌و دونیاو دوارۆژیاندا، وە لابردنی نارەحەتی لەسەریان لە دین‌و دونیاو دوارۆژیان، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ لِيُنذِرَ ﴾ (تا خەڵکی بترسێنێ) لە ڕێگای ئەو کەسەی خوا وەحی بۆ دەنێرێ ﴿ يَوْمَ ٱلتَّلَاقِ ﴾ واتە: (ڕۆژی بەیەکتر گەیشتن) بەندەکان بەوە دەترسێنێ، وە هانیان دەدا لەسەر خۆئامادە کردن بۆ ئەو ڕۆژە، بە هۆکارە ڕزگار کەرەکان لەوانەی کە تیایدایە، وە ناوی ناوە، ﴿ يَوْمَ ٱلتَّلَاقِ ﴾ واتە: چونکە بەدیهێنەرو بەدیهێنراوەکان بە یەکتر دەگەن، وە بەدیهێنراوەکان هەندێکیان بۆ هەندێکیان، وە کارکەران‌و کردەوەکانیان‌و پاداشتیان.

(١٦): ﴿ يَوْمَ هُم بَٰرِزُونَ ﴾ واتە: دەردەکەون لەسەر زەویدا، هەموویان کۆدەکرێنەوە لە یەک شوێندا، هیچ لاری‌و چەوتیەکی تێدانیە، بانگکەر گوێی لێیان دەبێت‌و چاویش دەیانبینێ. ﴿ لَا يَخْفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِنْهُمْ شَىْءٌ ﴾ (واتە: هیچ شتێکیان لە خوا پەنهان نابێت) نە لە خودی خۆیان نە لە کردەوەکانیان، نە لە پاداشتی ئەو کردەوانە.

﴿ لِّمَنِ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ ﴾ واتە: کێ پاشای ئەو ڕۆژە مەزنەیە، کۆکەرەوەی یەکەمین‌و دواینەکان، خەڵکی ناو ئاسمانەکان‌و زەوی، ئەو ڕۆژەی هاوبەشی لە دەسەڵاتدا پچڕاوە، وە هۆکارەکانیش پچڕاون، هیچ نەماوەتەوە تەنها کردەوەی چاک یان خراپ نەبێ؟ پاشایەتی ﴿ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴾ واتە: (بۆ خوایە) تاک‌و تەنهایە لە زات‌و ناوو سیفات‌و کارەکانیدا، هاوبەشی نیە لە هیچ یەکێک لەوانە بەجۆرێ لە جۆرەکان ﴿ ٱلْقَهَّارِ ﴾ زاڵە بەسەر هەموو بەدیهێنراوەکاندا، ئەو زاتەی هەموو دروستکراوەکان ملکەچ‌و زەلیلی بوون، بە تایبەتی لەو ڕۆژەدا کە هەموو دەم‌و چاوەکان تیایدا ملکەچ‌و فەرمان بەردارن بۆ خوای هەمیشە زیندوو ڕاگری بوونەوەر، لەو ڕۆژەدا هیچ کەس قسە ناکات تەنها بە مۆڵەتی ئەو نەبێ.

ٱلۡيَوۡمَ تُجۡزَىٰ كُلُّ نَفۡسِۭ بِمَا كَسَبَتۡۚ لَا ظُلۡمَ ٱلۡيَوۡمَۚ إِنَّ
ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ﴿١٧﴾ وَأَنذِرۡهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡأٓزِفَةِ إِذِ ٱلۡقُلُوبُ
لَدَى ٱلۡحَنَاجِرِ كَٰظِمِينَۚ مَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ حَمِيمٖ وَلَا شَفِيعٖ
يُطَاعُ ﴿١٨﴾ يَعۡلَمُ خَآئِنَةَ ٱلۡأَعۡيُنِ وَمَا تُخۡفِي ٱلصُّدُورُ ﴿١٩﴾ وَٱللَّهُ
يَقۡضِي بِٱلۡحَقِّۖ وَٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَقۡضُونَ
بِشَيۡءٍۗ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ﴿٢٠﴾ ۞ أَوَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي
ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ كَانُواْ مِن قَبۡلِهِمۡۚ
كَانُواْ هُمۡ أَشَدَّ مِنۡهُمۡ قُوَّةٗ وَءَاثَارٗا فِي ٱلۡأَرۡضِ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ
بِذُنُوبِهِمۡ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٖ ﴿٢١﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ
كَانَت تَّأۡتِيهِمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَكَفَرُواْ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُۚ
إِنَّهُۥ قَوِيّٞ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿٢٢﴾ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَا
وَسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٍ ﴿٢٣﴾ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَهَٰمَٰنَ وَقَٰرُونَ
فَقَالُواْ سَٰحِرٞ كَذَّابٞ ﴿٢٤﴾ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلۡحَقِّ مِنۡ
عِندِنَا قَالُواْ ٱقۡتُلُوٓاْ أَبۡنَآءَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ وَٱسۡتَحۡيُواْ
نِسَآءَهُمۡۚ وَمَا كَيۡدُ ٱلۡكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٖ ﴿٢٥﴾

**(١٧):** ﴿ ٱلۡيَوۡمَ تُجۡزَىٰ كُلُّ نَفۡسِۭ بِمَا كَسَبَتۡۚ ﴾ لە دونیادا لە خێرو شەڕو زۆرو کەم، ﴿ لَا ظُلۡمَ ٱلۡيَوۡمَۚ ﴾ لەسەر هیچ کەسێک، بە زیادکردن لە گوناهەکانی یان کەمکردنەوەی چاکەکانی، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ﴾ واتە: ئەو ڕۆژە بە دوور مەزانە بێگومان هەر دێ، هەر شتێکیش بێت ئەوە نزیکە. هەروەها ئەو زاتە بە پەلەو خێرایە لە لێپرسینەوەی بەندەکانی لە ڕۆژی دواییدا، بە هۆی دەوردانی زانستیو تەواوی دەسەڵاتی.

**(١٨-٢٠):** ﴿ وَأَنذِرۡهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡأٓزِفَةِ إِذِ ٱلۡقُلُوبُ لَدَى ٱلۡحَنَاجِرِ كَٰظِمِينَۚ مَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ حَمِيمٖ وَلَا شَفِيعٖ يُطَاعُ ﴿١٨﴾ يَعۡلَمُ خَآئِنَةَ ٱلۡأَعۡيُنِ وَمَا تُخۡفِي ٱلصُّدُورُ ﴿١٩﴾ وَٱللَّهُ يَقۡضِي بِٱلۡحَقِّۖ وَٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَقۡضُونَ بِشَيۡءٍۗ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ﴿٢٠﴾ ﴾: خوا ﷻ بە پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ دەفەرموێ: ﴿ وَأَنذِرۡهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡأٓزِفَةِ ﴾ واتە: ڕۆژی دوایی کە نزیک بووەتەوە، وە کاتی گەیشتنی سامناکیو ناخۆشیەکانی هاتوە، ﴿ إِذِ ٱلۡقُلُوبُ لَدَى ٱلۡحَنَاجِرِ ﴾ واتە: دڵەکان بەرز بوونەتەوەو لە ترسو نارەحەتیدا گەیشتوونەتە گەروو، چاویان دەرپۆقیوە ﴿ كَٰظِمِينَ ﴾ هیچ قسە ناکەن تەنها ئەوە نەبێ کە خوا ﷻ مۆڵەتی پێدابێ، ئەویش قسەی چاک دەکات، وە پێچ دەخۆنەوە لەسەر ئەوەی لە دڵەکانیاندایە لە ترسو تۆقینێکی سامناک، ﴿ مَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ حَمِيمٖ ﴾ واتە: (ستەمکاران هیچ) نزیکو دۆستێکیان نیە، ﴿ وَلَا شَفِيعٖ يُطَاعُ ﴾ (نە تکا کارێک بە گوێی بکرێت) چونکە تکا کاران تکا بۆ کەسێک ناکەن ستەمی لە نەفسی خۆی کردبێ بە هاوبەشدانان، ئەگەر وادابنرێ تکایش بکەن ئەوە خوا ﷻ ڕازی نابێ بە تکاکانیانو لێیان قبوڵ ناکات.

**(١٩):** ﴿ يَعۡلَمُ خَآئِنَةَ ٱلۡأَعۡيُنِ ﴾ (خوا دەزانێ بە خیانەتی چاوەکان) تەماشاکردنێکە کە مرۆڤ لە هاوشانەکەی دەیشارێتەوە، ئەویش تەماشاکردنێکە کەسی بەرانبەر لێی غافڵە، ﴿ وَمَا تُخۡفِي ٱلصُّدُورُ ﴾ (هەرچی دڵەکان دەیشارنەوە) لەوەی بەندە ئاشکرای نەکردوە بۆ

غەیـری خـۆی، خـوا ﷻ ئاگاداره بەو شـاراوەیە، جا غەیـری ئەوانه له کاروباره ئاشـکراکان ئەوە لە پێشـتره.

(٢٠): ﴿ وَٱللَّهُ يَقۡضِي بِٱلۡحَقِّۖ ﴾ (خـوا بـە حـەقو ڕاسـتی دادوەری دەکات) چونکه قسـەکانی حەقـە، بڕیـاره شـەرعیەکانی حەقـە، بڕیـاری پاداشـتی حەقـە، ئـەو زاتـە بـە زانسـتیو بە نووسـینیو بـە پاراسـتنی دەوری هەموو شـتەکانیداوە، وە پـاکو بێگەردە لە هەموو سـتەمو ناتـەواویو سـەرجەم کـەمو کورتیـەکان، ئـەو زاتە بڕیـاری قـەدەری دەدات، کـە بریتیە لـەوەی ئەگـەر بیـەوێ دەبـێ، وە ئەگەر نەیـەوێ نابێ، ئـەو زاتـە دادوەری دەکات لە نێوان بەنـدە بـڕوادارو بێبـڕواکان لـە دونیـادا، وە جیایـان دەکاتـەوە بە سـەرکەوتنێ دۆسـتانو خۆشەویسـتانی خـۆی پـێ سـەردەخات ﴿ وَٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ ﴾ واته: (ئەوانـەی جگە لە خـوا هاواریـان لێدەکـەن) ئەمە گشـتگیره لـە هەمـوو ئەوانەی بپەرسـترێ لە غەیـری خوا، ﴿ لَا يَقۡضُونَ بِشَيۡءٍۗ ﴾ (ناتوانـن بڕیـاری هیچ شـتێک بدەن) لە بـەر بێ توانایـیـان، وە نەبوونی ویسـتو ئیرادەیان بـۆ خێرو چاکـەو نەتوانینی ئەنجامدانی، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ﴾ بیسـەری هەمـوو دەنگەکانـە، بە جیـاوازی زمانەکان، لە جیـاوازی داواکاریـەکان، ﴿ ٱلۡبَصِيرُ ﴾ بینەره بـەوەی کـە بـووەو بەوەی کـە دەبـێ، وە ئـەوەی دەیبینیـنو ئـەوەی نایبینیـن، وە ئەوەی بەنـدەکان دەیزانن و ئەوەیشـی نایزانن. لە سـەرەتای ئەم دوو ئایەتـەدا فەرمووی: ﴿ وَأَنذِرۡهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡأٓزِفَةِ ﴾ پاشـان وەسـفی کـردوە بەم وەسـفانە، کـەوا دەخـوازێ بە خۆ ئامـادە کردن بۆ ئـەو ڕۆژە مەزنـە، چونکـە ترسـاندنو هاندانی لەخـۆ گرتووە.

(٢١-٢٢): ﴿ أَوَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ كَانُواْ مِن قَبۡلِهِمۡۚ كَانُواْ هُمۡ أَشَدَّ مِنۡهُمۡ قُوَّةٗ وَءَاثَارٗا فِي ٱلۡأَرۡضِ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمۡ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٖ ٢١ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَانَت تَّأۡتِيهِمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَكَفَرُواْ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُۚ إِنَّهُۥ قَوِيّٞ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ٢٢ ﴾

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ أَوَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾ واته: بە دڵو جەسـتەیان، گەڕانی سـەرنجدانو پەندوەرگرتـنو بیر کردنـەوە لـە شـوێنەوارەکان ﴿ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ كَانُواْ مِن قَبۡلِهِمۡ ﴾ لـە بەدرۆدانـەران، جـا بێگومـان خراپتریـن سـەرەنجام دەبینـن، سـەرەنجامی لەناوچـوونو ریسـواییو سەرشـۆڕی.

بێگومـان ﴿ كَانُوٓاْ ﴾ ئەوانـە بەهێزتـر بـوون لـە ئەمانـە، لـە ڕووی ژمـارەو خۆئامادەکردنو گەورەیـی جەسـتەیان، ﴿ وَءَاثَارٗا فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾ وە لـە ڕووی شـوێنەوارو خانـوو چاندندا، وە هێـزو توانـای شـوێنەوار بەڵگەیـە لەسـەر توانای ئـەو کەسـانەی کە تێیـدا بوون ﴿ فَأَخَذَهُمُ

ٱللَّهُ﴾ (بەلاَم خوا) سزای دان ﴿بِذُنُوبِهِمۡ﴾ (بە هۆی تاوانەکانیانەوە) کاتێ سوور بوون لەسەری‌و بەردەوام بوون.

(٢٢): ﴿إِنَّهُۥ قَوِيّٞ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ﴾ (واتە: بە ڕاستی خوا بەهێزی تۆڵەسێنی بەتینە) تواناو هێزیان هیچ سوودی پێ نەگەیاندن لە بەرانبەر توانای خوادا، بەڵکو بەهێزترین ئۆممەت لە ڕووی هێزەوە گەلی عاد بوون، ئەوانەی کە وتیان: ﴿وَقَالُواْ مَنۡ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً (١٥)﴾ فصلت، (واتە: کێ لە ئێمە بەهێزترە) خوا بایەکی بۆ ناردن هێزو تواناییانی لاواز کردو لە ناوی بردن بە ئەوپەڕی لە ناوبردن.

پاشان نموونەیەکی باس کردوە لە بارودۆخی بە درۆدانەرانی پێغەمبەران، ئەویش فیرعەون‌و سەربازەکانی بوون، فەرموی:

(٢٣-٤٦): ﴿وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَا وَسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٍ (٢٣) إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَهَٰمَٰنَ وَقَٰرُونَ
فَقَالُواْ سَٰحِرٞ كَذَّابٞ (٢٤) فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلۡحَقِّ مِنۡ عِندِنَا قَالُواْ ٱقۡتُلُوٓاْ أَبۡنَآءَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ
وَٱسۡتَحۡيُواْ نِسَآءَهُمۡۚ وَمَا كَيۡدُ ٱلۡكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٖ (٢٥) وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ ذَرُونِيٓ أَقۡتُلۡ مُوسَىٰ
وَلۡيَدۡعُ رَبَّهُۥٓۖ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمۡ أَوۡ أَن يُظۡهِرَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ٱلۡفَسَادَ (٢٦) وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِنِّي عُذۡتُ
بِرَبِّي وَرَبِّكُم مِّن كُلِّ مُتَكَبِّرٖ لَّا يُؤۡمِنُ بِيَوۡمِ ٱلۡحِسَابِ (٢٧) وَقَالَ رَجُلٞ مُّؤۡمِنٞ مِّنۡ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ يَكۡتُمُ
إِيمَٰنَهُۥٓ أَتَقۡتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّيَ ٱللَّهُ وَقَدۡ جَآءَكُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ مِن رَّبِّكُمۡۖ وَإِن يَكُ كَٰذِبٗا فَعَلَيۡهِ
كَذِبُهُۥۖ وَإِن يَكُ صَادِقٗا يُصِبۡكُم بَعۡضُ ٱلَّذِي يَعِدُكُمۡۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَنۡ هُوَ مُسۡرِفٞ كَذَّابٞ (٢٨) يَٰقَوۡمِ
لَكُمُ ٱلۡمُلۡكُ ٱلۡيَوۡمَ ظَٰهِرِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَمَن يَنصُرُنَا مِنۢ بَأۡسِ ٱللَّهِ إِن جَآءَنَاۚ قَالَ فِرۡعَوۡنُ مَآ أُرِيكُمۡ إِلَّا مَآ
أَرَىٰ وَمَآ أَهۡدِيكُمۡ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ (٢٩) وَقَالَ ٱلَّذِيٓ ءَامَنَ يَٰقَوۡمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُم مِّثۡلَ يَوۡمِ ٱلۡأَحۡزَابِ (٣٠)
مِثۡلَ دَأۡبِ قَوۡمِ نُوحٖ وَعَادٖ وَثَمُودَ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡۚ وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلۡمٗا لِّلۡعِبَادِ (٣١) وَيَٰقَوۡمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ يَوۡمَ
ٱلتَّنَادِ (٣٢) يَوۡمَ تُوَلُّونَ مُدۡبِرِينَ مَا لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنۡ عَاصِمٖۗ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٖ (٣٣) وَلَقَدۡ جَآءَكُمۡ
يُوسُفُ مِن قَبۡلُ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَمَا زِلۡتُمۡ فِي شَكّٖ مِّمَّا جَآءَكُم بِهِۦۖ حَتَّىٰٓ إِذَا هَلَكَ قُلۡتُمۡ لَن يَبۡعَثَ ٱللَّهُ مِنۢ
بَعۡدِهِۦ رَسُولٗاۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَنۡ هُوَ مُسۡرِفٞ مُّرۡتَابٌ (٣٤) ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بِغَيۡرِ
سُلۡطَٰنٍ أَتَىٰهُمۡۖ كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْۚ كَذَٰلِكَ يَطۡبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ قَلۡبِ مُتَكَبِّرٖ جَبَّارٖ
(٣٥) وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ يَٰهَٰمَٰنُ ٱبۡنِ لِي صَرۡحٗا لَّعَلِّيٓ أَبۡلُغُ ٱلۡأَسۡبَٰبَ (٣٦) أَسۡبَٰبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ فَأَطَّلِعَ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ
وَإِنِّي لَأَظُنُّهُۥ كَٰذِبٗاۚ وَكَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِفِرۡعَوۡنَ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَصُدَّ عَنِ ٱلسَّبِيلِۚ وَمَا كَيۡدُ فِرۡعَوۡنَ
إِلَّا فِي تَبَابٖ (٣٧) وَقَالَ ٱلَّذِيٓ ءَامَنَ يَٰقَوۡمِ ٱتَّبِعُونِ أَهۡدِكُمۡ سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ (٣٨) يَٰقَوۡمِ إِنَّمَا هَٰذِهِ
ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا مَتَٰعٞ وَإِنَّ ٱلۡأٓخِرَةَ هِيَ دَارُ ٱلۡقَرَارِ (٣٩) مَنۡ عَمِلَ سَيِّئَةٗ فَلَا يُجۡزَىٰٓ إِلَّا مِثۡلَهَاۖ وَمَنۡ عَمِلَ

صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ يُرْزَقُونَ فِيهَا بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٤٠﴾
وَيَٰقَوْمِ مَا لِيٓ أَدْعُوكُمْ إِلَى ٱلنَّجَوٰةِ وَتَدْعُونَنِيٓ إِلَى ٱلنَّارِ ﴿٤١﴾ تَدْعُونَنِي لِأَكْفُرَ بِٱللَّهِ وَأُشْرِكَ بِهِۦ مَا
لَيْسَ لِي بِهِۦ عِلْمٌ وَأَنَا۠ أَدْعُوكُمْ إِلَى ٱلْعَزِيزِ ٱلْغَفَّٰرِ ﴿٤٢﴾ لَا جَرَمَ أَنَّمَا تَدْعُونَنِيٓ إِلَيْهِ لَيْسَ لَهُۥ دَعْوَةٌ فِي ٱلدُّنْيَا
وَلَا فِي ٱلْأٓخِرَةِ وَأَنَّ مَرَدَّنَآ إِلَى ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱلْمُسْرِفِينَ هُمْ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ﴿٤٣﴾ فَسَتَذْكُرُونَ مَآ أَقُولُ
لَكُمْ وَأُفَوِّضُ أَمْرِيٓ إِلَى ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿٤٤﴾ فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُواْ وَحَاقَ
بِـَٔالِ فِرْعَوْنَ سُوٓءُ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٥﴾ ٱلنَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدْخِلُوٓاْ ءَالَ فِرْعَوْنَ
أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٦﴾ ﴾:

**(٢٣):** ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا ﴾ (بێگومان ناردمان) بۆ ڕەگەزی ئەو بە درۆدانەرانە ﴿ مُوسَىٰ ﴾ کوڕی عمران ﴿ بِـَٔايَٰتِنَا ﴾ بە نیشانە مەزنەکانمان، کە بەڵگەیەکی براوەیە لەسەر ڕاستی ئەو پەیامەی هێناویەتی، وە پووچی ئەوەی هاوبەشدانەران لەسەرین ﴿ وَسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴾ واتە: بەڵگەی ڕوون کەرەوە، زاڵ دەبێت بەسەر دڵداو ملکەچی دەبێ، وەک مارو گۆچانو وێنەی ئەوانەش لە نیشانە ڕوونەکان، کە خوا پشتیوانی مووسای پێکرد، وە جێگیری کرد لەو حەقەی بانگەشەی بۆ دەکرد.

**(٢٤):** وە نێردراو بۆ لایان ﴿ فِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ ﴾ وە وەزیرەکەی ﴿ وَقَٰرُونَ ﴾ کە لە گەلی مووسا عليه السلام بوو، ستەمو دەست درێژی لێدەکردن بە ماڵو سامانەکەی، هەموویان ڕەتیان دایەوە بە توندترین شێوە، ﴿ فَقَالُواْ سَٰحِرٌ كَذَّابٌ ﴾ (واتە: وتیان جادووگەرێکی درۆزنە).

**(٢٥):** ﴿ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلْحَقِّ مِنْ عِندِنَا ﴾ (واتە: ئنجا کاتێ مووسا ئاینی ڕاستی لە لایەن ئێمەوە بۆ هێنان) خوای گەورە پشتیوانی لێکرد بە موعجیزە درەوشاوەکان، کە پێویست بوو تەواو ملکەچی ببن، ئەوان وەریان نەگرت، تەنها بە وازهێنانو پشت تێکردن نەوەستان، بە نکوڵی دژایەتی کردنیان بە بەڵگە پووچەکانیانەوە نەوەستان. بەڵکو حاڵیان گەیشتە ئەوەی تا ﴿ قَالُواْ ٱقْتُلُوٓاْ أَبْنَآءَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ وَٱسْتَحْيُواْ نِسَآءَهُمْ وَمَا كَيْدُ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾ (واتە: وتیان: کوڕانی ئەوانەی لەگەڵ مووسا بڕوایان هێناوە بکوژن، وە ژنەکانیان بە زیندوویی بهێڵنەوە، بەڵام فێڵی بێبڕوایان) کاتێ ئەم فێڵەیان بەکارهێنا، وە پێیان وابوو بێگومان ئەوان ئەگەر منداڵەکانیان بکوژن، ئەوە بەهێز نابنو لە کۆیلایەتیدا دەمێننەوە لە ژێر فەرمانی ئەواندا، بەڵام فێڵەکانیان ﴿ إِلَّا فِي ضَلَٰلٍ ﴾

(هـەر مایـەی سەرلێشـێوانە) کاتێ ئەوەی ویسـتیان بۆیان نەچووە سـەر، بەڵکـو پێچەوانەی ئەوەیـان تـووش بـوو کـە مەبەسـتیان بـوو، خـوا لە نـاوی بـردن تـا کۆتایی. یاسـایەک: سـەرنجی ئـەم خاڵە بدە کـە لـە قورئانـدا زۆر هاتووە:

ئەگـەر سـیاقەکە لـە چیرۆکێکـی دیاریکـراودا بێت یان شـتێکی دیـاری کـراو، وە خوای گـەورەش ویسـتی وابێـت حوکمو بریار لەسـەر ئـەو دیاریکراوە بـدا بە بریارێـک تایبەت نەبێـت پێیـەوە، باسـی بریارەکەی کردوە، وە بەسـتویەتیەوە بە وەسـفی گشـتی بـۆ ئەوەی گشـتگیر بێـت، وە ئـەو وێنەیـش بچێتـە ناویـەوە کـە قسـەکە لـەو پێنـاوەدا کـراوە، وە بـۆ ئـەوەی بە تایبـەت کردنـی بریارەکـە وەهـمو گومـان دوور بخرێتـەوە، لەبـەر ئەمەیە نەیفەرمـووە: (ومـا کیدهـم إلا في ضـلال) (واتـە: بـەڵام فێڵـی ئـەوان هـەر مایـەی سـەرلێ شـێوانە)، بەڵکـو فەرمـووی: ﴿ وَمَا كَيْدُ ٱلْكَٰفِرِينَ إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ ﴾ (واتـە: بـەڵام فێڵـی بێبروایـان هـەر مایەی سەرلێشـێوانە).

وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِيٓ أَقْتُلْ مُوسَىٰ وَلْيَدْعُ رَبَّهُۥٓ إِنِّيٓ أَخَافُ
أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِي ٱلْأَرْضِ ٱلْفَسَادَ ﴿٢٦﴾
وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِنِّي عُذْتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُم مِّن كُلِّ مُتَكَبِّرٍ لَّا يُؤْمِنُ
بِيَوْمِ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٧﴾ وَقَالَ رَجُلٌ مُّؤْمِنٌ مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ
يَكْتُمُ إِيمَٰنَهُۥٓ أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّيَ ٱللَّهُ وَقَدْ
جَآءَكُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ مِن رَّبِّكُمْ ۖ وَإِن يَكُ كَٰذِبًا فَعَلَيْهِ
كَذِبُهُۥ ۖ وَإِن يَكُ صَادِقًا يُصِبْكُم بَعْضُ ٱلَّذِي يَعِدُكُمْ ۖ
إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ كَذَّابٌ ﴿٢٨﴾ يَٰقَوْمِ لَكُمُ
ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ ظَٰهِرِينَ فِي ٱلْأَرْضِ فَمَن يَنصُرُنَا مِنۢ بَأْسِ ٱللَّهِ
إِن جَآءَنَا ۚ قَالَ فِرْعَوْنُ مَآ أُرِيكُمْ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهْدِيكُمْ
إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٢٩﴾ وَقَالَ ٱلَّذِيٓ ءَامَنَ يَٰقَوْمِ إِنِّيٓ أَخَافُ
عَلَيْكُم مِّثْلَ يَوْمِ ٱلْأَحْزَابِ ﴿٣٠﴾ مِثْلَ دَأْبِ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ
وَثَمُودَ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعْدِهِمْ ۚ وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِّلْعِبَادِ ﴿٣١﴾
وَيَٰقَوْمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ يَوْمَ ٱلتَّنَادِ ﴿٣٢﴾ يَوْمَ تُوَلُّونَ مُدْبِرِينَ
مَا لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ ۗ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴿٣٣﴾

(٢٦): ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ﴾ (فیرعەون) بە لووت بەرزیو خۆ بە گەورە زانینەوە بە گەلە گێلو گەمژەکەی گوت: ﴿ذَرُونِيٓ أَقْتُلْ مُوسَىٰ وَلْيَدْعُ رَبَّهُۥٓ﴾ واتە: (لێم گەڕێن با مووسا بکوژم ئەوسا با ئەو هانا بۆ پەروەردگاری بەرێ) پێی وابوو خوا ڕوو ڕەشی بکات- ئەگەر دڵی گەلەکەی لەبەر چاو نەگرتایە ئەوە دەیکوشت، ئەو بەهاناوە چوونی خوا ڕێگری لێنەدەکرد بۆ ئەو کارە.

پاشان باسی پاڵنەری ئەوەی کردوە کە بووەتە مایەی ئەوەی بیکوژێت، بێگومان لەبەر ئامۆژگاری گەلەکەی بووە، وە لابردنی خراپەکاری لە زەویدا، جا فەرمووی: ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ﴾ (واتە: من دەترسم ئاینەکەتان بگۆڕێ) ئەو ئاینەی کە ئێوە لەسەرین، ﴿أَوْ أَن يُظْهِرَ فِي ٱلْأَرْضِ ٱلْفَسَادَ﴾ (واتە: یان لە زەویدا ئاژاوە بنێتەوە) ئەمە لە سەرسوڕهێنەرترین شتەکانە، کە خراپترین دروستکراو ئامۆژگاری خەڵک بکات لە شوێنکەوتنی چاکترین خەڵک، ئەمەش لە ساختەکردنو ڕازندنەوەکانە کە ناچێتە ناو تەنها عەقڵی ئەوانە نەبێ خوا دەربارەیان فەرموویەتی: ﴿فَٱسْتَخَفَّ قَوْمَهُۥ فَأَطَاعُوهُ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَٰسِقِينَ ﴿٥٤﴾﴾ الزخرف (واتە: جا بەم قسانە گەلەکەی هەڵخەڵەتاندو ئەوانیش گوێڕایەڵیان کرد بێگومان ئەوان هەمیشە گەلێکی لە سنوور دەرچوو بوون).

(٢٧): ﴿وَقَالَ مُوسَىٰٓ﴾ (مووسا فەرمووی:) پشت بەست بە پەروەردگاری -کاتێ کە فیرعەون ئەو قسە ناشرینەی وت کە گومرابوونی پێویست کرد، وە پشتی بە توانای دەسەڵاتی خۆی بەست-: ﴿إِنِّي عُذْتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُم﴾ واتە: ڕێگریم لێکرا بە پەروەردگاریتی خوا، کە سەرجەم کاروبارەکانی پێی ڕێکخستووە، ﴿مِّن كُلِّ مُتَكَبِّرٍ لَّا يُؤْمِنُ بِيَوْمِ ٱلْحِسَابِ﴾ لووت بەرزیو بڕوانەبوونی وای لێکردبێ، بڕوای نەبێ بە ڕۆژی دوایی. فیرعەونو غەیری فیرعەونیش دەچێتە نێویەوە، هەروەک بەم نزیکانە لە یاساکەی پێشوو

باسـمان کـرد، خـوا ﷻ ڕێگـری لێکرد بە سـۆزو بەزەیی خۆی، لـە هەمـوو خۆبەزلزانێ کە بـڕوای بـە ڕۆژی لێپرسـینەوە نیـە، وە چەندین هـۆکاری بۆ دانا، کـە ببنە ڕێگر لـە بەردەم زیانو خراپەی فیرعەونو دارو دەسـتەکەی.

وە لـە کـۆی ئـەو هۆکارانە ئـەم پیاوە بـڕواداره بوو، کە لە کـەس‌و کاری فیرعـەون بوو لە بنەماڵـەی پاشـا، بێگومـان هەردەبـێ گوێ لە قسـەی بگیرێ، بـە تایبەت ئەگەر بـە ڕواڵەت لەگەڵیاندابـێ‌و ئیمانەکـەی بشـارێتەوە، بـەزۆری ئەوانیـش ئـەوە لەبـەر چـاو دەگـرن، کە ئەگـەر بـە ڕواڵـەت پێچەوانەیان بێ ئـەوە هیچ شـتێک لەبەرچاو ناگـرن، هەروەکو خوا ﷻ ڕێگـری لـە پێغەمبەرەکـەی کرد ﷺ بە هـۆی مامی ئەبو طالیبـەوە لە قورەیـش، ئەبو طالیب پیاوێکـی گـەورەو قسـە ڕۆیشـتوو بـوو لە ناویانـدا، وە لەسـەر ئاینەکـەی ئەوان بـوو، خۆ ئەگـەر مسـوڵمان بووایـە ئـەوە نەیدەتوانی ئـەو ڕێگریە بکات.

(٢٨): ئـەو پیـاوە بـڕواداره تێگەیشـتوو ژیـرە، کە ڕەفتـاری گەلەکـەی بە خـراپ دادەنا، وە ناشـرینی ئەوەی سـوور بـوون لەسـەری، فەرمـووی: ﴿ أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّيَ ٱللَّهُ ﴾ واتـە: چـۆن کوشـتنی (مووسـا) بە حـەڵاڵ دەزانـن کە ئەمـە تـاوانو سـتەمەکەیەتی، کە دەڵـێ: پەروەردگـارم خوایـە، هەروەهـا قسـەکەی بـێ ڕوونکردنـەوە نیـە، وە لەبـەر ئەمە فەرمـووی: ﴿ وَقَدْ جَآءَكُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ مِن رَّبِّكُمْ ﴾ (واتـە: بە ڕاسـتی بەڵگەو موعجیـزەی ڕوونی لەپەروەردگارتانـەوە بـۆ هێنـاون) چونکـە بەڵگەکـەی بـڵاو بویەوە لـە ناویاندا، بـە جۆرێ بچـووکو گـەورە پێـی دەزانـی، واتە: ئەم کەسـە پێویسـت ناکا بکـوژرێ.

ئایـا بۆچـی پێش ئەوە ڕەتتـان نەکردەوە کە حەق‌و ڕاسـتی هێنـا، وە بە بەڵگـە ڕووبەڕووی بەڵگـە نەبوونـەوەو ڕەتـی بکەنـەوە، پاشـان دوای ئـەوە تەماشـاتان کردبایە ئایا شایسـتەی ئەوەیـە بکـوژرێ یـان نا؟ بـەڵام ئێسـتا بەڵگەکـەی دەرکەوتووەو سـەلماندنی زاڵـە، جا لە نێـوان ئێوەو کوشـتنی ئـەودا ڕێگایەکـی زۆر هەیە کە گەردنـی گوێدرێژی تێـدا دەپچڕێ، پاشـان وتارێکـی عەقڵـی پـێ وتـن هەمـوو کەسـێکی عاقـڵ قایـل دەکات بـە هەرچۆنێ ئەنـدازەت کردبـێ، جـا فەرموویەتـی: ﴿ وَإِن يَكُ كَٰذِبًا فَعَلَيْهِ كَذِبُهُۥ وَإِن يَكُ صَادِقًا يُصِبْكُم بَعْضُ ٱلَّذِى يَعِدُكُمْ ﴾ واتـە: مووسـا ﷺ لـە نێـوان دووکاردایـە، یـان درۆدەکات لـە بانگەوازەکەیـدا، یـان ڕاسـت دەکات، جـا ئەگـەر درۆی کرد ئـەوە درۆکەی بۆ سـەر خـۆی دەگەڕێتـەوە، وە زیانەکەیشـی تایبـەت دەبێ بـە خۆی، ئێـوە هیچ زیانێکتـان لەوەدا پـێ ناگات، کاتـێ ڕێگریتان کـرد لە وەڵامدانـەوەو بەڕاسـتدانانی، جا ئەگەر ڕاسـتگۆ بوو،

وە بــە بەڵگــەی ڕوونكــراوەوە هــات بــۆ ناوتــانو هەواڵی پێــدان كــە بێگومان ئێــوە ئەگەر وەڵامــی نەدەنەوە، خوا ﷻ ســزاتان دەدات بە ســزایەك لــە دونیادا، وە ســزایەك لە دواڕۆژ، بێگومــان هەردەبــێ بەشــێ لــەوەی بەڵێنی پێداون تووشــتان بێ، ئەویش ســزایە لــە دونیادا، ئەمــەش لــە چاكــی عەقڵــیو شــارەزایی بەرگریكردنی بــوو لە مووســا ﷺ، كاتــێ كە ئەم وەڵامــەی دایــەوە كــە هیــچ ئاڵۆزیەكــی تێدانیــە لەســەریان، كارەكەی دانــا لە نێــوان دوو حاڵەتــدا، جــا بە هــەر گریمانەیەك كوشــتنی گێلــیو گەمژەیــیو نەفامیە لەلایــەن ئێوەوە، پاشــان گواســتیەوە -خــوای لێ ڕازیبــێو لێی خۆش بــێو ڕەحمی لێ بكات- بــۆ لای كارێ لــەوە بەرزتــر، وە ڕوونكردنــەوەی نزیكــی مووســا ﷺ لە حەقو ڕاســتیەوە، جــا فەرمووی: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِى مَنۡ هُوَ مُسۡرِفٌ ﴾ واتــە: زێدەڕۆیــە بــە وازهێنان لە حــەقو ڕووكردنە باتڵو ناهــەق ﴿ كَذَّابٌ ﴾ بەدانەپاڵــی لــەوەی زێدەڕۆیــی كــردوە تیایــدا بــۆ لای خوا، ئــا ئەمە خوا هیدایەتــی نــادا بۆ ڕێگای ڕاســت، نــە لەناوەڕۆكیــدا نە لەبەڵگەیــدا، وە ســەركەوتوو ناكرێ بۆ ڕێگای ڕاســت.

واتــە: بێگومــان ئێــوە بینیتــان ئەوەی مووســا ﷺ بانگــەوازی بــۆ دەكرد بۆ حەقو ڕاســتی، وە ئەوەیشــی خــوا هیدایەتــی دابــوو، بۆ ڕوونكردنــەوەی لە ســەلماندنو بەڵگــە عەقڵیەكانو لــە سروشــت بــەدەرە ئاســمانیەكان، جا هــەر كەســێ ئــەم هیدایەتــە وەردەگــرێ ناگونجێ كەسێكی زێــدەڕەوو درۆزن بــێ، ئەمــەش بەڵگەیــە لەســەر تــەواوی زانســتو عەقــڵو شــارەزایی بــە پەروەردگاری.

(٢٩): پاشــان گەلەكــەی ئاگادار كــردەوەو ئامۆژگاری كردنو ترســاندنی بە ســزای ڕۆژی دوایــی، وە ڕێگــری لێكــردن لــە لەخۆبایــی بــوون، بــە دەســەڵاتی ئاشــكراو ڕواڵــەت، جا فەرمــووی: ﴿ يَٰقَوۡمِ لَكُمُ ٱلۡمُلۡكُ ٱلۡيَوۡمَ ﴾ واتــە: لــە دونیادا ﴿ ظَٰهِرِينَ فِى ٱلۡأَرۡضِ ﴾ بەســەر ژێر دەســتەكانتانەوە، هەرچیتــان بــوێ بەســەریاندا جێبەجێی دەكەن.

جــا ئەمەتــان بــۆ دەســتەبەر بــووە، وە بۆتــان تــەواو نابــێ ﴿ فَمَن يَنصُرُنَا مِنۢ بَأۡسِ ٱللَّهِ ﴾ واتە: ســزای خــوا ﴿ إِن جَآءَنَا ﴾؟ ئەمــەش لــە جوانــی بانگەوازەكــەی بــوو، كاتێ كــە كارەكەی هاوبەشــكرد لــە نێــوان خــۆیو ئەواندا كــە فەرمــووی: ﴿ فَمَن يَنصُرُنَا ﴾ وە كــە دەفەرموێ: ﴿ إِن جَآءَنَا ﴾ بــۆ ئــەوەی وا تێیــان بگەیەنــێ ئــەو ئامۆژگاریــان دەكات، هــەروەك چــۆن ئامۆژگــاری نەفســی خــۆی دەكات، وە ڕازیــە بۆیــان، ئــەوەی ڕازیــە بۆ نەفســی خۆی.

جــا ﴿ قَالَ فِرۡعَوۡنُ ﴾ فیرعــەون بەرهەڵســتی كرد لــەوەدا، گەلەكــەی یاخی كرد كە شــوێنی

موسا ﷺ بکەون: ﴿ مَآ أُرِيكُمۡ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهۡدِيكُمۡ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴾ (واتە: چی خۆم بە چاکی دەبینم هەر ئەوەتان نیشان دەدەم، وە تەنها بۆ ڕێگای ڕاست ڕێنماییتان دەکەم). ڕاستی کرد لە قسەکەیدا ﴿ مَآ أُرِيكُمۡ إِلَّا مَآ أَرَىٰ ﴾ بەڵام فیرعەون چی بە چاک بینی؟ ئەوەی بە چاک بینی گەلەکەی بترسێنی بۆ ئەوەی شوێنی بکەون، بۆ ئەوەی دەسەڵاتداری لە ناویاندا جێگیر بێ، وە حەقی نەبینی لە خۆیدا، بەڵکو حەقی بینی لەلای موسا ﷺ، ئینکاری و نکوولی لێکرد.

وە درۆی کرد لە قسەکەیدا: ﴿ وَمَآ أَهۡدِيكُمۡ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴾ (واتە: تەنها بۆ ڕێگای ڕاست ڕێنماییتان دەکەم)، بەڕاستی ئەمە هەڵگێڕانەوەی حەقە، ئەگەر فەرمانی پێبکردایەن بە شوێنکەوتنی، تەنها لەسەر کوفرو گومڕاییەکەی، ئەوە شەڕەکە ئاسانتر دەبوو، بەڵام فەرمانی پێکردن بە شوێنکەوتنی، وە پێی وابوو شوێنکەوتنی ئەو شوێنکەوتنی حەقە، وە شوێنکەوتنی حەقیش شوێنکەوتنی گومڕاییە.

(٣٠): ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِيٓ ءَامَنَ ﴾ دووبارە بانگەوازی گەلەکەی کردەوە، بەبێ ئەوەی لە هیداتیان بێئومێد بێ -هەروەک چۆن ئەوە حاڵی بانگخوازانە بۆ لای خوا، بەردەوام خەڵکی بانگ دەکەن بۆ لای پەروەردگاریان، وە هیچ شتێک ناتوانێ لەبەردەمیاندا ببێتە بەربەست، وە پەشیمانیان ناکاتەوە سەرکەشی و لووت بەرزی ئەو کەسەی بانگی دەکەن لە دووبارە بانگەواز کردن- جا پێیانی فەرموو: ﴿ يَٰقَوۡمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُم مِّثۡلَ يَوۡمِ ٱلۡأَحۡزَابِ ﴾ واتە: ئۆممەتە بەدرۆدانەرەکان، ئەوانەی کۆبوونەوە لەسەر پێغەمبەرەکانیان لەسەر دژایەتی کردنیان.

(٣١): پاشان بۆی ڕوونکردنەوەو فەرمووی: ﴿ مِثۡلَ دَأۡبِ قَوۡمِ نُوحٖ وَعَادٖ وَثَمُودَ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ ﴾ وەکو نەریتی ئەوان لە کوفرو بەدرۆ دانانەدا، وە سوننەتی خواش لەواندا بە سزای بە پەلە لە دونیا پێش دوارۆژ، ﴿ وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلۡمٗا لِّلۡعِبَادِ ﴾ سزایان بدە بەبێ هیچ گوناهێ ئەنجامیان دابێ، وە هیچ تاوانێ پێشتر کردبێتیان.

(٣٢): دوای ئەوەی ترساندنی بە سزا دونیاییەکان، ترساندنی بە سزای دوارۆژ، جا فەرمووی: ﴿ وَيَٰقَوۡمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ يَوۡمَ ٱلتَّنَادِ ﴾ واتە: ڕۆژی دوایی، کاتێ کە خەڵکانی بەهەشت بانگی خەڵکانی دۆزەخ دەکەن: ﴿ أَن قَدۡ وَجَدۡنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقّٗا ﴾ ﴿ الأعراف، (واتە: بێگومان ئێمە ئەوەی پەروەردگارمان بەڵێنی پێدابووین ڕاست بوو پێی گەیشتین) تا کۆتایی ئایەتەکان. (وەک خوا دەفەرموێ:) ﴿ وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ أَنۡ

أَفِيضُواْ عَلَيْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ أَوْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُۚ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٥٠﴾ ﴾ الأعراف، (واتـە: وە دۆزەخیـەکان بانـگو هـاوار لە بەهەشـتیەکان دەکـەن دەڵێن هەنـدێ ئاومان پێ بەخشـن، یـان هەنـدێ لـەو ڕۆزیـەی کە خـوا پێی بەخشـیون لـە وەڵامیانـدا دەڵێـن: خوا هەردووکـی لەسـەر بێبڕوایـان حـەرام کـردوە). وە کاتێ خەڵکانـی دۆزەخ بانگـی مالیک دەکـەن سەرپەرشـتیاری دۆزەخ: ﴿ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ ﴿٧٧﴾ ﴾ الزخـرف، (واتـە: بـا پەروەردگارت بمانمرێنێت) ئەویـش دەڵێ: ﴿ إِنَّكُم مَّٰكِثُونَ ﴿٧٧﴾ ﴾ الزخرف، (واتە: بێگومـان ئێوە دەمێننەوە). وە کاتـێ بانگـی پەروەردگاریـان دەکـەن: ﴿ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْهَا فَإِنْ عُدْنَا فَإِنَّا ظَٰلِمُونَ ﴿١٠٧﴾ ﴾ المؤمنـون، (واتـە: ئـەی پەروەردگارمـان لەم دۆزەخـە دەرمان بێنە جا ئەگـەر جارێکی تـر گەڕاینەوە بـۆ بێبڕوایی ئـەوە بە ڕاسـتی ئێمە سـتەمکارین) ئەویش وەڵامیـان دەداتەوە: ﴿ ٱخْسَـُٔواْ فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ ﴿١٠٨﴾ ﴾ المؤمنون، (واتـە: وە خـوا دەفەرموێ: بە ڕیسـوایی بمێننەوە لە دۆزەخـداو هیـچ قسـەیەکم لەگەڵـدا مەکەن).

وە کاتێ بە هاوبەشـدانەران دەوترێ: ﴿ وَقِيلَ ٱدْعُواْ شُرَكَآءَكُمْ فَدَعَوْهُمْ فَلَمْ يَسْتَجِيبُواْ لَهُمْ ﴿٦٤﴾ ﴾ القصص، (واتـە: وە پێیـان دەوتـرێ هـاوار بکـەن لـەو بتانـەی کـە داتـان نابوو بـە هاوبەشـی خوا ئەوانیـش هاواریـان لێدەکەن، بـەڵام وەڵامیان نادەنـەوە) ترسـاندنی -ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبـێ- لـەم ڕۆژە ناخۆشـە، وە خەمبار بوو بۆیان، بە هـۆی بەردەوام بوونیان لە هاوبەشـدانان.

(٣٣): لەبـەر ئەمەیـە فەرمـووی: ﴿ يَوْمَ تُوَلُّونَ مُدْبِرِينَ ﴾ کـە بێگومـان دەبرێـن بـۆ نـاو ئاگر، ﴿ مَا لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ ﴾ نـە نەفـسو دەروونتـان ئـەو هێـزەی هەیـە ڕێگـری بـکات لە سـزای خـوا، وە نـە هیچ کـەس یارمەتیتـان دەدات لە غەیـری خـوا ﴿ يَوْمَ تُبْلَى ٱلسَّرَآئِرُ ﴿٩﴾ فَمَا لَهُۥ مِن قُوَّةٍ وَلَا نَاصِرٍ ﴿١٠﴾ ﴾ الطـارق، (واتـە: لـە ڕۆژێکـدا کە هەرچـی نهێنی هەیە ئاشـکرا دەکرێ × ئـەو نـە هێزێک شـک دەبـاتو نە پشـتیوانێک).

﴿ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴾ چونکـە هیدایـەت بەدەسـتی خوایـە، جـا ئەگـەر ڕێگـری هیدایەتـی کـرد لـە بەندەکـەی، ئەوە زانسـتی بـەوە هەیە کـە ئەو شایسـتەی ئـەو هیدایەتە نیـە، بـە هـۆی ئـەوەی پیسـە، بۆیـە هیـچ ڕێگایەک نیـە بـۆ ڕێنمایـی کردنی.

وَلَقَدْ جَآءَكُمْ يُوسُفُ مِن قَبْلُ بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَمَا زِلْتُمْ فِى
شَكٍّ مِّمَّا جَآءَكُم بِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا هَلَكَ قُلْتُمْ لَن يَبْعَثَ ٱللَّهُ
مِنۢ بَعْدِهِۦ رَسُولًا ۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ
مُّرْتَابٌ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بِغَيْرِ سُلْطَٰنٍ
أَتَىٰهُمْ ۖ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۚ كَذَٰلِكَ
يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ قَلْبِ مُتَكَبِّرٍ جَبَّارٍ ﴿٣٥﴾ وَقَالَ فِرْعَوْنُ
يَٰهَٰمَٰنُ ٱبْنِ لِى صَرْحًا لَّعَلِّىٓ أَبْلُغُ ٱلْأَسْبَٰبَ ﴿٣٦﴾ أَسْبَٰبَ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ فَأَطَّلِعَ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّى لَأَظُنُّهُۥ كَٰذِبًا ۚ
وَكَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِفِرْعَوْنَ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَصُدَّ عَنِ ٱلسَّبِيلِ ۚ
وَمَا كَيْدُ فِرْعَوْنَ إِلَّا فِى تَبَابٍ ﴿٣٧﴾ وَقَالَ ٱلَّذِىٓ ءَامَنَ
يَٰقَوْمِ ٱتَّبِعُونِ أَهْدِكُمْ سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٣٨﴾ يَٰقَوْمِ
إِنَّمَا هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا مَتَٰعٌ وَإِنَّ ٱلْءَاخِرَةَ هِىَ
دَارُ ٱلْقَرَارِ ﴿٣٩﴾ مَنْ عَمِلَ سَيِّئَةً فَلَا يُجْزَىٰٓ إِلَّا مِثْلَهَا ۖ
وَمَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُو۟لَٰٓئِكَ
يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ يُرْزَقُونَ فِيهَا بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٤٠﴾

(٣٤): ﴿وَلَقَدْ جَآءَكُمْ يُوسُفُ﴾ کوڕی یەعقووب درودی خوایان لەسەربێ ﴿مِن قَبْلُ﴾ پێش هاتنی مووسا ﷺ بە بەڵگە ڕوونو ئاشکراکان لە سەر ڕاستێتی، وە فەرمانی پێکردن بە بەندایەتی پەروەردگارتان بە تاکو تەنها، کە هیچ هاوەڵێکی نیە ﴿فَمَا زِلْتُمْ فِى شَكٍّ مِّمَّا جَآءَكُم﴾ لە ژیانیدا ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا هَلَكَ﴾ گومانو هاوبەشدانانتان زیادی کرد، وە ﴿قُلْتُمْ لَن يَبْعَثَ ٱللَّهُ مِنۢ بَعْدِهِۦ رَسُولًا﴾ واتە: ئەمە گومانی پووچتان بوو، وە ئەو گومانە خراپەتان کە شایستە نیە بە خوای بەرزو مەزن، بێگومان خوا واز لە بەدیهێنراوەکانی ناهێنێ بە هەوەنتە، کە فەرمانیان پێ نەکاو قەدەغەیان لێ نەکاتو نێردراویان بۆ نەنێرێ. گومان بردنێک کە خوا پێغەمبەر نانێرێ گومان بردنێکی گومڕایانەیە، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ مُّرْتَابٌ﴾ (واتە: ئا بەو جۆرە خوا گومڕای دەکات ئەو کەسەی زیادەڕەوی دوو دڵە) ئەمە وەسفی ڕاستەقینەی ئەوانە، کە مووسایان پێ وەسف کردەوە، بە زوڵمو خۆبەگەورە زانین، بە ڕاستی ئەوان زێدەڕۆ بوون، بە دەرچوونیان لە حەقو لادانیان لێی بۆ گومڕایی، ئا ئەوانە درۆزنن کاتێ ئەوەیان داوە پاڵ خواو پێغەمبەرەکەیان بەدرۆ دانا.

جا ئەو کەسەی وەسفی زێدەڕۆ درۆیە- جیا نابنەوە لێی- خوا هیدایەتی ناداو سەرکەوتووی ناکا بۆ خێر، چونکە حەقو ڕاستی ڕەت کردۆتەوە دوای ئەوەی پێی گەیشتوەو ناسیویەتی، جا پاداشتی ئەوەیە خوا ﷻ تۆڵەی لێ بسەنێ بە ڕێگریکردنی لە هیدایەت، هەروەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿فَلَمَّا زَاغُوٓا۟ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْ ﴿٥﴾﴾الصف، (واتە: جا کاتێک لایاندا لە حەق خواش دڵی وەرگێڕان).

﴿ وَنُقَلِّبُ أَفْئِدَتَهُمْ وَأَبْصَٰرَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَنَذَرُهُمْ فِى طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ١١٠ ﴾الأنعام، (واتە:وە کاتی هاتنی موعجیزەکان دڵو چاویان وەردەگێرینو لایدەدەین لە باوەڕهێنان هەروەک لە سەرەتاوە بڕوایان بە قورئان نەهێنا وە لێیان دەگەڕێین لەسەرکەشی خۆیاندا هەر سەرگەردان بن)، ﴿ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٢٥٨ ﴾البقرة، (واتە: وە خوا ڕێنموونی گەلی ستەمکاران ناکات).

(٣٥): پاشان باسی وەسفی زێدەڕۆی درۆزنی کردووەو فەرموویەتی: ﴿ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ﴾ (واتە: ئەوانەی دەربارەی نیشانەکانی خوا دەمە قاڵێ دەکەن) ئەو نیشانانەی حەقی لە ناحەق ڕوون کردۆتەوە، وەکو دەرکەوتنی خۆر بۆ چاو، ئەوان دەمەقاڵێی تێدا دەکەن لەگەڵ ڕوونیدا، بۆ ئەوەی ڕەدی بدەنەوەو پووچی بکەنەوە، ﴿ بِغَيْرِ سُلْطَٰنٍ أَتَىٰهُمْ ﴾ واتە: بەبێ ئەوەی بەڵگەو سەلماندنێکیان بۆ هاتبێ، ئەمە وەسفێکی پێویستە بۆ هەریەک لەوانەی دەمە دەمێ لە ئایەتەکانی خوادا دەکەن، بێگومان ئەستەمە دەمە دەمێ بە بەڵگە بکەن، چونکە حەقو ڕاستی هیچ دژێک لە دژی ناوەستێ، بە هیچ جۆرێ ڕەوا نیە بە بەڵگەی شەرعی، یان عەقڵی دژایەتی بکرێ.

﴿ كَبُرَ ﴾ ئەو قسەیەی کە ڕەتکردنەوەی حەق بە پووچو بەتاڵ لە خۆ دەگرێ: ﴿ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾ (واتە: تووڕەییە لای خوا، وە لای ئەوانەش بڕوایان هێناوە) خوا ﷻ زۆر ڕقی لە خاوەنەکەیەتی، چونکە لەخۆی گرتوە درۆدانان بە حەقو بەڕاست دانانی پووچو بەتاڵ وە دایەتیە پاڵی، ئا ئەم کارانە تووڕەیی خوا سەخت دەکاتەوە بەو کەسەی کە پێی وەسفکراوە، بە هەمان شێوە بەندە بڕوادارەکانیشی تووڕە دەبن لەوە بەوپەڕی تووڕە بوون، وەک گونجاندنو ڕێک هاتنێ لەگەڵ پەروەردگاریان، ئا ئەوانە تایبەتمەندترینی دروستکراوەکانی خوان، جا تووڕەییان بەڵگەیە لەسەر خراپیو ناشرینی ئەوەی کە لێی تووڕەن، ﴿ كَذَٰلِكَ ﴾ واتە: وەک چۆن خوا مۆریدا بەسەر دڵی دارودەستەی فیرعەوندا ﴿ يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ قَلْبِ مُتَكَبِّرٍ جَبَّارٍ ﴾ (واتە: خوا مۆر دەنێ بەسەر دڵی هەموو خۆبەلزانێکی زۆرداردا) خۆ بە گەورە زانە لە نەفسی خۆیدا لەسەر حەق بە ڕەتکردنەوەی، وە لەسەر خەڵکی بە بە کەم دانانیان. زۆرداره بە زۆری ستەمو دژایەتی کردنی.

(٣٦): ﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ ﴾ بە بەرهەڵستی مووساو بەدرۆدانانی لە بانگ کردنیدا بۆ

دانپێدانــان بــە پەروەرگــاری جیهانیــان، ئــەو زاتــەی کــە لــە ســەرووی عەرشــەوەیە، وە لــە ســەرووی دروســتکراوەوە بەرزبوەتــەوە﴿ يَـٰهَـٰمَـٰنُ ٱبۡنِ لِي صَرۡحٗا ﴾ واتــە: کۆشــکێکی بــەرزو مەزنــم بــۆ دروســت بکــە، مەبەســت لــەو کۆشــکەدا: بەڵکــو لەوێــوە ســەیری ﴿ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّي لَأَظُنُّهُۥ كَٰذِبٗا ﴾ واتــە: (خواکــەی مووســا ﷺ بکــەم بەڕاســتی مــن وا گومــان دەبــەم ئــەو مووســا درۆزنــە) لــە بانگەوازەکەیــدا کــە ئێمــە پەروەردگارێکمان هەیــە، ئەویــش لــە ســەرووی ئاســمانەکانەوەیە.

(٣٧): بــەڵام فیرعــەون ویســتی ئــەوە بســپێرێو بــە نەفســی خــۆی ئــەو کارە تاقــی بکاتــەوە، خــوا ﷻ فەرمــووی لــە ڕوون کردنــەوەی ئــەوەی وای لــە فیرعــەون کــرد ئــەو قســەیە بــکات: ﴿ وَكَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِفِرۡعَوۡنَ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ ﴾ (واتــە: ئــا بەوجــۆرە ڕازێنرایــەوە بــۆ فیرعــەون کــردەوەی خراپــی) کــردەوەی ناشــرینی لــەلا جــوان کــرد، بــەردەوام شــەیتان بــۆی دەڕازانــدەوە، بانگــی دەکــرد بــۆ لایو لــە پێــش چــاوی جوانــی دەکــرد، هەتــا بــە چاکــی زانــیو بانگــەوازی بــۆ کردو مشــتو مــڕی دەکــرد وەک مشــتومڕی ئەوانــەی لەســەر حەقــن، لــە کاتێکــدا ئــەو لەوپــەڕی خراپــەکاران بــوو.

﴿ وَصُدَّ عَنِ ٱلسَّبِيلِ ﴾ (واتــە: ڕێگــری کــرا لــە ڕێگــای) ڕاســت، بەهــۆی ئــەو پووچــەوە کــە بــۆی ڕازابوویــەوە ﴿ وَمَا كَيۡدُ فِرۡعَوۡنَ ﴾ (واتــە: هــەر فێــڵو پیلانێکــی فیرعەون بــوو) کــە مەبەســتی پێــی فێــڵ کــردن بــوو لــە حــەق، خەڵکیــش وا تێبگەیەنێــت کــە ئــەو لەســەر حەقــەو مووســا ﷺ لەســەر ناحەقــە ﴿ إِلَّا فِي تَبَابٖ ﴾ واتــە: خەســارەتمەندو بــە فیــڕۆ چــوو، هیــچ ســوودێکی پێنەگەیانــد بێجگــە لــە بەدبەختــی نەبێــت لــە دونیــاو دواڕۆژدا.

(٣٨): ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِيٓ ءَامَنَ ﴾ (واتــە: ئــەو پیــاوەی بــڕوای بــە مووســا ﷺ هێنابــوو) ئامۆژگاریەکــەی دووبــارە کــردەوە بــۆ گەلەکــەیو وتــی: ﴿ يَٰقَوۡمِ ٱتَّبِعُونِ أَهۡدِكُمۡ سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴾ (واتــە: ئــەی گەلەکــەم شــوێن مــن بکــەون ڕێگــای ڕاســتتان نیشــان دەدەم) نــەک ئــەوەی فیرعــەون پێتــان دەڵــێ، بێگومــان ئــەو ڕێنماییتــان نــاکات جگــە لــە ڕێگــای گومڕایــیو خراپــەکاری نەبێــت.

(٣٩): ﴿ يَٰقَوۡمِ إِنَّمَا هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا مَتَٰعٞ ﴾ (واتــە: بەڕاســتی ژیانــی ئــەم دونیایــە ڕابواردنێکــی کەمــە) چێــژی پــێ وەردەگــرێ بــۆ ماوەیەکــی کــەم، پاشــان دەبڕێتــەوەو پــەرشو بــڵاو دەبــێ، بــا یاخیتــان نــەکاتو هەڵتــان نەخەڵەتێنــێ لــەوەی بــۆی

دروســتکراون ﴿ وَإِنَّ ٱلۡأٓخِرَةَ هِيَ دَارُ ٱلۡقَرَارِ ﴾ (واتــە: بەڕاســتی هــەر دوارۆژ) جێگــای مانەوەیــە، وە شــوێنی نیشــتەجێبوونو جێگیربوونــە، جــا پێویســتە لەســەرتان بایەخــی پێبــدەنو کاری بــۆ بکــەن، کار کردنێــک بەختەوەرتــان بــکات تیایــدا.

(٤٠): ﴿ مَنۡ عَمِلَ سَيِّئَةً ﴾ (واتــە: هەرکەســێک کارێکــی خراپــی کردبێــت) لــە هاوبەشــدانان یــان خراپــە یــان ســەرپێچی ﴿ فَلَا يُجۡزَىٰٓ إِلَّا مِثۡلَهَا ﴾ واتــە: پاداشــت نادرێتەوە تەنهــا بــەو ئەنــدازە نەبــێ کــە ئەنجامیــداوە، زیانــی پێدەگەیەنــێو خەمبــاری دەکات، چونکــە پاداشــتی خراپــە خراپەیــە.

﴿ وَمَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ ﴾ (لــە کردەوەکانــی دڵــەکانو جەســتەکانو وتەکانــی زمــان) ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ يُرۡزَقُونَ فِيهَا بِغَيۡرِ حِسَابٖ ﴾ واتــە: پاداشــتیان پێــدەدرێ بــە بــێ ســنوورو بــێ ژمــارە، بەڵکــو خــوا ئەوەندەیــان پێدەبەخشــێ کردەوەکانیــان هەرگیــز پێــی ناگــات.

وَيَٰقَوۡمِ مَا لِيٓ أَدۡعُوكُمۡ إِلَى ٱلنَّجَوٰةِ وَتَدۡعُونَنِيٓ إِلَى ٱلنَّارِ
﴿٤١﴾ تَدۡعُونَنِي لِأَكۡفُرَ بِٱللَّهِ وَأُشۡرِكَ بِهِۦ مَا لَيۡسَ لِي بِهِۦ
عِلۡمٞ وَأَنَا۠ أَدۡعُوكُمۡ إِلَى ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡغَفَّٰرِ ﴿٤٢﴾ لَا جَرَمَ أَنَّمَا
تَدۡعُونَنِيٓ إِلَيۡهِ لَيۡسَ لَهُۥ دَعۡوَةٞ فِي ٱلدُّنۡيَا وَلَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ
وَأَنَّ مَرَدَّنَآ إِلَى ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ هُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ
﴿٤٣﴾ فَسَتَذۡكُرُونَ مَآ أَقُولُ لَكُمۡۚ وَأُفَوِّضُ أَمۡرِيٓ إِلَى ٱللَّهِۚ
إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴿٤٤﴾ فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُواْۖ
وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرۡعَوۡنَ سُوٓءُ ٱلۡعَذَابِ ﴿٤٥﴾ ٱلنَّارُ يُعۡرَضُونَ
عَلَيۡهَا غُدُوّٗا وَعَشِيّٗاۚ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدۡخِلُوٓاْ ءَالَ
فِرۡعَوۡنَ أَشَدَّ ٱلۡعَذَابِ ﴿٤٦﴾ وَإِذۡ يَتَحَآجُّونَ فِي ٱلنَّارِ
فَيَقُولُ ٱلضُّعَفَٰٓؤُاْ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا كُنَّا لَكُمۡ
تَبَعٗا فَهَلۡ أَنتُم مُّغۡنُونَ عَنَّا نَصِيبٗا مِّنَ ٱلنَّارِ ﴿٤٧﴾ قَالَ
ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا كُلّٞ فِيهَآ إِنَّ ٱللَّهَ قَدۡ حَكَمَ
بَيۡنَ ٱلۡعِبَادِ ﴿٤٨﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ فِي ٱلنَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ
ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ يُخَفِّفۡ عَنَّا يَوۡمٗا مِّنَ ٱلۡعَذَابِ ﴿٤٩﴾

(٤١): ﴿وَيَٰقَوۡمِ مَا لِيٓ أَدۡعُوكُمۡ إِلَى ٱلنَّجَوٰةِ﴾ بەوەی كە پێم وتن ﴿وَتَدۡعُونَنِيٓ إِلَى ٱلنَّارِ﴾ بە وازهێنان لە شوێنكەوتنی پێغەمبەری خوا مووسا ﷺ.

(٤٢) پاشان ئەوەی شی كردوەتەوەو فەرموویەتی: ﴿تَدۡعُونَنِي لِأَكۡفُرَ بِٱللَّهِ وَأُشۡرِكَ بِهِۦ مَا لَيۡسَ لِي بِهِۦ عِلۡمٞ﴾ تەنها ئەو زاتە شایستەی ئەوەیە بپەرسترێ كە خوایە، وە قسەكردن لەسەر خوا بەبێ زانست لە گەورەترینی گوناهەكانو ناشرینترینیانە ﴿وَأَنَا۠ أَدۡعُوكُمۡ إِلَى ٱلۡعَزِيزِ﴾ (عەزیز) ئەو زاتەیە كە خاوەنی هەموو هێزێكە، جگە لە ئەویش هیچی لەو كاروبارەدا نیە ﴿ٱلۡغَفَّٰرِ﴾ ئەو زاتەی كە بەندەكان زیادەڕۆیی دەكەن بەسەر نەفسی خۆیانەوەو بوێری دەكەن لەسەر تورەییەكانی، پاشان ئەگەر داوای لێخۆشبوونیان كردو گەڕانەوە بۆ لای، لە گوناهەكانیان خۆش دەبێ، وە ئەوەیشی پێویستە لە سزا دونیایی‌و دواڕۆژیەكان ڕەتی دەكەنەوە.

(٤٣): ﴿لَا جَرَمَ﴾ واتە: ڕاستەو گومانی تێدانیە، ﴿أَنَّمَا تَدۡعُونَنِيٓ إِلَيۡهِ لَيۡسَ لَهُۥ دَعۡوَةٞ فِي ٱلدُّنۡيَا وَلَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ﴾ واتە: شیاوی بانگكردن نیە بۆ لای‌و هاندان لەسەری، نە لە دونیاو نە لە دواڕۆژدا، لەبەر كەم‌و كوڕی‌و بێ توانایی، بێگومان ئەوە هیچی بەدەست نیە، نە سوودو نە زیان، نە مردن‌و نە ژیان، وە نە زیندووكردنەوەیش.

﴿وَأَنَّ مَرَدَّنَآ إِلَى ٱللَّهِ﴾ (واتە: بە ڕاستی گەڕانەوەمان هەر بۆ لای خوایە خوای) بەرزو مەزن، پاداشتی هەموو كردەوەكارێ دەداتەوە بەپێی كردەوەكەی ﴿وَأَنَّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ هُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ﴾ ئەوانەی زێدەڕۆییان كردوە لەسەر نەفس‌و دەروونیان بە چاو قایمی بەرانبەر پەروەردگاریان، بە سەرپێچی كردنی‌و بێبڕوابوون پێی.

(٤٤): كاتێ ئامۆژگاری كردن‌و ئاگاداری كردنەوەو ترساندنی، ئەوانیش گوێڕایەڵیان نەكردوو نەگونجان لەگەڵیدا، پێیانە فەرموو: ﴿فَسَتَذۡكُرُونَ مَآ أَقُولُ لَكُمۡ﴾ (واتە: جا

لەمــەودوا ئــەوەی من پێتــان دەڵێم بیرتــان دەکەوێتەوە) لــەم ئامۆژگاریە وە لــە داهاتویەکی نزیکــدا دەرەنجامــی وەرنەگرتنــی دەبیننەوە، کاتێ ســزاتان بۆ حــەڵاڵ دەبــێ و بێبەش دەبن لە ئەوپەڕی پاداشــت.

﴿ وَأُفَوِّضُ أَمْرِىٓ إِلَى ٱللَّهِ ﴾ واتــە: پەنــای بــۆ دەبــەمو کاری خۆم بەو دەســپێرم، وە پشــتی پێ دەبەســتم لــە بەرژەوەندیەکانــمو دوورخســتنەوەی ئــەو زیانانــەی کە لــە لایەن ئێــوەوە یان جگــە لــە ئێــوە تووشــم دەبێــت،﴿ إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرٌ ﴾ بارودۆخــی ئــەوان دەزانێ وە ئەوەیشــی شایســتەیانە. وە بارودۆخــی لاوازی منیــش دەزانــێ، ڕێگریــم لــێ دەکات لــە ئێــوەوەو لــە خراپەتــان دەمپارێــزێ، بــە بارودۆخی ئێــوەش دەزانێ، ناتوانــن هیچ هەڵــسو کەوتێ بکەن تەنهــا بــە ویســتو ئیــرادەی ئــەو نەبــێ، جــا ئەگــەر ئێــوەی زاڵ کــرد بــە ســەرمدا ئــەوە حیکمەتێکــی تێدایــەو لــە ویســتو ئیرادەی ئــەوەوە ئــەو بڕیــارە دەرچووە.

(٤٥):﴿ فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُوا۟ ﴾ واتــە: خــوای بــە هێــزو بــە بەزەیــی ئــەو پیاوە بــڕوادارەی پاراســت لە فرتو فێڵو ســزاو پیلانی فیرعەونو داروو دەســتەکەی، لە ویســتی لەناوبردنــی و کوشــتنی، چونکــە ئــەو دەستپێشــخەری بــە شــتێک کــرد کــە ئــەوان پێیــان ناخــۆش بــوو، وە ڕێــک بوونی لەگەڵ مووســادا بــە تەواوەتی ئاشــکرا کــردو بانگی کردن بــۆلای ئەوەی کە مووســا بانگیانــی کرد، ئەمــەش کارێکە ئــەوان بەرگەی ناگــرن، چونکە ئــەو کات خــاوەن هێزو دەســەڵات بــوون، ئەویش تــووڕەی کــردنو بێزاری کــردن، بۆیە ویســتیان فــرتو فێڵو زیانــی لێبدەن، بەڵام خوا ﷻ پاراســتی لــە فروفێڵەکانیان، فــرو فێڵو پیلانەکانیــان گەڕایــەوە بۆ ســەر خۆیــان ﴿ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرْعَوْنَ سُوٓءُ ٱلْعَذَابِ ﴾ (واتە: وە ســزای ســەخت هاتــوو داروو دەســتەی فیرعەونی گرتەوە) خــوا ﷻ نوقمی کردن، لــە بەرەبەیانێکدا هەموویــان بەیەکجار.

(٤٦): وە لــە بەرزەخــدا﴿ ٱلنَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا ۖ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدْخِلُوٓا۟ ءَالَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ ﴾ (واتــە: بەیانیانو ئیــواران دەبرێنە دیاری ئاگــری دۆزەخ ڕۆژێکیش قیامەت هەڵدەســتێ فەرمــان دەدرێ داروو دەســتەی فیرعەون بخەنە ســەخترین ســزاوە) جا ئەم ســزا خراپانــە تووشــی ئەوانــە دەبێ کــە پێغەمبەرانی خــوا بــەدرۆ دادەنێنو عینــادی فەرمانەکانی دەکەن.

(٤٧-٥٠): ﴿ وَإِذْ يَتَحَآجُّونَ فِى ٱلنَّارِ فَيَقُولُ ٱلضُّعَفَٰٓؤُا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓا۟ إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا نَصِيبًا مِّنَ ٱلنَّارِ ﴿٤٧﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓا۟ إِنَّا كُلٌّ فِيهَآ إِنَّ ٱللَّهَ قَدْ

حَكَمَ بَيْنَ ٱلْعِبَادِ ﴿٤٨﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ فِي ٱلنَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ ٱدْعُوا۟ رَبَّكُمْ يُخَفِّفْ عَنَّا يَوْمًا مِّنَ ٱلْعَذَابِ
﴿٤٩﴾ قَالُوٓا۟ أَوَلَمْ تَكُ تَأْتِيكُمْ رُسُلُكُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ ۚ قَالُوا۟ فَٱدْعُوا۟ ۗ وَمَا دُعَٰٓؤُا۟ ٱلْكَٰفِرِينَ
إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ ﴿٥٠﴾ ﴾:

خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات دەربـارەی دەمە دەمـێو قڕە قـڕی دۆزەخیان، وە سەرزەنشـتکردنی هەندێکیـان بـە هەندێکی دیکەیـان، وە پەنا بردنیان بـۆلای دەرگاوانانـی دۆزەخ، وە نەبوونی هیـچ سـوودێک لـەوەدا، جـا فەرمـووی: ﴿ وَإِذْ يَتَحَآجُّونَ فِى ٱلنَّارِ ﴾ (واتـە: کاتـێ دۆزەخیـەکان لەنـاو ئاگـردا دەمـە قڕە دەکـەن) شـوێنکەوتوان بەڵگـە دەهێننـەوە بەوەی سەرمەشـقەکانیان گومڕایـان کـردوون، وە سەرمەشـقەکانیش خۆیـان بـەری دەکـەن لـە شـوێنکەوتووەکانیان.

﴿ فَيَقُولُ ٱلضُّعَفَٰٓؤُا۟ ﴾ شـوێنکەوتووی دەسـەڵاتدارەکان دەڵێـن: ﴿ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓا۟ ﴾ (بەوانـەی خۆبەزلـزان بـوون) لەسـەر حـەق، وە بانگیـان کـردوون بـۆ لای ئـەوەی لووت بەرزیـان کردوە لـە پێناویدا: ﴿ إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا ﴾ (واتە: بە ڕاسـتی ئێمە شـوێنکەوتووی ئێوە بووین) ئێوە سـەرتان لێشـێواندینو گومڕاتان کردین، وە هاوبەشـدانانو شـەڕو خراپەتان لە لامـان جـوان کـرد، ﴿ فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا نَصِيبًا مِّنَ ٱلنَّارِ ﴾ (واتـە: دەی ئایـا ئێوە لە جیاتـی ئێمـە بەشـێک لەم ئاگـرە لە ئەسـتۆ دەگرن) ئەگـەر چی کەمیـش بێ.

(٤٨): ﴿ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓا۟ ﴾ (واتـە: ئەوانـەی خۆبەزلـزانو زۆردار بـوون وتیـان) بێتوانایـی خۆیـان ڕوون کـردەوە، وە جێبەجێ کردنـی فەرمانی خوایی لـە هەمووانـدا: ﴿ إِنَّا كُلٌّ فِيهَآ إِنَّ ٱللَّهَ قَدْ حَكَمَ بَيْنَ ٱلْعِبَادِ ﴾ (واتـە: بـە ڕاسـتی هەموومان لـە ئاگرداین بێگومان خـوا لەنێـوان بەندەکانیـدا دادوەری کـردوە) بۆ هەر یەکێ سـزای خۆی بـۆی دیاریکردوە، لێـی زیاد نـاکاو لێی کەم نـاکات، وە نایگۆڕێ ئـەو بڕیارەی کە داویەتی خـوای کاربەجێ.

(٤٩-٥٠): ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ فِى ٱلنَّارِ ﴾ لـە لـووت بـەرزەکانو لاوازەکان ﴿ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ ٱدْعُوا۟ رَبَّكُمْ يُخَفِّفْ عَنَّا يَوْمًا مِّنَ ٱلْعَذَابِ ﴾ (واتـە: داوا لـە پەروەردگارتـان بکـەن تەنهـا یەک ڕۆژ سـزامان لەسـەر سـووک بکات) بۆئـەوەی هەنـدێ پشـوو حەوانەوە بەدەسـت بێ.

قَالُوٓاْ أَوَلَمۡ تَكُ تَأۡتِيكُمۡ رُسُلُكُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِۖ قَالُواْ بَلَىٰۚ
قَالُواْ فَٱدۡعُواْۗ وَمَا دُعَٰٓؤُاْ ٱلۡكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٍ ﴿٥٠﴾
إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا
وَيَوۡمَ يَقُومُ ٱلۡأَشۡهَٰدُ ﴿٥١﴾ يَوۡمَ لَا يَنفَعُ ٱلظَّٰلِمِينَ مَعۡذِرَتُهُمۡۖ
وَلَهُمُ ٱللَّعۡنَةُ وَلَهُمۡ سُوٓءُ ٱلدَّارِ ﴿٥٢﴾ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى
ٱلۡهُدَىٰ وَأَوۡرَثۡنَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡكِتَٰبَ ﴿٥٣﴾ هُدٗى
وَذِكۡرَىٰ لِأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿٥٤﴾ فَٱصۡبِرۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ
حَقّٞ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ بِٱلۡعَشِيِّ
وَٱلۡإِبۡكَٰرِ ﴿٥٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ
بِغَيۡرِ سُلۡطَٰنٍ أَتَىٰهُمۡ إِن فِي صُدُورِهِمۡ إِلَّا كِبۡرٞ
مَّا هُم بِبَٰلِغِيهِۚ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ
ٱلۡبَصِيرُ ﴿٥٦﴾ لَخَلۡقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ أَكۡبَرُ مِنۡ
خَلۡقِ ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٥٧﴾
وَمَا يَسۡتَوِي ٱلۡأَعۡمَىٰ وَٱلۡبَصِيرُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ
ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَلَا ٱلۡمُسِيٓءُۚ قَلِيلٗا مَّا تَتَذَكَّرُونَ ﴿٥٨﴾

﴿قَالُوٓاْ﴾ سەرزەنشتیان دەکەن، وە بۆیان روون دەکەنەوە کە شەفاعەتو تکا کردنی ئەوان هیچ سوودێکیان پێ ناگەیەنێ، وە داواکردنیشیان هیچ کەڵکێکی نیە، دەڵێن: ﴿أَوَلَمۡ تَكُ تَأۡتِيكُمۡ رُسُلُكُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ﴾ (واتە: ئایا پێغەمبەرانتان بۆیان نەهێنابوون بەڵگە روونەکان) کە حەقو رێگای راستیان پێیان روون دەکردەوە، وە ئەوەیشی لە خوا نزیک دەکاتەوەو ئەوەیشی لەو دوور دەخاتەوە؟ ﴿قَالُواْ بَلَىٰ﴾ (وتیان بەڵێ) بەراستی بە بەڵگەی روونەوە هاتن بۆ ناومان، وە بەڵگەو حوجەی خوایان لەسەرمان پێویست کرد، ئێمە ستەمو ئینکاری حەقمان کرد، دوای ئەوەی روون بویەوە ﴿قَالُواْ﴾ واتە: دەرگاوانی دۆزەخ خۆیان بەری دەکەن لە دوعا بۆکردنو شەفاعەت کردنیانو دەڵێن: ﴿فَٱدۡعُواْ﴾ واتە: خۆتان بپارێنەوە، بەڵام ئایا ئەم پارانەوەیە هیچ سوودێکی دەبێ یان نا؟

خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَمَا دُعَٰٓؤُاْ ٱلۡكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٍ﴾ واتە: پووچو هەڵوەشاوەیە، چونکە کوفرو بێبڕوایی هەڵوەشێنەرەوەی هەموو کردەوەکانە، رێگرە لەبەردەم وەڵامدانەوەی پارانەوەدا.

(٥١-٥٢): ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَيَوۡمَ يَقُومُ ٱلۡأَشۡهَٰدُ ﴿٥١﴾ يَوۡمَ لَا يَنفَعُ ٱلظَّٰلِمِينَ مَعۡذِرَتُهُمۡۖ وَلَهُمُ ٱللَّعۡنَةُ وَلَهُمۡ سُوٓءُ ٱلدَّارِ ﴿٥٢﴾﴾

کاتێ باسی سزایداروو دەستەی فیرعەونی کرد لە دونیاو بەرزەخو رۆژی دوایی، وە باسی خراپی حاڵی دۆزەخیانی کرد، ئەوانەی وازیان لە پێغەمبەرەکەیان هێناو دژایەتیان کردن ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا﴾ واتە: (بە راستی ئێمە پێغەمبەرانمانو ئەوانەی باوەریان هێناوە سەرکەوتوو دەکەین) بە بەڵگەو سەلماندنو سەرکەوتن. ﴿وَيَوۡمَ يَقُومُ ٱلۡأَشۡهَٰدُ﴾ واتە: لە دوارۆژدا بە بڕیار دانی پاداشت بۆ خۆیانو

شـوێنکەوتووەکانیان، وە بـۆ ئەوانەیشـی دژایەتیـان کـردوون بـە سـزای توندو بـە ئێش.
(٥٢): ﴿ يَوْمَ لَا يَنفَعُ ٱلظَّٰلِمِينَ مَعْذِرَتُهُمْ ﴾ کاتـێ کە بیانـوو دێننەوە ﴿ وَلَهُمُ ٱللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوٓءُ ٱلدَّارِ ﴾ واتـە: خراپترین جێگا، کە دانیشـتووانی بێـزار دەکات.
(٥٣-٥٥): ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْهُدَىٰ وَأَوْرَثْنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْكِتَٰبَ ﴿٥٣﴾ هُدًى وَذِكْرَىٰ لِأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٥٤﴾ فَٱصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَٱسْتَغْفِرْ لِذَنۢبِكَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ بِٱلْعَشِىِّ وَٱلْإِبْكَٰرِ ﴿٥٥﴾ ﴾:
﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ﴾ کاتـێ خـوا ﷻ باسـی ئـەوەی کرد لـە مووسـاو فیرعەون روویـدا، وە ئـەوەی بەسـەر فیرعەونو سـەربازەکانیدا هات، پاشـان باسـی بڕیـاری گشـتگیری بۆ ئەوو دۆزەخیـان کـرد، باسـی ئـەوەی کرد کە بەخشـیویەتی بـە مووسـا ﷺ ﴿ ٱلْهُدَىٰ ﴾ واتە: ئایەتـەکان، وە ئەو زانسـتەی کە ڕێنماییـکاران ڕێنمایـی پێوەردەگرن ﴿ وَأَوْرَثْنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْكِتَٰبَ ﴾ واتـە: (تەوراتمـان کردە میراتگـری نەوەکانی ئیسـرائیل).
(٥٤): جـا ئـەو کتێبـەش گشـتگیرە لەسـەر هیدایـەت، کـە بریتیـە لـە زانسـت بـە بڕیارە شـەرعیەکانو جگـە لـە ئەوانیـش. وە لەسـەر بیرهێنانـەوە بۆ خێـر بەحەزو تامـەزرۆ کردن تیایـدا، وە لـە دوورکەوتنـەوە لە شـەڕ بە ترسـاندن لێـی. ئەوەش بـۆ هەموو کەسـێک نیە، بەڵکـو بـۆ ﴿ لِأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾ (خـاوەن ژیریەکانە).
(٥٥): ﴿ فَٱصْبِرْ ﴾ (خۆڕاگـر بـە) ئـەی پێغەمبـەر ﷺ وەکو چۆن پێشـینت ئارامیان گرت لە خـاوەن عەزمەکانـی پێغەمبـەران ﴿ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ﴾ واتـە: (بێگومان بەڵێنی خوا ڕاسـتە) هیـچ گومانێکـی تێـدا نیـە، یـان دوو دڵـی یـان درۆ، تـا ئارامگرتن لەسـەرت گـران بێت، بەڵکـو حەقو ڕاسـتی پوختـەو ڕێنمایـی پەتیە، کـە خۆڕاگران لەسـەری ئـارام دەگرن، وە بەرچـاو ڕوونـانو خـاوەن بیناییەکان کۆشـش دەکـەن بۆ دەسـت پێوەگرتنو پەیوەسـت بوونیان.
خـوا ﷻ کـە دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ﴾ (واتـە: بەڕاسـتی بەڵێنـی خـوا ڕاسـتە) لەو هۆکارانـەی هاندەرن لەسـەر ئارامگرتنو لەسـەر گوێڕایەڵـی خوا، وە وازهێنـان لەوەی خوا پێی ناخۆشـە.
﴿ وَٱسْتَغْفِرْ لِذَنۢبِكَ ﴾ (واتـە: داوای لێبـوردن بـۆ گوناهـت بکـە) کـە ڕێگرە لـە بەردەم بەدەسـتهێنانی سـەرکەوتنو بەختەوەریـت، فەرمانی پێکـردوە بە ئارام گرتن کـە بە هۆیەوە ئەوەی خۆشویسـتراوە بەدەسـت دێت، وە بە داوای لێخۆشـبوون مەترسـیەکان دوور دەبنەوە،

وە بــە تەسـبیح کــردن بــە سـتایش کردنی خـوا ﷻ بــە تایبەتـی ﴿ بِٱلۡعَشِيِّ وَٱلۡإِبۡكَٰرِ ﴾ (واتــە: ئێــواران‌و بەرەبەیــان) ئــەو دوو کاتــە چاکترینــی کاتەکانــن، وە چەندیــن زیکــرو ویــردی پێویســت‌و پەسـندی تێدایە، چونکــە لــەوەدا یارمەتیە بۆ هەمــوو کارەکان.

(٥٦): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بِغَيۡرِ سُلۡطَٰنٍ أَتَىٰهُمۡ إِن فِي صُدُورِهِمۡ إِلَّا كِبۡرٞ مَّا هُم بِبَٰلِغِيهِۚ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ٥٦ ﴾:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بِغَيۡرِ سُلۡطَٰنٍ أَتَىٰهُمۡ إِن فِي صُدُورِهِمۡ إِلَّا كِبۡرٞ مَّا هُم بِبَٰلِغِيهِ ﴾ خــوا ﷻ هــەواڵ دەدات ئــەو کەســەی دەمەقاڵــێ‌و مشــت‌ومڕ دەکات لــە ئایەتەکانــی بــۆ ئــەوەی بەتاڵــی بکاتــەوە بــە بەڵگــەی پــووچ‌و بــێ بنەمــا، ئەمــە لــە لــووت بەرزیــەوە ســەرچاوەی گرتــووە لەناخیانــدا دژ بــە حــەق‌و بــەوەی هێناویەتــی، مەبەســتیان خــۆ بــە گــەورە دانانــە بەســەریەوە بــەوەی لــە لایانــە لــە پــووچ‌و بەتــاڵ، ئــا ئەمــە مەبەســت‌و ویســتیانە.

بــەڵام ئــەوان ئەمەیــان بــۆ تــەواو نابێــت‌و بــە مەبەســتیان ناگــەن، ئەمــە دەقێکــی ڕوون‌و ئاشــکرایە، وە مژدەیەکیشــە کــە هەرکەســێک دەمەقاڵــێ‌و مشــت‌و مڕی حەق بــکات ئەوە دۆڕاوە، هەرکەسـێکیش لــە ئاســتیدا خــۆی بە گــەورە بزانێت ئەوە ســەرەنجام زەلیــل دەبێ.

﴿ فَٱسۡتَعِذۡ ﴾ واتــە: پەنــا بگــرە لــە ﴿ بِٱللَّهِ ﴾ (بــە خوا)، باســی نەکــردوە کە پەنــا لە چی دەگــرێ بــە مەبەســتی ئەوەی گشــتگیر بێــت. واتە: پەنــا بەخوا بگــرە لە لووت بــەرزی کە دەبێتــە هــۆی خــۆ بە گــەورە زانین بەســەر حەقــەوە، وە پەنــا بەخوا بگــرە لە شــەیتانەکانی ئادەمیــزادو جنۆکــە، وە پەنــا بــە خوا بگــرە لە هەمــوو خراپــەکان. ﴿ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ﴾ (بێگومــان خــوا بیســەری) هەمــوو دەنگەکانــە بــە جیاوازیانــەوە ﴿ ٱلۡبَصِيرُ ﴾ (بینــەرە) بە هەمــوو بینینــەکان، لە هــەر جێگاو شــوێن‌و کاتێکــدا بێت.

(٥٧-٥٩): ﴿ لَخَلۡقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ أَكۡبَرُ مِنۡ خَلۡقِ ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ٥٧ وَمَا يَسۡتَوِي ٱلۡأَعۡمَىٰ وَٱلۡبَصِيرُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَلَا ٱلۡمُسِيٓءُۚ قَلِيلٗا مَّا تَتَذَكَّرُونَ ٥٨ إِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَأٓتِيَةٞ لَّا رَيۡبَ فِيهَا وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤۡمِنُونَ ٥٩ ﴾:

﴿ لَخَلۡقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ أَكۡبَرُ مِنۡ خَلۡقِ ٱلنَّاسِ ﴾ خــوا ﷻ هــەواڵ دەدات دەربــارەی ئــەوەی لــە عەقڵەکان جێگیر بووە، بەڕاســتی دروســتکردنی ئاســمانەکان‌و زەوی -بە مەزنی‌و بەرفراوانیانــەوە- مەزنتــرو گەورەتــرن لە دروســتکرنی ئادەمیــزاد، بێگومان خەڵکــی لە چاو دروســتکردنی ئاســمانەکان‌و زەوی لــە ئەوپــەڕی بچووکی دایە.

ئـەو زاتەی ئەسـتێرە مەزنەکانـی دروسـتکردووەو ڕێکی خسـتوون، بەتوانایە لەسـەر دووبارە دروسـتکردنەوەی خەڵکـی دوای مردنیان.
ئەمـە یەکێکـە لەو بەڵگـە عەقڵیانەی کە بەڵگەن لەسـەر زینـدوو کردنەوە، بە سـەلماندنێکی یەکلاکـەرەوە، تەنهـا بـە سـەرنجدانی کەسـی عاقـڵ تیایـدا، دەیکات بـە بەڵگە بـە جۆرێ کـە هیچ گومـانو دوودڵیـەک هەڵناگرێ، بەڕاسـتی ئەوەی پێغەمبـەران هەواڵیـان پێداوە لە دروستکردنەوە.
هەمـوو کەسـێک بیـرو هۆشـی بـۆ ئـەوە ناجوڵێـت، وە بـە سـەرنجدان وەریبگـرێ، لەبەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ (واتـە: بـەڵام زۆربـەی خەڵکی ئەمـە نازانـن) بۆیـە پەنـدی لێوەرناگـرن، وە بـە بـای خەیاڵیانـدا نایـەت، پاشـان خـوا ﷻ فەرموویەتی:
(٥٨): ﴿ وَمَا يَسْتَوِي ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَلَا ٱلْمُسِيٓءُ ﴾ واتـە: هەروەکـو چـۆن بینـاو نابینا یەکسـان نیـن، بە هەمان شـێوە یەکسـان نیە کەسـێ بـڕوا بە خـوا بهێنـێو کـردەوەی چـاک ئەنجـام بدات، وە کەسـێ لـووت بـەرزی بـکات بەرانبەر بەندایەتیکردنـی پەروەردگـاری، گوناەو سـەرپێچی کردنی پێش خسـتبێ، کۆششـی کردبێ لەوانـەدا کـە دەبێتە مایـەی توڕەیـیو خەشـمو قینی خوا.
﴿ قَلِيلًا مَّا تَتَذَكَّرُونَ ﴾ واتـە: بیرکردنەوەتـان کەمە، ئەگـەر نا ئەگەر بیرتـان بکردایەتەوە لـە پلـەو پایـەی کاروبـارەکانو چاکـەو خراپـەکان، وە جیـاوازی لەنێـوان چاکـەکارانو خراپـەکاران، ئـەوە هیمـەتو ورەیەکـی بەرزتـان دەبـوو، بایەخی سـوودتان دەدا بەسـەر زیانـداو ڕێنمایـی بەسـەر گومڕایـی، وە کامەرانـی بـەردەوام لـەم دونیا تـەواو بووەدا.

إِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَآتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ
لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٥٩﴾ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِيٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ
إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ
دَاخِرِينَ ﴿٦٠﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ لِتَسْكُنُوا۟
فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبْصِرًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ
أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٦١﴾ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ
خَٰلِقُ كُلِّ شَيْءٍ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴿٦٢﴾
كَذَٰلِكَ يُؤْفَكُ ٱلَّذِينَ كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٦٣﴾
ٱللَّهُ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً
وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَرَزَقَكُم مِّنَ
ٱلطَّيِّبَٰتِ ۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ ۖ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ
ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦٤﴾ هُوَ ٱلْحَيُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱدْعُوهُ مُخْلِصِينَ
لَهُ ٱلدِّينَ ۗ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦٥﴾ ۞ قُلْ إِنِّي
نُهِيتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَمَّا جَآءَنِيَ
ٱلْبَيِّنَٰتُ مِن رَّبِّي وَأُمِرْتُ أَنْ أُسْلِمَ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦٦﴾

**(٥٩):** ﴿إِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَآتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا﴾ (واتە: بەڕاستی ڕۆژی دوایی دێت هیچ گومانی تێدا نیە) پێغەمبەران هەواڵیان پێداوە، ئەوانەی کە ڕاستگۆترینی دروستکراوەکانن، وە کتێبە ئاسمانیەکانیش دانیان پێدا ناوە، کە هەموو هەواڵەکانیان لەوپەڕی پلەبەندی ڕاستیدایە، وە ئەوانەیشی بەچاو دەبینرێن، لەگەڵ ئایەتو نیشانە گەردوونیەکاندا بەڵگەن لەسەری ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ (بەڵام زۆربەی خەڵکی بڕوا ناهێنن) لەگەڵ هەموو ئەمانەدا، کە تەواوی بە ڕاست دانانو ملکەچبوون پێویست دەکات.

**(٦٠):** ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِيٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴿٦٠﴾﴾:

﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِيٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ﴾ واتە: پەروەردگارتان فەرموویەتی: لێم بپاڕێنەوە وەڵامتان دەدەمەوە، ئەمە لە بەزەیی خوایە بە بەندەکانیو نیعمەتە مەزنەکانێتی، کاتێ بانگی کردن بۆ لای ئەوەی کە چاکی ئاینو دنیایانی تێدایە، وە فەرمانی پێکردن بە پاڕانەوە لێی: پاڕانەوەی پەرستشو پاڕانەوەی داواکردن، وە بەڵێنی پێدان کە لێیان وەربگرێ، وە هەڕەشەی کرد لەوەی خۆی بەگەورە دەزانێ لە ئاستیدا، بۆیە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾ واتە: (بە ڕاستی ئەوانەی خۆ بەگەورە دەزانن کە بمپەرستن دەچنە دۆزەخەوە) بەزەلیلیو سەرشۆڕی، سزاو ئیهانەو سەرزەنشتکردنیان لەسەر کۆدەبێتەوە، وەک پاداشتێک لەسەر لووت بەرزیان.

**(٦١-٦٥):** ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبْصِرًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٦١﴾ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ خَٰلِقُ كُلِّ شَيْءٍ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴿٦٢﴾ كَذَٰلِكَ يُؤْفَكُ ٱلَّذِينَ كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٦٣﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ ۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ

﴿فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦٤﴾ هُوَ ٱلْحَىُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱدْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ۗ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦٥﴾﴾

سەرنجی ئەم ئایەتە پیرۆزانە بدە کە بەڵگەن لەسەر بەرفراوانی میهرەبانی خوای بەرز، وە چاکەی بێپایانیو پێویستبوونی سوپاسگوزاری کردنیو تەواوی تواناو، مەزنی دەسەڵاتیو، فراوانی موڵکیو، گشتگیری دروستکردنی بۆ هەموو شتەکان، وە تەواوی ژیانیو، وەسفکردنی بە ستایش لەسەر هەموو ئەوەی وەسفی پێکراوە لە سیفاتە تەواوەکان، وە هەموو ئەوەی کردوویەتی لەو کارانەی کە چاکن، وە تەواوی پەروەردگارێتیو تاکو تەنهایی تیایدا، بە ڕاستی هەموو بەڕێوەبردنەکان لە جیهانی سەروو خواروو لە ڕابردوو ئێستاو داهاتوویاندا بە دەستی خوای گەورەن، هیچ کەسێک لە فەرماندا هیچی بەدەست نیەو دەسەڵاتی نیە.

لەوەدا ئەوە دێتە بەرهەم کە خوا ﷻ دروستکەرو پەرستراوە بە تاک تەنها، هیچ کەس شایستەی پەرستن نیە جگە لە ئەو. وەک چۆن هیچ کەس شایەنی پەروەردگارێتی نیە، وە ئەوەش دێتە بەرهەم پڕبوونی دڵەکان بە ناسینی خواو خۆشویستنیو ترسان لێیو هیوابوون پێی.

ئەم دوو کارە کە بریتین لە ناسینی خواو بەندایەتیکردنی ئەو دووانەن کە خوا ﷻ لە پێناویاندا خەڵکی دروستکردوە، ئەو دووانە ئامانجو مەبەستی خوان بۆ بەندەکانی، ئەو دووانە گەیەنەرن بۆ هەموو خێرو چاکەو سەرکەوتنو کامەرانی دونیاو دوارۆژ، ئەو دووانە بەرێزترینی بەخشینی خوان بۆ بەندەکانی. ئەو دووانە ئەوپەڕی لەزەتن بە ڕەهایی. ئەو دووانە ئەگەر نەمێنن هیچ خێرێک نامێنێ، وە هەموو شەڕو خراپەیەک ئامادە دەبێ.

جا داوا دەکەین لە خوا دڵمان پڕ بکات بە ناسینو خۆشویستنی، وە جوڵەی نهێنیو ئاشکرامان تەنها لە پێناو ئەودا بێ، شوێنی فەرمانەکانی بکەوێ، بێگومان ئەو زاتە هیچ داواکردنێ گران نیە بەلایەوە، وە هیچ نهێنیەکیش شاراوە نیە لە لای ئەو.

خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ﴾ واتە: لەبەر ئێوە خوا شەوی کردوە بە تاریکی ﴿لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ﴾ (تا ئارامی تێدا بگرن) لە جوڵەکانتان کە ئەگەر بەردەوام بێت ئەوە زیانی دەبێت، دەچن بۆ لای شوێنی خەوتنەکانتان، خوا خەوتان بەسەردا دێنێ کە دڵو جەستە پێی ئارام دەبن، ئەوەش لە پێویستیەکانی ئادەمیزادە، بەبێ ئەوە ناژی. هەروەها هەموو خۆشەویستێ لە پاڵ خۆشەویستەکەی دەحەسێتەوەو بۆچوونەکانیش یەک دەگرنو سەرقاڵیەکان کەم دەبنەوە.

﴿وَٱلنَّهَارَ مُبْصِرًا﴾ ڕۆژیشی ڕووناک کردوەتەوە بە خۆر کە بەردەوامە لە گەردووندا، جا

لە جێگاکانتان هەڵدەستن بۆ کاروباری ئاینیو دونیاییتان، ئەمە بۆ زیکرو خوێندنی، ئەویش بۆ نوێژەکەی، ئەویش بۆ گەڕان بە دوای زانستو بەدەستهێنانی، ئەویش بۆ کڕینو فرۆشتنی، ئەویش بۆ ئاسنگەریەکەی، یان وێنەی ئەوانەش لە پیشەسازیەکان، ئەمەش بۆ گەشت کردنی بە وشکانیو دەریا، ئەمەش بۆ جوتیاریەکەی، ئەمەش چاککردنی ئاژەڵداریەکانی.

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضۡلٍ ﴾ واتە: (خوا خاوەن چاکەی) مەزنە، وەک چۆن نەناسراو دەبێتە بەڵگە لەسەری، ﴿ عَلَى ٱلنَّاسِ ﴾ (بەسەر خەڵکەوە) کاتێ ئەم نیعمەتانەی پێبەخشیونو جگە لە مانیش، وە نارەحەتیەکانی لەسەر لابردوون، ئەمەش تەواوی سوپاسگوزاریو یادکردنەوەی پێویست دەکات لەسەریان، ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ ﴾ بە هۆی نەفامیو ستەمیانەوە، ﴿ وَقَلِيلٌ مِّنۡ عِبَادِيَ ٱلشَّكُورُ ١٣ ﴾سبأ، (واتە: وە کەمێک لە بەندەکانم شوکرانە بژێرن) ئەوانەی دان دەنێن بە نیعمەتەکانی پەروەردگاریانو ملکەچی خوا دەبنو خۆشیان دەوێ، لە گوێڕایەڵیو ڕەزامەندی خوادا بەکاری دەهێنن.

(٦٢): ﴿ ذَٰلِكُمُ ﴾ واتە: ئەوەی کە کردی کردی، ﴿ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡ ﴾ واتە: تاکو تەنهایە بە پەرستراوێتی، وە بە پەروەردگارێتی، وە پێویست بوونی بە سوپاسگوزاری کردنی لە پەرستراوێتیدا ﴿ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٍ ﴾ (واتە: بەدیهێنەری هەموو شتێکە) چەسپاندنی پەروەردگارێتیە، ﴿ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾ چەسپاندنە کە ئەو شایستەی بەندایەتی کردنە بە تاکو تەنها بە بێ هاوبەش دانان.

پاشان بە ڕوونو ڕەوانی فەرمانی کردوە بە بەندایەتی کردنی، جا فەرموویەتی: ﴿ فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ ﴾ واتە: چۆن لادەدەن لە بەندایەتی کردنی خوای تاکو بێ هاوبەش، دوای ئەوەی بەڵگەتان بۆ ڕوون بوویەوەو ڕێگاتان بۆ ڕۆشن بوویەوە؟!

(٦٣): ﴿ كَذَٰلِكَ يُؤۡفَكُ ٱلَّذِينَ كَانُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجۡحَدُونَ ﴾ واتە: (ئا بەم جۆرە لا دەدرێن ئەوانەی کە دان نانێن بە بەڵگەو نیشانەکانی خوادا) وەکو سزایەک لەسەر ئینکاری کردنیان بە نیشانەکانی خواو دەستدرێژی کردنیان لەسەر پێغەمبەرانی، لادران لە یەکتاپەرستیو دڵسۆزی، وەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَإِذَا مَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٞ نَّظَرَ بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٍ هَلۡ يَرَىٰكُم مِّنۡ أَحَدٖ ثُمَّ ٱنصَرَفُواْۚ صَرَفَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُم بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَفۡقَهُونَ ١٢٧ ﴾التوبة، (واتە: وە کاتێک سووڕەتێک بنێردرێتە خوارەوە دەڕوانن بۆ یەکتری دەڵێن ئایا هیچ کەس دەتان بینێ؟ پاشان بە دزیەوە دەگەڕێنەوە خوا دڵیانی وەرگێڕا لە بڕوا هێنان چونکە بەڕاستی کۆمەڵێکن هیچ تێناگەن).

(٦٤): ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ قَرَارٗا ﴾ واتە: (خوا زاتێکە زەوی بۆ کردوونەتە) نشتیمانێکی ئارام، سازی کردوە بۆ هەموو بەرژەوەندیەکانتان، دەتوانن تیایدا بچێننو بڕوێننو

ماڵی لەسەر دروست بکەنو گەشت بکەنو بمێننەوە، ﴿ وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً ﴾ (واتە: ئاسمانی بۆ کردوون) بە سەقفی زەوی کە ئێوە تیایدا دەژین، خوای گەورە لە ئاسمانەکاندا دایناوە کە ئێوە سوودو کەڵکی پێوەردەگرن لە ڕووناکیەکانو ئەو نیشانانەی کە ڕێنماییان پێدەکرێ لە تاریکیەکانی دەشتو دەریادا.

﴿ وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ ﴾ (واتە: بە جوانترین شێوە ئێوەی دروست کردوە) لە ناو گیاندارانداا شتێک نیە لە ئادەمیزاد جوانتر بێت. وەک خوا فەرموویەتی: ﴿ لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾ التين، (واتە: بە ڕاستی ئێمە ئادەمیزادمان دروستکردوە لە جوانترین شێوە). ئەگەر دەتەوێ جوانی ئادەمیزادت بۆ دەربکەوێ، وە تەواوی کاردروستی خوا تیایدا، تەماشای ئەندام بە ئەندامی بکە، ئایا دەبینی ئەندامێک لە ئەندامەکانی شیاوی جێگایەکی دیکە بێت؟ هەروەها تەماشای ئەو ئارەزوو حەزە بکە کە لە ناو دڵەکان هەندێکیان بۆ هەندێکی دیکەیان، ئایا جگە لە ئادەمیزاد ئەمە بەدی دەکەیت؟ هەروەها تەماشای ئەو تایبەتمەندیە بکە لە عەقڵو ئیمانو خۆشەویستیو ناسین کە ئەمە چاکترین ڕەوشتە کە گونجاوە لەگەڵ جوانترین وێنەدا.

﴿ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ ﴾ (واتە: ئەوەش حەڵاڵو ڕۆزی داون) ئەمە گشتگیرە بۆ هەموو پاکێک لە خواردنو خواردنەوەو ژنهێنانو جلو بەرگو دیمەنی جوانو بیستن، وە جگە لەوانەش لە و پاکانەی خوا ئاسانی کردوە بۆ بەندەکانی، وە هۆکارەکانیشی بۆیان ئاسان کردوە، وە ڕێگری لێکردوون لەو پیسیانەی کە پێچەوانەیەتی، وە زیانی هەیە بۆ جەستەیانو دڵەکانیانو ئاینەکەیان.

﴿ ذَٰلِكُمُ ﴾ ئەو زاتەی کاروبارەکانی ڕێکخستووە، وە نازونیعمەتی ڕشتوە بەسەرتاندا بەم نازونیعمەتانە ﴿ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ ﴾، ﴿ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ واتە: مەزنیو پیرۆزی، وە خێرو چاکەکانی، ئەو زاتەی پەروەردەکەری هەموو جیهانیانە بە نیعمەتەکانی.

(٦٥): ﴿ هُوَ ٱلْحَىُّ ﴾ ئەو زاتەی کە خاوەن ژیانی تەواوە، پێویستکەرە لەوەی سیفاتە خودیەکان پێویست دەکات، کە ژیانی تەواو نابێ بەو سیفاتانە نەبێ، وەک بیستنو بینینو هێزو تواناو زانستو قسەکردن، وە جگە لەوانەش لە سیفەتە تەواوو گەورەکانی ﴿ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾ واتە: هیچ پەرستراوێک نیە بەڕاستی جگە لە خوای بەخشندە، ﴿ فَٱدْعُوهُ ﴾ ئەمەش گشتگیرە بۆ پاڕانەوەی بەندایەتیو پاڕانەوەی داواکردن ﴿ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ﴾ لە هەموو بەندایەتیو پاڕانەوەیەکدا با مەبەستان تەنها خوا بێ، چونکە دڵسۆزی بریتیە لە پەرستن، هەروەکو خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعْبُدُواْ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ ﴿٥﴾ ﴾ البينة، (واتە: لەگەڵ ئەوەشدا

کە فەرمانیان پێنەدرا بوو مەگەر بەوەی کە پەرستشی خوا بکەن بە دڵسۆزی ملکەچی بۆ بکەن خۆیان بەدوور بگرن لە هەموو بیرو باوەڕێکی خوارو خێچ).

﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ واتە: هەموو ستایش‌و سوپاس‌و وەسفەکان (بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان)، بە گوفتار وەک دەربڕینی دروستکراو بە یادکردنی، وە ڕەفتار وەک بەندایەتی کردنیان بۆی، هەموو ئەوانە بۆ خوای تاک‌و تەنهای بێ هاوبەشە، بە هۆی تەواوی لە وەسفەکانی‌و کارەکانی، وە تەواوی نیعمەتەکانی.

(٦٦-٦٨): ﴿ قُلۡ إِنِّي نُهِيتُ أَنۡ أَعۡبُدَ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَمَّا جَآءَنِيَ ٱلۡبَيِّنَٰتُ مِن رَّبِّي وَأُمِرۡتُ أَنۡ أُسۡلِمَ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٦٦﴾ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ ثُمَّ مِنۡ عَلَقَةٖ ثُمَّ يُخۡرِجُكُمۡ طِفۡلٗا ثُمَّ لِتَبۡلُغُوٓاْ أَشُدَّكُمۡ ثُمَّ لِتَكُونُواْ شُيُوخٗاۚ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ مِن قَبۡلُۖ وَلِتَبۡلُغُوٓاْ أَجَلٗا مُّسَمّٗى وَلَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴿٦٧﴾ هُوَ ٱلَّذِي يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۖ فَإِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٦٨﴾ ﴾:

کاتێ کە فەرمانی کرد بە دڵسۆزی بەندایەتی بۆ خوا، باسی بەڵگەی کرد لەسەر ئەوەو ڕوونیکردەوە، ئنجا بە ڕاشکاوی باسی قەدەغەکردنی بەندایەتی جگە لەخوای کرد، جا فەرمووی: ﴿ قُلۡ ﴾ ئەی پێغەمبەر ﷺ بڵێ: ﴿ إِنِّي نُهِيتُ أَنۡ أَعۡبُدَ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ (واتە: بەڕاستی من ڕێگری کراوم لە پەرستنی ئەوانەی ئێوە دەیانپەرستن جگە لە خوا) لە بتەکان‌و هەموو ئەوانەی دەپەرسترێن بێجگە لە خوا.

من هیچ گومانێکم نیە لە کارەکەمدا، بەڵکو لەسەر دڵنیایی‌و بەرچاو ڕوونیم، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ لَمَّا جَآءَنِيَ ٱلۡبَيِّنَٰتُ مِن رَّبِّي وَأُمِرۡتُ أَنۡ أُسۡلِمَ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ (واتە: دوای ئەوەی بەڵگەی ڕوونم بۆ هاتووە لە پەروەردگارمەوە وە فەرمانم پێکراوە کە گەردن کەچ بم) بە دڵ‌و زمان‌و ئەندامانی جەستەم، بە جۆرێ هەموویان ملکەچی بەندایەتی‌و فەرمانی ئەو بن، ئەمە مەزنترین فەرمان پێکراوە بە ڕەهایی، هەروەکو چۆن قەدەغەکردن لە بەندایەتی جگە لە خوا گەورەترین قەدەغە لێکراوە بە ڕەهایی. پاشان ئەم یەکتاپەرستیەی چەسپاندووە بەوەی دروستکەری ئێوەیە، وە قۆناغ بە قۆناغ ئێوەی دروست کردوە.

هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ ثُمَّ مِنۡ عَلَقَةٖ ثُمَّ
يُخۡرِجُكُمۡ طِفۡلٗا ثُمَّ لِتَبۡلُغُوٓاْ أَشُدَّكُمۡ ثُمَّ لِتَكُونُواْ شُيُوخٗاۚ
وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ مِن قَبۡلُۖ وَلِتَبۡلُغُوٓاْ أَجَلٗا مُّسَمّٗى وَلَعَلَّكُمۡ
تَعۡقِلُونَ ﴿٦٧﴾ هُوَ ٱلَّذِي يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۖ فَإِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا فَإِنَّمَا
يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٦٨﴾ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ
فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ أَنَّىٰ يُصۡرَفُونَ ﴿٦٩﴾ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِٱلۡكِتَٰبِ
وَبِمَآ أَرۡسَلۡنَا بِهِۦ رُسُلَنَاۖ فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ ﴿٧٠﴾ إِذِ ٱلۡأَغۡلَٰلُ
فِيٓ أَعۡنَٰقِهِمۡ وَٱلسَّلَٰسِلُ يُسۡحَبُونَ ﴿٧١﴾ فِي ٱلۡحَمِيمِ
ثُمَّ فِي ٱلنَّارِ يُسۡجَرُونَ ﴿٧٢﴾ ثُمَّ قِيلَ لَهُمۡ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡ
تُشۡرِكُونَ ﴿٧٣﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ قَالُواْ ضَلُّواْ عَنَّا بَل لَّمۡ نَكُن
نَّدۡعُواْ مِن قَبۡلُ شَيۡـٔٗاۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٧٤﴾
ذَٰلِكُم بِمَا كُنتُمۡ تَفۡرَحُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَبِمَا كُنتُمۡ
تَمۡرَحُونَ ﴿٧٥﴾ ٱدۡخُلُوٓاْ أَبۡوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ فَبِئۡسَ مَثۡوَى
ٱلۡمُتَكَبِّرِينَ ﴿٧٦﴾ فَٱصۡبِرۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞۚ فَإِمَّا نُرِيَنَّكَ
بَعۡضَ ٱلَّذِي نَعِدُهُمۡ أَوۡ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَيۡنَا يُرۡجَعُونَ ﴿٧٧﴾

(٦٧): جا وەک چۆن بەتاکو تەنهایی دروستی کردوون بە تەنهایش بیپەرستن، فەرموویەتی: ﴿هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن تُرَابٖ﴾ (واتە: ئەو خوایەی کە ئێوەی لە خاک دروست کردوە) ئەویش بە دروستکردنی بنچینەتان، وە باوکتان ئادەم ﷺ ﴿ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ﴾ (پاشان لە دلۆپێک ئاو) ئەمەش سەرەتای دروستبوونی هەموو جۆرێکی مرۆڤایەتیە مادام لە سکی دایکدا بێ، ئاگاداری کردۆتەوە بە سەرەتای لەسەر قۆناغەکانی دیکە، لە خوێن پارە، پاشان پارچە گۆشتێ، پاشان ئێسک، پاشان ڕووح کردن بە بەریدا، ﴿ثُمَّ يُخۡرِجُكُمۡ طِفۡلٗا﴾ (واتە: پاشان لە سکی دایک دەتانهێنێتە دەرەوە)، پاشان بەم شێوەیە دەگوازرێنەوە لە قۆناغەکانی تەمەنتاندا هەتا دەگەن بەوپەری هێز لە رووی عەقڵو جەستە، وە هەموو هێزێکی ئاشکراو نهێنی، ﴿ثُمَّ لِتَكُونُواْ شُيُوخٗاۚ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ مِن قَبۡلُۖ﴾ گەیشتن بە ئەوپەڕی، ﴿وَلِتَبۡلُغُوٓاْ﴾ بەم قۆناغانەی ئەندازە کراوە تا کاتێکی دیاریکراو، کە لای خوا تەمەنتان کۆتایی دێ، ﴿وَلَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ﴾ لە بارودۆختان، تا بزانن ئەو کەسەی قۆناغەکانی تەمەنی بۆتان دیاریکردوە بەم جۆرە خاوەنی دەسەڵاتی تەواوە، ئەو زاتەیە کە نابێ جگە لە ئەو بەندایەتی بۆ بکرێ، بێگومان ئێوە ناتەواون لە هەموو ڕوویەکەوە.

(٦٨): ﴿هُوَ ٱلَّذِي يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۖ﴾ ئەو زاتە تاکو تەنهایە بە ژیاندنو مراندن، هیچ نەفسێک بە هۆکارو بەبێ هۆکار نامرێ بەبێ مۆڵەتی ئەو نەبێ، ﴿وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٖ وَلَا يُنقَصُ مِنۡ عُمُرِهِۦٓ إِلَّا فِي كِتَٰبٍۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ﴿١١﴾﴾ فاطر، (واتە: وە هیچ تەمەن درێژ کراوێ تەمەنی درێژ ناکرێ، وە لە تەمەنی کەم ناکرێ، مەگەر لە کتێبێکدا نووسراوە بەڕاستی ئەو کارە بۆ خواناسانە).

﴿ فَإِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا ﴾ گــەورەو بــە نــرخ بــێ، یــان بــە نــرخ، ﴿ فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴾ ڕەتکردنــەوە لــەو بڕیــارەدا نیــە، وە دووبــارە وتنــەوەو ڕێگــری کردنیــش نیــە.

(٦٩-٧٦): ﴿ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ أَنَّىٰ يُصۡرَفُونَ ٦٩ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِٱلۡكِتَٰبِ وَبِمَآ أَرۡسَلۡنَا بِهِۦ رُسُلَنَاۖ فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ ٧٠ إِذِ ٱلۡأَغۡلَٰلُ فِيٓ أَعۡنَٰقِهِمۡ وَٱلسَّلَٰسِلُ يُسۡحَبُونَ ٧١ فِي ٱلۡحَمِيمِ ثُمَّ فِي ٱلنَّارِ يُسۡجَرُونَ ٧٢ ثُمَّ قِيلَ لَهُمۡ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡ تُشۡرِكُونَ ٧٣ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ قَالُواْ ضَلُّواْ عَنَّا بَل لَّمۡ نَكُن نَّدۡعُواْ مِن قَبۡلُ شَيۡـٔٗاۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٧٤ ذَٰلِكُم بِمَا كُنتُمۡ تَفۡرَحُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَبِمَا كُنتُمۡ تَمۡرَحُونَ ٧٥ ٱدۡخُلُوٓاْ أَبۡوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ فَبِئۡسَ مَثۡوَى ٱلۡمُتَكَبِّرِينَ ٧٦ ﴾

﴿ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ﴾ (واتــە: ئایــا ســەرنجی ئەوانــەت نــەداوە ســەبارەت بــە ئایەتەکانــی خــوا دەمــە قاڵــێ دەکــەن) کــە زۆر ڕوونو ڕەوانــە، سەرســوور دەمێنــێ لــە حاڵــی خراپــی ئــەوان ﴿ أَنَّىٰ يُصۡرَفُونَ ﴾ چــۆن لێــی لادەدرێــن؟ وە بــۆ کــوێ دەڕۆن دوای ڕوونکردنــەوەی تــەواو؟ ئایــا ئایــەتو نیشــانەی ڕوون دەبینــن دژی ئایەتەکانــی خوابــێ؟ نەخێــر ســوێند بــە خــوا. یــان گومانێــک بەدیدەکــەن گونجــاو بــێ لەگــەڵ هــەواو ئارەزوویــان، خۆیانــی پــێ پــاک بکەنــەوە بــە هــۆی پووچەکانیانــەوە؟ خراپترین شــت بــوو کــە کردیــان بــە بەڵگــەو هەڵیــان بــژارد، بــە درۆدانانیــان بــەو کتێبــەی لــە لایــەن خــواوە بۆیــان هــات، بــەوەی خــوا پێغەمبەرانــی بۆیــان نــاردوە، کــە چاکتریــنو ڕاســتگۆترینی نــاو بەدیهێنراوەکانــن، وە مەزنترینیانــن لــە ڕووی ژیریــەوە.

(٧٠-٧٢): جــا ئەوانــە هیــچ پاداشــتێکیان بــۆ نیــە جگــە لــە ئاگــری بەتیــن نەبــێ، لەبــەر ئەمەیــە خــوا ﷻ هەڕەشــەی لێکــردوون بــە ســزادانیان بــەو ئاگــرە، وەک فەرموویەتــی: ﴿ فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ ٧٠ إِذِ ٱلۡأَغۡلَٰلُ فِيٓ أَعۡنَٰقِهِمۡ ﴾ کــە بــە هیــچ شــێوەیەک ناتوانــن جوڵــە بکــەن ﴿ وَٱلسَّلَٰسِلُ ﴾ کــە پێــی دەبەســترێنەوە ئــەوانو شــەیتانەکانیان ﴿ يُسۡحَبُونَ ٧١ فِي ٱلۡحَمِيمِ ﴾ واتــە: (ڕادەکێشــرێن) بەنــاو ئاوێکــی زۆر گەرمــی کــوڵاودا، ﴿ ثُمَّ فِي ٱلنَّارِ يُسۡجَرُونَ ﴾ ئاگرێکــی زۆر توونــد دەیانســووتێنێ. پاشــان سەرزەنشــت دەکرێــن لەســەر هاوبەشــدانانو درۆکردنیــانو پێیــان دەوتــرێ:

(٧٣-٧٤): ﴿ لَهُمۡ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡ تُشۡرِكُونَ ٧٣ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ (واتــە: لــە کوێــن ئــەو هاوبەشــانەی بــۆ خواتــان دادەنــا × بێجگــە لــە خــوا) ئایــا ســوودیان پێگەیانــدن، یــان ڕێگــری هەندێ ســزایان کــرد لەســەرتان؟ ﴿ قَالُواْ ضَلُّواْ عَنَّا ﴾ واتــە: دیــار نەمــانو گــووم بــوونو ئامادە نەبــوون، ئەگــەر ئامــادەش بوونایــە هیــچ ســوودێکیان نەدەبــوو، پاشــان ئەوانــە نکوڵــی

دەکەنو دەڵێن: ﴿بَل لَّمۡ نَكُن نَّدۡعُواْ مِن قَبۡلُ شَيۡـٔٗاۚ﴾ (واتە: وانیە بەڵکو ئێمە لە دونیا بێجگە لە خوا شتێکمان نەدەپەرست) دەگونجێ مەبەستیان بەوە نکوڵی کردن بێ، وە وا گومان ببەن ئەوە سوودو کەڵکیان پێ دەگەیەنێ.
وە دەگونجێ -ئەمە لە پێشترە- مەبەستیان لەو قسەیەدا چەسپاندنی پووچیو بەتاڵی پەرستراوێتی ئەوانەیە کە دەیانپەرستن، وە بێگومان خوا ﷻ هاوبەشی نیە لە حەقیقەتدا، بەڵکو ئەوان گومراو هەڵە بوون بە بەندایەتی کردنی نەبوونی پەرستراوێتی، وتەی خوا ﷻ دەبێتە بەڵگە بۆی: ﴿كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ واتە: بەهەمان شێوە ئەو گومراییەی کە لە دونیا لەسەری بوون، گومراییەکی روونە بە لای هەموو کەسێکەوە، تەنانەت خودی خۆیان دانیان بە پووچیو بەتاڵی ئەوەدا دانا لە رۆژی دواییدا، وە بۆیان روون بوویەوە مانای وتەی خوا ﷻ ﴿وَمَا يَتَّبِعُ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُرَكَآءَۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ ٦٦﴾يونس، (واتە: پەیرەویان نەکردوە ئەوانەی بێجگە لە خوا دەپەرستن پەرستراوانێ هاوبەشانێ بۆ خوا ئەوانە تەنها شوێن گومان کەوتوون)، وە وتەی خوا ﷻ بەڵگەیە لەسەری: ﴿وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يَكۡفُرُونَ بِشِرۡكِكُمۡۚ ١٤﴾فاطر، (واتە: وە لە رۆژی قیامەتیشدا بێبەروا دەبن بە هاوبەش دانانەکەتانو بەدرۆتان دەخەنەوە)، ﴿وَمَنۡ أَضَلُّ مِمَّن يَدۡعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَن لَّا يَسۡتَجِيبُ لَهُۥٓ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ ٥﴾الأحقاف، (واتە: کێ گومراترە لەو کەسەی کە هاوار لە غەیری خوا بکات کە وەڵامی ناداتەوە تا رۆژی دوایی).
(٧٥): بە خەڵکانی دۆزەخ دەوترێ: ﴿ذَٰلِكُم﴾ ئەو سزایەی کە جۆراو جۆرە بەسەرتانەوە، ﴿بِمَا كُنتُمۡ تَفۡرَحُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَبِمَا كُنتُمۡ تَمۡرَحُونَ﴾، واتە: شادو دڵخۆش دەبن بەو پووچو بەتاڵەی کە ئێوە لەسەرین، وە بەو زانستەی دژایەتی زانستی پێغەمبەرانتان پێدەکرد، وە فیزو کەشخەتان دەکرد بەسەر بەندەکانی خواوە، بە گومراییو دژایەتیکردنو ستەمو سەرپێچیکردنەوە، هەروەکو خوا ﷻ لە کۆتایی ئەم سوورەتەدا فەرموویەتی: ﴿فَلَمَّا جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَرِحُواْ بِمَا عِندَهُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ ٨٣﴾غافر، (واتە: جا کاتێ پێغەمبەرەکانیان بە بەڵگە روونەکانەوە هاتنە لایان دڵخۆش بوو بەو زانینەی هەیانبوو) هەروەک گەلی قاروون بە قاروونیان وت: ﴿لَا تَفۡرَحۡۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡفَرِحِينَ ٧٦﴾القصص، (واتە: کاتێ ئیماندارانی گەلەکەی پێیان وت دڵخۆش مەبە بەو سامانە بێگومان خوا ئەو کەسانەی خۆش

نـاویٚ دڵخۆشـن وە لەخۆبایـی بـوون بـە سـەروەت و سـامانەوە). ئەمـە دڵخۆشـیەکی سەرزەنشتکراوە کـە شایستەی سزایە بـە پێچەوانەی دڵخۆشی ستایشکراو کـە خوا ﷻ دەربـارەی فەرموویەتـی: ﴿ قُلۡ بِفَضۡلِ ٱللَّهِ وَبِرَحۡمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلۡيَفۡرَحُواْ ﴾يونس، (واتـە: ئـەی موحەممـەد ﷺ بڵـێ: هـەر بـە هـۆی چاکـەو میهرەبانـی خواوەیـە جـا کەواتـە بـا بـەوە دڵخـۆش بـن)) ئەویـش دڵخۆشـیە بـە زانسـتی بەسـوودوو کـردەوەی چـاک.

(٧٦): ﴿ ٱدۡخُلُوٓاْ أَبۡوَٰبَ جَهَنَّمَ ﴾ واتـە: (دەی لـە دەرگاکانـی دۆزەخـەوە بچنـە ژوورەوە) هـەر چینـێ لـە چینەکانـی بـە ئەنـدازەی کردەوەکـەی ﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَا ﴾ هەرگیـز لێـی دەرناچـن ﴿ فَبِئۡسَ مَثۡوَى ٱلۡمُتَكَبِّرِينَ ﴾ (واتـە: ئـای چەنـد خراپـە شـوێنی خۆبەزلزانـان) جێگایـەک تیایـدا سەرشـۆڕن، لۆمـەو سەرزەنشـت دەکرێـن، وە زیندانـیو سـزا دەدرێن، جێگایـان دەگـۆڕێ لـە نێـوان زۆر گەرمـیو زۆر سـاردیدا.

(٧٧): ﴿ فَٱصۡبِرۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞۚ فَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعۡضَ ٱلَّذِي نَعِدُهُمۡ أَوۡ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَيۡنَا يُرۡجَعُونَ ٧٧ ﴾:
﴿ فَٱصۡبِرۡ ﴾ واتـە: (خۆڕاگربـە) ئـەی پێغەمبـەر ﷺ لەسـەر بانگـەوازی گەلەکـەت، ئەوەشـی تووشـت دەبـێ لـە لایـەن ئەوانـەوە لـە ئـازار، وە پشـت ببەسـتە لەسـەر خۆڕاگریـت بـە ئیمانەکـەت ﴿ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ ﴾ (بێگومـان بەڵێنـی خـوا ڕاسـتە) ئاینەکـەی سـەردەخات و وشـەی خـۆی بـەرز دەکاتـەوەو پێغەمبەرەکانـی سـەردەخات لـە دونیـاو دوارۆژدا، هەروەهـا پشـت بـەو ببەسـتە بـە چاوەڕوانـی سـزا بـە دوژمنەکانـت لـە دنیـاو دوارۆژدا، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ فَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعۡضَ ٱلَّذِي نَعِدُهُمۡ ﴾ لـە دونیـادا، جـا ﴿ أَوۡ نَتَوَفَّيَنَّكَ ﴾ (یـان تـۆ دەمرێنیـن) پێـش سـزادانی ئـەوان ﴿ فَإِلَيۡنَا يُرۡجَعُونَ ﴾ جـا سـزایان دەدەیـن لەسـەر کردەوەکانیـان ﴿ وَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱللَّهَ غَٰفِلًا عَمَّا يَعۡمَلُ ٱلظَّٰلِمُونَ ٤٢ ﴾إبراهیم، (واتـە: وا مەزانـە خـوا بـێ ئاگایـە لـەوەی کـە سـتەمکاران دەیکـەن)، پاشـان دڵـی دایـەوەو خۆڕاگـری کـرد بـە باسـکردنی بـرا پێغەمبەرەکانـی، فەرمـووی:

وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ مِنْهُم مَّن قَصَصْنَا عَلَيْكَ
وَمِنْهُم مَّن لَّمْ نَقْصُصْ عَلَيْكَ ۗ وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِيَ
بِآيَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ ۚ فَإِذَا جَاءَ أَمْرُ اللَّهِ قُضِيَ بِالْحَقِّ وَخَسِرَ
هُنَالِكَ الْمُبْطِلُونَ ﴿٧٨﴾ اللَّهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَنْعَامَ
لِتَرْكَبُوا مِنْهَا وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٧٩﴾ وَلَكُمْ فِيهَا مَنَافِعُ
وَلِتَبْلُغُوا عَلَيْهَا حَاجَةً فِي صُدُورِكُمْ وَعَلَيْهَا وَعَلَى
الْفُلْكِ تُحْمَلُونَ ﴿٨٠﴾ وَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ فَأَيَّ آيَاتِ اللَّهِ
تُنكِرُونَ ﴿٨١﴾ أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ
كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَانُوا أَكْثَرَ مِنْهُمْ وَأَشَدَّ
قُوَّةً وَآثَارًا فِي الْأَرْضِ فَمَا أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ
﴿٨٢﴾ فَلَمَّا جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَرِحُوا بِمَا عِندَهُم مِّنَ
الْعِلْمِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ ﴿٨٣﴾ فَلَمَّا رَأَوْا
بَأْسَنَا قَالُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَحْدَهُ وَكَفَرْنَا بِمَا كُنَّا بِهِ
مُشْرِكِينَ ﴿٨٤﴾ فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَانُهُمْ لَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا ۖ سُنَّتَ
اللَّهِ الَّتِي قَدْ خَلَتْ فِي عِبَادِهِ ۖ وَخَسِرَ هُنَالِكَ الْكَافِرُونَ ﴿٨٥﴾

**(٧٨):** ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ مِنْهُم مَّن قَصَصْنَا عَلَيْكَ وَمِنْهُم مَّن لَّمْ نَقْصُصْ عَلَيْكَ ۗ وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِيَ بِآيَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ ۚ فَإِذَا جَاءَ أَمْرُ اللَّهِ قُضِيَ بِالْحَقِّ وَخَسِرَ هُنَالِكَ الْمُبْطِلُونَ ﴿٧٨﴾ ﴾:

﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ ﴾ (واتە: بەڕاستی پێغەمبەرانێکی) زۆرمان ناردووە بۆ لای گەلەکانیان، بانگیان دەکردنو ئارامیان دەگرت لەسەر ئازاردانیان ﴿ مِنْهُم مَّن قَصَصْنَا عَلَيْكَ ﴾ بەسەرهاتی (هەندێکیانمان بۆ باس کردی)، ﴿ وَمِنْهُم مَّن لَّمْ نَقْصُصْ عَلَيْكَ ﴾ هەموو پێغەمبەران ئەرک پێسپێردراون، هیچ شتێکیان بە دەست نیە لە کاروباردا.

بۆ هیچ یەکێک لە ئەوان نیە ﴿ أَن يَأْتِيَ بِآيَةٍ ﴾ (نیشانەیەک لە نیشانەکان بهێنێ) لەو ئایەتو نیشانانەی بیستراوو عەقڵین، ﴿ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ ﴾ واتە: تەنها بە ویستو فەرمانی خوا نەبێ.

جا پێشنیار کردنی پێشنیارکەران لەسەر پێغەمبەران بە هێنانی ئایەتەکان، ستەمو لەسنوور دەرچوونو بەدرۆدانانە، دوای ئەوەی خوا پشتیوانی لێکردن بەو ئایەتو نیشانانەی کە بەڵگەن لەسەر ڕاستیانو ڕاستی ئەوەی هێناویانە ﴿ فَإِذَا جَاءَ أَمْرُ اللَّهِ ﴾ (واتە: جا کاتێ فەرمانی خوا هات) بە جیا کردنەوە لە نێوان پێغەمبەرانو دوژمنەکانیاندا، وە سەرکەوتن ﴿ قُضِيَ ﴾ لە نێوانیاندا ﴿ بِالْحَقِّ ﴾ (بەو حەقەی) کە لەوێدا هەیەو گونجاوە لەگەڵ ڕاستیدا، بە ڕزگار کردنی پێغەمبەرانو شوێنکەوتوانیانو لە ناو بردنی بەدرۆدانەران، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ وَخَسِرَ هُنَالِكَ ﴾ واتە: (زەرەرمەند دەبن لەوێدا) لە کاتی دادوەری کردنەکەدا، ﴿ الْمُبْطِلُونَ ﴾ ئەوانەی وەسفیان پووچو بەتاڵەو ئەوەیشی هێناویانە لە زانستو کردەوە بەتاڵو پووچە، وە ئامانجو مەبەستیشیان هەر پووچە.

جا با ئەو دوێنراوانە ئاگاداری ئەوە بن لە بەردەوام بوونیان لەسەر پووچیو بەتاڵیان،

دوایـی زەرەرمەنـد دەبـن هەروەکـو چۆن ئـەوان زەرەرمەنـد بـوون، چونکە ئەمانـە لەوانی پێشـوویان چاکتـر نەبـوون، وە هیچ بەربیوونێـکان بۆ نیە لـە کتێبەکانی پێشـوودا بە ڕزگار بوون.

(٧٩-٨١): ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَنْعَٰمَ لِتَرْكَبُوا۟ مِنْهَا وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٧٩﴾ وَلَكُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ وَلِتَبْلُغُوا۟ عَلَيْهَا حَاجَةً فِى صُدُورِكُمْ وَعَلَيْهَا وَعَلَى ٱلْفُلْكِ تُحْمَلُونَ ﴿٨٠﴾ وَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ فَأَىَّ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ تُنكِرُونَ ﴿٨١﴾ ﴾:

﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَنْعَٰمَ لِتَرْكَبُوا۟ مِنْهَا وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴾ خوا ﷻ منەت دەکات بەسـەر بەندەکانیـدا بـەوەی بـۆی داناون لـە ئاژەڵـەکان، کە کۆمەڵێ نـازو نیعمەت لە خـۆ دەگرێ:

یەکەم: سوودی سواربوون لەسەریانو هەڵگرتنی پێویستیەکانیان.

دووەم: سوودی خواردن لە گۆشتەکانیانو خواردنەوە لە شیرەکانیان.

سـێیەم: سـوودی خۆ گـەرم کردنەوە، وە دروسـتکردنی کەرەسـتەو کەلو پـەل لە خوریو کوڵـکو مووەکانیـان، وە جگـە لەوانەش لە سـوودەکانی دیکە.

(٨٠): ﴿ وَلِتَبْلُغُوا۟ عَلَيْهَا حَاجَةً فِى صُدُورِكُمْ ﴾ (واتـە: تـا بە هۆی ئەوانەوە بگەنە پێویسـتیەک کـە لـە دڵو دەروونتاندایـە) لە گەیشـتن بە وڵاتـە دوورە دەسـتەکان، وە دەسـتەبەر بوونی دڵخۆشـی بە هۆی ئەمانەوە، وە دڵخۆشـی بە مانەوە لەلایان ﴿ وَعَلَيْهَا وَعَلَى ٱلْفُلْكِ تُحْمَلُونَ ﴾ لەسـەر پشـتی وڵاخـە دەشـتیەکان، وە کەشـتیە دەریاییەکان، خـوا ﷻ هەڵتان دەگـرێ ئەو زاتـەی کـە ڕامی هێنـاوە بۆتان، وە ڕێکی خسـتووە ئەوەی ڕێکی خسـتووە لـە هۆکارەکان کە تـەواو نابـێ تەنها بـەوە نەبێ.

(٨١): ﴿ وَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ ﴾ (واتـە: خـوا زۆر نیشـانەی خۆیتان نیشـان دەدات) کـە بەڵگەن لەسـەر تـاکو تەنهایی ئـەو ناوەکانـیو سـیفاتەکانی، ئەمەش لـە مەزنتریـن نیعمەتەکانێتی کـە نیشـانی بەندەکانـی داوە، ئایەتـە دەروونیـەکانو ئایەتـە گەردوونیـەکان، وە نیعمەتـە درەوشـاوەکانیو بۆیانـی ژمـاردووە، تا بیناسـنو سوپاسـگوزاری بکـەنو یـادی بکەنەوە، ﴿ فَأَىَّ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ تُنكِرُونَ ﴾ واتـە: کام ئایـەت لە ئایەتەکانـی دانی پێدانانێـن؟ بێگومان ئێوە جێگیـر بووە لـە لاتان کە هەمـوو نیشـانەو نیعمەتەکان لەلایـەن خواوەیە، هیـچ دەرفەتێک نەمـاوە بـۆ نکوڵی کـردن، وە پشـت تێکردنیان.

بەڵکـو پێویسـت بووە بۆ ژیـرو خاوەن دڵـەکان تواناکانیـان بەکاربێننو لە کۆشـش کردن لـە گوێڕایەڵیـداو ملکەچ بوون لـە خزمەتیداو یەکلا بوونـەوە بۆ لای.

(٨٢-٨٥): ﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَانُوٓا۟ أَكْثَرَ مِنْهُمْ وَأَشَدَّ قُوَّةً وَءَاثَارًا فِى ٱلْأَرْضِ فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٨٢﴾ فَلَمَّا جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَـٰتِ فَرِحُوا۟ بِمَا عِندَهُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٨٣﴾ فَلَمَّا رَأَوْا۟ بَأْسَنَا قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥ وَكَفَرْنَا بِمَا كُنَّا بِهِۦ مُشْرِكِينَ ﴿٨٤﴾ فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَـٰنُهُمْ لَمَّا رَأَوْا۟ بَأْسَنَا ۖ سُنَّتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى قَدْ خَلَتْ فِى عِبَادِهِۦ ۖ وَخَسِرَ هُنَالِكَ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿٨٥﴾ ﴾

﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾ خوا ﷻ بە درۆ دانەرانی پێغەمبەرانیان هاندەدات لەسەر گەڕان بەناو زەویدا، بە جەستەو دڵەکانیانو پرسیار کردن لە جیهانیان ﴿ فَيَنظُرُوا۟ ﴾ تا تەماشا بکەن، تەماشاکردنێکی بیرکردنەوەو سەرنجدانو بەڵگە هێنانەوە، نەک تەماشاکردنێکی بێئاگایی‌و فەرامۆشکردن ﴿ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾ (واتە: سەرەنجامی کەسانێ کە بەر لەوان بوون چۆن بووە) لە گەلەکانی پێشوو، وەک گەلی عادو ثمودو جگە لەوانیش، لەوانەی کە لەمان زۆر بەهێزترو بە تواناتر بوون، وە شوێنەواریشیان لە زەویدا زیاتر بوو لە خانوو باڵەخانە قایمو پتەوەکان، وە باخو باخاتی جوانو کشتوکاڵی زۆر، ﴿ فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴾ (واتە: جا ئەوەی کردبوویان لە دونیا سوودی پێنەگەیاندن) کاتێ فەرمانی خوایان بۆ هات، هێزو توانایان هیچ سوودێکی پێنەگەیاندن، نە بە ماڵەکانیان ڕزگاریان بوو، وە نە شوێنە قایمەکانیان پاراستنی.

(٨٣): پاشان باسی تاوانی گەورەیانی کردوە، جا فەرموویەتی: ﴿ فَلَمَّا جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَـٰتِ ﴾ (واتە: جا کاتێ پێغەمبەرەکانیان بە بەڵگە ڕوونەکانەوە هاتنە لایان) لە کتێبە ئاسمانیەکانو، وە موعجیزە لە ڕادەبەدەرە مەزنەکانو زانستی بەسوود، کە ڕوونکەرەوەی هیدایەت بوو لە گومڕایی‌و حەق بوو لە ناحەق، ﴿ فَرِحُوا۟ بِمَا عِندَهُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ ﴾ (واتە: دڵیان خۆش بوو بەو زانینەی هەیانبوو) کە پێچەوانەی ئاینی پێغەمبەران بوو.

بێگومان ئەوەی زانراوە دڵخۆشبوونیان بەو زانینەیان بەڵگەیە لەسەر ئەوپەڕی ڕەزامەندی‌و پەیوەست بوونیان پێیەوە، وە دژایەتیکردنی ئەو حەقو ڕاستیەی کە پێغەمبەران پێی هاتوون، پووچەکانی خۆیان بە حەق دادەنا، ئەمەش گشتگیرە بۆ هەموو ئەو زانستانەی کە پەیامی پێغەمبەران هەڵدەوەشێننەوە.

وە لە پێشترینیان لەمەدا زانستی فەلسەفەو مەنتقی یۆنانیە، کە زۆرێک لە ئایەتەکانی قورئانی پێ ڕەتکراوەتەوە، وە ڕێزی لەناو دڵەکاندا کەم کردۆتەوە، وە بەڵگە دڵنیاکەرەوەو یەکلاکەرەوەکانی کردۆتە بەڵگەیەکی قسەو ئاخاوتن کە هیچ سوودێکی

نیـە لـە دڵنیاییـدا، وە عەقڵـی گەمـژەکانو شـوێنکەوتووانی پووچـی پێشخسـتووە بەسـەر ئایەتەکانـی قورئانـدا، ئەمـەش لـە ئەوپـەڕی گومڕایـیو بێبڕواییە لـە ئایەتەکانـی خوا، وە دژایەتـی کـردنو هەڵوەشـانەوەیان، خوا پشـتیوانە.

﴿ وَحَاقَ بِهِم ﴾ واتـە: دابـەزی ﴿ مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴾ (واتـە: ئـەوەی ئـەوان گاڵتەیـان پێدەکـرد) لە سـزا.

(٨٤): ﴿ فَلَمَّا رَأَوْا۟ بَأْسَنَا ﴾ واتـە: (ئینجـا کاتـێ) سـزای ئێمەیـان بینـی، دانیـان پێـدا نـا کاتـێ دانپێدانـان هیـچ سـوودێکی نەبـوو بۆیـان ﴿ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥ وَكَفَرْنَا بِمَا كُنَّا بِهِۦ مُشْرِكِينَ ﴾ (واتـە: بڕوامـان بـە خـوای تـاکو تەنهـا هێنـا، وە بێبڕوایـن بـەو شـتانەی کردبوومانـە هاوبەشـی خـوا) لـە بتـەکان، وە بەریـنو دەسـتبەرداری هەموو ئەوانـە بووین پێچەوانـەی پێغەمبەرانـن لـە زانسـت یان کـردەوە.

(٨٥): ﴿ فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَـٰنُهُمْ لَمَّا رَأَوْا۟ بَأْسَنَا ﴾ واتـە: جـا بڕواهێنانەکەیـان هیـچ سـوودێکی نەبـوو بۆیـان) لـەو کاتەی سـزای ئێمەیان بینـی، ئا ئەمـەش ﴿ سُنَّتَ ٱللَّهِ ﴾ نەریتـی (خوایە) ﴿ ٱلَّتِى قَدْ خَلَتْ فِى عِبَادِهِۦ ﴾ (واتـە: هەروابوو پێشـتر لەگـەڵ بەندەکانیـدا) بەدرۆدانەران کاتێ سـزای بـە تینی خوایان بـۆ دادەبـەزێ، ئەگەر بـڕوا بهێنن، ئـەوە بڕواهێنانیان تـەواو نیە، وە ڕزگاریشـیان نابێ لە سـزا.

ئەویـش بـە هۆی ئـەوەی بڕواهێنانـی ناچاری بوو، ئـەوان ناچار بـوون پێـی، وە بڕواهێنانی بینیـن بوو بە چـاو، بەڵکو بڕواهێنانی بە سـوود کـە خاوەنەکەی ڕزگـار دەکات، بڕواهێنانی ویسـتو ئـارەزووە کـە بڕوابوونـە بـە پەنهـان، ئەویـش پێـش بوونـی ئامـاژەو هێماکانی سـزا. ﴿ وَخَسِرَ هُنَالِكَ ﴾ واتـە: لـە کاتـی لەناوچـوونو چەشـتنی سـزا ﴿ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴾ ئاینو دونیـاو دوارۆژیـان. تەنهـا خەسـارەتو زەرەرمەندی بـەس نیە لـەو ماڵەدا، بەڵکـو دەبێ لەو زەرەرمەندیـەدا بەدبەخـت بێت لە سـزای بـە ئێشو مانـەوەی هەمیشـەیی تیایدا.

تەفسیری سوورەتی (غافر) تەواو بوو.


سورة فصلت
بسم الله الرحمن الرحيم
حمٓ (١) تنزيل من الرحمن الرحيم (٢) كتب فصلت ءايته قرءانا عربيا لقوم يعلمون (٣) بشيرا ونذيرا فأعرض أكثرهم فهم لا يسمعون (٤) وقالوا قلوبنا في أكنة مما تدعونا إليه وفي ءاذاننا وقر ومن بيننا وبينك حجاب فاعمل إننا عملون (٥) قل إنما أنا بشر مثلكم يوحى إلي أنما إلهكم إله وحد فاستقيموا إليه واستغفروه وويل للمشركين (٦) الذين لا يؤتون الزكوة وهم بالآخرة هم كفرون (٧) إن الذين ءامنوا وعملوا الصلحت لهم أجر غير ممنون (٨) قل أئنكم لتكفرون بالذي خلق الأرض في يومين وتجعلون له أندادا ذلك رب العلمين (٩) وجعل فيها رواسي من فوقها وبرك فيها وقدر فيها أقوتها في أربعة أيام سواء للسائلين (١٠) ثم استوى إلى السماء وهي دخان فقال لها وللأرض ائتيا طوعا أو كرها قالتا أتينا طائعين (١١)

## تەفسیری سوورەتی (فصلت)
## مەککیە (٥٤) ئایەتە
## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٢): ﴿ حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلٌ مِّنَ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٢﴾ ﴾:

خـوا ﷻ هەواڵ دەدات بـە بەندەکانی کە ئەم کتێبە گـەورەو قورئانـە جوانە ﴿ تَنزِيلٌ ﴾ هاتـووە واتـە: ﴿ مِّنَ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ ئـەو زاتـەی میهرەبانـی هەمـوو شـتێکی داپۆشـیوە، لـە مەزنترینـی میهرەبانیەکانیو گەورەترینیـان دابەزاندنی ئـەم کتێبەیە، کە بە هۆیەوە زانسـتو هیدایـەتو ڕووناکیو شـیفاو ڕەحمـەتو خێرێکـی زۆر بەدەسـت هاتووە، کـە لـە گەورەترینـی نیعمەتەکانیەتی بەسـەر بەندەکانیـەوە، ئەویـش ڕێگـای بەختەوەریە لـە هـەردوو ماڵی دونیـاو دوارۆژ.

(٣): ﴿ كِتَٰبٌ فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٣﴾ ﴾:

﴿ كِتَٰبٌ ﴾ پاشـان ستایشـی کتێـب دەکات بـە تـەواوی ستایشـکردنو فەرموویەتـی: ﴿ فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥ ﴾ واتـە: درێژەی بە هەموو شـتێک داوە لە هەمـوو جۆرەکانی هەریەکەو بـە پێـی خـۆی، ئەمـەش ڕوون کردنـەوەی تـەواو پێویسـت دەکات، وە جیاکردنـەوە لـە نێـوان هەمـوو شـتێکداو جیاکردنـەوەی ڕاسـتیەکانیش ﴿ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا ﴾ واتـە: بـە زمانی پـاراو تەواوترینـی زمانـەکان، دەقەکانـی ڕوون کراوەتـەوەو دانـراوە بـە عەرەبی ﴿ لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴾ واتـە: بـۆ ئـەوەی ماناکـەی ڕوون بێتـەوە بۆیان، وەکـو چۆن فەرمایشـتەکەی ڕوون بووەتـەوەو هیدایەتـی لـە گومڕایی ئاشـکرا کـردوە، وە سەرلێشـێواوی لـە ژێری. بـەڵام ئـەو نەفامانـەی کـە هیدایـەتو ڕێنمایی هیچیـان بۆ زیاد نـاکات جگە لـە گومڕایی نەبـێ، وە ڕوونکردنـەوەش جگە لە کوێری نەبێ، ئەوە فەرمایشـتە کە لەبەر ئـەوان نەهاتووە: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ سَوَآءٌ عَلَيْهِمْ ءَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٦﴾ ﴾ البقرة، (واتـە: بۆ

ئـەوان چـوون یەکە بیانترسـێنیت یان نەیان ترسـێنیت بـڕوا ناهێنن).
(٤): ﴿ بَشِيرًا وَنَذِيرًا فَأَعْرَضَ أَكْثَرُهُمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴿٤﴾ ﴾:
﴿ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ﴾ واتـە: مـژەدەرە بە پاداشـتی بە پەلەو دواخراو، ترسـێنەرە بە سـزاو تۆڵەی بـە پەلـەو دواخراو، وە باسـی کـردوە بە تێرو تەسـەلیو باسـی ئـەو هۆکارو وەسفانەیشـی کـردوە کە مژدەو ترسـاندنیان پێ بەدەسـت دێت، ئەمانەش وەسـفی کتێبن، کەوا پێویسـت دەکات بەدەمیـەوە بچێـت بـە وەرگرتـنو ملکـەچ بـوونو بڕواهێنـانو کـردەوە پێکردن، بـەڵام زۆربـەی خەڵکـی گوێیـان پێنـەداوە وەکو گـوێ پێنەدانـی لووت بـەرزان ﴿ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴾ (واتـە: بۆیـە ئەوان نابیسـتن) بیسـتنی وەرگرتـنو وەڵامدانـەوە، ئەگەرچی بیسـتوویانە بە بیسـتنێک بەڵگەی شـەرعیان لەسـەر پێویسـت بێت.
(٥): ﴿ وَقَالُوا قُلُوبُنَا فِي أَكِنَّةٍ مِمَّا تَدْعُونَا إِلَيْهِ وَفِي آذَانِنَا وَقْرٌ وَمِنْ بَيْنِنَا وَبَيْنِكَ حِجَابٌ فَاعْمَلْ إِنَّنَا عَامِلُونَ ﴿٥﴾ ﴾:
﴿ وَقَالُوا ﴾ ئەوانـەی خۆیـان لـێ دەپاراسـتو روونیـان کردبوویەوە کە هیچ سـوودێکی پێناگەیەنـن داخسـتنی ئـەو دەرگایانـە لێـی ﴿ قُلُوبُنَا فِي أَكِنَّةٍ ﴾ واتـە: (دڵەکانمـان لـە نـاو) چەنـد پەردەیەکـی داخراودایـە ﴿ مِمَّا تَدْعُونَا إِلَيْهِ وَفِي آذَانِنَا وَقْرٌ ﴾ واتـە: (لەوەی تـۆ ئێمـەی بـۆ بانگ دەکـەی وە لـە گوێکانمانـدا) گرانـیو کـەڕی هەیە، بۆیـە هەرگیز نابیسـتین لێـت ﴿ وَمِنْ بَيْنِنَا وَبَيْنِكَ حِجَابٌ ﴾ (واتـە: لـە نێوانـی ئێمـەو تـۆدا پەردەیەک هەیـە) هەرگیـز ناتبینین.
مەبەسـت لەوەدا: ئـەوان پشـتێکردنو خۆپارێزیان لێی ئاشـکرا کرد لە هەمـوو ڕوویەکەوە، وە ڕق لێبـوونو ڕەزامەندیـان ئاشـکرا کـرد لەوەی لەسـەرین، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتی: ﴿ فَاعْمَلْ إِنَّنَا عَامِلُونَ ﴾ هـەروەک چـۆن ڕازیت بـە کردەوە کردن بـۆ ئاینەکەت، ئێمەش ڕازیـن بـە ئەوپەڕی کـردەوە کردن بـۆ ئاینەکەمان، کـە ئەمەش ئەوپـەڕی زەلیلیـە، کاتێ ڕازی بـوون بـە گومڕایـی لە هیدایـەت، وە کوفـرو بێبڕواییـان گۆڕیوەتەوە بـە بڕواهێنانو دوارۆژیان فرۆشـتووە بـە دونیا.
(٦-٧): ﴿ قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ فَاسْتَقِيمُوا إِلَيْهِ وَاسْتَغْفِرُوهُ وَوَيْلٌ لِلْمُشْرِكِينَ ﴿٦﴾ الَّذِينَ لَا يُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُمْ بِالْآخِرَةِ هُمْ كَافِرُونَ ﴿٧﴾ ﴾:
﴿ قُلْ ﴾ ئـەی پێغەمبـەر ﷺ پێیـان بڵـێ: ﴿ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ ﴾ واتـە: ئەمـە

سـیفەتو پیشـەی منـە مـن مرۆڤێکـم وەکـو ئێـوە، هیچـم بە دەسـت نیە لـە کاروبـاردا، وە هیـچ لەوانـە لـەلای مـن نیـە کـە ئێـوە پەلـەی لێدەکـەن، بەڵکـو خـوا ﷻ فەزڵـی منی داوە بەسـەر ئێـوەداو تایبەتـی کـردووم بـەو وەحیـەی کە وەحی بـۆ کـردووم، وە فەرمانی پێکـردووم بـە شـوێنکەوتنی و بانگـەوازی ئێـوەم کـردوە بـۆلای ﴿ فَٱسۡتَقِيمُوٓاْ إِلَيۡهِ ﴾ ڕێگـای ڕاسـت بگرنـە بـەر بـۆ لای خـوا ﷻ، بـە بەڕاسـتدانانی ئـەو هەواڵەی کـە هەواڵی پێـداوە، وە شـوێنکەوتنی فەرمـانو دوورکەوتنـەوە لـە قەدەغەکـراو، ئەمـە حەقیقەتـی ئیسـتیقامەیە، پاشـان بـەردەوام بوون لەسـەری.

وە لـە وتەی خوا ﷻ: ﴿ إِلَيۡهِ ﴾ ئاگادار کردنەوەیە لەسـەر دڵسـۆزی، بێگومان خواپەرسـت دەبـێ مەبەسـتو ئامانجی لەکارەکەی گەیشـتن بـێ بەخواو ماڵـی ڕێزداری، ئا بەو شـێوەیە کردەوەکـەی پاڵفتـەو چـاکو بەسـوود دەبێ، وە بـە نەبوونـی کردەوەکەی پـووچو بەتاڵ دەبێ.

کاتـێ کە بەندە -ئەگەر چی سـووربێ لەسـەر ئیسـتقامەت- هـەر دەبێ کەمو کـوڕی لێ ڕوو بـدات لـەوەی فەرمانی پێکـراوە، یـان ئەنجامدانی قەدەغەکـراوێ، بۆیە فەرمانـی پێکردوون بـە چارەسـەر کردنـی ئـەوە داوای لێخۆشـبوونێ تەوبـە لەخـۆ بگـرێ، جـا فەرموویەتی: ﴿ وَٱسۡتَغۡفِرُوهُ ﴾، پاشـان هەڕەشـەی کـردوە لـەو کەسـەی واز لـە ئیسـتیقامە دەهێنـێو فەرموویەتـی: ﴿ وَوَيۡلٞ لِّلۡمُشۡرِكِينَ ٦ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ ﴾ واتە: (سـزاو لەناوچوون بـۆ هاوبەشـدانەران) ئەوانـەی بەندایەتـی جگـە لـە خوایـان کـردوە، نـە سـوودیان پـێ دەگەیەنـێ نـە زیـان، وە نە مردنو نە ژیـانو نـە زیندووکردنەوە، نەفـسو دەروونی خۆیان پیـس کردوە، پاکیـان نەکردۆتەوە بـە یەکتاپەرسـتی پەروەردگاریانو دڵسـۆزیان بۆی، وە نوێژیـان نەکـردوەو خاوێنیـان نەکردۆتـەوە، هیچ دڵسـۆزیەکیان نیـە بۆ بەدیهێنـەرو، هیچ سوودێکیشـیان نیـە بـۆ خەڵکـی بە زەکات جگـە لـەوەش ﴿ وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ كَٰفِرُونَ ﴾ واتـە: بڕوایـان بە زینـدوو کردنـەوەو بەهەشـتو دۆزەخ نیە، لەبـەر ئەوە کاتێ تـرس نەما لـە دڵەکانیانـدا، پێشـیان خسـت ئەوەی کە پێشـیان خسـت، لـەوەی زیانیـان پێدەگەیەنێت لە دوارۆژدا.

(٨): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمۡ أَجۡرٌ غَيۡرُ مَمۡنُونٖ ٨ ﴾:

کاتـێ باسـی بێبڕوایانـی کرد باسـی بڕوادارانی کـرد، وە وەسـفی کردنو پاداشـتی دانەوە، جـا فەرموویەتـی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾ بـەم کتێبـە، وە ئەوەشـی دەیگرێتـەوە لـەوەی

بانگەشـەی بـۆ کـردوە لـە ئیمـان، وە ئیمانەکەیـان بە کـردەوەی چـاک سـەلماندووە کە دڵسـۆزی شـوێنکەوتن کۆ دەکاتـەوە ﴿لَهُمْ أَجْرٌ﴾ واتـە: مـەزن ﴿غَيْرُ مَمْنُونٍ﴾ واتە: بەبـێ نەبـڕاوە تـەواو بـوون، بەڵکـو بەردەوامـە بەدرێژایـی کاتـەکانو لە زیـاد بووندایە، هەمـوو لـەزەتو حـەزوو ئارەزووەکانـی گرتۆتەوە.

(٩-١٢): ﴿قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِالَّذِي خَلَقَ الْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُ أَندَادًا ذَٰلِكَ رَبُّ الْعَالَمِينَ ﴿٩﴾ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِن فَوْقِهَا وَبَارَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَا أَقْوَاتَهَا فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَاءً لِّلسَّائِلِينَ ﴿١٠﴾ ثُمَّ اسْتَوَىٰ إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ ﴿١١﴾ فَقَضَاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ فِي يَوْمَيْنِ وَأَوْحَىٰ فِي كُلِّ سَمَاءٍ أَمْرَهَا وَزَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَحِفْظًا ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ ﴿١٢﴾﴾:

خـوا ﷻ نکوڵی دەکاتو سـەری سـووڕدەمێنێ لە کوفـری بێبڕوایان پێی، ئەوانـەی لەگەڵیدا هاوبەشـیان دانـاوە، وە هەرچـی لەتوانایانـدا بـێ لە پێنـاو بەندایەتـی ئەواندا دەیبەخشـن، وە یەکسـانی دەکەنـەوە لەگـەڵ پەروەردگـاری مـەزنو بەخشـندەدا، ئـەو زاتـەی ئـەو زەویە چـڕو پـڕەی بەدیهێناوە لە دوو ڕۆژدا. پاشـان لەماوەی دوو ڕۆژدا ڕایخسـت، بەوەی شـاخی زۆری تیـادا دانـاوە دەیپارێـزێ لە جوڵـەو لەرزینو جێگیـر نەبوون.

(١٠): بەدیهێنانـی تـەواو کـردوەو ڕایخسـتوە، بژێویەکانـی تێـدا دەرهێنـاوەو ئەوەیشـی بـە دوای ئەوانـدا دێ، ﴿فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَاءً لِّلسَّائِلِينَ﴾ (واتـە: لـە مـاوەی چـوار ڕۆژدا بـە یەکسـانی بـۆ گشـت داواکـەران) دڵنیابە کـەس وەک خوای ئاگـادار ئاگـادارت ناکات لە سـەرەنجامتان، جـا ئـەم هەواڵە ڕاسـتە هیـچ زیـادەو ناتەواویەکـی تێدانیە.

(١١): ﴿ثُمَّ﴾ دوای دروسـتکردنی زەوی ﴿اسْتَوَىٰ﴾ مەبەسـتی کـرد ﴿إِلَى﴾ بـۆ دروسـتکردنی ﴿السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ﴾ (واتـە: ئاسـمانەکان لەکاتێکـدا کـە دووکـەڵ بـوو) جووڵـە لەسـەر ڕووی ئاوەکـەدا ﴿فَقَالَ لَهَا﴾ (بـە ئاسـمانی وت) کاتـێ ئـەم تایبەتمەندی کردنـەی ئاسـمان وا خەیـاڵ دەکـرێ مەبەسـت پێـی تایبەتمەنـد کـردن بێ، بۆیـە عەطفی کـردوە بەسـەریدا بـە وتـەی خـۆیو فەرموویەتـی: ﴿وَلِلْأَرْضِ﴾ (بـە زەویـش) ﴿ائْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا﴾ واتـە: (بێـن) بـە ملکەچبوونـی فەرمانەکانـم بە ویسـتی خۆتان یـان بەزۆر هـەر دەبـێ جێبەجێـی بکـەن، ﴿قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ﴾ (هیـچ ویسـتێکمان نیـە پێچەوانەی ویسـتی تـۆ بێ).

فَقَضَىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَاتٍ فِي يَوْمَيْنِ وَأَوْحَىٰ فِي كُلِّ سَمَآءٍ أَمْرَهَا
وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ وَحِفْظًا ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ
ٱلْعَلِيمِ ﴿١٢﴾ فَإِنْ أَعْرَضُوا فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَٰعِقَةً مِّثْلَ صَٰعِقَةِ
عَادٍ وَثَمُودَ ﴿١٣﴾ إِذْ جَآءَتْهُمُ ٱلرُّسُلُ مِنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ
خَلْفِهِمْ أَلَّا تَعْبُدُوٓا إِلَّا ٱللَّهَ قَالُوا لَوْ شَآءَ رَبُّنَا لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةً
فَإِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿١٤﴾ فَأَمَّا عَادٌ فَٱسْتَكْبَرُوا فِي
ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَقَالُوا مَنْ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ ٱللَّهَ
ٱلَّذِي خَلَقَهُمْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَكَانُوا بِـَٔايَٰتِنَا يَجْحَدُونَ
﴿١٥﴾ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا فِيٓ أَيَّامٍ نَّحِسَاتٍ لِّنُذِيقَهُمْ
عَذَابَ ٱلْخِزْيِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَلَعَذَابُ ٱلْـَٔاخِرَةِ أَخْزَىٰ وَهُمْ
لَا يُنصَرُونَ ﴿١٦﴾ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَٰهُمْ فَٱسْتَحَبُّوا ٱلْعَمَىٰ عَلَى
ٱلْهُدَىٰ فَأَخَذَتْهُمْ صَٰعِقَةُ ٱلْعَذَابِ ٱلْهُونِ بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ
﴿١٧﴾ وَنَجَّيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ ﴿١٨﴾ وَيَوْمَ يُحْشَرُ أَعْدَآءُ ٱللَّهِ
إِلَى ٱلنَّارِ فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴿١٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا مَا جَآءُوهَا شَهِدَ عَلَيْهِمْ
سَمْعُهُمْ وَأَبْصَٰرُهُمْ وَجُلُودُهُم بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿٢٠﴾

(١٢): ﴿فَقَضَىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَاتٍ فِي يَوْمَيْنِ﴾ (واتـە: ئەوسـا حـەوت ئاسـمانی لـە دوو ڕۆژدا دروسـت کـرد) بۆیە دروسـتکردنی ئاسـمانەکانو زەوی لە شـەش ڕۆژدا تەواو بـوو، یەکەمینیان ڕۆژی یەکشـەممە بوو وە کۆتاییەکـەی ڕۆژی جومعـە بـوو، لەگـەڵ ئـەوەی توانـاو ویسـتو ئیـرادەی خـوا گونجـاوە بـۆ دروسـتکردنی هەموویـان لە یـەک چرکەدا.

بـەڵام لەگـەڵ ئـەوەی خـوا بەتوانایـە، بێگومـان کار بەجـێو دانـاو لەسـەر خۆیـە، جـا لـە حیکمـەتو لەسـەرخۆیی ئەوەیـە دروسـتکردنیانی دانـاوە لـەو مـاوە دیاریکـراوەدا.

بزانـە ڕواڵەتـی ئەم دەقـە لەگەڵ وتەی خوا ﷻ لە سـوورەتی نازعاتدا کاتێ باسـی دروسـت کردنـی ئاسـمانەکانی کرد، فەرمـووی: ﴿وَٱلْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ ﴿٣٠﴾﴾ (واتە: لە پاشـان زەوی ڕاخسـت) بـە ڕواڵـەت جۆرێ لـە دژیەکی تیـا دەردەکـەوێ، لەگەڵ ئـەوەدا کتێبی خـوا ﷻ نە دژ یەکـی تێدایەو نـە جیاوازی.

وەڵامـی ئـەوە ئەوەیـە کە زۆرێـک لە زانایانـی پێشـین وتوویانـە: بێگومان دروسـتکردنی زەوی‌و وێنەی لە پێشـی دروستکردنی ئاسـمانەکانەوەیە، وە ڕاخستنی زەوی بەوەی ﴿أَخْرَجَ مِنْهَا مَآءَهَا وَمَرْعَىٰهَا ﴿٣١﴾ وَٱلْجِبَالَ أَرْسَىٰهَا ﴿٣٢﴾﴾النازعـات، (واتـە: (لێی دەرهێنـا ئاوی‌و لەوەڕی * وە شـاخەکانی پتـەو دامەزرانـد) دواکەوتـووە لـە دروسـتکردنی ئاسـمانەکان، هەروەکو چـۆن لـە سـوورەتی نازعاتدا هاتـووە، لەبەر ئەمەیە خـوا ﷻ فەرموویەتـی تیایدا: ﴿وَٱلْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ ﴿٣٠﴾ أَخْرَجَ مِنْهَا ﴿٣١﴾﴾النازعـات، (واتـە: لە پاشـان زەوی ڕاخسـت * تیایدا دەریهێنـا) تـا کۆتایـی، نەیفەرمـووە: (والأرض بعد ذلك خلقها) (واتـە: دوای ئـەوە زەوی دروسـت کردوە).

وە کـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿وَأَوْحَىٰ فِي كُلِّ سَمَآءٍ أَمْرَهَا﴾ واتـە: فەرمـانو بەڕێوەبردنـێ

شیاو بێ پایان، کە حیکمەتی دادپەروەرترینی دادپەروەران وای خواستبێ، ﴿ وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ ﴾ ئەویش ئەستێرەکانە ڕووناکیان لێوەردەگیرێو ڕێنماییان پێ دەکرێ، وە دەبن بە جوانیەکو ڕازاندنەوەی ئاسمان بە ڕواڵەت، وە دەبێتە جوانیەکیش بۆ ناوەڕۆکیان، ئەویش بە ڕەجم کردنی شەیتانەکان، بۆ ئەوەی گوێ هەڵنەخەن تیایدا، ﴿ ذَٰلِكَ ﴾ ئەوەی باسکرا لە زەویو ئەوەی لە ناویدایە، ئاسمانو ئەوەی لە ناویدایە ﴿ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ﴾ (ئەوە بڕیاری خوای زاڵی بە دەسەڵاتە) ئەو زاتەی بە دەسەڵاتی زاڵە بەسەر هەموو شتەکانداو ڕێکی خستوون، بەدیهێنراوەکانی پێ دروستکردوە، ﴿ ٱلۡعَلِيمِ ﴾ ئەو زاتەیە کە زانستی دەوری هەموو بەدیهێنراوەکانیداوە، ئەوەی کە پەنهانەو ئەوەی کە دیارە.

جا وازهێنانی هاوبەش دانەران لە دڵسۆزی بۆ ئەم پەروەردگارە مەزنە تاکو تەنهای زاڵە، کە بەدیهێنراوەکان ملکەچی فەرمانی ئەو بوون، وە دەسەڵاتی خۆی تیایاندا چەسپاندووە، لە سەرسوورهێنەرترینی شتەکانە، وە هاوبەشدانانیان بۆ ئەو زاتە یەکسانی دەکەنەوە لەگەڵیدا، لە کاتێکدا ئەو پەرستراوانە ناتەواون لە وەسفو کردارییاندا، ئەمە سەرسووڕهێنەرترینی سەرسوڕهێنراوەکانە، هیچ چارەسەرێ بۆ ئەوانە نیە، ئەگەر بەردەوام بن لە پشت تێکردنو خۆپارێزیان تەنها سزای دونیاو دواڕۆژ نەبێ، ئا لەبەر ئەمەیە ترساندوونی بە وتەی خۆی:

(١٣-١٤): ﴿ فَإِنۡ أَعۡرَضُواْ فَقُلۡ أَنذَرۡتُكُمۡ صَٰعِقَةٗ مِّثۡلَ صَٰعِقَةِ عَادٖ وَثَمُودَ ١٣ إِذۡ جَآءَتۡهُمُ ٱلرُّسُلُ مِنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ وَمِنۡ خَلۡفِهِمۡ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَۖ قَالُواْ لَوۡ شَآءَ رَبُّنَا لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةٗ فَإِنَّا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ١٤ ﴾:

﴿ فَإِنۡ أَعۡرَضُواْ ﴾ جا ئەگەر ئەو بەدرۆدانەرانە ڕوویان وەرگێڕا دوای ئەوەی بۆیان ڕوون بویەوە وەسفەکانی قورئانی ستایشکراو، وە لە سیفاتەکانی پەرستراوی مەزن ﴿ فَقُلۡ أَنذَرۡتُكُمۡ صَٰعِقَةٗ ﴾ واتە: سزایەک لە ڕیشە دەرتان بهێنێ ﴿ مِّثۡلَ صَٰعِقَةِ عَادٖ وَثَمُودَ ﴾ (واتە: وەک هەورە تریشقەی گەلی عادو ثمود) ئەو دوو هۆزە ناسراوە، کاتێ سزا لە ناوی بردنو لەسەریان پێویست بوو تۆڵەی خوایی، ئەویش بە هۆی زوڵمو بێبڕواییانەوە.

(١٤): کاتێ ﴿ إِذۡ جَآءَتۡهُمُ ٱلرُّسُلُ مِنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ وَمِنۡ خَلۡفِهِمۡ ﴾ واتە: هەندێکیان بە دوای هەندێکی دیکەدا، بانگەوازی هەموویان یەک بانگەواز بوو ﴿ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَ ﴾ واتە: فەرمانیان پێدەکردن بە دڵسۆزی بۆ خوا، وە ڕێگریان لێدەکردن لە

هاوبەشدانان، بەڵام ئەوان پەیامەکەیان ڕەتکردەوەو بەدرۆیان دانان، وە ﴿ قَالُوا۟ لَوْ شَآءَ رَبُّنَا لَأَنزَلَ مَلَـٰٓئِكَةً ﴾ واتە: بەڵام ئێوە مرۆڤن وەکو ئێمە ﴿ فَإِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَـٰفِرُونَ ﴾ واتە: (بۆیە بەڕاستی ئێمە بەوەی ئێوەی پێ نێردراون باوەڕ ناکەین) ئەم گومانە وەکو میراتێک بە بەردەوام بۆ بەدرۆدانەران ماوەتەوە لە ئۆممەتەکان، ئەوەش لاوازترین گومانە، چونکە بێگومان لە مەرجی نێردراوێتیدا ئەوە نیە کە نێردراو فریشتە بێ، بەڵکو مەرجی پەیام ئەوەیە کە پەیامبەر بە شتێکەوە بێ بەڵگە بێ لەسەر ڕاستێتی. جا با ڕەخنە بگرن ئەگەر دەتوانن‌و ڕاست دەکەن، بە ڕەخنەگرتنی عەقڵی یان شەرعی، بێگومان هەرگیز توانای ئەوەیان نیە.

(١٥-١٦): ﴿ فَأَمَّا عَادٌ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَقَالُوا۟ مَنْ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً ۖ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِى خَلَقَهُمْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُمْ قُوَّةً ۖ وَكَانُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا يَجْحَدُونَ ﴿١٥﴾ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا فِىٓ أَيَّامٍ نَّحِسَاتٍ لِّنُذِيقَهُمْ عَذَابَ ٱلْخِزْىِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَعَذَابُ ٱلْـَٔاخِرَةِ أَخْزَىٰ ۖ وَهُمْ لَا يُنصَرُونَ ﴿١٦﴾ ﴾:

ئەمە درێژەپێدانی چیرۆک‌و سەرگوزەشتەی ئەو دوو ئۆممەتەیە عادو ثمود ﴿ فَأَمَّا عَادٌ ﴾ واتە: (ئنجا گەلی عاد) جا ئەوان -لەگەڵ بێبڕوایی بوونیان بە خواو نکوڵی کردنیان بە ئایەتەکانی‌و بێبڕواییان بە پێغەمبەرانی- لووت بەرزیان دەکرد لەسەر زەویدا، زاڵ بوون بەوانەی لە دەورو بەریاندا بوون لە بەندەکان، ستەمیان لێدەکردن، سەریان سوورمابوو لە هێزو توانای خۆیان ﴿ وَقَالُوا۟ مَنْ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً ﴾ (واتە: وتیان کێ لە ئێمە بەهێزترە؟) خوا ﷻ وەڵامی دانەوە بەوەی هەر کەسێ دەیزانی‌و فەرمووی: ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِى خَلَقَهُمْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُمْ قُوَّةً ﴾ (واتە: ئایا نەیانزانییوو بێگومان ئەو خوایەی کە ئەوانی دروست کردوە ئەو لە ئەوان بەهێزترە) ئەگەر ئەو دروستی نەکردایەن بەدینەدەهاتن. جا ئەگەر سەرنجی ئەو دۆخەیان بدایە بە سەرنجداناێکی ڕاستەقینە، ئەوە یاخی نەدەبوون بەهۆی هێزوو توانایان، بۆیە خوا ﷻ سزای دان بە سزایەک گونجاو بوو لەگەڵ ئەو توانا و هێزەی کە بە هۆیەوە یاخیبوو بوون.

(١٦): ﴿ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا ﴾ واتە: (ئەوسا ئێمە) بایەکی زۆر مەزنمان بۆ ناردن لە بەهێزی‌و سەختی، دەنگێکی ناخۆشی هەبوو وەکو هەورە تریشقە. جا خوا ﷻ زاڵیکرد بەسەریان ﴿ سَبْعَ لَيَالٍ وَثَمَـٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومًا فَتَرَى ٱلْقَوْمَ فِيهَا صَرْعَىٰ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ خَاوِيَةٍ ﴿٧﴾ ﴾ الحاقة، (واتە: حەوت شەو هەشت ڕۆژ بە بێ وچان لە ناوی بردن

ئـەو گەلـەت دەبینـی لەو ماوەیـەدا بێگیـان کەوتبـوون وەک قـەدی دارخورمـای گەندەڵ (نـاو ڕزاو)، ﴿ نَّحِسَاتٍ ﴾ لـە نـاوی بـردنو لەتو پەتـی کـردن، تەنانەت وایـان لێهاتبوو هیـچ نەدەبینـرا جگـە لـە شـوێنەوارەکانیان نەبـێ، لێـرەدا فەرموویەتـی: ﴿ لِّنُذِيقَهُمْ عَذَابَ الْخِزْيِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ﴾ ئـەو سـزایەی کـە پێـی ڕیسـوا بـوونو سەرشـۆڕ بـوون لـە نـاو خەڵکیـدا ﴿ وَلَعَذَابُ الْآخِرَةِ أَخْزَىٰ وَهُمْ لَا يُنصَرُونَ ﴾ واتـە: ڕێگریـان لێناکـرێ لە سـزای خـوا، وە ناتوانـن ڕێگری نەفسـی خۆیـان بکەن.

(١٧-١٨): ﴿ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَاهُمْ فَاسْتَحَبُّوا الْعَمَىٰ عَلَى الْهُدَىٰ فَأَخَذَتْهُمْ صَاعِقَةُ الْعَذَابِ الْهُونِ بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿١٧﴾ وَنَجَّيْنَا الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ ﴿١٨﴾ ﴾:

بـەڵام گەلـی ثمود ئەوانیـش ئـەو گەلو هۆزە ناسـراوە بـوون کە لـە حیجـرو دەوروبەری نیشـتەجێ بـوون، ئەوانـەی خـوا ﷻ پێغەمبـەر صالحـی بۆیـان نـارد، بانگـی دەکـردن بـۆ یەکتاپەرسـتی پەروەردگاریان، وە ڕێگری لێدەکردن لە هاوبەشـدانانیان، خوا ﷻ وشـترێکی پێـدان وەک نیشـانەیەکی مـەزن، ئـاو خواردنـەوە ڕۆژێـک بـۆ ئـەو بـوو، وە ڕۆژێکـی دیاریکراویـش بـۆ ئـەوان، ڕۆژێـک لـە شـیرەکەیان دەخـواردەوە، ڕۆژێکیش لـە ئاوەکە، ئـەوان هیـچ نەفەقـەو بژێویەکیـان بۆ ووشـترەکە خـەرج نەدەکـرد، بەڵکو لـە گژووگیای زەوی دەخـوارد، جـا لەبـەر ئەمەیـە لێـرەدا فەرموویەتـی: ﴿ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَاهُمْ ﴾ واتـە: ڕێنماییەکـی ڕوون، لەبـەر ئەوەیـە بـە تایبەتی ئەوانی باسـکردوە، ئەگەرچی سـەرجەم گەلە لەناوچـووەکان بەڵگـەو حوجەیـان لەسـەر پێویسـت کرابـوو، چونکـە ئایەتو نیشـانەی ثمود نیشـانەیەکی ڕوونو درەوشـاوە بـوو، گـەورەو بچووکو نێـرو مێیـان بینیبوویان، وە نیشـانەیەکی بینـراو بـوو، ئا لەبـەر ئەمەیـە تایبەتی کـردوون بـە ڕوونکردنـەوەو ڕێنمایی زیاتر.

بـەڵام ئـەوان -بـە هـۆی زوڵـمو خراپەکاریانـەوە- حەزیان لـە کوێـری کرد، کـە بریتیە لـە هەڵبژاردنـی کوفـرو بێبڕوایـی لەسـەر هیدایـەت، ئـەو هیدایەتـەی کە زانسـتو ئیمان دەگرێتـەوە، جـا خـوا ﷻ بە سـزا گرتنـی ﴿ بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴾ نـەک بە هۆی سـتەمێک لەلایەنـی خـوا ﷻ بۆیـان ﴿ وَنَجَّيْنَا الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ ﴾ واتە: خـوا ﷻ صالح ﷺو شـوێنکەتووانی لـە بـڕوادارە خۆپارێزەکان لـە هاوبەشـدانانو سـەرپێچیکردن ڕزگار کرد.

(١٩-٢٤): ﴿ وَيَوْمَ يُحْشَرُ أَعْدَاءُ اللَّهِ إِلَى النَّارِ فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴿١٩﴾ حَتَّىٰ إِذَا مَا جَاءُوهَا شَهِدَ عَلَيْهِمْ سَمْعُهُمْ وَأَبْصَارُهُمْ وَجُلُودُهُم بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿٢٠﴾ وَقَالُوا لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدتُّمْ عَلَيْنَا قَالُوا

أَنطَقَنَا ٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَنطَقَ كُلَّ شَىْءٍ وَهُوَ خَلَقَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢١﴾ وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ
أَن يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَآ أَبْصَٰرُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ وَلَٰكِن ظَنَنتُمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَا يَعْلَمُ كَثِيرًا مِّمَّا
تَعْمَلُونَ ﴿٢٢﴾ وَذَٰلِكُمْ ظَنُّكُمُ ٱلَّذِى ظَنَنتُم بِرَبِّكُمْ أَرْدَىٰكُمْ فَأَصْبَحْتُم مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِن
يَصْبِرُوا۟ فَٱلنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ وَإِن يَسْتَعْتِبُوا۟ فَمَا هُم مِّنَ ٱلْمُعْتَبِينَ ﴿٢٤﴾ ﴾:

﴿ وَيَوْمَ يُحْشَرُ أَعْدَآءُ ٱللَّهِ ﴾ خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات دەربـارەی دوژمنەکانـی ئەوانـەی بە ئاشـکرا کوفـرو بێبڕواییـان پێکـردوە، وە بەنیشانەکانیشـی، وە پێغەمبەرانیان بـەدرۆ داناوەو دژایەتـیو جەنگیـان لـە دژ کردوون، وە ئـەو حاڵە خراپەیـان کاتـێ کۆدەکرێنەوە، ﴿ إِلَى ٱلنَّارِ فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴾ سـەرەتایان ڕەت دەکرێتـەوە بەسـەر کۆتایـان، وە کۆتایـان شـوێنی سـەرەتایان دەکـەوێ، پێکـەوە هەموویـان پەلکێـش دەکرێـن، توانـای ڕێگریکردنیان نیە، ناشـتوانن یارمەتـی خۆیـان بدەنو کەسـێکیش نیـە هاوکاریـان بکات.

(٢٠): ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا مَا جَآءُوهَا ﴾ واتـە: تـا کاتـێ دەگەنـە لای ئاگرو دەیانـەوێ نکووڵی بکەن، یـان نکووڵـی ئـەو سـەرپێچیانە بکـەن کـە کردوویانـە ﴿ شَهِدَ عَلَيْهِمْ سَمْعُهُمْ وَأَبْصَٰرُهُمْ وَجُلُودُهُم ﴾ (شـایەتی دەدات لـە دژیـان گـوێو چاو وپێسـتی لەشـیان) گشـتگیرە دوای تایبەتمەنـدی، ﴿ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾ واتـە: شـایەتیان لەسـەر دەدات هەمـوو ئەندامێـک لـە ئەندامەکانیـان، جـا هـەر ئەندامێکـی دەڵـێ من ئـەوەم کردوو ئـەوەم کرد، ئـەو ڕۆژەو ئەو ڕۆژە، ئـەم سـێ ئەندامـەی تایبـەت کـردوە، چونکـە زۆربـەی گوناهـەکان بەوانـە ئەنجام دەدرێ، یـان بـە هـۆی ئەوانەوە.

وَقَالُوا لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدتُّمْ عَلَيْنَا قَالُوٓا أَنطَقَنَا ٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ
أَنطَقَ كُلَّ شَىْءٍ وَهُوَ خَلَقَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢١﴾
وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَن يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَآ أَبْصَٰرُكُمْ
وَلَا جُلُودُكُمْ وَلَٰكِن ظَنَنتُمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَا يَعْلَمُ كَثِيرًا مِّمَّا تَعْمَلُونَ
﴿٢٢﴾ وَذَٰلِكُمْ ظَنُّكُمُ ٱلَّذِى ظَنَنتُم بِرَبِّكُمْ أَرْدَىٰكُمْ فَأَصْبَحْتُم
مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِن يَصْبِرُوا فَٱلنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ وَإِن يَسْتَعْتِبُوا
فَمَا هُم مِّنَ ٱلْمُعْتَبِينَ ﴿٢٤﴾ وَقَيَّضْنَا لَهُمْ قُرَنَآءَ فَزَيَّنُوا لَهُم
مَّا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَحَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْقَوْلُ فِىٓ أُمَمٍ قَدْ
خَلَتْ مِن قَبْلِهِم مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ إِنَّهُمْ كَانُوا خَٰسِرِينَ ﴿٢٥﴾
وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَسْمَعُوا لِهَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَٱلْغَوْا فِيهِ
لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ ﴿٢٦﴾ فَلَنُذِيقَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا عَذَابًا شَدِيدًا
وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَسْوَأَ ٱلَّذِى كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿٢٧﴾ ذَٰلِكَ جَزَآءُ أَعْدَآءِ ٱللَّهِ
ٱلنَّارُ لَهُمْ فِيهَا دَارُ ٱلْخُلْدِ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا بِـَٔايَٰتِنَا يَجْحَدُونَ
﴿٢٨﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا رَبَّنَآ أَرِنَا ٱلَّذَيْنِ أَضَلَّانَا مِنَ ٱلْجِنِّ
وَٱلْإِنسِ نَجْعَلْهُمَا تَحْتَ أَقْدَامِنَا لِيَكُونَا مِنَ ٱلْأَسْفَلِينَ ﴿٢٩﴾

(٢١): ئنجا کاتێ ئەندامەکان شایەتیان لەسەر دەدەن ئەوانیش سەرزەنشتی ئەندامانی جەستەیان دەکەن ﴿وَقَالُوا لِجُلُودِهِمْ﴾ (وە بە پێستەکانیان دەڵێن) ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی شایەتیدان لە هەموو ئەندامێکی جەستەیا هەروەک باسمانکرد، ﴿لِمَ شَهِدتُّمْ عَلَيْنَا﴾ (بۆچی شایەتیتاندا لە دژمان) وە ئێمە بەرگری لە ئێوە دەکەین؟ ﴿قَالُوٓا أَنطَقَنَا ٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَنطَقَ كُلَّ شَىْءٍ﴾ (دەڵێن ئەو خوایەی کە ئێمەی هێناوەتە زمان هەموو شتێکی هێناوەتە زمان) ئێمە لە توانامانداندا نیە ڕێگری بکەین لە شایەتیدان، کاتێ کە ئێمەی هێناوە قسەکردن، هیچ کەسێ ناتوانێ لە ویستو مەشیئەتی یاخی بێ.

﴿وَهُوَ خَلَقَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ (هەر ئەویش یەکەمجار ئێوەی دروستکردوە) جا هەروەک چۆن خودو جەستەتانی دروستی کردوە، هەروەها سیفاتتانیشی دروستکردوە، لەوانەش: هێنانە قسەکرد ﴿وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ لە دوارۆژدا پاداشتان دەداتەو بەپێی کردەوەکانتان.

دەگونجێ مەبەست لەوەدا بەڵگە هێنانەوە بێ لە سەر زیندووکردنەوە بە دروستکردنی یەکەم، هەروەکو چۆن ئەوە ڕێگای قورئانە.

﴿وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَن يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَآ أَبْصَٰرُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ﴾ واتە: ئێوە خۆتان نەدەشاردەوە لە شایەتیدانی ئەندامانی جەستەتان لەسەرتان، وە ئاگاداری ئەوە نەبوون ﴿وَلَٰكِن ظَنَنتُمْ﴾ (بەڵام وا گومانتان دەبرد) بە سەرپێچی کردنتان ﴿أَنَّ ٱللَّهَ لَا يَعْلَمُ كَثِيرًا مِّمَّا تَعْمَلُونَ﴾ ئا لەبەر ئەمەیە دەرچوو لێتان ئەوەی کە دەرچوو. ئەم گومانە بوو بە هۆکاری لەناوچونو بەدبەخت بوونیان، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی:

(٢٣): ﴿وَذَٰلِكُمْ ظَنُّكُمُ ٱلَّذِى ظَنَنتُم بِرَبِّكُمْ﴾ گومانی خراپ، کاتێ کە گومانتان بە پەروەردگارتان برد کە شیاوی گەورەیی ئەو نەبوو ﴿أَرْدَىٰكُمْ﴾ واتە: لە ناوی بردن ﴿فَأَصْبَحْتُم مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ﴾ (واتە: چوونە ڕیزی زیان باران) نەفسو دەروونو ماڵو ئاینیان،

بە هۆی ئەو کردەوانەی کە گومانی خراپتان بە پەروەردگارتان پێویستی کردبوو بۆتان، جا ووشەی سزاو بەدبەختی لەسەرتان پێویست بوو، وە بۆ هەمیشەیی ئاگری دۆزەختان لەسەر واجب بوو، ئەو سزایەی بۆ ساتێکیش لەسەریان لاناچێ.

(٢٤): ﴿ فَإِن يَصْبِرُوا فَالنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ ﴾ واتە: (ئنجا ئەگەر ئارام بگرن ئەوە ئاگر شوێنی مانەوەیانە) ئارامگرتنی تێدا نیە، وە هەموو حاڵەتێ ئەندازە دەکرێ ئارامی لەسەر بگیرێ، بەڵام ئاگر ناتوانرێ ئارامی لەسەر بگیرێ، چۆن ئارام دەگیرێ لەسەر ئاگرێ کە گەرمیەکەی سەخت بووەتەوە، وە زیاترە بەسەر ئاگری دونیادا بە حەفتا جار، وە کوڵاندنی گەرمیەکەی زۆر مەزنەو بۆنی کێمو زوخاوی زۆر پیسە، سەرماو سۆڵەی چەند قاتە، کۆتو بەندو زنجیر کردنی مەزنە، لێدانو ئازاردانی گەورەیە، دەرگاوانەکانی زۆر تووڕەن، ئەوەی ڕەحمەتی خوایێ لە دڵیاندا نیە، کۆتایی ئەمەش توورەیی خوای بەدەسەڵاتە، وە قسەی ئەوە بۆیان کاتێ داوای لێدەکەنو دەپاڕێنەوە: ﴿ اخْسَئُوا فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ ﴿١٠٨﴾ ﴾ المؤمنون، (واتە: وە خوا دەفەرموێ: بە ڕیسوایی بمێننەوە لە دۆزەخداو، هیچ قسەیەکم لەگەڵدا مەکەن).

﴿ وَإِن يَسْتَعْتِبُوا ﴾ واتە: داوا بکەن نارەحەتیان لەسەر لابرێو بگەڕێنەوە بۆ دونیا، بۆ ئەوەی جارێکی تر کردەوە ئەنجام بدەن، ﴿ فَمَا هُم مِّنَ الْمُعْتَبِينَ ﴾ (واتە: ئەوە خوا هەرگیز ڕازی نابێت)، چونکە کاتی نەماوەو کاتی ڕۆیشتووە، وە ئەوەندە تەمەنیان کرد کە پەندو ئامۆژگاری تێدا وەربگرن، ترسێنەریان بۆ هاتو بیانووەکانیان برا، کەچی داوای لێبوردن کردنیان درۆ بوو، ﴿ وَلَوْ رُدُّوا لَعَادُوا لِمَا نُهُوا عَنْهُ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾ الأنعام، (واتە: وە ئەگەر بگەڕێنرێنەوە بۆ دونیا بێگومان دووبارە دەگەڕێنەوە بۆ ئەو کارانەی کە لێیان قەدەغە کرابوو).

(٢٥): ﴿ وَقَيَّضْنَا لَهُمْ قُرَنَاءَ فَزَيَّنُوا لَهُم مَّا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَحَقَّ عَلَيْهِمُ الْقَوْلُ فِي أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِم مِّنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ ۖ إِنَّهُمْ كَانُوا خَاسِرِينَ ﴿٢٥﴾ ﴾:

﴿ وَقَيَّضْنَا لَهُمْ ﴾ واتە: بۆ ئەو ستەمکارو نکوولیکارانی حەق دامانناە ﴿ قُرَنَاءَ ﴾ (هاودەم لە شەیتانەکان) هەروەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّا أَرْسَلْنَا الشَّيَاطِينَ عَلَى الْكَافِرِينَ تَؤُزُّهُمْ أَزًّا ﴿٨٣﴾ ﴾ مریم، (واتە: ئایا نەتدیوەو سەرنجت نەداوە کە بێگومان ئێمە شەیتانەکانمان زاڵ کردوە بەسەر بێبڕواياندا چاک هانیان دەدەن بۆ کوفرو تاوان) واتە: هانیان دەدەن بۆلای سەرپێچی بە هۆی ئەوەی ڕازاندوویانەتەوە ﴿ لَهُم مَّا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ ﴾ (بۆیان خراپەکاری لە دونیاو دوارۆژدا) جا دونیایان لەلا جوان کردن بە چاوەکانیان، وە بانگیان کردن بۆ لەزەتو ئارەزوو بازیە حەرامکراوەکان هەتا تووشی فیتنە بوون، دەستپێشخەریان

کرد لە سەرپێچی کردنی خوا ﷻ، وە هەرچی لە توانایاندا بوو گرتیانەبەر بۆ دژایەتی کردنی خواو پێغەمبەرەکەی، وە دوارۆژیان لە پێش چاویان دوورخستەوەو یادکردنەوەیشیان لەبیر بردنەوە، وە هەندێ جار تووشی گومانیان کردن دوای تووش بوونیان، ترسی دوارۆژ نەما لە ناو دڵەکانیاندا، بۆیە دەستیان کرد بە کوفرو بیدعەو سەرپێچی.

ئەم زاڵ بوونو هاودەم دانانەی شەیتانەکان لەلایەن خوا ﷻ بۆ بەدرۆدانەران بە هۆی ڕوو وەرگێرانیان بوو لە یادی خواو ئایەتەکانیو نکووڵی کردنی حەق، هەروەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ لَهُۥ شَيْطَٰنًا فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٌ ﴿٣٦﴾ وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٣٧﴾ ﴾الزخرف، (واتە: وە هەر کەس پشت لە یادی خوا هەڵکات شەیتانێکی بۆ ئامادە دەکەن کە هەمیشە لەگەڵی بێو لێی جیانەبێتەوە * وە بێگومان ئەوانە شەیتانەکان لە ڕێگای ڕاست بەرگریان دەکرد واش دەزانن بە بێگومان هەر ئەوانن ڕێنوین)، ﴿ وَحَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْقَوْلُ ﴾ واتە: پێویست بوو لەسەریان، وە قەزاو قەدەر دابەزی بە سزادانیان ﴿ فِىٓ ﴾ لە کۆی ﴿ أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِم مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ ۖ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ خَٰسِرِينَ ﴾ (واتە: ئەو گەلانەی ڕابوردن پێش ئەمان لە جنۆکەو ئادەمی بەڕاستی ئەوان زەرەرمەند بوون) لە ئاینەکانیانو دوارۆژیان، وە هەرکەسێ خەسارەتمەند بێ ئەوە هەر دەبێ زەلیلو بەدبەختو سزادراو بێ.

(٢٦-٢٩): ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَا تَسْمَعُوا۟ لِهَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَٱلْغَوْا۟ فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ ﴿٢٦﴾ فَلَنُذِيقَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ عَذَابًا شَدِيدًا وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَسْوَأَ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٢٧﴾ ذَٰلِكَ جَزَآءُ أَعْدَآءِ ٱللَّهِ ٱلنَّارُ ۖ لَهُمْ فِيهَا دَارُ ٱلْخُلْدِ ۖ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يَجْحَدُونَ ﴿٢٨﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ رَبَّنَآ أَرِنَا ٱلَّذَيْنِ أَضَلَّانَا مِنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ نَجْعَلْهُمَا تَحْتَ أَقْدَامِنَا لِيَكُونَا مِنَ ٱلْأَسْفَلِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾:

خوا ﷻ هەواڵ دەدات دەربارەی ڕوو وەرگێرانی بێبڕوایان لە قورئانو ئامۆژگاریکردنیان بەوە، جا فەرموویەتی: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَا تَسْمَعُوا۟ لِهَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ ﴾ ڕووی لێ وەرگێڕن بە بیستنتان، دەخیلە ڕووی تێنەکەن یان گوێی بۆ بگرن، یان لەو کەسەی کە هێناویەتی ، ئەگەر وا ڕێککەوت ئێوە گوێتان لێگرت، یان گوێتان لە بانگەوازی گرت بۆلای ئەحکامو بڕیارەکانی ﴿ وَٱلْغَوْا۟ فِيهِ ﴾ واتە: قسەیەک بکەن کە هیچ سوودێکی تێدا نیە، بەڵکو زیانی تێدایە، ڕێگە بەهیچ کەس مەدەن قسەتان بۆ بکات لەو بارەیەوە، فەرمایشتەکانتان بۆ بخوێنێتەوەو واتای بکات. ئەمە زمانی حاڵو زمانی قسەکردنیان بوو لە ڕوو وەرگێرانیان لەم قورئانە ﴿ لَعَلَّكُمْ ﴾ ئەگەر ئێوە ئەوەتان کرد ﴿ تَغْلِبُونَ ﴾ (سەربکەون) ئەمە شایەتیدانێکە لەلایەن دوژمنانەوە، وە

ئەوپەڕی حەقو ڕاستیە کە دوژمنان شایەتیان پێی داوە، ئەوان بڕیاریان نەداوە بەسەرکەوتنیان بەسەر ئەوکەسەی حەقو ڕاستی هێناوە، تەنها لە حاڵەتی ڕوو وەرگێڕان نەبێ، وە ئامۆژگاری کردن بەوە، وە مەفهومو تێگەیشتن لە قسەکانیان، ئەوان ئەگەر قسەی پڕوو پووچی تێکەڵ نەکەن، بەڵکو گوێی بۆ بگرنو بیخەنە بیرو هۆشیانەوە، ئەوان هەرگیز سەرناکەون، چونکە حەق زاڵەو نادۆڕێ، ئەمە شوێنکەتووانی حەقو دوژمنانی دەناسێ.

(٢٧): کاتێ ئەمە زوڵمو عینادی بوو لە لایەن ئەوانەوە، هیچ ئومێدو تەماحێکی هیدایەتیان تێدا نەما، هیچ نەمایەوە تەنها سزاو تۆڵەیان نەبێت، لەبەر ئەمەیە فەرمووییەتی: ﴿ فَلَنُذِيقَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ عَذَابًا شَدِيدًا وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَسْوَأَ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾ (واتە: دەی سوێند بە خوا بێگومان ئەوانەی بێبڕوا بوون پێیان دەچێژین سزایەکی سەخت، وە تۆڵەیان لێدەسێنین بە تۆڵەی خراپترین تاوانێ کە دەیان کرد)، ئەویش کوفرو سەرپێچی کردن بوو، چونکە ئەوان گوناهو سەرپێچیان دەکرد، جا پاداشت بەسزاو تۆڵەسەندنەوە، تەنها بۆ کردەوەی خراپە ﴿ وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا ﴿٤٩﴾ ﴾ الکهف، (واتە: وە پەروەردگارت ستەم لە کەس ناکات).

(٢٨): ﴿ ذَٰلِكَ جَزَآءُ أَعْدَآءِ ٱللَّهِ ﴾ (واتە: ئەوەی باسکرا سزای دوژمنانی خوایە) ئەوانەی دژایەتیان کردوە، وە دژایەتی دۆستو خۆشەویستەکانیان کردوە بە کوفرو بەدرۆدانانو دەمەقاڵێ کردنو زۆرانبازی ﴿ ٱلنَّارُ لَهُمْ فِيهَا دَارُ ٱلْخُلْدِ ﴾ واتە: (کە ئاگری دۆزەخە ماڵی ئەوانە) بە هەمیشەیی‌و بەردەوامی، سزایان لەسەر لانابرێ بۆ ساتێ، وە هەرگیز یارمەتی نادرێن، ئا ئەوە ﴿ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا يَجْحَدُونَ ﴾ (واتە: لە پاداشتی ئەوەی دانیان بە نشانەکانی ئێمەدا نەدەنا) بێگومان ئەوانە ئایەتو نیشانەی ڕوونن، وە بەڵگەی یەکلاکەرەوەی بە سوودن بۆ دڵنیایی، جا گەورەترین ستەمو گەورەترین عینادی نکووڵی کردنێتی‌و بێبڕوایی پێ کردنیەتی.

(٢٩): ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ﴾ واتە: شوێنکەوتەکان لە ئەوان، بە بەڵگەی دوای ئەوە، لە ڕووی توڕەیی‌و بێزاری لەسەر ئەوانەی گومڕایان کردن، ﴿ رَبَّنَآ أَرِنَا ٱلَّذَيْنِ أَضَلَّانَا مِنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ ﴾ واتە: ئەو دوو دەستەیەی پێشەوایەتیمانیان کرد بۆ گومڕایی‌و سزا، لە شەیتانەکانی جنۆکەکانو شەیتانەکانی ئادەمیزاد، بانگخوازان بۆ ناو دۆزەخ ﴿ نَجْعَلْهُمَا تَحْتَ أَقْدَامِنَا لِيَكُونَا مِنَ ٱلْأَسْفَلِينَ ﴾ واتە: (تا بیانخەینە ژێر پێمان) بە زەلیلی‌و سەرشۆڕی، هەروەکو چۆن گومڕایان کردین‌و تووشی فیتنەیان کردین، وە بوون بە هۆکار بۆ دابەزینی ئێمە. ئا لەمەدا تووڕەیی‌و بێزاری هەندێکیان دەردەکەوێ بەسەر هەندێکی دیکەیان، وە بەری بوونی هەندێکیان لە هەندێکی تریان.

إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ
ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحْزَنُواْ وَأَبْشِرُواْ بِٱلْجَنَّةِ
ٱلَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ ٣٠ نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا
وَفِي ٱلْءَاخِرَةِ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِيٓ أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ
فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ٣١ نُزُلًا مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ ٣٢ وَمَنْ أَحْسَنُ
قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ
ٱلْمُسْلِمِينَ ٣٣ وَلَا تَسْتَوِي ٱلْحَسَنَةُ وَلَا ٱلسَّيِّئَةُ ٱدْفَعْ
بِٱلَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا ٱلَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُۥ عَدَٰوَةٌ كَأَنَّهُۥ
وَلِيٌّ حَمِيمٌ ٣٤ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ
إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ٣٥ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ
فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ٣٦ وَمِنْ ءَايَٰتِهِ
ٱلَّيْلُ وَٱلنَّهَارُ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ لَا تَسْجُدُواْ لِلشَّمْسِ
وَلَا لِلْقَمَرِ وَٱسْجُدُواْ لِلَّهِ ٱلَّذِي خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمْ
إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ٣٧ فَإِنِ ٱسْتَكْبَرُواْ فَٱلَّذِينَ عِندَ
رَبِّكَ يُسَبِّحُونَ لَهُۥ بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَهُمْ لَا يَسْـَٔمُونَ ٣٨

(٣٠-٣٢): ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحْزَنُواْ وَأَبْشِرُواْ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ ٣٠ نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْءَاخِرَةِ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِيٓ أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ٣١ نُزُلًا مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ ٣٢﴾:

خـوا ﷻ هـه‌واڵ ده‌دات ده‌رباره‌ی دۆسـتـو خۆشه‌ویسـتانی، وه‌ له‌ناو ئه‌وه‌شـدا چالاكیان ده‌كاتـه‌وه‌و هانیـان ده‌دات له‌سـه‌ر په‌یـڕه‌و كردنیان، جـا فه‌رموویه‌تـی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُواْ﴾ (واتـه: بـه‌ ڕاسـتی ئه‌وانـه‌ی وتیـان: خـوا ﷻ په‌روه‌ردگارمانـه‌ پاشـان) دانیـان پێدانـاو ده‌ریـان بـڕی‌و ڕازی بـوون بـه‌ په‌روه‌ردگاریتی خـوای به‌رزومـه‌زن، ملكه‌چـی فه‌رمانه‌كانـی بوون، پاشـان بـه‌رده‌وام بـوون له‌سـه‌ر ڕێگای ڕاسـت بـه‌ زانسـتـو كـرده‌وه‌، جـا مژده‌یان بـۆ هه‌یـه‌ لـه‌ ژیانـی دونیـاو دواڕۆژدا.

﴿تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ﴾ به‌ڕێـزه‌كان، واتـه‌: پـۆل پـۆل داده‌بـه‌زن به‌سـه‌ریان مژده‌یـان ده‌ده‌نـێ له‌كاتی ئاماده‌ بووندا ﴿أَلَّا تَخَافُواْ﴾ (مه‌ترسـن) لـه‌وه‌ی ڕوو به‌ڕووتان ده‌بێتـه‌وه‌ لـه‌ داهاتـوودا ﴿وَلَا تَحْزَنُواْ﴾ (خه‌فـه‌ت مه‌خـۆن) بـۆ ڕابـردوو، ناره‌حه‌تـی ڕابـردوو داهاتوویان له‌سـه‌ر ڕه‌ت ده‌كه‌نـه‌وه‌ ﴿وَأَبْشِرُواْ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ﴾ (واتـه‌: مـژده‌ بـێ لێتان ئه‌و به‌هه‌شـته‌ی به‌ڵێنتان پـێ درابـوو) بێگومان ئه‌و به‌هه‌شـته‌ بۆ ئێوه‌ پێویسـتـو جێگیـر بـوو، وه‌ بڕیـاری خوا هه‌میشـه‌ بـه‌دی دێت.

(٣١): هه‌روه‌هـا پێیان ده‌ڵێن به‌ چه‌سـپاندنو مـژده‌ پێدانه‌وه‌: ﴿نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْءَاخِرَةِ﴾ (واتـه‌: ئێمـه‌ لـه‌ ژیانی دونیـاو له‌ ژیانـی دواییدا پشـتیوانی ئێوه‌ین) لـه‌ دونیـادا هانیان ده‌ده‌ن له‌سـه‌ر كاری چاكه‌و بۆیـان ده‌ڕازێننه‌وه‌، وه‌ ده‌یانترسـێنن له‌كاری خراپـه‌و لـه‌ دڵه‌كانیانـدا ناشـرینی ده‌كـه‌ن، وه‌ بۆیـان ده‌پاڕێنـه‌وه‌ لـه‌لای خـواو جێگیریان

دەکـەن لەکاتـی بـەڵاو موسـیبەتو مەترسـیدا، بەتایبەتی لە کاتـی مردنو سـەختیەکەیو گـۆڕو تاریکیەکـەی، وە لـەڕۆژی دوایـیو ناڕەحەتیەکانـیو لەسـەر پـردی (سـیراط)، لە بەهەشتیشـدا مژدەیـان پـێ دەدەن بەڕێـزداری خـوا ﷻ بۆیـان وە لـە هەمـوو دەرگایەکەوە دەچنـە ژورەوە بـۆ لایـان، ﴿ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُم بِمَا صَبَرۡتُمۡۚ فَنِعۡمَ عُقۡبَى ٱلدَّارِ ﴿٢٤﴾ ﴾الرعـد (واتـە: پێیـان دەڵێـن سـەلامتان لێ بـێ، چونکە ئارامتان گـرت لە دونیـادا جا چەند سـەرەنجامێکی چاکتـان بوو).

هەروەهـا پێیـان دەڵێـن: ﴿ وَلَكُمۡ فِيهَا ﴾ واتە: بـۆ ئێوە هەیە لە بەهەشـتدا ﴿ مَا تَشۡتَهِيٓ أَنفُسُكُمۡ ﴾ (هەرچـی حـەزی لـێ بکـەن) بۆتـان ئامادەیـەو ڕێکخـراوە ﴿ وَلَكُمۡ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ﴾ واتـە: هەرچـی داوا بکـەن لـە هەمـوو ئەوانـەی پەیوەنـدی بـە ویسـتو ئیرادەتانـەوە هەیـە، لەجۆرەها لەزەتو حـەزوو ئـارەزووەکان، لەوانەی کە چـاو نەیبینیوەو گـوێ نەیبیسـتووەو بـە خەتـەرەش بە سـەر دڵـدا نەهاتووە.

(٣٢): ﴿ نُزُلٗا مِّنۡ غَفُورٖ رَّحِيمٖ ﴾ واتـە: ئـەم پاداشـتە بـێ پایانەو نـازو نیعمەتە بـەردەوامو جێگیـرە، میوانـداریو ڕێزلێنانـە ﴿ مِّنۡ غَفُورٖ ﴾ (لـە لایـەن) خـوای لێبـووردە کـە لـە تاوانەکانتـان خـۆش بووە ﴿ رَّحِيمٖ ﴾ کاتـێ سـەرکەوتووی کردوون بـۆ کارە چاکەکان، پاشـان لێی وەرگرتوون. جا بە لێبووردەی خۆی مەترسـی لەسـەر لابـردوون، وە بەمیهرەبانی هەمـوو داواکاریەکانی پێ بەخشـیون.

(٣٣): ﴿ وَمَنۡ أَحۡسَنُ قَوۡلٗا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴿٣٣﴾ ﴾: ﴿ وَمَنۡ أَحۡسَنُ قَوۡلٗا ﴾ ئەمـە پرسـیاری نکوولـی کردنـە، بـە مانـای نەفـیو ڕەتکردنەوەی بڕیـاردەر دێ، واتـە: هیـچ کـەس وتەیەکـی چـاکو بەجێـی نیـە. واتـە: قسـەیەکو ڕێگایـەکو حاڵەتێـک ﴿ مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ ﴾ (لـەو کەسـەی خەڵکـی بـۆ لای خوا بانگ دەکات) بـە فێـر کردنـی نەفامانو ئامۆژگـاری بێ ئاگایانو پشـتتێکەران، وە مشـتو مڕی خەڵکانـی پـووچو بەتـاڵ بە فەرمـان کـردن بەبەندایەتی خـوا بەهەمـوو جۆرەکانیـەوە، وە هانـدان لەسـەریانو جوانکردنیان هەرچی لەتوانـادا بێ، وە سـەرکۆنەکردنی ئەوانەی خوا ﷻ قەدەغـەی کردوەو ناشـرینکردنیان بەهـەر ڕێگایەک، ببێتـە مایەی وازهێنـان بەتایبەتی لەم بانگـەوازە بـۆلای بنەمـای ئایـنو ئیسـلامو جوانکردنـی، وە مشـتو مـڕی دوژمنەکانی بە چاکتریـن شـێوەو قەدەغەکردنی ئـەوەی پێچەوانەیەتی لـە کوفرو هاوبەشـدانان، وە فەرمان کـردن بە چاکـەو ڕێگـری کردن لـە خراپە.

وه لـه بانگـه‌واز كـردن بـۆ لای خـوا ﷻ، خۆشه‌ویستكردنی لـه پێش چـاو به‌نده‌كانـی باسـكردنی نیعمه‌ته‌كانـی بـه تێرو ته‌سـه‌لی، فراوانـی به‌خشـنده‌یی‌و تـه‌واوی میهره‌بانی، وه باسـكردنی وه‌سـفه‌كانی كه‌ماڵـی‌و گه‌وره‌یـی.

وه لـه بانگـه‌واز كردنـت بۆ لای خوا هاندان بۆ به‌ده‌سـتهێنانی زانسـت‌و ڕێنمایـی له قورئانی پیـرۆزو سـوننه‌تی پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی ﷺ، وه هاندان له‌سـه‌ر ئـه‌وه به‌هه‌ر ڕێگایـه‌ك پێی بگات، له‌وانـه‌ش: هاندان له‌سـه‌ر ڕه‌وشـت‌و ئـاكاری جوان‌و چاكه‌كـردن له‌گه‌ڵ خه‌ڵكی به‌گشـتی، ڕووبـه‌ڕوو بوونـه‌وه‌ی خراپه‌كار بـه چاكه‌و فه‌رمانكردن بـه گه‌یاندنی په‌یوه‌نـدی خزمایه‌تی و چاكه‌كـردن له‌گه‌ڵ دایـك‌و باوكدا.

وه له‌وانـه: ئامۆژگاریكردنـی خه‌ڵكـی به‌گشـتی له‌كاتـی بۆنـه‌و ڕووداو بـه‌ڵاو موسـیبه‌ته‌كاندا، بـه جـۆرێ له‌گـه‌ڵ ئـه‌و حاڵه‌تـه‌دا بگونجـێ، جگـه لـه ئـه‌وه‌ش لـه‌وه‌ی كـورت هه‌ڵناهێنـرێ لـه تاكه‌كانیـدا، لـه‌وه‌ی كـه بانگـه‌واز بـۆ لای خێـر ده‌گرێتـه‌وه بـه گشـتی، دوور كه‌وتنـه‌وه‌ش لـه هه‌مـوو شـه‌ڕوو خراپه‌یـه‌ك، پاشـان فه‌رموویه‌تـی: ﴿وَعَمِلَ صَٰلِحًا﴾ واتـه: (وه كاری چـاك ده‌كات) له‌گـه‌ڵ بانگه‌وازكردنـی خه‌ڵكـی بـۆ لای خـوا، خـۆی ده‌ستپێشـخه‌ری ده‌كات بـه جێبه‌جـێ كردنـی فه‌رمانـی خـوا، بـه كرده‌وه‌یه‌كـی چـاك كـه بـه هۆیـه‌وه‌ی په‌روه‌ردگـاری لێـی ڕازی ده‌بـێ ﴿وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ﴾ واتـه: (ده‌ڵـێ بێگومـان مـن) لـه په‌یڕه‌وكارانـی فه‌رمانی ئـه‌وم، ئه‌وانه‌ی كـه ڕێگـه‌ی ئه‌ویـان گرتۆتـه بـه‌ر، ئـه‌م پلـه‌و پایـه بـه تـه‌واوی بـۆ ڕاسـتگۆیانه، ئه‌وانـه‌ی كرده‌وه‌یـان كـردوه بـۆ ته‌واوكردنـی نه‌فسـی خۆیـان‌و ته‌واوكردنـی جگـه لـه خۆیـان، خاوه‌ندارێتـی ته‌واویـان بـۆ ده‌سـته‌به‌ر بـووه لـه پێغه‌مبه‌رانـه‌وه، هـه‌روه‌ك لـه خراپترینـی مرۆڤـه‌كان ئه‌وانـه‌ن بانگه‌شـه بـۆ لای گومڕایـی ده‌كـه‌ن‌و ئـه‌و ڕێگایـان گرتۆتـه بـه‌ر.

خـوا ﷻ ئـه‌م دوو پله‌و پایـه جیـاوازه‌ی ڕوون كردۆته‌وه، كـه یه‌كێكیان بـه‌رز بووه‌ته‌وه به به‌رزبوونه‌وه‌یه‌كـی تـه‌واو، وه ئـه‌وی دیكه‌یان دابه‌زیـوه بۆ خواری خـواره‌وه، پله‌و پایه‌یه‌كن كـه‌س نایزانـێ جگه له خـوا، وه هه‌مـووی ئاوه‌دانـه له خه‌ڵكـی ﴿وَلِكُلٍّ دَرَجَٰتٌ مِّمَّا عَمِلُوا۟ ۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ ﴿١٣٢﴾﴾ الأنعام (واتـه: بـۆ هـه‌ر یه‌كێـك لـه جنۆكـه‌و ئاده‌مـی چه‌ند پلـه‌و پایه‌یـه هه‌یـه لـه به‌رانبـه‌ر كرده‌وه‌كانیـدا وه په‌روه‌ردگارت لـه‌وه‌ی كـه ده‌یكـه‌ن بێ ئاگـا نیه).

(٣٤-٣٥): ﴿ وَلَا تَسْتَوِي ٱلْحَسَنَةُ وَلَا ٱلسَّيِّئَةُ ٱدْفَعْ بِٱلَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا ٱلَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُۥ عَدَٰوَةٌ كَأَنَّهُۥ وَلِيٌّ حَمِيمٌ ﴿٣٤﴾ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٣٥﴾ ﴾: خوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَا تَسْتَوِي ٱلْحَسَنَةُ وَلَا ٱلسَّيِّئَةُ ﴾ واتـە: یەکسـان نیـە ئەنجامدانی کارە چاکـەکانو گوێڕایەڵیـەکان لەبـەر ڕەزامەندی خوا، لـە بەرانبەر کـردەوە خراپەکانو سـەرپێچیەکان کـە دەبنـە مایـەی تووڕەیـی خـواو پێـی ڕازی نیە، وە یەکسـان نیـە چاکە لەگـەڵ خەڵکـیو خراپەکـردن لەگەڵیـان، نـە لـە خودو، نە لە وەسـفو، نـە لە پاداشـتیاندا ﴿ هَلْ جَزَآءُ ٱلْإِحْسَٰنِ إِلَّا ٱلْإِحْسَٰنُ ﴿٦٠﴾ ﴾الرحمـن، (واتـە: ئایـا پاداشـتی چاکـە هـەر چاکـە نیە؟).

پاشـان فەرمانـی کـردوە بـە چاکەی تایبـەت کە پلـەو پایەیەکی گـەورەی هەیـە، ئەویش چاکەکردنـە لەگـەڵ ئـەو کەسـەی خراپـەت لەگەڵـدا دەکات، جـا فەرموویەتـی: ﴿ ٱدْفَعْ بِٱلَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ﴾ واتـە: ئەگـەر کەسـێ لـە خەڵکـی خراپەی لەگەڵـدا کردی بـە تایبەت ئەوانـەی حەقـی گەورەیـان لە سـەرتە وەک خزمو دۆسـتو هاوڕێیـانو وێنـەی ئەوانیش ئەگـەر پەیوەندی لەگـەڵ پچڕاندی ئـەوە تۆ پەیوەنـدی بگەیەنە، وە ئەگەر سـتەمی لێکردی ئـەوە لێـی ببـورە، وە ئەگـەر قسـەی لەسـەر کردی بـە پەنهانـی یـان ڕوو بەڕوو ئـەوە تۆ ڕوو بـەڕووی مەبـەرەوەو لێـی ببـورە، وە بـە قسـەی نـەرم مامەڵـەی لەگەڵدا بکـە، ئەگەر لێـت دوور کەوتـەوەو قسـەی لەگەڵـدا پچڕانـدی ئـەوە تۆ قسـەی جوانی لەگەڵـدا بکەو بە سـڵاو دەستپێشـخەری لەگەڵدا بکـە، جا ئەگـەر ڕووبەڕووی خراپـە بویتەوە بـە چاکە ئەوە سـوودێکی مـەزن بەدەسـت دێ ﴿ فَإِذَا ٱلَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُۥ عَدَٰوَةٌ كَأَنَّهُۥ وَلِيٌّ حَمِيمٌ ﴾ (واتە: ئەوسـا کەسـێ لەنێوان تـۆو ئـەودا دوژمنایەتی هەیە) ئەوە وەکو دۆسـتێکی دڵسـۆزو گیانی بەگیانـی لێ دێ.

(٣٥): ﴿ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ ﴾ واتـە: سـەرکەوتوو نابـێ بـۆ ئـەم سـیفاتە جـوانو ستایشـکراوە ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ ﴾ (کەسـانێک نەبـێ کـە خـۆ ڕادەگـرن) نەفـسو دەروونیـان لەسـەر ئـەوەی پێیـان ناخۆشـە، وە ناچاریان دەکەن لەسـەرئەوەی خوا پێی خۆشـە، بێگومان نەفسو دەروونـەکان دروسـتکراون لە سـەر وەڵامدانـەوەی خراپـەکار بەپێی خراپەکـەیو لێخۆش نەبوونـی، جـا چۆن بـە چاکە؟!

جـا ئەگـەر مـرۆڤ دەروونـی خـۆی خۆڕاگـر کـردو فەرمانـی پەروەردگـاری بەجێهێناو پاداشـتی بـێ پایانـی ئـەوی زانی، وە زانـی کـە ڕووبەڕووبوونەوەی کەسـی خـراپ بە پێی

کـردەوە خراپەکـەی خـۆی هیـچ سـوودێکی پـێ ناگەیەنـێ، تەنهـا دوژمنایەتی پـێ زیاد دەبـێ، وە چاکەکـردن لەگەڵیـدا نـەک لەبـەر ڕێزی ئـەو، بەڵکـو لەبەر ئەوەی هەرکەسـێ خـۆی بەکـەم بزانـێ خوا ﷻ بـەرزی دەکاتەوە، ئـەوە کارەکەی لەسـەر سـووک دەبێو بە دڵخۆشـیو لەزەت وەرگرتنەوە ئـەو کارە ئەنجام دەدات ﴿ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴾ (واتـە: وە پێی ناگات مەگەر کەسـێ خاوەنی بەشـی هـەرە گەورە بێت لە پاداشـت) چونکە ئەم سـیفاتە لـە سـیفاتی بەدیهێنـراوە تایبەتەکانە، کـە بەندە بەهۆیـەوە پلەی بـەرز دەبێتەوە لـە دونیـاو دوارۆژدا ئەویـش لە مەزنترینی سـیفاتو نیشـانەکانی خورەوشـتی بەرزە.

(٣٦-٣٩): ﴿ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَـٰنِ نَزْغٌ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ ۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٦﴾ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِ ٱلَّيْلُ وَٱلنَّهَارُ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ ۚ لَا تَسْجُدُوا۟ لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَٱسْجُدُوا۟ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿٣٧﴾ فَإِنِ ٱسْتَكْبَرُوا۟ فَٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ يُسَبِّحُونَ لَهُۥ بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَهُمْ لَا يَسْـَٔمُونَ ۩ ﴿٣٨﴾ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنَّكَ تَرَى ٱلْأَرْضَ خَـٰشِعَةً فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ ۚ إِنَّ ٱلَّذِىٓ أَحْيَاهَا لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰٓ ۚ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ ﴾:

کاتـێ خـوا ﷻ باسـی چۆنێتـی ڕووبـەڕوو بوونەوەی خراپـەکاری لـە لایەن ئادەمیـزادەوە کـرد، ئەویـش ڕووبـەڕوو بوونەوەی خراپەیـە بە چاکە، ئنجا باسـی چۆنێتـی بەرگریکردنی دوژمنـی جنۆکـەی کـرد، ئەویـش پەنـا گرتنـە بـە خـواو خۆپاراسـتنە لـە شـەڕی، جـا فەرموویەتـی: ﴿ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَـٰنِ نَزْغٌ ﴾ واتـە: هەرکاتـێ هەسـتت کـرد لـە شـەیتانەوە تووشـی خەتـەرەو جـوان کردنـی خراپـە بـووی، وە هەسـتت کـرد تەمبەڵـت دەکات لـە خێـرو چاکـە، وە تووش بـوون بە هەنـدێ گوناهـو گوێڕایەڵیکردنـی لەهەندێ لەوانـەی فەرمانـت پێـدەکات ﴿ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ ﴾ واتـە: بە هەژاریـەوە داوای لـێ بکە، کە پەنـات بـداو بتپارێزێ لێـی ﴿ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴾ بێگومان خوا گوێبیسـتی قسـەو گـەردن کەچـی تۆیـە، وە دەزانێ بەحـاڵو ناچاریـت بـە پارێزگاریو پاراسـتنی.

(٣٧): پاشـان خـوا ﷻ باسـی کـردوە کـە ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِ ﴾ (لـە نیشـانەو ئایەتەکانی) کە بەڵگـەن لەسـەر توانـای خـواو جێبەجـێ کردنـی ویسـتو ئیـرادەیو فراوانی دەسـەڵاتی بەزەیـی بـە بەندەکانی، بێگومان خـوا ﷻ تاکـو تەنهایـەو هاوەڵی نیە ﴿ ٱلَّيْلُ وَٱلنَّهَارُ ﴾ ئەمەیـان بـە سـوودی ڕۆشـنایيو ڕووناکـیو بەرێکخسـتنی کاری بەنـدەکان تیایـدا، وە ئەمەشـیان لـە سـوودی تاریکاییەکەی حەوانـەوەی خەڵک تیایـدا ﴿ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ ﴾ واتـە: (خـۆرو مانگ) ئـەو دووانەی کـە کاروبـاری بەندەکان ڕێـک نابن، نە جەسـتەیانو

نەجەستەی ئاژەڵەکانیان، تەنها بە بوونی ئەو دووانە نەبێ، وە بەبوونیان بەرژەوەندیەکی زۆر بەدەست دێ کە لە ژماردن نایەت ﴿ لَا تَسۡجُدُواْ لِلشَّمۡسِ وَلَا لِلۡقَمَرِ ﴾ (سوژدە مەبەن نە بۆ خۆرو نە بۆ مانگ) چونکە ئەو دووانە بەڕێوەبراو ڕامهێنراوو بەدیهێنراون. ﴿ وَٱسۡجُدُواْ لِلَّهِ ٱلَّذِي خَلَقَهُنَّ ﴾ واتە: بە تەنها بیپەرستن، چونکە بەدیهێنەری مەزنە، وە واز لە بەندایەتی جگە لەو بهێنن لە بەدیهێنراوەکان، ئەگەرچی تاوانەکەی گەورەبێو بەرژەوەندیەکانیشی زۆر بێ، ئەوە بێگومان لە لایەن ئەوەوە نیە، بەڵکو ئەوە لەلایەن بەدیهێنەری بەرزوو مەزنەوەیە ﴿ إِن كُنتُمۡ إِيَّاهُ تَعۡبُدُونَ ﴾ تایبەتی بکەن بە بەندایەتی کردنو دڵسۆزیو گەردن کەچی بۆی.

(٣٨): ﴿ فَإِنِ ٱسۡتَكۡبَرُواْ ﴾ (جا ئەگەر خۆیان بە گەورە زانی) لە بەندایەتی کردنی خواو ملکەچی نەبوون، بێگومان ئەوانە زیان بە خوا ناگەیەننو خوا بێ نیازە لێیان، وە بەندەی بەڕێزی هەیە، سەرپێچی فەرمانەکانی ناکەن، وە هەر فەرمانێکیان پێ بکات جێبەجێی دەکەن، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ فَٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ ﴾ واتە: فریشتە نزیکەکان ﴿ يُسَبِّحُونَ لَهُۥ بِٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ وَهُمۡ لَا يَسۡـَٔمُونَ ﴾ واتە: (بە شەوو ڕۆژ بەندایەتی ئەو دەکەن) ماندوو نابن لە بەندایەتی کردنیاندا بە هۆی بەهێزیانەوە، وە پاڵنەری بەهێز لەلایەن ئەوانەوە بۆ بەندایەتی کردن.

وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنَّكَ تَرَى ٱلْأَرْضَ خَٰشِعَةً فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ
ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ ۚ إِنَّ ٱلَّذِىٓ أَحْيَاهَا لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰٓ ۚ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ
قَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ ءَايَٰتِنَا لَا يَخْفَوْنَ عَلَيْنَآ ۗ أَفَمَن
يُلْقَىٰ فِى ٱلنَّارِ خَيْرٌ أَم مَّن يَأْتِىٓ ءَامِنًا يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ ٱعْمَلُوا۟ مَا شِئْتُمْ ۖ
إِنَّهُۥ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٤٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِٱلذِّكْرِ لَمَّا جَآءَهُمْ ۖ
وَإِنَّهُۥ لَكِتَٰبٌ عَزِيزٌ ﴿٤١﴾ لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَٰطِلُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ
خَلْفِهِۦ ۖ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ ﴿٤٢﴾ مَّا يُقَالُ لَكَ إِلَّا مَا قَدْ قِيلَ
لِلرُّسُلِ مِن قَبْلِكَ ۚ إِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ وَذُو عِقَابٍ أَلِيمٍ
﴿٤٣﴾ وَلَوْ جَعَلْنَٰهُ قُرْءَانًا أَعْجَمِيًّا لَّقَالُوا۟ لَوْلَا فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥٓ ۖ
ءَا۬عْجَمِىٌّ وَعَرَبِىٌّ ۗ قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هُدًى وَشِفَآءٌ ۖ وَٱلَّذِينَ
لَا يُؤْمِنُونَ فِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرٌ وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ
يُنَادَوْنَ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ ﴿٤٤﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ
فَٱخْتُلِفَ فِيهِ ۗ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِىَ
بَيْنَهُمْ ۚ وَإِنَّهُمْ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ ﴿٤٥﴾ مَّنْ عَمِلَ صَٰلِحًا
فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ۗ وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿٤٦﴾

(٣٩): ﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ﴾ (لە نیشانەکانی) کە بەڵگەن لەسەر تەواوی توانای خواو تاکو تەنهایی بە مولکو بەڕێوەبردن ﴿أَنَّكَ تَرَى ٱلْأَرْضَ خَٰشِعَةً﴾ واتە: (زەوی دەبینی) وشکەو هیچ سەوزیەکی تێدانیە، ﴿فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ﴾ واتە: باران، ﴿ٱهْتَزَّتْ﴾ دەجوڵێتەوە بە ڕووەک ﴿وَرَبَتْ﴾ دەبوژێتەوە، پاشان دەڕوێ لە هەموو جوتێکی جوانو گەشاوە، مرۆڤەکانو وڵاتی پێ زیندوو دەبنەوە.

﴿إِنَّ ٱلَّذِىٓ أَحْيَاهَا﴾ دوای مردنو ووشک بوونی ﴿لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰٓ﴾ (زیندووکەرەوەی مردووەکانیشە) لە گۆڕەکانیان تا ڕۆژی زیندووکردنەوەو بڵاوبوونەوەیان ﴿إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ هەروەکو چۆن تواناو دەسەڵاتی دەستەوسان نیە لە زیندووکردنەوەی زەوی دوای مردنی، بە هەمان شێوە دەستەوسان نیە لە زیندووکردنەوەی مردووەکان.

(٤٠-٤٢): ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ ءَايَٰتِنَا لَا يَخْفَوْنَ عَلَيْنَآ ۗ أَفَمَن يُلْقَىٰ فِى ٱلنَّارِ خَيْرٌ أَم مَّن يَأْتِىٓ ءَامِنًا يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ ٱعْمَلُوا۟ مَا شِئْتُمْ ۖ إِنَّهُۥ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٤٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِٱلذِّكْرِ لَمَّا جَآءَهُمْ ۖ وَإِنَّهُۥ لَكِتَٰبٌ عَزِيزٌ ﴿٤١﴾ لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَٰطِلُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِۦ ۖ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ ﴿٤٢﴾﴾:

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ ءَايَٰتِنَا لَا يَخْفَوْنَ عَلَيْنَآ﴾ ئیلحاد لە ئایەتەکانی خوادا: بریتیە لە لادان لێیان لە ڕاستی، بە هەر جۆرێ بێت، یان بە نکوڵی کردنیو بەدرۆدانانی ئەوەی هێناویەتی، یان دەستکاری کردنو گۆڕینی لە مانای ڕاستەقینەی، وە چەسپاندنی چەند مانایەک بۆی کە لە مەبەستی خوا دوورە.

جا خوا هەڕەشەی کردوە هەرکەسێ لادانی تێدا بکات لە لای ئەو شاراوە نیە، بەڵکو ئاگادارە بە ڕواڵەتو ناوەڕۆکی، لە داهاتوویەکی نزیکدا سزای دەدات

لەسـەر ئـەو لادانـەی کردویەتـی، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ أَفَمَن يُلْقَىٰ فِي ٱلنَّارِ ﴾ (واتـە: دەی ئایـا کەسـێ دەخرێتـە نـاو ئاگـرەوە چاکتـرە) ئەمـە نموونـەی لادەرە لـە ئایەتەکانـی خـوا ﴿ خَيْرٌ أَم مَّن يَأْتِيٓ ءَامِنًا يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ﴾ (واتـە: یـان ئـەو کەسـەی لـە ڕۆژی قیامەتـدا بـێ تـرس دێـت) لـە سـزای خـوا شایستەی پاداشـتی بێـت؟ ئـەوەی زانـراوە ئەمـە چاکتـرە.

کاتـێ حـەق لـە ناحـەق جیابوویـەوە، وە ڕێگـای ڕزگارکـەر لـە سـزای خـوا لـە ڕێگای لـە ناوبـەر، فەرمـووی: ﴿ ٱعْمَلُوا۟ مَا شِئْتُمْ ﴾ ئەگـەر ویـستان ڕێگـای ژێـری بگرنـە بـەر کـە گەیەنـەرە بـۆ ڕەزامەنـدی پەروەردگارتـانو بەهەشـتەکەی، وە ئەگـەر ویـستان ڕێگـای گومڕایـی بگرنەبـەر کـە دەبێتـە مایـەی تووڕەیـی خـواو دەتـان گەیەنێـت بـە ماڵـی بەدبەختـی.

﴿ إِنَّهُۥ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾ پاداشـتان دەداتـەوە بـە پێـی بـارودۆخو کردەوەکانتـان، وەکو فەرموویەتـی: ﴿ وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ﴿٢٩﴾ ﴾الكهـف، (واتـە: بڵـێ حـەق ئـەم قورئانەیـە لەلایـەن پەروەردگارتانـەوە هاتـووە جـا هـەر کـەس دەیـەوێ بـا بـروا بێنـێ، وە هەرکەسـیش دەیەوێـت بـا کافـر بێـت).

(٤١): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِٱلذِّكْرِ ﴾ واتـە: (بێگومـان ئەوانـەی) بێبڕوایـی بـە قورئـان دەکەن کـە یادخـەرەوەی بەندەکانـە هەمـوو بەرژەوەندیـە ئاینـی دونیایـیو دوارۆژەکانیانـی تێدایـە، بەرزکـەرەوەو شـکۆمەندکاری ئەوەیـە شـوێنی دەکـەوێ ﴿ لَمَّا جَآءَهُمْ ﴾ (کاتـێ بۆیـان هـات) نیعمەتێـک لـە پەروەردگاریـان لەسـەر دەسـتی چاکتریـن بەدیهێنـراوو تەواوترینیـان ﴿ وَإِنَّهُۥ لَكِتَـٰبٌ ﴾ لـە کاتێکـدا (ئـەو قورئانـە کتێبێکـە) هەمـوو وەسـفەکانی تـەواوی لەخـۆ گرتـووە ﴿ عَزِيزٌ ﴾ واتـە: ڕێگـرە لـە هەمـوو ئەوانـەی کـە بیـەوێ گـۆڕان یـان زیانـی پێبگەیەنێـت، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی:

(٤٢): ﴿ لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَـٰطِلُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِۦ ﴾ واتـە: نزیکـی ناکەوێتەوە شـەیتانێک لـە شـەیتانەکانی ئادەمیـزادو جنۆکـە، نە بە دزین نە بە خسـتنە ناوی شـتێک کە لـە ئەو نیە، نەبـە زیـادەو نەبە کەموو کورتی، ئـەو قورئانە پارێـزراوە لە دابەزاندنیدا، پارێزراوە لە وشـەو ماناکانیـدا، ئـەو زاتەی دایبەزاندووە گرنتـی پاراسـتنی داوە، وەک فەرموویەتی: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَـٰفِظُونَ ﴿٩﴾ ﴾الحجر. (واتـە: بێگومـان هـەر ئێمـە قورئانمـان ناردۆتە خـوارەوە، بەڕاسـتی هـەر ئێمەیـش دەیپارێزیـن)، ﴿ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ ﴾ (واتـە: نێردراوەتە

خــوارەوە لــە لایــەن کار دروســت) لــە دروســت کردنــیو فەرمانیــدا، هەمــوو شــتێک لە جێگــای خۆیــدا دادەنێ، بە پێی پلــەو پایەی خۆی ﴿ حَمِيدٍ ﴾ (ستایشــکراو) لەســەر ئەوەی خــاوەن ســیفاتی تــەواوو گەورەیــە، جا لەبــەر ئەمــە کتێبەکەی گشــتگیرە لەســەر تەواوی حیکمــەت، وە لەســەر بەدەســتهێنانی بەرژەوەنــدیو ســوودەکانو دوورخســتنەوەی خراپەو زیانــەکان کە ســتایش دەکرێ لەســەری.

(٤٣): ﴿ مَّا يُقَالُ لَكَ إِلَّا مَا قَدْ قِيلَ لِلرُّسُلِ مِن قَبْلِكَ إِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ وَذُو عِقَابٍ أَلِيمٍ ﴿٤٣﴾ ﴾:

﴿ مَّا يُقَالُ لَكَ ﴾ (واتــە: هیــچ شــتێک بــە تــۆ ناوتــرێ) لــەو قســانەی دەرچــووە لــە لایــەن ئــەو کەســەی بــە درۆی دانــاویو نکوولــی کــردووی ﴿ إِلَّا مَا قَدْ قِيلَ لِلرُّسُلِ مِن قَبْلِكَ ﴾ واتــە: لــە وێنــەی ئەوانــە، بەڵکــو هەنــدێ جــار هەموویــان یــەک قســەیان کــردوە، وەک سەرســوڕمانی هەمــوو تۆمەتــە بەدرۆدانــەرەکان لــە پێغەمبــەران، لــە بانگەوازیــان بــۆ دڵســۆز بــوون بــۆ خــواو بەندایەتــی کردنــی بــە تــاکو تەنهــا، وە ڕەتکردنەوەیــان بــە هەمــوو ڕێگایــەک توانایــان هەبێــت بەســەریدا، وە کــە گوتیــان: ﴿ مَا أَنتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا ﴿١٥﴾ ﴾ یس، (واتــە: خەڵککــە وتیــان ئێــوە هــەر ئادەمیەکــی وەک ئێمــەن)، وە پێشــنیار کردنیــان بــۆ پێغەمبەرەکانیــان بــە هێنانــەوەی چەنــد ئایەتــێ کــە پێویســت نیــە بــە ئەوانــەوە بهێننــەوە، وێنــەی ئەمانــەش لــە قســەکانی بــەدرۆ دانــەران، کاتــێ دڵەکانیــان لەیــەک چــوو لــە بیێروایــدا قسەکانیشــیان لەیــەک چــوو.

وە ئارامگرتنــی پێغەمبــەران لەســەر ئازاردانیــانو بــە درۆدانانیــان، دەی ئــارام بگــرە وەک ئارامیــان گــرت پێــش تــۆ، پاشــان بانگــی کــردوون بــۆ داوای لێخۆشــبوونو هاتــن بــە هۆکارەکانــی لێخۆشــبوون، ئاگــاداری کردوونەتــەوە لــە ســەر بــەردەوام بــوون لــە گومڕایــی، فەرموویەتــی: ﴿ إِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ ﴾ (بەڕاســتی پەروەردگــارت خــاوەن لێخۆشــبوونێکی) مەزنــە، بــە هــۆی لێخۆشــبوونیەوە هەمــوو گوناهێــک دەســڕێتەوە، بــۆ کەســێک خــۆی دارنــی بێــتو داوای لێخۆشــبوونی کردبێــت ﴿ وَذُو عِقَابٍ أَلِيمٍ ﴾ (واتــە: وە خــاوەن تۆڵــەی ســەختە) بــۆ ئــەو کەســەی ســوورە لەســەر تــاوانو خۆبەزلزانە.

(٤٤): ﴿ وَلَوْ جَعَلْنَٰهُ قُرْءَانًا أَعْجَمِيًّا لَّقَالُواْ لَوْلَا فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥٓ ءَا۬عْجَمِيٌّ وَعَرَبِيٌّ قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ هُدًى وَشِفَآءٌ وَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ فِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرٌ وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى أُوْلَٰٓئِكَ يُنَادَوْنَ مِن مَّكَانٍ بَعِيدٍ ﴿٤٤﴾ ﴾:

﴿ وَلَوۡ جَعَلۡنَٰهُ قُرۡءَانًا أَعۡجَمِيّٗا لَّقَالُواْ ﴾ خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات دەربـارەی فەزڵو بەخشـندەیی خـۆی، كاتـێ كتێبەكـەی بـە عەرەبـی دابەزانـدووە، بـۆ سـەر پێغەمبـەری عـەرەب، بـە زمانـی گەلەكـەی بـۆ ئـەوەی بۆیـان ڕوون بكاتـەوە.

ئەمـەش ئـەوە پێویسـت دەكات لەسـەریان زیاتـر گرنگـی پێبـدەنو بەدەمیـەوە بچـنو ملكەچـی ببـن، بێگومـان خـوا ئەگـەر ئـەم قورئانـەی بـە جگـە لـە زمانـی عەرەبـی دابەزاندایـە، ئـەوە بـە درۆدانـەران ڕوویـان لـێ وەردەگێـراو دەیانـوت: ﴿ لَوۡلَا فُصِّلَتۡ ءَايَٰتُهُۥٓۖ ﴾ واتـە: بـە سەرزەنشـتەوە دەیانـوت بۆچـی ئایەتەكانـی ڕوون نەكراوەتـەوە ﴿ ءَا۬عۡجَمِيّٞ وَعَرَبِيّٞۗ ﴾ واتـە: چـۆن دەبـێ موحەممـەد ﷺ عەرەبـی بێـتو كتێبەكـەش بـە زمانـی جگـە لـە عەرەبـی؟ ئەمـە نابێـت.

خـوا هەمـوو كارێكـی ڕەتكردۆتـەوە دەربـارەی كتێبەكـەی كـە ببێتـە مایـەی گومـان لـە لایـەن خـاوەن باتڵەكانـەوە، وە وەسـفی كـردوە بەجـۆرێ پێویسـت بـكا لەسـەریان ملكەچـی بـن، بـەڵام بـڕواداره سـەركەوتووەكان سـوودیان لێـوەر گرتـووەو پێـی بەرزبوونەتـەوە، وە غەیـری وانەیـش بـە پێچەوانـەوەن لـە بارودۆخەكانیـان.

لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ قُلۡ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ هُدٗى وَشِفَآءٞۚ ﴾ واتـە: ڕێنماییـان دەكات بـۆ ڕێگـای ژیـریو ڕێگـای ڕاسـتو زانسـتی بەسـوودیان فێـر دەكات، كـە بـە هۆیـەوە ڕێنمایـی تـەواو دەسـتەبەر دەبـێ، وە شـیفایە بۆیـان لـە هەمـوو نەخۆشـیەكانی جەسـتەو دڵ، چونكـە سەرزەنشـتی ڕەوشـتی ناشـرینو كـردەوەی خـراپ دەكات، وە هانـدەدات لەسـەر تەوبـەی ڕاسـتەقینە، كـە گوناهـەكان دەشـۆرێو شـیفای دڵەكانیـان دەدات، ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴾ بـە قورئـان ﴿ فِيٓ ءَاذَانِهِمۡ وَقۡرٞ ﴾ كـەڕن لـە بیسـتنی، وە ڕوویـان وەردەگێـڕن ﴿ وَهُوَ عَلَيۡهِمۡ عَمًىۚ ﴾ واتـە: بـە چـاوی ژیرانـە تەماشـای ناكـەنو ڕێنمایـی پـێ وەرناگـرن، هیچیـان بـۆ زیـاد نـاكات گومڕایی نەبـێ، جـا ئەگـەر ئـەوان حـەق ڕەت بكەنـەوە كوێریـان زیـاد دەبـێ بەسـەر كوێریـدا، وە سەرلێشـێواوی بەسـەر سەرلێشـێواویان ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ يُنَادَوۡنَ مِن مَّكَانِۭ بَعِيدٖ ﴾ بانـگ دەكرێـن بـۆ ئیمـانو وەڵامـی نادەنـەوە، وەكـو كەسـێ بانـگ بكـرێو ئـەو لـە شـوێنێكی دووربـێ، گوێـی لـە قسـەی بانگكـەر نەبـێو وەڵامـی نەداتـەوە، مەبەسـت ئەوەیـە ئەوانـەی بڕوایـان بـە قورئـان نیـە سـوود لـە ڕێنماییەكانـی وەرناگـرن، وە ڕووناكـیو ڕۆشناییەكانیشـی نابینـن، وە هیـچ سـوودێكی لێوەرناگـرن، چونكـە ئـەوان

ده‌رگـای ڕێنماییـان به‌سـه‌ر خۆیانـدا داخسـت بـه‌ ڕوو وه‌رگێـڕانو بێبڕواییـان.

(٤٥-٤٦): ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ فَٱخْتُلِفَ فِيهِ ۗ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ ۚ وَإِنَّهُمْ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ ﴿٤٥﴾ مَّنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ۗ وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿٤٦﴾ ﴾

خـوا ﷻ ده‌فه‌رمـوێ: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ فَٱخْتُلِفَ فِيهِ ۗ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ ﴾ (بێگومـان ته‌وراتمـان دابـه‌ مووسـا) وه‌ك چـۆن قورئانمـان دابـه‌ تـۆ، خه‌ڵكـی له‌گـه‌ڵ ئـه‌ودا مامه‌ڵه‌یـان كـرد وه‌ك چـۆن له‌گـه‌ڵ تـۆدا كردیـان، وه‌ خه‌ڵـك جیاوازیـان تێـدا: تیایانـدا بـوو بـڕوای هێنـاو ڕێنمایـیو سـوودی وه‌رگـرت، وه‌ تیایانـدا بـوو بـه‌ درۆی دانـاو سـوودێكی لێوه‌رنه‌گـرت. به‌ڕاسـتی خـوا ﷻ ئه‌گـه‌ر له‌سـه‌رخۆییو بڕیـاری پێشـووی نه‌بووایـه‌ بـه‌ دواخسـتنی سـزا، تـا ماوه‌یه‌كـی دیاریكـراو كـه‌ نـه‌ پێـش ده‌كـه‌وێو نـه‌ دوا ده‌كـه‌وێ ﴿ لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ ﴾ (لـه‌ نێوانیانـدا دادوه‌ری ده‌كـرا) ته‌نهـا بـه‌ جیابوونـه‌وه‌ی بـڕواداران لـه‌ بێبڕوایـان، بـه‌ له‌نـاو بردنـی بێبڕوایان ڕاسـته‌وخۆ، چونكـه‌ هـۆكاری له‌ناوچـوون پێویسـت بـووه‌و هاتۆتـه‌ جـێ، ﴿ وَإِنَّهُمْ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ ﴾ واتـه‌: گومـانو دوو دڵیـان گه‌یشـتۆته‌ ئـه‌وه‌ی بێزاریـان بـكات، ئـا له‌بـه‌ر ئه‌وه‌یـه‌ بـه‌ درۆیـان دانـاوه‌و نكوڵیـان كـردوه‌.

(٤٦): ﴿ مَّنْ عَمِلَ صَٰلِحًا ﴾ ئه‌ویـش ئـه‌و كاره‌یـه‌ خـواو پێغه‌مبه‌ره‌كـه‌ی فه‌رمانیـان پێكـردوه‌ ﴿ فَلِنَفْسِهِۦ ﴾ سـوودو پاداشـتی بـه‌ دونیـاو دواڕۆژدا بـۆ خۆیه‌تـی، ﴿ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ﴾ (واتـه‌: هـه‌ر كه‌سـێ خراپـه‌ بـكات) زیـانو سـزاكه‌ی لـه‌ دونیـاو دواڕۆژ بـۆ خۆیه‌تـی.

ئـا له‌مـه‌دا هانـدان هه‌یـه‌ له‌سـه‌ر كاری چاكـه‌و وازهێنان لـه‌ خراپـه‌، وه‌ سـوود وه‌رگرتنی بكـه‌ران بـه‌ كاره‌ چاكه‌كانیـان، وه‌ زیانیـان بـه‌ كـردوه‌وه‌ خراپه‌كانیـان، به‌ڕاسـتی هیـچ كه‌سـێ تـاوانو گوناهـی كه‌سـێكی دیكـه‌ هه‌ڵناگـرێ، ﴿ وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴾ (واتـه‌: په‌روه‌ردگـارت سـته‌م لـه‌ به‌نـده‌كان نـاكات) ئه‌وه‌نـده‌ بداتـه‌ سـه‌ر كه‌سـێكدا لـه‌ سـه‌رووی گوناهه‌كانیـه‌وه‌ بـێ.

إِلَيْهِ يُرَدُّ عِلْمُ السَّاعَةِ وَمَا تَخْرُجُ مِن ثَمَرَاتٍ مِّنْ أَكْمَامِهَا
وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلْمِهِ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ أَيْنَ
شُرَكَائِي قَالُوا آذَنَّاكَ مَا مِنَّا مِن شَهِيدٍ (٤٧) وَضَلَّ عَنْهُم
مَّا كَانُوا يَدْعُونَ مِن قَبْلُ وَظَنُّوا مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٍ (٤٨)
لَّا يَسْأَمُ الْإِنسَانُ مِن دُعَاءِ الْخَيْرِ وَإِن مَّسَّهُ الشَّرُّ فَيَئُوسٌ
قَنُوطٌ (٤٩) وَلَئِنْ أَذَقْنَاهُ رَحْمَةً مِّنَّا مِن بَعْدِ ضَرَّاءَ مَسَّتْهُ
لَيَقُولَنَّ هَٰذَا لِي وَمَا أَظُنُّ السَّاعَةَ قَائِمَةً وَلَئِن رُّجِعْتُ إِلَىٰ
رَبِّي إِنَّ لِي عِندَهُ لَلْحُسْنَىٰ فَلَنُنَبِّئَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِمَا عَمِلُوا
وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ (٥٠) وَإِذَا أَنْعَمْنَا عَلَى الْإِنسَانِ
أَعْرَضَ وَنَأَىٰ بِجَانِبِهِ وَإِذَا مَسَّهُ الشَّرُّ فَذُو دُعَاءٍ عَرِيضٍ
(٥١) قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ اللَّهِ ثُمَّ كَفَرْتُم بِهِ
مَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ هُوَ فِي شِقَاقٍ بَعِيدٍ (٥٢) سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا
فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ
أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ (٥٣) أَلَا إِنَّهُمْ
فِي مِرْيَةٍ مِّن لِّقَاءِ رَبِّهِمْ أَلَا إِنَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ مُّحِيطٌ (٥٤)

(٤٧-٤٨): ﴿إِلَيْهِ يُرَدُّ عِلْمُ السَّاعَةِ وَمَا تَخْرُجُ مِن ثَمَرَاتٍ مِّنْ أَكْمَامِهَا وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلْمِهِ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ أَيْنَ شُرَكَائِي قَالُوا آذَنَّاكَ مَا مِنَّا مِن شَهِيدٍ (٤٧) وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَدْعُونَ مِن قَبْلُ وَظَنُّوا مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٍ (٤٨)﴾:

ئەمە هەواڵێکە دەربارەی فراوانی زانستی خواو تایبەتمەندی بەو زانستەی کە هیچ کەس پێی ئاگادار نیە جگە لەو، جا فەرموویەتی: ﴿إِلَيْهِ يُرَدُّ عِلْمُ السَّاعَةِ﴾ واتە: هەموو خەڵکی کردەوەکانیان دەگەڕێتەوە بۆ لای ئەو، پێغەمبەرانو فریشتەکانو جگە لەوانیش دان بە بێ توانایی خۆیاندا دەنێن.

﴿وَمَا تَخْرُجُ مِن ثَمَرَاتٍ مِّنْ أَكْمَامِهَا﴾ واتە: (هەر بەرووبوومێ) لە پێستو قەپاغەکەی دێتە دەرەوە، ئەمەش گشتگیرە بۆ بەرووبوومی سەرجەمی دارەکان کە لە شارو دەشتاییەکان دان، بەرهەمی درەختێ لە درەختەکان دەرناچێ ئەوە بێگومان خوا دەزانێ بە وردو درشتی.

﴿وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَىٰ﴾ (واتە: هەر مێینەیەک ئاوس دەبێ) لە نەوەکانی ئادەمو جگە لەوانیش، لە هەموو جۆرە گیانلەبەرەکان، تەنها بە زانستی ئەو، ﴿وَلَا تَضَعُ﴾ مێینەیەک سکەکەی دانانێت ﴿إِلَّا بِعِلْمِهِ﴾ (ئەوە خوا ئاگای لێیە)، جا چۆن هاوبەشدانەران یەکسانیان کرد بە خوای گەورە شتێک کە نە زانستو نە بیستنو نە بینینی هەبێ؟ ﴿وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ﴾ ئەوانەی هاوبەشیان بۆی داناوە لە ڕۆژی دواییدا، بە سەرزەنشتکردنو ئاشکراکردنی درۆکانیان، جا پێیان دەڵێ: ﴿أَيْنَ شُرَكَائِي﴾ (واتە: هاوبەشانی من لە کوێن) کە ئێوە پێتان وابوو ئەوانە هاوبەشی منن، بەندایەتیتان بۆ کردنو دەمە قاڵێتان لەسەر ئەوە کرد، وە

لــە پێنــاو ئەوانیشــدا دژایەتــی پێغەمبەرانیشــتان كــرد؟ ﴿ قَالُوٓاْ ﴾ دانیــان نــا بــە پووچــی پەرســـتراوەكانیانو هاوبەشـــدانانیان لەگـــەڵ خـــوا ﴿ ءَاذَنَّٰكَ مَا مِنَّا مِن شَهِيدٍ ﴾ واتـــە: پێمــان ڕاگەیانــدی ئــەی پەروەردگارمــان، وە شــایەتی بــدە لەســەرمان بێگومــان هیــچ یەكێــك لــە ئێمــە شــایەتی نــادا بەڕاســتی پەرســتراوەكانیانو هاوبەشــدانانیان، هەموومــان ئێســتا گەڕاینــەوە بــۆ بەتاڵــیو پووچــی بەندایەتــی كردنیــان، وە لێیــان بــەری بوویــن، لەبــەر ئەمەیــە فەرموویەتــی:

(٤٨): ﴿ وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَدۡعُونَ ﴾ (واتــە: گــوم بــوون لێیــان ئەوانــەی پێشــتر دەیانپەرســتن) لــە غەیــری خــوا، واتــە: بیــرو بــاوەڕو كردەوەكانیــان ڕۆیــیو نەمــا، كــە تەمەنیــان لــە پێناویــدا تــەواو كــرد لــە بەندایەتیكردنــی بێجگــە لــە خــوا، پێیــان وابــوو ســوودیان پێدەگەیەنــنو ســزایان لەســەر لادەبــەنو تكایــان بــۆ دەكــەن لــەلای خــوا، كۆششــەكەیان بەفیــڕۆ چــوو گومانەكەیشــیان هەڵوەشــایەوە، هاوبەشــەكانیان هیــچ ســوودێكیان پێنەگەیانــدن ﴿ وَظَنُّواْ ﴾ واتــە: لــەو كاتــەدا زانیــانو دڵنیــا بــوون ﴿ مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٍ ﴾ واتــە: هیــچ ڕزگــار كــەرێ نیــە ڕزگاریــان بــكاتو پەنــای بــۆ ببــەن. ئەمــە ســەرەنجامی ئەوكەســەیە هــاوەڵ بــۆ خــوا دادەنــا، خــوا ڕوونــی دەكاتــەوە بــۆ بەندەكانــی بــۆ ئــەوەی ئاگــادار بــنو هاوبەشــی بــۆ دانەنێــن.

(٤٩-٥١): ﴿ لَّا يَسۡـَٔمُ ٱلۡإِنسَٰنُ مِن دُعَآءِ ٱلۡخَيۡرِ وَإِن مَّسَّهُ ٱلشَّرُّ فَيَـُٔوسٞ قَنُوطٞ ٤٩ وَلَئِنۡ أَذَقۡنَٰهُ رَحۡمَةٗ مِّنَّا مِنۢ بَعۡدِ ضَرَّآءَ مَسَّتۡهُ لَيَقُولَنَّ هَٰذَا لِي وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةٗ وَلَئِن رُّجِعۡتُ إِلَىٰ رَبِّيٓ إِنَّ لِي عِندَهُۥ لَلۡحُسۡنَىٰۚ فَلَنُنَبِّئَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِمَا عَمِلُواْ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنۡ عَذَابٍ غَلِيظٖ ٥٠ وَإِذَآ أَنۡعَمۡنَا عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ أَعۡرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ فَذُو دُعَآءٍ عَرِيضٖ ٥١ ﴾ ئەمــە هەواڵێكــە لــە لایــەن خــواوە دەربــارەی سروشــتی ئادەمیــزاد لــەو ڕووەی كــە هەیــە، وە نەبوونــی ئارامگرتــنو خۆڕاگــری، نــە لەســەر كاری خێــرو نــە لەســەر كاری شــەڕ، جگــە لــەو كەســەی خــوا لــەم حاڵــەوە گواســتێتیەوە بــۆ حاڵەتــی تــەواوی، جــا فەرموویەتــی: ﴿ لَّا يَسۡـَٔمُ ٱلۡإِنسَٰنُ مِن دُعَآءِ ٱلۡخَيۡرِ ﴾ واتــە: ئادەمیــزاد قــەت مانــدوو نابــێ لــە پاڕانــەوە لــە خــوا، دەربــارەی دەوڵەمەنــدیو مــاڵو منــداڵ، جگــە لەوانــەش لــە داواكاریەكانــی دونیــا.

بــەردەوام كار لەســەر ئــەوە دەكات، ڕازی نابــێ نــە بەكــەم نەبــە زۆر، ئەگــەر هەمــوو دونیــای بــۆ دەســتەبەر بێــت، بــەردەوام داوای زیاتــر دەكات.

﴿ وَإِن مَّسَّهُ ٱلشَّرُّ ﴾ واتــە: (ئەگــەر دووچــاری) ناخۆشــی ببێــت، وەک نەخۆشــیو هــەژاریو جۆرەهــا بــەلا ﴿ فَيَـُٔوسٌ قَنُوطٌ ﴾ واتــە: بــێ هێــوا دەبــێ لــە ڕەحمەتــی خــوا، وە واگومــان دەبــات ئــەم بــەڵاو نارەحەتیــە دەبێتــە لــە ناوبــەرو لــە نــاوی دەبـات، تووشـی ئاڵـۆزیو دڵەڕاوکـێ دەبێـت لـە هاتنـی ئـەو هۆکارانـەی کـە حـەزی پێنــاکاتو داوای نــاکات.

جگــە لەوانــەی ئارامیــان گرتــوەو کــردەوەی چاکیــان ئەنجامــداوە، بێگومــان ئەوانــە ئەگــەر تووشــی خێــرو نیعمــەت بــوون، سوپاســگوزاری خــوا دەکــەن، وە دەترســن نیعمەتەکانـی خـوا لەسـەریان پلـە بـە پلـەو مۆڵـەت بێـت نزیکیـان بکاتـەوە لـە سـزا. وە ئەگــەر تووشــی بــەڵاو موســیبەتێک بــوون لــە نەفــسو مــاڵو منــداڵ، ئــارام دەگرنو دەگەڕێنــەوە بــۆ چاکــەی پەروەردگاریــان، هەرگیــز بــێ هیــوا نابن.

(٥٠): پاشـان خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ وَلَئِنْ أَذَقْنَٰهُ ﴾ (واتـە: ئەگـەر پێمـان بەخشـی) بــە ئادەمیــزاد کــە تێــر نابــێ لــە دوعــای خێــر، وە ئەگــەر تووشــی شــەڕ بــوو بــێ هیــوا دەبــێ ﴿ رَحْمَةً مِّنَّا ﴾ واتــە: (میهرەبانیــەک لــە لایــەن خۆمانــەوە) دوای ئــەو شــەڕەی کــە تووشــی بــوو، بــەوەی خــوا لــە نەخۆشــیەکەی چاکــی کــردەوە، یــان دەوڵەمەنــدی کــرد لــە هــەژاری، ئــەوە بێگومــان شــوکرانە بژێــری خــوا نابــێ، بەڵکــو گومــڕا دەبــێو ســنوور دەبەزێنــێو دەڵێــت: ﴿ هَٰذَا لِى ﴾ واتــە: ئەمــە هــی منــە، چونکــە مــن شایسـتەی ئـەوەم ﴿ وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً ﴾ (واتـە: وە وا گومـان نابـەم ڕۆژی دوایـی بەرپـا بێـت)، ئەمـەش نکوڵـی کردنـە لـە لایـەن ئـەوەوە دەربـارەی زیندووکردنـەوەو بێبڕواییــە بــە نیعمــەت، وە ئــەو ڕەحمەتــەش کــە خــوا پێــی بەخشــیوە.

﴿ وَلَئِن رُّجِعْتُ إِلَىٰ رَبِّىٓ إِنَّ لِى عِندَهُۥ لَلْحُسْنَىٰ ﴾ واتــە: بــە گریمانــەی هاتنــی ڕۆژی دوایــی، بێگومــان مــن دەگەڕێمــەوە بــۆلای پەروەردگــارم، لای خــوا ﷻ پاداشــتی زۆر چاکـم بـۆ هەیـە، وەک چـۆن نـازو نیعمـەت بـە دەسـتم هـات لـە دونیـادا، بێگومـان لــە دوارۆژیشــدا بــە دەســتم دێــت.

ئەمــە لــە مەزنتریــن چاوقایمــیو قســەکردنە لەســەر خــوا بــە بــێ زانســت، ئــا لەبــەر ئەمە خــوا هەڕەشــەی لێکــردوەو فەرموویەتــی: ﴿ فَلَنُنَبِّئَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِمَا عَمِلُوا۟ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴾ واتــە: (بێگومــان هــەواڵ دەدەیــن بەوانــەی بێبــڕوا بــوون بــەوەی کردوویانــە، وە ســوێند بــە خــوا پێیــان دەچێژیــن) ســزایەکی ســەخت.

(٥١) ﴿ وَإِذَآ أَنْعَمْنَا عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ ﴾ بـە لـەش سـاغی، یـان ڕزقو ڕۆزی، یـان جگـە لەوانـە، ﴿ أَعْرَضَ ﴾ (ڕوو وەردەگێـڕێ) لـە پەروەردگـاریو لـە سوپاسـگوزاری کردنـی، ﴿ وَنَـَٔا ﴾ واتـە: خـۆی بـە گـەورە دەزانـێ ﴿ بِجَانِبِهِۦ ﴾ بـە لـە خۆبایـی بـوونو لـووت بەرزیـەوە ﴿ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ ﴾ (واتـە: بـەڵام کاتـێ ناخۆشـی تـووش بێـت) لـە نەخۆشـی، یـان هـەژاری، یاخـود جگـە لەوانیـش ﴿ فَذُو دُعَآءٍ عَرِيضٍ ﴾ واتـە: (نـزاو هـاواری) زۆر دەکات، بـە هـۆی نەبوونـی خۆڕاگریـەوە، خۆڕاگرتـن نیـە لـە ناخۆشـیدا، سوپاسـگوزاریش نیـە لـە خۆشـیدا، مەگـەر کەسـێ خـوا ڕێنمایـی کردبـێو منەتـی کردبـێ بەسـەریدا.

(٥٢-٥٤): ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ثُمَّ كَفَرْتُم بِهِۦ مَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ هُوَ فِى شِقَاقٍۭ بَعِيدٍ ﴿٥٢﴾ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْـَٔافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾ أَلَآ إِنَّهُمْ فِى مِرْيَةٍ مِّن لِّقَآءِ رَبِّهِمْ ۗ أَلَآ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَىْءٍ مُّحِيطٌۢ ﴿٥٤﴾ ﴾.

﴿ قُلْ ﴾ واتـە: بڵـێ: بەوانـەی قورئـان بـە درۆ دادەنێـن، ئەوانـەی پەلـە دەکـەن لـە بێبڕواییـدا ﴿ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ ﴾ (پێـم بڵێـن ئەگـەر) ئـەم قورئانـە ﴿ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ﴾ (لـە لایـەن خـواوە بووایـە) بێگومـانو بـێ دوودڵـی ﴿ ثُمَّ كَفَرْتُم بِهِۦ مَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ هُوَ فِى شِقَاقٍۭ بَعِيدٍ ﴾ واتـە: (پاشـان بڕواتـان پـێ نەکـرد، کـێ گومڕاتـرە، لـەو کەسـەی کـە لـە دژایەتیەکـی دوور لـە ڕاسـتیدا بێـت) دژایەتـی خـواو پێغەمبەرەکـەی، چونکـە حـەقو ڕاسـتیتان بـۆ ڕوون بووەتـەوە، پاشـان لاتانـداوە لێـی، نـەک بـۆ لای حـەق، بەڵکـو بـۆ لای پـووچو نەفامـی، کەوابـوو ئێـوە دەبـن بـە گومڕاترینـی خەڵکـیو سـتەمکارترینیان.

(٥٣): ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْـَٔافَاقِ ﴾ جـا ئەگـەر گوتتـان، یـان گومانتـان هەبـوو لـە ڕاسـتیو حەقیقەتـی قورئـان، ئـەوە خـوا بۆتـان دەهێنێتـەوەو بەڵگەکانـی خۆیتـان پێنیشـان دەدات لـە ئاسـۆی دونیـا، وەک بەڵگەکانـی ناو ئاسـمانو ناو زەوی، وە ئەوەشـی خـوا دەیهێنێتـە پێـش لـەو ڕووداوە مەزنانـە کـە بەڵگـەن بـۆ ئـەو کەسـەی بەرچـاوی ڕوونـەو حـەق دەبینـێ، ﴿ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ ﴾ (وە لـە خـودی خۆیانـدا) لـەوەی جەسـتەیان لەخـۆی گرتـووە لـە داهێنانـی ئایەتەکانـی خـوا کـە پـڕن لـە شـتی سەرسـوڕهێنەرو توانـای لـە ڕادەبـەدەر، وە لـە حـەڵاڵ بوونـی سـزاکانو بەسـەرهاتی بەدرۆدانـەران، وە

سەركەوتنی بڕواداران ﴿ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ ﴾ (واتە: هەتا بۆیان ڕوون ببێتەوە) لەو نیشانانە، ڕوون كردنەوەیەك گومان هەڵنەگرێ ﴿ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ﴾ ئەوەشی لەخۆی دەگرێ ڕاستە.

بێگومان خوا ئەوەی كرد، نیشانی بەندەكانی دا لە كۆمەڵە نیشانەیەك كە بەهۆیەوە بۆیان ڕوون بوویەوە ئەوە حەقە، بەلاّم خوا هەركەسێكی بوێ بە ویستی خۆی سەركەوتووی دەكات بۆ ئیمان، وە هەركەسێكیشی بوێ سەرشۆڕی دەكات.

﴿ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ ﴾ واتە: ئایا ئەوەیان بەس نیە لەسەر ئەوەی ئەم قورئانە حەقە، وە ئەوەشی هێناویەتی ڕاستگۆیە، بە شایەتی خوا، بێگومان خوا شایەتی بۆ داوە، وە ئەو ڕاستگۆترینی شایەتەكانە، وە پشتیوانی لێكردووەو سەری خستووە بەسەرخستنێك كە شایەتی گوفتاری لەخۆ گرتووە، لە لای كەسێ كە گومانی هەبێت.

(٥٤): ﴿ أَلَآ إِنَّهُمْ فِى مِرْيَةٍ مِّن لِّقَآءِ رَبِّهِمْ ﴾ واتە: (ئاگاداربە بەڕاستی ئەوانە) لە گوماندان لە زیندوو كردنەوەو ڕۆژی دوایی، هیچ ماڵێكیان نیە جگە لە ماڵی دونیا، بۆیە كاریان بۆ دواڕۆژ نەكردووەو لایان لێ نەكردووەتەوە، ﴿ أَلَآ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَيْءٍ مُّحِيطٌۢ ﴾ (واتە: ئاگاداربە بە ڕاستی خوا دەوری هەموو شتێكی داوە) بە زانستو تواناو دەسەلاّت.

تەفسیری سوورەتی (فصلت) تەواو بوو.


سورة الشورى

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

حمٓ ① عٓسٓقٓ ② كَذَٰلِكَ يُوحِيٓ إِلَيْكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكَ ٱللَّهُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ③ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ وَهُوَ ٱلْعَلِيُّ ٱلْعَظِيمُ ④ تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرْنَ مِن فَوْقِهِنَّ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِمَن فِي ٱلْأَرْضِ أَلَآ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ⑤ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهُ حَفِيظٌ عَلَيْهِمْ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ ⑥ وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا لِّتُنذِرَ أُمَّ ٱلْقُرَىٰ وَمَنْ حَوْلَهَا وَتُنذِرَ يَوْمَ ٱلْجَمْعِ لَا رَيْبَ فِيهِ فَرِيقٌ فِي ٱلْجَنَّةِ وَفَرِيقٌ فِي ٱلسَّعِيرِ ⑦ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَهُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَٰكِن يُدْخِلُ مَن يَشَآءُ فِي رَحْمَتِهِۦ وَٱلظَّٰلِمُونَ مَا لَهُم مِّن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ ⑧ أَمِ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ فَٱللَّهُ هُوَ ٱلْوَلِيُّ وَهُوَ يُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ⑨ وَمَا ٱخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِن شَيْءٍ فَحُكْمُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبِّي عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ ⑩

## تەفسیری سورەتی (الشورى)
## مەککیە (٥٣) ئایەتە
## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٣): ﴿ حمٓ ① عٓسٓقٓ ② كَذَٰلِكَ يُوحِيٓ إِلَيْكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكَ ٱللَّهُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ③ ﴾

واتــە: خوا ﷻ هــەواڵ دەدات بە ڕاســتی ئەم قورئانــە مەزنــەی بە وەحیو نیگــا ناردوە بۆ پێغەمبــەری بەخشــندە، وەک چــۆن وەحــی کــردوە بــۆ پێش ئــەو لــە پێغەمبــەران، ئەم دەقــە ڕوون کردنــەوەی چاکــەی ئــەوی تێدایــە، بــە دابەزاندنــی کتێبــەکانو ناردنی پێغەمبــەران لــە پێــش ئــەو، بێگومــان موحەممــەد ﷺ شــتێکی تــازەو داهێنــراو نیــە لــە ناو پێغەمبەرانــدا، بێگومــان ڕێگــای ئــەو ڕێگای پێش خۆیەتــی، وە بارودۆخی گونجــاوە لەگەڵ بارودۆخــی پێــش خۆی لــە پێغەمبــەران، ئەو پەیامــەی هێناویەتی لــە پەیامی ئــەوان دەچێ، چونکــە هەموویــان حــەقو ڕاســتن، ئــەو قورئانــە دابەزێنــراوی زاتێکــی وەســفکراوە بــە پەرســتراوێتیو عیزەتی مــەزنو حیکمەتو کار دروســتی تەواو، وە هەموو جیهانی ســەروو خــوارەوە موڵکــی ئــەون، وە لــە ژێــر فەرمانی قەدەریو شــەرعی ئــەودان.

(٤-٥): ﴿ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ وَهُوَ ٱلْعَلِيُّ ٱلْعَظِيمُ ④ تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرْنَ مِن فَوْقِهِنَّ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِمَن فِي ٱلْأَرْضِ أَلَآ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ⑤ ﴾

ئــەو خوا ﴿ ٱلْعَلِيُّ ﴾ (بەرزە) بە زاتو تواناو دەســەڵاتی ﴿ ٱلْعَظِيمُ ﴾ لە مەزنێتی ئەو خوایە ﴿ تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرْنَ مِن فَوْقِهِنَّ ﴾ (واتــە: نزیکــە ئاســمانەکان پارچــە پارچە ببن لــە ســەروویانەوە) لەبەر مەزنیــان وە لــەو ڕووەی کە بێگیانن ﴿ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ﴾ وە فریشــتە بەڕێــزە نزیکــەکان کــە ملکەچی مەزنی ئــەو زاتــەن، زەلیلــی دەســەڵاتو پەروەردگارێتی

ئـەون ﴿ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ ﴾ (بـە پاکـی یـادو سوپاسـی پەروەردگاریـان دەکـەن) وە بـە مەزنـی دادەنێـن لـە هەمـوو ناتەواویـەکو وەسـفی دەکـەن بـە هەمـوو تەواویەک ﴿ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِمَن فِي ٱلْأَرْضِ ﴾ لـەوەی کـە لێیانـەوە دەرچووە کە شایسـتەی مەزنیو گەورەیـی ئـەو زاتە نیە، لەگەڵ ئەوەدا خـوا ﷻ ﴿ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴾ ئەگەر لێبووردەییو میهرەبانـی ئـەو نەبووایـە، ئەوە سـزای لەناوبەری بـۆ خەڵکی پێش دەخسـت.

وە لـە وەسـف کردنـی خـوا ﷻ بـەم وەسـفانە، دوای ئـەوەی باسـی کـردوە بێگومـان ئـەو وەحـیو نیگـای بـۆ هەمـوو پێغەمبـەران کـردوە، وە بـۆ موحەممـەد ﷺ بـە تایبەتی، ئاماژەیەکـە کـە ئـەم قورئانـە پـیرۆزە چەندیـن بەڵگـەو سـەلماندنو ئایەتی تێدایە لەسـەر تـەواوی ئـەو زاتە، وە وەسـفکردنی بەو نـاوە مەزنانە کە پێویسـتکەرە دڵەکان پـڕ بکات لە ناسـینیو خۆشەویسـتیو مەزنیو گەورەیـیو ڕێزی ئەو زاتـە، وە ئەنجامدانـی هەموو جۆرە عیبـادەتو پەرستشـە ئاشـکراو نهێنیـەکان تەنها بـۆ ئەو.

بێگومـان گەورەتریـن سـتەمو خراپترین قسـە دانانی هاوبەشـانێکە بۆ خوا کە هیچ سـوودو زیانێکیـان نیـە، بەڵکو ئـەوان بەدیهێنـراوو هـەژارن بۆ لای خوا لـە هەمـوو ڕووەکانیانەوە، ئـا لەبەر ئەمەیـە دوای ئەمـە فەرموویەتی:

(٦): ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهُ حَفِيظٌ عَلَيْهِمْ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ ﴿٦﴾ ﴾

﴿ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ ﴾ (واتـە: ئەوانـەی جگـە لە خـوا دۆسـتانێکیان بۆ خوا هەڵبـژاردوە) پشـتیان پێ دەبەسـتن بە بەندایەتـیو گوێڕایەڵیکـردن، هەروەکو چۆن خوا ﷻ دەپەرسـتنو گوێڕایەڵـی دەکـەن، بێگومـان ئەوانـە پووچیان هەڵبـژاردوەو لە ڕاسـتیدا نابنە دۆسـتیان ﴿ ٱللَّهُ حَفِيظٌ عَلَيْهِمْ ﴾ کردەوەکانیـان دەپارێزێ، پاداشـتیان دەداتـەوە بە چاکەو خراپەیـان ﴿ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ ﴾ (واتـە: تـۆ ئـەی موحەممـەد ﷺ بریـکار نیـت بەسـەریانەوە) تا پرسـیار لـە کردەوەکانیان بکەیـت، بەڵکو تۆ گەیەنەری ئەرکی سەرشـانی خۆتـت گەیاندووە.

(٧): ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا لِّتُنذِرَ أُمَّ ٱلْقُرَىٰ وَمَنْ حَوْلَهَا وَتُنذِرَ يَوْمَ ٱلْجَمْعِ لَا رَيْبَ فِيهِ فَرِيقٌ فِي ٱلْجَنَّةِ وَفَرِيقٌ فِي ٱلسَّعِيرِ ﴿٧﴾ ﴾

﴿ وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ ﴾ پاشـان باسـی منەتی خۆی دەکات لەسـەر پێغەمبەرەکەیو لەسـەر خەڵکـی، کاتـێ دایبەزانـدووە ﴿ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا ﴾ واتـە: وشـەو ماناکانـی ڕوونە ﴿ لِّتُنذِرَ أُمَّ ٱلْقُرَىٰ ﴾ ئەویـش مەککەی ڕێزلێگیـراوە ﴿ وَمَنْ حَوْلَهَا ﴾ لادێکانی دەوروبەری، پاشـان

ئەم ترسـاندنە هەمـوو خەڵکی بگرێتـەوە ﴿وَتُنذِرَ﴾ خەڵکی بترسـێنیٚ ﴿يَوۡمَ ٱلۡجَمۡعِ﴾ کە خـوا ﷻ یەکەمیـن‌و کۆتاییـان کۆدەکاتـەوە، وە هەواڵیان پـێ دەدا کە بێگومـان ئەو ڕۆژە ﴿لَا رَيۡبَ فِيهِ﴾ (کـە هیـچ گومانێکـی تێدانیـە) خەڵکیش دابـەش دەکرێن بۆ دوو دەسـتە ﴿فَرِيقٞ فِي ٱلۡجَنَّةِ﴾ ئەوانیـش ئەو کەسـانەن بڕوایان بـە خوا هێناوەو پێغەمبەرانیان بەڕاسـت دانـاوە ﴿وَفَرِيقٞ فِي ٱلسَّعِيرِ﴾ ئەوانیش دەسـتەو تاقمـی بێبڕوایان‌و بـە درۆ دانەرانن.

(٨): ﴿وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَهُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَلَٰكِن يُدۡخِلُ مَن يَشَآءُ فِي رَحۡمَتِهِۦۚ وَٱلظَّٰلِمُونَ مَا لَهُم مِّن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٍ ﴿٨﴾﴾

﴿أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ﴾ لەگـەڵ ئەمـەدا ئەگەر خوا ﷻ بیویسـتایە خەڵکی دەکرد بـە یەک ئوممەت لەسـەر هیدایـەت، چونکـە بە توانایـە هیچ شـتێک ناتوانـێ ڕێگری لـێ بکات، بـەڵام هەر کەسـێ بویٚ لـە بەدیهێنـراوە تایبەتەکانی دەیخاتـە ناو میهرەبانـی خۆیەوە.

بـەڵام سـتەمکاران ئەوانـەی چـاک نابـن بێگومـان بـێ بەشـن لـە میهرەبانـی، جـا ﴿مَا لَهُم﴾ جگـە لـە خـوا ﴿مِّن وَلِيّٖ﴾ دۆسـت‌و یارمەتیـدەرێ کـە یارمەتیان بـدات، ئەوەی خۆشەویسـتە بۆیـان دەسـتەبەر بـێ ﴿وَلَا نَصِيرٍ﴾ نارەحەتیـان لەسـەر لاببـات.

(٩): ﴿أَمِ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَۖ فَٱللَّهُ هُوَ ٱلۡوَلِيُّ وَهُوَ يُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٩﴾﴾

وە ئەوانـەی ﴿ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَ﴾ (واتـە: جگـە لـە خوا پشـتیوان‌و دۆسـتانێکیان بۆ خـوا هەڵبـژاردووە) پشـتیان پێ دەبەسـتن لە بەندایەتـی کردنیاندا، ئـەوە بێگومـان هەڵەیان کـردوە بـە ناشـرینترین هەڵـە، تەنها خـوا ﷻ یارمەتیـدەرو پشـتیوانە، بەندەکەی پشـتی پێ دەبەسـتێ لـە بەندایەتـی‌و گوێڕایەڵیـداو نزیـک بوونـەوە لێی، بـەوەی دەکرێ لـە جۆرەها نزیـک بوونـەوە، وە پشـتیوانی بەندەکانی دەکات بەگشـتی، بە بەڕێوەبـردن‌و جێبەجێکردنی توانـای خۆی تیایاندا. وە پشـتیوانی بەنـدە بڕوادارەکانـی دەکات بە تایبەتی، بـە دەرهێنانیان لـە تاریکـی بـۆ ڕووناکـی، وە پەروەردەکردنیان بە بەزەیی خـۆی‌و یارمەتیدانیـان لە هەموو کاروبارەکانیانـدا، ﴿وَهُوَ يُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾ واتـە: ئەو زاتە هەڵسـوڕێنەرە بـە زیندووکردنـەوەو مراندن، جێبەجێکردنـی ویسـت‌و توانـا، ئـەو زاتە شایسـتەی ئەوەیە بەتـاک‌و تەنهاو بـێ هـاوەڵ بەندایەتی بـۆ بکرێ.

(١٠): ﴿وَمَا ٱخۡتَلَفۡتُمۡ فِيهِ مِن شَيۡءٖ فَحُكۡمُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبِّي عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ ﴿١٠﴾﴾

خـوا ﷻ دەفەرمـویٚ: ﴿وَمَا ٱخۡتَلَفۡتُمۡ فِيهِ مِن شَيۡءٖ﴾ (وە هەر شـتێک تیایـدا جیاواز بوون)

لـە بنەمـاو لـق‌و پۆکانـی ئاینەکەتان، لـەوەی کە یەکدەنـگ نین لەسـەری ﴿ فَحُكْمُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ ﴾ بڕیارەکـەی بـۆلای خـواو سـوننەتی پێغەمبەرەکـەی دەگەڕێتـەوە، ئـەوەی ئـەوان بڕیاریـان پێـدا تەنهـا ئـەوە حەقـە، ئەوەیشـی پێچەوانـەی ئـەوە بێ ئـەوە بەتـاڵ‌و پووچە ﴿ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبِّى ﴾ واتـە: هـەر وەک چۆن ئـەو زاتـە پەروەردگاری بەدیهێنـەری ڕزق‌و ڕۆزیـدەری بەڕێوەبـەرە، هـەر ئەویـش دادوەرە لـە نێـوان بەندەکانـی بە شـەریعەتەکەی بە هەمـوو کاروبارەکانیان.

مەفهـوم‌و تێگەیشـتنی ئایەتـە پیرۆزەکـە ئەوەیـە یەکدەنگـی ئۆممـەت بەڵگەیەکـی یەکلاکەرەوەیـە، چونکـە خـوا ﷻ فەرمانـی پێنەکردوویـن بیگەڕێنینـەوە بـۆی تەنها ئەوە نەبـێ کـە جیاوازیمـان هەیـە تیایـدا. ئـەوەی یەکدەنـگ بوویـن لەسـەری ئـەوە بەسـە یەکدەنگـی ئۆممـەت لەسـەری، چونکـە ئـەم ئۆممەتە پارێـزراوە لە هەڵـە، بۆیە هـەر دەبێ یەکدەنگیەکەیـان ڕێـک‌و گونجـاو بـێ لەگـەڵ کتێبـی خـواو سـوننەتی پێغەمبەرەکـەی. وە خـوا ﷻ کـە دەفەرمـوێ: ﴿ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ ﴾ واتـە: بـە دڵ پشـتم پێـی بەسـت لـە بەدەسـتهێنانی سـوودەکان‌و لابردنـی خراپـەکان، متمانـەم پێـی هەیـە فریـام بکـەوێ بـە هـۆی ئـەو پشـت بەسـتنەوە، ﴿ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ ﴾ واتـە: بـە دڵ‌و جەسـتەم ڕووی تێدەکەم، وە گوێڕایەڵـی‌و بەندایەتـی بـۆ دەکەم.

جـا ئـەم دووانـە (پشـت بەسـتن‌و گەڕانـەوە بـۆلای) دوو بنەمـان زۆر جـار خـوا ﷻ لـە کتێبەکەیـدا باسـی کـردوە، چونکـە تـەواوی بەنـدە بەدەسـت دێـت بـە کۆکردنـەوەی هەردووکیـان، وە تـەواوی لە دەسـت دەدات بـە نەمانیان یان بـە یەکێکیـان، هەروەکو خوا ﷻ فەرمویەتـی: ﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ۝٥ ﴾ الفاتحة. (واتـە: تەنها تۆ دەپەرسـتین‌و تەنهـا پشـت بە تـۆ دەبەسـتین) وە وتـەی خـوا ﷻ ﴿ فَٱعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ ۝١٢٣ ﴾ هود. (واتـە: جـا ئـەو خوایە بپەرسـتەو پشـت بـە ئەو ببەسـتە).

فَاطِرُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِۚ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا
وَمِنَ ٱلْأَنْعَٰمِ أَزْوَٰجًا يَذْرَؤُكُمْ فِيهِۚ لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَيْءٌۖ وَهُوَ
ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ (١١) لَهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِۖ يَبْسُطُ
ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُۚ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ (١٢) ۞ شَرَعَ
لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَٱلَّذِيٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ وَمَا
وَصَّيْنَا بِهِۦٓ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓۖ أَنْ أَقِيمُوا۟ ٱلدِّينَ
وَلَا تَتَفَرَّقُوا۟ فِيهِۚ كَبُرَ عَلَى ٱلْمُشْرِكِينَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِۚ ٱللَّهُ
يَجْتَبِيٓ إِلَيْهِ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِيٓ إِلَيْهِ مَن يُنِيبُ (١٣) وَمَا تَفَرَّقُوٓا۟
إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْۚ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ
مِن رَّبِّكَ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى لَّقُضِيَ بَيْنَهُمْۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ أُورِثُوا۟
ٱلْكِتَٰبَ مِنۢ بَعْدِهِمْ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ (١٤) فَلِذَٰلِكَ
فَٱدْعُۖ وَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَۖ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْۖ وَقُلْ
ءَامَنتُ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِن كِتَٰبٍۖ وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُۖ
ٱللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْۖ لَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْۖ لَا حُجَّةَ
بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُۖ ٱللَّهُ يَجْمَعُ بَيْنَنَاۖ وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ (١٥)

(١١): ﴿ فَاطِرُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِۚ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا وَمِنَ ٱلْأَنْعَٰمِ أَزْوَٰجًا يَذْرَؤُكُمْ فِيهِۚ لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَيْءٌۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ (١١) ﴾:

﴿ فَاطِرُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ واتە: بەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەویە بە تواناو ویستو حیکمەتی، ﴿ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا ﴾ (واتە: بۆی بەدیهێناون هاوسەران لە خودی خۆتان) بۆ ئەوەی لە پاڵیاندا بحەوێنەوە، وە وەچە کانتان بڵاو ببێتەوە، وە سوودو بەرژەوەندیتان بۆ دەستەبەر ببێ.

﴿ وَمِنَ ٱلْأَنْعَٰمِ أَزْوَٰجًا ﴾ واتە: لە هەموو بەشەکانی ئاژەڵ دوو جۆری داناوە، نێرو مێ بۆ ئەوەی بمێنێتەوەو زیاد بکات لە پێناو بەرژەوەندیەکانتان، وە لەبەر ئەمە ژماردوویەتی بە (لام) کە بەڵگەیە لەسەر (تعلیل) واتە: بۆی داناون لە پێناو ئێوەدا، وە لەپێناو نازو نیعمەت بۆ ئێوە، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ يَذْرَؤُكُمْ فِيهِ ﴾ واتە: بڵاوەتان پێدەکاو زۆرتان دەکات، وە ئاژەڵەکانیشتان زیاد دەکات بەهۆی ئەوەی لە نەفسو دەروونتان هاوسەرانی داناوە، هەروەها لە ئاژەڵانیشدا جووتی بۆتان داناوە.

﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَيْءٌ ﴾ واتە: هیچ شتێک ناشوبهێتە خوای گەورە، وە هیچ شتێک لە بەدیهێنراوەکانی بە وێنەی خوا نیە، نە لە خودی، نە لە زاتی، نە لە ناوەکانی، نە لە سیفاتەکانی، نە لە کارەکانی، چونکە ناوەکانی هەموویان جوانن، سیفاتەکانی تەواو و مەزنن، وە کارەکانی ئەو بەدیهێنراوە مەزنانەی هێناوەتە بوون بەبێ هاوبەش، هیچ شتێ بە وێنەی ئەو نیە، بە هۆی تاکو تەنهایی بە تەواوێتی لە هەموو ڕووەکانەوە ﴿ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ﴾ (وە ئەو بیسەری) هەموو دەنگەکانە، بە جیاوازی زمانەکانو جۆراوجۆری پێویستیەکان ﴿ ٱلْبَصِيرُ ﴾ ڕۆیشتنی مێرووڵەی ڕەش دەبینێ لە شەوێکی تاریکدا بەسەر بەردێکی ڕەشی قەترانی، وە ڕۆیشتنی بژێوی لەناو ئەندامی جەستەی گیانلەبەرە زۆر بچووکەکاندا دەبینێ، وە ڕۆیشتنی ئاو بە ناو گەڵای دارەکاندا.

ئەم دەقەو هاوشێوەی، بەڵگەیە بۆ مەزهەبی ئەهلی سونتەو جەماعە لە چەسپاندنو جێگیر کردنی سیفاتەکاندا، وە ڕەتکردنەوەی هاووێنە بوونی بەدیهێنراوەکان. وە ڕەتکردنەوەی تێدایە لەسەر (المشبه) لە وتەی خوا ﷻ: ﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ﴾ وە لەسەر (المعطلة) لە فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴾.

(١٢): ﴿ لَهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١٢﴾ ﴾:

﴿ لَهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ واتە: (موڵکی ئاسمانەکانو زەوی هی خوایە) وە کلیلی دەرگای میهرەبانیو ڕزقو ڕۆزیو نیعمەتە ئاشکراو نهێنیەکان بە دەستی خوایە، هەموو بەدیهێنراوەکان هەژارن بۆ لای خوا، لە بەدەستهێنانی بەرژەوەندیەکانیانو دوور خستنەوەی زیان لێیان لە هەموو دۆخەکاندا، بە دەستی هیچ کەس نیە شتێ لە فەرمانو کاروبارەکاندا.

وە خوا ﷻ پێدەرو ڕێگرە، زیانو سود هەر بە دەستی ئەوە، هیچ نازونیعمەتێک نیە لەلای بەندەکان تەنها لە ئەوەوەیە، وە کەس ناتوانێ ڕێگری لە شەرو خراپە بکات جگە لەو، وە ﴿ مَّا يَفْتَحِ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحْمَةٍ فَلَا مُمْسِكَ لَهَا ۖ وَمَا يُمْسِكْ فَلَا مُرْسِلَ لَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ ﴿٢﴾ ﴾ فاطر، (واتە: خوا هەر بەهرەو چاکەیەک بۆ خەڵک بەرەڵا بکاتو بیکاتەوە ئیتر بەرگریکەرێکی بۆ نیە، وە خوا هەر بەهرەیەک بگرێتەوە ئیتر لە پاش گرتنەوەی خوا بەرەڵاکەرو نێرەری بۆ نیە)، لەبەر ئەمەیە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ ﴾ واتە: فراوانی دەکاتو دەیبەخشێ لەجۆرەکانی ڕزقو ڕۆزی بۆ هەر کەسێ بیەوێ ﴿ وَيَقْدِرُ ﴾ واتە: تەنگی دەکاتو دەیگرێتەوە لە سەر هەر کەسێ کە بیەوێ، تەنانەت بە ئەندازەی پێویستی، زیادی ناکات لەسەری، وە هەموو ئەوانە شوێنی زانستو کاربەجێی حیکمەتی خوا کەوتووە، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴾ بارودۆخی بەندەکانی دەزانێ، دەیبەخشێ بە هەر کەسێ شایستەی حیکمەتی ئەوبێ، وە ویستو ئیرادەی وا بخوازێ.

(١٣): ﴿ شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِۦٓ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓ ۖ أَنْ أَقِيمُوا۟ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا۟ فِيهِ ۚ كَبُرَ عَلَى ٱلْمُشْرِكِينَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ ۚ ٱللَّهُ يَجْتَبِىٓ إِلَيْهِ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِىٓ إِلَيْهِ مَن يُنِيبُ ﴿١٣﴾ ﴾:

﴿ شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِۦٓ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓ ﴾ ئەمە گەورەترین منەتە خوا ﷻ کردوویەتی بەسەر بەندەکانیدا، ئەو ئاینەی بۆ داناون چاکترینی ئاینەکانو پاکترینو پاڵفتەترینیانە، کە ئەویش ئاینی ئیسلامە، خوا ﷻ دایناوە

بۆ پاڵفته‌كراوانو هه‌ڵبژێردراوان له‌ به‌نده‌كانی، ئه‌وانیش خاوه‌نانی عه‌زمن له‌و پێغه‌مبه‌رانه‌ی باسكراون له‌م ده‌قه‌دا، به‌رزترینی خه‌ڵكین له‌ڕووی پله‌و پایه‌وه‌، وه‌ ته‌واوترینیانن له‌ هه‌موو ڕوویه‌كه‌وه‌، جا ئه‌و ئاینه‌ی خوا ﷻ بۆی داناون هه‌ر ده‌بێ گونجاوبێ له‌گه‌ڵ بارودۆخیانو ته‌واوه‌تیان، به‌ڵكو خوا ﷻ ته‌واوی كردوونو هه‌ڵیبژاردوون به‌ هۆی ئه‌وه‌ی به‌جێیان هێناوه‌و پێی هه‌ستاون، ئه‌گه‌ر ئاینی ئیسلام نه‌بووایه‌ هیچ كه‌س له‌ خه‌ڵكی پله‌و پایه‌ی به‌رز نه‌ده‌بوویه‌وه‌، ئه‌و ئاینه‌ ڕووحی به‌خته‌وه‌ریه‌، جه‌مسه‌ری ده‌ستاری ته‌واویه‌، ئه‌ویش ئه‌وه‌یه‌ كه‌ ئه‌م كتێبه‌ به‌خشنده‌یه‌ له‌ خۆی گرتووه‌، وه‌ بانگه‌شه‌ی بۆ كردوه‌ له‌ یه‌كتاپه‌رستیو كرده‌وه‌كانو ڕه‌وشتو ئادابه‌كان.

له‌ به‌ر ئه‌مه‌یه‌ فه‌رموویه‌تی: ﴿ أَنْ أَقِيمُوا۟ ٱلدِّينَ ﴾ واته‌: فه‌رمانی پێكردوون سه‌رجه‌م شه‌ریعه‌ته‌كانی ئاینو بنه‌ماو لقو پۆكانی جێبه‌جێ بكه‌ن، به‌ڕاستو ڕێكی به‌جێیان بێننو هه‌وڵو كۆشش بده‌ن بۆ به‌جێهێنانی، هاوكارو یارمه‌تیده‌ر بن له‌سه‌ر چاكه‌و له‌ خوا ترسان، هاوكار مه‌بن له‌سه‌ر گوناهو دژایه‌تی كردنی، ﴿ وَلَا تَتَفَرَّقُوا۟ فِيهِ ﴾ واته‌: (جیاوازی تێدا مه‌كه‌ن) بۆ ئه‌وه‌ی یه‌كده‌نگی به‌ده‌ست بهێنن له‌سه‌ر بنه‌ماكانی ئاینو لقو پۆكانی، وه‌ سووربن له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی بابه‌ته‌كان دووبه‌ره‌كیو جیاوازی نه‌خاته‌ نێوانتانو به‌ش به‌شو كۆمه‌ڵ كۆمه‌ڵتان نه‌كا ببنه‌ ده‌سته‌ ده‌سته‌، تا هه‌ندێكتان دژایه‌تی ئه‌وه‌ بكات، له‌گه‌ڵ یه‌كده‌نگیتان له‌سه‌ر بنه‌مای ئاینه‌كه‌تان.

وه‌ له‌ جۆره‌كانی كۆبوونه‌وه‌ له‌سه‌ر ئاینو جیاوازی نه‌بوون تیایدا، ئه‌وه‌یه‌ خوا ﷻ فه‌رمانی پێكردوه‌ له‌و كۆبوونه‌وه‌ گشتیانه‌ وه‌ك كۆبوونه‌وه‌ی حه‌جو جه‌ژنه‌كانو جومعه‌و پێنج نوێژه‌كه‌و جیهاد كردنو جگه‌ له‌وانیش، له‌و عیباده‌تو په‌رستشانه‌ی كه‌ ته‌واو و كامڵ نابن به‌ كۆبونه‌وه‌و نه‌بوونی جیاوازی نه‌بێ.

﴿ كَبُرَ عَلَى ٱلْمُشْرِكِينَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ ﴾ واته‌: زۆر قورسو گرانه‌ به‌ لایانه‌وه‌ كاتێ بانگیان ده‌كه‌ی بۆ دڵسۆزی بۆ خوای تاكو ته‌نها، وه‌ك خوا ﷻ ده‌رباره‌یان فه‌رمویه‌تی: ﴿ وَإِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَحْدَهُ ٱشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ وَإِذَا ذُكِرَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦٓ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿٤٥﴾ ﴾الزمر، (واته‌: وه‌ كاتێك یادی خوا بكرێ به‌ تاكو ته‌نها تێكده‌چێو بێزار ده‌بێ دڵی كه‌سانێ كه‌ باوه‌ڕیان نیه‌ به‌ ڕۆژی دوایی كه‌چی كاتێك ناوی په‌رستراوانی بێجگه‌ له‌ خوا ببرێت یه‌كسه‌ر شادو ڕووخۆش ده‌بن) وه‌ وته‌ی ئه‌وان: ﴿ أَجَعَلَ ٱلْـَٔالِهَةَ إِلَـٰهًا وَٰحِدًا ۖ إِنَّ هَـٰذَا لَشَىْءٌ عُجَابٌ ﴿٥﴾ ﴾ص، (واته‌: ئایا ئه‌و پێغه‌مبه‌ره‌ هه‌موو خواكانی كردوه‌ته‌ یه‌ك خوا).

﴿ ٱللَّهُ يَجْتَبِىٓ إِلَيْهِ مَن يَشَآءُ ﴾ واته‌: هه‌ڵیده‌بژێرێ له‌ به‌دیهێنراوه‌كانی ئه‌وه‌ی بزانێ گونجاوه‌

بۆ هەڵبژاردن بۆ نێردراوێتیو پشتیوانی کردنی، وە لەوانە: ئەم ئوممەتەی هەڵبژاردوەو فەزڵی داوە بەسەر سەرجەم ئوممەتەکاندا، وە چاکترینی ئاینەکانی بۆ هەڵبژاردوون ﴿ وَيَهۡدِيٓ إِلَيۡهِ مَن يُنِيبُ ﴾ (وە ڕێنمایی کەسێک دەکات بۆ لای خوا بگەڕێتەوە) ئەم هۆکارەی کە لە بەندەوەیە پێ دەگات بە هیدایەتی خوای بەرزوو مەزن، ئەویش ملکەچبوونێتی بۆ پەروەردگاریو ڕاکێشرانی پاڵنەرەکانی دڵێتی بۆ لای، وە مەبەستیشی تەنها ئەوە، جا مەبەستی چاکی بەندە لەگەڵ کۆشش کردنی لە بەدەستهێنانی هیدایەت لە هۆکارەکانی ئاسانکردنە بۆی، هەر وەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ يَهۡدِي بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضۡوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ ﴿١٦﴾ ﴾المائدة، (واتە: خوا ڕێنموونی کەسێکی پێ دەکات شوێن ڕەزامەندی ئەو بکەوێ بۆ ڕێگەکانی ئارامیو ئاشتی)، وە لەم ئایەتەدا بێگومان خوا ﷻ ﴿ وَيَهۡدِيٓ إِلَيۡهِ مَن يُنِيبُ ﴾ لەگەڵ وتەی: ﴿ وَٱتَّبِعۡ سَبِيلَ مَنۡ أَنَابَ إِلَيَّۚ ﴿١٥﴾ ﴾لقمان، (واتە: وە شوێن ڕێبازی کەسێک بکەوە کە بە دڵسۆزی گەڕاوەتەوە بۆ لای من) لەگەڵ زانیاری بە بارودۆخی هاوەڵان (خوایان لێ ڕازیبێ) وە تەواوی گەڕانەوەو ملکەچبوونیان بەڵگەیە لەسەر ئەوەی قسەی ئەوان بەڵگەو حوججەیە، بە تایبەتی خەلیفەکانی ڕاشدین خوا لە هەموویان ڕازی.

(١٤-١٥): ﴿ وَمَا تَفَرَّقُوٓاْ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلۡعِلۡمُ بَغۡيَۢا بَيۡنَهُمۡۚ وَلَوۡلَا كَلِمَةٞ سَبَقَتۡ مِن رَّبِّكَ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى لَّقُضِيَ بَيۡنَهُمۡۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ أُورِثُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ لَفِي شَكّٖ مِّنۡهُ مُرِيبٖ ﴿١٤﴾ فَلِذَٰلِكَ فَٱدۡعُۖ وَٱسۡتَقِمۡ كَمَآ أُمِرۡتَۖ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡۖ وَقُلۡ ءَامَنتُ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِن كِتَٰبٖۖ وَأُمِرۡتُ لِأَعۡدِلَ بَيۡنَكُمُۖ ٱللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمۡۖ لَنَآ أَعۡمَٰلُنَا وَلَكُمۡ أَعۡمَٰلُكُمۡۖ لَا حُجَّةَ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمُۖ ٱللَّهُ يَجۡمَعُ بَيۡنَنَاۖ وَإِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ ﴿١٥﴾ ﴾:

﴿ وَمَا تَفَرَّقُوٓاْ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلۡعِلۡمُ بَغۡيَۢا بَيۡنَهُمۡۚ ﴾ کاتێ خوا ﷻ فەرمانی کرد بە کۆبوونەوەو یەکدەنگی مسوڵمانان لەسەر ئاینەکەیانو ڕێگریکردن لە جیاوازیو دووبەرەکی، هەواڵی پێدان کە ئێوە بوغراو یاخی مەبن بەوەی خوا دایبەزاندووە بۆ سەرتان لە کتێب، چونکە بێگومان خاوەنانی کتێب جیاوازی نەکەوتە نێوانیان تا کتێبی بۆ دابەزاندن، کە یەکدەنگی پێویست کرد، ئەوان پێچەوانەی فەرمانی کتێبەکەیان جووڵانەوە، ئەوانە هەموو بە هۆی گومڕاییو دژایەتیکردنیانەوە بوو، چونکە ئەوان ڕقیان لە یەکتر بوو، حەسوودیو دژایەتی کەوتە نێوانیان، وە لە نێوانیاندا شەڕو ئاژاوە ڕوویدا، ئنجا جیاواز بوون ڕوویدا، جا بۆیە ئەی مسوڵمانان ئاگادار بن ئێوەش وەکو ئەوان نەبن ﴿ وَلَوۡلَا كَلِمَةٞ سَبَقَتۡ مِن رَّبِّكَ ﴾ واتە: بە دواخستنی ئەو سزایەی کە لە ناویان دەبات ﴿ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى لَّقُضِيَ بَيۡنَهُمۡۚ ﴾ بەڵام حیکمەتو

لەسەرخۆیی خوا وای خواست ئەو سزایە لەسەریان دوابخریّ ﴿ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ أُورِثُواْ ٱلْكِتَٰبَ مِنۢ بَعْدِهِمْ ﴾ واتە: ئەوانەی لە دوای ئەوان نامەیان پێدراو بوو بە جێنشینیان، لەوانەی درانە پاڵ زانست، تیایاندا بوو ﴿ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ ﴾ واتە: لە گومانو دوو دڵیەکی زۆردا، دەیخاتە ناو دووبەرەکیەوە، کاتیّ کە پێشینیان جیاواز بوون بە هۆی گومڕاییو عینادیانەوە، بێگومان پاشینیانیش جیاوازیان تێکەوت بە گومان بردنو دوو دڵی، وە هەموویان بەشدار بوون لە جیاوازبوونی سەرزەنشت کراودا.

بۆیە دەفەرمویّ: ﴿ فَلِذَٰلِكَ فَٱدْعُ ﴾ واتە: بۆ ئاینی پتەو ڕێگای ڕاست کە خوا کتێبەکەی بۆ دابەزاندوەو کتێبەکانی پیّ ناردوە، بانگەوازی ئۆممەتەکەت بکەو هانیان بدە لە سەری، وە جیهادو تێکۆشانی ئەوانەش بکە کە وەریناگرن ﴿ وَٱسْتَقِمْ ﴾ بە نەفسی خۆت ﴿ كَمَآ أُمِرْتَ ﴾ واتە: بە ڕاست بوونێک بگونجیّ لەگەڵ فەرمانی خوادا، بەبیّ ڕۆچوونو شل گیری، بەڵکو بەجێبەجیّ کردنی فەرمانی خواو دوورکەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکانی، بە بەردەوامی لەسەر ئەوە، جا فەرمانی پێکرد بە تەواوکردنی نەفسی خۆی بە پەیوەست بوونی بەردەوام بوونو ئیستیقامەت، وە بە تەواوکردنی جگە لە خۆی بە بانگەوازکردن بۆلای، ئەوەی زانراوە فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانە بۆ ئۆممەتەکەی، ئەگەر تایبەت کردنی بۆ نەهاتبیّ ﴿ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ ﴾ (شوێنی) هەواو ئارەزووی ئەوانە مەکەوە لە ئاین لایانداوە لە بیروایانو دوو ڕووەکان، یان بە شوێنکەوتنیان لەسەر هەندیّ لە ئاینەکەیان، یان بە وازهێنانی بانگەواز بۆ لای خوا ﷻ، یان بە وازهێنانی پابەندبوون بە ئاینی ڕاست، بێگومان ئەگەر شوێنی هەواو ئارەزووی ئەوان بکەوی، دوای ئەوەی زانستت بۆ هات ئەوە تۆ لە ستەمکارانی، نەیفەرمووە: (ولا تتبع دینهم) واتە: شوێنی ئاینەکەیان مەکەوە، چونکە حەقیقەتی ئاینەکەیان کە خوا بۆی ناردوون، ئاینی سەرجەم پێغەمبەرانە، بەڵام ئەوان شوێنی نەکەتوون، بەڵکو شوێنی هەواو ئارەزووەکانیان کەوتوونو ئاینەکەیان کردبووە سەرقاڵی بیّ سوودو گاڵتە.

﴿ وَقُلْ ﴾ پێیان بڵیّ: لە کاتی گفتوگۆو مشتومڕ کردنیاندا: ﴿ ءَامَنتُ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِن كِتَٰبٍ ﴾ واتە: (بڕوام هێناوە بە هەر نامەیەک کە خوا ناردوویەتیە خوارەوە)، با مشتومڕەکەت لەسەر ئەم بنەما مەزنە بوونیات نرابیّ لەگەڵیاندا، کە بەڵگەیە لەسەر شەرەفو گەورەیی ئیسلامو چاودێری کردنی بەسەر سەرجەم ئاینەکاندا، بێگومان ئەو ئاینەی کە خاوەن کتێبەکان پێیان وایە ئەوان لەسەری دەڕۆن بەشێکە لە ئیسلام.

لەمەدا ڕێنیشاندان هەیە کە خاوەنانی کتێب ئەگەر گفتوگۆو مشتو مڕیّ بکەن بوونیات

نرابێ لەسەر ئیمان بەهەندێ لە کتێبەکان، یان بە هەندێ لە پێغەمبەران جگە لە هەندێکیان ئەوە بۆیان ڕێک نایەت، چونکە ئەو کتێبەی بانگەشەی بۆ دەکەنو ئەو پێغەمبەرەی دەدرێنە پاڵی، لە مەرجەکەی ئەوەیە بەڕاستدانەری ئەم قورئانە بێ، وە بەوەیشی هێناویەتی، جا کتێبی ئێمەو پێغەمبەرەکەمان فەرمانی پێنەکردووین مەگەر بە برواهێنان بە مووساو عیسا ﷺ و تەوراتو ئینجیل، کە هەواڵی پێداوەو بەڕاستی داناوە، وە هەواڵیداوە کە ئەوانە بەڕاستدانەری قورئاننو دان بەڕاستیەکەیدا دەنێن، بەڵام تەوراتو ئینجیلو مووساو عیسا ﷺ کە وەسف نەکراون بۆ ئێمە، وە ڕێک نەهاتوون لەگەڵ کتێبەکەی ئێمەدا، ئەوە فەرمانی پێنەکردووین بەبرواهێنان پێیان.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ ﴾ واتە: (وە فەرمانم پێدراوە کە دادپەروەربم لە نێوانتاندا) لە بریاردان لەوەی جیاوازن تیایدا، دژایەتیو ڕقو کینەتان ڕێگریم لێناکات، ئەی خاوەن کتێبەکان، لە دادپەروەری لە نێوانتاندا، وە لە دادپەروەری لە بریاردان لە نێوان خاوەن ئەو قسە جیاوازانەدا، لە خاوەن کتێبەکانو جگە لەوانیش، ئەوەیە ئەوەی حەقە دانی پێدابنرێو وەربگیرێ، ئەوەشی ناحەقو پووچە ڕەت بکرێتەوە ﴿ اللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ ﴾ واتە: ئەو زاتە پەروەردگاری هەمووانە، ئێوە لە پێشتر نین بە خوای پەروەردگار لە ئێمە، ﴿ لَنَآ أَعْمَـٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَـٰلُكُمْ ﴾ (واتە: کردەوەی خۆمان بۆ خۆمانو کردەوەی خۆتان بۆ خۆتان) لە خێرو شەڕ ﴿ لَا حُجَّةَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ﴾ واتە: (هیچ بەڵگەیەک نەماوە لە نێوان ئێمەو ئێوەدا) دوای ئەوەی ڕاستیەکان دەرکەوتو حەق لە ناحەق ڕوون بوویەوەو هیدایەتیش لە گومڕایی، هیچ شوێنێک بۆ مشتو مڕو ناکۆکی نەمایەوە، چونکە مەبەست لە مشتو مڕ ڕوون کردنەوەی حەقە لە ناحەق، بۆ ئەوەی کەسی ژێر هیدایەت وەربگرێ، وە ببێتە بەڵگەو حوججە بەسەر گومڕاوە، مەبەست لەمەدا ئەوە نیە کە خاوەن کتێبەکان مشتومڕ ناکەن، چۆن خوای گەورەش دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تُجَـٰدِلُوٓا۟ أَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ﴿٤٦﴾ ﴾العنكبوت (واتە: دەمەقاڵێو موجادەلە مەکەن لەگەڵ خاوەن کتێبە ئاسمانیەکاندا مەگەر بە جوانترین شێوە) بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە باسمان کرد.

﴿ ٱللَّهُ يَجْمَعُ بَيْنَنَا ۖ وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ﴾ (واتە: خوا کۆمان دەکاتەوە) لە ڕۆژی دوایی، پاداشتی هەریەکە دەداتەوە بە پێی کردەوەکەی، وە ئەوکاتە ڕاستگۆ لە درۆزن ڕوون دەبێتەوە.

وَٱلَّذِينَ يُحَآجُّونَ فِي ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مَا ٱسۡتُجِيبَ لَهُۥ حُجَّتُهُمۡ
دَاحِضَةٌ عِندَ رَبِّهِمۡ وَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٌ وَلَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٌ
(١٦) ٱللَّهُ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ وَٱلۡمِيزَانَۗ وَمَا يُدۡرِيكَ
لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ قَرِيبٞ (١٧) يَسۡتَعۡجِلُ بِهَا ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ
بِهَاۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مُشۡفِقُونَ مِنۡهَا وَيَعۡلَمُونَ أَنَّهَا ٱلۡحَقُّۗ
أَلَآ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُمَارُونَ فِي ٱلسَّاعَةِ لَفِي ضَلَٰلِۢ بَعِيدٍ (١٨)
ٱللَّهُ لَطِيفُۢ بِعِبَادِهِۦ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُۖ وَهُوَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡعَزِيزُ
(١٩) مَن كَانَ يُرِيدُ حَرۡثَ ٱلۡأٓخِرَةِ نَزِدۡ لَهُۥ فِي حَرۡثِهِۦۖ وَمَن
كَانَ يُرِيدُ حَرۡثَ ٱلدُّنۡيَا نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَا وَمَا لَهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ
مِن نَّصِيبٍ (٢٠) أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ
مَا لَمۡ يَأۡذَنۢ بِهِ ٱللَّهُۚ وَلَوۡلَا كَلِمَةُ ٱلۡفَصۡلِ لَقُضِيَ بَيۡنَهُمۡۗ
وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ (٢١) تَرَى ٱلظَّٰلِمِينَ
مُشۡفِقِينَ مِمَّا كَسَبُواْ وَهُوَ وَاقِعُۢ بِهِمۡۗ وَٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فِي رَوۡضَاتِ ٱلۡجَنَّاتِۖ لَهُم
مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمۡۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَضۡلُ ٱلۡكَبِيرُ (٢٢)

(١٦): ﴿ وَٱلَّذِينَ يُحَآجُّونَ فِي ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مَا ٱسۡتُجِيبَ لَهُۥ حُجَّتُهُمۡ دَاحِضَةٌ عِندَ رَبِّهِمۡ وَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ وَلَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٌ (١٦) ﴾:

ئەمە جێگیرکردنی وتەی خوایە کە دەفەرموێ: ﴿ لَا حُجَّةَ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمُۖ (١٥) ﴾ الشـوری، ﴿ وَٱلَّذِينَ يُحَآجُّونَ فِي ٱللَّهِ ﴾ (واتە: ئەوانەی دەمە دەمێ دەکەن لە بارەی خواوە) بە بەڵگەی پووچو گومانی دژ بەیەکتر، ﴿ مِنۢ بَعۡدِ مَا ٱسۡتُجِيبَ لَهُۥ ﴾ واتە: لە دوای ئەوەی خاوەن دڵو عەقڵە ژیرەکان وەڵامی خوایان دایەوە، کاتێ بۆی ڕوون کردنەوە لە بەڵگە یەکلاکەرەکانو سەلماندنە درەوشاوەکان، ئەوانەی مشتو مڕی حەق دەکەن، دوای ئەوەی کە ڕوون بوویەوە ﴿ حُجَّتُهُمۡ دَاحِضَةٌ ﴾ واتە: بەڵگەکانیان پووچو ڕەتکراوەیە ﴿ عِندَ رَبِّهِمۡ ﴾ (لە لای پەروەردگاریان) چونکە ڕەتکردنەوەی حەقی لەخۆ گرتووە، وە هەر شتێ پێچەوانەی حەق بێت ئەوە پووچە. ﴿ وَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ ﴾ (وە خەشمو قینی خوایان لەسەرە) بە هۆی سەرپێچی کردنیانو ڕوو وەرگێڕانیان لە بەڵگەکانی خواو ڕوون کراوەکانی، وە بە درۆدانانیان، ﴿ وَلَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٌ ﴾ ئەویش شوێنەواری خەشمو قینی خوایە لەسەریان، ئەمە سزای هەموو مشتومڕکارێکی حەقە بە پووچ.

(١٧-١٨): ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ وَٱلۡمِيزَانَۗ وَمَا يُدۡرِيكَ لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ قَرِيبٞ (١٧) يَسۡتَعۡجِلُ بِهَا ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِهَاۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مُشۡفِقُونَ مِنۡهَا وَيَعۡلَمُونَ أَنَّهَا ٱلۡحَقُّۗ أَلَآ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُمَارُونَ فِي ٱلسَّاعَةِ لَفِي ضَلَٰلِۢ بَعِيدٍ (١٨) ﴾:

کاتێ خوا ﷻ باسی کرد کە بێگومان بەڵگەکانی ڕوونو ئاشکران، بە جۆرێ وەریدەگرێو بەدەمیەوە دەچێ هەر کەسێ خێرو چاکەی تێدا بێ، ئنجا باسی بنچینەو یاساکانی کرد، بەڵکو هەموو بەڵگەکان کە گەیاندوویەتی بە بەندەکانی، جا فەرموویەتی:

﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ وَٱلْمِيزَانَ ﴾(خـوا ئـەو زاتەیـە کە ئەم قورئانەی بەڕاسـتی ناردۆتـە خـوارەوە وە تـەرازووی ناردووە بـۆ جیاکردنەوەی حـەق‌و بەتاڵ) جا مەبەسـت لە کتێـب بریتیـە لـە قورئانی مـەزن، بە حـەق‌و ڕاسـتی دابەزیوە، وە حـەق‌و ڕاسـتی‌و دڵنیایی لەخـۆ دەگـرێ، هەموو ئایـەت‌و دەقەکانـی ڕوونکـەرەوەن‌و بەڵگەی دیارن، لەسـەر هەموو داواکاریەکـی خوایـی‌و بیـروو باوەڕێکـی ئاینـی، جـا بـە چاکتریـن بابـەت‌و ڕوونتریـن بەڵگـەوە هاتووە.

بـەڵام تـەرازوو بریتیـە لـە دادپـەروەری‌و بایەخـدان بە قیاسـی ڕاسـتەقینەو عەقـڵ‌و ژیری تـەواو، جـا هەموو بەڵگـە عەقڵیەکان لـە ئایەت‌و نیشـانە گەردوونی‌و نەفـس‌و دەروونەکان، وە بایەخدانـە شـەرعیەکان‌و هـۆکارو بڕیـارەکان‌و حیکمەتـەکان، لە نێو ئەو تـەرازووەدان کـە خـوا دایبەزاندوەو لـە نێـوان بەندەکانی دایاننـاوە، بۆ ئـەوەی بیپێون بەو تـەرازووە هەر شـتێک کـە جێگـای گومانــە لـە کاروبـارەکان، وە پێی بناسـنەوە ڕاسـتی ئـەوەی هەواڵی پێـداوەو، وە ڕاسـتی ئـەوەی پێغەمبەرانـی هەواڵیـان پێی داوە، جـا هەر شـتێک دەربچێ لەم دووکارە -کـە بریتیـە لـە کتێب‌و تـەرازوو- لـەوەی بوترێ ئـەوە بەڵگەیە یان سـەلماندن، یـان حوججـە، یـان وێنـەی ئەوانە لـە دەسـتەواژەکان، ئـەوە پـووچ‌و بەتـاڵ‌و پێچەوانەیە، بنەماکـەی تێکچـووەو بنچینەو لـق‌و پۆکانی ڕووخاوە. ئـەوە دەزانرێ لە هەواڵـی بابەتەکان‌و جیاکردنـەوەی لـە نێـوان بەڵگـەی تـەواو و ناتـەواودا، وە جیـاوازی لـە نێـوان بەڵگەکان‌و گومانەکاندا.

بەڵام هەر کەسـێ بـەو دەسـتەواژە ڕازاوەو قسـە فریودەرانـە هەڵخەڵەتاوە، بینایـی‌و بەرچاو ڕوونـی نەگەیشـتۆتە ئـەوەی مانای پێویسـت بچەسـپێنێ، ئەوە نە لـە خاوەنی ئـەم پلەو پایە نیـە، وە نـە لە سـەربازی ئـەم گۆڕەپانە، جـا گونجـان‌و جیاوازبوونی وەک یـەک وایە.

پاشـان خوا ﷻ ئەو کەسـانە دەترسـێنێ کە پەلە دەکەن لـە هاتنی ڕۆژی دوایـی‌و نکوڵی لێ دەکـەن، فەرموویەتـی: ﴿ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ قَرِيبٌ ﴾ واتـە: (تـۆ چوزانیـت لەوانەیە هاتنـی ڕۆژی دوایـی زۆر نزیـک بێـت) زانـراو نیـە دوای ڕۆژی دوایـی، وە نازانرێ کەی دێ، ئـەو لە هەمـوو کاتێکدا چـاوەڕوان دەکـرێ ڕووبدات.

﴿ يَسْتَعْجِلُ بِهَا ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِهَا ﴾ (ئەوانـەی باوەڕیـان پێـی نیـە پەلـەی هاتنـی دەکـەن) بە عینادیکردن‌و بەدرۆ دانان، وە دەستەوسـانی پەروەردگاریان ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مُشْفِقُونَ مِنْهَا ﴾ واتـە: (بـەڵام ئەوانـەی بڕوایان پێی هەیە) دەترسـن، چونکـە بڕوایان پێی

هەیـە، وە زانسـتیان هەیـە بـەوەی پاداشـتی کـردەوەکان دەدرێتـەوە، وە دەترسـن بە هۆی ناسـینی پەروەردگاریانـەوە، لـەوەی کردەوەکانیـان رزگـار کەریـان نەبـێ‌و بەختەوەریان نـەکات. لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ وَيَعۡلَمُونَ أَنَّهَا ٱلۡحَقُّۗ ﴾ کـە هیـچ گومـان‌و دوو دڵیەکـی تێـدا نیـە ﴿ أَلَآ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُمَارُونَ فِي ٱلسَّاعَةِ ﴾ واتـە: (بێـدار بـن ئەوانـەی کە گومانیـان هەیـە لـە ڕۆژی دوایی) دوای ئـەوەی بە گومـان‌و دوو دڵ بوون تیایـدا، داوایان کـرد لە پێغەمبەران‌و شـوێنکەوتوانیان بە چەسـپاندنی، بەڕاسـتی ئەوانە لـە گومڕاییەکی زۆر دوور دان، دڕایەتیەکـی ئـەو پـەڕی دووری لە حەق‌و ڕاسـتی.

چ دووریـەک لـەوە دوورتـرە کە کەسـێک ڕۆژی دوایـی بەدرۆ بخاتـەوە، کە ئـەوە ماڵی ڕاستەقینەیە، ئـەو ماڵەی دروسـتکراوە بۆ مانەوەی هەتـا هەتایی‌و هەمیشـەیی، ئەویش ماڵی پاداشـتە، کـە دادپـەروەری‌و فەزڵـی خـوای تێـدا دەردەکـەوێ؟ جـا ئـەم ماڵە بە نیسـبەتی ژیانـی دونیـا وەک ڕێبوارێـک وایـە کە لـە سـێبەری دارێکـدا بخەوێت‌و قەیلولـە بکات، پاشـان جێـی بهێڵـی‌و بڕوا، ئـەوە ماڵـی تێپەڕاندن‌و ڕۆشـتنە نەک شـوێن‌و جێگـای مانەوە، جـا ئـەم ماڵـە پەرش‌و بـڵاوە کاتیەیـان بە ڕاسـت دانا کاتـێ بینیان‌و تەماشـایان کـرد، وە ڕۆژی دواییـان بـەدرۆ دەخسـتەوە، کـە هەواڵـەکان بەیەک دەنگـی هاتوون دەربـارەی، لە کتێبـە ئاسـمانیەکان‌و لە پێغەمبـەرە بەڕێـزەکان‌و شـوێنکەوتووانیان، کە ئـەوان چاکترینی خەڵکیـن لـەڕووی عەقڵەوە، وە خاوەنی زۆرترین زانسـتن، وە مەزنترین هۆشـیاری‌و ژیری‌و تێگەیشتن.

(١٩-٢٠): ﴿ ٱللَّهُ لَطِيفُۢ بِعِبَادِهِۦ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُۖ وَهُوَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡعَزِيزُ ١٩ مَن كَانَ يُرِيدُ حَرۡثَ ٱلۡأٓخِرَةِ نَزِدۡ لَهُۥ فِي حَرۡثِهِۦۖ وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرۡثَ ٱلدُّنۡيَا نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَا وَمَا لَهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ ٢٠ ﴾:

﴿ ٱللَّهُ لَطِيفُۢ بِعِبَادِهِۦ ﴾ خـوا ﷻ هەواڵ دەدات بـە بەزەیی‌و دڵسـۆزی بەندەکانی بۆئەوەی بیناسـنەوەو خۆشـیان بـوێ، بـۆ ئـەوەی بەزەیـی‌و ڕێـزی خـوا بەدەسـت بێنـن. بەزەیـی‌و دڵسـۆزی لـە سـیفاتەکانی خوایـە، مانـای ئەوەیـە: ئـەو زاتـەی بـە نـاوەڕۆک‌و نهێنیەکان دەزانـێ، کـە دەیگەیەنێ بـە بەندەکانی -بە تایبەت بەنـدە بڕوادارەکان- لـەو خێرو چاکەیەی ئـەوان نەپێـی دەزانـن‌و نە هەسـتی پێدەکـەن، جا لەبەزەیـی بە بەنـدە بڕوادارەکـەی ئەوەیە ڕێنمایـی کـردوە بۆ خێـر بـە ڕێنماییکردنێ کە بـە خەیاڵیدا نەهاتـووە، لـەو هۆکارانەی بۆ ئاسـانکردوە کـە پاڵنـەرن بۆ لای ئـەو هیدایەتە، لە سروشـتیدا لەسـەر خۆشویسـتنی حەق‌و

ملکەچبوون بۆی، وە فەرمانکردن بە فریشتە بەڕێزەکان کە بەندە بڕوادارەکانی پابەند بکەنو هانیان بدەن لەسەر خێرو چاکە، وە حەقو ڕاستی لەناو دڵەکانیان جوان بکەن، کە ببێتە مایەی شوێنکەوتنی.

لە بەزەیی خوا ﷻ ئەوەیە کە فەرمانی کردوە بە بڕواداران بەو پەرستشانەی بە کۆمەڵ ئەنجام دەدرێن، کە بە هۆیانەوە عەزیمەتیان بەهێز دەکاتو هیممەتو وورەیان بەرز دەکاتەوە، دەبێتە مایەی کێبڕکێ کردن لەسەر خێرو چاکەو هاندان تیایدا، وە پەیڕەوکردنی هەندێکیان بە هەندێکی دیکەیان. لە بەزەیی خوا ئەوەیە هەموو هۆکارێکی بۆ بەندەکەی نووسیوە کە دەبێتە بەربەست لە نێوان ئەو نێوانی سەرپێچی کردن، تەنانەت بێگومان خوا ﷻ زانیویەتی کە دونیاو ماڵو دەسەڵاتو وێنەی ئەوانیش لەوانەی خەڵکی دونیا کێبڕکێی تێدا دەکەن بەندەکەی دەپچڕێنێ لە گوێڕایەڵیکردنی یان بێئاگای دەکات لێی، یان بە سەرپێچی کردنی دووری خستۆتەوە لێیو ڕزقو ڕۆزی بۆ دیاریکردوە، لەبەر ئەمەیە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُ ﴾ بە پێی داخوازی حیکمەتو میهرەبانی خۆی ﴿ وَهُوَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡعَزِيزُ ﴾ ئەو زاتەی خاوەنی هێزی تەواوە، هیچ هەوڵو تواناو هێزێک نیە بۆ هیچ یەکێ لە بەدیهێنراوەکان، تەنها بە توانای ئەو نەبێ، ئەو زاتەی هەموو بەدیهێنراوەکان گەردن کەچی بوون.

پاشان فەرموویەتی: ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ حَرۡثَ ٱلۡأٓخِرَةِ ﴾ واتە: ئەجرو پاداشتی ڕۆژی دوایی، بڕوای پێ بهێنێو بە ڕاستی دابنێو کۆششی بۆ بکات، ﴿ نَزِدۡ لَهُۥ فِي حَرۡثِهِۦۖ ﴾ (واتە: ئێمە بەرهەمەکەی بۆ زیاد دەکەین) بەوەی کردەوەکەی بۆ چەند قات دەکەینو پاداشتی دەدەینەوە بە چەند ئەوەندەیەکی زۆرتر، هەروەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَمَنۡ أَرَادَ ٱلۡأٓخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعۡيَهَا وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ كَانَ سَعۡيُهُم مَّشۡكُورٗا ١٩ ﴾الإسراء، (واتە: هەرکەسێکیش مەبەستی ڕۆژی دوایی بوویێت وە هەوڵی بۆ بدات بەو جۆرەی شایستەی ئەوە وە برواداریش بێت ئا ئەوانە کردەوەو تێکۆشانەکەیان وەرگیراوە)، وە لەگەڵ ئەوەدا، بەشی لە دونیادا هەر دەبێ پێی بگات. ﴿ وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرۡثَ ٱلدُّنۡيَا ﴾ (واتە: هەر کەسێک بەرهەمی دونیای بوێ) بەوەی: دونیا تاکە مەبەستو ئامانجو داواکراوی بێ، وە هیچی پێشنەخستبێ بۆ دوارۆژیو ئومێدی پاداشتی نەبێو لە سزای نەترسابێ ﴿ نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَا ﴾ (هەندێ لە دونیای پێ دەدەین) کە بەشیەتیو بۆی دیاریکراوە، ﴿ وَمَا لَهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ ﴾ بێگومان بەهەشتو نازونیعمەتەکانی

لەسـەر حـەرام بوو، وە شایسـتەی ئاگـرو ناخۆشـیەکانی بوو.
ئەم ئایەتـە وەک ئەو ئایەتەیە دەفەرمـوێ: ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَٰلَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ ﴿١٥﴾ ﴾هود، (واتـە: هـەر کـەس دەیەوێـت ژیانـی دونیاو ڕازاوەو جوانـی ئـەوە ئێمە بەرهەمـی کردەوەکانیان بە تـەواوی پێ دەدەین تیایـدا وە ئەوان لـەم ژیانەدا کـەمو کوریـان لەگەڵ ناکرێـت) تا کۆتایـی دەقەکە.
(٢١-٢٣): ﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ۚ وَلَوْلَا كَلِمَةُ ٱلْفَصْلِ لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ ۗ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢١﴾ تَرَى ٱلظَّٰلِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا كَسَبُواْ وَهُوَ وَاقِعٌۢ بِهِمْ ۗ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فِى رَوْضَاتِ ٱلْجَنَّاتِ ۖ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمْ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْكَبِيرُ ﴿٢٢﴾ ذَٰلِكَ ٱلَّذِى يُبَشِّرُ ٱللَّهُ عِبَادَهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ۗ قُل لَّآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِلَّا ٱلْمَوَدَّةَ فِى ٱلْقُرْبَىٰ ۗ وَمَن يَقْتَرِفْ حَسَنَةً نَّزِدْ لَهُۥ فِيهَا حُسْنًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ شَكُورٌ ﴿٢٣﴾ ﴾:
﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُاْ ﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدات کە بەڕاسـتی هاوبەشـدانەران هاوبەشانێکیان دانـاوە، پشـتیوانیان لێدەکـەنو بەشـدارن لـە گەڵیانـدا لـە بێبڕوایـیو کردەوەکانـی، لـە شـەیتانەکانی ئادەمیزاد بانگخـوازان بۆ لای کوفرو بێبڕوایـی، ﴿ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ﴾ (واتـە: ئاینێکیـان بۆ داناون کـە خوا ڕێگەی پێنەداوە) لە هاوبەشـدانانو بیدعـە، وە حەرامکردنـی ئـەوەی خوا حەرامـی کردوەو حـەڵاڵ کردنـی حەرامکراوەکانی، وە وێنـەی ئەوانـەش لەوەی هـەواو ئارەزووەکانیـان دەیخوازێ.
لەگـەڵ ئـەوەدا ئایـن تەنها ئەوەیە کـە خوا ﷻ داینـاوە، تا بەنـدەکان بەندایەتی پـێ بکەنو لێـی نزیـک ببنـەوە بـە هۆیـەوە، جا ئەصـڵو بنەمـا وایـە ڕێگری لە هـەر کەسـێ دەکرێ کـە شـتێک لـە ئاین دابنـێ لـە لایـەن خـواو پێغەمبەرەکەیـەوە نەهاتبـێ، جا ئەو فاسـقو تاوانبـارە هاوبەشـدانەرانە کـە لەسـەر کوفـرو بێبڕوایی بـوون، ﴿ وَلَوْلَا كَلِمَةُ ٱلْفَصْلِ لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ ﴾ واتـە: ئەگـەر کاتو ئەجـەلو دیاریکـراو نەبوایە، کە خـوا ﷻ کردوویەتی بـە جیاکەرەوەیـەک لـە نێـوان دەسـتە جیاوازەکانـدا، بێگومـان ئـەو دوایـان دەخـات، لە نێوانیانـدا بڕیـار دەدرا هـەر لـە ئێسـتادا بـە بەختـەوەری ڕاسـتگۆیانو لەناوچوونـی بەدرۆ دانـەران، چونکە پێویسـتبوونی لەناو چـوون بوونی هەیە، بەڵام سـزای بە ئێش لـە دواڕۆژدا لە پێشـیانە، ئـەوانو هەموو سـتەمکارێک.
ئـا لـەو ڕۆژەدا ﴿ تَرَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ (تـۆ سـتەمکاران دەبینـی) ئەوانـەی سـتەمیان لـە

نەفسـی خۆیان کردوە بـە کوفرو سـەرپێچیکردن ﴿ مُشْفِقِينَ ﴾ واتە: دەترسـن‌و دڵیان دەلـەرزێ ﴿ مِمَّا كَسَبُوا ﴾ (لـە تـاو ئـەوەی کردوویانە) کە سـزا بدرێن لە سـەری. کاتـێ کـە ترسـنۆک هەنـدێ جار تووشـی ئەوە دەبـێ کە لێـی ترسـاوە، وە هەنـدێ جار تووشـی نابـێ، خوا ﷻ هەواڵیـداوە کە بێگومان ئـەو سـزایە ﴿ وَاقِعٌ بِهِمْ ﴾ (دووچاریان دەبێـت) کە لێی ترسـاون، چونکە هۆکاری پێویسـتکاری سـزایان هێناوە، بەبـێ خۆپارێزی لـە تەوبـەو داوای لێخۆشـبوون‌و جگـە لەویش، گەیشـتن بـە شـوێنێ مۆڵـەت‌و چاوەڕوانی تێدا کۆتایـی پێهاتووە.

﴿ وَالَّذِينَ آمَنُوا ﴾ (ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوە) بـە دڵەکانیـان، بـە خـواو کتێبەکانـی‌و پێغەمبەرانـی‌و ئەوەیشـی کـە هێناویانـە ﴿ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ ﴾ هەمـوو کردەوەیەکـی چـاک دەگرێتـەوە لـە کردەوەکانی دڵ‌و کردەوەکانی جەسـتە، لە پێویسـت‌و پەسـندەکان، جـا ئەوانە ﴿ فِي رَوْضَاتِ الْجَنَّاتِ ﴾ واتە: ئـەو باخچانەی دراونەتە پاڵ بەهەشـتەکان، دانەپاڵیـش بەپێـی دراوە پـاڵ دەبـێ، پرسـیار ناکـرێ لـە جوانـی‌و ڕازاوەیـی‌و دیمەنی ئەو باخچانـە، وە ئەوەیشـی تیایاندایـە، لەو ئاوە هەڵقوڵاوانەو سروشـتە سەرنجراکێشـانەو درەختە بـە بەرهەمانـە، وە ئـەو باڵندانـەی تێیـدا دەخوێنـن، وە دەنگە خـۆش‌و سەرنجراکێشـەکان‌و کۆبوونـەوەی هەمـوو خۆشەویسـتان، وە پێکـەوە ژیـان‌و هاودەمـی بـە چاکترین شـێوە ، بـاخ‌و باخاتێکـە بەدرێـژای چـاو بـردەکا پڕە لـە جوانـی، وە خەڵکەکەیشـی بە بـەردەوام تیایـدا دڵخۆشـن‌و لەزەتـی لێوەردەگـرن ﴿ لَهُم مَّا يَشَاءُونَ ﴾ تیایـدا، واتە: لە بەهەشـتەکان هەرچیـان بـوێ ئەوە دەسـتەبەرە بۆیـان، وە داوای هەرچی بکـەن ئامادەیە لەوانـەی کە چاو نەیبینیـوەو گـوێ نەیبیسـتوەو بـە خەتەرەش بەسـەر دڵی هیـچ مرۆڤێکـدا نەهاتووە.

﴿ ذَلِكَ هُوَ الْفَضْلُ الْكَبِيرُ ﴾ ئایـا سـەرکەوتنێ هەیـە گەورەتـر بـێ لـە سـەرکەوتنێ بە ڕازی بوونـی خـوا ﷻ، وە چێـژ وەرگرتـن لـە نزیکـی ئەو لـە ماڵی پـڕ لـە ڕێزیدا؟

ذَٰلِكَ ٱلَّذِى يُبَشِّرُ ٱللَّهُ عِبَادَهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ۗ
قُل لَّآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِلَّا ٱلْمَوَدَّةَ فِى ٱلْقُرْبَىٰ ۗ وَمَن يَقْتَرِفْ
حَسَنَةً نَّزِدْ لَهُۥ فِيهَا حُسْنًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ شَكُورٌ ﴿٢٣﴾ أَمْ يَقُولُونَ
ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ۖ فَإِن يَشَإِ ٱللَّهُ يَخْتِمْ عَلَىٰ قَلْبِكَ ۗ وَيَمْحُ ٱللَّهُ
ٱلْبَٰطِلَ وَيُحِقُّ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٢٤﴾
وَهُوَ ٱلَّذِى يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ وَيَعْفُوا۟ عَنِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ
وَيَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ ﴿٢٥﴾ وَيَسْتَجِيبُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟
ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضْلِهِۦ ۚ وَٱلْكَٰفِرُونَ لَهُمْ عَذَابٌ
شَدِيدٌ ﴿٢٦﴾ ۞ وَلَوْ بَسَطَ ٱللَّهُ ٱلرِّزْقَ لِعِبَادِهِۦ لَبَغَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ
وَلَٰكِن يُنَزِّلُ بِقَدَرٍ مَّا يَشَآءُ ۚ إِنَّهُۥ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرٌۢ بَصِيرٌ ﴿٢٧﴾ وَهُوَ
ٱلَّذِى يُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ مِنۢ بَعْدِ مَا قَنَطُوا۟ وَيَنشُرُ رَحْمَتَهُۥ ۚ وَهُوَ ٱلْوَلِىُّ ٱلْحَمِيدُ
﴿٢٨﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَثَّ فِيهِمَا مِن دَآبَّةٍ ۚ
وَهُوَ عَلَىٰ جَمْعِهِمْ إِذَا يَشَآءُ قَدِيرٌ ﴿٢٩﴾ وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا
كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُوا۟ عَن كَثِيرٍ ﴿٣٠﴾ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ
فِى ٱلْأَرْضِ ۖ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿٣١﴾

﴿ ذَٰلِكَ ٱلَّذِى يُبَشِّرُ ٱللَّهُ عِبَادَهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾ واتە: ئەم مژدە مەزنە کە گەورەترینی مژدەکانە بە ڕەهایی، خوای بە سۆزو بە بەزەیی مژدەی پێداوە لەسەر دەستی چاکترین بەدیهێنراوەکانی، بۆ خاوەن بڕواو کردەوەی چاک، ئەوە گەورەترینی مەبەستەکانە، وە هۆکاری گەیەنەرە بۆ ئەو مژدانە بە چاکترین هۆکارەکان ﴿ قُل لَّآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ ﴾ واتە: (داوای هیچ پاداشتێکتان لێ ناکەم) لەسەر گەیاندنی ئەم قورئانە بە ئێوە، وە بانگەوازکردنتان بۆ لای بڕیارەکانی، ﴿ أَجْرًا ﴾ نامەوێ ماڵەکانتان وەربگرم، وە ببم بە دەسەڵاتدارو سەرۆکتان، وە جگە لەوانەش لە مەبەستەکانی دیکە ﴿ إِلَّا ٱلْمَوَدَّةَ فِى ٱلْقُرْبَىٰ ﴾ (مەگەر خۆشەویستی خزمایەتی).

دەگونجێ مەبەست داوای هیچ پاداشتێکتان لێ ناکەم، ئەویش بۆ ئێوەیەو سوودەکەی دەگەڕێتەوە بۆ خۆتان، ئەویش ئەوەیە منتان خۆش بوێ بە هۆی خزمایەتیەوە، وە ئەو خۆشەویستیەش زیاد لە سەرووی ئیمانەوە بێ، چونکە خۆشەویستی ئیمان بە پێغەمبەر ﷺو پێشخستنی بەسەر هەموو خۆشەویستاندا دوای خۆشەویستی خوا فەرزە لەسەر هەموو مسوڵمانێ، ئەوان داوای ئەوەیان لێکرا زیاد لەو خۆشەویستیە کە خۆشیان بوێ بە هۆی خزمایەتیەوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ بانگەوازی نزیکترینی کەسی خۆی کرد، هەتا وتراوە: لە ناو قوڕەیشدا کەسێک نیە مەگەر پێغەمبەری خوا نزیکایەتی لەگەڵیدا هەیە.

وە دەگونجێ مەبەست: مەگەر خۆشەویستی خوای بەرز بە ڕاستەقینە، ئەویش خۆشەویستیەکە نزیکی بکاتەوە لە خوا، وە پاڕانەوە بە گوێڕایەڵی کردنی کە بەڵگەیە لەسەر ڕاستیو دروستی ئەو خۆشەویستیە، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ إِلَّا ٱلْمَوَدَّةَ فِى ٱلْقُرْبَىٰ ﴾ واتە: لە نزیک بوونەوە لە خوا.

وە لەسەر ئەم دوو قسەیە ئەم جیاکردنەوەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو بە گشتی داوای پاداشتیان

لێ ناکات، مەگەر شتێ کە سوودەکەی بگەڕێتەوە بۆ خۆیان، ئەمیش هیچی لە پاداشتدا نیە، بەڵکو ئەوە پاداشتی پێغەمبەری خوایە بۆ ئەوان، وەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَمَا نَقَمُوا مِنْهُمْ إِلَّا أَن يُؤْمِنُوا بِاللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ ﴿٨﴾ ﴾البروج. (واتە: ئەم سزایەشیان هەر لەبەر ئەوە دەدران کە بڕوایان هێنا بە خوای بە دەسەڵاتی سوپاسکراو) وە وتەی ئەوان: فڵان کەس تاوانی نیە لە لای تۆ، تەنها ئەوە نەبێ چاکە لەگەڵتدا.

﴿ وَمَن يَقْتَرِفْ حَسَنَةً ﴾ (هەر کەس هەر چاکەیە بکات) لە نوێژ، یان ڕۆژو، یان حەج، یاخود چاکە لەگەڵ خەڵکیدا ﴿ نَّزِدْ لَهُ فِيهَا حُسْنًا ﴾ (بۆی زیاد دەکەین بە چەند بەرانبەر) بەوەی خوا ﷻ سنگی دەکاتەوەو کاری بۆ ئاسان دەکات، ئەوەش دەبێتە هۆکارێک بۆ سەرکەوتن بۆ کردەوەیەکی دیکە، وە بە هۆیەوە بڕوادار کردەوەی پێی زیاد دەبێ‌و لەلای خواو خەڵکی بەرز دەبێتەوە، پاداشتی بە پەلەو دواخراوی بۆ دەستەبەر دەبێ.

﴿ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ شَكُورٌ ﴾ لە تاوانە مەزنەکان دەبورێ ئەگەر چەندە زۆریش بێ، لەکاتی تەوبەکردن لێیان، وە سوپاسگوزارە لە سەر کردەوەیەکی کەم بە پاداشتی زۆر، جا بە لێبوردەیی لە گوناهەکان دەبورێ‌و کەم‌و کوڕیەکان دەپۆشێ، وە بە سوپاسگوزاری چاکەکان وەردەگرێ‌و چەند بەرانبەریان دەکات، بە چەند قاتێکی زۆر.

(٢٤): ﴿ أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا فَإِن يَشَإِ اللَّهُ يَخْتِمْ عَلَىٰ قَلْبِكَ وَيَمْحُ اللَّهُ الْبَاطِلَ وَيُحِقُّ الْحَقَّ بِكَلِمَاتِهِ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ ﴿٢٤﴾ ﴾

﴿ أَمْ يَقُولُونَ ﴾ واتە: یان ئەو بێبڕوایانە بە پێغەمبەر ﷺ بە چاو قایمی‌و بەدرۆدانانەوە دەڵێن: ﴿ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا ﴾ (واتە: درۆی بە ناوی خواوە هەڵبەستووە) تۆمەتباریان کردی بە ناشرینترین کارو خراپترینیان، ئەویش درۆ هەڵبەستن بوو بەدەم خواوە، بە بانگەشە کردنی پێغەمبەرایەتی‌و دانەپاڵی خوا ﷻ کە ئەو لێی بەریە، ئەوان ڕاستێتی‌و دەستپاکی تۆیان دەزانی، جا ئیتر چۆن بوێریان دەکرد لە سەر درۆکردن بە ئاشکرا؟ بەڵکو بەوە بوێریان دەکرد لەسەر خوا، بێگومان ئەوە لەکەدار کردنی خوایە، کاتێ جێگیری کردی لەسەر ئەم بانگەوازە مەزنە، کە لە خۆی گرتووە -لەو ڕووەی ئەوان پێیان وابوو- گەورەترین فەسادو خراپەکاری لەسەر زەویدا، کاتێ خوا ﷻ جێگیری کردبوو بە ڕاگەیاندنی بانگەوازەکەی، پاشان بە دانەپاڵی بەلای خۆی، پاشان پشتگیری کرد بە موعجیزە ئاشکراکان‌و بەڵگە زاڵەکان‌و سەرکەوتنی ڕوون، وە دەست بەسەراگرتنی ئەوەی پێچەوانەیەتی، ئەو زاتە زاڵە لەسەر کۆتایی پێهێنانی ئەم بانگەوازە لە بنەڕەت‌و بنچینەیدا، ئەویش ئەوەیە مۆرێ بدا بەسەر دڵی پێغەمبەر ﷺ، هیچ هۆشیاریەکی

نه‌مێنێ‌و هیچ خێرێک بۆ لای نه‌چێ، ئه‌گه‌ر مۆریدا به‌سه‌ریدا كاره‌كه‌ كۆتایی پێ دێ‌و ده‌پچڕێ. ئه‌مه‌ به‌ڵگه‌یه‌كی یه‌كلاكه‌ره‌وه‌یه‌ له‌سه‌ر ڕاستی ئه‌و په‌یامه‌ی پێغه‌مبه‌ر هێناویه‌تی، وه‌ گه‌وره‌ترین شایه‌تیه‌ له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی فه‌رموویه‌تی، هیچ شایه‌تیدانێک مه‌زنترو گه‌وره‌تر نیه‌ له‌وه‌، وه‌ له‌به‌ر ئه‌مه‌ له‌ حیكمه‌ت‌و میهره‌بانی‌و سوننه‌تی به‌رده‌وامی خوا ئه‌وه‌یه‌ كه‌ بێگومان ئه‌و به‌تاڵ‌و پووچ لاده‌باو ده‌یسڕێته‌وه‌، ئه‌گه‌رچی له‌ هه‌ندێ كاتدا ده‌ست‌و توانای هه‌بێ، به‌ڵام سه‌ره‌نجام په‌رش‌و بڵاوی‌و له‌ناوچوونه‌. ﴿ وَيُحِقُّ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦٓ ﴾ (واته‌: وه‌ به‌ وته‌كانی جێگیری ده‌كات ڕاستیه‌) گه‌ردوونیه‌كان، كه‌ نه‌ ده‌گۆڕێ‌و نه‌ ده‌ستكاری ده‌كرێ، وه‌ په‌یمانی ڕاسته‌، وه‌ وته‌ ئاینیه‌كانی كه‌ ڕاستیه‌كان جێگیر ده‌كات له‌وه‌ی داناوه‌ له‌ حه‌ق، له‌ دڵه‌كانیشدا ده‌یچه‌سپێنێت‌و نیشانی خاوه‌ن دڵه‌كانی ده‌دات، هه‌تا له‌ كۆی به‌ حه‌ق دانانی خوا بۆ حه‌ق، ئه‌وه‌یه‌ به‌تاڵ‌و پووچی له‌ به‌رانبه‌ری داناوه‌ بۆ ئه‌وه‌ی ڕووبه‌ڕووی ببێته‌وه‌، جا ئه‌گه‌ر به‌رگری كرد حه‌ق به‌سه‌ریدا زاڵ ده‌بێ به‌ به‌ڵگه‌ ڕوونه‌كانی، جا ده‌رده‌كه‌وێ له‌ ڕووناكی‌و هیدایه‌تی كه‌ به‌ هۆیه‌وه‌ پووچ‌و به‌تاڵ په‌رش‌و بڵاو ده‌بن‌و نامێنن، تا ڕووناكی ده‌رده‌كه‌وێ بۆ هه‌موو كه‌سێک، حه‌قیش ده‌رده‌كه‌وێ به‌وپه‌ڕی ده‌ركه‌وتن بۆ هه‌موو كه‌سێک.

﴿ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴾ واته‌: (به‌ڕاستی خوا زانایه‌) به‌وه‌ی له‌ ناو دڵه‌كاندایه‌، وه‌ ئه‌وه‌شی وه‌سفی پێكراوه‌ له‌ خێرو شه‌ر، وه‌ ئه‌وه‌شی شاردوویه‌تیه‌وه‌و ده‌ری نه‌خستووه‌.

(٢٥-٢٨): ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ وَيَعْفُواْ عَنِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ وَيَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ
(٢٥) وَيَسْتَجِيبُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضْلِهِۦ ۚ وَٱلْكَٰفِرُونَ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ
(٢٦) وَلَوْ بَسَطَ ٱللَّهُ ٱلرِّزْقَ لِعِبَادِهِۦ لَبَغَوْاْ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَٰكِن يُنَزِّلُ بِقَدَرٍ مَّا يَشَآءُ ۚ إِنَّهُۥ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرٌۢ بَصِيرٌ
(٢٧) وَهُوَ ٱلَّذِى يُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ مِنۢ بَعْدِ مَا قَنَطُواْ وَيَنشُرُ رَحْمَتَهُۥ ۚ وَهُوَ ٱلْوَلِىُّ ٱلْحَمِيدُ (٢٨) ﴾

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ ﴾ (واته‌: ئه‌و خوا زاتێكه‌ ته‌وبه‌ له‌ به‌نده‌كانی وه‌رده‌گرێت) ئه‌مه‌ ڕوونكردنه‌وه‌یه‌ به‌ ته‌واوی ڕێزداری خواو فراوانی به‌خششه‌كانی‌و ته‌واوی به‌زه‌یی‌ومیهره‌بانی، به‌ وه‌رگرتنی داوای لێخۆشبوون كه‌ ده‌رچووه‌ له‌ به‌نده‌كانیه‌وه‌ كاتێ خۆیان له‌ گوناهه‌كانیان داده‌ڕنن‌و په‌شیمان ده‌بنه‌وه‌و سوور ده‌بن كه‌ جارێكی تر دووباره‌ی نه‌كه‌نه‌وه‌، ئه‌گه‌ر مه‌به‌ستیان له‌و ته‌وبه‌كردنه‌دا په‌روه‌ردگاریان بێت، بێگومان خوا وه‌ریده‌گرێ دوای ئه‌وه‌ی هۆكاری له‌ناو چوون بووه‌، وه‌ تووشبوونی سزای دنیایی‌و ئاینی.

﴿ وَيَعْفُواْ عَنِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ﴾ (واته‌: وه‌ چاوپۆشی له‌ كرده‌وه‌ به‌ده‌كان ده‌كات) وه‌ ده‌یانسڕێته‌وه‌، شوێنه‌واره‌كانیشیان ده‌سڕێته‌وه‌ له‌ كه‌م‌و كوڕیه‌كان، ئه‌وه‌شی پێویست بووه‌ له‌ تۆڵه‌كان،

تەوبەکار لە لای خوا بەڕێز دەبێ، وەکو ئەوەی بە هیچ شێوەیەک کاری خراپی نەکردبێ، وە خۆشی دەوێ‌و سەرکەوتووی دەکات لەوەی لێی نزیک دەبێتەوە.
کاتێ تەوبە کردن لە کردەوە مەزنەکانە کە هەندێ جار تەوبەکە تەواوە بە هۆی تەواوی دڵسۆزی‌و ڕاستگۆیی تیایدا، وە هەندێ جار ناتەواوە لە کاتی ناتەواو بوونی (دڵسۆزی‌و ڕاستگۆیی)، وە هەندێ جار فاسیدو تێکچووە، ئەگەر مەبەست تیایدا گەیشتن بێت بە مەبەستێک لە مەبەستە دونیاییەکان، جا کاتێ شوێنی ئەو دڵە کەس نایزانێ جگە لە خوا، ئەم دەقەی تەواو کردوە بەو فەرمایشتەی خۆی: ﴿وَيَعۡلَمُ مَا تَفۡعَلُونَ﴾ (واتە: وە دەزانێ بە هەرچی کە ئێوە دەیکەن).
خوای بەرز بانگی هەموو بەندەکانی کردوە بۆ ملکەچ بوون بۆ لای، وە داوای لێخۆش بوون لە کەم‌و کورتی، بە پێی وەرگرتنی بوون بە دوو بەشەوە:
ئەوانەی وەریان گرتووە، وەسفی کردوون‌و فەرموویەتی: ﴿وَيَسۡتَجِيبُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ واتە: بەدەم بانگەوازی پەروەردگاریانەوە دەچن وەریدەگرن کاتێ بانگی کردوون بۆ لای‌و ملکەچی دەبن، چونکە ئەو ئیمان‌و کردەوە چاکەی هەیانە دەبێتە مایەی بەدەمەوە چوونیان، جا ئەگەر وەریان گرت خوا سوپاس گوزاریان دەکات، هەر ئەو لێبوردەو سوپاس کراوە وە لە بەهرەی خۆی زیاتریان پێدەدات، بۆ ئەوەی سەرکەوتوو بن‌و چالاک بن لەسەر کردەوە، وە چەند بەرانبەر پاداشتیان بۆ زیاد دەکات، زیادەیەک شایستەی کردەوەکانیان بێت لە پاداشت‌و سەرکەوتنی مەزن.
بەڵام جگە لەوانەی پەیامی خوایان وەرگرتووە، ئەوانیش عینادو کەللەڕەقانن، ئەوانەی بێبڕواییان کردوە بە پەروەردگاریان‌و بە پێغەمبەرەکانی، جا ﴿لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٞ﴾ (واتە: سزای سەختیان بۆ هەیە) لە دونیاو دوارۆژدا. پاشان باسی کردوە لە بەزەیی بە بەندەکانی، ئەو زاتە دونیایان بۆ فراوان ناکات بە فراوان کردنێک زیان بە ئاینەکەیان بگەیەنێت، جا فەرموویەتی: ﴿وَلَوۡ بَسَطَ ٱللَّهُ ٱلرِّزۡقَ لِعِبَادِهِۦ لَبَغَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ واتە: (خۆ ئەگەر خوا ڕزق‌و ڕۆزی فراوان بکردایە بۆ بەندەکانی) بێ ئاگا دەبوون لە گوێڕایەڵی خواو ڕوویان دەکردە لەزەت وەرگرتن بە ئارەزووەکانی دونیا، ئەوەی نەفس‌و دەروونیان حەزی لێبکردایە دەکەوتن بەسەریدا ئەگەرچی تاوان‌و ستەمیش بووایە.

﴿ وَلَٰكِن يُنَزِّلُ بِقَدَرٍ مَّا يَشَآءُ ﴾ (واتە: بەڵام خوا ڕزقو ڕۆزی دەنێرێتە خوارەوە) بە گوێرەی لێبوردەیی‌و حیکمەتی خۆی ﴿ إِنَّهُۥ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرُۢ بَصِيرٌ ﴾ هەر وەکو لە هەندێ لە شوێنەوارەکاندا هاتووە بەڕاستی خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ:

{إن عبادي من لا يصلح إيمانه إلا الغنى، ولو أفقرته لأفسده ذلك، وإن من عبادي من لا يصلح إيمانه إلا الفقر، ولو أغنيته لافسده ذلك، وإن من عبادي من لا يصلح إيمانه إلا الصحة، ولو أمرضته لأفسده ذلك، وإن من عبادي من لا يصلح إيمانه إلا المرض، ولو عافيته لأفسده ذلك، إني أدبر أمر عبادي بعلمي بما في قلوبهم، إني خبير بصير} واتە: بە ڕاستی کەسانێک لە بەندەکان هەیە، بڕوای چاک نابێ بە دەوڵەمەندی نەبێ، جا ئەگەر هەژاری بکەم ئەوە هەژاری ئاینەکەی تێک دەدات، وە لە بەندەکانم هەیە بڕوای چاک نابێ تەنها بە هەژاری نەبێ، جا ئەگەر دەوڵەمەندم کرد، ئەوە دەوڵەمەندی ئاینەکەی تێک دەدات، وە لە بەندەکانم هەیە بڕوای چاک نابێ تەنها بە لەش ساغی نەبێ، جا ئەگەر نەخۆشی بخەم، ئەوە نەخۆشیەکەی ئاینەکەی تێک دەدات، وە لە بەندەکانم هەیە بڕوای چاک نابێ تەنها بە نەخۆشی نەبێ، جا ئەگەر لەشم ساغ کرد، ئەوە لەش ساغیەکەی ئاینەکەی تێک دەدات، من کاروباری بەندەکانم بەڕێوە دەبەم بە زانستم بەوەی لە دڵیاندایە، بە ڕاستی من شارەزاو بینام).

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى يُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ ﴾ واتە: بارانی بە خوڕ دەبارێنێ کە بە هۆی ئەو بارانەوە وڵاتو بەندەکان دەبووژێنێتەوە ﴿ مِنۢ بَعْدِ مَا قَنَطُوا۟ ﴾ (واتە: لە دوای ئەوەی خەڵکی بێ ئومێد بوون) ماوەیەک بەسەریاندا ڕۆیی لە بێ بارانی، وا گومانیان برد ئیتر بارانیان بۆ ناباریێ، بێ ئومێد بوون، وە کاریان کرد بۆ ئەو قاتوقڕییە بە کارکردنێک، پاشان خوا بارانی باراند ﴿ وَيَنشُرُ ﴾ (بڵاوی دەکاتەوە) بە ﴿ رَحْمَتَهُۥ ﴾ لە دەرهێنانی بژێویەکانی ئادەمیزادو ئاژەڵەکانیان، زۆر سەرسام دەبن پێی، بەو هۆیەوە مژدە دەدەن‌و دڵخۆش دەبن ﴿ وَهُوَ ٱلْوَلِىُّ ﴾ (هەر ئەو پشتیوانە) کە پشتیوانی بەندەکانی دەکات بە جۆرەها بەڕێوەبردن، وە بەرژەوەندیەکانی دین‌و دونیایان دەپارێزێ ﴿ ٱلْحَمِيدُ ﴾ (ستایشکراوە) لە پشتیوانی‌و بەڕێوەبردنیدا، ستایش کراوە لەوەی تایبەتە بە ئەو لە تەواوێتی، ئەوەشی گەیاندوویەتی بە بەدیهێنراوەکانی لە جۆرەها بەهرە.

(٢٩): ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَثَّ فِيهِمَا مِن دَآبَّةٍ وَهُوَ عَلَىٰ جَمْعِهِمْ إِذَا يَشَآءُ قَدِيرٌ (٢٩) ﴾:

﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ ﴾ واتە: وە لە بەڵگەکانی توانای مەزنی خوا ﷻ بێگومان ئەو مردوو زیندوو دەکاتەوە دوای مردنیان ﴿ خَلْقُ ﴾ دروستکردنی ئەم ﴿ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ بە

مەزنیی‌و فراوانیانەوە بەڵگەن لەسەر تواناو فراوانی دەسەڵاتی خوا، وە ئەوەیشی تیایاندایە لە وردەکاریی‌و پتەوی بەڵگەن لەسەر حیکمەت‌و دانایی ئەو زاتە، وە ئەوەی تیایاندایە لە سوودو بەرژەوەندیەکان، بەڵگەن لەسەر میهرەبانی ئەو، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بێگومان ئەو زاتە شایستەی جۆرەها بەندایەتی بۆ کردنە بە گشتی، وە بێگومان پەرستراوێتی جگە لە ئەو بەتاڵ‌و پووچە، ﴿وَمَا بَثَّ فِيهِمَا﴾ واتە: بڵاوی کردۆتەوە لە ئاسمانەکان‌و زەوی لە جۆرەها گیانلەبەر کە خوا ﷻ دایناون بۆ بەرژەوەندی‌و سوودی بەندەکانی ﴿وَهُوَ عَلَىٰ جَمْعِهِمْ﴾ واتە: کۆکردنەوەی بەدیهێنراوەکان دوای مردنیان لە ڕۆژی دواییدا ﴿إِذَا يَشَآءُ قَدِيرٌ﴾ جا تواناو ویستی گونجاون بۆ کۆکردنەوەیان، وە ڕوودانی وەستاوە لە سەر بوونی هەواڵێکی ڕاستەقینە، بێگومان زانراوە هەواڵی پێغەمبەران‌و کتێبەکانیان یەک لەدوای یەک هاتووە بەزیندوو کردنەوەو کۆکردنەوەیان.

(٣٠-٣١): ﴿وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُواْ عَن كَثِيرٍ ﴿٣٠﴾ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿٣١﴾﴾:

﴿وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُواْ عَن كَثِيرٍ﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدات کە بێگومان هەر بەڵاو موسیبەتێک تووشی بەندەکان ببێ، بە جەستەو ماڵ‌و مناڵیان، وە لەوانەی خۆشیان دەوێ‌و بەرێزە بەلایانەوە تەنها بەهۆی کردەوەی خراپی خۆیانەوەیە کە پێشیان خستووە، وە ئەوەی خوا ﷻ چاوپۆشی لێدەکاو لێی دەبورێ زۆرترە، بێگومان خوا ستەم لە بەندەکانی ناکات، بەڵکو خۆیان ستەم لە نەفسی خۆیان دەکەن ﴿وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِمَا كَسَبُواْ مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهْرِهَا مِن دَآبَّةٍ ﴿٤٥﴾﴾فاطر (واتە: وە ئەگەر خوا قار بگرێ لە خەڵکی (تۆڵەیان لێ بسەنێ) لەبەر ئەو خراپانەی کردوویانە هیچ گیاندارێکی بەسەر زەویەوە نەدەهێشت) دواخستنی سزاکان بە هۆی پشت گوێخستن‌و بێ تواناییەوە نیە لە لایەن خوا ﷻ.

﴿وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ واتە: (ئێوە ناتوانن) قوتار بن لە تواناو دەسەڵاتی خوا، بەڵکو ئێوە دەستەوسانن لەسەر زەویدا، هیچ بەرگریەکتان نیە لەوەی خوا جێبەجێی دەکا تیاتاندا ﴿وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ﴾ (وە نیتانە بێجگە لە خوا هیچ پشتیوان) پشتیوانیتان لێ بکات، تا سوودەکان بەدەست بهێنن ﴿وَلَا نَصِيرٍ﴾ نە هیچ یارمەتیدەرێ زیانتان لەسەر لابیات.

وَمِنْ ءَايَٰتِهِ ٱلْجَوَارِ فِى ٱلْبَحْرِ كَٱلْأَعْلَٰمِ ﴿٣٢﴾ إِن يَشَأْ يُسْكِنِ ٱلرِّيحَ
فَيَظْلَلْنَ رَوَاكِدَ عَلَىٰ ظَهْرِهِۦٓ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ
﴿٣٣﴾ أَوْ يُوبِقْهُنَّ بِمَا كَسَبُوا۟ وَيَعْفُ عَن كَثِيرٍ ﴿٣٤﴾ وَيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ
يُجَٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَٰتِنَا مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٍ ﴿٣٥﴾ فَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَىْءٍ فَمَتَٰعُ
ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ
يَتَوَكَّلُونَ ﴿٣٦﴾ وَٱلَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ وَإِذَا مَا
غَضِبُوا۟ هُمْ يَغْفِرُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ
وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَابَهُمُ
ٱلْبَغْىُ هُمْ يَنتَصِرُونَ ﴿٣٩﴾ وَجَزَٰٓؤُا۟ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا فَمَنْ عَفَا
وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٠﴾ وَلَمَنِ ٱنتَصَرَ
بَعْدَ ظُلْمِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَا عَلَيْهِم مِّن سَبِيلٍ ﴿٤١﴾ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى
ٱلَّذِينَ يَظْلِمُونَ ٱلنَّاسَ وَيَبْغُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ أُو۟لَٰٓئِكَ
لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤٢﴾ وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنْ عَزْمِ
ٱلْأُمُورِ ﴿٤٣﴾ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن وَلِىٍّ مِّنۢ بَعْدِهِۦ وَتَرَى
ٱلظَّٰلِمِينَ لَمَّا رَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ يَقُولُونَ هَلْ إِلَىٰ مَرَدٍّ مِّن سَبِيلٍ ﴿٤٤﴾

(٣٢-٣٥): ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِ ٱلْجَوَارِ فِى ٱلْبَحْرِ كَٱلْأَعْلَٰمِ ﴿٣٢﴾ إِن يَشَأْ يُسْكِنِ ٱلرِّيحَ فَيَظْلَلْنَ رَوَاكِدَ عَلَىٰ ظَهْرِهِۦٓ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿٣٣﴾ أَوْ يُوبِقْهُنَّ بِمَا كَسَبُوا۟ وَيَعْفُ عَن كَثِيرٍ ﴿٣٤﴾ وَيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَٰتِنَا مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٍ ﴿٣٥﴾ ﴾

﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِ ﴾ واتــە: لــە بەڵگەکانــی میهرەبانــیو یارمەتیدانــی خــوا ﷻ بــە بەڵگەکانــی ﴿ ٱلْجَوَارِ فِى ٱلْبَحْرِ ﴾ لــە کەشــتیو ئەوانــەی بەنــاو دەریادا بــە ئاگر دەجوڵێــن، کــە لــە مەزنــیو گەورەییانــدا: ﴿ كَٱلْأَعْلَٰمِ ﴾ وەکو کێــوە گەورەکان وان، خــوا ﷻ دەریــای چڕی بــۆ ڕامهێنــاون، وە پاراســتوونی لــە شــەپۆلو بەیەکدادانەکانی، وای لێکــردوە خۆیــانو کەلو پەلــە قورسو گرانەکانیــان هەڵبگرێ لە شــارە دوورەکانەوە، وە چەندیــن هــۆکاری بــۆ ڕامهێنــاون کــە ببێتــە یارمەتــی لەســەر ئــەو هەڵگرتنــە.

پاشــان ئاگــاداری داوە لەســەر ئــەو هۆکارانە، بــەوەی کــە فەرموویەتــی: ﴿ إِن يَشَأْ يُسْكِنِ ٱلرِّيحَ ﴾ (واتــە: ئەگــەر خــوا بیــەوێ با ڕادەگــرێ) ئــەو بایەی خــوا داینــاوە بــە هۆکارێک بــۆ ڕێکردنــی کەشــتیەکان ﴿ فَيَظْلَلْنَ ﴾ واتە: کەشــتیەکان ﴿ رَوَاكِدَ ﴾ دەوەســتن لەســەر پشــتی دەریــا نــە پێش دەکــەون نــە دوا دەکــەون، ئەو کەشــتیانەی بــە ئاگر ئیــش دەکەن ئەمــە هەڵناوەشــێننەوە، چونکــە لــە مەرجی ڕێکردنیاندا پێویســتە بــا بوونی هەبــێ. وە ئەگەر خــوا بیــەوێ کەشــتیەکان نقووم دەکات لە نــاو دەریــاداو لەناویان دەبات، بەڵام خوا لەســەر خــۆو لێبوردەیە لــە زۆربەیان.

﴿ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴾ واتــە: زۆر ئارامگــر بێ لەســەر ئەوەی نەفســی حەزی پێ ناکاو قورســە بەســەریەوە، جا زۆری لێدەکات لەســەری لە نارەحەتــی گوێڕایەڵی کردن، یــان دامرکاندنــەوەی پاڵنەرێ بــۆ لای تاوانو ســەرپێچی، یان دامرکاندنەوەی نەفســی خۆی لــە کاتی بەڵاو موســیبەتو نارەحەتیدا لــە تووڕەییو بێزاری ﴿ شَكُورٍ ﴾ سوپاســگوزارە لە

خۆشـیو لـە کاتی نـازو نیعمەتـەکان، دان دەنێ بـە نیعمەتەکانی پەروەردگـاریو بەکاریان دەهێنـێ لـە ڕەزامەنـدی ئـەودا، ئا ئەم کەسـە سـوود وەردەگـرێ لـە ئایەتو نیشـانەکانی خوا.

بـەڵام ئـەو کەسـەی ئـارامو خۆڕاگر نیە ئـەوە سوپاسـگوزار نیـە لەسـەر نیعمەتەکانی خوا، بێگومـان ئـەو ڕوو وەرگێـڕە، یان عینادو نکوڵیکارە سـوود لـە ئایەتەکانی خـوا وەرناگرێ.

پاشـان خـوا ﷻ فەرمویەتـی: ﴿ وَيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا ﴾ بۆ ئـەوەی پووچی بکەنەوە بـە (بەڵگە) بەتـاڵو پووچەکانیـان!﴿ مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٖ ﴾ واتە: هیچ ڕزگارکـەرێ ڕزگاریان ناکا کاتێ سـزایان لەسـەر پێویسـت دەبێ.

(٣٦-٣٩): ﴿ فَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَيۡءٖ فَمَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٣٦﴾ وَٱلَّذِينَ يَجۡتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡفَوَٰحِشَ وَإِذَا مَا غَضِبُواْ هُمۡ يَغۡفِرُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِرَبِّهِمۡ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَابَهُمُ ٱلۡبَغۡيُ هُمۡ يَنتَصِرُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾:

ئەمـە بەکـەم دانانـە لـە دونیـاو هاندانـە بـۆ دوارۆژ، وە باسـکردنی ئـەو کردەوانەیـە کـە دەیگەیەنـێ بـەو ڕۆژە، جـا فەرموویەتـی: ﴿ فَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَيۡءٖ ﴾ (واتـە: جا هەر شـتێکتان پێ بەخشـرا) لە موڵکو دەسـەڵاتو مـاڵو منداڵو تەندروسـتیو لەشـاغی ﴿ فَمَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا ﴾ لەزەتێکـە بەرەنگاربوونـەوەی تێدایـەو پچڕاوەیـە ﴿ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ ﴾ (ئەوەی لەلای خوایـە) لـە پاداشـتی بـێ پایـانو گـەورەو نازونیعمەتـی جێگیـر ﴿ خَيۡرٞ ﴾ چاکتـرە لـە لەزەتەکانـی دونیـا، چاکیەک کە بە هیـچ جۆرێ هاوتا ناکرێـن، ﴿ وَأَبۡقَىٰ ﴾ (بەردەوامترە) چونکـە نیعمەتێکـە نـە بەرەنگـار بوونـەوەی تێدایە نە ئاڵـۆزیو نە گواسـتنەوە.

پاشـان باسـی کـردوە کە ئـەم پاداشـتە بـۆ کێیـە، فەرموویەتـی: ﴿ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ﴾ واتـە: کۆیـان کـردوە لـە نێـوان ئیمانـی سـاغو ڕاسـتەقینە کـە پێویسـتکەری کردەوەکانـی بڕواهێنانـی ئاشـکراو نهێنیـە، وە لـە نێـوان پشـت بەسـتن کـە کەرەسـتەی هەمـوو کردەوەیەکـە، جـا هـەر کردەوەیـەک پشـت بەسـتنی تێـدا نەبێ ئـەوە ناتـەواوە، ئەویـش بریتیە لە پشـت بەسـتن بـە دڵ لەسـەر خوا لـە بەدەسـتهێنانی ئەوەی بەندە خۆشـی دەوێ، وە دوورخسـتنەوەی ئـەوەی پێـی ناخۆشـە لەگـەڵ متمانـە بوونـی بـە خوا.

﴿ وَٱلَّذِينَ يَجۡتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡفَوَٰحِشَ ﴾ (واتـە: وە ئەوانەی لـە گوناهە گەورەکانو خراپە زۆر ناشـرینەکان دوور دەکەونـەوە) جیـاوازی لە نێـوان (الکبائر والفواحـش) لەگەڵ ئەوەی

هەردووکیــان تاوانــە گەورەکانــن، ئەوەیە کــە (الفواحــش) بریتیە لەو تاوانــە گەورانەی کە لــە نەفــسو دەروونـدا پاڵنەرێــک هەیە بــۆ لای وەک زینــاو هاوشــێوەی ئــەوە، (والکبائر) بــەو شــێوەیە نیــە، ئەمە لــە کاتی پێکــەوە بوونـدا، بەڵام لــە کاتی هاتنــی هــەر یەکەیان بە تەنهــا ئەوە ئــەوی دیکــەش دەچێتە نێــو ئەمەوە.

﴿ وَإِذَا مَا غَضِبُواْ هُمۡ يَغۡفِرُونَ ﴾واتــە: (وە کاتــێ ڕقو قینیــان هەڵســێت ئــەوان لێدەبوورن) واتــە: خۆیــان ڕازاندۆتــەوە بــە ڕەوشتی بــەرزو بڵنــدو جــوان، تــا لەســەرخۆیی بــووە بــە ئاکاریــان، وە ڕەوشــتی جوانیــش بووە بە سروشــتیان، تا ئەگەر کەســێ تووڕەیــان بکات بە قســەکردن یــان بە ڕەفتار، ئــەوان ئەو توڕەییەیــان دەخۆنــەوەو جێبەجێی ناکــەن، بەڵکو لێی دەبــورنو لــە بەرانبەر خراپــەکاردا تەنهــا چاکەو لێبــوردنو دڵســافی دەنوێنن.

جــا ڕێکیخســتوە لەســەر ئــەم لێبــوردنو دڵ پاکیــە، چەندیــن بەرژەوەنــدیو ڕێگریکردنی خراپــە لە نەفــسو دەروونیانو جگە لەوانیش شــتێکی زۆر، هەروەکو خــوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ ٱدۡفَعۡ بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ فَإِذَا ٱلَّذِي بَيۡنَكَ وَبَيۡنَهُۥ عَدَٰوَةٞ كَأَنَّهُۥ وَلِيٌّ حَمِيمٞ ٣٤ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٖ ٣٥ ﴾فصلت، (بــە چاکتریــن شــێوە وەڵامــی خراپــە بدەرەوە ئەوســا کەســێ کە لــە نێوان تــۆو ئــەودا دوژمنایەتی هەیە وەک دۆســتێکی گیانــی بــە گیانــی لــێ دێــت * بــەم ئاســتە ناگــات کەســانێ نەبــێ کــە خۆڕادەگــرنو بە ئارامــن، وە پێــی ناگــات مەگەر کەســێ خاوەنی بەشــی هــەرە گــەورە بێت لە پاداشــت).

﴿ وَٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِرَبِّهِمۡ ﴾واتە: ملکەچی گوێڕایەڵی خوا بوونو بەدەم بانگەوازەکەیەوە هاتنو مەبەستیان ڕەزامەندی ئەو بوو، وە ئامانجیشیان سەرکەوتن بوو بە نزیک بوونەوە لێی.

وە لــە گوێڕایەڵیــان بــۆ خــوا بــە بەجێهێنانی نوێــژو پێدانــی زەکات، ئا لەبــەر ئەمەیە عەتفی کــردوە بەســەریدا لــە بەشــی عەتفــی گشــتی بەســەر عەتفــی تایبەتی، کــە بەڵگەیە لەســەر شــەرەفو فەزڵــی، بۆیــە فەرمویەتــی: ﴿ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾واتــە: (نوێژەکانیــان دەکــەن) بە ئاشــکراو نهێنــی، فــەرزو ســوننەتەکانی ﴿ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ﴾لــەو ڕۆزیو بژێویانــەی کــە پێویســتن، وەک زەکاتو بەخشــین بەســەر خــزمو نزیکــەکانو وێنــەی ئــەوان، وە لە بژێویــە پەســەندەکان وەک خێــرو چاکەو بەخشــین بەهەمــوو خەڵکــی ﴿ وَأَمۡرُهُمۡ ﴾واتە: کاروبــاری ئاینــیو دنیاییــان ﴿ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ ﴾واتــە: هیچ کەســێک لــە نێوانیانــدا بۆچوونی خــۆی ناســەپێنێ لــە یەکێک لــەو کاروبارانــەی بــەژدارن تیایدا، ئەمــەش نابــێو ڕوونادات مەگــەر لقێک بــێ لە کۆدەنگــیو برایەتیو خۆشەویســتی نێوانیــانو تــەواوی عەقڵەکانیان،

بێگومـان ئـەوان ئەگـەر کارێ لـە کارەکانیـان بـوێ کـە پێویسـت بـکات هـزرو بیـرو بۆچوونـی تێـدا بەکاربێ، کۆدەبنـەوە بۆیو ڕاوێـژو کۆبوونەوە لەناو یەکتـردا دەکەن، هەتا بەرژەوەندیـان بـۆ ڕوون دەبێتـەوە، بـە هـەل دەیقۆزنـەوەو ئەنجامـی دەدەن، ئەویش وەکو بیـروڕا لـە جەنگو جیهـاداو دانانـی کارمەندان بـۆ ئیمارەتێ، یان بۆ شـارێ، یـان بۆ جگە لـە ئەوانـە، وە وەکـو لێکۆڵینـەوە لە بابەتـە ئاینیەکان بە گشـتی، بێگومان ئـەوە یەکێکە لەو کاروبـارە هاوبەشـانە، وە لێکۆڵینـەوە تێیـدا بـۆ ڕوونکردنەوەی ڕاسـتیە لەوەی خوا خۆشـی دەوێ، ئەویـش لەنێـو ئـەم دەقەدایە.

﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَابَهُمُ ٱلۡبَغۡيُ ﴾واتـە: لـە لایـەن دوژمنانیانـەوە (دەسـتدرێژیان لـێ دەکـرێ) ﴿ هُمۡ يَنتَصِرُونَ ﴾(تۆڵـەی خۆیـان دەسـێنن) بە هـۆی هێـزو عیزەتیانەوە زەلیلو سەرشـۆڕو دەستەوسـان نیـن لە ئاسـتی سـەرکەوتندا.

خـوا ﷻ وەسـفی کردوون بە ئیمانو پشـت بەسـتن بەخـوا، وە دوور کەوتنەوە لـەو گوناهە گەورانـەی کـە بەهۆیانـەوە تاوانـە بچووکـەکان دەسـڕێنەوە، وە ملکەچبوونـی تـەواو و گوێرایەڵـی پەروەردگاریـانو بەجێهێنانـی نوێژەکانیانو بەخشـین لەو ڕووانـەی کە چاکن، ڕاوێژ کردنیـان لـە کاروبارەکانیانـداو هێـزو سـەرکەوتن بەسـەر دوژمنەکانیـان، ئـا ئەمانە سـیفاتو نیشـانەی تـەواون، کـە بێگومان کۆیـان کردۆتـەوە، وە پێویسـتە لـە بەجێهێنانی لەوانـدا ئەنجامدانی ئـەوەی لەخـواری ئەوانەوەیـە، وە ڕەتکردنـەوەی پێچەوانەکانیان.

(٤٠-٤٣): ﴿ وَجَزَٰٓؤُاْ سَيِّئَةٖ سَيِّئَةٞ مِّثۡلُهَاۖ فَمَنۡ عَفَا وَأَصۡلَحَ فَأَجۡرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ٤٠ وَلَمَنِ ٱنتَصَرَ بَعۡدَ ظُلۡمِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَا عَلَيۡهِم مِّن سَبِيلٍ ٤١ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَظۡلِمُونَ ٱلنَّاسَ وَيَبۡغُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ٤٢ وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنۡ عَزۡمِ ٱلۡأُمُورِ ٤٣ ﴾

﴿ وَجَزَٰٓؤُاْ سَيِّئَةٖ سَيِّئَةٞ مِّثۡلُهَا ﴾خـوا ﷻ لـەم دەقـەدا باسـی پلـەو پایەکانـی تۆڵەکردنەوەی کـردوە، ئەوانـە دەبـن بـە سـێ پلـەوە: دادپـەروەری، فـەزڵو چاکـە، سـتەمکردن، پلـەی دادپـەروەری: تۆڵـەی هـەر خراپەیـەک خراپەیەکـە بـە وێنـەی خۆی، نـە زیادو نـە کەم، جـا نەفـس بە نەفـس، وە هەموو برینـدار کردنێ بـە بریندار کردنـێ وێنەی ئـەو، وە ماڵیش دەبژێـردرێ بـە وێنـەی خۆی.

پلـەی فـەزڵو چاکـە: لێبـوردنو چاکە دەربـارەی خراپـەکار، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتی: ﴿ فَمَنۡ عَفَا وَأَصۡلَحَ فَأَجۡرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ﴾(واتـە: جـا هـەر کەسـێ ببـورێو ئاشـتی بـکات ئەوە

پاداشتی ئەو لەلای خوایە) خوا ﷻ پاداشتی دەداتەوە بە پاداشتێکی مەزنو زۆر، وە مەرجی خوا لە لێبوردنو چاکەکردن تیایدا بۆ ئەوەی ببێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەگەر تاوانبار شایستەی ئەوە نەبوو لێی ببورێ، وە بەرژەوەندی شەرعی وایخواست تۆڵەی لێ بکرێتەوە، ئەوە بێگومان لەم حاڵەتەدا فەرمان پێکراو نیە بە لێبوردن، وە لە دانانی پاداشتی ئەو کەسەی دەبوردرێ لەسەر خوا نابێ کاردانەوەی خراپی هەبێت لە لێبوردنەکەیدا، وە دەبێت بەندە مامەڵە لەگەڵ ئادەمیزاددا بکات بەوەی پێی خۆشە خوا مامەڵەی لەگەڵدا بکات، وەک چۆن پێی خۆشە خوا لێی ببورێت، با لە ئەوان ببورێت، وە وەک چۆن حەز دەکات خوا بیبەخشێو چاوپۆشی لێبکات، با چاوپۆشیان لێبکات، بێگومان پاداشت لە رەگەزی کردەوەیە.

بەڵام پلەو پایەی زوڵمو ستەم: بێگومان خوا ﷻ باسی کردوە دەفەرمویێ: ﴿ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ (واتە: خوا ستەمکارانی خۆش ناوێ) ئەوانەی سەرەتا دەستپێشخەری دەکەن لە بەرانبەریان، یان رووبەرووی تاوانبار دەبنەوە زیاتر لە تاوانەکەی، جا زیاتر زوڵمە.

﴿ وَلَمَنِ ٱنتَصَرَ بَعۡدَ ظُلۡمِهِۦ ﴾ واتە: تۆڵە بسەنێ لەو کەسەی ستەمی لێکردوە دوای ئەوەی ستەمی لێکراوە ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَا عَلَيۡهِم مِّن سَبِيلٍ ﴾ واتە: هیچ تاوانێکیان لەسەر نیە لەو تۆڵەکردنەوەدا.

وە دەبێتە بەڵگە فەرموودەی خوا ﷻ ﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَابَهُمُ ٱلۡبَغۡيُ ﴾ وە فەرموودەی خوا ﷻ ﴿ وَلَمَنِ ٱنتَصَرَ بَعۡدَ ظُلۡمِهِۦ ﴾ بێگومان هەر دەبێ خراپەکارو ستەمکار تووش ببێت.

بەڵام ویستو ئیرادەی خراپەکردن بەرانبەر بە کەسێکی تر، وە ویستی ستەم کردن لێی بەبێ ئەوەی هیچی لێکردبێت، ئەمە وەکو خۆی تۆڵەی لێناکرێتەوە، بەڵکو تەمێ دەکرێ بە تەمێکردنێک بیترسێنێ لە قسە کردن یان کردەوەیەک لێیەوە دەرچوو بێت .

﴿ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ ﴾ واتە: بەڵکو بەڵگە رووبەروو دەبێتەوە بەتۆڵەکردنەوەی شەرعی ﴿ عَلَى ٱلَّذِينَ يَظۡلِمُونَ ٱلنَّاسَ وَيَبۡغُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ ﴾ (واتە: لەسەر ئەو کەسانەی کە ستەم لە خەڵکی دەکەن وە بەناحەق خراپەکاری دەکەن لەزەویدا) ئەمە گشتگیرە بە ستەمکردنو دەستدرێژی کردن لەسەر خەڵکی لە خوێنوماڵو شەرەفو ناموسیان ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴾ واتە: بە ئێشە بۆ دڵو جەستەکان بە پێی ستەمو دەستدرێژیو خراپەکاریان.

﴿ وَلَمَن صَبَرَ ﴾ (هەر کەسێ خۆگر بێ) لەسەر ئەوەی لە لایەن خەڵکەوە تووشی دەبێت ﴿ وَغَفَرَ ﴾ (وە ببورێ) لێیان، بەوەی بەخشندە بێتو چاوپۆشیان لێ بکات لەوەی لێیانەوە دەرچووە ﴿ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنۡ عَزۡمِ ٱلۡأُمُورِ ﴾ واتە: لەو کارە پڕ بایەخانەیە کە خوا هانی داونو جەختی لەسەر کردوەتەوە، وە هەواڵی داوە کەس پێی ناگات جگە لە خۆڕاگرانو خاوەن بەختە مەزنەکان نەبێت، وە لەو کاروبارانەی کە سەرکەوتوو نابێت بۆی جگە لە خاوەن عەزمو ورە بەرزان نەبێت، وە خاوەن دڵەکانو بەرچاو ڕوونەکان. بێگومان وازهێنان لە سەرخستنی نەفسو دەروون بە قسە یان بە کردەوە، لە گرانترین شتە بەسەریەوە، وە ئارامگرتن لەسەر ناڕەحەتیو لێبووردنو ئاشتیو ڕووبەڕووبوونەوەی بە چاکە، گرانو گرانترە، بەڵام ئاسانە لەسەر کەسێ خوا ﷻ بۆی ئاسان کردبێ، وە جیهادی نەفسو دەروونی کردبێ لەسەر وەسفکردن پێی، وە پشتی بە خوا بەستبێ لەسەر ئەو کارە، پاشان ئەگەر بەندە چێژو شیرینی ئەوەی وەرگرت، وە شوێنەوارەکانی بینی بە دڵێکی فراوانەوە وەریدەگرێو لەزەتی لێ دەبینێ.

(٤٤-٤٦): ﴿ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن وَلِيّٖ مِّنۢ بَعۡدِهِۦۗ وَتَرَى ٱلظَّٰلِمِينَ لَمَّا رَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَ يَقُولُونَ هَلۡ إِلَىٰ مَرَدّٖ مِّن سَبِيلٖ ﴿٤٤﴾ وَتَرَىٰهُمۡ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا خَٰشِعِينَ مِنَ ٱلذُّلِّ يَنظُرُونَ مِن طَرۡفٍ خَفِيّٖۗ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ وَأَهۡلِيهِمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ أَلَآ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ فِي عَذَابٖ مُّقِيمٖ ﴿٤٥﴾ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنۡ أَوۡلِيَآءَ يَنصُرُونَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِۗ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن سَبِيلٍ ﴿٤٦﴾ ﴾:

خوا ﷻ هەواڵ دەدات کە بێگومان ئەو تاکو تەنهایە بە هیدایەتدانو گومراکردن، وە بێگومان ئەو زاتە ﴿ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ ﴾ بە هۆی ستەمکردنیەوە ﴿ فَمَا لَهُۥ مِن وَلِيّٖ مِّنۢ بَعۡدِهِۦ ﴾ کاروباری بەڕێوە بباو ڕێنمایی بکات.

﴿ وَتَرَى ٱلظَّٰلِمِينَ لَمَّا رَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ﴾ (واتە: وە ستەمکارەکان دەبینی کاتێ سزای خوا) بە چاو دەبینن، کە دیمەنێکی زۆر ترسناکو قورسو ناڕەحەتە، پەشیمان بوونەوەیان ئاشکرا دەکەنو خەمو پەژارە دەخۆن لەوەی لە دەستیان چووە، وە ﴿ يَقُولُونَ هَلۡ إِلَىٰ مَرَدّٖ مِّن سَبِيلٖ ﴾ واتە: ئایا ڕێگەیەکمان بۆ هەیە، یان چارەیەک بۆ گەڕانەوەمان بۆ دنیا، بۆ ئەوەی کردەوەیەک بکەین جگە لەوەی دەمانکرد؟ ئەمە داواکاری کارێکە کە مەحاڵەو نایەتە جێ

وَتَرَىٰهُمْ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا خَٰشِعِينَ مِنَ ٱلذُّلِّ يَنظُرُونَ
مِن طَرْفٍ خَفِيٍّ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِنَّ ٱلْخَٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ
خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَلَآ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ
فِى عَذَابٍ مُّقِيمٍ ﴿٤٥﴾ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنْ أَوْلِيَآءَ يَنصُرُونَهُم
مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن سَبِيلٍ ﴿٤٦﴾ ٱسْتَجِيبُوا۟
لِرَبِّكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ يَوْمٌ لَّا مَرَدَّ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَكُم
مِّن مَّلْجَإٍ يَوْمَئِذٍ وَمَا لَكُم مِّن نَّكِيرٍ ﴿٤٧﴾ فَإِنْ أَعْرَضُوا۟
فَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا إِنْ عَلَيْكَ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ وَإِنَّآ إِذَآ
أَذَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِنَّا رَحْمَةً فَرِحَ بِهَا وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌۢ
بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ فَإِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ كَفُورٌ ﴿٤٨﴾ لِّلَّهِ مُلْكُ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثًا
وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ ﴿٤٩﴾ أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَٰثًا
وَيَجْعَلُ مَن يَشَآءُ عَقِيمًا إِنَّهُۥ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ﴿٥٠﴾ وَمَا كَانَ
لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَآئِ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ
رَسُولًا فَيُوحِىَ بِإِذْنِهِۦ مَا يَشَآءُ إِنَّهُۥ عَلِىٌّ حَكِيمٌ ﴿٥١﴾

﴿ وَتَرَىٰهُمْ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا ﴾ واتە: (وە دەیان بینی پیشانی ئاگر دەدرێن)﴿ خَٰشِعِينَ مِنَ ٱلذُّلِّ ﴾ واتە: جەستەیان دەبینی پڕ لە ترس‌و زەلیلیە کە لەناو دڵەکانیاندایە﴿ يَنظُرُونَ مِن طَرْفٍ خَفِيٍّ ﴾ واتە: تەماشای دۆزەخ دەکەن بە گۆشەی چاوەکانیان، لە هەیبەت‌و ترسیدا. ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ ﴾ کاتێ کە دەرەنجامی خەڵکی ئاشکرا دەبێ، وە ڕاستگۆیان دەردەکەون لە غەیری خۆیان: ﴿ إِنَّ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴾ بە حەقیقەت،﴿ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾ کاتێ نەفسی خۆیان بێ بەشکرد لە پاداشتی بێ پایان‌و سزاو تۆڵەی بە ئێشیان بەدەست هێنا، وە جیاکرایەوە لە نێوان ئەوان‌و خانەوادەکانیاندا،﴿ أَلَآ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ (بێدار بن بە ڕاستی ستەمکاران) لە نەفس‌و دەروونی خۆیان بە کوفرو سەرپێچیکردن﴿ فِى عَذَابٍ مُّقِيمٍ ﴾ لە ناوەڕاستی سزادا نقوم بوون‌و بە هەمیشەیی لێی دەرناچن، وە لەسەریان لانابرێ‌و ئەوان تیایدا نائومێدو سەرگەردانن.

﴿ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنْ أَوْلِيَآءَ يَنصُرُونَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ (واتە: وە ئەوانە هیچ پشتیوانێکیان نیە کە یارمەتیان بدەن بێجگە لە خوا) هەروەکو چۆن لە دنیادا منەتیان دەکرد بە نەفس‌و دەروونیان، جا لە ڕۆژی دواییدا بۆیان دەردەکەوێ کە ئەو هۆکارانەی گرتبوویانە بەر دەپچڕێ‌و نامێنێ، وە کاتێ سزای خوایان بۆ دێ بەرگریان لێ ناکەن﴿ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن سَبِيلٍ ﴾ واتە: (هەر کەسێ خوا گومڕای بکات ئەوە هیچ ڕێگەیەکی ڕزگار بوونی بۆ نیە) ڕێنمایی پێ دەستەبەر بێ، ئا ئەوانە گومڕا بوون کاتێ پێیان وابوو هاوبەشەکانیان سوودیان پێ دەگەیەنن‌و ڕێگری لە زیان دەکەن، جا ئەو کاتە گومڕاییان بۆ ڕوون بوویەوە.

(٤٧-٤٨): ﴿ ٱسۡتَجِيبُواْ لِرَبِّكُم مِّن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَ يَوۡمٞ لَّا مَرَدَّ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِۚ مَا لَكُم مِّن مَّلۡجَإٖ يَوۡمَئِذٖ وَمَا لَكُم مِّن نَّكِيرٖ ﴿٤٧﴾ فَإِنۡ أَعۡرَضُواْ فَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ عَلَيۡهِمۡ حَفِيظًاۖ إِنۡ عَلَيۡكَ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُۗ وَإِنَّآ إِذَآ أَذَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِنَّا رَحۡمَةٗ فَرِحَ بِهَاۖ وَإِن تُصِبۡهُمۡ سَيِّئَةُۢ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡ فَإِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ كَفُورٞ ﴿٤٨﴾ ﴾ :

﴿ ٱسۡتَجِيبُواْ لِرَبِّكُم مِّن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَ يَوۡمٞ لَّا مَرَدَّ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِۚ مَا لَكُم مِّن مَّلۡجَإٖ يَوۡمَئِذٖ وَمَا لَكُم مِّن نَّكِيرٖ ﴾ خـوا ﷻ فەرمـان بـە بەندەکانـی دەکات بـە گوێڕایەڵیکردنی، بە جێبەجێکردنـی ئـەوەی فەرمانـی پێکـردوەو دوورکەوتنەوە لـەوەی قەدەغـەی لێکردوە، وە پەلەکـردن تیایـدا بەبـێ دواخسـتنی، پێـش ئـەوەی ڕۆژی دوایـی بێت لە لایەن خـواوە کە هیـچ گەڕانەوەی بـۆ نیە.

وە لـەو ڕۆژەدا بەنـدە هیـچ پەناگەیەکـی نیـە پەنـای بـۆ ببـات، خـۆی لـە پەروەردگاری بشـارێتەوە یـان لێـی ڕابـکات، بەڵکـو فریشـتەکان دەوری دروسـتکراوەکانیان داوە لـە پشـتیانەوە، وە بانـگ دەکرێـن: ﴿ يَٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ إِنِ ٱسۡتَطَعۡتُمۡ أَن تَنفُذُواْ مِنۡ أَقۡطَارِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ فَٱنفُذُواْۚ لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلۡطَٰنٖ ﴿٣٣﴾ ﴾ الرحمن، (واتـە: ئـەی کۆمەڵـی جنۆکـەو ئادەمیـزاد ئەگـەر توانیتـان دەرچـن لـە بەشـەکانی ئاسـمانو زەوی ئـەوە بـڕۆن دەرچـن ناشـتوانن مەگـەر بـە دەسـەڵاتێک نەبێ).

لـەو ڕۆژەدا بەنـدە ناتوانـێ هیـچ نکوڵـیو ئینکاریەک بـکات لـەو تاوانانـەی ئەنجامیداوە، بەڵکـو ئەگـەر نکوڵـی بـکات ئەندامانی جەسـتەی شـایەتی لەسـەر دەدەن.

ئـەم دەقـەو وێنەی ئەمـە سەرزەنشـتکردنی دواخسـتنی هیـواو ئومێـدی تێدایـە، وە فەرمان دەکات بـە هـەل قۆسـتنەوە لەهـەر کارێکـدا ڕووبـەڕووی بەنـدە دەبێتـەوە، چونکـە لـە دواخسـتندا بـەڵاو نارەحەتـی هەیـە﴿ فَإِنۡ أَعۡرَضُواْ ﴾ (جا ئەگـەر ڕوویان وەرگێـڕا) لەو پەیامـەی بۆیانـت هێنـاوە، دوای ڕوونکردنـەوەی تـەواو﴿ فَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ عَلَيۡهِمۡ حَفِيظًاۖ ﴾ کردەوەکانیـان بپارێـزیو پرسـیار بکـەی دەربارەیـان﴿ إِنۡ عَلَيۡكَ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُۗ ﴾ (تـۆ تەنها ڕاگەیاندنـت لەسـەرە) ئەگەر ئەوەی لەسـەر شـانت بوو گەیاندت ئەوە پاداشـتت پێویسـت دەبـێ لەسـەر خوا، یەکسـانە گوێڕایەڵ بن یـا ڕوو وەرگێڕن، لێپرسـینەوەیان لـەلای خوایە، ئـەو زاتـەی کـە تۆمـاری دەکاتو دەیپارێزێ لەسـەریان کـردەوە بچووکو گـەورەکان، ئاشـکراو نهێنیان.

پاشـان خـوا ﷻ باسـی ئادەمیـزاد دەکات، بەڕاسـتی کاتێ کە خـوا بەهرەیەکی پـێ بچێژێ

لـە لەشساغیو ڕزقو ڕۆزی بەرفـراوانو ناوبانگـو وێنەی ئەوانـە ﴿فَرِحَ بِهَا﴾ واتە: زۆر پێـی دڵخـۆش دەبـێ، بـە کـورت هەڵهێنـان لەسـەری تێیناپەڕێنـێ، لـەوەدا دڵشـارام دەبێو ڕوو وەردەگێـڕێ لـە پێـدەری نازونیعمەتـەکان ﴿وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ﴾ واتـە: (ئەگـەر ناخۆشـیەکیان تـووش ببـێ) لە نەخۆشـی یان هـەژاری، یـان وێنـەی ئەوانە ﴿بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ فَإِنَّ الْإِنسَانَ كَفُورٌ﴾ (بـە هـۆی کـردەوەی خۆیانـەوە بەڕاسـتی) سروشـتی ئادەمیـزاد سـپڵەییە بەرانبـەر نیعمەتەکانـی پێشـوو، وە تـووڕە بوونە لەوەی بـەڵاو نارەحەتی تـووش دەبێ.

(٤٩-٥٠): ﴿لِّلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ ۚ يَهَبُ لِمَن يَشَاءُ إِنَاثًا وَيَهَبُ لِمَن يَشَاءُ الذُّكُورَ ﴿٤٩﴾ أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَاثًا ۖ وَيَجْعَلُ مَن يَشَاءُ عَقِيمًا ۚ إِنَّهُ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ﴿٥٠﴾﴾:

ئـەم دەقـە هەواڵـی تێدایـە دەربـارەی فراوانـی موڵکـی خـوا، وە دەسـەڵاتی هەڵسـوڕاندنی لـە موڵکـدا لەنـاو دروسـتکراودا بە ویسـتی خـۆی، وە بەڕێوەبردنـی هەموو کاروبـارەکان، تەنانـەت بەڕێوەبردنـی خـوا لـە گشـتاندنیدا، ئـەو هۆکارانـەش دەگرێتـەوە کـە بەندەکان ئەنجامـی دەدەن، بێگومـان مـارە بریـن لەهۆکارەکانـی بوونـی منداڵـە، خوا خـۆی منداڵیان پێدەبەخشـێ بەویسـتی خۆی.

جـا هەنـدێ لە بەدیهێنـراوەکان هەیە خـوا مێینەی پێدەبەخشـێ، وەهەندێکی دیکـە نێرینەی پێدەبەخشـێ، وە تیایانـدا هەیـە نێـرو مێـی پێکـەوە پێدەبەخشـێ. ﴿إِنَّهُ عَلِيمٌ﴾ بە هەموو شـتێک ﴿قَدِيرٌ﴾ لەسـەر هەموو شتێک، هەڵیدەسـوڕێنێ بە زانسـتو وردبینی لە شتەکاندا، وە بە دەسـەڵاتی لە دروسـتکراوەکاندا.

(٥١-٥٣): ﴿وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِ مَا يَشَاءُ ۚ إِنَّهُ عَلِيٌّ حَكِيمٌ ﴿٥١﴾ وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ وَلَٰكِن جَعَلْنَاهُ نُورًا نَّهْدِي بِهِ مَن نَّشَاءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾ صِرَاطِ اللَّهِ الَّذِي لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ۗ أَلَا إِلَى اللَّهِ تَصِيرُ الْأُمُورُ ﴿٥٣﴾﴾:

﴿وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلَّا وَحْيًا﴾ کاتـێ بەدرۆدانـەرانو بێبڕ وایـان بە پێغەمبەرانی خوایـان وت: ﴿لَوْلَا يُكَلِّمُنَا اللَّهُ أَوْ تَأْتِينَا آيَةٌ ﴿١١٨﴾﴾ البقرة، (واتـە: بۆچـی خوا خۆی قسـەمان لەگـەڵ نـاکات یـان نیشـانەیەکمان بۆ نایـەت) لە لووت بـەرزیو خۆ بـە گەورە

زانینیانــەوە، خــوا ﷻ وەڵامــی دانــەوە بــەم دەقــە پیــرۆزە، کــە بێگومــان قســەکردنی نایێ تەنهــا بۆ بەدیهێنــراوە تایبەتەکانــی نەبێ، لــە پێغەمبــەرانو پاڵفتەکراوانی نــاو جیهانیان، ئەو قســەکردنەش لەســەر یەکــێ لەم ڕووانــە دەبێ:
یــان خــوا قســەی لەگەڵــدا دەکات بە وەحیو ســروش، بــەوەی کــە وەحی دەخاتە نــاو دڵی پێغەمبەرەکــەی بەبــێ ناردنــی فریشــتەیە، وە بەبێ دوانــدن لەگەڵیدا بە قســە کردن.
﴿ أَوۡ ﴾ یــان قســەی لەگەڵــدا دەکات بە قســەکردن، بــەلاَم ﴿ مِن وَرَآيِٕ حِجَابٍ ﴾ واتە: (لە پشــتی پــەردەوە) وەکــو چۆن ڕوویدا لە مووســای کــوڕی عیمران قســەکەر لەگــەڵ خوای بــە بەزەیی.
﴿ أَوۡ ﴾ یــان قســەی لەگەڵــدا کــردوە بەڕێگــای فریشــتەیەکی نێــردراوەوە، جا ﴿ يُرۡسِلَ رَسُولٗا ﴾ (نێردراوێــک بنێرێــت) وەک جبریل، یان وێنەی ئەو لە فریشــتەکان ﴿ فَيُوحِيَ بِإِذۡنِهِۦ ﴾ واتــە: بــە فەرمانــی پەروەردگــاری (کە بیەوێ ســروش دەکات) نــەک بە هەواو ئــارەزووی خۆی.
﴿ إِنَّهُۥ ﴾ بێگومــان خــوای بەرز، خــودی بەرزە وەسفەکانیشــی بەرزن، مەزنــن کردارەکانی بــەرزن، زاڵە بەســەر هەموو شــتێکدا، بەدیهێنراوەکان ملکەچی بــوون ﴿ حَكِيمٞ ﴾ کار دروســتە لــە دانانی هەر شــتێ لە جێگای خۆیــدا، لــە بەدیهێنراوەکانو شــەریعەتەکان

وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾ صِرَٰطِ ٱللَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ أَلَآ إِلَى ٱللَّهِ تَصِيرُ ٱلْأُمُورُ ﴿٥٣﴾

﴿ وَكَذَٰلِكَ ﴾ (هەر بەو شێوەیە) کاتێ وەحیمان نارد بۆ پێغەمبەرانی پێش تۆ﴿ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ﴾ ئەویش قورئانی پیرۆزە خوا ناوی لێنا بە ڕووح، چونکە ڕووح جەستەی پێ زیندوو دەبێتەوە، قورئانیش دڵو ڕووحەکانی پێ زیندوو دەبنەوە، وە بەرژەوەندیەکانی دینو دنیایان پێ بەدەست دێ، چونکە خێرێکی زۆرو زانستێکی بێ ئەندازەو فراوانی تێدایە.

ئەو قورئانە تەواوی منەتی خوایە لەسەر پێغەمبەرەکەیو بەندە بروادارەکانی، بەبێ هیچ هۆکارێک لەلایەن ئەوانەوە، ئا لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی:﴿ مَا كُنتَ تَدْرِى ﴾ واتە: پێش دابەزینی قورئان بۆ سەرت﴿ مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ ﴾ واتە: هیچ زانستێکت نەبوو بە هەواڵی کتێبەکانی پێشین، وە نە ئیمانو نە کردەوە هەبووە بە شەریعەتەکانی خوا، بەڵکو تۆ کەسێکی ئوممیو نەخوێندەوار بووی، نە دەتزانی بنووسی نە بخوێنیتەوە، جا ئەم کتێبەت بۆ هات کە﴿ جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا ﴾ (واتە: ئێمە ئەوەمان کردە ڕووناکی) ڕێنمایی پێ دەکەین لە تاریکیەکانی کوفرو بیدعەو هەواو ئارەزووە خراپەکان، وە بە هۆیەوە حەقیقەتو ڕاستیەکان دەناسن، وە ڕێنمایی پێ وەردەگرن بۆ ڕێگای ڕاست﴿ وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾ (واتە: بەڕاستی تۆ خەڵک ڕێنمایی دەکەیت بۆ ڕێگای ڕاست) ئاگاداریان دەکەیتەوەو بۆیان ڕوون دەکەیتەوە، وە ڕووناکی دەکەیتو حەزیان دەجوڵێنی بۆ لایو ڕێگریان لێدەکەی لە دژەکەیو دەیانترسێنی لێی، پاشان تەفسیری ڕێگای ڕاستی کردووەو فەرموویەتی:﴿ صِرَٰطِ ٱللَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ﴾ ئەو ڕێگایەی

خـوا دانـاوه بـۆ بەندەکانـی، وە هەواڵـی پێـداون ئـەو ڕێگایـە دەیانگەیەنـێ پێـی، وە بـۆ ماڵـی ڕێـزداری ﴿أَلَآ إِلَى ٱللَّهِ تَصِيرُ ٱلۡأُمُورُ﴾ واتـە: هەمـوو کارە خێـرو شـەڕەکان دەگەڕێنـەوە بـۆلای ئـەو، جـا پاداشـت دەداتـەوە هەرکەسـەو بەپێـی کـردەوەی خـۆی، ئەگـەر خێربـوو بـە خێـر، وە ئەگـەر شـەڕ بـوو بـە شـەڕ.

تەفسیری سوورەتی (الشوری) تەواو بوو.

# ناوەڕۆک